# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی دەیەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

مامۆستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی دەیەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

## سورەتی (المجادلة)
## مەدینەیی یە و ۲۲ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئـەم سـورەتەو وێنـەی ئـەم سـورەتە نیـشاندەری ئـەو سـتوونە بـەهێزو پتەوانـەن کـە کۆمەڵگـەی موسـڵمانی سـەرەتایی لەسـەر راوەسـتاوە، بـەو شـێوەیە چەسـپا کـە مرۆڤایـەتی گـشتی شـانازی پێـوە دەکـاو لـە مێـژووی مرۆڤایـەتی دا سـەرپەڕی بـۆ تـەرخان کـراوەو بـە لوتکەی بەرزی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی دانراوە. بەجۆرێ چەسپاو بناغەی دانا ئەو کۆمەڵە بەختیارەی گەیاندە ئاسۆیەکی ئەوەندە بەرز تاکو بە رۆڵی جیهانی و رۆڵی گـەردوونی خۆی هەسـتێ. ئەو رۆڵـەش زۆر گـەورەو گرنگە کـە سەرەتاکەی لە تێـڕوانینی نـوێ و گشتگیر بـۆ جیهـان و بـوون دەسـت پـێ ئـەکات. لـە دەروونـی ئـەو کۆمەڵـەی کـە بـە نیـازە هـەڵگری بـێ بـۆ تەواوی مرۆڤایەتی.. کەواتـە ئـادەمیی تـەواوی پێویـستە. سـەرەتام ئـەم سـورەتە چارەسـەری رەببـانی و قورئـانی بـە شـێوەیەکی وردو کاریگـەر دەخاتـە روو، مرچـرك بـە رۆحـی مرۆڤـدا دێنێ. لە چەند روویەکەوە هەست بەوە دەکرێ، یەکێ لەوانە لایەنی چاودێریی خوا بەسـەر مرۆڤەوە، بە تایبەتی ئەو کۆمەڵە مرۆڤەی سەرەتایی ئیسلام. چاودێریی خوا لە ئاستێکەو بە جۆرێکە کە بە ئاشکرا هەسـت دەکـرێ وا خـوای گـەورە سـەرنجت دەدا و لەسـەر بەرنامەکـەی خۆی پەروەردەت دەکاو وات لێ دەکات کە هەستێکی زیندووت هـەبێ و پلـە بـە پلـە لـە وردو درشـتی کاروبـاردا هەسـت بـە پەیوەنـدی راستەوخۆی ئاسمـان و زەوی بکـەیت، پەیوەنـدی و بەشـداری ئاسمـان لەگـەڵ زەوی و ئـەو کۆمەڵـە خەڵکـەی سـەر زەوی. ببینـە چـۆن خـوای بوونـەوەرو زەوی و ئاسمـان و گـەورەیی گـەردوون، چـۆن لـە کاروبـاری رۆژانـەی خێزانێکـی هەژارو داماو و دەنگ دێت و حوکم و بڕیاری خۆی دەداو چۆن گوێ بیستی قسەو گوفتاری ئەو ژنە بوو، هەروەها چۆن سکاڵا و دادو هـاواری ژنێکی بـێ دەسـەڵات و لێقەوماو کە هیچ ئومێدێکی لەسەر زەوی نەمابو، ئەو سەر زەوی یەی کە حوکمی نارەواو ناهەقی بە مل دا بڕی و تروسکەی رووناکی بۆ نەهێشتەوە، بەڵێ لەسـەر سکاڵاو دادی ئەو ژنـە خـوا حوکم و بڕیاری خۆی داو بوو بە وانە و پەندێکی وا گرنگ و کاریگەر بۆ هـەتا هەتایە سوودی لێ

وەربگیرێ و سیفەتی دادگەری و بیسەری و بینەری خوای تێدا رەنگ بداتەوە، چۆنیەتی رووداوەکە بەم شێوەیە کە هۆی دابەزینی چوار ئایەتی سەرەتای سورەتەکەیە: دەڵێن خەولەی کچی ثعلبە کە خێزانی (اوس بن الصامت) بوو واتە برای (عبادە بن الصامت)، اوس لە خەولە تورە دەبێ و (ظهار) ی لەگەڵ بەکار دێنێ. (ظهار) واتە هەرکام لە ئێوە بە ژنەکەی بڵێ تۆ وەك پشتی دایکم وایت، ئەوەش شتێك بوو لە سەردەمی نەفامی دا هەرکەس بیگوتبا ئەوا خێزانەکەی لێ ی حەرام دەبوو، ئەویش وا بە خەولە دەڵێ. بەم پێ یە دەبێ خەولە لای ئەوس نەمێنێ و تەلاق بدرێ. ئەوەش شتێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ ئافرەتێك کە چەند منداڵی بچووکی هەبێ و تاکە پەنا بێ بۆیان، بێجگە لەوەش کە پێشتر ئافرەتێکی دیارو خاوەن کەس و پشت و پەنا بووە، کەچی ئێستا بێ کەس و پشت و پەنا کەوتووە، ناچار دەچێتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا سکاڵای خۆی لای ئەو بکات...

بەسەرهاتەکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەگێرێتەوە و دەڵێ: ئەوس بە گەنجی منی مارە کرد، کە ماڵی زۆرو کەس و کاری زۆرم هەبوو، بەلاّم کە گەنجیم نەماو ماڵەکەی خواردم کەس و کارم بلاّوەیان تێ کەوت و منداڵم زۆر بوو من وەك دایکی خۆی دادەنێ. ئێستاش من منداڵی ساوام هەیە ئەگەر لای ئەو بێ دەفەوتێن، ئەگەر لای خۆم بن لە برسان دەمرن. پێغەمبەریش(ﷺ) پێ‌ی دەڵێ: (هیچم لەو بارەوە لا نی یە و پێم نەگەیشتووە) یان لە ریوایەتێکی تردا پێ‌ی دەڵێ: (لێی حەرام بوویت) ئەویش دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئەوس باوکی منداڵەکانمەو خۆشەویست ترین کەسە بەلامەوە، باسی تەلاّقی نەکردووەو تەلاّقی نەداوم. دوو سێ جار ئافرەتەکە ئەوە ئەڵێت و پێغەمبەریش (ﷺ) هەر ئەو وەلاّمەی ئەداتەوە، ئینجا ئەویش سەر بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان و ئەڵێ: خوایە من سکاڵای خۆم بۆلای تۆ ئەکەم، بۆ هەژاری و بێکەسی خۆم، ئەم مێردەم بە گەنجی منی مارە کرد، کە ماڵی زۆرو کەسو کاری زۆرم بوو، کاتێك کە گەنجیم نەماو ماڵەکەی خواردم و کەس و کارم بلاّو بوونەوە ئاوام بەسەر ئەهێنێ، ئێستاش چەند منالّێکم هەیە لێی، ئەگەر ئەیاندەم بەسەریدا ئەفەوتێن، ئەگەرئەیانگرمە لای خۆم ئەمرن لەبرساندا، خەولە لەم قسانەدا بوو پێغەمبەر(ﷺ) وەحی بۆ دێ، لە پاشان سەر بەرز ئەکاتەوە،

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ
﴿١﴾ الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ
لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾

**ئەفەرموێ: خەولە لەبارەی خۆت و مێردەکەتەوە خوا ئەم چوار ئایەتەی ناردە خوارەوە[1]:**

**﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ *قَدْ سَمِعَ اللَّهُ﴾ بێگومان خوا بیستی و وەری گرت ﴿قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ﴾ قسەی ئەو ئافرەتەی کە قسەو وت و وێژی زۆری لەگەڵ کردی ﴿فِي زَوْجِهَا﴾ لەبارەی مێردەکەیەوە﴿وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ﴾ سکاڵای خۆی ئەکردبۆلای خوا، ﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾ خوا قسەو وتووێژی هەردووکتانی بیست،چونکە﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾بەڕاستی خوابیسەری بینایەبۆهەموو بیستراوو بینراوێ کە هەندێ لەوانە قسەو شێوە نزاکەی ئەو ئافرەتەو داستانەکەیەتی.**

**ئینجا مەسەلەی ﴿ظهار﴾ روون ئەکاتەوە لەگەڵ بڕیاری خوا تیای دا، ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم﴾ ئەوانەی لە ناو ئێوەدا ﴿ظهار﴾ بەکار ئەهێنن لەگەڵ ژنەکانیان، واتە هەرکام لە ئێوە ئەڵێ بە ژنەکەی تۆ وەك پشتی دایکم وایت بەو قسە نابن بە دایکتان، چونکە ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ﴾ لە راستی دا ئەو ژنانە دایکتان نین ﴿إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ﴾ دایکی ئەوانە هیچ کەس نین بێجگە لەوانەی کە ئەوانیان لێ بووە، ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا﴾ بەڕاستی ئەوانە قسەیەکی بێزراو و ناپەسەندو درۆ ئەڵێن، واتە ئەو ﴿ظهار﴾ە بێ بنەڕەتە و قسەی رووتە، چونکە هاوسەر هەرگیز نابێ بە دایك هەتا قەدەغە ببێ بە وێنەی دایك. هەرگیز بەو قسە رووتە ناگەڕێ بە دایك، ئەو قسە رووتە عەقڵ و شەرع و سروشت و واقیع دژیەتی و وەری ناگرێ، درۆیە و پێچەوانەی راست و راستی یە، ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ بەڕاستی خوا زۆر لێ خۆشبووی لێ بوردەیە، کەواتە ئەبووری لەم کارە ناپەسەندەی کە لەمەوبەر کراوە.**

---

[1] ئەم زیادەیە لە ریوایەتی تردا زۆر رێك و پێك ترە لەگەڵ رواڵەتی یەکەم ئایەتدا.

وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ

---

**ئینجا بڕیارو حوکمی شەرعی ئەم گوناهە روون و دیاریی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ﴾ ئەوانەی کە ﴿ظهار﴾ بەکار ئەهێنن لەگەڵ ژنەکانیان بەم رەنگە ئەڵێن تۆ وەك دایکم وایت، یان تۆ دایکمی، یان تۆ وەك پشتی دایکمی، واتە چەندە دایکم حەرامە لێم تۆش ئەوەندە حەرامی. ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾[1] لە پاشان ئەگەڕێنەوە بۆ بەسەرو گرتن و سڕینەوەی ئەوەی وتیان، بەم رەنگە ئەیانەوێ بچنەوە لای ژنەکانیان و ژیانی ژن و مێردی بەسەر ببەن لەگەڵیان.**

**ئەوانە بەهۆی ئەو قسەو گەڕانەوەوە پێویستە لەسەریان کەفارەت دان بە یەکێ لەم سیانەی کە دێت بەڕیزو یەك لە دوای یەك:**

**١- ﴿فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾ ئازاد کردنی بەندەیەك، نێر یان مێ، گەورە یان بچووك ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ﴾ لەپێش ئەوەی ئەو پیاوو ئافرەتە بکەون لە یەك و کردەوەی ژن و مێردی بکەن. واتە حەرامە بچنە لای ژنەکانیان پێش کەفارەت دان، خوای گەورە ئازاد کردنی بەندەی گیراوە بە کەفارەتی چەند کردەوەو تاوان، تا ببێتە هۆی ئازاد بوونی ئەوانەی کە رژێمی جەنگ هەر لە کۆنەوە گیرانی بە بەندەو بە ناچاری ئیسلام هێشتی یەوە تا ماوەی خۆی دێت، چەند هۆیەکی بڕیاردا، - کە ئەمە یەکێکیان بوو - بۆ ئازاد کردنی بەندە، کە بەو هۆیانەوە رژێمی بەندەیی نەئەماو خۆی بۆ خۆی ئەتوایەوە وەکو لە چەند شوێن دا باسمان کرد.**

---

[1] چەندرایەکی تر هەیە لە تەفسیری ئەم رستەیەدا، هەموو دەست ئەدەن و ئەگونجێن، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە باشتر جێگیر ئەبێ لە دڵدا.

ئینجا هۆی دانانی ئەو کەفارەتە روون ئەکاتەوە وەکو ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ﴾ ئەو بڕیاری کەفارەتە لەسەرتان ئێوەی پێ ئەمێ و مۆچیاری ئەکرێ، کە جارێکی تر ئەو قسە نارەوا نەڵێن، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خوا ئاگادارە بەوەی ئەیکەن، ئاگادارە بە حەقیقەتەکەی، ئاگادارە بە رووداني، ئاگادارە بە نیازتان لەو کردەوانەی کە ئەیکەن. ئەم رستەیەی هێنا لەناو بەناوو پێش تەواو کردنی بڕیارەکە بۆ بێدار کردنەوەی دڵ، پەروەردە کردنی دەروون، بۆ سەرنج راکێشان بۆ زانین و ئاگاداری خوا بە ئاشکراو پەنهانی هەموو شت، ئینجا دێتەوە سەر باسی کەفارەتەکە ئەفەرموێ:

٢- ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ ئینجا هەرکەس بەندەی دەست نەکەوت لەبەر نەبوونی و کەم دەستی یان لەبەر نەبوونی بەندەو نەمانی رژێمەکەی – وەکو ئێستا – ﴿فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾ ئەوە لەسەریەتی رۆژووی دوو مانگ لەسەریەك و بەدوای یەك دا بێ وچان و پچڕان ﴿مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾ لەپێش ئەوەی ئەو پیاوو ئافرەتە بکەون لە یەك و کاری ژن و مێردی بکەن.

٣- ﴿فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ﴾ ئینجا ئەگەر نەیتوانی ئەو رۆژووە بگرێ لەبەر پیری یان نەخۆشی یان لەبەر هەر هۆیەکی تر ﴿فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾ ئەوە لەسەریەتی خۆراك دانی شەست هەژار، ئەندازەی ئەو خۆراکە دیاریی کراوە لە کتێبی زاناکانی ئیسلامدا بە پێی مەزهەبە جیاوازەکان کە ناسراون و جێگای باوەڕن. با سەرنجی ئەو کتێبانە بدرێ.

ئینجا بەدوای ئەو بڕیارو تەمێدا ئەم فەرمودە ئەهێنێ کە زۆر سەرنج راکێشە: ﴿ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ ئەوەی کە باس کراو پێویست کرا لەسەرتان بۆ ئەمەیە بڕوا بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، بێگومان ئەوانەی کە ئەم فەرمودەو فەرمانەیان ئاراستە کراو ئەکرێ بڕوادارن، بەڵام ئەم باس و بڕیارو کەفارەت و بەستنەوەی کاروبارە بە خواوە بڕوا بە خوا بەدی ئەهێنێ و دەری ئەخات لە رووداوی ژیان دا، ژیان پەیوەست ئەکات پێ یەوە، دەسەڵات و زاڵی ئاشکرا ئەکات بەسەر ژیان و رووداوی ژیاندا، کە ئەوەیە بڕوای راستەقینە و ئەوەی بڕوایە کە مەبەست و داوا کراوە لە ئایینی پاکی ئیسلامدا،

وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ كُبِتُوا۟ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ

---

﴿وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ ئەو بڕیارانە سنوورەکانی خوان، کەواتە بە هیچ کلۆج نابێ سەریان لێ بکرێتەوە و دەستیان تێ بخرێ و گۆڕانیان بەسەر بهێنرێ، ئەوانەی کە بەو جۆرە دەست درێژیی بکەن لە سنوورو بڕیاری خوا، ئەوانە لە ئیسلام دەرئەچن و کافرن ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆ کافرانیش سزایەکی ئێش و ئازار دەر هەیە، سزای سووتان بە ئاگری دۆزەخ، سزای بەش براوی لە نازو ڕێزی بەهەشت و بێ بەشی لەرەحمەت وبەزەیی خوا، خوا پەنامان بدات.

لە سەرەتای سورەتەکەوە تا ئێرە شێوەی شیرینی چاودێریی و بەڕێزگرتنی خوای نیشاندا دەربارەی موسڵمانان، ئینجا لەم چەند ئایەتی تردا شێوەی خەشم و سزای خوا نیشان ئەدات سەبارەت بەوانەی کە هەڵوێستێکی دژو پێچەوانەیان هەیە بەرامبەر خواو پێغەمبەرو سنوورەکانیان، ئەوەش بە گوێرەی باوی قورئان کە لە باسێکەوە ئەگوێزێتەوە بۆ باسێکی ترکەدژو پێچەوانەی باسی پێشووە، بێجگە لەوەش کە باوێکی زۆر ڕێك و بەجێیە و بەکارە لەتەمیّ دادان و ڕێنموونیدا، بێجگە لەوە لێرەدا ڕستەی: ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ی هێنا.

بە دوای باسی پێشوودا کە زۆر پەیوەست و ڕێك بوو لەگەڵی، لە هەمان کات دا وەك پەیژەیەکی لێ هات بۆ گواستنەوە بۆ باسی دووەم کە لێرەدا دەست پێ ئەکات: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بەرامبەرکێ ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا، بەم ڕەنگە لە هەڵوێست و سنوورێك دان دژو پێچەوانەی سنووری ئەوان ﴿كُبِتُوا۟﴾ ئەوانە ڕیسواو سەرشۆڕ کران و لەناو بران. واتە بڕیاری ئەوەیان لەسەر درا یان مەبەست ئەوەیە: بێگومان ڕیسواو سەرشۆڕ ئەکرێن. ﴿كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ هەرچۆنێ ئەوانەی پێش ئەمان ڕیسواو سەرشۆڕ کران و لەناو بران لە گەلە ڕابردووەکان کە بەرامبەرکێیان کرد لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان [1] ئەمانە ئەوەیان بەسەر دێت بە هۆی ئەو بەرامبەرکێ کردنەیان.

---

[1] هەڵەگرێ مەبەست بە پێشووەکان ئەوانە بن کە موسڵمانان زاڵ بوون بەسەریان دا پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە وەکو ئەو کۆمەڵەی کە لە غەزای بەدردا تیاچوون.

وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۚ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ
أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ

**﴿وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ﴾ لەكاتێك دا كە ئێمە چەند ئایەتی روونمان ناردە خوارەوە لە بارەی دوا رۆژو چارەنووسی ئەوانەی بەرامبەرکێ یان کرد لە گەڵە رابردووەکان، یان چەند ئایەتی روون لەبارەی راستی پێغەمبەرەوە (ﷺ). بەهەرحاڵ کەواتە ئەوانە هەرچیان بەسەرهات ماڵ خۆیانەو هیچ بەڵگەو بیانوویەکیان بەدەستەوە نی یە.**

**ئینجا دوارۆژو چارەنووسی رۆژی دوایی یان نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ بۆ ئەو کافرانە هەیە سزایەکی ریسوا کەر ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا﴾ لە رۆژێك دا کە خوا هەموویان زیندوو ئەکاتەوە و پێکەوەن﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟﴾ ئینجا هەواڵیان پێ ئەدات و ئاگاداریان ئەکات بە هەر کردەوەیەك کە کردوویانە لەم جیهانەدا، ﴿أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ﴾ خوا هەموو کردەوەکانی هەڵژماردوون، ﴿وَنَسُوهُ﴾ ئەمان لەبیریان چووەتەوە، جا خوا یەك بە یەك ئەیداتەوە بە ناوچاویان دا، ئەو ریسوا کردنەیان بەسەر ئەهێنرێ لە تۆڵەی کەشخە و خۆ بە زل زانی و دەم درێژیی یەکەی ئەم جیهانیان، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ خوا بینا و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا شێوەی رێزو چاودێریی موسڵمانان، شێوەی ریسوا کردن و سزادانی دوژمنەکانیان کۆ ئەبنەوەو یەك ئەگرن لە ئاگاداری و زانینی خوادا چونکە خوا بینا و ئامادەی ئەو کۆمەکی و چاودێریی یەیە و بینا و ئامادەی ئەو ریسوا کردن و سزادانەیە، کەواتە با موسڵمانان دڵشادو دڵنیا بن بە بینین و ئامادەیی یەکەی خوا. با کافرەکانیش بترسن لەو ریسوا کردن و سزادانە کە لە پێش چاوو ئامادەیە لە زانینی خوادا.**

**ئینجا بە شێوەیەك نەخشە ئەکێشێ و نموونەیەك لە زانین و ئاگاداری خوا ئەخاتە بەرچاو، شێوەو نموونەیەکی دڵ تەزێن کە ئەدا لە بەنوکەی دڵ، لە یەکەم جارەوە زانین و ئاگاداری تێرو تەواو و گشتی بۆ خوا بۆ ئەم زەوی و ئاسمانانە نیشان ئەدات، با دڵ بکەوێتە گەردش و بڕواو بگەڕێ بۆ هەموو ئاسۆو کون و قوژبنی ئاسمانەکان و زەویدا لەگەڵ ئەو زانینە بێ سنوورەی کە دەوری هەموو شتی داوە، لە گەورەو بچووك، دیاریی و نادیاریی، ئاشکراو نە ئاشکراو، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا نەتزانیوە خوا ئاگادارو زانایە بە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەویدا.**

مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾

**ئینجا لە ئاسۆو ناوچەکانی ئاسمانەکان و کون و قوژبنەکانی زەوی یەوە دێتەوە هەتا ئەنووسێت بە خەڵکی یەوەو دەست کاری دڵیان ئەکات بە نموونەیەك لەو زانینە بێ سنوورە بە جۆرێ دڵی بێدار ئەهێنێتە لەرزە، ئەفەرموێ: ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ﴾ هیچ چپە و سرتەی سێ کەس نابێ ﴿إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾ مەگەرخواچوارەمیان ئەبێ، ﴿وَلَا خَمْسَةٍ﴾ چپەو سرتەی هیچ پێنج کەسێك نییە ﴿إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾ مەگەر خوا شەشەمیان ئەبێ، ﴿وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ﴾ نە کەمتر لەوەو نە زۆرتر نییە و نابێ ﴿إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ﴾ مەگەر خوا لەگەڵیانە بە زانین و دەسەلات ﴿أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾ لە هەر شوێنێك بن، لە دەرەوە بن، یان ژوورەوە بن، لەسەر بەرزترین شوێن بن، یان چاڵ ترو نزم تر، لەسەر ئەم زەوی یە بن، یان لەسەر مانگ یان هەر ئەستێرەیە تر بن، چونکە خوا زانایە بە هەرچی لەم بوونەوەرەدایە.**

**بەراستی نموونە و شێوەیەکی زۆر بەکارو کاریگەرە لە دڵ و دەروون دا، نموونەو شێوەیەکە لە لایەکەوەو دڵ و دەروون ئەهێنێتە لەرزەو پڕی ئەکات لە سام و بیم، لە لایەکی ترەوە ئارامی و ئاسایشی تێ ئەخات، چونکە هەست ئەکات کە هەمیشە لە حوزوری خوادایە و خوای لەگەڵە، هەرسێ کەس کەوتنە یەك ئەزانن خوا چوارەمیانە، هەر پێنج کەس کۆبوونەوە ئەزانن خوا شەشەمیانە. هەر دوو کەس لە هەر شوێنێ چپەیان کرد خوا لەوێیە! هەرچەندیتربن خوا لەوێیەولەگەڵیانە، کەواتەبە ناچاری ئەو دوو حاڵەتە روو ئەکاتە ئەو دڵە.**

**بەراستی دڵی وشیار کە بیر بکاتەوە خۆی بۆ ناگیرێ، ناتوانێ نەکەوێتە لەرزەو پەرۆش، بەراستی شێوەکە زۆر سامناکە و لەهەمان کات دا ئارام دەرو هۆی شادمانی یە، خوا لەگەڵیانەلەهەر کوێ بن، ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەپاشان لە رۆژی دوایی دا هەواڵیان پێ ئەدات و ئاگاداریان ئەکات بە هەر کردەوەیەك کردوویانە لەم جیهانەدا ئەمەش دەستکاری کردنێکی ترە دڵ ئەهێنێتە لەرزەو هەشوکە. بێگومان تەنیا ئاگاداری خواو حازربوونی**

خواو بیستنی چپە و سرتەی خەڵکی شتێکی زۆر گرنگ و سامناکە، چ جای ئەوە پرسیارو تۆڵەیشی بەدوادا بێت بۆرۆژی دوایی، چ جای ئەوچپەوسرتەی کەئێستالەخەڵکی ئەشارنەوە لەو رۆژە سەختەدا دەرخرێ و جاڕی لێ بدرێ لەناو هەموو ئادەمی و جن و مەلائیکەدا!!! ئینجائایەتەکە دوایی ئەهێنێ بە باسی فراوانی و گشتێتی زانینی خوا بۆ هەموو شتێك، وەکو لە سەرەتای ئایەتەکەیشەوە نیشانیدا. ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا بە هەموو شتێ زاناو ئاگادارە.

ئا بەم جۆرە شێوەی زانینی خوا دامەزراوو جێگیر ئەکات لە دڵ و دەروون دا، لە تەنیا ئایەتێك دا بە سێ جۆر نیشانی ئەدات و ئەیچەسپێنێ، لە بارەی دیاریی کردن و هەڵبژاردنی ژمارەی ۳، ٥، لە ئایەتەکەدا چەند هۆیەك باس کراوە لە ناویان دا دوانیمان هەڵبژارد:

١- ناپاکەکان بە سێ کەس و پێنج کەس کۆ ئەبوونەوە و دەستیان ئەکرد بە چپە و سرکەسرك بە پێش چاوی موسڵمانانەوە، بۆ ئەمەی داخ بەرنە دڵیان، بە تایبەتی لە کاتێك دا کە پێغەمبەر (ﷺ) تاقمێکی لە موسڵمانەکان بناردایە بەم لاو بەو لا بۆ غەزا یان بۆ کارێکی تری ئیسلام، لەو کاتانەدا ئەوەیان فەراهەم ئەهێنا تا موسڵمانەکان گومان بەرن کە ئەو تاقمە نێرراوە کوژراون یان بەسەرهاتی خراپیان بەسەر هاتووەو ئەوانە ئەو هەواڵەیان پێگەیشتووەو باسی ئەوە ئەکەن، کەواتە دیاریی کردنی ئەو دوو ژمارەیە بە پێی ژمارەی ئەو ناپاکانەیە بۆ هەڕەشە لێ کردن و ترساندنیان بەمەی خوا ئاگادارە لەو پیلان و کردەوە پیسەیان.

٢- ئەو کەسانەی کە دائەنیشن و سەر ئەکەن بە یەك دا بۆ تەگبیر و پرس و را بە پێی باوی خەڵکی ژمارەیەکی کەمن، لای خوارووی دوان، ئینجا تا پێنج و شەش بە پێی پێویستی و کات و شوێن، حەکەمێکیش پێویستە بۆ روون کردنەوەی کام راو بار راست و رەوایە، خوای گەورە سیان و پێنجی باس کردو لەپاشان فەرموی: ﴿وَلَآ أَدۡنَىٰ مِن ذَٰلِكَ﴾ کە چوارو دوو ئەگەیەنێ، فەرموی: ﴿وَلَآ أَكۡثَرَ﴾ کە ئەو ژمارەیانەی تر ئەگرێتەوە کە پێویست بێت، ئەم دوو ژمارەیەش تاکن و خوایش تاکی خۆش ئەوێت.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُواْ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ

---

**خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاگاداری خۆی روون کردەوەو بە قوڵی و وردی، بەوە رێگای کردەوە بۆ هەڕەشە کردن لە ناپاك و جولەکە کە کۆ ئەبوونەوەو سەریان ئەکرد بە یەك دا بۆ تەنـدنی پـیلان دژی پێغەمبـەر (ﷺ) و دژی کۆمـەڵی مـسوڵمانان لـە مەدینـەدا، بـە شـێوەی پرسیار خەڵکی سەرسام ئەکات لە هەڵوێستی نارەوای ئەو جوولەکەو ناپاکانە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئایـا سـەرنجت نـەداوەو ئاوڕێـك نادەیتـەوە ﴿إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُواْ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ﴾ بـەلای ئەوانـەی بەرگری کران لە چپە و سرکە سرك ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ﴾ کەچی لە پاش ئـەوە ئەگەڕێنـەوە بۆ ئـەوەی جلـەوگیری کـران لـیێ ی، ﴿وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ لـەناو خۆیـان دا بـە نهێنی چپە ئەکـەن بـە گونـاهو دوژمنایـەتی و دەسـت درێـژیی و ﴿وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ﴾ سەرکێـشی لـە پێغەمبەرو بە گوێ نەکردنی ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ﴾ کاتێ بێن بۆ لات سڵاوت لـێ ئەکەن، ﴿بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾ بە جۆرێك کە خوا بەو جۆرە سڵاوی لێ نەکردوویت، لە باتی السلام علیك ئەڵێن: السام علیك واتە مردن بێتـە سـەرت، لـە کاتێك دا کە خـوا ئەفـەرموێ: ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ سەڵاو لەسەر پێغەمبەرەکان بێت، ﴿وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ لە دەروونی خۆیان دا ئەڵێن: ﴿لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ﴾ با خوا سزامان بدات بە هۆی ئەو قسانەی کە ئەیڵێین پێ ی. ئەم ئایەتە وا نیشان ئەدات کە خیتەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە یەکەم جارەوە لەگەڵ ناپاکەکان دا پەند و مۆچیاری بوو بە رێك و راستی و ئیخلاس و دوورکەوتنەوە لە پیلان و ناپاکی یە کە هەڵئەسان پێ ی بە رێك کەوتنیان لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینە و بە هاندانی ئەوان، لەگەڵ ئەو پەند و مۆچیاری یـەدا ئـەوان هـەر بـەردەوام بـوون لەسـەر پیسی و ناپـاکی خۆیـان، تێکۆشـان لـە پـیلان و سەرکێـشی لـە فـەرمانی پێغەمبـەر (ﷺ) و شـێواندنی کاروبـاری موسـڵمانان، هـەروەها هەڵوێستە نارەواکانی تریان، هـەر لـە سـەرەتای سـورەتـەوە تـا ئێـرە دەرئەکەوێ کە خـوا ئەو هەواڵە نهێنی یانەی داوە بە پێغەمبـەر (ﷺ) و قسە نارەواکانیـان و نیـازە پیسەکانیانی بۆ ئاشکرا کردووە.**

حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ
وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا النَّجْوَىٰ مِنَ الشَّيْطَانِ
لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾

---

ئینجا دەم کوتیان ئەکاتەوەو بەرپەرچیان ئەداتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ﴾ بەسیانە دۆزەخ ﴿يَصْلَوْنَهَا﴾ لەکاتێك دا ئەچنە ناوی یەوەو پێ ی ئەسوتێنرێن ﴿فَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ چونکە دۆزەخ خراپترین جێ و شوێن و چارەنووسە. دەرخستنی ئەو هەموو پیلانە نهێنی یانە، هەواڵدان بەو چپە و سرسرکی ئەو ناپاکانە، هەروەها ئاشکرا کردنی ئەو نیازو قسەیانەی کە لە دەروونی خۆیان دا ئەیانوت. ئەوانە هەموو نموونەیەکی روون کەرەوە بوون بۆ راستی و حەقیقەتی ئاگاداری و زانایی خوا بە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەوی دا، حازری و ئامادەیی خوا بۆ هەموو چپە و نهێنی و کۆبوونەوەیە. ئەوەش دوژمن و ناپاکەکان ئەخاتە مەترسی و دەست نیشانیان بۆ ئەکات کە هەموو کاروباریان ناسراوو پێ زانراون، هەرچۆنێ ئارام و باوەڕی بەهێز ئەدات بە دڵ و دەروونی موسڵمانان.

ئینجا لێرەدا لایەك ئەکاتەوە بۆ لای ئیمانداران بانگیان ئەکات و ئەم فەرمان و فەرمودەیان ئاراستە ئەکات، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا تَنَاجَيْتُمْ﴾ کاتێ چپە و سرتەتان کرد ﴿فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ﴾ چپە و سرتە مەکەن بە گوناهو دەست درێژیی و دوژمنایەتی و سەرکێشی لە پێغەمبەرو بە گوێ نەکردنی، واتە بە وێنەی جولەکە و ناپاکەکان مەبن، بەڵکو کاتێ چپەو سرتەتان کرد یان بەم جۆرە بێت ئەفەرموێ: ﴿وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ﴾ چپە و سرپە بکەن بە شتی چاك و لەخواترس و خۆپارێزیی لە شتی خراپ، ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن لەو خوایەی ﴿إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ کە تەنیا بۆلای ئەو ئێوە کۆ ئەکرێنەوە لە رۆژی دواییدا.

وا دەرئەکەوێ هەندێ موسڵمانەکان کە هێشتا دەروونیان دەقی نەگرتبوو بەو رژێمەوە، رەنگی نەگرتبوو بەو هۆندنەوەی کە ئیسلام فەراهەمی هێنا لە ریزی موسڵمانان دا، ئەوانە

لەکاتی تەنگانەو رووداوی گەورەو گرنگ دا کۆئەبوونەوە بۆ ئەمەی لەناو خۆیان دا تەگبیر و پرس و را بکەن بە بێ سەرکردایەتی و دوور لەوە، ئەوەیش کارێکی ناڕەوایە و دژی سروشتی کۆمەڵایەتی ئیسلامی یە، کە پێویستی کردووە گەڕانەوە بۆلای سەرکردایەتی لەو جۆرە کارانەدا و لە خۆوە بە بێ پرس و رای سەرکردایەتی موسڵمانان کۆئەبنەوە هیچ راوێژ و بڕیارێ نەکرێ و نەدرێ، هەروەها وا دەرئەکەوێ هەندێ لەو کۆبوونەوانە ئەبوو بە هۆی بێ ئارامی و ئازاری دڵ و دەروونی کۆمەڵی موسڵمانان – هەرچەند ئەو کۆبوونەوانە بە نیازی خراپە نەکرابن و مەبەست چاکە بووبێ – بەڵام تەنها دەست خستنە ئەو جۆرە کارە گشتی یانە بە بێ پرسی سەرکردایەتی سەری لە چاکەوە دەرناچێ و لەوانەیە ببێ بەهۆی زیان و ئازاری دڵی موسڵمانان. جا لەبەر ئەوە ئەو بانگەی کرد لە ئیمانداران و جڵەوگیری کردن لە بارو رێگای راست و دەست نیشانی بۆ کردن بۆ ئەو مەبەست و ئامانجەی کە شایانە بۆ ئیمانداران و تەگبیر و راوێژی تیا بکەن.

ئینجا سەرچاوەی چپە و سرتەی ناڕەوا روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ چپە و سرتەی خراپ و ناڕەوا تەنها لەلایەن شەیتانەوەیە، ئەوەش فەراهەم ئەهێنێ ﴿لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بۆ ئەمەی ئەوانەی بڕوایان هێناوە غەمبار بکات بەو چپە و سرتەیە، واتە ئیمانداران وا بزانن باسی ئەوان ئەکەن و بەو بۆنەوە غەمبار ببن ﴿وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا﴾ بێگومان شەیتان یان ئەو چپە و سرتەیە زیانداری هیچ شتێکی بڕواداران نی یە ﴿إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ مەگەر بە ئیزن و فەرمانی خوا، کەواتە با ئیمانداران هیچ باکیان نەبێ لەوە ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ تەنها پشت بە خوا ببەستن بڕواداران.

چەند حەدیس هاتووە بۆ قەدەغە کردنی چپە و سرتە لە کاتێك دا کە ببێتە هۆی بێ ئارامی دڵی خەڵکی و مەترسی: یەکێ لەو حەدیسانە ئەمەیە کە لە بوخاری و موسلیم دا هاتووە لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە – خوای لێ رازی بێت – ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کاتێ سێ کەس پێکەوە بن با دوانتان چپە و سرپە نەکات، بە بێ هاوڕێکەیان، چونکە ئەو چپەیە غەمباری ئەکات.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١١﴾

---

بەراستی ئەوە ئەدەبێكی زۆر بەرزە، هەرچۆنێ خۆپارێزیی یەكی رێك و رەوایە بۆ دوور خستنەوەی هەموو دوو دڵی و بەد گومانی یە، بەڵێ ئەگەر بەرژەوەندی هەبوو لە شاردنەوەی شتێكی نهێنی دا، یان چاو نوقاندن و پەردە هێنان بەسەر عەیب و لەكەیەك دا، یان هەركارێكی تری گشتی یان تایبەتی، ئەوە هیچ خراپی یە نی یە لە پرس و راو مەشوەرەت دا بە نهێنی و شاردنەوە لە هەركەس پێویست نەبێ. ئەبێ ئەوە باو بێ لەناو لێپرسراوەكانی گەل و كۆمەڵی موسڵمانان دا، دروست نی یە بۆ هیچ تاقمێ سەربەخۆو بێ پرس و زانینی ئەوانەی پێویستە پرس و رای وەرگرتنیان، ئەو سەربەخۆیی یە هۆی تەفرەقە و دوو دڵی و بەد گومانی یە لەناو رێزو كۆمەڵی موسڵمانان دا، ئەوە یەكێكە لەوانەی كە شەیتان فەراهەمی ئەهێنێ بۆ غەمبار كردنی موسڵمانان، بەڵام وەكو باس كرا پێویستە موسڵمانان بەوە غەمبار نەبن و باكیان لەو جۆرە شتانە نەبێ، چونكە هەموو شتێ بە دەست خوایە.

ئینجا ئامۆژگاری یەكی تری موسڵمانەكان ئەكات، ئەدەب و وێڵێكی تری كۆمەڵایەتی یان بۆ دائەنێ و فێریان ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ﴾ كاتێ پێتان وترا: جێگا بكەن و شوێن فراوان كەن لە جێگا دانیشتنەكەتان دا ﴿فَٱفۡسَحُواْ﴾ ئێوەش شوێن فراوان بكەون و رێگای مەردوم بدەن، بەم رەنگە تەكە بكەن و خۆتان كۆكەنەوە تەك بدەنە دوا ﴿يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ خوایش گوشادی و فراوانیتان پێ ئەدات لە شتێك دا ئێوە ئەتانەوێ. ﴿وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ﴾ كاتێ وترا هەڵسن و جێگا چۆڵ كەن بۆ كەسی تر كە شایانترە ﴿فَٱنشُزُواْ﴾ ئێوەش هەڵسن و جێگا چۆڵ كەن. ئەگەر ئێوە وا بكەن ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ﴾ خوایش پایەو پلەی ئەوانەتان بەرز ئەكاتەوە كە بڕوایان هێناوەو گوێڕایەڵ و فەرمانبەری خواو پێغەمبەرن ﴿وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ﴾ بە

تایبەتی ئەوانەی کە زانینتان پێ بەخشراوە بەرزیان ئەکاتەوە بە چەند رادەو پلەیەك. ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ خوا ئاگادارە بە هەر کارێ کە ئێوە ئەیکەن.

ئەم ئایەتە خۆی لە خۆی دا پەیوەستە بە ئایەتی پێشووە، ئایەتی پێشوو جڵەوگیری ئەکات لەوەی هۆی کینەو بێزاری ناو ئیماندارانە، ئەم ئایەتە فەرمان ئەدا بەوەی هۆی خۆشەویستی و برایەتی یە، بە پێی هەندێ لە ریوایەت هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پەیوەندی هەیە بە ناپاکەکانەوە، کەواتە پەیوەستی نێوانی ئەم ئایەتە و ئایەتەکانی پێشوو بەهێزترو پتەوتر ئەبێتەوە: مقاتلی کوڕی حبان ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە رۆژێکی هەینی دا، پێغەمبەر (ﷺ) لەو رۆژەدا لەو بەشە مزگەوتەدا دائەنیشێ کە ناوبراوە بە (صفة) و جێگای هاوڕێ بێ لانە و یانەکان بووە، شوێنەکە تەنگ بووەو دانیشتوان زۆرو ئەم لاو ئەولای پێغەمبەر (ﷺ) داگیر ئەکەن و پڕی ئەکەنەوە، لەو کاتەدا هەندێ لە یارانی بەدر دێن کە پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە زیادە رێزیان پێ ئەدات و لەبەر بێ جێگایی ئەوەستن و ئەڵێن: السلام علیکم أیها النبي و رحمة الله و برکاته * ئینجا وەڵامیان ئەداتەوەو لەپاش دا سڵاو ئەکەن لە دانیشتوەکان و چاوەڕوانی ئەکەن جێگایان بکەنەوەو ئەوانیش وەڵامیان ئەدەنەوە و ئیتر گوێیان پێ نادەن و ئەوانیش هەر ئەوەستن، ئەوەش لە دڵی پێغەمبەردا(ﷺ) زەحمەت ئەبێ، ئینجا چەند کەس هەڵئەسێنێ لە دانیشتوان کە بەدری نەبوون بۆ ئەوانەی کە وەستاون و بەدرین، بەوەش هەڵسێنراوەکان دڵگران ئەبن، پێغەمبەریش (ﷺ) هەست بەوە ئەکات لە ناوچاویانەوە، ئینجا ناپاکەکان ئەڵێن پێ یان: ئێوە ئەڵێن: ئەم پیاوە بە عەدالەت رەفتار ئەکات لەناو خەڵك دا، بە خوا هیچ بەو جۆرە رەفتاری نەکرد لەگەڵ ئەوانەدا!! کۆمەڵێ هاتوون جێگای خۆیانیان گرتووە لە پێشەوە و حەز ئەکەن نزیك بن لێ یەوە، کەچی ئەوانە هەڵئەسێنێ بۆ تاقمێ ترکە خۆیان سستی و تەمەڵی یان کردووەو نەهاتوون جێگا بۆ خۆیان بگرن. ئینجا ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: رەحمەتی خوا لە هەرکەسێ جێگای برایەکی خۆی بکاتەوە، ئینجا بە جارێ دانیشتووەکان بە گورجی راست ئەبنەوەو رێگای براکانیان ئەکەنەوە، ئەم ئایەتە دێتە خوارەوە لەو رۆژی هەینی یەدا.

ئەم ریوایەتە ئەگەر سەحیح بێت هیچ دژو پێچەوانەی ئەو حەدیسانە نی یە کە جڵەوگیری ئەکەن لەوەی کەس کەسیٚ هەڵسێنیٚ بۆ ئەمەی لە جێگاکەی دا دانیشیٚ، وەکو لە حەدیسی سەحیحی بوخاری و موسلیم دا ئەفەرمویٚ: هیچ کەسێك کەسێکی تر هەڵنەسێنیٚ و ئینجا خۆی لە شوێنەکەی دا دانیشیٚ، بەڵاّم تەکە بکەن و جێگا بکەن و فراوانی بکەن.

هەروەها دژو پێچەوانەی ئەو حەدیسانە نی یە کە پێویست ئەکەن لەسەر ئەوانەی کە دێن بۆ هەر کۆڕیٚ لە هەر شوێنیٚ جێگای هەبوو دانیشیٚ و ئیتر هەنگاو نەنیٚ بە ملی خەڵك دا بۆ ئەمەی بچیٚ لەسەرەوە دانیشیٚ! چونکە ئەوەتا ئایەتەکە فەرمان ئەدات و هانی دانیشتوان ئەدات لەسەرئەوەجێگا بکەنەوە بۆئەوەی لەرێوە دێت، هەرچۆنیٚ فەرمان ئەدات و هان ئەدات لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەری فەرماندار کاتیٚ وتی بە هەر دانیشتوویەك: هەڵسە هەڵسیٚ.

ئەو فەرمانە لە لایەن سەرکردەو لێپرسراو دێت، نەك لەلایەن کابرا کە لە رێوە دێت بۆ ئەمەی هەڵیسێنیٚ و خۆی لە جێگای دا دانیشیٚ. مەبەست پێك هێنانی فراوانی دەروونە پێش فراوانکردنی جیٚ و شوێن، هەرکات دڵ گوشادو فراوان بوو، کابرا بە خۆشەویستی و چاوپۆشی یەوە چوو بۆ ناو براکانی، ئەو کاتە بە خۆشی و رەزامەندی یەوە جێگای ئەکەنەوە، ئینجا کاتیٚ لێپرسراو لەبەر هەر هۆیەك بە جوانی زانی یەکیٚ هەڵسێنیٚ لە شوێنیٚ جێگا چۆڵ بکات بۆ یەکیٚ تر بێگومان ئەو کاتە گوێڕایەڵی پێویستە بە هەموو خۆشی و ئارامی دڵەوە، لەگەڵ ئەوەدا یاسای گشتی بمێنیٚ و پارێزگاری بکریٚ، کە بریتی یە لە هەنگاو نەنان بە ملی خەڵك دا و دانیشتن لە هەر شوێنێك دەست بدات، هەڵنەساندنی هیچ کەسیٚ بۆ ئەمەی هەڵسێنەر لە شوێنی دانیشیٚ، ئەوەی کە ئیسلام داوای ئەکات چاوپۆشی و دڵ گوشادی یە، ئەدەبێکە کە پێویستە لە هەموو کاتێکدا.

ئا بەو شێوە قورئان دەروون پەروەردە ئەکات و پاك و خاوێنی ئەکات، فێری چاوپۆشی و دڵ فراوانی ئەکات بە رەوشتێکی پڕ لە سۆزو کامەرانی، چونکە ئایینی پاکی ئیسلام ئەرك و بارێك نی یە بخرێتە سەرشان و بە زۆر بدریٚ بە ملی خەڵك دا، بەڵکو گوڕانە لە هەست دا و پاك بوونەوەیە لە دەرووندا.

ئینجا موسڵمانان فێری وێڵ و ئەدەبێکی تر ئەکات لە بارەی پەیوەندی یان بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وا دەرئەکەوێ زۆر زۆر ئەچوونە خزمەتی و خەریکیان ئەکرد بە ئیشی تایبەتی خۆیانەوە – با ئیشەکەشیان بێ نرخ و پووچیش بوایە – بۆ ئەمەی تەمێ و رای وەرگرن، یان هەر پێ یان خۆش بوو لەگەڵی کۆبنەوەو چپە و سرپەی لەگەڵ بکەن، گوێ یان نەبوو لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کاری زۆر گرنگی گشتی هەیە، کات و وەختی زۆر پڕ سوود و بە نرخە نابێ بە فیڕۆ و لە خۆڕایی بەخت کرێ، ئینجا خوا ویستی تەمێ یان بکات بەم رەنگە خەرجێکی دانا لەسەر ئەوانەی کە لە خۆڕایی خەریکی ئەکەن و وەختەکەی داگیر ئەکەن کە هینی گشتی یەو ماڵی هەموو موسڵمانانە، ئەو خەرجە بە خێرو سەدەقە بدەن بە هەژارو بێ نەوایانی گەل لە بریتی ئەو کاتە داگیر کراوەی گەلەدا، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا نَـٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ﴾ کاتێك ویستتان بە نهێنی قسە بکەن لەگەڵ پێغەمبەردا ﴿فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً ۚ﴾ خێرو سەدەقەیە پێش بخەن لە قسە نهێنی یەکەتان دا، واتە لە پێشەوە خێرێك بکەن بە هەژاران، ئینجا لەگەڵی کۆ ببنەوەو قسە نهێنی یەکەی بۆ بکەن، ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەو خێرو سەدەقە پێش خستنە چاکترە بۆتان ﴿وَأَطْهَرُ ۚ﴾ پاك و خاوێن ترە بۆتان، بەڵێ چاکترە چونکە پاداشتی هەیە لای خوا، ئەبێ بە کەفارەتی ئەو وەخت داگیر کردنە، پاك و خاوێن ترە، چونکە دڵ فێری بەخشین ئەکات و رامی ئەکات لەسەر بە گرنگ نەگرتنی ماڵ و سامان و لاواز کردنی خۆشەویستی و پەیوەستی دڵ و دەروون پێ یەوە، کە هۆی چەپەڵ بوونی دڵە. دانانی ئەم خەرجە زۆر جوان و بەجێ بوو، چونکە:

١- رێزو بە گەورە گرتنی پێغەمبەری نیشان دا و نرخی کات و وەختی ئەوی دەرخست، ئەوەتا لە خۆڕایی دەست کەوت نابێ.

٢- ناپاك و ماڵ خۆشەویستی پێ جوێ بووەوە لە ئیمانداری راستەقینە و ئەوانەی کە مەبەستیان رۆژی دوایی یە و چاویان تەنها بڕیوەتە ئەوەی خوا بەڵێنی پێداوە.

٣- گرنگی مافی هەژاران و پێویستی یارمەتی و لەبیر نەکردنیانی نیشاندا.

٤- بووبەبەرگرلەکۆمەڵکردن لەسەرپێغەمبەرو بێ ئارام کردن وداگیر کردنی کاتی پیرۆزی.

فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ ۚ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ
عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ
لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا

---

**ئینجا لەم بارەكەیشەوە بەزەیی بەكار هێنا لەگەڵ هەژارو بێ نەوایان دا فەرموی: ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ قَومَا﴾ ئینجا ئەگەر دەستتان نەبوو هیچتان شك نەبرد بیكەن بە خێرو سەدەقەیەك ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خوا زۆر لێ بوردەیە و میهرەبانە، كەواتە داوای ئەو خێرەتان لێ ناكات.**

**حەزرەتی عەلی – خوای لێ رازی بێت – رەفتاری كرد بەم ئایەتە، تەنها دینارێكی هەبوو كردی بە درهەم و هەر جارێ قسەیەكی نهێنی ببوایە لە پێشەوە درهەمێكی ئەكرد بە خێرو ئینجا ئەچووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).**

**دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە زۆر كەس وازی هێنا لەو چپە و سركەی كە جاران ئەیكرد و خەڵكی تەمەنی وەرگرت و فێری وێڵ و ئوسوڵ بوون و تێگەیشتن كە ئەوەی جاران ئەیانكردو بێ جێ یی و ناڕەوا بوو، كەواتە مەبەست لە ئایەتەكە بەدی هات و پێویست نەما بە مانەوەی ئەو یاسایە، لەبەر ئەوەی سڕی یەوەو فەرموی: ﴿ءَأَشْفَقْتُمْ﴾ ئایا مەترسیتان لە هەژاری كردكەوا پێكێشیتان كرد ﴿أَن تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ﴾ لە پێش خستنی چەند خێرو سەدەقەیەك لە چپە و سرپەكەتان ﴿فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُواْ﴾ ئینجا لە كاتێك دا ئەوەتان نەكرد ﴿وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ خوا لێتان بوردو تۆبەو گەڕانەوەی لێ وەرگرتن ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ كەواتە نوێژ بە رێكی بەجێ بێنن، ﴿وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەكات بدەن ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ فەرمانبەری خواو پێغەمبەرەكەی بكەن، واتە ئەوەی نەتان كرد بەسەری بگرنەوە بە هەمیشەیی و بەردەوامیتان لەسەر بەجێ هێنانی نوێژی رێك و راست و زەكات دان و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی، ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ خوا ئاگادارە بەوەی كە ئەیكەن. كەواتە با وریای خۆتان بن و خۆتان بپارێزن لەوەی هۆی خەشم و ناڕەزایی خوایە. لەم دوو ئایەتە و ئەو ریوایەتانەی كە هۆی هاتنە خوارەوەیان باس كردن روون ئەبێتەوە ئەو هەموو هەوڵ و تێكۆشان و پەروەردە**

کردنەی کە بەکار هێنراوە بۆ پێگەیاندن و ئامادەکردنی ئەو کۆمەڵە موسڵمانەیە لە بچووک تا گەورەی هەست و رەوشتیاندا.

ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ناپاکەکان کە جوولەکەکانیان کردبوو بە خۆشەویست و کاربەدەستی خۆیان، هەندێ هەڵوێست و بەسەرهاتیان باس ئەکات، هەڕەشەیان لێ ئەکات بە ئابڕوو بردن و جاڕ لێدانی کارە نهێنی یەکانیان، بە خراپی دوا ڕۆژو چارەنووسیان، بە زاڵ بوون و سەرکەوتنی ئایینی ئیسلام و شوێن کەوتووەکانی لەگەڵ ئەو هەموو پیلان و تەگبیری خراپی ئەوانەدا، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ﴾ ئایا سەرنجێکت نەداوە بەلای ئەوانەی ﴿تَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا﴾ کە دۆستایەتی یان کردووەو کۆمەڵێکیان گێڕاوە بە خۆشەویست و دەستە برا ﴿غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم﴾ کە خوا قارو خەشمی لێ گرتوون، واتە سەرت سوڕ بمێنێ لە حاڵی ئەو ناپاکانە کە جولەکەیان کردووە بە خۆشەویست و دەستە برا بۆ خۆیان و بە قسەیان ئەکەن، ﴿مَّا هُم مِّنكُمۡ﴾ ئەو ناپاکانە نە لە ئێوەن لە راستی دا، چونکە هەر بڕوایە دەرئەبڕن بە دەمی رووتە و لە دڵیانەوە نایەت، ﴿وَلَا مِنۡهُمۡ﴾ نە لەو جولەکە خەشم لێ گیراوەن، چونکە بڕوایان بەڕاستی ئایینەکەیان نی یە، بەڵکو کۆمەڵێکن ئەیانەوێ لەو بەینەدا بمێننەوەو سوود لە هەردوو لاوە وەرگرن ﴿وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ﴾ هەمووجارێ سوێند ئەخۆن لەسەر شتی درۆ ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ لەکاتێك دا کە ئەزانن درۆیشە، کە ئەوەش ئەوپەڕی ناپیاوی و خراپی یە، ئیترئەودرۆیە ئەوە بێ کە بە دەم ئەیانوت بڕوامان هێناوەو هەیە، ئەیانوت بە پێغەمبەر(ﷺ) ئێمە شایەتی ئەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوای، یان ئەو هەموو پیلان و دەست هەڵبەستانەی کە لە پەنادا ئەیانکرد و ئینجا سوێندیان لەسەر نەبوونی ئەخوارد.

ئەم هێرشە بەتینە بۆ سەر ئەو ناپاکانە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەوانە ئێجگار خەریکی پیلان و ناپاکی بوون دەربارەی موسڵمانەکان، بوون بە دار دەستی جولەکەش کە پیس ترین دوژمنی ئیسلام و موسڵمانەکان، هەروەها لەم هێرشەدا دەرئەکەوێ کە دەسەڵاتی ئیسلام بەهێزو گەورە بووە لە مەدینەدا، بە جۆرێ ناپاکەکان – کە جولەکەیشیان لە پشت بووە – ترساون لە موسڵمانەکان و ناچار بوون بە سوێندی درۆ خۆیان رزگار بکەن لە دەستیان کاتێ ناپاکی و پیلانێکیان لێ دەرکەوتایە، سوێندیان ئەکرد بە قەڵغان بۆ خۆیان وەکو لەمەولا ئەفەرموێ. ئەوانە بەهۆی کردەوەی خراپی خۆیانەوە ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدًا﴾ خوا ئامادەی کردووە بۆیان سزایەکی زۆر بەتین

إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن
تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ
اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴿١٨﴾ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ
الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُولَٰئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿١٩﴾

---

**﴿إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ چونكە بەڕاستی زۆر خراپ بوو ئەو كردەوەی كە هەمیشە ئەیان كردو خەریك بوون پێ یەوە، ﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً﴾ ئەو ناپاكانە سوێندەكانی خۆیان ئەكرد بە قەڵغان و سوپەر، بەو سوێندانە ناپاكی خۆیانیان ئەشاردەوەو خەڵكی بە موسڵمانی ئەزانین و ئەمین ئەبوون لێ یان و قسەیان وەرئەگرتن ﴿فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بەهۆی ئەوەوە بەرگری و جڵەوگیریی مەردومیان ئەكرد لە ڕێ ی خواو ئاییینی خواو دڵیان سارد ئەكردنەوە لە یارمەتی دانی پێغەمبەرو جەنگ كردن لە ڕێگای ئیسلام دا، ﴿فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ بەهۆی ئەوە بۆیان هەیە سزایەكی ئابڕوو بەر و ریسوا كەر، ئەمە هەڕەشەیە بە سزایە كە ئەم سیفەت و نیشانەیەش هەیە لە باتی فێڵ و تەڵەكەو خەڵەتاندنەكەیان و سوێندە درۆكانیان كە بێ باكانە بە درۆوە ناوی خوایان ئەبرد.**

**﴿لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ نە ماڵیان و نە منداڵیان هەرگیز سوودیان پێ ناگەیەنێ و پەنایان نادات لە خواو هیچ تۆڵە و سزایەكی خوایان لێ دوور ناخاتەوە، ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ ئەو ناپاكانە هاوڕێ و هاودەمی ئاگرن ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانە لەو ئاگرەدا هەمیشەیین و ئەمێننەوە بێ بڕانەوەو دوا هاتن، خوا پەنامان بدات.**

**ئینجا شێوەیەكی تری ریسواكەریان نیشان ئەدات كە لە ڕۆژی دواییدا سوێندی درۆ ئەخۆن بۆ خوا هەرچۆنێ لەم جیهانەدا سوێند ئەخۆن بۆ بەندەكانی خوا كە ئەوەش وا ئەگەیەنێ ناپاكی ریشەی داكوتاوە لە دەروونیاندا، تا رادەیەك لە ڕۆژی دوایی دا و لە**

حوزوری پەروەردگاریشدا لە کۆڵیان نابێتەوە، کە هیچ شتێکی لێ شاراوە و پۆشیدە نییە!!

ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ڕۆژێ بکە کە خوا ئەوانە هەموو زیندوو ئەکاتەوە ﴿فَيَحْلِفُونَ لَهُ﴾ ئینجا سوێند ئەخۆن بۆ خوا ﴿كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ﴾ هەروەك سوێند ئەخۆن بۆ ئێوە لەم جیهانەدا کە بڕوادارن. ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ وا ئەزانن کە بەو سوێندە درۆیانە شتێکیان دەست کەوت ئەبێ و ڕزگار ئەبن، هەرچۆن لەم جیهانەدا بەو سوێندە درۆیانە خۆیان ڕزگار ئەکردو مەردومیان فریو ئەدا، ئەوانە وا ئەزانن کە لەسەر شتی دامەزراون و ئەو سوێندە درۆیانە پاڵپشت ئەبێ بۆیان، نازانن کە لەسەر بۆشن و بێ پاڵپشتن ﴿أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ بێدار ئاگادار بن بەڕاستی تەنها ئەوانە درۆزنن کە ئەوپەڕی رادەیان گرتووە لە درۆزنیدا، ئەوەتا لە حوزوری پەروەردگاری ئاگادارو زانا بە هەموو شتێك سوێندی درۆ ئەخۆن و لایشان وایە ئەو سوێندە درۆیانە سوودی ئەبێ بۆیان و نرخی ئەبێ لای خوا!!

ئینجا هۆی ئەو حاڵەتە خراپەیان ڕوون ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ﴾ بە تەواوی شەیتان زاڵ بووە بەسەریان دا، بە جۆرێك هۆش و ژیریی لێ سەندوون ﴿فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ﴾ بەهۆی ئەوەوە یادو باسی خوای لە بیر بردوونەتەوە، هەر دڵێ وای بەسەرهات ئەشێوێ و ئەبێتە هێلانەی خراپە و یەك بار ئەبێتەوە بۆ شەڕ و خراپە، کەواتە ﴿أُولَٰئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ﴾ ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن، تاقمی تایبەتین بۆی و ئەچنە ژێر ئاڵای ئەوەوە، بە فەرمانی ئەو ئەجوڵێنەوەو مەبەست و ئامانجی ئەو بەجێ ئەهێنن، ﴿أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ بێدار بن و بزانن کە بەڕاستی تەنها کۆمەڵ و تاقمی شەیتان زیانبارو ڕەنجەڕۆی ڕاستەقینەن. بەڕاستی ئەم هێرشەی کە لەم چەند ئایەتەدا برایە سەر ئەم ناپاکانە ئێجگار سەخت و بەتین بوو، زۆر بەجێ و ڕێك و ڕاست بوو لەگەڵ بەد کرداریی و ئاژاوەو ئەو پیلانەی کە پێ ی هەڵئەسان بەرامبەر ئایینی خواو کۆمەڵ و تاقمی خوا. ئەم هێرشە هۆی ئارام و دڵخۆشی موسڵمانانەئەوەتا خوا خۆی لە باتی ئەوان هێرش ئەباتە سەر دوژمنە خۆ داشاردەرەکانیان.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ

---

ئەو ناپاکانە پەنایان ئەبرد بە جولەکەکان و بە قسەی ئەوان هەڵئەسوڕان، چونکە لایان وابوو کە ئەوانە هێزێکی تەقیٚ و بیم لیٚ کراون، جێگای ئومێدن بۆیان، ئینجا ئەوا خوا ئەدات لە دەماخیان و نائومێدی یان ئەکات، ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ئەکەن لە هەڵوێست و سنوورێك دان دژو بەرامبەر سنووری ئەوان ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ﴾ ئەوانە لە ریسواتر و سەرشۆڕ تری مەردومانن و لە ریزی ئەوانن، چونکە ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ﴾ خوا نووسیویەتی و بڕیاری داوە، ﴿لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ﴾ بێگومان من و پێغەمبەرەکانم زالٚ ئەبین. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ﴾ بەڕاستی خوا بەهێزو توانایە بەسەر یارمەتی دان و زالٚ کردنی ئاین و پێغەمبەرەکانی، ﴿عَزِيزٌ﴾ زاڵە بەسەر هەر کاروباریٚ کە بیەویٚ. ئەمە بەڵێنی خوایە کە راستە و هەروا هاتووەو بینراوەو ئەبیٚ هەروایش بێت هەتا دنیا دنیایە، هەرچەند بە دیمەن و رواڵەت لە هەندیٚ کات دا پێچەوانە بینراوەو ئەبینریٚ.

ئەوەی کە لەمەوبەر بەدی هاتوە ئەمەیە کە بڕواو خواپەرستی بە تاك و تەنیا هەر زالٚ و سەرکەوتوو بوون بەسەر بیٚ بڕوایی و بت پەرستی دا، عەقیدەی خواپەرستی لە زەوی دا جێگیر بووە، ئادەمی مل کەچ بوو بۆی لە پاش ئەو هەموو قۆرت و گرێی کوفرو بت پەرستی یە کە هاتە ریٚگای، لە پاش ئەو هەموو زۆرانبازی و بەربەرەکانیٚی کوفرو بیٚ بڕوایی و بت پەرستی یەدا، ئەگەر لە چەند کات و ماوەیەك دا بیٚ بڕوایی و بت پەرستی هاتبنەوە کایەو دووبارە دەرکەوتبنەوەلە هەندیٚ ناوچەکانی زەوی دا – وەکو ئێستا رووی داوە لە دەوڵەتە بیٚ بڕواو بت پەرستەکاندا – ئەگەر شتی وا هەیە و رووی داوە، بێگومان عەقیدەی بڕوا بە خواو خواپەرستی هەر زاڵە بە شێوەی گشتی لەسەر زەوی دا، بێجگە لەوە کە ماوەی بیٚ بڕوایی دەست نادەن بۆ مانەوە، چونکە دژو پێچەوانەی سروشتن. بێجگە

لەوەش ڕۆژ بە ڕۆژ ئادەمی ڕێ ئەبا بە چەند بەڵگە و ڕابەری تازە کە دەستی ئەگرێ و ڕای ئەکێشێ بۆ بڕوا بە خواو چەسپاندنی عەقیدەی بڕواو پەرستنی خوای تاك و تەنیا.

ئیماندارو موسڵمانی ڕاستەقینە بە بێ دوو دڵی و بە هەموو ئارامەوە ئەو بەڵێنی خوا وەرئەگرێ و بە ڕاست و بەدی هاتووی سەیر ئەکات. ئەگەر لە چین و چەرخێکی کەم دا یان لە وڵاتێکی دیاریی دا پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی بینی، ئەو بە شتێکی کاتی سەیر ئەکات بە بەرەونەمانی دائەنێ، ئەزانێ ئەوە شتێکە خوا ڕێگای داوەو هۆو بەرژەوەندی یەکی تایبەتی هەیە، ڕەنگە بۆ ئەوە بێت ئیمان و سروشت بهێنێتە سۆزو پەرۆش و ڕاپەڕینێ بۆ بەدی هێنانی بەڵێنی خوا لە کاتی دیاریی کراوی خۆیدا.

کاتێ ئەمڕۆ ئێمە سەرنجی ئەو هەموو جەنگە جۆر بە جۆرە بدەین کە دوژمنانی ئیمان و ئیسلام هەڵئەسن پێی و بەرپاری ئەکەن دەربارەی ئیماندار و موسڵمانان، بە جەورو ستەم و زۆر پێ هێنان و چەند جۆر پیلان لە هەموو لایەکەوە و لەو هەموو مادەو چەرخی دوورو درێژەدا، تا ڕادەی کوشتن و بڕین و دەرکردن و ڕۆزی بڕین، کەچی لە پاش ئەوە هەر ئیمان بە ڕێکی مایەوە لە دڵ و دەروونی بڕواداران دا، بەرگری یان ئەکات لە ڕووخان و نەمان، گەلەکانیان ئەپارێزێ لە توانەوەیان لەناو ئەو هەموو گەل و کۆمەڵەی کە پەلاماریان داونێ، کاتێ ئێمە سەرنجێکی ئەوە بدەین کە ڕووی داوە لەو ماوە دوورو درێژەدا دەستمان ئەکەوێ ڕاستی ئەو بەڵێنە. دەستمان ئەکەوێ لەم ڕووداوە دوورو درێژەدا بە بێ پێویستی بە چاوەڕوانی داهاتوو، ئەوەتا ئەو بڕواو عەقیدە هەرچار نەکراو مایەوەو زاڵ بوو بەسەر هەموو سزاو ئازارو کوشتن و بڕینەداو تا بێت پەرە ئەسێنێ!!

بە هەر حاڵ بڕواداری ڕاستەقینە هیچ گومان و دوو دڵی یە ڕووی تێ ناکات و بڕوای بەهێزی دامەزراوی هەیە کە بەڵێنی خوا ڕاستە و ئەبێ هەر بەدی بێت، ئەوانەی دوژمنایەتی و بەربەرەکانێ ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەردا (ﷺ) ئەبێ هەر لە ڕیسوا ترین بن، ئەبێ تەنها خواو پێغەمبەرەکەی زاڵ بن، شتەکە هەروا بووەو ئەبێ هەروایش بێت و بەدی بێت، ئیتر با بە دیمەن و ڕواڵەت دژو پێچەوانە ببینرێ! ئینجا لە دوایی سورەتەکەدا ئەو یاسا و بنەڕەتە دامەزراوە ئەهێنێ کە پێویستە ئیمانداران لەسەری ڕاوەستن، یان ئەو ترازووە وردە کە

ئیمانی راستەقینەی پێ ئەکێشرێ. کە بریتی یە لە جیا بوونەوەی کۆمەڵی خواو پچڕانی بە تەواوی لە کۆمەڵی شەیتان و ئەوپەڕی لایەنگیری بۆ کۆمەڵی خواو وەستان لە ریزی ئەوان دا، خۆ رووت کردن لە هەر شتێ کە راکێشەر بێت بۆلای کۆمەڵی شەیتان، پەیوەستن و خۆ بەستنەوەو دەست گرتن تەنها بەهۆی پەیوەستی بە خواو پێغەمبەرەوە (ﷺ). ئەفەرموێ: ﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ دەست ناکەوێ گەلێ بڕوای ببێ بە خواو رۆژی دوایی لە کاتێك دا ﴿يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ خۆشەویستی و دۆستایەتی کەسانێ بکەن کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ئەکەن و لە سنووربەزێن و دژو پێچەوانەی سنووری ئەوان. چونکە خوا دوو دڵی نەداوە بە هیچ کەس، هەرگیز هیچ دڵێ دوو خۆشەویستی دژو پێچەوانە کۆناکاتەوە لە خۆی دا: خۆشەویستی خواو خۆشەویستی دوژمنی خوا! کەواتە لە هەر دڵێك دا یان بڕوا هەیە یان بێ بڕوایی، بەڵام هەردوو بە هیچ رەنگ کۆنابنەوە. ﴿وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ﴾ با ئەو دوژمنانی خواو پێغەمبەرە باوکیان بن، ﴿أَوْ أَبْنَاءَهُمْ﴾ یان کوڕیان بن. ﴿أَوْ إِخْوَانَهُمْ﴾ یان برایان بن، ﴿أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ یان خزم و کەس و کاریان بن. کەواتە پەیوەستی خوێن و خزمایەتی ئەبێ نەمێنێ و بپچڕێ لەگەڵ ئەو دوژمنانە لە سنووری ئیمان دا، بەڵێ ئەو پەیوەندی و پەیوەستی یە تێبینی ئەکرێ کاتێ ئەو ئاژاوەو بەربەرەکانێ بەرپا نەبێ لە نێوان ئاڵای خواو ئاڵای شەیتان دا، هاوڕێ یەتی و ژیان بە چاکە لەگەڵ باوك و دایکی بێ بڕوادا پێویست کراوە بۆ ژیانی ئەم جیهانە بە مەرجێ جەنگ بەرپا نەبێ لە نێوان کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتاندا، بەڵام کاتێ جەنگ و بەربەرەکانێ رووی دا لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا ئەبێ هەموو پەیوەستی و پەیوەندی یەکی تر بپچڕێ و نەمێنێ، ئەوەتا ئەبو عوبەیدە باوکی خۆی کوشت لە غەزای بەدردا، ئەبوبەکر نیازی کوشتنی عبدالرحمن ی کوڕی کرد. مصعبی کوڕی عومەیر، عبیدی برای کوشت. عمرو حمزەو علی و عبیدە و حارث خزم و کەس و کاری خۆیان کوشت. خۆیان داڕنی لە هەموو ئەو پەیوەندی و پەیوەستی یانە و تەنها ئایین و عەقیدەیان گرت بە دەستەوە. ئەوە ئەوپەڕی راستی یە لەگەڵ خواداو لە تەرازووە راستەکەی خوادا!

أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٢٢﴾

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ﴾ ئەوانەی کە لەگەڵ دوژمنانی خوادا بەو جۆرەن خوا بڕوان لە دڵیان دا نووسیوەو جێگیری کردووە. ماتوڵ ئەو بڕوایانە بە دەستی قودرەتی خوا نووسراوە و جێگیر کراوە ئیتر نەمان و کوژانەوەو سڕینەوەی بۆ نابێ! ﴿وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ﴾ پشتیوانی کردوون و بەهێزی کردوون بە گیانێك لە لایەن خۆیانەوە، بەڵێ بێگومان ئەو خوا پێداوانە خۆیان لە هەموو شتێ بۆ رووت ناکرێ و ئەو هەست و نیازە بەهێزەیان بۆ پەیدا نابێ بەو گیانە نەبێت لەلایەن خواوە، هەرگیز دڵیان بەو جۆرە رووناك نابێتەوە مەگەر بەهۆی ئەو گیانە کە یارمەتی یان ئەدات بە هێزو رووناکی، پەیوەستیان ئەکات بە سەرچاوەی هێزو رووناکی. ﴿وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ئەیانخاتە بەهەشتانێ کە دێت و ئەچێ رووبارەکان بە ژێر کۆشك و ناویان دا، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا هەتا هەتایە بێ بڕانەوە، ئەوەش لە پاداشتی ئەوەی خۆیان لەم جیهانەدا رووت کرد لە هەموو پەیوەستی و پەیوەندی یەکی ئەم زەوی و جیهانە لەبەر خوا، لە دڵی خۆیان دەرکردهەمووخۆشەویستی یە جگە لە خۆشەویستی خواو هەرشتێ ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا. هۆی ئەو هەموو چاکە و میهرەبانی یەش ئەمەیە: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ خوا لەوان رازی بووەو ئەوانیش لە خوا رازی بوون و دڵشاد بوون بەوەی بۆی بڕیار دان لە هەردوو جیهاندا.

ئەوانە خۆیان پچڕی لە هەموو شتێ خۆیان بەستەوە بە فەرمانی خواوە، ئینجا خوایش کردەوەی ئەوانی وەرگرت و خستنیە پەنای خۆی، سایەو پەنای خۆی بۆ فراوان کردن، تێی گەیاندن و حاڵی کردن لە خۆشنوودی خۆی لێ یان، ئەوانیش بەوە دڵشادو خۆشنوود

بوون، ئەوانە لەبەر خوا خەشم و کینەیان بوو لەکەس و کاریان خوایش لە باتی ئەوە رازی بوو لێ یان و بەو هەموو بەهرەو چاکەیە رازی و دڵشادی کردن لە خۆی. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ﴾ ئەوانەن کۆمەڵی خواو تاقمی تایبەتی بە خواوە. ئەوانە تاقمەکەی خوان کە کۆبوونەتەوە لە ژێر ئاڵاکەی دا، بزووتنەوەو کردەوەیان لە ژێر سەرکردایەتی خوادایە، ئەوانەن رێنوومایی ئەوەیان وەرگرت، ئەوانەن بەرنامەی خوا بەدی ئەهێنن لەم جیهانەدا. ئەوانەن شتێ ئەکەن کە خوا پێی خۆشەو ئەیەوێ لەم جیهانەدا. ﴿أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ بێدارو ئاگادارین کە بێگومان تەنها کۆمەڵی خوا رزگارەو گەیشتووە بە ئامانج.

ئەگەر ئەوانە بەو جۆرە نەبن ئیتر کێ ی تر وابێ؟

ئا بەو جۆرە ئادەمی دابەشە بە دوو کۆمەڵ: کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتان. تەنها دوو ئاڵا هەیە: ئاڵای حەق و ئاڵای بەتاڵ ئینجا هەرکەس لە کۆمەڵی خوا بێ ئەوە لە ژێر ئاڵای حەق دایە، ئەگەر لە کۆمەڵی شەیتان بێت، ئەوا لە ژێر ئاڵای بەتاڵ دایە، ئەو دووانە دوو تاقم و رێزی جیاوازن بە بێ تێکەڵ و پێکەڵی!!

نە نەسەب و نەژاد شتە، نە خزمایەتی و ژن و ژن خوازی شتە، نە نیشتمان و بەرەو تیرە شتە، نە رەگەزایەتی و نەتەوایەتی شتە، بەڵکو تەنیا شتێ هەیە لە مەیدانی خوادا کە بریتی یە لە ئایین و عەقیدەو ئیتر بەس، کەواتە هەرکەس ئەچێتە ناو کۆمەڵی خواو لە ژێر ئاڵای خوادا ئەوەستێ ئەوا ئەوو هەمووانی تر بران لای خواو لە ئایینی خوادا، ئیتر هەرچەند رەنگ و نیشتمان و بەرەو تیرەیان جیاواز بێت، هەرچەند خێزان و کەس و کاریان دوورو جیاواز بن، چونکە هەموو کۆئەبنەوە لە شتێك دا کە کۆمەڵی خوا پێك ئەهێنێ، کەواتە هەموو هۆی جیاوازی ئەم جیهانە ئەتوێتەوە لە ژێر ئەو ئاڵادا، هەرکەس شەیتان زاڵ بووبێ بەسەری دا و داگیری کردبێ و رایکێشابێ بۆ ژێر ئاڵای خۆی، ئەو کەسە بە هیچ کلۆج نالکێ بە کۆمەڵی خواوەو هیچ هۆیەکی تر پەیوەستی ناکات پێ یەوە، نە خاك و وڵات، نە بەرەو

تیره، نه نیشتمان و نه رەنگ، نه نەسەب و خزمایەتی، چونکە لای خوا یەکەم هۆی پەیوەستی و پەیوەندی عەقیدەو ئیمانە و هۆی پەیوەستی و پەیوەندی یەکانی تر لەسەر ئەم راگیرە، دەی کاتیٚ ئەم بنەڕەتە نەماو پچڕا هەموو ئەوانی تر نرخی نامێنیٚ و ئەپچڕیٚ.

ئەم ئایەتە هەرچەند وا ئەگەیەنیٚ کە لەناو گەل و کۆمەڵی موسڵماندا هینی وا بووە کە دڵی بەسرابیٚ بەو هۆی پەیوەستی یە ئەرزی یانەوە کە باس کران و بەم ئایەتە ئەیەویٚ چارەسەریان بکات و تەرازووی ئیمانی داناو بڕیاری ئەو پچڕان و جویٚ بوونەوە بەتینەی دا، بەلاّم لە هەمان کات دا نەخشەی شێوەی تاقمێکی کێشا کە بە راستی بوون لەناو گەلی موسڵماندا، لەوانەی کە خۆیان داڕنی لە هەموو شتێکی ئەم زەوی یە و پاك و خاوێن بوون و گەیشتن بەو پلەو پایە بەرزە. خوا لیٚ یان رازی بێت.

ئەم وێنەو شێوە بەرزو رووناکە رێك و پێك ترین شتە باس بکریٚ و سورەتەکەی پیٚ دوایی بهێنریٚ، ئەو سورەتەی کە لە یەکەم جارەوە دەستی پیٚ کرد بە چاودێریی و میهرەبانی خوا بۆ ئەم ئوممەتە کە باس کراو دەرکەوت لە رووداوی ئەو ئافرەتە هەژارەدا. لیٚ بڕان بۆ خواو خۆ رووت کردن لە هەموو شتیٚ لەبەر خوا زۆر رێك و بەجیٚ یە بەرامبەر ئەو چاودێریی و لوتفەی کە خوا هەیەتی دەربارەی ئەم ئوممەتە. پچڕان و جیا بوونەوەی تەواو لە نێوان کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتان دا شتێکە پێویستی سەرشانی ئەم ئوممەتەیە کە خوا هەڵیبژارد بۆ ئەمەی هەڵسیٚ بەو سپاردە و ئەرکەی کە خرایە سەرشانی و ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان نەیانتوانی هەڵسن پێی.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ
ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُواْ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ

## سورەتی «الحشر»
## مەدینەیی یە و ٢٤ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە بە بۆنەی رووداوی (بنی نضیر) ەوە – کە گەڕەکێ بوو لە گەڕەکەکانی دەورووبەری مەدینە – هاتە خوارەوە لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا باسی ئەوە ئەکات کە چۆن رووی دا؟ لەبەرچی روویدا؟ باسی چۆنێتی ناو کۆمەڵ و گەلی موسڵمان ئەکات لە پاش ئەو رووداوە. لە پێش ئەمەی دەست بکەیت بە سورەت و باسەکە لە ئایەتەکان وەرگرین، هەندێ لەو رووداوە ئەگێڕنەوە بە پێی ئەوەی بۆمان باس کراوە لە کتێبی سیرەت و حەدیسدا.

ئەو رووداوە لە سەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچی دا بوو لە پاش جەنگی ئوحود و پێش رووداوی جەنگی خەندەق. هەندێ لەوەی کەباس ئەکرێ لەوبارەیەوە ئەمەیە: پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ دە کەس لە یارانی کە ئەبوبەکر و عومەرو علی یان تێدا بوو رۆیشت بۆ ناو ئەو خێڵ و گەڕەکە، داوای بەشداری لێ کردن لە خوێنی ئەو دوو کوژراوەدا بە پێی بەڵێن و پەیمانێ کە درا لە نێوان ئەمان و ئەوان دا لە سەرەتای هاتن بۆ مەدینە، ئینجا کە چوون جولەکەی – بنی نضیر – هاتن بە پیریەوە. بە خۆشی و بەخێر هاتنی گەرم و بەڵێنیان دا بە جێ بەجێ کردنی ئەوەی لەسەریانە، لە هەمان کات دا لە ژێرەوە تەگبیریان کرد بۆ لەناو بردنی خۆی و ئەوانەی لە خزمەتی دا بوون، پێغەمبەر (ﷺ) دائەنیشێ لە پاڵ دیواری خانوویەك لە خانووەکانیان دا، ئینجا لەناو خۆیان دا ئەڵێن هەلی وامان دەست ناکەوێ یەکێ بچێ لە سەریانەوە بەردێکی گەورە بخات بە ملیدا، بەڵکو رزگار بین لە دەستی، عەمری کوڕی جحاش ئەڵێ ئەوە لەسەر من. ئینجا خوا ئەنێتە دڵی پێغەمبەر (ﷺ) و حاڵی ئەکات لەو نیازو پیلانە پیسەیان، بەهۆی ئەوەوە لە شوێنەکەی خۆی هەڵئەسێ وەکو ئیشێکی هەبێ، بەڵام کاتێ دیار نابێ و ناگەڕێتەوە یارەکانی بێ ئارام ئەبن و ئەگەڕێن بە دوای دا و ئەزانن کە

گەڕاوەتەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان ئەدات بە ئامادە بوون بۆ جەنگ لەگەڵ ئەو تاقمە لەبەر ئەو نیازو ناپاکی یە گەورەیە کە کردیان. لە پێش ئەوە کەعبی کوڕی ئەشرەف کە لەوان بوو نەئەوەستا لە جوێن و قسەی ناشیرین دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاندانی دوژمنان لێی، لەگەڵ تاقمێ پەیوەندی یان کرد لەگەڵ قورەیش و سوێند خوار بوون لەگەڵیان بۆ پیلان و هەڵسانیان بەو دژو دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەو پەیمانی ئاسایش و ئاشتی یەی کە هەبوو لە نێوان دا، تا کار گەیشتە ئەو رادەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئیزنی محمدی کوڕی مەسلەمەی دا بە کوشتنی کەعب و ئەویش کوشتی.

ئینجا کە ئەم پیلانە گەورەیەش هات بەسەردا هیچ چار نەما ئەو پەیمانەی تووڕ دایەوە بەسەریان دا بە پێی یاسای قورئان، ئینجا فەرمانی دا چوار دەوری ئەو گەڕەکە دراو مۆڵەتی دان سێ رۆژ یان دە رۆژ بۆ ئەمەی بار بکەن و مەدینە بەجێ بێڵن و چی یان هەیە لەگەڵ خۆیان ببەن، لە باتی خۆیان چەند کەسێ دانێن بەسەر باغ و کشتوکاڵەکەیانەوە، بەڵام ناپاکەکانی مەدینە بە سەرۆکایەتی عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ناردیان بۆ لایان و هانیان دان لەسەر مل پێچی و بەرەنگاری، وتیان: بەرگە بگرن و خۆتان مەدەن بە دەستەوە بێگومان ئێمە هەرگیز دەستتان لێ هەڵناگرین، ئەگەر جەنگتان لەگەڵ کرا لەگەڵتانین، ئەگەر دەرکران لەگەڵتان دەرئەچین.

بەهۆی ئەوەوە خۆیان قایم کرد لە قەڵاکانیان دا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بە بڕین و سوتاندنی دار خورماکانیان، ئینجا کاتێ بیست و شەش رۆژ لەسەر ئەو حاڵەتە مانەوەو نائومێد بوون لە راستی ناپاکەکان، خوایش ترس و بیمی خستە دڵیان، بەهۆی ئەوەوە داوایان کرد کە بەرەڵایان کات و نەیان کوژێ تا دەرچن بە وێنەی - بنی قینقاع - وەکو لە سورەتی ﴿الأحزاب﴾ دا باس کرا. بە مەرجێ باری حوشترێ بارکەن بۆ خۆیان و ببەن، بەڵام چەك نەبەن، پێغەمبەریش (ﷺ) داواکەی وەرگرتن و ئەوانیش بەو جۆرە لە مەدینە دەرچوون. هەندێکیان بۆ خەیبەر و هەندێکیان بۆ شام.

ئینجا با گوێ شل کەین بۆ قورئانی بەفەڕ ئەم رووداوەمان بۆ باس بفەرموێ بەو شێوە تاقانە کەس نەدیوەی خۆی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەوی دا باس و یادی خوای کردو بە پاك و خاوێنی راگرتووە لە هەموو لەکەو خراپە و رەخنەیەك.

له سەرەتای سورەتی ﴿الحديد﴾ دا بە درێژیی دواین و مەبەست لە وێنەی ئەم ئایەتەمان روون کردەوەو پێویست نی یە دووبارە کردنەوەی. قاپی سورەتەکەی کردەوە بەم شتە زۆر گرنگە راستە. ئەو سورەتەی کە باسی دەرکردنی کافران ئەکات لە شوێن و ولآتی خۆیان و بەخشینی ئەو جێ و شوێنە بە بەندە بڕوادارەکان کە هەمیشە باس و یادی خوای خۆیان ئەکردو سوپاس و سەنایان ئەکرد بە ناوو سیفەتە شیرینەکانی، کەواتە ئیشەکەی زۆر راست و بەجێ بوو ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ تەنها ئەو توانا و زاڵەو دانا و زانا و کاردروستە. توانایە بەسەر یارمەتی دان و سەرخستنی دۆستانی و پێشێل کردنی و لەناوبردنی دوژمنانی، تەگبیر و بڕیارەکەی راست و بەجێ یە.

ئینجا هەواڵی ئەو رووداوە ئەدا کە ئەم سورەتەی تیا هاتە خوارەوە، ئەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ خوا ئەو خوایەیە کە بێ بڕواکانی لە ئەهلی کتێب دەرکرد﴿مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ لە جێ و شوێنی خۆیان ﴿لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ﴾[1] لە یەکەم جاری کۆکردنەوەو دەرکردنیان لە خاکی نیوە دورگەدا، واتە ئەمە یەکەم جارە ئەوانە دووچاری ریسوایی و سەرشۆڕ بوون لەو ولآتەدا، چونکە لەوەوبەر بەهێزو بە دەسەلآت بوون و ملیان شۆڕ نەکردووە بۆ کەس، بێگومان هەموو شتێ بەدەست خوایە و خوا ئەیکات، ئیتر چ ئەوەی دەخلی هیچ کەسی تری تێدا نی یە، چ ئەوەی خوا لەسەر دەستی بەندەکانی دا بەدی ئەهێنێ، ئەو دەرکردنی ئەوانە هەرچەندبە رواڵەت لەسەردەستی پێغەمبەرویارانیدا بوو(ﷺ) و علی آله و صحبه. بەلآم شێوەی فەرموودەکە وا نیشان ئەدات کە کارەکە زۆر گەورەو گرنگە و لە توانای هیچ کەس دا نەبووە، بەڵکو شتێ بوو خوا خۆی کردی، وەکو هەمیتر ئەوە نیشان ئەدات و ئەیخاتە بەرچاو کە ئەفەرموێ: ﴿مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ﴾ ئێوە گومانتان نەئەبرد کە ئەوانە دەرئەچن و بە تەمای ئەوە نەبوون لەبەر هێزو دەسەلآتی زۆریان، ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئەوانیش لایان وابووو گومانیان ئەبرد کە قەلآو قوللەکانیان بەرگری کەرو پارێزەریانە لە سزای خوا، بەوە هەڵخەڵەتان و خوایان لە بیر نەبوو

---

[1] بە چوار جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەلآم ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە، بەلامەوە بەهێزترە و رای زۆربەیشی لەسەرە، لەبەر ئەوە هەڵم بژارد.

فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ
فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى
ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾

---

**﴿فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟﴾ ئینجا فەرمان و بڕیاری خوایان بۆ هات لەلایەکەوە کە نەیانزانی و گومانیان بۆ نەئەبرد، بۆیان هات لەناو دەروونیانەوە نەك لە قەلآکانیانەوە، ﴿وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ﴾ ترسی بەتینی فڕێ دایەدڵیانەوە تا بێ ئارام بوون، ﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ﴾ خانووەکانی خۆیان وێران ئەکرد بە دەستی خۆیان ﴿وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بە دەستی ئیماندارەکان. وێران کردنیان بەدەستی خۆیان لەبەر ئەوە بوو کاتێ نائومێد بوون لە خۆیان با موسڵمانان لە پاش ئەوان سوودی لێ وەرنەگرن، یان لەبەر ئەوە بوو تێکیان ئەداو بە دارو بەردو خۆڵەکەی کون و کەلەبەرو سەرکۆڵان و کوچەکانیان پێ ئەگرت لەو کاتەدا کە چوار دەور درا بوون، یان لەسەر تەمێی ناپاکەکان تێکیان دان و کردنیان بە قەلآو قەلآکانی تریان پێ قایم کردن، یان بەرە بەرە موسڵمانەکان ئەچوونە پێشەوە و ئەوەی ئەیانگرت تێکیان ئەداو ئەوانیش ئەچوونە دواو کونیان ئەکردە خانووەکانیان و لە دواوە دەرئەچوون، یان لەپاش بڕیاری دەرچوون و هەرکام باری حوشترێ ببەن لەگەڵ خۆیان ئەوانیش خانووەکانیان تێك ئەداو هەر دارو پەنجەرەو قاپی یە بەکار بهاتایە ئەیانبرد، بەهەر حاڵ خۆیان بوون بەهۆی تێك دانی ئەوەی موسڵمانەکان تێکیان ئەدا، کەواتە وەکو خۆیان بەدەستی موسڵمانەکانیش تێکیان دابن وا بووە.**

**لێرەدا بەسەرهات و داستانەکە دوایی هات، ئینجا ئەم فەرمودەیە ئەهێنێ لەسەر ئەو باس وبەسەرهاتە: ﴿فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ ئینجاتەمێ خواربن و پەند وەرگرن ئەی هۆشیاران، تەمێ خوار بن بەوەی بەسەر ئەو جولەکە بەهێزە بە دەسەلآتانەدا هات، خۆتان بپارێزن لە**

وێنەی تاوان و ناپاکی ئەوان، کە سەری لەو بەد بەختی یەوە دەرکردن، پشت تەنها بە خوا ببەستن یا وەکو ئەوانتان بەسەر نەیەت. بەڕاستی فەرمودەکە لە کات و شوێنی خۆیدا هاتووە، ئەو دڵانەی کە زیندوو بن دەرگایان کراوەتەوەو ئامادەیە بۆ دەرس و پەند وەرگرتن.

ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە ئەو جولەکانە بە هیچ کلۆج رزگار بوونیان نەئەبوو، قوتار نەئەبوون لە سزادان ئەگەر دووچاری ئەم دەرکردن و دەربەدەری یەش نەبوونایە، ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ﴾ئەگەرخوا ئەودەرچوون ودەربەدەری یەشی لەسەرنەنوسینایە و بڕیاری نەدایە ﴿لَعَذَّبَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا﴾ بێگومان سزای ئەدان لەم جیهانەدا بە سزایەکی تر، بۆ وێنە وەکو سزای کوشتن و بەدیل گرتنی کە بەسەر قورەیش هات لە ڕۆژی بەدردا، هەرجۆرە سزایەك بدرێن لەم جیهانەداجیاوازەوناکەوێتە بەر سزای ڕۆژی دوایی یان، بەڵکو ئەوەش ئەبێ هەر ببێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لە ڕۆژی دوایی دا سزای ئاگر، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ ئەو دەربەدەری و سزایەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە دژایەتی یان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی و پێچەوانەی فەرمانەکانیان کردن، بارو لایەکیان گرت بەرامبەر بارو لای ئەوان، خوای گەورە تەرەف خۆی و پێغەمبەری کرد بە یەك تەرەف، پێچەوانەیی هەردووی وەك یەك کرد بەهۆی ئەو سزا سەختەیان، جا لەبەر ئەو یەکێتی یە لە دوای ئایەتەکەدا هەر باسی تەرەفی خۆی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ﴾ هەرکەس دژو پێچەوانەی خوا بێ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ بێگومان خوا تۆڵە و سزای بەتین و سەختە بۆی، بەڕاستی زۆر بەجێ یە تۆڵە و سزای ئاوا دەربارەی ئەو بەندەیانەی ئەوەندە بێ شەرم و سپڵە بن لە ڕووی پەروەردگاریان بوەستن و بەر بەرەکانیی لەگەڵ بکەن، کەواتە با بخۆن ئەوە دەردیان بێت، دەی ئازا بن بتوانن بەرگری ئەو تۆڵەوسزایە بکەن یان بەرگەی بگرن. ئا بەو جۆرە ئەبێ پاشەڕۆژو چارەنووسی ئەوانەی دژایەتی و پێچەوانەیی فەرمانی خواو پێغەمبەر ئەکەن (ﷺ) لە هەموو چەرخ و چین و وڵاتێکدا.

مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ
ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ

ئینجا بڕواداران دڵنیا و دڵئارام ئەکات لەسەر ئەوەی کە کردیان دەربارەی ئەو جولەکە تاوانبارە بێ پەیمانانە لە بڕینی دارخورما و سوتاندنی و هێشتنەوەی هەندێکیان، بڕیاری خوا لەوەدا ئاشکرا ئەکات، چونکە لەو بارەیەوە هەندێ لە موسڵمانەکان دڵیان کەوتبووە خەتەرە وەکو بە گوناهی سەیر بکەن، لەبەر ئەوە شتی وایان بە خۆیانەوە نەدیبوو، جڵەوگیر کرابوون لەو جۆرە کردەوانە ئەفەرموێ: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ﴾ ئەوەی کە بڕیتان لە دارخورمای چاك و ناسك ﴿أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا﴾ یان هێشتبتانەوە بە وێستاوی لەسەر بنەکانیان ﴿فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بە فەرمان و رای خوا بوو ﴿وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ بۆ ئەوە بوو کە بەد کردارەکان ریسواو زەبوون بکات، بڕین داخە و هێشتنەوەی هەر داخە چونکە لەدەستیان دەرچوو. بەهۆی ئەوەوە دڵی بڕواداران ئارامی گرت و دامەزرا، مەترسی و خەتەرەی تیا نەماو بۆیان دەرکەوت کە خوا ئەوەی ویستووەو خوا کردوویەتی.

جولەکەکانی (بنی نضیر) لە مەدینە دەرچوون ئەوەی بۆیان هەڵگیرا بە باریێ حوشتر لەگەڵ خۆیان بردیان، ئەوەی نەیانویست بیبەن یان بۆیان نەبراو وەکو زەوی و باخەکانیان بەجێ یان هێشت، ئینجا موسڵمانەکان ویستیان بە وێنەی دەست کەوتی غەزای بەدر دابەش بکرێ بەسەریان دا و نەیانزانی ئەم جۆرە دەست کەوتە کە پێی ئەوترێ ﴿فيء﴾ واتە بە بێ جەنگ و ئەرك خوا داوێتی، جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لە بەدردا دەست کەوت و پێی ئەوترێ ﴿غنیمة﴾ واتە هۆی دەست کەوتنەکەی جەنگ و کوشتارو فیداکاری یە، جا ئەوا ئەو جیاوازی یەی روون کردەوەو لەگەڵ چۆنێتی دابەش کردنی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ﴾ ئەوەی کە خوا رشتی بەسەر پێغەمبەرەکەی دا لە ماڵی (بنی نضیر) و لەوانی سەمندو دای بەم ﴿فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾ ئەوە ئێوە - ئەی لەشکری موسڵمانان - هیچ ئەسپ و حوشترێکتان لەسەری تاو نەداوە، بە جەنگ و کوشتار نەتانگرتووە، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ بەڵام خوا باوی وا بووە پێغەمبەرەکانی زاڵ ئەکات بەسەر ئەو کەسەی کە خوا خۆی ویستبێتی بە زاڵ کردنێکی تایبەتی بە بێ ئەوەی ئەرکی بخاتە سەرشانی بەندەکانی، لەم بەسەرهاتی (بنی نضیر)ەدا خوا وای کرد،

مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ
ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ

**ئینجا بڕواداران دڵنیا و دڵئارام ئەکات لەسەر ئەوەی کە کردیان دەربارەی ئەو جولەکە تاوانبارە بێ پەیمانانە لە بڕینی دارخورما و سوتاندنی و هێشتنەوەی هەندێکیان، بڕیاری خوا لەوەدا ئاشکرا ئەکات، چونکە لەو بارەیەوە هەندێ لە موسڵمانەکان دڵیان کەوتبووە خەتەرە وەکو بە گوناهی سەیر بکەن، لەبەر ئەوە شتی وایان بە خۆیانەوە نەدیبوو، جڵەوگیر کرابوون لەو جۆرە کردەوانە ئەفەرموێ: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ﴾ ئەوەی کە بڕیتان لە دارخورمای چاك و ناسك ﴿أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا﴾ یان هێشتبتانەوە بە وێستاوی لەسەر بنەکانیان ﴿فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوە بە فەرمان و رای خوا بوو ﴿وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ بۆ ئەوە بوو کە بەد کردارەکان ریسوا و زەبوون بکات، بڕین داخە و هێشتنەوەی هەر داخە چونکە لەدەستیان دەرچوو. بەهۆی ئەوەوە دڵی بڕواداران ئارامی گرت و دامەزرا، مەترسی و خەتەرەی تیا نەما و بۆیان دەرکەوت کە خوا ئەوەی ویستووە و خوا کردوویەتی.**

**جولەکەکانی (بنی نضیر) لە مەدینە دەرچوون ئەوەی بۆیان هەڵگیرا بە بارێ حوشتر لەگەڵ خۆیان بردیان، ئەوەی نەیانویست بیبەن یان بۆیان نەبراو وەکو زەوی و باخەکانیان بەجێ یان هێشت، ئینجا موسڵمانەکان ویستیان بە وێنەی دەست کەوتی غەزای بەدر دابەش بکرێ بەسەریان دا و نەیانزانی ئەم جۆرە دەست کەوتە کە پێی ئەوترێ ﴿فیء﴾ واتە بە بێ جەنگ و ئەرك خوا داوێتی، جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لە بەدردا دەست کەوت و پێی ئەوترێ ﴿غنیمة﴾ واتە هۆی دەست کەوتنەکەی جەنگ و کوشتارو فیداکاری یە، جا ئەوا ئەو جیاوازی یەی روون کردەوەو لەگەڵ چۆنێتی دابەش کردنی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ﴾ ئەوەی کە خوا رشتی بەسەر پێغەمبەرەکەی دا لە ماڵی (بنی نضیر) و لەوانی سەندو دای بەم ﴿فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾ ئەوە ئێوە - ئەی لەشکری موسڵمانان - هیچ ئەسپ و حوشترێکتان لەسەری تاو نەداوە، بە جەنگ و کوشتار نەتانگرتووە، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ بەڵام خوا باوی وا بووە پێغەمبەرەکانی زاڵ ئەکات بەسەر ئەو کەسەی کە خوا خۆی ویستبێتی بە زاڵ کردنێکی تایبەتی بە بێ ئەوەی ئەرکی بخاتە سەرشانی بەندەکانی، لەم بەسەرهاتی (بنی نضیر)ەدا خوا وای کرد،**

وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ
وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ

﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خوا بەسەر هەموو شتێکا توانایە، کەواتە ئەم دەست کەوتی (بني نضير)ە بە وێنەی دەست کەوتی بەدر دابەش ناکرێ، بەم رەنگە چوار لەسەر پێنجی بدرێ بە لەشکرو یەك بەشی بخرێتە دەستی پێغەمبەر (ﷺ) دابەشی بکات بەسەر ئەوانەی دیاریی کراون. بەڵکو ئەمەو وێنەی ئەمە هەموو دەخرێتە دەستی و بەم جۆرە دابەشی بکات کە ئەفەرموێ: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ﴾ ئەوەی کە خوا ئەیداو ئەیرێژێ بەسەر پێغەمبەرەکەی دا لەماڵ و سامانی دانیشتوانی دێهاتەکان کە بە بێ جەنگ و کوشتار ئەگیرێن و ژێر دەست ئەکرێن ﴿فَلِلَّهِ﴾ ئەوە بۆ خوایە، ﴿وَلِلرَّسُولِ﴾ بۆ پێغەمبەرە، ﴿وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ بۆ خزمەکانی کە زەکات و سەدەغە قەدەغەیە لێ یان، ﴿وَٱلْيَتَـٰمَىٰ﴾ بۆ هەتیوانە ﴿وَٱلْمَسَـٰكِينِ﴾ بۆ هەژارانە، ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ بۆ رێبوارە کە ماڵی نەبێ یان دەستی نەگاتە ماڵەکەی، لەناو زانایان دا خیلاف هەیە ئایا ئەم جۆرە دەست کەوتە ئەکرێ بە شەش بەشەوە بە پێی ئایەتەکە، بەشەکەی خوا بۆ کەعبەو مزگەوتەکانی ترە، یان ئەکرێ بە پێنج بەش ئەو کاتە ئەبێ بڵێین باسی خوا بۆ رێزو بە گەورەو گرتنە، هەروەها چەند خیلافێ تر هەیە لە دابەش کردنی بەشەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پاش خۆی، لە مەرجی ئەو دابەش بەسەردا کراوانەدا، بۆ ئەوانە هەموو با تەماشای کتێبی زانایان بکرێ و لێرەدا ئەو درێژە دانە پێویست نییە.

لە پاش بریاری چۆنێتی دابەش کردنی، ئینجا هۆکەی روون ئەکاتەوەو بەو بۆنەیەوە دەست نیشان ئەکات بۆ یاسایەکی گەورە لە یاساکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی گەلی ئیسلامی. ئەفەرموێ: ﴿كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ﴾ بەو جۆرە دابەش ئەکرێ بۆ ئەمەی ئەو دەست کەوتە دەستەو دەست نەبێ لەناو دەوڵەمەندەکان و تایبەتی نەبێ بەوانەوە و هەر ئەوان بیگێرن لەناو خۆیان دا و قازانجی وەرگرن.

ئەم یاسایە بەشێکی گەورە دەرئەخات لە بنەرەتەکانی ئابووری لە ئیسلام دا. ئەوەتا موڵکایەتی تایبەتی رەوا ئەدات و دانی پیا ئەنێ. بەڵام لە هەمان کات دا بەرەڵای ناکات بە ئارەزووی خاوەنی، بەڵکو سنووری بۆ دائەنێ بەوە کە نابێ ماڵ و سامان دەستا و دەست بێت هەر لەناو دەوڵەمەندەکان دا بەرگری بکرێ لە هەژاران و بێ نەوایان، کەواتە هەر بارو

یاسایە سەری لەوەوە دەرچێ سامان کۆ بکاتەوە لای تاقمێ و ئیتر ئەوی تری گەل بێ بەش بێت و لە دوورەوە بڕوانێ. ئەو بارو یاسایە دژو پێچەوانەی ڕژێمی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئیسلامە، هەموو مامەڵە و ئاڵ و گۆڕ پەیوەستی لەناو گەلی ئیسلامی دا ئەبێ بە جۆرێ بهۆنرێتەوە و رێك بخرێ کە ئەو بارە نارەوای لێ پەیدا نەبێ، ئەگەر ئەو بارە هەبوو نەیهێڵێ.

ئیسلام بە کردەوە ڕژێمی خۆی لەسەر ئەو بنەڕەتە دامەزران بەم رەنگە زەکاتی بڕیاردا، لە ئاڵتوون و زیوو جێگریان لە سەد دوو نیوی دانا ساڵانە ٥٪ یان ١٠٪ ی لە زۆربەی دەرامەت و وارداتی ترا، بەڕاستی ئەوە بەشێکی زۆر گەورەیە، غەنیمەت و (فیء) ی دانا کە زۆربەی بۆ هەژارو بێ نەواکانە، لەبارەی کشتوکاڵەوە مزارەعەو مخابەرەی دانا کە بریتین لە هاوبەشی فەلاح و خاوەن زەوی لە بەرهەم و دەرامەت دا، رێگای کاربەدەست و پێشەوای دەوڵەتی دا کە زیادەی ماڵی دەوڵەمەندەکان وەرگرێ و بیدا بە هەژارو بێ دەستەکان، لە ماڵی دەوڵەمەندان موچە ببڕێتەوە بۆ موچە خۆران کاتێ ماڵی دەوڵەت دەری نەئەهێنا، دەست بەسەردا گرتن و سوودی قەدەغە کرد بە هەموو جۆر، کە ئەم دووانە دوو هۆی سەرەکین بۆ سەرمایەداری و دەستاو دەستی ماڵ و سامان لەناو دەوڵەمەندان بە تەنیا و بێ بەش بوونی بێ دەست و بێ نەواکان. بە کورتی ئیسلام ڕژێمی ئابووری خۆی بە جۆرێ داهێنا و راگیری کرد کە ئەو یاسا گەورەو گرنگە پێك بێنێ و بەدی بێنێ کە ئەم یاسایە مەرجێکی گەورەیە ئیسلام دایهێنا لەگەڵ چەند مەرجی تردا بۆ رەوادانی موڵکایەتی تایبەتی ﴿الملكية الفردية﴾[1] یان تاکە خاوەنداریتی، جا لەبەر ئەوە ئیسلام موڵکایەتی تایبەتی رەوا دا، بەڵام لە هەمان کات دا ڕژێمێکی سەرمایەداری نی یە، هەرچۆنێ ڕژێمی سەرمایەداری وەنەگیراوە لێ ی، چونکە سەرمایەداری بە هیچ کلۆج بەدی نایەت بەبێ دەست بەسەردا گرتن و سوود، بەڵکو ڕژێمی ئیسلام شتێکی تایبەتی یە و لەلایەن خوای لێزانی کاردروستی ئاگادارەوە هاتووە، خۆی بە تەنیایی گەیشتووە، بە تەنیا ئەڕوات بەڕێوە، بە تەنیا ماوەتەوە هەتا ئەمڕۆ، ڕژێمێکی تاقانەیە هەموو بارو رووەکانی هاوتاو هاوکێشن، ماف و پێویستی یەکانی رێك و گونجاون، رێك و پێك و تێك نەچوون، بە وێنەی رێك و پێکی و تێك نەچوونی هەموو بوونەوەر کە لەو کاتەوەی خوا دروستی کردووە بەو رێك و پێك و گونجاوی یە هەموو کاروباری گشتی و هەموو بەش و پارچەکانی بەڕێوە ئەبات!!

---

[1] با تەماشای فصلی (سیاسە المال) بکرێ لە کتێبی (العدالە الأجتماعیە) دا، دانراوی شەهید سەید قطب و لە کتێبی (سیاسە الحكم و المال) دانراوی شەهید عبدالقادر عودە.

وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴿٨﴾

---

لەپاش دەست نیشان کردن بۆ ئەو یاسا گەورەی ئابوری و کۆمەڵایەتی یە ئینجا یاسایەکی گەورەی دەستوری نیشان ئەدات لەناو گەلی ئیسلامی دا ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾ هەرچی پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی داون و پێتان ئەدات وەری گرن و ﴿وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ هەرچی بەرگری و جڵەوگیریی کردن لێ ی کۆتایی و وازی لێ بێنن.

ئەم یاسایە پێمان رائەگەیەنێ کە سەرچاوەی شەریعەت ئەبێ تەنها ئەوە بێ کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی لە خواوە، ئینجا بە ئایەتی قورئان هێنابێتی، یان بە فەرمودەی خۆی، ئیتر نە گەل و نە سەرۆکی گەل ناتوانێ لێی لابدات، هەر بریارێکی پێچەوانە بدەن گوێ ی بۆ ناگیرێ. ئەمە بۆ کاتێکە کە فەرمودەی خوا یان پێغەمبەر (ﷺ) بە رێکی دەست کەوێ، ئەگەر فەرمودەی ئەوان دەست نەکەوت، یان بە روونی بریاری لێ وەرنەئەگیرا، ئەو کاتە رێگای ئەوەیە زانایانی ئوممەت زانینی خۆیان بخەنە کار لەبەر رووناکی ئایەت و حەدیس دەستوورو یاسا دابنێن بە مەرجێ دژو پێچەوانەی هیچ ئایەت و حەدیس دەرنەچێ ئەگینا ئەوەیش گوێ ی بۆ ناگیرێ و گوێرایەڵی بۆ ناکرێ. دەسەڵاتی ئوممەت و سەرۆکی ئوممەت لەو سنوورەدایە و تێپەڕ ناکات لەوە، ئەم رژێمە تاقانەیە و هیچ رژێمێ تر لە ئەو هەموو رژێمە دەست کردانەی لەوەوبەرو ئێستاو لەمەودوا وێنەی ئەم نی یەو هاوتای ناکات. ئینجا هەردوو یاساکە لە دڵی ئیمانداران ئەبەستێتەوە و پەیوەستی ئەکات بە یەکەم سەرچاوەوە کە خوایە ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە هۆی خەشم و سزای ﴿إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ بەراستی خوا تۆڵە و سزای سەختە.

بەراستی ئەم بیم و ترسە لە خواو لە تۆڵەی سەختی خواو هەست کردن بە ئاگاداری خوای گەورە گەورەترین چارەسەرە بۆ بەرگری هەموو خراپە و نالەباری یەك، بۆ لانەدان لە ناوەڕاستی رێگای راست، ئیمانداری راستەقینە کاتێ زانی کە خوا ئاگادارە بە هەموو شتێ، گەڕانەوە بۆلای ئەو ئەبێ، زانیان کە تۆڵە و سزای خوا زۆر سەختە، هەرکاتێ ئاوا بە هۆش و

وریا بوون هەر فەرمانێکی خواو پێغەمبەر (ﷺ) روویان تێ بکات بە خۆشی و رەزامەندی دڵەوە ئەچن بە پێشوازی یەوەو فەرمانبەری ئەکەن، ئەوەی پێ یان بدرێ بە خۆشی یەوە وەری ئەگرن و بەرگری لە هەرچی کران بە خۆشی یەوە وازی لێ ئەهێنن. ئەوەی دەست کەوت بوو لە (بنی نضیر) دابەش کرا تەنیا بەسەر یارانی کۆچ کردودا بێجگە لە دوو کەس لە یارانی یارمەتی دەران (انصار). ئەو دابەش کردنە بەو جۆرە شتێکی تایبەتی بوو بەو دەست کەوتەوە لەبەر بەدیهێنانی ئەو یاسایە کە باس کرا. بڕیاری گشتی بۆ هەموو دەست کەوتێکی، ﴿فیء﴾ بۆ هەموو بێ دەست و بێ نەوایانە لە کۆچ کەران و یارمەتی دەران و ئەوانەی پاش ئەوان دێن لە هەموو چەرخ و چینێك دا، وەکو وەرئەگیرێ لەم ئایەتانەی کە دێن. بەڵام قورئان بڕیارەکانی خۆی دەرناکات هەروا بە وشك و برین و بێ گیان، بەڵکو شێوەیەکی بۆ ئەسازێنێ کە ئەوانەی دڵ مردوو نەبن بچن بە پیری یەوە بە خۆشی.

جا لەبەر ئەوە هەرکام لەم سێ تاقمەی باس کرد بە چەند نیشانە و سیفەتێکی راستی بەدی هاتووە کە سروشت و شێوە راستەقینەکەی روون بکاتەوە:

١- ئەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ﴾ ئەو دەست کەوتەی کە ناو ئەبرێ بە ﴿فیء﴾ بۆ هەژارە کۆچ کەرەکانە ﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ﴾ ئەوانەی کە دەرکران لە وڵات و جێ و شوێنی خۆیان و لەماڵ و سامانیان، زۆریان پێ هێنراو دەرکران. هیچ تاوان و گوناهێکیان نەبوو بێجگە لەوە ئەیان وت: خوای هەموومان تاك و تەنیایە و ناوی ﴿الله﴾ یە. دەستیان نا بە وڵات و سامانیانەوە و بەجێ یان هێشت لە کاتێك دا ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا﴾ نیازو داوای بەخشش ئەکەن لەلایەن خواو، رەزامەندی ئەو مەبەستیانە، ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ یارمەتی خواو پێغەمبەرەکەی ئەدەن بە دڵ و بە ماڵ و بە گیان و بە شیرو تیران لە تەنگ و تاریك ترین کاتیان دا ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ﴾ ئا ئەوانەن راست و راستگۆ، بە زمان راستیان وت، بە کردەوە راستیان کردو راستیان بەدی هێنا، ئەوانە راستیان کرد لەگەڵ خوادا کە ئەویان هەڵبژارد بۆ پەرستراوی خۆیان، راست بوون لەگەڵ پێغەمبەردا کە کردیان بە پێشەواو شوێنی کەوتن، لەگەڵ حەق و راستی دا راستیان کرد کە بوون بە نوێنەرو بەدی هێنەر، بوون بە وێنەیەك بۆی بەسەر زەوی دا ئەگەڕان و ئەبینران.

وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ

---

٢- ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ﴾ ئەو دەست كەوتە بۆ هەژارانێكە كە نیشتەجێ بوون لە مەدینەدا كە بوو بە جێ و شوێنی كۆچكەرانیش، دامەزران و جێگیر بوون لەسەر بڕوا بە ئایینی ئیسلام ﴿مِن قَبْلِهِمْ﴾ لەپێش كۆچ كردنی كۆچ كەران بۆ لایان.

بەڕاستی هەر بە قورئان ئەكەوێ نیشاندانی شێوەو مەبەستی ڕاستەقینەی هەر شتێ بدوێ لێ ی، بەڕاستی ڕاستترو نزیك ترین شێوەی هەڵوێستی یارانی یارمەتی دەران لە ئیمان و ئیسلامەوە ئەمەیە كە ئەم ڕستەیە نیشانی ئەدات ﴿تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ﴾ بەڵێ بەڕاستی ئیمان و ئیسلام بوو بە جێ و شوێن و نیشتمانیان، ئارام و ئاسایشی گیانیان بەوە بوو، سۆزو خۆشی دڵ و دەروونیان هەر بۆلای ئیمان و ئیسلامەكەیان ئەڕۆیشت. لە كاتێك دا ﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾ هەركەس كۆچی ئەكرد بۆلایان خۆشیان ئەوێ ﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟﴾ دەستیان ناكەوێ لە دەروونی خۆیان دا هیچ پێویستی یەك بە هەندێ لەوەی دراوە بە كۆچ كەران، واتە ئەوەندە دەروون پاكن هیچ داواو كینە و حەسادەت و دڵگرانی یەك ڕوویان تێ ناكات بەرامبەر هەر بەخششێ بدرێ بە برا كۆچ كەرەكانیان، با ئەمان بێ بەش بكرێن لێی.

هەموو مێژووی ئادەمی ڕووداوێكی گشتی و كۆمەڵی نەدیوە بە وێنەی ڕووداوی بە پیرەوە چوونی مەدینەیی یەكان بۆ برا مەككەیی یەكانیان. بەم خۆشەویستی و ڕێزو برایەتی یە، بەم دەست و دڵ گوشادی یە، بەم هاوبەشی و بەشدار كردنە بە خۆشی و خۆشنوودی یەوە، بەم چەسپانی و پەلاماردان و بەربڕكێ كردنە لە دامەزراندن و جێگە

کردنـەوەو ئـەرك گرتنـە سەرشـانە، تەنانـەت ئەگێڕنـەوە کـە هـیچ کـۆچ کـەرێ دەسـت کـەوت نـەبووە بـەناو نـووس و قورعـە نـەبێ، چـونکە ژمـارەی کـۆچ کـەران کـەمتر بـووە لـە مەدینـەیی یەکان، ئەوانە دەربارەی برا کۆچ کەرەکانیان گەیشتنە ئەم رادەیە کە ئەفـەرموێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ فـەزڵ و بـاوی ئـەوان ئـەدەن بەسـەر خـۆیـان دا ﴿وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ بـا خـۆیـشیان پێویستی زۆریان ببێ بەوەی کە ئەیدەن بەوان! باودانی و فەزڵی خەڵکی بەسەر خۆدا پۆپە و لوتکەیـەکی زۆر بەرزە، هـەروا بـە ئاسانی مـەردوم پـێی ناگـات، بەڕاسـتی یـارانی یارمـەتی دەرانی مەدینەیی پێگەیشت بە جۆرێ کە ئادەمی وێنەی نەدیتووە، ئەوانە خوا لێ یـان رازی بێت لە هەموو کارێکی خێرو چاك دا هـەر وا بوون و گەیشتوونەتە رادەیـە لـە باوی خـەڵکی دەرچـوون و تێپـەڕی یـان کـرد. بوخـاری و موسـلیم و ترمـزی حەدیـسێ ئـەهێنن لـە ئـەبو هـورەیرەوە خـوا لـە هـەمووان رازی بێـت، پیـاوێ چـووە خزمـەت پێغەمبـەر (ص) هـاواری برسێتی کرد، ئینجا ئەویش ناردی بۆلای حەرەمەکانی شتێکی بۆ بێنن و لای هیچیان هـیچ دەست نەکەوت، ئینجا فەرموی: رەحمـەتی خـوا لـە کەسـێ ئـەم شـەو ئـەم پیـاوە بباتـەوە بـە میوانی، ئەبو طلحەی ئەنساری وتی: من ئەیبەمەوە، ئینجا بردی یەوە وتی بەخێزانی: رێزی میوانی پێغەمبەر بگرە، ئەویش وتی: سوێند بەخوا هیچمان نییە بێجگە لە خواردنی منداڵە وردەکان، ئەبو طلحە وتـی: کاتێ منداڵەکان شیریان ویست بیانخەوێنـە و خۆراکەکە بێنـە و چراکە بکوژێنـەوە بـا نـەزانێ مـن نـاخۆم و ئێمـە ئـەم شـەو بـێ شـێو سـەر ئەنێینـەوە لەبـەر میوانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا بەیانی میوانەکە ئەچێ بۆ خزمەت پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەویش ئەفەرموێ: بەڕاستی خوا کردەوەی ئەبوطلحەوخێزانەکەی زۆر پەسەندکردوپێی خۆش بوو، دەربـارەی ئـەو ژن و مێـردە فـەرموی ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ﴾ هەرکـەس بپـارێزرێ لـە چـنگ قوچراوی و بەرچاوبرسی تەماع بازی خۆی

فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا
وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ
﴿١٠﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَئِنْ
أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ

---

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ئەو ئەوانەن رزگار لە ناخۆشی و گەیشتوو بە ئامانجن، ئەو خووە خراپە رێگرە لە هەموو خێرو چاکەیە، چونکە خێرو چاکە بریتی یە لە بەخشین لە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی، بەخشینی ماڵ، بەخشین لە سۆزو بەزەییدا، بەخشین لە كردەوەو كۆشش دا، بەخشین لە گیان و ژیان دا لە كاتی پێویستیدا، ئەوەی كە هەمیشە بیەوێ هەر وەرگرێ و هیچ كاتێ نەیەوێ ببەخشێ هەرگیز ئەو كەسە خێرو چاكەی لە دەست نایە، هەركەس پارێزراو بێت لەو خوە پیسە بێگومان ئەو كەسە پارێزراوە لە رێگری خەیر. ئەبێ بە بەخشندەو میهرەبان و یارمەتی دەر، ئەوەیشە رزگاری و گەیشتن بە ئامانج.

٣- ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ ئەو دەستە كەوتە بۆ هەژارانێكە هاتن و دێن لە پاش كۆچ كەران و یارمەتی دەران كە بە جۆرێكن ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەڵێن ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا﴾ ئەی خوای پەروەردگارمان ببورە لە ئێمە ﴿وَلِإِخْوَٰنِنَا﴾ لەبرا ئایینی یەكانمان ﴿ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ كە پێش كەوتن لە ئێمە بە بڕوا هێنان ﴿وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا﴾ پەیدا مەكە لە دڵەكانمان دا هیچ جۆرە رق و كینەیەك ﴿لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ دەربارەی ئەوانەی بڕوایان هێناوە. ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەی خوای ئێمە بە راستی تۆ زۆر بەخشندەو میهرەبان و بەزەیی داری. ئەمە شێوەی پاك و خاوێنی تێگەیشتروی تاقمی سێ یەمە. گرنگ ترین نیشانەیان دەرئەخات، هەرچۆنێ تایبەتی ترین سیفەتی ئەم ئوممەتە موسڵمانەیە بە شێوەی گشتی لە هەموو چەرخێكدا.

ئەم تاقمی سێ یەمە لە كاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا هێشتا پەیدا نەبوون و نەهاتبوون، بەڵكو لە زانینی خوادا بوون، ئەو زانینەی كە رووتە لە سنووری كات و شوێن و چەرخ. ئەم تاقمی سێ یەمە نیشانەی دەروونیان ئەمەیە كە روو ئەكاتە پەروەردگاری بۆ

داوای لێ بوردن، نەك تەنها بۆ خۆیان بەڵكو بۆ ئەوانەش كە بە بڕوا هێنان لێ یان پێش كەوتوون، بۆ داوای پاك كردنەوەی دڵیان لە كینەو رق دەربارەی هەموو بڕواداران، لەوانەی كە ئیمان و بڕوا پەیوەستی كردبوون پێكەوە، لەگەڵ هەست كردن بە میهرەبانی و بەزەیی خوا، داوا كردنی ئەو میهرەبانی و بەزەیی یە بۆ هەردوو لایان.

لەبەر رووناكی ئەم ئایەتانە دەرئەكەوێ سروشت و شێوەی شیرینی ئەم ئوممەتە موسڵمانە لەناو ئەم بوونەوەرەدا. دەرئەكەوێ پەیوەستی دواوبەری بە یەكترەوە، بە سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی و یارمەتی و هاوكاری و برایەتی و هەست كردن بە نزیكی و برایەتی یەكە تێپەڕ ئەكات و هەنگاو ئەنێ بە مل دووری و جیاوازی چەرخ و شوێن و تیرەو نەژاددا، بە تەنیا و رووت لەوانە ئەمێنێتەوە لە دڵ دا، هەست و دەروون ئەمێنێتە سۆزو بزووتنەوە، یادو بیرەوەری ئیمان و بڕوادار ئەهێنێ بۆ برا بڕوادارەكەی لە پاش تێپەڕ كردنی چەند چەرخی زۆر دوورو درێژ، بە وێنەی یادو بیرەوەری برای زیندووی هاوچەرخی، بەڵكو زۆر بەهێزو بەتین تر، لە سۆزو بەزەیی و رێزو خۆشەویستی دا، تاقم و چینی رابردوو دوو تاقم و چینی داهاتووی لەبیرە و حسابی بۆ ئەكات، تاقم و چینی تازە پەیدا بوو رێبازو رێگای تاقم و چینی رابردوو ئەداتە بەرو شوێنی ئەو ئەكەوێ، بە یەك ریزو یەك كۆمەڵ و لەشكر بە درێژایی چەرخ و جیاوازی و دووری شوێن و وڵات، هەموو لە ژێر تەنیا ئاڵایەك دا ئەڕۆن و بەرز ئەبنەوە بۆ ئاسۆی بەرزو بەڕێز، بە چاوەڕوانی میهرەبانی و لوتف و بەزەیی خوای تاك و تەنیای هەمووان، بەڕاستی وێنەو شێوەیەكی ئێجگار شیرین و دڵ رفێنە، وێنەو شێوەیەكی راستی بەدی هاتووە، دەرخەرو نوێنەری بەرزو بەڕێزترین شێوەو وێنەی ئادەمێتی یە كە بە دڵ و خەیاڵی ئادەمی راستەقینەدا بێت. بەرزی و بەڕێزی و شیرینی ئەو وێنە و شێوەیە كاتێ روون ئەبێتەوە بە تەواوی كە بەراورد بكرێ لەگەڵ شێوەو وێنەی رق و كینەی بەتین و رووخاندن و دژایەتی سەخت لە نێوان تاقم و چینەكان دا كە شیوعی یەت نوێنەریەتی و مژدەی پێ ئەدات لەسەر زمانی ماركس و لە كتێبەكەی ماركس دا. وێنەو شێوەی ئەو رق و كینەی كە ئەكوڵێ لە دڵ و دەروون دا دەربارەی هەموو تەبەقەكانی تر، دەربارەی هەموو چین و ئوممەتەكانی ئێستا كە ئەو بیرو باوەڕەی نەگرتبێتە گەردن. بە تایبەتی دەربارەی ئاین و ئاین داران لە هەموو گەل و میللەتێك.

بەڕاستی ئەو وێنەو شێوەی ئادەمێتی یە كە ئەو ئایەتانە دەست نیشانی بۆ ئەكات زۆر زۆر دوورو دژو جیاوازە لەگەڵ ئەو شێوەو وێنەی كە ماركسێتی داوای ئەكات، وێنەو

شێوەیەکە ئادەمێتی تیا بەرز ئەبێتەوە بۆ پۆپە و لوتکەی هەرە بەرزی، لەگەڵ وێنەو شێوەیەك کە ئادەمێتی تیا بێتە خوارەوە بۆ پەستترین پلە و رادە. وێنەو شێوەیەکە هەموو تاقم و چینەکانی ئادەمی بکات بە یەك و سەرنجی جیاوازی چەرخ و وڵات و تیرەو رەنگ نەداو بیەوێ هەموو پەیوەست و بە سۆزو بەزەیی قۆڵگیرو یارمەتی دەرین و هەموو پێکەوە بەرز ببنەوە بۆلای پەروەردگاریان، بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی و دەروونێکی پاك و خاوێن لە رق و کینە، لەگەڵ وێنە و شێوەیەکە تاقم و چینەکانی ئادەمی بکات بە دوژمن تێکیان بەر بدات بە ئاژاوەو کوشتن و بڕین و دڵ پڕ لە رق و کینە و لاری و غەش و فڕ و فێڵ، هەموو مەبەست و ئامانجی بکات بە خۆراك و جێ و شوێن و پەڕین، ئایین و خواپەرستی بەداوو تەبکە سەیر بکات کە سەرمایە دار دایهێناوە بۆ گرتنی چەوساوەو هەژارو بێ دەسەلاتەکان!! بەراستی ئەم دوو وێنەو شێوەیە هەرگیز کۆ نابنەوە و یەك ناگرن لە هیچ شتێك دا، لەم ئایەتەوە دەرئەکەوێ کە پێویستە لەسەر موسڵمان یارەکانی پێغەمبەری خۆش بوێ بە تێکڕایی، نابێ بە هیچ رەنگ کینەو رقی هەبێ دەربارەیان، داوای لێبوردن بکات بۆیان لە هەر هەڵەو کەم و کوڕی یەکیان. هەر موسڵمانێ وا نەبێ بێ بەشە لەم مەرجە و وەسف و سەنای کە خوا کردی دەربارەی ئیمانداران، پێویستە ئێمە بزانین یارانی پێغەمبەر(ﷺ) ئادەمی بوون، کەواتە دەست ئەدەن بۆ هەڵە کردن، هەڵەی ئەوان لێ بوراوە، چونکە ﴿مجتهد﴾ بوون و بە هەوای نەفسی نەیان کردووە. لەپاش ئەوەی ئەو شێوە شیرینەی نەخشە کێشا، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو رووداوەی کە سورەتەکەی تیا هاتە خوارەوە، بۆ ئەمەی نەخشەی شێوەو کردەوەی تاقمێ تر بکێشێ لەوانەی کە بەشدار بوون لەو رووداوەدا، تاقم و کۆمەڵی ناپاکەکان. ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟﴾ ئایا سەرنجێکت نەداوە بۆلای ئەوانەی کە ناپاکی یان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرو ئیمانداران دا، واتە ئەوانە جێگای سەرسوڕمانن بە دیمەن و رواڵەت خۆیان بە موسڵمان دائەنێن کەچی لەگەڵ موسڵمانان نین، بەڵکو لەگەڵ دوژمنەکانیان.

ئەوەتا ﴿يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ﴾ ئەڵێن بە برادەرەکانیان ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ ئەوانە کە بێ بڕوا بوون لە خاوەن نامە، واتە جولەکەکانی (بنی نضیر) ﴿لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ئێوە دەرکران لە ولاتی خۆتان ﴿لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ﴾ ئێمەش لەگەڵتان دەرئەچین،

وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا
يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾

---

﴿وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا﴾ هەرگیز فەرمانبەری هیچ کەس ناکەین لەبارەی ئێوەو بە دژی ئێوە، ﴿وَإِن قُوتِلْتُمْ﴾ ئەگەر جەنگتان لەگەڵ کرا ﴿لَنَنصُرَنَّكُمْ﴾ بێگومان یارمەتیتان ئەدەین، ئەو ناپاکانە ژێر بە ژێر دەیان ناردە لای ئەوجولەکانەو بە سوێند و پاکانە ئەو بەڵێنەیان پێدان، ئینجا خوا کە ئاگادارە بە هەموو شتێ جاڕی لێدان و ئەوەی ئەوان ئەیانویست دەرنەکەوێ بۆ موسڵمانەکان، خوا دەری خست و بە درۆی خستنەوەو دڵنیایی کرد لەسەر ڕوودانی پێچەوانەی بەڵێنەکەیان، فەرموی: ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ خوا شایەتی ئەدات کە بێگومان ئەو ناپاکانە درۆ ئەکەن لە بەڵێنەکەیان دا، وەکو بە درێژییش ئەفەرموێ: ﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ئەو جولەکانە دەرکرێن ناپاکەکان لەگەڵیان دەرناچن، ﴿وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ﴾ ئەگەر جەنگیان لەگەڵ بکرێ یارمەتی یان نادەن. ئەم هەواڵە پێشەیک دراو کەس نەیئەزانی و بە ڕاست دەرچوو و بەدیهات وەکو هەموو هەواڵەکانی تری قورئان، کەواتەئەمەش بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون بوو لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ). بێگومان خوا زانایەو ئاگادارە بە هەر شتێ کە دەست بدات بۆ ئەوەی بزانرێ و زانین ڕووی تێ بکات بۆ لەمەوپێش و ئێستاو داهاتوو، ئیتر چ ئەوەی بووە یان ئێستا هەیە یان لە داهاتوودا ئەبێ، چ ئەوەی نەبووە یان ئێستا نی یە یان لە داهاتوودا ئەبێ. لەهەرکام لەم شەشە ئەزانێ ئەگەر پێچەوانەی ببێ چۆن ئەبێ، کەواتە هەرچۆنێ زانیویەتی کە یارمەتی دانی ناپاکەکان هەرگیز بەدی نایەت، هەروەها زانیویەتی ئەگەر لەوانە بوایە بەدی بهاتایە چۆن ئەبوو، جا بە پێی ئەمە ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ناپاکەکان یارمەتی جوولەکەکان بدەن، واتە ئەگەر وا دابنێین شتی وا ئەبێ و ڕوو ئەدات لە کاتێك دا کە بە هیچ کلۆج نایش بێ ﴿لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ﴾ بێگومان هەموو ئەشکێن و پشت هەڵئەکەن و واز ئەهێنن لە یارمەتی دان ﴿ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ ئینجا دوای ئەوە جولەکەکان ئیتر یارمەتی نادرێن و ئەشکێن و یارمەتی دان سوودیان پێ ناگەیەنێ: یان دوای ئەوە ناپاکی ناپاکان دەرکەوت ئیتر یارمەتی نادرێن.

لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾

ئینجا حاڵەتی دەروونی ناپاك و جوولەكەكان روون ئەكاتەوە:

١- ئەفەرمویٚ: ﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً﴾ بێگومان ئێوە ئەی موسڵمانەكان سام لیٚ كراو ترن ﴿فِي صُدُورِهِم﴾ لەدڵی ئەواندا ﴿مِّنَ ٱللَّهِ﴾ لەخوا، واتەبیم و ترسیان لە ئێوە زۆرترو بەتین ترە لە بیم و ترسیان لە خوا ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە كە ئەوانە گەلێكن نەزان و تێنەگەیشتوون.

ئەو كەسەی كە تێگەیشتوو بیٚ ئەزانیٚ هەموو هێزی ئەم بوونەوەرە مل كەچە بۆ جوا، هەرچی ئەو نەیكات نابیٚ، هەرچی ئەو بیكات و بیەویٚ ئەبیٚ هەر ئەوە ببیٚ و هیچ هێزێك ناتوانیٚ بەرگری بكات، كەواتە تەنها خوا شایانە بیمی لیٚ بكریٚ، هەركەس لەخوا بترسیٚ نابیٚ لە هیچی تر بترسیٚ، چونكە بیم و ترس لە خوا بە رێكی و بیم و ترس لە هەر شتی تر كۆنابێتەوە لە هیچ دڵێكدا، بەڵام ئەوانە نەفامن تیٚ ناگەن لەم شتە راستە بەهۆی ئەوەوە لە بەندەكانی خوا زیاتر ئەترسن.

٢- ئەفەرمویٚ: ﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا﴾ ئەوانە جەنگتان لەگەڵ ناكەن بە كۆو كۆمەڵی ﴿إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ﴾ مەگەر لەناو دێهاتێكی قایم كراودا ﴿أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ﴾ یان لە پەناو پشتی دیواراندا، واتە ناتوانن روو بە روو لەگەڵتان جەنگ بكەن، ﴿بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ﴾ دوژمنایەتی و ناكۆكی ناو خۆیان سەخت و بەتینە ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا﴾ وا ئەزانیت ئەوانە كۆو یەك دڵن، ﴿وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ﴾لە كاتێك دا دڵیان پێچەوانەی یەكترو پەراگەندەن ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾ ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە ئەوانە گەلێكن نافامن و ژیر نین، بەهۆی ئەوەوە نازانن یەكێتی تا چ رادەیەك پێویستە و دووبەرەكی چەندە خراپ و زیاندارە. خوای گەورە ئەو هەواڵە گرنگەی دا لەوانە و ئەو حاڵ و بارەیانی دەرخستن، تا بێت چەرخ و رۆژگار راستی ئەو هەواڵە روونتر ئەكاتەوە، هەر كاتیٚ ئیماندارانی راستەقینە كەوتنە جەنگ لەگەڵ جولەكەدا نەیانتوانیوە رووبەروویان بوەستن و خۆیان

دەرخەن، بۆ نموونە: ئەو جەنگە دوایی یەی کە رووی دا لە خاکی پاکی قودس و فەلەستین دا لە نێوان فیدایی فیدایی یە موسڵمانەکان و جولەکەدا بە شێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا راستی ئەو هەواڵەی بەدی هێناو نیشانی دا، ئەوە بوو جوولەکەکان جەنگیان پێ نەئەکرا لەناو دێهاتە قایم و محکەم کراوەکان دا نەبێ. ئەگەر یەك تۆز بهاتنایەتە دەرەوە دەرکەوتنایە وەکو مشك راو بنرێ سەریان لێ ئەشێواو رایان ئەکردو خۆیان بۆ نەئەگیرا بە جۆرێ وەکو ئەم ئایەتە یەکەم جار هاتبێتە خوارەوە لەبارەی ئەوانەوە، ئەمە شتێکی ئاشکرا بوو بە پێش چاوی هەموو ئەوانەی لەو جەنگەدا بوون، ناو بانگی پەیدا کرد لەناو دەوڵەتە کافرە یارمەتی دەرەکانیان دا، هەروەها لە پاش ئەو جەنگە هەر تێ جەنگانێکی تر رووی دا، لە ١٩٥٦ وە تا ئێستای ١٩٨٢ کە جەنگە لەگەڵ موسڵمانانی لوبنانی و فەلەستینی دا ئەوەتا لە پەنای دیواری دەبابەو فرۆکەو کەشتی و شتەکانی تردا نەبێ روو بە روو نایەو ناتوانێ بێتە سەر ئەو کۆمەڵە کەمە بێ دەستە داماوە، لەگەڵ ئەوەش دا هیچ کام لەم جەنگانەی دوایی یە جەنگی موسڵمان و جولەکە نی یە، لە رێگای خوادا نی یە و بەناوی ئیسلامەوە نی یە، بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام نی یە. بەڵکو ئەمانە هەموو جەنگی جولەکەن لەگەڵ گەل و کۆمەڵێکی عەرەبدا، بەناو عروبە و نەتەوایەتین، لەبەر بەرزکردنەوەی ئاڵای عروبەن، لە ژێر ئاڵاو سەرکردایەتی عروبەدان!! هەروەها نیشانە دەروونی یەکانی تریشیان راستە: ئاژاوەو ناکۆکی ناو خۆیان زۆر بەتینە، دڵیان لای یەکتر نی یە، دژو پێچەوانەی یەکترو پەراگەندن، هەرچەند بە دیمەن و رواڵەت لە زۆرکات دا ئەبینرێن بە یەك دڵ و یەك مەبەست و یارمەتی دەرو قۆڵگیری یەك، بەڵام لە راستی دا بارو حاڵەتی راستەقینەیان ئەوەیە کە خوای زاناو ئاگادار هەواڵی پێداین، جار بە جاریش بە روونی دەرئەکەوێ لێ یانەوە ئەوەی قورئان جاڕی لێدان، قورئان ئەو جاڕەیان لێ ئەداو بە باشی ئەیانناسێنێ بە موسڵمانەکان بۆ ئەمەی بێ نرخ و ریسوایان بکات لە پێش چاوی موسڵمانەکان، بیم و ترسیان نەمێڵێ لە دەروونیاندا، کەواتە ئەمە هاندان و ئامادە کردنێکی دەروونی و رۆحی یە بۆیان، هەرکات موسڵمانەکان قورئانەکەی خۆیان بەهێزو بە جیدی گرت دوژمنی خواو دوژمنی خۆیان ریسوایە و نرخی نامێنێ لایان، هەموو یەك دڵ و یەك بارو یەك مەبەست ئەبن و لە یەك ریزدا ئەوەستن، کەواتە هیچ هێزێك لەم جیهانەدا بەرگەیان ناگرێ و ناتوانێ بەرەو روویان بوەستێ.

كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ
ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ
أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ

---

ئەم داستان و رووداوی (بنی نضیر) و ناپاکانە یەکەم شت نی یە، بەڵکو لە پێشەوە رووداوو بەسەرهاتی (بنی قینقاع) و ناپاکەکان رووی دا وەکو دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ داستانی ئەم جولەکەی (بنی نضیر) ە وەك داستانی جولەکەکانی بنی قینقاع وایە کە لە پێش ئەمان دا بوون.

رووداوی بنی قینقاع لە پاش جەنگی بەدردا بوو پێش جەنگی احد، لە پێشەوە لە نێوان ئەوان و پێغەمبەردا (ﷺ) پەیمان بوو کە دەست درێژیی نەکەن بۆ یەکتر، ئینجا کاتی موسڵمانەکان لە جەنگی بەدرا زاڵ بوون جولەکەکان زۆر غەمبار بوون و ئەو سەرکەوتنەیان پێ ناخۆش بوو، مەترسی یان کرد کە ئەو سەرکەوتنە ببێتە هۆی نزم بوونەوەو زەبوونی خۆیان. بەهۆی ئەوەوە کەوتنە جم و جوڵ و کۆبوونەوەو نیازی خراپەکاری. ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش مۆچیاری کردن و پەیمانەکەی بیرخستنەوە و ترساندنی بە دووچار بوونی تۆڵەی پەیمان شکاندن، ئەوانیش بە رەقی و بێ شەرمی وەڵامیان دایەوەو وتیان: ئەی محمد بێگومان تۆ وا ئەزانی کە ئێمەش گەلەکەی خۆتین! بەوە لە خۆت مەگۆڕێ و هەڵمەخەڵەتێ کە تووشی گەلێ بوویت ناشارەزای جەنگ، بەهۆی ئەوەوە هەلێکت بۆ هەڵکەوت لێیانەوە، ئێمە ئەگەر جەنگت لەگەڵ بکەین بە خوا ئەزانی کە مەردو پیاو ئێمەین!

ئینجا دەستیان کرد بە هاندان لە موسڵمانان و دەست درێژیی لێ یان، تەنانەت ئەگێڕنەوە کە ئافرەتێکی عەرەب هەندێ شت و مەك ئەهێنێ لە بازاڕی ئەو جولەکانەدا ئەیفرۆشێ، لای دووکانی زەڕەنگەرێ دائەنیشێ، جولەکەکان داوای لێ ئەکەن چارشێوو پەچەکەی لابات، ئەویش بە گوێ یان ناکات، ئینجا ئافرەتەکە بە خۆی نازانێ کابرای زەڕەنگەر داوێنی کراسەکەی گرێ ئەدات بە پشتی یەوە، ئینجا کاتێ هەڵئەسێ کراسەکەی بەرز ئەبێتەوەو لەشی دەرئەکەوێ، ئەوانیش دەست ئەکەن بە پێکەنین پێ ی، ژنەکە هاوار ئەکات، یەکێ لە موسڵمانان پەلاماری زەڕەنگەرەکە ئەداو ئەیکوژێ، جولەکەکانیش بە جارێ پەلامار ئەدەن موسڵمانەکە ئەکوژن، ئینجا کەس و کاری موسڵمانەکە هاوار ئەکەنە

موسڵمانەکان و ئەوانیش دێن بە هاواریانەوە و هەراو ئاژاوە بەرپا ئەبێ، ئەو هەواڵە ئەگات بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش خێرا دەوری بنی قینقاع ئەدا، تا ناچار دێنە بەر حوکمی و بەوە رازی ئەبن، ئینجا سەرۆکی ناپاکەکان عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ئەچێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) تکایان بۆ ئەکات، بەناوی ئەوەوە کە پەیمان و دۆستایەتی هەیە لە نێوان ئەوان و تایفەیدا (خزرج). بەڵام لە راستی دا لەبەر یەکێتی و پەیوەستی ناپاکەکان بوو لەگەڵ برادەرە جولەکەکانیان! بەهۆی ئەو تکا و لاڵەیەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەستیان لێ هەڵئەگرێ بڕۆن لەمەدینەدەرچن و هەرچی یان هەیەلەگەڵ خۆیان ببەن بێجگەلەچەکی جەنگ. ئەمە بوو رووداوێ کە لە پێش رووداوی (بنی نضیر) دا رووی داو خوا کردی بە وێنە بۆ رووداوەکەی ئەمان و فەرمووی: ﴿قَرِيبًا ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾[1] ئەوان چەشتیان سەرەنجام و بەرهەمی سەخت و خراپی کاری خۆیان لە کاتێکی نزیك لە یاخی بوونەکەیان و هەر لەم جیهانەدا، هەر بەوەش خوا وازیان لێ ناهێنێ، بەڵکو بۆ رۆژی دوایش بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی سەخت و ئێش و ئازار دەر.

ئینجا وێنەو داستانێکی پڕ بە پڕ ئەهێنێتەوە بۆ داستانی ناپاکەکان کە جولەکەکانیان هەڵخەڵەتان و هانیان دان لەسەر جەنگ کردن و خۆگرتن، تا بەدبەختیان کردن و سەریان لە سزاو سەرشۆڕی هەردوو جیهان دەرکردن، ئەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ وەك داستانی شەیتان وایە، ﴿إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ﴾ کاتێ وتی بە ئادەمی کافر ببە ﴿فَلَمَّا كَفَرَ﴾ ئینجا کاتێ بێ بڕوا بوو بە گوێی کرد، ﴿قَالَ﴾ شەیتان وتی پێی: ﴿إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ﴾ بەڕاستی من لە تۆ بەریم و بێزارم، ﴿إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەڕاستی من ئەترسم لە خوا کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە، بەڵام هەرچۆنێ ئەوئادەمی یەی بەدبەخت کرد تازە خۆبەری کردن و لێ کشانەوە هیچ سوودێکی نابێ بۆ شەیتان بەڵکو هاندەرو هاندراو وان لە ئاگردا. وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا﴾ ئینجا سەرەنجام و دوا رۆژی شەیتان و ئادەمی بوو بەمە هەردووکیان لە ئاگری دۆزەخ دان بە ئێجگاری و بێ بڕانەوە.

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە ﴿ قريبا ﴾ زەرف بێت بۆ ﴿ ذاقوا ﴾ بێجگە لەوە چەند بارێ تر هەڵئەگرێ نزیك تریان ئەمەیە پەیوەست بێت بە وشەی ﴿ من قبلهم ﴾ پەیوەستە پێ یەوە، واتە ئەوانەی لە پێش ئەمانەوە بوون بەم نزیکانە.

﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەوەیەتۆڵەی ستەم کارانی هەرە گەورە، واتە کافرو بێ بڕواکان. کۆڕو جەماوەر لەسەر ئەوەن کە مەبەست بە شەیتان ئادەمی یە بە شێوەی نادیاریی، نەك بە شێوەی تایبەتی کردن بە دوو کەس یان چەند چەند، ئەو بێزاری و خۆ بەری کردنە لە ڕۆژی دواییدا ئەبێت.

شێوەی شەیتان لێرەداو کارو کردەوەی لەگەڵ فەرمانبەرو گوێڕایەڵەکانی زۆر ڕێك و پێکە لەگەڵ سروشت و مەبەست و کارو پیشەی هەمیشەیی، کەواتە زۆر سەیرو هۆی سەرسوڕمانە ئادەمی بە گوێی شتی وا بکات و فەرمانبەری بێت، کە ئەو ئەوە ڕەوشت و پیشەیەتی!

لەپاش باسی جولەکە و ناپاکەکان کە بەو جۆرە دووچاری سزای سەختی خوا بوون بەهۆی یاخی بوون و لە خوا نەترسی یان، ئینجا ڕووی فەرمودە ئەکاتە بڕواداران، بانگیان لێ ئەکات بە سیفەتی بڕواو ئیمان، ئەو سیفەتەیان بۆ بەکار ئەهێنێ کە پەیوەستیان ئەکات بە خوای فەرماندارەوە، گوێڕایەڵی و بە پیرەوە چوونی پەندو تەمێی داوا لێ کراوەکەیان لەسەر شان سووك و کەم ئەرك ئەکات، ڕووی فەرمودەیان تێ ئەکات بۆ ئەمەی بانگیان بکات بۆ لەخوا ترسی و خۆپارێزەری لە هەر شتێ هۆی خەشم و سزای خوایە، بانگیان ئەکات بۆ تێبینی و ئاوڕدانەوە لەوەی لەم جیهانەدا ئەیکات و پێشی ئەخات بۆ ڕۆژی دوایی، بۆ وریایی یەکی هەمیشەیی، بۆ خۆپاراستن، لە خوا لە بیر دەرکردن بە وێنەی ئەوانەی پێش ئەمان کە خوایان لە بیر چوو، ئەوانەی کە سزای ئەبڕاوەی ئاگریان بۆ بڕیار دراوە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن، ئەو ترسانە بکە نبە بەربەست و بەرهەڵست بۆ هەموو گوناهو تاوانێ.

سیفەتی ﴿تقوی﴾ – کە قورئان زۆر فەرمانی پێ ئەدا – حاڵەتێکە لە دڵ دا بە دەروون و ویژدان باشتر ئەناسرێ وەستی پێ ئەکرێ تا ئەوەی بە دەم بوترێ و ڕاڤە بکرێ، حاڵەتێکە دڵ وریا و ئاگادار ئەکات بە جۆرێ هەمیشە خوای خۆی لە بیرە، بیم و سامی لێ ئەکات و خۆی ئەپارێزێ و شەرم ئەکات لەوەی خوا بیبینێ لەسەر بارو حاڵەتێ کە پێی ناڕازی یە و پێی ناخۆشە. بێگومان بڕوای وایە کە هەمیشە وا بە پێش چاوی قودرەتی خواوە، کەواتە چۆن و کەی و لە کوێ دا خۆی داشارێ لێی؟!!

﴿وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ﴾ با هەموو كەسێ سەرنج بدات و ورد بێتەوە لەوەی پێشی خستووە بۆ دوا ڕۆژی خۆی، با ئێستا حیساب و پرسیاری خۆی بكات پێش ئەمەی هەل و هەلكەوتی ئەم ژیان و جیهانەی لە دەست دەرچێ، با بزانێ كردەوەكانی چۆنە، ئەگەر چاكە ئەوا سوپاسی خوا بكات و هەوڵی زیاتر و چاكتر بدات، ئەگەر خراپی كێڵاوە با پەشیمان بێتەوە و بگەڕێتەوە بۆلای خوا.

بەڕاستی ئەم ڕستەیەش ئێجگار گرنگە، تەنیا بیر لێ كردنەوەی بە ڕێكی دەفتەری كردەوەی، بەڵكو دەفتەری هەموو ژیان ئەكاتەوە و ئەیخاتە بەرچاوی دڵ و دڵیش چاو هەڵئەخاو ورد ئەبێتەوە لە هەمو دێڕەكانی، ئەو بیر كردنەوە بەو جۆرەیە بەسە بۆ ئەمەی بێدار ببێتەوە و ئاگادار ببێ بەسەر هەموو كەم و كوڕی، لەكەو چڵك و چەپەڵی یەك كە بووبێتی و هەیەتی، هەرچەند و هەر ئەنداز خێرو چاكەی بووبێ و پێشی خستبێ، چا جای ئەوە خێرو چاكەی كەم و كوڕو لاواز بێت، بەڕاستی جێگیر بوونی ئەم فەرمانە لە دڵ دا بەرگری ئەكات لە خەوتن و بێ ئاگایی و هەمیشە سەرنجی پێ ئەدات و دەفتەرو نامەی كردەوەی پێ ئەپشكنێ و ئەم دیوو ئەو دیوی ئەكات!

ئەم ئایەتەی كە ئەو هەموو هەست و سۆزو پەرۆشە هەڵئەگرێنێ واز ناهێنێ هەتا هەمیترو زیاتر وریایی و بیم و ترس و شەرم فەراهەم ئەهێنێ لە دڵ و دەروون دا كە ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن لە هۆی خەشم و سزای خوا، ئاگاتان لە كردەوەی خۆتان بێت ﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ بەڕاستی خوا ئاگادارو خەبەردارە بە هەر كردەوەیەك ئەیكەن.

وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ

**به بۆنەی بانگ کردنیان بۆ بێداری و وریایی بۆ بیر کردنەوە ئەیانترسێنێ لەوەی وێنەی ئەوانە بن کە خوای خۆیان لەبیر چووەو بەهۆی ئەوەوە خوایش سەری لەوان تێك داوەو خۆیانی لەبیری خۆیان بردووەتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ﴾ وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لەبیر چوو، فەرامۆشیان کرد ﴿فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوایش ئەوانی لە بیری خۆیان بردەوە، بێگومان ئەو کەسەی خوای خۆی لە بیر کردبێ بە سەرگەردانی ئەسوڕێتەوە لەم ژیان و جیهانەدا بە بێ ئەوەی پەیوەندی و پەیوەست بێ بە ئاسۆیەکی هەرە بەرزەوە، بە بێ مەبەست و ئامانجێ بۆ ئەم ژیانەی کە جوێ و بەرزی بکاتەوە لەو هەموو گیانلەبەرانەی کە هەموو مەبەست و ئامانجیان لەوەڕان و خەوو خواردنەوەیە، ئەوەش لە راستی دا لە بیر چوون و فەرامۆش کردنی ئادەمێتی یەکەیەتی، ئەوەش ئەبێتە هۆی ئەوە کابرا خۆی لەبیر بچێتەوەو هیچ توێشوویەك فەراهەم نەهێنێ بۆ ژیانی دوورو درێژیی نەبڕاوەی خۆی، سەرنج و دڵی تێبینی نەکات لەوەی پێشی ئەخات بۆ دوا رۆژی. ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ ئەوپەڕیان گرتووە لە گوناهو ئا ئەوانەن لە رێگای راست ترازاو و دەرچوون لە فەرمان و گوێڕایەڵی بۆ خوا.**

**ئینجا روونی ئەکاتەوە کە ئەوانەن لە ئاگردا بە هەمیشەیی و بێ بڕانەوە، دەست نیشان ئەکات بۆ بڕواداران کە رێگای ئەمان ئەدەنە بەر و رێگایەکی تری جیاواز بدەنە بەر، ئەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾ یەکسان نین و وەك یەك نین بە هیچ رەنگ نیشتەجێکانی ئاگرو نیشتەجێکانی بەهەشت. بەڵێ ئەو دوو کۆمەڵە وەك یەك نین نە لە سروشت و حاڵ و باردا، نە لە رێگا و رێبازو رەوشت دا، نە لە مەبەست و ئامانج و چارەنووس دا، کەواتە وان بەسەر دوو رێگاوە کە هەرگیز یەك ناگرن و ناگەن بە یەك لە هیچ رێگایەك دا، یەك ناگرن لە نیشانە و دروشم دا، یەك ناگرن لە هیچ خیتەو بەڕێوە بردنی هیچ کاروبارێکیاندا، هەرگیز لە یەك ریزدا کۆنابنەوە لەم جیهان و لەو جیهاندا.**

أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ
خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ
عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ

---

**﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ تەنها نیشتەجێکانی بەهەشت گەیشتوون بە ئامانج و رزگارن لە ناخۆشی، باسی دوا رۆژو چارەنووسی تاقمەکەی تری نەکرد، رەنگە لەبەر ئەوە بێت کە ئەوانە ئەوەندە پەست و بێ نرخن شایستەی باس و ناوبردن نین.**

**لەپاش ئەو هەموو پەندو تەمێ و هەڕەشەی سامناك و مژدەو ترساندن و دڵخۆشی و دڵنەوایی یەك کە قورئان ئاراستەی ئادەمی ئەکات، کەچی لەگەڵ ئەوەدا زۆربە لە ئاستی وەکو کەڕو کوێرو بێ هۆش وایە و هیچ کاری لێ ناکات، ئینجا گرنگی و گەورەیی و هێزو دەسەڵاتی قورئان باس ئەکات و ئەیانخاتە بەرچاو بۆ تانەو تەشەردان لەوانەی کە قورئان کاریان لێ ناکات، ئەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ﴾ ئەگەر ئەم قورئانەمان بناردایەتە خوارەوە بۆ سەر شاخێك ﴿لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا﴾ ئەو شاخەت ئەبینی بە مل کەچی و سەرکوبی ﴿مُّتَصَدِّعًا﴾ پارە پارەیی ﴿مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ لە بیم و ترسی خوا، زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە مەبەست بەم فەرمودەیە چیرۆك و تەمسیلە، واتە هێزو کاریگەری ئەم قورئانە لە رادەیەك دایە ئەگەر بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەر کێوێ کە چەندە بەتینە لە رەقی و سەختی و کار لێ نەکراویدا، ئەو کێوە هۆش و تێگەیشتنی ببوایە، ئەو کاتە بەو جۆرەی بەسەر ئەهات، ئەفەرمون: بەڵگە لەسەر ئەوە ئەمەیە کە ئەم فەرمودەیە ئەهێنێ بە دوای دا: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ئەو جۆرە وێنە و نموونانە ئەهێنینەوە و باس ئەکەین بۆ خەڵکی بەڵکو تێ فکرێن و بیر بکەنەوە، وێنە و نموونە زۆرتر بەکار ئەهێنرێ بۆ چیرۆك و شتی خەیاڵی، بەڵام هیچ پێویستی نی یە ئێمە لابدەین لە دیمەن و رواڵەتی**

ئایەتەکە، لادان لە دیمەن و رواڵەت بە بێ رابەرو بەڵگەیەکی بەهێز رەوا نی یە و قەدەغەیە، دەی ئایا هیچ ئایەت یان حەدیس یان بڕیاری زانایان هەیە لەسەر نەگونجاوی شتی وا؟ بێگومان هیچ کام لەوانە نی یە، بەڵکو لەم بارەوە بەڵگە و نیشانە هەیە: قورئان فەرمودەو سیفەتی خوایە، کاتێ خوا خۆی دەرخست لەو شاخەی کە باسی ئەکات شاخەکە پارە پارە بوو، ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾[1] دەی با شاخێکیش پارە پارە ببێ بە هاتنە خوارەوەی حەقیقەتی قورئان لەسەری، بەڕاستی ئەوە هیچ هۆی سەرسوڕمان و سەر لێ کردنەوە نی یە، ئەم قورئانە هێزو قورسی و دەسەڵاتێکی وای هەیە هیچ کەس و هیچ شتێ خۆی بۆ ناگیرێ لە ئاستی نموونەیە لە حەقیقەت و شێوە راستەقینەکەی، مەگەر خوا یارمەتی بدات و بەهێزی بکات، کار ئەکا لەدڵ و دەروون و گۆڕانی بەسەردا دێنێ، بە وێنەی موگناتیس و کارەبا کە شت رائەکێشێ و ئەیگرێ، لەم بارەوە بەسەرهاتی زۆر رووی دا و بۆ نموونە لە سەرەتا سورەتی ﴿الذاريات﴾دا بەسەرهاتی کابرایەکمان باس کرد، کە بە بیستنی چەند ئایەتێ حاڵی گۆڕا و سەری کردە خواپەرستی و چوو بۆ مەککە و ئینجا بە بیستنی ئایەتێ تری هەمان سورەت گیانی دەرچوو، لە سەرەتای سورەتی ﴿الطور﴾ دا بەسەرهاتێکی خەلیفەی دووەم خوا لێ ی رازی بێت باس کرا بە بیستنی چەند ئایەتێکی سەرەتای سورەتەکە مانگێ لە ماڵ دا کەوت و خەڵکی ئەچوون بۆ دیاری.

ئینجا خوای پەروەردگار باسێکی گەورەیی و بێ وێنەیی خۆی ئەکات و خۆیمان پێ ئەناسێنێ بە چەند ناوو سیفەتێکی بەرزو شیرینی، کە ئەم بوونەوەرە شایەتە لەسەریان و باس و یادی خوای خۆی ئەکات پێ یان، هەر ناوێ لەو ناوانە جۆرە کارێ نیشان ئەدات و بەرو بەرهەمێکی خۆی هەیە. لە بوونەوەرو ئادەمی و ژیان دا. ئەو ناوانەی کردووە بە سێ بەش و کۆمەڵ. هەر بەش و کۆمەڵێ دەست پێ ئەکات بە سیفەتی تاك و تەنیایی خوا، تا لە

---

[1] ئینجا کاتێ خوا خۆی دەرخست بۆ کێوەکە پارە پارەی کرد. سورەتی ﴿ الأعراف ﴾.

یەکەم جارەوە بەوە بناسرێ و جێگیر ببێ لە دەروون دا یەکێتی عەقیدە، یەکێتی پەرستن و عیبادەت، یەکێتی روو کردنی بەندەکان و ئەوەی رووی تێ ئەکەن، یەکێتی کارو ئیش کەر لە سەرەتای دروست کردن و داهێنانەوە تا دوایی و رۆژی دوایی. لەسەر ئەم یەکێتی یە فەراهەم دێت و راگیر ئەبێ بەرنامەیەکی تێرو تەواو لەبیر و بڕواو هەست و رەوشت و تێکەیشتن و پەیوەندی و پەیوەستی ئادەمی لەناو خۆیان دا و بە یەکتر و بە هەموو گیان لەبەرێ تر و بە بوونەوەرەوە بە شێوەی گشتی، ئەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ﴾ تەنها ئەوە خوایەکە ناوی ﴿الله﴾ یە ﴿ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ کە هیچ خوایەکی تر نی یە بێجگە لەو ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ زاناو ئاگاداری هەموو نهێنی و هەموو ئاشکرایەکە، کەواتە ئێمە هەرچی بڵێین و بیکەین بە ئاشکراو بە نهێنی خوا ئاگادارە پێ ی، هەر دڵێ ئەم باوەڕەی تیا جێگیر ببێ بێگومان وریا ئەبێتەوەو هەست ئەکات بەوە کە هەمیشە وا لە ژێر تاقی کردنەوەو چاودێریی خوادا، ئەو کاتە شەرم ئەکات لەوەی خۆی چەپەڵ بکات بە گوناهو تاوان لە پێش چاوی خوا، خاوەنی ئەو دڵە خۆی ئەپارێزێ لەهۆی خەشم و نارەزایی خوا بە ئاشکراو بە نهێنی وەك یەك، ئەزانێ هەرگیز بە تەنیا نابێ و ناژی. ﴿هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ تەنها ئەوە زۆر بەزەیی دارو میهرەبانە، بەهۆی ئەمەوە ئارامی و دڵنیایی لە دڵ دا فەراهەم دێت، تەرازووی ترس و ئومێد بەرامبەر ئەبن، بەندە تێ ئەگات کە خوا نایەوێ بیتارێنێ و بەڵکو سەرپەرشتی ئەکات، زیان و خراپەی هیچ کەسی پێ خۆش نی یە، بەڵکو رێنموونی ئەوێ لە بەندەکانی. ﴿ هُوَ ٱللَّهُ﴾ تەنها ﴿الله﴾ خوایە ﴿ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ ئەوەی کە هیچ خوایەکی تر ن ییە بێجگە لەو، ئەم رستەیەی دووبارە کردەوە، چونکە ئەمە بنەڕەت و بنیاتی هەموو ناوو سیفەتەکانی ترە، ﴿ٱلْمَلِكُ﴾ پادشاو فەرمانداری بە دەسەڵاتە. بەهۆی بڕوا بەم سیفەتەوە بەندەتێ ئەگات کەهیچ کەسێکی تُرمیچی بەدەست نییە، ئەوکاتەتەنهایەك خاوەن وگەورە و فەرمانداربۆخۆی دائەنێ، بەندەیی کەسی ترناکات، بە هۆی ئەوەوە ئازادی تەواو وەرئەگرێ.

ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾

**﴿ٱلْقُدُّوسُ﴾ ئەوپەڕی رادە پاکە لە هەموو لەکەو ناتەواوی یەك. بڕوا بەم ناو و سیفەتە تیشك و روونـاکی پـاکێتی ئەخاتـە دەروون، بـە هـۆی ئـەوەوە مـەردوم دڵ و دەروونـی پـاك ئەکاتەوە، بۆ ئەمەی شایان بێت بۆ وەرگرتنی فەڕو بەهرەی پادشای پاکی و بێگەردو لەکە.**

**﴿ٱلسَّلَٰمُ﴾ ئارام وئاسایش وبێ باکی ئەخاتەناووئەیخاتە دڵی بڕوادار بەرامبەرپەروەردگاری، لەم ناوە بەفەڕەوە دڵنیـایی و ئاشتی دڵـی بـڕواداران روونـاك ئەکاتـەوە، ئـەو کاتـە خێـر خـواه ئەبێ و داواکاری خۆشی و چاکەیە بۆ هەموو کەس. ﴿ٱلْمُؤْمِنُ﴾ بەخشندەی ئارام و ئاسایش و بڕوای دڵنیاکەرە بۆ بڕواداران، ئەم وشە بەفەڕە نرخی بڕوا نیشان ئەدات و دڵخۆش کەری بڕوادارانە، چونکە بەکار ئەهێنرێ بۆ هەموو یەکێ لەمان، ئیتر با مەبەست پێی جیاواز بێت لەم کاتەدا، ئەم ناوو سیفەتانەی کە تێپەڕیان کرد پێ یان ئەوترێ: ﴿ذاتي﴾ واتە پەیوەندی یان هەیە بە تەنها زاتی پاکی خواوە، لێرە بە دواوە جۆرێ ترن پێ یان ئەوترێ ﴿فعلي﴾ واتە ئەوانەن کە پەیوەندی یان هەیە بە خواوە لەم رووەوە کە ئیش کەرە لە دروست کراوەکانی دا وەکو لـە راڤـە کردنیش دا دەرئەکەوێ، ﴿ٱلْمُهَيْمِنُ﴾ ئاگادارو چاودێریی هـەموو دروسـت کراوەکانیەتی. ﴿ٱلْعَزِيزُ﴾ زاڵەبەسەرهەمووشتێکداو هیچ کەس و هیچ شتێك لێی یاخی نابێ، ﴿ٱلْجَبَّارُ﴾ گەورەوبەدەسەڵات دارێکە دروست کراوانی ناچار ئەکات لەسەر هەر بارو روویەك کە ویستبێتی و بۆی بڕیار درابێ. ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ ئەوپەڕی رادەی هەیـە لـە گەورەییدا و هیچ کەم و کوڕی تیا نییە. ئەم سیفەتانە هەموو تایبەتین بە خواوەو هیچ وێنەو هاوبەشی نی یە بـۆی تیایانـدا، لەبـەر ئـەوە ئەفـەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خـوا پاکـەو پـاکی بـۆ خوایە لەوانەی کە خەڵکی ئەیانکەن بە هاوبەشی.**

**ئینجادێتەسەریەشی سێ یەم ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱللَّهُ﴾ تەنهائەوە خواو کەسی تر خوا نییە، ﴿ٱلْخَٰلِقُ﴾ داڕێـژەرەو رێـك و پێـك کـەری شـتەکانە، بـە پێـی لێزانـی و کاردروسـتی، ﴿ٱلْبَارِئُ﴾**

داهێنەرو بەدی هێنەرە بە پێی ویست و خواهیشی خۆی. ﴿ٱلۡمُصَوِّرُ﴾ وێنەو شێوە دەری هەموو شتێکە بە جۆرێکی جیاواز کە هەرکام ببێتە شتێکی تایبەتی و جیاواز لە هەموو شتەکانی تر ﴿لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ تەنها بۆ ئەوە هەموو ناوە جوانەکان کە گەیەنەری ئەو مانا و مەبەستە پاك و شیرینانەن کە شایانی خوان و رەوای داون بۆ خۆی، ئەو ناوە جوانانە کە خۆیان لە خۆیان دا جوان و شیرینن بە بێ ئەمەی پێویست بن بە جوان کردن و بە جوان زانینی هیچ کەس، ئەو ناوە بەفەڕانە ٩٩ ناون شوێنی باسکردنی ئەو ناوانە بە درێژیی لە دوادوایی سورەتی ﴿الإسراء﴾ دایە. بە چەند جۆرو شێوەیەکی تر راڤە و تەفسیر کراون، زۆر لە زانایان هەڵساون بەو راڤەو تەفسیرانە بۆ نزیك خستنەوەی مەبەستەکانی لە زانین و تێگەیشتنی کەم و کوڕی ئێمەوە ئەگینا تەنها خوا بە تەواوی حەقیقەتی ئەو ناوانە ئەزانێ و ئەناسێ. زانایان و خواناسان چەند سڕو شتی نهێنی یان هەست پێ کردووە لە ژێر هەرکام لەم ناوە بەفەڕانە، چەند سوودو بەرهەمی تایبەتی یان لێ وەرگیراوە. ئەو کەسانەی کە بێ بەشن لەو تام و مەزەیە نابێ سەربکەنەوە لەو جۆرە شتانەو خوا نەخواستە ناڕاستیان دابنێن.

نەزان چوزانێ لە بیرونەوە بزان ئەزانێ لە دەروونەوە

ئینجا لە کۆتایی سورەتەکەو ئەو ناوە پیرۆزەدانەدا شێوەیەك نیشان ئەدات کە دڵی وریا چاوەڕوانی بۆ ئەکات لە دوای بیر کردنەوە لەو ناوانە. شێوەی سوپاس و ستایشی ئەم بوونەوەرە بۆ خوای خاوەنی ئەو ناوو سیفەتانە، ئەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە یادو باسی خوا ئەکات و بە پاکی راگیری ئەکات و ستایشی ئەکات﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ﴾ تەنها ئەو زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا ﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾ کردار جوان و کاردروستە.

وصلى الله وسلم على من أنزل عليه القرآن إلى يوم الدين و على آله و صحبه

# سورەتی «الممتحنه»
## مەدینەیی یەو ١٣ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئـەم سـورەتە ئەڵقەیەکـە لـە پـەروەردە کردنـی برِوایـی و ڕێکخسـتن و هۆنینەوەیـەکی کۆمەلآیەتی و دەوڵەتی لەناو گەلی مەدینەدا، ئەڵقەیەکە لەو زنجیرە درێژە، یان لەو بەرنامە خوایی یەی کە هەڵبژێرراوە بۆ گەلی موسڵمانی هەڵبژێرراو، کە خوا لەسەر دەستی ئەوان دا بەدی هێنا ئەو بەرنامـەی کـە ویستی و داینا بۆ ژیانی ئادەمی، بە شێوەیەکی رووداو بە کردەوە، بۆ ئەمـەی جێگیر ببێ لە زەوی دا بە رژێمێکـی دیاریی جیاوازی خاوەن سنوورو نیشانە و دروشم، کە جار جاریّ ئادەمی پێی ئەگات و جار بە جاریّ کەم و کورِ و کورتە و پـێی ناگـات، بـەلآم هەمیشە ئەمێنێتـەوە بە چاوەڕوانی و تـەقالای پێگەیشتنی، لە پـێش چاویەتی شێوەی شیرینی بەدی هاتووی، کە پێك هات رۆژیّ لە رۆژان لەم زەوی یەدا.

گەیشتن بەو رادەو پلە بەرزەو گەیشتن بە پێك هێنان و بەدی هێنـانی ئەو ئامانجە بـەرزە — وەکو لـە سـەرەتای ئـەم جزمـەوە وتـرا — ئامـادە کردنێکـی دوورو درێـژیی ئەویّ بە چەند هـەنگاونان و بـڕینی چـەند قۆناغێـك، ئـەو بەسـەرهات و رووداوانـەی کـە لـەناو ئـەو گـەل و کۆمەڵەدا بەرپا ئەبوو، یان پەیوەندی ئەبوو بەوانەوە، ئەوانە هەموو هۆی ئەو ئامـادە کردن و پێگەیاندنە بوون، بەوانە کۆمەڵە پاڵفتە ئەکرا.

لەناو کۆڕی ئەو رووداوانەدا، لەناو شەپۆل و لافاوی بەهێزی بەسەرهاتی ژیـان و جیهـان دا، پێك هـات و دوایـی هـات داڕشتن و دروسـت کردنـی ئـەو گەلـەی کـە هەڵبـژێررا بـۆ بـەدی هێنانی ئەو بەرنامەی خوا لـە زەوی دا، کەواتـە هـیچ دووری و کەنارگیری یـەکی ئـەو کۆمەڵـە نـەبوو لـە خـەڵکی تـر، بێجگـە لـە دووری و کـەنارگیری بـیرو بـاوەڕو تێگەیـشتن و بۆچـوونی تازەیان، کە لـەو بەرنامە تازەی خواوە وەریـان ئـەگرتو بە پاك و خاوێن رایان ئـەگرت، بیّ تێکەڵ کردنی بە هیچ شتیّ تر، ئەو پەروەردە کردن و پێگەیاندنی هەمیشەیی یە بۆ داڕشتن و پتـەوکردنی ئـەو تێگەیـشتن و بۆچـوونە تایبـەتی یـە بـوو کە جیـاواز بـوو لـە هـەموو بـارو رووییەکەوە لە هەموو بۆچوون و تێگەیشتنیّ کە لەو رۆژەدا با بوو لـە جیهان دا، لەناو نیـوە دورگەدا بە تایبەتی. تەنها لەم بارەیەوە دوور بوون و تێکەڵ و پێکەڵی یان پیّ نەئەکرا، ئیتر لـە هـەموو بەسـەرهات و رووداوی ژیـان دا تێکـەڵی ئـەو خەڵکـە بـوون، لـەناو بۆتـەی ئـەو

بەسەرهات و ڕووداوانەدا ئەتوێنرانەوەو پاڵفتە ئەکران، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جار لە دوای جار، وا ئەبوو چەند جار ئەتوێنرانەوەو پاڵفتە ئەکران لەبەر تەنها کارو رەوشت و خویە، چونکە ئەو خوایە کە ئەم دڵ و دەروونانەی دروست کردووە ئەیزانێ کە هەموویان بە یەکجار و یەك دەستکاری کردن چارەسەر ناکرێن، بەڵکو پێویستی هەیە بە چەند تیمار و دەستکاری یەك، ئەیزانێ کە تەم و ژەنگ و چڵکی نەزانی لەوەوبەر تەپەی داوە بەسەر دەروون و ژێریی یانەوە، هێزی راکێشەری سۆزو ئارەزووی سروشتی، بێ هێزی و لاوازی ئادەمی و خۆنەگرتنی، دەسەلات و زاڵی ئولفەت و دەق پێوە گرتن، ئەمانە هەموو هۆی کارنەکردنی تەمێ و پەروەردە کردنن، ڕێگرو هۆی گیرو گرفتن، بەرەنگاری و لەکار خستنی ئەم هەموو ڕێگرانە و پاك کردنەوەی ڕێگا لەو هەموو درك و داڵە پێویستی هەیە بەو هەموو پەند و تەمێ یەك لە دوای یەك و ئەو چەند جار پاڵفتە کردنە، جا بەهۆی ئەوە ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە بە دوای یەك دا ئەهاتن بە پێی قەرارو بڕیاری خوا، پەندو تەمێ یان پێ ئەکرا جار لە دوای جار. پێغەمبەر (ﷺ) بە بێداری و ئاگاداری هەمیشەیی و بە پێی ئەوەی خوا ئەینایە دڵی بەفەڕی هەڵئەسا بە وەرگرتنی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانە لەهەموو هەل و هەڵکەوتێك دا، بە بەکارهێنانیان بە هەموو لێزانی یەوە لە داڕشتن و دروست کردنی ئەو دڵ و دەروونانە، سروش و تێگەیاندنی خوا یارمەتی دەری بوون هەتا ئەو گەل و کۆمەڵە هەڵبژێراوەی پێك هێنا لە ژێر چاودێری خوادا، بە ڕێکخستنی خواو لەسەر دەستی پێغەمبەری خوادا (ﷺ).

ئەم سورەتە ئەڵقەیەکە لە زنجیرەی ئەو پەروەردە کردنە دوورو درێژە، مەبەست و ئامانجی ئەو وێنەو ئەم فەراهەم هێنانی جیهانێکی خوایی پاك و خاوێنە لە دەروونی موسڵمانان دا، جیهانێ کە بخولێتەوە بە دەوری بڕوا بە خوا بە تاك و تەنیا، هەموو موسڵمانان پەیوەست بکات و شەتەکی بدات بەو بڕوایە بە جۆرێ پچڕانی نەبێ لێ ی، دڵ و دەروونیان پاك بکاتەوە لە هەموو لایەنگری و ڕەگەزایەتی یەکی تر، ڕەگەزایەتی نەتەوەو تیرەو خاك و خزم و کەس و کار. بۆ ئەمەی لە جێگای ئەوانەدا تەنها شتێ دابنێ کە بریتی یە لە بڕوا بە خوا، وەستان لە ژێر ئاڵای خوادا، لەگەڵ کۆمەڵی خواو لە ناو کۆمەڵی خوادا.

ئەو جیهانەی کە ئیسلام ئەیەوێ جیهانێکی خوایی یە و ئادەمی یە. مەبەست بە خوایی ئەوەیە هەموو کاروبارێ بە پێی تەمێ و بڕیاری خوا بێت، بە هەست و نیازو کردەوەی ڕوو بکاتە خوا. مەبەست بەوە ئادەمێتی بێت ئەمەیە هەموو چین و جۆرەکانی ئادەمی بگرێتەوە

– له سایه‌و په‌نای عه‌قیده‌دا – هه‌موو هۆی جیاوازی تر بتوێته‌وه له تیره‌و نیشتمان و زمان و نه‌ژاد و هه‌مووشتێ ترکه‌ئاده‌می یه‌ك جوێ بکاته‌وه له ئاده‌می یه‌کی تر، بێجگه‌له عه‌قیده و بروا، ته‌نها ئه‌وه‌یه جیهانی به‌رز که شایانی ئه‌و ئاده‌می یه بێت که رێزدراوه لای خوا.

له رێگای فه‌راهه‌م هاتنی ئه‌م جیهانه به‌رزه‌دا چه‌ند گرێ و کۆسپی زۆر بووه له‌ناو گه‌لی عه‌ره‌ب دا زۆر به زیادو ئێستاش هه‌یه له هه‌موو جیهاندا، کۆسپ و گرێی ره‌گه‌زایه‌تی بۆ بنه‌ماڵه، بۆ عه‌شیره‌ت و تائیفه، بۆ گه‌ل و نه‌ته‌وه، بۆ تیره‌و به‌ره، بۆ خاك و نیشتمان. هه‌رچۆنێ گرێ و کۆسپی تر هه‌بوو هه‌یه له خودپه‌سه‌ندی و خۆ به‌زل زانی و هه‌موو لاری و نالەباری یه‌کانی دڵ و ده‌روونی!! پێویست بوو له‌سه‌ر ئیسلام چاره‌سه‌رکردنی هه‌موو ئه‌وانه له‌ناو ئه‌و گه‌ل و کۆمه‌ڵه‌ی که ئه‌یویست په‌روه‌رده‌و ئاده‌می بکات بۆ پێك هێنان و به‌دی هێنانی به‌رنامه بێ وێنه‌که‌ی خوا له زه‌ویدا.

هه‌ندێ له یاره کۆچ که‌ره‌کان که وڵات و ماڵ و که‌س و کاریان به‌جێ هێشتبوو له پێناوی عه‌قیده‌و بڕواکه‌یان دا، هێشتا ده‌روونیان به‌سترابوو به‌وه‌ی به‌جێ یان هێشتبوو له ئه‌ولاد و هاوسه‌رو خزم و خوێشه‌وه. له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌موو سزادان و ده‌ست درێژیی یه‌ی که لێ یان کرابوو هێشتا هه‌ندێ له‌وانه هه‌ر پێ یان خۆش بوو، ئاواتیان بوو که خۆشی و خۆشه‌ویستی په‌یدا ببێته‌وه ئه‌و دوژمنایه‌تی و ئاژاوه سه‌خته نه‌مێنێ که ناچاری کردن به جه‌نگ و کوشتار له‌گه‌ڵ براو که‌س و کاردا و په‌یوه‌ستی و په‌یوه‌ندی پچراندن خوای گه‌وره‌ش ئه‌ویست ئه‌و جۆره ده‌روونانه پاك و خاوێن بکاته‌وه‌و رزگاری بکات له‌و هه‌موو په‌یوه‌ستی و په‌یوه‌ندی یانه، هه‌موو شتێ تریان لێ داپنێ و یه‌ك یه‌ك بارو یه‌ك دڵیان بکات بۆ ئایین و عه‌قیده‌و به‌رنامه‌که‌ی.

خوای گه‌وره زاناو ئاگاداره به قورسی و گرانی ئه‌و شتانه له‌سه‌ر دڵ و ده‌روون، له باره‌ی ره‌گه‌زایه‌تی یه‌وه عه‌ره‌ب له هه‌موو گه‌له‌کانی تر به‌تین تر بوون، جا له‌به‌ر ئه‌وه رۆژ به رۆژ خوا تیمارو چاره‌سه‌ری ئه‌کردن به هۆی ئه‌و رووداوو به‌سه‌رهاتانه‌و په‌ندو ته‌مێ یان له‌سه‌ریان.

چه‌ند ریوایه‌تێ رووداوێکی دیاری باس ئه‌که‌ن که هۆی هاتنه خواره‌وه‌ی سه‌ره‌تای ئه‌م سوره‌ته بێت، ئه‌و ریوایه‌تانه هه‌رچه‌ند راست و سه‌حیح بن و ئه‌م رووداوه بگرێته‌وه، به‌ڵام قورئانه‌که تایبه‌تی ناکرێ پێ یه‌وه، به‌ڵکو له‌سه‌ر دیمه‌ن و رواڵه‌ته گشتی یه‌که‌ی ئه‌مێنێته‌وه. له‌باره‌ی ئه‌و رووداوه‌وه ئه‌ڵێن: کاتێ قوره‌یش په‌یمانی حوده‌یبیه‌ی شکاند

پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری دا کە مەککە ڕزگار بکات لە بت پەرست و بت پەرستان، لەبەر ئەوە فەرمانی دا بە خۆ ڕێکخستن و فەرمووی: خوایە ئەم نیازو هەواڵی ئێمە نەگەیەنی بە قورەیش، خۆی ئەو نیازو بڕیارەی گەیاند بە هەندێ لە یارەکانی، کە یەکێ لەوانە (حاطب ی کوڕی ئەبی بەلتەعە) بوو کە یەکێ بوو لە یارەکانی جەنگی بەدر، ئەم یارە ماڵ و ئەولادی لە مەککە بەجێ مابوو، خۆی لە قورەیش نەبوو، بەڵکو سوێند خوار بوو بۆ عثمان - خوا لێ یان ڕازی بێت - ئینجا بە هۆی ئەوەوە کە مەترسی لە ماڵ و ئەولادەکەی بوو، نووسراوێکی نووسی بۆ مەککەیی یەکان و نیازو بڕیارەکەی پێغەمبەری تیا نووسی، بۆ ئەمەی ئەوە بکات بە پیاوەتی یەك بەسەریانەوەو ئەوانیش ماڵ و ئەولادەکەی بپارێزن، ئەو نووسراوەی دا بە ئافرەتێکی بت پەرست کە هاتبوو بۆ مەدینە، ئینجا خوا پێغەمبەری ئاگادار کرد بەسەر ئەوەدا، ئەویش خێرا ناردی بە دوای ئافرەتەکەداو نووسراوەکەی لێ سەنرا، ئینجا با گوێ بگرین لە ئیمامی عەلی - کرم الله وجهە - کە یەکێ بوو لەوانەی نێرران بۆ لێسەندن و گێڕانەوەی ئەو نووسراوە، گوێ شل کەین بۆی ئەو بەسەرهاتەمان بۆ بگێڕێتەوە، وەکو بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە و ئەو هەواڵە ئەهێنن لێ یەوە، ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) من و مقدادو زوبەیری ناردو فەرمووی: بڕۆن هەتا ئەگەنە باخچەی (خاخ) کە ئەچنە ئەو شوێنە ئافرەتێکی بت پەرستی لێ یە نووسراوێکی پێ یە لە حاطبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە بۆ بت پەرستەکان. ئینجا ئێمەیش ڕۆیشتین و گەیشتین بە ئافرەتەکە لەم شوێنەدا بە سواری حوشترێ. پێمان وت: نووسراوەکە لە کوێ یە؟ ئەویش وتی: هیچ نووسراوم پێ نی یە، ئینجا حوشترەکەمان یەخ داو گەڕاین هیچمان دەست نەکەوت، ئینجا وتمان پێغەمبەر (ﷺ) درۆ ناکات، یان نووسراوەکەمان ئەبێ بدەیتێ بە خۆشی خۆت، یان بە زۆر جل و بەرگت لەبەر دائەکەنین و ئەتپشکنین، ئینجا کە زانی بە ڕاستی لێ بڕاوین، کاغەزەکەی لەناو پرچی دا دەرهێناو پێ ی داین، ئێمەیش هێنامان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر ناپاکی کردووە لەگەڵ خواو پێغەمبەرو بڕواداران، کەواتە لێم گەڕێ با سەری بکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چی پاڵی پێوە نایت ئەمەت کرد؟ حاطب وتی: بەخوا بڕوام هەیە بە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە ڕاستی ویستم پیاوەیەتی یە بکەم، خوا بیکات بە هۆی پاراستنی ماڵ و خێزانەکەم، هیچ کەس نی یە لە یارەکانی تۆ کەس و کاری نەبێ لە مەککە ببێتە هۆی ڕزگار بوونی ماڵ و خێزانیان بێجگە لە من، پێغەمبەریش فەرمووی: ڕاست ئەکات قسەی خراپ نەکەن دەربارەی، ئینجا عومەر وتی: بەڕاستی ناپاکی کردووە لەگەڵ

خواو پێغەمبەرو بڕواداران، کەواتە لێم گەڕێ با بدەم لە گەردنی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: چۆنی ئەکوژی ئەمە لە ئەهلی بەدر نی یە؟ تۆ چووزانی بەڵکو خوا موژدەی دابێ بە ئەهلی بەدر کەچی ئەکەن بیکەن من لێتان ئەبورم. ئینجا عومەر هەردوو چاوی پڕ بوو لە ئاوو وتی: خواو پێغەمبەر باش ئەزانن. بوخاری ئەفەرموێ: ئینجا خوا سەرەتای ئەم سورەتە ئەمێنێتە خوارەوە... چاك وایە ئێمە ئەندازەیە بوەستین بیر بکەینەوە لەم رووداوەو لە تەمێ و کردەوە گرنگەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەم رووداوەدا.

یەکەم بیر بکەینەوە لە کردەوەی حاطب، کە ئەو موسڵمانە کۆچ کەرە بوو، یەکێ بوو لەوانە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کرد بەسەر ئەو کارە نهێنی یەدا، لەمەدا دەرئەکەوێ لاری و چەوتی دەروونی ئادەمی، ئادەمی هەر ئەنداز تێرو تەواو بێت هەر ئادەمی یە و دووچاری هەڵە و لادان ئەبێت لە هەندێ کات دا، پەناو پارێزەر نی یە بێجگە لە خواو ئەو کۆمەگی نەکات هیچ ناکرێ.

ئینجا با بوەستین لەبەردەم ئەو هونەرو گەورەیی یەی خوا دای بەو پێغەمبەرە (ﷺ) لەو کارە زۆر گەورەدا هیچ پەلەی نەکرد هەتا پرسیاری کرد لە حاطب: چی پاڵی پێوە نایت؟ بەو دەروون فراوانی و لوتف و بەزەیی یەی کە بەکاری هێنا لەو کاتی لاوازی دەروونی یەی کە هات بەسەر ئەو ئادەمی یە، بەو تێگەیشتنەوە کە خوا نایە دڵی بەمەی کە فەرموی: بێگومان راست ئەکات، بەهۆی ئەوەوە فەرموی: بە یارانی هیچ قسەیەکی خراپ نەکەن و هەر چاك بڵێن دەربارەی تا کۆمەکی بکات و بنەوێ لە پەلی و لەو هەڵخلیسکانەی راستی بکاتەوە، نەیتاراند و نەیهێشت کەس بیتارێنێ. لە لایەکی ترەوە ئەبینین بڕوای تیژو بەتینی عومەر: ئەڵێ: بەڕاستی ناپاکی کردووە لەگەڵ خواو پێغەمبەر و ئیمانداران دا، لێم گەڕێ با بدەم لە ملی، عومەر خوای لێ رازی بێت هەر سەرنجی لادان و هەڵخلیسکانەکەی دا بەهۆی ئەوەوە هەست و بڕوای هاتە جۆش و راپەڕی، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) سەرنجی دا لە چاوە دوور بینی یەکەیەوە، بەو زانین و تێگەیشتنە فراوانەی کە خوا پێی دابوو لە هەموو بارو روویەکەوەو ئادەمی و سروشتی ئادەمی ئەناسی کە هەڵە بازە مەگەر خوا بیپارێزێ، لەگەڵ ئەوەدا سۆزو بەزەیی یەکەی جیاوازی پێ درابوو کە شایستەی ئەو بێت کە مامۆستای فێرکردن و پەروەردە بوو بۆ هەموو ئادەمی.

ئینجا با بوەستین و بیر بکەینەوە لە وشەو قسەکانی حاطب، لە کاتێك دا کە لەکاتی لاوازی دایە، بەڵام بۆچوون و تێگەیشتنەکەی موسڵمانانە و رێك و راست بوو کە وتی:

ویستم چاکەیەکیان لەگەڵ بکەم کە خوا بیکات بە هۆی بەرگری لە ماڵ و خێزانەکەم. واتە خوا ئەو بەرگری و پاراستنە ئەکات، ئەو چاکەو پیاوەتی یە خۆی بە خۆی هیچ نی یە، ئەوەی دووبارە کردەوەو دڵنیایی لەسەر کرد کە وتی: هیچ کام لە یارەکانت نی یە کە لە مەککە کەس و کارێکی وای نەبێ کە خوا بەرگرییان پێ بکات لەماڵ و خێزانی، کەواتە خوا ئامادە بوو لە دەروون و تێگەیشتنی دا، هەموو شتی لەو زانیووەو داویەتی یە دەستی ئەو. رەنگە پێغەمبەریش (ﷺ) سەرنجی ئەو بڕواو تێگەیشتنە راستەی ئەوی دابێ و ئەوە یەکێ بێ لە هۆی فەرمودەکەی: راست ئەکات هەر قسەی چاك بکەن دەربارەی.

ئینجا لە دوایی دا با بوەستین لەبەردەم بڕیاری خوا لەو رووداوەدا، کە حاطب یەکێ بێ لەو کۆمەڵە کەمەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو قسە نهێنی یەی پێ راگەیاند، ئەویش ئەوەی بەسەر بێت کە یەکێ بوو لەو کۆمەڵە هەڵبـژێرراوە، ئینجا ئەو بەسەرهاتەش دەرخات، کارێکی وایش بکات حاطب دووچاری هیچ زیانێك نەبێ لەسەری، مەبەست تەنها دەرخستن و چارەسەر کردنی بێت! ئینجا هیچ کەسێکی تر لەوانە کە بێ ئاگا بوون لەو نهێنی یە هیچ رەخنەیەکیان نەگرت و هیچ تەشەریان نەدا لە حاطب لەسەر ئەوەی کە رووی دا لێ یەوە، هیچ کەس لەوان نەیان وت: ئەگەر ئێمە بمانزانیایە بە هیچ رەنگ ئاشکرامان نەئەکرد، ئەمانە هیچیان روویان نەدا. کە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر شەرم و ئەدەبی موسڵمانان لەگەڵ سەرکردەو سەرکردایەتی یەکەیاندا، مل کەچی و خۆ بە زل نەزانی خۆیان، تەمێ و دەرس وەرگرتنیان لەوەی روویدالەبراکەیانەوە، ئەم بەسەرهات و رووداوی (حاطب)ە شتێکی راستەوهیچ گومانی تێدانییەوهاتنەخوارەوەی سەرەتای ئەم سورەتەلەم رووداوەداوبە بۆنەی ئەمەوە ئەوە یەکێکە لە ریوایەتەکانی بوخاری، هەرچەند وابێ و بەو بۆنەیەوە هاتبێ بڕیاری ئەم ئایەتە گشتی یە و نابەسترێتەوە پێیەوە، وەکو هەموو هۆی هاتنە خوارەوەکانی تریش.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِي سَبِيلِي وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِي

---

ئینجا با گویْ شل كەین بۆ سورەتە بەفەڕەكە و دڵمانی بۆ بكەینەوە بەڵكو خوا بە تیشكی رووناكی ئەو ئایەتانە تاریكی ئەمێلێ لە دڵ و دەروون دا، بە ئاوی پاك و رەوان دڵمان وریا و زیندوو بكاتەوە. ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی كەسانێ كە بڕواتان هێناوە. ئەمە بانگ كردنێكە لەلایەن پەروەردگاری بڕوادارانەوە، بانگیان ئەكات بەناوی ئەو بڕوایەی كە ئەیانگەیەنێ پێ‌ی و ئەیانكات بە بەندەی تایبەتی ئەو، بانگیان ئەكات بۆ ئەمەی چاویان بكاتەوەو بینایان بكات بە هەڵوێستی رێك و راست و رەوایان، ئەیانترسێنێ لە تۆڕو داوی دوژمنەكانیان، بیریان پێ ئەكاتەوە لەو كارە گرنگەی كە خراوەتە سەرشانیان، ﴿لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ﴾ دوژمنی من و دوژمنی خۆتان – واتە بێ بڕوایان – مەكەن بە دۆستی گیانی بە گیانی خۆتان، بەم رەنگە ﴿تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ﴾ خۆشەویستی خۆتان دەرئەبڕن بۆیان و پێ یان ئەگەیەنن.

خوای گەورە لوتف و خۆشەویستی بەكار ئەهێنێ لەگەڵ بەندەو بڕوادارەكانی و دەروونیان ئەهێنێتە سۆزو پەرۆش بەمەی دوژمنی ئەوان ئەكات بە دوژمنی خۆی و دوژمنی خۆی ئەكات بە دوژمنی ئەوان، تێ یان ئەگەیەنێ كە ئەوان لە خۆین و بۆلای خۆی ئەبێ بڕۆن. هەركەس دوژمنی ئەوان بێ دوژمنی ئەویشە، كەواتە ئەوان پیاوو بەندەی تایبەتی ئەون و نیشانە و دروشمی ئەویان هەڵگرتووە لەم زەوی یەدا، ئەوان خاوەن دۆست و خۆشەویستی ئەون. كەواتە دروست نی یە دۆستایەتی و خۆشەویستی بەكار بێنن لەگەڵ دوژمنەكانی خۆیان و دوژمنەكانی ئەودا.

ئینجاتاوان وستەمی ئەودوژمنەیان بیرئەخاتەوە، بەرامبەرئاینەکەیان و پێغەمبەرەکەیان و خۆیان، ئەفەرموێ: ﴿وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ﴾ لە کاتێك دا ئەو دوژمنانە بێ بڕوا بوون و بێ بڕوان بەوەی بۆتان هاتووە لەلایەن خواوە، کە بریتی یە لەو ئایینە راست و دروستە، لە کاتێك دا ﴿يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ﴾ پێغەمبەرو ئێوە دەرئەکەن لە ولأتی خۆتان، واتە بەرامبەریان لێ بڕینەوەو بەربەستی ئایینەکەیان کردن و تەنگەتاویان کردن هەتا ناچاریان کردن بە دەرچوون، ئەوەشیان بەسەر هێنان ﴿أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ تەنها لەبەر بڕوا هێنانتان بە خوای پەروەردگارتان، کەواتە ئیتر چیتان تیا هێشتەوە؟ چ تاوانێ لەوە گەورەترە کە بڕوایان نەبێ و دژی ئایینە راستەکەتان بن، پێغەمبەرەکەتان و خۆتان دەرکەن لە ولأت و نیشتمانی خۆتان، لەبەر هیچ هۆیەك نی یە بێجگە لە بڕواتان بە خوا؟ دەی ئیتر چۆن ئەبێ دۆستایەتی بکرێ لەگەڵ دوژمنی وادا، ئەو ستەم و کردەوە خراپانەی خستەوە بیریان، ئەوەی کە ئاژاوەو دووبەرەکی و جەنگی لەسەرە دەری خست و روونی کردەوە، کە تەنها بریتی یە لە عەقیدەو بڕوا، ئەمان هەرچییان بەسەر هاتووە لەسەر ئەوەیە، هەوڵ و تێکۆشانیان تەنیا بۆ عەقیدەو بڕواکەیانە، لەبەر ئەوە تەمێ ی کردن و تێ ی گەیاندن کە بە هیچ کلۆج رێگاتان نی یە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەدا، ﴿إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي﴾ ئەگەر ئێوە کاتی خۆی دەرچوون لە ولأتی خۆتان لەبەر جەنگ و تێکۆشان لە رێگای من دا ﴿وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي﴾ لەبەر بە دواگەڕان و داوا کردنی رەزامەندی من، واتە ئەگەر ئێوە نیازی ئەوەتان بووەو مەبەستتان ئەوەیە، دەی نابێ دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەو دوژمنە ستەم کارانەدا، چونکە ئەو دوو شتە لە دڵێك دا کۆ نابێتەوە: نیازی جەنگ و تێکۆشان لە رێگای خواداو لەبەر رەزامەندی خوا، لەگەڵ خۆشەویستی کەسێ کە دژی عەقیدەو ئایینەکەی بێت و دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەی بێت (ﷺ).

تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن
يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمْ
أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي
إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ

**ئینجا بە شێوەی نهێنی هەڕەشەیان لێ ئەکات و ئەیانترسێنێ لەوەی لە دڵیان دایە، ئەو خۆشەویستی یەی کە ئەیگەیەنن بە دوژمنەکانیان، لە کاتێك دا کە خوا ئاگادارە بەسەر ئاشکراو پەنهانی دڵەکان دا، ئەفەرموێ: ﴿تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾ بە نهێنی خۆشەویستی خۆتان ئەگەیەنن پێ یان، ﴿وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ﴾ لە کاتێك دا کە من زاناترم لەخۆتان بەوەی ئەیشارنەوەو ئەوەی دەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن، کەواتە هیچ سوودێکیش نی یە لە داشاردنی دا، چونکە خوا ئاگاو خەبەردارە.**

**ئینجا هەڕەشەیەکی ترسێنەریان لێ ئەکات، کە ترس و لەرز ئەخاتە دڵی بڕواداری راستەقینە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ هەرکەس لە ئێوە ئەوە بکات بێگومان ئەو کەسە رێگای راستی ون کردووە و لایداوە لێ ی. ئایا چی لەوە سامناك ترە بۆ بڕوادار کە لە پاش رێگا نیشاندان و کەوتنە سەری، ئەو رێگایە ون بکات و لێ ی لا بدات؟!**

**ئەو هەڕەشەو ترساندنەی خستە نێوان روون کردنەوەی حەقیقەتی دوژمنەکانیان و ئەو پیلان و نیازی خراپەی کە گرتوویانەتە دڵ و دەروونیان دەربارەیان، ئەفەرموێ: ﴿إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً﴾ ئەگەر ئێوەیان دەست کەوێ و بەر پەلیان کەون ئەوانە هەر دوژمن ئەبن بۆتان و ئەو دۆستایەتی و خۆشەویستی یەی کە پێتان گەیاندن هیچ سوودێکی نابێ، هەر کاتێ هەلێکیان بۆ هەڵکەوێ بەسەرتان دا تێپەڕ نابن، ﴿وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ﴾ دەست و زمانتان بۆ درێژ ئەکەن بە خراپە لە کوشتن و بڕین و جوێندان و هەر خراپەیەکی تر، لە هەموو شت خراپتر ئەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ [1] ئەوان لە پێش هەموو**

---

[1] لە بارەی عەنفی ئەم رستەیە و رابردوویتی وشەی ﴿ ودوا ﴾ چەند قسەو باس و لێکۆڵینەوە هەیە، لەناو ئەوانەدا بارێکم هەڵبژارد کە ئەو مەبەستە ئەگرێتەوە کە کردم بە تەفسیر، ئەو بارەکانی تریش هەر ئەگونجێن.

شتێك دا پێ یان خۆشە و ئاواتە خوازن كە كاشكێ ئێوە بێ بڕوا بن و لە ئایینەكەتان هەڵگەڕێنەوە. بێگومان بێ بڕوایی و هەڵگەڕانەوە لە ئایین بە لای بڕواداری راستەقینەوە لە هەموو سزایە و لە هەموو خراپە و دەست درێژیی یەك كە بە دەست یان بە زمان دەربارەی بكرێ. بەڵكو لە هەموو سزای ئەم جیهانە بێزراو ترە. چونكە بڕوای بڕواداری راستەقینە بێجگە لەوەی كە خۆی خۆشی و ئارامی دڵەو هۆی كردەوەو رەوشتی رێك و پێكە، كە ئەوەش لەم جیهانەدا گەورەترین چاكەو بەهرەی خوایە، بێجگە لەوە هۆی رزگار بوونە لە ئاگری دۆزەخ و گەیشتن بە نازو رێزی نەبڕاوەی رۆژی دوایی، ئەو بڕوایە خۆشەویست ترین شتە بەلای بڕوادارەوە، كەواتە هەركەس بیەوێ بڕواكەی لە دەست دەركات لە هەموو دوژمنی دوژمن ترە كە بیەوێ بە دەست و زمان سزای بدات. ئەو كەسەی كە شیرینی بڕوای چەشتبێ لە پاش بێ بڕوایی، لەپاش گومڕایی و ون بوون بە رووناكی بڕوا رێنوومایی وەرگرتبێ، ژیانی بەو ژیانی ئارامی و كامەرانی بڕوایە ئەو بڕوادارە بێ بڕوایی و هەڵگەڕانەوەی پێ ناخۆشە هەرچۆنێ پێی ناخۆشە تورِ بدرێ بۆ ناو ئاگر، بەڵكو ئەوی پێ ناخۆش ترە. كەواتە هەموو دوژمنی دوژمن تر كەسێكە كە بیەوێ بڕوادار بڕواكەی لە دەست دەرچێ و نەمێنێ، جا لەبەر ئەوە ئەو ئاواتی ئەوانەی كرد بە دواترین پلە لە هێنانە پەرۆشی بڕواداران بە دژی دوژمنە بێ بڕواكانیان. بێگومان سۆزو بەزەیی منداڵ و كەس و كار بەهێزەو دڵڕفێنە و لەوانەیە كە مەردوم بە هەڵەو هەدەردا ببا. ئەوەتا حاطب بەهۆی ئەوەوە دووچار بوو، جا ئەوا تیمارو چارەسەری ئەوەیش ئەكات، بەم رەنگە سەرنج رائەكێشێ بۆ بێ كەڵكی و بێ نرخی ئەوانە لە رۆژی دوایی دا، كە كات لەوە سەخت تر نابێ و رووناكاتە هیچ كەس. كەواتە نابێ لە پێناوی بەرژەوەندی و پارێزگاری ئەوان دا چاكە و خۆشەویستی بەكار بهێنرێ لەگەڵ دوژمنی خوادا، بە تایبەتی ئەگەر منداڵ و خزم و خوێشە هاوبڕواو عەقیدە نەبن و ئەو هۆی پەیوەستی و پەیوەندی یە گرنگە پچڕابێ، ئەفەرموێ: ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ﴾ هەرگیز سوودو قازانجتان پێ ناگەیەنن خزم و خوێشەكانتان ﴿وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ﴾ نە رۆڵە و منداڵەكانتان ﴿يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾[1] لە رۆژی دوایی دا، چونكە ﴿يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ﴾ خوا جۆیەتی ئەخاتە ناوەندی ئێوەو ئەوان، واتە خوا كارێكی وا ئەكات و ئەو رۆژە ئەوەندە سەخت و سامناك

---

[1] تەفسیرەكە لەسەر ئەوەیە كە ﴿یوم﴾ بەسترابێ بە رستەی ﴿لن تنفعكم﴾ ەوە كە ئەوەش زیاد تر دڵ بۆی ئەچێت. دروستە بەسترابێ بە ﴿یفصل﴾ ەوە بەو جۆرەش تەفسیر كراوەتەوە، بەهەر حاڵ مەبەستەكە هەر یەكە.

ئەكات مەردوم فیرار ئەكات و جویٚ ئەبێتەوە لە كەس و كاری و ئەیەویٚ خۆی رزگار ببیٚ و ئیتر گوێی لە هیچ كەسێكی تر نی یە، مەبەست ئەوەی ئەنێریٚ بۆ بەهەشت و دۆزەخی بۆ دۆزەخ، خزمایەتی و باوك و كوڕی كەڵكی نابیٚ و بەكار نایەت، چونكە پەیوەستی و پەیوەندی بڕواو عەقیدە پچڕاوەكە لای خوا تەنها ئەوە شتەو بەكارە.﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خوا بینایە بە هەر كردەوەیەك ئێوە ئەیكەن، كەواتە با هەموو كەس بترسیٚ هیچ شتێكی خراپ نەكات بە پێش چاوی قودرەتی خواوە، شتیٚ بكات كە ئەو پیٚی خۆشە. ئینجا گەشتیٚ ئەكات بە دڵ و دەروونی موسڵمانان و سەرنجیان رائەكێشیٚ و ئاوڕێكیان پیٚ ئەداتەوە بۆلای ئیبراهیم باوكی پێغەمبەرانی پاش خۆی و باوكی پێغەمبەری خۆشەویستمان و ئەو یەكەم تاقمەی كە ئەم قورئانەی چوو بە گوێچكەدا، بۆ ئەمەی پەیرەوی ئەوو شوێن كەوتووەكانی بكەن و رێبازی ئەوان بدەنە بەر لە لیٚ بڕانیان بە تەواوی بۆ خواو یەخە هەڵتەكاندنیان لە هەموو كەس و كارە بیٚ بڕواكانیان لە پێناوی رەزامەندی خوادا، خۆیان رووت كردو داڕنی لە هەموو پەیوەندی یەكە دژی عەقیدەو بڕواكەیان بێت. لەم ئاوڕدانەوەدا دەرئەكەویٚ بۆ موسڵمانان كە میللەتی خواپەرستی لە سەرەوە تا خوارەوە یەك میللەتە. كاروانی بڕوا یەك كاروانە بە درێژایی هەموو چەرخ و چینەكانی ئادەمی. ئەفەرمویٚ: ﴿قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾[1] بەڕاستی هەبوو بۆ ئێوە رەوشتی چاك و شایان بە پەیڕەوی كردن كە ئەو رەوشتە هەبوو لە ئیبراهیم و ئەوانە كە لەگەڵی بوون، ﴿إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ﴾ لە كاتێك دا كە وتیان بە گەلەكەیان: ﴿إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ﴾ بەڕاستی ئێمە بەرین و بێزارین لە ئێوە ﴿وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ لە هەر شتیٚ كە ئێوە ئەیپەرستن بێجگە لە خواو كە لەو تێپەڕ ئەكەن بۆ پەرستنی، واتە ﴿كَفَرۡنَا بِكُمۡ﴾ بیٚ بڕواین بە ئێوەو ئایینەكەتان و هیچ نرخێكتان نی یە بەلامانەوە،

---

[1] تەفسیرەكەلەسەر ئەمەیە: ﴿ لكم﴾ خەبەرە بۆ ﴿كانت﴾ ئیسمە بۆی، ﴿حسنة﴾، ﴿في إبراهيم﴾ سیفەتن بۆ ﴿أسوة﴾ بێجگە لەوە بە چەند جۆریٚ تریش تركیب كراوەو هەموو ئەگونجیٚ ودروستن و مەبەستەكان نزیكن لە یەكەوە، وشەی ﴿أسوة﴾ ناوە بۆ پەیرەوی كراو خەسڵەت و رەوشت بێت یان یەكێكی چاكی پەیڕەوی كراو. جار ئەگەر مەبەست لێرەدا كەسیٚ بێت ئەوە ئەبیٚ بە پیٚی یاسایە بێت لە عیلمی بەلاغەدا كە پێی ئەوتریٚ: ﴿تجرید﴾ كە بەناوبانگە لەو عیلمەداو لای زانایانی ئەو عیلمە.

وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا

---

﴿وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ﴾ پەیدا و ئاشکرا بووە لە ناوەندی ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتی و کینەبەری ﴿أَبَدًا﴾ بە ئێجگاری و بێ برانەوە ﴿حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا﴾ هەتا کاتێ بڕوا ئەهێنن ﴿بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ بە خوا بە تاك و تەنیاو بێ هاوبەش و کۆتایی ئەهێنن لەو ئایینەی کە وان لەسەری. مەبەست بەوانەی لەگەڵ ئیبراهیمن پێغەمبەرانێ بن کە نزیك بوون لە چەرخی خۆیەوە، یان بڕوادارانێ بن کە لە پاش دا پەیدا بوون، چونکە وا دەرئەکەوێ لە مێژووەوە، ریوایەتێکیشی لەسەرە کە لەو کاتی بەربەرەکانێ‌ی ئیبراهیم دا لە یەکەم جارەوە خۆی تاق و تەنیا بووبێ، ئەوپەڕی ئەوەیە تەنیا سارە خاتوونی هاوسەری لەگەڵ بووبێ، بە هەر حاڵ و لەسەر هەر بار ئەوا خوای گەورە روونی کردەوە کە رەوشت و کردارو گوفتاریان لەگەڵ کەس و کاریان – کە بێ بڕواو دوژمنی ئایینی خوا بوون – بەو جۆرە توندو تیژ بووە، پچڕان و جیا بوونەوەیەکی رێك و راست و بێ پێچ و پەنا پەیدا بوو لە ناوەندی ئەمان و ئەوان دا لە پێناوی عەقیدەو ئایینی خوادا، ئینجا خوا فەرمان ئەدات لە بڕوادارانی ئەم ئوممەتە هەتا هەتایە ئەو رەوشتە پاکە بگرنە گەردن و ئەو رێگا راستە بدەنە بەر، هەموو رەوشتەکانی ئیبراهیم و ئەوان بە چاك دائەنێ و دەست نیشان ئەکات بە پەیڕەوی کردنیان ﴿إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ مەگەر تەنیا قسەی ئیبراهیم کە وتی بە باوکی: ﴿لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ﴾ سوێند بەخوا داوای لێ خۆش بونت بۆ ئەکەم، ئەو قسەشی کرد لەبەر ئەوە بوو هێشتا روون نەبوو بۆی کە باوکی دوژمنی خوایە و هەرگیز بڕوا ناهێنێ، دوای ئەوە ئەوەی بۆ دەرکەوت یەخەی خۆی لێ هەڵتەکاند، وەکو لە سورەتی ﴿التوبة﴾ دا ئەیفەرموێ، کەواتە ئەو قسە هەرچەند گوناه نەبووە، بەڵام رەوشتێکی چاك نەبوو کە شایانی پەیڕەوی کردن بێت، چونکە لە رووی

راستی دا بە بێ جێ دەرچوو، بێجگە لەوەش ئەو قسەیە سۆزو بەزەیی و دۆستایەتی ئەگەیەنێ، کە ئەوەش نابێ بەکار بهێنرێ لەگەڵ دوژمنانی خواو ئاییینی خوادا، ئینجا ئیبراهیم ئەمەیشی فەرمو: ﴿وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ﴾ واتە داوای لێ خۆش بوونت بۆ ئەکەم لە کاتێك دا کە من هیچ شتێکم بەدەست نی یە بۆ تۆ لەلایەن خواوە، ناتوانم بەرگری هیچ سزایەکت لێ بکەم، ئەم فەرمودەیە هەرچەند لە خۆی دا شتێکی راست و رەوایە، بەڵام لێرەدا بەستراوە بە قسە پێشووەکەوەو وایش ئەگەیەنێ ئەگەر شتی بەدەست بوایە دریغی نەئەکرد لە باوکی، ئەوەش سۆزو خۆشەویستی و دۆستایەتی نیشان ئەدات، کەواتە ئەم قسەش ماڤ ئەوەیە بپێچرێتەوە بە قسەکەی ترو جووت کرێ لەگەڵی و لەو رەوشت و قسە چاکانە دەرکرێ کە شایستەی پەیڕەوی کردنن.

ئینجا ئەچێتەوە سەر باسی ئیبراهیم و ئەوان و نزاو پاڕانەوەکەیان باس ئەکات کە سەراسەر مل کەچی یە بۆ خواو پەنا پێ بردن و پشت پێ بەستنە، ئەفەرموێ: ﴿رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا﴾ وتیان ئەی پەروەردگارمان تەنیا پشتمان بە تۆ بەستووە، ﴿وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا﴾ تەنیا بۆ لای تۆ رووومان کردووەو گەڕاوینەتەوە، ﴿وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ تەنها بۆلای تۆیە گەڕانەوە لە رۆژی دواییدا، ﴿رَبَّنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ مەمانگێڕە بەهۆی سەر لێ شێوان و سەرگەردانی بۆ ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە، واتە ئەوانە زاڵ مەکە بەسەرماندا تا ئەوە ببێ بەهۆی گومڕایی یان، چونکە ئەو کاتە ئەڵێن: ئەگەر بڕوا بە خوا بەکار بهاتایە و بڕوادارانی پارێزگاری بکردایە ئێمە زاڵ نەئەبووین بەسەریان دا، ئەو قسە ناڕەواو زۆر جار دێت بە دڵی نەفام و نەزان دا کاتێ ئەبینن ستەمکار زاڵ ئەبێ بەسەر بڕواداردا، ناڕەوایی بەسەر رەوادا، ﴿وَٱغۡفِرۡ لَنَا﴾ لێمان ببورە و هەڵەمان داشارە. ئیبراهیمی خەلیل ئەوە ئەڵێ و ئەو نزایە ئەکات، لەبەر ئەوەی تێگەیشتووە لە رادەو کەم و کوڕی ئەو خواپەرستی یەی کە ماڤ خوایە بەسەریانەوە، دەست پاچەیی بە هۆی نادەمێتی یەوە لە گەیشتنی بە رادەیەك کە هاوتایی و چاکەو بەهرەکانی خوا بکات، بەهۆی ئەوەوە داوای لێ بوردن ئەکات لە خوای خۆی، تا لە هەست وداوادابێ بە پەیڕەوی کراو بۆ ئەوانەی وان لەگەڵی و ئەوانەی کە لە داهاتوودا دێن.

رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ ۚ وَمَن
يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦﴾ ۞ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً ۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٌ ۚ
وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾

---

ئینجا نزاو پاڕانەوەکەی دوایی ئەهێنێ بە دوو سیفەتی خوا کە ڕێکە لەگەڵ داواکەی دا، ئەفەرموێ: ﴿رَبَّنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڕاستی تۆیت بە دەسەڵات و زاڵی لێزانی کاردروست. ئینجا باسی پەیڕەوی کردنی ئیبراهیم و ئەوان دووبارە ئەکاتەوە بۆ زیادە هاندانی بڕواداران لەسەر ئەو پەیڕەوی کردنە لەبەر ئەوە لە سەرەتاوە سوێند ئەخوا ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ سوێند بەخوا هەبوو بۆ ئێوە لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵی بوون ڕەوشتی چاك کە پەیڕەوی بکەن و بێجگە لەو سوێند لەسەر خواردنە لەم جارەدا دەست کاری یەکی دڵی بڕواداران ئەکات بە جۆرێ ئەیانهێنێتە پەرۆش بۆ ئەو پەیڕەوی کردنەی، ئەفەرموێ: ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ﴾ ڕەوشتێکی چاکتان بۆ هەیە کە بۆ کەسێکە لەم جیهانەدا بە تەمای خواو پاداشتی ڕۆژی دوایی بووبێت، چونکە بەڕاستی ئەو کەسە نرخی ئەو ڕەوشتە چاکە ئەزانێ، تێ ئەگات لە گرنگی ئەو تێکۆشان و فیداکاری یەی کە ئیبراهیم و ئەوان پێ ی هەڵسان لە ڕێگای خواو ئایینی خوادا، ئەو کەسە باش ئەزانێ کە پێویستە لەسەر بڕواداران ئەو پەیڕەوی کردنەو لانەدان لەو ڕێگا ڕاستە، بێگومان واز هێنان لەو ڕەوشتە شیرینەی ئەوان لادان لەو ڕێگا ڕاستە بێ بڕوایی و بەد عەقیدەیی ئەگەیەنێ وەکو وەرنەگیرێ لەم هەڕەشە سامناکەی کە ئاراستەی بێ بڕوا ئەکرێ و مافی ئەوانە ﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ هەرکەس ڕوو وەرگێڕێ لەو بەرنامەیە و پشتی تێ بکات. ئەو کەسەی کە ئەیەوێ لابدا لە ڕێگای ئیبراهیم و ئەوان بێگومان خۆی زیان ئەکات خوا هیچ پێویست نییە پێی ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ چونکە بەڕاستی تەنها خوایە بێ پێویستی شایان بە سوپاس و ستایش. لێرەدا گەشت و ئاوڕدانەوەکە دوایی هات، بڕواداران گەڕانەوە بۆ سەرەتای مێژووی دوورو درێژی

خۆیان، بەو یادو بیرەوەری یەوە گەڕانەوە، بەرنامەو کارو فرمانی خۆیانیان زانی و ناسی، زانیان کە ئەمان یەکەم ڕێبواری ئەو ڕێگایە نین، بەڵکو هەر لە کۆن و یەکەم جارەوە بڕواداران هەر بەم ڕێگەدا هاتوچۆو گوزەریان کردووە، کەواتە با هیچ بڕوادارێك خۆی بە تەنیا و غەریب دانەنێ، بەڵکو یەکێکە لەو کاروانە گەورەی کە بە درێژایی مێژووی ئادەمی وا هاتووە. کەواتە با هەموو بڕواداری ئەرك و باریْ کە خراوەتە سەرشانی بە سووکی سەرنج بدات ماتولْ ئەم تەنیا نی یە و کارەکە هەر وا هاتووە.

بڕواداران بە راستی رەوشتە شیرینەکەی ئیبراهیم و ئەوانیان دایە بەرو بێزاری و دوژمنایەتی خۆیانیان دەربڕی دەربارەی کەس و کارو براو باوکیان، بێگومان ئەوەش شتێکی زۆر قورسە لە دەروون دا، لەبەر ئەوە ئاواتە خوازبوون و ئارەزووی ئەوەیان ئەکرد خوا کارێکی وا بکات، ئەم دوژمنایەتی و بێزاری یە نەهێڵێ، ئەوان راستیان کرد لەگەڵ خوای خۆیان دا، خوایش ئەو دەروونانەی فێنك و پاراو کردەوە بە نەسیمی تەڕو ناسکی ئومێد و چاوەڕوانی ئەوە ئەو دوژمنایەتی یە نەهێڵێ لە ڕێگای بڕواهێنانی ئەو دۆستانەو تێکەڵ بوون و کۆبوونەوەیان لەژێر ئاڵای ئیسلام دا، کەواتە ئەوەیە ڕێگای لاچوون و نەمانی ئەو بێزاری یە و پەیدا بوونی خۆشەویستی لەسەر بنەڕەتی بەهێزو دامەزراوی خۆی، فەرموی: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ﴾ ئومێدە خوا خۆشەویستی و دۆستایەتی فەراهەم بێنێ لە ناوەندی ئێوەو ئەوانەی دوژمنایەتیتان لەگەڵ کردن لە بێ بڕواکانی مەککە. هیواو ئومێد لەلایەن خواوە مەبەست بەڵێن و بڕیاری تەواوە بە بەدی هێنانی، ئەو بڕوادارانەی ئەمەیان بیست بە ڕێکی دڵنیا بوون پێی، ئومێد و ئاواتەکەشیان بەدی هات بە ماوەیەکی کەم، ئەوە بوو مەککە گیراو قورەیش موسڵمان بوون، هەموو لە ژێر ئاڵایەك دا کۆبوونەوە، ئەو هەموو کینەبەری و خوێن خواری یە بە جاریْ پێچرایەوەو دروشمیشی نەما، هەموو بوون بە برای گیانی بە گیانی. ﴿وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ﴾ خوا توانایە هەرچی ویست ئەیکات، ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ خوا زۆر لێ بوردەو لێ خۆش بووە لە هەڵەتان، لە تاوان و خراپەی ئەوانەی موسڵمان ئەبن، زۆر بە بەزەیی یە و میهرەبانە پێتان.

لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾

---

ئینجا هەمیتر باری شانی سوك كردن پێش ئەوەی بەڵێنەكەی بەدی بێنێ، بەم رەنگە رێگای بەرەلاكرد بۆیان بە چاكە كردن و دادپەروەریی لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەی كە جەنگیان لەگەڵ نەكردوون لە دین داو دەریان نەكردوون لە ولاتی خۆیان، كە ئەمەشی گێڕا بە یاسایەكی گەورەی ئیسلامی لە بارەی پەیوەندی لەگەڵ بێ بڕوایان دا بە شێوەی گشتی، چ بۆ ناوخۆی ولاتی ئیسلام و چ بۆ دەرەوەی، فەرموی: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا بەرگریی و جڵەوگیریتان ناكات موسڵمانەكان ﴿عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ﴾ لەوانەی كە جەنگیان لەگەڵ نەكردوون ﴿فِى ٱلدِّينِ﴾ لەدیندا ﴿وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ﴾ دەریان نەكردوون لە ولاتی خۆتان، جڵەوگیریتان ناكات لەوەی ﴿أَن تَبَرُّوهُمْ﴾ چاكەیان لەگەڵ بكەن ﴿وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ﴾ داد بنوێنن لەگەڵیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ چونكە بەڕاستی خوا كەسانێكی خۆش ئەوێ كە دادگەرن. بێگومان ئیسلام ئایینی ئاشتی یە، عەقیدەی خۆشەویستی یە، رژێمێكە ئامانج و مەبەستی ئەوەیە كە سایەو سەمەندی بكەیەنێ بە هەموو جیهان و جیهانیان، بەرنامە راست و رەواكەی خۆی راگیر بكات لەناوا، هەموو بە برایەتی و خۆشەویستی كۆ ببنەوە لە ژێر ئالاكەی دا، هەر كات ئەوانەی كە موسڵمان نین دانیشتن و دەست درێژیی نەكەن و ئاشتیان بوێ لەو كاتەدا ئیسلام بە هیچ رەنگ ئارەزووی ئاژاوە ناكات و جەنگ و كوشتاری ناوێ، تەنانەت لەكاتی ئاژاوەیش دا بەشی ئاشتی و خۆشەویستی ئەهێڵێتەوە بە راستی و دادو رەوشت پاكی، بە ئومێدو چاوەڕوانی ئەوەی رۆژێ بێت كە دوژمنەكەی دڵنیا ببێ كە پیت و فەڕو خۆشی لەوەدایە بێتە ژێر ئالا بەرزەكەی، ئیسلام نائومێد نی یە لە هاتنی رۆژێكی وا كە دەروونە چەوتەكانی تیادا راست ببێتەوە، بەهۆی ئەوەوە ئەو رێگا راستە بداتە بەر. بەڵێ ئەگەر دوژمن هەر لاری و نالەباری بەكار هێناو گوێی شل نەكرد بۆ ئەو هەموو پەندو ئامۆژگاری و بەڵگەو رابەرە روونانە، دەست درێژیی كردە سەر ئیسلام و موسڵمانان، ئەو كاتە زۆر ناڕاست و ناڕەوایە دۆستایەتی و خۆشەویستی بەكارهێنان لەگەڵ ئەو دوژمنانە، لەبەر ئەوە

ئەم جڵەوگیریی و هەڕەشە سامناکەی ئاراستە کردو کردی بە بەشی دووەم لە یاسا گشتی یە گەورەکەی ئیسلام و فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يَنْهَـٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ﴾ خوا بەرگری و جڵەوگیرییتان ئاکات لەوانە نەبێ کە ﴿قَـٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ﴾ جەنگیان لەگەڵ کردن لە دینەکەتاندا، ﴿وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ﴾ دەریـان کـردن لـە وڵاتەکـەتان، ﴿وَظَـٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ﴾ پـشت گـیرو یارمـەتی یـان دا لەسـەر دەرکردنیان، جڵەوگیریی و بەرگریتان ئەکات ﴿أَن تَوَلَّوْهُمْ﴾ لەمەی دۆستایەتی یان لەگەڵ بکەن، ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُمْ﴾ هەرکـەس دۆسـتایەتی یـان بکـات ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ ئـا ئەوانـەن سـتەمکاری راسـتەقینە، سـتەمکارن چـونکە لـە جێگـای دوژمنایـەتی و بێـزاری دا دۆسـتایەتی و خۆشەویستی بەکار ئەهێنن، ستەمکارن لە خۆیان، خۆیان ئەخەنە بەر خەشم و سزای خوا، بەڕاستی ئەمە هەڕەشـەیەکی زۆر سامناکە، دڵی بڕواداری پێ دائەچڵەکێ، چونکە وشـەی ﴿ظالم﴾ لە قورئان دا زۆرتر بەکار ئەهێنرێ بۆ بت پەرست و کافر. ئەم یاسایە لە بارەی جوڵانەوەو رەفتار کردن لەگەڵ غەیرە موسڵمان دا راست ترین یاسایە، رێك و پێکە لەگەڵ سروشتی ئەم ئایینە گشتی یە جیهانی یەدا، رێکە لەگەڵ تێڕوانین و سەرنج دانی بۆ ژیانی ئادەمی و ئەم بوون و بوونەوەرە.

ئەم یاسا راستەیە بناغەو بنەڕەتی شەریعەتە میری یەکەی ئیسلام، کە موسڵمان یەك بار ئەکات لەگەڵ هەموو کەس دا بە ئاشتی و خێر خواهی چاکە و پیاوەتی دادپەروەری، لەم بارە ناگۆڕێ مەگەر بە بەرپابوونی دەست درێژیی و جەنگ و ناچاربوون بە بەرگری و بەرپەرچ دانەوەی، یان بەهۆی مەترسی لە ناپاکی و هەڵوەشاندنەوەی پەیمان لەلایەن ئەوانەی پەیمانیان لەگەڵ کراوە، ئەوەش هەڕەشەیە بە دەست درێژیی کردن، یان بەهۆی وەستان بە هێزو چەك و رێگا گرتن لە بانگ کردن بۆ رێگای خواو ئازادی و سەربەستی عەقیدەو باوەڕ، ئیتر بێجگە لەم کاتانە موسڵمان ئەبێ بەرامبەر هەموو بێ بڕواکان لەسەر ئەو تەنیا بارە بێت کە باس کرا.

ئینجا ئەم یاسایە رێك و پێکە لەگەڵ بۆچوونی – تصور – لە ئیسلامدا، کە مەسەلەی ناوەندی بڕواداران و بێ بڕوایان ئەکات بە یەك مەسەلە و یەك شت کە بریتی یە لە تەنیا ئەم بیرو باوەڕو عەقیدەیەو ئیتر بەس، تەنیا ئەمە ئەکات بە مەبەستێ کە بڕوادار دەستی بەسەردا بگرێ و دوژمنایەتی و جەنگ و کوشتاری لەسەر بکات، کەواتە هیچی تر نی یە لە ناوەندیان ئاژاوەو جەنگی لەسەر بکەن تەنیا سەربەستی و ئازادی بیروباوەڕو عەقیدە نەبێ

و بانگ کردن بۆلای خواو پێك هێنانی بەرنامەی خوا لە زەوی دا، بەرزکردنەوەی تەنیا وشەو ئایینی خوا.

ئەم سورەتە سەرتا بە خواری بەرەو ئەوە ئەڕوا کە تەنیا عەقیدەو بیروباوەڕ شتەو نرخ بۆ ئەوە، تەنیا ئەوە بکرێ بە ئاڵایەك کە موسڵمانان لە ژێری دا کۆببنەوە. ئینجا هەرکەس هاتە ژێر ئەو ئاڵایە ئەو کەسە لەوانە، هەرکەس جەنگ و دوژمنایەتی لەگەڵ کردن ئەو کەسە دوژمنیانە، هەرکەس ئاشتی بەکاربێنێ بەم رەنگە واز لە خۆیان و عەقیدەو بیرو باوەڕیان بێنێ، بەرگرییان نەکات لە بانگ کردن و بانگەوازەکەیان و نەبێ بە بەرهەڵستی بیستنی، ئازارو سزای موسڵمانان نەدا لەسەری، هەرکەس ئا بەو جۆرە بێت ئیسلام ئەو کەسە بە ئاشتی خواز دائەنێ، جڵەوگیریی موسڵمانان ناکات لە چاکەو پیاوەتی و داد لەگەڵی.

موسڵمان ئەبێ لەم زەوی یەدا بژی بۆ عەقیدەکەی، ئەبێ تەنها ئەوە بکات بە مەبەست و مەسەلەی خۆی، بۆ خۆی و بۆ هەموو کەسی تر، کەواتە نابێ تێ گیران و ئاژاوەی ببێ لەسەر هیچ بەرژەوەندی یەکی تر لەم جیهانەدا، تێکۆشانی نەبێ لە پێناوی هیچ رەگەزایەتی یەك دا، نە تیرەو گەل و بەرەو نە خاك و وڵات، نە رەنگ و زمان و نەژاد، تێکۆشانی بەس بۆ ئەوە بێت کە ئایین و وشەی خوا بەرزتر بێت، ئایین و عەقیدەکەی بەرنامەیەکی بەدی هێنراو بێ لە ژیاندا. لە پاش دانانی ئەم یاسایە سورەتی ﴿التوبة﴾ هاتە خوارەوەو جاڕی بەری بوونی خواو پێغەمبەری (ﷺ) دا لەو بت پەرستانەی کە پەیمانیان لەگەڵ کرابوو، بەوە دوایی هات حاڵەتی پەیمان و وازهێنان لە یەکتر لە نێوان موسڵمانان و ئەوان دا. لە پاش مۆڵەتدانی چوار مانگ بۆ ئەوانەی کە ماوە دیاریی نەکرابوو بۆ پەیمانەکەیان، مۆڵەتدانی ئەوانەی ماوە دیاریی کرابوو تا دوایی هاتنی ماوەکەیان، بەڵام ئەوە هەمووی لە پاش ئەوە بوو کە بە چەند تاقی کردنەوە دەرکەوت و روون بووەوە کە ئەو هاوبەش بڕیار دەرانە هیچ گوێ یان نی یە لە پەیمان و رەفتاری پێ ناکەن. مەگەر تا کاتێ هەلێکیان بۆ هەڵئەکەوێ بۆ هەڵوەشاندنەوە کە بزانن قازانجیان لەوەدایە، کەواتە ئەوانە ئەبێ ئەم یاسایان بۆ بەکار بهێنرێ کە ئەفەرموێ:

﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴾[1] ئەوەش شتێکی پێویستە و ناچاری هەیە بۆی بۆ نەهێشتنی مەترسی و جێگیر کردنی ئاسایش لە وڵات و مەڵبەندی

---

[1] واتە ئەگەر مەترسی ناپاکیتان ئەکرد لە لایەن گەلێکەوە کە پەیمانتان لەگەڵ بەستبوون پەیمانەکەیان بۆ فڕێ بدەنەوە لەسەر دادو بارو رێگای راست و تێ یان بگەیەنن کە پەیمان نەماوە لە نێوانمان دا، بەڕاستی خوا ناپاکانی خۆش ناوێ. سورەتی ﴿ الأنفال / ٥٨ ﴾.

ئیسلام دا، که لەو کاتەدا نیوە دورگەی عەرەب بوو بۆ بەربەست کردنی ئەو دوژمنانەی کە لەو ولاتەدا بوون و لەگەڵ موسڵمانەکان ئەژیان چ بت پەرست و چ ئەهلی کیتاب. هەمیشە خەریکی پیلان بوون و بە دوای هەلێك ئەگەڕان بۆ لێدانی ئیسلام و موسڵمانان، زۆرجار ناپاکی و بێ پەیمانی یان لێ دەرکەوتبوو. ئەوەش لە راستی دا دەست درێژیی بوو، ئەبێ یاسای دەست درێژیی لەگەڵ دا بەکار بهێنرێ، بە تایبەتی ئەو دوو ئیمپراتۆریەتەی کە دەوری خاکی ئیسلامی دابوو خەریکی کود کەڵەك و پەلاماردان بوون و هەستیان کردبوو کە ئیسلام مەترسی لێ ئەکرێ بۆ سەر گیانی ئەوان، هەمیشە هانی ئەو میری یە عەرەبانەیان ئەدا لێ یان کە بەسەر سنووری ولاتی ئیسلامەوە بوون و لە ژێر دەستی خۆیان دا بوون و مل کەچیان بوون، کەواتە هیچ چارەیەك نەما ئەبێ ناوخۆی ولاتی ئیسلام پاك بکرێتەوە لەو دوژمنانە پێش ئەمەی جەنگی گەورەی دەرەوە روو بدات، کە لەو رۆژەدا چاوەڕوانی ئەکرا.

بەم ئەندازە کۆتایی ئەهێنین و ئیتر ئەگەڕێینەوە بۆ سەر سورەتەکە بۆ ئەمەی حوکم و بڕیاری ئەو ئافرەتانەمان بۆ بۆ دەرکات کە بڕوایان هێناوەو لە مەککەوە کۆچیان کرد لە دوای پەیمانی حودەیبی یە وەکو لە کتێبی سیرەت و حەدیس دا ئەفەرموێ لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتەی کە دێن، زانایان ئەفەرمون: لە پاش پەیمانی حودەیبی یە کە بەندێ لە بەندەکانی ئەوە بوو: هەرکەس لە قورەیش بڕوا بۆ مەدینە با موسڵمانیش بێت ئەبێ وەرنەگیرێ و بدرێتەوە بە قورەیش. ئینجا کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ موسڵمانەکان لە پێ پێینی حودەیبیەدا بوون چەند ئافرەتێکی بڕوادار هاتن و ویستیان کۆچ بکەن و بێنە ولاتی ئیسلام لە مەدینە، قورەیش هاتن و داوایان کرد بیاندەنەوە بە پێی دیمەنی پەیمانەکە، بەلام ئەو بەندە روون و ئاشکرا نەبوو لەبارەی ئافرەتەوە، بەڵکو بۆ پیاو روون و ئاشکرا بوو، بەهۆی ئەوەوە ئەم دوو ئایەتە هاتە خوارەوە جڵەوگیریی کرد لە گێڕانەوەی ئافرەتە بڕوادارەکان بۆلای بێ بڕواکان، کە سزا بدرێن لەسەر ئاین و بڕواکەیان لە کاتێك دا کە ئافرەت بێ دەسەلات و لاوازن. لەگەڵ ئەوەدا چەند حوکم و بڕیارێکی دەوڵەتی دا سەبارەت بەو جۆرە ئافرەتانەی کە باس کران، رەفتارو کردەوەی دیاریی کرد لەسەر راست ترین بنەڕەت و یاسا کە دادی بەکار هێناوە بە بێ ئەمەی گوێ بێ لە جەورو ستەمی دوژمن. ئەوەش بە پێی ئەو رێگا راستەی کە ئیسلام داویەتی یە بەر لە هەموو رەفتارو کردەوەو مامەڵەیەکی ناوخۆو دەرەوەو دەوڵەتیدا،

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ

**ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ﴾ کاتێ هاتن بۆلاتان ئافرەتە بڕوادارەکان بە کۆچکەری ﴿فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ﴾ تاقییان بکەنەوە، ئەو تاقی کردنەوەش بەم جۆرە کە ئیبن عەباس ئەفەرموێ: بڵێ بە خوا لە رق و قینی مێرد نەهاتووم، بە خوا بە نیازی دەرچوون لە خاکێ بۆ خاکێ تر نەهاتووم، بە خوا نەهاتووم لەبەر خۆشەویستی خواو پێغەمبەر نەبێ. عیکریمە ئەفەرموێ: پێی ئەوترا: سوێند بخۆ کە هیچ تۆی نەهێناوە خۆشەویستی خواو پێغەمبەر نەبێ، سوێند بخۆ کە دڵت نەچووبێ لە یەکێکی ئێمە، سوێند بخۆ کە لە دەستی مێرد هەڵنەهاتووی.**

**ئا بەم جۆرە بووە تاقی کردنەوەکەیان، ئەوەش بە پێی دیمەن و رواڵەتی حاڵیانەوە بە پێی قسە و سوێندی خۆیانە، ئیتر کەس ئاگای لە دڵ و دەروونیان نییە ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ﴾ خوا زانا و ئاگادارە بە بڕوای ئەو ئافرەتانە، ﴿فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ﴾ ئینجا ئەگەر زانیتان ئەو ئافرەتانە بڕوادارن، واتە ئەگەر بە پێی قسە و سوێندەکەیان وا چووە دڵتانەوە کە راست ئەکەن و بۆ خوا هاتوون ﴿فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ﴾ مەیانگێڕنەوە بۆ لای بێ بڕواکان چونکە ﴿لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ﴾ نە ئەو ئافرەتانە ئیتر حەلاڵن بۆ مێردە بێ بڕواکانیان، ﴿وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ﴾ نە ئەو پیاوە بێ بڕوایانەش حەلاڵ ئەبن بۆئافرەتەبڕوادارەکان، کەواتەنیکاحەکانی لەوەوبەرهەڵئەوەشێتەوەو هیچ نیکاحێکی ئێستا بەدواوە دانامەزرێ لە ناوەندی پیاوی بێ بڕواو ئافرەتی بڕواداردا.**

**ئەم دوو تاقمە پچڕاون لە یەکترو یەکەم هۆی پەیوەستی - کە عەقیدەو بڕوایە - نی یە لە نێوانیان دا، کەواتە هیچ هۆیەکی تر جێگای ئەو یەکەم هۆیە ناگرێتەوە و نایانبەستێتەوە پێکەوە، حەلاڵ و هاوسەری کە تێکەڵی و پێکەوە نووسان و دامەزرانە، ناگونجێ و بەسەر نابرێ کاتێ ئەو یەکەم هۆیە نەبێ یان بپچڕێ. عەقیدەو بڕوا هۆی ژیانی دڵەو هیچ سۆزو ئارەزوویەکی تر جێگای ناگرێتەوە، کەواتە هیچ دڵێکی بڕوادار ناتوانێ بەر حوکم و ژێر دەستە بێ بۆ بێ عەقیدەو بێ بڕوا، بە خۆشی و ئارام و ئولفەت و خۆشەویستی یەوە ژیان بباتە سەر، ژن و مێردییش حەق وایە سەراسەر بە خۆشەویستی و سۆزو بەزەیی و ئارام و ئولفەت بەسەر ببرێ.**

وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟

**ئەم قەدەغەیە هەر لە یەکەم جارەوە نەکرا، چونکە گەلی موسلمان هێشتا دانەمەزرابوو، بنەڕەت و پایەکانی جێگیر نەکرابوو، بەڵام لەپاش پەیمانی حدیبیة دامەزراو جێگیر بوو، کەواتە کاتی ئەوە هاتە پێشەوە کە ئەو جیابوونەوە بەکار بهێنرێ و لە دەروونی بڕواداردا ئەوە جێگیر ببێ کە هیچ هۆی یەکێتی و پەیوەستی یە نرخی نی یە بێجگە لە بڕواو عەقیدە کە یەکەم سەردەستەیە.**

**ئینجا بە پێی دادو یەکسانی یە کە ئیسلام دای هێناو پێی هەڵسا هەرچۆنێ ئەو نیکاح و ژن و مێردی یەی هەڵوەشاندەوە، هەروەها بڕیاری بژاردنی ئەو مارەیی یەی کە درابوو لەلایەن مێردی بێ بڕواوە بۆ ئافرەتە بڕوادارەکە، هەروەها ئەو مارەیی یەی کە مێردی بڕوادار دابووی بە ژنی بێ بڕوای. ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟﴾ بدەن بە مێردە بێ بڕواکان ئەو مارەیی یەی کە خەرجیان کردبوو بۆ ژنە بڕوادارەکان.**

**ئینجا لە دوای ئەوە حەڵاڵە خواستنی ئەو ئافرەتە کۆچ کەرانە بە مەرجێ مارەیی یان بۆ دانێن، ئیتر ئەم مارەیی یە شتێکە مافی ئافرەتەکەیە و جیاواز لە بژاردنی مارەیی یەکەی تری، وەکو زۆربە و رای بەهێزی لەسەرە، یان بۆ ئەمەیە بدرێ لە باتی مارەیی یە بژێرراوەکەدا، وەکورای کەم و بەهێزی لەسەرە. ئەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە لەمەدا ﴿أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ ئەو ئافرەتە کۆچ کەرانە مارە بکەن ﴿إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ کاتێ مارەیی یەکانیان بدەنێ.**

**ئینجا ئیتر ئایا ئەوانە عەقیدەیان هەیە یان نی یە بۆ سك پڕەکانیان نەبێ کە عدەیان منالْ بوونەکەیانە؟ ئەگەر ئەوانی تریش عیدەیان ببێ ئایا عیدەی تەڵاق دراویان ئەبێ، یانَ تەنیا حەیزێ بەسە کە نیشانەی نەبوونی سکە؟ ئەوانە هەموو زانایانی ئیسلام باسیان کردوون و دووبەرەکی یان هەیە تیایان دا، ﴿وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ﴾ دەست مەگرن بەسەر هیچ لە ئافرەتە بێ بڕواکان دا و مەمێننەوە لەسەر نیکاحیان، هیچ جۆرە پەیوەندی ژن و مێردییان نەمێنێ لەگەڵیان، ئیتر چ ئەو ئافرەتانەی کۆچیان نەکردووەو بە بێ بڕوایی مانەوە**

له مەککە چ ئافرەتیٚ لە پاش موسڵمان بوون هەڵگەڕابێتەوە لە ئیسلام ﴿وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ﴾ داوا بکەن – ئەی موسڵمانەکان – ئەومارەیی یەی کەخەرجتان کردو داتان بە ژنە بیٚ بڕواکانتان. ﴿وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ﴾ با مێردە بیٚ بڕواکانیش داوای ئەو مارەیی یە بکەن کە خەرجیان کردو دایان بەو ئافرەتانەیان کە کۆچیان کردو هاتنە ریزی بڕواداران. ئینجا حوکم و بڕیارەکان پەیوەست ئەکات و ئەیبەستێتەوە بە چاودێریی و ئاگاداریی خواو سام و ترس لە خوا کە ئەوەش دڵ و دەروونی بڕواداران وریا ئەکاتەوە و بە ئاسانی گوێڕایەڵی ئەکەن، ئەفەرمویٚ: ﴿ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِۖ﴾ ئەوەی کە باس کرا بۆتان بڕیارو حوکمی خوایە، کەواتە ئەبیٚ مل کەچ بن بۆی، ﴿يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۚ﴾ بڕیار ئەدا لەناوتان دا، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ خوا ئەوپەڕی رادە زانای لێزانی کاردروستە، کەواتە هەر بڕیارێکی راست و دروست و بەجیٚ یەو هەرکەس ژیریی لەکار نەکەوتبیٚ ئەبیٚ گوێڕایەڵ بێت و نابیٚ سەرپێچی لیٚ بکریٚ. بڕیارەکە بڕیاری خوای پەروەردگارە، بڕیاری زانای کاردروستە، بڕیاری کەسێکە کە ئاگای لە ترپەی دڵە، بڕیاری بەهێزی دەسەڵات دارە، بەڕاستی بەسە بۆ بڕواداری راستەقینە هەست بکات بەوە، بیر بکاتەوە لە سەرچاوەی ئەو فەرمان و بڕیارە بۆ ئەمەی رێك و راوەستیٚ لەسەری و پارێزگاری بکات، لە کاتێك دا کە بڕوادارێشە بە گەڕانەوەی بۆلای ئەو خوایە لە رۆژی دوایی.

ئینجا ئەگەر بیٚ بڕواکان مل پێچی بکەن لە دانەوەی مارەیی بە مێردە موسڵمانەکان ئەو کاتە ئەبیٚ کاربەدەستی موسڵمانان بۆیان ببژێریٚ لەو مارەیی یەی کە مافی بیٚ بڕواکانە، یان لە دەست کەوتی ماڵی بیٚ بڕواکان کە لە جەنگ دا بگیریٚ، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾ ئەگەر لە دەستتان دەرچوو یەکیٚ لە ژنەکانتان و چوو بۆلای بیٚ بڕواکان و سەرپێچی یان کرد لە گێڕانەوەی مارەیی یەکە بۆتان ﴿فَعَاقَبۡتُمۡ﴾ ئینجا نۆبەی ئێوە هات بۆ دانەوەی مارەیی بیٚ بڕواکان ﴿فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم﴾ ئەو کاتە ئەی موسڵمانەکان بدەن بەوانەی ژنەکانیان رۆیشت بۆلای بیٚ بڕواکان ﴿مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ﴾ وێنەی ئەوەی خەرجیان کردووەو داویانە بە ژنە بیٚ بڕواکانیان[1]،

---

[1] وشەی ﴿ شيء ﴾ تەفسیر کراوەتەوە بە شتێك لە مارەیی نەك بە ئافرەتە خاوەن مارەیی یەکە، کەواتە لەسەر باری یەکەم ﴿ من ﴾ بۆ بەیانە و لەسەر ئەم بارە بۆ ئیبتدایە، هەروەها ﴿ عاقبتم ﴾ تەفسیر کراوەتەوە بە تۆڵە سەندن بە جەنگ کردن لەگەڵیان و ماڵ گرتنیان بە هەردوو هەریاشەو ئەگونجیٚ، زانین لای خوایە.

وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾

---

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ لەخوا بترسن وخۆتان بپارێزن لە سەرپێچی و نافەرمانی ﴿الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ ئەو خوایەی کە ئێوە بڕوادارن پێی بە هەمیشەیی، بەڕاستی ئەم جۆرە تەمێی فەرمودەیانە زۆر بەهێزەو بەکارە لە دەست کاری کردنی دڵ و دەروون‌دا.

ئا بەم جۆرو شێوەیە بڕیار هاتە خوارەوە بە جیابوونەوەو پچڕانی تەواو لە ناوەندی ژن و مێردی کە پەیوەستی و پەیوەندی بڕواو عەقیدەیان نەمابێ و پچڕابێ لەبەر بەدی هێنانی ئەوەی ئیسلام داوای ئەکات و ئەیەوێ لە ژیاندا. کە بریتی یە لە یەکێتی ریزی موسڵمانان و جیابوونەوەی لە هەموو ریزو کۆمەڵێکی تر، بریتی یە لە دامەزراندن و راگیر کردنی ژیان لەسەر بنەڕەتەکانی عەقیدەو پەیوەستی هەموو کاروباری بە بڕواوە، داهێنان و فەراهەم هێنانی جیهانێکی ئادەمی یانە کە جیاوازی تیرەو رەنگ و زمان و نەژاد و خاك و وڵاتی تیا بتوێتەوە. تەنهایەك نیشانەودروشمێکی تیابێت مەردوم جیابکاتەوە. نیشانەو دروشمی ئەو کۆمەڵەی کە تیایەتی، لەم جیهانەدا تەنها دوو کۆمەڵ هەیە: کۆمەڵی خواو کۆمەڵی شەیتان.

ئینجاروونی ئەکاتەوە بۆپێغەمبەر(ﷺ) کەپەیمان بکات لەگەڵ ئەوئافرەتەوهەمووئافرەتێ ترکەبیەوێ بێتەژێرئاڵاوسایەی ئیسلام ولەسەرچ بناغەوبنەڕەتێ ئەوپەیمانەیان لێ وەرگرێ. ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ﴾ کاتێ ئافرەتە بڕوادارەکان هاتن بۆلات ﴿يُبَايِعْنَكَ﴾ پەیمانت لەگەڵ ببەستن لەسەر ئەم بەندانەی کە دێن:

١- ﴿عَلَىٰ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا﴾ لەسەر ئەوەی هیچ شتێ نەکەن بە هاوبەش بۆ خوا.

٢- ﴿وَلَا يَسْرِقْنَ﴾ دزی نەکەن.

٣- ﴿وَلَا يَزْنِينَ﴾ داوێن پیسی نەکەن.

٤- ﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ﴾ منداڵەکانی خۆیان نەکوژن وەکو باوی لەوەوبەریان کە زیندە بە چاڵیان ئەکردن، هەروەها بە هەر جۆرێ تریش وەکو لەم جاهیلێتی تازەدا کە منداڵ لەبار ئەبەن یا لە چوار مانگ تێپەڕی کردبێ و گیانی کرابێ بەبەردا. بەڵێ پێش ئەوە

دروستە لەبەر هەر هۆیەکی شەرعی وەکو نەخۆشی یان منداڵ زۆری و دەسەلاتی بەخێو کردنیان نەبێ، وەکو باس کراوە بە روونی لە کتێبی زاناکاندا.

٥- ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ﴾ هەڵنەسن بە کردنی بوختانێك ﴿يَفْتَرِينَهُۥ﴾ کە هەڵی ببەستن ﴿بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ لە بەینی دەست و پێی خۆیان دا، ئیبن عەباس و مقاتل و زۆربەی زانایان ئەفەرمون: مەبەست ئەمەیە منالی زۆڵ و حەرام زادەی خۆیان نەکەن بە منداڵی مێردەکانیان، کە ئەو منداڵە کاتێ لە سك دایەو لە نێوان هەردوو دەستی ئافرەتەکەدا، کاتێ ئەیبێ وا لە نێوانی هەردوو قاچی دا، ئینجا بەم شێوەی باس کرد لەبەر ناشیرین کردنی کردەوەکەو تەشەر دان لەوانەی شتی وا ئەکەن و هەڵی ئەبەستن[1].

٦- ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾ یاخی نەبن و سەرکێشی نەکەن لێت لە هیچ فەرمانێکی چاك و شەرعیدا. بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەموو فەرمانێکی رەواو شەرعی بووەو ناگونجێ بە هیچ رەنگ فرمانی بێ شەرعی لێ یەوە رووی دابێ، کەواتە مەبەست ئەوە نی یە کە پێغەمبەر (ﷺ) دوو جۆر فەرمانی بووبێ: شەرعی و ناشەرعی، باش و خراپ و ئەبی لە باش و شەرعی یەکەدا گوێڕایەڵی بکرێ. نەخێر مەبەست ئەوە نی یە، بەڵکو مەبەست زیادە رەوی و توند و تیژیی یە لە جڵەوگیریی لە شتی بێ شەرعی دا، دەست نیشان کردنە بە یاسایەکی گرنگ لە یاسا و دەستوورەکانی ئیسلام، کە ئەفەرموێ: ﴿لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق﴾ هیچ جۆرە گوێڕایەڵی یەك نی یە و نابێ بۆ هیچ دروست کراوێکی خوا لە هەر شتێك دا کە گوناه بێت و سەرکێشی خوای تیا بێت. بە پێی ئەم یاسایە پێشەواو گەل وەك یەك مل کەچ و بەرحوکمن بۆ فەرمان و شەرعی خواو گەل ئەبێ گوێڕایەڵ بێت تەنها لە شتی شەرعیدا کە خوا داینا‌وە بۆ هەمووان.

کاتێ ئافرەتەکان ئەو پەیمانەیان دا بە تۆ ﴿فَبَايِعْهُنَّ﴾ تۆش پەیمانیان لەگەڵ ببەستە ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ﴾ داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکەلە خوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زۆر لێ خۆش بووی میهرەبانە.

---

[1] بێگومان دیمەن و رواڵەتی ئایەتەکە گشتی یە و هەموو جۆرە بوختان و دەست هەڵبەستێ ئەگرێتەوە، لەبەر ئەوە کۆمەڵێکی بەرزلەزانایان هەریەشێوەگشتی یەکەتەفسیری ئەکەنەوە، ئەوکاتەمەبەست بەوشەی ﴿أيديهن﴾ و ﴿أرجلهن﴾ نەفسی خۆیانە وەکو بەو جۆرە بەکار ئەهێنرێ لە زمانی عەرەب دا، لەم کاتەش دا تانەو تەشەر ئەگەیەنێ، واتە لە خۆتانەوە ئەو دەست هەڵبەستە نەکەن.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ ﴿١٣﴾

له كۆتایی سورەتەكەدا ئەم بانگە گرنگەو ئەم جڵەوگیرییە بەهێزە ئەكات، كە زۆر رێك و پێكە لەگەڵ سەرەتاو مەبەست و ئامانجی سورەتەكەدا، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی كەسانێ كە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾ دۆستایەتی مەكەن لەگەڵ گەلێك دا كە خوا قاری لێ گرتن و خەشمی هەیە لەسەریان، ﴿قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ بێگومان بێبەش و نائومێدن لە پاداشت و خۆشی رۆژی دوایی ﴿كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ﴾[1] هەرچۆنێ بێبەش و نائومێد بوون بێ بڕوایانێ كە مردن و لەناو گۆڕدان. واتە هەرچۆنێ ئەوانەی كە بە بێ بڕوایی مردن و چوونە ناو گۆڕ تازە بێبەشن و كاریان تێپەڕی كردو روون بوەوە بۆیان بەش بڕاوی یان.

لە هەندێ ریوایەت دا هاتووە كە مەبەست بەم گەلە جولەكەیە، چونكە ئەم سیفەتی خەشم لێ گیراوی یە بۆ ئەوان بەكار هاتووە لە چەند جێگایەك لە قورئان دا. بەڵام ئەوە بەرگری ناكات لەوەی مەبەست لێرەدا گشتی بێ لە جوولەكە و بت پەرستەكان، كە لەم سورتەدا باس كران، چونكە هەموو دوژمنی خوان، خوا خەشمی هەیە لێ یان. هەموو نائومێدن لە رۆژی دوایی.

خوا بە بەزەیی خۆی بەشدارمان كات بە بەش و خۆشی بەهەشت و بێ بەشمان كات لە بەش و سزای دۆزەخ، آمین.

**و صلى الله و سلم على سيدنا محمد و آله و صحبه**

١٩ ذي القعدة ١٤٠٢ بەرامبەر ١٩٨٢/٩/٧ هەر لەم رۆژەدا دەستم كرد بە سورەتی ﴿الصف﴾ خوا یارمەتی بدات بۆ ئەوەی كە ماوە لە تەفسیری قورئانی پیرۆز.

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر كراوەتەوە هەموو هەر ئەگونجێ و رێكە و هەر جۆرێ رای چەند باوەڕ پێكراوی لەسەرە. خوا باش ئەزانێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ
مَا لَا تَفْعَلُونَ (٢)

## سورەتی (الصف)

## مەدینەیی یەو ١٤ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە بە روونی مەبەست و ئامانجی دوو شتی بنەڕەتی گرنگە، لەگەڵ روون کردنەوەی ئەو دووانەدا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند لق و پۆپێك كە ئەوانیش دەست ئەدات گێرانەوەیان بۆلای ئەو دوو شتە بنەڕەتی یانە: یەکەم مەبەستی ئەوەیە روونی بکاتەوە لە دەروونی موسڵمان دا کە ئاییینەکەی بەرنامەیەکی خوایی یە لە دواترین شێوەی دا ناردی بۆ هەموو ئادەمی، چەند شێوەیەکی ئەم ئاییینە پێش کەوت و تێپەڕی کرد کە رێك و پێك بوون لەگەڵ چەند بارو قۆناغێ لە مێژووی ئادەمی دا، چەند تێکۆشان و بەسەرهات و تاقی کردنەوەیە لە پێشەوە هاتن و تێپەڕیان کرد لە ژیانی پێغەمبەران و ژیانی گەلان و کۆمەڵەکان دا، هەموو ئەوانە پێشڕەوو رێگا تەخت کەر بوون بۆ ئەم دواترین پەیامی خۆی و زاڵی بکات بەسەر هەموو ئاییینێك لەم زەوی یەدا. جا لەبەر ئەوە باسی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موسا ئەکات (علیه السلام) بۆ ئەمەی روونی بکاتەوە کە ئەو گەلەی رەوانە کرا بۆ سەریان ئازاریان دا لە پەیام و بەرنامەکەی تا گومڕا بوون، کەڵکی ئەوەیان نەما بکرێن بە ئەمین دار بەسەر ئاییینی خوا لە زەوی دا، باسی پێغەمبەرێتی حەزرەتی عیسا ئەکات (علیه السلام). بۆ ئەمەی روونی بکاتەوە کە هاتنی بۆ درێژە پێدانی پێغەمبەرێتی موسایە، هاتووە بە بڕواکەر بە تەوراتەکەی ئەو، بە پێشڕەوو رێگا ئامادەکەر بۆ دواترین پەیامی خوا، بە مژدە دەر بە پێغەمبەری ئەو پەیامە دوایی یە، هات تا ببێتە هۆی گەیاندنی ئاییینی تامەیی یەکەم بە دواترین ئاییینی تامەیی. کەواتە هات بۆ ئەمەی ئەو سپاردەی ئاییینی خوایە کە لە

پاش موسا هەڵی گرت و گرتی یە گەردن. ئەو سپاردەیە بگەیەنێ بەو دواترین پێغەمبەرەی کە مژدەی ئەدا بە هاتنی. لەلای خواو لە زانین و بڕیاری خوادا تێپەڕی کردبوو کە ئەو هەنگاوانە دوایی بێن بە هاتنی بڕیارێکی دامەزراوی نەگۆڕاوی هەمیشەیی، جێگیر ببێ لە زەوی دا ئاییینی خوا لە دواترین شێوەی دا لەسەر دەستی دواترین پێغەمبەردا (ﷺ). ئەمە بوو مەبەست و ئامانجی یەکەم لەم سورەتەدا کە مەبەست و ئامانجی دووەمی لەسەر راگیرە، کە بریتی یە لە تێکۆشان بە گیان و بە ماڵ لە رێگای خوادا بەڕاستی و بە نیازی پاك و خاوێنەوە بۆ زاڵ کردنی ئاییینی خوا بەسەر هەموو ئاییینی تر لە زەویدا – بەو جۆرو شێوەی خوا ئەیەوێ – بە بێ دوو دڵی و بە بێ ئەمەی وتارو کردار رێکی یەك نەبن و دژی یەکتربن. شتێکی ناشیرینە بڕوادار لە لایەکەوە بە دەم وای دەر ببڕێ کە ئارەزووی هەیە لە تێکۆشان و تێ جەنگان لە رێگای خواداو لەلایەکی ترەوە بە کردەوەی دژی ئەوە بێت و کاتی جەنگ و کوشتار هەڵگەڕێتەوەو پاشەکشێ بکات، وەکو رووی دا لە کۆمەڵی موسڵمانانەوە، وەکو لە هەندێ ریوایەتدا اسی ئەکات. ئینجابابێینەسەرسورەتەکەو گوێی بۆ شل کەین ئەو مەبەستە گرنگانەمان بدات بە گوێدا لەگەڵ ئەو هەموو پەندو تەمێ گرنگانەدا. قاپی سورەتەکە ئەکاتەوە بە باس و یادو ستایش بۆخوای زاڵی کاردروست لەلایەن بوونەوەرەوە، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەوی دا باس و یادی خوای کردو بە پاك و خاوێنی راگرت لە هەموو لەکەو رەخنەیە و هەموو شایەتن لەسەر ئەوە، ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەر ئەو زاڵ و کاردروستە.

ئەم یادو وەسف و سەناو شایەتی یە دێت لەلایەن ئەم بوونەوەرەوە بۆ خوای زاڵی کاردروست، لە سەرەتای سورەتەکەوە جاڕ ئەدات بۆ موسڵمانەکان کە ئایینەکەیان دواترین ئەڵقەیەکە لە ئاییینی خوا، ئەمان ئەمیندارن لەسەر ئەم ئایینەی کە جاڕی تاك و تەنیایی خوا ئەدات، بێزاری دەرئەبڕێ لە بت پەرستان و بێ بڕوایان و دژی بێ بڕوایی و بت پەرستی و خوانەناسی یانە، بانگیان ئەکات بۆ تێکۆشان و فیداکاری بۆ یارمەتی دان و سەرخستنی، خوایش بڕیاری داوە کە سەری خاو زاڵی بکات با بت پەرستەکان پێ یان ناخۆش بێت.

کەواتە ئەم سەرەتایە نیشان ئەدات کە ئەو سپاردەیەی دراوە بە موسڵمانان سپاردەی هەموو بوون و بوونەوەرە، ئەو عەقیدەو باوەڕەی کە ئایینەکەیان داوای تێکۆشان ئەکات لێ یان لە پێناوی دا عەقیدەو باوەڕی هەموو شتێکە کە وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا، سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئەو ئایینە بەشێکە لە کاروباری ئەم بوون و بوونەوەرەو ڕێك و پێکە لەگەڵ ڕوو کردنی هەموو ئەم بوونەوەرە بۆلای خوای زاڵی کاردروست.

لەپاش ئەم سەرەتا بەهێزە ئینجا ئەنگ ئەگرێ و ناڕەزایی دەرئەبڕێ زۆر بە سەختی و تەشەر ئەدات لە موسڵمانان بەهۆی کردەوەی هەندێکیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ﴾ بۆچی شتێك ئەڵێن کە نایکەن؟ واتە کردەوەتان جیاوازەو ڕێك نی یە لەگەڵ وتارتان دا. علی کوڕی طلحە ئەگێڕێتەوە لە ئیبن عەباسەوە – خوا لێ یان ڕازی بێت – کە فەرموی: پێش ئەوەی جەنگ پێویست بکرێ لە ڕێگای خوادا تاقمێ ئەڵێن: زۆرمان پێخۆش بوو کە خوا ئاگاداری بکردینایە بەسەر خۆشەویست ترین کردەوە بە لای خۆیەوە، تا ئێمەیش بیکەین، ئینجا خوا هەواڵ ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە خۆشەویست ترین کردەوە بڕوا هێنانە بە خوا بە بێگومان و دوو دڵی، جەنگ کردنە لەگەڵ ئەو گوناهکارانەی کە دژو پێچەوانەی بڕوا بە خوان و دانی پیا نانێن، ئینجا کاتێ کە پێویست کردنی جەنگ لە ڕێگای خوادا هاتە خوارەوە، ئەو کۆمەڵە پێ یان ناخۆش بوو، ئەو فەرمانەیان بە لاوە زۆر قورس بوو، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، ئیبن جەریر لە تەفسیرەکەی دا ئەمەی هەڵبژارد. هەروەها ئیبن کەسیریش لە تەفسیرەکەی دا وێنەی ئەمە ئەفەرموێ کە وترا. ئەوەی کە فەرمویانە ڕێك و گونجاوە لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکاندا، بەڵام وەکو چەند جاری تر وترا بە پێی بڕیاری زانایانی ئیسلام هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەت تایبەتی ناکەن و لایان نادەن لەو دیمەنە گشتی یەی کە ئایەتەکان بیانبێ. بەڵێ ئەو ڕووداوەی کە هۆی هاتنە خوارەوە بێت بێگومان داخڵە لە بڕیاری ئەو ئایەتانەدا، جا لەبەر ئەوە لەم ئایەتانەدا شێوە گشتی یەکەی ئەگرین و لە هەمان کات دا گوێمان هەیە لەو ڕووداوەی کە هۆی هاتنە خوارەوەی بووبێ.

﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾

لە یەکەم جارەوە ئەو تەشەرو گلەیی یە بەتینەی ئاراستە کرد. ئینجا دووبارەی ئەکاتەوە بە دەربڕینی بێزاری یەکی ئێجگار سەخت و سامناك، بە تایبەتی لە دەروونی ئەو بڕوادارانەدا کە بەو ناوە بانگ کران، ئەو خوایە بانگی کردن کە بڕوایان پێ‌ی هەیە، ئەفەرموێ: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئای چەند گەورەیە لە بارەی خەشمی زۆر بەتینی بەلای خواوە، ﴿أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ ئەمەی شتێ بڵێن کە نایکەن[1]. واتە قسەی رووتی بێ کردەوەتان زۆر بێزراوەو بەتین ترین خەشمی خوای هەیە بۆی.

بەڕاستی رستەیەکی زۆر سامناکی دڵ تەزێنە و ئەوپەڕی رادەی گرتووە لەبەر زیادە رەوی لە جڵەوگیریی کردن لە لاف لێدان و قسەی رووت و گزاف دان. چونکە ئەوە سیفەتێکی زۆر ناشیرینە و سەر تێك دەرە لە گەل و کۆمەڵ، مایەی بڵاو بوونەوەی بێ بڕوایی و خەشمە لەناو گەل دا، بەهۆی ئەو سیفەتە دوژمن نرخیان بۆ دانانێ و بیم و ترسی نابێ لێ یان، لە هەموو شت خراپتر ئەمەیە ئەبێتە درۆ کردن لەگەڵ خواداو سەری لەوەوە دەرئەچێ، سەری دەرئەچێ لە دوو سیفەت لە سیفەتەکانی ناپاکان: درۆ کردن لە قسەداو بەڵێن شکاندن.

ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو مەبەستەی کە بە دەم وتراو کردەوەی لەگەڵ نەبوو، تا بوون بە جێگای ئەو تانەو تەشەرو نەنگە سەختەی کە باس کرا، ئەوەش بریتی بوو لە جەنگ و کوشتار وەکو باس کرا. روونی ئەکاتەوە ئەو بارو کردەوەی کە خوا ئەیەوێ و پێ‌ی خۆشە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا﴾ بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە جەنگ و کوشتار ئەکەن لە رێگای ئەودا بە رێزو شان بە شانی یەکتر، بە جۆرێك لە یارمەتی و یەك دڵی و یەك نیازی و بەهێزیی و دامەزراوی و کار لێ نەکراویدا

---

[1] تەفسیرەکەلەسەر ئەوەیە کە وشەی ﴿کبر﴾ بۆ سەرسوڕمانە ﴿مقتا﴾ تمییزە. رستەی ﴿أن تقولوا﴾ فاعلە و ﴿مقتا﴾ بەتین ترین خەشمە کە ئەوەش رای زجاجە و خاوەنی کشاف، بە چەند جۆرێ تریش ترکیب کراوە، هەرچەند جیاوازن بەڵام هەموو بۆ یەك مەبەستن.

﴿كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ وەك ئەوانە كۆشكێكی قایمی یەك پارچەی داڕێژراو بن كە هیچ كون و ناڕێكی و لاری و دواو بەرێكی تیا نی یە. یان مەبەست ئەومیە كاتێ ئەڕۆن بۆ جەنگ ریز ئەبن و ئەنووسێن پێكەوە بە بێ ناڕێكی و دواوبەر ئەڵێیت لە قاڵب دراون، كە ئەو شێوەیە باوە لەم چەرخی تازەیشەدا كاتی ڕۆیشتن بۆ جەنگ، بێگومان ئەو شێوەیە دوژمن ترسێنەرە هۆی بەهێزبوونی دەروونی لەشكرەكەیە و خۆشەویستی و یەك دڵییانە، بێجگە لە شیرینی ڕژێمێ كە فەرمانی پێ دراوە لە ئایینی پاكی ئیسلام دا بۆ هەموو كاروبارێ، ئەوەتا هەموو كۆمەڵێ نوێژ بكەن بە جەماعەت هەر ناڕێكی و دواو بەرێ ببێ لە ریزەكەیان دا خێری جەماعەتیان نابێ.

خوای گەورە لەم ئایەتەدا تێی گەیاندن كە تەنها جەنگ كردن مەبەست نی یە، بەڵكو جەنگێ مەبەستە لە ڕێگای خوادا بێت، ئەو جەنگەیش بە یارمەتی و قۆڵگیری كۆمەڵی موسڵمان بێت و لە ریزی ئەوان دا، بە دامەزراوی و بەرگە گرتن و خۆگری بێت.

بێگومان قورئان – وەكو چەند جاری تر وتمان لەم جزمەدا – گەل و ئوممەتێكی پێك ئەهێنا. پێكی ئەهێنا و دای ئەرشت بۆ ئەمەی هەڵسێ بە گەیاندن و بڵاو كردنەوەی سپاردەی ئایینەكەی لە زەوی دا، بەدی هێنانی بەرنامەی لە ژیان دا، ڕژێمەكەی لەناو ئادەمی دا، كەواتە ئەبێ ئەو ئوممەتە دروست بكات بە یەكە یەكەو دروستی بكات بە گەل و كۆمەڵ، دروستی بكات بە كردەوەی بەدی هاتوو، هەموو ئەمانە پێكەوە لەكاتێك دا، چونكە موسڵمان بە یەكە یەكە دروست ناكرێ لەناو گەل و كۆمەڵ دا نەبێ، ئیسلام بەدی نایەو راگیر نابێ مەگەر لە ناو چوار چێوەی كۆمەڵێكی ڕێكخراوی هۆنراوەی پەیوەستی بەستراو پێكەوە، خاوەنی ڕژێمێك بێت، خاوەن مەبەست و ئامانجێكی كۆمەڵایەتی بێت كە لە هەمانكات دا پەیوەست بێت بە هەموو یەكێ لە گەل و كۆمەڵ دا، ئەو مەبەستەش راگیر كردنی ئەم بەرنامە خوایی یە لە دەروون و لە كردەوەدا لەگەڵ راگیر كردنی لە وڵات دا، ئەو بەرنامەیەش بەدی نایەو راگیر ناكرێ لە وڵات دا مەگەر لەگەڵ كۆمەڵێك دا كە بژی و ئیش و كار بكات و بەرهەم بێنێ لە سنووررو چوار چێوەی ئەو بەرنامە خوایی یەدا.

ئیسلام ئایینێكی كەنارگیر نی یە و ئایینی چەند كەسێكی كەنارگیر نی یە كە هەركام بچێ بۆ خۆی لە خەڵوەخانەیەك دا لێ ی بكەوێ و هەر خواپەرستی خۆی بكات، بێگومان ئەوە ئیسلام بەدی ناهێنێ لە دەروونی ئەو كەسەدا، دیارە باشتر بەدی ناهێنێ لە ژیانی دا.

ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتووە ئاوا کەنارگیر بێت، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە حوکمڕان بێت بەسەر ژیـان دا و بیگرێتـە دەسـت. هـاتووە بـۆ ئـەوەی چـاودێرو فـەرمان ڕەوا بێـت بەسـەر هـەموو کاروباری گەل و هەموو یەکێ لە ئەندامەکانی گەل، ئادەمیزاد خۆی لە خۆی دا ناژی بە گـەل و کۆمەڵ نەبێ، ئیسلامیش هاتووە بۆ ئەوەی حوکمڕانی ئادەمی بکات کە گـەل و کۆمـەڵ بن، جا لەبەر ئەوە هەموو یاسا و ڕژێم و ئادابەکانی داڕێژراون لەسەر ئەو بنەڕەتە، کاتێ کە زۆر بە گرنگ سـەرنجی هـەموو یەکە یەکە ئـەدات و خـەریك ئـەبێ لەگـەڵ دەروونـی و هـەموو شـتە تایبەتی یەکانی، کاتێ کە زۆر بە گرنگ ئەوە ئەگرێ ئەیەوێ ئەنـدامێکی ڕێك و پێك بێـت لـە گەلەکەی کە تێیدا ئەژی. ئەوو گەلەکەی ڕوو ئەکەنە خوای خۆیان، لەناو ئـەو گەلـەدا هەڵسێ بە چەسپاندنی ئایینەکەی خوا لە زەویدا، بەرنامەکەی لە ژیان دا، ڕژێمەکەی لەناو ئادەمیدا.

لە یەکەم ڕۆژی ئەم بانگ و بانگەوازی ئیسلامەوە پێك هـات کۆمـەڵ و گـەلێکی ئیسـلامی کە خـاوەنی سـەرکردایەتی یـەکی گوێڕایـەڵی کـراو بـوو کـە سـەرکردایەتی پێغەمبـەرە (ص)، ئەندامـەکانی ئـەو گەلـە ئـەژیان بـە هەسـتێکی کۆمەڵایـەتی تێـرو تـەواو، کیـانێکی تایبـەتی جیاوازیـان هـەبوو لـە هـەموو گـەل و کۆمـەڵێ تـر کـە بـە دەوریـان دا بـوون، ئـاداب و ویژدانێکـی دەروونـی تایبـەتی یـان بـوو کـە لـە هـەمانکات دا چاودێریی ژیـانی کۆمەڵایـەتی تێکـەڵ بـوو، ئەوەش هەموو پەیدا بوو پێش فەراهەم هاتنی دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینەدا.

کاتێ سـەرنجی ئـەدەین و بیر ئەکەینـەوە لـەم سـێ ئایەتـەی کـە ئـەژین لەگـەڵیان ئـەبینین تێکـەڵی خـوو ڕەوشـتی ئەنـدامی گـەل لەگـەڵ پێویسـتی کاروبـاری کۆمەڵایـەتی دا، لـە ژێـر سایەی عەقیدەو بڕوای ئایینی داو سروشتی ئەو عەقیدەیەی کە داخوازی بـەدی هێنانیـەتی لە ژیانی ئادەمی دا لە شێوەی ڕژێمێك دا کە پاسەوانەکەی کار بەدەستیەتی.

ئایـەتی یەکـەم و دووەم باسـی تۆڵـە و بێـزاری ئـەکات لـە لایـەن خـواوە دەربـارەی ئـەو بڕوادارانەی کە شتێ ئەڵێن نایکەن. ئەم دوو ئایەتە بەو جۆرە نەخشەی دوو سیفەتی گرنگ ئەکێشن کە پێویستن و ئەبێ نیشانەیەکی دیاری بن لـە موسڵمانان دا: ڕاستی، دامـەزراوی. ئەمـەی دیـوی دەرو نـاوی وەك یـەك بن وتـنی جـوت و ڕێـك بـێ لەگـەڵ کردەوەی، لـە هـەموو شتێك دا، نەك تەنها لە مەسەلەی جەنگ و کوشتاردا کە باسی دێت لە سێ یەم ئایەتدا.

ئـەم نیـشانەو سـیفەتە لـە موسـڵمان دا قورئـان زۆر باسـی ئـەکات و بـە وردی لەسـەری ئـەڕوات لـە چـەند ئایـەتێك دا، ڕەوشـت و وتـارو کـرداری پێغەمبـەریش (ﷺ) دێـت بـە دوای قورئان داو چەند بارەی ئەکاتەوە. یەکێ لەو حەدیسانە کە بەناوبانگن و بوخاری و موسلیم

و ترمزی و نەسائی ئەیهێنن لە ئەبوهورەیرەوە: نیشانەی ناپاکی سیانە: کاتیٚ قسەی کرد درۆ ئەکات، کاتیٚ بەڵێنی دا نایباتە سەرو بەدی ناهێنیٚ، کاتیٚ کرا بە ئەمین دار بەسەر شتێکەوە ناپاکی تیا ئەکات، لەبارەی راستی یەوە ناپاکی تیا ئەکات، لە بارەی راستی یەوە رەنگە ورد ترو ناسك تر تەمیٚ ئەمە بێت کە ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داود ئەیگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی عامیری رەبیعەوە کە ئەفەرمویٚ: من منداڵ بووم پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ ماڵمان، منیش لەماڵ دەرچووم بۆ یاری کردن. دایکم بانگی کردم، وتی: عبدالله وەرە شتت بدەمیٚ، پێغەمبەریش (ﷺ) پیٚی فەرمو: ئایا ویستت چی پیٚ بدەی؟ ئەویش وتی: خورما. ئەویش فەرموی: بزانە ئەگەر وات نەکردایە بە درۆ لەسەرت ئەنووسرا.

رەنگە ئیمامی ئەحمەد – خوا لیٚ ی رازی بێت – لەم سەرچاوە پاکە ئەمەی وەرگرتبیٚ، کە حەدیسی وەرنەگرت لەو پیاوەی کە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هات بۆ لای بۆ ئەمەی حەدیسێکی لابوو بۆی باس بکات و لیٚ ی وەرگریٚ. ئیمامیش گویٚی بۆ نەگرت، چونکە بینی کابرا ولاٚخەکەی بەر بووەو بە درۆوە کۆشی گرتووەتەوەو بانگی ولاٚخەکەی ئەکات، تا بەو فێڵە بیگریٚ.

ئیمام مەترسی کردو گویٚی بۆ نەگرت ماتوڵ درۆی کرد لەگەڵ هێسترەکەی. ئا بەو شێوەیەو بەو وردی و پاك و خاوێنی یە ئەو موسڵمانانە پەروەردە کران و دڵ و دەروونیان دارێژرا، تا شایستەی ئەوە بوون کران بە ئەمین دار بەسەر بەرنامەی خوا لە زەوی دا، ئەمینداری ئەو سپاردە گەورەیە هەر وابووەو ئەبیٚ هەروایش بیٚ، ئەمە ئەو مەبەستەیە کە ئەم سورەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات، ئەمە ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی پێگەیاندن و پەروەردە کردن لەو کۆمەڵە موسڵمانەی کە خوا ئامادەی کردن بۆ ئەمەی پاسەوان و چاودێر بن بەسەر ئەم کارە گەورەی خواوە.

ئینجا کاتیٚ بێینە سەر ئەو مەبەستە گرنگەی کە ئەم ئایەتانەی تیا هاتە خوارەوە، کە مەبەستی جەنگ لە رێگای خوادا، بەڕاستی پێویستە بوەستین لەبەردەم چەند مەبەست و مەسەلەیەکی جیاوازدا بۆباس لیٚ کردن و سەرنج دان و بیر لیٚ کردنەوەو تەمیٚ لیٚ وەرگرتن.

یەکەم بیر ئەکەینەوە لە دەروونی ئادەمی کە هەڵەو بیٚ هێزی رووی تیٚ ئەکات، کەواتە هیچ پەناو پارێزەریٚ نی یە بۆی جگە لە کۆمەکی و یارمەتی خوا، جگە لە بیر خستنەوەی هەمیشەیی، ئەوەتا ئەو کۆمەڵە لە موسڵمان کە لە هەندیٚ ریوایەت دا وتراوە ئەوانە لە کۆچ کەرانیٚ بوون کە کاتی خۆی لە مەککەدا ئاواتە خواز بوون خوا ئیزن بدا بۆ جەنگ کردن، کە

ئەو کاتە کاتی ئەوە نەبوو، ئینجا کاتیٚ هاتنە مەدینەو جەنگیان لەسەر پێویست کراو کە کاتی خۆیشی بوو کەچی سەیر ئەکەیت کۆمەڵیٚ لەوان کەوتنە چم و چاروو ئەو فەرمانەیان زۆر لەسەر شان قورس بوو. یان ئەوان کۆمەڵیٚ بوون لە موسڵمانان لە مەدینەدا کە پرسیاریان ئەکرد لە خۆشەویست ترین کردەوە بەلای خواوە بۆ ئەمەی بیکەن، ئینجا کاتیٚ فەرمان درا بە جەنگ پیٚ یان ناخۆش بوو.

ئەم وەستان و بیر کردنەوە بەسە بۆ ئەمەی چاو بکەینەوە و بزانین تا چ رادەیەك دەروونی ئادەمی پێویستی هەیە بە تەمیٚ و مۆچیاری و بەهێز کردن و دامەزراندن، لە کاتێك دا کە داواو تەکلیفاتی شەرعی رووی تیٚ ئەکات، بۆ ئەمەی لە رێگای راست لانەداو دامەزراو بێت لەسەر رێگای خۆی، بتوانیٚ زاڵ ببیٚ بەسەر کاتی بیٚ هێزی و لاوازی دەروون دا، هەمیشە چاوی بروانیٚ بۆ ئاسۆی دوورو بەرز. هەروەها لەم وەستان و بیر کردنەوەدا تیٚ ئەگەین کە پێویستە لەسەرمان بۆ خۆمان سەر داخەین لە ئاستی فەرمانەکانی خواو دەمی زیادە نەکوتین و داوای ئەرکی گەورەو قورس نەکەین لە خوا بیخاتە سەرشانمان، کاتیٚ ئەو لوتفی کردو نەیخستینە ناڕەحەتی! چونکە لەوانەیە ئەوە داوای بکەین و ئاواتی بۆ بخوازین نەتوانین بەجیٚی بێنین! ئەوەتا ئەو کۆمەڵە لە یەکەم چینی ئەم ئوممەتە بوون و داوای کردەوەی قورسیان کرد لە خوا کەچی کە فەرمانە قورسەکە درا بەسەریان دا لاوازی رووی تیٚ کردن، تا ئەوەی وتیان نەیان ئەکردو خوایش ئەو گلەیی و تەشەرو هەڕەشەی ئاراستە کردن کە چەندە سامناك و بەتین بوو!

دووەم ئەوەستین و بیردەکەینەوە لە خۆشەویستی خوا بۆ ئەوانەی کە جەنگ ئەکەن بەو جۆرەی لە ئایەتی سیٚ یەم دا باس کرا، ئەوەستین و بیر ئەکەینەوە لەو بە گرنگ گرتن و هاندانە بەهێزە لەلایەن خواوە لەسەر جەنگ و کوشتار لە رێگای خوادا. بێگومان ئیسلام ئارەزووی جەنگی نی یە و خۆیشی لیٚ ی نایە، بەڵام پێویستی ئەکات لەبەر ئەوەی ناچارەو واقیعی ژیان پێویستی ئەکات، لەبەر ئەوەی ئەو مەبەست و ئامانجەی کە جەنگی بۆ ئەکریٚ زۆر گەورەو گرنگە، ئیسلام بەرەنگاری مەردوم ئەوەستیٚ بەو بەرنامە خوایی یە کە هێنای بۆ ئادەمی لە دواترین شێوەی دا کە دامەزراوو نەگۆڕاوە، ئەو بەرنامەیە – هەرچەند هەموو خواست و مەبەستێکی سروشتی رێك و راست بەجیٚ ئەهێنیٚ – بەڵام ئەرك و زەحمەت ئەخاتە سەرشان بۆ ئەمەی ئادەمی بەرز بێتەوەو بگاتە رادەی خۆی، بۆ ئەمەی لەسەر ئەو رادە بەرزە جێگیر ببیٚ و دامەزریٚ. بێگومان چەند هێزی زۆرو زەبەندە هەن لە زەویدا

حەزناکەن ئەو بەرنامەیە جێگیر بێ، چونکە ئەم بەرنامەیە ئەدا لە مەبەست و ئامانجە تایبەتی یە ناڕەواکانیان و ئەکەوێتە جەنگ لەگەڵیان و نایان هێڵێ کاتێ جێگیر ببێ لە ژیان دا، ئەو هێزە ناڕەوایانە بە دوای هەموو هەلێك دا ئەگەڕێن و هەموو چەکێ کە لە دەستیان دا بێت بەکاری ئەهێنن بۆ بەرگری ئەو بەرنامەیە و هەرچۆن بۆیان بکرێ ئەوەستن لە ڕێگای دا، هێزی شەڕ بەتینە، بەتاڵ کەشخە کەرو لە خۆ گۆڕاوە، شەیتانیش دوژمنێکی کۆڵ نەدەرە! جا لەبەر ئەوە پێویست لەسەر هەڵگرانی عەقیدەو بڕواو پاسەوانەکانی ئەو بەرنامەیە بەهێزبن تا زاڵ بین بەسەر بەکرێ گیراوانی شەڕو یارمەتی دەرانی شەیتان دا، پێویستە بەهێزبن لە خووڕەوشت دا، بەهێزبن لە جەنگی دوژمنان دا، پێویستە لەسەریان جەنگ و کوشتار کاتێ کە چارە نەمێنێ و جەنگ ببێ بە دواترین چەك و هۆی سەربەستی و ئازادی لە بانگ کردن بۆ سەر ئەو بەرنامەیە، بۆ ئازادی و سەربەستی عەقیدەو بڕوا پێ ی، بۆ ئازادی و سەربەستی لە کارو کردەوە بە پێ ی ئەو ڕژێمەی کە لەو ئایینەدا نەخشە کێشراوە.

ئەوانە جەنگ ئەکەن تەنها لە ڕێگای خوادا، نەك لەبەر خۆیان و ڕەگەزایەتی یان لە هیچ بارو ڕوویەکەوە، ڕەگەزایەتی بەرەو تیرەو ڕەگەزایەتی خاك و تائیفە و بنەماڵە. بەڵکو تەنها لە ڕێگای خوادا، بۆ ئەمەی هەر ویست و خواستی خوا بەرزو بڵند بێ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ لە حەدیسێك دا کە هەموو پەڕاوە سەحیحەکان ئەیهێنن کە ئەفەرموێ: ﴿من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله﴾ هەرکەس جەنگ بکات بۆ ئەمەی هەر وشەی خوا بەرز ببێتەوە تەنها ئەوە لە ڕێگای خوادایە. تەنها ئەو وشەو ویست و خواستی خوا ڕێك و ڕاست و بەکەڵکە. تەنها ئەوە ڕێکە لەگەڵ یاساو ڕژێمی ئەم بوونەوەرە و هەرچۆنێ ئەم بوونەوەرە هیچ کەس دەست کاری کاروباری ناکات و ناگونجێ بە هیچ ڕەنگ دەست کاری کردنی لە لایەن غەیری خواوە، بە هیچ ڕەنگ لادانی نی یە لە بەرنامەی خوا، هەروەها ئادەمیش کە بەشێکی بچووکە لەم بوونەوەرەدا ئەبێ تەنها بە پێ ی فەرمانی خواو بەرنامەی خوا بجوڵێتەوە، بە هیچ کلۆج نابێ لێ ی لادا، هەرکەس ئەو بەرنامە بگۆڕێ یان دەست کاری بکات ئەو کەسە دوژمنی ئادەمی یە و ئەیەوێ لە ڕێگای ڕاستی سروشتی خۆی بیترازێنێ.

بێگومان – وەکو باسمان کرد – ئەو ئایین و بەرنامەیە بە هەموو هێز بەرگری ئەکرێ لەلایەن ئەو هەموو دوژمنە کۆڵ نەدەرەوە، ئەبێ ئیسلامیش نەوەستێ و تێك هەڵچێ لەگەڵ ئەو هێزە شەڕانەدا، کەواتە ئەبێ جەنگ و کوشتار پێویست بکرێ لەسەر موسڵمانان بۆ یارمەتی دان و سەرخستنی ئەو ئایین و بەرنامەیە، بۆ بەدی هێنانی ویست و خواستی خوا لە زەوی دا، جا

لەبەر ئەوە خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە جەنگ ئەکەن لە ڕێگای دا بەڕیزو شان بە شانی یەکتر، بە جۆرێ لە یەکێتی و قایمی و دامەزراویدا وەك ئەوانە کۆشکێکی داڕێژراوی یەك پارچەن بە بێ لاری و کون و کەلەبەرو دواو بەر.

سێ یەم ئەوەستێن و بیر ئەکەینەوە لەو شێوەی کە خوا پێ ی خۆشە جەنگ کەرو تێکۆشەرانی لەسەر بن، ﴿صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ وەکو باس کرا. ئەوە داوایە لە هەموو یەکە یەکە، بەڵام لە شێوەی کۆمەڵایەتی دا، لەناو کۆمەڵێك دا کە خاوەنی ڕژێم بێت، چونکە ئەوانەی کە دوژمنن و بەرەنگاری ئەکەن بە هێزێکی کۆمەڵی و کۆمەڵایەتی ئەیکەن، چەند کۆمەڵێ گەورە گەورە ڕێك ئەخەن و هانی ئەدەن لە ئیسلام و موسڵمانان، کەواتە پێویستە بۆ لەشکری ئیسلامیش بەڕیزو شان بە شان بەرانگاری یان بوەستن، بە شێوەیەکی ڕێك و پێکی دامەزراوی قایم، بێجگە لەوەش سروشتی ئەم ئایینە وایە کاتێ کە سەرکەوت بە کۆمەڵی سەرئەکەوێ، گەل و کۆمەڵێکی پەیوەستی بەهێزی ڕێك و پێك فەراهەم ئەهێنێ، کەواتە شێوەی تاك تاکی پچڕاوی و کەنارگیر کە بە تەنیا خواپەرستی بکات، بە تەنیا تێکۆشان و جەنگ بکات بە تەنیا بژی، شێوەیەکی دوورە لە سروشتی ئەم ئایینە، دوورە لەوەی پێویستە بۆ تێکۆشان لە ڕێگای ئەم ئایینەدا، دوورە لە سەرکردایەتی و چاودێریی یەك کە خوا ئەیەوێ بۆ ئەم ئایینە. ئەو شێوەیە کە خوا پێ ی خۆشە و ئەیەوێ تێکۆشەرانی ڕێگاکەی نەخشەی سروشتی ئایینەکەیانە، نیشانەو دروشمەکانی ڕێگایان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، سروشتی یەکێتی و یارمەتی و قۆڵگیری ناوخۆیان ئەخاتە بەرچاویان بەو جۆرەی کە هەر لە دەست قورئان دێت گەیاندن و پیشاندانی بە ﴿صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ ئەیانکات بە کۆشکێ کە هەموو بەش و پارچەو خشتەکانی نووسابن پێکەوەو یەك پارچەیی وەستابوونەوە، هەموو پارچەو خشتێکی هەڵسێ بە کارو ئیشی خۆی، هەرکام جێگاو کون و کەلەبەری خۆی بگرێ، چونکە ئەگەر بەو جۆرە نەبن ئەو کۆشکە زیاندار ئەبێ و ئەگەر بە گورجی نەڕوخێ هەر بەرەو ڕووخان ئەڕواو ئەبێ بڕووخێ و ئەم شێوەیە تەنیا بۆ کاتی جەنگ و کوشتار نی یە، بەڵکو ئەوە ئەبێ شێوەی گشتی گەل و کۆمەڵی موسڵمان بێت لە هەموو کات و بەسەرهاتێکدا، ئەندامی گەل و لەناو گەل و کۆمەڵدا ئەبێ بەو جۆرە یەك بن و پەیوەستی یان بەوشێوە بێت، پەیوەستی هەستیان، پەیوەستی کردەوەو بزووتنەوەیان، لەناوڕژێمێکی نەخشە کێشراودا، کەبەرەوئامانج ومەبەستێکی دیاریی نەخشەکێشراوئەڕوا.

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ

**دوای ئەوە ئینجا باسی سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی ئەم بەرنامە خوایی یە ئەکات و قۆناغەکانی کە گوزەری کرد پیٚ یان دا لە پەیامەکانی پیٚش ئیسلام دا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە موسا وتی بە گەلەکەی ﴿يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى﴾ ئەی گەلەکەم بۆچی ئازارم ئەدەن ﴿وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ﴾ لە کاتێك دا کە بێگومان ئێوە ئەزانن کە من نێرراوی خوام بۆ لای ئێوە.**

**ئازار دانی ئەو گەلە بۆ موسا – کە رزگار کەریان بوو لە دەست فیرعەون و کۆمەڵەکەی، پێغەمبەریان بوو، سەرکردەو مامۆستایان بوو – ئازاردانێکی دوورو درێژو جۆر بە جۆر بوو، تێکۆشانی موسا (علیه السلام) لە راست کردنەوەی لاری یان تێکۆشانێکی نارەحەتی ماندوو کەر بوو، قورئان لە گێرانەوەی سەرگوزەشتەی موسا و ئەو گەلەدا چەند شێوەیەکی جیاواز لەو ئازارو ئەرکە باس ئەکات.ئەوانە رقیان هەڵئەگرت لە موسا لە کاتێك دا هەوڵی ئەدا لەگەڵ فیرعەوندا بۆ رزگارکردنیان لیٚ ی، خۆی ئەخستە بەر زۆرو ستەمی ئەوو ئەمانیش رازی بوون بەو ژێر دەستەیی و سەرشۆڕی یە دانیشن! پیٚ یان ئەوت بە گلەیی و بێزاری یەوە: ئێمە سزادراین پێش ئەمەی تۆ بێیت بۆ ناومان و پاش ئەوەی کە هاتی! وەکو هیچ خێرو چاکەیەکیان نەدیبیٚ لە پێغەمبەرێتی یەکەی دا، یان ویستویانە ئەو سزادانی دوایی بکەن بە خەتای ئەو! لەگەڵ رزگاری کردن بەناوی خوای تاك و تەنیاوە لە دەست فیرعەون و ئەوی خنکاند بە بەرچاویانەوە، دەست بەجیٚ ئارەزووی بت پەرستیان کراوەو داوایان کرد کە بتیان بۆ دیاریی بکات تا بیپەرستن!! لەگەڵ لیٚ یان براو چوو بەدەم وادەو بەڵێنی خواوە بۆ وەرگرتنی تەورات دەست بەجیٚ سامیری کردنی بە گوێرەکە پەرست و گومرای کردن!**

**ئینجا بێزاری یان دەربڕی لەو خۆراکە پاك و خاوێنەی کە خوا بە بیٚ ئەرك ئەیباراند بەسەریان دا: گەزۆو شەلاقە، داوای ئەم شتانەیان لیٚ ئەکرد کە لە زەوی ئەڕوێ و دێتە دەرەوە: گیاو گژەو ترۆزی و سیرو نیسك و پیاز! لە رووداوی سەربڕینی ئەو رەشە وڵاخەی**

که داوایان لیٚ کرا لەلایەن خواوە وەکو لە سورەتی ﴿البقرة﴾ دا باسی فەرمو، ئەو هەموو لاری و گیروگرفت و بیٚ شەرمی و قسە ناڕەوایان بەدەم دا هات.

ئینجا داوای ڕۆژێکی پیرۆزیان کرد کە خەریکی خواپەرستی بن تیای داو کارو فرمان نەکەن لەو ڕۆژەدا و کەچی کە ڕۆژی شەممەیان بۆ دیاریی کراو لەسەریان نووسرا گوناهو دەست درێژیی یان تیادا کرد. بەرامبەر ئەو خاك و وڵاتە پاك و پیرۆزەی کە خوا موژدەی پێدان بە تێچوونی، ئەوانە وەستان و بیم و ترس گرتنی و ملیان وەرگێڕا لە موسا و بیٚ شەرمی یان کرد تا ڕادەیەك لە کۆتایی دا گەیشتنە ئەوە وتیان: ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو خاکە تا ئەو گەلە زۆردارەی تیا بیٚ، بڕۆ تۆو خواکەت جەنگ و کوشتار بکەن لەگەڵیان و ئێمە لێرە بۆ خۆمان دائەنیشین.

بێجگە لەوانە هەموو موسایان تەنگەتاو ئەکرد بە پرسیاری زۆرو تەگبیرو ڕاوێژو مل پێچی و نافەرمانی و قسەی خراپیان ئەخستە شوێنی وەکو لە چەند حەدیس دا باسی ئەکات. سەرەنجامی ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایە ئەمە بوو لە دوایی دا لایان دا لە ڕێگای ڕاستی خوا ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓا﴾ ئینجا کاتیٚ ئەوان لایان داو هەر سوور بوون لەسەر لادان لەو ئایینە ڕاستەی کە موسا بۆی هێنان ﴿أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾ خوایش دڵەکانی ئەوانی لادا لە وەرگرتنی حەق و ڕاستی و ئارەزووی ڕاست، کەواتە ئیتر دەستیان نەئەداو بە شیاوی ڕێنموونی نەمان، خوا گومرایی و ون بوونی لەسەر نووسین ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ خوا ڕێنموونی گەلیٚ ناکات و نایانخاتە سەر ڕێگای ڕاست کە خۆیان بە ئارەزوو هەڵبژاردنی خۆیان لایاندابیٚ و دەرچووبن لە فەرمان و گوێڕایەڵی خوا، کەواتە ئەو کەڵکیان نەماو بەکاری ئەوە نەمان کە هەڵگری ئاڵای ئایینی خوا بن و موژدەدەرو بانگ کەر بن بۆ ڕێگای خوا.

ئینجاخوا پێغەمبەری تری نارد وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە عیسای کوڕی مەریەم وتی: ﴿يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئەی کوڕو ڕۆڵەکانی یەعقوب ﴿إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم﴾ بەڕاستی من نێرراوی خوام بۆلای ئێوە. پیٚی نەوتن: من خوام، یان کوڕی خوام، یان ئوقنومێکم لە ئوقنومەکانی خوا، بە پیٚی ئەو مەزهەبە پڕوپووچانەی کە لە پاشان پەیدا بوون لە بارەی عیسا پێغەمبەرەوە (ﷺ) ﴿مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ ڕەوانە کراوم بۆلای ئێوە لە کاتێك دا بڕواکەرم بەو تەوراتەی کە لە پێش منەوە هاتووە

﴿وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ﴾ موژده دەرم بە ناردنی پێغەمبەرێك كە دێت لە دوای من و ناوی (احمد)ە. ئەم فەرمودەیە پیشانمان ئەدات كە ئەڵقەكانی زنجیرەی پێغەمبەرێتی پەیوەستن بە یەكترەوە، هەموو جۆشن لە حەقیقەت و بنەڕەت دا، بەرەو یەك شت ئەڕۆن، لە ئاسمانەوە هاتوون بۆ سەر زەوی، ئەڵقە لە دوای ئەڵقە لەو زنجیرە درێژەدا. ئەو شێوەی شایانە بە كردەوەی خواو بەرنامەی خواوە، كەواتە لە بنەڕەت دا تەنیا بەرنامەیەكە، شێوەكانی جیاوازن، بە پێی ئامادەیی ئادەمی و پێویستی و توانایان، بە گوێرەی بەراوردو ئەندازی زانین و ناسینیان هەتا ئادەمی گەیشتە تەمەنی تێرو تەواوی ژیریی و هەستی، ئەو كاتە دواترین ئەڵقە لە دواترین شێوە هات بە تێرو تەواوی و گشتی بۆ هەموو بارو رووبەكی ژیان و جیهان، هات بۆ ئەمەی بدوێ لەگەڵ ئەو ژیریی و هەستی، ئەو كاتە دواترین ئەڵقە لە دواترین شێوە هات بە تێرو تەواوی و گشتی بۆ هەموو بارو رووبەكی ژیان و جیهان، هات بۆ ئەمەی بدوێ لەگەڵ ئەو ژیریی یە پێگەیشتووەدا، لەبەر تیشك و رووناكی ئەو هەموو بەراوردەدا، هات ژیریی بەرەڵا كرد بە ئارەزووی خۆی ئیش بكات لە سنووری خۆی دا، لەناو چوار چێوەی ئەو بەرنامەی كە نەخشە كێشرا بۆ ئادەمی، كە رێك و گونجاوە لەگەڵ توانین و لێهاتن و ئامادەیی دا.

مژدە دانی عیسا (علیه السلام) بە هاتنی احمد (ﷺ) شتێكی راستە بە پێی ئەم فەرمودەیە لەم ئایەتەدا، ئیتر ئەو مژدەیە ببێ لەم ئینجیلانەی كە ئێستا هەن و بەكار ئەهێنرێ یان نەبێ، چونكە ئاشكرایە ئەم ئینجیلانە لە كات و چەرخێك دا نووسراونەتەوەو بە شێوەیە نووسراون ناكرێن بە سەرچاوە لەم بارەیەوە، بێگومان ئەم قورئانە خوێنرایەوە بەسەر جولەكەو مەسیحی نیوە دورگەی عەرەب دا، ئەمەی خوێندەوە بەسەریان دا: ﴿ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ﴾ (الأعراف/١٥٧) ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەی كە نامەدارەكان ناوی بە نوسراوی هەیە لایان لە تەورات و ئینجیلدا.

ئەمەی خوێندەوە بەسەریاندا و هیچ كام نەیانتوانی بڵێن: وا نییە، كە ئەوانە دوژمنێكی ئاواتە خواز بوون نوختەیەكیان دەست كەوێ. بیگرن بە دەستەوەو بەرەنگاری ئەو ئایینە تازەی پێ بكەن، كە هاتووەو ئەیەوێ ئەوانە واز بێنن لە عەقیدەو بڕواكەی خۆیان و هەموو

بێنە ژێر ئالآی ئەم، دەی ئەگەر ئەوە راست نەبوایە ئەوانە بە جاریّ ئەیانکرد بە هۆسەو تەورات و ئینجیلیان ئەهێناو ئەیانوت: کوا شتی وا هەیە؟ بێجگە لەوە هەندیّ لە زاناکانیان کە موسڵمان بوون وەکو عبدالله ی کوڕی سەلام بە رێکی دانیان نا بەو هەواڵە راستەداو بەو شتە راستەی کە شاردیانەوەو وەسێتیان کرد بۆ یەکتر بە دەرنەخستنی!! بە پیّ ی مێژوو شتێکی ئاشکرایە کە جولەکە چاوەڕوان بوون بۆ رەوانە کردنی ئەو پێغەمبەرەی کە بەڵێنی پیّ درا بوو، هەروەها هەندیّ لە زانایانی مەسیحی کە خەڵوەنشین بوون لە وڵاتی نیوە دوورگەدا، بەڵام جولەکەبەتەما بوون لەخۆیان بیّ.

ئینجا کاتیّ خوا ویستی ئەو پێغەمبەرە لەو لقەکەی تر بێت لە نەوەی ئیبراهیم جولەکە ئەوەیان پیّ ناخۆش بوو کەوتنە بەربەرەکانی و بەرگری! بەهەرحاڵ قورئان خۆی بە خۆی راستە و راست و ناڕاست جیا ئەکاتەوەو پێویستی بە هیچ یارمەتی و پشتیوانی یەك نی یە، قسە تەنها قسەی ئەوە لەم جۆرە شتانەدا.

وا دەرئەکەویّ ئەم ئایەتانەی کە دێن و هاتوون سەبارەت بەو بە پیرەوە چوونە ناڕاست و ناڕەوای کە جولەکەو مەسیحی یەکان کردیان بۆ ئەم ئاینە و پێغەمبەرەی کە نامەکان خۆیان مژدەیان دا بە هاتنیان. تەشەریان لیّ ئەدات و لەکەداریان ئەکات لەسەر ئەو کردەوە خراپەیان و ئەو فرو فێڵ و پیلانەی کە بەکاریان هێنا دەربارەی ئەم ئایینە تازەی کە خوا بڕیاری دا سەری بخات بەسەر هەموو ئایینێکی تردا، بیکا بە دواترین پەیام و ئایینی خۆی لەم جیهانەدا، ئەفەرمویّ: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ ئینجا کاتیّ ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات بەو موعجیزەو نیشانە روونانە لەسەر راستی پێغەمبەرێتی یەکەی، کە ئەوەش بریتی یە لەم قورئانە کە موعجیزەیەکی نەگۆڕاوی هەتا هەتایی یە لە چەند بارو روویەکەوە، کاتیّ ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ﴾ ئەم قورئانە جادویەکی ئاشکرایە.

ئیسرائیلی یەکان – بە تایبەتی جولەکە – دژی ئەم ئایینە تازەیە هەڵسان هەر لە یەکەم جارەوە تا ئێستا، بەرەنگاری وەستان بە دوژمنایەتی و پیلان، لەهەر رێگایەکەوە بۆیان کرابیّ و بە هەر جۆر لە دەستیان هاتبیّ جەنگیان لەگەڵ کرد بە جەنگێکی وا کە بڵێسەی ئاگرەکەی نەکوژاوەتەوە تا ئێستا، جەنگیان لەگەڵ کرد هەر لە یەکەم جارەوە بە بەدگومان کردنی خەڵکی لیّ ی و لەکەدار کردنی قورئانەکەی بەمەی جادووەو پێغەمبەرەکەی جادوبازە، وەکو باس کرا، هەرچۆنیّ بت پەرستەکان کە نامەیان نەبوو، ئاگایان لەو مژدەیە نەبوو ئەو قسە ناڕەوایان ئەکرد. جەنگیان لەگەڵ کرد بە هەوڵ دانی تێك دانی کۆمەڵ و

لەشكری ئیسلام بە ئاژاوە نانەوە لە ناوەندی كۆچ كەران و یارمەتی دەران، بە بیر خستنەوە و زیندوو كردنەوەی دوژمنایەتی و براكوژی كۆنی تیرەی ئەوس و خەزرەج. جەنگیان لەگەڵ كرد بە پیلانبازی و یەك كەوتنیان لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام دا، دەمی ناپاكەكانیان ئەكرد بە چەكی دەستیان، دەمی بت پەرستەكان. جەنگیان لەگەڵ كرد بە یەك كەوتن و بە هاندانی هێرش بەران بۆ سەر مەدینە لە رووداوی خەندەق دا. جەنگیان لەگەڵ كرد بە بڵاو كردنەوەی بوختانە گەورەكە بۆ دایكی ئیمانداران عائشە لەسەر دەست و زمانی سەرۆكی ناپاكەكان عبدالله ی كوڕی ئەبو سەلول دا. جەنگیان لەگەڵ كرد بەو ئاژاوە زۆر گەورەی كە نایانەوە بۆ عوسمان – خوا لیّ ی رازی بێت – لەسەر دەستی دوژمنی خوا عبدالله ی كوڕی سبأ كە بوو بەهۆی ئەو تاوانە زۆر زلەو تێك چوونی ناوەندی موسڵمانان و تا ئێستاش ژارو تاڵاوی ئەوە ئەخورێتەوە لەناو ئەم ئوممەتەدا. جەنگیان لەگەڵ كرد بە هەڵبەستنی ئەو هەموو درۆو دەلەسەو شتی پڕوپووچەی كە پیّ یان ئەوتریّ: ئیسرائیلی یات، بڵاو بوونەتەوە لە كتێبی تەفسیر و حەدیس و سیرەت دا. ئەو درۆ پڕوو پووچەیان هەڵبەست كاتیّ كە دەستە پاچەو داماو بوون لە ئاستی قورئان و بەرگری یان پیّ نەكرا. ئەو ئیسرائیلی یەتانە هەرچەند زانایانی ئیسلام دیارییان كردوون و ناڕاستی و پڕوپووچی یان روون كردوونەتەوە، بەڵام بە داخەوە هەموو كەس ئاگای لەوە نی یە، ئەمانیش بە زۆری بەناوی حەدیسەوە بڵاو بوونەتەوە، كەواتە نەشارەزا شوێنیان ئەكەویّ و وەریان ئەگریّ، دوژمنانی ئیسلامیش نان و پیازی خۆیانی پێوە ئەخۆن. هیچ رۆژیّ لە رۆژان ئاگری ئەو جەنگە نەكوژایەوەو بڵێسەی كز نەبوو هەتا ئێستا، بەڵكو سەموێنی یەتی و سەلیبێتی جیهانی هەمیشەیی و كوڵ نەدەرن لەسەر داونانەوەو پیلانگێڕی بۆ ئیسلام و موسڵمانان، هەمیشە خەریكن تێكیان بەردەنە یەكترو هانی خەڵكی یان لیّ ئەدەن. جەنگیان كرد لەگەڵ ئیسلام دا لە جەنگی سەلیبی یەكانی رۆژهەڵات دا، لە ئەندەلوس لە رۆژئاوادا، جەنگیان كرد لەگەڵی لە ناوەڕاست دا لە دواترین دەوڵەتی عوسمانیدا، تا ئەو دەوڵەتە گەورەیان پارچە پارچە كردو كەلەپورەكەیان دابەش كرد لەناو خۆیان دا، پێویست بوون بە دروست كردنی چەند فسفس پاڵەوانیّ لە خاكی ئیسلام دا بۆ بەجیّ هێنان و بەدی هێنانی داخ و كینە و پیلان و فرو فێڵی خۆیان دژی ئیسلام و موسڵمانان، ئینجا كاتیّ ویستیان خەلافەتی ئیسلام بڕوخێنن و دواترین شێوەی حوكمی ئیسلامی لە جیهان دا نەهێڵن فسفس پاڵەوانێكی وەك ئەتاتوركیان دروست كردو بڕیاریان دا لەناو خۆیان دا بیكەن بە سەرۆك و كاربەدەست لە وڵاتی توركیادا بۆ

بەجێ هێنانی ئامانجی پیسی خۆیان، ئینجا ئەم بە کرێ گیراوەیان لە پێش چاوی دانیشتوانی وڵات بەرزکردەوەو فویان پیاکرد، بەم رەنگە لەشکری سوێند خواران (حلفاء) پاش داگیر کردنی ئەستەمبوڵ کشایەوەو دەرچوو لێ ی، وایان پیشان دا ئەتاتورک دەری کردن و لە ترسی ئەو دەرئەچن!!

بەم فێڵە ئەو بەکرێ گیراوە زل کراو بوو بە هۆسەو هەڵداو ئافەرین کردن لە هەموو لایەکەوە، کە ئەم مەردە تورکیای سەندەوە لە حلفاو ناونرا (أتاترك) واتە باوکی تورك!!

ئینجا ئەو بێ ئایینە ناپاکە هەڵسا بە بەجێ هێنانی ئامانجە گڵاوەکانی سەلیبی و سەهیۆنی کە گرنگەکانی ئەم خاڵانەیە:

١- جێنشینی (خلافة) ئیسلامی هەڵگرت و جاڕی هەڵوەشاندنەوەو نەهێشتنیدا.

٢- بڕیاری کۆمارێکی تورکی بێ ئایینی داو ئەوەی بەدی هێنا.

٣- جاڕی پچڕانی خاك و گەلی تورکی یەی دا لە خاك و گەلی ئیسلام و نابێ ئیسلام هۆی پەیوەندی بێ لە خاکی تورکیادا.

٤- زمان وپیتی عەرەبی قەدەغەکردلەتورکیاداو ئەبێ زمان تورکی بێت و نووسین لاتینی، بۆئەمەبووقورئان وحەدیس لەبیرنەمێنێ و پەیوەندی نەمێنێ بە شەریعەتی ئیسلامەوە.

٥- ئینجا بەند بەندی قانون و یاسای ئیسلامی نەهێشت لە تورکیادا کە لەوەو بەر رەفتاری پێ ئەکرا، لەباتی ئەوانە قانون و یاسای لە ئەوروپا وەرگرت تەنانەت رەوای دا شوکردنی ئافرەتی موسڵمان بە گاورو جولەکە. نەفرینی خوای لێ بێ شەوو رۆژ هەزارجار. بۆ ئەمەی بە تەواوی شوێن کەوتووی ئەوروپا بێ رۆژی یەك شەمەی کرد بە رۆژی عوتڵەو ئیش نەکردن. هەزار بار نەفرینی خوای لێ بێ.

هەروەها ئەو جۆرە فسفس پاڵەوانەیان دروست کرد و ئەیانەوێ دروستی بکەن. رێ یان ئەدەن بۆ کردنی چەند ئیشێکی گرنگ تا بەرز ببنەوە لە پێش چاوی گەل و قسە وەرگیراوو لە گوێ کراو بن، ئینجا دوای ئەوە هانیان ئەدەن لە ئیسلام و هەموو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی. لای ئەوانە سۆزو لایەنگیریی تەنها بۆ ئیسلام قەدەغەو قاچاغە، هەموو ئاڵایەك رەوایە بێجگە لە ئاڵای ئیسلام! بت پەرست و گاورو جولەکە بەو جۆرە ناڕەوا چوون بە پێشوازی ئەم ئایینە پیرۆزەی کە خوا بۆی ناردن،

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾

---

ئەو وتەو قسە ناڕاستانەیان کرد دەربارەی خواو قورئان و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئینجا خوایش تاوانباریان ئەکات و دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ ئایا کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە درۆی هەڵبەستبێ لەسەر خوا، بەم ڕەنگە هاوبەشی بۆ دانابێ و پێغەمبەرەکەی بە درۆزن و قورئانەکەی بە جادو دانابێ، ئەوەش ئەکات و ئەڵێ ﴿وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ﴾ لە کاتێك دا کە بانگ ئەکرێ بۆ ئاییني ئیسلام و موسڵمانێتی کە شتێکی ڕێك و ڕوون و ڕەوانەو مایەی کامەرانی و خۆشبەختی هەردوو جیهانی یەتی؟ واتە هیچ کەس لەو کەسە ستەمکار تر نی یە. جا پەنا بەخوا لە حاڵی کەسێ کە خوا دایبنێ بە ستەمکارترینی هەموو ستەمکاران!! ئەو جۆرە کەسانە بە دەستی خۆیان و بە ئارەزووی خۆیان ئا بەو جۆرە لاڕێ ئەگرن و خۆیان ئەکەن بە ستەمکار ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوایش ڕێنموونی گەلی ستەمکار ناکات و نایانخاتە سەر ڕێگای ڕاست. بێ بڕواکان ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾ ئەیانەوێ ڕووناکی خوا بکوژێننەوە بە دەمی خۆیان، واتە ئەیانەوێ ئاییني ئیسلام نەهێڵن بە دەلەسەو پڕو پاگەندەو فاك و فیك. بەڵام بەو ئاواتە ناگەن، چونکە خوا ئەیەوێ ئەم ئایینە ببێ و ڕووناکی یەکەی بە تەواوی دەرکەوێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ﴾ خوا تەواوکەری ڕووناکی یەکەی خۆیەتی ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ با بێ بڕواکان پێ یان ناخۆش بێت، کەواتە با هەر داخ بێت لە دڵیان دا و هەر مەراق بخۆن.

ئەم ئایەتە لا لایەکەوە شتێکی زۆر ڕاستی گەیاند، لە هەمان کات دا شێوەیەکی نەخشە کێشاکە نائومێدی ئەدا بەدەرروونی بێ بڕواکاندا و هۆی ڕیسوایی و لاقرتی پێ کردنیشیانە! ئەمە شتێکی ڕاستە کە ئەوانە بە دەست و دەم تێکۆشابوون دەلەسەو پڕوپاگەندەیان

ئەکردو ئەیانوت ئەمە جادووە، هەروەها هەموو قسە ناڕاست و بێ تامەکانی تریان. هەموو پیلانێکیان بەکار ئەهێناو ئەیهێنن بۆ بەرگریی کردن و کوژاندنەوەی رووناکی ئیسلام. بەڵام هەر هەوڵ و تەقەلایە دایان و ئەیدەن وەکو ئەوە وایە بیانەوێ بەم هەموو بێ هێزی و لاوازی یەوە بە فو ئەو رووناکی یەی خوا دایناوە لەم بوونەوەرەدا بیکوژێننەوە، بیانەوێ بە فو بیکوژێننەوە!

خوای گەورە ئەو بەڵێنە بەهێزە دڵنیاکەرەی دا: فەرمووی خوا تەواوکەری رووناکی خۆیەتی. بە زوویی بەڵێنەکەیشی بە راست گێڕاو بەدی هێنا، ئەوە بوو هەر لە چەرخ و ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەو شەریعەتە جیهانی یە هەتا هەتایی یە لە ئاسمانەوە هێنایە خوارەوە. ئینجا ئەو گەلە موسڵمانە شێوەیەکی راستەقینەی بەدی هاتوی ئەو بەرنامە خوایی یەیان پێك هێنا لە ژیان دا، شێوەیەکە دروشم و نیشانەکانی روون و ئاشکرا بوون، سنوورەکانی نەخشە کێشراوو دیاریی کرابوون. کە هەموو تاقم و چینەکانی پاش ئەوان بتوانن نەخشەی بکێشن بە کردەوە نەك، بە تێڕوانین و سەرنج دان لەناو نووسراوو کتێبەکان دا، شێوە راستەقینەکەی ئیسلام بە تێرو تەواوی لە دڵ و لە وڵات دا دامەزراو جێگیر بوو پێکەوە، ئەو شێوە راستەقینە هەموو جارێ رائەپەڕێ و زیندوو ئەبێتەوە لەگەڵ ئەو هەموو جەنگ و پیلان و فڕ و فێڵ و سزاو ئازارو ئاوارە کردنەی کە رووی ئەکرێتە ئیسلام و موسڵمانان لە هەموو لایەکی جیهانەوە، چونکە رووناکی یەکەی خوا بە دەمی ئەو دوژمنانە ناکوژێتەوە، ئاگرو ئاسنەکەیان دەرەقەتی نایەو پەکی ناخات، ئەگەرچی سەرکێشە ستەمکارەکان و فسفس پاڵەوانەکان – کە سەلیبی و جولەکە دروستی کردن – لایان وابوو کە گەیشتبوون بە ئامانجی ئەوان و مەبەستەکەیان بەجێ هێناون. بێگومان بڕیاری خوا لەسەر ئەوە تێپەڕی و پێش کەوت کە ئەم ئایینی ئیسلامە زاڵ ببێ بەسەر هەموو ئایینێکدا،

هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿١٠﴾ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ
ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ

---

**کەواتە ئەبێ هەر وابێ و ئەوە بەدی بێت وەکو ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ﴾ خوا خوایەکە کە پێغەمبەرەکەی خۆی نارد ﴿بِٱلۡهُدَىٰ﴾ بە ڕێنموونی ﴿وَدِينِ ٱلۡحَقِّ﴾ بە ئایینی ڕاست و ڕەواوە ﴿لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾ بۆ ئەمەی زاڵی بکات بەسەر هەموو ئاین دا ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾ با هاوبەش بڕیار دەران و بت پەرستان پێ یان ناخۆش بێت، واتە با بزانن و داخ بێ لە دڵیاندا خوا ئەوە ئەکات.**

**شایەتی دانی خوا بۆ ئەم ئایینە، کە ڕێنموونی یەو ئایینی ڕاست و دروستە بەسەو هەر ئەو شایەتی یەو هەر ئەوە شتەو ئیتر هیچی تری پێویست نی یە. ئەوەی خوا ویستی بەدی هات، بەم ڕەنگە ئەم ئایینی ئیسلامە زاڵ بوو بەمەی کە ئایینێکی ڕاستەو هیچ ئایینێکی تر بەرامبەرکێ ی پێ ناکرێ و ناتوانێ لە ڕووی دا بوەستێ، چونکە ئەو ئایینانەی کە بت پەرستی یان تێدایە ئەوە هەر پڕوپووچن و شت نین. ئایینە نامەیی یەکانیش ئەم ئایینی ئیسلامە دواترینیانە، تەنها ئەم دواترین شێوەی تێرو تەواوو گشتی یانە، کەواتە ئەم هەر ئەوانە، بەڵام لە بەرزترین شێوەیان کە دەست بدا بۆ هەموو چەرخ و گەل و چینێك تا دواهاتنی ژیان لەم جیهانەدا.**

**ئەو ئایینە نامەیی یانە دەستیان تێ خراو گۆڕێنران و ناشیرین کران و بەش بەش کران و زیادو کەمیان لێ کرا، تا گەیشتنە ئەو رادەیە بەو شێوەیە کە ئێستا هەن دەست نادەن بۆ سەرکردایەتی ژیان و بەڕێوەبردنی کاروباری ژیان، ئەگەر وایشیان بەسەر نەهێنرایە هەر دەستیان نەئەدا بۆ ئەو مەبەستەی کە باس کرا، چونکە ئەو ئایینانە وەها نەهاتن کە هەموو مەبەستە داهاتووەکانی ژیان و جیهان بگرنەوە، چونکە لە بڕیاری خوادا نێرران بۆ ماوەیەکی دیاریی و چەرخێکی تایبەتی. لەبارەی ئایینێتی یەوە بەو جۆرە زاڵەو ئەو بەڵێنی خوا بەدی هات. لەبارەی واقیعی ژیانەوە، ئەو بەڵێنی خوا بەدی هات، ئەوەتا ماوەیەکی زۆر زاڵ بوو زۆربەی ئاوەدانی لە زەوی دا مل کەچ بوو بۆی، سەرکەوت بەسەر هەموو ئاینێك دا لەبارەی**

هێزو دەسەڵات و ڕژێمێتی حوکمڕانی دا، ئینجا بە بێ جەنگ و ئاژاوە کشا بۆ ناو جەرگەی ئەفەریقاو ئاسیا، بە بانگ کردنی رووت ژمارەیەکی زۆر گەورە موسڵمان بوون. پێنج قاتی هەموو ئەوانەی کە موسڵمان بوون لە هەموو ماوەی بزووتنەوەکانی جەنگ و تێکۆشانی پێشوو یەکەم جاردا، هەروەها پەرەی سەند و ئەکشێ و پەرە ئەسێنێ لە هەموو جیهان دا بە بێ ئەمەی تەنها دەوڵەتێکی لە پشت بووبێ لە کاتێکەوە سەهیۆنیەتی و سەلیبێتی جیهانی خەلافەتی عوسمانی یان رووخاند لەسەر دەستی فسفس پاڵەوانەکەی خۆیان دا، لەگەڵ ئەو هەموو پیلان و جەنگەی کە ئامادەیان کردووە بۆ بەرگری کردنی لە هەموو ناوچەو ولاَتێك دا، لەگەڵ پەلامار دانی هەموو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی لە هەموو ولاَتەکانی چەند فسفس پاڵەوانەکانی تر لە دەست کردی سەهیۆنێتی و سەلیبێتی جیهانی.

هەتا بێت ئەم ئایینە چەند دەوری هەیە و ئەیبێ لە مێژووی ئادەمی دا، ئەیبینێ هەڵئەسێ پێی، کە بەهۆی ئەوە هەر زاڵ ئەبێ بەسەر هەموو ئایینێك دا، ئەبێ ئەو بەڵێنی خوا هەمیشەیی بێت و هەوڵ و تەقەلای دوژمنە لاوازەکان هیچ کاری لێ ناکات و ئەو بەندە بێ نرخانە نەتوانن بەربەستی زاڵی بکەن، هەر ئەنداز هێزو پیلان و فڕو فێڵ بەکاربێنن.

بێگومان ئەم ئایەتانە پاڵ پێوەنەرێکی بەهێز بوون بۆ موسڵمانان لەسەر هەڵسانیان بە ئەرکی ئەو سپاردە گەورەیەی کە خوا هەڵیبژاردن بۆی لە پاش ئەوەی جولەکەو مەسیحی یەکان لە ڕێگای راست لایانداو هەڵئەسان بەو ئەرکە، ئەم ئایەتانە دڵخۆش کەرو ئارام دەر بوون بە دڵ و دەروونیان لە کاتێك دا ئەیانزانی بڕیاری خوا دەرچووە بەو زاڵ کردنەو ئەمان هۆو سەبەبێکن خوا بەمان و لەسەر دەستی ئەمان دا بڕیارەکەی خۆی بەدی ئەهێنێ، هەروەها ئەم ئایەتانە دڵخۆش کەرو ئارام دەرن بە دڵ و دەروونی بڕواداران کە دڵنیان بە بەڵێنی خوای خۆیان، هەر بەو جۆرە پاڵ پێوەنەرو دڵخۆش کەرو ئارام دەر ئەبن بۆ تاقم و چینەکانی داهاتوو هەتا بەڵێنی خوا جارێ تریش بەدی دێت لە واقیعی ژیان دا، بە ئیزنی خواو یارمەتی خوا.

ئینجا لەناو سێبەرو سەهەندی عەقیدەو بەڵێنی خوا بە زاڵ کردنی ئەم دواترین ئایینە، بانگ ئەکاتە بڕواداران، ئەوانەی کە یەکەم جار ئەو بانگ کردنەیان چوو بە گوێچکەدا و ئەوانەی کە هاتن پاش ئەوان و ئەوانەی کە لە داهاتوودا دێن تا ڕۆژی دوایی، بانگیان ئەکات بۆ سەر باشترو بە نرخ ترین بازرگانی لە هەردوو جیهان دا، بازرگانی بڕوا بە خواو تێکۆشان لە ڕێگای خوادا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە، بانگ

کردنەکە دەست پێ ئەکات بەناوی بڕواوە کە شیرین ترین و بەرێزترین ناوە، سەرنج ڕاکێش و هاندەرو پاڵ پێوەنەرە بۆ گوێڕایەڵی و وەرگرتنی فەرمان بە سۆزو پەرۆشەوە، ئینجا پرسیارێ ئەهێنێ بەدوای دا، پرسیارێکی وریا کەرەوە: ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئایا ڕێنموونیتان بکەم بۆ بازرگانی یەك کە ڕزگارتان بکات لە سزایەکی ئازار دەری بە سۆ؟

ئایا کێ هەیە ئارەزووی ئەو ڕێنموونی یە نەکات؟ ئایەتەکە لێرەدا دوایی ئەهێنێ و گوێگران ئەکەونە سۆزو پەرۆش بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە گرنگە. لەم کاتەدا بۆیان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾[1] بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، ئەو بانگ کراوانە بڕوادارن. کەواتە خۆشی و ڕووناکی ئەکەوێتە دڵیان لە کاتی بیستنی ئەم بەشە لە وەڵامەکەدا، چونکە ئەزانن بڕواداران، ﴿وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾ تێکۆشان بکەن لە ڕێگای خوادا بە ماڵ و گیانتان، واتە بۆ بڵاوکردنەوەو چەسپاندن و بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلام، ئەم بەشە لە وەڵامەکە مەبەستە سەرەکی یەکەیە کە سورەتەکەی پێوە خەریکە، لێرەدا بەو جۆرە ئەیخاتە بەرچاو، چەند بارە کردنەوە بەو جۆرە جۆرە وتن و گەیاندنە، بۆ ئەمەی هەڵسن بەو ئەرکە گرانە، کە ناچاری هەیە پێ‌ی و بە بێ ئەو بەرنامەی خوا ڕاگیر ناکرێ و پارێزگاری ناکرێ لە جیهان و وڵات دا....

ئینجا ئەو بازرگانی و کڕین و فرۆشتنە شیرین ئەکات و ئەیرازێنێتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەوە باشترە بۆتان ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە زانا بن و تێ بگەن.

بە کورتی لە پێشەوە فەرموی: ئەوە باشترە بۆتان، ئینجا بە درێژی چاکێتی یەکەی ڕوون ئەکاتەوە بەم جۆرەی کە دێت:

١- ﴿يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ خۆش ئەبێ لە هەموو گوناهەکانتان، بەڕاستی ئەمە بە تەنیا بەسە، ئایا کێ هەیە لێبوردنی گوناهی مسۆگەر بکرێ و ئیتر چاوەڕوانی هیچی تر بکات؟ یان لە ڕێگای ئەوەدا هەموو شتێ بەخت نەکات؟ بەڵام میهرەبانی خوا بەوەوە ناوەستێ، بەڵکو ئەمانەش هەن.

[1] ئەم دوو کردەوە بە ڕواڵەت ڕانەبردوون بەڵام مەبەست فەرمان دانە، لەبەر ئەوە بەو جۆرە تەفسیرم کردن.

٢- ﴿وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ئەیانخاتە باخات و بەهەشتانێکەوە کە رووبارەکان دێن و ئەچن لەژێروبنکیاندا، ﴿وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً﴾ نیشتەجێ یان ئەکات لە چەند جێگا و شوێن و کۆشکی پاك و خاوێن ﴿فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ﴾ لە بەهەشتانی هەتا هەتایی دا، بێگومان بازرگانی و کڕین و فرۆشتن لەوە چاکتر نابێ و قازانج لەوە گەورەتر نابێ کە بڕوادار تێکۆشان بکات لەم ماوە کورتەی ژیانیدا و لە باتی ئەوە ئەو هموو نازو رێزە کەس نەدیوەی پێ بدرێ بە بێ دواهاتن و بڕانەوە. بەڕاستی جێی خۆیەتی کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ هەر ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی زۆر گەورە. بەڕاستی قازانجەکە ئێجگار گەورەو گرنگە. بڕوادار وەرە بیر بکەرەوە ئەم جیهانە کەم و کورە پڕ لە داخ و دووره ئەدەیت و لە باتیدا رۆژی دوایی نەبڕاوەی نازو رێزو بێگەردو لەکە وەرگری!!

لە بازاڕی ئەم جیهانەدا هەرکەس بە درهەمێ چوار درهەم پەیدا بکات ئەبێتە تەحا تەحاو هەموو بازاڕی یەکان خۆزگەی پێ ئەخوازن. کەواتە ئەبێ ئەم کڕین و فرۆشتن و قازانجە چۆن بێ؟!!

لە شەوی پەیمانی عەقەبەدا ئەم مامەڵەو کڕین و فرۆشتنە بەستراو تەواو بوو لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەگەڵ عبدالله ی کوڕی رەواحە – خوای لێ رازی بێت – ئەوە بوو وتی بە پێغەمبەر (ﷺ) مەرج دانێ بۆ خواو بۆ خۆت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: مەرجم بۆ خوا ئەمەیە کە بیپەرستن و هیچ شتێ نەکەن بە هاوبەشی، مەرجم بۆ خۆم ئەمەیە: بەرگریم لێ بکەن لە هەر شتێ کە بەرگری خۆتان و ماڵی خۆتانی لێ ئەکەن... عبدالله وتی: کاتێ ئێمە ئەوەمان کرد ئینجا ئێمە چیمان بۆ هەیە و پاداشتمان چی یە؟ ئەویش فەرمووی: بەهەشت. عبدالله و هاوڕێکانیشی وتیان: مامەڵەکە قازانجی کردو نە رێگای هەڵوەشاندنەوە ئەدەین و نە داوای هەڵوەشاندنەوە ئەکەین.

هەرچەند قازانجی مامەڵەو بازرگانی یەکە لە بارەی ڕۆژی دوایی یەوە گەیشتە ئەوپەڕی ڕادەو پلە، بەڵام خوای میهرەبان چاکەو بەهرەی بێ سنوورە، بەندەکانی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ هەمیشە چاوەڕوانی قازانج و دەست کەوتی ئەم جیهانەیشن، لەبەر ئەوە پاداشت و دەست کەوتی ئەم جیهانەشیان بۆ باس ئەکات و بەڵێنی ئەوەشیان پێ ئەدات و کردی بە سێ یەم پاداشتیان:

٣- ﴿وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا﴾ چاکەو بەهرەیەکی ترتان بۆ هەیە کە خۆشتان ئەوێ و پێی خۆش حاڵ ئەبن، ئەوەش ﴿نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ یارمەتی دانێکە لە خواوە بۆتان و زاڵ کردنتانە بەسەر دوژمن دا، ﴿وَفَتْحٌ قَرِيبٌ﴾ گوشادی و دەست بەسەردا گرتنێکی نزیك وەکو گرتنی شاری مەککە. یان گرتنی فارس و ڕۆم و وڵاتەکانی تریش. لێرەدا قازانجەکە بە تەواوی بەرز بووەوەو گەیشتە پۆپەیە کە بێجگە لە خوا لای هیچ کەسی تر دەست ناکەوێ، ئینجا ئایا کێ یە ئەو کەسەی کە خوا ڕێنموونی بکات بۆ بازرگانی ئاواو کەچی ئەو کەسە خۆی بدزێتەوە و پەلاماری نەدا؟!!

لە کۆتاییدا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ مژدە بدە بە بڕواداران بەو پاداشتانەی کەباسکران. خوای گەورەبەزوویی بەڵێنی ئەم جیهانەی بەدی هێنا بۆ بڕواداران، ئەوە بوو لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا شاری مەککە گیراو پاك کرایەوە لە بت و بت پەرستی.

ئینجا لەوە بە دوا بە پانزە ساڵ ئیمپراتۆریەتی فارس و ڕۆم تەخت کراو هەوری ڕەشی ستەمیان لابرا، ئینجا پێش ئەمەی یەکەم چەرخی کۆچی تەواو ببێ بەیداخی ئیسلام بەرزکرایەوە بەسەر زۆربەی ئاوەدانی ئەو ڕۆژەی ئەم سەر زەوی یەدا، ڕووناکی چرای ئیسلام بەرەو هەموو وڵاتی ڕۆیشت. بێگومان بڕواداری ڕاستەقینە کە بە چاوێکی قورئانی سەرنجی خۆی و ژیان و بوونەوەر ئەدات، بەو بۆچوون و تێگەیشتنەوە ئەژی، هەرکات بیر بکاتەوە لە ژیان بەبێ ئەو بڕواو زانین و بۆچوونە فراوانە، ئەو کاتە بە باشی تێ ئەگات لە

گرنگی و نرخی ئەو بڕوا قورئانی یە، ئەزانێ بە بێ ئەو بڕوایە ناتوانی بژی، هیچ کات ناوەستێ و بە بێ دوو دڵی تێکۆشان ئەکات بۆ بەدی هێنانی ئەو بەرهەمە بەرزو زۆر بەنرخەی کە ئەو بڕوا قورئانی یە سەرچاوەیەتی. تێکۆشان و فیداکاری ئەکات بۆ بەدی هێنانی تا خۆی و خەڵکیش بژین بەو ژیانە بەرزە، لەوانەیە هیچ ئەجرو پاداشتێ داوا نەکات لەسەر تێکۆشانەکەی، چونکە ئەو تێکۆشانەو ئەو ئارام و خۆشی یەی کە ئەیخاتە دڵ خۆی بە خۆی ئەجرو پاداشتە، ئینجا ئەو بڕوادارە ناتوانێ بژی لە جیهان و وڵاتێك دا کە بڕوای تیا نەبێ، ناتوانێ دانیشێ بە بێ تێکۆشان و فیداکاری بۆ بەدی هێنانی جیهانێ کە بڕوای تیا زاڵ و سەرکەوتوو بێت، کەواتە ئەو بڕوادارە خۆی بە خۆی راپەڕیوو پەلامار ئەرە بۆ تێکۆشان و فیداکاری، نایەوێ کەس راپەڕێنێ و پاڵی پێوە بنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا خوا بەندەکانی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ کە لاوازی روو ئەکاتە دەروونیان، راپەڕینەکەیان خاو ئەبێتەوە، تێکۆشانەکەیان کول ئەبێت و تیژیی نامێنێ، ماندوویی داگیریان ئەکات، خۆشەویستی و ئارام و ئاسایش رادەی هەستی تێکۆشان ئەمێنێتە خوارەوەو دڵ و دەروون رائەکێشێ بۆ واز هێنان لە تێکۆشان و رازی بوون بەو بارو وەزعە ناڕەوای کە هەیەو دەقی پێوە گیراوە.

جا لەبەر ئەوە قورئان ئەو هەوڵ تێکۆشانە ئەکات لەگەڵ دڵ و دەروون دا، بەو جۆرە خەریکی ئەبێت و چارەسەری ئەکات، چەندو جارو بە چەند جۆر بانگی لێ ئەکات بە شێوەیەکی کاریگەرو راپەڕێنەر. نایداتە دەست بڕواکەی و حەواڵەی ئەوی ناکات، بە یەك بانگ لێ کردن کۆتایی نامێنێ، بەڵکو چەند جار بەناوی بڕواکەیەوە بانگی لێ ئەکاتەوە، بۆ وێنە ئەوەتا لەم سورەتەدا هەر لە سەرەتاوە هێنای لەبارەی راپەڕاندن بۆ تێکۆشان و فیداکاری تا گەیشتە ئەم چوار ئایەتەی دوایی یە کە بەو جۆرەو شێوە کەس نەدیوە فەرمانی دا بە تێکۆشان و فیداکاری و لەسەرەتاوە بەناوی بڕوا بانگی کردە بڕواداران. ئینجا ئەوەتا لەم دوو ئایەتی دوایی یەدا بانگ کردنەکە تازە ئەکاتەوەو کە شێوەیەکی تازەی هەیە و هاندان و پاڵ پێوەنانێکی تازەی هەیە، بە تێگەیاندنێکی تازەوە هاتووەو خەریك ئەبێ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ١٤﴾

ئەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانیٚ کە بڕواتان هیٚناوە ﴿كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ﴾ ببن بە یارمەتی دەرانی خواوبەرز کردنەوەی ئالأو بەیداخی ئایینی خوا. هەرچۆنیٚ هاوڕیٚ تایبەتی یەکانی عیسا بەو جۆرەیان کرد وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ﴾ هەرچۆنیٚ عیسای کوڕی مەریەم وتی بە هاوڕیٚ تایبەتی یەکانی خۆی ﴿مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ کیٚن یارمەتی دەرانی من بۆ بانگ کردن بۆلای خوا، کیٚن لەشکری من بەرەو یارمەتی دانی ئایینی خوا ﴿قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾ هاوڕیٚ تایبەتی یەکانی وتیان: ئیٚمە یارمەتی دەرانی خواین. ئەوانە قوتابی یەکانی حەزرەتی عیسا بوون (علیه السلام)، ئەڵیٚن: دوازدە کەس بوون کە هەمیشە لەگەڵی بوون و پەنایان پیٚ برد، لیٚ بڕابوون بۆ وەرگرتنی ئایینەکە لیٚ ی، لە پاش بەرزکردنەوەی عیسا ئەمان هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی ڕەوشت و تەعلیمات و پاریٚزگاری وەسیەت و فەرمانەکانی، ئەوانە بوون بەڕاستی لیٚ بڕا بوون بۆ ئەو کارە تا ڕیٚزو پاداشتی خۆیان وەرگرت و ناو بران بە یارمەتی دەرانی خوا کە ئەوەش گەورەترین نازناوو ڕیٚز پیٚدانە. عیسا (علیه السلام) هات بۆ ئەمەی مژدە بدات بە پیٚغەمبەری تازەو دواترین ئایینی خوا، کەواتە شویٚن کەوتووەکانی ئەم پیٚغەمبەرە (علیه السلام) شایستە ترن بە لیٚ بڕان بۆ ئەم کارە هەمیشەیی و ئایینە هەتا هەتایی یە، لەو یارە تایبەتی یانە کە لیٚ بڕان بۆ ئەو کارو ئایینە کاتییە!

ئینجابۆمان دەرئەخات ئەنجام و دوا ڕۆژی ئەو لیٚ بڕانی ئەوانە ئەفەرمویٚ: ﴿فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئینجا بڕوای هیٚنا بە پیٚغەمبەریٚتی عیساو ئایینی ڕاستی خوا تاقمیٚ لە نەوەکانی ئیسرائیل، ﴿وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞ﴾ تاقمیٚ بڕوایان نەهیٚنا ﴿فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ﴾ی ئینجا ئیٚمەش پشتیوانی ئەوانەمانکرد کە بڕوایان هیٚناو بەهیٚزمان کردن بەسەر دوژمنەکانیاندا ﴿فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە بڕوادارەکان گەڕان بە زاڵ و سەرکەوتوو بەسەر بیٚ بڕواکاندا.

ئینجا ئایا مەبەست بە بڕواداران هەموو مەسیحی یەکانە بە تێکڕایی چ ئەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستی عیسا بوون، چ ئەوانەی لایان دا، مەبەست بە کافرەکانیان جولەکە بێت کە دانیان نەنا بە پێغەمبەرێتی عیسادا، ئەو کاتە مەبەست بە زاڵ بوونیان زاڵ بوونە بە زۆرو دەسەلأت وەکو شتێکی ئاشکرایە لە مێژوودا هەمیشە ئەوان سەرکەوتوون بەسەر جولەکەداو جولەکە ژێر دەست و سەرشۆڕ بووە بۆیان، یان مەبەست بە بڕواداران ئەوانەن کە لە ڕێگا ڕاستەکەی عیسا لایان نەدا، نە عیسا و دایکیان لەکەدار کرد وەکو جولەکە، نە زیادە ڕەوویان کرد لە عیسادا بەم ڕەنگە بە خوای بزانێ یان کوڕی خوا یان سێ یەمی سیان، وەکو ئەو تاقمە مەسیحی یانە کە لە پاش بەرزکردنەوەی عیسا لایان داو گومڕا بوون، ئایەتەکە بۆ هەرکام لەم دووبارە دەست ئەدات، بەلأم لەسەر باری دووەم مەبەست بە زاڵ بوونی بڕواداران زاڵ بوونیانە بە ئایینە ڕاستەکەیان کە زاڵە بەسەر ئایینە پڕوپووچەکەی ئەوانی تردا بە رابەرو بەڵگەو نیشانەی بەهێز، یان زاڵ بوونیانە بە زۆرو دەسەلأتیش لە دواترین شێوەی ئایینی خوادا لەسەر دەستی پێغەمبەرو شوێن کەوتووەکانیدا(ﷺ) و رضی عنهم. کە زاڵ بوونەکەی لەم شێوەدا شتێکی ئاشکرایە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، کەواتە ئەم ئایەتە بڕین بەسەر هەرکام لەم دوو بارە ڕێك و ڕاستە.

ئینجاتەمێ و دەرسێ کە وەرئەگیرێ لەم بانگ کردنی دوایی یە و دەست نیشان کردن بۆ ئەو هەڵوێستەی هاوڕێ تایبەتی یانە هێنانە سۆزو پەرۆش و غیرەت نانەبەرە بۆ بڕواداران بەم پێغەمبەرو ئایینە دوایی یە، کە کران بە ئەمین دار بەسەر ئەم دواترین بەرنامەی خوا لە زەوی دا، کران بە میرات بەرو کەلەپوور وەرگری هەموو عەقیدەو پەیامەکانی خوا، هەڵبژێرران بۆ ئەم کارە زۆر گەورەو گرنگە، با بڕوادارانی ئەم ئایینە دوایی یە بە غیرەت بن و چاو بکەن لەو تاقمە کەمە لە هاوڕێ یەکانی عیسا کە هەڵسان بە کارو فرمانی خۆیان بە جوانی. خوا بە بەزەیی خۆی بەشدارمان بکات لە هەڵسان بەو کارە گەورە آمین.

١٤٠٢/١٢/٤ بەرامبەر ١٩٨٢/٩/٢٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ

## سورەتی (الجمعة)

## مەدینەیی یە و ١١ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورتە لە پاش سورەتی ﴿الصف﴾ هاتە خوارەوە چارەسەری مەبەستیٚ ئەکات کە سورەتی ﴿الصف﴾ چارەسەری نەکرد، بەلاٌم لەبارو روویەکی ترەوەو بەشێوەو رەوشتیٚ تر.

ئەم سورەتە ئەیەویٚ بیچەسپێنیٚ لە دلٌی گەلی موسلٌمانی مەدینەدا کە ئەمان لەم دوایی یەدا هەلٌبـژێرراون بـۆ هـەلٌگرتنی سـپاردەی عەقیـدەو بروایـەك کـە لای خـواوە هـاتووەو هەلٌبژێرراوە بۆ هەموو جیهان و جیهانیان، ئەوەش بەهرەیەکە خوا رشتوویەتی بەسەر ئەو کۆمەلٌەدا، ناردنی دواترین پێغەمبەر لەناو گەلی عەرەب دا چاکە و منەتێکی زۆر گەورەیە شایستەی سەرنج دان و سوپاس لەسەر کردنە، هەروەها چەند ئەرکێ پێویست ئەکات و ئەیخاتە سەرشانی ئەوانەی بروایان هێنا بەو پێغەمبەرەو ئەو سپاردەیان هەلٌگرت، ئەو کۆمەلٌە کە هەلٌگری ئەو سپاردەیەن دوابڕاو نابن و بەلٌکو چین لە دوای چین دێن بە درێژایی چەرخ و زەمان بە بیٚ پچڕان و نەمان، چونکە خوا بڕیاری دا ئەو ئوممەتە پاك بڕویٚ و گەشە بکات و پەل بکوتیٚ و درێژە بسێنیٚ، لە پاش ئەوەی نەوەکانی ئیسرائیل وازیان هێنا لە هەلٌگرتنی ئەو سپاردەیە و پەیوەندیان پچڕا بە سپاردەکەی ئاسمانەوە، دەست بەرداری تەورات بوون و رەفتاریان پیٚ نەئەکردو بە بەهرەمەند نەمان پیٚی، بە وێنەی کەریٚ کە بارخانەیە کتێب هەلٌگریٚ کە بێجگە لە ماندوویی هیچی دەست ناکەویٚ لەو هەلٌگرتنە. ئەوە بوو ئەو شتە راستە سەرەکی یەی کە ئەم سورەتە ویستی بیچەسپێنیٚ لە دلٌی موسلٌمانان دا، بە تایبەتی ئەوانەی کە لەو کاتەدا لە مەدینە بوون، ئەوانە کەسانیٚ بوون کە خوا بڕیاری

دابوو پێك هێنان و بەدی هێنانی بەرنامەکەی خۆی لەسەر دەستی ئەوان دا بەجێ بێنێ و ئەو مەبەستە گرنگەی بەستبوو بەوانەوە، هەروەها ئەو کۆمەڵ و تاقمانەی کە پاش ئەوان دێن کە لەو سورەتەدا دست نیشانیان بۆ ئەکات، کردوونی بە بەشێ لەو زنجیرەی کە بە درێژایی کات و چەرخ درێژە ئەکێشێ. لە هەمان کات دا ئەم سورەتە چارەی هێندێ لە حاڵەت و بەسەرهات ئەکات کە بووە لەناو یەکەم گەل و کۆمەڵی ئەم ئوممەتەدا. بە تایبەتی ئەدوێ لەرووداوێکی تایبەتی، کە ئەوەش ئەوە بوو لەکاتی خوتبە دانی پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژێکی جومعەدا، زۆر لە گوێگرانی مزگەوت ئەو گوێ گرتنەیان بەجێ هێشت و چوون بۆلای کاروانێ لە کاروانەکانی بازرگانی یەکانیان کە لەو کاتەدا گەیشتە بەرەوە، وەکو بە درێژتر لەکاتی لە کاتی خۆی دا باسی ئەکەین بە یارمەتی خوا، هەروەها لە چەند شتی تریش ئەدوێ وەکو پێی ئەگەین بە ئیزنی خوا.

ئینجا با گوێ شل کەین بۆ ئایەتە پیرۆزەکان ئەو شتە گرنگانە بدەن بە گوێچکەمان داو بیچەسپێنین لە دەروونماندا: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لەپاش ئەوە قاپی سورەتەکە ئەکاتەوە بە ئایەتێ کە یادو بە پاکی راگرتنی خوا نیشان ئەدات لەلایەن هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، لەگەڵ باسی چوار سیفەتی خوا کە پەیوەندی یەکی وردو ئاسکیان هەیە بە مەبەستەکانی سورەتەکەوە: ئەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ یادی خوا ئەکات و بە پاکی ناوی ئەبات و رای ئەگرێ هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەوی دایە ﴿ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ کەئەو خوایە پادشایەتی پاك و بە پاکی ناسراوو روو تێ کراوی زاڵ بەسەر هەموو شتێك دا و لێزان و کار دروست لە هەموو کارو بڕیاریدا.

ئینجادەست ئەکات بەمەبەستی سەرەکی لەسورەتەکەدا، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ﴾ ئەو خوا پادشای پاکەزاڵەکاردروستە﴿ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ﴾کەسێکەکەرەوانەیکردلەناونەخوێندەواراندا ﴿رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ﴾ پێغەمبەرێك لە خۆیان، واتە گەلی عەرەب. بەو گەلە وتراوە ﴿ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ﴾ واتە نەخوێندەوارەکان، چونکە ئەوانە لەو کاتەدا زۆربەیان نەخوێندەوار بوون و نووسین و خوێندنەوە باو نەبووە لەناویان دا وەکو لە حەدیسێکیش دا هەیە کە بوخاری و موسلیم و

ئەبوود داود و نەسائی ئەیهێنن لە ئیبن عمرەوە – خوا لێ یان رازی بێت – کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئێمە ئوممەتێکی نەخوێندەوارین نا نووسین و حیساب و ژمارە ناکەین، ئەو وشەیە دەست ئەدا بۆ مانا و مەبەستی تریش، کە بریتی یە لە هەموو تیرەو بەرەکانی تر بێجگە لە ئیسرائیلی کە ناو ئەبرێن بە نامەدار، هەروەك جولەکە کە گەلی ئیسرائیلی ناو ئەبەن و دای ئەنێن بە گەلی هەڵبژێرراوی خوا، بێجگە لەو ناو ئەبەن بە (جوییم) واتە ئومی یەکان و خەڵکی تر، لەوانەیە بڵێین: ئەمە بۆ ئێرە رێك تر بێت لەگەڵ مەبەستی سورەتەکەدا، لەسەر ئەم رایە وەکو لە رێوە درا لە دەماخی جولەکەکان وایە کە بە تەما بوون ئەم پێغەمبەریش لەوان بێت لە نەوەی ئیسرائیل بێت. ئەو جولەکانە ئومێدیان وا بوو ئەو دواترین پێغەمبەرە لەوان بێت، ئەو کاتە کۆیان ئەکاتەوە لە پاش پچڕان و پرژو بڵاو بوونەوەیان، زاڵ و سەرکەوتوویان ئەکات لە پاش شکاندن و ژێر کەوتنیان، سەربەرزییان بکات لە پاش ریسوایی و سەرشۆڕی، هەموو جارێ هەڕەشەیان ئەکرد لە عەرەبە بت پەرستەکان بە هاتنی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ)، بەڵام خوا بە لێزانی و کاردروستی خۆی ویستی کە ئەو پێغەمبەرە لە عەرەب بێت، لە تیرەو گەلی تر بێت نەك لە گەلی جولەکە، چونکە خوا زانی کە گەلی جولەکە کەڵکی نەماو بەکاری ئەم سەرکردایەتی یە تازەیە نایەت کە هات بۆ ئادەمی و جیهان، لە رێگای راست لایداو ون بوو کەواتە شایستە نی یە بۆ هەڵگرتنی سپاردەی خوا جارێکی تر، کەواتە با ئەو لاچێ و تاقمێ تر بێت کە سیفەت و نیشانەی سەرکردایەتی پێوەیە و شایانە بۆی. نزاو داوای ئیبراهیمی خەلیل (علیە السلام) کردی کە لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی لە پەنای ماڵی خوادا ئەبێ بەدی بێت، ئەو نزاو داوای کە قورئان بۆمان باس ئەکات و ئەیگێرێتەوە لێ یانەوە: ﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡ ﴾[1] ئەوداواونزایەکەبەنەیان چەرخ لەوەوبەرکرا، لای خواهەڵگیراومایەوەبە پارێزراوی هەتا کاتی دیاریی کراوو بڕیار دراوی خۆی دێت، بە پێی لێزانی و کاردروستی خوا.

---

[1] سورەتی ﴿ البقرة ﴾ پێویست بە راڤە نی یە، چونکە وێنەی ئەوە راڤە ئەکەین لەم ئایەتەدا کە خەریکین بە تەفسیرەکەیەوە.

پرسیار کرا له پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی خۆیەوە ئەویش فەرموی: ئیبراهیمی باوکم نزای کرد بۆ پەیدا بوونم، عیسا مژدەی دا بە هاتنم و دایکم کاتێ من لە سکی دا بووم نوورو رووناکی یەکی بینی لێ یەوە دەرچوو کۆشکەکانی شاری بوسرای لە وڵاتی شام دا بۆ رووناك کردەوە تا بینی منەت و بەهرەی خوا زۆر گەورەو ئاشکرایە بەسەر ئەوانەی کە ئەم پێغەمبەرەی تیا رەوانە کردن. گرنگ ترین ئەو بەهرەیانە ئەمانەن:

١- پێغەمبەرەکەلەوانە، کەئەوەمۆی شانازی یەوگەیشتن بەو پلەو رادەیەکی بەرزو بەرێزە.

٢- ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾ ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) ئەخوێنێتەوە بەسەریان دا ئایەتەکانی خوا، واتە ئەم قورئانە گەورەیە کە گەورەترین موعجیزەی خوایە.

کەواتە لە نەخوێندەواری دەری کردن و قاپی خوێندەواری لێ کردنەوە. یان لە ئومییەتی دەری کردن و گێرانی بە هەڵبژێرراوی خوا.

٣- ﴿وَيُزَكِّيهِمۡ﴾ پاك و خاوێنیان ئەکاتەوە , بەراستی پاك و خاوێن کردن ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) هەڵسا پێی بۆیان. پاك و خاوێن کردنی دەروون و ویژدان و هەستیان، پاك کردنەوەی کردەوەو رەوشتیان، پاك کردنەوەی ژیانی خێزان و ژن و مێردیی یان، پاك کردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی یان، پاك کردنەوەیە کە دەروون و ویژدانیانی پێ بەرز بووەوە لە عەقیدەو بیرو باوەری بت پەرستی بۆ عەقیدەو بیروباوەری خواپەرستی بە تەنیا، لە بۆچوون و تێگەیشتنی پروپووچ و بەتاڵ بۆ راست و رەواو سەحیح، لە نووسراوو قسەی پووچی کۆن و نەزانراو بۆ قسەی باسی روونی ئارام دەرو دڵنیاکەر. پێی بەرز ئەبێتەوە لە چەپەڵی و پەستی بێ ئەخلاقی بۆ پاکی و بێ لەکەیی و بەرزی خووڕەوشتی قورئانی، لە چڵك و پیسی سو و حەرام خۆری بۆ پاکی کەسابەت و دەست کەوتی حەڵاڵ و رەوا، بەراستی خاوێن کردنێ بوو گشتی بۆ کۆمەڵ و یەکە یەکە و ئەندامی کۆمەڵ، بۆ ژیانی نهێنی و ئاشکرا. خاوێن کردنەوەیە بوو کە ئادەمی بەرز کردەوە بۆ ئاسۆکانی رووناکی.

٤- ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ فێری کتێبیان ئەکات کە هەر ئەو تێرو تەواوو بێ کەم و کوری یە، کەواتە هەر ئەو شایانە ناو ببرێ بە کتێب وەکو تەنها ئەو کتێب بێت لەم جیهانەدا،

فێری ئەو کتێبەی کردن تا گەران بە ئوممەتێکی نامەدارو بوون بە خاوەنی گەورەترین نامەی خوا، ﴿وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ فێری رەوشت و کردەوەی خۆی کردن کە هەموو بەجێ و رەواو دروست بوو، چونکە خوا رێنموونی کەری بوو، فێری کردن هەموو شتێ بناسن لەسەر بارو شێوەی راستەقینەی خۆی و لە سنوورو رادەی خۆی دا فێری بریاری راست و کردەوەی دروست و بەجێی کردن. ئەو هەموو خێرو پیت و فەرەی بەسەرا رشتن لە کاتێك دا ئەوان نەزان و گومراو بێ ئاگا بوون لەوانە هەموو، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ بەراستی ئەوانە لەوەو پێش لە گومرایی یەکی روون و ئاشکرادا بوون. گومرایی نەزانی و جاهیلێتی یەکە جعفری کوری ئەبو طالب باسی کرد بۆ پادشای حەبەشە کاتێ کە قورەیش عەمری کوری عاص و عبدالله ی کوری رەبیعەی نارد بۆ لای پادشا بە دیاریی یەکی زۆرەوە بۆ ئەمەی ئەو موسڵمانە کۆچ کەرانەی کە پەنایان بردووە پێی و چوونەتە ولأتەکەی ناشیرین و بێ نرخ بکەن لای پادشا، هەڵوێستیان بێزراو بکەن. تا بەهۆی ئەوەوە دەریان کات لە ولأتەکەی و پەنایان نەدات، ئینجا پادشایش بە بەرچاوی نێرراوەکانی قورەیشەوە پرسیاری لێ کردن کە بۆچی لایانداوە لە ئایینی باوباپیریان و ئەم ئایینە تازەیە چی یە کەوتونەتە سەری، جعفریش – خوای لێ رازی بێت – وەلأمی دایەوەو وتی: ئەی پادشا ئێمە لەمەوبەر گەلێکی نەزانی نەخوێندەوار بووین، بتمان ئەپەرست، مردارەوەبوومان ئەخوارد، داوێن پیسیمان ئەکرد، بێ بەزەیی بووین و خزمایەتیمان نەئەزانی، دراوسێتیمان نەئەفامی، دەست دارمان بێ دەستی ئەخوارد، ئابەو جۆرە بووین تا خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین لە خۆمان، نەژادو بنەماڵەی ئەناسین، شارەزای راست و پاکیی و پاك کرداریتی، ئینجا ئەو پێغەمبەرە بانگی کردین بۆ پەرستنی خوا بە تەنیاو توردان و دوورکەوتنەوە لەو دارو بەردو بتانەی کە خۆمان و باوك و باپیرمان پەرستوومانە، فەرمانمان پێ ئەدا بە راستگۆیی و سپاردە دانەوە، خزم پەیوەستی، دراوسێ شناسی، خۆگرتنەوەو دوورکەوتنەوە لە سەروماڵ و ناموسی مەردووم، لە هەموو کارێکی ناشیرین و قسەیەکی درۆ لە خواردنی ماڵی هەتیو، بوختان کردن بۆ ئافرەتی داوێن پاك، فەرمانی پێداین بەمەی تەنها خوا بپەرستین و هیچ شتێ نەکەین بە هاوبەشی، بە نوێژو زەکات و رۆژوو. لەگەڵ ئەو هەموو نەزانی و گومرایی و بێ وێڵی یەی کە لەسەری بوون و تیایدا ئەژیان خوا زانی کە ئامادەیی یان تێدایە بۆ خێرو

چاکە، لەبەر ئەوە بڕیاری دا کە ئەوانە هەڵگری ئەم ئایین و عەقیدە ئەبن و ئەوان بن بە ئەمیندار بەسەریەوە، خوا زانی دەروونی جولەکە و ئیسرائیلی شێواوەو تێك چووە، کەواتە دەست نادەن بۆ هەڵگرتنی سپاردەی خوا، لەبەر ئەوە لە دەستی سەندنەوە و عەزلی کردن لەو کارە گەورەیە. خوا زانی کە نیوە دورگەی عەرەب لەو کاتەدا باشترین جێگایە بۆ دواترین ئایین و بانگەوازی خوا کە هات بۆ ئازاد کردنی جیهان و جیهانیان لە هەموو جۆرە بەندەیی یەکی ناڕەوا، ڕزگارکردنیان لە گومڕایی و نەزانی، لەو شارستانی یەتە بۆگەن و ڕزیوەی کە بوو لەو ئیمپراتۆری یەتانەی ئەو چەرخەدا! وەکو نووسەری ئەورووپایی باسی ئەکات لە کتێبی خۆی دا: العواطف كأساس للحضارە...

ئەڵێ: لە چەرخی پێنجەم و شەشەم دا جیهانی شارستانی و ئاوەدانی لە کەوتن و وێران بوونا بوو بە جۆرێ وەکو بەسەر لێواری کەندێکەوە بێت کە لە ژێرەوە رووخا بێت و بن کەن بووبێ بەهۆی بێ ڕژێمی و بێ سەرو پێییەوە، چونکە ئەو عەقیدەو بیروباوەڕانەی کە لەوەو بەر یارمەتی دەر بوون لەسەر ڕاگیر کردنی شارستانی هەموو ئەوانە رووخابوون و تێك شێوا بوون بە ملی یەك دا، لەوێدا شتێکی بەکارهاتوو نەبوو جێگری ئەو عەقیدەو بیرو باوەڕە پێشوانە بێت، لەو کاتەدا دەرکەوت کە ئەو مەدەنیەتە گەورەی کە بە چوار هەزار ساڵ پێك هاتبوو لە رووخان و تەواو بوون دا بوو، ئادەمێتی خەریك بوو لەناو بچێ و ئەگەڕایەوە بۆ هەرچی و پەرچی و بێ سەرو پێی یەك کە لە پێشەوە لەسەری بوو، هۆزو تیرەکان کەوتبوونە جەنگ و کوشتار لەناو یەك دا، نە یاسا بوو نە ڕژێم. ئەو ڕژێمانەی کە مەسیحی یەتی دایهێنابوون، هۆی رووخان و تەفرەقە بوون لە باتی یەکێتی و ڕژێم. شارستانێتی کە هەبوو بە ڕواڵەت، وەکو درەختێکی زۆر گەورەوابوو کەپەل و پۆوسێبەری کشابێ بەولاَتدا و با بیشەکێنێتەوە لە کاتێك دا کە لە ناوەوە سیسی و وشکی رووی تێ کردبێ هەتا ناوەڕۆکی... لە ناوەندی ئەو هەموو شێوان و تێك چوونەدا پیاوێ لە دایك بوو – واتە محمد – کە هەموو جیهانی کرد بە یەك....

ئەو شێوە خراپەی کە باس کرا وەرگیراوی نووسەرێکی ئەورووپایی یە کە چاوی ئەوەندە تیژ نی یە هەموو شتێکی خراپ ببینێ، ئەگەر بە چاوی دووربینی و وردبینی ئیسلامی سەرنج بدرێ تەم و تاریکی و ڕەشی ئەو چەرخە زۆر زۆر فراوانترە!

خوای گەورە ئەو گەلە نەزانە دوور لە شارستانی یەی هەڵبژارد لەو وڵاتە دەشت و ساراو کەم ئاوەدانی ئەو کاتەدا، هەڵی بژارد بۆ هەڵگرتنی ئەم ئایینە جیهانی یە، چونکە زانی هەڵنەگرن و شایستەی ئەو کارە گەورەیەن، هەڵی بژاردن بەم رەنگە پێغەمبەرێکی لەناویان دا رەوانە کرد، ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ﴾ لەناو کەسانی تر لەوان ﴿لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾ کە هێشتا نەهاتوون و نەگەیشتوون بەو یەکەم تاقمە.

دەربارەی مەبەست بەم کەسانە چەند ریوایەتێ هاتووە.... ئیمامی بوخاری ئەفەرموێ: ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ: ئێمە دانیشتبووین لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) سورەتی ﴿الجمعة﴾ هاتە خوارەوە بۆ سەری، دانیشتوان پرسیاریان کرد لێ ی لەم کەسانە کە هێشتا نەهاتوون، ئەویش وەڵامی نەدانەوە هەتا سێ جار ئەو پرسیارەی لێ کرا، سەلمانی فارسیمان لەناودا بوو، ئینجاپێغەمبەر (ﷺ) دەستی خستە سەرسەلمان و فەرموی: ئەگەر ئیمان لای ئەستێرەی کۆ بێت چەند پیاوێ یان پیاوێ لەوانە پێ ی ئەگات و دەستی ئەخات، ئەم فەرمودە وا نیشان ئەدات کە ئەو کەسانە فارسیش ئەگرنەوە، لەبەر ئەوە مجاهد ئەفەرموێ: ئەوانە غەیرە عەرەبەکانن و هەرکەسێ تر جگە لە عەرەب کە بڕوا بێنێ بە پێغەمبەر (ﷺ).

ئەبوحاتەم حەدیسێ ئەهێنێ لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی یەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بێگومان لە پشتی پشتی پشتان دا چەند پیاوو ئافرەت هەن لە ئوممەتی من کە ئەچنەبەهەشت بەبێ حیساب وپرسیار. ئینجائەم ئایەتەی خوێندەوە، ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾ واتە چین و تاقمەکانی پاش یەکەم تاقم و چین. هەردوو مەبەستەکە ئەگونجێ و ئایەتەکە هەردوو ئەگرێتەوە، چونکە وشەی ﴿آخرين﴾ دەست ئەدا بۆ کەسانی تر لە غەیرە عەرەب. کەسانی تر جگە لەو یەکەم چینەی کە ئایەتەکە دەربارەیان هات، ئایەتەکە دەست نیشانە بەمەی کە ئەم ئوممەتە زنجیرەیەکی دوورو درێژە ئەڕوا بەناو هەموو دۆڵێکی چەرخ و وڵاتێك دا، هەموو ئەڵقەکانی پەیوەستن پێکەوە، هەڵگری ئەم سپاردە گەورەیەن، پارێزەرو پاسەوانی دواترین ئایینی خوان. ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ هەر ئەو خوایە زاڵی کاردروستەو مەیلی هەرچی بکات ئەیکات و هەموو کارو فرمانیشی بەجێ یە و دروستە. رەوانە کردنی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) لەناو ئەم ئوممەتەدا بەهرەو رێز گرتنێکی زۆر گەورەیە بۆیان لە یەکەم تاقم و چینەوە تا دواترین چین و تاقم.

ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥﴾

---

**﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ﴾ ئەورەوانەكردنی پێغەمبەرە زیادە لوتف و میهرەبانی یەكی خوایە ئەیدا بە هەر كەسێ كەخوا خۆی بیەوێ و مەیلی بكات، ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ خوا خاوەنی بەهرەو بەخششی زۆر گەورەیە.**

**بەڕاستی هەڵبژاردنی خوا بۆ ئوممەتێ یان بۆ گەل و كۆمەڵێ یان بۆ تاقە كەسێ بۆ هەڵگرتنی سپاردەیەكی زۆر گەورەی وا، بۆ ئەمەی ببێ بە جێگا و شوێنی نوری خوای تیا دانرێ، بە بێ سەرچاوەیەك بۆ وەرگرتنی پیت و فەڕی خوا، بكرێ بە هۆی پەیوەندی و پەیوەستی لە ناوەندی ئاسمان و زەوی دا، بە راستی هەڵبژاردنی وا بەهرەیەكی وایە هیچ بەهرەیەكی تر هاوتای نی یە، گەورەترە لە هەموو گیان و ماڵ و ژیانێ كە بڕوادار بەختی بكات، زیادەی هەیە بەسەر هەموو ماندوویی ڕێگاو هەموو داخ و مەراق و ئێش و ئازار و بەسەرهاتی سەختی تێكۆشان.**

**خوای گەورە ئەو بەهرەیە ئەخاتەوە بیری ئەو موسڵمانەی كە لە مەدینەدا بوو لە یەكەم جارەوە، ئینجا هەموو تاقم و چینەكانی تری ئەم ئوممەتە كە لەو كاتەدا نەبوون و لە پاشان هاتن. ئەو بەهرە زۆر گەورەیان بیر ئەخاتەوە، سەرنجیان رائەكێشێ بۆ ڕەونەكردنی ئەم پێغەمبەرە لەناویاندا (ﷺ) كە ئایەتەكانی خوایان بەسەردا بخوێنێتەوەو پاك و خاوێنیان بكاتەوەو فێری قورئان و ڕەوشت و كرداری پاكی خۆی و ئەو بەرنامەی خواو ئەو شەریعەتە گەورەیان بكات، بەڕاستی بەهرەو چاكەكە ئێجگار گەورەو گرنگە، هیچ چاكەو بەهرەیەكی تری پێ ناگات، هیچ ئێش و ئازارو فیداكاریی یە لە ئاستی ئەوە چاونادات.**

**نامەدار لە گاورو جولەكە ویستیان ئەم ئایەتە بكەن بە بەڵگە لەسەر ئەوە كە پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆ سەر هەموو ڕەوانە نەكراوە، بەڵكو تەنها بۆ عەرەبە، یان بۆ غەیری نامەدار. بەڵام قسەكەیان ناڕاست و بێ جێ یە، چونكە ئایەتەكە ئەفەرموێ: ﴿بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ﴾ ڕەوانەی كردووە لەناو ئەوانەدا پێغەمبەرێ لە خۆیان، نەیفەرمووە: بعث للأميين**

أو إلى الأميين. رەوەنەی کرد بۆ ئەوانە یان بۆ لای ئەوان. دەی با پێغەمبەرەکە لەناو ئەوان دا ڕەوانە کرابێ و لەوانیش بێت لەگەڵ ئەوەدا بۆ سەر هەمووانیش بێت.

ئەگەر بە یەکێ لەم جۆرەش بوایە هەر نەئەبوو بە بەڵگە، چونکە هیچ کام لەم دوو جۆرە ئەوەی نەئەگەیاند کە تەنها بۆ ئەوانە و کورت هەڵهێنراوەتەوە سەر ئەوان، بێجگە لەوەش ئەم ئایەتە مەدینەیی یەی قورئان لە پێشەوە لە سورەتە مەککەیی یەکاندا وەکو ﴿الأعراف، الأنبياء، الفرقان، التكوير﴾ جاڕی گشتێتی ئەم پێغەمبەرو پێغەمبەرێتی یەکەی دا. لەکاتێك دا ئەو جاڕەی دا کە ئیسلام و موسڵمانان نەیان ئەتوانی دەرکەون، ئیتر با بوەستێ ئەو ئایەتانەی کە بە تایبەتی بانگی نامەدار ئەکەن بۆ بڕوا هێنان و هەڕەشەیان لێ ئەکەن بە سزای هەردوو جیهان، بە جەنگ و کوشتار لەگەڵیان ئەگەر بڕوا نەهێنن، با بوەستێ کە بەرنامە و بڕیارەکانی هەموو گشتێن بۆ هەموو جیهان و جیهانیان. کەواتە ئەوانە ئەو قسە ناڕەوا ئەکەن سەریان لە بەرد ئەدەن، ئەوانە نەفام و تێنەگەیشتوون نازانن ڕەوانە کردنی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە کە لە گەلێکی نەخوێندەواریشە بەڵگەو موعجیزەیەکی زۆر گەورەو روونە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی یەکەی، ئەگەر پێغەمبەر نەبوایە چۆن ئەم قورئانەی ئەهێنا کە هەموو ئادەمی و جن لە ئاستی دەستە پاچە و پەك کەوتوون. ئیمامی بوسیری چاکی فەرمو:

كفاك بالعلم في الأمي معجزة في الجاهلية و التأديب في اليتم [1]

لەپاش باسی ئەو هەڵبژاردن و ڕەوانە کردنە ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە جولەکە دەوری دوایی هات لە هەڵگرتنی سپاردەی خوادا، چونکە ئەو دڵەیان نەما کە هەڵگری سپاردەیەك بێت، کە هەڵگری ئەبێ دڵێکی زیندووی زانای تێگەیشتووی وشیاری بێت، کە خۆی ڕووت کردبێ و لێ بڕابێ بۆ هەڵگرتنی ئەو سپاردەیە. ئەفەرموێ: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ﴾ وێنەی ئەوانەی کە تەوراتیان درا بەسەردا، واتە ئەو جولەکانەی کە زاناو ئاشنا کران بە تەورات و داوای کردەوەو ڕەفتاریان لێ کرا پێی، ﴿ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا﴾ لەپاشان هەڵیان نەگرت بەم ڕەنگە گوێ یان پێ نەداو ڕەفتاریان پێ نەکرد ﴿كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا﴾ وەك وێنەی کەرێکە کە

---

[1] واتە ئەی پێغەمبەر بەسە موعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرێتی تۆ زانین و زانیاریت بە نەخوێندەواری و لە چەرخی نەزانی و لەناو گەلێکی نەزان دا، بەسە بۆ تۆ ئەو وێل و ئەدەب و ڕەوشتە شیرینە لە کاتێك دا کە بە هەتیویی پێگەیشتی و گەورە بووی!!

بارخانەیەك كتێب هەڵگرێ، واتە ئەو دوو هەڵگرە ئەرك و مەینەت ئەچەژن لەگەڵ شتی زۆر بەكارو پڕ سووددا و بێبەشن لە سوودو بەهرەكەی.

ئەوانە تەوراتیان درا بەسەردا، سپاردەی عەقیدەو شەریعەتیان خرایە سەرشان و داوای پاراستن و هەڵگرتنی ئەو سپاردە گەورەیان لێ كراو لە پاشان ئەوانیش گوێڕایەڵی یان نەكردو هەڵیان نەگرت... چونكە هەڵگرتنەكەی ئەمەیە لە یەكەم جارەوە تێی بگەن و بیزانن، ئینجا مەبەستەكانی بە كردەوە بەدی بێنن لە دەروون و ژیان دا، بەڵام ئەوانە نە تێی گەیشتن و نە ڕێزیان گرت و نە ڕەفتاریان پێ كرد، جا بەهۆی ئەوە وەك ئەو كەرە وان و بێجگە لە ئەرك و زەحمەت هیچ دەست كەوتێكی نییە.

وێنەكە بەڕاستی وێنەیەكی ریسواكەرو ئابڕو بەرە، بەڵام وێنەو شێوەیەكی ڕێك و ڕاست و ڕەوایەو ئەبێ هەروابێ، ﴿بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئای چەندە خراپ و ناشیرینە ئەو وێنەیەكەوێنەی گەلێكە كە بڕوای نەهێنا بە ئایەتەكانی خوا!! ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ خوا ڕێنموونی گەلە ستەمكارەكان ناكات. ئەوانە كە بڕوا نەهێنانیان لە جێگای بڕوا دانا، ئەوانەی كەبەدەستی خۆیان ستەمیانكردلە خۆیان و خۆیان خستە بەر سزای نەبڕاوەی خوا.

ئەم ئایەتە هەموو كەسێ تریش ئەگرێتەوە كە سپاردەی بڕواو عەقیدەی پێ سپێررا بێت و ئینجا هەڵنەسێ بە پێویستی سەرشانی خۆی، ئەو موسڵمانانەی كە بە ناو موسڵمانن لەم زەمانەداو ڕەفتاریان دوورە لە ئیسلامەوە، بە تایبەتی ئەوانەی كە قورئان و كتێبی شەریعەت ئەخوێنن و ڕاناپەڕن و هەڵناسن بە پێویستی سەرشانیان، ئەوانە هەموویان وەك ئەو كەرە وان، لەو بابەتەش ئەمڕۆ زۆر زۆرن!! خوا پەنامان بدات و بە بەزەیی خۆی یارمەتیمان بدات تا دووركەوینەوە لەو وێنە ئابڕو بەرە.

جولەكە لەو كاتەدا وای ئەزانی - وەكو ئەمڕۆیش وا ئەزانێ - كە خۆیان گەلی تایبەتی و هەڵبژێرراوی خوان، ئەوان دۆست و خۆشەویستی خوان، ئەوان بەهۆی ئەوەوە پێویست نی یە لەسەریان كردەوەیان باش بێت لەگەڵ ئەوانەی نامەدار نین، هەروەها چەند درۆو دەلەسەی تر كە هەڵیان ئەبەست بە دەم خواوە! جا ئەوا لێرەدا بانگ ئەكرێن بۆ ﴿مباهلة﴾ هەرچۆنێ مەسیحی یەكان و بت پەرستەكانیش بانگ كران و بەوە دەم كوت كران و نەیانتوانی بێنە مەیدان. ﴿مباهلة﴾ ئەمەیە دوو تاقم كە ئاژاوەیان هەبێ و دوو بەرەكی بن ڕوو بە ڕووی یەك بوەستن و هاوارو نزا بكەنە لای خوا كە هەركام لەسەر ناهەقە و درۆ ئەكات خوا لەناوی بەرێ و نەفرینی لێ بكات.

قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ
ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەی ئەوانەی کە بوون بە جولەکەو ئەو ئایینەیان گرتووەتە گەردن ﴿إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ﴾ ئەگەر ئێوە لاتان وایە کە دۆست و خۆشەویستانی خوان ﴿مِن دُونِ ٱلنَّاسِ﴾ بە بێ خەڵکی تر ﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ دەی ئاواتی مردن بخوازن و داوای بکەن لە خوا ئەگەر ئێوە راست ئەکەن لەوەی کە ئەیڵێن و لاف پێ لێ ئەدەن. پێغەمبەر (ﷺ) هەر تاقم و هەرکەسی بانگ کردبێ بۆ ﴿مباهلة﴾ نەهاتووەو نەیوێراوە بێت کە ئەوەش نیشانەیە لەسەر ئەوەی ئەوانە لە دڵی خۆیان دا خۆیان بەڕاست نەزانیوە و پێغەمبەرو ئاینەکەی ئەویان بەڕاست زانیوە، بەڵام بەدبەخت و چارە رەش بوون نەیانویستووە دان بە حەق دا بنێن و سەرداخەن بۆ حەق و راستی!!**

**ئیمامی ئەحمەد حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە، هەروەها بوخاری و ترمزی و نەسائی، کە ئیبن و عەباس فەرموی: ئەبو جەهل نەفرینی خوای لێ بێت، جارێ وتی: ئەگەر محمدم بینی لای کەعبەدا ئەبێ بچمە سەری و پێشێلی بکەم و پێ بنێم بەسەر ملی دا، ئەفەرموێ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی: ئەگەر ئەوەی بکردایە مەلائیکە بە ئاشکرا ئەهاتن ئەیانگرت، ئەگەر جولەکە داوای مردنیان بکردایە هەموو ئەمردن و جێگای خۆیان ئەبینی لە ئاگردا، ئەگەر ئەوانە دەرچوونایە بۆ ﴿مباهلة﴾ لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ئەگەڕانەوە نە ماڵیان ئەما و نە خێزان و کەس و کار.**

**هەڵئەگرێ مەبەست بەم ئایەتە ﴿مباهلة﴾ نەبێ، بەڵکو مەبەست تەنها بەر لێ بڕینەوە بێت لێ یان، بەمەی ئەگەر راست ئەکەن دۆست و خۆشەویستی خوان، ئیتر بۆچی ئەترسن**

له مردن و له هەموو کەس ترسنۆك ترن، لە کاتێك دا کە ئەوان بمرن ئەو پلەو بەهرەیان دەست کەوت ئەبێ لای خوا! ئینجا لە دوای ئەو بەر لێ بڕینەوە باسی ئەوە ئەکات کە ئەوانە ڕاست ناکەن لەوەی کەئەیڵێن و لاف پێوە لێ ئەدەن، خۆیان کە کردەوەیەکیان پێش نەخستووە دڵ ئارام بن پێی چاوەڕوانی پاداشت و نزیك کەوتنەوەی پێ بکەن لای خوا، گوناهو تاوانێکیان پێش خستووە ئەیانترسێنێ لە مردن و دوا ڕۆژی مردن، هەرکەس توێشووی پێ نەبێ ناتوانێ ڕێگای دوور بداتە بەر، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ ئەوانە هەرگیز ئاوات بۆ مردن ناخوازن و داوای ناکەن بەهۆی ئەو تاوان و گوناهەی کە کردوویانە و بە دەستی خۆیان پێشیان خستووە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا زانایەو ئاگادارە بە ستەمکاران. ئینجا ڕوونی ئەکاتەوە کە مردن شتێکی چار نەکراوەو دەرچوون لە دەستی نابێ، دوای مردنیش گەڕانەوەیە بۆلای خوا، حیساب و پرسیار لەسەر کردەوە شتێکی ڕاست و پێویستەو بێگومان ئەبێ ببێ، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ﴾ بەڕاستی ئەو مردنەی کە ئێوە لێ ی ڕائەکەن ﴿فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ﴾ بێگومان ئەو مردنەتان پێ ئەگات و توشتان دێت، ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ لەپاشان ئەگێڕێنرێنەوە بۆلای زانا و ئاگادار بە هەموو ئاشکراو نهێنی یەك، ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئینجا هەواڵتان پێ ئەدات بە هەر کردەوەیە کە کردووتانە لەم جیهانەدا.

ئەمە سەرنج ڕاکێشانێکی زۆر گرنگ و وریا کەرەوەیە بۆ هەموو کەس، چ ئەوانەی کە ئەو فەرمودەیان ئاراستە کرا، چ غەیری ئەوان و هەرکەسی تر، شتێکی ڕاستی ئاشکرا ئەخاتە دەروون کە خەڵکی لە بیریان ئەچێت، ئەوەیش کەوتووەتە شوێنیان و بەدوایان دا ئەگەڕێ لە هەر شوێنێ بن، ئەم ژیانە هەمیشە بەرەو دواهاتن ئەڕوات و ئەبێ دوایی بێت، دووری لە خوا تیای دا ئەبێ دوایی بێت بە گەڕانەوە بۆ لای، کەواتە هیچ پەنایەك نی یە مەگەر بۆلای خوا، حیساب و پرسیار لە پاش گەڕانەوە ئەبێ هەر ببێ و هەموو کەس بگات بە ئامانجی کردەوەی خۆی.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗا

ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە چوار ئایەت کە تایبەتین بە تەمێ و فێر کردنێ کە پەیوەندی بە نوێژی جومعەوە هەیە ئەوە بە بۆنەی رووداوێك کە لە سەرەتای سورەتەوە دەست نیشانمانکرد ولەروالەتی ئایەتەکەوەواوەرئەگیرێ ئەورووداوەزیاد لە یەك جار رووی دابێ. نوێژی جومعە ئەو نوێژە ناسراوەیە کە بەناوبانگە و پێویستە لە هەموو هەفتەیەك دا بەجێ بهێنرێ بەو مەرجانەی کە لە کتێبی زانایانی ئیسلام دا بە درێژیی باس کراوە، ئەو نوێژە ئەبێ بە جەماعەت و کۆمەڵ بەجێ بهێنرێ و موسڵمانان کۆ ببنەوە تیای دا و بگەن بە یەك و گوێ بگرن لەو خوتبە کە مۆچیاری یان ئەکات و خوایان بیر ئەخاتەوە، ئەوەش خواپەرستی و عیبادەتێکە کە سوودو بەرژەوەندی هەردوو جیهانی تێدایە لە گەلێ بارو رووەوە، وەکو لە شوێنی تایبەتی خۆی دا باس کراوە، هەموو هەفتەیەك موسڵمانەکان ئەمۆنێتەوەو فێری رژێمیان ئەکات، ئەوەش بە پێی باوی ئیسلام کە بە یەك جار موسڵمانان رائەپەرێنێ و ئامادەیان ئەکات بۆ ئەم دنیاو بۆ رۆژی دوایی، ئەو کردەوەیە لەسەر سروشتی ئیسلام کە ئایینێکی کۆمەڵی و گشتی یە، لەبارەی گەورەیی ئەم عیبادەتەو پێویستی و چۆنێتی بەجێ هێنانی و گەورەیی تاوانی ئەوانەی پێویستە لەسەریان و بەجێی ناهێنن. لەم بابەتانەو لە هەموو بارو روویەکی تریەوە چەند حەدیسێ زۆرو زەبەندە هاتووە، لێرەدا بە پێویستی نازانم باسکردنی ئەوانە، لەبەر ئەوە باسی ئەوانەم نەکردو لە سنووری ئایەتەکاندا وەستام. یەکەم ئایەت فەرمان ئەدا بە موسڵمانان کە واز بێنن لە کڕین و فرۆشتن، هەروەها هەر کارو فرمانێ تر بە بیستنی بانگ بۆ نوێژی جومعە، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ﴿إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ﴾ کاتێ بانگ درا بۆ نوێژ ﴿مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ﴾ لەرۆژی هەینیدا ﴿فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ﴾ واز بێنن لەکڕین و فرۆشتن و مامەڵە.

ئینجاهانیان ئەدات لەسەر گوێڕایەڵی و ئەو وازهێنان و چوونەیان بەلاوە خۆشەویست ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەوە باشترە بۆتان ئەگەر ئێوە تێ بگەن

و زانا بن. ئەم فەرمودەیە وا نیشان ئەدات کە کاروباری ژیان ئەوەندە راکێشەرو دڵ رفێنەرە واز لێ هێنان و دەست لێ هەڵگرتنی سەختە لە دەروون دا و پێویستی هەیە بەو هاندان و وریا کردنەوە لەلایەن خواوە، لە هەمان کات دا نیشان ئەدات و فێرمان ئەکات کە پێویستە بۆ موسڵمانان چەند کات و ماوەیەك دڵ و دەروونی تیادا بپڕن لە خەریك کەری ژیان و گوزەران و راکێشەرەکانی ئەم جیهان و زەوی یە، تا یادی خوا بکەن بە یەك بارو یەك دڵی، لێ بڕین بە یەك جار بۆ باس و یادی خوا، ئەم تام و مەزە خۆشە بچەژن، دڵ و سنگیان پڕ بکەن لەو نەسیم و هەوا پاك و خاوێنە بۆن خۆشەو بۆنە خۆشەکەی هەڵمژن.

ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ باسی کاروباری ژیان و خەریك بوون بەهۆی گوزەرانەوە کە دەستی پێ بکەنەوە بە یادو ناوی خواوە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ﴾ ئینجا کاتێ نوێژی جومعەبەجێ هێنرا ﴿فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ بلاوببنەوەبەزەویدا،﴿وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾ دوای رۆزی خواو خێرو بێرو دەستکەوتی ئەم جیهانە بکەون ﴿وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ باس و یادی خوا زۆر بکەن ﴿لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکو بگەن بە ئامانج و رزگار بن لە هەردوو جیهاندا.

ئا ئەوەیە هاوتایی و هاوکێشی یەك کە بەرنامەی ئیسلام هێنای و بەکاری ئەهێنێ، هاوکێشی لە ناوەندی پێویستیاتی ژیان لە زەوی دا، لە ئیش و کارو تێکۆشان بۆ دەست کەوتی ئەم جیهانە، وازهێنان و کەنارگیریی رۆح چەند کات و ماوەیەك لە خەریك بوون بەو هەوڵ و تێکۆشانەو لێ بڕان و یەك باری دڵ بۆ یادو باسی خوا، ئەم کەنارگیریی و لێ بڕانە بۆ یادی خوا پێویستی ئەو سپاردە گەورەیە کە دراوە بەسەری دا، باس و یادی خوا شتێکی پێویستە لەکاتی خەریك بوون و بە دوا گەڕانی هۆی ژیان و گوزەرانیش دا، ئەو هەست و یادە ئەوهەوڵ و تێکۆشانەیش ئەگێڕێ بەخواپەرستی و عیبادەت، بەلأم – لەگەڵ ئەوەیشدا– هەر پێویستی هەیە بەو چەند کات و ماوەی بۆ خەریك بوون تەنها بەو یادە پیرۆزەوە، بەو لێ بڕانە تەواوەوە، وەکو لەم دوو ئایەتەیشەوە وەرئەگیریێ.

ئین و ئەبی حاتەم ئەڵێ: عەراکی کوڕی مالیك کاتێ نوێژی جومعەی بکردایە هەڵئەسا و لەبەر قاپی مزگەوت دا ئەوەستا و ئەیفەرمو: ئەی خوا من هاتم بە پیری بانگەو بانگ کردنەکەتەوە، فەرزەکەتم بەجێ هێنا، بە پێی فەرمانی تۆ ئەوا بلاوەی لێ ئەکەم، کەواتە تۆیش رۆزیم بدەو لە چاکە و بەهرەی خۆت بەشم بدە و تۆ باشترین رۆزی دەرانی. بێگومان ئەو جۆرە راستی و تێگەیشتن و بە گەرمی گرتنە ئەو کۆمەڵ و گەلەی گەیاند بەو رادەو

پلەی کە پێی گەیشتن، لەگەڵ بوونی ئەو هەموو بەرگری کەرو شتی راکێشەرو خەریك کەرەی کە باوی چەرخی نەزانی و جاهیلی بوون و مابوونەوە لەو چەرخی ئیسلامیشدا.

لە وێنەی ئەوەی ئەم ئایەتە نیشانی ئەدات: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا﴾ کاتێ بازرگانی یەك ببینن یان دەف و تەپڵ و شتی بێ هودە ﴿انفَضُّوا إِلَيْهَا﴾ [1] بڵاوەی لێ ئەکەن و ئەچن بۆلای ئەو بازرگانییە، ﴿وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾ تۆبەجێ ئەهێڵن لە کاتێك دا تۆ وایت بە پێوە خوتبە ئەڵێیت بۆیان.

بوخاری و موسلیم و ترمزی حەدیسێ ئەهێنن لە جابرەوە – خوا لێ یان رازی بێت – کە ئەفەرموێ: جارێ ئێمە نوێژمان ئەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لەو کاتەدا کاروانێ هات خۆراکی پێ بوو، ئینجا خەڵکەکە چوون بۆلای کاروانەکە بە جۆرێ دوانزە کەس مانەوە کە ئەبوبەکرو عمر لەو دوانزە کەسە بوون، بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. بە درێژتر ئەم رووداوە ئەگێڕینەوە: گرانی و قاتی یە روو ئەدا لە مەدینە لە پاشان دحیەی کوڕی خەلیفە کاروانێ خۆراك ئەهێنێ لە شامەوە و لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) خوتبەی جومعەی ئەدا، ئینجا خەڵکەکە ئەچن بە دەم کاروانەکەوەو بڵاوەی لێ ئەکەن، نەوەك بەشیان نەمێنێ، ژمارەیەکی کەم ئەمێنێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: سوێند بە کەسێ گیانی منی بەدەستە ئەگەر هەموو دەرچوونایە بۆلای ئەو کاروانە خوا ئەم شیوەی پڕ ئەکرد لە ئاگر بەسەریان دا، مەدینەیی باویان وا بووە کە ئەو جۆرە کاروانە ئەهاتە بەرەوە ئەچوون بە پیری یەوە بە تەپڵ و چەپڵە رێزان، مەبەست بە وشەی ﴿لهو﴾ ئەوەیە. قتادە ئەفەرموێ: سێ جار ئەوە کرا لە کاتی گەیشتنی کارواندا.

[1] لە ئایەتەکەدا دوو شتی فەرمو: ﴿تجارة، لهو﴾ کەچی راناوەکە یەکێکە ﴿ها﴾ بۆکردنەوەی ئەو گرێ یە زانایان چەند شتێکیان فەرموە: ١– خاوەنی کشاف ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە لە ئەسڵ دا بەم جۆرەیە: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا﴾ ئەمیان لابراو ئەویتر نیشانەیە لەسەری. ٢– بە وشەی ﴿أو﴾ عەتف کراوە کە تەنیا یەکێکی ئەوێ، راناوی ﴿تجارة﴾ وترا چونکە ئەو مەبەستەکەیە و ﴿لهو﴾ ەکە لەبەر ئەو ئەکرا، دەرچوون بۆ ئەم لەبەر خاتری ﴿تجارة﴾ ەکەیە، یان لەبەر ئەمەیە بزانرێ کاتێ دەرچوون لەبەر ﴿تجارة﴾ ئەوەندە خراپ بێت ئەی لەبەر ﴿لهو﴾ چۆن بێت کە خۆی لە خۆی دا خراپە. ٣– ئەو راناوە ئەگەڕێتەوە بۆ وشەی ﴿رؤية﴾ کە وەرئەگیرێ لە ﴿رأوا﴾ بەلام ئەمە زۆر بلاو نی یە.

﴿قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ ئەوەی لای خوا دەست ئەکەوێ لە پاداشتی نوێژی جومعەو مانەوە بە دیاریی پێغەمبەرو گوێ گرتن لە خوتبەکەی و دانیشتن لە مزگەوتەکەیدا ﴿خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ﴾ چاکترە بۆتان لە گوێگرتن لە شتی بێ هودەو بێ نرخ ﴿وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِ﴾ لە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن، ﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ خوا باشترینی هەموو رۆزی دەرانە.

ئەم رووداوە دەری ئەخات ئەندازەی ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی کە بەکار هێنراوە لە دروست کردن و پێگەیاندن و پەروەردە کردنی دڵ و دەروون دا هەتا گەیشتە ئەو رادەیە کە ئەو کۆمەڵەی لێ پێك هات کە تاقانە کۆمەڵی هەڵکەوتوو بوو لە هەموو مێژووی ئادەمی دا، هەروەها ئەم رووداوە رێگای پەروەردە کردن روون ئەکاتەوە بۆ هەموو ئەوانەی کە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆلای خوا، بەشتێکی گەورەو ئارام و خۆگرییان پێ ئەدات لەسەر ئەوە هەموو لاوازی و کەم و کوڕی و لاری و نالەباری و لادان و دواو بەری کە دووچاریان ئەبێ لەو رێگادا، بە خۆگرتن و تێگەیشتن و دامەزراوی و بەردەوامی و کۆڵ نەدان هەموو گرێ یەك ئەکرێتەوەو هەموو کۆسپێ تەخت ئەکرێ پشت بە خوا.

وصلى الله و سلم على سيدنا محمد و على آله و صحبه

## سورەتی (المنافقون)
## مەدینەیی یەو ١١ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتەی کە ئەم ناوە تایبەتی یەی هەیە نیشانەیە لەسەر مەبەستی سەرەکی سورەتەکە: یەکەم سورەتی قورئان نی یە کە باسی ناپاکی و ناپاکان ئەکات، فرو فێلّ و پیلانیان دەرئەخات، لەوانەیە بلّێین هیچ سورەتێکی مەدینەیی نی یە کە باسێکی ئەوانی تیا نەبێ ئیتر بە ئاشکرا یان بە دەست نیشان کردن بەلاّم ئەم سورەتە لەوانەیە کورت هەلّبێتەسەر باسی ناپاکان و دوان لەوان و دەست نیشان کردن بۆ هەندێ لە رووداوو قسەو وتەی ئەوان.

ئەم سورەتە هێرشێکی زۆر بەتین ئەکاتە سەر خووڕەوشت و دەلەسەو پیلانەکەیان، دلّ پیسی و کینەو رقیان دەربارەی موسلّمانان، ترسنۆکی و ناپیاوی و کوێری دلّ و دەروونیان. لەم سورەتەدا جگە لەمەی باس کرا هیچی تر نی یە مەگەر سەرنج راکێشانێکی موسلّمانان لە دوا دوایی سورەتەکەدا بۆ بێدار کردنەوەو ترساندنیان لەوەی هیچ سیفەت و نیشانەیەکی ناپاکەکانیان پێوە بلکێ، لە دووریشەوە بێت، کەمترین رادەی ناپاکی لێ نەبڕانە بۆ خواو خۆ خاوێن نەکردنە لە نیازی هەر شتێ تر بێجگە لە خوا، بێ ئاگایی و لە بیر چوونی خوا بەهۆی خەریك بوون بە مالّ و بە ئەولادەوە، پشت هەلّکردن و خۆ دزینەوە لە بەخت کردن و بەخشینی لە رێگای خوادا.

بزووتنەوەی ناپاکی دەستی پێکرد لە مەدینەدا هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوەو درێژەی کێشا تا نزیکی لە دنیا دەرچوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ماوەدا هیچ کاتێ بە تەواوی نەبڕایەوەو لە ریشە نەهات، هەر چەند جار بە جارێ شێوەی ئەگۆڕا، بەو بزووتنەوەیە زۆر زیانی هەبوو، کاری کردوو کۆسپێکی گەورە بوو لەبەر پێی موسلّمانان دا، ئەندازێکی گەورەو قەبەی لە کات و تێکۆشان و توانینی موسلّمانان داگیر کردو خەریك کرد، ناوبردن و

باس کردنی ئەو بزووتنەوە نارەوا لە قورئان و لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) بە زۆری نیشانەیە لەسەر گەورەیی ئەو بزووتنەوەو بەرهەمی خراپ و کارکردنی لە ژیانی بانگ و بانگەوازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو چەرخەدا.

لەبارەی ئەو بزووتنەوەوە باسێکی چاکی تایبەتی هەیە لە کتێبی ﴿سيرة الرسول﴾ دا دانراوی مامۆستا (عزة دروزة) با لێرەدا چەند چەپکە گوڵێکی لێ بچنین، ئەفەرموێ: هۆی پەیدا بوون و دەرکەوتنی ئەو بزووتنەوەیە لە مەدینەدا شتێکی روونە، پێغەمبەرو موسڵمانان لە مەککەدا هێزو دەسەڵاتێکی وایان نەبوو کە خەڵکی لێ یان بترسێ یان چاوەڕوانی خێرو چاکەیان بن، تا بەهۆی ئەوەوە مەرایی و رووپامایی یان بکەن و بیانەوێ خۆیان نزیك بکەنەوە لێ یانەوە بە دیمەن و رواڵەت، لە پەناو لە ژێریشەوە بیان برنەوە، کە ئەوە پیشەی ناپاکەکانە بە شێوەی گشتی، دانیشتوانی مەککە بە تایبەتی سەرۆکەکان بە ئاشکرا دژی پێغەمبەرو ئایینەکەی هەڵسا بوون، هەرکام لە موسڵمانانیان بەر پل بکەوتایە سزاو ئازاری بەتینیان ئەدا، بە هەموو هۆیە بە بێ دەست گێڕانەوە بەرگری بانگەوازەکەی پێغەمبەریان ئەکرد (ﷺ)، ئەوەندە هێزو دەسەڵاتیان بوو موسڵمانەکانیان ناچار کرد بە کۆچ کردن لە یەکەم جارەوە بۆ حەبەشەو لە پاشان بۆ مەدینە، لەبەر پاراستنی ئایین و گیانیان، تەنانەت هەندێ لە موسڵمانەکانیان بە زۆر پێ هێنان و سزادان هەڵگێڕایەوە لە ئایینەکەی، یان بە هەڵخەڵەتاندن و شت پێدان، تەنانەت هەندێ لە موسڵمانەکان کەوتنە پەلەو زەلە و بێزار بوون و رووپامایی یان کرد بۆ بت پەرستەکان، هەندێ لەوانەی کە دامەزراو بوون لە ژێر سزاو ئازاردا شەهید کران و گیانی خۆیانیان بەخت کرد لە رێگای خوادا. بەڵام لە مەدینەدا کار بە جۆرێکی تر بوو زۆر جیاواز لە کاری مەککە، پێغەمبەر (ﷺص) توانی پێش کۆچ کردنی بۆ مەدینە چەند یارمەتی دەرێکی بەهێز پەیدا بکات لە ئەوس و خەزرەج کە دوو هۆزی بەهێزو سەرەکی بوون لە مەدینەدا، کۆچی نەکرد تا دڵنیا نەبوو لە هەڵوێستی خۆی لە مەدینەدا، لەوانەبوو هیچماڵێکی عەرەب نەمابێ لە مەدینەدا کە ئیسلامی تێ نەکەوتبێ،

کەواتە لەم کاتەدا ئەوانەی بڕوایان نەهێنا بوو نەیان ئەتوانی هەڵوێستی دوژمنایەتی دەربڕن و بە ئاشکرا دوژمنایەتی بکەن لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کە هێزی کۆچ کەران و یارمەتی دەرانی لە ژێر دەست دایە، بە تایبەتی کاتێ کۆڕو کۆمەڵی گەورە لە ئەوس و خەزرەج بەباشی موسڵمان بوون و پەیمانی یارمەتی وبەرگری لێکردنیاندا بە پێغەمبەر(ﷺ) و بڕوایان دامەزرا بەمەی پێغەمبەریانەو بەرزترین سەرکردەیە بۆیان و پێویستە گوێڕایەڵی کردنی، گەورەترین فێرکەرو ڕێگا پیشاندەریانەو پێویستە لەسەریان پەیڕەوی کردن و شوێن کەوتنی لە هەموو شتێك دا کاتێ کارەکە گەیشتە ئەو رادەیە ئەو کۆمەڵەی کە بڕوایان نەبوو نەیان ئەتوانی دوژمنایەتی و بێ بڕوایی خۆیان دەربڕن، هیچ چارەیان نەبوو ئەمە نەبێ کە خۆیان بە موسڵمان نیشان بدەن، لە پێش چاوی موسڵمانەکان نوێژە فەرزەکان بەجێ بێنن و هاوکاری بکەن لەگەڵ خزم و خوێشە موسڵمانەکانیان، هەموو پیلان و خراپەکاری یان بە شێوەی نهێنی بێت. بێگومان پیلان و هەڵوێستە ناڕەواکانیان زۆر سەخت و کاریگەر بوو، بەرهەمی زۆر خراپی بوو لەناو موسڵمانان دا وەکو ئایەتەکانی قورئان ئەیخاتە بەرچاومان، ڕێگری ئەو ناپاکانە و پیلان و خراپەکاری یان ئەوەندە بەتین و بەهێز بوو لەوانە بوو هاوتا بکرێن لەگەڵ ڕێگری و بەربەرەکانێ ی بت پەرستەکان دا، بەس ئەوەندە بوو لە مەدینەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان ڕەواو کاربەدەست بوو، هێزو دەسەلآت لەلایەن ئەمەوە بوو، ئیسلام پەرەی ئەسەندو جێگای فراوان ئەبووو ناپاکەکان کوتلەو کۆمەڵێکی ئاشکرا نەبوون کە یەکێتی و هاوکاری ببێ لەناویان دا، لاوازی و ژمارەی کەمییان هەمیشە بەرەو دواکەوتن ئەیبردن و بێ نرخی ئاشکرا ئەکردن، بە پێچەوانەی تەرەفی پێغەمبەرو یارەکانی کە هەمیشە بەرەو بەرزی و گەورەیی و هێزو سەرکەوتن ئەڕۆیشتن، ئەمە نموونەیەك بوو لەوەی کە لە کتێبەکەدا وتراوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ ﴿١﴾

---

ئەم سورەتە دەست پێ ئەكات بە باس و روون كردنەوەی رێگاو رچەیان لە شاردنەوەی بێ بڕوایی یەكەیان و دەربڕینی موسڵمانێتی و سوێند خواردنیان بە درۆ بۆ شاردنەوەی ئەو بارەی وان لەسەری، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ﴾[1] كاتێ ناپاكەكان بێنە لات ﴿قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ﴾ ئەڵێن: شایەتی ئەدەین كە بەڕاستی تۆ رەوانە كراوی خوایت. ئەوانە – وەكو خوا هەواڵی دا – هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەم شایەتی یەیان دا بە دەم، نەك بە راستی و بە دڵ، بەڵكو ئەوەیان وت بۆ خۆپاراستن، بۆ ئەمەی پێغەمبەرو موسڵمانەكان فریو بدەن و باری راستەقینەی خۆیان بشارنەوە لێ یان، كەواتە درۆ ئەكەن لەمەدا كە ئەڵێن شایەتی ئەدەین، چونكە مەبەستیان شایەتی دان نەبوو، بەڵكو مەبەستیان ئەوە بوو بەو قسەیە موسڵمان بخەڵەتێنن، بەوە ئیدارە سازی بكەن، جا لەبەر ئەوە خوا بە درۆی خستنەوە لە شایەتی دانەكەیان دا، لەوەدا كە ئەیانوت: شایەتی ئەدەین. چونكە – وەكو وترا – مەبەستیان شایەتی دان نەبوو، ئەوەی ئەوان وتیان شایەتی نەبوو چونكە شایەتی ئەبێ لە دڵەوە بێت و ئەوەی بە دەم ئەوترێ رێك بێت لەگەڵ ئەوەی لە دڵ دایە، وێنەو سێبەری ئەو بێت، خۆ ئاشكرایشە ئەو ناپاكانە دەم و دڵیان یەك نەبوو، كەواتە ئەبێ بە درۆیان بخاتەوە.

لەپێش بە درۆ خستنەوەكە فەرموی: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ﴾ خوا ئەزانێ كە بە راستی تۆ پێغەمبەرو نێرراوی ئەوی. ئینجا فەرموی: ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ خوا شایەتی ئەدات كە بەڕاستی و بێگومان ناپاكەكان درۆزنن. تا بە هیچ كلۆج نەگونجێ بە درۆ خستنەوەكە روو بكاتە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان (ﷺ) كە بەدەم وتراو بە رواڵەت شایەتی لەسەر دراوی ئەوان بوو.

---

[1] ﴿ المنافق ﴾ لە زمانی شەرع دا كەسێكە لە دڵ دا بێ بڕوا بێت و بەدەم بڵێ: بڕوام هەیە. لە زمانی كوردا ئەم وشەیە راڤە ئەكرێ بە ناپاك و وشەیەكی پڕ بە پڕ نی یە بۆی.

ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٣﴾

ئەو ناپاكانە هەر كاتێ دەركەوتنايە بۆ موسڵمانان يان بزانرايە بە پیلان و تەگبیرێکی خراپیان یان قسەیەکی پیسیان لە دەم دەرچووایە دەربارەی موسڵمانان، دەست بەجێ فریای خۆیان ئەکەوتن بە سوێند و پاکانە کردن و بەهۆی ئەوەوە خۆیان ئەپەڕاندەوەو ئەو سوێندەیان ئەکرد بە سوپەر وەکو ئەفەرموێ: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ﴾ سوێندە درۆکانی خۆیان ئەکرد بە قەڵغان و لە پەنایان دا خۆیان ئەپاراست و ئەشاردەوە لە کوشتن و زیان بۆ ئەمەی هەمیشە پیلان گێڕی خۆیان بکەن و خەڵکی فریو بدەن و بیانخەڵەتێنن. ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە بەربەستی مەردومیان کرد لە ڕێگای خوا، واتە بەهۆی ئەو سوێندە درۆیانە بە موسڵمان دائەنران، کەواتە موسڵمانان جەنگیان لەگەڵ نەئەکردن، بە وێنەی بت پەرستەکانی تر، لە هەمانکات دا نەئەوەستان لە پیلان و خراپەکاری دەبارەی ئیسلام و موسڵمانان و پەشیمان کردنەوەی هەرکەس بە گوێی بکردنایە لە یارمەتی ئیسلام و لەشکری ئیسلام دا، ﴿إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ بەڕاستی زۆر خراپ و بەد بوو ئەوەی ئەوانە کردیان، بە جۆرێ کردەوەیان جێگای سەرسوڕمانە! هۆی ئەو کردەوە خراپانەشیان ئەمەیە کە بەم فەرمودەیە روونی ئەکاتەوە: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو خراپانەی کە باس کرا بۆ ئەو ناپاکانە﴿بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە بڕوایان هێنا لە پاشان بێ بڕوا بوون، واتە بەدەم بڕوایان هێنا و لە دڵدا بێ بڕوا بوون، یان لای موسڵمانان بڕوایان دەردەبڕی و لە پاشان لای سەرۆك و شەیتانەکانیان وشەی بێ بڕوایی یان دەردەبڕی لەبەر لاقرتی کردن بە ئیسلام، یان مەبەست تاقمێکە کە لە پێشەوە بڕوایان هێنا و لەپاشان پەشیمان بوونەوەو هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام. ئەم باری سێ یەمە لە دڵ دا جێگیر ترە، چونکە باشتر دەست ئەدا بکرێ بە هۆی ئەو کردەوە خراپانەی کە باس کران لەم سورەتەدا. بەڵێ بەڕاستی هەر دڵێ بڕوای ناسی و لەپاشان لێی هەڵگەڕایەوەوبێ بڕوایی هەڵبژێرێ بەسەریدا، ئەودڵەزیندوونییەوبێ بەشەلەفام وتێگەیشتن، ئەبێ بەم جۆرەی بەسەر بێت کە ئەفەرموێ: ﴿فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ بەهۆی ئەوەوە مۆر نرا بەسەر دڵەکانیانداوقاپی دڵ و دەروونیان داخرا. ﴿فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ﴾ کەواتە ئەوانە تێ ناگەن و نازانن.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾﴾

ئینجا چەند وێنەو شێوەیەکی زۆر نایابیان بۆ نەخشە ئەکێشێ، کە هۆی ریسوایی و لاقرتی پێ کردنیانە، نیشانە داریان ئەکات بە بۆش و چۆڵی دڵ و کوێر بوونەوەی بینایی و ترسنۆکی و کینەو دڵ پیسی و دوژمنایەتی. ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ﴾ کاتێ بیانبینی لەش و قەبارەکانیان سەرسامت ئەکەن، بە قەڵەوی و بەرزی و جوانی و رێك و پێکی، کەواتە ئەوانە هەر بە لەش و قەبارەکانیان مەردوم سەرسام ئەکەن نەك بە پیاوەتی و سیفەتی ئادەمێتی! تا قسە ئەکەن و بێ دەنگ بن بەو جۆرە لەش و تاپاڵێکی جوان و رێکن. ﴿وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾ ئەگەر قسە بکەن گوێ ئەگریێ لە قسەکانیان لەسەر لووسی و شیرینی و رەوانبێژیی، ئەوانە لە دیمەن و رواڵەت دا بەو جۆرەن، بەڵام دڵ و دەروونیان بۆش و خاڵی یە لە ژیریی و تێگەیشتن و هەموو خێرێك، بێ کەڵك و بێ نرخن ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ﴾ وەکو چەند کۆتەرە دارێکی وشکن کە ﴿مُّسَنَّدَةٌ﴾[1] هەڵسپێررابن بە دیواردا، ئەو جۆرە کۆتەرانە بەکارنایەن بۆ هیچ شتێ بۆ سووتان نەبێ بە وێنەی لەشی ئەو ناپاکانە کە ئەکرێن بە سووتەمەنی دۆزەخ. خوا پەنامان بدات. ئەوانە خۆیان ئەناسی و ئەیانزانی چەندە داخ لە دڵ و ناپاکن دەربارەی ئیسلام و پێغەمبەرو یارانی. بە سوێندو پاکانە و مەرایی کردن و دەربڕینی بڕوا خۆیان داشاردبوو، جا لەبەر ئەوە هەمیشە لە بیم و ترس دا بوون لەوەی دەرکەون و ئەو پەردەیان بەسەرەوە نەمێنێ. بیم و ترسەکەیان لەم رادەیەدا بوو کە ئەفەرموێ: ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾ وا گومان ئەبەن هەموو تێخوڕین و جاڕدان و بانگ کردنێ بۆ سەر ئەوانەو دژی ئەوانە. واتە هەموو کات بێ ئارامن و هەر چرکەو دەنگ و جاڕدانێ ببیستن وا ئەزانن مەبەست ئەوانە بە دوای ئەوان دا ئەگەڕێن و پەردەکەیان دڕاوەو دەرکەوتوون. ﴿هُمُ الْعَدُوُّ﴾ هەر ئەوانن دوژمنی راستەقینە، دوژمنی ناوخۆی شاراوەن و

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە ئەم رستەیە لە مەبەست دا سەربەخۆیەو پەیوەندی نییە بە رستەی پێشووەوە، بە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە کە پەیوەندی ببێ بە جۆرێ تەواوکەری ئەوە بێت. بەو جۆرەیش ئەگونجێ و باشە. بەڵام جۆری تەفسیرەکە بەهێزترەو دڵ پێی بە ئارام ترە، خوا خۆی باش ئەزانێ.

هەمیشە وان لە کەمین دا و هەر هەلێکیان بۆ هەڵکەوێ بەسەری دا تێپەڕ ناکەن و بە دەم و لە روویش دا خۆیان ئەکەن بە دۆست، کە ئەوەش لە دوژمنی روو بە روو ئاشکرا خەتەر ترەو زیانی گەورەترو زۆرترە، ﴿فَٱحۡذَرۡهُمۡ﴾ کەواتە خۆتیان لێ بپارێزەو وریای خۆت بەو بە دیمەن و رواڵەتیان فریو نەخۆی، لەگەڵ ئەوەیش دا فەرمان نەدراو رێگای پێغەمبەر (ﷺ) نەدرا بیانکوژێ و جەنگ و کوشتاریان لەگەڵ بکات، بەڵکو خیتەیە تری لەگەڵ بەکار هێنان و رێگایەکی تری دایە بەر، وەکو بۆمان دەرئەکەوێ نموونەیە لەوە توێژێکی تر، کە ئەو خیتەو رێگایە رێك و رەواتر بوو، بەرژەوەندی یەکی ئاشکرای تیابوو. ﴿قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا بیانکوژێ و نەفرینیان لێ بکات ﴿أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ چونکە ئەوانە لادراون و وەرگێڕاون لە رێگای راست؟!!

ئەمە نزایە لەلایەن خواوە کە ئەوە بڕیارێکی بڕاوەی چار نەکراوو بەرگری نەکراوە، ئەوەش بوو چارەنووس و دواڕۆژیان، هەموو ئەوانە خوا لەناوی بردن بە نەفرین لێ کراوی بەرەو دۆزەخ هەتا هەتایە.

ئینجا هەروا لەسەر باسی بەد کرداری ئەو ناپاکانە ئەڕواو هەندێ وتارو کرداری چەپەڵیان لێوە ئەگێڕێتەوە کە بەڵگەو نیشانەیەکی روونن لەسەر پووچی و تێك چوونی دڵ و دەروونیان و نیاز پیسی و بەد نیهادییان دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) و درۆو ناڕاستی یان لەکاتی روو بەڕوودا، ئەوەش چەند کردەوەو رەوشتێکن کە ناپاکان بەناوبانگن پێ یانەوە. وەکو ئەوانەمان بۆ روون ئەبێتەوە لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا کە زانایان ئەفەرمون: لەبارەی عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هاتن، کە ئەو عبدالله یە سەرۆکی ناپاکەکانی مەدینە بوو. جا پێش ئەوەی بچینە سەر ئایەتەکان چاك وایە هۆی هاتنە خوارەوەیان بزانین:

ئیبن و ئیسحاق بە درێژیی ئەوە ئەگێڕێتەوە لە باسی جەنگی (بنی مصطلق) دا کە روویدا لە ساڵی شەشەمی کۆچی دا. لە پاش دواهاتنی ئەو جەنگە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئاوێ کە ناوی مریسیع بوو دابەست و خستی، مەردوم چوون بۆ ئاوو لەوێدا کرێکارێکی حەزرەتی عومەر ناوی جهجاه بوو.لەگەڵ سنانی کوڕی وەبری جهنی دا بوو بە دەمە قاڵی و شەڕیان و تێ هەڵگژان، ئینجا جهنی هاواری کردە مەدینەیی یەکان و جهجاهیش هاواری کردە مەککەیی یەکان، واتە کۆمەڵی یارمەتی دەران و کۆمەڵی کۆچ کەران. ئینجا لەوێدا عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول رقی هەڵساو لەناو کۆمەڵێك دا وتی: چۆن شتی وایان کرد؟ بەڕاستی پەرەیان سەندووەو زۆریان پێ هێناوین لە وڵاتەکەی خۆمان دا، والله ی ئێمەو ئەو لات و لوتانە وەکو پەندی پێشینانمان بەسەر هات کە ئەڵێ: سەگەکەت قەڵەو بکە

با بت خوا!! والله ی ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە ئەبێ زاڵ و دەسەڵات دار بێ دەسەڵات و زەبوون دەرکات لە مەدینە، واتە ئەبێ ئەوان دەرکەین. ئینجا روو ئەکاتە ئەوانەی کە لەوێدا ئەبن لە گەلەکەی و پێ یان ئەڵێ: ئەمە خۆتان بەسەر خۆتانتان هێنا، هێنانتانە ولاتەکەتان، کردنتان بە هاوبەشی خۆتان لە ماڵ و داراییتان دا، بزانن سوێند بەخوا ئەگەر لێ یان گەڕێن و دەستی خۆتان ئەخەنە کار دەرئەکرێن لە ماڵەکانتان بۆ ولاتێکی تر. زەیدی کوڕی ئەرقەم گوێی لەوە ئەبێ و ئەو هەواڵ و قسەو باسە ئەهێنێ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەدا عومەری لە خزمەت دا ئەبێ و عەرزی ئەکات: فەرمان بدە بە عبادی کوڕی بشر با بیکوژێ. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی: ئەی عومەر چۆنە ئەو کاتە خەڵکی بڵێن: محمد هاوڕێکانی خۆی ئەکوژێ؟ نەخێر ئەوە نابێ بەلام فەرمان ئەدات بە بار کردن و ڕۆیشتن، بەلام کاتەکە کاتێکە هەرگیز لەوەبەر پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتنی تیا نەکردووە، ئینجا مەردوم هەموو باریان کردو کەوتنە ڕێگا، عبدالله ی ناپاك کاتێ بیستی زەید ئەو دەنگ و باسەی گەیاندووە چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) سوێندی خوارد بە خوا کە ئەوەم بە دەم دا نەهاتووە، لەناو تاقم و گەلەکەی دا بەڕێزو گەورەبوو، ئەوانەی کە لەوێدا بوون لە تاقمەکەی وتیان: ئەی پێغەمبەر رەنگە ئەو کوڕە، واتە زەید لێ ی تێك چووبێ و قسەکەی وەرنەگرتبێ، ئەیانویست قسەکەی لێ دوور خەنەوەو بەرگری لێ بکەن.

ئین ئیسحاق ئەفەرموێ: ئینجا کە پێغەمبەر (ﷺ) سواربوو هەرکەوتە ڕێ اسیدی کوڕی حضیری تووش بوو، ئەسید ڕێزی پێغەمبەرێتی پێشکەش کردو سەلامی لێ کرد، لەپاش ئەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، والله ی کاتێکی زۆر ناخۆشە کەوتنە ڕێ هەرگیز لە کاتی وادا نەڕۆیشتووی و سەفەرت نەکردووە، ئەویش فەرموی: ئایا نازانی هاوەڵەکەتان چی وتووە؟ اسیدیش وتی: کام هاوەڵ؟ ئەویش فەرموی: عبدالله ی کوڕی ئوبەی. ئەویش فەرموی: چی وتووە؟ ئەویش فەرموی: وتویەتی: ئەگەر ئێمە گەڕاینەوە بۆ مەدینە ئەو کەسەی کە زاڵ و بە دەسەڵات ترە ئەبێ بێ دەسەڵات دەرکات لە مەدینە، اسیدیش وتی: کەواتە والله ی تۆ ئەو دەرئەکەیت ئەگەر ئارەزوو بکەیت، والله هەر ئەو بێ دەسەڵات و زەبوونە و تۆ دەسەڵات دارو زاڵی، لە پاشان وتی: ئەی پێغەمبەر نەرمی و بەزەیی بەکاربێنە لەگەڵی، والله خوا تۆی هێنا بۆ ئێمە لە کاتێك دا کە ئەو گەلەکەی خەریك بوون تاجیان بۆ دروست ئەکردو بیکەنە سەری، ئەزانی تۆ ئەو پادشای یەت لە دەست دەرکرد!

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکەکەی دایە بەرو نەیوەستاندن ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە، ئەو شەوەیشیان هەتا ڕۆژ بووەوە، بەشێ لە ڕۆژی دواییش هەتا خۆر گەرمی کردو ئازاری دان. ئینجا فەرمانی دا وەستان و خستیان، ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو راکشان و خەوتن، ئەوەشی بۆ ئەمە کرد خەریکیان بکات لە قسەو باسەکەی دوێنێ کە سەرۆکی ناپاکەکان کردی. ئیبن ئیسحاق ئەڵێ ئەم سورەتە هاتە خوارەوە کە خوا باسی ناپاکەکانی تیادا ئەکات، دەربارەی عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و هەرکەسێکی تر کە وێنەی ئەو بوو. ئینجا کاتێ هاتە خوارەوە پێغەمبەر (ﷺ) گوێچکەی زەیدی کوڕی ئەرقەمی گرت و فەرمووی: ئەمە ئەوە بوو کە راستی کردو بۆ خوا گوێی گرت.

ئەو هەواڵ و فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) گەیشت بە عبدالله ی کوڕی عبدالله ی ئوبەی، ئینجا هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وا گەیشت پێم کە تۆ ئەتەوێ عبدالله ی باوکم بکوژی، جا ئەگەر تۆ ئەوە هەر ئەبێ بکەیت فەرمان بدە بە خۆم ئەچم سەرەکەی دێنم بۆت، خۆ والله هۆزی خەزرەج ئەزانن هیچ پیاوێکیان نی یە لەمن چاکتر بێت بۆ باوکی، من ئەترسم فەرمان بدەی بە کەسێ تر بیکوژێ، ئینجا ئەترسم نەفسم وازم لێ نەهێنێ سەرنجی باوک کوژم بکەم بگەڕێ لەناو خەڵك دا و بەهۆی ئەوەوە بچم بیکوژم. ئەو کاتە موسڵمانانێ ئەکوژم لەباتی ناموسڵمانێکدا، بەهۆی ئەوەوە بچمە ئاگر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر شتی وا ناکەین، بەڵکو نەرمی و نیانی لەگەڵ ئەکەین و هاوڕێ یەتی ئەکەین بە شیرینی و جوان تاماوە لەناومان دا، ئەو کردەوە شیرینەی پێغەمبەر (ﷺ) وای لێ کرد لەپاش ئەوە گەلەکەی هەر نارێکی یەکیان لێ بدیایە بە توندی سەرزەنشتیان ئەکردو خەتاباریان ئەکردو سەریان ئەکردە جەرگی، ئینجا فەرمووی بە عومەر - خوا لێ ی رازی بێت - کاتێ کە بیستی گەلەکەی عبدالله ئاوان. فەرمووی: ئەی عومەر ئێستا چی ئەڵێیت؟ والله ئەو ڕۆژەی کە تۆ وتت فەرمان بدە با بیکوژم، فەرمانم بدایە و بت کوشتایە و بت کوشتایە لوتی چەند کەسێکی پێ ئەسوڵایەوە کە ئەگەر ئەمڕۆ فەرمانیان پێ بدەم بە کوشتنی ئەیکوژن. عومەریش عەرزی کرد: والله ئەزانم کە کارو فرمانی پێغەمبەر (ﷺ) گەورەترو بەفەڕترە لە کارو فرمانی من.

عیکریمە و ابن زوید و چەند کەسی تر ئەگێڕنەوە کە کاتێ خەڵکی گەڕانەوە بۆ مەدینە عبدالله ی کوڕی عبدالله لە قاپی مەدینەدا وەستا، شمشێرەکەی دەرکێشا، ئینجا لەبەرەوە خەڵکی تێپەڕیان ئەکرد بەلای دا، ئینجا کاتێ باوکی گەیشتە بەرەوە پێ ی وت: بۆ دواوە!

ئەویش وتی: چیتە بەسەرمەوە؟ هاوار بۆ تۆ! ئەمیش وتی: والله لێرە تێناپەڕی هەتا پێغەمبەر (ﷺ) ئیزنت نەدا، چونکە هەر ئەو زاڵ و بەدەسەلاتەو تۆ بێ دەسەلات و زەبوونی! ئینجا کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەگاتە بەرەوە کە باوی وا بووە لە دوای لەشکرەوە ئەهات لەبەر دواکەوتو و ون بو و داماو، عبدالله شکات ئەکات لە عبدالله ی کوڕی، ئینجا ئەمیش ئەڵێ: والله نایەتە مەدینە هەتا تۆ ئیزنی نەدەیت، ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) ئیزنی ئەداو ئەمیش ئەڵێ: ماتوڵ ئەو ئیزنی دای ئێستا تێپەڕە.

پێویستە بە قوڵی بیر کردنەوە لەم جۆرە ڕووداوانەو لەو جۆر جۆرە پیاوانەو لەم بەرنامەی پێگەیاندن و پەروەردە کردنەی کە خوا داینا بۆ بەندەکانی. با سەرنجێ بدەین لەو گەل و کۆمەڵە هەڵکەوتووە کە ئەو تاقمە ناپاکە خۆیان تێ کێشا، ژیان لەناوی دا نزیکی دە ساڵ لە ماوەی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) لەو ماوەیەدا دەری نەکردن لە ڕیزی موسڵمانان، بەناوو بە شەخسی نەیئەناسین تا کەمێ پێش لە دنیا دەرچوونی، ئەگەر چی بە دەم و دامان و بە شێوەو نالەباری یان ئەیناسین. ئەوەش لەبەر ئەوە بوو بێ بڕوایی و ناپاکی یەکە لە دڵیان دا بوو، کاروباری دڵی خەڵکیش بە دەست کەس نی یە بێجگە لە خوا، تەنها خوا ئەزانێ چی لە دڵ دایەو خوا حیساب و پرسیاری لەسەر ئەکات، ئیتر بەندەیانی خوا هەر دیمەن و ڕواڵەتیان بۆ هەیەو بە دەستیانە، بۆ ئەمەی نەنیشنە ملی خەڵکی و بە پێی گومان و بۆچوونی خۆیان، بەو پێ یە بڕیار نەدەن لە کاروباری خەڵکی دا! کاتێ خوا پێغەمبەری حاڵی کردو زانای کرد لە دوا دوایی ژیانی دا بەو چەند کەسە ناپاکە کە لەو کاتەدا بوون و خوا ئەیزانی هەر بە ناپاکی ئەمێننەوە، کاتێ زانای کرد بەوانەو ناوەکانی دیاریی کرد بۆی، پاش ئەوەیش هێشتا هەر دەری نەکردن لە ڕیزی موسڵمانان دا لە کاتێك دا کە بە درۆ موسڵمانێتی خۆیان دەرئەبڕی و فەرزەکانیان بەجێ ئەهێنا لەبەرچاوی موسڵمانەکان، بەس تەنیا کەسێکی ئاشنا کرد پێ یان کە حذیفەی کوڕی یەمان بوو – خوا لێ ی ڕازی بێت – ئەوە لەناو موسڵمانان دا بڵاو نەبوەو کەسی تر نەیئەزانی، تەنانەت عومەر خوا لێی ڕازی بێت ئەهاتە لای حذیفە و پرسیاری لێ ئەکرد لە بارەی خۆیەوە، ئایا ناوی ئەم هەیە لەو ناوانەدا و پێغەمبەر (ﷺ) ناوی ئەمی بردووە؟!! حذیفەش هەر ئەوەندەی ئەوت: ئەی عومەر تۆ لەوان نیت، زیاد لەمەی نەئەوت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پیا درا کە نوێژ نەکات لە هیچ کام لەوانە کاتێ مردن، ئینجا هاوەڵەکانی کاتێ بیان دییایە نوێژ ناکات لەسەر هەرکەس بۆیان دەرئەکەوت کە ئەوە لەو ناپاکانەیە. لەپاش پێغەمبەر (ﷺ) حذیفە نوێژی نەئەکرد

لەسەر هیچ کام لەوانە. عومەریش هەڵنەئەسا بۆ نوێژکردن لەسەر هیچ مردوویەك تا نەیزانیایە حذیفە نوێژی لەسەر ئەکات! ئا بەو جۆرە ئەو رووداوانە ئەهاتن و تێپەڕیان ئەکرد – بەو جۆرەی بڕیاری خوای لەسەر بوو – بۆ پەندو تەمێ دادان و پەروەردە کردن و داڕشتنی کۆشکی رەوشت و رژێم و وێڵ و ئوسوڵ.

ئەم رووداوەی کە ئەم ئایەتانەی تیا هاتە خوارەوە بە تەنیا جێگای چەند تەمێ و مۆچیاری گرنگە. عبدالله ی کوڕی ئوبەی ئەژیالەناو موسڵماناندا، نزیك لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەو هەموو رووداوانە ئەهاتن بە دوای یەك دا و ئەو هەموو ئایەتانە ئەچوو بە گوێچکەی دا بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر روون بوون لەسەر راستی ئەم ئاینە و پێغەمبەرە. بەڵام خوا دڵی نەئەخستە سەر رێگای راست. چونکە ئەو چاکەو بەهرەی بۆ نەنووسی بوو، ئەو داخ و کینەی کە چوو بووە دڵی یەوە بوو بە پەردەو بەرهەڵست لە بەردەمیدا، داخ و کینەی لە دەست دەرچوونی پادشایەتی ئەوس و خەزرەج بەهۆی هاتنی پێغەمبەرەوە، لە لایەکی ترەوە ئەوە عبدالله ی کوڕی خوا لێ ی رازی بێت کە وێنەو نموونەیەکی بەرز بوو بۆ موسڵمانی راستەقینەی لێ بڕاو بۆ خوا.

دڵگران و دڵتەنگ ئەبوو بەهۆی باوکی و کردەوە خراپەکانی یەوە شەرمەزار ئەبوو لە هەڵوێستە نارەواکانی، بەڵام لە هەمان کات دا دڵی رێزو بەزەیی تیا بوو بەرامبەری وەکو چاکترین کوڕ لە ئاستی باوکی خۆی، بیستی کە پێغەمبەر (ﷺ) نیازی کوشتنی ئەو باوکەی کردووە، بەهۆی ئەوە چەند سۆزو هەستێکی جیاوازی دژی یەکتر لە دەروونی دا پەیدا بوو، کە بەرەنگاریان وەستا بە بێ پێچ و پەنا و بە هەموو هێزی دڵەوە. بێگومان ئیسلامی خۆش ئەوێ، گوێڕایەڵی پێغەمبەری (ﷺ) پێ خۆشە، پێ ی خۆشە بەسەر سەر هەموو فەرمانێکی بەجێ بێنێ با ئەو فەرمانە کوشتنی باوکیشی بێت. بەڵام لە هەمانکات دا ئەترسێ خۆی بۆ نەگیرێ سەرنجی باوك کوژی خۆی بدات بکەوێ لەناو خەڵك دا، ئەترسێ شەیتان بەسەری دا زاڵ ببێ و لەباتی کافرێك دا موسڵمانێ بکوژێ و بەهۆی ئەوە خوا بیخاتە ناو ئاگری دۆزەخ. ئینجا پەنا ئەبا بە پێغەمبەرەکەی و سەرکردەکەی کە چارەسەری بکات بەو جۆرە فەرمان بدات بە خۆی سەری ئەو باوکە بەڕێزەی بۆ بێنێ، بێگومان ئەشی هێنا!!

پێغەمبەری ئازیزیش (ﷺ) ئەو دڵە بڕواداره بە تەنگ هاتووەی بینی، بەهۆی ئەوەوە بەڕێزو چاوپۆشی یەوە ئەو دڵتەنگی یەی نەهێشت و سڕی یەوە: فەرمووی: نەخێر شتی وا ناکەین، بەڵکو نەرم و نیانی لەگەڵ بەکار ئەهێنین، بەخۆشی و شیرینی هاوڕێ یەتی ئەکەین

تا ماوه لە ناوماندا. ئینجا با سەرنجێکی کردەوەی نایابی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین لەو ڕووداوەدا بەو جۆرە لێزانی و دروستی یە، ئەوە بوو ئەو ماوە دوورو درێژە خەڵکەکەی خستە ڕێ و خەریکی کردن بە ڕۆیشتن و نەخەوتنەوە تا بە تەواوی ماندووی کردن، بۆ ئەمەی ئەو ڕەگەزایەتی یە بۆگەنەیان لەبیر بباتەوە کە هاوار کردنی ئەو دوانە خەریك بوو هەڵیگیرسێنێ کە لەسەر ئاوەکە هەراو ئاژاوەیان بوو، هەروەها ویستی خەڵکەکە دوور بخاتەوە لە ئاگری کینەو دووبەرەکی یەك کە عبدالله ی کوڕی ئوبەی هەوڵی دا بۆ کردنەوەو هەڵگیرساندنی. بۆ ئەمەی ئەو برایەتی و خۆشەویستی یە کەس نەدیوەی پێ بسوتێنێ کە لە ناوەندی موسڵمانانی مەککەیی و مەدینەیی دا بوو.

ئینجا قسەو وتو وێژی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ اسیدی کوڕی حضیرو وەڵام دانەوەی شیرین و بەهێزی اسید بۆی – خوای لێ ڕازی بێت –. لە دوای هەموو شتێ با بوەستێ لەبەردەم شێوەی شیرینی کەس نەدیوی موسڵمانی ڕاست عبدالله ی کوڕی عبدالله کە چۆن شمشێری گرت بە دەستی یەوەو ڕێگای مەدینەی گرت لە باوکی و بەرگری کرد لە هاتنە مەدینەتابزانێ و بۆی دەرکەوێ کە خۆی زەبوونەو زاڵی و سەربەرزی هەر بۆ پێغەمبەرە(ﷺ) هەر بەو جۆرە بیوەستێنێ هەتا پێغەمبەر بێت و ئیزنی بدات، ئینجا لەسەر ئیزن و فەرمانی ئەو بێتەوە مەدینە، کەواتە بە کردەوەو بەراورد کردن بۆی دەرخست کە کێ زەبوونە و کێ زاڵ و بە دەسەڵاتە.

بەڕاستی ئەوە پۆپەی هەرە بەرزو دواترین پلەیە کە ئیسلام ئەو گەل و کۆمەڵەی بۆ بەرزکردەوە، بەرزی کردنەوە بۆ سەر ئەو لوتکە بەرزە، لە کاتێك دا کە دوای ئەوە هەر ئادەمی بوون و لاوازی ئادەمێتی یان هەر تیا بو، ئەوە جوانترین و ڕاست ترین وێنەو شێوەیە لەم عەقیدەو ئایینەدا، کاتێ مەردوم تێی بگات و بارە ڕاستەقینەکەی وەرگرێ. کاتێ بگەڕێ بە نوێنەری ڕاستەقینەی ئەم ئایین و عەقیدەیە.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾
سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ
ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ وَلِلَّهِ
خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾

---

ئینجا با بێینە سەر تەفسیری ئەو ئایەتانەی کە ئەو ڕووداوانەیان گرتووەتە خۆیان، بژین لە ژێر سێبەر و سەهەندیان دا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ کاتێ بوترێ بەو ناپاکانە ﴿تَعَالَوْا﴾ وەرن ﴿يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ﴾ با پێغەمبەر داوای لێ بوردنتان بۆ بکات لە خوا ﴿لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ﴾ مل پێچی ئەکەن و سەریان با ئەدەن و لاقرتێ یان لێ دێ ﴿وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ﴾ ئەیانبینی ڕوو وەرئەگێڕن ﴿وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾ لە کاتێك دا کە بە دەمارو خۆ بە زل زانن.

ئەوانە کردەوەی خراپیان ئەقەومان، دەم درێژیی یان ئەکرد. ئینجا کاتێ ئەیانزانی هەواڵیان گەیشتووە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەترسان و ئەهاتن بە سوێندو پاکانە کردنەوە، ئینجا کە پێ یان بوترایە وەرن با پێغەمبەر (ﷺ) داوای سڕینەوەی گوناهتان بۆ بکات، لەکاتێك دا کە هیچ بیم و ترسیان نەبوایە، مل پێچی یان ئەکردو ڕوویان وەرئەگێڕا لەبەر لە خۆ گۆڕان و خۆ بە زل زانی یان! ئەم دوو سیفەتە دوو نیشانەن لە دەروونی ناپاکان و لە یەك جوێ نابنەوە، بێ هێزو ترسنۆکن لە کاتی ڕوو بە ڕوو شتێ ڕوویان تێ بکات، لە خۆگۆڕاوو خۆ بە زل زانن لەکاتی ئارام و خۆشیدا.

لەبەر ئەوە دەربارەیان ئەم فەرمودەیە هات و ڕووی کرایە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ﴾ یەکسانە بۆیان ﴿أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ﴾ ئایا داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکەیت یان داوای لێ خۆش بوونیان بۆ نەکەیت ﴿لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ﴾ هەرگیز خوا لێ یان خۆش نابێ،

چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ﴾ بەڕاستی خوا ڕێنموونی گەلی بەدکارو لە سنوور دەرچوو ناکات.

ئینجا بەشێ لەو بەد کاریی و لە سنوور دەرچوونەیان باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە ئەڵێن: ﴿لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ دەست گیرۆیی ئەوانە مەکەن کە لای پێغەمبەرن و شتیان مەدەنێ، واتە کۆچ کەران ﴿حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ﴾ با بڵاوەی لێ بکەن، واتە کە ئێوە نەتانژیاندن ئەو کاتە لە برسان بڵاوەی لێ ئەکەن و ئاوا زۆر نابن تا لامان لێ ببڕنەوە و زۆرمان پێ بهێنن. ئەم قسەو تەگبیرە ئەوپەڕی ناپیاوی و نامەردییان دەرئەخات، ئەم تەگبیری برسی کردن و بێ نەوا کردنە وا دیارە دوژمنایەتی ئایینی خوا هەر لە کۆنەوە بەکاریان هێناوەو هەمیشە بەکار ئەهێنن لە هەموو چەرخ و وڵاتێك دا بۆ بەرگریی کردنی ئایینی خواو جڵەوگیریی و دوورخستنەوەی مەردوم لێ ی، ئەوانە بەهۆی پەستی و هەست پیسی خۆیانەوە هەر خۆراك و گوزەران بە شت دائەنێن، ئەوە هەموو شتە لە ژیان دا. کەواتە بەو چەکە جەنگ ئەکەن لەگەڵ بڕواداران دا، کە بەلایانەوە چەکێکی چار نەکراوو بەگری نەکراوە، ئەو کردەوە پیسە بت پەرستەکانی قورەیش بەکاریان هێنا لەگەڵ پێغەمبەرو بڕواداران دا، ئەوە بوو هەموو پەیوەندی و پەیوەستی یەکیان پچڕی لێ یان و لە مەککە دەریان کردن بۆ دۆڵ و شیوە دوورەکان، بڕیاریان دەرکردو نووسییان و هەڵیانواسی بە کەعبەدا کە هیچیان پێ نەفرۆشن و هیچیان لێ نەکڕن و ژنیان نەدەنێ و ژنیان لێ نەخوازن. ماوەی سێ ساڵ ئەوە درێژەی کێشا تا خوا کارێکی کرد هەر بە خۆیان ئەو بڕیارەیان سڕی یەوە. ئەو کردەوە نامەردانە شیوعی یەکان بەکاریان هێنا لە وڵاتی خۆیان دا کارتی تموین نادەن بە بڕواداران، بۆ ئەمەی لە برسان بمرن یان دەست لە بڕوا بە خواو خواپەرستی هەڵگرن و نوێژ بە جێ نەهێنن. هەروەها لە هەندێ

ولاّتـی ئیسلام دا ئـەو کـردەوە پیـسە بـەکارهێنرا بـۆ جڵـەوگیریی لـە بزووتنـەوەو راپـەڕینی ئیسلامی لەو ولاّتانەدا.

ئا بەو جۆرە لە کۆنەوە تا ئێستا دوژمنایەتی دینی خوا ئەو چەکە پیسە بەکار ئەهێنن لەگەڵ بڕواداران دا، بێ ئاگان لەم قسە راستەی کە قورئان ئەیدا بە گوێ یان داو ئەم ئایەتەی پێ دوایی ئـەهێنێ و ئەفـەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ تـەنها هـینی خوایـە و بەدەست خوایـە هـەموو گەنجینـە و غەزنـەکانی ئاسمانـەکان و زەوی، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ﴾ بـەلاّم ناپاکەکان تێ ناگەن لەوەو نەفامن لەو گەنجینە و غەزنانەی ئاسمانەکان و زەوی یە ئەژین و رۆزی وەرئەگرن ئەو کاربەدەستە ستەمکارانەی کە ئەیانەوێ دەست درێژیی و ئارەزووەکانی بکەن لە رۆزی و ژیانی بڕواداران دا، خۆ خۆیـان ئـەو رۆزی یە دروست ناکەن، کەواتـە ئـای ئەوانەی چەندە کەودەن و تێ نەگەیشتوون کە ئەیانـەوێ رۆزی مـەردوم ببڕن!! ئا بەو جۆرە خوا دڵی بڕواداران بەهێزو دامەزراو ئەکات لەسەر بەرەنگاری ئەو تەگبیرو خیتە پیسەو ئەو کردەوە نامەردانەی کە دوژمنانی خوا بەکاری ئەهێنن لە جەنگی بڕواداران دا، دڵ ئارامیـان ئـەکات بەمـەی کـە غەزنـەکانی خـوا لـە ئاسمـان و زەوی دا سەرچاوەی رۆزی هەموانـە. ئەو کەسەی کە رۆزی ئەدا بە دوژمنەکانی، دۆستەکانی خۆی لەبیر ناچێ، خوا بە بەزەیی خۆی نە دۆست و نە دوژمنـەکانی خۆی برسی و رۆزی بڕاو ناکات. لـەکاتێك دا کە ئەزانێ ئەگەر رۆزی براویان بکات ناتوانن نـە زۆرو نە کـەم رۆزی خۆیـان بدەن!! خوا بە رەحم ترە لەوەی بەندەکانی – با دوژمنیشی بن – بەو جۆرە تەنگەتاو بکات و حەواڵەی شتێکیان بکات کە بە هیچ کلۆج بە دەستیان نی یە و دەستە پاچەن لە ئاستی، کەواتـە هیچ کـەس ئـەو کردەوە پیسە بەکار ناهێنێ مەگەر کەسێ کە بێ نرخ ترو پەست ترینی هەمووان بێت!!

يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾

---

ئینجا دواترین هەڵەو پیس تریان باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەو ناپاکانە ئەڵێن: ﴿لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە ﴿لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ﴾ ئەبێ زاڵی دەسەڵات دار زەبوونی بێ دەسەڵات دەرکات لە مەدینە، واتە ئەبێ ئێمە محمدو شوێن کەوتووەکانی دەرکەین، بەڵام کارەکە بە پێچەوانەی گومانی ناپاکان دەرچوو، عبدالله ی کوڕی عبدالله ئەوەی بە کردەوە بەدی هێنا، ئەوە بوو عبدالله ی موسڵمان عبدالله ی سەرۆکی ناپاکانی وەستان و مەدینەی لەسەر قەدەغە کردو نەیهێشت پێ ی تێ بنێ، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) ئیزنی داو ڕێگای بەرەڵا کرد. دەرکەوت کە ئەمە ڕاستە کە فەرموی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ زاڵی و دەسەڵات داری تەنها بۆ خوایەو بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ بڕوادارانە.

با بیر بکەینەوە لەم نرخ پێدان و ڕێزگرتنەی خوا بۆ پێغەمبەرو بڕواداران کە لەم فەرمودەیەدا خستیە بەرچاو، ئەوەتا کردنی بە دەستەو بەرەی خۆی و بەشداری کردن لە زاڵی و دەست داریی یەکەی خۆی دا، بەڕاستی ئەوە ڕێزگرتن و نرخ پێدانێکی ئێجگار گرنگ و گەورەیە، هەر لە دەست خوا دێت میهرەبانی وا! ئایا چ ڕێزگرتنێ ئەگاتە ئەم رادەیە کە ئەوانی لە تەنیشت خۆیەوە دانا و ئەفەرموێ: ها ئەمە ئێمەین! ئەمەیە تاقمی زاڵ و بە دەسەڵات دار! خوا ڕاستی فەرمووە ئەوەتا زاڵ و سەربەرزی کردووە بە هاوسەری بڕوا لە دڵی بڕواداردا. زاڵییەك کە بەرهەمی زاڵی خوایە، زاڵی یەك کە سستی و لاوازی و ریسوایی ڕووی تێ ناکات، نەرم نابێ و سەر ناخەفێنێ، لە دڵی بڕوادار نابێتەوەو جوێ نابێتەوە لە تەنگ ترین و تاریکترین کات دا مەگەر بڕواکەی لەخشە بکات و لاواز ببێ، هەرکات بڕوا جێگیر بوو دامەزرا زاڵی و سەربەرزی جێگیرو دامەزراو ئەبێ لەگەڵی، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام ناپاکەکان نازانن. چونکە ئەزانن کە خۆیان ئەم زاڵی و سەربەرزی یەیان نەچەشتووەو پەیوەستی یان نییە بە سەرچاوە ڕاستەقینەکەیەوە.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩﴾﴾

ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە ئەو بڕوادارانەی کە وەستاندنی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لە ڕیزی خۆی دا و ئەو نرخ و ڕێزەی پێدان، بانگیان لێ ئەکات بەم بانگ کردنە دوایی یە لە سورەتەکەدا بۆ ئەمەی بەرز ببنەوە بۆ ئەم ڕادەو پلە بەرزو بەرێزە، دووركەونەوەو خۆیان پاك و خاوێن بكەن لە هەر سیفەت و نیشانەیەك لە سیفەت و نیشانەی ناپاكان بكات، ئەو ڕادەو پلە بەرزە هەڵبـژێرن بەسەر ماڵ و منداڵ دا، نەیەڵن خەریك و بێ ئاگایان بكات لە گەیشتن بەو بەهرەو پایە شیرین و بەرزە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی كەسانێ كە بڕواتان هێناوە ﴿لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ﴾ با ماڵ و منداڵتان خەریك و بێ ئاگاتان نەكات ﴿عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ﴾ لە یادو باسی خوا، دیارە مەبەست یادو باسێكە كە لە ئیسلام دا دیاریی كراوە و نەخشە كێشراوە. ماڵ و منداڵ خەریك كەرو بێ ئاگا كەری دڵن ئەگەر دڵ وریا و بە خەبەر نەبێ، نەزانێ مەبەست لە بوون و دروستی كردنی چی یە، هەست نەكات بەوە كە بەرزترین مەبەست و ئامانجی هەیە كە شایستەی ئەو گیان و ڕۆحە تایبەتی یەیە كە خوا كردی بە بەری دا، ئینجا ئەو ڕۆح و گیانەی سۆزو پەرۆش دار كردووە بۆ پێك هێنان و بەدی هێنانی هەندێ لەو سیفەت و نیشانانەی كە خۆشەویست و پەسەندن بەلای خواوە، بەرهەم و نموونەی هەندێ لە سیفەتەكانی خۆیین، ماڵ و منداڵیشی پێداوە بۆ ئەمەی هەڵسێ بە كاروباری جێنشینی یەكەی لە زەوی دا نەك بۆ ئەمەی خەریك و بێ ئاگای بكات لە یادی خواو پەیوەستی و پەیوەندی بەو سەرچاوە كە ئادەمێتی خۆی لێ وەرگرتووە، ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ هەركەس ئەوە بكات، واتە بەهۆی ئەو ماڵ و منداڵەوە خەریك و بێ ئاگا ببێ و دوور كەوێتەوە لە خوا ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانەن زیانكەری ڕاستەقینە. یەكەم زیانی ئەوەیە نیشانەی ئادەمێتی نامێنێ، چونكە ئادەمێتی یەكەی بەسراوە بە پەیوەستی و پەیوەندی لەگەڵ ئەو سەرچاوەی كە هۆی ئادەمێتی پێداوە، ئەو كاتە خۆی لە دەست دەرئەچێ و زیانی نەفسی خۆی ئەكات، هەركەس خۆی لە دەست دەرچێ بێگومان هەموو شتی لە دەست دەرچووە هەرچەند بە ڕواڵەت هەر ئەنداز ماڵ و منداڵ و هەرچی ببێ.

وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾

**ئینجا لەم ئایەتەدا بە چەند جۆرێ دەست کاری دڵ و دەروون ئەکات و ئەیخاتە سۆزو پەرۆش و کار بۆ بەخت کردنی ماڵ لە رێگای خوادا، ئەفەرموێ: ﴿وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم﴾ لەوەی پێمان داون و کردوومانە بە بەش و رۆزیتان هەندێکی بەخت بکەن و بیدەن لە رێگای رەزامەندی ئێمەدا، ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ لە پێش ئەمەی نیشانەی مردن بێت بۆ هەرکامتان، ئەو کاتە سەرنج ئەدات هیچی پێش نەخستووە بۆ خۆی و فریای ئەو کاتەی خۆی نەکەوتووە، بەهۆی ئەوە پەشیمان ئەبێتەوە ﴿فَيَقُولَ رَبِّ﴾ ئینجا ئاوات ئەخوازێ و داوا ئەکات و ئەڵێ ئەی پەروەردگارم ﴿لَوْلَآ أَخَّرْتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ ئای کاشکێ مردن منت دوا بخستایە تا ماوەیەکی نزیك و کەم ﴿فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە ماڵ بەخت کەم و لە چاکان بم، واتە ئەگەر کەمێ مردنم دوا بخەیت بەو جۆرە ئەکەم و ئەبم! بەڵام داواو ئاواتەکەی بێ جێ یەو تازە شتی وا نابێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا﴾ هەرگیز خوا مردنی هیچ کەس دوا ناخات کاتێ ماوەی ژیانی دوایی هات و کاتی مردنی هات. ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ خوا ئاگادارە بەوەی ئێوە ئەیکەن، کەواتە با ئاگاتان لە خۆتان بێت کردەوەیەك بکەن کە هۆی رەزامەندی بێت. مەبەست لەم رستەیە ترساندن و ئامۆژگاری گشتی یە یان مەبەست دەم کوت کردن و بە درۆ خستنەوەی ئەو ئاوات خوازو داواکەرانەی کاتی مردنە بە تایبەتی، واتە درۆ ئەکەن ئەگەر دواش بخرێن هەروەکو خۆتان وا ئەبن وەکو دەربارەی دۆزەخی یەکان کە داوای گەڕانەوە ئەکەن بۆ گەڕانەوەو بەسەروگرتنی تاوان و خراپەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾ ئەگەر بگێڕێنرێنەوە بێگومان هەر دووبارە ئەبنەوە بۆ ئەو تاوان و بێ بڕوایی یەی کە قەدەغەو جڵەوگیر کرا بوون لێ ی، بێگومان ئەوانە درۆزنن.**

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە و بیری بکەینەوە لەو دەست کاری یە جۆر بە جۆرانە کە خوای بەزەیی دار ئەیانکات بۆ تیمار کردن و چارەسەرکردنی دڵی بەندەکانی.

١- فەرموی: هەندێ لەو ماڵ و دارایی یە بدەن.

٢- فەرموی: ئەو ماڵ و دارایی یە سەرچاوەکەی ئێمەیەو ئێمە پێمان بەخشیون، کەواتە هینی ئەو خوایە کە بڕواتان پێ‌ی هەیە و ئەویش فەرمانی داوە پێتان.

٣- مردن یەخەتان پێ ئەگرێ و هەمووی بەجێ ئەهێڵن و لەو کاتەدا ئەزانن کە فریای خۆتان نەکەوتن و بێ ئاگا و نەفام بوون.

٤- لەو کاتە تەنگەدا ئاوات ئەخوازن بۆ ئەم کاتی ئێستا کە وان تیای دا و ئەتوانن فریای خۆتان بکەون.

٥- هەر لە ئێستاوە سیخی سارد ئەنێ بەسەر دڵ دا، نائومێدی پیشان ئەدات لەو داواو ئاواتەی کە لەو کاتەدا هەوڵی بۆ ئەدات.

بەڕاستی ئەم هەموو دەست کاری یە بەهێزانە ئەکات لەم ئایەتەدا لە کات و شوێنی زۆر رێك و پێکی خۆی دا، لەپاش نیشاندانی نیشانەو شێوەی ناپاکەکان، خستنی بڕواداران بۆ سایەو پەنای خوایەك کە ئەیانپارێزێ لە پیلان و خراپەی ناپاکان، کەواتە زۆر شایانە بۆ بڕواداران هەستن بە ئەرکی بڕواکەیان و بێ ئاگا نەبن لە یادی خوا کە سەرچاوەی ئارام و ئاسایشە لە هەردوو جیهان دا.

ئا بەو جۆرە خوا موسڵمانان پێ ئەگەیەنێ و پەروەردەیان ئەکات بەم قورئانە بەفەڕە.

خوا بە بەزەیی خۆی بەشدارمان بکات لەوەدا.

وصلى الله و سلم على عبده و رسوله الذي أنزل عليه هذا القرآن

لە ١٤٠٢/١٢/٢٦ سورەتی ﴿المنافقون﴾ دوایی هات

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي
خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾

## سورەتی (التغابن)
## مەدینەیی یەو ١٨ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە وەك سورەتە مەككەیی یەكان وایە لەم بارەیەوە كە هەدەف و ئامانجی دامەزراندنی عەقیدەیەو دامەزراندنی بۆچوونی ئیسلامی بە تایبەتی بەشی یەكەمی. لە باریٚ ترەوە وەك سورەتە مەدینەیی یەكان وایە كە بانگ دەكاتە ئیمانداران، نەك وەك سورەتە مەككەیی یەكان بە ﴿یا ایها الناس﴾ بانگ بكات. چەند ریوایەتێك هاتووە لەبارەی مەككەیی یەتی یەوە وەك چەند ریوایەتێكی تر هاتووە لەبارەی مەدینەیی یەوە. بەهەرحاڵ لەبەر ئەوە ریوایەتی مەدینەیی بەهێز ترە بە مەدینەیی ناومان برد.

بەشی یەكەم بۆچوونێكی ئیمانی بوونەوەری ئەگەیەنیٚ، حەقیقەتی پەیوەندی ئەم بوونەوەرە بە خواوە نیشان دەدات، خوای تاك و تەنیا كە ئەم بوون و بوونەوەرەی داهێناوە لە نەبوون، ئەوەش حەقیقەتێكە لە هەموو پێغەمبەرانەوە هاتووە صلی الله علیهم وسلم اجمعین، ئەو باوەڕە راستە باوەڕدار ئاگادار ئەكاتەوە بە رەقابە و چاودێریی هەمیشەیی خوا بەسەر دڵ و دەروونەوە. ئینجاچاوی دڵی دەبینیٚ ئەم بوون و بوونەوەرە و هەرچی واتێیدا ژێر بارەو تەسبیح و سوپاس و سەنای داهێنەرەكەی دەكات وەك یەك ئایەت لە سورەتەكە ئەو هەواڵە ئەداو دەفەرمویٚ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ تەسبیح وسەنای خوادەكات هەرچی وا لە ئاسمانەكان و هەرچی وا لە زەوی دا، ﴿لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەر بۆ ئەوە خاوەنی و پادشایەتی و هەر بۆ ئەوە سوپاس و سەنا، خوا توانایە بەسەر هەموو شتێكدا. مەبەست لە تەسبیح لای هێندیٚ لە زانایان بە نەزەر

غەیری ئیمانداران بەڵگە بینیانە لەسەر بوون و دەسەلاَت و زانین و حیکمەتی خوایە، بە نەزەر ئیماندارانەوە هەرچۆنیٚ بەڵگەیی یە، هەروەها بە زمانیش ئەو زیکرو سوپاس و سەنا دەکەن، بەلاَم هیچ پێویست نییە ئایەت و حەدیس بە بیٚ بەڵگە لە دیمەن و رواڵەتەکەی لا بدەین کەواتە هەموو بیٚ گیانەکان زمانی تایبەتی خۆیان هەیە و بەو زمانە تایبەتی یە یادو زیکرو سوپاسی خوای خۆیان دەکەن و بە خیلافی عادەت بە موعجیزە شتی وا رووی داوە وەك لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەیفەرمو لە مەککە بەردێك هەبوو هەرکاتیٚ بمدایە بەلای دا دەیگوت: السلام علیك یا رسول الله. هەروەها لە حەدیسی سەحیح دا هاتووە دەربارەی شاخی احدئەفەرمویٚ: هذا جبل أو جوبیل یحبنا و نحبه. هەروەها جارێك تەشریفی برد بۆ سەر احد أبوبکرو عمر و عثمان لە خزمەتی دا بوون احد کەوتە جوڵەو لەرزە ئەمیش پیٚی فەرمو: اثبت احد فإنما علیك نبی و صدیق و شهیدان. بەهەر حاڵ وتەی تەسبیح و بەکار هێنانی بە فیعلی ماضی هات و بە فیعلی مضارع و بە ئەمرو بە مصدر: سبح الله، یسبح الله، فسبح باسم ربك، سبحان الذي اسری.

ئینجا دەست کاری یەکی دڵ دەکات کە هەقی وابوو هەموو باوەڕدار بوونایە، چونکە دەیزانن لە خۆیانەوە پەیدا نەبوون، ﴿هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَكُمۡ﴾ بەڵکو خوا دروستی کردوون کەچی بەو جۆرە دەرنەچوون و بوون بە دوو تاقم وەك فەرموی: ﴿فَمِنكُمۡ كَافِرࣱ وَمِنكُم مُّؤۡمِنࣱۚ﴾ بەم جۆرە هێندێکتان و لەناوتان دا کافرو بیٚ باوەڕ هەیە، بەڵکو زۆربە سپلە و نەفام و بیٚ باوەڕن، لەناودا هێندێکتان باوەڕدارە. بەڕاستی خەجاڵەتی یە چۆن بەو جۆرە و بەو تاقمە دەرچووە وان بە پێش چاوی قودرەتی خواوە وەك دەفەرمویٚ: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِیرٌ﴾ خوا بە هەموو کردەوەکانتان بینایە، کەواتە هەموو لە ژێر چاودێریی و رەقابەی خوادان، دەی با هۆشتان بە خۆتانەوە بێت و فریای خۆتان بکەون پێش مردن و هاتنی محاسەبەی رۆژی دوایی. ناسینی ئادەمی بەو جۆرو شێوە بەشێکە لە بۆچوون و بیروباوەڕی ئیسلامی کە بریتی یە لە ناسینی خواو بوونەوەرو ئادەمی کە ئادەمی وا دروست کراوە سەربەستەو ئیختیاری هەیە، کەواتە بەر پرسیارە لە هەموو نیازو کارو کردەوەکان.

خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾

---

ئینجا دەست كاریی یەكی تری دڵ و دەروون ئەكات بەمەی ئەم ئادەمی و بوونەوەرە لەسەر بنەڕەتی حەق و حەقیانەت دروست كراوەو بۆ ماوەیەكی دیاریی دانراوەو دەبێ لە پاش نەمان بگەڕێتەوە بۆ حوزوری پەروەردگاری، بۆ ئەمەی هەركام بگات بە بەرهەمی كردەوەكانی خۆی وەك دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ خوا ئاسمانەكان و زەوی دروست كردووە بە حەقیانەت و هەموو بەش و پارچەیەكیان بە راستی و لەسەر بنەڕەتی حەق داڕێژراوە و حەق و راستی ریشەی كوتاوە لە دروست كردنی ئەم بوونەوەرەدا. ئەی ئادەمی نەخشەو شێوەی كێشاون و جوان و شیرینترین شێوەی پێ بەخشیون: شێوەی دیمەن و رواڵەتەكەتان، شێوەی هەست و خولق و رەوشتتان بە جۆرێ ئادەمی تێرو تەواوترینی هەموو گیانلەبەرانی ئەم زەوی یە لە هەموو بارو روویەكەوە منەتی بەسەریانەوە گەورەو گرنگ ترە، كەواتە شیرینی و تێرو تەواوی تێدا كۆبووەتەوە، كەواتە دەبێ هەڵسێ بە شوكرو سوپاسی خوا و ئاگای لە خوا بێ بۆ رۆژی دوایی كە گەڕانەوە هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەی هەموو شتێ، گەڕانەوەی هەموو كارو نیازو كردەوەیەك تا گەڕانەوەی ئەم بوون و بوونەوەرە.

ئینجا دەست كاریی یەكی دڵ ئەكات بە نیشاندانی فراوانی و گشتێتی زانینی خوا. بێگومان ئەم زانینەوجێگیربوونی ئەم زانینەزۆر زۆر بەكارەبۆشەرم كردن لە خواو پارێزكاری لەو كارو كردەوانەی كە خوا پێیان رازی نییە، دەفەرموێ: ﴿يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ خوا دەزانێ و ئاگایە بە هەرچی وا لە ئاسمانەكان و لە زەوی دا هەیە، زاناو ئاگایە بە هەر كارو كردەوەیەك كە ئێوە ئەیكەن و دەری ئەبڕن و بە هەر كارو كردەوەیەك كە دەیشارنەوە، تەنانەت ئاگادارو زانایە بە هەر نیازو خەتەرەیەك كە لە دڵەكاندا هەیە و گوزەر ئەكەن. ئەم سێ ئایەتەی كە تێپەڕیان كرد بەسن بۆ ئەوەی خەڵكی خۆیان بناسن و ئەم بوونەوەرەش بناسن، تێ بگەن لە پەیوەندی ئادەمی و بوونەوەر بە خوای خۆیەوە، ئەو كاتە بێگومان شەرم و شكۆو بیم و سام و لە هەمان كات دا ئومێدو چاوەڕوانی دڵ داگیر ئەكات، خوا بە میهرەبانی خۆی بەهرەمەندمان بكات لەم فەرو بەرەكەتەدا آمین.

أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ
رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ ۚ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ ۚ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن
لَّن يُبْعَثُوا۟ ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ
أَنزَلْنَا ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ

---

بەشی دووەمی باسەکەمان لەناوچوونی بێ باوەڕەکانی گەل و ئوممەتە پێشووەکان باس دەکات کە سەرکێشی یان کردو باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکان و موعجیزەکانیان، رەخنەیان گرت لەوەی پێغەمبەر لە ئادەمی بێت، هەرچۆنێ بێ باوەڕە سەرکێشەکانی ئەم ئوممەتەیش بەو جۆرە بوون، ئەفەرموێ بەو بێ باوەڕانە و دەیانترسێنێ بە دووچاربوونیان بە سزای خوا ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئایا نەهاتووە بۆتان و پێتان نەگەیشتووە هەواڵ و داستانی ئەوانەی لەمەوپێش کە باوەڕیان نەئەهێنا بەهۆی ئەوەوە سزای کارو کردەوەکەی خۆیانیان چەشت؟ واتە بەڵێ ئەو هەواڵ و داستانەیان پێ گەیشت، چونکە گەلێ لەو گەلە بێ باوەڕانە نیشتەجێ بوون لە دەوروبەری ئەمان دا، وەکو عادو سەمود و اصحاب الأیکەو تایفەی پێغەمبەر لوط، بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی ئێش و ئازار دەر، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟﴾ ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە پێغەمبەرەکانیان دەهاتن بۆلایان بە موعجیزەکانیانەوە کەچی ئەوان روویان لێ وەردەگێڕان و پشتیان تێ دەکردن و دەیانگوت ئایا ئادەمی یەك رێنموونیمان دەکات و ئەمانخاتە سەر رێگەی راست، ئەم رەخنە بێ جێ یە موشریکەکانی قورەیشیش دەیانگرت لە پێغەمبەرێتی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڕاستی ئەوپەڕی نەفامی یە ئەو قسە ناڕەوا لە چەند بارێکەوە. یەکەم پێغەمبەر کە بەرنامەیەك بێنێ دەبێ کەسێك بێت ئەو بەرنامەیە لە خۆی دا بەدی بێنێ و ببێ بە وێنەو نموونەیەك بۆ بەرنامەکەی، بژی لەناو ئەو گەلەدا هەست بکات بەهەر شتێك کە ئەوان هەستی پێ دەکەن. دەی ئەگەر ئەو پێغەمبەرە مەلائیکە بێت – وەك ئەوان دەیانگوت – بێگومان سروشتی جیاوازەو ناگونجێ ئەو گەل و کۆمەڵەی لەسەر داڕێژێ و پێی بگەیەنێ. دووەم شت لە نەفامێتی ئەو نەفامانە ئەمەیە ئەم ئادەمی یە بەڕێزە سەرنج دەدەن بە گیان لەبەرێکی پەست تر لەو رێزەی خوا پێی داوە. سێ یەم ئەوانە هەر

دەیانەویٚ سەرکێشی و عیناد بەکار بێنن، چونکە بیستوویانەو بەناوبانگن ئەو گەلانەی بە دەوریان دا پێغەمبەرەکانیان ئادەمی بوون وەك نوح و ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ئەو عەرەبانە بە باوکی خۆیانیان دائەنان. نزیکتر لەم دووانە موسا و عیسا کە بەناوبانگ بوون لای ئەو عەرەبانە. دەی ئەوان کە بەو جۆرە سەرکێش بوون و عینادیان بەکارهێنا خۆیان بیٚ رێز کرد ﴿وَٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ﴾ خوایش هیچ پێویستی نی یە بەوان ﴿وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ بیٚ پێویست و سوپاس کراوەو هیچ جۆرە زیان و کەم و کوڕی روو ناکاتە گەورەیی خوا.

ئینجاباسی باوەڕ نەکردنی ئەو نەفامانە دەکات بە زیندوو بوونەوە کە بەندێکی سەرەکی یە لە هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوادا. ئەفەرمویٚ: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ ئەوانەی کە کافر بوون، واتە بت پەرستەکان دەیانگوت و بۆچوونیان وابوو و وایە کە ﴿أَن لَّن يُبْعَثُوا۟﴾ هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە ﴿قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵیٚ پیٚ یان نەخێر بۆچوونەکەتان ناڕاستەو سوێند بە پەروەردگارم زیندوو ئەکرێنەوە ﴿ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ لەپاش زیندوو کردنەوەتان هەواڵتان پیٚ دەدریٚ بە هەر کردەوەیەك کە لە دنیادا کردتان، ئەوە شتێکی ئاسانە لەبەر خواو هیچی ناویٚ بێجگە لە ئیرادە کردن روو کردنی ئیرادەی خوا بۆی.

﴿فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلْنَا﴾ کەواتە باوەڕ بێنن بە خواو فروستادەکەی و بەو نوورەی کە ئێمە هێناومانەتە خوارەوە، واتە قورئان، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خوا زاناو ئاگادارە بە هەرچی کە کردووتانە ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ﴾ زیندووتان ئەکاتەوەو کۆتان ئەکاتەوە لە رۆژی کۆبوونەوەتان ﴿ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ﴾ ئەو رۆژەی کۆبوونەوەتان رۆژی زیانباریی یە.

لە قورئاندا رۆژی دوایی بە پەنجاو دوو ناو ناوبراوە کە دوانی لێرەدا هەیە: ﴿یوم الجمع﴾ رۆژی کۆبوونەوە بۆ هەموو دروست کراوەکانی خوا لە جنۆکە و مەلائیکە و ئادەمی و گیان لەبەرانی تریش، ئەو رۆژە ﴿یوم التغابن﴾ رۆژی زیانباری، زیانباریی بیٚ باوەڕان و تاوانباران کە دووچاری سزای دۆزەخی نەبڕاوەو نائومێدی لە رەحم و بەزەیی خوا نعوذ بالله، زیانباری ئەولادوکەس و کارو دۆست، بەڵکو بە شێوەی گشتی زیانباری ئیماندارانیش وەك وەردەگیریٚ لەو حەدیسەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿ما منکم من احد إلا و يندم يوم القيامة، قيل يا رسول الله فهذا الكافر يندم فكيف يندم المؤمن؟ قال يندم لأنه استطاع ان يعمل اكثر مما عمل و تتفاوت درجات الجنان بحسب تفاوت الأعمال. او كما قال﴾ خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزیٚ لە زیانباری گەورە.

وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ
خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ
أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٠﴾

---

**ئینجا با بیرێکە بکەینەوەو خەیاڵ بهاوێژین بۆلای زۆری کۆکراوەکانەوە!! ئینجا لەم کاتەدا کە کۆکردنەوەو محاسەبە کردن دەخاتە بەرچاو. لەم کاتەدا هێندێ لە پاداشت و بەهرەمەندی چاکان دەخاتە بەرچاوو هێندێ لە تۆڵەو سزای سەختی بەش براوان دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ هەرکەس باوەڕی بێنێ و هەبێ بە خوا کە باوەڕ بە خوا بریتی یە لە باوەڕ کردن بە هەرچی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی لە لایەن خواوە هەرکەس ئیمانی بەو جۆرە هەبێ و کردەوەی چاك بکات خوا هەموو خراپەکانی ئەسڕێتەوە و ئەیخاتە بەهەشتانێ کە لە ژێر کۆشکەکانی دا رووبارەکان دێن و دەچن بە هەمیشەیی و هەتا هەتایە بە بێ برانەوە، دیارە ئەوەش ئەوپەڕی رادەی خۆشی و بەختەوەری یە بۆیە فەرموی: ئا ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی هەرە گەورە، خوا بەشدارمان بکات تیایدا، آمین.**

**بەرامبەر بەوان هێندێ لە تۆڵەو سزای سەختی بێ باوەڕان دەخاتە بەرچاوو ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان نەهێناوە لە دنیادا و باوەڕ ناهێنن ئەوانە هاوەڵ و هاوڕێی ئاگرن بە جۆرێ دەمێننەوە تیای دا بە بێ برانەوە دیارە بەد بەختی و عاقیبەت شەڕی راستەقینە ئەوەیە وەك دەفەرموێ: ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ زۆر بەدو سەختە دوا رۆژی ئەوانە.**

مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ

---

**ئینجا یاسایەك لە یاساكانی ئیسلام دەخاتە بەرچاوو جاڕی پێ ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ هیچ موسیبەت و ناخۆشی یەك دووچار نابێ مەگەر بە ئیزن و ئیرادەی خوا، باوەڕ بەوە كە بەشێكە لە ئیمان و بەو بۆنەوە لە پاش باس كردنی ئیمان و پاداشتی ئیمان ئەم فەرمودەیەی هێنا، هەركەس ئەو ئیمانە راستەقینەی هەبێ كە باسمان كرد خوا رێنموونی دەكات وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾ هەركەس ئیمان بێنێ خوا رێنموونی دڵی دەكات ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ خوا زاناو ئاگایە بە هەموو شتێ كە یەكێ لەوانە ئەو باوەڕە راستەقینەیە.لەبارەی دووچار بوون بە موسیبەت ئەم حەدیسانە هاتووە لە بوخاری و موسلیمەوە كە فەرموی: ﴿عجبا لأمر المؤمن لا يقضي الله قضاء إلا كان خيرا له إن أصابته ضراء صبر فكان خيرا له و إن أصابته شرا شكر فكان خيرا له و ليس ذلك لأحد إلا للمؤمن﴾ سەبارەت بە ئایەتەكە ﴿يهد قبله﴾ مەبەست ئیمانە بە قەزاو قەدەرو مل كەچی بۆ خوا لە كاتی موسیبەت دا، بەلاَم ئیبن و عەباس – خوا لێ یان رازی بێت – دەفەرموێ: مەبەست رێنموونی یە بە بێ قەیدو شەرت، واتە خوا دڵی دائەمەزرێنێ و ئارام و ئاسایشی پێ دەدات، لەم فەرمودەیشەوە وا وەردەگیرێ كە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ خوا بە هەموو شتێ زاناو ئاگایە، كەواتە رێنموونی یە بۆ هەر شتێ كە خوا خۆی دەزانێ و پێی دەبەخشێ بە هەركەس كە خوا خۆی دەزانێ و شایانە بۆ ئەو رێنموونی یە.**

**ئینجا هەمیتر بانگیان ئەكات دەكات بۆ گوێ رایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ﴾ گوێڕایەڵی خوا بكەن و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بكەن. ئینجا دەین و**

هـەواڵی خۆیـان بـە مـل خۆیانـەو پێغەمبـەر (ص) هـەر ڕاگەیانـدنی لەسـەرە وەك دەفـەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ ئەگەر ئێوە ڕوو وەرگێڕن و گوێڕایەڵ نەبن بێگومان هـیچ شـتێ پێویـست نـی یـە لەسـەر پێغەمبەرەکـەمان بێجگـە لـە ڕاگەیانـدنێکی ڕوون، واتـە خستنە سەر ڕێگەو باوەڕ پەیدا کردن هەر بە دەست خوایە.

ئینجا ئایەتەکە دوایی ئەمێنێ بە حەقیقەتی خوایەتی خـواو خواپەرسـتی ڕاسـتەقینە ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوایـە کـە نـاوی ﴿الله﴾ یـە هـیچ خـواو پەرسـتراوێکی ڕاسـتەقینە نـی یـە بێجگە لەو ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ کەواتە با ئیمانداران هـەر پـشت بـەخوا ببەسـتن و هەر چاوەڕوانی ئەوبن، چونکە هیچ کەس هیچی بە دەست نی یە بێجگە لەو. ئینجا ڕووی فەرمودە ئەکاتە ئیمانداران کە ئاگایان لە خۆیان بێت و ژن و منـداڵ نەبێتـە هـۆی لادانیـان لـە ڕێگـە ڕاسـتەکەی خـوا ئەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ﴾ ئیمانـدارەکان بەڕاسـتی هێنـدێ لـە ژن و منداڵـەکانتان دوژمـنن بۆتـان، کەواتـە وریای خۆتان بن و خۆتان بپارێزن لێ یان نەك لاتان دەن لە ڕێگە ڕاستەکەی خوا.

ئەمەش شتێکی ئاشکرایە هێنـدێ لـە ژن و منـداڵ هـەر بـە ڕاسـتی دوژمـنن، چونکە بیرو باوەڕێکی دژی ئیسلامی یان هەیە و بە هەموو جۆر هەوڵ دەدەن باوك و دایکە موسڵمانەکان لادەن لـە ئیـسلام و بیانخەنـە سـەر بیروبـاوەڕە بۆگەنەکـەی خۆیـان، بـە چـاوی خۆمـان ئـەوە دەبینین، هینی واش هەیە موسڵمانیش بێت و دوژمن نەبێ، بەڵام خۆش ویستنیان دڵی باوك و دایکەکە خەریك دەکات. لە ئیبن و عەباسەوە - خوا لێ یان ڕازی بێت - ڕیوایەت کراوە سەبارەت بە ئایەتی یەکەم فەرموی کاتێ کە پیاوێك پرسیاری لێ کرد ئەوانە چەند پیاوێك لە مەککە موسڵمان بوون و ژن و منداڵەکانیان بەرگری یان کردن لەوەی جێ یان بێڵن، ئینجا کاتێ هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بینییان خەڵکی زانا بوون و ئەمان بەو جۆرە نەبوون ویستیان تۆڵە بسێنن لە ژن و منداڵەکانیان، بەو بۆنەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، بەڵام دەقی ئایەتەکە گشتی یەو هۆی هاتنە خوارەوە تایبەتی ناکات، بەڵام هۆی هاتنە خوارەوە یەکێکە لەو حوکمە گشتی یە.

وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ

بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ ئەگەر ئێوە ببورن و تاوانەکەیان بۆ داپۆشن و چاوپۆشی بکەن لێ یان بێگومان خوا غەفورو ڕەحیمە و بە گوێرەی کردەوەی ئێوە لەگەڵتان ڕەفتار ئەکات. وتەی ﴿فتنة﴾ بە دوو جۆر تەفسیر کراوەتەوە:

١- ژن و ئەولاد فیتنەن، واتە خوا تاقیتان ئەکاتەوە پێ یان، کەواتە وریا بن تا لەو تاقی کردنەوەدا سەرکەون و پاك و خاوێن بن بۆ خوای خۆتان بە وێنەی ئاڵتوونێکی قەڵب کەدەخرێتەبۆتەوەهەرچڵك وچەپەڵی یەکی تێدابێت دەڕوات و ئاڵتوونە سافەکە دەمێنێ.

٢- ماڵ و ئەولاد فیتنەن دووچاری لادان و گوناهتان دەکەن، کەواتە وریا بن با دووچارتان نەکەن، هەردوو تەفسیرەکە زۆر نزیکن لە یەکەوە. ئیمامی ئەحمەد حەدیس دەهێنێ لە عبدالله ی کوڕی بەریدەوە کە دەڵێ: جارێ پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر مینبەرەوە خوتبەی دەخوێند، لەو کاتەدا حسن و حسین منداڵ بوون هاتن و دوو کراسی سووریان لەبەردا بوو درێژ بوون لەبەر ئەوە هەڵدەکەوتن بەهۆی ئەوەوە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە خوارەوەو هەڵی گرتن و بردنیە سەر مینبەرەکە و فەرمووی: خوا ڕاستی فەرمو: صدق الله و رسوله ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ﴾ دیتم ئەم دوو منداڵە دەهاتن و پێ یان هەڵدەکەوت و بەهۆی ئەوەوە خۆم پێ نەگیرا تا هێنامنە سەر مینبەرەکە ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ﴾ هەر لای خوا هەیە ئەجرو پاداشتی گەورە بۆ ئەو کەسانەی باوی لای خوا دەدەن بەسەر هەموو شتێکی تردا، لەبەر ئەوە دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ خۆتان بپارێزن تا دەتوانن لە هۆی ناڕەزایی خواو هەرچی خوا پێی خۆشە هەر ئەوە بکەن. ئەم ئایەتە تەفسیرە بۆ ئایەتەکەی تر کە ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾ واتەئەوئایەتە بە پێی ئایەتەکەی ئێرە تەفسیر دەکرێتەوە لەلوتفی خوابەزیاد بێت، چونکە هیچ کەس ناتوانێ هەڵسێ بە تەقوای تەواو وەك ناتوانێ هەڵسێ بە شوکرو سوپاسی تەواو ﴿وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ﴾ بیستن و گوێ ڕایەڵی بکەن.

وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ
قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ
ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾

---

دەربارەی فیتنـەی ژن و ئـەولاد بـەو شێوەی فـەرمو، دەربـارەی مـاڵ و چارەسـەرکردنی فیتنەکـەی دەفـەرموێ: ﴿وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡ﴾ مـاڵ و سـامان سـەرف بکـەن و بیـدەن بـە خـاوەن مافـەکان، بـەختی بکـەن بـۆ خۆتـان چونکە لـە راسـتی دا ئـەو شـتەی بـۆ خـوا بـدرێ سـوودو ئـەجری بـۆ خاوەنەکەیـە، ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ هەرکـەس خـۆی پـارێزێ لـە چرووکی و چـنگ گوشـراوی خـۆی، ئەوانـەی کـە بـەو جـۆرە بـن، هـەر ئەوانـەن گەیشتوو بە ئامانج و رزگار بوون لە نەخۆشی یە دەروونی یەکان.

ئینجا هـەمیتر هانیـان دەدا لەسـەر سـەرف کردن و بەخت کردنـی مـاڵ لە رێی خوادا بـە جۆرێ ئیماندار ئەهێنێتە باڵ و وای نیشان دەدا مامەڵە لەگـەڵ خـوادا دەکات و قـەرز بـە خـوا دەداو دەفـەرموێ: ﴿ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ﴾ ئەگـەر ئێـوە قـەرز بـدەن بـە خـوا بـە قـەرزێکی شـیرین و جـوان، بـەم رەنگـە هـەر بـۆ خـوای بـدەن و مـاڵێ بـدەن کـە خۆشەویسـتە بەلاتانـەوە و پێویسـتتان پـێی هەیـە، ئەگـەر ئێـوە قـەرزێکی ئـاوا بـدەن بـە خـوا، خـوا چـەند چـەندانەی ئەکاتـەوە بۆتـان کـە لای خـوارووەکـەی دەقاتـە وەك چـەند جـار گـوترا. هـەر بـەوە ناوەستێ، بەڵکو ئەفەرموێ: ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ﴾ لێتان دەبوورێ لـە گونـاه ﴿وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾ خـوا زۆر سوپاس گوزارو بـە حیلمـە، واتـە شـتی زۆر گـەورە دەبەخشـێ بەرامبـەر شـتی زۆر کـەم و زۆر بە حیلمە پەلە ناکات لە تۆڵە سەندن دا لەگەڵ گوناهو تاوانی زۆری بەندەکان.

پێویسـتە ئیمانـدار ژیـر بێـت و بـیر بکاتـەوە لـە لـوتفی خـوای خـۆی، خـوا بەندەکـەی وا دروست کردووەو ئەو ماڵەی پێداوە کە ماڵی خوایەو خوا ناوێتی یە دڵی کە ئەو ماڵە بدات، داوای کەمێك لە ماڵەکە دەکات و بە قەرزدان بە خوای ناو دەبات و چەند چەندانەی دەکاتەوە

بۆی بە حیلم و چاوپۆشی کەرە لە کەم و کوڕی گوناهی، عەبد دەبێ چۆن بێت و چی بڵێ بەرامبەر لوتف و میهرەبانی خوای ڕخۆی، یا الله یا إلهنا یا مولانا چی بڵێین بێجگە لە شەرم و خەجاڵەتی بەرامبەر لوتف و میهرەبانی یەکەت؟!!

ئینجاکۆتایی ئایەت وسورەتەکەئەمێنێ بەم فەرمودەیە ﴿ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئەو خوایە زاناو ئاگادارە بە هەموو غەیب و نهێنی و ئاشکراکان و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و لێزان و کاردروستە، کەواتە هەموو لە ژێر زانین و دەسەڵاتی دایەو بەڕێوەبەری هەموو شتێکە بە لێزانی و کاردروستی. بیرکردنەوە لەم سیفەتانە دەبێ بەس بێت بۆ خۆپارێزێی بەندەو خۆ تەرخان کردن بۆ بەندەیی و گوێڕایەڵی.

والحمد لله أولا وأخرا و صلى الله وسلم على عبدة و رسولة و على آله و أصحابه و أزواجه إلى يوم الدين

به یارمەتی خوای میهرەبان لێ بوومەوە لە دووبارە کردنەوەی ئەم سورەتە بۆ جاری دووەم کە دەست نووسی جاری یەکەم ون بوو بوو. لێ بوومەوە لە ڕۆژی دووشەمە ١٤١٨/٤/١٥ داواکارم خوای میهرەبان لێم وەرگرێ آمین.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ

## سورەتی (الطلاق)
## مەدینەیی یەو ١٢ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە باسی هێندێ مەسەلەو بڕیارمان بۆ ئەکات لەبارەی تەڵاق و تەڵاق دراوەکە لە هیچ سورەتێکی تردا باس نەکراون، وەکوبەروونی ئەکەوێتەبەرچاو. لەیەکەم جارەوە کاتی رێك و رەوا دیاریی ئەکات بۆ ئەو پیاوانەی کە هەر ئەیانەوێ تەڵاقی ژنیان بدەن، ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ کاتێ ویستتان ژنانتان تەڵاق بدەن ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ تەڵاقیان بدەن لە عیددەیان. بەم رەنگە هەر تەڵاق دران عیددەیان دەست پێ بکات، کە ئەوە کاتی پاکییانە. بانگ کردنەکەی تایبەتی کرد بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەپاشان بڕیارو فەرمودەکەی گشتی کرد، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) پێشەوای ئوممەتە، بانگ کردنی ئەو، بانگ کردنە بۆ ئەوانیش. ناوی ئەوان نابرێ تا دەرکەوێ ئەوپێشەواوسەرۆکە و قسەکەرە لە باتی ئەوان. یان لەبەر ئەوەیە قسەو گفت و گۆ هگەڵ ئەوەو بڕیارەکەگشتییە. بەهەر حاڵ ئەم فەرمودەیە سەرنج راکێشە و گرنگی مەسەلەکە نیشان ئەدات. ئەوەتا لە رادەیەك دایە خوا بانگی پێغەمبەرەکەی ئەکات بۆ ئەو فەرمانە.

مەبەست بەو ئافرەتانە لێرەدا ئەوانەن کە مێردەکانیان چووبنە لایان و سك پڕ نەبن و بکەونە پاکی و پیسی. چونکە مەبەست لەم دیاریی کردنی کاتی تەڵاق دانە ئەوە بە عیددەکەیان درێژە ئەکێشێ و ئافرەتەکە زۆر ئەمێنێتەوە. لە خۆڕایی بە بێ مێرد و بتوانێ شوو بکات دوای تەواو بوونی عیددەکەی. ئەگەر لە کاتی پیسی و حەیزدا تەڵاق بدرێ ئەوا ماوەی حەیزەکەی بۆ حیساب نی یە، کەواتە عیددەکەی درێژ تر ئەبێت، دەی ئەم درێژە

کێشان و حیساب نەکردنە تەنها روو ئەکاتە ئەم جۆرە تەڵاق دراوانە، چونکە ئەوانەی مێردەکانیان نەچوو بوونە لایان عیدەیان لەسەر نی یە وەکو ئایەتی سورەتی ﴿البقرة﴾ ئەفەرموێ. ئەوانەی کە حەیزو پیسی یان نەبووە، یان بوویانە و لێ کەوتوون عیدەیان سێ مانگە ئەوانە سك پڕن عیدەیان دانانی سکەکەیان وەکو لەم سورەتەدا باسیان ئەکات.

کەواتە ئەمانە هەرکات تەڵاق دراون هیچ گۆڕان و جیاوازییان نی یە. بێجگە لەوەش حەدیسێکی سەحیحی بوخاری هەیە ئەو مەبەستە روون ئەکاتەوە. ئەو حەدیسە ئەهێنێ لە عبدالله ی کوڕی عمرەوە – خوا لێ یان رازی بێت – باسەکە ئەکات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەو خەشمناك ئەبێت و لە پاشان ئەفەرموێ: پێی بڵێ: بیگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی و راگیریی بکات هەتا پاك ئەبێتەوە، ئینجا ئەکەوێتەوە حەیزو پاك ئەبێتەوە، جا ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات بە پاکی تەڵاقی بدات بێ ئەوەی بچێتە لای، چونکە ئەوەیە ئەو عیدەی کە خوا فەرمانی پێ داوە. موسلیمیش ئەم حەدیسەی هێناوە. ئەم بەم شێوە ئەیڵێ: ئەوەیە ئەو عیدەی کە خوا فەرمانی پێداوە ژنی تیا تەڵاق بدرێ.

ئەم شێوە تەڵاق دانە کە لەم ئایەت و حەدیسەدا هەیە زۆر رێك و راستەو بەرژەوەندی تیایە، چونکە خواو پێغەمبەر (ﷺ) تەڵاقدانیان پێ خۆش نی یە و ئەیانەوێ ئەو پەیوەندی ژن و مێردی یە بمێنێ و پارێزگاری بکرێ تا پێ یان ئەکرێ. زۆربەی تەڵاق دان روو ئەدات لە هۆی رق هەڵسان و هەڵچوونی پیاوەوە. بێگومان دیاریی کردنی ئەو کاتە تایبەتی یە زۆر جار ئەبێتە هۆی دواخستنی تەڵاقدانەکە، لەو ماوە دواخستنەدا لە سەدا هەشتا کابرا هێواش ئەبێتەوەو ئەو هەڵچوون و رق هەڵسانەی نامێنێ و پەشیمان ئەبێتەوە لە تەڵاق دان. کەواتە ئەو دیاریی کردنی کاتە ئەبێ بە هۆی کەم کردنەوەی تەڵاق دان بە زۆری. بێجگە لەوی تەڵاق دان لەم کاتەدا هیچ مەترسی سك پڕی ئافرەتەکەی تێدا نی یە، کە ئەو سك پڕی یە ئەبێتە هۆی پەشیمانی لەو تەڵاق دانەو هەوڵدانی هێنانەوەی ئافرەتەکە بەهەر شێوەیەك بگونجێ بۆ تەڵاق دەر. بێجگە لەم کاتە راستە دیاریی کراوە کاتی تریش هەیە بۆ تەڵاق دان بە راست و رەوا دائەنرێ بە پێی هەندێ رووداو و هەواڵ، ئەو کاتەش کاتی سك پڕی

ئافرەتە کە سکەکەی ئاشکرا بوویێ، ئەمەش هەر جوانە بە ڕەوا دابنرێ، چونکە کابرای تەڵاق دەر ئاگادارە بەسەر حاڵەکەدا. کەواتە لەگەڵ ئەوەدا تەڵاق دانەکەی نیشانەیە لەسەر بێزاری و نەویستنی ئەو ئافرەتەو نەگونجانی لەگەڵی.

مەبەست لە دیاریی کردنی ئەو کاتە بۆ تەڵاق دان ئەوە نی یە کە لەو کاتەدا نەبێ ناکەوێ، چونکە لەهەر کاتێك دا تەڵاق درا ئەکەوێ بە پێی رای کۆڕو جەماوەری پێشەواو زانایانی ئیسلام. ئەو حەدیسی بوخاری یە کە باس کرا بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر کەوتن، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) نەیفەرمو نەکەوتووە، بەڵکو پێی ناخۆش بوو، فەرموی: بیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی. بەڵکو مەبەست لەو دیاریی کردنە ئەوەیە ئەگەر لەو کاتەدا نەبێ گوناهەو خواو پێغەمبەر (ﷺ) پێیان ناخۆشە. دیاریی کردنی ئەو کاتە یەکەم هەوڵدانە بۆ پینە کردنی دڕاوی و پێکەوە نووساندنی ئەو درزەی کە رووی کردووەتە خانووی ماڵ و خێزان، هەوڵدانە بۆ لادانی ئەو زەنگنەی کە خەریکە بیڕوخێنێ.

﴿وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَ﴾ عیدەی تەڵاق دراوەکان هەڵژمێرن، بەم رەنگە بزانن کەی دەست پێ ئەکات و کەی دوایی دێت، بۆ ئەمەی زیاد لە ئەندازەی پێویست درێژە نەکێشێ و ئافرەتەکان بە بێ مێردو شوکردن بمێننەوە. کە ئەوەش زیاندانە لێ یان، کەم و کوڕی نەبێ لە ماوەکەیان تا یەکەم مەبەست لەو عیدەیە پێك نەیەت کە بریتی یە لە دڵنیایی نەبوونی سك، کە نەبوونی لەوێدا زۆر پێویستە بۆ تێکەڵ نەبوون و پاراستنی نەسەب و نەژاد. ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ﴾ بترسن لە خوای پەروەردگارتان لە درێژە پێدانی عیدەیان، هەروەها لە کەم کردنەوەی عیدەیان تا نەوەك پێچەوانەی فەرمان و رەزامەندی خوا روو بدات. یان مەبەست ئەوەیە لە خوای پەروەردگارتان بترسن ﴿لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ﴾ ئەو ئافرەتە تەڵاق دراوانە دەرمەکەن لە جێ و شوێنەکانی خۆیان کە هینی ئێوەیە و ئەوانی تیا بوون لە کاتی تەڵاق دان دا، ناوی ئەبات بە ماڵی ئەوان بۆ بەهێز کردنی ئەو مافە مانەوە کە خوا بڕیاری داوە بۆ ئەو تەڵاق دراوانە لەو ماوەی وان لە عیدەدا، کە فەرموی: دەریان مەکەن ﴿وَلَا يَخۡرُجۡنَ﴾ خۆیشیان دەرنەچن، بەڵکو ئەبێ بیانهێڵنەوە ماوەی عیدەیان.

إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ

---

﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾ مەگەر كاتێ كردەوەیەكی زۆر ناشیرین بكەن كە ناشیرینی ئاشكرایە وەكو دزی یان داوێن پیسی، یان دەم درێژیی بۆ سەر تەلاق دەركەی یان كەس و كاری، یان خوێڕیی و مالأن گەڕ بێ بە بێ پرس لە مالْ دەرچێ. بێگومان مانەوەیان لەو مالأنەدا ئەبێ بە جۆرێك بێت هەرگیز تەنها نەكەون لەگەلْ كۆنە مێردەكانیان، وەكو هەموو نامەحرەمی تر. مانەوەی بەو شێوە شەرعی یە بەرژەوەندی یەكی ئاشكرای تێدایە:

١- ئەوە رێزو دلْنەوایی تیایە، هەر داخ و مەراقێكی تەلأق دانەكە ببێ بەرە بەرە كۆن ئەبێ و نامێنێ، بە پێچەوانەی ئەوە لە رۆژی لە پاش تەلأق دانەكە دەركرێن و دوور بخرێنەوە لەو مالْ و حالەی كە دلْیان پەیوەست بووە پێ یەوە.

٢- ئەگەر بە شەرعی رێگای یەك كەوتنەوە ببێ، بەم رەنگە هەر سێ تەلأقەكە نەكەوتبێ، ئەو مانەوە زۆر جار ئەبێتە هۆی بیر كردنەوەی پیاوو ئافرەتەكان و نەمانی خەشم و دلْ ئازاری یە كە بوو بەهۆی ئەو تەلأق دانە، گەڕانەوەی ئاشتی و دووبارە بوونەوەی سۆزو خۆشەویستی لە ناوەندیان دا، ئەو كاتە بە شەرعی یەك ئەكەونەوە و ئەو مالْ و حالە ناشێوێ كە ئەوەش شتێكە خواو پێغەمبەر (ﷺ) پێ یان خۆشە. ئەگەر ئەو تەلأق دراوە ئافرەتێكی رێك و پێك بێ بەو جۆرە بەرێزە با بمێنێ لە جێگاو شوێنی خۆی. بەلأم ئەگەر كردەوەی ناشیرینی كرد ئەوە هیچ شایانی ئەو رێزگرتنە نی یە و با بڕوا وەكو تەلأق دراوە، با لەبەر چاویش نەمێنێ.

﴿وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ﴾ ئەوانەی كە باس كران لەبارەی تەلأق دانی ئافرەت و خۆپارێزیی و ترسان لە خواو دەرنەكردنی تەلأق دراوەكان لە عیددەدا سنوورو دیاریی كراوی خوان، دایناون بۆبەندەكانی و نابێ لێی تێپەڕ بكەن. ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ﴾ هەركەس تێپەڕ بكات و دەرچێ لە سنوورەكانی خوا بێگومان ستەمی لە خۆی كردووە، ستەمی لە خۆی كرد بە هۆی ستەم لە ژنەكەی كە هەردوو لە یەك كەس پەیدا بوون كە باوكی هەمووانە، كەواتە ستەمە لە خۆی.

لەپاش ترساندن لە شکاندنی ئەو سنوورانە ئینجا هان ئەدا لەسەر پارێزگارییان بەمەی خوا خۆی ئەزانێ و چاوەڕوان و ئومێدەوارین لەوەی خوا داینا‌و بڕیاری دا. ئەفەرموێ: ﴿لَا تَدْرِي﴾ ئەی تەڵاق دەر تۆ نازانی ﴿لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾ بەڵکو لە پاش ئەو تەڵاق دانە لە عیدەداو هێشتنەوەی تەڵاق دراو لە جێ و شوێنی خۆی دا خوا کارێکی تر فەراهەم بێنێ، ئومێدەواری خێرو چاکە بکە، بەم ڕەنگە خوا کارێکی وا بکات لە پاش ئەو بەسەرهاتانە ئەو پیاوو ئافرەتە پەشیمان بکاتەوە لەو بارەی کە تێ‌ی کەوتن و بیانخاتەوە یەك بەخۆشی و کامەرانی. کەواتە مل کەچی بۆ خواو فەرمانبەری خوا لە هەموو شت چاکترە، پیت و فەڕ لە گوێڕایەڵی خوادا هەیەو لە خۆپارێزیی لە خواو ترسان لێ ی. زۆر جار بەسەرهات و ڕووداوی دڵ و دەروونی مەردوم داگیر ئەکات، هەموو کون و کەلەبەری داهاتووی لێ گیراوەو بە هیچ ڕەنگ نازانی لە داهاتوودا چۆن ئەبێ و چی بەسەر دێت؟ کەواتە دەروونی لە کۆت و زنجیرو بەندیخانەی ئەو بەسەرهاتە ناخۆشەدا ئەژی، وایش گومان ئەبات کە ئەو بەسەرهاتە هەمیشەیی ئەبێت و هەر بەو شێوە ئەژی، ئاگرێکی دەروونی یە لەوانەیە دووچاری نەخۆشی دەماری ئەکات. ئەو گومانەش شتێکی ڕاست نییە، ئەوەتا ئەبینین ئەو هەموو گۆڕاندن و دەوران دەورە خوا ئەیانهێنێ لەم جیهانەدا، شتی وا ئەهێنێ، لە پاش تەنگی و تەنگەتاوی خۆشی و کامەرانی ئەهێنێ و دەروو ئەکاتەوە، هەروەها... هەموو کاتێ خوا ئەم شتانە دەرئەخات لە پاش ئەوەی هەموو ئەوانە لە پەنای پەردەی غەیب دا شارابوونەوە. جا خوای گەورە لەناو بەناوی ئەم باسەدا ئەم شتە ڕاستە ئەخاتە بەرچاوی بەندەکانی بۆ ئەمەی جێگیر ببێ لە دەروونیان دا، تا هەمیشە چاو ببڕنە کاری خواو هیچ شتێکی تر دەروونیان نەگرێ، هەمیشە دەرگای هیواو ئومێد بە خوا بکەنەوە لە خۆیان و هەرگیز دای نەخەن، دەروونی لە بەندیخانەدا ئەژی و ئەگەر بەسەرهاتی خراپ سەر دڵی گرت و هەناسەی سوار کرد با بیرێك بکاتەوەو بڵێ بە خۆی: ﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾.

قۆناغی یەکەم لەبارەی تەڵاق دانی ئافرەتەوە بەو جۆرە بوو کە باس کرا، ئینجا دێتە سەر قۆناغی دووەم و ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ ئینجا کاتێ تەڵاق دراوەکان گەیشتنە دوا دوایی عیدەکەیان

فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا (٢) وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ

---

﴿فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ﴾ راگیریان بکەن و بیانگێڕنەوە بۆلای خۆتان بە باشی، بەم رەنگە بە خۆشی بژین لەگەڵیان و نان و نەفەقەیان بدەن بەو شێوەی شەرع دایناوە، هێنانەوەکەیان بە نیازی ئێجگاری بێت نەك بۆ ئەوە دووبارە و سێ بارە تەڵاقیان بدەنەوە تا عیدەکەیان زۆر درێژە بکێشێ بۆ بەستنەوەو ئازار دانیان یان بۆ ئەوە ناچار بن تەڵاقتان لێ وەرگرن لەسەر مارەیی و ماڵ و بەوە خۆیان رزگار بکەن وەکو لەو کاتەدا شتی وا بووەو هەر هەیشە. ئەگەر ئافرەتەکان راگیر کران با بەو شێوە چاکە بێت ﴿أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ﴾ یان لێ یان جوێ ببنەوە بە باشی، بەم رەنگە لێ یان گەڕێن تا عیدەکەیان دوایی دێت ئەو کاتە بە تەواوی لە ژێر رکێفتان دەرئەچن و قەدەغە ئەبن لێتان مەگەر بە مارەکردنێکی تازە وەکو یەکەم جار، ئەگەر رێگای شەرعی مابێ.

ئینجا دوای دەست بەردار بوون مافی شەرعی خۆیان بدەنێ، تورەیی و جوێن و قسەی ناشیرین بەکار نەهێنرێ لەگەڵیان، بەڵکو بە نیازی پاك و قسەی پاك، کە ئەو نیاز پاکی و دەم پاکی یە ئیسلام داوای ئەکات لە هەموو کەس لە هەموو کاتێك دا و بۆ هەموو کارێك، بە تایبەتی لێرەدا پێویستە ئەو دەم پاکی و نیاز پاکی یە، چونکە ئەگونجێ ئەو پیاو و ئافرەتە جارێکی تر بکەونە یەك بە مارە کردنێکی تازە ئەو کاتە روویان ئەبێ تەماشای یەکتر بکەن و ژیانێکی کامەرانی تازە دامەزرێنن. ئینجا شتێکی زۆر بەجێ و بە نرخە شایەت گرتن لەسەر جیا بوونەوە یان گێڕانەوەو هێنانەوە، بۆ بەربەست کردنی هەموو گومان و قسەو باس و ئاژاوەیەك، چونکە لەوانەیە خەڵکی ئاگادار بن بە تەڵاق دان، بەڵام بێ ئاگان لە گێڕانەوە بۆ ژێرنیکاح،کاتێ کەشایەتیان لەسەرگیرانەوگومان وئاژاوەبەربەست ئەبن. لەبەرئەوەئەفەرموێ:

﴿وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾ دوو پیاوی دادپەروەری راستگۆ لە خۆتان بگرن بە شایەت.

ئینجا ئەو شایەت گرتنە واجب و پێویست کراوە لە هەردوو باردا یان فەرز نی یە و سوننەتە بۆ هەردوو، یان فەرزە بۆ گێڕانەوەو سوننەتە بۆ تەڵاق دان و جیا بوونەوە، یان بە

پێچەوانەی ئەم باری سێ یەمە؟ ئەمانە هەرکام رای هەندێکە لە زانایانی ئیسلام. بەهەرحاڵ – وەکو وتمان – شتێکی زۆر بە نرخ و پەسەندەو شایانە بۆ بەدی هێنان، بە تایبەتی بۆ جیابوونەوە کە زۆرتر جێگای گومان و ئاژاوەیە. بێگومان هەڵگرتنی شایەتی و شایەتی دان، ئەرك و مەینەتی هەیە، چونکە لەوانەیە شایەت خەریك ئەکات و دەستی ئەگرێ لە کارو فرمانی خۆی، پێویستی ئەبێ بە چوونە دادگاو بەردەم حاکم، لەوانەیشە جێ و شوێنیان دووربێ، یان چەند بەرگری کەری بۆ پەیدا ئەبێ و ناتوانێ شایەتی یەکە بدات، هەروەها ئەگونجێ بە هەر هۆیەك ئەو شایەتە بە رێك و راستی نەیەتە پێشەوە. لەبەر ئەوە بە گرنگی رووی ئەم فەرمانە ئەکاتە شایەتەکان و ئەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ﴾ لەبەر خواو بۆ رەزامەندی خوا ئەو شایەتی یە بە رێك و راستی بدەن بە بێ گۆڕین و زیادو کەم، کەواتە مەسەلەکە مەسەلە خوایە، شایەتی دان تیای دا بۆ خوایە، ئەو فەرمانی پێداوە، ئەو ئاگادارە بەسەریەوە، ئەو پاداشتی لەسەر ئەداتەوە، لێرەدا هاوکاری لەگەڵ خوایە نەك لەگەڵ مێردو نەك لەگەڵ ئافرەتەکەو نەك لەگەڵ هیچی کەسی ترا!

﴿ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ ئەوەی کە باس کرا لەبارەی تەلاق دانی ئافرەتەوە، یان ئەو شاهید گرتن و شایەتی دانە بە رێکی پەندو ئامۆژگاری کەسێکی پێ ئەکرێ کە بڕوای هێنابێ و بڕوای هەبێ بە خواو رۆژی دوایی. واتە ئەو بڕیارانە ئاراستەی بڕوادار ئەکرێ و خوا ئامۆژگاری ئەکات بە شتێ کە پەیوەستە بەو بڕوادارەوە و خێرو چاکەی تیایە. کەواتە کاتێ بڕواکەی راست بێ ئەبێ ئامۆژگاری یەکەی خوا وەرگرێ و بیگرێتە گوێ و گەردن، دە ئەوەیە سەنگی مەحەك بۆ بڕواکەیان.

ئینجا بڕیارێکی گشتی ئەهێنێ بە دوای باسەکەدا کە زۆر بەکارە بۆ وەرگرتن و لە گوێ گرتنی ئەو پەندو ئامۆژگاری یانەی کە باس کران، زۆر بە جوانی ئەیان گرێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ﴾ هەرکەس لە خوا بترسێ و خۆی بپارێزێ لەو شتانەی قەدەغەی کردوون ﴿يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾ خوا دەروی لێ ئەکاتەوە و رێگای دەرچوون لە تەنگی بۆ فەراهەم ئەهێنێ و دەربازی ئەکات لە خەم و خەفەتی هەردوو جیهان، ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ رۆزی ئەداتێ لە لایەکەوە کە بە تەمای نی یە و گومانی بۆ ناچێ. کەواتە هەرکەس لە خوا بترسێ و لە تەلاقدانی ژنەکەی دا بە پێی ئەو فەرمانانە بجوڵێتەوە کە باس کران خوا دەروی خێری لێ ئەکاتەوەو رزگاری ئەکات لە هەر تەنگ و چەڵەمەیەك بێتە رێگای بەهۆی ئەو تەلاق دانەوە.

﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ هەركەس پشت ببەستێ بەخواو کاروباری خۆی هەواڵەی خوا بکات﴿فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾ خوا بەسە بۆ چارەسەر کردنی ئەو کەسە.

پشت بەستن بە خوا ئەوە نی یە کە هەوڵ و تێکۆشان نەکرێ و پاڵی لێ بدرێتەوە بە تەمای خواو چاوەڕوانی خوا، ئەوە شتێکی بێزراوەو ئیسلام ئەوەی ناوێ، ئەوە پێی ناوترێ ﴿توکل﴾ پشت بە خوا بەستن، بەڵکو ئەوە تەمبەڵی و تەوەزەلی یەو لە شەرع دا پێی ئەوترێ ﴿تواكل﴾. پشت بەستن بە خوا ئەمەیە: کابرا هەوڵ و تەقەلای خۆی بەکار بێنێ، هەرچی هۆی بوونی کارەکەیە دەستی پێوە بگرێ، هەرچی هۆی نەبوون و فەراهەم نەهاتنە نەیهێڵێ، ئینجا پشت ببەستێ بە خوا لە فەراهەم هێنانی کارەکەیدا.

بە درێژیی لە شوێنێکی تردا ئەم باسە روون کراوەتەوە، کەواتە لێرەدا ئەم ئەندازە بەسە بۆ بیر خستنەوە. هۆی پشت بە خوا بەستنیش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ﴾ بەڕاستی خوا بەجێ هێنەری هەموو کارو بڕیاری خۆیەتی و ئەگات بە هەمووی و هەرچی ویستبێ لە دەستی دەرناچێ. کەواتە پشت بەستن بە خوا پشت بەستنە بە کەسێ کە هەموو شت و هەموو کاروبارێ بە دەست ئەوەو ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەو. ﴿قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا﴾ بێگومان خوا دایناوە و گێڕاویەتی بۆ هەموو شتێ ئەندازێ کە زیادو کەم نابێ لێ ی. کەواتە هەموو شتێ دیاریی کراوە بە ئەندازەی خۆی، بە کات و شوێنی خۆی، بە حاڵەت و بەسەرهاتی، بەهۆو بەرهەمی، لە ڕیزی تایبەتی خۆی دا هیچ شتی گۆترە کاری نی یە لە هەموو ئەم بوونەوەرەدا، لە ئادەمی و ژیانی ئادەمیدا. ئەم باوەڕو تێگەیشتنە بەو جۆرە شتێکی زۆر گرنگ و بە نرخە لە ئیسلام دا، لە ژیانی بڕواداران.

﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ٥﴾

---

لە سورەتی ﴿البقرة﴾ دا باسی عیددەی تەڵاق دراوێکی کرد کە حەیزدار بێت کە سێ پاکی یە یان سێ حەیزە، ئەوەش بە گوێرەی دووبەرەکی و رای جیاوازی زانایانی ئیسلام لەوەدا. کەواتە تەڵاق دراو لە حەیزدا، ئەوەی کە حەیزی هەر نەبووبێ و ئەوەی سك پڕ بێ پێویستە عیددەیان دیاریی بکرێ. ئینجا لەم ئایەتەدا عیددەی ئەمانەشی دیاریی کردو فەرموی: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ﴾ لەناو ژنەکانتان دا ئەوانەی کە بێ هیوا بوون لە حەیزو وەستاونەتەوە لێ ی ﴿إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾ ئەگەر عیددەیان نەزانی و گومانتان هەیە تیای دا، ﴿فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ﴾ عیددەی هەرکام لەوانە سێ مانگە ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ﴾ ئەوانەیش کە هێشتا نەکەوتوونەتە حەیز لەبەر منداڵی یان هەر حەیزدار نین وەکو ئەگێڕنەوە لە ئافرەتانەوە کە لە ژیانیان دا حەیزیان پیا نەهاتووە.

ئەم دوو تاقمەی بەو جۆرە روون کردەوە، ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ﴾ خاوەن سکەکان ﴿أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾ دوایی عیددەیان دانانی سکەکەیانە، ئیتر زۆر پێ بچێ یان کەم، هەر لەگەڵ سکەکەی لێ بوەوە عیددەی تەواو ئەبێ و دروستە داوا بکرێ و مارەش ببڕێ. بەس ئەگەر مارە بڕرا تا پاك نەبێتەوە لە زەیسانی دروست نی یە مێردەکەی بچێتە لای، بەڵکو ئەبێ چاوەڕوانی پاك بوونەوەی بکات با شەست رۆژیشی پێ بچێ کە ئەوپەڕی ماوەی زیسانییە.

ئینجا بە پێ ی باوی قورئان کە هەمیشە پەندو ئامۆژگاری ئەهێنێ بە دوای بڕیارەکانی داو پەیوەستیان ئەکات بە لە خوا ترسان و فەرمان بەری و خۆپارێزیی لە قەدەغەکانی خوا. لەسەر ئەو باوە شیرینە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ﴾ هەرکەس بترسێ لە خوا بەم رەنگە لە سنووری فەرمان و بڕیارەکانی تێپەڕ نەکات ﴿يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا﴾ خوا کاری بۆ ئاسان ئەکات

و ئاسانی فەراهەم ئەهێنێ لەکارو فرمانی دا. بێگومان ئاسان کردنی کار ئەوپەڕی ئامانج و مەبەستی مەردومە، بەڕاستی بەهرەو چاکەی گەورە لەمەدایە کە خوا کاروباری بەندەی سووك و ئاسان بکات. ئەو کاتە نە ماندوویی و نە تەمبەڵی رووی تێ ناکات، نە لە هەستی دا و نە لە کردەوەو بزووتنەوەی دا، رەزامەند و خۆشی بەرهەمی کردەوەی خۆی دەست کەوت ئەبێ، بە ئاسانی و خۆشی ژیان ئەباتە سەرو ئەم جیهانە بەجێ دێڵێ. کەواتە هەرکەس فەرمانبەریی خوا بکات لەبارەی تەلاق دانەوە بەو جۆرەی کە خوا فەرمانی دا بێگومان خوا کاروباری بە ئاسانی ئەگوزەرێنێ وەکو بە ئاسایش بۆی نەخشە کێشاوە. بۆ وێنە ئەگەر هەرکەس بە پێی بەرنامەکەی خوا تەلاق بدات ئەبێ یەك تەلاقی ژنەکەی بدات، ئەو کاتە کاری ئاسانە تا ئافرەتەکە عیددەی تەواو نەبێ هەرکاتێ بڵێ: ئەوا فلأنم گێڕایەوە بۆلای نیکاحی خۆم ئیتر بەوە حەلأڵ ئەبێتەوە بۆی و ئەگەر لەو ماوەیەدا نەیگێڕێتەوە تا عیددەی بەسەر ئەچێ هەر کاری ئاسانە و ئەگەر دوو لا ئارەزوو بکەن بە نیکاحێکی تازە بە دوو وشە حەلأڵ ئەبێتەوە، تا دووجار ئەوە بە ئاسانی ئەکرێ!! ﴿ذَٰلِكَ أَمْرُ اللَّهِ﴾ ئەوەی کە وترا فەرمانی خوایە، ﴿أَنزَلَهُ إِلَيْكُمْ﴾ ناردی یە خوارەوە بۆ لای ئێوە ئەی بڕواداران، کەواتە فەرمانبەریی ئەو فەرمانە بەدی هێنانە بۆ بڕواکەتان، بۆ پەیوەندی و پەیوەستیتان بە خواوە.

ئینجا هەمیتر ئەگەڕێتەوە سەر لە خواترسان کە بنەڕەتی هەموو خێرو چاکەیەکە لەم جیهانەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا﴾ هەرکەس بترسێ لە خوا، خوا خراپەکانی بۆ دائەپۆشێ و لێ ی ئەکاتەوە، پاداشتی بۆ گەورە ئەکات، واتە بە چەند قات پاداشتی ئەداتەوە، بەڵێنی پێشوو ئاسان کردنی کاروباریان بوو، ئەم بەڵێنە داشاردن و داڕنینی گوناهیانەو گەورە کردنی پاداشتیان. بەڕاستی بەهرەو بەخششەکە ئێجگار گەورەو فراوانە، ئێجگار هاندەرو پاڵ پێوەنەرە بۆ گوێڕایەڵی. ئەم بڕیارو بەڵێنە هەرچەند گشتین. بەلأم لەم شوێنەدا لە یەکەم جارەوە مەسەلەی تەلاق ئەخاتە بەرچاو، کەواتە بڕوادار بە چ ڕوویەکەوە سەرپێچی بکات و توندو تیژیی و گرێ و گوتاڵ بەکاربێنێ لە مەسەلەی تەلاق دا لە کاتێك دا کە خوا ئاوا بە لێشاو بەهرەو چاکەی ئەرێژێ؟!!

﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ﴾

**لەپاش باسی عیددەی تەلاق دراوان، ئینجاباسی جێ و شوێن و ماوایان ئەکات لەماوەی عیددەدا، ئەفەرموێ: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم﴾دایان بنێن لەشوێنێکدا لەوشوێنەی کەخۆتانی تیا بوون، ﴿مِّن وُجْدِكُمْ﴾ بە پێی بوون و دەسەلاّتتان، واتە کەم تر نەبێ لە جێ و شوێن و دەسەلاّتی خۆتان. ﴿وَلَا تُضَارُّوهُنَّ﴾ زیان و کەم و کوڕی بەکار مەهێنن لەگەڵیان ﴿لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ تا تەنگیان پێ هەڵچنن و وەڕەسیان بکەن تا ناچار ببن بە دەرچوون. ﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ﴾ ئەگەر ئەو تەلاق دراوانە سکیان هەبوو ﴿فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ نەفەقەیان بکێشن ﴿حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ هەتا سکەکەیان دائەنێن. ئیتر هەرچەندی پێ بچێ، کە بەوە عیددەیان دوایی بێت وەکو لەمەو پێش فەرموی. ئینجا ماوەتەوە نەفەقەی ئەوانەی کە سك پڕ نین ئایا پێویستە یان نا؟ ئەوە مەسەلەیەکە زانایان تیای دا دووبەرەکین و لە کتێبەکانیان دا بە درێژیی باس کراوە.**

**ئینجا کە منداڵەکەی بوو پێویست نی یە لەسەری دایەنی و شیر پێدانی ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ﴾ ئینجا ئەگەر شیر بدەن بە منداڵەکانتان ﴿فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئەوا کرێی خۆیانیان بدەنێ لەسەر دایەنی و شیر دانەکەیان. واتە بە پێی باوو عادەت هەرچەند کرێ یان بدەنێ تا پێی بژین و شیرەکەیان وشك نەکات، کە ئەوەش ئەوپەڕی چاکەو چاودێریی یە کە ئیسلام بەکاری ئەهێنێ لەگەڵ ئەو دایکەدا!!!**

**ئینجارووی فەرمودەئەکاتەباوك ودایکەکانی ئەومنداڵە بێ چارە، ئەفەرموێ: ﴿وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ﴾ واتە ئەی باوك و دایکەکان لەناو خۆتان دا راوێژ بکەن و فەرمان بدەن بە یەکتر بە چاکەو یەك بکەون لە بارەی بەرژەوەندی ئەو منداڵانە و بەخێو کردن و شیر پێ دانیان و کرێی بەخێو کردن و شیر پێ دانەکەیان.**

**ئەو منداڵانە سپاردەیەکن لە گەردنی ئەو باوك و دایکانەدا، کەواتە بە هەوڵ بدەن کارێکی وا نەکەن جیا بوونەوەو تەلاق دانەکە ببێ بە زیان و نەگبەتی بەسەر ئەو منداڵە بێ تاوان و بێ چارانەوە. کەواتە با بە سووك و ئاسانی یەك کەون.**

وَإِن تَعَاسَرۡتُمۡ فَسَتُرۡضِعُ لَهُۥٓ أُخۡرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقۡ ذُو سَعَةٖ مِّن سَعَتِهِۦۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيۡهِ رِزۡقُهُۥ فَلۡيُنفِقۡ مِمَّآ
ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَاۚ سَيَجۡعَلُ ٱللَّهُ بَعۡدَ عُسۡرٖ يُسۡرٗا ﴿٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ عَتَتۡ عَنۡ
أَمۡرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبۡنَٰهَا حِسَابٗا شَدِيدٗا وَعَذَّبۡنَٰهَا عَذَابٗا نُّكۡرٗا ﴿٨﴾ فَذَاقَتۡ وَبَالَ أَمۡرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمۡرِهَا
خُسۡرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ

---

﴿وَإِن تَعَاسَرۡتُمۡ﴾ ئەگەر سەختیتان بەکارهێنا لەگەڵ یەکتر و یەك نەکەوتن، بەم رەنگە باوکەکان چرووکی یان ئەکرد یان دایکەکان داوای زیاد لە ئەندازیان ئەکرد ﴿فَسَتُرۡضِعُ لَهُۥٓ أُخۡرَىٰ﴾ ئەو کاتە ئافرەتێکی تر شیری پێ ئەدا. واتە نابێ ئەو منداڵە پەکی بکەوێ، بەڵکو پێویست لەسەر باوکەکە ئافرەتێکی تر پەیدا بکات شیر بدات بە منداڵەکە.

ئینجا باسی ئەندازەی نەفەقە ئەکات ئەفەرموێ: ﴿لِيُنفِقۡ ذُو سَعَةٖ مِّن سَعَتِهِۦۖ﴾ ئەوەی هەیەتی و دەوڵەمەندە با بە پێی بوون و دەسەڵاتی نەفەقە بدات و ماڵ خەرج بکات لەو مافانەی کە لەسەریەتی ﴿وَمَن قُدِرَ عَلَيۡهِ رِزۡقُهُۥ﴾ هەرکەس رۆزی کەم و کوڕ کراوەو تەنگ گوزەرانە ﴿فَلۡيُنفِقۡ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُۚ﴾ با لەوەی خوا پێی داوەو بە پێی ئەوە نەفەقە بکێشێ و خەرج بکات. هەرکەس بە پێی حاڵی خۆی و بوون و نەبوونی نەفەقەی لەسەرە، چونکە ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَاۚ﴾ خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازی ئەوەی کە خۆی پێی داوە.

ئینجادڵنەوایی پیاووژنەکە ئەکات لەسەر نەبوونی و دەست تەنگی یەکەیان و دڵخۆشیان ئەکات بەمەی خوا دەروو ئەکاتەوەو ئەوان هەر لەسەر ئەو بارە نامێنن. ئەفەرموێ: ﴿سَيَجۡعَلُ ٱللَّهُ بَعۡدَ عُسۡرٖ يُسۡرٗا﴾ دوای تەنگی خوا ئاسانی ئەهێنێ، لەپاش بەسەرهاتی ناخۆش و خراپ خۆشی ئەهێنێ. لەپاش بێ نەوایی و بێ دەستی دەسەڵات و سامان ئەهێنێ، ژیانی ئەم جیهانە لەسەر بارێ نابێ و گۆڕانی تێ ئەکەوێ، هەموو بەستراوە بە مەیل و خواهیشی خواوە، کەواتە با بەندەکانی هەر بە تەمای ئەو بن و روو تەنها بۆلای ئەو بکەن.

ئا بەم شێوە نایابە کەس نەدیوە قورئان چارەسەری دانا بۆ تەڵاق و هەموو گرێ یە روو بدات لە پاش تەڵاق دان. بەو شێوە پڕ لە دادە بەرگری ئەو ناڕەوایی و ستەمانەی کرد کە لە سەردەمی نەفامیدا ئافرەت گرفتار بوو پێ یانەوە، هەروەها لە هەموو چەرخێ تردا کە لادرێ

له بەرنامەکەی خوا. رادەو پلەی ئافرەتی بەرز کردەوە و تا رادەیەك ئەوپەڕی نرخ و ڕێزداری بۆ دانا و ئازادی و سەربەستی راستەقینەی پێدا. ئەمانەشی هەموو داهێنا نەك لەبەر ئەوە لە هەموو جیهان دا تاقە دەنگێ بووبێ هاوار بکات بۆ بەش خوراویی ئافرەت. یان بە بەش خوراو ستەم لێ کراوی دانێ و دڵی بداتەوە، لەبەر ئەمە نەبوو یەکێتی ئافرەتان ببێ و داوای ماف بکات بۆ ئافرەت، ئەمانە هیچیان نەبوون. بەڵکو هۆکە تەنیا ئەوە بوو کە یاسا و رژێمەکە لە ئاسمانەوە هاتبوو نەك لە زەوی پیس و پۆخڵ دەرهاتبێ، دادو راستی یەکە لە رەحمەتی ئاسمانەوە باری بەسەر زەوی دا. رەحمەتێك بوو کە ژیانی ئادەمی لەو چاڵی و پەستی یە رزگار ببێ و بەرز ببێتەوە و بگاتە رادەی خۆی.

ئەمە ئایینی بەرزی خوایە، هەرکەس رووی لێ وەرگێڕێ کوێری سمەسا لێ بڕاوە، هەرکەس تانەی لێ بدات و لەکەداری بکات پەست و سەر بەرەو ژێرە، هەرکەس بەربەرەکانێ و جەنگی لەگەڵ بکات دوا بڕاوو ژێر کەوتووە، چونکە هەرکەس لادا لە شەریعەتی خواو بچێ بۆ شەریعەتی بەندەیانی خوا، ئەو کەسە پاکی و بەرزی ناوێ و ئەیەوێ خۆی بخاتە ناو چاڵی زەلکاوی بۆگەن.

دوای ئەو باس و بڕیارو فەرمانانە ئینجا هەڕەشە ئەکات لە سەرپێچی کردن و سەرپێچی یان لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکانیان لە گەلە رابردووەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ﴾ دانیشتوانی زۆر شاری لەمەوبەر ﴿عَتَتۡ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ﴾ سەرکێشی و سەرپێچی یان کرد لە فەرمانی پەروەردگاریان و لە پەندو ئامۆژگاری پێغەمبەرەکانی ﴿فَحَاسَبۡنَٰهَا﴾ بەهۆی ئەوەوە ئێمەش حیساب و پرسینەوەمان لەگەڵ کردن ﴿حِسَابٗا شَدِيدٗا﴾ بە حیساب و پرسینەوەیەکی بەتین، بەم رەنگە هەموو گوناهو تاوانەکانمان خستە بەرچاوو لە هیچیان نەبوردین ﴿وَعَذَّبۡنَٰهَا عَذَابٗا نُّكۡرٗا﴾ سزامان دان بە سزایەکی گەورەی ناخۆش ﴿فَذَاقَتۡ وَبَالَ أَمۡرِهَا﴾ تا چەشتیان سزای کارو کردەوەی خۆیان ﴿وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمۡرِهَا خُسۡرًا﴾ سەرەنجامی کارو کردەوەیان زیانێکی گەورە بوو کە هیچ زیانێ پێی ناگات، ئەوەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ﴾ خوا ئامادەی کردووە بۆیان سزایەکی سەخت وبەتین، کە سزای ئاگری دۆزەخە لە رۆژی دواییدا.

ئەندازەیە ئەوەستین و بیری ئەکەینەوە لەم ترساندنە درێژە لێرەدا ئەبینین خوای گەورە باوی وابووە هەر گەل و وڵاتێ یاخی بووبن لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا، خوا قاری لێ گرتوون و دووچاری تۆڵەو سزای کردەوەی خۆیان بوون.

ئەم ترساندنە بەتینەش ئەهێنێ بە بۆنەی مەسەلەی تەلاق و ئەو بڕیارو فەرمانانەی کە پەیوەندی یان هەیە بە تەلاقەوە، پەیوەستیان ئەکات بەو باوە گشتی یەوە، ئەو پەیوەستی یەش ئەوە ئەگەیەنێ کە تەلاق شتێکی تایبەتی نی یە بە خێزان و ژن و مێردەوە، بەڵکو کاری هەموو گەلی موسڵمانە، کەواتە گەل لێپرسراوە لیێ ی، گەل لێپرسراوە لە ئایین و شەریعەتی خواداو سەرپێچی و دەرچوون لە فەرمانی خوا لە نیکاح و تەلاق و هەر فەرمانێکی تردا کاتێ ڕوو بدات لەناو گەل دا بە بێ بەرگری و جڵەوگیریی ئەو کاتە هەموو گەل و ئوممەت تاوانبارو لێپرسراوە و تۆڵەی ئەو سەرپێچی و دەرچوونە تەنها بۆ ئەو کەسانە نی یە کە ئەیکەن، بەڵکو بۆ هەموو ئەو گەل و وڵاتەیە کە ئەو سەرپێچی یەی تیا ڕوو ئەدات، لە ڕێکخستنی ژیان دا لایاندا لە بەرنامەی خوا. چونکە ئەم ئایینە بۆ ئەوە هاتووە گوێڕایەڵی بکرێ و هەموو فەرمانەکانی بەجێ بهێنرێ، بۆ ئەوە هاتووە بەڕێوەبەرو کاربەدەست بێت بەسەر ژیان داو چاودێریی هەموو کاروباری ژیان ئەکات. کەواتە هەر سەرپێچی یەك کرا لە فەرمانی خوا لەناو هەر گەل و کۆمەڵێك دا بە بێ بەرگری با ئەو سەرپێچی یە لە شتێکی سەختی دا بێت و لەلایەن چەند کەسێکەوە بێت، ئەو سەرپێچی یە تاوانە بۆ هەموو، تۆڵەکەی ڕوو ئەکاتە هەموو، ئەو گەل و کۆمەڵە ئەکەونە بەر ئەو باوی خوا کە دەست نیشانی بۆ کردو هەرگیز گۆڕانی نی یە، ئەوە شتێکە هەروا بووەو هەر وایش ئەبێ. ئێمە ئێستا ئەبینین و پێشووەکانی ئێمەش بینیویانە کە ئەو تۆڵەی لادان لەبەرنامەی خوا دووچاری لادەرەکان بووە وەك ئێستاش دووچارە ئەم هەموو گەل و تاقمە پیێ یەوە، ئیتر هەرکاتێ و هەرجارێ بە جۆرێ، بە گرانی و قات و قڕی، بە ئاژاوەو تێك چوونی وڵات، بە داباریینی جەورو ستەم. بە بیم و ترس و بێ ئارامی و دانەمەزرانی وڵات.

بەڕاستی ئەگەر بیر بکەینەوە لە هەموو ڕۆژێك دا تۆڵەو سەرەنجامی ئەو لادانە ئەبینین و ئەبیستین!! ئەم ئایینە بەرنامەی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی یە، هاتووە بۆ ئەمەی کۆمەڵێکی موسڵمان پێك بێنێ کە ڕژێمێکی تایبەتی هەیە. هات بۆ ئەمەی ژیانی ئەو گەل و کۆمەڵە بگۆڕێ و بیگرێتە دەست و چاودێریی بکات. جا لەبەر ئەوە هەموو گەل و کۆمەڵ لێپرسراوە لەو ڕژێمە، لێپرسراوە لە بڕیارو فرمانەکانی، هەرکات پشتیان تیێ کردو لایان دا دووچاری تۆڵەی خۆیان دێن کە دەست نیشانی بۆ کرد لەم ئایەتەی کە خەریکین بە تەفسیرەکەیەوە.

فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ الَّذِينَ آمَنُوا قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِ اللَّهِ مُبَيِّنَاتٍ
لِيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ

ئینجا لە بەرامبەر ئەو ترساندنە درێژەدا بانگ ئەکاتە ژیرە تێگەیشتووەکان بۆ لە خواترسان. ئەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾ کەواتە لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە هۆی خەشم و سزای خوا لە وێنەی تۆڵەو سزای گەلە رابردووەکان، ئەی ژیرە تێگەیشتووەکان، ئەی خاوەن دڵەکان، مەبەست بەوانە ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ کەسانێکن کە بڕوایان هێناوە، ﴿قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا﴾[1] بێگومان خوا بۆی ناردوونەتە خوارەوە پەندو ئامۆژگاری یەکی گەورە کە قورئانە.

ئینجا ئەو قورئانەی کە لای خواوە هات لەبەر ئەوەی بە دڵ و گیانی فروستادەکەی دا گوزەر ئەکات و ئەگات بە ئوممەت وەك ئاوێنەیەکی بێ لەکە قورئانی تێدا دەرئەکەوێ. کەواتە وەك ئەوە وایە قورئانەکە بووبێ بە فروستادە، لەبەر ئەوە لە بریتی ئەودا ئەفەرموێ: ﴿رَسُولًا﴾ پێغەمبەرێك: ﴿يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِ اللَّهِ﴾ کە ئەخوێنێتەوە بەسەرتان دا ئایەتەکانی خوا لە کاتێك دا ﴿مُبَيِّنَاتٍ﴾ ئەو ئایەتانە روون کەرەوەی ئەوەن کە پێویستە بۆ بەندەکانی خوا ﴿لِيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ تا دەرتان بێنێ لە تاریکی یەکانی نەفامی بۆ روناکی رێنموونی و رێگای راستی خوا، کە تاقە رێگایە. بێگومان رێگای کوێرایی زۆر زۆرە تا رادەیەك بە ئاسانی نایەتە ژمارە، بەڵکو دواییش نەهاتووەو بەرە بەرە جۆرو شێوەی تری پەیدا ئەبێ. بەڵام رێگای راست تەنها رێگایەکەو بە هیچ کلۆج ناگونجێ زیاد لە یەك بە وێنەی هێڵی راست کە ناگونجێ زیاد لە یەك بێت، جا لەبەر ئەوە قورئان لەم جۆرە شوێنانەدا ﴿ظلمات﴾ بە کۆ ئەفەرموێ، ﴿نور﴾ بە تاك.

---

[1] وشەی ﴿ ذکرا، رسولا ﴾ بە چەند جۆرێ تر تەفسیر کراوەتەوە. بە پێی رێزمانی عەرەبی وشەی ﴿ رسولا ﴾ بە چەند جۆرێ ترکیب کراوەو بە پێی ئەوانە تەفسیرەکەیان جۆر بە جۆر ئەبێت، هەموو جۆرێکیان ئەگونجێن، بەڵام لەم کاتەدا ئەم رایەم پەسەند کرد کە وتم.

وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ
رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾

---

**ئینجا زیاد له رووناکی و رێنموونی بەڵێن ئەدا به نازو ڕێزی هەتا هەتایی ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ﴾ هەرکەس بڕوا بێنێ به خوا ﴿وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾ کاری چاك و پەسەند بکات ﴿يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ﴾ خوا ئەیخاته ناو بەهەشتانێ که ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ که جۆگه و رووبارەکان دێن و ئەچن به ژێر درەختەکانی دا، له کاتێکدا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ ئەمێننەوەو هەمیشەیی ئەبن لەو بەهەشتانەدا بێ برانەوە هەتا هەتایه، له کاتێك دا ﴿قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا﴾ که بێگومان خوا ڕۆزی ئامادە کردووە بۆی به زۆری و فراوانی، به جۆرێ وێنەی نەبینراوەو نەبیستراوەو به دڵ دا نەهاتووە!!**

**لەپاش ئەو هەموو یاساو تەمێ و پەندو مژدەو ترساندنەی که له سورەتەکەدا تێپەڕی کرد، ئینجا کۆتایی سورەتەکه ئەهێنێ به ئایەتێ له بارەی دروست کردنی ئەم بوونەوەره گرنگەو بەڕێوە بردن و تەگبیر کردنی هەموو کاروبارێ. ئەوەی لەم سورەتەدا باس کراوە پەیوەستی ئەکات بەو بڕیارو دەسەلات و**

**زانینی خواوە که ئیش کەرن لەم بوونەوەرەدا، ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى﴾ خوایەکی ئەوتۆیه ﴿خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ که حەوت ئاسمانی دروست کردووە. خوای گەورە له زۆربەی شوێن دا ژمارەکەیشی دیاری ئەکات و هەواڵمان پێ ئەدات به شێوەیەکی روون و ئاشکرا به دروست کردن و بوونی حەوت ئاسمان. ئەو ئاسمانەش تەبەق لەسەر تەبەقن له پاش قورئان ئەم هەواڵه به روونی هەیه له فەرمودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) کەواته پێویسته لەسەرمان بێ گێرو گرفت بڕوای بەمێزمان هەبێ به بوونی حەوت ئاسمان، ئیتر با نەزانین مەبەست بەو حەوته چی یه؟ ئایا مەبەست حەوت کۆمەڵەی خۆری یه؟ یان حەوت کاکەشانه؟ یان هەر شتێکی تر**

که وتراوه؟ بەلاَم زەوی بە کۆ باسی نەهاتووە لە قورئان دا، ژمارەشی بۆ باس نەکراوە بە هیچ رەنگ تەنها لەم ئایەتەدا نەبێ کە دەست نیشانی تیایە بۆ ژمارەی حەوت کە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ﴾ دروستی کردووە لە زەوی وێنەی ئەو حەوت ئاسمانە. ئیتر ئایا مەبەست وێنەیان لە مایەو ماددەو کەرەسەو هەندێ سیفەت و نیشانەدا. یان وێنەیان لە ژمارەدا، هەرکام لەم دوو مەبەستە هەڵئەگرێ و ئەگونجێ، بەلاَم دووەم ئاشکرا ترو روون ترە لە دیمەن و رواڵەتەوە. هاتنی زەوی بە کۆ بە ژمارەی حەوتەوە ﴿والأرضين السبع﴾ لە چەند حەدیسێك دا قۆڵگیرو بەهێز کەری ئەم مەبەستی دووەمەیە. بەڵێ بە درێژیی و بە روونی چەندەها ریوایەت هاتووە لە بارەی ئەو حەوت زەوی یەو جێ و شوێن و چۆنێتی و ماوەی نێوانیان و ئاوو هەواو دانیشتوانیان و هەروەها، ئەو ریوایەتانە پشتیان پێ نابەسترێ و زانا بەهێزەکانی ئیسلام بە دەلەسەو ئیسرائیلی یاتی دائەنێن، کەواتە با گوێ نەگیرێ لەوانە، بەلاَم لەبەر رواڵەتی ئایەتەکە و هاتنی زەوی لە حەدیس دا بە کۆو ژمارەی حەوتەوە زانایانی ئیسلام بروایان هێناوە بە بوونی حەوت زەوی. چەند کەس لەو زانایانە هەوڵیان داوە لە کۆن و تازەوە بۆ دیاریی کردنی مەبەست لەو حەوت زەوی یە. خوا پاداشتی بەخێریان بداتەوە مەبەستیان پاراستنی هێندێ لە بروادارانی دڵ لاواز بووە کە دووچاری بەد عەقیدەیی نەبن. بەلاَم بەراستی هیچ پێویست نی یە بەو ئەرك و زەحمەت کێشانە، چونکە هەرکەس داناو تێگەیشتوو بێت ئەزانێ ژیریی و زانینی ئادەمی بێ هێزو کوڵ و کەمو کورە لە ئاستی خۆی و ناسینی خۆی چ جای دروست کراوەکانی تری خوا، ئێمە ئاگامان لە کاروباری ئەم زەوی یە نی یە کە دایکمانەو لە کۆشی دا ئەژین، چ جای بە تەما بین ئاشناو زانا بین بەم بوونەوەرە گرنگە. کەواتە با بڵێین: ئەو حەوت زەوی یە هەیە و ئەم زەوی ئێمە یەکێکە لەوان و شەشەکەی تر لە زانینی خوادایەو خۆی ئەزانێ کامەن و لە کوێن لەم بوونەوەرەدا؟!!

هەرچۆن بێن و لە هەر لایەك هەن ﴿يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ﴾ فەرمان و بریاری خوا دێتە خوارەوە لە نێوان ئاسمانەکان و زەوی دا و ئەو فەرمان رەوایە و هەموو کاروباریان بەو ئەروا بەرێوە.

خوا ئەو زەوی و ئاسمانانەی دروست کردو هەموو کاروباری بەو جۆرە ئەبات بەڕێوە، ئەوەیشی کرد ﴿لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ﴾ بۆ ئەمەی ئێوە بزانن کە خوا توانایە بەسەر هەموو شتێك دا ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمَۢا﴾ بێگومان خوا دەوری هەموو شتی داوە بە زانین و زانینی گشتی یە بۆ هەموو شت. چونکە شتێکی روون و ئاشکرایە کە ئەم کاروبارە بە بێ توانین و زانین فەراهەم نایەت، هەرکەس بتوانێ و بزانێ شتی وا بکات ئەبێ توانین و زانینی بێ سنوور بێت و هیچ شتێ لە توانین و زانینی یاخی نەبێت و دەرنەچێ. کەواتە هەر ئەو ئایین و شەریعەتەی ئەو ناردی راستەو شایانە بە پەیڕەوی کردن، چونکە دانراوی کەسێکە کە توانینی بێ سنووری هەیە، هەروەها حەق وایە بەندەکانی خوا باش گوێڕایەڵ بن و نەتوانن سەرپێچی بکەن بە هیچ فەرمانێ چونکە هەمیشە دەور دراون بەو توانین و زانینە. ئا بەم ئایەتە سامناکە دڵ داچڵەکێنەرە سورەتەکەی دوایی هێنا کە سەرنجی هەموو ژیریی رائەکێشێ بۆ گوێڕایەڵی هەموو فەرمانەکانی ئەم سورەتە بە تایبەتی.

وصلى الله و سلم على نبيه محمد و على آله

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ

# سورەتی (التحريم)
# مەدینەیی یەو ١٢ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

کاتێ خوا ویستی ئەم ئایینی ئیسلامە بکات بە دواترین پەیام، بەرنامەکەی بکات بە بەرنامەیەکی هەمیشەیی هەتا دنیا دنیایە، ژیانی بڕواداران بەرێوە بڕوا بە پێی رژێم و یاسایەکەبەشێکەلەرژێم و یاسای بوونەوەربەشێوەی گشتی، کاتێ ویستی ئەم ئایینەجڵەوی ژیانی ئادەمی بگرێتە دەست و بەرێوەبەرو چاودێریی کەری هەموو کارو فرمانی بێت.

کاتێ خواهیش و ویستی خوا بەو جۆرە دەرچوو ئەم بەرنامەیەی لەم شێوەدا نارد کە تێرو تەواوو گشتی بێت، دان بنێ بە هەموو هێزو وزەی ئادەمی و خواست و ویستەکانیان، لە کاتێکدا، کە ئەم هێزو وزەیانە بە پاکی راگیر بکات و بەرزیان بکاتەوە بۆ پلەو ئاسۆیەك کە شایستە بێت بە دروست کراوێ کە خوا ناوی برد بە جێنشین لە زەوی داو شایانی گیان لەبەرێ بێت کە گیانی کردبێ بە بەردا لەو گیانەی کە بەرێزەو پەیوەندی یەکی تایبەتی هەیە بە خواوە، رێزی داوە بەسەر زۆر لە دروست کراوەکانیدا.

سروشتی ئەم ئایینەی وا داناوە کە ژیان بەرەو پێش ببا بە گەشە کردن و بەهێزو فراوانی و بەرزی و پاك و خاوێنی. چونکە هیچ هێزو وزەیەك کە بەرهەم درابێ و رووخێنەر نەبێ نایوەستێنێ و لەکاری ناخات، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەیخاتە ئیش و هێزو پەرەی پێ ئەدات، دەست ناگرێ بەسەر دەمی هیچ ئامادەیی و لێ هاتنێ کە سوود بەخش بێ، بەڵکو ئێجگاری بەرەلای ئەکات و بێداری ئەکاتەوە، لە کاتێك دا کە پارێزەرە بۆ هاوتایی و هاوکێشی لە ناوەندی بزووتنەوەی راپەرین بۆ پێش، لەگەڵ بزووتنەوەی بەرز بوونەوە بۆ ئاسۆی بەرزی بەرێزی پیاوەتی و ئادەمێتی، کە لەم جیهانەدا رۆح پەروەردە ئەکات بۆ گەیشتن بە نازو رێزی رۆژی دوایی، مەردومی ئەم زەوی یە کە ئەم ژیانە کەم و کورتەی هەیە ئامادەی ئەکات بۆ ژیانێکی نەبڕاوەی هەتا هەتایی لە بەهەشتی نەبڕاوەدا. واتە نە باری رۆح

بەرەڵاّ ئەكات و نە باری لەش، بەڵكو پارێزگاری ماف و بەشی هەردوو لا ئەكات بە جووت و بە هاوتایی، كە بەو جۆرە كاروباری جێنشینی ئادەمی بە رێك و راستی ئەڕوا بەڕێوە لەم زەوی و جیهانەدا. كاتێ كە خوا ویستی سروشتی ئایین و شەریعەتەكەی بەو جۆرە بێت. هەروەها ویستی پێغەمبەرەكەیشی (ﷺ) ئادەمی بێت بە هەموو نیشانەو بەرهەمێكی یەوە، ببێ بە نوێنەرێكی راستەقینە بۆ ئەو ئایین و عەقیدەیە، ویستی ئەو پێغەمبەرە (ص) ئادەمی یەك بێت كە هێزو وزەی ئادەمێتی تیای دا تێرو تەواو بێت، لەشێكی بەتین و بەهێزو ساغ و تەندروستی ببێ، هێزی بیستن و بینین و هەموو هێزو هەستەكانی تری رێك و پێك بێ، وریا و ئاگادار بێ، حەزو ئارەزو و سۆزو بەزەیی ئادەمی یانەی بە تێرو تەسەلی تیا بێت، لە هەمان كاتداخاوەنی ژیریی یەكی زۆرگەورەوبیرێكی زۆرفراوان ودووربینی یەكی بەرزو دوور وئیرادەیەكی بەهێز بووە،خۆگروزاڵ بووە بەسەرنەفسی خۆیداونەفسی زاڵ نەبووەبەسەریدا.

ئینجا لەپاش هەموو ئەوانە پێغەمبەر بووە، پێغەمبەرێك كە گیان و رۆحی تیشك و رووناكی وەرگرت لە سەرچاوەی هەموو تیشك و رووناكی، توانی شەو رەوی بكات و بەرز ببێتەوە بۆ سەرووی ئاسمانەكان، تا ئەو جێگەی خوا ویستی، كەسێ بوو لە ئاسمانەوە بانگی لێ كرا، لەوێ بینی ئەوەی كە بینی لە بەڵگەو نیشانە روونەكانی خوا، كە دەم و زمانی ئێمە كۆڵ و كولە لە باس كردنی، كەسێ بوو كە ئاشنا كرا بە حەقیقەتی ئەم شتانەی كە لەم بوونەوەرەدا هەن، ناسرا پێ یان و پەیوەندی لەگەڵ كردن و پەیوەست بوو لەگەڵیان، بەهۆی ئەوەوە بەرد سەلامی لێ كرد، درەخت كەوتە سۆزو پەرۆش بۆی بە پێش چاوی یارەكانی یەوە كەوتە حیلە حیل بۆی كاتێ كە مینبەری بۆ دروست كراو بەسەر ئەوەوە نەوەستا بۆ خوتبەدان. شاخی احد لە ژێر پێ ی دا كەوتە لەرزە!!

ئینجا ئەم هەموو هێزو توانای جۆر بەجۆری جیاوازە كۆ بۆوە تیای دا بە بێ زیادە رەوی، بەڵكو بە ئەوپەڕی رێكی بە پێ ی تەرازوو بكێشرێن، بە وێنەی رێكی و هاوكێشی ئەو تەرازووەی كە ئایین و عەقیدەكەی لەسەر دارێژراوەو بۆی هەڵبژێررا. ئینجا خوای گەورە هەموو ژیانی ئەو پێغەمبەرەی وەك كتێبێكی ئامادەكراو لێ كرد بۆ ئوممەتەكەی و بۆ هەموو ئادەمی، كە شێوەی ئەم ئایین و عەقیدەی تیا بخوێنرێتەوەو ببینرێ تیای دا بە بەدی هاتوویی. جا لەبەر ئەوە ژیانی بە تەواوی دەرخست و هیچ نهێنی یەكی شاراوەی تیا نەهێشت، پەردەی لابرد بەسەر هەموو كاروباری تایبەتی خۆی و ماڵ و خێزانیشی. بەڵكو لە چەند بار رووبەكەوە بەشێكی زۆری لە قورئان دا باس كرد و نیشانی دا، ئەوەشی دەرخست

که به پێی باوی خەڵکی له ژیانی گشتی دا ئەشاررێتەوه. تەنانەت هێندێ لەو کارانەی که روو ئەدەن به هۆی لاوازی یه که به سروشت هەیه له ئادەمی دا به تایبەتی هێندێ شت که هیچ چاره نییه بۆ مەردوم لێی. ئەم پێغەمبەره (ﷺ) له خۆی دا هیچ شتێکی تایبەتی نەبووه بۆ خۆی، چونکه خۆی به هەموو شتیەوه بۆ ئەم ئایین و بانگەوازه بووه.کەواتەلەسەرچی بەشێ لەژیانی دیارنەبێ یابشاررێتەوه؟ بێگومان ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم پێشانگایەکی سەرنج دراوه که ئەم ئایین و عەقیدەیەی تیا ببینرێ بەڕاستی و بەدی هاتوویی، هات بۆ ئەمەی ئەو ئایینه نیشان ئادەمی بدا له خۆی دا و له ژیانیدا، هەرچۆنێ به زمان رایگەیەنێ. بۆ ئەوه دروست کراوەو بۆ ئەوه هات، بەڕاستی یارەکانی – خوا پاداشتی بەخێریان بداتەوه – به درێژیی و به روونی ئەو ژیانه پاکەیان وەرگرت و هەڵگرت و گەیاندیان به ئوممەت. به جۆرێ هیچیان نەهێشتەوه له ژیانی رۆژانەی عادەنیش دا که وەریان گرتبێ و رایانگەیاندبێ. ئەوەش شتێك بوو خوا ویستی و رێکی خست که گەورەو بچووك و وردو درشت ئەم ئایینه نیشان بدات لەو ژیانه پاکەدا و به بەدی هاتوویی به ئەوپەڕی راستی و پاك و خاوێنی. کەواته ئەوەی وەریان گرت لەگەڵ ئەوەی که قورئان پێی هاته خوارەوه لەو ژیانه پاکه بوو به دەفتەرو کتێبێکی هەمیشەیی بۆ هەموو جیهان و جیهانیان تا دواهاتن و کۆتایی ژیان لەم زەوی یەدا.

ئەم سورەته له سەرەتایەوه لاپەڕەیەك لەو ژیانه نیشان ئەدات له بارەی ناو خۆو ماڵ و خێزانی یەوه، بەشێ باس ئەکات له کردارو رەفتاری ئادەمێتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هێندێ له هاوسەرەکانی، هەروەها هێندێ له کردارو رەفتاری ئەو هاوسەرانه دەربارەی یەکتر. پێش هەموو شتێك پێویستی هەموو کەسێکه هەمیشه سەرنجی پێغەمبەر بدات و بیناسێ بەو جۆرەی که قورئان له چەند شوێن دا نیشانی ئەدات و ئەیناسێ پێمان که ئەفەرموێ: ئادەمی یەکی فروستاده و نێرراوی خوایه. کەواته دوو باری بووەو دوو شتی تیا کۆبووەتەوه، ئادەمێتی و پێغەمبەرێتی، ئادەمێتی به هەموو پێویستی یەکی یەوه، پێغەمبەرێتی به هەموو پێویستی یەکی یەوه، له هەردوو بارەکەدا گەیشتووەته پلەی هەره بەرزیان، وەکو ئەندازێ به درێژیی دەست نیشانمان بۆ کرد، هەرچۆنێ هەستاوه به ماف و ئەرکێ که پێویست بێت بۆ ئادەمێتی یەکەی وەك خەوو خواردن و خواردنەوەو رابواردن به خۆشی لەگەڵ خێزان و هاوسەرانی، هەروەها هەموو شته سروشتی یەکان وەك ویستن و نەویستن و حەزو ئارەزووی شتی جوان، هیچ کام لەوانه به لەکەو عەیب دانانرێن و دژو پێچەوانەی پلەی

بەرزی پێغەمبەرێتی نین. بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئادەمی یەکی بەرز بووەو پاك و خاوێن بووە لە جەورو ستەم و ناحەقی، وەك هەموو پێغەمبەرانی تریش – سەلامی خوایان لێ بێت – چونکە ئەو تاوان و نارەوایی یە دژو پێچەوانەی پێغەمبەرێتی یەکەیانە، خوا دووری خستووەتەوە لێ یان. کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) لەناو ماڵ و خێزانیشی دا ژیاوە بە ئادەمێتی و بە پێغەمبەرێتی وەك خوا بەو شێوە دروستی کردو فەرمانی پێدا. ژیا لەناو ماڵ و خێزانی دا بە ئەوپەڕی دادو پاك و راستی و نەرم و ناسکی و بەزەیی و میهرەبانی و دەم و دەست و دڵ گوشادی. هەرچەند لە ژیان و گوزەران و رابواردنی دنیایی دا تەنگی و کەم و کوڕی بووە، ئەوپەڕی رادە ئەمە بوو گوزەرانی سەروبەر بێت. بەڵام هەموو کات لەناو ئەو ماڵ و خێزانانەدا ژیان بەسەر نەئەبرا لەسەر ئەو هەست و سۆزە ئادەمی یانە، بەڵکو هەندێ بار بە پێی باوی هەوێ ساری قسەی ناڕێك یان دڵ گۆڕان و وردە ئاژاوە رووی ئەدا لە نێوان هێندێ لەو هاوسەرە پیرۆزانەدا.

ئیبن و ئیسحاق ئەگێڕێتەوە لە عائیشەوە – خوای لێ رازی بێت – کە پێی ناخۆش بووە صفیە ببینێ، چونکە لای وا بووە ئەگەر بکەوێتە بەرچاوی پێغەمبەر (ﷺ) بە دڵی ئەبێ و مارەی ئەکات، ئەوەی ئەو چاوەڕوانی کرد بەدی هات، کەواتە هەر لە پێشەوە لەدڵی دا هەوێ ساری هەست کردووە بەرامبەر صفیە خوا لێ یان رازی بێت. هەروەها ئەگێڕێتەوەو باسی رووداوێکی خۆی ئەکات لەگەڵ دایکی ئیمانداران صفیە، ئەفەرموێ: جارێ وتم بە پێغەمبەر (ﷺ) صفیە کورتە بالآت بەسە، ئەویش پێی فەرموم بەڕاستی وشەیەکت وت ئەگەر تێکەڵی ئاوی دەریا بکرێ رەنگ یان بۆنی ئەگۆڕێ. هەروەها ئەگێڕێتەوە هەر لە خۆیەوە کە کاتێ سورەتی ﴿الأحزاب﴾ هاتە خوارەوەو فەرمانی دا کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگی هاوسەرانی بکات بۆ ئەمەی ژیانی ئەم جیهانەیان ئەوێ یان خواو پێغەمبەر (ﷺ) وەکو بە درێژیی باس کرا لەو سورەتەدا، ئەوە بوو کە بانگی کرد لە یەکەم جارەوە لە عائشەوە دەستی پێکردن و ئەویش بە خۆشی و سۆزەوە خواو پێغەمبەری هەڵبژارد، لە پاشا داوای کرد کە ئەم هەواڵی هەڵبژاردنی ئەمە نەگەیەنێ بە هاوسەرەکانی تر، ئاشکرایە مەبەستی چی بوو، با نەیلێین و پێویست ناکات بە وتن. لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە گوێی نەکردو فەرموی: هەرکام لەوان پرسیاری تۆم لێ بکات هەواڵی ئەدەمێ کە تۆ منت هەڵبژاردووە.

ئەم رووداوانەی کە عائشە – خوای لێ رازی بێت – ئەیگێڕێتەوە لە خۆی بە هۆی راستی خۆی و ئەو پەروەردە ئیسلامی یە راستەقینەی کە پێی گەیاند. ئەوانە چەند وێنەو

نموونەیەك بوون ئاگادارمان ئەكاتەوە كە هەمیشە كاروباری ئەو هەمووماڵ و خێزانە بە رێكی نەڕۆیشتووە بە بێگەردو تەم، بەڵكو وەكو وتمان لە هێندێ كات دا بە پێی باوی ئافرەت لە هەوێ ساردی دا ئەو جۆرە شتانە روویان داوە. هەرچۆنێ تێمان ئەگەیەنێ كە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن پەیام و پێغەمبەرێتی یەكەی بەجێ هێنا بە فێركردن و پێگەیاندن و پەروەردە بەرزی و پاك و خاوێنی لەناو ماڵ و خێزانی دا هەرچۆنێ بەجێی هێنا لەناو ئوممەتەكەیدا. ئەم رووداوەی كە ئەیگێڕێتەوە و سەرەتای ئەم سورەتەی تیا هاتە خوارەوە یەكێكە لەو نموونە و وێنەیانە كە روویان داوە لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانی هاوسەرەكانی دا. لەبارەی ئەم رووداوەوە چەند ریوایەتێكی جیاواز هاتووە: یەكێ لەوانە ئەمەیە كە بوخاری ئەیهێنێ لە عائشەوە – خوا لێ ی رازی بێت – ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) لای زەینەب هەنگوینی ئەخوارد، ئینجا من و حفصە یەك كەوتین و بڕیارمان دا كە پێغەمبەر هات بۆلای هەركاممان بڵێین پێی (مغافیر) ت خواردووەو بۆنی ئەوەت لێ دێ. (مغافیر) خواردەمەنی یەكی شیرینی بۆن ناخۆش بووە. ئینجا كە ئەوەی پێ ئەگوترێ، ئەفەرموێ: نەخێر ئەوەم نەخواردووە بەڵكو هەنگوینم خواردووە لای زەینەب، ئیتر هەرگیز نای خۆم ئەوا سوێندم خوارد. ئەم هەواڵە مەگێڕەوە بۆ هیچ كەس. ئەفەرموێ: ئەمە بوو پێغەمبەر (ﷺ) حەرامی كرد لەسەر خۆی لە كاتێك دا حەڵاڵ بوو بۆی. بەهۆی ئەوەوە سەرەتای ئەم سورەتە هاتە خوارەوە.

لە ریوایەتێكی تردا كە نسائی ئەیهێنێ لە حەدیسی ئەنەسەوە پێغەمبەر كەنیزەكێكی بوو هات و چۆی ئەكرد، ئینجا عائشە و حەفصە وازیان لێ نەهێنا هەتا حەرامی كرد لە خۆی. بەهۆی ئەوەوە سەرەتای ئەم سورەتە هاتە خوارەوە.

لە ریوایەتێكی تردا ئیبن و جەریر و ئیبن و ئیسحاق ئەیهێنن ئەو كەنیزەكە مارییە بوو كە پاشای میسر بە دیاریی ناردی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش وەری گرتو بوو بە دایكی ئیبراهیم. هۆی حەرام كردنەكەش ئەمە بوو كە رۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی حەفصە ئەبێ و ئەویش لە ماڵ نابێ و لەو كاتەدا مارییە لەوێ ئەبێ، ئینجا كاتێ حەفصە دێتەوە مارییە ئەبینێ بە پێی باوی ساری زۆر دڵ گران ئەبێ و بێزاری دەرئەبڕێ، لە پاشان بۆ ئاشت كردنەوەو دڵنەوایی حەفصە، مارییە لە خۆی حەرام ئەكات و سوێندی لەسەر ئەخوات، ئەفەرموێ پێی كە ئەو باسە لای كەس نەكات، ئەویش هەواڵەكە ئەگەیەنێ بە عائشە.

هەرکام لەو دوو ریوایەتە کە هەڵنەگریْ هۆی هاتنە خوارەوەی سەرەتای ئەم سورەتە بێت، سەنەدی ریوایەتی یەکەم بەهێز ترە لای زانایان، ئەوەوی لە شەرحی موسلیم دا ئەفەرمویْ: ریوایەتی یەکەم سەحیحە و لە بوخاری و موسلیم و کتێبە سەحیحەکانەوە هاتووە، ریوایەتی مارییە لە رێگای سەحیحەوە نەهاتووە. هەرکام هۆ بێت بڵاو کردنەوەی ئەو حەرام و قەدەغە کردنە لەناو هاوسەرەکان دا جۆرە ئاژاوەو دەنگ و باسێکی دروست کرد لەماڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) بوو بەهۆی خەشم گرتن لە هاوسەرانی و تەلاقێکی حەفصەی داو لە پاشان لەبەر دڵی حەزرەتی عومەر – کە بەوە زۆر غەمبارو پەشێو بوو – هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆی، هەروەها بوو بەهۆی کەنارگیریی و بەجیْ هیشتنی هەموو دایکی ئیمانداران تا ماوەی مانگیْ. دەنگ و باس وا بڵاو بووەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەموویانی تەلاق داوە بە هۆی ئەوەوە ئەوانیش و موسڵمانانیش کەوتنە داخ و مەراق و گریان، وەکو بە درێژیی ئیمامی ئەحمەد ئەم رووداوی کەنارگیریی یە ئەگێڕێتەوە لە ئیبن و عەباسەوە – خوا لیْ یان رازی بێت –.

ئینجا لەبەر رووناکی ئەم ریوایەتانەدا با بێینە سەر ئایەتەکان و سورەتەکە کە لە یەکەم جارەوە سەرزەنشتێکی کاریگەری پێغەمبەر (ﷺ) ئەکات لەسەر ئەو قەدەغە و حەرام کردنە، ئەفەرمویْ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ﴾ بۆچی قەدەغە ئەکەیت لە خۆت شتیْ کە خوا رەوای داوەو حەڵاڵی کردووە بۆت؟ ﴿تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ﴾ بەو قەدەغە کردنە رەزامەندی ژنەکانت ئەویْ. گلەیی و سەرزەنشتێکی سەرنج راکێشەر، واتە راست و رەوا نی یە قەدەغە کردنی هەر شتیْ کە خوا حەڵاڵی کردبیْ. پێغەمبەر (ﷺ) هەنگوینی لە خۆی قەدەغە نەکرد بەم رەنگە بە حەرامێکی شەرعی دابنیْ، بەڵکو بڕیاری دا خۆی بیْ بەش بکات لێی، لەبەر ئەوە ئەو سەرزەنشتەی بۆ هات و گەیاندی ئەوەی خوا حەڵاڵی کردبیْ بۆ کەس راست نی یە خۆی لیْ بیْ بەش بکات بە ئارەزووی خۆی یان لەبەر رەزامەندی هەرکەس.

﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٢ وَإِذۡ أَسَرَّ
ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا
بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ۝٣﴾

---

ئەو قەدەغە کردن و خۆ بێ بەش کردنە هەرچەند لە شەرع دا گوناه نەبێ، بەڵام شایان نییە لەگەڵ پایەو پلە بەرزی پێغەمبەردا (ﷺ) لەبەر ئەوە بۆ ئەو وەکو گوناه وایەو لەوانەیە لێپرسینەوەی لەسەر بکرایە ئەگەر لێ خۆش بوون و میهرەبانی خوا فریا نەکەوتایە. لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾خوا لێ خۆش بووی بەزەیی داری میهرەبانە.

لە ریوایەتەکان دا فەرموی: کە پێغەمبەر (ﷺ) سوێندی خوارد لەسەر قەدەغە کردنەکە و لە ئایەتەکەش دا دەست نیشانی بۆ ئەکات و ئەیگەیەنێ لەگەڵ دانانی چارەسەردا و کردی بە یاسایەکی گشتی و فەرموی: ﴿قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ﴾ بێگومان خوا داینا و باسی کرد بە روونی بۆتان کردنەوەی گرێی سوێندەکانتان و رزگار بوونتان لێ یان بە کەفارەت دان، ئەگەر سوێندەکە لەسەر کارێکی ناڕاست بێت و پێچەوانەی باشتر بێ، وەك ئەفەرموێ لە حەدیسێك دا کە لە سەحیحی بوخاری و موسلیم دا هەیە کە ئەبو موسا ئەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ﴿إني والله إن شاء لا احلف على يمين ثم ارى خيرا منها إلا كفرت عن يميني و اتيت الذي هوا خير﴾ قتادە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) کەفارەتی دا بۆ ئەم سوێندەی بەم رەنگە بەندە یان کەنیزەکێکی ئازاد کرد، ﴿وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ﴾ خوا کاربەدەست و کارسازی ئێوەیە. کەواتە کۆمەکیتان ئەکات لەکاتی داماوێتی و تەنگانەتان، لەبەر ئەوە چارەی دانا بۆ سوێندەکانتان، بۆ ئەوەی رزگار بن لە ناڕەحەتی، ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ هەر ئەو زانای لێزانی کاردروستە، کەواتە هەرچیتان بۆ دائەنێ بە پێی توانین و بەجۆرێ کە شیاو بێت و بەرژەوەندی ئێوەی تیا بێت. کەواتە هیچ شتێ قەدەغە مەکەن لە خۆتان کە خوا قەدەغەی نەکردبێ.

ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ قسەو باسێك بە بێ دیاریی کردن و روون کردنەوە، چونکە ئەوە گرنگ نی یە و شتێ نی یە بمێنێنەوەو کەڵکی دوا رۆژو داهاتوو بگرێ، ئەوەی کە بمێنێتەوەو کەڵك بگرێ ئەو پەندو ئامۆژگاری و لە خوا ترسانە. ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە پێغەمبەر قسەیەکی بە نهێنی درکان لای

هێندێ لە هاوسەرانی، واتە حەفصە بە پێی ڕیوایەتە سەحیحەکان و ڕای زۆربە. قسە نهێنی یەکەش یەکێ بوو لەوانەی کە لە ڕیوایەتەکان دا باس کران، کە ڕاست و سەحیح تریان ئەوەبوو فەرموی: هەنگوینم خوارد لای زەینەب و حەرام بێ لێم و جارێکی تر نایخۆم و سوێندی لەسەر خواردو ئینجا فەرموی: لای کەس ئەم باسە مەکە. بەڵام بە پێی باوی ئادەمی کە مەڵە ئەکات حەفصە قسە نهێنی یەکەی کرد بۆ عائشە – خوایان لێ ڕازی بێت – ئینجاخوا هەواڵی ئەم قسەیدا بەپێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش هێندێکیدا بە ناوچاری حەفصەدا.

وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ﴾ ئینجاکاتێ حەفصە هەواڵی قسە نهێنی یەکەیداو درکاندی ﴿وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ﴾ خوایش پێغەمبەری ئاگاداركردبەسەرئەوەدا﴿عَرَّفَ بَعْضَهُۥ﴾ پێغەمبەر هەواڵی داو هێندێ لە قسەکانی حەفصەی باس کرد لای ﴿وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ﴾ چاوپۆشی کرد لە گێڕانەوەی هێندێکی و باسی نەکرد، بۆ ئەمەی حەفصە زۆر تەریق نەبێتەوە، باوی پیاوی بەڕێزو گەورەش وایە زۆر لەسەر قسە ناڕواو بە کورتی ئەیبڕێتەوە، ﴿فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ﴾ ئینجا کاتێ هەواڵی ئەوەی دا بە حەفصە ﴿قَالَتْ﴾ حەفصە وتی بە پێغەمبەر ﴿مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا﴾ کێ هەواڵی ئەمەی پێدای؟ ﴿قَالَ﴾ پێغەمبەریش فەرموی: ﴿نَبَّأَنِىَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ خوای زۆر زانا ئاگاداری کردوم و خەبەری داومێ. با بیرێ بکەینەوە لەو کات و ماوە نایابە کە ڕووی دا لە مێژووی ئادەمیدا. ئەو ماوە پیرۆزەی کە مەردوم تێیدا ژیا لەگەڵ ئاسمان دا، ئاسمان بە ڕوونی و ئاشکرا دەستی ئەخستە کاروباری مەردوم. بەڕاستی زمان و قەڵەم کوڵ و کولە لە باس و نووسینی ڕاستی ئەو کات و چەرخە بێ وێنەیە!! لەم ئایەتانە وەرئەگیرێ ئەم چەند شتە کۆمەڵایەتی یە:

١- ڕەوایە گەیاندنی قسەو کاری نهێنی بە هاوسەرو دۆست.

٢- هەرکەس قسەیەکی نهێنی لاکراو داوا کرا لێ ی دەرنەبڕینی پێویست و فەرزە لەسەری ئەو قسە نەکا لای کەس مەگەر ئیزنی قسە کەرەکەی لەسەر بێ.

٣- چاك وایە لە کاتی سەرزەنشت و تەمێ کردنی ژنان دا نەرمی و نیانی بەکار بهێنرێ و درێژەی پێ نەدرێ.

. . . . . . .

إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ

---

ئینجا شێوەی باسەکە ئەگۆڕێ بەم ڕەنگە ڕووی فەرموده ئەکاتە عائشە و حەفصە – خوایان لێ ڕازی بێت – بۆ تەمێ و زیادە سەرزەنشت، ئەفەرموێ: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئەگەر ئێوە پەشیمان ئەبنەوە لەوەی کە کردتان و دڵ ئازاری پێغەمبەری تیا بوو، ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا ئەوا کارێکی ڕاست و بەجێ ئەکەن و هۆی پەشیمان بوون و گەڕانەوەتان هەیە، چونکە ﴿فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ﴾ بەڕاستی دڵتان لایدا لە باری ڕاست و ئەوەی پێویستە ئەوەش ئەوەیە کە دڵتان شتێکی خۆش بوێ کە پێغەمبەر پێی خۆشە، هەرچی ئەو خۆشی نەوێ دڵی ئێوەیش خۆشی نەوێ.

لەپاش بانگ کردن بۆ گەڕانەوە، ئینجا قورئان هێرشێکی سامناک ئەکات و هەڕەشەیەکی سەخت ئەکات ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ﴾ ئەگەر ئێوە کۆمەکی و پشتگیریی یەکتر ئەکەن لە دژی پێغەمبەر، واتە ئەگەر کارێ ئەکەن – بەهۆی هەوێ ساری خۆتان – کە ئەو دڵ ئازار بکەن ئەوە دەربەست نایەو زیانبار نابێ، چونکە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ﴾ بەڕاستی خوا خۆی کاربەدەست و یارمەتی دەری ئەوە ﴿وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾ جوبرەئیل و پیاو چاکی بڕوادارانیش یارمەتی دەری ئەون، ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ لەپاش ئەوە هەموو فریشتە پشت گیرو پشتیوانی ئەون.

لەم هێرش و هەڕەشە سەختەوە دەرئەکەوێ قوڵی و گەورەیی ئەو ڕووداوە و قورسی و کارکردنی لە دڵی بەفەڕی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەتا پێویستی کرد بە جاڕدان بەو کۆمەکی و پشت گیریی یە گەورەیە لەلایەن خواو جوبرەئیل و پیاو چاکان و هەموو فریشتە! بۆ ئەمەی پێغەمبەر (ﷺ) دڵخۆش ببێ و ئارام و ڕەحەتی ڕووی تێ بکات و باکی نەمێنێ لەو ڕووداوە دڵ هەست داگیر کەرە!! بەڵێ بێگومان ئەو ڕووداوە زۆر گەورە بوو تا ڕادەیەك دەنگ و باس

وا بڵاو بووەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو هاوسەرەکانی تەڵاق داوە، جا چی لەوە سامناک تره کە بە جارێ هەموو ماڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تێك بچن و سەر تێك بچێ لە هەموو دایکی ئیماندارەکان!!

ئەو هەواڵە ناخۆشە دڵی موسڵمانانی داگرت و بە ناخۆش ترین بەسەرهاتیان سەیر ئەکرد، تا رادەیەك عومەر ئەفەرموێ: موسڵمانێکی مەدینەیی دراوسێ و هاوڕێم بوو هەر رۆژێ یەکێکمان ئەچووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەر شتێکی تازە لە ئیسلام بهاتایە وەرمان ئەگرت و ئەمان گێڕایەوە بۆ یەکتر. ئەفەرموێ: لەو کاتەدا دەنگ و باس وابوو کە دەوڵەتی غسان کە دەوڵەتێکی عەرەبی بوو دۆست و بەکرێ گیراوی رۆم، ئەیەوێ هێرش بێنێ بۆ سەر مەدینە، ئەوەش شتێکە زۆر جێگای مەترسی یە، جا ئەفەرموێ: ئێوارەیەك ئەو دراوسێ یەم هات و تەقەی دا لە قاپی و بانگی لێ کردم منیش چووم بە دەمیەوە، ئینجا وتی کارێکی گەورە رووی داوە. منیش وتم: چی رووی داوە؟ ئایا دەوڵەتی غسان هات؟ وتی: نەخێر لەوە گەورەتر رووی داوە! پێغەمبەر (ﷺ) هەموو ژنەکانی خۆی تەڵاق داوە!

ئەو موسڵمانانە خوایان لێ رازی بێت ئەو هەواڵی تەڵاق دانەیان بەلاوە ناخۆش تر بوو لە هەواڵی هێرشی غسان، چونکە تێگەیشتوو بوون، دەیانزانی ئارامی و دامەزرانی دڵە گەورەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو شتێ گەورەترو بە کەڵك ترە بۆ هەردوو جیهانیان، ئاشتی و کامەرانی ماڵە پیرۆزەکانی لە پێش ترو پێویست ترە بۆیان. بێ ئارامی دڵی ئەو و تێك چوونی ماڵی سامناک ترە لە هێرشی غسان و ئاغای غسان!! ئەوەش بەڵگەو نیشانە بوو لەسەر لێزانی و دووربینی و تێڕوانینی راست و دروستیان. ئەو تێگەیشتنی ئەوانە رێك و پێك دەرچوو لەگەڵ بڕیارو بە گرنگ گرتنی قورئان سەبارەت بەو رووداوە.

ئینجاهەمیتر ئەیانترسێنێ و بە هەڕەشەوە رووی فەرمودەی ئەکاتە هەموو هاوسەران و ئەفەرموێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ﴾ ئەگەرپێغەمبەر ئێوە تەڵاق بدات خوا بەڵێنی پێ ئەدا ﴿أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ﴾ کە لە بریتی ئێوە چەند ژنێکی چاکتر لە ئێوەی پێ بدات کە ﴿مُسْلِمَٰتٍ﴾ مل کەچانی ﴿مُّؤْمِنَٰتٍ﴾ بڕوادارانی ﴿قَٰنِتَٰتٍ﴾ بە دڵ گوێڕایەڵانی ﴿تَٰٓئِبَٰتٍ﴾ تۆبە کارانی ﴿عَٰبِدَٰتٍ﴾ خواپەرستانی ﴿سَٰٓئِحَٰتٍ﴾ کۆچ کەران لە رێی خوادا ﴿ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا﴾ کە هێندێکیان لە بێوە ژنان بن و هێندێ لە کچان.

ئەم دوو جۆرەی باس فەرموو بە گوێرەی دایکی ئیمانداران کە خۆیان لەو دوو جۆرە بوون، هەم ئارەزووی دەروون بۆ دوو جۆر زۆرترە. بێگومان ئەو کۆمەڵە ئافرەتە چاکترین

کۆمەڵی ئافرەت بوون لە هەموو مێژووی ئادەمی دا، بە کۆمەڵ تاقمێ تر وەکو ئەوانە هەڵنەکەوتووە. بێگومان بەشدار بوون لەم سیفەتە گرنگانەدا کە لە پەنای هەڕەشەکەدا بە دەست نیشان بانگی کردن بۆ پارێزگاری و دەرنەچوون لە سنووریان. بەڵام ئادەمیزاد – بێجگە لە پێغەمبەران – دووچاری هەڵە ئەبن، بە تایبەتی ئافرەت بە هۆی هەوێ ساری – کە شتێکی سروشتی یە تیای دا – زۆرجار هەڵە ئەکات و لە ڕێگای ڕاست ئەترازێ. جا کەواتە نابێ سەر سوڕ بمێنێ لەو نارێکی و ئاژاوە کە بەرپا بوو لەناو ئەو کۆمەڵە پاکەدا. هەرچەند هەوێ ساری و ئاژاوەکەی ئەوان لە ڕاستی دا بە دژی پێغەمبەر (ﷺ) نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوەلەبەر زۆر خۆش ویستنی ئەوبوو، هەرکام پێی خۆش بووبە تەنیا پێغەمبەر(ﷺ) بۆخۆی بێ و کەس بەشداری نەبێ. هەرچەند کاری ئەوان بەو جۆرە بوو بەڵام باری ڕاست و ڕێك ئەوە بوو دەست هەڵگرن لە حەزو ئارەزووی خۆیان لە پێناوی حەزو ئارەزووی ئەودا، لە هەموو بارو ڕوویەکەوە شوێن کەوتووی ئەوبن.

ئەو کردەوەی ئەوانە هەرچەند بە پێی باوی ئادەمی بە گوناهو تاوان دانانرێ، بەڵام پایەو پلەی ئەوان ئەوەندە بەرزە هەڵەی زۆر وردو بچووکیان زۆر بە زل و گەورە سەیر ئەکرێ، هەڵەی ئەوان ڕوو ئەکاتە هەموو ئوممەت، هەڵەکەی ئەوان دڵی پێغەمبەری(ﷺ) ئەگرت کە بەختەوەری و کامەرانی هەردوو جیهانی ئوممەت بەستراوە پێ یەوە، لەبەر ئەوە زۆر زۆر بەجێ بووئەوهەڕەشە و ترساندنە سامناکەیان ئاراستە کرا، خوا لێ یان ڕازی بێت. لەپاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە دڵی بەفەڕی پێغەمبەر (ﷺ) دامەزراو ڕازی بوو، ئارام و ئاشتی تەواو کەوتە ناو ماڵ و خێزانەکانی و کاروبار گەڕایەوە بۆ ناوەڕاستی تەرازووی خۆی. سوپاس و ستایش بۆ خوای میهرەبان.

ئەمەی کە باس کرا شێوەیەك بوو لە ژیانی ماڵ و خێزانی کەسێ کە هەڵسا بە دامەزراندنی گەل و ئوممەتێ، فەراهەم هێنانی دەوڵەتێ، بە بێ ئەوەی وێنەیەکی ناسرابێ، بە بێ ئەمەی شێوەو تەرزێکی لە پێشەوە بووبێ، ئوممەتێکی دامەزراند کە سپاردەی ئایین و بیروباوەڕی خوا هەڵگرێ و بگرێتە گەردن لە چاکترین شێوەی دا، گەل و کۆمەڵێکی خوایی پێك بێنێ لە زەوی دا، لە شێوەو وێنەیەك دا کە ببێ بە سەرمەشق بۆ هەموو گەلان و جیهان هەتا دنیایە.

ئەوەی کە باس کرا شێوەیەك بوو لە ژیانی ئادەمی یەکی بەرزی بەڕێزی گەورە کە هەڵسێ بە پێویستی ئادەمێتی خۆی لە کاتێك دا کە کارو کردەوەی پێغەمبەرێتیشی بەجێ

ئەمێنێ، بە بێ جیاوازی ئەمیان لە ئەویان، بە بێ دژایەتی و بەرگری هیچ کام لەوی تر، چونکە بڕیاری خوا وا هات کە ئەو ئادەمی یە ئادەمی فروستادە بێت، لە کاتێك دا کە بڕیار دەرچوو کە هەڵگری دواترین پەیام و بەرنامەی خوا بێت بۆ هەموو جیهان و جیهانیان.

بەڕاستی پەیام و فروستادەیی یەکە تێرو تەواو بوو، یەکێ لە نیشانەی تێرو تەواوی ئەو پەیام و بەرنامەیە ئەمەیە کە ئادەمی بە هەموو سیفەتی ئادەمێتی ئەمێڵێتەوە، بەم رەنگە دان ئەنێ بە هەموو هێزو وزەیەکی داو دەست ناگرێ بەسەر دەمی دا و خۆی پێ ناخواتەوە، هیچ ئامادەیی و لێ هاتنێکی بەنرخی لەکار نەخستووە، لەهەمان کات دا پەروەردەی ئەکات و پێی ئەگەیەنێ و پاك و خاوێنی ئەکات، بەوە ئادەمی بەرز ئەکاتەوە بۆ بەرزترین پلەی.

ئەوانە کە تێگەیشتن لە ئیسلام و جوانی رەنگی ئاویان گرت بەو جۆرە پێی گەیاندن و پەروەردەی کردن هەتا گەران بە روویەك و نموونەیەکی راستەقینە بۆ ئیسلام. رەوشتی پێغەمبەرەکەیان و ژیانی بەدی هاتوویی و رووداوی، بە هەموو سیفەتە ئادەمی یەکانی یەوە، تێکەڵ بوو بە فروستادەیی و بانگ و بانگەوازە ئاسمانی یەکەی، هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵی ئەڕۆیشتن و بەرز ئەبوونەوە پێی. ئەو رەوشت و ژیانە بەرزو خاوێنە نموونەیەکی رێك و راستی بەدی هاتوو لە واقیعی ژیان دا، نەك بە تێڕوانین و خەیاڵ، نموونەیەکی سەرمەشق بێت بۆ هەرکەس بیەوێ شوێنی کەوێ و پەیڕەوی بکات. بەرهەمی کاردروستی خوا بە جوانی دەرکەوت لەناردنی ئەم دواترین پەیامە بۆ ئادەمی بە شێوە تێرو تەواوە گشتی یەکەی، لە هەڵبژاردنی پێغەمبەرێ کە بتوانێ ئەو پەیامە وەرگرێ و بەدی بێنێ لە ژیان دا و لە پێش هەموو کەس دا خۆی ببێتە وێنەو ئاوێنەیەکی بێگەرد بۆی، بەجۆرێ رەوشت و ژیانی ببێ بە نامەیەکی هەمیشە کراوە بۆ هەموو ئادەمی یەك، تا چین لەدوای چین بیخوێنن و بیخوێننەوە تا جیهان جیهانە. ئینجا لە پاش خۆی ماڵ و خێزانی پێك بێنێ کە تاقانە هەڵکەوتوو بن لە مێژووی ئادەمی داو ببنە نموونەو سەرمەشق بۆ هەموو ماڵ و خێزانی پاك هەتا هەتایە.

لەم شوێن و سورەتەدا بە جوانم ئەزانی هێندێ بدوێم – با بە شێوەیەکی کورتیش بێت – لە بارەی هاوسەرانی بەرزو بەڕێزەوە، هۆی تایبەتی خواستنی هەرکام لەوان و هۆی خواستنی ئەو کۆمەڵە روون بکەمەوە بە شێوەیەکی گشتی، هەروەها هۆی رەوادانی ئیسلام بۆ خواستن و هێنانی زیاد لە یەك ژن تا چوار بۆ هەر موسڵمانێ کە ئارەزوو بکات و بۆی بکرێ. پێم خۆش بوو لەم باسەوە هێندێ بدوێم. بەڵام بە پێویستم نەزانی لێرەدا، پاش

ئەوەی ئەندازەیە دوام و باسێکی باشم نووسی لەم بارەیەوە، لەپاش لێ بوونەوە لە سورەتی ﴿الأحزاب﴾ و کردم بە پاشکۆ لە دوا دوایی تەفسیری ئەو سورەتەدا، هەرکەس ئارەزوو ئەکات با تەماشای ئەو باسە بکات لەوێ. ئینجا بە بۆنەی ئەو رووداوی ئاژاوەی کە زۆر قورس و بەتین بوو لەدڵ و دەروونی بڕواداران دا، قورئان بانگ ئەکاتە بڕواداران کە پێویستی سەرشانی خۆیان بەجێ بێنن لەبارەی ماڵ و خێزانیانەوە، بیم و ترسێکی گەورە ئەخاتە بەریان بەرامبەر هەڵنەسانیان بەوەی پێویستی سەرشانیانە لە تەمێ و پەروەردە کردن و ئامۆژگاری ماڵ و خێزان و کەس و کار.

ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ﴾ خۆتان بپارێزن بە گوێڕایەڵی بۆ خوا ﴿وَأَهْلِيكُمْ﴾ خێزان و کەس و کارو ژێر دەستەکان بپارێزن بە گوێڕایەڵ کردنیان بۆ خوا بە تەمێ و ئامۆژگاری و راهێنانیان لەسەر ئەو ﴿نَارًا﴾ خۆتان و ئەوان بپارێزن لە ئاگرێك کە ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ سوتەمەنی یەکەی ئادەمی و بەردە. کەواتە ئەو ئاگرە ئاگرێکی تایبەتی یەو جۆرێکی جیاوازە بە وێنەی ئەم ئاگری ئێستا نی یە، کە سووتەمەنی و هەڵگرێنەری داروپوش و پەلاشە. ئەو وا دروست کراوە سوتەمەنی و هەڵگرێنەری ئادەمی یەو بەرد بێ. – خوا پەنامان بدات لێ ی – ئیتر مەبەست بەو بەردە گوگرد بێت، کە سوور بوونەتەوەو گەرمی یەکەی لە هەموو شتی تر بەتین ترەو زوتر ئاگرەکەدا تاو ئەدا، یان مەبەستە بەردە بە شێوەی گشتی، واتە ئاگرەکە ئەوەندە سەخت و بەتینە بەرد سووتەمەنی یەتی، کە هێندێ لەو بەردە ئەو بەردانەیە کە ئەپەرستران لەم جیهانەدا، خوا لەوێ بە بەرچاوی بت پەرستەکانەوە ئەیکات بە سووتەمەنی دۆزەخ و ئاگری ئەوانی پێ تاو ئەدا بۆ زیادە سزاو داخی دڵیان!!

ئای هاوار لە ئاگری واو لە سووتان بە ئاگری وا کە هەموو شتی سەخت و سامناکە، ئەوەتا ﴿عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ﴾ بەسەر ئەو ئاگرەوەیە چەند فریشتەیەکی بەڕێوەبەرو کار بەدەست کە ﴿غِلَاظٌ﴾ دڵ رەقی بێ بەزەیین ﴿شِدَادٌ﴾ بەهێزو بەتینن،

لَا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ
مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ
سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ

---

**﴿لَا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ﴾ سەرپێچی و بێ فەرمانی ناکەن لەوەی خوا فەرمانی پیا داون، ﴿وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ ئەوەی فەرمانیان پێ بدرێ بەجێی ئەهێنن، کەواتە ئەوانە هەمیشە گوێڕایەڵی خوان، توانان بەسەر هەڵسان و بەجێ هێنانی هەر فەرمانێ خوا بیدا پێ یان، ئەو فریشتانە بەو هەموو رەقی و توندو تیژیی و زۆرو تواناوە کراون بە کار بەدەستی ئەو ئاگرە بەهێزی بەتینە. کەواتە پێویستە لەسەر بڕوادار فریای خۆی بکەوێ و قەڵغان و بەرهەڵست دروست بکات بۆ پاراستنی خۆی و کەس و کاری لەو ئاگرە پێش ئەوەی هەلی لە دەست دەرچێ و لەم ژیانەدا چارەسەری خۆی نەکات.**

**پێش هاتنی رۆژی دوایی کە ئیتر رێگا نەبەسترێ و هیچ بیانوو بەهانەیەك وەرناگیرێ، وەکو لێرەدا شێوەی بەدبەختی و نائومێدی رۆژی دوایی بێ بڕواکان ئەخاتە بەرچاو، کە لەو رۆژەدا هەموو رێگایەکیان لێ ئەبەسترێ هیچ برو بیانوویان لێ وەرناگیرێ و لەو کاتەدا کە فریشتە بە فەرمانی خوا زنجیریان ئەکەن و توڕیان ئەدەنە دۆزەخ. لەو کاتە سەختەدا پێ یان ئەوترێ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان نەهێنا ﴿لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ﴾ ئەمڕۆ هیچ بیانوو مەهێننەوە، چونکە ئەو رۆژە رۆژی بەهانە هێنانەوە نی یە، بەڵکو رۆژی وەرگرتنی بەرهەمی کردەوەی لەوەو پێشە وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ تۆڵەتان لێ ناسێنرێ بە پێی کارو کردەوەیەك نەبێ کە لەمەو بەر کردتان لە جیهاندا.**

**ئینجارێگای خۆپارێزیی لەو ئاگرەمان نیشان ئەدا، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ﴾ پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆلای خوا ﴿تَوْبَةً نَّصُوحًا﴾ بە پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوەیە کە هەمیشە تەمێ دادەرو ئامۆژگاری کەر بێت بۆتان، بەم رەنگە هەمیشە لەبیرتان بێت و نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو گوناهە و خراپەکارییە و نیازی گەڕانەوەش نەبێ، بە بیست و سێ جۆر ئەم وشەیە راڤە کراوە، هەموو ئەوانە**

ئەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە وترا. تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خوا فەرزێکە لە فەرزەکانی ئیسلام، نەکردن و دواخستنی گوناهێکە لە گوناهەکان بە پێی بڕیاری هەموو زانایانی ئیسلام.

ئینجا هەر گوناهێ تەنها پەیوەندی بە خواوە بێ و مافی ئادەمی تیا نەبێ تۆبەو گەڕانەوە لێ ی بە سێ شت پێك دێت:

١- کۆتایی هێنان و دەرچوون لێی.

٢- پەشیمان بوونەوە لەو گوناهە. بە ئێش پێگەیشتن و داخ بۆ خواردن لەبەر ترسی خوا.

٣- نیازو بڕیار بە دڵ و بەڕاستی لەسەر نەگەڕانەوە بۆ سەر ئەو گوناهە. هەر گوناهێ مافی بەندەشی تیابێ بێجگە لەو سیانە ئەم چوارەمەشی پێویستە.

٤- ڕزگاربوون و ئازاد بوون لەو مافە. ئیتر بە بژاردن یان بە گەردن ئازادی. هەر تۆبەو گەڕانەوەیەك بە پێی فەرمودەی خواو پێغەمبەر (ﷺ) وەك لێرەیش دا ئەم بەڵێنە گەورەیە ئەدا.

بەڵام بۆ ئەمەی تۆبە کەران لە ناوەندی ترس و ئومێددا بژین، بۆ ئەمەی دەست نیشان بێت بەمەی ئەو بەڵێنە میهرەبانی یە لەلایەن خوایە و بەندە هیچ حەقێکی نی یە بەسەر خواوە. لەبەر ئەوە بەڵێنەکە بە شێوەی ئومێدو چاوەڕوانی بۆ کردن دەرئەخات و ئەفەرموێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ﴾ ئومێد وایە پەروەردگار ﴿أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ داشارێ و ببورێ لە خراپەو گوناهەکانتان، ﴿وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾ بتانخاتە ناو بەهەشتانێکەوە کە دێن و ئەچن لە ژێر درەختەکانیان دا ڕووبارو جۆگەکان ئەتانخاتە ناو ئەو بەهەشتانە، ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾ ڕۆژێ کە خوا، پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێنا لەگەڵی ریسوایان ناکات، لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی ریسوا کردن و بێ ئابڕوو کردنی بێ بڕواکانە ئەوان ئەخاتە ناو ئەو بەهەشتانەوە. ئای چە نرخ پێدان و ڕێز گرتنێکی گەورەیە بۆ بڕواداران کە خوا ئەیانخاتە ریزی پێغەمبەر (ﷺ) لە وەرگرتنی بەهرەو ڕێزو شادمانی و سەربەرزی لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی ریسوا کردنی تاوانبارانە!! لە ڕۆژەدا ﴿نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ﴾ ڕووناکی یەکەیان - کە بەرهەمی بڕوای خواپەرستی یانە - ئەڕوا لەبەر دەمیانەوەو لای ڕاستیانەوە، بەو ڕووناکی یەیان ئەناسرێن و جوێ ئەبنەوە لەو ڕۆژە ڕەش و تاریك و سامناکەدا، بەو ڕووناکی یە ڕێگا دەرئەکەن لەناو ئەو کۆمەڵ و قەرەباڵغەدا کە مەگەر خوا ئەندازو ژمارەیان بزانێ، ئەو ڕووناکی یە لەگەڵیانە تا ئەیانگەیەنێتە بەهەشت!!

يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ
ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا
لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ
فَخَانَتَاهُمَا

---

**لەوكات وشوێن وهەڵوێستەسەخت و سامناکەدا خوا ئەنێتە دڵیان ئەم نزاو داوا پیرۆزە ﴿يَقُولُونَ﴾ ئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا﴾ ئەی خوای پەروەردگارمان رووناکی و رۆشنایی یەکەیمان بۆتەواوبکەوبیگەیەنەبەدواترین پلەی ﴿وَٱغۡفِرۡ لَنَآ﴾ ببورە لێمان و گوناهمان داپۆشە ﴿إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ بەڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێك دا توانای، لەو رۆژە سامناکەدا کە هۆش نامێنێ و زمان ئەبەستریێ خوا ئەنێتە دڵیان ئەم نزایە بکەن تا لێیان وەرگریێ و داواکەیان بەجێ بێنێ. کەواتە ئەو نزایە لەوێدا بەهرەو چاکەیەکە خوا دەربارەیان ئەیکات زیاد لە رێزو رووناکی یەکەیان. جابابیربکەینەوە ئەمە لە کوێ و ئەو ئاگرە لە کوێ کە سووتەمەنی یەکەی ئادەمی و بەردە؟ بەڕاستی ئەم پاداشت و تۆڵە و سزایە روونی ئەکەنەوە ئەرکی سەرشانی بڕوادار، هاندەرو پاڵ پێوەنەرێکی زۆر بەهێزو گرنگن بۆ هەوڵ و تێکۆشانی بڕوادار بۆ پاراستنی خۆی و کەس و کاری لەو ئاگرەو گەیاندنی بە نازو رێزی نەبڕاوەی بەهەشت.**

**ئەم ئایەتانە بە جوانی روونی ئەکەنەوە کە بڕوادار هەرچۆنێ پێویستە لەسەری چاك کردن و رێنموونی خۆی هەروەها پێویستە لەسەری هەوڵدان بۆ چاك کردن و رێنموونی ماڵ و خێزان و ئەوەی لە ژێر دەستی دایە. کەواتە هەوڵ و تێکۆشانی بۆ چاك کردنی ئەوان بەشێکە لە چاك کردنی خۆی، بە بێ ئەو هەوڵ و تێکۆشانە چاك کردنی خۆی نابێ و بەدی نایە. بێگومان ئیسلام ئایینی گەلە، گەلیش لە خێزان پێك دێت، جا لەبەر ئەوە ئەرك و پێویستی ماڵ و خێزانی بڕیار داوەو خستوویەتە سەرشانی بڕواداری خاوەن ماڵ و خێزان. بێگومان ماڵ و خێزان بەردی بنچینەی گەلە، هەر خێزانێ بە وێنەی لەش کە چۆن لە سێڵ پێك دێت، ئاوا لەو هەموو سێڵانە لەشی زیندووی گەلی ئیسلامی پێك دێت. هەموو ماڵ و خێزانی قەڵایەکە لە قەڵاکانی ئەم ئایین و عەقیدەیە. پێویستە هەرکام لەم قەڵایانە قایم و بەتین بن، هەرکام لەوانەی وان لەو قەڵایەدا پاسەوانێکی بەهێزی وریا بن، رێگای دوژمن و**

ناپاك نەدەن بچێتە ناوی یەوە. پێویستی سەرشانی بڕوادار ئەوەیە بانگ کردنی ئاراستەی ماڵ و خێزانی بکات لە پێش ئەمەی ئاراستە مەردومی تری بکات. پێویستی یەکەم جاری ئەوەیە قەڵاکەی خۆی لە ناوەوە قایم بکات و کون و کەلەبەری تیا نەمێڵێ، ئینجا لەوە دەرچێ بۆ لایەکی تر. بێگومان بۆ چاك کردنی ماڵ و خێزانی هەرچۆنێ پێویستی هەیە بە باوکی موسڵمان، هەروەها پێویستی هەیە بە دایکی موسڵمان تا بە هەردووکیان هەڵسن بە چاك کردن و پاراستنی کوڕو کچەکان، کەواتە هەوڵدان بۆ چاك کردنی تەنها پیاوان بەس نی یە و چارەسەر نی یە و گەلی موسڵمان بەوە پێك نایەت، بەڵکو بۆ ئەو مەبەستە پێویستی بە ئافرەتیش هەیە و بە بێ ئافرەت نابێ، چونکە ئافرەت پاسەوانە بۆ رۆڵە و منداڵەکان، ئەمانیش بەروبوومی دوا رۆژو دواهاتوون. جا لەبەر ئەوە قورئان ئەهاتە خوارەوە بۆ پیاوان و بۆ ئافرەتان، ماڵ و خێزانی رێك و پێك ئەکرد، راستی ئەکردەوە لەسەر بەرنامەو رێگایەکی ئیسلامی، ئەرکی ئەو چاك کردنەی خستە سەر شانی بڕوادارە خاوەن خێزانەکان هەرچۆنێ ئەرکی خۆیشیان لەسەرە. ئەمە شتێکە کە پێویستە بانگ کەرانی رێگای خوا بە باشی تێ ی بگەن. پێویستە یەکەم هەوڵ و تێکۆشانیان بەرامبەر ماڵ و خێزان بێ، لەگەڵ ژن و دایکی منداڵەکان هەوڵ بدەن لە پاش ئەو منداڵ و خێزان بە تایبەتی، لەگەڵ هەموو کەس و کاری تری نزیك لەدوای نزیك بە شێوەی گشتی، پێویستە زۆر بە گرنگی هەوڵ بدا بۆ پێك هێنانی هاوسەری موسڵمان بۆ پێك هێنانی ماڵ و منداڵی موسڵمان. ئەگەر بەو جۆرە نەکرێ زۆر دوا ئەکەوێ پێك هاتنی گەل و کۆمەڵی موسڵمان، ئەو گەلەی بەو شێوە پێك نەهێنرێ هەمیشە لاری و نالەباری لێ نابڕێ!

لە گەل و کۆمەڵی موسڵمانی یەکەم جاردا کارەکە زۆر ئاسانتر بوو لە ئەمڕۆی ئێمە... ئەو کاتە گەل و کۆمەڵێکی موسڵمان پێك هێنرا لە مەدینەدا کە ئیسلام زاڵ و کاربەدەست و چاودێری کەر بوو بەسەریەوە، بەو تێگەیشتنە پاك و خاوێنەی کە بووی بەرامبەر ئادەمی و ژیانی ئادەمی، بە یاسا و قانونێکەوە کە لەو تێگەیشتنە هەڵ ئەقوڵا، پیاوو ئافرەت بۆ هەموو شتێ و لە هەموو کارو بارێکیان دا ئەگەڕانەوە بۆلای خواو پێغەمبەری خوا (ص) بۆ بڕیاری ئەوان، هەرکاتێ هەر بڕیارێکی ئەوان بهاتایە بێ سێ و دوو گوێ رایەڵی تەنها بۆ ئەوە ئەکرا. بەمۆی ئەوەوە کاری ئافرەت زۆر سووك و ئاسان بوو لە دروست کردن و داڕشتنی خۆی دا هەرچۆن ئیسلام ئەیویست و داوای ئەکرد. بۆ مێردەکان ئاسان بوو چۆن ئامۆژگاری ژنەکانیان بکەن و کوڕو کچەکانیان پەروەردە بکەن لەسەر رێگاو بەرنامەی خوا. بەڵام ئێمەی

ئەمڕۆ بارو هەڵوێستێکی ترمان هەیە زۆر زۆر جیاوازە، ئێمە ئەمڕۆ ئەژین لە چەرخێکی نەفامی دا، نەفامی گەل و کۆمەڵ، نەفامی یاسا و قانوون، نەفامی خو و رەوشت، نەفامی رژێم، نەفامی باوو تێگەیشتن. نەفامی خوێندەواری و رۆشنبیریی!!

ئافرەتی ئەمڕۆ لەناو ئەم گەلەدا ئەژی و ئەڵێەسێ و دائەنیشێ، کاتێ بیەوێ بە پێی ئیسلام رەفتار بکات و گوێڕایەڵی بێت هەست ئەکات بە قورسی و بارێکی گران کە ئەکەوێ بەسەری دا لەلایەن ئەو گەلە نەفامەی کە تیای دا ئەژی، ئیتر خۆی لە خۆیەوە رێگای ئیسلامی دابێتە بەر یان مێردی یان براو باوکی رێنموونی یان کردبێ.

لە چەرخی گەلی یەکەمی ئەم ئوممەتەدا پیاو و ئافرەت و هەموو گەل هەموویان، ئەگەڕانەوە بۆ یەك باوەڕو یەك تێگەیشتن و یەك بڕیار. بەڵام ئێستا و لەناو گەلی ئێستادا پیاو ئەگەڕێتەوە بۆ بیروباوەڕو تێگەیشتنێکی رووت کە لە واقیعی ژیان دا نی یە و بەدی نەهاتووە. ئافرەتیش بەژێر باری گرانی باوو تێگەیشتنی گەلەوە ئەناڵێنێ. ئەو گەلە نەفامەی کە دوژمنی ئەو تێگەیشتن و بیرو باوەڕەیە و بە هەموو هێز بەرگری ئەکات و بەرهەڵستی ئەوەستێ! بێگومان زۆرو زەحمەتی ئەو گەلە نالەبارە لە هەست و دەروونی ئافرەت دا چەند چەندانەی پیاوە!! جا لێرەدا پێویستی و ئەرکی سەرشانی پیاوی بڕوادار چەند قات ئەبێتەوە. چونکە ئەبێ خۆی بپارێزێ لەو ئاگرە کە ئایەتەکە باسی فەرموو! لەپاش ئەوە پێویستە لەسەری هەوڵ بدا بۆ پاراستنی خێزان و ماڵ و منداڵی لە کاتێك دا هەموو وان لە ژێر ئەو بارە گرانەی گەل و باوی گەلدا!!

کەواتە بڕواداری ئێستا ئەبێ تێ بگات و بزانێ کە ئەرك و پێویستی سەرشانی ئەم قورس و گرانترە لە ئەرك و پێویستی سەرشانی بڕواداری یەکەم چین بۆ ئەمەی تێکۆشانی زیاتر بکات لە تێکۆشانی ئەو بڕوادارەی کە لە یەکەم تاقم دا بوو.

ئەو کەسەی کە ئەیەوێ ماڵ و خێزانێکی موسڵمان پێك بێنێ ئەبێ لە یەکەم جارەوە بگەڕێ بەدوای ئافرەتێکی موسڵمانی راستەقینەدا ببێتە پاسەوانی ئەو قەڵایە کە ئەیەوێ پێکی بهێنێ، ئەبێ لە پێناوی دەست کەوتنی ئەو ئافرەتە موسڵمانەدا گوێی نەبێ لە هیچ شتێ تر کە لەم جیهانەدا نرخ دارە. وەکو ئەم حەدیسە سەحیحەش دەست نیشانی بۆ ئەکات ﴿تنكح لأربع: لمالها و جمالها و لحسبها و لدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك﴾ ژن ئەهێنرێت لەبەر چوار شت: لەبەر ماڵی، لەبەر جوای. لەبەر کەس و کارو نەژادی. لەبەر دین داری، ئینجا ئەی کەسێ کە رێگای راستت ئەوێ بگەڕێ بەدوای دین داراو ئەوە دەستی

خۆت بخە. پێویستە بوونی ئەو ئافرەتە دین دارە تا کۆمەکی بکات لە دروست کردنی ماڵێکی موسڵمان و قەڵایەکی موسڵمان! پێویستە لەسەر باوکە موسڵمانەکان کە ئەیانەوێ ئیسلام زیندوو بکەنەوەو دووبارە هەڵیگیرسێننەوە. پێویستە بزانن کە کوڕو کچەکانیان سپاردەیە لە دەستیان کەواتە لە پێش هەموو کەسێ تردا ئەوانە ئامادە بکەن و پەروەردەیان بکەن بەو شێوەی کە ئیسلام فەرمان ئەدات، تا هەرکام لەوانە بنن بە سێڵێکی زیندووی بەکار لە لەشی گەلی موسڵمان دا. بێگومان – وەکو چەند جار وترا – سروشتی ئیسلام لەسەر ئەوەیە و داوای ئەوە ئەکات کە ئەبێ گەل و کۆمەڵێ ببێ ئیسلام کار بەدەست و چاودێرو فەرمان ڕەوای بێت، گەل و کۆمەڵێ کە ئیسلامی تێدا بەدی بێت. ئەبێ گەل و کۆمەڵێ ببێ کە ئیسلام عەقیدەو بیروباوەڕی ببێ، ئیسلام ڕژێمی بێ، ئیسلام قانون و یاسای بێ، ئیسلام بەرنامەی تێرو تەواوی بێ کە تێکەیشتن و هەموو شتی لەو هەڵگوزێ. تەنها کۆمەڵێکی وا ئەبێ بە پەروەردە بۆ ئیسلام کە ئەتوانێ پارێزگاری بکات و بیچێنێ و بیڕوێنێ لە دڵ و دەروون‌دا، بیپارێزێ لە هەموو زەخت و زۆرێکی گەلی نەفام، هەرچۆنێ ئەیپارێزێ لە سزادان و دەست درێژی بۆ سەری لەلایەن دوژمنەوە. کەواتە روون و ئاشکرایە کۆمەڵێکی واو پێویستی بە بوونی کۆمەڵێکی وا، کە کچی موسڵمان و ئافرەتی موسڵمان تیا بژی، بەهۆی ئەو کۆمەڵەوە پارێزراو ئەبێت لە زەخت و زۆری گەلی نەفامی و باوی ناڕەوای گەلی نەفام.

ئینجا یەکسەر روو ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای بۆ نەخشە ئەکێشێ کە چۆن هەڵوێست وەربگرێ دژی کافرو ناپاکەکان کە هەردەم لە کەمین دا بوون بۆ قۆستنەوەی بچووکترین شتی بڕواداران و گەورەی بکەن و بەوە دژایەتیان بکەن و قسەو قسەڵۆکیان بۆ هەڵبەستن. ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾ ئەی پێغەمبەر لەگەڵ کافران و ناپاکان و دوو ڕووان دا بجەنگەو توندی و سەختی بنوێنە لەگەڵیان ﴿وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ جێگەیان دۆزەخە و خراپترین شوێن و جێگای مانەوەیە. دوای ئەوە نموونە ئەهێنێتەوە بۆ بڕواداران و بێ بڕوایان هەریەکە بە وێنەو کەسانی وەك خۆیان کە لە سەرەتاو بەردەوامی ئیمان و خواپەرستیدا روویداوەو بەردەوام بووە. ئەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ﴾ خوا بۆ کافران نموونەی بە ژنی نوح وژنی لوط هێناوەتەوە﴿كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَـٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا﴾ کە هەردووکیان هاوسەری دوو بەندە لە بەندە چاکەکانی ئێمە بوون و خیانەتیان لەگەڵ کردن

فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا
لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ
وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا
فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾

---

**﴿فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ﴾ نەیانتوانی سوودیان بۆ ژنانی خۆیان هەبێ لەبەردەم بارەگاو دادی خوادا، جا پێ یان گوترا بچنە ناو ئاگر لەگەڵ ئەوانەی چوونە ناوی یەوە. هەردوو بەندە پاکەکە پێغەمبەر بوون و نەیانتوانی سوود بە هاوسەرەکانی خۆیان بگەیەنن لە کاتێك دا ئەو هاوسەرانە لە رێگای خواپەرستی لایاندا.**

**دوای ئەوە نموونەی چاکان و پاکان بۆ بڕواداران دەهێنێتەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا بۆ ئەوانەی بڕوادارن نموونەی بە ژنی فیرعەون هێناوەتەوە، لەو کاتەدا گوتی: پەروەردگاری من بۆم دروست بکەماڵێك لای خۆت لە بەهەشت دا و رزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەکەی و لە گەلی ستەمکار و رزگارم بکە. هەر بە سروشت ئافرەت حەز لە ماڵ و ماڵداری ئەکات، خوای گەورە چەند جوان لەو نزایەی ئەو ژنی فیرعەونە رایدەگەیەنێ.**

**نموونەی پاکی دووەم ﴿وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ﴾ مەریەمی کچی عیمران کە داوێنی خۆی پاك راگرت و پاراستی، ئێمەش لە رۆحی خۆمانەوە فوومان پیاکرد و ئەویش فەرمایشتەکان و کتێبەکانی خوای بەراست دانا وتەسدیقی کردو یەکێك بوولەمل کەچان و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرانی خوا.**

**بە یارمەتی خوای گەورە نووسینەوەی ﴿تەفسیری قورئانی پیرۆز﴾ لەسەر کۆمپیوتەر کۆتایی هات، لە رۆژی یەك شەممە ٦ ی رەمەزانی پیرۆزی ساڵی ١٤١٨ ی کۆچی بەرامبەر ١٩٩٨/١/٤ ی زایینی.**

## سورەتی(الملك)
## مەککەیی یە و(٣٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم جزمی(٢٩) هەمووی مەککەیی یە. هەرچۆنێ جزمی(٢٨) هەمووی مەدینەیی یە، وەکو باسمان کرد لەسەرەتای تەفسیرەکەیا.

لەبەر ئەوە هەر کام لەم دوو جزمە شێوە و تام و ئاوازی تایبەتی خۆیان هەیە... هێندێ لە سەرەتای سورەتەکان لەم جزمەدا لەو ئایەتانەیە کە لە سەرەتای هاتنە خوارەوەی قورئان دا هاتوون وەك سەرەتای سورەتی(المدثر) و(المزمل).

هەرچۆنێ چەند سورەتێکی تیایە رەنگە بە سێ ساڵ دوای رەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) هاتبنە خوارەوە، وەك سورەتی(القلم). سورەتی وای هەیە بە دەساڵ دوای رەوانە کردنی هاتووە، وەکو سورەتی(الجن) کە بە پێی(حەدیس) هاتەخوارەوە لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە(طائف) وە ئەو رۆیشتنە بۆ(طائف) لە پاش مردنی(خدیجە خاتوون) و(ابو طالب) بوو پێش کۆچ کردنی بۆ(مەدینە) بە ساڵێ یا دوو ساڵ، ئەگەرچی ریوایەتێ تریش هەیە کە بەهێزتریشە، ئەفەرموێ: ئەمیش لەو سورەتانەیە کە لە نزیکی سەرەتاوە هاتوون.

سورەتەمەککەیی یەکان–وەکوچەندجارێ وترا – زۆرتر مەبەستی چاندن و دامەزراندنی ئاقیدە و بڕوایە. ئاقیدە بە خواو بەڕاستی(وحی) و سروشی خواو رۆژی دوایی... و دامەزراندنی تێگەیشتن و بۆچوونێ(تصور) کە لەو ئاقیدە و باوەڕەوە هەڵئەقوڵێ بەرانبەر ئەم بوون و بوونەوەرە و پەیوەندی یان بە پەروەردگاریانەوە. هەروەها نیشاندان و ناساندنی خوا بەو شێوە و سیفەتانەی کە شایانن بۆ خواو کار ئەکەن لەدڵ و دەروونا و رووی بەندە ئەکەنە پەروەردگاری و فێری ئەکەن و تەمێی دائەدەن کە بە چ جۆرێ بن لەگەڵ خوادا.

سورەتی مەدینەیی زۆرتر هەوڵی بەدی هێنانی ئەو ئاقیدە و بڕواو تێگەیشتنە ئەدات لە ژیانا، و پاڵ ئەنێ بە دڵ و دەروونەوە و هانی ئەدا لەسەر ئەوەی بە توونـدی و بەهێز ئەو سپاردەی ئاقیدە و شەریعەتە بگیرێ و بەکار بهێنرێ لە زۆرانبازی و زۆرە زمانی ژیان دا و هەڵسان بە ئەرکی ئەو ئاقیدە و شەریعەتە لە دەروون و کردەوەدا بە یەکسانی. چەند وێنە و نموونەیەکمان لەوە بینی لە سوورەتە مەدینەیی یەکانا کە سوورەتەکانی ئەم جزمە پێشووە بەشێ بوون لەوانە. ئەم یەکەم سورەتە ئەیەوێ تێگەیشتن و بۆچوونێکی(تصور) تازە داهێنێ و دامی مەزرێنێ لەدەروونا، لەبارەی بوون و بوونەوەرو پەیوەندی بەپەروەردگارەوە. تێگەیشتن و بۆچوونێکی فراوان و گشتی کە لەم جیهانە تەنگەی زەوی یەوە دەرچێ و تێپەڕ بکات، بۆ چەند جیهان و جیهانێ تر لە ئاسمانەکانا و بۆ ژیانێ تر لە رۆژی دواییدا.

بۆ چەند دروست کراوێ تر بێجگە لە ئادەمی لەم جیهانی زەوی یە وەکو جنۆکە و پەلەوەر، بۆ جیهانی تر لەرۆژی دواییدا وەکو دۆزەخ و فەرمان رەواو کار بەدەستەکانی دۆزەخ. بۆ چەند جیهان و جیهانی یەتر کە نادیار و هەست پێ نەکراون بۆ ئێمە و جیاوازن لەم جیهانە ئاشکراو هەست پێ کراوەی کە بە هەست و دڵ و دەروونی ئادەمی پەیوەستە و پەیوەندی هەیە پێیەوە.

بەهۆی ئەوە ئەو کاتە دڵ و دەروون سەر ناکاتە تەنها ئەم ژیانە ئاشکرایە و نابەسرێتەوە تەنها بەمەوە کە هەیە لەم زەوی یەدا. ئەم سورەتە هەرچی تێگەیشتن و بۆچوونی نەفامی و چەرخی نەفامی و نەزانی هەیە کە نەقشی بەستبوو، و وشک و برین و بێ گیان تەپەیان دابوو لە مێشکدا. ئەوانە هەموو ئەخاتە لەرزە و جێگایان پێ لەق ئەکات، کون و کەلەبەر ئەکاتەوە لە دەروون و فوو ئەکات لە تۆزو غوبار بەسەریەوە. هەست و ژیریی بەرەڵا ئەکات تا بڕوا بگەڕێ بە هەموو ئاسۆو، ناوچەکانی بوونەوەردا و بگەڕێ بە قوڵایی دەروونا، وە بە

هەموو شاراوەو نادیاری یەکانی غەیبا، تا بەهۆی ئەو گەردش و خولانەوە دەستی قودرەتی داهێنەریی خوا ببینیٚ، و هەست بکات بە بزوتنەوەی بوون لە نەبوونەوە کە پەیدا ئەبیٚ و هەڵئەقوڵیٚ لە خواهیش و زۆری خواوە.

ئەو کاتە ئەگەڕێتەوە لە گەردش و خولانەوەکەی بە تیٚ گەیشتن و هەستێکی ترەوە، ئەزانیٚ گەشتەکە گەورەتر و فراوانترە لەوەی کە ئەو زانی بووی، وە بەم زەوی یەوە ناوەستیٚ و ئەڕوا بۆ ئاسمان، لە وەستانەوە ئەگۆڕیٚ بۆ بزوتنەوە و جولاّن، لە دیمەن و رواڵەتی رووتەوە ئەڕوا بۆ کرۆك و ناوەڕۆك.

مردن و ژیان دوو شتی ئاشکرای ناسراون و دەقیان پێوە گیراوە و هیچ جێگای سەر لیٚ کردنەوەو سەرسوڕمان نین، بەلاّم ئەم سورەتە بەجۆریٚ باسی ئەکات و ئەیدا بە گوێچکەدا ژیری ئەخاتە بزوتنەوە و بیرکردنەوە لە لیٚ زانی و کار دروستی خواو تەگبیر و بڕیاری خوا، و بیر کردنەوە لەو تاقی کردنەوەی کە خوا ویستوویەتی لە دانان و بڕیاردانی ئەو مردن و ژیانەدا. ئاسمان ئەو دروست کراوە دامەزراوەیە، چاوی نەفام سەرنجی ئەدات بە بیٚ ئەوەی تێپەڕ بکات بۆ بینینی ئەو دەستە قودرەتەی کە دروستی کردوە و دایهێناوە، بە بیٚ ئەوەی لایە بکاتەوە بۆ ئەو هەموو تێری و تەواوی و وردەکاری یەی کە تیایا کراوە. بەلاّم ئەم سورەتە بزوتنەوەی بیرکردنەوە ئەخاتە سورو پەرۆش بۆ تیٚ روانینی ئەو هەموو جوانی و شیرینی و وردەکاری و ئەو مەبەست و ئامانجەی کە تیٚ بینی کراوە لەو دروست کراوەدا.

ئەم ژیانی جیهانە لای نەفامێتی و لەبەرچاوی نەفام ئەوپەڕی مەبەست و ئامانجە. بەلاّم ئەم سوورەتە جیهانیٚ تر نیشان ئەدا. هەروەها چەندشتیٚ تری پێویست کەئادەمێتی بەبیٚ ئەوانەپێك نایەوبەدی نایە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾

ئینجا با به دڵ گوێ شل بکەین بۆ ئایەتەکانی سوورەتەکە و ئەو ئاقیدە و مەبەستانەمان نیشان بداو بیاندا بە گوێمانا. لە یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ئینجا ئایەتێ ئەکا بەسەرەتا کە هەموو باس و مەبەستەکانی سوورەتەکە لەو تەنها ئایەتە هەڵئەقوڵێ و بە دەوری ئەودا ئەخولێتەوە. ئەفەرموێ ﴿تَبَٰرَكَ﴾ بەرزوبڵندوپاکەلەهەموو نەنگ و لەکەیەك ﴿ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ کەسێ کە هەر بەدەستی ئەوە پادشایەتی تەواو و بێ سنوور. کەواتە ئەو کەسە خاوەنی هەموو شتێکە و جڵەوی هەموو کاروبارێ لە دەستی ئەوایە و ئەو تەگبیر و چاودێریی ئەکات و هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەو.

هەرکاتێ ئەم بڕوایە لە دڵا جێگیر بوو، ئەو دڵە ئەزانێ روو بۆ کوێ ئەکات و گەڕانەوەی بۆلای کێیە، رزگارئەبێ لە رووکردن بۆلای غەیری خوا وە پشت بەستن و داواکردن لە غەیری خوایە کە هاوبەشی نییە لەو پادشایەتی یەدا، هەرچۆنێ رزگار ئەبێ لە بەندەیی و پەرستنی هیچ کەس بێجگە لەو خوایە کە خاوەنی هەموو شتەو هەرچی ویست ئەیکات. ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ وەئەوکەسە بەسەرهەمووشتێکا تواناودەسەڵاتدارە. کەواتەهیچ شتێ دەستەپاچەی ناکا و هیچ شتێ لە دەستی دەرناچێ و هیچ شتێ بەرگری و بەربەستی ناکا لە هەر کارێ کە نیازی بکات و بیەوێ.

ئەم بڕوا راستە کاتێ دامەزرا لە دەروونی هەر کەسا، ئەو کەسە تێ ئەگات لە بێ سنووری خواهیش و دەسەڵات و تەوانای خوا، هەرگیز سەری سوڕنامێنێ و سەر ناکاتەوە لە بەدی هێنان و فەراهەم هێنانی خوا بۆ هەر شتێ کە بە پێی باوو خەیاڵ و تێ گەیشتنی ئێمە نەکراوە و نەگونجاوە. بۆ وێنە: سەرناکاتەوە لەوەی کە خوا دار دەستە وشك و رەق و تەقەکەی موسای کردبە ئەژدەهایەك کە هەموو کردەوەو دام و دەزگای جادووگەرەکانی فیرعەونی قووت دا و هەڵی لوشین و لە پاشا لە دەستی موسادا بووەوە بە دارەدەستەکەی جاران. هەرگیز سەرناکاتەوە لە هەزارەها شتی وا، بەڵکو بڕوای بەهێز و دامەزراوی هەیە کە هەرشتێ خوا ویستی گونجاوە و دەسەڵاتی هەیە بەسەریا بە بێ بەرگری و بەبێ سنوور.

ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ
طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ

یەكێ لەو نیشانانە و بەرهەمی پادشایەتی و دەسەڵات و تەواناى ئەمەیە كە ئەم فەرموودە روونی ئەكاتەوە: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ﴾ واتە ئەو پادشای توانا كەسێكە كە بڕیاری مردن و ژیانی داو ئەو دوو شتەی داهێنا. هەركام لەم دوانە دوو جۆر ئەگرێتەوە: مردنی پێش ژیان و مردنی دوای ژیان. ژیانی دوای مردنی یەكەم و ژیانی پاش مردنی دووەم. هەر چوار بڕیار دراوی خوان و خوا دایناون. ئەو بڕیارەشی هەروا بە رێكەوت نی یە و بەبێ تەگبیر. بە گۆترە نییە و بەبێ مەبەست. بەڵكو بۆ تاقی كردنەوەیە، تا دەركەوێ ئەوەی شاراوە بووهەرلای خوا ولەزانینی خوادا بوو، لەو هەموو رەوشت و كردەوەی جیاوازە كەلەپاشابەندەكانی خواهەڵسان پێی لەم زەوی و جیهانەدا و بەهۆی ئەوە هەركەس بگات بە بەرهەمی كردەوەی خۆی و دەركەوێ شایستەیی بۆ پاداش و تۆڵەی كردەوەی.

وەكو ئەفەرموێ: ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ واتە مردن و ژیانی بڕیاردا بۆ ئەمەی خوا بە شێوەی تاقی كردنەوە رەفتارتان لەگەڵ بكات، ئەی كەسانێ كە تەكلیفی خواتان لەسەرە، تا دەركەوێ بۆ خەڵكی كامتان كارو كردەوەتان رێك و راست ترو پاك و خاوێن ترە. جێگیر بوون و رەنگ گرتنی ئەم مەبەستە لە دەروونا تێ گەیشتن و وریایی و ترس و خۆپارێزی فەراهەم ئەهێنێ لەو دەروونەدا، هەمیشە سەرنجی رائەكێشێ بۆ هەموو نیازو كردەوەیەكی، لە ترسی دەرنەچوون لەو تاقی كردنەوەدا. واز ناهێنێ لەو دەروونە سەر بكاتە بێ ئاگایی و بێ هۆشی و ژیانی بە بێ سوود و بێ هوودە. هەروەها لێی ناگەڕێ بە ئارام و خۆشی یەوە پشتوێن بكاتەوە و لێ ی دانیشێ. بەڵكو هەمیشە بە ترس و بێ ئارامی یەوە ئەژی.

جا لەبەر ئەوە خوای میهرەبان ئومێد و دڵخۆشی بۆ ئەنێرێ كە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ﴾ وە هەر ئەو خوایە زاڵی زۆر لێ خۆش بووە. واتە ئەو خوایە هەرچەندە بە توانا و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا بەڵام لە هەمان كاتا زۆر لێ خۆش بوو و خاوەن چاوپۆشی یە. كەواتە كاتێ دڵ بێدار و هۆشدار بوو، زانی كە هەمیشە وا لە ژێر تاقی كردنەوەدا، بەهۆی ئەوە كەوتە ترس و بێ ئارامی یەوە، با نا ئومێد نەبێ، بەڵكو دڵ ئارام بێ بەلێ خۆش بوون و بەزەیی خوا!

بێ گومان خوا لەڕاستی یا و بەو شێوە راستەقینەی کە ئیسلام نیشانی ئەدا و ئەیەوێ لەدڵا جێگیر بێ، بەندەکانی ناتارێنێ و توڕیان نادات. تەنگەتاو و نارەحەتیان ناکات، و پێی خۆش نی یە سزایان بدا بەڵکو پێی خۆشە وت و وریابن و بزانن مەبەست لە دروست کردن و بوونیان چی یە، وە پێی خۆشە بەرز ببنەوە بۆ رادە پلەی هەرە بەرزی خۆیان وە پێی خۆشە پارێزگاری ئەو رێزە بکەن کە خوا پێی داون و پێچەوانەی نەجوڵێنەوە. هەرکات بەندەکانی بەو جۆرە بوون کە خوا پێی خۆشە ئەو حەلە میهرەبانێتی و فراوانی و یارمەتی گەورە و لێ بووردن و چاوپۆشی زۆری هەیە بۆیان.

ئینجا هەمیتر چەند بەرهەم و نیشانەی پادشایەتی و کاربەدەستی و زاڵی و تەواناای خوا ئەخاتە بەرچاو لەگەڵ بەهێزکردنی بڕوا بە تۆڵە و پاداش. لەم چەند ئایەتانەی کە دێن ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَـٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ کەسێکە حەوت ئاسمانی دروست کردو دای هێنان و کە یەك لەسەر یەك و قات لەسەر قاتن، ئەم حەوت ئاسمانەی کە قورئان لە چەند ئایەتا باسی ئەفەرموێ بەرێکی و بە بێ گومان نازانرێ مەبەست پێ یان چییە.

هەرچی زانایانی ئاسمانی وتوویانە هەمووی گۆترەکاری و نەزەری یاتی رووتن دەست ئەدەن بۆ گۆڕاندن و بژارەکردن بەڵکو زۆریان بە درۆ کەوتنەوە، هەر جارێ کە هۆی زانیاری و دۆزینەوەی نەزانراوەکان بەهێزترو پێش کەوتووتر بوو بەهیچ رەنگ دروست نی یە بەستنەوەی مەبەست لە ئایەت بەو نەزەری یات و گۆترەکاری یەوە کە دەست ئەدەن بۆ گۆڕان و راست کردنەوە. تەنها بۆ ئێمە ئەمە بەسە کە بزانین حەوت ئاسمان هەیە وە ئەو حەوتەش قات لەسەر قاتن و دوورن لە یەکتر و رادەی دووری یەکەیشیان جۆر جۆرو جیاوازە. قورئان سەرنج رائەکێشێ بۆ دروست کراوەکانی خوا، لە ئاسمانەکانا بە تایبەتی وە بۆ هەموو دروست کراوەکانی بە شێوەی گشتی. سەرنج رائەکێشێ بۆ هەموو دروست کراوەکانی لە کاتێکا بەر ئەبڕێتەوە بە تیرو تەواوی یان بە جۆرێ چاو کول و دەستەپاچە ئەکات لەوەی بتوانێ هیچ جۆرە نەنگ و نارێکی و لەکەیەك بدۆزێتەوە تێیاندا. ئەفەرموێ: ﴿مَّا تَرَىٰ فِى خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ مِن تَفَـٰوُتٍ﴾ ئەی سەرنج دەر نابینی لە دروست کراوی خوای میهرەبانا هیچ جۆرە نارێکی و زیادە رەوی و کەم و کوڕی یە نی یە، بەڵکو هەموو شتێ لە ئەندازە و سنووری تایبەتی شایان و شیاوی خۆیایە!!

**ئەگەر دوو دڵی و گومانت هەیە لەو رێکی و بێ لەکەیی یە ﴿فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ﴾ دەی چاو بگێڕەوە و ورد بەرەوە ﴿هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ﴾ ئایا هیچ درز و کون و کەلەبەرو ناڕێکی یە ئەبینی؟ ﴿ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ﴾ لەپاش ئەوە زۆر جاری تر چاو بگێڕە جار لەدوای جار. واتە لەوانەیە لە سەرنج دان و چاوگێڕانی پێشوو لەکە و عەیبێکت بەرچاو نەکەوتبێ، کەواتە دووبارە ورد بەرەوە و ئینجا هەمیتر ورد بەرەوە. ئەگەر هەرچەند هەوڵ بدەیت و چاوبگێڕی هیچت دەس ناکەوێ و ﴿يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا﴾ چاوت ئەگەڕێتەوە بۆلات بە زەبوونی و سەرشۆڕی و دووری لە دەست کەوتنی ئەوەی بەدوایا ئەگەڕێت. ﴿وَهُوَ حَسِيرٞ﴾ لەکاتێکا کە ئەو چاوە ماندو و کول و پەك کەوتووە بەهۆی گەڕانی زۆری دوور و درێژەوە.**

**واتە هیچ کەس بەهیچ رەنگ هیچ جۆرە ناڕێکی و لەکەو عەیبێکی بۆ نادۆزرێتەوە. کەواتە با مل کەچ بکرێ و گوێ رایەڵی تەنها ئەو پەروەردگارە بکرێ کە زانا و بە دەسەڵات و لێ زان و کار دروستە. لەبارەی کار دروستی خوا لە دروست کراوەکانیا ئیمامی غەزالی – خوا لێ ی رازی بێت – فەرموودەیەکی هەیە زۆر بەتام مەزەیە بە جوانی ئەزانم هێنانی لێرەدا ئەفەرموێ: ئەگەر هەرچی ئادەمی هەیە لە یەکەم کەسەوە هەتا دواترین کەس، هەموو کۆبکرێنەوە پێکەوە، هەموو بکرێن بە زاناترو ژیرتر لە هەموو کەس، ئاگادار بکرێن بە دوا رۆژو سەرەنجامی هەموو شت و هەموو کارو کردەوەیە، ئینجا درێژترین تەمەنیان پێ بدرێ، ئینجا هەموو ئەوانە تەمەن و ژیانی خۆیان بەخت بکەن لە بیر کردنەوەو ورد بوونەوە بۆ ئەمەی بچوکترین شت زیاد یا کەم بکەن لەوەی خوا دروستی کردووە. بە هیچ رەنگ رەوا نادەن نە بۆ زیادکردن و نە بۆ کەم کردن. بەڕاستی فەرموودەکەی زۆر بەتامە و زۆر راست و بەجێشە، چونکەئەوەی خوادایناوەو کردوویەتی لە رادەیەکایە وەك ناوەڕاستی تەرازوویەکی زۆر راست کە بۆ هەر لایە بگۆڕێ خوارو لارە سەنگ ئەبێ. ئا بەو جۆرە خوا بەر ئەبڕێتەوە لە هەموو کەس، هەتا بێت شتە نهێنی یە نایابەکانی ئەم بوونەوەرە بەرە بەرە دەرئەکەون و بەهۆی ئەوە راستی ئەو بەر لێ بڕینەوە روون و ئاشکرا ئەبێت.**

**بەکارهێنانی ئەو بەر لێ بڕینەوە هۆی بە گرنگ گرتنی سەرنج دان و زیادە ورد بوونەوەیە. ئەوەش شتێکە زۆر پێویستە و مەبەستی قورئانە، چونکە دەق و ئولفەت بەهەر**

شتێکەوە گیرا لەبەرچاو کۆن ئەبێ و فەرامۆش ئەکرێ هەر چەند نایاب و بەنرخ بێ. جا قورئان بەو بەر لێ بڕینەوەیە مەردوم ئەهێنێتە سۆز و پەرۆش بۆ بیرکردنەوە و وردبوونەوە لەم بوونەوەرە شیرینە، کە چاو تێر ناخوات لە سەرنج دانی جوانی و شیرینی یەکەی، دڵ تێر نابێ لە وەرگرتنی تامێ و تێگەیاندن و دەست نیشان کردنەکانی، ژیریی تێر نابێ لە بیرکردنەوەی نیزام و یاسای ئەو هەموو وردەکاری یەی کە تیایدا کراوە.

هەرکەس بەو چاوە سەرنجی بدا ئەژی لەم بوونەوەرەدا لەناو مەهرەجانێکی رازاوەی دڵ رفێن، کە گرنگی و نایابی یەکەی کۆن نابێ، چونکە تا بێت تازە ئەبێتەوە بۆ چاو و دڵ و ژیریی ئەو کەسە کە ئاشنا ئەبێ بە هێندێ شت لەبارەی سروشتی ئەم بوونەوەرە و نیزامەوە – وەکو زانیاری تازە چەند ناوچە و رووبەکی دەرخستووە –هەروا سەرسام و سەرگەردان ئەبێ بەڵام نایابی و شیرینی ئەم بوونەوەرە پێویستی نی یە بەو زانیاری یە. چونکە یەکێ لە بەهرەو چاکەکانی خوا بەسەر ئادەمی یەوە ئەوەیە کە توانای کردووە بەسەر وەرگرتن و وت و وێژ لەگەڵ ئەم بوونەوەرە بەهۆی تەنها سەرنج دان و بیر لێ کردنەوەی.

هەر دڵێك کوێر نەبێ و سمەسای لێ نەبڕابێ تەنها بەو سەرنج دان و بیر لێ کردنەوە بە باشی تێ ئەگات لە نایابی و رێك و پێکی یاسا و نیزامی تێرو تەواوی، بڕوای بەهێزو پتەوی ئەبێ کەبەهیچ کلۆج ناگونجێ بوون و مانەوەی ئەم بوونەوەرە بە بێ پەروەردگارێکی زانای کار دروستی توانای چاودێری بەڕێوەبەر. جا لەبەر ئەوە قورئان پاڵ ئەنێ بە مەردومەوە بۆ تەنها سەرنج دان و بیر کردنەوە لەوەی کە بەچاو ئەیبینێ. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە قورئان بۆ هەموو هاتووە و قسە لەگەڵ هەموو دا ئەکات، لە هەموو چەرخ و کاتێکدا. قسە ئەکات لەگەڵ دانیشتوانی چڕو بێشەو دانیشتوانی دەشت و خێوەت، هەرچۆنێ قسە ئەکات لەگەڵ دانیشتوانی کۆشکەکان، لەناو شارە گەورەو گرنگەکانا، لەگەڵ کاربەدەست و گەرۆکەکانی دەریایی و ئاسمانیدا. ئەدوێ لەگەڵ نەخوێندەو یەکێ کە هەرگیز تەنها حەرفێکی نەخوێندبێ و نەنوسی بێ، هەرچۆنێ ئەدوێ لەگەڵ زانای سروشتی و زانای ئاسمانی و زانای بیری دا بە یەکسان. هەرکام لەوانە لە قورئانا دەستیان ئەکەوێ بەشێ لەوەی کە بیان گەیەنێ و پەیوەستیان بکات بەم بوونەوەرە، پڕی دڵیان بکات لە نایابی و بەنرخی ئەم بوونەوەرە. جوانی و شیرینی لە دروست کردن و داڕشتنی ئەم بوونەوەرەدا تێبینی کراوەبەوێنەی تێری وتەواویەکەی! لەبەر ئەوە قورئان سەرنج رائەکێشێ بۆ جوانی و شیرینی ئاسمانەکان لەپاش سەرنج راکێشان بۆ تێری و تەواوی یەکەیان.

ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾ سویٚند بە خوا نزیك ترین ئاسمان لە ئیٚوەمان ئارایش کردو رازاندمانەوە بە چەند چرایەکی گەورەو گرنگ. واتە بە چەند ئەستێرەیە کە لە دوورەوە وەکو چرا وایە و لای سەروتانی رووناك و جوان کردووە بە وێنەی جوان کردن و رووناك کردنی ماڵ و خانووەکانتان بە چرا و رووناکی کەرەوەکانی زەوی.

بەڵیٚ وا دەرئەکەویٚ مەبەست بە نزیك ترین ئاسمان نزیك تریانە لە زەوی و دانیشتوانی زەوی یەوە کە بەم قورئانە قسەیان لەگەڵ ئەکریٚ و کراوە. هەروەها وا دەرئەکەویٚ مەبەست بەو چرایانە ئەو ئەستێرانە بن کە بەچاو ئەیانبینین کاتیٚ سەرنجی لای سەرومان ئەدەین لەشەودا. چونکە بەو جۆرە رێك و پێکە لەگەڵ تەمیٚ کردن و فەرمان دان بە مەردوم بۆ سەرنج دان و تەماشا کردنی ئاسمان، بە تایبەتی یەکەم چین کە ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، کە ئەوانە بێجگە لەچاوی خۆیان هیچ هۆی سەرنج دانیان نەبوو، نە دووربین و نە هیچی تر، کەواتە بێجگە لەم ئەستێرە ئاشکرایانە هیچی تریان نەئەبینی، بێگومان شێوەی ئەستێرەکان لەلای سەرەوە زۆر جوان و شیرینە و بەڕاستی دڵ رفێنە، جوانی و شیرینی یەکەیان تازە ئەبێتەوە و رەنگەکانیان جۆر جۆرە. بەپیٚی گۆڕان و جۆر جۆری کاتەکانیان. لە بەیانی یەوە بۆ ئیٚوارە، لە هەڵهاتنەوە بۆ ئاوا بوون، لە مانگەشەوەوە بۆ تاریکە شەو لە سایەقە و بیٚ تەم و هەوری یەوە بۆ تەم و هەور.. بەڵکو ئەو شێوە لە ساتێکەوە ئەگۆڕیٚ بۆ ساتێکی تر و لە ناوچە و لایەکەوە بۆ ناوچە و لایەتر...

هەموو هەر جوان و دڵ رفێنن، سەرنج ئەدەیت تەنها ئەستێرەیە لەبەرچاو تاك بووەتەوە و لە دورەوە جریوە جریویەتی، ئەڵێیت چاوێکی زۆر جوانە و سۆز و خۆشەویستی لیٚ ئەباریٚ. لە لایەترەوە ئەبینی دوو ئەستێرە تاك بوونەتەوە لە کۆمەڵ وەکو قسەی نهێنی یان ببیٚ! لەلایەترەوە چەند کۆمەڵ ئەبینی لە پێش چاو نزیکن لە یەك و پرژو بڵاو بوونەتەوە لێرەو لەویٚ، وەکو هەموو لە زنجیرەیەکا بن بۆ کەیف و ئاهەنگ لەو مەهرەجانی ئاسمانەدا. ئەوانە کۆ ئەبنەوە و جویٚ ئەبنەوە وەکو ئەوانە هاوڕیٚ ی شەویٚ بن لە مەهرەجانێکا! ئەو مانگە جوانە ئەبینی مات و بەرەو تاریکی. لە شەویٚ ترا روون و جوان و کەشخە ئەکات و لەشەویٚ ترا ئەبینی شکا و بەرەو کزی ئەڕوا. و لە شەویٚ تر وون ئەبیٚ و دروشمی نامێنیٚ. ئینجا سەرنجی ئەو بۆشایی یە(فەزان) پان و پۆڕە بدە! کە چاو پیا ناگات و بەو شێوە

رازاوەتەوە. بەڕاستی هەمووی جوانی و شیرینی یە. و لە ڕادەیەکایە ئەبینرێ و بیری لێ ئەکرێتەوە، بەلاّم ناتوانرێ بە دەم و وتن ڕوون بکرێتەوە و شێوە ڕاستەکەی دەرخرێ! قورئان دەروون ڕائەکێشێ بۆ جوانی و شیرینی ئاسمان، بۆ شیرینی هەموو بوونەوەر چونکە تێگەیشتن و هەست کردن بە جوانی دروست کراو نزیك تر و ڕاست ترین هۆیە بۆ تێگەیشتن و هەست کردن بە جەمالێ و شیرینی پەروەردگار. ئەم تێ گەیشتن و هەست کردنەش ئادەمی بەرز ئەکاتەوە بۆ بەرزترین پلەو ئاسۆیە کە لەوانا بێت چاکترین کاتەکانی دڵی ئادەمی ئەو کاتانەیە کە جوانی و شیرینی دەستکردی خوای تیا وەرگرێ و دەست کەوتی ببێ. چونکە بەهۆی ئەوە ئامادە ئەبێت بۆ گەیشتن بە پەیوەندی لەگەڵ سەرچاوەی هەموو جوانی و شیرینی یەك.

ئینجا کارو کەڵکێ تری ئەو ئەستێرانە نیشان ئەدا ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ﴾ وە ئەو ئەستێرانەمان گێڕا بە ڕەجم پێ کەرو لێ دەری ئەو شەیتانانەی کە بەرز ئەبنەوە بۆلای ئاسمان، ئەیانەوێ گوێ بگرن لە مەلائیکە بۆ ئەمەی هەواڵ و دەنگ و باسێکیان لێ وەرگرن بە نهێنی و دزی یەوە. واتە بەو ئەستێرانە لێیان ئەدەین و دووریان ئەخەینەوە بەم ڕەنگە پارچە ئاگرو چەخماخەیە لەو ئەستێرانە پەیدا ئەبێ و لێیان ئەدا. پێویستە لەسەرمان زیادە ڕەوی نەکەین و بە بێ ڕابەر و بەڵگەیە دەم نەکوتین لەم جۆرە شتانەی کە غەیبی و نادیار بن و بۆمان ڕوون نەکراونەتەوە. کەواتە ئەڵێین: بڕوامان هەیە چەند دروست کراوێکی خوا هەیە پێیان ئەووترێ: شەیاتین، هێندێ سیفەت و ناونیشانیان لە قورئاندا هەیە، و ئێمەیش زیاد لەوە ناڵێین، وە بڕوامان هەیە کە خوا لەم ئەستێرانەدا هۆی لێ دان و تاراندنی ئەمانەی فەراهەم هێناوە لە شێوەی ئاگر و چەخماخەیەکا. وەکو لە سورەتی(الصافات) دا ئەفەرموێ، ئیتر ئەوە چۆن پێك دێت؟ و قەبارەو شێوە و هۆی پێك هاتنی چۆنە؟ ئەمانە هیچیان خوا باسی نەفەرموون. ئەگەر پێویست بوایە باسی ئەوانە خوا باسی ئەکردن بۆمان.

کەواتە با ئێمەیش بێ دەنگ بین لە شتێ کە خوا باسی نەکردوەو ئەگەر باس کردنی باش بوایە ئەیکرد. بەڕاستی(قتادة) چاك ئەفەرموێ لێرەدا:(خوا ئەستێرەی دروست کرد بۆ سێ شت، یەکەم: هۆی جوان کردن و ڕازانەوەی ئاسمانن. دووەم هۆی لێ دان و ڕەجمی شەیتانەکانن. سێ یەم: چەند نیشانەیەکن ڕێگایان پێ دەر ئەکرێ بە شەو لە دەشت و دەریادا، ئینجا هەرکەس زیادە لەوە بڵێ ئەو کەسە دەم ئەکوتێ لە شتێ کە نایزانێ و بێ ئاگایە لێ ی، دەست درێژی و ستەم ئەکات).

وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا
سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۖ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ
﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾

---

ئینجا بە بۆنەی ڕەجم و لێدانی شەیتانەکانەوە باسی سزای ئاگریان ئەکات لە ڕۆژی دوایی دا. ئەفەرمویٚ: ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾ وە ئامادەمان کردووە بۆیان سزای ئاگرێکی هەڵگیرساو. ئینجا بە بۆنەی ئەوانەوە باسی سزای شوێن کەوتووەکانیشیان ئەکات. ئەفەرمویٚ: ﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ﴾ وە سزای دۆزەخ هەیە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە بە پەروەردگاریان. واتە ئەوانەی کە لەم جیهانەدا بە بێ بڕوایی بمرن. ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ وە دۆزەخ دوا ڕۆژ و شوێنی گەڕانەوەیەکی زۆر بەدو خراپە!

ئینجاشێوەیەکی ئێجگار سەخت و سامناك ئەکێشێ بۆ ئەو دۆزەخە، لە کاتێکا کە بە ڕق و خەشمێکی زۆر بەتینەوە دێت بە دەمی بێ بڕواکانەوە. ئەفەرمویٚ: ﴿إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا﴾ کاتیٚ کە بێ بڕواکان توڕ ئەدرێنە ناو دۆزەخ بە وێنەی کۆتەرە کە لە دوورەوە توڕ ئەدرێتە ناو ئاگری گەورە ﴿سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا﴾ پیشکەوپرمە و دەنگێکی زۆر ناخۆش و بێزراو ئەبیستن کە بۆ دۆزەخ هەیە بەهۆی خەشم و ڕقی دەربارەی بێ بڕواکان. یا وەکو(ئیبن و عەباس) ئەفەرمویٚ: دەنگیٚ ئەبیستن لە دۆزەخ وێنەی لوشکەو زەڕینی گویٚ درێژ و هێستر کە ئەیکەن بۆجۆ وئالیك. واتە دۆزەخ ئەکەوێتە جۆش و خرۆش بۆ خواردن و سوتاندنیان! لەسەر هەر بارو بەهەرجۆر بێ بڕواکان توڕئەدرێنەناودۆزەخ ﴿وَهِىَ تَفُورُ﴾ لە کاتێکا ئەکوڵیٚ پیٚ یانەوە بە وێنەی کوڵانی مەنجەڵ بەوەی کەوا لەناویا. ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ﴾ نزیکە پارچە پارچە ببیٚ لە خەشم و ڕقا!

دۆزەخ لێرەدا نیشان ئەدا بەشێکی زیندوو کە لە داخا پیش ئەخواتەوە و بە پیشکەو پرمەوە هەناسە ئەداو لەناو سکا ئەکوڵیٚ وەك مەنجەڵ، وە ناو سکی پڕە لە ڕق و کینە و ئەوەندە داخی لە دڵایە بۆ بێ بڕواکان خەریکە لەت لەت ببیٚ! ئەم شێوەیە بە دیمەن و بە ڕواڵەت وا دائەنریٚ و سەرنج ئەدریٚ کە مەبەست نیشاندانی ئەوپەڕی سزای سەختەکە دووچاری ئەو سیاچارانە ئەبیٚ , وەکو زۆر لە زانایانی تەفسیر ئەفەرموون: نەك بە شێوە

ڕاستەقینەکەی مەبەست بێت. بەڵام هیچ پێویست نی یە ئەم ئایەتە لە دیمەن و ڕواڵەتەکەی لابدەین، بەڵکو ئەڵێین: لەم بوونەوەرەدا ئەوی بە ڕواڵەت گیان لەبەر نی یە لەڕاستی دا زیندووە و گیانێکی تایبەتی خۆی هەیە و پەروەردگاری خۆی باش ئەناسێ و ئەیپەرستێ و بە زووبانی تایبەتی خۆی باس و سوپاسی ئەکات. هەموو دڵ گران و داخ لە دڵن لەسەر ئەو تاوان و بێ بڕوایی یەی کە ڕوو ئەدەن لە زۆربەی ئادەمی و جنۆکەوە. تا ئەو ڕادەیە لەوانەیە ئاسمانەکان پارە پارە ببن و زەوی شەق ببا لەداخا. وەکو کەسێ تاقانە خۆشەویستێکی ببێ و یەکێ تر دەم درێژی و دەست درێژی بۆ بکات، تەماشا ئەکەیت ئەو کەسە داخ ئەخوات و رقی لێ هەڵ ئەگرێ و خەریکە پەلاماریبداو بە ددان هەڵی دڕێ.

ئەوەی کە وتمان لەبارەی ئەم بوونەوەرەوە لە چەند ئایەتا دەست نیشانی بۆ ئەکات، وەکو لە چەند شوێنێ تر لەم تەفسیرەدا ئەم باسەمان بە درێژتر ڕوون کردوەتەوە. کەواتە با بڵێین: دۆزەخیش یەکێکە لەوانە کە گیانی تایبەتی خۆی هەیە و خوای خۆی خۆش ئەوێ و داخ لەدڵەبۆئەوانەی سەرکێشی ئەکەن لەخواتائەو ڕادەیەی کە قورئان خستیە بەر چاومان!!

ئینجاباسی سزادانی دەروونیشیان ئەکات لەلایەن مەلائیکەوکاربەدەستەکانی دۆزەخەوە کە بە تەشەرەوە پرسیاریان لێ ئەکەن. لەهەمان کاتدا دادی خوا دەرئەخات لە سزادانیان و سزادراوان. هیچ رەخنە و بیانوویەکیان بەدەستەوە نی یە و دان ئەنێن بە خراپی خۆیانا و شایستەیی یان بۆ ئەو سزایە ئەفەرموێ: ﴿كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٌ﴾ هەموو جارێ کە پۆلێ تورِ ئەدرێنە ناو دۆزەخ ﴿سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ﴾ خەزێنەدارەکان و کاربەدەستانی دۆزەخ پرسیاریان لێ ئەکەن ﴿أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ﴾ ئایا ترسێنەرتان بۆ نەهات، کە بتان ترسێنێ لەم سزایە؟ ئەوانیش بە زەبوونی و دڵ زاماری یەوە ﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن: ﴿بَلَىٰ﴾ بەڵێ ﴿قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ﴾ بەڕاستی ترسێنەرمان بۆ هات. ﴿فَكَذَّبۡنَا﴾ ئینجا ئێمە بڕوامان پێ نەهێنا و بە درۆزنمان دانان ﴿وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ﴾ وتمان خوا هیچ شتێکی نەناردۆتە خوارەوە. واتە(وحی) و پێغەمبەرێتی نی یە و ڕاست نییە خوا هیچ کەسی نەکردووە بە پێغەمبەر. وتمان بە ترسێنەرەکان ﴿إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ٱلدُّنۡيَا﴾ ئێوە هەر لە گومڕایی یەکی گەورەدان و دوورن لە ڕاستی و ڕێنمونی.

وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾

﴿وَقَالُواْ﴾ وه ئەڵێن ﴿لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ﴾ ئەگەر ئێمە بیسەر بوینایە، یا ژیر بوینایە ﴿مَا كُنَّا فِيٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ ئێمە لە تاقم و هاوەڵەکانی ئاگری هەڵگیرساوی بڵێسەدار نەئەبوین کە هەتا هەتایی و هەمیشەیی یە. واتە دۆزەخی نەئەبووین.

هەر بیستن و ژیری یە کەڵکی لێ وەرنەگیرێ نەبوونیان زۆر چاکترە و وەکو هەر نەبن وان. ئەگەر بیستن و ژیری یەکەی ئەوانە شت بوایە رۆژیان بەو رۆژە نەئەبوو، وە سەریان لە ئاگرێکی نەبڕاوە وە دەرنەئەچوو، ﴿فَٱعْتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمْ﴾ کەواتە دان ئەنێن بە گوناهی خۆیانا کە بێ بڕوایی و دەم درێژیی و بێ شەرمی یان بوو دەربارەی پێغەمبەرانی خوا - سەلامی خوایان لێ بێ - بەڵام ئەو دان نانە تازە بەوان چی؟ ئەوانە هیچ سودێکی لێ وەرناگرن چونکە کاتەکەی بەسەرچوو. بەهۆی ئەوە دوای دان نانەکەیان خوای گەورە نزای شەڕیان لێ ئەکات. کە نزا لە لایەن خواوە بڕیارە لەلایەن خواوە کە بە هیچ رەنگ چاوەڕوانی و ئومێدی رزگاریی نابێ و نامێنێ. ئەفەرموێ: ﴿فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ دووری لە بەزەیی خوا بۆ هاوەڵەکان و نیشتەجێ کانی ئەو ئاگرە هەڵگڕاوە. واتە خوا ئەوانە دوور ئەخاتەوە لە بەزەیی و میهرەبانی خۆی. ئای هاوار بۆ کەسێ کە خوا نزای شەڕی لێ بکات، بەڕاستی حەق وایە بەبیرکردنەوە لەشتی وا تیکەلەگەرودا بگیرێ. ئینجا با بیر بکەینەوە لەوەی کە هەمیشەیی بێت لەناوئەوئاگرەدا کەمەگەر تەنها خوا رادەی سەختی بزانێ. خوا پەنامان بدە لەوە، آمین.

خوا ستەم ناکا لە بەندەکانی، ئەمان خۆیان ستەمکارن لە خۆیان، خوا رابەر و نیشانەی بڕوای داناوە لە سروشتی بەندەکانیا، بێجە لەوەش ترسێنەر و پێغەمبەرانی بۆ ناردون بە نیشانە و بەڵگەی ئاشکراوە. ئەوەی کە خوا داوای ئەکات لە بەندەکانی هەموو رێك و راست و گونجاوە و هەموو ژیرێکی زیندوو وەری ئەگرێ، کەواتە هەر کەسێ پاش ئەوانە بڕوا نەهێنێ ئەو کەسە بۆش و پووچە لە هەموو خێرێ و هیچ جۆرە نرخێك نی یە بۆ بوونی و هیچ سوودێ نی یە لە بوونیا. ئەوانە خۆیان تاراند لەم بوونەوەرە و خۆیان جوێ کردەوە

لەناو ئەم بوونەوەرە گەورەیەدا و هاوبەشی هیچ کەس هیچ شتێکیان نەکرد لە پەرستن و گوێڕایەڵی پەروەردگارا، کەواتە با بکەون لەناو ئاگراو لەگەڵ بەردا دۆزەخیان پێ تاو بدرێ.

باوی قورئان وایە لەبارەی بارو بەسەرهاتی رۆژی دوایی یەوە دوو لاپەڕە نیشان ئەدا کە دژوبەرانبەری یەکترن. جابەپێی ئەوباوەئەوالاپەڕەی بڕواداران نیشان ئەدالەپاش نیشاندانی لاپەڕەی بێ بڕواکان لەو چەند ئایەتەی تێ پەڕیان کرد. بەم دوو لاپەڕەیە بەرهەمی تاقی کردنەوەکە تەواو ئەبێ کە لە پێشەوە فەرمووی، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە ئەترسن لە پەروەردگاریان. بەم رەنگە سام و بیم ئەکەن لە گەورەیی وده‌سەلاتی، یا سام و بیم ئەکەن لە تۆڵە و سزای سەختی، لە کاتێکا نە خوایان دیوەو نە سزاو تۆڵەکەی، لەکاتێکا لەپاش ملێ بن و هیچ مەردومێ بە دیارەوە نەبێ. ﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لەلایەن خواوە لێ خۆش بوونێکی گرنگ و گەورە لە گوناهیان و پاداشتێکی گەورە لەسەر چاکەیان. بێ گومان هەر دڵێ ئەو سام و ترسەی تیا جێگیر ببێ خۆی ئەپارێزێ لە گوناهو سەر ناکاتە تاوان. ئەگەر دووچاری گوناهێ ببێ دەست بەجێ ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا و رووئەکاتە خوا بە مل کەچی. کەواتە شایانە بەو پاداشتە گەورەیە.

هەر بەندەیە ئەو بیم و ترسەی بوو، دڵی پەیوەست ببێ بە خواوە لە ئاشکراو پەنهانیدا ئەو کەسە بڕوادارە بەڕاستی و بەری ئەو موژدە گەورەیە ئەکەوێ، ئیتر با هەموو کاتێ لەسەر یەك بار نەمێنێ. بەم رەنگە لە هێندێ کاتا رادەی ترس و بیمی لەخواو سۆزو پەرۆشی بۆ گوێڕایەڵی بەتین و بەهێزتر بێ وە ئەو بار گۆڕانە نابێتە هۆی لاوازی بڕوا و ناپاکی وەکو لە چەند حەدیسێکا ئەوە روون ئەبێتەوە.(حافظ ئەبوبەکر) حەدیسێ ئەهێنێ لە – ئەنەسی کوڕی مالك – ئەڵێ عەرزی پێغەمبەریان کرد(ﷺ) وتیان ئێمەلای تۆ لەسەر حاڵێکین، ئینجا کاتێ لەتۆجوێ بووینەوەلەسەر حاڵێ ترین. ئەویش فەرمووی: چۆنن لەگەڵ پەروەردگارتانا؟ ئەوانیش وتیان: لە ئاشکراو پەنهانیمانا تەنها خوا خوامانە ئەویش فەرمووی: دەی ئەو گۆڕانی حاڵەتانە ناپاکی نییە.

وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾
هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزْقِهِۦۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾

---

ئینجا ئاگاداری ئەکات لەسەر ئاگاداریی خوا بەسەر نهێنی یەکانا، کەواتە با بیٚ بڕواکان بترسن و کۆتایی بێنن. و لەخوا ترسەکان باشتر لەخوا ترس بن ئەفەرموێ: ﴿وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓ﴾ قسەو وتەتان نهێنی بکەن یان دەری بڕن و ئاشکرای بکەن. هەردوو یەکسانە بۆ خواو وەك یەك ئاگادارە پێیان. خوا ئاگادارە بە شتیٚ کە پۆشیدە و شاراوە ترە لەوە. چونکە ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوائەوپەڕی رادە ئاگایەبەخەتەرەوخەیاڵیٚ کەلەدڵایە و لەدڵ جویٚ نەبووەتەوە، چ جای قسەی نهێنی. خوا ئاگادارە بەو خەتەرە و خەیاڵانە. چونکە خوا دڵەکان و خەتەرە و خەیاڵەکانی دروست کردووە و دروستیان ئەکات، دەی ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ﴾ ئایاکەسیٚ کەشتی دروست کردبیٚ نازانیٚ وبیٚ ئاگایەلەوەی دروستی کردووە؟ ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ لەکاتێکا کە هەر ئەو زانا و خەبەردارە بە هەموو بچووك و وردیٚ و بە هەموو پۆشیدە و شاراوەیە. گرتوویەتی و ئەیەویٚ لە دەروونا جێگیری بکات. چونکە جێگیربوونی ئەوە تیٚ گەیشتنێکی رێك و پێك فەراهەم ئەهێنیٚ لە دڵ و دەروونا.

بێجگە لە وریایی و هەست و سام و ترس لە تێیانا پەیدا ئەبیٚ، کە ئەو سپاردەیەش کە خراوەتە سەرشانی بڕوادار بەستراوە بەو وریایی و هەست و بیم و ترسەوە. سپاردەی ئاقیدەو بڕوا، سپاردەی راستی و دادپەروەری، سپاردەی لیٚ بڕان تەنها بۆ خوا لە کردەوەو نیازا. کاتیٚ کە بڕوا بەو ئاگاداریی خوا لە دڵا جێگیر بوو وە دڵ رەنگی گرت پێی ئەو کاتە بڕوادار ئەترسیٚ و خۆی ئەپارێزیٚ لە نیازو نیەتیٚ کە شاراوەیە، و لە خەیاڵ و خەتەرەیە کە دێت بەدڵاو گوزەر ئەکات، هەرچۆن ئەترسیٚ و خۆپارێزی ئەکات لە وتارو کردەوەی ئاشکرا.

چونکە ئەزانیٚ کارو فەرمانەکەی لەگەڵ خوایەکە کە نهێنی و ئاشکرا وەك یەك ئەزانیٚ، لەگەڵ خوایەکە کە دڵ و دەروون و ئەوەی وا لە دڵ و دەروون و گوزەر ئەکات پێیانا ئەو خوا دروستی کردوون. ئینجا بەندەکانی خوا ئەگوێزێتەوە لەباسی شتە تایبەتی یەکانی دەروونیانەوە کە دروستی کردوون بۆیان، بۆ باسی ئەو زەوی یەی کە دروستی کردووە بۆیان، ژێرباری کردووە و هۆی ژیانیانی تیا داناوە. ئەم باسە لە بارێکەوە سەرنج راکێشانە

بۆ ئەو بەرهەمە گرنگەی دەسەڵات و توانینی خوا کە بەهۆی دەق پێوە گرتنەوە لەپێش چاو کۆن بوون و بیریان لێ ناکرێتەوە. لەبارێ ترەوە سەرنج راکێشانە بۆ ئەو چاکە و بەهرە گەورەیە کە لەبەر زۆری و فراوانی و ئاسانی نرخ و گرنگی یەکەی لەیاد و هۆش چووە.

ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا﴾ خوا کەسێکە کە زەوی گێرا بۆ ئێوە زۆر بەمل کەچ و ژێربار بەبێ ملەجەڕە و سەرکێشی و تاسە و لەنگەرە، بەڵکو بە سووك و ئاسان بۆ گەڕان و دانیشتن و هەڵسان، و بۆ کشت و کاڵ و هەموو هۆی مانەوەو ژیان.

مەردوم بەهۆی مانەوەی بەدرێژی ژیان بەسەر ئەم زەوی یەوە و دامەزران و جێگیر بوونی بە ئاسانی بەسەریەوە، پیاگەڕانی و داگیرکردن و دەست بەسەرا گرتنی خاك و ئاو و هەوا وخێر و بێری و رۆژی هەموو هێزو وزەکانی. بەهۆی ئەوە لەبیری چووە ئەو بەهرە و میهرەبانی و چاکەی خوا لەم مل کەچ کردن و ژێر بارکردنی زەوی یەدا.

جا ئەوا قورئان ئەو چاکە و بەهرە گرنگەیان بیر ئەخاتەوە، چاویان ئەکاتەوە لە حاستی، بەشێوەیە کە هەموو کەس و هەموو تاقم و چینێ بەشێ لەو چاکە و بەهرەیە هەست پێ ئەکات بە پێی ئاگادار بوون و ئاشنابوونی بەم زەوی یە ژێر بار کراوە. ژێر بار بوونی ئەم زەوی یە لە دەرونی پێشووەکانا لەم رووەوە بوو کە بە پیادە و بە سواری وولاّخ پیا ئەگەرێن بەئاسانی لەوشکیدا، وەبەسواری کەشتی لەدەریاکاناوهۆی ژیان وگوزەرانی لێ پێك ئەهێنن.

ئەوانە چەن شتێکن بە کورتی و بەشێکن لە مەبەست بەم ئایەتە کە لەبەرەوە لەرێگای زانین و زانیاری یەوە رێگایان پێ ئەبرێ و دەرئەکەون کە تابێت مەبەستەکەیان پان و پۆڕ و فراوانتر ئەکەن. هێندێ لەوانەی کە وتراوە لەو بارەیەوە ئەمەیە: لە زمانی عەرەبا ﴿ذلول﴾ بە ئوولاغێکی سواری ئەوترێ کەخۆش رەو بێت و تاسە و لەخشە نەکات بە سوارەکەی کەواتە بە تایبەتی ئەم ناوە هەڵبژێرراوە بۆ ئەم زەوی یە! چونکە ئەم زەوی یەی کە بە وەستاو و دامەزراو ئەبینرێ، لەڕاستی دا ژێر بارێکە ناوەستێ و هەمیشە لە گەڕان و خولانەوە دایە، بەڵکو بە ئەسپانی غار ئەکات!! لەهەمان کاتا لە خشەو جوڵە ناکات بەوانەی وان بەسەر پشتی یەوە، بەجۆرێ هیچ کەس هەست ناکات بە گەڕان و خولانەوەکەی! ئینجا هەر چۆنێ مل کەچ و ژێر بارە لەو بارەیەوە، هەروەهاشیر دەریشە، ئەو هەموو خۆراك و خێرو بێرە ئەدا بە سوارەکانی.

ئەم ئوولاّغەسواری یەی کەئێمەواین بەسەر پشتی یەوە – بە پێی زانیاری – ئەخولێتەوە بەدەوری خۆیابەخێرایی هەزار میل لە سەعاتێکا ئینجا لەگەڵ ئەوەدا ئەخولێتەوە و چەرخە

ئەکات بە دەوری خۆردابە خێرایی نزیکەی(٦٥) هەزار میل لە سەعاتێکدا. ئینجا بە خۆی و خۆرو کۆمەڵەی خۆری دا غار ئەکەن بەرەو(برج الجبار) بەخێرایی(٢٠) هەزار میل لە سەعاتێکدا. لەگەڵ ئەو هەموو خولانەوە و غار کردنەدا ئێمە ئەمێنینەوە بەسەری یەوە بە ئارام و ئاسایش و بەبێ لەرزە و لەخشە و بەبێ گێژ بوون و سەر ئێشە!

ئەم سێ گەڕان و خولانەوە مەبەست و بەرژەوەندی گرنگی تێدایە. بەرو بەرهەمی دوانیانمان ناسیوە بۆ ژیانی ئەم ئادەمی یە، بەڵکو بۆ هەموو ژیان. ئەوەتا خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیا شەو و رۆژی لێ پێك دێت. کە بەبێ ئەو دوانە ژیان ناگونجێ. گەڕان و خولانەوەی بە دەوری خۆرا چوار وەرزەی لێ پێك دێت، کە بەبێ بوونی ئەو چوارە ژیان بەم رێك و پێکی یە بەسەر نەئەبرا. گەڕان و خولانەوەی سێ یەم هێشتا مەبەست و بەرژەوەندی یەکەی دەرنەکەوتووە. بەڵام بێ گومان ئەویش پێویستە وەکو ئەم دوانەکەی تر.

ئەم ئوولاغە سواری یە کە بەو جۆرە مل کەچ و ژێربارە هەڵ ئەسێ بەم سێ گەڕان و خولانەوە زۆر گرنگە، لەگەڵ ئەوەدا بە ئارام و دامەزراو و لەسەر باری خۆی بە بێ دژایەتی و تێك چوونێ کە پەیدا ببێ لە ناوەندی ئەمانە و بەرهەمەکانیانا! خوای گەورە زەوی گێڕا بە مل کەچ و ژێر بار بۆ ئادەمی بەم رەنگە هێزێکی راکێشەری پێ دا کە ئادەمی پێ ببەستێتەوە بە خۆیەوە لەکاتی ئەم سێ گەردش و خولانەوە گەورەیەدا، هەرچۆنێ زەخت و زۆرێکی لای سەرووی بۆ فەراهەم هێناوە لە رادەیەکا کە گەڕان و جوڵان بەسەریەوە ئەکرێ بە سوك و ئاسانی. ئەگەر ئەو زەخت و زۆرە بەهێزتر و قورس تر بوایە لەم رادەی ئێستەیە ئەو حەلە گەڕان و گواستنەوە نەئەگونجا یا زۆر سەخت و نارەحەت ئەبوو – بە پێی ی رادەی قورسی ئەو زەخت و زۆرە –، چونکە ئەو حەلە یان ئەیکوتا و پان و پڵیشی ئەکردەوە بە زەویدا یا بەربەستی ئەکرد و رای ئەوەستان. ئەگەر رادەی ئەو زەخت و زۆرە سووك تر بوایە لەرادەی ئێستە ئەو حەلە هەنگاوەکانی تێك ئەچوون و ئەشێوان یا بۆشایی یەکانی ناو لەشی ئەتەقینەوە بەهۆی زیادبوون و بەرزبوونەوەی زەختی خۆی بەسەر زەختی هەوا بە چوار دەوریدا، وەکو ئەوە روو ئەدا بەسەر ئەوانەی کە بەرز ئەبنەوە بۆ تەبەقە هەرە بەرزەکانی لای سەرو بەبێ چارەسەر کردنی زەخت و زۆری هەوا! خوای گەورە زەوی ژێربارو مل کەچ کرد بۆ ئادەمی بە راخستنی لەژێریا و بە پێك هێنانی ئەم خۆڵە نەرمە بەسەر زەوی یەوە. ئەگەر بەردێکی سەختی رەق بوایە هیچی لێ نە ئەڕوا و ژیان نەئەگونجا.

بەڵام خوا ئەم خۆڵە نەرم و ناسکەی فەراهەم هێنا کە رێگە بۆ ژیان و رواندنی ئەو هەموو

ڕۆزی و خۆراکەی کە ئادەمی و گیان لەبەرانی تر لەم زەوی یە ئەیدۆشن! خوای گەورە ئەم زەوی یەی مل کەچ و ژێربار کرد بەم رەنگە ئەو هەوای کە چوار دەوری داوە پێکی هێنا لە چەند کەرەسەیە کە ژیان پێویستە پێیان، هەر کام لەو کەرەسەیانە لە رادەیەکی تایبەتی دان ئەگەر لەوە لادرێ ژیان نابێ لەم زەوی یەدا. ئەگەر ببێ بڕ ناکا و نامێنێتەوە.

بۆ وێنە رادەی ئۆکسجین نزیکی ٢١٪ و رادەی ئازۆت یان نیترۆجین نزیکی ٧٨٪ و ئەوی تری لە دووەم ئۆکسیدی کەربۆن لەرادەی(٣) بەش لە دە هەزار بەش و لە چەند کەرەسەیەکی ترە. ئەم رادەیانە هەموو پێویستن بۆ ژیان بەسەر ئەم زەوی یەوە! خوای گەورە زەوی مل کەچ و ژێر بار کرد بە هەزارەها شتی تری رێك و گونجاو لەگەڵ ژیانا کە بەبێ ئەوانە ژیان بەدی نایە و دەست نادا. یەکێ لەوانە ئەم قەبارە تایبەتی یەیە کە دایناوە بۆ زەوی و بۆ خۆرو مانگ، و دووری زەوی لە مانگ و رۆژەوە. رادەو بڕی گەرمی خۆر و ساردی و فێنکی مانگ و قلەختی چەرم و پێستی زەوی. رادەی چەسپانی گەردش و پێستی زەوی. رادەی دابەش کردنی ئاو و وشکی تیایا. قلەختی هەوا کە چوار دەوری داوە... هتد... هتد، بوون و کۆبوونەوەی هەموو ئەوانە زەوی گێڕاوە بە گونجاو و شیاو لەگەڵ ژیانا بە شێوەی گشتی، وە لەگەڵ ژیانی ئادەمیدا بە تایبەتی.

ئایەتەکە دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو هەموو شتە گرنگانە تا هەموو کەسێ و هەموو چین و تاقمێ تێ بگات و وەریان گرێ بە ئەندازێ کە لە تەوانا و زانینا هەیە، بۆ ئەمەی هەست بکات بەو دەستە قودرەتەی کە ئەو هەموو کاروبارەی فەراهەم هێنا لەم زەوی یەدا و پارێزگاری ئەکات و چاوەدێری ئەکات. ئەگەر چرکەیەك واز بێنێ و دەست بکێشێتەوە ئەم بوونەوەرە گەورەیە نامێنێ بەخۆی و ئەوەی وا تیایا.

خوای گەورە زەوی بەو جۆرە ژێربار و گونجاو کرد لەگەڵ ژیانا ئینجا رێگای بەرەڵلا کرد بۆ بەندەکانی ئەفەرموێ: ﴿فَٱمۡشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا﴾ کەواتە برۆن بگەڕێن بە شاخ و بەرزایی یەکانیا.یا بە تەنیشت و ناوچەکانیا. واتە هیچ بەش و شوێنێکی یاخی و قەدەغە نی یە لێتان. کەواتە بگەڕێن و کوزەر بکەن بە هەموو لایەکیا بۆ بازرگانی و دەست خستنی خێرو بێری، ﴿وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ﴾ وە بخۆن لە رۆزی خوا. بێ گومان ئەو رۆزی یەی کەوا لە زەویدا هەمووی دروست کراوی خوایە و هینی خوایە. مەبەست بەم رۆزی یە تەنها خواردەمەنی و ئەو ماڵ و شت و مەکە نی یە کە لە دەستی هەر کەسایە و پێویستی خۆی پێ دەرئەکات. بەڵکو مەبەست هەموو ئەو شتانەیە کە خوا لەم زەوی یەدا فەراهەمی هێناون.

که خۆراك و هۆی پێك هاتنی خۆراك و هەموو هۆی ژیان ئەگرێتەوە، بەڵكو هەموو ئەو كەرەسانەی كە زەوی لێ فەراهەم هاتووە، ئەو هێزو تەواناى كە دراوە بە گیان لەبەرو ئادەمی و هەموو گیا و درەخت و رواویێ بۆ سود وەرگرتن لە كەرەسەكانی زەوی.

ئەمانەش هەموو ئەگرێتەوە، كەواتە مەبەست بە خواردنی رۆزی خوا سوود وەرگرتنە نەك تەنها خواردن. بەلاّم بە خواردن ناوی برد چونكە خواردن گرنگ ترین سوود وەرگرتنە.

بەجوانی ئەزانم بە كورتی هێندێ بدوێم لەبارەی ئەم رۆزی خوا وە بەم جۆرە و شێوە گشتی یەی كە وتمان لێرەدا مەبەستە. بەپێی ئەوەی دەركەوتوون لەزانیاری تازەدا وەكو لە كتێبی(العلم يدعوا للايمان) یش دا ئەڵێ: ژیانی هەموو كشت وكاڵ و رواویێ لەسەر چەند ئەندازێكە لە(دووەم ئۆكسیدی كاربۆن) كە لە هەوادا هەیە و ئەوان هەڵی ئەمژن لە رێگای گەلاّكانیانەوە كە لە جێگای سی گیان لەبەرانن، بەهۆی رووناكی خۆرەوە ئەتوانن(دووەم ئۆكسیدی كاربۆن) كە لە دووبەش پێك دێت بەشەكانی جوێ بكەنەوە، بەم رەنگە ئۆكسجینەكەی فڕێ دەن و وەری نەگرن، و كاربۆنەكەی راگیركەن كە یەك ئەگرن لەگەڵ هێدرۆجینی ئاودا كە وەری ئەگرن بەهۆی رەگ و ریشەیانەوە.

ئەم دوو كەرەسەیە ئەبن بە خۆراك بۆیان و بەوە ئەژین، بەهۆی ئەم دوانە و چەند كەرەسەیەترمیوەو گوڵ و خۆراك پەیدا ئەبێ بۆ گیان لەبەران. لەهەمان كاتدائۆكسجین تورئەدا تا ئێمە هەڵی مژین كە بەبێ ئۆكسجین ژیانی ئێمە بڕ ناكات زیاد لە پێنج دەقیقە.

بە كورتی گیان لەبەران دووەم ئۆكسیدی كاربۆن تور ئەدەن، كە هۆی ژیانی درەخت و رواوەكانە، ئەمانیش ئۆكسجین وەرناگرن و توڕی ئەدەن، كە هۆی ژیانی گیان لەبەرانە!!

هەروەها پێویستی هەیە بە(هێدرۆجین) كە كەرەسەیە كە لە كەرەسەكانی ئاو، كە ئاو بەشێكی زۆر و فراوانە لە هەموو گیان لەبەرو كشت و كاڵ و رواوێكدا. پێویستی هەیە بە(نایترۆجین) (ئازوت) و چەندكەرەسەیەتر. ئەمانە هەموو هەن و پێویستن بێجگە لەو هەموو رۆزی و هۆی ژیانە كە داشاراون لەناو سكی زەویدا. بە كورتی رۆزی تەنها ئەوە نەبوو كە خەڵكی بەو شێوە سادەیی یە وەریان ئەگرت و وەری ئەگرن بەهەرحاڵ كاتێ ئەم رۆزی یە دیاریی كراوەوماوەكەی ئەم كاتی تاقی كردنەوەیەوئیتربەخۆی و ئەم جیهانەوە ئەپێچرێنەوە و لائەبرێن: ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ﴾ وە هەر بۆلای خوایە گەڕانەوە لەپاش زیندوو كردنەوە.

ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ

**کەواتە ئەبێ مەردوم ئاگای لەخۆی بێ و بیری ئەو ڕۆژی گەڕانەوەی بەلاوە بێت، لەم ڕۆژەدا هەڵسێ بە سوپاسی ئەو هەموو چاکە و بەهرە و میهرەبانی یە کە خوای گەورە ڕشتویەتی بەسەریا.**

**ئینجا لەم کاتەدا کەوان بەسەر پشتی ئەم زەوی یە مل کەچە ژێر بارەوە بە ئارام و ئاسایش و خۆشی. لەم کاتەدا سەرنج ڕائەکێشێ و شێوەی رووخان و بوومەلەرزەی ئەم زەوی یە ئەخاتە بەرچاو، هەروەها شێوەی بێ ئارامی لەلای سەرو بەرد بارانی بە سەریانا، بۆ ئەمەی بێدار ببنەوە لەو بێ ئاگایی یە کە داگیری کردوون بەهۆی ئەو ئارامی و بێ باکی یە کە تیایا ئەژین.**

**بێدار ببنەوە و دڵ و دەروونیان ببەستنەوە بە کار و بڕیاری خواوە ئەفەرموێ:** ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ﴾**؟ ئایا ئێوە بێ باك بوون و ناترسن لەکەسێ کە لە ئاسمانە، لەمەی بتانبات بە ناخی زەوی دا و ونتان بکات لەناویا بە وێنەی قاروون.** ﴿فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ **ئینجا دەست بەجێ لەو کاتەدا ئەو زەوی یە - بە ئارامە دامەزراوە - دێت بە یەکا و هات و چۆ ئەکات و ئەکەوێتە جومبوش و بوومەلەرزە. واتە بێ باکیتان ناراست و ناڕەوایە چونکە هۆی ئەو سزایە هەیە پێتانەوە.**

**ئینجا واز ئەهێنێ لەو هەڕەشەیە و ئەگوێزێتەوە بۆ هەڕەشەیەتر بە سزایە زۆرەوە لەلای سەرەوە. ئەفەرموێ:** ﴿أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا﴾ **ئەی ئایا باکتان نەبووە و ناترسن لە کەسێ کە لە ئاسمانە لەمەی ڕەوانە بکاتە سەرتان بایەکی بە تەووژم و ببارێنێ بەسەرتانا ڕیز و بەردە ووردە.**

به وێنەی گەلەکەی لوط پێغەمبەر – دروودی خوای لەسەربێ– ﴿فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ﴾ ئینجا ئەو کاتە ئەزانن چۆنە ترساندنی من بۆتان بەڵام ئەو زانین و تێ گەیشتنە تازە هیچ سوودی نابێ. چونکە کار لەکار ئەترازێ و هیچ ناکرێ. بێ گومان خوا شوێن و جێگای نی یە، نە لە زەوی و نە لە ئاسمان نیشتەجێ نییە.

بەڵکو پاش دروست کردنی ئاسمان و زەوی، وەك پێش دروست کردنیان وایە بەبێ جیاوازی و گۆڕان، ئیتر هەر کەس تێ ئەگات لەو بێ شوێنی یە چاکە و هەر کەس تێ ناگات بابڕوای وابێ ونەکەوێتەشوێن خەیاڵی ناتەواوی خۆی، و بزانێ خوا بێ وێنە و بێ سنوورە.

کەواتە چاوی ژیری ئێمە نابینایە لە حاستی چۆنێتی ئەو جۆرە شتانە. بە هەزارەها شت هەیە لە خۆمان و بە دەورمانا کە ئەزانین هەیە و هیچ تێیش ناگەین لێیان و لە چۆنێتی یان کەواتە ئەبێ چۆن بە تەما بین تێ بگەین لە خواو لە سیفەتە بێ وێنەکانی.

ئەمەی کە وترا بڕوا و بڕیاری هەموو زانایانی ئیسلامی لەسەرە ئینجا کەواتە لێرەدا ئەم پرسیارە ئەکرێ: ئایا مەبەست بەو کەسەی کە لە ئاسمانە کێ یە کە لەم دوو ئایەتەدا ئەفەرموێ؟ ئەگەر مەبەست بەو کەسە خوایە چۆن ئەوەی بۆ بەکار ئەهێنرێ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەمەیە: هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست بەو کەسە ئەو مەلائیکەتانەن کە فەرمان بەرو کار بەدەستن بۆ ئەو جۆرە کارانە کەواتە رێگای هیچ قسە و باسێ نی یە لەسەر ئەم رایە... وە زۆربە لەسەر ئەوەن کە مەبەست خوایە و ئەم ئایەتە لەم بارەیەوە لەو ئایەتانەن کەپێیان ئەوترێ(متشابە) واتە مانا و مەبەست پێ یان روون نییە. لەو ئایەتانەیشا دوو را هەیە، وەك لە چەند شوێنێ تردا باسمان کردووە:

١- رای کۆمەڵی پێشووسەرەتای ئوممەت(ئەصحابە)وتابیعین کە ناو ئەبرێن بە – سلف –.

٢- رای تاقمی دوایی پاش ئەوان کە پێ یان ئەگوترێ – خلف –.

ئـەم دوو كۆمەڵـە يـەك راو يـەك قـسەن لەمـەدا: كـە ئـەو ئايەتانـە سـەرجەم ديمـەن و رواڵەتەكەيان مەبەست نين و دروست نى يە بە پێى ئەو ديمەن و رواڵەتە تەفسير بكرێنەوە. ئينجا دوو بەرەكين، ئايا تـەنها خوا مەبەستەكەيان ئەزانىٚ و بەس، يان بێجە لە خوا چەند بەندەيە لە زانا دامەزراوەكانيش ئەو مەبەستانە ئەزانن؟

تاقمى يەكەم ئەفەرمون: تەنها خوا ئەيانزانىٚ و ئێمە ئەڵێين: بڕوامان پێيان هەيە لەسەر ئەو بارو شێوەيە كە خوا مەبەستى يەتى و ئێمە هيچ مانا و مەبەستێكيان بۆ ديارى ناكەين. بىٚ گومان ئەم بارە زۆر چاكە و هيچ جێگاى مەترسى نييە.

تاقمى دووەم ماناومەبەستيان بۆديارى ئەكەن. وەكوباس كراوە و نوسراون لەكتێبەكانا.

ئەم رايە هەرچەند جێگاى مەترسى هەڵە كردنى تيايە، بەڵام دەست و دەمى دوژمن ئەبەستىٚ و رێگاى دەمبازى نامێنىٚ. جا لێرەدا لەسەر راى يەكەم ئەڵێين: خوا لە ئاسمانە بەو جۆرە و شێوە پاك و خاوێنەى كە خوا نيازى كردووە و گونجاو و شياوە لەگەڵ زاتى پاكيا، نەك بەم شێوەى كە ناسراوە لاى ئێمە و شايستە نى يە بۆ خوا. لەسەر راى دووەم ئەڵێين: مەبەست كەسێكە كە فەرمان و بڕيارى لە ئاسمانەوە دەرئەچێت يا پادشايەتى و دەسەڵاتى لە ئاسمانا ئاشكرايە. لەسەر هەركام لەم دوو رايە خواى گەورە ئەوانە ئەترسێنىٚ بەم دوو سزا سەختە كە زۆرجار نموونە و وێنـەيان ئـەبينرىٚ لـە جيهانـا، ئـەوەتا چـەند جار(بوومەلەرزە) يا(بوركان) روونەدا لە وڵاتێكا و لەماوەى چەند چركەيەكا ئەو وڵاتە وێران ئەبىٚ و دانيشتوانى ئەبن بە ژێر خشت و داروبەردى خانووەكانەوە، هەركەس بە پەلەفرتىٚ و رووت و قووتى دەرچىٚ ئەوە خاوەن بەختە و ئاوات لىٚ خوازراوە.

هەروەها ئەبينرىٚ و ئەبيسرىٚ لە چەند شوێن ئەو جۆرە با بە تەووژمانە هەڵئەكەن و بە تۆز و زەيخەوە ئەدەن بەسەر هەر شوێنێكا كاولى ئەكەن و دارى بەسەر بەردى يەوە ناهێڵن بەوێنەى بوومەلەرزە و بوركانەكان. قورئان ئامۆژگارى ئەكات و ئادەمى ئەترسێنىٚ بەو جۆرە بەسەرهات و سزا سەختانە بۆ ئەمەى خوايان لەبير نەچىٚ و هەڵنەخەڵەتێن بەو خۆشى و كامەرانى و ئارامەى كە خوا بە ميهرەبانى خۆى پێيان ئەدا.

ئەوەتا ئەو زەوی یە بە ئارامە کە بە هەموو کەشخە و خۆشی یەکەوە رائەبوێرن بەسەریەوە کاتێ بەزەیی و میهرەبانی یەکەی لابرد و خەشمی خستەکار جڵەوی ئەو زەوی یە بەرەڵلا ئەکات و ئەوەیان بەسەر ئەهێنێ کە بەسەریان ئەهێنێ. یا ئەو هەوا خۆشە کە هەڵی ئەمژن و ژیانیان لەسەریەتی، کاتێ خەشمی کەوتە کار ئەیکا بەو با سەختە وێران کەرە! ئینجا دەست نیشانیان بۆ ئەکات و سەرنجیان رائەکێشێ بۆ ئەو جۆرە سزای سەخت و بەسەرهاتە وێران کەرانەی کە روویان دا لەناو ئەو گەلانەی رابردوو کە بڕوایان نەهێنا.

ئەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ بێگومان ئەوانەی کە لە پێش ئەمانەوە بوون بڕوایان نەهێناو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆزن دانا ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ دەی ئایا چۆن بوو دژایەتی من بۆیان و کردەوەی سەختم بەرانبەریان؟ واتەئەم بێ بڕوایانە ئەزانن چیم بەسەر ئەو تاقمە پێشوانە هێنا، چونکەبەسەرهاتی سەختی ئەوانەبەناوبانگ بوولە ناویانا و بەدەما و دەم ئەگێڕرایەوە، شوێنەوار و نیشانەی وێران کردنی وڵاتەکانیان ئەبینی کاتێ گوزەریان ئەکرد بەلایاندا.

کەواتە با ئەمان تەمێ خواربن لەوانەوە و خۆیان بپارێزن لەوەی بەسەر ئەوان هات. ئەو بێ باکی و نەترسی یەی کە قورئان بێزاری دەرئەبڕێ لێی، بێ باکی و نەترسی یەکە کە بەهۆی بێ ئاگایی بێت لەخوا و لە دەسەڵات و بڕیاری خوا، نەك بێ باکی یە کە بریتی یە لە خۆدانە دەست خواو ئارامی دڵ بە چاودێری و بەزەیی خوا و بڕیاری خوا.

ئەمە جیاوازە لەوەی تر، بڕواداری راستەقینە ئەم بێ باکی و ئارامەی هەیە و لەهەمان کاتا بێ هۆش و بێ ئاگا نییەلەخواو لە خەشم و سزای خوا. بەڵکو هەمیشە وریا و ئاگادارە شەرم ئەکات لەخوا، و خۆی ئەپارێزێ لە خەشمی خوا، مەترسی هەیە لە بڕیارو قەزا و قەدەری سەختی خوا.

ئیمامی(احمد) حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران عایشەوە – خوا لێی رازی بێت – کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ هەورێ یا بایەکی بدیتایە رەنگی تێك ئەچوو. ئەفەرموێ: منیش عەرزم ئەکرد ئەی پێغەمبەری خوا مەردوم کە هەور ئەبینن کەیف خۆش ئەبن بە ئومێدی ئەوە بارانی تیا بێ، وە تۆ ئەبینم کاتێ هەور ئەبینی رەنگت تێك ئەچێ. ئەویش فەرموون: ئەی عایشە ئایا چۆن نەترسم لەوەی سزایەکی تێدا بێ؟ گەلێ لە گەلان بە با سزا دراون وسزای خوایان بینی لە شێوەی هەوردا و وتیان: ئەمە هەورێکە بارانمان بۆ ئەبارێنێ.

ئا ئەمەیە ئەو وریایی و هەستە هەمیشەیی یە بەخواو بە بڕیار و قەزاو قەدەری خواو ئەمە دژو پێچەوانەی ئەو بێ باکی و ئارامە نی یە کە بڕوادار هەیەتی بەخواو بە رەحم و بەزەیی خوا و چاوەڕوانی و ئومێدی بە چاکە و میهرەبانی خوا. پێویستە لەسەر بڕوادار ئەم هەموو هۆ و ئەسبابە روالەتی یانە بگێڕێتەوە بۆ لای خوا. گێڕانەوەی هەموو کارێ بۆلای کەسێ کە پادشایەتی گشتی لە دەستیایەتی و توانایە بەسەر هەموو شتێك دا، چونکە ئاشکرایە کە رووخان و رۆچوونە خوارەوەی زەوی و بای سەخت و بە تەووژم و بوومەلەرزە و بورکان و هەموو هێزە بوونەوەری یەکانی تر، هیچ کام لە دەستی ئادەمی دا نین و ئادەمی هیچی بە دەست نی یە لەبارەیانەوە. بەڵکو هەموو کارو باریان بە دەست خوایە.

هەرچی ئادەمی وتوویە و ئەیڵێ لەبارەی ئەوانەوە هەمو گوترە کاری یە و ئەیانەوێ هۆی رووداینان دەربڕن و روونی بکەنەوە، ئیتر زیاد لەوە هیچ دەسەلاتێکیان نی یە لە رووداینان یان بەرگری کردنیان، و ناتوانن خۆیانی لێ رزگار و قوتار بکەن. کەواتە چاك وایە بۆ هەموو شتێ هەر روو لە خوا بکەن کە پادشایەتی گشتی لە دەستی ئەوایە و توانایە بەسەر هەموو شتێکدا.بێ گومان ئادەمی هێزدارە بەو ئەندازە هێزە کە خوا پێی داوە.

زانایە بەو ئەندازە زانینەی کە خوا پێ‌ی بەخشیوە. بەلام ئەم بوونەوەرە گرنگە جڵەوەکەی لەدەست پەروەردگارێتی، و هەموو هێز و ووزەی دەست کردی ئەوە. ئەو هەموو هێزە کار ئەکەن و ئەگەڕێن بە پێی یاسا و رژێمێ کە پەروەردگار بۆی داناون، و لە سنووری بڕیاری ئەوان. هەر ئەندازە لەوانە دەست کەوتی ئادەمیی ببێ. یا دووچاری هەرچی ببێ لێیانەوە هەموو بڕیار دراو و دیاری کراون لای خوا. ئەو ئەندازەی کە ئادەمی ئاشنا و زانایە پێیان هەر دیاری کراوە و بڕیار دراوە. ئەو بەسەرهات و رووداوانەی کە پەیدا ئەبن ئادەمی ئەوەستێنن لەبەردەم خۆیانا بە سەرگەردانی و دەستە پاچەیی، بەجۆرێ هیچی بۆ نامێنێتەوە بێجگە لە بیر کردنەوە لە پەروەردگاری ئەو هێزانە و جڵەو راکێشیان، بێجگە لە چاوەڕوانی و کۆمەکی و یارمەتی خوا بۆ بەرەنگاری و بە پیرەوە چوونیان. بۆ ژێر بار کردنی ئەوەی ژێر بار کراوە بۆی هەر حەلێ ئادەمی ئەو شتە راستەی لەبیر نەبوو وە بێ ئاگا بوو لێی، و هەڵخەڵەتا و لەخۆی گۆڕا بەهۆی ئەو بەشە زانین و توانینەی کە خوا پێ‌ی داوە بۆ ژێر بار کردن و بەکار هێنانی هێزێ لە هێزەکانی بوونەوەر، بێ گومان ئەو ئادەمی یە ئەو حەلە ئەبێ بە گیان لەبەرێکی هەڵگەڕاوە و شۆڕاوە لە ئادەمێتی و پچڕاو لە زانینی راستەقینە کە رۆحی بەرز ئەکاتەوە بۆ سەرچاوە بەرزەکەی، و سەرشۆڕ ئەکاتەوە بەرەو

زەوی بە دووری لە ڕۆح و گیانی بەرزی بوونەوەر! لەکاتێکدا زانای بڕوادار لەم مەهرەجانە شیرینەی بوونەوەرەدا سوژدە ئەبا و پەیوەندی ئەکات لەگەڵ پەروەردگاری بوون و بوونەوەرا. ئەوەش خۆشی و شادمانی یەکە هیچ کەس شیرینی یەکەی نەچەشتووە و رادەی خۆشی یەکەی نازانێ مەگەر ئەوانەی کە خوا بۆی نووسیون!

بێجگە لەوەش زۆر جار هێزە گرنگەکانی بوونەوەر مەردوم ناچار ئەکات و ئەبێ دان بنێ بە دەستە پاچەیی و پەك کەوتویی خۆی، یا ئەو تامە شیرینەیشی نەچەشتبێ، بۆی روون ئەبێتەوە کە هەر کەس بڵێ: ئەم ئادەمی یە خۆی بەخۆی راگیر و راوەستاوە، یا بڵێ: ئادەمیی ئاغای ئەم بوونەوەرەیە و کاربەدەستێتی. ئەو کەسە کوێرە و چاوی دڵی سمەسای لێ براوە و بێ بەشە لە ژیری. بە باشی تێ ئەگات کە ئەم ئادەمی یە لەم زەوی یەدا دانراوە بە ئیزن و بڕیارو فەرمانی خوا. هێزو توانین و زانینی پێ دراوە، ئەو ئەندازەی کە خوا ویستبێتی. وە خوا راگیر کەرو پارێزەریەتی، رۆزی دەر و بەخشندەیەتی. ئەگەر چرکەیەك دەستی خوای پێوە نەبێ لەناو ئەچێ و نەبوون کالآی بالآیەتی.

لەپاش ئەو هەڕەشە و ترساندنە، ئینجا سەرنجیان رائەکێشێ بۆ بیرکردنەوەو وورد بوونەوە. لە شت و شێوەیەکا کە بە زۆری ئەیبینین، و بیری لێ ناکەینەوە کەم جاریش نەبێ، ئەو شت و شێوەش ئاوێنەیەکی بێ گەردە بۆ بینینی دەستی قودرەتی خوا، بەرهەمێکی ئاشکرایە لە بەرهەمی تەگبیرە نایابە سەر سوڕهێنەرەکانی خوا ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ﴾ ئایائەوانەسەرنجیان نەداوە و چاویان هەڵ نەخستووە بۆلای پەلەوەر بەلای سەریانەوە ﴿صَافَّاتٍ﴾ لەکاتێکا کە باڵەکانیان بلآو ئەکەنەوە و سەری پەڕەکانیان ریز ئەدەن ﴿وَيَقْبِضْنَ﴾ وە جار بەجاریش ئەیانگوشن و پەڕەکانیان ئەلکێننەوە پێکەوەو ئەیاندەن لە تەنیشتیان بۆ ئەمەی هێز بدەنە خۆیان.

بەڕاستی شێوەی فڕینی پەلەوەر بەلای سەرومانەوە بە هەردوو جۆر و لە هەردوو کاتەکەدا زۆر جوان و دڵڕفێنە. هەرکەس بەهۆش و وریایی یەوە سەرنجی بدا چاو و دڵی تێر نابێ لێی. بەڵام بەهۆی ئەوە هەمیشە هەیە و ئەکەوێتە بەرچاو، بێ ئاگا ئەبین لێی و هۆشمان بەلایەوە نامێنێ. بێ گومان هەر چۆنێ شێوەیەکی جوان و شیرینە هەروەها ئەگەر بیری لێ بکرێتەوە زۆر جێگای سەرسوڕمانە کە ئەو پەلەوەرە چۆن بە حەواوە راگیر ئەبێ و ئەڕوا بەتایبەتی هێندێ پەلەوەر زۆر قورسە و شتی قورسیش بە سروشت و مەیلی بۆ خوارەوەیە.

جا لەبەر ئەوە لە یەکەم جارەوە شێوە شیرینەکەی خستە بەرچاو و مەردومی وریا کردەوە بۆ لێ ورد بوونەوەی، ئینجا بێداری ئەکاتەوە بەهۆی راگیر بوونەکەش. ئەفەرموێ: ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُۚ﴾ هیچ کەس راگیریان ناکات جگەلەخوای بەزەیی داری میهرەبان. راگیریان ئەکات بەو یاسا و نیزام و تەگبیرەی کە فەراهەمی هێناوە لەم بوونەوەرە گەورەیەدا، کە هەموو شتێکی گەورەو بچوکی تیا سەرنج دراوە و بۆ هەموو شتێکی حیسابێکی تایبەتی کراوە لە هەر سێلْ و ئەتۆمێکەوە تا گەورەترین شت.

خوای میهرەبان راگیریان ئەکات بەو هێزو دەسەڵاتەی کە کولی و کەم و کوڕی رووی تێ ناکات، بەو چاودێری یەی کە هەمیشە هەیە و ون و ئاوا نابێ، ئەو هەموو کار و بارو شتەی فەراهەم هێناوە بەبێ شێوان و تێك چوون.

خوای میهرەبان بەو جۆرە راگیریان ئەکات چونکە ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍۭ بَصِيرٌ﴾ بێ گومان خوا بە ووردی ئاگادارە بە هەموو شتێ و بینایە بە هەموو شتێ. راگیر کردنی پەلەوەر لە حەوادا وەکو راگیر کردنی هەموو گیان لەبەرێ وایە بەسەر پشتی ئەم زەوی یەی کە ئەفڕێ بە بۆشاییدا. هەروەها وەکو راگیر کردنی ئەو هەموو ئەستێرەو مانگ و رۆژە وایە کە هیچ شت و هیچ کەسێ راگیری نەکردوون لە جێگا و شوێن و خولگەی خۆیانا بێجگە لە خوا، بەڵام قورئان سەرنجی مەردوم رائەکێشێ بۆ هەرشتێ کە بتوانن بیبینن و تێی بگەن و دەست کاری دڵ و دەروون ئەکات بە شێوەیەکی سوك و ئاسان، ئەگینا هەموو کردەوە و دەست کردەکانی خوا بێ وێنەیە و کەس ناتوانێ لاسایی بکاتەوە.

ئینجا دەست کاری یە تری دڵ و دەروونمان ئەکات، ئەیانگێڕێتەوە بۆ شێوەی ئەو بیم و داچڵەکانەی کە نیشانی دان و خستی یە بەر چاویان لە چەند ئایەتێ لەمەو پێش کە ترساندنی و هەڕەشەی لێ کردن بە کردنی بە ناخی زەویدا، وە بە بای بەهێز کە بەرد و زیخیان بکا بەسەرا و بە بیرخستنەوەی بەسەرهاتی سەخت و رۆژی رەشی گەلە بێ بڕواکان.

أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ

**جا لێرەدا ئەگەڕێتەوە سەریان بۆ ئەمەی پرسیاریان لێ بکات: ئایا کێ یە ئەو کەسەی یارمەتی ئەوان بدات و پارێزگاری یان بکات لە خوا؟ ئەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ ئایا کێ یە ئەم بێ نرخەی کە کۆمەك و لەشکرێك بێ بۆ ئێوە یارمەتی تان بدات و بتانپارێزێ لە سزایە کە بێت لەلایەن خوای میهرەبانەوە؟ یا ئایا کێ یە ئەمەی کە کۆمەك و لەشکرێ بێ بۆ ئێوە لە کاتێکا تێ پەڕ بکات لە یارمەتی خوای میهرەبان؟ بێ گومان هیچ کەس نییە بتوانێ هیچ کەس بپارێزێ و پەنای بدا لە سزای خوا بێجگە لە خوای میهرەبان.**

**هیچ کەس نییە بتوانێ تێ پەڕ بکات لە یارمەتی خوا و بە بێ یارمەتی خوا یارمەتی هیچ کەس بدا. کەواتە بت پەرستەکان کە بە تەمای ئەوەن بتەکانیان بیانپارێزن یا تکایان بۆ بکەن، لە ئەوپەڕی گومڕایی و سەر لێ تێك چوونان یا لایان وایە ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە نی یە و کەواتە پرسیار و سزای پاش مردن نابێ. ئەو نەفامانە لە ئەوپەڕی رادەی گومڕایی و سەر لێ شێوانان. وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ﴾ بێ بڕواکان نین مەگەر لە خەڵەتاوی یەکی گەورەو گومڕایی یەکی ئاشکرادا، واتە ئەوانە شوێنی هەوا و ئارەزووی نارەوای خۆیان کەوتوون و شەیتان خستوونی یە ناو چاڵی گومڕایی.**

**ئینجا دەست کاری یە تری دڵیان ئەکات لەبارەی ئەو ڕۆزی یەی کە پێ ی رائەبوێرن و ئەژین، بێ هۆش وبێ ئاگان لە بەخشندە و سەرچاوەکەی، ئینجا ناترسن لەنەمانی و کەشخە ئەکەن بە روو وەرگێڕانیان لە حەق و ڕاستی. ئەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ﴾ ئایا کێ یە ئەمەی کە ڕۆزیتان ئەدا. ﴿إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ﴾؟ ئەگەر خوا ڕۆزی یەکەی بگرێتەوە لێتان؟**

**ڕۆزی ئادەمی – وەکو وتمان – بەسراوە بە مەیل و خوایشی خواوە لە یەکەم جارەوە و لە فەراهەم هێنانی هۆکانی، لە داڕشتنی ئەم بوونەوەرە و لە کەرەسەکانی زەوی و لای سەرووی زەوی، هیچ کام لەوانە بە هیچ رەنگ دەسەڵاتی ئادەمی یان تیا نی یە و پەیوەندی یان نیە بە کار و کردەوەیانەوە. چونکە ئەو هۆیانە لە پێش ئادەمی دا هەر بوون، وە گەورەتر و بەهێزترن لە ئادەمی. دە ئایا کێ ڕۆزی ئادەمی ئەدا ئەگەر خوا ئاو بگرێ و**

نەیهێنیٚ، یا با و هەوا بگرێتەوەو نەیهێڵیٚ، یا ئەو یەکەم کەرەسانە نەهێڵیٚ کە هەموو شتەکان لەوانەوە پەیدا ئەبن؟ بیٚ گومان مەبەست بە ڕۆزی زۆر پان و فراوانترە لەوەی کە ئەچێتە دڵی مەردوم لە کاتی بیستن و ناویردنی ئەم ووشەیەدا.

هەموو کەرەسە و کارو باریٚ ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا و دەسەلاّت و بڕیاری خوا , وە گرتنەوە و کەم کردنی و بەرەلاّ کردن و زۆر کردنی ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا بە پیٚی زانین و ویستن و کار دروستی خوا. هەروەها هەموو ئەو شتانەش کە مەردوم بە هینی خۆی دائەنیٚ، وەکو خەریك بوون و هەولیٚ و تێکۆشان و بەرهەم و داهێنان. ئەمانەش هەر ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، هەموو بەسراون بەو هەموو هۆ و کەرەسە بنەڕەتیانەوە کە باس کران و بەسراون بە بەخشندەیی خواوە. ئایا هەر هەناسەیەك بدریٚ و هەر جولاّن و بزوتنەوەیەك بکریٚ هینی خوا نین و خوا نایاندا؟ ئایا ژیری و تێکۆشانی ژیری کە ئەم هەموو شتەی پیٚ دا ئەهێنریٚ هینی خوا نی یە و بەدەست خوا نی یە؟ ئایا هەر بەرهەمیٚ کە ئیش کەر و داهێنەر هەیانە هەمووی لەو کەرەسانەدا نین کە دەستکرد و داهێنراوی خوان؟

ئایا بە چەند هۆیە بەدی نایەن کە خوا لەم بوونەوەرە و لە ئادەمی دا دروستی کردوون؟ بۆ وێنە: ئایا کارەبا و نەوت کە ژیانی ئەم جیهانەی ئەمڕۆی لەسەر راگیرە بێجگە لە خوا هیچ کەس دەخلی هەیە لە داهێنانیانا؟ بیٚ بڕواکان بەو جۆرە دەم کوت کران و دەستە پاچەیی یان دەرخرا، لەگەلیٚ ئەوەداسەری بەندایەتیان دانەخست بۆخوا ﴿بَل لَّجُّواْ فِي عُتُوّٖ وَنُفُورٍ﴾ بەڵکو درێژەیان پێدا و بەردەوام بوون لەسەرکێشی و خۆ بە زل زانی و تار بوون و دوور کەوتنەوە لە خوا پەرستی و راستی!!

ئەو بیٚ بڕوایانە لەگەلیٚ ئەوەدا بەو جۆرە سەر لیٚ تێك چوو گومڕا بوون پێغەمبەر(ﷺ) و بڕوادارانیان لەکەدار ئەکرد بە گومڕایی و سەر لیٚ شێواوی خۆیان دا و دائەنا کە لەسەر ڕێگای راستن! ئەو قسە ناڕەوا و ئەو بارە لارەی کە ئەوانەی لەسەر بوون قسە و پیشەی هەموو وێنەکانی ئەوانە لەگەلیٚ بانگ کەرانی ڕێگای خوالەهەموو چەرخ و ولاّتێك دا. جا لەبەر ئەوە چیرۆك و وێنەیەکی نایاب ئەهێنێتەوە بۆ ئەو دوو تاقمە، کە بە جوانی حالیٚ و باری هەر دوولانەخاتەبەرچاو.ئەفەرمویٚ: ﴿أَفَمَن يَمۡشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجۡهِهِۦٓ أَهۡدَىٰٓ﴾ دەی ئایاکەسیٚ کەبڕوا بە ڕێوە لە کاتێکا کە ئەکەویٚ بەسەر ڕوودا و هەڵئەسیٚ و ئەکەویٚ لەبەر سەختی و نارەحەتی و چالیٚ و چۆڵی ڕێگاکەی. یا بەسەر ڕوودا بڕوا بەڕێوە بە پێچەوانەی سروشت نەك بە پیٚ بگەڕیٚ لەسەر سروشتی ئادەمی. ئایائەوکەسە ڕێگا باشتر دەر ئەکات و سووك تر گوزەر ئەکات،

﴿أَمَّن يَمۡشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ یا كەسیٚ كە بڕوا بەرێك و پێكی و بە بیٚ كەوتن و هەڵكەوتن بەسەر ڕێگایەكی ڕاستەوە؟ شێوەی یەكەم شێوەی كەسێكە كە لابدا لە ڕێگا ڕاستەكەی خوا و بیٚ بەش بێت لە ڕێنموونی ئەو، بە پێی بەرنامەكەی ئەو ژیان بەسەر نەبا، كەواتە هەمیشە هەڵ ئەخلیسكیٚ وپێی هەڵئەكەویٚ و هەمیشە دڵ و دەروونی لە بیٚ ئارامی و ناڕەحەتی دایە، هەمیشەبەگومڕایی ئەژی هەرچەندبە ڕواڵەت هۆی خۆشی و كامەرانی ببیٚ و زۆر و بەهێزبیٚ.

شێوەی دووەم شێوەی كەسێكە دامەزراو بیٚ لەسەر ڕێگا ڕاستەكەی خوا، بە پێی ڕێنموونی ئەو بجوڵێتەوەو ڕەفتار بكات و بەپێی یاسا و بەرنامەكەی ئەو ژیان بەسەر ببا، كە ئەوەش ڕێگا و ڕچەی ئاسمانەكان و زەوی و مانگ و ڕۆژ و هەموو ئەستێرەكانە، كەواتە ئەو كەسە هەموو كارو باری بە ڕێكی ئەڕوا بە وێنەی ڕێكی كارو باری ئەمانە. بیٚ گومان ژیانی بڕوا بە خواو پەرستنی خوا بە ڕاستی، هەمووی سووك و ئاسانی و ڕێك و ڕاستی و دامەزراوی یە. وە ژیانی بیٚ بڕوایی و سەركێش لە خوا هەمووی تەنگی و تەنگەتاوی و هەڵكەوتن و لاری و گومڕایی یە.

جا كام لەم دوانە باشتر و خۆشترە؟ ئایا پێویستی بە وەڵام دانەوە هەیە؟ بێگومان نەخێر كەواتە ئەم پرسیارە هەر بۆ دان نانە بە بارە ڕاستەكە و ڕیٚ بڕینەوەیە لەسەر كێشە بیٚ بڕواكان. لێرەدا پرسیار و وەڵام لەبەرچاو ون ئەبن و لەدڵ دەرئەچن، ئەوەی جێگیر ببیٚ لە دڵ و دەروونا و سەرنج بدریٚ ئەم دوو وێنەیە: وێنەی كۆمەڵیٚ بەسەر ڕوودا بڕوا بە ڕێوە، یا بڕوا و هەڵكەویٚ و بكەویٚ بە دەما و هەڵسێتەوە و بكەوێتەوە، هەروەها بە بیٚ مەبەست و بە بیٚ ڕێگا و ئامانج. وە وێنەی كۆمەڵیٚ تركەبڕوابەسەربەرزی و بەڕێكی، بە بیٚ تاسە و هەڵكەوتن، بە هەنگاو نانی ڕێك، لەسەر ڕێگایەكی ڕاست و لەبەر مەبەست و ئامانجێكی دیاری نەخشە كێشراو.

ئینجا بە بۆنەی باسی ڕێنموونی و گومڕایی. لەسەر ئەم باسە، ئامۆژگاری ئەکات و ئەو هەموو هۆی ڕێنموونی یە ئەخاتەوە بیری بێ بڕواکان کە خوای بەخشندە پێی داون و کەچی ئەوانە بەکاری ناهێنن و سوودی لێ وەرناگرن و سوپاسی خوا ناکەن لەسەری. ئەفەرموێ ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ﴾ خوا کەسێکە کە ئێوەی داهێنا و دروستی کردن. دروست کردن و داهێنانی خوا بۆ ئادەمی شتێکە خۆی دائەبڕێ بەسەر ژیری دا و ئەچێتە ناو دەروون و هەستەوە و خۆی دائەمەزرێنێ بەجۆرێ هەرکەس ڕێزی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز دژی ئەوە نالێ و نادوێ. بێگومان هەرکەس دژی ئەو شتە ئاشکرایە بدوێ ئابڕووی خۆی ئەبا و خۆی ئەکات بەپەن. چونکە ئەم ئادەمی یە ئاوا بە ئاشکرا هەیە کە بەرزتر و زاناتر و لێ هاتووتر و بە دەسەلات ترینی هەموو دروست کراوەکانە و ئاشکرایە کە خۆی خۆی دروست نەکردوە، کەواتە ئەبێ کەسێکی بەرزتر و زاناتر و بە دەسەلات ترین دروستی کردبێ وە بە هیچ ڕەنگ ڕێگا نی یە دان نەنرێ و بڕوا نەبێ بە بوونی پەروەردگارێتی. چونکە بوونی ئادەمی بەرهەڵستی ئەو بێ بڕوایی یە ئەوەستێ و ژیری پیا هەڵئەشاخێ.

هەر دەمبازی یەك بكات وەكو كاوێژ كردنە و هیچ ڕێزێكی بۆ دانانرێ. قورئان لێرەدا باسی ئەم شتە ئاشكرا ئەكات بۆ ئەمەی لەگەڵ ئەمەدا باسی ئەم هۆو چەكە بەهێزانە ئەكات كە خوا بەخشینی بەم ئادەمی یە بۆ دەست خستنی زانین و ناسینی ئەو شتانەی كە لە توانای ئادەمیدا هەن. ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾ وە بەدی هێنا بۆتان هێزی بیستن، تا ببیستن ئامۆژگاری و ئایەتەكانی قورئان، ﴿وَٱلْأَبْصَـٰرَ﴾ وە هێزی بینین تا سەرنج بدەن و ببینن هەموو بەڵگە و نیشانە بوونەوەری یەكان. ﴿وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾، وە ژیری و هێزی هۆش و بیر كردنەوە لە بیسراو و بینراوەكان. بە كورتی ئەم چەكە گرنگانە و ئەم بەخششە گەورانە بەكار بهێنن لەو مەبەستانەی كە بۆی دروست كراون.

بیستن و بینین دوو نیشانە و موعجیزەی گەورەن هەندێ سیفەت و شتی تایبەتی نایابیان تا ئێستا زانراوە. كە ئێجگار جێگای سەرسوڕمانن. وە هێزی ژیریی و زانین نیشانە

و موعجیزەیەکی زۆر نایاب تر و گەورەترە و لەبارەی ئەمەوە بەشێکی زۆر کەم زانراوە. بەڕاستی ئەمەیە سیر و نهێنی یەکەی خوا لەم دروست کراوە نایابەدا. زانیاری تازە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆری کرد بۆ ناسین و زانینی شتێ لە بارەی هێزی بیستن و بینینەوە بەجوانی ئەزانم باس کردنی بە کورتی تا باشتر دەرکەوێ گەورەیی و گرنگی یان و چاکتر سەر سوڕ بمێنێ لە کرداری بێ وێنەی خوا تا باشتر بڕوا بە هێز ببێ بە دەسەڵات و کار دروستی خوا.

گوێی مرۆڤ دەکرێت بە سێ بەشی سەرەکی یەوە:

١- گوێی دەرەوە، کە لە بەشێکی کرِ کراگەیی پێک دێت کە پێی دەڵێن: کرکراگەی گوێ(الصیوان) کە لە ناوەندە کونێك(قناة مرکزیة) پێك دێت ئەویش جۆگەی بیستنە، کە لە ناوەوە بە گوێی ناوەڕاست کۆتایی دێت.

٢- گوێی ناوەڕاست. کە بریتی یە لە بۆشایی یەکی نارێك کەوتۆتە ناو ئێسکەکانی لاجانگەوە (عظام الصدغ).

٣- گوێی ناوەوە کە ئەم بەشەش دەکەوێتە ناو ئێسکەکانی لاجانگەوەو پێك هاتوە لە:

أ- پێچ پێچۆکە – یا پێچ لوول(القوقع). کە پێك هاتوویەکی پێچاو پێچە لەبەرگێکی ئێسکین پێك هاتوەو پێی ئەڵێن پێچ پێچۆکەی ئێسکی(التیه العظمی) لەناویشیا پێك هاتوویەکی تەنکی هەیە پێی دەڵێن پێچ پێچۆکەی پەردەیی(التیه الغشائی).

ب- جۆگەی کەوانی یەکان کە سێ جۆگەن. کە تا رادەیەك ستونین و لەسەر یەکترن. جا زانیاری ئەڵێ: ئەو لەرینەوەی کە دەنگ پەیدا ئەکات لە هەوادا ئەدا لە گوێ، کە ئەویش بە رێك خراوی ئەیدا لە پەردەی گوێ یا تەپڵی گوێ(طبلة الاذن). ئەمیش ئەیگوێزێتەوە بۆ ئەو بۆشایی یە لەناو گوێدا. ئەو بۆشایی یەش چەند جۆرە کونی هەن – هێلکەیی یا بازنەیی –، لە بەشە هێلکەیی یەکەیا چوار هەزار کەوانی بچووك هەیە پەیوەستن بە دەماری بیستنەوە لە سەردا.

ئینجا با بیر بکەینەوە لە کرداری خوا ئەبێ درێژی و قەبارەی هەرکام لەو کەوانانە چەند بن؟ وە چۆن ئەو چەند هەزار کەوانە دروست کراو پێك هێنرا بەو شێوە و جۆرە تایبەتی یە؟

وە ئەو جێگایەی ئەوانەی تیا دانرا ئەبێ چی بێت و چۆن بێت؟ ئەمانە هەموو هەن بێجگە لەو هەموو ئێسکە ووردیلانەی تر کە شەپۆل ئەدەن لە زۆری دا. خوای گەورە ئەوانەی هەموو جێگە کردەوە لەو بۆشایی یەدا کە لەوانە نی یە بەچاوی رووت ببینرێن!!

لە گوێدا (سەد هەزار) سێڵی(خانە) بیستن هەیە، ئەو دەمارە ووردانە کە بەچاو نابینرێن کون کون و برژانگ دارن. ئەمەی کە وترا دەست نیشان بوو بۆ بەشێکی زۆر کەم لەوەی کە زانراوە لای زانایان، کە ئەوەش بەشێکی زۆر کەمە لەوەی خوا فەراهەمی هێناوە لە گوێ و هەستکاری بیستندا. بەڕاستی هەر کەس سەرنجی تەنها وێنەکانی ئەو ئەندام و کۆ ئەندامانە بدا کە لە کتێبەکانی زیندەوەر زانی و تەندروستیدا بڵاو کراونەتەوە، دڵی پڕ نەبێ لە بڕوا بە گەورەیی و کار دروستی خوا، ئەو کەسە بێ بەشە لە تێگەیشتن و ژیری.

ئینجا با هەندێ بدوێین لە هێزی بینین. مەڵبەندی ئەم هەستیارە چاوە، کە(سەد و سی – ١٣٠) ملیۆن پێشوازخانەی رووناکی تێدایە، ئەوانەش لە ئەم لاو ئەو لای دەمارەکانی بینینن. چاو پێك دێت لەم شتانە:(الصلبة، القرنية، المشيمة، الشبكية).. هەموو ئەوانەش بێجگە لە ژمارەیەکی گرنگ لە دەمار و لوولە شەبەکی یەکەی(تۆڕی) پێك دێت لە نۆ خانی لە سەریەکی نەنووسا و پێکەوە، ئەو خانەی کە لای سەرووی ناوەوەیە پێك هاتووە لە(سی – ٣٠) ملیۆن عوود و چیلکە و(سێ – ٣) ملیۆن قووچەك(مخروطی) ئەوانە هەموو رێك خراون بە شێوە و رێژەیەکی تەواو لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ زەرەبینەکانا!!

کورتەیەکمان لەم هەستیارەش باس کرد، ئینجا با هەندێ بدوێین لە بەهرە و بەخششی ئەم هێزە تایبەتی یەی کە بەهۆی ئەوەوە ئادەمی بوو بەم ئادەمی یە گرنگە، بەهۆی ئەوە کراوە بە جێ نشین لەم جیهانە پان و فراوانەدا. بەهۆی ئەوەبوو بە هەڵگری سپاردەکەی خوا کە ئاسمانەکان و زەوی ترسان لێی و نەیانتوانی هەڵی گرن. وەکو بە درێژی باس کرا لە دوا دوای سوورەتی(الأحزاب)دا.

قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾

---

**هیچ کەس بەڕاستی نازانێ ئەم هێزە چی یە و چۆنە و لە کوێ دایە، لەناو لەشایە. یا لە دەرەوەیە! بەڵکو ئەم هێزە نهێنی یە کە لە نهێنی یەکانی خوا لەم ئادەمی یەدا و بێجگە لە خوا کەس نایزانێ لەسەر ئەم هەموو بەهرەو بەخششە گرنگانەی کە درا بە ئادەمی بۆ ئەمەی هەڵسێ بە ئەرکی ئەو سپاردەیە، کەچی هەڵناسێ پێی. وەکو ئەفەرموێ ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ زۆر کەم سوپاسی خوا ئەکەن، ئەمەش کاتێ وا ئەڵێین ئەگەر ئەم فەرمودەیە ئاراستەی هەموو ئادەمی کرابێ، ئەگەر مەبەست تەنها بێ بڕواکان بێت ئەو حەلە ئەبێ بڵێین: هیچ سوپاس ناکەن، ئەم رستەیە هەرچۆنێ بەکار ئەهێنرێ لە زۆر کەمی سوپاس دا. هەروەها بەکار ئەهێنرێ بۆ نەبوون و بەدی نەهاتنیشی.**

**ئینجا ئامۆژگاری ئەکات و بیریان ئەخاتەوە کە خوا ئادەمی جوێ کردەوە و ئەو بەهرە و بەخششەی پێ بەخشی لە خۆڕایی ئەوەی نەکردوە بە بێ نیاز و مەبەستێ. بەڵکو ئەم ژیانەی کردووە بە هەل و هەڵکەوتێ بۆ تاقی کردنەوە. لە پاشا تۆڵە و پاداش و سەرەنجامی کردەوە بە دوایا دێت لە ڕۆژی دواییدا. ئەفەرموێ ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان ﴿هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ خوا کەسێکە کە ئێوەی بە زۆری دروست کرد لە زەوی دا و بڵاوی کردنەوە بە هەموو لایەکیا، ﴿وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ وە بۆلای ئەو کۆ ئەکرێنەوە. واتە هەرچۆنێ لە یەکەم جارەوە دروستی کردن هەروەها دووبارەتان ئەکاتەوە. هەرچۆنێ بڵاوەی پێ کردن هەروەها کۆتان ئەکاتەوە بۆ حساب و پرسیار و گەیشتن بە بەرهەمی کردەوەتان.**

**ئینجا قسەی گومان و دوو دڵی یان لەو کۆکردنەوەدا ئەگێڕێتەوە. ئەفەرموێ ﴿وَيَقُولُونَ﴾ بێ بڕواکان ئەڵێن بە پێغەمبەر(ﷺ) وبڕواداران: ﴿مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ﴾ کەی ئەم بەڵێنە بەدی دێت و ئەبێ ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەرئێوەراست گۆن وراست ئەکەن لەم بەڵێن وهەڕەشەیەداکە ئەیکەن؟**

ئەم پرسیارە هەرچۆنێ لەگومان و دوو دڵی یەوە ئەهات هەروەها مەبەستیان لاقرتی و چەنەبازی و قسە تێ گیران بوو. ئەگینا زانینی کاتی هاتنی ئەو بەڵێن پێ دراوە نە پێش ئەخات و نە دوای ئەخات، وە هیچ پەیوەندی یەکی نی یە پێ یەوە، ئەو ڕۆژە دێت لە پاش ئەم جیهان و ژیان و تاقی کردنەوەیە. یەکسانە بۆ ئەوان سبەینێ بێت یا لە پاش چەند ملیۆن ساڵی تر... بەڵکو ئەوەی کە گرنگ بێت بۆ ئەوان ئەوەیە کە ئەو ڕۆژە دێت و ئەوان کۆ ئەکرێنەوە تیایا، پاداش و تۆڵەیان ئەبێ بە پێی کردەوەی ئەم جیهانەیان. جا لەبەر ئەوە خوا هیچ کەسی ئاگادار نەکرد بەسەر کاتی هاتنیا، چونکە هیچ بەرژەوەندی یەکی مەردوم نی یە لە زانینی ئەوەدا، هیچ پەیوەندی یەکی ئەو زانینە نی یە بە سروشت و چۆنیەتی ئەو ڕۆژەوە، هیچ بەرو بەرهەمێکی نی یە لەو داواو ئەرکانەی کە خراونەتە سەر شانی مەردوم، بەڵکوبەرژەوەندی و کار دروستی هەیە لە شاردنەوەو دیاری نەکردنی ئەو کاتەدا، و تایبەتی کردنی ئەو زانینە تەنها بە خواوە. ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان ﴿إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ﴾ زانینی ئەوەهەرلای خوایە و هیچ کەسی ئاگادار نەکردوە بەسەریا. ﴿وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ وە من هەر ترسێنەرێکی روون کەرەوەم بە روونی ئەوەی پێم سپێرراوە پێتان ڕائەگەیەنم. کارو فەرمانم ترساندنە و ئیشی گرنگم ڕاگەیاندنە بە روونی و زانینی ئەو کاتە لە کارو ئیشی من بەدەرە. لەم کاتەدا کەئەوان بە گومان و دوو دڵی پرسیار ئەکەن و وەڵام ئەدرێنەوە بە دڵنیا کردن لەسەر راستی هاتنی ئەو ڕۆژو کاتە. لەم کاتەدا قورئان وا ئەخاتە دڵەوەو وا نیشان ئەدا وەك ئەو ڕۆژ و کاتە هاتبێ و ئێستە ئەوانی تێ کەوتبن. ئەفەرموێ ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً﴾ ئینجا کاتێ ئەو بەڵێن پێ دراوەیان بینی لەکاتێکا کە نزیك کەوتەوە لێ یانەوە ﴿سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ روو دەم و چاوی ئەوانەی بێ بڕوا بوون تاڵ و ڕەش و ناشیرین ئەکرێ. واتە: سام و ترس و داخ و غەم و پەژارە داگیریان ئەکات بە جۆرێ ڕەنگ و روویان ئەگۆڕێ و هەڵ ئەبڕسکێ و ڕەش دائەگیرسێ. ﴿وَقِيلَ﴾ وە بە تەشەرو توانجەوە ئەوترێ پێیان. ﴿هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَدَّعُونَ﴾ ئەمە ئەوەیە کە ئێوە لاتان وابوو ئەتان ووت: هەرگیز نابێ و روو نادا، ئەوا هات و یەخەی گرتن. لەکاتی بەرەنگاری بێ بڕوایی و گومان و دوودڵی بێ بڕواکان لە هاتنی ڕۆژی دوایی و ئەو ترساندن و هەڕەشانەی کە ئاراستەیان ئەکرێ. لەو کاتانەدا قورئان ئەم شێوەو ڕەوشتی ئێرە بەکار ئەهێنێ بەم ڕەنگە هەست و دڵ و دەروونیان داگیر ئەکات و شتەکە بە حازر و بزری ئەخاتە بەرچاویان. بێ گومان ئەو شێوەو ڕەوشتە زۆر

بەکارە لەکاتی تەمیٚ کردن و ئامۆژگاریدا. ئەو ئامادە کردن و خستنە بەرچاوە چ بۆ حالٚ و باری داهاتووی بەدی نەهاتوو. ئەو ئامادە کردنە شتێکی راست و رەوایە بە پێی یاسا و باوی رەوان بێژی زان (علم الفصاحة) ئینجا ئەوە هەر چۆنیٚ لەو بارەیەوە راست و رەوایە، هەروەها لێرە و لە هەموو شوێنەکانی تری قورئان دەست نیشانە بۆ شتێکی راستی راستەقینە.

واتە ئەو رووداوانەی داهاتوو کە خوا بە ئامادە و بەدی هاتوو نیشانیان ئەدات لە راستیدا ئامادەن و ئێستە هەن و بەدی هاتوون لای خوا و لە زانینی خوادا. ئەو کات و ماوەیە کە هەیە لە بەینی ئێمە و ئەو شتانەدا ئەوە تەنها بۆ ئێمەیە و لە حیسابی ئێمەدایە، نەك بۆ خوایە و لە حیسابی خوادا. دوا و بەر و جیاوازی کات و چەرخ و شوێن بۆ ئێمەیە و بۆ ئەو شتانەیە کە لای ئێمەن. کەواتە ئەو بەڵێن و پیٚ دراوە و ئەو حاڵەت و بەسەرهاتی ئەو بیٚ بڕوایانە کە قورئان خستنی یە بەرچاو ئێستە هەن و حازر و بزرن و بەس لەوانەوە دیار نین، وە ئەگەر خوا مەیلی بیٚ و ئیزن بدات کوت و پڕ دەر ئەکەون و حازر ئەبن. ئێمە نابیٚ بە پێی کێشانە و پێوانەی خۆمان بەراووردی شتەکانی لای خوا بکەین. ئیتر تیٚ ئەگەین لە چۆنیەتی یان یان نەء؟ یا هەندیٚ شت بکەین بە نمونە لەم جیهان و بوونەوەرەدا. ئەوەتا وەزن و قورس و سووکی لای ئێمە هەیە کەچی کە لە جیهانی زەوی ئێمە تێپەڕکرا بۆ جیهانی ئاسمانی، وەزن و قورسی نامێنیٚ و هەموو شت چوون یەکە. ئەمە شتیٚ بوو لەمەوپێش بە قسەو بیرکاری ئەووترا کەچی ئێستە گەشت کەرەکانی ئاسمانی بە چاوی خۆیان بینیان!!

بیٚ بڕواکان بە تەمای لەناوچوون و مردنی پێغەمبەر(ﷺ) و بڕواداران بوون و دڵخۆشی خۆیان بەوە ئەدایەوە و لەناو خۆیانا فەرمانیان ئەدا بە ئارام و خۆگرتن تا ئەمانە خوا لەناویان ئەبا و ئیتر ئەوان ئەکەونە رەحمەتی و رزگاریان ئەبیٚ لەو بوومەلەرزەی کە ئەم ئایینە فەراهەمی هێناوە لەناویاندا. لەباریٚ ترەوە دڵشاد بوون کە خوا ئەوە ئەکات چونکە لایان وابوو کە خۆیان لەسەر رێگای راستن و ئەوان گومڕا و سەر لیٚ تێك چوون و درۆ ئەکەن بەدەم خواوە لەوەی کە ئەیڵێن و رای ئەگەیەنن!

﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَهۡلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوۡ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ٢٨ قُلۡ هُوَ
ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢٩ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا فَمَن
يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ٣٠﴾

---

**ئینجا قورئـان بـیْ داریـان ئەکاتـەوە بەمـەی ئەگـەر ئـەو ئـاواتی ئەوانـەش بـەدی بێـت چارەسـەر نـی یـە بـۆ ئـەوان و ئـەوان قوتـار نـابن لـە سـزای سـەخت، کەواتـە چاکتر بـۆ ئـەوان ئەمەیە بیریْ بکەنەوە لەکاری خۆیان پێش هاتنی ئەو کاتە بەڵێن پـیْ دراوەی کە خستیە بەر چاویان وەکو ئێستە هـاتبیْ و حـازر بێـت. ئەفـەرموێت ﴿ قُلۡ﴾ ئـەی پێغەمبـەر پـیْ یـان بڵـیْ: ﴿أَرَءَيۡتُمۡ﴾ پێم بڵێن و هەواڵم بدەنیْ ﴿إِنۡ أَهۡلَكَنِيَ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر خوا من لـەناو بـەریْ ﴿وَمَن مَّعِيَ﴾ وە ئەوانەش کە لەگەڵ منن لەناویان بەریْ، ﴿أَوۡ رَحِمَنَا﴾ یا بەزەیی بێتەوە پیامانا و میهرەبانیمـان لەگـەڵ بکـات بـە دواخسـتنی مردنمـان و یارمـەتی دان و زاڵ کردنمـان بەسـەرتانا ﴿فَمَن يُجِيرُ ٱلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ دەی ئایا کیْ بیْ بڕواکان پەنا ئەدا و ئەیانپارێزیْ لە سزایەکی ئێش و ئازاردەر؟ واتە بەدی هاتنی ئەو ئاواتەتان و بەدی نەهاتنی سودیْ ناگەیـەنیْ بە ئێوە چونکە رزگار بوونتان نی یە لە سزای خوا. فـەرمووی کـیْ بـیْ بڕواکـان پـەنا ئـەدا، ئـەی فـەرموو کـیْ ئێوە رزگار ئەکات بۆ ئەمـەی سەرکێشی و نەفامی یەکەیان هێـواش بکاتـەوە بەمـەی کە پـان بەپان نایانکات بە بیْ بڕوا و نائومێدیان ناکات لـە رزگـاربون و بـەزەیی خـوا، ئـەو رەوشـتەش زۆر راست و دروستە لەکاتی تەمیْ و ئامۆژگاریدا و باشتر کار ئەکات.**

**ئینجاپلەیەبەرز ئەبێتەوە و هەڵوێستی بڕواداران لەگەڵ خواداروون ئەکاتەوە، ئەفەرمویْ: ﴿ قُلۡ﴾ بڵـیْ ﴿هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ هـەر خوایـە میهرەبـان و بـەزەیی دار کـە خـاوەنی هـەموو چاکەیەکە ﴿ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ ئێمەبڕوامان پیْ هێناوە﴿وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَا﴾ وە هەر پشت بەو ئەبەستین. چونکە باوەڕمان هەیە و دڵنیاین کە قازانج و زیان هەر بە دەست ئەوە ﴿فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ ئینجا لەمەو پـاش ئـەزانن لـە بـەینی ئێمـە و ئێـوەدا کـیْ لـە گومڕایـەتی یـەکی ئاشـکرادایە. واتـە بۆتـان**

دەرئەکەوێ کە خۆتان لە چاڵی گومراییدا سەرگەردانن، بەلاَم لێرەش لەسەر رەوشتی ئایەتی پێشوو ویستی نەفامی و سەرکێشی یەکەیان بلێسە نەسێنێ و بەڵکو بیرێ بکەنەوە لە هەڵوێستی ناڕەوای خۆیان.

ئینجا کۆتایی بە سورەتەکە ئەهێنێ بە ترساندنیان بەسزای ئەم جیهانە پێش سزای ئەوجیهان، ئەیان ترسێنێ بە دەسەلاَتی خوا بەسەر نەهێشتنی ئاودا کە یەکەم هۆی ژیانە. ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بلێ پێیان: ﴿أَرَءَيْتُمْ﴾ هەواڵم بدەنێ و پێم بلێن ﴿إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا﴾ ئەگەر ئاوەکەتان ببێ بە شتێکی بە ناخی زەویدا چوو ون بوو لەناو زەوی دا. ﴿فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ﴾ ئایا کێ ئاوێکی جاری ئاشکراتان بۆ ئەهێنێ؟

بێگومان ئەگەر خوا ئەوە بکات هیچ کەس ناتوانێ ئاومان بۆ دەربێنێ، تەنانەت دەوڵەتەکانیش ناتوانن بە ئیرتیوازیش ئاومان بۆ دەربێنن. هەرکەس فام و تێگەیشتنی هەبێ لە هەڕەشەی وا ئەترسێ. کەواتە لە وەلاَمی ئەم پرسیارەدا ئەبێ هەر ئەمە بلێین کە حەدیسی لەسەرە: ﴿الله رب العاليمن﴾ ئا بەم جۆرە ئەم سورەتە دوایی هات بەو هەموو تەمێ و ئامۆژگاری و دەست کاری کردنی دڵ و دەروون و گەردش پێ کردن بەناو بوونەوەرداو دەست نیشان کردن بۆ جیهانی غەیبی و نادیاری و نەناسراو، یا زانراوی ناسراوی بیر لێ نەکراودا. بەڕاستی سورەتێکی زۆر گەورەو گرنگە. ئەوەی ئەیگەیەنێ زۆر زۆرترە لە قەبارەو ژمارەی ئایەتەکان. خوا بێ بەشمان نەکات لە پیت و فەڕی – آمین –.

# سورەتی(القلم)
# مەککەیی یە و(٥٢) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ناگونجێ بۆمان دیاری کردنی مێژوویە کە ئەم سورەتەی تیا هاتوەتە خوارەوە. ئیتر چ هەمووی، وە چ سەرەتاکەی. هەرچۆنێ بەرێکی نازانرێ هەمووی پێکەوە هاتووەتە خوارەوە، یا سەرەتاکەی لە پێشەوە هاتووە و ئەوی تری پاش ماوەیە و دواکەوتووە. چونکە سەرتا بەخواری ئەگەڕێتەوە بۆ تەنها شتێ، کە بریتی یە لە باسی دەم درێژی بێ بڕواکان بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ریوایەتانەی کە ئەڵێن ئەم سورەتە دووەم سورەتە لە هاتنە خوارەوەدا و لەپاش سورەتی(العلق) هات، زۆرن، هەروەها لە قورئان دا بەو جۆرە ریز کراوە و نووسراوە، بەڵام شێوەو رەوشتی سورەتەکە و مەبەستەکانی وا پیشان ئەدەن کە بەو جۆرە نەبێ تەنانەت وانیشان ئەدەن کە هاتنە خوارەوەکەی ماوەیەك پاش ئاشکرا کردنی پێغەمبەر بۆ بانگەوازەکەی بووبێ، لەکاتێکا بووبێ کە قورەیش دەستیان کردبێ بە بەرگری کردن و دژ هەڵسانی پەیام و بانگەوازەکەی تا رادەیەك دەستیان کردبێ بە دەم درێژی و لەکەداری کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە شێتی. قورئانیش دەم کوتی کردبن و هەڕەشەی لێ کردبن بەو هەڕەشەی کە لەم سورەتەدا هاتە خوارەوە، بەڵکو گەیشتبنە ئەوە ئاواتە خواز بووبن کە پێغەمبەر(ﷺ) وازیان لێ بێنێ و کەمێ بێتە خوارەوە و نەرمی بەکار بێنێ لەگەڵیان، شتێکی ئاشکرایە ئەمەش کاتێ بووە کە پەیام و بانگ کردنەکە بووبێ بە گشتی و ئاشکرا کرابێ و قوڕەیش کەوتبنە مەترسی لێ ی. ئەبێ لە پێش ئەم سوورەتە چەند بەشێ لە قورئان هاتبێ کە هەواڵ و سەرگوزەشتەی گەلە پێشووەکانی تیا بووبێ و قوڕەیش بیستبێتیان بەهۆی ئەوە پڕوپاگەندەیان ئەکرد و ئەیان وت: ئەمە قسەی پڕوپووچ و نووسراوی کۆنی پێشووەکانە و ئینجا ئەم سورەتە باسی ئەوە ئەکات و بەرپەرچیان ئەداتەوە.

ئەمەی کە بڵێین مەبەست لە هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە لەپاش سورەتی(العلق) هەر سەرەتاکانیانە. واتە سەرەتای ئەم لەپاش سەرەتای ئەو هاتووە و دووەمە بۆی. مەبەست لەو شێتی یەی کە دووری ئەخاتەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و دڵنیای ئەکات لەسەر نەبوونی کە لەم سوەتەدا ئەفەرموێ: ﴿مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ﴾ ئەو شێتی یەیە کە بوو بە خەتەرە بۆی و مەترسی لێکرد لە یەکەم جاری(وحی) سروشەوە لەپاش هاتنە خوارەوەی سەرەتای(العلق)، ئەمەی کە وا بڵێین زۆر دوور و لاوازە، چونکە ئەو مەترسی یەش ئەگەر بووبێ شتێکی وا نەبووە کە بووبێ بە گرێ لە دڵیا تا پێویست بکات بەو دڵنیا کردنە و ئەوەندە بە گرنگ بیگرێ، بەڵکو خەیاڵ و خەتەرەیەکی رووت کە بە ناچاری گوزەر ئەکات بە دڵ و دەروونا، ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کە کارەکە زۆر گەورەو گرنگ و کەس نەدیو بووە.

بێجگە لەوەش شێوەی ئەم سورەتە کە ئایەت و مەبەستەکانی زۆر جۆش و پەیوەستن وا نیشان ئەدات کە مەبەست بەم شێتی یە کە لە سەرەتاوە دووری ئەخاتەوە ئەو شێتی یەیە کە لە دوایی سورەتەکەوە ئەیگێڕێتەوە لە دەم بێ بڕواکانەوە کە دەم درێژی یان پێ ئەکرد دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ).

بەڵێ بارێ تر هەڵئەگرێ کە بەلامەوە رێکە و دژی ئەو ریوایەتە زۆرانە نی یە و دژی ئەو رێزدانە نی یە کە لە قورئانەکانا نووسراوە. ئەم بارو ئیحتیمالەش ئەوەیە کە سەرەتای سورەتی(العلق) وەکو بڕیاری هەموانی لەسەرە لە یەکەم جارەوە هاتووە، ئینجا باقی تری دواکەوتبێ بۆ پاش سێ ساڵەکەی یەکەم جار کە بانگ کردن تیایا نهێنی بووە، بۆ پاش ئاشکرا کردن و بەربەرەکانێ ی بێ بڕواکان وەکو شێوەی ئایەتەکانیش شایەت و رێکە لەگەڵ ئەوە. ئینجا لەپاش هاتنە خوارەوەی ئەو سورەتە بە تەواوی ئەم سورەتە هاتبێ و بووبێ بە دووهەمی.

بێ گومان لە یەکەم جارەوە نەمانی ئەم درەختی گەورەی ئیسلامە نێژرا لەو خاکەدا لە شێوە بەرزو پاك و خاوێنەکەیا. ئەوەش غەریب و نەناسراو بوو لەو چەرخ و سەردەمی نەفامی یەی کە وڵاتی داگیر کردبوو، نەك تەنها لە وڵاتی نێو دوورگەدا بەڵکو لە هەموو

ناوچەکانی زەوی دا. ئەو گواستنەوە ئێجگار گەورە بوو کە پەیدا ئەبوو لە نێوان ئەو شێوە ئایینەی تێك دراو و ناشیرینەی کە بت پەرستەکانی قورەیش بە دەما و دەم پێ یان گەیشتبوو لە ئایینی پاکی ئیبراهیم – سەلامی خوای لێ بێ –، ئەو شێوە گەورە راست و بەرز و روونەی کە پێغەمبەرمان(ﷺ) بۆی هێنان، کە رێك بوو لە بنەڕەتا لەگەڵ ئایینەکەی ئیبراهیم دا و گەیشتە ئەوپەڕی تێری و تەواوی یەك کە شایان و شایستەی دواترین پەیام و ئایینە گشتی یەکەی خوا بێ کە ناردی یە سەر زەوی بۆ ئەمەی هەمیشەیی بێت هەتا دنیا دنیایە. گواستنەوە کە زۆر گەورەو دوور بوو لە بت پەرستی و هاوبەش رەوا دان بۆ خواو پەرستنی مەلائیکە و جنۆکە و باقی ئەو هەموو بۆچوون و تێ گەیشتنە ناڕاست و ناڕەوایانەی کە ئاقیدە و ئایینی چەرخی نەفامی لێ پێك هاتبوو.

گواستنەوە لەو ئاقیدە پووچە بۆ خوا پەرستی بە تاك و تەنها و بەو شێوە پاك و خاوێنەی کە قورئان هێنای. هەروەها گواستنەوە کە زۆر گەورەو دوور بوو لە نێوان چینایەتی یەك(الطبقة)، کە بڕوا پێ کراو و زاڵ بوو بەسەر هەست و دەماغی نیوە دورگەدا و لەنێوان سووك و سۆڵی و یەکسانی هەمووان لە هەموو مافێ و لەبەردەم یاسا و نیزامی خوادا. هەروەها گواستنەوەکە زۆر دوور و گەورە بوو لە بەدخویی و بەد کرداری یە کە باو بوو لەو سەردەمەدا بۆ ئەو خوو رەوشتە شیرینەی کە قورئان هێنای و پێغەمبەر(ﷺ) بانگی بۆ ئەکرد و خۆی وێنەی رێك و راست بوو بۆی.

تەنها ئەم گۆڕاندن و گواستنەوە بەس بوو بۆ دوژمنایەتی و بەر بەرەکانێ لە نێوان ئەم ئایین و ئاقیدە تازە و هەڵگرانی ئالآکەی و نێوان قورەیش و بیر و باوەڕە لارو چەوتەکەی. بەڵام ئەمە تەنها هۆیەك نەبوو. بەڵکو لەگەڵ ئەمەدا چەند شتێ تریش بوو گرنگ تر و بەهێزتر، لەبارەی کۆمەڵایەتی و دەروونی و چینایەتی و سوود و بەرژەوەندی شەخصی ئەمانە هەموو کەوتبوونە کارو پاڵ پێوە نەرێکی زۆر بەهێز بوون بۆ بەرپا بوونی ئەو دوژمنایەتی یە و تێ کۆشانە لەلایەن بێ بڕواکانەوە بۆ لەناوبردنی ئەم ئایین و ئاقیدە تازەیە و بڕین و هەڵکەندنی ئەو ئەمانە تازەیە پێش ئەمەی دامەزرێ و ریشە داکوتێ و پەل

بهاوێژێ. به تایبەتی لەپاش ئەوەی بانگ کردن و بانگەوازەکە بە تەواوی ئاشکرا بوو و بەرە بەرە شوێن کەوتووی بۆ پەیدا ئەبوو، قورئانیش پەیتا پەیتا ئەهاتە خوارەوە لاری و نەگونجاوی و بێ کەڵکی و زیانی ئاقیدە و ئاییینی ئەوانی دەرئەخست و روونی ئەکردەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) هەرچەند پێغەمبەربوو، هەرچەند(وحی) سروشی لە خواوە وەرئەگرت، هەرچەند پەیوەستی هەبوو بە کۆمەڵی هەرە بەرزەوە بەڵام لە هەمان کاتدا ئادەمی بوو، هەستی ئادەمێتی رووی تێ ئەکرد. دووچاری ئەو بەرگری و بەربەستە بەتینە و ئەو جەنگە بەهێزە ئەبوو لەلایەن بت پەرستەکانەوە خۆی و ئەو کۆمەڵە کەمە کە بڕوایان پێ هێنابوو ئەو هەموو ئێش و ئازارە بەتینەیان ئەچەشت.

خۆی و ئەو تاقمە کەمە ئەو دەم درێژی و چەنە بازی یەیان ئەبیست کە ئەکرا دەربارەی شەخسی پێغەمبەر(ﷺ) ئەیان وت پیێ شێتە و ئەم قسە ناڕەوایە کە لەم سورەتەدا ئەیگێڕێتەوە لێیانەوە یەکێ بوو لەو هەموو تانە و تەشەرو لاقرتێ زۆر و فراوانەی کە قورئان باسیان ئەکات لە سوورەتەکانی ترا , و ئاراستەی پێغەمبەر و بڕواداران ئەکران. تەشەرو لاقرتی پێ کردن – لەگەڵ کەمی و لاوازیدا – ئازاری بەتین ئەدەن بە دەروونی ئادەمی، با ئەو ئادەمی یە پێغەمبەریش بێت. ئەمانە هەموو بوون بێجگە لەو هەموسزای لەشی یە کە ئەکرا دەربارەی بڕواداری بێ کەس. یا ئەو بڕوا دارانەی کە کەس و خزمی زۆر نزیکی خۆیان بەسەریان ئەهێنان.

جار لەبەر ئەوە ئەبینی لە سورەتە مەکەیی یەکانا خوا پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو کۆمەڵە بڕوا دارە پەروەردە ئەکات و بەخێویان ئەکات. دڵخۆشی و دڵنەوایی یان ئەکات، وەسف و سەنایان ئەکات و بەرپەرچ و دەم کوتی بێ بڕواکان ئەکاتەوە، بێ هێز و بێ دەسەڵاتەکان دڵ ئارام ئەکات و خۆی ئەکات بە خاوەن جەنگ لەگەڵ دوژمنەکانیان. لەناو بەناوی ئەو دڵنەوایی و دڵ بەهێز کردنەوە هێرشی پشت شکێن و هەڕەشەی سامناک ئەباتە سەر دوژمنە بێ بڕواکان... لەمانەوە دەرئەکەوێ سەختی و زۆر بەتینی ئەو ماوەیە کە تێ پەڕی کرد بەسەر ئەو کۆمەڵە کەم و کەم دەسەڵاتەدا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ﴿١﴾

ئینجاباگویٚ شل کەین بۆسورەتەکەو دەست بکەین بە تەفسیری لەبەر رووناکی ئەو باسە گرنگەی کردمان بە پێشەکی بۆی. خوای گەورە ئەفەرمویٚ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * نٓۚ﴾ لەبارەی ئەم پیتە و وێنەیەوە کە هەمووی چواردەن و لەسەرەتای(٢٩) سورەتەوە هەن ئەندازیٚ بە درێژی دواین لەسەرەتای سورەتی(یس) وە. دەست نیشانمان کرد بۆ ئەو را جیاوازانەی کە هەن تێیانا لەلایەن زانایانەوە.

کەواتە لێرەدا هیچ نالێین و با سەرنجی ئەویٚ بدریٚ. ﴿وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾ سوێن بە قەڵەم و ئەوەی ئەینووسن و دێری ئەکەن. ئەم سوێنە رێزو نرخی نووسین و خوێندنەوە دەرئەخات. تەمیٚ کردن و سەرنج راکێشانە بۆیان، ئەوەش لەکاتێکا و لەناو گەل و ئوممەتێکا کە بیٚ ئاگا بوون لەو نرخ و گرنگی یەوە بەرەو ئەوە نەئەرۆیشتن و بە دڵیانا نەئەهات فێربوون و زانین لەو رێگایەوە، نوسین تێیانا زۆر کەم و دواکەوتووبوو، لەکاتێکا کە ئەو کارو فەرمانە گەورەی کەبۆی بڕیار درابوو نوسرابوو لای خوا و لەزانین و بڕیاری خوادا پێویستی بوو بە پەرەسەندن و گەشە کردنی نووسین و خوێندنەوە و بڵاو بوونەوەیان، بۆ ئەمەی هەڵسن بە گواستنەوە و گەیاندنی ئەو ئاقیدە و شەریعەت و بەرنامەی ژیانە بۆ هەموو ناوچەکانی زەوی، ئینجا هەڵسیٚ بە سەرکردایەتی ئادەمی، بە سەرکردایەتی یەکی راست و تێر و تەواو.

بیٚ گومان نوسین و خوێندنەوە کەرەسەیەکی سەرەکی و بنەڕەتی یە لە هەڵسان بەو کارو فەرمانە گرنگەدا. بەڵگەیە تریش لەسەر ئەو مەبەستە ئەمەیە کە یەکەم جار قاپی سروش(وحی) کرایەوە بە سەرەتای سورەتی(العلق) کە ئەویش نرخ و گەورەیی نووسین و خوێندنەوە ئەگەیەنیٚ و دەست نیشانی بۆ ئەکات.

رووی فەرمودەکەیشی ئەکاتە پێغەمبەری نەخوێندە(ﷺ) کە خوا ویستی و بڕیاری دا نەخوێندە بیٚ لەبەر ئەوەی خۆی بەخۆی بەڵگە و نیشانەیەکی روون بێت لەسەر پێغەمبەری یەتیەکەی و بۆ ئەمەی دەمی بیٚ بڕواکان ببەستریٚ لە پڕوپاگەندە کردن بەوەی کە ئەم قورئانەی وەرگرتووە لە خەڵکی و نوسینەوەی لەبەر نوسراو و وتراوی ئەوان.

**خوای گەورە ئەو سوێنە گەورەی خوارد و سوێن لەسەر خوراوەکەی لێرەدا سێ شتە:**

١- ﴿مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ﴾ ئەی پێغەمبەر تۆ - بەهۆی لوتف و چاکەی پەروەردگارتەوە - بێ گومان شێت نیت. لەم ئایەتە کورتەدا دوو شتی گرنگی گەیاند سەبارەت بە پێغەمبەر(ﷺ):

یەکەم: چاکە و لوتفی خوا بۆی بە شێوەیەك نزیکی و خۆشەویستی نیشان ئەدا کە ئەفەرموێ: ﴿رَبِّكَ﴾ ئەوەش بە پێی یاسای رەوانبێژی(البلاغة).

دووەم: دوور خستنەوەی لەکەو تەشەری شێتی کە بێ بڕواکان دەست هەڵبەستیان کرد و دەم درێژی یان پێ کرد کە ئەوە بە هیچ جۆر کۆ نابێتەوە لەگەڵ لوتف و چاکەی خوا بەسەر ئەو بەندەیەوە کە بە نزیك و هەڵبژێراو و تایبەتی خۆی نیشانیدا.

بەڕاستی هەرکەس شارەزا بێت لە کردار و رەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) لەناو گەلەکەیدا زۆر سەرسام ئەبێت و سەری سوڕ ئەمێنێ لەم قسە زۆر ناڕاست و ناڕەوایە کە ئەو نەفامانە کردیان دەربارەی، لەکاتێکا کە ئاشنا و شارەزا بوون لە ژیری بەرزو بەهێزی، تەنانەت ئەوەبوو چەند ساڵێ پێش پێغەمبەرێتی کردیان بە قسەو فەرمان رەوا لە دانانی(حجر الأسود) دا کە گرنگ ترین رووداو بوو لە مێژووی ئەو گەلەدا. لەپێش ئەوەیشەوە نازناویان کرد بە(الأمین) واتە راست و جێگای بڕوا و هەمیشە سپاردەیان لا دائەنا تەنانەت لە رۆژی کۆچ کردنیشی بۆ مەدینە چەند سپاردەیەکی ئەو دوژمنانەی لابوو، (علی کوڕی ئەبو تالیب) - کرّم الله وجهه - بەجێ مالەمەککەدا چەند رۆژێ تا ئەو سپاردەیانەی داوە بە خاوەنەکەی، لەکاتێکاکەلەپێی سەری پێغەمبەرئەگەڕان ودوژمنایەتی یەکەیان گەیشتبووە ئەوپەڕی پلەی.

ئەوانە هەرگیز تەنها درۆیەکیشیان لێ نەدیبوو لەپێش پێغەمبەرێتیشدا. ئەوەبوو(هرقل) پرسیاری کرد لە ئەبو سفیان: ئایا لەپێش داوای پێغەمبەرێتی دا درۆتان لێ دیوە؟ ئەویش وتی نەخێر. ئینجا هرقل یش وتی: ئەو کە درۆ لەگەڵ مەردومدا ناکات درۆ لەگەڵ خوادا ناکات! ئەو وەڵامی ئەبوو سوفیانەش لە کاتێکا بوو پێش موسڵمان بوونی و یەکەم دوژمنی پێغەمبەر بوو(ﷺ). بەڕاستی زۆر سەر سووڕ ئەمێنێ لەمەی قین و خەشم بگاتە ئەو رادەیە کە ئەو جۆرە قسە ناڕاست و ناڕەوایە بکات بە مەردوم دەربارەی پیاوێ وا بەرز و بەڕێز. کە بەناوبانگ بێت بەژیری وخووڕەوشتی پاك وخاوێن، بەڵام چی ئەکەیت لە کینە و دوژمنایەتی کەکابراکوێر و کەڕ ئەکات، و درۆی وا زلی پێ ئەکات لە کاتێکا خۆیشی ئەزانێ درۆ ئەکات!!

وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾

٢- ﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾ وه بەڕاستی و بێ گومان بۆ تۆ هەیە ئەجرو پاداشتێکی گەورە کە نەبڕاوە و دوایی نەهاتوو. ئەجرو پاداش لای پەروەردگارت کە چاکەی رشت بەسەرتابە پێغەمبەرێتی و پایە و پلەی بەرز و بەڕێز. بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی دڵنەوایی و دڵخۆش کردنە. ئایا کەسێ خوا موژدەی وا گەورەی بداتێ ئەبێ ئیتر دەربەستی چی بێ؟ ئایا دوژمنایەتی و پشت تێ کردنی ئەو نەفامانە و دەم درێژیی یان چ نرخێکی ببێ و چ زیانێ بدا؟

٣- ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ وە بەڕاستی و بێ گومان تۆ لەسەر خوو رەوشتێکی گەورەی.

بەڕاستی ئەمە شایەتی هەر گەورەو رێزگرتن و رێز پێ دانێکە زوبان و قەڵەم کول و کۆڵە لە روون کردنەوەی رادەو پلەیان، ئەمە شایەتی یەکە لە لایەن خواوە، لە تەرازووی خوادا، بۆ بەندەی خوا.

بەڕاستی هیچ کەس ناگات و پەی نابا بە ئەندازەی نرخ و گەورەیی ئەوەی ئەم رستەیە ئەیگەیەنێ! ئەم رستەیە گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەیەنێ لە چەند بارو روویەکەوە. ئەیگەیەنێ لەم بارەوە کە ئەمە لەلایەن خواوە هاتووە، لە گەورەترین کتێبیا هات و وتنەکەی کرا بە عیبادەت و خوا پەرستی هەتا هەتایە. وە ئەیگەیەنێ و دەر ئەکەوێ لەبارەی توانینی وەرگرتنی ئەم وەسف و سەنا گەورەیە لە پەروەردگاریەوە، کە ئەم خۆی باشتر لە هەموو کەس ئەو پەروەردگارە ئەناسێ و باشتر تێ گەیشتووە لە گەورەیی و دەسەڵاتی، وە ئەزانێ خۆی چی یە لە چاو ئەو گەورەیی و دەسەڵاتە بێ سنوورەدا.

بەڵێ بەڕاستی توانین و خۆ راگیر کردنی بەرانبەر ئەم خەڵاتە گەورەیە، بە ئارام و دامەزراوی بەڵگەیەکی روونەلەسەرگەورەیی ئەم بەندەهەڵکەوتووە هەڵبژێرراوە(ﷺ). لەبارەی گەورەیی کردار و رەوشتی یەوە چەند شتی جۆر بەجۆری زۆر گێڕراوەتەوە لە کتێبەکانی سیرەت و لەسەر زوبانی هاوەڵەکانی. واقیعی رەوشتی شایەتێکی گەورەترە لە هەموو ئەوشتانەی کەباس کراوە وگێڕاویانەتەوە. بەڵام ئەم کەلیمە و رستەیە لە هەموو شتێ تر

باشتر ئەو گەورەیی یە ئەگەیەنێ و گەورەترە لە هەموو ئەوانی تر، گەورەترە بەمەی لەلایەن خوای گەورەوە هات. گەورەتر بەهۆی توانین و خۆراگیر کردنی لە کاتێکا کە چاك ئەزانێ ئەو کەسەی ئەمەی پێ فەرموو کێ یە، ئینجا وەك وەری گرت لەپاشا مایەوە بە ئارام و دامەزراوی بە بێ لە خۆ گۆڕان و خۆ بەزل زانی و خۆ بەرز کردنەوە بەسەر هیچ بەندەیەکا، لە کاتێکا ئەم شتە گەورەی بیست و وەرگرت لەخوای گەورەی بەرز و بڵند!

خوا خۆی باشتر ئەزانێ پەیام و پێغەمبەرێتی بەکێ ئەدات. بێ گومان تەنها محمد(ﷺ) شایان و شایستە بوو بۆ هەڵگرتنی ئەم پەیام و پێغەمبەرێتی یە دوایی یە بەو هەموو گەورەیی و فراوانی یەوە.

تەنها ئەم هاوکێش و هاوتای بوو، هەرچۆنێ بوو بە وێنە و نوێنەرێکی راستەقینە بۆی.

بێ گومان ئەم پەیام و پێغەمبەرێتی یە دوایی یە جوانی و تێرو تەواوی و گەورەیی و فراوانی و راستی و شیاوی لە رادەیەکایە، کە ئەبێ هەڵگرەکەی پیاوێ بێ خوا بەم جۆرە وەسف و سەنای بکات. کەواتە ئەبێ پیاوێ بێ بتوانێ ئەم وەسف و سەنایە وەرگرێ و هەڵی گرێ، بە دامەزراوی و بە ئارامەوە.

دامەزراوی ئەو دڵە گەورەی کە جێگای ئەم پێغەمبەرێتی یە گەورەیە و ئەو وەسف و سەنا گەورەیەی تیا ببێتەوە. ئینجا لەپاش ئەوە بتوانێ ئەنگ و گلەیشی وەرگرێ لەسەر هێندێ کردەوەی، هەر بەو دامەزراوی و ئارامەوە.

ئەمیش وەکو وەسف و سەنا کە دەربڕێ و رایگەیەنێ بە مەردوم چون یەك، هیچ شتێ نەشارێتەوە نەلەم ونەلەو ولە هەر دوو بارەکەدا پێغەمبەرێکی بەرێزە. بەندەیەکی گوێڕایەڵە و راگەیەنەرێکی راستی بڕواپێکراوە. بێ گومان بارە راستەقینەکەی ئەم پێغەمبەرە بەشێکە لە بارە راستەقینەکەی ئەو پەیام و پێغەمبەرێتی یە. گەورەیی یەکەی بەشێکە لە گەورەیی ئەو. بارە راستەقینەکەی وەك باری راستەقینەی ئیسلام ئەوەندە بەرز و بڵندە دووربین و رەسەدی ئادەمی ناگەن پێیان و بەراوورد ناکرێن و سنووریان دیاری ناکرێ پێیان. بەڕاستی تەنها محمد(ﷺ) بەرز بووە بۆ ئاسۆی ئەم گەورەیی یە. بەڕاستی تەنها ئەم گەیشتە

لوتکە و پۆپەی هەرە بەرزی تێرو تەواوی ئادەمێتی. تەنها ئەم هاوتا و هاوکێشی ئەو پێغەمبەرێتی یە جیهانی یەیە، بەجۆرێ بوو بە ئاوێنەیەکی بێ گەردی بالأنما بۆی، وە ئەو پێغەمبەرێتی یە ئەگەڕا بەسەر زەوی دا لە ڕواڵەت و شێوەو دیمەنی ئادەمیدا.

تەنها ئەم بوو کە خوا زانی شایستە و شیاوی ئەو پلە و پایەیە. خوا لەم پەیامەدا جاڕی دا کە ئەم پێغەمبەرە لەسەر خوو ڕەوشتێکی گەورەیە. جاڕیدا کە خۆی و مەلائیکەتەکانی سەڵەوات ئەدەن لەسەری. بێ گومان تەنها خوا توانایە بەسەر ئەوەی بەندەیە لە بەندەکانی بەو جۆرە بەرز بکاتەوە و ئەو هەموو چاکەی بەسەرا بڕێژێ.

ئینجا ئەم ئایەتە بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر ڕێزو بەرزی خووڕەوشت لە تەرازووی خوادا و سەرەکێتی و دامەزراوی خوو ڕەوشت لە ئایینی پاکی ئیسلاما وەکو سەرەکی و دامەزراوە لە پێغەمبەرەکەیا(ﷺ). ئەو کەسەی کە وورد ببێتەوە لەم ئاین و ئاقیدەیە، وەك ئەو کەسەی کە سەرنجی ڕەوشتی پێغەمبەرەکەی ئەدات بۆی دەرئەکەوێ کە خوو ڕەوشت بەشێکی ئاشکرایە تیایا و بنەڕەتە لە هەموو ئاوچەیەکیا... بانگ کردنی گەورەو گرنگ لەم ئاین و ئاقیدەدا بۆ پاکی و خاوێنی و ڕاستی و داد و بەزەیی و چاکە و پاراستنی پەیمانە، بۆ یەك بازی و یەك ڕوویی و ڕێکی و جووتی قسە و کردەوە، و جووتی و ڕێکی ئەم دووانە لەگەڵ نیاز و دەروونىدا، بۆ جڵەوگیری لە زۆر و ستەم و فڕو فێڵ و ناپاکی و خواردنی ماڵی مەردوم بە ناهەق و ناڕەوا، لە دەست درێژی بە هەموو جۆر و بەشێکی یەوە، وە ئاژاوە نانەوە و خراپەکاری و بڵاو کردنەوەی کاری ناشیرین.

دانانی یاساکانی ئەم ئایینە بۆ پارێزگاری ئەو بنەڕەتانەیە و پاراستنی خوو ڕەوشت لە هەست و کردار و دەروون و ویژدانا و لە واقیعی گەڵدا. لە هەموو پەیوەندی یەکانی گەل و ئەندامەکانی و دەوڵەتدا بە تێکڕایی. پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿إنما بُعِثتُ لأتَمم مَكَارِم الاخْلاق﴾ من ڕەوانە کراوم هەر بۆ ئەوە کە خوو ڕەوشتە چاکەکان تەواو بکەم و بیان گەیەنم بە پایان کەواتە کورتە و پاڵفتەی پێغەمبەرێتی یەکەی ئەکات بەو مەبەستە بەرزە. فەرموودەکانی یەك لەدوای یەك ئەهاتن بۆ فەرماندان و هاندان لەسەر هەموو ڕەوشتێکی

چاك. رەوشت و کرداری خۆیشی لە بەرزی و پاکی دا گەیشتە ئەو رادەیە کە خوای گەورە لە قورئانەکەیا پێی فەرموو: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ وە بەم رستەیە رێزو بەرزی پێغەمبەرەکەی دەرخست(ﷺ) هەرچۆنێ گرنگی و بەرزی خوو رەوشتیشی پێ دەرخست لە بەرنامەکەیا کە ئەم پێغەمبەرە بەرێزە هێنای و زەوی پێ پەیوەست کرد بە ئاسمانەوە، دڵی ئەوانەی پێوە بەست کە خوای خۆیان ئەوێ لە کاتێکا کە رێنوومایی یان ئەکات بۆ خوو رەوشتی چاك کە خوا پێی خۆشە و رازی یە لێی.

کەواتە ئەم رەوشت و خووە پاکە کە ئیسلام ئەوەندە بە گرنگ گرتوویەتی و پێ ویستی کردووە شتێك نی یە لە زەوی هەڵ قوڵاَ بێ و بە گوێرەی جێ و شوێن و ئاوو هەوا پەیدا بوو بێ و یا پەیدا ببێ و بە پێی باوو بەرژەوەندی پەیوەستی ناو گەل و چینەکان فەراهەم نەهاتووە. بەڵکو ئەو خوو رەوشتانە لە ئاسمانەوە هاتوون و وەرگیراون وە لە سیفەت و رەوشتە بەرزە بێ سنورەکانی خواوە هاتوون بۆ ئەمەی ئادەمی بەپێی تەوانا نموونەیەکیان لێ پێك بێنێ تا بەهۆی ئەوە ئادەمێتی بەرزو بەرێزی خۆیان پێك بێنن، تا ببن بە شایستە بۆ ئەو رێز پێ دانەی کە خوا پێی بەخشین و گێرانی بە جێ نشین لەزەویدا و تا شیاو بن بۆ بەرزترین ژیان لە رۆژی دواییدا.

جا لەبەر ئەوە ئەم خوو رەوشتە نەبەستراوە بە هیچ هۆیە لەم هۆیانەی کە لە زەوی هەڵ ئەقوڵێن و پەیوەست نین بە هیچ سنوورێ لە سنوورەکانی یەوە، بەڵکو بەرەڵاَ و مەرەخەسن لە هەموو شتێ لەوانە. ئینجا ئەم رەوشتە شیرینانە چەند یەکە یەکەیە نین بە تاك و تەنها: راستی، داد، بەزەیی، چاکە. بەڵکوهەموو بەرنامەیەکن تەواوکەری یەکترن، هەمووناوچەکانی ئەم شەریعەتە کۆ ئەبنەوە تیایا و کۆمەك و قۆڵگیری یەکن تیایا، هەموو بیروباوەڕی ژیان و رووپەڕەکانی ژیانی لەسەر راگیرە و هەموویشی لەدوایی دا ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا. نەك بۆ هیچ شتێ تری ئەم زەوی جیهانە! بێ گومان ئەو رەوشت و خووە ئیسلامی یانە بە هەموو شیرینی و تێری و تەواوی و دامەزراوی و رێك و راستی و بێ زیادە رەوی و کەم و کوڕی کۆبوونەوە لە پێغەمبەری ئازیزدا(ﷺ).

فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ
بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ﴿٩﴾

ئەم ئایەتە کورتە کە ئێستە ئەژین لە سایەیا ئاوێنەیەکی باڵانومای بێ گەردە بۆ ئەو و ئەوانە هەموو. لەپاش ئەو وەسف و سەنا گەورەیە ئینجا ئەم بەندەی خوا دڵنیا ئەکات بۆ دوا رۆژی لەگەڵ ئەو بت پەرستانەی کە دەم درێژی یان ئەکرد و ئەو لەکە ناجۆرەیان بۆ رەوا ئەدا، ئەم دڵنیائەکات و دوژمنەکانی ئەترسێنێ و هەڕەشەیان لێ ئەکات بەمەی بێ ئابڕوویان ئەکات و گومڕایی و سەر لێ تێك چوونەکەیان دەرئەخات ئەفەرموێ: ﴿فَسَتُبۡصِرُ﴾ ئینجا لەمەو پاش تۆ ئەبینی ﴿وَيُبۡصِرُونَ﴾ وە ئەوانیش ئەبینن ﴿بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ﴾ کە کامتان شێتە و باری شێتی دراوە بەسەرا. واتە باش دەرئەکەوێ بۆ تۆ و بۆ بێ بڕواکانیش لەمەو پاش کە کێ شێت و گومڕاو سەرلێ تێك دراوە، ئەمە بەڵێنی تیایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەرچۆنێ هەڕەشەیە لەوانەی کە دژی بوون و ئەیان ویست لەکەداری بکەن. ئەم بەڵێنە بەدی هات لە جیهانا بە زاڵ بوون و سەرکەوتنی ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان و سەرشۆڕی و لەناوچونی بێ بڕواکان و ئایینە پڕوپووچەکەیان، هەرچۆنێ لە رۆژی دوایشا بەدی دێت.

ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەو بەڵێن و هەڕەشەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بەڕاستی خوای تۆلەهەموو کەس زاناترەبەکەسێ کەلای داوە لە رێگاکەی خوا ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ وە ئەو لە هەموو کەس زاناترە بەوانەی رێنموومایی یان وەرگرتووە و لەسەر رێگای خوان. ئینجا بارو حاڵەت و هەستیان روون ئەکاتەوە، لە کاتێکا کە بەربەرەکانی و دەمەدەمەی لەگەڵ ئەکەن لەو ئایینە راستەی کە پێ یەتی، لەکەو نەنگ داری ئەکەن بەوەی کە ئەیکەن، لەکاتێکا کە خۆیان بیرو باوەڕو ئاقیدەیەکی دانەمەزراوی لەرزۆکیان هەیە و خۆیان وا نیشان ئەدەن کە دامەزراو و بەهێزن لەسەری. کەواتە بە تەواوی بڕوایان نییە بە ئاقیدەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ کەواتەگوێڕایەڵی بێ بڕواکان مەبە، واتە هەمیشەیی و بەردەوام بە لەسەر بەگوێ نەکردنیان وە رەق و بەهێزبە لەسەر

ئاقیدەو ئایینەکەت و نەرمی بەکار مەهێنە لەگەڵیان چونکە ﴿وَدُّوا﴾ ئەوانە پێ خۆشن و ئاواتیان بووە ﴿لَوْ تُدْهِنُ﴾ کە تۆ نەرمی بەکاربێنی لەگەڵیان، بەم رەنگە واز بێنی و دەست هەڵگری لە هێندێ شت کە ئەوان پێیان خۆشە، ﴿فَيُدْهِنُونَ﴾ ئینجا ئەوانیش نەرمی بەکار ئەهێنن، تا یەك کەون و بە بێ دەنگ بۆ خۆیان دانیشن و نەچن بەسەر یەکا.

کەواتە ئەوانە ئەیانەوێ مامەڵە و سەودا بکەن و هەر دولا هەنگاوێ بێنە پێشەوە تا لە ناوەڕاستی رێگەدا بگەن بە یەك، وەك ئەوانەی کە خەریکی خەرید و فرۆش و بازرگانین بەڵام ئاین و بازرگانی چوون یەك نین و زۆر جیاوازن. خاوەن ئاقیدە و ئاین ناتوانێ واز لە هیچ بەش و شتێکی بێنێ، چونکە گەورە و بچوك و ورد و درشتی وەك یەك وایە. بەڵکو لە ئاقیدەدا بچوك و گەورە نی یە. ئاقیدە یەك شتە و پێك هاتووە لە بەش و پارچەکانی و بەبێ هیچ کام بەدی نایەت وە هەموو بەش و پارچەکانی تەواوکەری یەکترن.

خاوەن ئاقیدە ناتوانێ بەگوێی هیچ کەس بکات تیایا و ناتوانێ واز لە هی شتێکی بێنی هەرگیز. بەهیچ رەنگێ ناگونجێ ئیسلام و نەفامی(جاهلية) بگەن بە یەك لە ناوەڕاستی رێگەدا، وە یا لە هیچ رێگایەکا. ئەوەیە بارو حاڵی ئیسلام لەگەڵ نەفامێتی دا(جاهلية) لە هەموو چەرخ و چین و شوێن و وڵاتێکا.

نەفامێتی لەمەوبەرو ئێستەو داهاتوو هەموو یەکسانەو ئەوەندە دوورن لە ئیسلام پرد نابەسترێ لە بەینیانا و دەست نادەن بۆ بەش کردن و پینە و پەیوەست کردن. بەڵکو ئەبێ هەر تێکۆشان و بەربەرەکانێ تەواوی و هەمیشەیی بێت و بەبێ یەك کەوتن. چەند ریوایەتێ هاتووە لەبارەی ئەوەی کە بت پەرستەکان ئەیانویست وازی لێ بێنن و نەرمی پێ بکەن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا ئەویش بەو جۆرە نەرمی بەکار بێنێ و بێتە پێشەوە، واز بێنێ لە قسەو وتن بەبت و بت پەرستی یەکەیان، یا ئەو شوێنی ئەمان بکەوێ لە شتێکی ئەمانا و تا ئەمانیش شوێنی ئاینەکەی ئەو بکەون، و بەهۆی ئەوە ئابروویان نەچێ لەناو گەلی عەرەبا!

ئەوەش بەپێی باوی ئەو تاقم و کۆمەڵانەی کە لەم جیهانەدا بەو جۆرە یەك ئەکەون و لەسەر بنەڕەتێ کە ناو ئەبرێ بە(انصاف الحلول) و گەیشتن بە یەك لە نیوەی رێگەدا. بەڵام

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوپەڕی رادە نەگۆڕاوو نەدۆڕاو بوو، لەبارەی ئایینەکەیەوە دامەزراو بوو، هەرگیز نەرمی رووی تێ نەئەکرد. ئیتر بێجگە لەوەدا لە هەموو کەس دڵ نەرم تر بوو لە هەموو کەس رەفتارو کردەوەی شیرین تر بوو، خاوەن چاکەبوو بۆ هەموو کەس بە تایبەتی لەگەڵ خزم و خوێش و کەس و کاریا، لە هەموو کەس سوورتر بوو لەسەر هەڵبژاردنی سوك و ئاسانترین بارو رێگا. بەلأم لەبارەی دینەوە هەمیشە بەپێی فەرمانی پەروەردگاری ئەجولأیەوە کە پێی فەرموو: ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ لە سەخت ترین کات و تەنگ ترین هەڵوێستی مەککە یا رۆژێ لە رۆژان بێ دەنگ نەبوولەتەنها وشەیە کە وتنی پێویست بووبێ لە رووی ئەو هەموو سەرکێشە دەسەلأت دارانەدا، بۆ دڵ خۆش کردنیان یا بۆ بەرگری ئەو هەموو سزاو ئازارەی کە هەڵئەسان پێی دەربارەی ئەو کۆمەڵە کەمە بێ دەسەلأتەی کە بڕوادار بوون.

هیچ رۆژێ لە رۆژان بێ دەنگ نەبوو لەروون کردنەوەی مەسەلەیە کە ئەیدا لە بیرو باوەڕەکەی خۆیان و باوباپیریان...(ئیبن و هیشام) لە سیرەتەکەیدا ئەگێڕێتەوە لە(ئیبن و ئیسحاق) ەوە کە لە یەکەم جارەوە قورەیش بەرپەرچی پێغەمبەریان نەدایەوە هەتا کەوتە باسی بتەکانیان ودووا لەخراپی و بێ نرخی یان. ئینجابەیەك جاردژی هەڵسان بێجگە لەوانەیان کە خوا نایە دڵیان و موسڵمان بوون و ئەمانەش زۆر کەم و زەبوون بوون لەچاو ئەوانا. ئەبو تالیبی مامی یارمەتیدا و بەرگری لێ کرد بەهۆی ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر کارو فەرمانی خۆی رۆیشت و ئایینەکەی خوای راگەیاند بە رێکی ئینجا قورەیش ئەوەیان بینی چەند کەسێ لە پیاو ماقوڵان چون بۆلای ئەبو تالیب و وتیان ئەی ئەبو تالیب ئەم برازاتە جوێن و قسە ئەڵێ بە پەرستراوەکانمان و ئێمەی بە نەفام دەرکردووە و باوك و باپیرمان بە گومڕا، کەواتە یا بەرگری بکە لەوەو کۆتایی پێ بێنە یان لێ ی گەڕێ بۆ خۆمان و پشتگیری مەکە، چونکە تۆیش وەك ئێمە دژی ئەو ئایین و کردەوەی ئەوی، کەواتە ئێمە بۆت چار ئەکەین! ئەبو تالیبیش بە قسەی خۆش و نەرم و شیرین وەلأمی دانەوە، ئینجا هەڵسان و رۆیشتن. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام لەسەر کارەکەی خۆی رۆیشت و ئایینی

خوای ئاشکرا ئەکرد و بانگی بۆ ئەکرد. بەهۆی ئەوە دوژمنایەتی یان بەتین تر بوو، و خەشم و رقیان لیٚ هەلٚگرت و کەوتنە هاندانی مەردوم لیٚی.

ئینجا جاریٚ تر چوونەوە بۆلای ئەبو تالیب وتیان: تۆ لەناومانا گەورەو بە نرخی وە ئێمە داوامان لیٚ کردی کە بەرگری ئەم برازاتە بکەیت و کەچی نەت کرد، سوێن بەخوا ئێمە خۆمان ناگرین لەسەر ئەمە کە جوێن بدات بە بتەکانمان و خۆمان بە نەفام دەرکات، کەواتە یا بیٚ دەنگی بکە لێمان یا لەگەلٚ ئەویش و تۆیش ئەجەنگین هەتا یەکێکمان لەناو ئەچێت.

دوای ئەوە یەکسەر هەلٚئەسن و ئەڕۆن. ئینجا(ئەبو تالیب) پیٚ ئەگیریٚ، لەلایەکەوە دلٚ رەنجان و دوژمنایەتی گەلەکەی ناخۆشە، وە لەلایەترەوە غیرەتی رێگا نادا واز بێنیٚ لەم برازایە بۆ ئەوان. ئینجا ئەنێریٚ بە شوێن پێغەمبەردا(ﷺ) و ئەلٚیٚ پیٚی: ئەی برازاکەم گەلەکەت هاتوون وا ئەلٚێن، کەواتە خۆت و منیش بهێلە، باریٚ مەخەرە سەرشانم کە نەتوانم هەلٚی بگرم.

پێغەمبەر(ﷺ) لە قسەکەیەوە وا گومان ئەبا کە مامی پەشیمانە لەو کۆمەکی یەی کە کردوویەتی و ناتوانیٚ یارمەتی بداو هەلٚسیٚ بەوەی کە لەمەوبەر پیٚی هەلٚساوە ئینجا روو ئەکاتە مامی و پیٚی ئەفەرمویٚ: ئەی مامە سوێن بەخوا ئەگەر ئەوانە خۆر لای راستمەوە دانێن و مانگ لای چەپمەوە دانێن لەسەر ئەمەی واز لەم کارە بێنم، وازی لیٚ ناهێنم تا خوا سەری ئەخات یا من تیا ئەچم لە پێناویا. پێغەمبەر(ﷺ) دلٚی پڕ ئەبیٚ و ئەگری لەپاشان هەلٚ ئەسیٚ. ئینجا کاتیٚ ئەڕواو پشتی تیٚ ئەکات ئەبو تالیب بانگی لیٚ ئەکات و ئەلٚیٚ کوڕی برام وەرە ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆلای. ئینجا ئەبو تالیب ئەلٚیٚ: کوڕی برام بڕۆ چیت پیٚ خۆشە بیلٚیٚ سوێن بەخوا هەرگیز بۆ هیچ شتیٚ پشتت مەرەخەس ناکەم.

ئەمە شێوەیەك بوو لە دامەزراوی و سووربونی لەسەر بانگ و بانگەوازەکەی لە کاتێکا کە مامی وازی لیٚ هێنا و دەس بەرداری بوو. کە یارمەتی دەرو پارێزگاری بوو، دواتر قەلاٚو سەنگەریٚ بوو لە زەوی دا کە بەرگری بکات لەو دوژمنانەی کە لەپەی سەری بوون!

شێوەیە تر هەر وەك شێوەی پێشوو(ئیبن هیشام) ئەیهێنیٚ لە(ئیبن ئیسحاق) هوە ئەویش لە(محمدی کوڕی کەعبی قرظی) یەوە ئەیهێنیٚ ئەلٚیٚ: بۆم باس کراوە کە(عوتبەی رەبیعە) کە

گەورە و سەرۆك بووە رۆژێ لە نادی قورەیش دا ئەبێ و پێغەمبەریش بە تەنها لە مزگەوتی کەعبەدا ئەبێ. ئینجا(عوتبە) ئەڵێ: ئەی گەلی قورەیش. با بڕۆم بۆلای محمد و چەند شتێکی بخەمە بەرچاو بەڵکو هێندێکی وەرگرێ ئینجا کامی پێ خۆشە ئێمە پێ ی ئەدەین و ئەویش کۆڵمان لێ بدا. ئەوە لە کاتێکدا بوو(حمزە) – خوا لێ ی رازی بێ – موسڵمان بوو بوو، ئەیانبینی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئەبن و زیاد ئەکەن. ئەوانیش ئەڵێن: ئەی(ئەبو الولید) بڕۆ بۆلای و قسەی لەگەڵ بکە. ئەویش ئەچێ و ئەڵێ: ئەی برازام: بێ گومان تۆ خۆت ئەزانی کە تۆ لەناو ئێمەدا پایەو پلەی بەرزت هەیە لە عەشرەت و نەژاد، تۆ شتێکی گەورەت هێنایە ناو گەلەکەت، کۆمەڵت تێك داون و بە نەفامت دەرکردوون، لەکەو عەیبت گرتووە لە پەرستراوو ئایینەکەیان و باوك و باپیریانت بەبێ بڕواو گاور دەرکردن. ئینجا گوێ بگرە چەند شتێ ئەخەمە بەرچاوت، بەڵکو هێندێکی وەرگری.

ئەویش فەرمووی: ئەی ئەبوالولید بڵێ گوێ ئەگرم و ئەی بیستم... ئەویش ئەڵێ: ئەی برازام ئەگەر تۆ لەم کارەی کە کەوتویتە سەری ماڵت ئەوێ ئەوەندە ماڵت بۆ کۆ ئەکەینەوە تا لە هەموومان ماڵت زۆرتر بێ، ئەگەر گەورەیی داوا ئەکەیت ئەوا ئەتکەین بە گەورەی خۆمان هیچ بڕیارێ نادەین بەبێ تۆ، ئەگەر پادشاییت ئەوێ ئەتکەین بە پادشای خۆمان، وە ئەگەر ئەمەی دێت بۆلات جنۆکەیە و ناتوانی خۆتی لێ رزگار بکەیت ئەوا هەوڵی پزیشك و چارەت بۆ ئەدەین و ماڵ و پارەت تیا بەخت ئەکەین هەتا رزگارت ئەکەین لێ ی. چونکە زۆر جار ئەو جنۆکە زۆر ئەسێنێ لە پیاو تا بە دەواو دەرمان خۆ رزگار ئەکرێ لێی.

بەو جۆرە عوتبە قسە ئەکات و پێغەمبەر(ﷺ) گوێ ی بۆ ئەگرێ تا لێ ئەبێتەوە وە ئینجا ئەفەرموێ: ئەبوالولید لێ بوویتەوە. ئەویش ئەڵێ: بەڵێ. ئەفەرموێ: دەی گوێم بۆ بگرە، ئەویش ئەڵێ باشە گوێ ئەگرم. پێغەمبەر(ﷺ) دەست ئەکات بە خوێندنی سورەتی (فصلت). (عوتبەش) گوێ ئەگرێ و بەبێ دەنگ دائەنیشێ هەتا پێغەمبەر(ﷺ) ئەگاتە ئایەتەکەی سوژدە ئەبا، لە ریوایەتێکا ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەگاتە ئەم ئایەتە: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَـٰعِقَةً مِّثْلَ صَـٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾ لەوێدا عوتبە هەڵئەسێ بە ترس و

داچڵەکانەوە دەست ئەنێ بەسەر دەمی پێغەمبەردا(ﷺ) و ئەڵێ نەکەیت بۆ خاتری خواو بۆ خاتری رەحم و خزمایەتی.

ئینجا کە لێ ئەبێتەوە ئەفەرموێ: ئەبوالولید بێ گومان بیستت ئەوەی کە بیستت. دەی ئەوە تۆو ئەمەش ئەمەیە. واتە قسەم هەر ئەمەیە کە بیستت..ئینجا(عوتبە) ئەگەڕێتەوە بۆلای هاوەڵەکانی، هەر لە دوورەوە ئەڵێن سوێند بەخوا(ئەبوالولید) گەڕایەوە بە روویەترەوە جیاواز لەو رووەی کە پێی رۆیشت. ئینجا کاتێ دائەنیشێ ئەڵێن: دەنگ و باست چی یە؟ ئەویش ئەڵێ: دەنگ و باسم ئەوەیە وتراوێکم بیست(واللە) هەرگیز وێنەم نەبیستووە،(واللە) نە شیعرە و نە جادوە و نە سیحرەو نە قسەی کاهینە، ئەی گەلی قورەیش بە قسەم بکەن، وەرن واز بێنن لەم پیاوە خەریکی چی یە با خەریك بێ، ئێوە کەنار گیر بن لێ ی،(واللە) ی ئەوەی کە من لێم بیست هەواڵێکی گرنگی گەورەی بەدەمۆیە.

ئەگەر عەرەب سەرکەوتن بەسەریا ئەوا بەهۆی ئەوان لە کۆڵتان ئەبێتەوەو سەرفراز ئەبن لێی. وە ئەگەر ئەم سەرکەوت بەسەر عەرەبا ئەوا سەرکەوتنەکەی سەرکەوتنە بۆ ئێوە، وە پادشایەتی یەکەی ئەبێتە پادشایی بۆ ئێوە، ئێوە لە هەموو کەس بەختیارتر ئەبن پێی. ئەوانیش وتیان:(واللە) ئەبوالولید بە دەم و زوبان جادووی لێ کردی. ئەویش ووتی: ئەمە رای منە لەو پیاوەدا، ئینجا خۆتان چی بە چاك ئەزانن وا بکەن.

ئینجا شێوەیە تری سێ هەم کە هەر لە(ئیبن و ئیسحاق) ەوە هاتووە کە ئەڵێ: جارێ پێغەمبەر(ﷺ) خەریکی تەواف ئەبێ.(ئەسوەدی کوڕی المطلب) و(ولیدی کوڕی موغەیرە) و(ئومەیەی کوڕی خەڵەف) وە(عاسی کوڕی وائل) کە ئەمانە قسە رەواو بەگوێ کراو بوون لەناو کەس و کاریاندا. ئەمانە دێنە رێگای و پێی ئەڵێن: ئەی محمد وەرە پێشەوە با یەك کەوین، بەم رەنگە ئەوەی کە تۆ ئەی پەرستی ئێمەیش ئەیپەرستین، تۆش ئەوە بپەرستە کە ئێمە ئەیپەرستین کەواتە هەردوو لامان بەشدار ئەبین لەم کارەدا.

وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ
زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾
سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾

---

جا ئەگەر پەرستراوی تۆ چاکتر بوو ئەوا بەشی خۆمانی لیٚ وەرئەگرین، وە ئەگەر پەرستراوی ئێمە چاکتر بوو ئەوا بەشی خۆتی لیٚ وەرئەگری! ئینجا سورەتی(الکافرون) دێتە خوارەوە بەو شێوە بەهێزە دووری و جیاوازی ئەخاتە نێوانیان کە بە هیچ کلۆج یەك کەوتن نابیٚ و ئەو تیٚ کەڵ و پێکەڵی یە ناگونجیٚ. ئینجا هەمیتر نرخی خوو رەوشتی شیرین دەرئەخات بەمەی بەرگری و جڵەوگیری پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات لە گوێرایەڵی و بەگویٚ کردنی هیچ کام لەو بیٚ بروایانە، وە چەند رەوشت و ناونیشانێکی ئابروبەری قیزەوون کەریان بۆ باس ئەکات. ئەفەرمویٚ: ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ﴾ گوێرایەڵی هیچ کەسێکی زۆر سوێن خۆر مەبە. زۆرتر پیاوی زۆر سوێندخۆرکە بە حەق و ناحەق سوێن ئەخوات ناڕاست و درۆزنە، ئەزانیٚ مەردوم بڕوای پیٚ ناکەن و بە درۆزنی ئەزانن، بەهۆی ئەوە سوێنی زۆر ئەخوات بۆ ئەمەی بڕوا بە قسەکەی بکریٚ و درۆکەی بچەسپێنیٚ ﴿مَّهِينٍ﴾ کە ئەو زۆر سوێن خۆرە بیٚ نرخ و سوك و ترۆیە لە دەرونی خەڵکا با بە رواڵەت دەست دارو بە دەسەلاتیش بیٚ. نیشانەی سوکی و ریسوایی یەکەی ئەوەتە سوێند زۆر ئەخوات، باوەری نی یە بەخۆی و جێگای بڕوایش نی یە بۆ خەڵك. ﴿هَمَّازٍ﴾ زۆر لەکەو رەخنە گرە لە مەردوم لەبەرەو روو پاش ملیٚ.

ئەم کردەوە نارەوایە ئیسلام زۆر دژیەتی و بە تایبەتی جڵەوگیری لیٚ ئەکات، وە دژو پێچەوانەی پیاوەتی یەو پێچەوانەی باوە لەناوپیاوانا. ﴿مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ﴾ زۆر قسە گێرو هاتوچۆکەرە بە قسە لەناو خەڵکا بۆ بەین تێك دانیان و پچڕینی پەیوەندی و پەیوەستی یان. هەرکەس ریٚزی خۆی بەلاوە بێت و بەتەمای ئەوە بێت ریٚزی بگیریٚ کاری وا ناپەسەند ناکا بە پیشە بۆخۆی. لە بارەی خراپی ئەم سیفەتەوە چەند حەدیسی دڵ داچڵەکێنەر هاتووە. یەکیٚ لەوانە ئەم حەدیسەیە کە(ئیمامی احمد) ئەیهێنیٚ لە(حذیفەوە): ﴿لا یدخل الجنة قتات﴾ ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی کە زۆر قسە گێرە بۆ بەین تێك دان.

﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ﴾ زۆر ڕێگرو بەرگری کەری خێرو چاکەیە. بێ گومان ئەو کەسەی کە ئەیەوێ مەردوم لەڕێگای خوابترازێنێ سەردەستەو پێشەوایە لەم سیفەت و کردەوە پیسەدا. ﴿مُعْتَدٍ﴾ دەست درێژی کەرەو لە ڕاستی و دادو لە سنووری خوا تێ پەڕ ئەکات. بێ گومان زیادە ڕەوی و دەست درێژی لە ئیسلاما ئێجگار بێزراو ناپەسەندە لە هەموو شێوەو وێنەیەکیا. تەنانەت لە عیبادەت و خواپەرستنیشا زیادە ڕەوی نەویستراوە و ناپەسەندە.

﴿أَثِيمٍ﴾ گوناهکارە. واتەئەوەندەخراپەکار و تاوانبارە ئەو ناو و سیفەتەی بەسەرا براوە.

﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ لەپاش ئەو سیفەتە خراپانە و زیاد لەوانە دڵ ڕەق و قسە ڕەقە، بە توندی و تیژی ڕەفتار ئەکات لەگەڵ مەردوم دا. ئەم وشەیە بۆ چەند مەبەستێ بەکار ئەهێنرێ هەموو هەر خراپ و بەدن. ﴿زَنِيمٍ﴾ لە کارتەو بێ ئەسڵە لەناو گەلا. یا حەرام زادەیە و بە شێوەی حەلاڵ پەیدا نەبووە یا بەناوبانگ و ناسراوە بە خراپی و بەدکرداری.

ئەمە دواترین سیفەت و نیشانە بوو لەو نۆ سیفەت و نیشانەی کە کۆ بووە لە دوژمنێ لە دوژمنەکانی ئیسلاما کە زۆربە لەسەر ئەوەیە مەبەست(وەلیدی کوڕی موغەیرە) یە.

بێ گومان هەرکەس دوژمنی ئیسلام بێ و بەو جۆرە سور بێ لەسەر دژایەتی و دوژمنایەتی ئیسلام ئەبێ ئاوا کانێ بەدخو و بەدکردار بێ و دوچاری نەفرین بێ لە هەردوو جیهانا. خوا بەبەزەیی خۆی بمانپارێزێ و پاکمان بکاتەوە لە نیشانە و دروشمی ئەو جۆرە سیفەتانە کە هۆی خەشم و نارەزای خوان – آمین –.

ئینجا بەدوای باسی ئەم سیفەتە ئابڕوبەرو ڕیسوا کەرانەدا زیاتر ئابڕوی بۆ ناهێڵێ بەباس کردنی هەڵوێستی نا پەسەندی بەرانبەر ئایەتەکانی خوا، هەڵوێستی ئەوپەڕی دەم درێژی وبێ شەرمی بەرانبەربەچاکەوبەهرەو بەخشینی خوا ئەفەرموێ: ﴿أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ﴾ لەبەرئەوەی خاوەنی ماڵ و دارایی و چەند کوڕێك بوو. ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا﴾ کاتێ ئایەتەکانی ئێمەبخوێنرێتەوەبەسەریا. ﴿قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾[1] ئەڵێ ئەمەنوسراوی پڕوپوچی گەلە

---

[1] ئەم تەفسیرە لەسەر ئەوەیە ﴿إن كان﴾ بەسترابێ بە ﴿قال﴾ و ﴿إذا﴾ تەنها زەرف بێت و بەم شێوە چاك جێگیر ئەبێ لەدلا. وە بە چەند جۆرێ تریش ترکیب کراوە کە بە پێی ئەوە تەفسیرەکە ئەگۆڕێ. ئەوانەش هەر ئەگونجێن. وە زانین بەڕاستی لای خوایە.

پێشووەکانە و درۆ و دەلەسەی کۆنە! ئای چەند ناشیرین و ناڕەوایە لە بەرانبەر و چاکەی خوا دەم درێژی ئاوا بکریّ دەربارەی ئایەتەکانی و لاقرتی بە پێغەمبەرەکەی بکریّ!!

بەڕاستی ئەمەیە تەنها هاوتای ئەو نۆ لەکەو سیفەتە پیسانە ئەوەستیّ کە باس کران و هاوتای هەموویانە. جا لەبەر ئەوە ئەم هەڕەشە گەورەو سامناکەی ئاڕاستە ئەکریّ لەلایەن خوای زاڵی دەسەلآت دارەوە: ﴿سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ﴾ داخ و نیشانەیەکی بۆ دائەنێین بەسەر لوتی یەوە. واتەئەولووت بەرزی و خۆ بەزل زانی یەی ئاهێڵین و ئەوپەڕی رادە ریسوا و سەرشۆڕی ئەکەین. ئەم هەڕەشەیە سیّ جۆر ریسوا کردن و بیّ ئابڕویی ئەگەیەنیّ:

یەکەم: داخ ونیشانەپیانان بەوێنەی بەندەکەئەوکاتەباوبووەنیشانەی بەندەیی پیا نراوە.

دووەم: بەکارهێنانی وشەی(خرطوم) بۆی کە ناوە بۆ لوتی بەراز یا فیل.

سیّ هەم: نیشانەیە کەوا بەسەر لووتەوە کە لووت و دەم و چاو بەرێزترو ئاشکراتری هەموو ئەندامی لەشە.

بیّ گومان ئێشی ئەم ئایەتانە لە دەروونی وەلیدا ئێجگار سەخت و بەتین بووە، چونکە ئەو لە گەل و ئوممەتیّ بووە کە بە نەنگ و لەکە و تەشەری شاعیران تێك ئەچوون و دنیایان لیّ ئەهاتە یەك چ جای ئەم زامدار کردنە لەلایەن پەروەردگاری ئاسمان و زەوی یەوەو لەم کتێبە گرنگەدا کە سەرسام و سەرگەردان بوون تیایا، تا رادەیەك هیچیان بۆ نەمایەوە ئەیانووت جادووە. بەڕاستی زامێکی کوشندەیە و زۆر شایستەیە بۆ دوژمنی ئیسلام و دوژمنی پێغەمبەری ئیسلام کە خاوەنی خوو رەوشتی گەورەیە(ﷺ).

ئینجا بە بۆنەی دەست نیشان کردن بۆ ماڵ و ئەولادی بیّ بڕواکان و کەشخە و یاخی بوونیان پێیان. بەم بۆنەیەوە داستان و سەرگوزەشتەیە باس ئەکات کە وا دەرئەکەویّ ناسراوو بەناوبانگ بوبیّ لایان، بەوە ئامۆژگاریان ئەکات بەدوا رۆژی لەخۆگۆڕان و یاخی بوون، بەرگری خێرو دەس درێژی بۆ سەر ماڤی مەردوم، ئاگاداریان ئەکات کە ئەو ماڵ و ئەولادەی پێیان دراوە بۆ تاقی کردنەوەیانە هەرچۆنیّ خاوەنەکانی ئەم داستانە تاقی کرانەوە بەو باغەی کە پێیان درا و سەرەنجامی تاقی کردنەوەکە هەرچۆنیّ رووی کردە ئەوان ئەبیّ دووچاری ئەم بیّ بڕوایانەش ببیّ، وەك لە چەند ریوایەتێکا هاتووە، ئەم باغچە لە ولآتی یەمەندا بووە، لە نزیکی(صنعاء)، لە ریوایەتێکا لە حەبەشە بووە لە یەکەم جارەوە خاوەنەکەی پیاوێکی چاك بووە ماڤی خوای لیّ دەرئەکرد.

إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ
وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾

---

**ئینجا کاتێ ئەو ئەمرێ و باغەکە ئەکەوێتە دەستی ڕۆڵەکانی ئەیانەوێ لەسەر ڕێگای باوکیان نەڕۆن و بەشی هەژاران نەدەن. ئینجا با گوێ بگرین لە قورئان باسەکەمان بۆ بکات.**

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ﴾ بەڕاستی ئێمە بێ بڕواکانی قوڕەیشمان تاقی کردەوە. واتە حاڵەت و باری ئەوانمان دەرخست ﴿كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ﴾ هەر چۆنێ خاوەنەکانی باخ و بەهەشتەکەمان تاقی کردەوە.**

**تاقی کردنەوە بە چاکە و خراپەو خۆشی و ناخۆشی ئەکرێتەوە، لە هەردوو بارەکەدا دەرئەکەوێ مل کەچی بەندە بۆ خوا یا یاخی بوونی، سوپاس و ناسوپاسی، ڕەزامەندی بەبەشی و ناڕەزایی و بێزاری. جا خوا ئەوانەی تاقی کردەوە بەوەی ئەو باخ و بەهەشتەی خستنە دەست، و کاتێ هەڵنەسان بە سوپاسی خواو بەزەیی یان نەهاتەوە بە بەندە هەژارەکانی خوادا، خوا تۆڵەی لێ سەندن و ئەوەی پێ ی دان لێ ی سەندنەوە.**

**وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِذْ أَقْسَمُوا۟﴾ تاقیمان کردنەوە کاتێ کە سوێنیان خوارد ﴿لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ﴾ کە بێ گومان بەرو میوەکەی ئەبڕن و ئەیچنن لەکاتێکا کەوتنە بەیانی و ڕۆژیان لێ بۆوە. ئەم سوێنەیان خوارد و بەبێ ئەوەی بیرێ بکەنەوە بۆلای خوا. لەبەر ئەوە ﴿وَلَا يَسْتَثْنُونَ﴾ نەیانووت ﴿إن شاء الله﴾ ئەگەر خوا ویستی و بیەوێ. یان سوێنیان خوارد کە بەشی هەژارانی لێ دەرنەکەن، وەك لە کاتی خۆیا باوکیان بەشی ئەوانی لێ دەرئەکرد بەڵکو ئەمان ویستیان هەمووی بۆ خۆیان بێت. بەو نیازو بڕیارە ناڕەواوە خەوتن و بێ ئاگا بوون لەوەی خوا بەسەریان ئەهێنێ.**

**﴿فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ﴾ ئینجادای بەسەر باخەکەیانا بەشەو دەردو ئافەتێ لەلایەن پەروەردگارتەوەو بە فەرمانی ئەو ﴿فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ﴾ بەهۆی ئەوە باخەکە وەك چنراو و بڕراوی لێ هات و هیچ بەرو میوەکەی نەهێشت ﴿وَهُمْ نَآئِمُونَ﴾ لەکاتێکا کە ئەوان خەوتوون و بێ ئاگان لەو بەسەرهاتە.**

فَتَنَادَوْا مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ اغْدُوا عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَانطَلَقُوا وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا
الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا عَلَىٰ حَرْدٍ قَادِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوا إِنَّا لَضَالُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾

---

﴿فَتَنَادَوْا مُصْبِحِينَ﴾ ئینجا کاتێ کەوتنە بەیانی و ڕۆژیان لێ بوویەوە بانگیان کردەیەکتر﴿أَنِ اغْدُوا عَلَىٰ حَرْثِكُمْ﴾ بەمەی زوو بڕۆن بۆ سەر باخ و کشتوکاڵەکەتان. ﴿إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بەرو میوە چنن. ﴿فَانطَلَقُوا﴾ ئینجا بەڕێ کەوتن و چوون ﴿وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ﴾ لەکاتێکا کە راوێژیان ئەکرد بە نهێنی. ﴿أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ﴾ بەمەی نەیەتە ناو باخەکە ئەمڕۆ بەسەر ئێوەدا هیچ هەژارێ. واتە ڕێگای هیچ هەژارێ نەدەن بێتە ناو باخەکە. ﴿وَغَدَوْا عَلَىٰ حَرْدٍ قَادِرِينَ﴾ وە بەیانی ڕۆشتن لە کاتێکا کە توانان هەر بەسەر بەرگریدا. واتە ئەوانە بڕیاریان دا لەسەر بەرگری هەژاران و ویستیان بێ بەشیان بکەن لەکاتێکا ئەیانتوانی بەشدارو بەهرەمەندیان بکەن، ئینجا دەسەڵاتیان هەر بەسەر بەرگری و بێ بەش کردنەکەدا مایەوە، چونکە هیچ نەما و هەرچی هەبووتیاچوو، یالەباتی دەست کەوتی خێروبێری باخەکەیان توانان بەسەر بێ بەش کردنی خۆیان لێ ی. بەڵێ ئەوانە هیچ نەما و توانا بوون بەسەر بەگری و بێ بەشی خۆیانا!!

ئەوانە بێ ئاگا بوون و بەو نیازو بڕیارە خراپەوە هاتن ﴿فَلَمَّا رَأَوْهَا﴾ ئینجا کاتێ باخ و بەهەشتەکەی خۆیان بینی بەو جۆرەی بەسەرهاتبوو نەیانناسی یەوە. ﴿قَالُوا﴾ وتیان ﴿إِنَّا لَضَالُّونَ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕێگامان ون کردووە و ئەمە باخەکەی ئێمە نییە. بەڵکو کە ورد بوونەوەو بۆیان دەرکەوت کە ئەوە وتیان: ﴿بَلْ﴾ نەخێر ئەوە ﴿نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ ئێمە بێ بەشی و بەش بڕاوکراین لێی.

ئینجا لێرەدا کە دەرکەوت تۆڵەی کردەوەی خراپ و یاخی بوون و چرووکی خۆیان دەوری دان و بەش بڕاوی کردن لەو کاتەدا ژیرتریان هاتە قسە لێیان و کردەوەی خراپی خۆیانی دا بەناو چاویانا.

قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَـٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ
يَتَلَـٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَـٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَـٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ
ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾

---

وا دەرئەكەوێ ئەوەیان رازی نەبووە بەڕاو بڕیارەكەیان. بەڵام لەبەر ئەوە تەنها بووە زۆر لەسەر قسەكەی خۆی نەڕۆیشت بەهۆی ئەوە ئەویش بەشداربوو لەو تۆڵەی ئەوان دا. بەڵام تەمێ و ئامۆژگاری یەكەی خۆیان بیر نەخاتەوە. وەكو ئەفەرموێ: ﴿قَالَ أَوْسَطُهُمْ﴾ باش ترو ژیرتریان وتی پێیان: ﴿أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ﴾ ئایا پێم نەوتن ﴿لَوْلَا تُسَبِّحُونَ﴾ یادی خوا بكەن و بگەڕێنەوە بۆلای خواو پەشیمان ببنەوە لەو نیازو بڕیارەتان. واتە تەمێ و ئامۆژگاریم كردن، بەڵام بە قسەتان نەكردم تا ئاواتان بەسەر هات. ئەو كاتە گوێیان بۆ نەگرت كە كات و هەلی خۆی بوو، بەڵكو لەپاش ئەوە هەل و كات لە دەست چوو پەشیمان بوونەوەو دانیان نا بە تاوانی خۆیانا و ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان ﴿سُبْحَـٰنَ رَبِّنَآ﴾ پاكی و بێ گەردی بۆ پەروەردگارمان ﴿إِنَّا كُنَّا ظَـٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە ستەمكار بووین.

﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَـٰوَمُونَ﴾ ئینجا لەناو خۆیانا روویان كردە یەكتر بە تەشەر لەیەك دان و یەكتر تاوانبار كردنەوە. ئەوەش وەكو باوە هەر تاقمێ دەست بدەنە كارێك و سەری لەزیان و خراپەوە دەرچێ هەركام ئەوانی تر خەتابار ئەكات.

ئینجا كۆتایی یان لەوە هێناو بەجارێ دانیان نا بە خراپی خۆیانا و ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان: ﴿يَـٰوَيْلَنَآ﴾ ئەی مەرگ و مردن بێ بۆ ئێمە، چونكە ئێمە هەر بۆ مردن چاكین ﴿إِنَّا كُنَّا طَـٰغِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە سەركێش بوین و لە سنوری خوا تێ پەڕمان كرد و سوپاسی خوامان نەكرد لەسەر چاكەو بەهرەكانی.

ئەم رق لە خۆ هەڵگرتن و جاڕدانیان لە خۆیان بە خراپی و ستەمكاری یان و دان نانیان بە دەست درێژی و تاوانباری یان بۆ ئەوە بوو بیكەن بەهۆی لێ بووردنی خواو بارینی میهرەبانی و بەزەیی خوا بەسەریانا، لەبەر ئەوە وتیان ﴿عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ﴾ ئومێدە پەروەردگارمان لە باتی ئەو باخەی كە لێ ی سەندین چاكتر لەومان پێ بدا. ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ﴾

بەڕاستی ئێمە هەر بۆلای خوا ئەگەڕێینەوە و ئەلالێینەوە بۆ بەجێ هێنانی داواو پێویستیمان و بۆ ئەمەی باشتر لە باخەکەی خۆمانمان پێ بدات.

ئەگێڕنەوە لە(موجاهید) ەوە کە ئەوانە گەڕانەوە بۆلای خواو، خوایش باشتر لەباخ و بەهەشتەکەی خۆیانی پێ دان. ﴿كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ﴾ سزای ئەم جیهانە بە وێنەی ئەو سزایە وایە کە بێ بڕواکانی مەککە و خاوەنەکانی ئەم باخەمان پێ تاقی کردەوەو کردمان بە تۆڵەی کردەوەی خراپیان ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ﴾ بێ گومان سزای ڕۆژی دوایی گەورەترە ﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بیانزانیایە و زانا بوونایە ئەیانزانی کە سزای ڕۆژی دوایی سەخت ترو گەورەترە.

ئەو حەلە خۆیان ئەپاراست لەهەر کردەوەیە کە ببێ بەهۆی ئەو سزا گەورەیە. ئا بەو جۆرو شێوەیە ئەو داستانەی هێنایەوە بۆ بێ بڕواکانی قورەیش، و دەست نیشانی کرد بۆیان کە باو و ڕەوشتی خوا چوون یەکە بۆ ڕابردو و ئێستە و هەموو کات. لەهەمان کاتدا بڕوادارانی بێدار کردەوە کە ئەو ماڵ و دارایی و دەسەلأت و خۆشی یەی کە خوا ڕشتوویە بەسەر ئەو بێ بڕوایانەدا هەمووی بۆ تاقی کردنەوەیە هەموو بەرهەم و دوا ڕۆژێکی هەیە. باوی خوا وایە بە خۆشی و بە ناخۆشی بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە.

ئینجا ئەوانەی کە سەرکێش و یاخی و خەڵەتاون بەخۆشی ئەم جیهانە و گەڕانەوەیان نابێ بۆلای خوا، ئەوانە دوا ڕۆژ و چارەنووسیان ئەو سزا زۆر گەورەیە ئەبێ کە باسی کرد.

لەخوا ترسەکان و وریا و خۆپارێزەرەکان سەرەنجام و دوا ڕۆژیان ئەمەیە کە بەم فەرمودەیە دەست نیشانی بۆ ئەکات: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ بێ گومان بۆ لەخوا ترس و خۆ پارێزەرەکان هەیە لای پەروەردگاریان بەهەشتانی نازو نیعمەت واتە بەهەشتانێ کە هەر نیعمەت و خۆشی تێدایە و پاك و بێ لەکەیە لەهەر ناخۆشی یەك.

ئەوەندە خۆشی یەکەی زۆرو فراوانە وەکو بەهەشتەکان لەناو خۆشی و نیعمەتا بن نەك خۆشی و نیعمەت لەناوئەوانابن. کەواتە ئەو دوو تاقمە هەرچۆنێ لەکردار و ڕەفتارا جیاواز و دژی یەکترن، وەهەرچۆنێ ڕێگاوبیروبڕوایان دژوجیاوازە،هەروەها دوا ڕۆژ و چارەنووسیشیان دژو جیاوازە. ئینجا دەست ئەکات بە لێ کۆڵینەوەیەکی روون و ڕەوان بەبێ گرێ و گیروگرفت. بەریان لێ ئەبڕێتەوەو تەنگەتاویان ئەکات بە پرسیار لەدوای پرسیار لە چەند شتێ کە تەنها وەلامێکیان هەیە و هەڵە و سەر لێ شێوانی تیا ناکرێ و هەڕەشەیان لێ ئەکات بە سزایەکی سەخت لە ڕۆژی دواییدا و بە جەنگێکی گەورە لەم جیهانەدا لەلایەن خوای دەسەلأت داری زاڵی بەهێزەوە.

أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمۡ فِيهِ لَمَا
تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمۡ لَكُمۡ أَيۡمَٰنٌ عَلَيۡنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمۡ لَمَا تَحۡكُمُونَ ﴿٣٩﴾

---

پرسیاری یەکەم کە بۆ بێزاری دەربڕینە ئەگەڕێتەوە بۆ دڵنیا کردن لەسەر راستی و بەجێیی دوا رۆژو چارەنوسی بێ بڕوایان و لەخوا ترسان کە باسی کردن. ئەفەرموێ: ﴿أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ دەی ئایا ئێمە موسڵمانەکان وەك تاوانبارەکان لێ ئەکەین و وەك یەك رەفتاریان لەگەڵ ئەکەین؟ واتە نەخێر شتی وا ناکەین چونکە ئەوە نارەوایە و پێچەوانەی دادە و ژیری دژیەتی. کەواتە موسڵمانان کە مل کەچ و گوێڕایەڵی پەروەردگاری خۆیانن هەرگیز وەك تاوانباران نابن لە تۆڵە و پاداش و چارەنوس دا. جا لەبەر ئەوە بە شێوەی سەرسوڕمان ئەم دوو پرسیارەش ئەهێنێ بۆ بێزاری دەربڕینێ تر. ئەفەرموێ: ﴿مَا لَكُمۡ﴾ ئایا چی یە بۆ ئێوەو چیتان لێ قەوماوە و چ سەر لێ شێوانێکتان بۆ پەیدا بووە؟ ﴿كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ﴾ چۆن بڕیاری ئاوا ئەدەن کە چاك و خراپ و دۆست و دوژمن یەکسان بن و تاوانبار لە ریزی پیاو چاکا بێت؟! ئینجا ئەگوێزێتەوە بۆ چەند پرسیارێ تر بەشێوەی لاقرتی پێ کردن بۆ سزادانی دەروون و دەم کوت کردن و بەر لێ برینەوەیان. ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ﴾ ئایا هەیە بۆ ئێوە نامەیەك لە ئاسمانەوە هاتبێ کە بخوێننەوە تیایا ﴿إِنَّ لَكُمۡ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾ کە بێ گومان هەیە بۆ ئێوە تیایا ئەوەی خۆتان هەڵی بژێرن و خۆتان ئارەزووی بکەن؟

واتە ئایا نامەیەکتان بۆ هاتووە لە ئاسمانەوە کە بڕیارێکی تیا بێت دژو پێچەوانەی ژیری و داد، بڵێ موسڵمانان وەك تاوانبارانن، کەواتە لەو نامەدا ببێ بڕیارێ کە خۆتان ئارەزووی ئەکەن و بەهۆی ئەوە ئەو بڕیارە ناڕاستە بدەن؟ بێ گومان نامەی وا ناڕاست لەسەرچاوەی راستی یەوە نایەت، ﴿أَمۡ لَكُمۡ أَيۡمَٰنٌ عَلَيۡنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ یان ئایا هەیە بۆ ئێوە چەن سوێن و پەیمانێکی بەتین و بەهێز بەسەرمانەوە تا رۆژی دوایی کە ﴿إِنَّ لَكُمۡ لَمَا تَحۡكُمُونَ﴾ بێ گومان بۆ ئێوە هەیە ئەوەی خۆتان بڕیاری ئەدەن. واتە ئایا پەیمانمان پێ داون و سوێنمان بۆ خواردوون کە هەر بڕیارێ بدەن پێتان ئەدەین؟ ئاشکرایە کە شتی وایش نییە و ناگونجێ. کەواتە لەسەرچی ئەو بڕیارە ئەدەن و پاڵپشتیان چی یە؟

سَلۡهُمۡ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَآءُ فَلۡيَأۡتُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ
وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ
﴿٤٣﴾ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ

---

**ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوان دەرئەکات لەو رادەیە کە رووی فەرمودەیان تیٚ بکات و فەرمان ئەدا کەم دەم کوتیان بکات و بەریان لیٚ ببڕێتەوە بە لاقرتی پیٚ کردنەوە ئەفەرمویٚ: ﴿سَلۡهُمۡ﴾ ئەی پێغەمبەر پرسیار بکە لەوانە ﴿أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ﴾ ئایا کامیان قسەکەریانە و زامنی ئەوەیە کە هەر بڕیاریٚ بدەن و چی ئارەزو بکەن خوا بۆیان جیٚ بەجیٚ ئەکات و پەیمان و سوێنیان وەرگرتووە لەخوا تا رۆژی دوایی لەسەر ئەوە؟ خوای گەورە لەم ئایەتانەدا رێگای بڕی یەوە لە بیٚ بڕواکان لەبارەی ناڕاستی و ناڕەوایی راو بڕیارەکەیانەوە کە ئەیان وت: ئەگەر رۆژی دوایی راست بێت ئێمە لەویٚ ئەگەر باشتر نەبین لە بڕواداران لەوان کەمتر نابین و هەر هیچ نەبیٚ وەك ئەوان ئەبین. خوای گەورە بەدرۆی خستنەوە و بەری لیٚ بڕینەوە لە چەند روویەکەوە:**

**یەکەم: ئەو راو بڕیارە دژو پێچەوانەی دادو ژیری یە. کەواتە بەڵگەی ژیریی یان بە دەستەوە نییە.**

**دووەم: رابەرو بەڵگەی(نقلی) بیستنی یان نی یە چونکە نامەیەکی ئاسمانی یان نی یە کە قسەکەیان بەڕاست دابنیٚ.**

**سیٚ هەم: پەیمان و بەڵێنێکیان پیٚ نەدراوە لەلایەن خواوە.**

**کەواتە هیچیان بەدەستەوە نی یە مەگەر ئەوە شوێنی قسەی چەند کەسیٚ کەوتبن کە هاوبەشی ئەمان بن لەو رایەدا یا بە تەما بن لەلایە ترەوە بێجگە لە خوا ئەوەیان بۆ بکریٚ و دەست کەوتیان ببیٚ.**

**ئینجا ئەوا لەم بارەیشەوە دەم کوتیان ئەکات و بەریان لیٚ ئەبڕێتەوە ئەفەرمویٚ: ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَآءُ﴾ ئەی ئایا چەند کەسیٚ هەیە بۆ ئەوان کە هاوبەشیان بێت لە راو بڕیارەکەیاندا. یا ئایا چەند بت و پەرستراوێکیان هەیە ئەوان کردوونیان بە هاوبەشی خوا کە ئەوان یەکسان بکات لەگەڵ بڕواداراناڵەرۆژی دواییدا؟ ﴿فَلۡيَأۡتُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ﴾ دەی با هاوبەشەکانیان بێنن ﴿إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ﴾**

ئەگەر ڕاست ئەکەن و ڕاستیان کردووە لەوەی کە گوتیان و ئەیڵێن؟ بائەو هاوبەشانەیان بێنن ﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ﴾ لەڕۆژێکا کە ئەوپەڕی سەختی و نارەحەتی ڕووئەدات و پەردە لائەبرێ و حەقیقەتی هەموو کارێ دەرئەکەوێ. واتە ڕۆژی دوایی. ﴿وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ﴾ وە ئەوانە بانگ ئەکرێن بۆ سوژدە بردن بۆخوابۆتەشەرلێدان و داخ پێ دانیان ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ﴾ ئینجا ئەوانیش ناتوانن سوژدە ببەن. لەبەر ئەوەی کاتی نەماوە. یا لەبەر ئەوە هەر تەوانایان نامێنێ. ﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾ لەکاتێکا کە چاوەکانیان شۆڕو داخراوە و کشاوە بەسەریانا لە بیم و ترسا﴿تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞ﴾ ڕیسوایی و زەبونی دەوری داون و داگیری کردوون. ئەو چاو شۆڕی و زەبوونی یە لە باتی لوت بەرزی و خۆ بەزل زانی یە کە لەم جیهانەدا کەشخەیان پێوە ئەکرد.

قورئان بەپێی باوی خۆی ئەم ڕووداو و بەسەرهاتانە لەپێش چاو ئامادە ئەکات و وێنە و شێوەکەیان ئەهێنێ وەکو ئێستە ئەو کاتە بێت. کە ئەوەش بۆ تەمێ و ترساندن زۆر بەکارە ئینجا بەپێی ئەو ئامادە کردن و هێنانی وێنەو شێوەی ئەو ڕۆژو بەسەرهاتانە بێ بڕواکان داماو و پێ گیراون و ئەوا ئەخرێتەوە بیریان ئەو کردەوەو تاوانەی کە دووچاری ئەو ڕۆژ و سزایەی کردن. ئەفەرموێ: ﴿وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ﴾ واتە ئەمانە کە لەم ڕۆژەدا ناتوانن سوژدە بەرن بێ گومان لە پێشەوە بانگ کران لە جیهانا بۆ سوژدە بردن لە کاتێکا کە ئەیانتوانی و سوژدەیان بۆ ئەبرا و هیچ بەرگری کەرێکیان نەبوو وە ساغ و سەلیم بوون. ئینجا لەم کاتەدا ئەم هەڕەشە سامناکە ئەکات کە دڵی وریایان ئەخاتە لەرزە ئەفەرموێ: ﴿فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ﴾ ئەی پێغەمبەر کەواتە لێم گەڕێ من و ئەو کەسەی کە بڕوا ناهێنێ بەم قورئانەو بە درۆی ئەزانێ، ئەوانە بدەرە دەست من و حەواڵەی منیان بکە، لێم گەڕێ من لەگەڵیان ئەجەنگم و چارەی دەردیان ئەکەم!

ئەوەی بڕوا ناهێنێ بێ گومان ئەو بڕوا نەهێنەرە ئەم ئادەمی یە لەڕو لاوازو بێ دەسەڵاتەیە! ئەم کرمە بچکۆلەیە لەم زەوی یەدا. بەڵکو ئەم تۆزو گەردەیە. بەڵکو ئەمەیە کە هیچ چاو نادا لەم وڵات و جیهانی خوادا. کەواتە ئەی پێغەمبەر لێم گەڕێ بۆ ئەم گیان لەبەرە. تۆو بڕواداران ئیسراحەت بکەن و دڵ مەدەنە ئەمانە. چونکە جەنگ و دوژمنایەتی یەکە لەگەڵ منە نەك لەگەڵ تۆو بڕواداران، من کارەکە ئەگرمە دەست! ئای ئای ئەمە چ ترساندن و هەڕەشەیەکی سامناکی دڵ داچڵەکێنەرە! و چ دڵخۆش کردن و ئارام پێدانە بە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو بڕوادارانە کە بەبێ هێزو لاواز سەرنج ئەدران؟!!

سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴿٤٧﴾

---

ئینجا خوای دەسەلأت دار خیتە و شێوەی جەنگە کە روون ئەکاتەوە کە ئەیکات لەگەڵ ئەم گیان لەبەرە بێ هێزو بێ دەسەلأتە! ئەفەرموێ: ﴿سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەرە بەرە نزیکیان ئەخەینەوە لە سزاکەیانەوە لەلایەکەوە و بەجۆرێ کە نازانن و بە خۆیشیان نازانن. ەم رەنگە هۆی ژیان و کامەرانی ئەم جیهانەیان پێ ئەدەین و ئەوانیش وا ئەزانن رێزیان هەیە لای خواوچاکتروخۆشەویستن لەبڕواداران، بەهۆی ئەوەلانادەن وئەمێننەوەلەسەر ئەو رێگاو بارەلارەی کەداویانەتەبەر،تاسەریان ئەکات بەئاگروسزای خوادا. ﴿وَأُمۡلِي لَهُمۡ﴾ وەماوەومۆڵەتیان ئەدەم تا تاوان وخراپەی زۆربکەن وئەوانیش لایان وایەخوانیازی خێروچاکەی ئەوانی هەیە.

﴿إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ﴾ بێ گومان پیلانی من زۆر بەهێزو بەتینە و بەهیچ شتێ بەرگری ناکرێ. خوای گەورە لە هەموو بارو روویەکەوە هۆی رێنومایی و خواناسی داوەبە بەندەی بە جۆرێ هەموو بڕو بیانووی بڕیون. خۆی دروستی کردوون، چاك ئەیانناسێ. کاتێ کە زانی هەر بەندەیەکی بڕوای پێ ناهێنێ و رێگا راستەکەی ئەو ناداتە بەرو پشت ئەکاتە هۆی رێنومایی پەروەردگاری، ئەو کاتە خوا قاری لێ ئەگرێ و هۆی بێ بڕوایی و گومڕایی بۆ فەراهەم ئەهێنێ تا مەنی خۆی بە تەواوی پڕ بکات و شایستەی سزای خوا بێت.

بێ گومان بێ بڕواکان و هەرچی لە جیهانایە سوك ترو بێ نرخ ترە لەوەی کە خوا تەگبیری لێ بکات و پیلانی پێ بگێڕێ. بەلأم ئەم هەواڵ پێ دانە ئەوپەڕی دادە بە کاری ئەهێنێ، ئەیەوێ بیانترسێنێ تا فریای خۆیان بکەون پێش ئەوەی هەلیان لە دەست بچێ. با بزانن ئەو خۆشی و کامەرانی یە تەپکە و داوێکە بۆیان نراوەتەوە. ماوەو مۆڵەتدانیان لەسەر ستەم و دەست درێژی و گومڕایی بۆ نزیك خستنەوەو راکێشانیانە بۆ سزای خواو خراپترین تۆڵە و چارەنووس. ئەوە تەگبیرێکە لەلایەن خواوە لێیان ئەکات بۆ ئەمەی باری تاوانی خۆیان هەڵگرن بە پڕی، وە بچن بۆ بەردەم دادگای گەورە بەو بارە قورسەوە و بە شایستەیی

بۆ سزادان و تۆڵە لێ سەندن. بەڕاستی ئەو هەواڵ پێ دان و ترساندنە ئەوپەڕی دادو میهرەبانی یە کە خوا بەکاری ئەهێنێ لەگەڵ دوژمنەکانی خۆی و ئاین و پێغەمبەرەکەی. ئیتر ئەوان لەپاش ئەوە چی بۆ خۆیان هەڵئەبژێرن، هەڵی بژێرن و چی بە چاك ئەزانن بیکەن، هیچ بڕو بیانوویەکیان بەدەستەوە نامێنێ. بێ گومان خوا مۆڵەت ئەدا بەڵام بەسەر تاوانبار و ستەمکارا رانابووری.

درێژە ئەدا بە ستەمکارو دوای ئەخات هەت کاتی خۆی دێت، ئەو کاتە کە گرتی رزگاربوونی نابێ و لە دەستی دەرناچێ. وەك حەدیسی صەحیحیش ئەفەرموێ. ئینجا لەم کاتی بیم و ترس نانە بەرەدا ئەگەڕێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەیە ترو بەر لێ بڕینەوەیە تر لەگەڵ ئەوبێ بڕوایانەدا وەردوم سەرسام ئەکات لەهەڵوێستی ناڕەوایان. ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرًا﴾ ئەی ئایاتۆداوای هیچ کرێ و پارەیەکیان لێ ئەکەیت لەسەر ئەو راگەیاندن و رێنموونی و ئامۆژگاری یە ﴿فَهُم مِّن مَّغۡرَمٍ مُّثۡقَلُونَ﴾ تا ئەوان لەبەر باج و بەدرەقە بارگران کرابن و بارو ئەرکی قورس خرابێتە سەرشانیان و بەهۆی ئەوە پشتت تێ بکەن و بڕوات پێ نەهێنن؟ واتە ئەوانە جێگای سەرسوڕمانن، چونکە تۆ بانگیان ئەکەت بۆلای خوا بەبێ ئەمەی داوای هیچیان لێ بکەیت، بەڵکو چاوەڕوانی پاداشی لای خوایت، کەچی ئەوانە بڕوا ناهێنن!

﴿أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ﴾ ئەی ئایا ئەوانە غەیب و نهێنی یان لایە و ئاگادار کراون بەسەر(لوح المحفوظ) دا کە غەیبی تیا نوسراوە ﴿فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ﴾ تا بنوسنەوە لێ ی ئەوەی بڕیاری ئەدەن بۆ خۆیان و پێویستیان نەبێ و بێ نیاز بن لەوەی تۆ ئەیزانی. کەواتە ترسیان نەبێ لەوەی بترسێنرێن پێ ی؟ یا ئەوان خۆیان نوسیبێتیان. کەواتە شتێکیان نوسیوە رێك و گونجاو بێ لەگەڵ حەزو ئارەزووی خۆیانا؟ بێ گومان هیچ کام لەمانە نەبووە. کەواتە چۆن ئەم هەڵوێستە ناڕاست و ناڕەوایەیان هەیە؟ بەڕاستی هەرکەس بێ بەش نەبێ لە تێگەیشتن و ژیری، بەم لێکۆڵینەوە و شی کردنەوە و بەم بەر لێ بڕینەوە سەری بەندەیی دا ئەخات بۆ خوای پەروەردگار و شەرم ئەیگرێ و خەجاڵەت ئەبێ لەمەی هەڵوێستی ئاوای ببێ کە ئەو بێ بڕوایانە بوویان. لەپاش ئەوەی خوای گەورە جەنگ و ئاژاوەکەی گرتە ژێر دەستی خۆی، و خۆی کرد بە خاوەن کارو بەربەرەکانێ لەگەڵ دوژمنەکاندا.

﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ ﴿٤٩﴾ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾﴾

ئینجا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە خۆگرو بە ئارام بێت. خۆگر بێ لەسەر ئەرکی ڕاگەیاندن و پێغەمبەرێتی یەکەی. خۆگر بێ لەسەر لاری و نالەباری بێ بڕواکان. خۆگر بێت لەسەر سزاو ئازاری بڕوا نەهێنان و دەم درێژی و بێ شەرمی یان. خۆگر بێت هەتا خوا بڕیاری خۆی بەدی ئەهێنێ لەکاتی تایبەتی دیاری کراوی خۆیا بە لێ زانی و کار دروستی خۆی. دەست نیشانی بۆ ئەکات بە بەسەرهاتی برایە لە برا پێغەمبەرەکانی کە دڵتەنگی و بێ ئارامی یە رووی تێ کرد لە هەڵسانی بە ئەرکی پێغەمبەرێتی یەکەیا، ئەگەر میهرەبانی خوا فریای نەکەوتایە دووچاری نارەحەتی ئەبوو.

ئەفەرموێ: ﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ﴾ ئینجا کەواتە خۆت بگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت و پەلە مەکە و بوەستە بە دیاری کاری خواوە. پەلە مەکە لە مۆڵەت و ماوەدانی بێ بڕواکان و دواکەوتنی سەرکەوتنی تۆ بەسەریانا. ﴿وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ﴾ وە وەك خاوەن نەهەنگەکە مەبە. واتە یونس(علیه السلام) وەك لە سورەتی ﴿الصافات﴾ دا باس کرا.

کورتەی ئەو داستانە ئەمەبووە: (یونس کوڕی متی) خوا ڕەوانەی کرد بۆ سەر دانیشتوانی شارێ کە بەناوبانگ بوو بە(نینوی) لە موصڵی ئێستەدا لەپاشان بێ ئارام و بێزار بوو لەبێ بڕوایی و لاری و نالەباری یان، بەهۆی ئەوە بەداخ و ڕقەوە بەجێی هێشتن لەدڵی خۆیا وتی: خوا تەنگەتاوم ناکات بەمانەوە لەناو ئەم یاخی و سەر کێشانەدا، و خوا ئەتوانێ ڕەوانەم بکات بۆ سەر کۆمەڵ و تاقمێ ترا لە شارەکەوە دەرچوو بە ڕق و بێزاری یەوە تا گەیشتە قەراغی دەریایە، لەوێدا سواری کەشتی یەکی پڕبوو کە گەیشتە ناو دەریاکە کەشتی یەکە قورس بوو خەریك بوو نوقم ببێ.

ئینجا ناچار بوون به دەرکردنی یەکێکیان بۆ ئەوەی تا ئەندازێ سوك ببێ، مەترسی نوقم بوون نەمێنێ، بۆ ئەو مەبەستە قورعەیان خست و بەری(یونس) کەوت(علیه السلام) ئینجا خستیانە ناو دەریاکە و بە فەرمانی خوا نەهەنگێ هەڵی لوشی. ئینجا لەوێدا هاوار و نزای کردەلای خواو خوایش لوتف و میهرەبانی لەگەڵ کرد و نزای وەرگرت و رزگاری کرد.

بەفەرمانی خوا نەهەنگەکە یەقی کردەوەو تورِی دایە قەراغی دەریاکەوە پێستی توابووەوە لەناو سکی نەهەنگەکەدا گۆشتەکەی مابووەو ئەو ماوەیە هەر چەند بووبێ خوا لەناو ئەو دەریا و هەر لە سکی نەهەنگەکەدا هێشتی یەوەو پاراستی لە مردن بەو توانین و دەسەلآتەی کە بێ سنوورە و هەرچی ویست لێ ی یاخی نابێ.

خوای گەورە بەم داستان و بەسەرهاتە ئامۆژگاری پێغەمبەر ئەکات(ﷺ) بۆ ئەمەی بیکا بە تویێشوی رێگاکەی، و دڵ بەهێز و دامەزراوی بکات لە هەڵگرتنی ئەو ئەرکە زۆر گرانە کە دابووی بەسەریا. ئەرکی رێنموونی هەموو ئادەمی نەك تەنها تیرەو بەرەو کۆمەڵێ. ئەرکی رێنموونی هەموو چین و چەرخەکان نەك تەنها چین و چەرخێ. ئەرکی یارمەتی دانی گرۆی ئادەمی بە هەموو نەتەوەو گەلەکانی یەوە بە بەرنامەیەکی هەمیشەیی دامەزراو کە دەست بدا بۆ جێ بەجێ کردنی کاروباری ژیان لە هەموو بارو روویەکی یەوە هەتا دنیا دنیایە. خوای گەورە فەرموی بە پێغەمبەرمان(ﷺ) وەك یونس مەبە و با حاڵی تۆ وەك حاڵی ئەو نەبێ.

﴿إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ﴾ لەو کاتەدا کە هاوارو نزای کردە لای ئێمە لەسکی نەهەنگەکەدا لە کاتێکا کە داخ و مەراق دڵی پڕ کردبوو، و پیشی خوارد بووەوە. واتە پەلە مەکەو بێ ئارام مەبە وەك یونس با وەك ئەوت بەسەر نەیەت.

ئینجائەفەرموێ: ﴿لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ ئەگەرمیهرەبانی وبەزەیی لەلایەن پەروەردگاری یەوە فریای نەکەوتایە و بەسەری نەکردایەتەوە ﴿لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ﴾ فڕێ ئەدرایە دەشتێکی رووتی بێ درەخت و سێبەر – کە لەشی بەرگەری ئەوەی نەئەگرت – بەو جۆرە تووڕ ئەدرا ﴿وَهُوَ

﴿مَذۡمُومٞ﴾ له كاتێكا كه نهنگ و تهشهر لێ دراوو زهم كراو ئهبوو. بهڵام میهرهبانی خوا فریای كهوت، یادی خواو گهڕانهوهكهی لێ وهرگرت. خوا زانی كه شایانی ڕێزه ﴿فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ﴾ بههۆی ئهوه پهروهردگاری ههڵی بژارد بهم ڕهنگه(وحی) سروشی كردهوه بۆلای و ناردی یهوه بۆ سهر گهلهكهی.

﴿فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ئینجا كردی به یهكێ له زۆر پیاو چاكان بهم ڕهنگه پاراستی لهوهی كردهوهیهك بكات كه نهكردنی چاكتر بێت. ئهمهبوو به كورتی ئهو داستان و بهسهرهاتهی كه تێ پهڕی كرد بهسهر یونس پێغهمبهردا(ﷺ) خوا ئامۆژگاری پێغهمبهرمانی پێ ئهكات(ﷺ) به بۆنهی ههڵوێستی ڕهق و نالهباری بێ بڕواكانی مهككه.

لهپاش ئهوهی كه خوا خۆی كرد به خاوهنی جهنگ و ئاژاوهكه وه فهرمانی دا كه لهوانه گهڕێ بۆ خۆی و پێغهمبهر(ﷺ) خۆگر و به ئارام بێت و بوهستێ به دیار كار و بڕیاری خواوه. بهڕاستی زهحمهت و نارهحهتی ڕاستهقینه بریتی یهله ئهرك و نارهحهتی ئهو خۆگرتن و وهستان به دیاری كارو بڕیاری خواوه تا كاتی دیاری كراوی خۆی دێت به پێی خواهیش و مهیلی خوا، لهو ڕێگهیهدا چهند نارهحهتی و ئێش و ئازار ڕوو ئهكاته دڵ و دهروون.

نارهحهتی و ئێش و ئازاری سهركێش و بڕوا نههێنان و لاری و نالهباری بێ بڕواكان. نارهحهتی وئێش وبافیش كردنی ناههقی و بهتاڵ و زاڵی و سهركهوتنی شوێن كهوتووهكانی بهدیمهن وبهرواڵهت. نارهحهتی وئێشی ههڵخهڵهتان وشوێن كهوتنی زۆربهی جهماوهر بۆیان.

ئینجا نارهحهتی و ئێش و ئازاری خۆ ڕاگیر كردن له ژێر ئهو باره گرانهدا به دامهزراوی و ئارام و ڕهزامهندی به بهڵێنی خوا و چاوهڕوانی بهدی هاتنی ئهو بهڵێنه بهبێ گومان و دوو دڵی له بڕینی ئهو ڕێگه سهختهدا، ههر چهند ئهرك و مهینهت ڕوویدا، بهڕاستی ئهوه به ههموو كهس ناكرێ، ئهوه به ههڵبژێراوهكانی خوا ئهكرێ له پێغهمبهران و شوێن كهوتووه ڕاستهقینهكانیان.

ئینجا دوایی سورەتەکە ئەهێنێ بە نەخشە کێشانی شێوەیەکی بێ بڕواکان، لەکاتێکا ئەم بانگ و بانگەوازە وەر ئەگرن لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە داخ و خەشمێکی زۆر بەتینەوە، وە بە حەسادەتێکی زۆر بەهێزەوە کە دەرئەکەوێ لەو سەرنج دانە دوژمنانەی کە ئاڕاستەی ئەکەن و ئایەتەکە ئەیگەیەنێ بە جۆرێ کە زیادە لەوە ناوترێ، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێ گومان بێ بڕواکان خەریکن ﴿لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَـٰرِهِمْ﴾ بە سەرنج دان و تەماشا کردنی چاویان هەڵت خلیسکێنن و بت خەن. یا لەناوت بەرن، ﴿لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكْرَ﴾ کاتێ کە قورئان ئەبیستن. واتە ئەو بێ بڕوایانە بەهۆی دوژمنایەتی زۆر بەتین و بەهێزیانەوە بە ئەوپەڕی رق و کینەوە سەرنجت ئەدەن، بەجۆرێ خەریکن بەو سەرنج دانە رەوتت لێ تێك دەن و بت خەن. یا لەناوت بەرن و بت کوژن ئەوەش بە پێی باوی خەڵکی کە بیانەوێ رادەی دوژمنایەتی کەسێ دەرخەن، ئەڵێن: فلان ئەوەندە رقی لە دڵایە بە رق و درژەوە سەیرم ئەکات، خەریکە هەر تەماشا کردن بم خات، یا بمکوژێ، یا بم خوا.

واتە ئەوەندە داخی لە دڵایە بۆم ئەگەر بکرایە هەر بە سەرنج دان ئەوەی بەسەر ئەهێنام. هۆی ئەو رق و دوژمنایەتی یەش داخ و حەسادەتی ئەم قورئانەیە کە بە هیچ رەنگ چار نەئەکرا بۆیان. لەداخ و حەسادەتا دەم درێژی یان ئەکرد بەم جۆرە کە ئەگێڕێتەوە لێیانەوە: ﴿وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ﴾ واتە ئەوانە ئەیانووت بێ گومان(محمد) شێتە!!!

ئەیانویست بەو پڕوپاگەندەیە خەڵکی لێ دوور بخەنەوە، لەلایە ترەوە سەرسام و سەرگەردان بوون تیایا و لایان وابوو ئەم قورئانە – کە دەستە پاچەن لە حاستی – ئەبێ جنۆکە پێ ی بڵێ!!

ئەوا خوای گەورەش بەر پەرچیان ئەداتەوەو دەم کوتیان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە ئەوانە ئەو قسە ناڕاست و ناڕەوایە ئەکەن، و زاتیان هەیە ئەو دەم درێژی یە

گەورەیە بکەن لە کاتێکا کە ئەم قورئانە هەر پەند و ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان.
ئاشکرایە کە شتی وا نە شێت ئەیڵێ و نە شێت ئەیهێنێ و هەڵگریەتی.

بێ گومان خوا راست ئەفەرموێ و پروپاگەندەچی یەکان درۆزن و دەلەسەچین. نەفرینی خوایان لێ بێ. پێویستە لێرەدا ئەندازێ بیر بکەینەوە بە سەرسامی یەوە سەرنجێکی ئەم وشە سەرنج راکێشەرە بدەین: ﴿لِّلْعَالَمِينَ﴾ کە ئەمەی فەرمووە و ئەم جارەی دا لە کاتێکا کە بانگ و بانگەوازەکەی بەو جۆرە بەرگری و بەربەست ئەکرا، و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بەو جۆرە سەرنج ئەدراو دوژمنایەتی لەگەڵ ئەکرا کە ئایەتی پێشو نەخشەی کێشاو شێوەی دەرخست، ئەو سەرکێشانە ئەوەی لە دەستیان ئەهات ئامادەیان کردبوو بۆ جەنگ و بەربەرەکانێ ی ئەو ئاین و قورئان و پێغەمبەرە(ﷺ).

لەو کاتە زۆر ناسك و تەنگەدا و لەو سەردەمەدا کە سەرەتای هاتنی ئەم ئاین و پەیامە بوو، ئەم وشە زۆر گەورەیە هات و ئەم ئایەتە جاری جیهانێتی ئەم قورئان و ئایینەیدا. هەرچۆنێ لە رووی راستیدا سروشت و بارو رووە راستەقینەکەشی هەروایە و هەر بۆ ئەوە هاتووە کە جیهانی بێت و هەر بۆ ئەمەش ئەگونجێ و دەست ئەدا. کەواتە ئەم سیفەتە سیفەتێکی بنەڕەتی و سەرەتایی بوو. نەك سیفەتێ بێت کە لە پاشا پەیدا بووبێ لەکاتی زاڵ بوون و سەرکەوتنی ئیسلام دا، لە سەردەمی مەدینەدا، وەك هەندێ لە پروپاگەندە چی یەکان ئەمڕۆ ئەیڵێن بەبێ شەرم و تەریق بوونەوەو ناترسن لەوەی کە مێژوو سروشتی ئایینەکە ئەیانخاتەوە بە درۆوە.

وصلى الله وسلم على من انزل عليه ذلك الكتاب الكريم والحمد لله اولا واخرا

تەواو بوو تەفسیری ئەم سورەتە لە ١٤٠٢/٣/١٣ بەرانبەر ١٩٨٢/١٢/٢٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٣﴾

## سورەتی(الحاقه)
## مەککەیی یەو(٥٢) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە زۆر گرنگ و سامناکە، هەر دڵێ وریا و بێدار بێ ئەم سورەتە کاری لێ ئەکات و لەرزەی تێ ئەخات، هەر لە سەرەتایەوە تا دوایی دێت تەقە ئەدا لە هەست و دەروون، بەسەرهات و روداوی ناڕەحەت و ناهەمواری نیشان ئەدا، چەند شێوەیەکی یەك لە دوای یەکی ئەخاتە بەرچاو، کە هەمووی سامناك و دڵ داچڵەکێنەرن.

زۆربەی ئەم سورەتە خەریکە بە باسی رۆژی دوایی و رووداو و شێوە بەسەرهاتەکانی ئەو رۆژەوە. جا لەبەر ئەوە سورەتەکە دەست پێ ئەکات بەناوێ لە ناوەکانی رۆژی دوایی، بەو ناوەش ناونراوە و ناو ئەبرێ: ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *ٱلۡحَآقَّةُ﴾ ئەو رۆژی دوایی یەی کە راستە بەدی هاتنی و ئەبێ بەدی بێت. ئینجا بۆ نیشاندانی گەورەیی و گرنگی ئەو رۆژە ئەفەرموێ: ﴿مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ ئاخۆ ئەو رۆژە چی یە؟

واتە ئەوەندە گرنگ و نایابە کەس نازانێ چۆنە. ئینجا هەمیتر گەورەیی و گرنگی یەکەی نیشان ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾ ئایا چ شتێ تۆی زانا کرد کەچی یە ئەو رۆژە؟ واتە تۆ چوزانی چی یە ئەو رۆژە، ئەو رۆژە کەس نازانێ چۆنە و چی یە تا نەیبینێ، ئەو رۆژە گەورەترە لەوەی زانین و تێ گەیشتنی ئادەمی پەی پێ بباو پیا بگات! لەبەر گەیاندنی ئەو مەبەستە وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوەو مەردومی وەستان لەبەردەم ئەم شتە زۆر گرنگ و گەورەو سامناکەدا.

كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌۢ بِٱلْقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾

---

**ئینجا دەست ئەكات بە باسی چەند تاقم و كۆمەڵێ لەوانەی بڕوایان نەهێنا بەو ڕۆژە، و باسی ئەو سزا و تۆڵە سەختەی كە دووچاریان بوو لەم جیهانەدا لەسەر ئەو بێ بڕوایی یە. ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌۢ بِٱلْقَارِعَةِ﴾ گەلی(سەمود) و گەلی(عاد) بڕوایان نەهێنا بەو ڕۆژی دوایی یە كە دڵ دائەچڵەكێنێ و ئەیهێنێتە لەرزە، بەهۆی سامناكی و ناهەمواری شاخە و شریخەیەوە، بوونەوەر دائەچڵەكێنێ و ئەیخاتە لەرزە بە وێران كردن و پارە پارە كردن.**

**ئەو دوو گەلە بڕوایان نەهێنا بەو ڕۆژە. ئینجا با بزانین بەرهەم و سەرەنجامی بێ بڕوایی یەكەیان چی بوو، لەم جیهانەدا سەری لە چی یەوە دەرچوو. ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ﴾ ئینجا گەلی(سەمود) بەرباد كران و لە ڕیشە هێنران بە ڕووداو و بەسەرهاتێ كە لە سنوور تێپەڕی كردبوو، كە ئەوەش بریتی بوو لە دەنگ و پیا هەڵشاخانێكی زۆر گەورە كە لە سنووری هەموو پیا هەڵشاخانێ تێپەڕی كردبوو.**

**بەم ڕەنگە بە فەرمانی خوا فریشتە بە تێ خوڕین، پیاهەڵشاخانێكی وای بەسەرا كردن بەجارێ هەموو لە حەیبەتا مردن و گیانیان دەرچوو، وەكو بە درێژی لەمەوبەر باس كرا. لە چەند شوێنێكا هۆی لەناوبردنەكەی كردن بە ﴿الصيحة﴾ وە لە ﴿حم السجدە﴾ دا بە ﴿صاعقة﴾ كە ئەو دووانە لەگەڵ ﴿الطاغية﴾ ی ئێرەدا لە مەبەست دا یەكن و جیاواز نین. وە لە پێشەوە لە سوورەتی ﴿الاعراف﴾ دا فەرموی: ﴿الرّجفة﴾ كە مەبەست بوومەلەرزەیەكە ڕووی تێ كردن بەهۆی ئەو دەنگ و پیاهەڵشاخانەوە. كەواتە هەموو هەر ڕاست و هیچ دژایەتی نی یە لە نێوان ئایەتەكانا.**

گەلی(سەمود) - وەك لە چەند شوێنی ترا باس كراون - لەلای سەرووی حیجازەوە بوون لە بەینی شام و حیجازا لە شوێنێكا كە ناو ئەبرا بە(الحجر). خوا بەو شتە كوت و پڕی یە لە ریشەی هێنان، هەرچۆنیێ لێرەش دا بەو ئایەتە زۆر كورتە باسەكەی دوایی هێنان. بەڵام گەلی(عاد) ماوەی سزاكەیان درێژەی كێشا، وەكو باسەكەشی درێژە پێ ئەدا كە ئەفەرمویێ: ﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ﴾ وە گەلی عاد بەرباد كران و لەناوبران بە بایەكی سەختی زۆر سارد ﴿عَاتِيَةٍ﴾ كە سەركێش و لە سنوور تیێ پەڕبوو لە سەختی و تەوژم و چارەنەكراویدا. ئەم گەلە نیشتەجیێ بوون لە شوێنێكا كە ناو ئەبرا بە(الاحقاف) لە بەینی (یەمەن و حضرموت)دا.

ئەوانەزۆر ستەمكارو دەست وەشێن و سەركێش بوون خوایش بەو با سەختە سەركێشە لەناوی بردن بەم جۆرە ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ﴾ خوا زاڵی كرد بەسەریانا و ژێر باری كرد بۆ لەناو بردنیان ﴿سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ﴾ حەوت شەو و هەشت رۆژی ﴿حُسُومًا﴾ لەسەر یەك. واتە ئەو ماوەیە ئەو بایە دای بەسەریانا هەتا لە ریشەی هێنان و دوا بڕاوی كردن.

پاشان شێوەیان نیشان ئەدا بە مردویی. ئەفەرمویێ: ﴿فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى﴾ ئینجا ئەبینی ئەو گەلە لەو ماوەدا بە مردوویی و كەوتویی بەسەر زەویدا بە بیێ گیان ﴿كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ﴾ وەك ئەوانە چەند بنكی دارخورمایە بن كە قەبارەكەیان مابیێ و لەناوا بۆش و خاڵی بن، سۆس و خۆرە ناوەكانی خوارد بن و ئینجا لە ریشە هاتبن و كەوتبن بەم دیوو بەو دیوا، بڵاوبوو بوونەوە و چەن و مل لیێ ی كەوتبن.

بە پێی باوی قورئان ئەو شێوەیە ئامادە ئەكات و ئەیخاتە بەرچاو ئەم وێنە و شێوەیە دەق و سەرو بەرە بۆ ئەو گەلە كە ئەو بایە لیێ ی دان و ناوسكی داخستن و ئینجا خستوونی بەسەر زەوی دا لە پەنای ماڵ و كۆڵان و لەبەردەم خانوو عەرەسەی ماڵەكانیان بە پرژو بڵاوی و بەچەن و ملی!

فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾ وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ
أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى
ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾

---

**دوای ئـەوە ئەگـەر بگـەڕێی بـە شـوێن و ماواکانیانـا ﴿فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ﴾ دەی ئایـا ئەبینی بۆ ئەوانە هیچ کەسێکیان مابێ و قوتار بووبێ لە مردن؟ نەخەیر بێ گومان هیچ کەسێکیان نەماوە. ئەوە بوو تۆڵە و دوارۆژی ئەم جیهانەی گەلی(عاد) و(سەمود). ئەوە بەشی بێ بڕواکانی تریش بوو.**

**ئینجا لەم دوو ئایەتەدا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند رووداو داستان و بەسەرهاتێکی جیاجیاو دوور لە یەکتر لە چەرخ و وڵاتا ئەفەرموێ: ﴿وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ﴾ وە فیرعـەون و ئەوانـەی لـە پـێش فیرعەونـەوە بـوون و دانیـشتوانی دێهـات و شـارە ژێـراو ژوورکراوەکان، واتە گەلەکەی لوط پێغەمبەر(علیه السلام) ئەوانە هەڵسان بە کردەوەیەکی زۆر هەڵـە و گونـاه. ﴿فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ﴾ بـەم رەنگـە یـاخی بـوون و گوێڕایـەڵ نـەبوون بـۆ فروسـتادەی پـەروەردگاری خۆیـان... ئەوانـە یـاخی بـوون لـە چـەند پێغەمبـەرێ، بـەڵام پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێ – هەموو یەکن و یەك فەرمانیان پێ یە و یەك پەیامیان هێناوەو لەیەك سەرچاوەوە رەوانە کراون.**

**کەواتە هەموو وەك یەك رەوانە کراو و فروستادە وان، کەواتە بەو جۆرەی فەرموو تا دەست نیشان بکات بۆ ئەو مەبەستە گرنگە کە پێویستە لەسەر هەموو بڕواداری بڕوای دامەزراوی بەوە ببێ یان مەبەست ئەوەیە هەر گەلێ یاخی بوو لە فروستادەی تایبەتی خۆی. ئینجا هەرچۆنێ بە کورتی دەست نیشانی کرد بۆ تاوانەکەیان. هەروەها بە کورتی دەست نیشان ئەکات بۆ تۆڵەکەشیان، بە جۆرێ بیم و ترس ئەخاتە دەروون.**

**ئەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً﴾ بەهۆی ئەوە خوا گرتنی و تۆڵەی لێ سەندن بە گرتن و تۆڵەیەکی زۆر زیاد لە تین و سەختیدا، و بەرز و بڵند و داگیرکەریان بوو. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ شێوەی تۆفانەکەی نوح پێغەمبەر(ﷺ)، و گەڕانی کەشتی یەکەی، بەهۆی ئەوە دەست نیشان ئەکات بە خنکان و لەناو چوونی بێ بڕواکانی گەلەکەی.**

لە کاتێکا منەت ئەنێ بەسەر ئادەمی دا بە رزگارکردنی کەسانێ کە بوون بە بنەڕەت بۆ رۆڵە و نەوەکانی پاش خۆیان، کە ئەوانەی لە یەکەم جارەوە ئەم فەرمودەیان بیست بەشێکن لەو نەوە و وەچانە، ئینجا بێ بڕواکانی ئەو تاقمە سوپاسی ئەو پەروەردگارەیان نەکردو تەمێ خوار نەبوون بەو نیشانە و بەڵگە گەورەیە.

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ﴾ بەڕاستی کاتێ ئاو سەرکێشی کردو لە سنور تێ پەڕی ئێمە ئێوەمان هەڵگرت لەناو کەشتی یە گەڕۆکەکەدا، بە هەڵگرتنتان لە پشتی باپیرە گەورەتانا، کە نوح و کوڕەکانیەتی. یا بە هەڵگرتنی ئەوان کە ئێوە لە پشتیانا بوون.

﴿لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً﴾ بۆ ئەمەی ئەو کردەوەمان – واتە رزگار کردنی بڕواداران و خنکاندنی بێ بڕواکان – بکەینە تەمێ و ئامۆژگاری بۆ ئێوە. وە بەڵگە لەسەر تەواویی دەسەڵات و کار دروستی و میهرەبانی فراوانمان، ﴿وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾ وە بۆ ئەمەی چەند گوێچکەیەکی وەرگری پارێزەر ئەو کردەوە وەرگرێ و راگیری کالای خۆی بۆ بیر لێ کردنەوە و تەمێ خواری واتە ئەو کردەوەمان کرد و بۆمان باس کردن بۆ ئەمەی هەر کەس ژیر و تێ گەیشتووە پەندی لێ وەرگرێ و تەمێ خوار ببێ پێی و بگەڕێتەوە بۆلای خوا بە بڕوا هێنان و گوێڕایەڵی.

ئەو چەند شێوە سزا سامناکە دڵ داچڵەکێنەرانە کە دەست نیشانی بۆ کردن، لەم ئایەتانەی کە تێپەڕیان کرد، زۆر شتێکی بچووك و لاوازن و هیچ چاو نادەن لەچاو رووداوی هەرە گەورەدا، رووداوی رۆژی دوایی، کە لە سەرەتای سورەتەکەوە دەست نیشانی بۆ کردو دوو ناو لە ناوەکانی باس کرد:﴿الحاقة-القارعة﴾ جا ئەوا لێرەدا چەند بارو روویەکی دەرئەخات. ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ﴾ ئینجا کاتێ یەك فووی تەنها کرا بە سوردا.

ئینجا بەدوای ئەوەدا ئەمانە روو ئەدەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ﴾ وە زەوی و شاخەکان هەڵ گیران و بەرز کرانەوە ﴿فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً﴾ ئینجا بە یەکجاری دران بە مل یەکا تا ئەبن بە تۆزو تێکەڵ ئەبن و هیچ چاڵی و بەرزو نزمی نامێنێ.

کاتێ ئەوە رووی دا ﴿فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾ لەو رۆژەدا رووداوەکە روو ئەدات و بەدی دێت. واتە رۆژی دوایی بەدی دێت کە ناو ئەبرێ بە ﴿الواقعة﴾ چونکە شتێکە ئەبێ هەر ببێ و بەدی بێت. وەك بە سروشت و هەمیشەیی هەر بەدی هاتوو بێ وایە. لەو رۆژەدا وە نەبێ وێران بوون هەر بۆ زەوی و شاخەکان بێت بەڵکو ئاسمانیش قوتار نابێ،

وەك ئەفەرموێ: ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ﴾ وە ئاسمان لەت لەت و پارە پارە ئەبێ ﴿فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ﴾ کەواتە ئاسمان لەو ڕۆژەدا نامەحکەم و بەرگە نەگرە. ئێمە لە ڕووی ڕاستی یەوە نازانین مەبەست بەم وشەی(ئاسمان)ە چی یە؟

بەڵکو هەر ئەمە ئەزانین کە ئەم ئایەتە و چەند ئایەتێ تر کە باسی ئەو ڕووداوە بوونەوەری یانە ئەکات، هەموو ئەوانە دەست نیشان ئەکەن بەوە ئەمەی کە ئێمە ئەیبینین و دەستی قودرەت ڕێکی خستووە و هۆنیویەتی یەوە تێك ئەچێ و ڕژێمەکەی ئەپچڕێ و نامێنێ و ئەڕوخێ و لەیەك جوێ ئەبێتەوە.

زۆر سەیرە زانایانی ئاسمانی ئەمڕۆ لە سەرەنجامی تێ ڕوانین و بیرکردنەوە و بەراورد کردنی خۆیان و بەپێ ی ئەوەی بۆیان دەرکەوتووە لە سروشتی ئەم بوونەوەرە. ئەو زانایانە باوەڕیان هەیە بە بەسەرهاتێ کە ڕوو ئەکاتە ئەم بوونەوەرە و ئەبێ بەهۆی وێران بوونی جیهان! بەڵام ئێمەی موسڵمان لەوانەین و خەریکین ئەو بەسەرهاتانە هەست پێ بکەین و بیانبینین لە ناوەندی ئەم ئایەتەدا، ئەوەستین لە سنووری ئایەتەکانا بێ زیاد و کەم، چونکە تاقانە هەواڵی ڕاست لەم بارەیەوە هەر ئەوەیە کە لەمانەوە وەری ئەگرین، چونکە لای خاوەن کارەکەوە هاتووە کە خۆی دروستی کردون و خۆی ئەزانێ و ئاشنایە بە دروست کراوی خۆی، و خۆی بەسەرهاتەکان ئەهێنێ.

خەریکین و لەوانەین بەچاو زەوی ببینین لە کاتێکا بەخۆی و هەموو شاخەکانی یەوە هەڵگیراون و دراون بەسەر یەکا، ئەم زەوی و شاخانە بەم هەموو گەورەیی و گرنگی یەوە لەچاو ئێمەدا ئەگەر چی لەچاو بوونەوەردا وەك ناوکە خەرتەلەیەکیش نین و خەریکین و لەوانەین ئاسمان ببینین لەکاتێکا لەت لەت و پارە پارەیە و ئەستێرەکانی پرژو بڵاو بونەتەوەو بوون بە تۆز.

ئەوانەهەموهەست پێ ئەکەین لە ناوەندی ئایەتەکانا بەهۆی بڕوای بەهێزو دامەزراومان پێیان. ئاسمان بەو جۆرەی لێ دێت، ﴿وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ﴾ وە مەلائیکە پرژو بڵاو ئەبنەوە بەم لاو ئەو لاو و ئەتراف ئاسمانا، ئیتر ئەو لەت بوونی ئاسمانە پاش فووی یەکەم ڕوویدات و لەپاش زیندوو کردنەوەی ئەو مەلائیکەتانە کە بە فووی یەکەم ئەمرن.

وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُواْ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾

---

یا ئەو لەت بوونە پاش فووی دووەم و زیندو بوونەوەی هەموان روویدات بەهەر دووبار ئەگونجیٚ. ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ﴾ وە لەو رۆژەدا عەرشی خوای پەروەردگارت بەلای سەرووی مەلائیکەکانەوە هەشت هەڵی ئەگرن. هەشت کەس یا هەشت ریز یا هەشت چین و تاقم لە مەلائیکە، یا هەشت لەوەی خوا ئەیزانیٚ. ئێمە نازانین کیٚن و ئەوانە چین؟ هەرچۆنیٚ نازانین عەرش چی یە؟ نازانین چۆن هەڵی ئەگرن؟ و لەم شتە غەیبی یانەی کە ئێمە هیچی لیٚ نازانین و خوایش زانینی زیاد لەم ئەندازەمان لیٚ داوا ناکات کە بۆی باس کردوین.

لەم شتانە تێپەڕ ئەکەین و دەرئەچین بەبیٚ دەم و دەست کوتان لە شتیٚ کە لە سنووری زانین و توانینی ئێمە بەدەرە وە ئەوەی وەرئەگیریٚ و هەستی پیٚ ئەکریٚ لەم جۆرە باسانەوە گەورەیی و بەرزی و بڵندیی بیٚ سنووری خوایە، لەگەڵ هەست کردن بەو هەموو سام و ترس و لەرزو مل کەچی یەی کە لەو رۆژەدا ئەو جیهانە داگیر ئەکات و ئەو هەڵوێستە گەورەیە دائەگریٚ. ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ﴾ لەو رۆژەدا عەرز ئەکریٚن و ئەبرێنەوە بەر دادگای گەورەی پەروەردگار و نیشان ئەدریٚن. واتە پرسیارتان لیٚ ئەکریٚ، لەکاتێکا ﴿لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ هیچ پۆشیدە و نهێنی یە لە لایەنتانەوە شاراوە و پۆشیدە نییە لەخوا.

کەواتە عەرز و پرسیارەکە بۆ ئەوپەڕی دادپەروەری یە، و بۆ نەهێشتنی هیچ بڕو بیانوویەکە و دەم بەستن و دەم کوت کردنی هەموو تاوانبارانە، بۆ دەرخستنی حاڵی هەموو کەسە لەو رۆژەدا لەناو ئادەمی و جنۆکە و مەلائیکەدا تا ئەوەش ببیٚ بەهۆی کەشخەو کەیف و خۆشی و سەربەرزی چاکان و سەرشۆڕی و بیٚ ئابڕویی و داخ و غەمباری تاوانباران. پەنا بە خوا لەو رۆژەدا هەموو شتیٚ ئاشکرایە و دەرخراوە.

لەش و دەروون و دڵ و نیاز و کردەوەو دوا رۆژ و چارەنوس، هەمووی ئاشکرا و دەرکەوتوو ئەبن. هەر پەردەیە بەسەر هەر نهێنی یەکەوە بووبیٚ ئەدڕیٚ و نامێنیٚ، و دەروون روون و دەرکەوتوو ئەبیٚ بە وێنەی لەشەکان، و غەیب و نهێنی یەکان ئاشکرا ئەبن بە وێنەی شتە ئاشکراو بینراوەکان. هیچ کەس خۆ شاردنەوە و خۆ پەنادان و فڕوفێڵی بۆ ناکریٚ، و

ئەوەی لە جیهانا ئەیویست دایشاریٚ لە هەموو کەس لەو رۆژەدا ئاشکرا ئەبیٚ! ئای هاوار بۆ ئەو ئابڕو چونە لەبەرچاوی ئەو هەمووە بیٚجگە لە خوا کەس ژمارەیان نازانیٚ!

بیٚ گومان هەموو بڕواداریٚ ئەزانیٚ کە هەموو شت هەمیشە ئاشکرایە لە خواو بەپیٚش چاوی قودرەتی یەوە. بەلاٌم هەموو کات لە جیهانا ئەو هەست و ئامادە نی یە لای مەردوم بەهۆی ئەوە زۆر جار خۆی دائەشاریٚ لەکاتی تاوان و خراپەکاری دا و بە پیٚش چاوی ئادەمی یەوە نایکات، کەچی کە کەوتە پاشەملیٚ ئەو ئادەمی یە بیٚ باك تاوانەکە ئەکات. دەی ئەگەر هۆشی لای خۆی بیٚ چۆن تەقیٚ لەخوا ناکات وە تەقیٚ لە بەندەی خوا ئەکات!

بەڕاستی شتی وا زۆر مایەی خەجاڵەتی و تەریق بوونەوەیە. جا ئەوا قورئان بیٚدارمان ئەکاتەوە کە لە رۆژی دوایی دا هەموو نهیٚنی و شاراوەکانیشمان ئاشکرا ئەبیٚ و دەرئەکەون، تەنانەت شتیٚ دەست ناکەویٚ بکریٚ بە پەناو پەردە لەحاستی مەردومیش بە ویٚنەی ئەم جیهانە.ئەویٚ دەشتیٚکی کاکی بە کاکی یە بەبیٚ بەرزی و نزمی و درەخت و چاڵ و چۆڵی و داروبەردیٚ، لەش رووت وقووتەبەبیٚ پۆشاك ودڵ و دەرونیش چی تیا بووە ئاشکرا ئەکریٚ!!

بەڕاستی کارو بەسەرهاتەکە ئیٚجگار سەخت و سامناکە. ئەی ئادەمی وەرە بیر کەرەوە لە وەستانت لەو رۆژەدا بە رووت و قوتی و بەبیٚ پەردە و داشاردەریٚ، نە بۆ لەشت، نە بۆ دەرونت، نە بۆ هەست و نیازت، نە بۆ میٚژووت، نە بۆ کردەوەت. لەبەر چاوو لەناو گەل و کۆمەڵە زۆر گەورەو گرنگە لە ئادەمی و فریشتە و پەری و جنۆکە، لەژیٚر زانین و بینینی خوادا و لەژیٚر عەرشەکەی خوادا کەوا بەلای سەرووی هەموانەوە. بەڕاستی کارەکە گەورەتر و سەخت و سامناك ترو تاڵ ترە لە هەموو شتیٚ!

ئینجا بەشیٚوەی رزگار بووەکان و سزا دراوەکان ئەخاتە بەرچاو، وەك ئیٚستە بووبیٚ. ئەفەرمویٚ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾ هەرکەسیٚ نامەی کردەوەی پیٚ بدریٚ بەدەستی راستی یەوە ﴿فَيَقُولُ﴾ ئەوکەسەلەخۆشیدا و بە کەشخەوە ئەڵیٚ ﴿هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ﴾ ها بیگرن نامەکەم بخویٚننەوە. وەرگرتنی نامە لە رۆژی دوایی دا بەلای راست یا بەلای چەپ وە لە پشتەوە کە لە قورئان و حەدیسا هاتووە هەڵئەگریٚ بەگویٚرەی دیمەن و رواڵەتەکەیان مەبەست بن، وەکو زۆربەی زانایان ئەفەرمون. هەڵئەگریٚ بە شیٚوەی چیرۆك بن، ئەوەش بەپیٚی باوی عەرەب کە لای راست بۆخیٚروچاکەبەکارئەهیٚنن ولای چەپ و پشت خستن بۆبەدو خراپە بەکار ئەهیٚنن.

بەهەرکام بیگرن مەبەستەکە هەر یەکە و پێویست نییە بە دووبەرەکی کردن لەم جۆرە مەسەلانەدا، وە راست نییە کات زایە کردن لەلێکۆڵینەوەو دەمەقاڵێ لە شتی وەهادا تابەهۆی ئەوە گەورەیی و سامناکی بەسەرهات و هەڵوێستەکە لەبیر بچێتەوە و فەرامۆش بکرێ.

﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ﴾ بەڕاستی من لام وابوو ئەمزانی کە ئەگەر بە حیساب و پرسیاری خۆم، واتە بڕوام بوو بەرۆژی دوایی بەهۆی ئەوە خوا چاکەی لەگەڵ کردم. وەکو لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە(عبدالله ی کوڕی حنظله) ئەفەرموێ: بێ گومان خوا بەندەی خۆی ئەوەستێنێ لە رۆژی دوایی دا، ئینجا گوناهو خراپەکانی لەپشتی نامەکەیەوە دەرئەخات و نیشانی ئەدا، ئینجا پێی ئەفەرموێ: ئایا تۆ ئەوەت کرد؟

ئەویش ئەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم. ئینجا ئەویش ئەفەرموێ: من لە جیهانا ئابڕووم نەبردی بەمانەو دەرم نەخست، و ئەمڕۆیش وا لێت خۆش بووم. ئینجا لەوێدا ئەو بەندەیە ئەڵێ بە خەڵکی: ﴿هَآؤُمُ اقْرَءُوا كِتَٰبِيَهْ * إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ﴾. ئینجاجاڕ ئەدات و روونی ئەکاتەوە ئەوەی کە ئامادەکراوە بۆ ئەم بەندە رزگار بووە لەنازو نیعمەتێ کە هەست پێ کراوو ناسراوە لای مەردوم، بە تایبەتی رێکە لەگەڵ ئەو یەکەم تاقمەی کە ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، کە ئەوانە هێشتا لە نەفامی و نەزانی دا بوون، یا تازە لێ ی دەرچووبوون، و لەگەڵ ئیسلام و بڕوادا چەند هەنگاوێ نەڕۆیشتبوون، دەروون و هەستیان رەنگی نەگرتبوو بە ئیسلام و بڕواوە، تا بەهۆی ئەوەوە نازو نیعمەتی بەرزتر و بەنرخ تر بناسن و بۆیان باس بکرێ و موژدەیان بەوانە پێ بدرێ. ئەفەرموێ: ﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ ئینجائەو کەسە وا لە گوزەران و رابواردنێکی زۆر پەسەند کراوی لێ بووراوا. کەواتە هیچ جۆرە ناخۆشی و ناتەواوی نییە. ئینجا بەشێ لەو گوزەران و رابواردنە بە کورتی روون ئەکاتەوە ئەفەرموێ:

﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾ وا لە باخ و بەهەشتێکی بەرزوبڵندا. بەرزوبڵندە لەهەمووبارورویەکەوە. بەرزەلەجێ وشوێنا، بەرزەلەرادەو پلەدا، بەرزە کۆشکەکانی، بەرزە دارودرەختەکانی. وا لەو بەهەشتەداکە﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ بەروبیوەو هێشووەکانی نزیکن و بە ئاسانی دەست کەوت ئەبن، بەپێوەو بەدانیشتن و بە پاڵەوە، ئەگەر ئارەزوو بکرێ بەدەست وەرئەگیرێن، ئەگەر حەز بکرێ ئەوان دێن بۆلای دەم وەکو لە حەدیسدا ئەفەرموێ، بێ گومان ناز و رێز هەرچەند خۆش و گرنگ بێت ئەگەر شێوەی منەت و چاو لەبەری تیا بێ لێڵی و تاریکی یە رووی تێ ئەکات.

﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ
كِتَٰبِيَهۡ ﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي
سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴿٢٩﴾﴾

---

جا لەبەر ئەوە هەرچۆنێ ئەو هەموو هۆی خۆشی یەیان بۆ تەرخان ئەكرێ پێشیان ئەووترێ لەلایەن خواوە. ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ﴾ بخۆن و بخۆنەوە چۆن ئارەزوو ئەكەن ﴿هَنِيٓـَٔۢا﴾ بە خۆشی ونۆشی گیانەوە﴿بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ﴾ لەبریتی ئەو كردەوە چاكانەی كە پێشتان خست و هەڵسان پێی لە رۆژەكانی رابوردووی جیهانا. واتە ماف و پاداشتی خۆتانە و منەتێكتان بەسەرا ناكرێ چونكە لە خۆڕایی پێتان نەدراوە. هەموو منەت و سوپاس و سەنایە بۆ خوا. ﴿وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ﴾ وە ئەو كەسەی كە نامەی كردەوەی پێ بدرێ بە دەست و لای چەپیەوە. زانی كە تاوانبارە و سزاو تۆڵەی لەسەرەو بەش و چارەنووسی سزای دۆزەخە، بە هەناسەی ساردو نائومێدی یەوە ئەوەستێ لەو كۆڕو كۆمەڵەدا. ﴿فَيَقُولُ﴾ ئینجا ئەڵێ ﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ﴾ ئای كاشكێ نامەكەم پێ نەدرایە ﴿وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ﴾ وە نەمزانیایە حیسابم چی یە. ﴿يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ﴾ ئای كاشكێ ئەو مردنەی كە كردم ژیانمی دوایی بهێنایە و ئیتر زیندو نەكرامایەتەوە. پەنا بەخوا، وەكو(قتادة) ئەفەرموێ: ئاوات بۆ مردن ئەخوازێ كە لە جیهانا هیچ شتێ نەبوو لە مردن بێزراوتر بەلایەوە.

ئینجا داخ و مەراقی ئەو دەرئەبڕێ كە ئەو شتانەی لە جیهانا هەوڵی بۆ ئەدان و شانازی پێوە ئەكردن هیچ سودێكیان لێ وەرناگیرێ. ئەڵێ ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ﴾ هیچ سودی پێ نەگەیاندم و بەرگری هیچ سزایەكی لێ نەكردم ماڵ و دارایی یەكەم. یا ئەوەی كە بووم لەماڵ و خزمەتكارو ژێر دەست. ﴿هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾ نەما و لە دەستم چوو زۆر و دەسەلآتەكەم. یا بەڵگەو رابەرم نەما كە لە جیهانا ئە هێنایەوە بۆ مەردوم. ئایا بەو جۆرە درێژە ئەدا بەدەربڕینی داخ و مەراق و دڵغەمگینی خۆی.

خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَـٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَـٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾

---

**ئینجا فەرمان دەرئەچێ لەپادشای گەورەو خاوەنی گشتی یەوە فەرمان دێت بۆ ئەو مەلائیکەتانەی کە کاروباری دۆزەخیان پێ‌سپێرراوە بەم جۆرە سامناکە کە بەیر لێ کردنەوەی حەق وایە دڵ بکەوێتە تەپەتەپ و لەرزەو تیکە لە گەروودا بگیرێ. ئەفەرموێ: ﴿خُذُوهُ﴾ بیگرن، ﴿فَغُلُّوهُ﴾ئینجا زنجیری کەن و کۆت و زنجیر بخەنە دەست و گەردنی پەنا بەخوا لەو کاتە سەختەو سامناکەو ئەو بەسەرهاتە کە دێتبەسەر ئەو سیاچارەی بەش براوی دوابڕاوەدا!!**

**(ئیبن ئەبی حاتم) ئەڵێ: کاتێ فەرمان ئەدرێ بەگرتنی دەست بەجێ حەفتاهەزار مەلائیکە پەلاماری ئەدەنێ لە هەموو لایەکەوە پەلاماری ئەو گیانلەبەرە بچووکە لاوازە بێ‌هۆشە ئەدەن!**

**هەرکام لەو حەفتاهەزارە پێی گەیشت زنجیر ئەخاتە گەردنی!! ﴿ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ﴾ ئینجا بیخەنە ناو جەحیم کە ناوە بۆ تەبەقەی تایبەتی لە دۆزەخ کە ئاگرەکەی زۆر گەورەو بڵێسەدارو بەتین هەڵگراوە.**

**بیخەنە ناوی بەجۆرێ سزاو سوتاندنەکەی بچەژێ. ﴿ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ﴾ ئینجا بیخەنە ناو زنجیرێکەوە کە پێوانەو ئەندازەکەی حەفتا گەزە. خستنی لەناو ئەو زنجیرە بەم جۆرەیە ئەپێچرێ بەسەر هەموو لەشیا تا تەواناى جوڵان و دەرچوونی نەمێنێ. پەنا ئەگرین بەخوا بە بەزەیی خۆی بمانپارێزێ.**

**لەپاش دواهاتنی فەرمانەکە ئینجا هۆی ئەو فەرمانە بڵاو ئەکرێتەوەوئەگەیەنرێ بەو گەل و کۆمەڵە، دوو شت ئەکات بەهۆی ئەو سزایە:**

١- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ بێگومان ئەو كەسە لەجیهانا بڕوای نەهێنا بە خوای گەورەو هەمیشەیی بوو لەسەر ئەو بێبڕوایی یە تا مرد.

٢- ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾ وە هانی مەردومی نەئەدا لەسەر خۆراك دان بە هەژار. دیارە هەركەسێ بەماڵی مەردوم بەزەیی نەیەتەوە بە هەژارا بەماڵی خۆی چروك ترەو بەزەیی هەر نایەتەوە پیایدا، ئەو ڕووڕەشە دڵی بێبەش بووە لەبڕوا بەخواو لە بەزەیی بە بەندەكانی خوا.

كەواتە ئەو دڵەو خاوەنی ئەو دڵە هەر بۆ ئەو ئاگرو سزا چاكە. دڵێ بێبەش بوو لە بڕوا بەخوا كەواتە وێرانەو بۆش و بێخێرو بێپیتەو بێبەشە لە ڕووناكی. ڕادەی پەست ترە لە ئاژەڵو گیانلەبەرانی تر، بەڵكو لە دارو بەردیش. چونكە هەموو شتێ تر بڕوا دارەو پەروەردگاری ئەناسێو یادو سوپاسی ئەكات و پەیوەندی بە سەرچاوەی بوونو بوونەوەرەوە هەیە. بەڵام ئەو ناپەسەندە پچڕاوە لە خوا پچڕاوە لە بڕوادار بەخوا.

دڵی خاڵی و بێبەشە لە بەزەیی بە بەندە هەژارەكانی خوا. هەژار لە هەموو كەس پێویست ترە بە بەزەیی بەڵام دڵی ئەم كە بەزەیی تیا نەبووە گوێی نەبوو لە هەژار.

هانە هانەی مەردومی نەئەدا لەسەر خۆراك پێدانی كە ئەو هاندانە ئەبێ هەنگاوی دووەم بێت بۆ خۆراك دانی خۆی بە هەژار. ئەو هاندانو خۆراك دانە پێویستێكی كۆمەڵایەتی یە لە گەردنی بڕوادارانا، ئەبێ هەڵسن پێی، پەیوەستی یەكی بەتینی هەیە بە بڕوا بە خواوەو دێت بە دوایا لە قورئاناو دێت بە دوایا لە تەرازووی خوادا!

﴿ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴾ كەواتە نی یە ئەمڕۆ بۆ ئەو كەسە لێرەدا هیچ خزمێكی بەزەیی داری دڵگەرم كە بیپارێزێو بەرگری لێ بكات. ﴿ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴾ وە هیچ خۆراكێك نیە بۆی مەگەر لە كێمو خوێنو زوخێ كە لەلەشی دۆزەخی یەكانا دێتە دەرەوە، كە ﴿ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴾ هیچ كەس ئەو خۆراكە ناخوات جگە لە گوناهباران. واتە گوناهبارانی هەرە گەورە كەبێ بڕواو بت پەرستەكانن. ئەوخۆراكەپیسە ڕێك و ڕاستە لەگەڵ ئەو دڵە ڕەقە بێبەزەییەدا.

لێرەدا فەرمووی خۆراکیان هەر لە(غسلين)ە لە ئایەتی(صافات)و(واقعە)دا ئەفەرمویٚ:((زەقوم) ئەخۆن. وەلە سورەتی غاشیەدا ئەفەرمویٚ: خۆراکیان هەر لە(ضريع)ە.

جا ئەگەر ئەم سیانە یەك شتو یەك خۆراك بن -وەکو هەندیٚ لە زانایان بە یەك تەفسیریان ئەکەنەوە- ئەوا ئاشکرایە هیچ دژایەتی نی یەو جیٚگای هیچ قسەو باسیٚ نین.

ئەگەر ئەمانە جیاوازبن ئەو کاتە ئەلٚێن: سزای خوا چەند جۆری هەیە، و سزادراوان چەن تاقمو چینێکن.هێندیٚ(غسلين) خۆرەو هێندیٚ زەقومو هێندیٚ(ضريع) بەپیٚی جیاوازی رادەو زۆرو کەمی تاوانو سزاکان. کەواتە لەسەر ئەم بارەش دژایەتی ڕوونادا لەناو ئایەتەکانا هیچ کەس هیچ ڕەخنەیەکی بۆ ناگیریٚ.

ئەو خۆراکە دەرخواردی ئەو بیٚباوەڕانە کەهان نادەن لەسەر خۆراك دان بە هەژارو بەزەییان نایەتەوە پیا. ئەی ئەبیٚ ئەو کەسانە چۆن بن کە بەرگری خۆراك ئەکەن لە هەژار، و منالٚو ئافرەتو پیر برسی ئەکەنو بە توندی ئەدەن بەدەستی هەر کەسێکا کە بیەوێت دەستی یارمەتی درێژبکات بۆ ئەو بیٚچارانە؟

ئایا ئەوانە بۆ کویٚ ئەچنو ئەبیٚ ئەوانە سزایان چۆن بیٚ، بەتایبەتی ئەوانەیان کە بەناو وان لە وولاتی ئیسلاماو لە ڕۆلەو نەوەی موسلٚمانانو ستەم لێکراوەکانیشیان هیچ گوناهێکیان نی یە بێجگە لەوەی موسلٚمانو ئەیانەویٚ هەر لە ژێر ئالاٚی ئیسلاما بن، ئەو جۆرە ستەم کارەش زۆرو زەبەنە پەیدابوونو ئەبن لە وولاٚتا!!

ئا بەو جۆرە ئەو شێوە سامناکە دلٚ داچلەکێنەرە دوایی هات. ڕەنگە ئەو شێوەیە کە بەو جۆرە هات بەهۆی ئەوە بێت ئەو گەلو کۆمەلٚەی یەکەمجارە یاخیو ستەم کارو بەتینو دلٚ ڕەق بوونو پێویستیان بەو جۆرە ترساندنە بوو. وێنەی ئەم تاقمو چینە لەپاش ئەوان بووەو هەر ئەشبیٚ لە چەرخو سەردەمە نەفامیەکانا کە دێن بەسەر گەلی ئادەمیدا، هەر چۆنیٚ لە هەمان کات دا دلٚ نەرمو گویٚ گریش هەر بوونو هەر ئەبن. جاقورئان لەگەلٚ هەموو جۆرە دەروونا ئەدویٚ بەجۆریٚ لەوانەبیٚ کاربکاتو وەریگریٚ.

فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖۚ قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾

---

لەپاش نیشاندانی ئەو هەموو شێوە بەتین و بەهێزە، هەر لە یەکەم جارو سەرەتای سورەتەکەوە تا ئێستا. شێوەی گرتن و سزای جیهان، و شێوەی وێران کردنی ئەم بونەوەرە. و شێوەی خۆشی و شادمانی داخ و مەراقی داگیرکەر. لە پاش ئەمانە ئینجا بڕیارو ڕوونکردنەوەیەکی بەهێز دێت لە بارەی ئەم قورئانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هێنان، ئینجا ئەمانیش وەریان گرت بەگومان و دوو دڵی و لاقرتی پێکردن و بڕوا پێ نەهێنان: ئەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ﴾[1]، (لا اقسم) سوێن ناخۆم واتە چونکە مەسەلەکە ڕوون و ئاشکرایە و سوێنی ناوێ. یا(لا اقسم) کار بەو جۆرە نی یە کە بێباوەڕەکان ئەڵێن و ئەزانن سوێن ئەخۆم. یا(لا اقسم) سوێن ئەخۆم(بما تبصرون) بەوەی کە ئەبینن و بەچاوی ئەکەن،(وما لاتبصرون) وە بەوەی کە بەچاوی ناکەن و نایبینن.

واتە سوێن بە هەموو ئاشکراو نهێنیەك. ئا بەم گەورەیی و گرنگیە. و بەم سامناکی یە هەموو غەیب و نهێنی یە ئەخاتە دەروون و باسی ئەکات لەگەڵ هەموو ئاشکراو هەست پێ کراوێکا. بێگومان ئەوەی کەهەیەو نابینرێ زۆرترو گرنگترە لەوەی ئادەمی ئەیبینێ. بەڵکو لەوەی ئەیزانێ. ئەوەی ئەیبینێ و ئەیزانێ چەند بەشێکی کەمەو هەڵژمێراوە، بە پێی پێویستیەتی بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی و هەڵسانی بەکاروباری جێ نسینی یەکەی لە زەویدا –هەر چۆن بەوجۆرەی خوا ویستی– هەموو زەوی شتێکی بچووکی لاوازە لەوانەیە نەبینرێ یان هەستی پێ نەکرێ لەناو ئەم بوونەوەرە گەورەیەدا. ئادەمی ناتوانێ تێ پەڕێکات لە بینین و زانین زیاد لەو ئەندازەی بۆی دانراوە و بۆی ڕێکخراوە لەم مەملەکەت و دروستکراوی خودا، کە بێجگە لەخۆی هیچ کەس سنورو ئەم پەڕو ئەوپەڕی نازانێ!!

ئەم جۆرە دەست نیشان کردنە قاپی دڵ ئەکاتەوەو دەروون ووریا ئەکاتەوە بەمەی کە بێجگە لەوەی ئەیبینین و ئەیزانین چەندەها شتی تر هەیە نایبینین و پێی ناگەین. بەو دەست نیشان کردنە بۆچوون و تێگەیشتنی ئێمە پان و فراوانتر ئەبێ و نابەسترێتەوە بەدیاری تەنها بینراوو زانراوە کەم و کوڕو سنوردارەکەی خۆمانەوە.

---

[1] (پەڕەکە دڕاوە)

بەڕاستی ئەو کەسانەی کە تێگەیشتن‌و زانینی خۆیان ئەخەنە ناو چوارچێوەی بینراوو هەست پێکراوو لەو سنورە دەرناچن وە تێپەڕ ناکەن. ئەو کەسانە زۆر هەژارو داماون، و لە جیهانێکی زۆر تەنگدا ئەژین کاتێ بەراوورد بکرێ لەگەڵ مەملەکەت‌و جیهانە پان‌و پۆڕەکەی خوادا کە تەنها خۆی سنووری ئەزانێ.

لە چەند ماوەو کاتێکی جیاجیا لە مێژووی ئەم ئادەمیەدا چەند کەسێ بوون‌و هەن خۆیان بەند ئەکەن بەدەستی خۆیان لەم چوارچێوە تەنگەدا، قاپی‌و کون‌و کەلەبەری زانین‌و ڕووناکی لەسەر خۆیان دائەخەن، لەڕێگای بێ بڕواییەوە. هەوڵ ئەدەن‌و ئەیانەوێ قاپی‌و کون‌و کەلەبەرە لە خەڵکیش دابخەن. بێگومان ئەوانە دوژمنی خۆیانن لە پێشەوە ئینجا دوژمنی هەموو ئادەمی‌و ئادەمێتین.

زانین‌و زانیاری لەم چەرخ‌و سەدەی دوایی یەدا بەرەبەرە ڕزگار ئەبێ لەو بەندیخانەی کەبەتوندی قاپی یەکەی داخست لەسەر خۆی لەو دوو چەرخ‌و سەردەمە ڕابووردووەدا، ڕزگار ئەبێ لەو تاریکی یە دێتە دەرەوە بۆ ڕووناکی لەڕێگای بەراووردگەڕایەوە لەو گومڕایی یەی کە تێی کەوت‌و بە ملکەچی یەوە بانگ ئەکات بۆ بڕواهێنان بەجۆرێ موژدە بەخشە بۆ ڕزگار بوون.

بۆ نموونە: مامۆستا(عقاد)لەکتێبی "عقائد المفکرین"دا قسەو بڕیاری چەند زانایەکی بەناوبانگی بەرز ئەهێنێ کە لەڕێگای زانینەوە ڕزگاربوون لەبەندیخانەی تەنگ‌و تاریکی ماددێتی.

١- (الکسیس کاریل) کە پزیشکی تایبەتی بوو لەبارەی سێڵ‌و گواستنەوەی خوێن و چاوەدێری مەعهەدەکانی چارەسەر کردن بوو، خاوەنی ئافەرین‌و جائیزەی "نۆبڵ" لەساڵی ١٩١٢و بەڕێوەبەری مەعهەدی دیراساتی ئادەمی لە فەرەنسا لەسەردەمی جەنگی جیهانی دووەما ئەڵێ:(ئەم بوونەوەرە بەم فراوانی یە کە هەیە پڕە لەچەند ژیریی ئیش کەری جیاواز لە ژیرییەکانی ئێمە... هتد).

٢- (دی نوی) کە پزیشکێ ترە ئەڵێ: زۆر کەس لە زیرەك‌و نیازپاکان لایان وایە ناتوانن بڕوا بێنن بە خوا چونکە ناتوانن بیناسن‌و هەستی پێبکەن‌و تێی بگەن. بێگومان ناسین‌وهەست پێکردن‌وتێگەیشتن پێویست نییەومەرج نییەبۆئەوبڕوا هێنانە. ئەوەتا هەموومان بڕوامان هەیە بەبوونی "کارەب"و بوونی "کارەب" ئاشکرایە بەوێنەی ئەم

شتانەی کە بەچاو نەیانبینین لەگەڵ ئەوەشا نە هەستی پێئەکەین و نە تێی ئەگەین و نە ئەیناسین.

٣- زانای بەناوبانگی ئەسکتلندی(سیر اربوگومسون) ئەڵێ: ئێمە بەڕێکی ئەڵێین: گەورەترین خزمەتێ کە زانیاری و زانین پێی هەڵساوە ئەمەیە کە مەردومی ڕاکێشا بۆ بیرو بڕوایەکی بەرزو بەڕێز لەبارەی خواوەو زیادەڕەوی ناکەین کاتێ ئەڵێین: زانین و زانیاری ئاسمان زەوی یەکی تازەی فەراهەم هێنا بۆ ئادەمی و پاڵی پێوەنا بۆ گەیشتن بە ئەوپەڕی مەبەست و کۆشش و بەرهەمی ژیریی، کە ئاشتی و ئارامی دەست ناکەوێ لەزۆر جارا، مەگەر لای خواوە بەهۆی بڕوای بەهێز بەخوا.

٤- زانای بەرز(ا. کریسی موریسون) سەرۆکی ئەکادیمی علوم لە نیۆیۆرك وە ئەندامی کۆڕی تەنفیزی لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەڵێ لە کتێبەکەیا: "الانسان لا یقوم وحده" کە گۆڕرا بە عەرەبی و ناونرا بە "العلم یدعو للایمان":

بیرو بڕوای "ماددیەت" شتێکی نەگونجاو و ناڕاستە و بێگومان ئەم بوونەوەرە بەڕێکەوت پەیدا نەبووە، چونکە ئەم جیهانە گەورەیە هەموو کاروباری لەسەر یاساو قانونە. ئینجا ئەڵێ: بە هیچ جۆر ناگونجێ ئەم ئادەمی یە فەراهەم هاتبێ لە ڕێگای گۆڕان(تگور)ی ماددەوە بەبێ داهێنەرێ. ئەڵێ: بەڕاستی ئێمە لە پێشکەوتنا گەیشتینە ڕادەیەك بەسە بۆئەمەی دڵنیابین کە خوا تروسکایی یەك لەڕووناکی خۆی بەخشی بەم ئادەمی یە...

ئابەم جۆرە زانین خۆی بەخۆی بەرەبەرە هاتە دەرەوە لە چواردیواری بەندیخانەی ماددێتی، بەهۆی ئەوە ئەگات بەو ڕادەو تێگەیشتنەی کەئەم ئایەتەو وێنەکانی دەست نیشانی بۆ ئەکەن.ئەگەر چی هێشتا لەناومانا چەند کەس هەن بەهەردوو دەستیان هەموو کون و دەلاقەیەك لەسەر خۆیان و ئەوانەی وان بەدەوریانا دائەخەن بەناوی زانینەوە!

بەڵام ئەوانە ژیریان دواکەوتووە لە زانین و ڕۆحیان دواکەوتووە لەئایین، هەستیان دواکەوتووە لە ئازادی و سەربەستی یەك کە هەیە بۆ ئادەمی لەناسینی حەقیقەت و ڕاستی داو ئادەمێتیان دواکەوتە لەو ڕادەی کە شایانە بۆ ئەم ئادەمی یە بەڕێزە!

ئینجا بابێینەوە سەر ئایەتەکە بۆ دەم کوت کردنی ئەو بێبڕوایانە کە دەم درێژیان دەکردە سەر ئەم قورئانەو پێغەمبەر(ﷺ) هەر دەمەو بەجۆرێ، جارێ ئەیان ووت ئەم قورئانە شیعرەو پێغەمبەر(ﷺ) شاعیرەو جارێ ئەیان ووت: کاهینەو ئەمەی ئەیڵێ قسەو هەواڵی کاهینە.

لەو چەرخ و سەردەمەدا باوەڕ وابوو کە شیعر بێژ جنۆکە یارمەتی ئەدات و بەهۆی ئەوە ئەتوانێ ئەو هۆنراوە نایاب و بەرزانە بڵێ. هەروەها لەو سەردەمەدا چەند کەسێ بوون خۆیان بە غەیب زان دائەنا و ئەیان ووت کە هەواڵ لە جنۆکە وەرئەگرن جا ئەو بێبڕوایانە کاتێ ئەیان دی قورئان ووتراوێکی ئێجگار بەهێزەو لە توانای ئەواندا نی یە وێنەی بڵێ ئەهات ئەم جۆرە قسە لارو لەق و لۆقانەیان ئەکرد.

ئینجا قورئانیش بەم جۆرە بەهێزە بەر پەرچیان ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾ بەڕاستی و بێ گومان ئەو قورئانە وتراوی نێراوو فرستادەیەکی بەڕێزی خوایە. واتە لەلایەن خواوە هێناویەتی و ڕای ئەگەیەنێ. ﴿وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖ﴾ بێ گومان وتراوی شاعیر نی یە. ﴿قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ﴾ ئێوە زۆر کەم بڕوا ئەهێنن و بڕواتان هەیە بەو قورئانە. واتە بەهۆی ئەوە ڕاستی قورئان ئاشکرایە ناچارن بڕوا ئەهێنن، بەڵام بەهۆی کەللە ڕەقی و یاخێتی تان دژو پێچەوانە دەرئەبڕن و دانی پیا نانێن. یا ئێوە بڕوا ناهێنن و بڕواتان نی یە. واتە مەبەست لەو زۆر کەمی یە نەبوونە. ئەوەش بەپێی باوی عەرەب کە نەبوون بە کەم دائەنێن. وەکو لە زۆر شیعرو ووتاریانا هەیە.

شیعر هەرچەند جوان و ڕازاوەو بەرزو ئاوازە خۆش بێت، جیاوازە لە قورئان و لەسەر هیچ ژێری یە ناگۆڕێ بە قورئان و جیاکەرەوەی سەرەکی و بنەڕەتی هەیە لە نێوان شیعرو قورئاندا. قورئان بەرنامەیەکی تێرو تەواوی ژیانی تیایە کە دامەزراوو ڕاگیرە لەسەر ڕاستی و دەست نادا بۆ گۆڕان، ئەدوێ لەبارەی بوونی خواو بوونەوەرو ئادەمی و ژیانەوە بەشێوەیەکی نەگۆڕاوی دامەزراو.

شیعر چەند حاڵەت و سۆزو بەزەیی یەکی یەك لەدوای یەکن کەم وەخت دائەمەزرێ لەسەر بارێ و زۆر کەم ئەدوێ لەبارەی ئەو مەبەستە سەرەکیانەی کە ئیسلام لێیان ئەدوێ، و لەیەك بارەوە سەرنجی ژیان نادا، بەڵکو بەپێی خۆشی و ناخۆشی و خەشم و ڕەزامەندی و خۆشەویستی و بێزاری و کینەبازی ئەگۆڕێ. بەکورتی هەموو ژیرو تێگەیشتوویەك شیعرو قورئان لەیەك جیا ئەکاتەوەو هەرگیز ئەم دوانەی لێ ناگۆڕێ بەیەکتر.

وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾

---

﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ﴾ وه ئهم قورئانه بێگومان ووتراوی كاهین نی یه. ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ زۆر كهم بیرئهكهنهوه. یا ههر بیرناكهنهوه، بههۆی ئهوه ئهو قسه ناڕهوایه ئهكهن. لهئایهتی پێشودا فهرمووی: زۆر كهم بڕوا ئههێنن. وه لێرهدا ئهفهرموێ: زۆركهم بیرئهكهنهوه، چونكه جیاوازی شیعر له قورئان زۆر ئاشكرایهو ههر كهس بڕوای ههبێ ئهزانێ و دانی پیا ئهنێ.

ئهو كهسهی دانی پیا نهنێ سهركێشی و عینادی بهكار ئههێنێ. بهڵام جیاوازی كاهین و ووتارهكهی له پێغهمبهرو قورئانهكهی تا ئهو ڕادهیه ئاشكرانی یهو بیركردنهوهی ئهوێ له خوو ڕهوشت و كرداری بهسهرهاتی پێغهمبهر(ﷺ) و بیر كردنهوه لهواتاو مهبهست و ئامانجی قورئان كهئهمانه ههموو دژو پێچهوانهی كاهین و ووتارهكانی كاهینن.

پێویست ههیه بهبیركردنهوه لهوهی كه قورئان چنۆكه لهڕادهیهكا نیشان ئهدا كه ههموو ڕێزگرتنی بریتیهله شوێن كهوتنی ئهم قورئانهو ههڕشهئهكات له یاخی یهكانیان بهئاگری دۆزهخ و جاڕیان لێ ئهدا كه بههیچ ڕهنگ ئاگادار نین بهغهیب و نهێنی یهكان.

كهواته له ههردوو شوێنهكهدا ههر ئهوه ڕێك و ڕاسته كه قورئان كردوویهتی. بهڵێ بێگومان بهكهمێ بیركردنهوه دهرئهكهوێ كه كاهین و ووتاری ڕێگایان نی یه نزیكی پێغهمبهر(ﷺ) و قورئان بكهونهوه چونكه نهله پێش هاتنی ئیسلام و نهله پاش هاتنی هیچ مێژوویهكا نی یه كه كاهین بهرنامهیهكی تهواوو دامهزراوی داهێنابێ، بهڵكو ئهوپهڕی ئهوهی كه كاهین دای هێنابێ چهند هۆنراوهیهك بووه وهك شیعر یا چهند ووشهو ڕستهیهكی ژیرانه، یا دهست نیشان كردن بۆ ماناو مهبهستێ كهبهڕێكی نهزانراون!

كهواته گومانی كاهین و كاهینێتی شتێكی زۆر نهفامی یهو تهنانهت لهو كاتهیشدا كه قورئان چهند سوورهت و ئایهتێكی هانبووه خوارهوهو هێشتا گهورهیی و تێری و تهواوی و بێ وێنهیی یه كهیشی ڕوون نهبوو بووهوه. گهورهو سهرۆكهكانی قوڕهیش لهدهروونی خۆیانا و لهناو خۆیانا باش ئهیانزانی ئهو جۆره قسانه درۆو دهلهسهن، بهڵام سهركێش و خۆبهزل زانی كهڕو كوێری كردبوون له حاستی مل كهچ كردن بۆ ڕاستی، لهلایهترهوه ئهیان ویست

ئەو درۆو دەلەسەو پڕوپاگەندەیە بکەوێتە ناو کوڕو کاڵو جەماوەر بڕوا نەهێنن‌و نەکەونە شوێنی قورئان‌و با هەر ژێردەستەو ژێر باری سەرۆکەکان بن!

کتێبەکانی سیرەت چەند قسەو هەڵوێستێك ئەگێڕنەوە لەهێندێ لەو سەرۆکانەوە لەم بارەیەوە. هێندێ لەوانە ئەمەیە کە(ئیبن‌و ئیسحاق) ئەیگێڕێتەوە لە(وەلیدی کوڕی موغەیرە)و(نضری کوڕی حاریس)و(عوتبەی کوڕی ڕەبیعە)وە. کورتەی هەموویان ئەمەیە کە بەباشی دان ئەنێن بەمەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) نە شاعیرەو نە جادووگەرەو نە کاهین، وە ئەمەی کە ڕای ئەگەیەنێ وتەو وتراوی هیچ کام لەمانە نی یە. کەواتەهەرئەمە ئەمێنێتەوەو هەر ئەمە ڕاستە کە ئەفەرموێ: ﴿تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ هێنراوە خوارێکە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانیانەوە.

ئینجا لەکۆتایی باس‌و سوورەتەکەدا ئەم هەڕەشە سامناکە ئەکات، لە هەرکەسێ کەدرۆ هەڵبەستێ بەدەم خواوە.مەبەست لەوەش ڕوونکردنەوەی ڕاستی‌وپاکی‌وئەمینی پێغەمبەرە-(ﷺ) لەوەی کە ڕای گەیاندووە پێیان‌و ڕای ئەگەیەنێ. ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ﴾ ئەگەر(محمد) بەدەم ئێمەوەهێندێ لەقسەو وتەی پڕوپووچ‌و بێ نرخی هەڵبەستایەو بەدەم ئێمەوە شتێکی بوتایە کە ئێمە نەمان وتووە ﴿لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ﴾ ئەنەوین لەپەل‌و بەدەستی ڕاستی ئەمانگرت ﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ﴾ لەپاشا بەنووکەی دڵیا شاڕەگی ملیمان ئەبڕی ﴿فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ﴾ ئینجا ئەی هەموو ئادەمی لەناو ئێوەدا هیچ کەس بەربەست‌و بەرگری ئێمە نەئەبوون لێی‌و لەدەست ئێمە قوتارتان نەئەکرد. واتە ئەگەر(محمد) پێغەمبەر نەبوایەو درۆی هەڵبەستایە بەدەم ئێمەوە ئێمە ماوەمان نەئەداو لەناومان ئەبرد، بەڵام لەناوبردنەکەی بەشێوەیەکی زۆر سەخت‌و بەتین‌و سامناك نیشان ئەدا، نیشانی ئەدات لەشێوەی سەخت‌ترین کردەوە کە پادشایان ئەیکەن دەربارەی کەسێ کە ئەو پەڕی ڕادە قارو خەشمی لێ بگرن تا ئەیگەیەننە ئەو ڕادەیە خۆیان بەدەستی خۆیان تۆڵەی لێ ئەسێنن‌و فەرمان نادەن بەهیچ کەسێ تر. بەم فەرموودەیە ڕوونی کردەوە کە محمد(ﷺ) ڕاستەو پێغەمبەرە. ئەوەتا هیچی بەسەر نەهێناو ماوەی دا بەڵکو یارمەتی دا تا سەری خست‌و زاڵی کرد.

هەروەها ڕوونی کردەوە کە ئەم کارە زۆر گرنگەو بەگرنگی گیراوەو چاوپۆشی لەکەس ناکرێ ناڕاستی تیابکات بائەوکەسە بەکێکی وەکو پێغەمبەریش بێ کە چاکترو خۆشەویست‌ترینی هەموانە.

وَإِنَّهُۥ لَتَذۡكِرَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعۡلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسۡرَةٌ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٥٢﴾

---

ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بەباسی حەقیقەتی ئەم قورئانەو سروشتی بەهێزی. ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَذۡكِرَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ بەڕاستی ئەو قورئانە تەمێ و ئامۆژگاریو بیر خستنەوەیە بۆ لە خوا ترسەکان. تایبەتی کرد بەلە خوا ترسەکانەوە، چونکە ئەمان سوودو پەندی لێ وەرئەگرن. ئەوانەی لەخوا ترس نین و ئامادەنین بۆ لەخوا ترسان ئەوانە چاوی دڵیان کوێرەو سمەسای لێ بڕاوەو هەست ناکەن بەو ژیان و ڕووناکی یەی کە ئەم قورئانە ئەیداو ئەیبەخشێ ﴿وَإِنَّا لَنَعۡلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ﴾ بێ‌گومان ئێمە ئەزانین کە لەناو ئێوەدا بێ بڕوایان هەن و ئەم قورئانە بەدرۆ ئەزانن.

ئێمە ئاگاین بەوانە، کەواتە تۆڵەیان لێ ئەستێنین، ئەو بێ بڕوایی ئەوانە هیچ نرخی نی یەو کار ناکاتە سەر ڕاستی و گەورەیی ئەم قورئانە. ﴿وَإِنَّهُۥ لَحَسۡرَةٌ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بێ‌گومان ئەم قورئانە داخ و مەراقێکی زۆر گەورەیە بەسەر بێ بڕواکانەوە، داخی دڵیانە لە جیهانا کەبوو بەهۆی بەرزبوونەوەی بڕواداران و زاڵی و سەرکەوتنیان و شان و شەرەفی ئەمانی پێ بەرز بووەوە، داخی دڵیانە بەهیچ ڕەنگ بۆیان چار نەکراو چار ناکرێ و بەهیچ ڕەنگ ناتوانن لاری و نارێکی و نەگونجاوی یەکی تیا بدۆزنەوە.

هەروەها داخ و مەراقی گەورەتریانە لەڕۆژی دواییدا کە ئەبێتە شایەت و بەڵگە لەسەر خراپیان و بەهۆی بڕوا نەهێنانیان پێی دووچاری ئاگری نەبڕاوەی دۆزەخ دێن و داخ و مەراقیانە کە چۆن خۆیان بێ‌بەش کرد لە ڕووناکی و خێرو فەڕی، کەواتە لەهەردوو جیهانا داخ و خەفەتی گەورەیە بۆیان.

خوا بیکات بەمایەی کامەرانیو شادمانیمان بۆ ڕۆژی دوایی -آمین- ﴿وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلۡيَقِينِ﴾ وە بەڕاستی قورئان ئەوپەڕی ڕادەیە لەڕاستی دا، بەجۆرێ بەهیچ ڕەنگ جێگای گومانو دوو دڵی نی یە. ئینجا لەڕێك ترین کاتو شوێنا ئەم فەرمانە ئاڕاستەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات: ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾ واتە لەپاش ئەوەی گەورەییو دەسەڵاتی خوای خۆتت بۆ دەرکەوت، وە دەرکەوت کە ئەم قورئانە ڕاستەو لای خواوە هاتووە، دوا ڕۆژو چارەنوسی بێ بڕواکان بەو جۆرە بوو کەباس کرا. کەواتە بەپاكو تەمیز ناوی پەروەردگاری گەورەی خۆت ڕاگرە. ناوێکی بۆ بەکاربێنە کە شایانو شیاوی ئەوبێت. بەناوێ یادو باسی بکەو هاواری لێ بکە کە خۆی دایناوە بۆ خۆی.

**وصلى الله وسلم على من انزل عليه هذا القرآن الكريم**

**لەتەفسیری ئەم سوورەتە بوومەوە لە ١٤٠٣/٣/٢٨ بەرانبەر ١٩٨٣/١/١٢.**

# سورەتی ﴿المَعَارِج﴾
## مەککەیی یەو(٤٤) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە ئەڵقەیەکە لە زنجیرەی چارەسەرکردنی دوورو درێژی لەسەرخۆو زۆر بەوردی، بۆ ئەو هەموو نەخۆشی یە دەروونی یانەی کە لەسەردەمی نەفامی دا مەردومی چەپەڵ کردبوو بەرەو ڕووی قورئان وەستان لە مەککەدا، هەروەها بەرەو ڕووی ئەوەستن لەهەموو چەرخ و سەردەمە نەفامی یەکانی ترا!

جۆرێکە لەو بەربەرەکانێ سەخت و دوورو درێژی کە قورئان پێی هەڵسا لەگەڵ ئەو هەموو دەروونە لارو نالەبارانەدا، کەئەوەش گرانترو بەتین ترو درێژ تر بوو لەهەموو ئەو جەنگ و کوشتارەی کە لەپاشا موسڵمانانی تێ کەوتن.

ئەو شتە سەرەکی و بنەڕەتی یەی کە ئەم سوورەتە ئەیەوێ چارەسەری بکات و بی چەسپێنێ بریتی یە لە بڕوا بەڕۆژی دوایی و پاداش و تۆڵە، بەتایبەتی سزای بێ بڕواکان. سورەتی(الحاقە)ش لەو مەبەستەداو، بەڵام هەر کام لەم دوو سوورەتە هەوڵ ئەدات لەڕێگایەکی جیاوازو بەشێوەیەکی تایبەتی جیاواز لەوی تر، وەکو دەرئەکەوێ بۆ هەر کەس کە وورد بێتەوەو بیربکاتەوە لەئایەتەکانی هەردوو سوورەتەکە شێوەیە لەشێوەکانی لاری و نالەباری بێ بڕواکانی مەککە ئەوە بوو کە لاقرتی یان ئەکرد بە پێغەمبەر(ﷺ)و گاڵتەیان لێ ئەهات بەو هەڕەشە سامناکانەی کە قورئان ئاڕاستەی ئەکردن.

ئەیان ووت:(محمد) ئەمان ترسێنێ بەسزا، ئایا ئەو سزایە چی یە؟و بۆ کێ ئەبێ؟ وەك(نضری کوڕی حارث) یان(ئەبو جەهل) بەلاقرتی و بێ بڕوایی یەوە ئەیوت: ئەی خوایە ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لای تۆوە هاتووە دەی لە ئاسمانەوە بەرد ببارێنە بە سەرمانا یا سزایەکی سەختمان بۆبێنە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ﴿١﴾ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ﴿٢﴾ مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ﴿٤﴾ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ﴿٥﴾

---

**جا بەو بۆنەوە سەرەتای ئەم سورەتە هاتە خوارەوە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ﴾ داواکەرێ داوای سزایەکی کرد کەبەدی دێت، داوابکات یا نەیکات ﴿لِّلۡكَٰفِرِينَ﴾ بۆ بێبڕواکان. ﴿لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ﴾ کە هیچ بەرگری کەرێ نی‌یە بۆی ﴿مِّنَ ٱللَّهِ﴾ لەلایەن خواوە کە ﴿ذِي ٱلۡمَعَارِجِ﴾ خاوەنی هەموو پادەی بڵندو پلە بەرزەکانە. یا خاوەنی ئاسمانەکانە کە مەلائیکە تیایاندا بەرز ئەبنەوە بەوێنەی پلەکانەو قادرمە لە ئاسمانێکەوە بۆ ئاسمانێ تر، بەرز ئەبنەوە بەو فەرمانانەی کە پێیان سپێرراوە، لەپاش ئەم سەرەتایە کە قسەو بڕیاری براوەی تێدا بوو لەبارەی سزای خواو بەدی هاتنی بۆ ئەوانەی شایستەن بۆی، هەروەها لەبارەی سەرچاوەی ئەو سزایەو بەرزو بڵندی ئەو سەرچاوەیە، بەجۆرێ کە ئەبێ بەدی بێت و بەرهەڵست و بەرگری نابێ.**

**لەپاش ئەو سەرەتایە ئینجا دەست ئەکات بەباسی ئەو ڕۆژەی کە ئەو سزای تیا ڕوو ئەدا، کە ئەوان پەلە ئەنێنەوە بە هاتنیو کەچی نزیکە لێیانەوە، هەرچەند ئەمان بە دووری دائەنێن، ئەفەرموێ: ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ﴾ مەلائیکەتەکان و ڕۆح بەرز ئەبنەوە بۆلای خوا ﴿فِي يَوۡمٖ﴾ لەڕۆژێکا ﴿كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ کە ئەندازەی ئەو ڕۆژە پەنجا هەزار ساڵە لە ساڵەکانی ئەم جیهانە.**

**لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا چەند ڕایە هەیە -وەکو لە کتێبەکانی تەفسیرا باس کراون- لەناو ئەو ڕایانەدا ئەمەم هەڵبژارد بۆ باس کردن کە مەبەست بەو ڕۆژە ڕۆژی دوایی یە. مەبەست بەڕۆح جوبرەئیلە، وەکو لە چەند شوێنی تردا بەم ناوە ناو براوە. بەتایبەتی ناوبراوەو جیاکراوەتەوە لە مەلائیکە لەبەر گەورەیی یا لەبەر ئەوە کارو کردەوەی تایبەتی هەیە لەو بەرز بوونەوەدا.**

**ئینجا لەو ڕۆژەدا بەرز ئەبنەوە لەبارەی ئەو ڕۆژەو کارو فەرمانە گرنگەکانی ئەو ڕۆژەوە. ئێمە نازانین ئەو کارو فەرمانانە چین، وە نازانین چۆن بەرز ئەبنەوەو بۆکوێ بەرز ئەبنەوە وە**

داوای زانینی ئەوانەمان لێ نەکراوە. ئەوانە هەموو شتێکی غەیبین، هیچ رایەکمان نی یە لەسەریان، کەواتە بە کورتی بەگوێرەی دیمەن و ڕواڵەتەکە ئەڕۆین و ئیتر بێ دەنگ ئەبین لەدرێژەدان، ئەوەندە بەسە بۆمان کە لەم فەرموودەوە هەست ئەکەین بە گەورەیی و زۆر گرنگی ئەو ڕۆژە کە مەلائیکەو ڕۆح ئەکەونە هاتوچۆو بزوتنەوەیەکە پەیوەندی هەیە بە کارو فەرمانی ئەو ڕۆژە گەورەیە.

پاشان ئەو پەنجا هەزار ساڵە هەڵئەگرێ مەبەست دەست نیشان بێ بۆ زۆر درێژیی ئەو ڕۆژە وەك باو بووە لەناو عەرەبا ئەو جۆرە ژمارانە بەکار ئەهێنن و مەبەست بارە ڕاستەقینەکەی نی یەو بەڵکو مەبەست ئەو دەست نیشان کردنەیە، هەڵئەگرێ هەر بارە ڕاستەقینەکە مەبەست بێت و لەڕواڵەتەکەی لانەدرێ، وە ئەو پەنجا هەزار ساڵی ئێستەو ئەم جیهانە تەنها ڕۆژێك بێت لەوێ! و تێگەیشتن لەچۆنێتی ئەوە زۆر ئاسانە ئێستە بۆمان. چونکە ئەوەتا زەمینی ئێمە بیست و چوار سەعاتە وە دەرکەوتووە کە چەند ئەستێرەی تر هەیە چەرخەو خولانەوەیەکی چەند هەزار قاتی ئەو ڕۆژی ئێمە داگیر دەکات، مەبەست ئەوە نی یە ئایەتکە بپرین بەسەر ئەوەدا بەڵکو ئەوە وێنەیەکە بۆ نزیك خستنەوەی ئەو جیاوازی یە زۆرەی ئەو ڕۆژە لەگەڵ ڕۆژی ئەم جیهانە لە دەروونمانا.

ئینجا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) بەئارام و خۆگرتن بەرانبەر پەلە نانەوەی بێبڕواکان بەسزای خوا بەشێوەی لاقرت پێکردن و بڕوا نەبوون پێی. ئەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا﴾ کەواتە پەلە مەکەو خۆت بگرە بە خۆگرتنێکی جوان، بەم ڕەنگە بەئارامی دڵەوەو بەبێ ئەمەی نارەزایی تێکەڵ بێت و گومان و دوو دڵیت بێ لەڕاستی بەڵێنەکەدا، بەڵکو بەئارام و دڵنیابیت بەپاشەڕۆژ، و ڕزای بیت بەبڕیاری خوا، هەست بکەیت بەلێزانی و کاردروستی خواو دڵت پەیوەست بێت بەخواوە.

فەرماندان بە ئارام و خۆگری بۆ هەموو پێغەمبەرێ بووە، لەگەڵ هەموو بانگەوازەکانی خواد بووە، هەروەها ئەو فەرمان بۆ هەموو شوێن کەوتووەکانی پێغەمبەر(ﷺ). بێگومان ئارام و خۆگری زۆر پێویستەو ناچاری هەیە پێی لەبەر قورس و گرانی ئەرکی بانگ کردن و ڕێنمایی و سەختی ڕێگاکە.

ئەو جۆرە خۆگرتنە ڕێك و ڕاستە شایانە لەگەڵ خاوەنی ئەو بانگ و بانگەوازەدا چونکە بانگ کردنەکەی بۆلای خوایە، بەهیچ ڕەنگ لەو بانگ کردنەی ئامانج و مەبەستێکی نی یە بێجگە لەخواو ڕەزامەندی خوا. کەواتە هەرچی بەسەربێت و دووچاری هەر سزاو مەینەتێ ببێ هەمووی بۆ خوایەو لەڕێگای خوادایەو هەمووی بەپێی لێ زانی و کاردروستی خواهیشی خوایە.

کەواتە لەگەڵ ئەو هەستەدا ئەو خۆگرتنە ڕاستە ئەبێ هەڵقوڵی لە کانگای دڵەوە. خوا کەخاوەنی ئەو ئایینەیە کە بێبڕواکان بەرهەڵستی ئەوەست، خواکە خاوەنی ئەو بەڵێن و هەڕەشەیە کە بێبڕواکان پەلەی پێ ئەنێنەوەو بەدرۆی ئەزانن، هەر ئەو بڕیاردەری هەموو بەسەرهات و ڕووداوێکە، و ئەوکات شوێنیانی دیاری کردووە، و تەگبیری هەموو شتی کردووە بەپێی زانین و کار دروستی خۆی. بەڵام مەردم بێئاگایە لەوەی خوا ئەیزانێ بەهۆی ئەوە پەلەئەکات و پەلە ئەنێتەوە.

کاتێ ماوەکە درێژەی کێشا و بەڵێن و هەڕشەکەی بەدی نەهات ئەکەوێتە گومان و دوودڵی، جاربەجارێ بێئارامی ڕووئەکاتە بانگ کەران خۆیان، و ئارەزوو ئاواتی زوو بەدی هاتن دەروونیان داگیر ئەکات، ئەو حەلە ئەم جۆرە تەمێ و دڵ دامەزراندن و ئارام پێدانە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دێت. وەك لێرەدا هات و فەرمووی: ﴿فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا﴾ ئەم فەرمان و فەرموودەیە لێرەدا لەگەڵ پێغەمبەرە(ﷺ) بۆ ئارام پێدان و دامەزراندنی دڵی بە فەڕی بەرانبەر ئەو هەموو دەم درێژی و سەرکێشی و لاری و ناڵەباری ئەو بێ بڕوایانە.

بۆ ڕوون کردنەوەی مەسەلەو مەبەستێ تر کەبریتی یە لەمەی حیساب و ئەندازەی هەرشتێ لای خوا جیاوازە لە بەراوورد کردنی کەم و کوڕی بەندەی خوا وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا﴾ بێگومان بێبڕواکان ئەو سزایەی کە هەڕشەیان لێ کراوە پێی. یا ئەو ڕۆژەی کەئەو سزای تیا ڕووئەدا بەدوورو نەگونجاوی ئەزانن و دائەنێن. ﴿وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا﴾ وە ئێمە بەنزیك و گەنجاوی ئەزانین و دائەنێین. پاشان شێوەیەکی ئەو ڕژە نەخشە ئەکێشێ کەکار ئەکات لەم بوونەوەرەو لە دەروونی مەردوم دا. ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ﴾ ئەو سزایە بەدی دێت یا ئەو ڕۆژە ڕوو ئەدات لەڕۆژێکا کە ئاسمان وەك مسی تواوەی لێ دێت،

﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ﴾ وە شاخ و چیاكان وەك خووری شی كراوەی ڕەنگا و ڕەنگی لێ دێت! قورئان لەچەند شوێنا ڕوونی ئەكاتەوە كەچ ڕووداوێكی گەورە لەم بوونەوەرەدا بەدی دێت لەم ڕۆژەدا، كەبارو حاڵی ئەم زەوی و ئاسمان ئەگۆڕێ، شێوە و نیشانە و پەیوەستی مانگ و خۆر ئەستێرەكان ناهێڵێ.

جا هێندێ لەو ڕووداوانە ئەمەیە كە لێرەدا ئەفەرموێ: ئاسمان ئەتوێتەوە بە وێنەی مس و ئاسن و ئەو جۆرە شتانە كە تواوە بن، ئەم جۆرە ئایەتانە شایستەی ئەوەن كە زانایانی ئاسمانی و سرەشتی باش لێیان وورد ببنەوە و بیریان لێ بكەنەوە. چونكە ڕای بەهێزی ئەوان لەسەر ئەوەیە كە ئەم ئەستێرانە پێك هاتوون لەو شتەكانی یانە كە توابنەوە تا ڕادەیە بوون بە گازو هەڵم كە ئەو ڕادەی هەڵمی و گازی یە بە چەند قۆناغێ پەیدا ئەبێ لەپاش توانەوە. (جا ڕەنگەو هەڵئەگرێ كە ئەو ئەستێرانە لەو ڕۆژدا بكوچێنەوە و سارد ببنەوە هەتا ئەبن بەو شتە تواوانەوجاری بن!).

ئەو حەلە ئەم حاڵەتی ئێستەیان ئەگۆڕێ و مەبەست ئەوە نی یە ئەم ئایەتانە بەم جۆرە تەفسیر بكەینەوە بیانبڕین بەسەر ئەم بارەدا كەباس كرا. بەڵكو ئەڵێین ئەم بارە هەڵئەگرێ و سوود بەخشە بۆ ئەو زانایانەو شایانە بۆیان بیر لێ كردنەوەیان، ئێمەی بڕوادار ئەوەستین لەبەردەم ئەم ئایەتانەداو بیر ئەكەینەوە لەو بەسەرهات و شێوە سامناكە، شێوە و بەسەرهاتێ كە ئاسمان تیایا تواوە بێت وەكو مس و ئاسن و شتەكانی تر، وە شاخەكان تیایا وەك خوریەكی شی كراوەبێت.

بیر ئەكەینەوە لەو سام و بیمە داچڵەكێنەرەی كە ڕوونەكاتە دڵ و دەروون، قورئان نیشانی ئەدات و ئەیگەیەنێ كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا﴾ وە هیچ خزمێكی دڵسۆزی دڵگەرم پرسیار ناكات و ناپرسێتەوە لەهیچ خزمێكی دڵسۆزی دڵگەرم، بەڵكو هەموو كەس دڵی بەستراوە بەخۆیەوە و ناپەرژێتە سەر كەسی تر، چونكە سام و بیمەكە ئەوەندە گەورەو بەهێزەو لەڕادەیەكایە هەموو پەیوەندی و پەیوەستی یە ئەپچڕێ و نایهێڵێ، و هیچ كەس هۆشی بەلای هیچ كەسی ترەوە نامێنێ و هەركەس غەمی خۆیەتی. پەنا ئەگرین بەخوا لەو ڕۆژە، ئەو لێ نەپرسینەوەش لەبەر ئەوە نی یە كە بەیەكتر نازانن و یەكتر نابینن،

﴿يُبَصَّرُونَهُمْ ۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى
تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُوا۟ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ
﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴿١٨﴾

---

بەڵكو ﴿يُبَصَّرُونَهُمْ﴾ ئەخرێنە بەرچاوی یەکترو یەکتر ئەبینن. بەڵام هەموو کەس دڵی بەستراوەو هۆشی بەلای کەسی ترەوە نی یەو کەسی بەخەیاڵ نایە کەلێی بپرسێتەوەو پرسیاری هیچی لێ بکات. ڕۆژە کە ئەوەندە سەختو سامناکە تاوانبار تیایا ئەگاتە ئەم ڕادەیە کە ئەفەرموێ: ﴿يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ﴾ تاوانبار پێی خۆشەو ئاواتەخوازە کە ﴿لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ﴾کاشکێ فیداکاری بکات لەباتی سزای ئەوڕۆژەی کەتێی کەوتووە ﴿بِبَنِيهِ﴾ بەکوڕەکانی ﴿وَصَٰحِبَتِهِۦ﴾ وەبەژنوهاوسەرەکەی، ﴿وَأَخِيهِ﴾ وە بەبراکەی، ﴿وَفَصِيلَتِهِ﴾ وە بەخزمو عەشیرەتە نزیکەکەی ﴿ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ﴾ کە ئەیگرێتە خۆیو بەرگری لێ ئەکات لەبەسەرهاتی خراپا، ﴿وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ وە بەهەرکەس والەزەویداهەمووبەیەکجار، ئاواتە خوازە فیداکاری بکات بەوانەوە و دەست هەڵگری لەوانە هەموو ﴿ثُمَّ يُنجِيهِ﴾ ئینجا خوا ئەو ڕزگاربکات، پەنا بەخوا لەسامو ترسێ بگاهە ئەو ڕادەیە کە کابرا ئاواتە خوازبێت بۆ دەست هەڵگرتن لەوانەی کەلە جیهانا فیداکاری ئەکات بەگیانی خۆی لەڕێگایانا!!

لەو کاتەدا کە تاوانبارەکە لەو حاڵەدایەو ئەوە ئاواتیەتی، ئەو سیاچارە تیری ژاراوی ئەکرێ بە بەنۆکەی دڵیاو شتێ ئەبیستێ کە بەتەواوی نائومێدی ئەکات لەهەموو هیواو ئاواتێ، بەڵکو لەهەموو خەتەرەو خەیاڵی خۆشی یە، پیا هەڵخشانو تێ خوڕین ئەبیستێ لەئومێدو ئاواتەکەیا، هەر چۆنێ لەم جیهانەیش دا قورئان پێی ڕائەگەیەنێو ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ نەخێر، ئەو ئاواتەی بەدی نایەو با ئاواتی وا نەخوازێو بەهیچ ڕەنگ ڕزگاربوون نابێ، ﴿إِنَّهَا لَظَىٰ﴾[1] بەڕاستی ئاگرێ کە سزای پێ ئەدرێ ئاگری دۆزەخەکە بڵێسەدارە. ﴿نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ﴾ لەکاتێکا هەمیشە پێستەکانی سەرو دەمو چاو ڕائەکێشێو هەڵی ئەپچڕێو ئەیخوات

---

[1] لەم ئایەتەو ئایەتی پاشی دا چەند تەرکیبێ کراوە، بەپێی ئەو ترکیبانە شێوەی تەفسیرەکە ئەگۆڕێ بەڵام مەبەستەگە هەر یەك شت ئەگرێتەوە.

و وەك خۆی لیٚ دیٚتەوە! کەپیٚست -بەتایبەتی لەسرو چاودا- هەستیاری بەهیٚزترە کەواتە سزادانی لەهەموو سزایە سەخت ترە. ﴿تَدْعُواْ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بانگ ئەکاتە ئەو کەسەی کەلەم جیهانەدا پشتی ئەکردە ئایینی خواو ڕووی وەرئەگیٚرا لە گویٚرایەڵی خواو پیٚغەمبەر(ﷺ) ﴿وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ﴾ وە ماڵی کۆئەکردەوەو ئینجا ئەکردو کۆی ئەکردەوە لە کیسەو گەنجینەو جیٚگای تایبەتی دا، و سەرفی نەئەکرد لەڕیٚگای خوادا.

لەم جیهانەدا کۆکردنەوەی ماڵ خەریکی ئەکردو هۆشی بەلای بانگ کردنی خواو پیٚغەمبەرەوە(ﷺ) نەبوو، بەڵام لەویٚ ناتوانیٚ بیٚهۆش بیٚت لە بانگ کردنەکەی دۆزەخ، لەم جیهانەدا ئەتوانیٚ مل پیٚچی بکات بەڵام لەویٚ ناتوانیٚ مل پیٚچی بکات لە دۆزەخ، بەڵکو بە ئەسپایی ئەڕوا بۆلای. ئەو بانگ کردنە ئیتر ئەوە بە قسەو بە زوبان بیٚت وەك ئەگیٚڕنەوە لە(ئیبن و عەباس)و چەند کەسی ترەوە -خوا لیٚیان ڕازی بیٚت- کە ئەفەرمون: خوا دۆزەخ گۆیا دەکات هەرچۆنیٚ پیٚست و دەست و قاچی دۆزەخی یەکان گۆیا ئەکات تا شایەتی ئەدەن لەسەر گوناهو تاوانیان.

دۆزەخ بەناوی خۆیان و باوکیانەوە بانگیان دەکات و ئەڵیٚ وەرن بۆلای خۆم ئەی بیٚبڕواکان، ئەی ناپاکەکان. یا مەبەست بە بانگ کردنەکە بە زوبانی حاڵ بیٚت، یا بانگ کردنی مەلائیکەتە کاربەدەستەکانی دۆزەخ بیٚت، بە هەرکام مەبەست بیٚت کارو بەسەرهاتەکە ئیٚجگار گەورەو سامناکە. لەم سورەتەو لە دوو سورەتی پیٚش ئەما قورئان بیٚزاریو خەشمی دەربڕی لەسەر ڕەزیلی و چنگ گوشراویو چاوبرسیٚتی و کۆکردنەوەی ماڵو دەست بەسەرا گرتنی بەبیٚ یارمەتی دان و دەست گیرۆیی هەژارو بیٚنەوا، دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو سیفەتە ناڕەوایانەو ئەیانهیٚنیٚ بەدوای بیٚ بڕوایی دا.

جا لەوەوە دەرئەکەویٚ کە گەل و کۆمەڵی مەککە لەگەڵ بیٚبڕوایی و بت پەرستی یەکەیاندا ئەو سیفەتە پیسانەش باو بووە لەناویاندا، بیٚگومان ئەوەش بەرهەڵستیٚکی بەتین و بەهیٚزبوو لەڕیٚگای ئەم ئایینە پیرۆزەدا کە مەبەستیٚکی گرنگ لە مەبەستەکانی پەروەردەکردن و فیٚرکردن و ڕام کردنی مەردومە لەسەر یەکیٚتی و برایەتی و خۆشەویستی و یارمەتی و دەست گیرۆیی و چاوو دڵ و دەست گوشادی لەناو کۆمەڵی ئادەمی داو ڕزگارکردنیان لەو هەموو نەخۆشی یە دەروونی و کۆمەلایەتی یە کە باو بووە لەو سەردەمی نەفامی و هەموو چەرخی تری نەفامی دا، لەپاش ئەو سەردەمە تا ئیٚستا و لەمەو پاش و لەداهاتوودا هەتا هەتایە.

﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾

ئایینی ئیسلام بێزاره له تەمەڵی و تەوەزەلی، و هانی مەردوم ئەدا لەسەر هەوڵ و تێ کۆشان -لەڕێگای ڕەواو شەرعی یەوە- بۆ زۆرکردنی ماڵ و سامان و دەست خستنی ئەو هەموو خێرو بێرەی کە خوا دروستی کردووە بۆ بەندەکانی، و ماڵ و سامان بەخێر ناوئەبا. بەڵام لەهەمان کاتدا دژی چروکی و چاوبرسێتی و زیادە هەڵپەو تێرنەخواردنە، هەرچۆنێ دژی پەیداکردن و کۆردنەوەیە لەهەر ڕێگایەکەوە زیانی گەلی تێدابێ، جا لەبەرئەوە قەدەغەی کرد زۆر بەتوندی سوودو خواردنی ماڵی خەڵکی بەناحەق و ناڕەوا، هەروەها هەر مامەڵەیە کە سەری لەوەوە دەرچێ وەکو بەدرێژی لەم شەریعەتەدا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا شێوەو باوەڕە ڕاستەقینەکەی دەروونی ئادەمی یشان ئەدا بەرانبەر خێرو خۆشی و شەڕو ناخۆشی، لەکاتێکدا ئادەمی بڕواداربێت و لەکاتێکدا بێبڕوا بێ، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا﴾ بێگومان هەموو ئادەمی دروست کراوە بەجۆرێ زۆر خۆنەگرە لەکاتی تەنگی و ناخۆشیدا وزۆرچروك وچاو برسی یە لەکاتی دەسەڵات و خۆشیدا. وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا﴾ کاتێ تەنگی و ناخۆشی بەسەربێت زۆر غەمبارو بێ ئارام و خۆنەگرە. ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا﴾ وەکاتێ خێروخۆشی وسامانی بەرکەوێ زۆر وبرسی وچاکەو خێرگرە.

ئەم شێوەی کە قورئان نەخشەی کێشا بۆ ئادەمی بێبڕوا زۆر شێوەیەکی نایابە لەڕاستی و لە ووردیدا، بەڕاستی نیشانە تێرو تەواوەکەی ڕوون ئەکاتەوە، بەڕاستی ئەو شێوە ناشیرینەی لەکۆڵ نابێتەوە بەو بڕوا ڕاستەقینە نەبێ کە پەیوەستی ئەکات بەخواوە کە تەنها ئەوەش سەرچاوەی ئارامە بۆ دڵ و دەروون لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا.

بێگومان هەرکەس ئەو بڕواو پەیوەستی یەی نەبێ لەکاتی ناخۆشی و تەنگانەدا بێ ئارامە، چونکە هیوای ڕزگاربوونی نی یەو لای وایە هەر بەو جۆرە ئەبێ و دەرووی لێ

ناكرێتەوە،و چاوەڕوان نی یە کەخوا ئەو بارەی لەسەر لابا، جا لەبەرئەوە ژیانێکی سەخت بەسەر ئەبا. کاتێ خۆشیو دەست کەوتێکی ببێ چاو برسی ئەبێو خێری لێ نابێتەوە. چونکە لەخوایەوە ناناسێ بەڵکو لە هونەرو تێکۆشانو کردەوەی خۆی ئەیزانێ. کەواتە چروکی بەکارئەهێنێو دڵی نایە هیچ کەسی تیا بەشدار بکات، و ئەبێ بەدیلو یەندەی ماڵو دەست کەوتەکەی. کەواتە ئەو کەسە نە بەکاری خۆشی دێتو نەبەکاری ماخۆشی، و نەبەرگەی سەرما ئەگرێو نەبەرگەی گەرما. کەواتە بڕوای ڕاستەقینە بەخوا شتێکی زۆر گەورەو گرنگە لەژیانا، بوونی ئەو بڕوایە هۆی گەورەترین دەست کەوتە لەجیهانا پێش پاداشتی ڕۆژی دوایی.

هەموو ئادەمی بەسروشت بەشدارە لەو دوو سیفەتە خراپەدا بێجگە لەو بڕوادارانەی کە خاوەنی ئەم هەشت سیفەتانەن کە یەك بەیەك دێنو ڕوونیان ئەکەینەوە:

١- ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ﴾ بێجگە لەو نوێژکەرانەی کەلەسەر نوێژ کردنیان بەردەوامنو هەرگیز تەرکی ناکەن. نوێژ زیاد لەوە پایەیەکە لەپایەکانی ئیسلام و نیشانەی بڕوایە، هۆی پەیوەندیو پەیوەستی بەخواوە، شێوەی بەندەیی تەواوە کە ڕادەو پلەی خوایەتیو بەندەیی تیا جوێ ئەبێتەوە لەشێوەیەکی تایبەتی دیاری دا. بەردەوامی لەسەریو واز لێ نەهێنانی نیشانەی جێگیربوونو دامەزراوی یە لەسەر ئەو بارە ڕاستەو ئەو پەیوەستی یە بە هەمیشەیی. جا لەبەرئەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەر ئەندازە عیبادەتی بکردایە بەردەوام ئەبوو لەسەریو وازی لێ نەئەهێناو ئەیفەرموو: خۆشەویسترین کردەوە چاکەکان بەلای خواوە ئەوەیە کە هەمیشەیی بێت با کەمیش بێت. وەك لە حەدیسی عائشەدا ئەفەرموێ: کەلە هەر شەش کتێبە صەحیحەکاندا هەیە، چونکە ئەوە دامەزراویە نەك بکرێ بەگڕو فڕو گاڵتەی منالان، دەمێ بە توندی بگیرێو دەمێ وازی لێ بهێنرێ.

٢- ﴿وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ﴾ وه ئەوانەی کەلە ماڵو دارایی یەکانیانا ماف و بەشێکی زانراو هەیە. ﴿لِّلسَّآئِلِ﴾ بۆ بێ نەوایە کە سواڵو داوا ئەکات، ﴿وَٱلۡمَحۡرُومِ﴾ وه بۆ بێ نەوایە کە سواڵو داوا ناکاتو بەبێ پێویست سەیر ئەکرێو بەهۆی ئەوه بێ بەش ئەکرێ، ئیتر ئەو ماف و بەشە زەکات بێت کە لەسەردەمو چەرخی مەککەیشا هەر بووەو ئەندازەکەی ئەو کاتە لەلایەن شەرعەوە دیاری نەکراو لەپاشا لەمەدینە دیاری کرا. یا خێرو صەدەقە بێت. یا ئەندازەیە بێت کە بڕواداران پێویستی بکەن لەسەر خۆیان لەبەر خواو لەبەر بەزەیی هاتنەوە بەبێ نەواو هەژاران دا لەهەموو حەفتەیەك یا هەموو مانگێ وەکو ئیمام(ئەبو عبدالله) ئەفەرموێ: بەهەر جۆرێبێ بە دەرکردنی ئەو ماف و بەشە مەردومی بڕوادار ڕزگار ئەبێ لەچروکیو چاو برسێتی، زاڵ ئەبێ بەسەر ئەو سیفەتە نارەوایانەدا و هەست ئەکات بەوەی پێویستە لەسەر شانی دەسەڵاتدار بەرانبەربێ دەسلاتوهەژار، لەناوئەم میللەتەداکەئەبێ قوڵگیرو یارمەتی دەری یەکتربن.

هەست کردن بەوەی کە هەژارو بێ نەوا مافی هەیە لەماڵی دەست دارو دەوڵەمەندا لەلایەکەوە هەست کردنە بەلوتف و میهرەبانی خوا، لەلایەترەوە هەست کردنە بە پەیوەستی ئادەمێتی، بێجگە لەوە لەو هەستەدا ئازادی یەکی دەروونی هەیە لە کۆتو زنجیری چروکیو ڕژدی، لە هەمان کاتدا هاندەرو پاڵ پێوەنەرە بۆ قوڵگیریو کۆمەکیو یارمەتی گەلو ئەندامی گەل. کەواتە ئەم سیفەتەی دووەم زۆر پڕ سوودو بەنرخە لە جیهانی دەروونو لە لە جیهانی ژیانو ڕووداوی ژیاندا. باس کردنی لێرەدا زیاد لەوە نیشانەو سیفەتێکە لە نیشانەو سیفەتەکانی بڕواداران، ئەڵقەیەکە لە زنجیرەی چارەسەرکردنی چرۆکیو ڕژدی کەلەسوورەتەکەدا باسی کرد.

٣- ﴿وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ وە کەسانێ کەبڕوای ڕێکو ڕاستیان هەیەو ئەیانبێ بەڕۆژی تۆڵەو پاداش کە ڕۆژی دوایی یە، بڕوایان هەیە پێی بەجۆرێ بەکردەوە ئەو بڕوایە دەرئەخەن، بەم ڕەنگە خۆیان ماندوو ئەکەن لەعیبادەتو خوا پەرستی دا. ئەم سیفەتە لەڕێوە پەیوەندی هەیە بەمەبەستی سەرەکی سوورەتەکەوە وە لەهەمان کاتدا نیشانەیەکی سەرەکی یە لەنیشانەکانی مرۆڤی بڕوادار.

بەرو بەرهەمێکی ئاشکرای هەیە لەبەرنامەی ژیانا لەبارەی هەستو ڕەوشتەوە. تەرازووی کەسێ کەبڕوای بەڕۆژی دوایی ببێ جیاوازە لە تەرازووی کەسێ کەبێ بڕوابێت بەو ڕۆژە یا بەگومانو دوو دڵ بێت تیایا.

بڕوادار بەو ڕۆژە سەرنجی تەرازوی ئاسمان ئەدات لە کێشانەو بەراووردکردنی ژیانو کردەوەو ڕووداو لە ژیانا. نەك سەرنجی تەرازووی زەوی لەدەروونی خۆیا هەوڵو تەقەلای بۆ ڕۆژی دوایی یە نەك بۆ ئەم جیهانەو بەس، ئەچێ بە پیری هەموو ڕوداوو بەسەرهاتێ چاك یا خراپ، و لەدەروونی خۆیا بەسەرەتاو پێشڕەو سەرنجیان ئەداتو بەرهەمو سەرەنجامەکانیان لەڕۆژی دوایی یە، کەواتە لەکاتی بەراووردو کێشانەی هەموو کردەوەو ڕووداوەکانی ئەو جیهانەدا بەرهەمو سەرەنجامەکانیش لەگەڵیان جووت ئەکاتو پێکەوە نرخیان بۆ دائەنێو ئەیانکێشێ. بەپێچەوانە ئەمانەیە بێ بڕوا بەو ڕۆژە.

بێبڕوا بەو ڕۆژە هەمیشە سەر ئەکاتە ئەم ژیانو جیهانەو چاوی تەنها ئەبڕێتە ئەم دوو شتە کەمو کورتو تەنگە، کەواتە هەرچۆنێ هەڵەیەو ڕێگای ڕاستی ون کردووە، هەروەها بەسزای دەروونیو بەبێ ئارامی ئەژی، چونکە هەرچەندە بەشو دەست کەوتی گەورەو فراوان بێت هەر کەمو ناتەواوەو بە ئارەزوو و خواستی نی یە، ماتوڵ چاوەڕوانی دەست کەوتی ئەو جیهانی نەبڕاوەی نی یەو بەتەما نی یە هەموو کەمو کوڕیو ناتەواوی ئێرە لەوێ تەواو بکات. جا لەبەر ئەوە باوەڕ بەو ڕۆژە بەشو پارچەیەکە لەو ئاقیدەو ئیمانەی کە بناغەو بنەڕەتە بۆ بەرنامەی ژیان لە ئیسلامدا.

٤- ﴿وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾ وە كەسانێ كە ئەترسن‌و دڵە لەرزەیانە لە سزای پەروەردگاریان، مەترسی ئەکەن لەخۆیان لەگەڵ ئەوەی کردەوەی چاکیان هەیە، چونکە ئەزانن هەرچی بکەن هەر کەمەو هیچ چاو نادا لەگەڵ گەورەیی خواو مافی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە، بێجگە لەوەش بەچی بزانن کە کردەوەکانیان پاك‌و خاوێنە لە هەموو لەکەیەو هیچ ڕووپامایی و نیازی تری تێکەڵ نیە. ئەم سیفەتە ڕادەو پلەیە ترە جیاوازەو بەرز ترە لە بڕوا بە ڕۆژی دوایی.

ئەوەتا چەند کەس هەیە زۆرو زەبەنە بڕوایان هەیە بەو ڕۆژەو کەچی ئەو وریایی‌و بیم‌و ترس‌و خۆپارێزی یانەیان نی یە، ئەم سیفەتە بریتی یە لە وریایی یەکی تێرو تەواو و هەست کردن بە کەم‌و کوڕی لە کردەوەی چاکدا هەرچەند زۆریش بێت، وە مەترسی لە لادانی دڵ‌و شایستەیی بۆ سزای خوا لە هەر کاتێکا ببێ، لەگەڵ چاوەڕوانی و ئومێد بە پاراستنی خوا. ئەم سیفەتە یەکێکە لە سیفەتە گەورەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە بوو لەگەڵ ڕادەو پلەی بەرزی لای خواو خۆشەویستی بەلای خواوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەیزانی کە خوا هەڵی بژاردووەو پاراستوویەتی. لەگەڵ ئەوانەدا هەمیشە وریاو پارێزەری خۆی بوو، هەمیشە ئەترسا لە سزای خوا، ئەیزانی کە کردەوەکانی پەنای نادەن‌و نایخەنە بەهەشت مەگەر بە میهرەبانی‌و بەزەیی خوا، فەرمووی بە هاوەڵەکانی وەکو(موسلیم)و(نەسائی) ڕیوایەتی ئەکەن: هەرگیز هیچ کەس کردەوەی خۆی نایخاتە بەهەشت. ئەوانیش ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆیش کردەوەت ناتخاتە بەهەشت؟ لە وەڵامدا فەرمووی: منیش کردەوەم نامخاتە بەهەشت مەگەر خوا بە ڕەحمەت‌و میرەبانیی خۆی دامشارێ.

ئینجا هۆی ئەو بیم‌و ترسە ڕوون ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ﴾ بێگومان سزای پەروەردگاریان باك لێ نەکراو نی یە، چونکە هەر هیچ نەبێ لە هەموو کاتێکا لەوانەیە هۆی ئەو سزایە ڕوو بدا لە بەندەوە ئەو کاتە شایستەی سزا ئەبێت، خوای گەورە وریایی‌و هەمیشەیی ئەو هەستەی ئەوێ لە بەندەکانی، ئینجا ئەگەر هەڵەو گوناهێ ڕوویدا، میهرەبانی یەکەی فراوانە، لێبوردنی ئامادەیە، و قاپی گەڕانەوەیشی لەسەر پشتە هەتا تۆزێ پێش مردن! هەر دڵێ پەیوەست بێ بەخواوە لە ناوەندی ترس‌و ئومێددا ئەژی[1].

---

[1] لە ٤/٤/١٤٠٣ بەرانبەر ١/١٨/ ١٩٨٣ گەیشتمە ئێرە لە تەفسیری قورئانی پیرۆزدا.

**٥- ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ﴾ وە کەسانێ کە پارێزەری عەیبو عەورەتی خۆیانن ﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ﴾ مەگەرلەحەڵاڵوهاوسەرەکانیان. ﴿أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ﴾ یائەوکەنیزەكو ئافرەتانەی کە بوون بە موڵکیان ﴿فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ﴾ چونکە بێگومان ئەوان بۆ ئەم دوو جۆرە ئافرەتە رەخنەو تەنگ لێ هەڵگیراو نین.**

**مەبەست بەم سیفەتە پاكو خاوێنی گەلو ئەندامی گەلە، چونکە ئیسلام گەلو ئەندامێکی پاكو خاوێنی ئەوێ، لە هەمان کاتا ئیسلام رێكو روونەو بێ پێچو پەنایە، نایەوێ هێزو وزەو ئارەزووە سروشتی یەکان لەکار بخات، یا دەست بگرێ بە سەریاناو سەرکوتیان بکاتو پەنگیان پێ بخواتەوە، بەڵکو ئەیەوێ داخوازی ئەو شتە سروشتیانە بەجێ بێت، بەڵام بە شێوەیەکی پاكو شەرعی، وە ئەیەوێ گەلەکەی دامەزرێنێ لەسەر ماڵو خێزانی رەوای شەرعی کە خشتو پایەکانی بەتینو بەهێزبن. گەلو کۆمەڵێکی ئەوێ کە منداڵ تیایدا باوکی خۆی بناسێ، وە شەرمەزار نەبێ لە شێوەی پەیدابوون. ئەیەوێ پەیوەستیو پەیوەندی ژنو مێردی لەسەر بنەرەتێکی پاك بێت بەبێ تێکەڵو پێکەڵی، دامەزراو و بەتین بێت، بە نیازی ژیانێکی ئارامو پڕ لە دڵنیایی، لەبەر ئامانجو مەبەستێکی روونو رەوان، کە هەڵسانە بە پێویستی یەکی ئادەمیو کۆمەڵایەتی، نەك بۆ تەنها بەجێهێنانی ئارەزوویەکی ئاژەڵ ئاسایی!**

**جا لەبەر ئەوە قورئان ئەم سیفەتی پێنجەمەی کرد بە سیفەتێ لە سیفەتە گرنگەکانی بڕواداری راستەقینە، و هەموو شێوەو جۆرەکانی بەجێهێنانی ئارەزووی ژنو مێردی قەدەغە کردبێجگە لەم جۆرو شێوەیە کە گەیشتنە بە ئافرەت لەرێگەی سروشتیو شەرعی خۆیەوە، ئیتر بە مارەکردن یا بەموڵکایەتی کاتێ دەست کەوێ لەرێگایەکی راستو بەهۆیەکی شەرعی. تاقانە هۆی راستو شەرعیش کە ئیسلام رەوای بداتو انی پیا بنێ گرتنی ئەو ئافرەتەیە لە جەنگێکا کە بەرپا بووبێ تەنها لەرێگای خوادا، وەتەنها ئەو جەنگەیش ئیسلام رەوای ئەداتو دانی پیا ئەنێ.**

**لەبارەی دیلو دەستگیری ئەو جەنگەوە بە درێژی دواین لە چەند شوێنێ لەم تەفسیرەدا وەك سورەتی "المؤمنون"و سورەتی "محمد" بە شێوەیە کە بەسە بۆ هەموو ژیرێ کە**

بەدوای ڕاستی دا بگەڕێ. کەواتە لێرەدا بەو درێژی یە لەسەری ناڕۆین! بەس ئەڵێین: یاسای ئەسڵی و بڕیاری هەتاهەتایی سەبارەت بە دیل و دەستگیرکراوی جەنگ ئەوەیە کە ئایەتی سورەتی محمد باسی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً﴾ واتە ئینجا یابە پیاوەتی و بەخۆڕایی بەرەڵایان بکەن، یا لەبریتی شتێکدا، ئیتر ئەو شتە لەشێوەی دیل بەدیلدا بێت، ئەمەی کە ئێستە پێی دەڵێن – تبادل الاسری–، یا لە هەر شێوەیەکی ترا کە گەورە پیاوی موسڵمانان بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدا ببینێ، بەڵام لە هەندێ کاتدا هێندێ لە دیلەکان ئەمێننەوە و بەرەڵا ناکرێن نە بەخۆڕایی و نە لەبریتیدا، ئەمە ئەبێ بە بەندە ئەگەر دوژمن دیلی موسڵمانەکان بکات بە بەندە – لە هەر شێوەیە لە شێوەکانی بەندەیی– ئیتر با ئەو ناوەی لێ نەنرێ، وە ئەگەر دوژمن ئەوە نەکات ئیسلام بەهیچ ڕەنگ بڕیاری بەندەیی نادا. ئینجا کاتێ بەگوێرەی کردەوەی دوژمن ئەمیش بڕیاری بەندەیی دا بەسەر هەرکەس و هەر ئەنداز لە مانا ئەوکاتە ئەو دیلانە دابەش ئەکرێن بە سەر موسڵمانەکانا بەو جۆرو شێوەی کە باسکراوە لە شەریعەتا، ئەو دابەشکراوانە ئەبن بە بەندە و مڵکی موسڵمانان پێش ئازادبوونیان، لەدوای ئازادبوونیان ئیتر سەربەست ئەبن. وە ئەوەی شایانی باسە ئەمەیە: ئیسلام ئەوەندە هۆی ئازادبوونی داناوە بەندەیی لە ژێر سێبەری ئیسلامی ڕاستەقینەدا خۆی ئەتوێتەوە. بۆ وێنە قورئان بڕیاری داوە(١/٨) هەشت یەکی هەموو زەکات تەرخان بکرێ بۆ ئازادکردنی بەندە!! ئینجا لەکاتی بەندەییدا ئەگەر دابەشکراو ئافرەت بن ئیسلام ڕەوای داوە بەس بۆ خاوەنەکانیان بچنە لایان و مامەڵەی ژن و مێردیان لەگەڵ بکەن، ئەو ئارەزوە سروشتیانەیان بەو جۆرە پاك و خاوێنە جێبەجێ بکەن، نەك بەریان بەرەڵاکەن بەکرێ یان بەخۆڕایی بۆ هەرکەس ئارەزو ئەکات ئەو شێوە ناڕەوا و چەپەڵەیان بەسەر بێنن وەکو باوە لە کۆن و تازەدا بۆ ئافرەتە دیلەکانی جەنگ لەلایەن غەیری موسڵمانەوە. ئیسلام لەبەر ئەمەی هەموو شتی ڕاست و ڕەوایە، بەبێ پێچ و پەنا هەموو قسەی خۆی ئەکات و هەموو بڕیاری خۆی بەئاشکرا دەردەبڕێ، ئەوەتا ئەو دیلەی کەکرا بە بەندە، بە بەندەومولکی ناوئەبا، نەك وەك خەڵکی تربەناوئازادوسەربەستی ناوببات و کەچی لەڕووی ڕاستیدا پیسترین شێوەی بەندەیی بەسەر بێنێ. ڕەوایداکەئەوئافرەتەدیلانەی کەبڕیاری بەندەییان بدرێ خاوەنەکانیان بچنە لایان، چونکە ئەبێ ئەو ئارەزووە سروشتیەیان جێبەجێ بکرێ. نەك وەك خەڵکی تر کە بەدەم باسی ئەوە ناکات –وەك ئەو ئافرەتانە ئەو ئارەزووەیان نەبێ– بەڵام بەکردەوە وەك ئاودەستخانەی گشتیان لێ ئەکات بەبێ بەرگری لەهیچ کەس!!

قورئان ئەو دوو جۆرە ئافرەتەی ڕەوادا بۆ بڕواداران و ئیتر ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا هەرکەس بگەڕێ بەدوای غەیری ئەو ڕەوادراوانەدا ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ﴾ هەر ئەوانەن دەست درێژی کەران و لە سنور تێپەڕانن لەبارەی بەجێهێنانی ئارەزووی ژن و مێردیەوە، بەم باس و بڕیارە قاپی دائەخات لەهەموو شێوەیەکی پیس و چەپەڵ، لەسەر هەر بارو بەهەر جۆرێ. تەنها ئەو دوو شیوەی ڕەوادا کە بەڕوونی باسکرا. کەواتە ئارەزووی ژن و مێردی و بەجێهێنانی لەخۆیان شتێکی ناڕەواو قیزەون نییە بەڵکو پیسی و قیزەونی لەوەدایە کە لەو شێوە ڕاست و پاکە بترازێنرێ.

٦- ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ﴾ وە کەسانێ کەبۆ سپاردەکانیان و پەیمانیان چاودێرو پارێزەرن بەبێ کەم و کوڕی. ئەم سپاردەو پەیمانە لە سپاردەی هەرە گەورە دەست پێدەکات کە خرایە بەر ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان و ئەوانیش مەترسیان لێ کردو لەبەرئەوە نەیان گرتە گەردن و ئادەمی گرتیە گەردن، کە بریتیە لە سپاردەی عەقیدەو خوا پەرستی و دامەزران لەسەری بەخواییش و هەڵبژاردنی خۆی. هەروەها لەیەکەم پەیمانەوەدەست پێدەکات کە درا بەسەر سروشتی ئادەمیدا، کە پەروەردگاری تاک و تەنهایان خوایە کەناوی(الله)یە وە ئادەمی بەشێوەیە دروستکران کە شایانن لەسەر ئەو پەیمانە. وە لە چاودێری و پاراستنی ئەو سپاردەو پەیمانەوە هەڵئەقوڵێ هەموو سپاردەکانی ترو پەیمانەکانی تر لە مامەڵەکانی ئەم جیهان و زەویەدا، ئیسلام زۆر زۆر بەتوندی سپاردەو پەیمانی گرتووە، بۆئەوەی گەلەکەی دامەزرێنێ و ڕاگیری بکات لەسەر بنەڕەتێکی بەهێز، بنەڕەتی ڕەوشتی چاک و ئارام و باوەڕو دڵنیایی.

چاودێری و پاراستنی سپاردەو پەیمانی کردووە بەنیشانەی مەردومی بڕوادار، هەرچۆنێ ناپاکی لە سپاردەو بێ پەیمانی و پەیمان شکاندنی گێڕاوە بەنیشانەی ناپاک و بێبڕوا. ئەمە شتێکە لەهەر شوێنێکداو چەند جار هاتووە لە قورئان و فەرموودەدا بەجۆرێ ڕێگای نەهێشتووەتەوە بۆ گومان و دوو دڵی لە زۆر گرنگی سپاردەو پەیمان لە ئیسلامدا. ئەم باسە بەدرێژی تێپەڕی کرد لە سورەتی(المؤمنون)دا. بە پێویستم نەزانی دووبارە کردنەوەی.

٧- ﴿وَالَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ﴾ وەك كەسانى كە هەڵئەستن بە شايەتيەكانيان بەڕێك و ڕاستى، واتە هەر شايەتيەكيان لابێ بەبێ زيادو كەم ئەيدەن با بەدژى خۆيان و نزيكترين كەسيان بێت و بەزيانى خۆى و ئەو تەواو ببێ، وەكو لە قورئان و فەرموودە ﴿حديث﴾دا ڕوون كراوەتەوە.

ئەم شايەتى يە هەر چەندە يەكێكە لەسپاردەكان، بەڵام بە تايبەتى باسى كرد لەبەر زۆر گرنگى و ڕوون كردنەوەى گەورەيى يەكەى، چونكە چەند مافى زۆرى پێوەبەستراوە، بەڵكو سنوورەكانى خودايشى پێوە بەستراوە، بەهۆى شايەتى دانەوە ئەو سنوورانە ئەسەلمێنرێن و تۆڵەيان ئەسێنرێ. كەواتە پێويستە و جێگاى خۆيەتى ئاوا بەتوندى و بەگرنگى بگيرێ بۆ ئەوەى مەردوم سستى و ناڕاستى و ناڕەوايى تيا نەكەن.

٨- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ وە كەسانێ كەلەسەر نوێژەكيان پارێزەرن، بەم ڕەنگە لەكاتى خۆيا ئەيكەن، وە فەرزو سووننەت و شێوەكانى بەجێ ئەهێنن، بەئامادەيى دڵ و تێگەيشتن و سام و بيم و خشوعەوە بەجێى ئەهێنن، كەواتە ئەم هەشتەمە جياوازە لەيەكەم كەبريتى بوو لەتەرك نەكردن و واز لێ نەهێنانى نوێژ، ئەم سيفەت و نيشانانەى بەباسى نوێژ دەست پێكردو بەباسى نوێژ دوايى هێنان، لەبەر گەورەيى و گرنگى نوێژ لە ئيسلامدا.

ئينجا لێرەدا دواڕۆژو چارەنووسى ئەم تاقم و كۆمەڵە ديارى ئەكات هەر چۆنێ لەپێشەوە دوا ڕۆژ چارەنووسى ئەو تاقمەكەى ترى ديارى كرد كە دژو پێچەوانەى ئەمان بوون.
ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي جَنَّٰتٍ﴾ ئا ئەوانەى كە خاوەنى ئەم سيفەتانە(ڕەوشتانە)ن دامەزراوو نيشتەجێ ئەبن لەبەهەشتانێكا كە ڕادەو پلە پايەيان بۆ ئێمە نازانرێ و خەياڵە ئێمە پيايانا ناگات. ﴿مُّكْرَمُونَ﴾ ئەوانە ڕێز لێ گيراو ئەبن لەو بەهەشتانەدا، كەواتە دوو خۆشى و لەزەتيان ئەبێ: لەزەت و خۆشى لەشى(ماددى) بەو هەموو نازو نيعمەتە، وە لەزەت و خۆشى دەروونى و ڕۆحى بەو ڕێز لێ گرتنە، لەپاداشتى ئەو خووڕەوشتە بەرزو شيرينانە كە ئەو برِوادارانەى پێ جوێ بووەوە لەم جيهانەدا. لەلوتف و ميهرەبانى خوا بەزياد بێ.

فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾

ئینجا شێوەیەك لە شێوەكانی بانگ‌و بانگەوازەكەی مەككە نیشان ئەدا، كە بت پەرستەكان بەئەسپایی هەنگاویان ئەنا بۆلای ئەو شوێنەی كە پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی تیا ئەخوێند، ئینجا كۆمەڵ كۆمەڵ بەچوار دەوریا كۆ ئەبوونەوە. قورئان بێزاری دەرئەبڕێ لەو كردەوەیان كە بۆ ئەمە نەبوو ڕێنومایی وەرگرن لەوەی ئەیبیستن. ئەفەرموێ: ﴿فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ﴾ ئایا چی هەیە بۆ ئەوانەی بێ‌بڕوان، چی ڕووی داوە لێ یان لەكاتێكا كە بە ئەسپایی هەنگاو ئەنێن‌و مل درێژئەكەن بەرەو تەرەفی تۆو، بۆلای تۆو چاوت بۆ هەڵئەخەن؟ ﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ﴾ چی یە بۆ ئەوانە لەكاتێكا بە كۆمەڵ كۆمەڵ دائەنیشن لای ڕاست‌و لای چەپتەوە؟ ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی ئەكرد لای كەعبەداو قورئانی ئەخوێند، بت پەرستەكانیش كۆئەبوونەوەو بەش بەش ئەبوون بەدەوریا، گوێیان ئەگرت بۆ لاقرتی كردن. ئەیان ووت: ئەگەر ئەوانە بچنە بەهەشت، وەك محمد ئەڵێ، بائێمە پێش ئەوان بچین، ئینجا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە بەبێزاری دەربڕین‌و سەرسوڕ هێنانەوە پرسیاری كرد لەو بارو حاڵەیان كەئەوان بە پەلەمەنگاو ئەنێن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) نەك بۆئەمەی گوێ بگرن‌و ڕێنموونی وەرگرن، بەڵكو بەس بۆئەوە كەوتوونەتە سەر سوڕمان با هەواڵێ بزانن، ئینجا كۆمەڵ كۆمەڵ لێی ئەوەستنەوە تەگبیر ئەكەن لە پیلان‌و بەرپەرچ دانەوەی ئەو قورئانەی كەئەی بیسن!!

چی هەیەبۆئەوانە؟ ﴿أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ﴾ ئایاهەر كام لەوانە ئومێدەوارە كە بخرێتە ناو بەهەشتی نازو نیعمەت؟ لە كاتێكا ئەوانە بێ بڕوان‌و لەسەر بارێكن بەرەو بەهەشت نایان بات، بەڵكو بۆ ئاگری بڵێسە داریان ئەبات. ئایا ئەوانە خۆیان بەگەرەو خاوەن ڕێز دائەنێن بەلای خواوە، لەگەڵ ئەوەدا بێ بڕوان‌و ئازاری دڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئەدەن،و ئەیانەوێ پیلان بگێڕن دەربارەی قورئان. ئایا ئەوانە لەگەڵ ئەو هەموو تاوانەدا هێشتا خۆیان بە گەورەو خاوەن ڕێز دائەنێن‌و لایان وایە ئەخرێنە بەهەشت؟!

كَلَّآ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّمَّا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٩﴾ فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٤١﴾

---

﴿كَلَّآ﴾ نەخێر شتی وا نابێ نەخەڵەتابن ئومێدی وابێ جێیان ببێ و خۆیا بە گەورەو خاوەن ڕێز دابنێن ﴿إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّمَّا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەوانمان دروست کردووە لەوەی کە خۆیان ئەیزانن! خۆیان باش ئەزانن کەدروست کراون لەو دڵۆپە ئاوە قێزوونە کە خۆیان ئەیناسن! هەر بە قورئان ئەکەوێ قسەکردن و تەمێ دادان، ئەوەتا بەم ڕستە بچووك و کورتە ئەدا لە لووت بەرزی ئەو بێبڕوایانە، و خۆ بەزل زانینەکەیان سەر بەرەو ژێرئەکاتەوە بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن و ڕێگای هیچ جموجووڵێکیان بمێنێ. وە دەست نیشانیان بۆ ئەکات و تێرو تەواوترین شێوەی بێنرخی و ڕیسوایی خۆیانیان ئەخاتە پێش چاو، بەم ڕەنگە ئەیانکاتەوە بەو دڵۆپەئاوە کە خۆشیان قێزی لێ ئەکەنەوە!

کەواتە چۆن ئەبێ بەتەمابن بەو هەموو تاوانە وە بخرێنە بەهەشتی خوا؟ وە ئەوانە کە دروست کراون لەوەی مەخۆیان ئەیزانن، بێنرخ ترن لای خوا لەوەی نازیان ببێ بەسەر خواوە، و خوا باوی ڕاست و دادی خۆی بگۆڕێ بۆ ئەوانە، بەم ڕەنگە پاداشتی بێبڕوایی و تاوان بکات بە بەهەشتی نازو نیعمەت لەباتی ئاگری سەخت و بڵێسە دارا!

ئینجا زیاتر ئەڕوا لەسەر بێ نرخ کردنیان و لووت دانەواندنیان، بەمەی خوا توانایە چاکتر لەوان دروست بکات، وەسزادانی ئەوانی لەدەست دەرناچێ. ئەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ﴾ ئینجا سوێن ناخۆم، چونکە شتەکە ئاشکرایەو سوێنی ناوێ. یا سوێن بەخواو پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواکان ﴿إِنَّا لَقَٰدِرُونَ﴾ بێگومان ئێمە تواناین ﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ﴾ بەسەر گۆڕینی ئەمان بەچاکتر لەخۆیان. وا ئەمان یەکسەر لەناو بەرین و تاقم و چینێکی

چاکتر لەمان بهێنینە شوێنیان کەبڕوادارو گوێ ڕایەڵ بن ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ وە ئێمە نین بەدەستە پاچەو شت لەدەست دەرچوو. واتە هەر شتێکمان ویست ئەیکەین و ئەنجامی ئەدەین، و هیچ کەس و هیچ شتێکمان لێ یاخی نابێ، کەواتە ئەمانە هەروا بەبێ سزادان و تۆڵە لێ سەندن ئەڕۆیشتن ئەگەریەکسەر لەناومان بردنایە، و هەرواش ناڕۆن و ئەبێ سزاو تۆڵەی خۆیان وەرگرن.

دەست نیشان کردن بە ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاواکان گەورەیی و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا نیشان ئەدات، گۆڕینی ئەوان بەچاکتر سووک و ئاسان ئەکات لە دەروونا، چونکە کەسێ بتوانێ ئەو هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە فەراهەم بێنێ و بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە، بۆ ئەبێ سەر بکرێتەوە لەتوانین و دەسەڵاتی بەسەر گۆڕینی ئەوان بەچاکتر. بێگومان هەرکەسێ بێ بەش نەبێ لەهەموو فام و ژیری یە ئەبێ بڕوای ببێ بەو دەستە قودرەتەی کە ئەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایانە فەراهەم ئەهێنێ، دەی ئەبێ بڕواش ببێ بەدەسەڵات بە سەر ئەو گۆڕینەدا.

مەبەست لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواکان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەو هەموو ئەستێرەو مانگ و خۆرەیە کە نایەنە ژمارە، یا مەبەست ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای هەر چوار وەرزەکە هەرکام سەدو هەشتان، بێجگە لە بیست و هەشتیا بیست و نۆ مەنزڵگەی مانگ کە هەموو ڕۆژێ لەیەکێ هەڵ دێ ئاوا ئەبێ، یا مەبەست ئەو هەموو ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتە بێت کە دێن بەدوای یەکا لەناوچەکانی زەویدا، بە هەمیشەیی و بەبێ وەستان.

ئەوەتا هەموو کاتێ لەماوەی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیا لەبەردەم خۆرا ڕۆژهەڵاتێ پەیدا ئەبێ ڕۆژئاوایە وون ئەبێ. بەهەرکام لەو جۆرانە مەبەست بێت، یا بەجارێ هەموو مەبەست بن ڕاست و گونجاوەو گەورەیی و دەسەڵاتی بێ سنووری پەروەردگارو گەورەیی و نایابی دەست کردەکەی لەدڵا جێ گیر ئەکات.

فَذَرْهُمْ يَخُوضُواْ وَيَلْعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ
يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

**لەپاش دەست نیشان کردن بۆ ڕۆژی دوایی و سزاو سامناکیەکەی، بۆ ڕێزی بڕواداران و بێ‌نرخی بێ‌بڕوایان، ئینجا ڕووی فەرموودەکە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) بەمەی لەبێ‌بڕواکان گەڕێ بۆ ئەو ڕۆژو سزایە، شێوەیەك لەشێوەو دیمەنەکانی ئەو ڕۆژەیان ئەخاتە بەرچاو، شێوەی ڕیسوایی و زەبوونی و غەمباری یان ئەفەرموێ: ﴿فَذَرْهُمْ﴾ ئینجا ئەی پێغەمبەر لێ یان گەڕێ و گوێ‌یان مەدەرێ ﴿يَخُوضُواْ﴾ با خەریك بن و سەربکەنە کارو کردەوەی بەتاڵ و بێ نرخی خۆیان، ﴿وَيَلْعَبُواْ﴾ وە گەمەو گاڵتەی خۆیان بکەن لەجیهانا ﴿حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوْمَهُمُ﴾ هەتا دووچاری ڕۆژی خۆیان ئەبن کە هەڕەشەیان لێ کراوە پێی ﴿ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا﴾ ڕۆژێ کە دێنە دەرەوە لە گۆڕەکانیان بە ئەسپایی ﴿كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾ وەك ئەوانە ڕابکەن و بە چەسپانی بڕۆن بۆلای بتێك کە ئامادەکراوەو دانراوە بۆ پەرستن.**

**لەم فەرموودەیەدا بێ‌نرخی یان نیشان ئەدا، لەگەڵ هەڕەشەیەکی بەهێز، کەبیم و ترس ئەخاتە دەروون، ئەو شێوەو دیمەنەیان لەلایەکەوە ترس و بێ ئارامی نیشان ئەدا، وەلەلایەترەوە گاڵتەو لاقرتی پێ‌کردنێ کە زۆر ڕێکە لەگەڵ کەشخەو شانازی و لووت بەرزی ئەمڕۆیانا. ئەفەرموێ: ئەوانە کە بانگ ئەکرێن ئەو ڕۆژەدا بۆ زیندوکردنەوە، بەئەسپایی ئەچن بەدەم ئەو بانگەوە وەك بە ئەسپایی ڕائەکەن بۆلای بتە پەرستراوەکەیان..... ئەو گاڵتەو لاقرتی پێ کردنەش ڕاست و ڕێکە لەگەڵ بارو حاڵی ئەم جیهانەیان، چونکە ئەمانە لەجەژنەکانیاندا بە ئەسپایی ئەڕۆیشتن بەرەو ئەو بتەیان و کۆ ئەبوونەوە بەدەوریا، ئینجا ئەوا لەو ڕۆژەیش بە ئەسپایی ئەڕۆن، بەڵام ئەو دوو ڕۆژو ئەو دوو چەسپانی یە زۆر جیاوازو دوورن لەیەکترەوە!**

ئینجا دوم‌ەن‌و نیشانەکانیان تەواو ئەکات ئەفەرموێ: ﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾ دێنە دەرەوە لە گۆڕەکانیان لە کاتێکدا کە چاوەکانیان بەترسەوە شۆڕو داخراون ﴿تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞ﴾ زەبوونی‌و ڕیسوایی باڵی کێشاوە بەسەریاناو داگیری کردوون. و ڕوویان ڕەش داگیرساوە ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ﴾ ئەوەیە ئەو ڕۆژەی کە هەڕەشەی پێ‌کرا لە بێ‌بڕواکان لەجیهانا. ئەو ڕۆژەیە کە ئەمان بە درۆیان ئەزانی‌و بەلاقرتی یەوە پەلەیان پێ ئەنایەوە. ئا بەم جۆرە سەخت‌و سامناکە سوورەتەکە دوایی هات، سەرتاو دوایی یەکەی جۆش بوون پێکەوە، ئەڵقەیە تەواو بوو لە ئەڵقەکانی چارەسەر کردنی درێژی قورئان بۆ مەسەلەی زیندوو بوونەوەو تۆڵەو پاداشت، دوایی هات گەردشێ لەگەردشەکانی بەربەرەکانێی دوورو درێژ لەنێوان بۆچوون‌و تێگەیشتنی نەفامی‌و بۆچوون‌و تێگەیشتنی ئیسلامی لەجیهان‌و ژیان.

**والحمد الله أولاً واخيراً**

لێ بوونەوە لە تەفسیری ئەم سوورەتە لە ١٤٠٣/٤/٩ بەرانبەر ١٩٨٣/١/٢٢ وەلەم ڕۆژەدا دەستم کرد بە تەفسیری سوورەتی نوح بەیارمەتی خوا

## سوورەتی(نوح)

## مەککەیی یەو ژمارەی ئایەتەکانی(٢٨)یە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە هەمووی بەشێکە لەداستان و سەرگوزشتەی نوح پێغەمبەر(عليه السلام) لەگەڵ گەلەکەیدا، وە باسی بەسەرهاتی بانگ و بانگەوازێ ئەکات لەبانگ و بانگەوازەکانی خوا لەزەوی دا، وەنموونەو نوێنەرە بۆ ئەو هەوڵ و تێکۆشانە هەمیشەیی و چەند بارە کراوەیە کە بەکار هێنرا بۆ تیمارو چارەسەرکردنی ئادەمی لەتەمەنی دوورو درێژیا، و هەنگاوو چەرخەیەکە لەئاژاوەو بەربەرەکانێ نەبڕاوەکەی ناوەندی خێرو شەڕ، ڕێنومایی و گومڕایی، هەق و بەتاڵ.

ئەم داستان و بەسەرهاتە وێنەو نموونەیە لە ئادەمی نیشان ئەدات کە سەرکەش و گومڕابوو، وە شوێن کەوتووی سەرکردایەتی یەکی گومڕاکەربوو، وە خۆ بەزل زان و ڕوو وەرگێڕبوو لەڕاست و ڕاستی و لەڕابەرو نیشانەی ڕێنومایی و بڕوا هێنان بەئایین و بەرنامەی پەروەردگار، کە ئەو ڕابەرو بەڵگەیانەش خرایە پێش چاویان لە خۆیان و ئەو بوونەوەرەی کە تیایا ئەژین، نوسراونەتەوە بەجۆرێ هەموو ژیرێ بیانخوێنێتەوە بەچاوی ژیریی.

ئەم سوورەتە لەهەمان کاتا وێنەیە لەوێنەکانی میهرەبانی خوا دەرئەخات کە بەڕوونی دەرئەکەوێت لەسەرپەرشتی و چاودێری خوا بۆ ئەم ئادەمی یە، وە بە گرنگ گرتنی تەمێ و پەند وەرگرتن و ڕێنومایی. ئەم بەگرنگ گرتنەش دەرئەکەوێ لەناردن و ڕەوانەکردنی پێغەمبەرەکانی یەك لەدوای یەك بۆسەر ئەم گیان لەبەرە سەرکەشە گومڕایە کە ئەکەوێتە شوێنی هەموو سەرکردایەتی یەکی گومڕاکەری سەرتێك دەری لووت بەرز لە حاستی ڕاستی و ڕێنومایی.

ئینجا لەپاش ئەوە ئەم سوورەتە وێنەو نموونەیەك نیشان ئەدات لەوێنەو نموونەکانی هەوڵ و تێکۆشانی سەخت و ماندووکەر، کۆڵنەدانێکی بەهێز لەگەڵ ئارام و خۆگرتنێکی شیرین لەلایەن پێغەمبەرانەوە -سەلامی خوایان لێ بێ- بۆ ڕێ نیشان دان و خستنە سەر ڕێگای ڕاستی ئەم ئادەمی یە. ئەم پێغەمبەرانە -سەلامی خوایان لێ بێ- هەڵئەسان بەو کارە زۆر گەورەو گرنگە و بەئەو ئەرك و ناڕەحەتی یە بەبێ ئەمەی هیچ جۆرە بەرژەوەندیەکی

ئەم جیهانەیان بووبێ بەبێ کرێو پاداشتو دەستکەوتێ نەلەلایەن بڕواداران و نە لەلایەن هیچ کەسی تر لەم جیهانەدا.

وەك ئەو هەموو کرێو پارەو پاداشتو دەست کەوتەی کە خوێندنگاو جامیعە (دانشگا) و مامۆستاو فێرکەران دەست کەوتیان ئەبێ لەم چەرخو سەردەمەی ئێمەو لەهەموو چەرخو سەردەمەکانی تردا، وێنەی ئەم سەردەمە. ئەم بەسەرهاتو وێنە بەتینە خرایە بەرچاوی پێغەمبەران(علیه السلام) کە کە سپاردەی فروستادەیی خواو بانگکردن بۆ ڕێگای خوا لەهەموو زەوی داو هەتا هەتایە درایە دەست ئەم، وە گەورەترین ئەرك خرایە سەرشانی. ئەو وێنەو نموونەیەی خرایە بەرچاو تا بیربکاتەوە لەو هەوڵو تێکۆشانە سەختو دوورو درێژەی کە نوحی برای پێی هەڵسا، بۆ چەسپاندنی بڕوا بەخواو ئایینی خوا لە زەوی دا. هەروەها بیربکاتەوەو سەرنجی ئەو لاریو نالەباریو سەرکەشی یە بدات کە ئەو گەلە بەکاریان هێنا لەگەڵ ئەو بانگو خاوەن بانگەدا. بێگومان بیرکردنەوە لەو دوو شتە هۆی خۆگریو ئارامی دڵە، و پاڵپێوەنەرێکی بەهێزە بۆ زیادە تێکۆشانو هۆی کۆڵ نەدانو ماندوو نەبوون. هەروەها ئەو وێنەو نموونە سەختە خرایە بەرچاوی کۆمەڵی کەمو بێهێزی موسڵمانانی ئەو کاتەی مەککە، وە بەرچاوی هەموو ئەم ئوممەتە موسڵمانە بەشێوەی گشتی، کەجێ نشینو میرات بەرو کەلەپوور وەرگری هەموو ئوممەتە موسڵمانەکانە کەهاتن بەدرێژایی تەمەنی ئادەمی.

بێگومان بیرکردنەوە لەوە دڵ بەهێزئەکاتو ئارام ئەدات بەدڵ لە هەوڵو تێکۆشان لەڕێگای خوادا، و دڵنیاکەرە بەمیهرەبانیو چاودێری خوا بۆ موسڵمانان، و بەسەرخستنو بەخشینی دوا ڕۆژی سەر بەرزی بۆ شوێن کەوتووەکانی پێغەمبەر(ﷺ)و سەر شۆڕیو لەناوبردنی دوژمنەکانی خوا. هەروەهائەم بەسەرهاتەدرا بەگوێی بت پەرستەکانا تا سەرنجی چارەنووسی بێبڕواکانی پێشووی خۆیان بدەن، و هەست بکەن چاکەی خوا بەسەریانەوە کە پێغەمبەرێکی زۆر میهرەبانو بەزەیی داری بۆ ناردن، کە لەگەڵ ئەو هەموو تاوانو دەست درێژی یەی کە ئەیکەن نزای شەڕیان لێ ناکات هەر چۆنی نوح پێغەمبەر کردی.

بەڕاستی مەردوم سەری سوڕئەمێنێ، هەرچۆنێ بیمو ترس ئەیگرێ کاتێ بیر ئەکاتەوە لەو هەموو کۆششو تێکۆشانەی کەکراوە لەلایەن پێغەمبەرانەوە -سەلامی خوایان لێ بێ- بۆ ڕێگا نیشان دانو خستنە سەر ڕێگای ئەم ئادەمییە گومڕا سەرکەشە. وە بیرئەکاتەوە لە مەیلو خواهیشی خوا لە ڕەوانەکردنو ناردنی ئەم پێغەمبەرانە یەك لەدوای یەك بۆ سەر ئەم

ئادەمییە گومڕاو ڕوو وەرگێڕە. لێرەدا پرسیارێ دێت بەدڵدا: ئایا ئەو مەبەست و بەرهەمەی کە پێغەمبەران بەدوایدا گەڕان و بۆی ڕەوانەکران ئەو هەموو کۆشش و تێکۆشانە دوورو درێژەو ئەو خۆ بەخت کردن و فیداکاریە ئەهێنێ کە بەکارهێنران، لە نوح پێغەمبەرەوە(علیه السلام) هەتا محمد(ﷺ) ئینجا لەلایەن ئەو هەموو بڕوادارانەی کە شوێنی ئەو پێغەمبەرانە کەوتن؟ ئایا ئەو هەموو سزاو ئەرك و كۆششەی کە قورئان ئەیگێڕێتەوە لە نوحەوە لەم سوورەتەو لەچەند شوێنی ترا کە کاتێکا کە درێژترین تەمەنی ئادەمی بەخت کرد لەگەڵ ئەو گەلەدا، کەچی ئەو گەلە تەنها بەبڕوانەهێنان و ڕوو وەرگێران وازیان نەهێنا، بەڵکو کەوتنە شوێنی بەلاقرتێ پێکردن و جوێن و قسەی ناشیرین و هەڕەشە لێ کردن. ئایا ئەو مەبەستە کە نوح بەدوایا ئەگەڕا ئەو هەموو ئەرك و مەینەتەی ئەهێنا؟

ئینجا پاش ئەو هەموو تێکۆشان و فیداکاریەی تر کە بەدرێژایی مێژوو هەر کراو نەبڕایەوە لەلایەن پێغەمبەرەکانی ترەوە، تا ئەو ڕادەیەی لێیان سوتێنرا بەئاگر، یا بەمشار داهێنرا، یا دەرکرا لەخاك و وڵاتی: تا دواترین پەیام کە پێغەمبەرمانی پێ ڕەوانە کرا(ﷺ) ئینجا ئەویش ئەو ڕەنج و تێکۆشانە بەناوبانگەی کرد تیا، بەخۆی و بڕوادارانەوە ئینجا ئەو تێکۆشان و بەخت کردنە لەپاش ئەوان هەر هات بەدوای یەکا لەلایەن ئەوانەی بانگ و بانگەوازەکەی ئەوانیان سەندەوە لەهەموو خاك و لەهەموو تاقم و چینێکدا.

ئایا ئەو مەبەست و بەرهەمە ئەو هەموو تێکۆشان و خۆ ماندووکردن و فیداکاریانە ئەڕژێ؟ ئایا ئەم ئادەمییە ئەوەندە نرخی هەیە کە خوا ئەوەندە بەگرنگ بیگرێ کە بەو جۆرە پێغەمبەرانی بۆ بنێرێ یەك لەدوای یەك لەگەڵ ئەو هەموو لاری و ناڵەباری و خۆ بەزل زانی و لاقرتێ و دەم درێژیەی کە کرا دەربارەی پێغەمبەرو ئاین و بەرنامەی خوا، لەلایەن ئەم گیان لەبەرە بێهێزو لاوازەی کە پێی ئەوترێ ئادەمی؟!

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێین: بەڵێ بێگومان ئەو مەبەست و بەرهەمە کە بریتیە لە جێگیربوونی بڕوا بەخواو پەرستنی خوا لەزەویدا ئەو هەموو شتە ئەهێنێ و ئەڕژێ! جێگیربوونی ئەوشتە ڕاست و گەورەترە لە بوونی ئادەمی، بەڵك و گەورەترە لەهەموو زەوی و ئەوەی وا لەزەویدا، بەڵك و گەورەترە لەم بوونەوەرە گرنگە کە زەوی لەچاویا تۆزو گەردێکە کە هەر چاوناداو، ویست و خواهیشی خوا بەم جۆرە هات ئەم ئادەمییە دروست بکات بەجۆرێکی تایبەتی و لەسەر چەند سیفەتێکی دیاری، کە لێهاتوو و توانا و دەسەڵات داربێ و بتوانێ بەهێزو خواهیشی خۆی کاربکات و بەرهەم بهێنێ و دەست بدا بۆ خێرو شەڕو چاکەو

خراپە. لەبەرئەوە جێگیرکردنی عەقیدەو ئایینی خواو چەسپاندنی بەرنامەو شەریعەتەکەی لە دەروون و ژیان و جیهانا حەواڵەی ئادەمی کرد و ئەو ئەرکەی خستە سەرشانیان کە بەیارمەتی و کۆمەکی خوا ئەو مەبەستە گەورەیە پێك بهێنن.

ئیتر ئێمە نازانین لەبەر چ هۆیەك ئەم ئادەمییەی وا دروست کرد، وە وای دروست نەکرد کە هەر بۆ بڕواو گوێ ڕایەڵی دەست بدات بەوێنەی مەلائیکە(فریشتە)، یا هەر بۆ خراپە دەست بدات وەك شەیتان.

ئێمە هۆی ئەوە نازانین، بەڵام بڕوامان هەیە کە ئەبێ لێزانی و کار دروستی لەوەدابێ وەیاسای ئەم بوون و بوونەوەرە داخوازە بۆئەوەی ئەم ئادەمییە بەو جۆرە بێت! کەواتە ئەبێ ئەو هەوڵ و تێکۆشانە ببێ لەلایەن ئادەمییەوە بۆ چەسپاندن و جێگیرکردنی ئەو ئایین و عەقیدەیە لەدەروون و ژیانی ئادەمیدا، بۆ ئەو هەوڵ تێکۆشانەش چەند کەسێ لەئادەمی هەڵبژارد کە پێغەمبەران و کۆمەڵێکی هەڵبژێراون لە بڕواداران و شوێنکەوتووە ڕاستەکانیان، ئەوانەی هەڵبژارد بۆ ئەو مەبەستە گەورەیە کەئەوەندە بەنرخ و بەڕێزە ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشان و فیداکاریە ئەژێ و ئەهێنێ، چونکە جێگیربوونی ئەو ئایین و عەقیدە لەدڵا بریتیە لە پەیدابوونی تروسکەیەك لە نووررو ڕووناکی خوا لەو دڵەدا، ئەوکاتە ئەو دڵە ئەبێتە جێگاو گەنجینەی نهێنیەك لە نهێنیەکانی خوا، ئەو دڵە ئەبێ بەچەکێك لەچەکەکانی فەرمان و بڕیاری خوا لەم بوونەوەرەدا. بێگومان ئەمانەش مەبەست و دەستکەوتێکن گەورەترو بەڕێزترن لەئادەمی و ئاسمان و زەویەکەیی و هەموو ئەم بوونەوەرە گەورەیە!

هەروەها جێگیربوونی ئەو ئایین و عەقیدەیە لەژیانی هەموو ئادەمی دا یان کۆمەڵێ لەوان هۆی پەیوەستی ئەم ژیانی زەوی وجیهانەیەبەژیانێکی هەمیشەیی ونەبڕاوە، وەبەرزبوونەوەی ئەم ژیانە بۆ ڕادەو پلەیە کە شایستەی ئەو پەیوەستیە بێت، مانای وایە سنووردارو ناتەواوو کەم و کوڕ پەیوەست بوو بەبێ سنووررو تێرو تەواوە. ئەوەش دەستکەوتێکە زیاتر ئەهێنێ و ئەژێ لەو هەموو هەوڵ و تێکۆشان و فیداکاریە کە بەکارهێنراوە لەرگای ئەو دەست کەوتەدا. ئیتر با ماوەی ئەو دەستکەوتە ڕۆژێك بێت یان کەمتر لەڕۆژێ لەهەموو ماوەی ژیانی دوورو درێژی هەموو ئادەمیدا، چونکە بەدی هاتنی ئەو دەستکەوتە –با ماوەکەشی کەم و کورت بێت– ئەبێ بەچراو گڵۆپێکی زۆر ڕووناك لەبەردەمی ئادەمیدا بۆ هەموو تاقم و چینەکانی تری، کە تێکۆشان بکەن بۆ پێگەیشتنی! بێگومان ڕووداوی چەن بارەی مێژوو ڕوونی ئەکاتەوە کە دەروونی ئادەمیە بەهیچ هۆیەك نەگەیشتووە بەئاسۆو پلەی هەرە بەرزی

خۆی مەگەر بەهۆی جێگیربوونی بڕواو عەقیدەی ڕاستەقینەی خوا تیایا، ژیانی ئادەمی بەهیچ هۆیەتر نەگەیشتووە بە ئاسۆی هەرە بەرزی خۆی، هەرکات سەرکردایەتی بەدەست خاوەنی ئەو بڕواو عەقیدەبووبێ، ئەو ماوەو کاتانە پۆپەی هەرە بەرزن لەمێژووی ئادەمی دا، بەڵکو وەك خەو ئاواتێ بوون کە بەخەیاڵ نەهاتوون، بەڵام مەردوم ژیاوە تیایانا بە بەدی هاتوویی! بەهیچ کلۆج ناگونجێ ئادەمێتی بەرزو بڵند ببێتەوە لەڕێگای زانینو فەلسەفەو زانیاریو پیشەسازیو هونەرەوە یا لە ڕێگای هەر یاساو بەرنامەیەکەوە. ناگونجێ لەهیچ ڕێگایە لەم ڕێگایانەوە بەرزبێتەوە بۆ ئەو ڕادەو پلە بەرزەی کە پێی گەیشت یا پێی ئەگات لەڕێگای جێگیر بوونی عەقیدەو ئایینی خواوە لەدەروونی ئادەمیو ژیانو کردەوەو ڕەوشتیو بۆچوونو تێگەیشتنی. ئەو عەقیدەو ئایینانە هەمیشە بەرنامەیەکی تێرو تەواوی ژیانی لێ هەڵقوڵاوە، ئیتر ئایا ئەو عەقیدەو ئایینانە بەشێوەیەکی کورت هاتبن وەك لە پەیامە پێشووەکانا کە بەو جۆرە هات، یا بەدرێژیو ووردیو گشتی هاتبێ وەك لەم دواترین پەیامەدا کەهات بۆسەر پێغەمبەرمان(ﷺ).

بەڵگەو نیشانەی ڕوون لەسەر ئەوەی کە ئەم عەقیدەو ئایینە لای خواوە هاتووە، ئەمەیە کە بەپێی ڕووداوی مێژوویی دەرکەوت کە ئادەمێتی لە ژێر سایەی ئەم ئایینو عەقیدەیەدا گەیشتەڕادەو پلەیەکە هیچ کات لەژیانیا پێی نەگەیشتووە بە هیچ هۆیەتر لەدەستکردەکانی ئادەمی. نەبەزانینو زانیاری نەبە فەلسەفەو هونەرو پیشەسازی، نەبەهیچ یاسایە. دەرکەوت کە ئادەمێتی کاتێ جڵەوی ژیانی لەدەستی ئەم عەقیدەو ئایینەدا نەماو سەرکردایەتی موسڵمانانی ڕاستەقینەی لێ بڕا هیچ هۆیە لەو هۆیانە سوودی پێ نەگەیاندو لەبارەی ئادەمێتی یەکەیەوە پێشی نەخستو بەرزی نەکردەوە، بەڵکو هاتە خوارەوەو هەمیشە بەرەو پەستی ڕەوشت ئەڕوا، هەر وەك نوقم بووە لەگێژاوی سزاو ئازاری دەروونیو سەرگەردانی بێریو نەخۆشی جۆر بە جۆرێ دەماری دا، لەگەڵ ئەو هەموو پێش کەوتنی شارستانی یەشی لەهەموو مەیدانێکداو لەگەڵ فراوانیو ڕەهەنی لەشو ژیریی دا، لەگەڵ ئەو هەموو تێریو تەسەلی کەرەسەو هۆی ڕاواردنی خۆراكو ئەوەی دڵ بۆی بڕوا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بەختیاریو ئارامو ڕەحەتی ئادەمێتی هەرگیز دەست نەکەوت. وە تێنەگەیشت لەژیانو مەبەستی ژیان بەو جۆرو شێوەی کەتێی گەیشت لە ژێر سایەی ئەم ئایینو عەقیدەدا، هەرگیز هەستی نەکرد بە بەرزیو بەڕێزی ئادەمێتی بەو جۆرو شێوەی کە هەستی پێکرد لە کاتێك دا کە ئەم ئایینو عەقیدەیە جێگیرو دامەزراو بوو لە ژیانو لەجیهانا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١

بێگومان ئەو بەرهەمو دەست کەوتانە شایستەو شایانن بۆ ئەو هەموو هەوڵو تێکۆشان و فیاکاری یەی کە پێغەمبەرانو شوێن کەوتووەکانیان هەڵسان پێی بۆ جێگیر کردنو چەسپاندنی عەقیدەو ئایینی خوا لەزەوی دا، وە بۆ ڕووناك کردنەوەی دڵو دەروون بە تروسکەیە لە ڕووناکی گەورەو بێ سنووری خوا، بۆ دامەزراندنو ڕاگیرکردنی ژیانێکی ئادەمی یانە پێی ئەو بەرنامەی ژانە کە خوا داینا لە ئاینو عەقیدەکەیا. بێگومان ئادەمی سەرکەشیو ملەجەڕەی هەر کردووە لەبانگ کەرانی خواو هەر ئەبێ بیشی کات. وە ڕۆشتووە بەدوای سەرکردایەتی سەرتێك دەرو گومڕاکەرا. وە سزاو ئازاری تێکۆشەرانی ڕێگای خوا بەهەموو جۆر هەر دراوەو هەر ئەشدرێ، ئەوە شتێکە بەدرێژایی مێژوو هەروا هاتووەو هەرواش ئەبێ، بەڵام بانگ کردن بۆ ڕێگای خوا پێویستە ڕێگای خۆی بداتە بەرو نەوەستێو کوێی نەبێ لە هیچ سزاو ئەركو مەینەتو کوشتنو بڕینێ، چونکە مەبەستو دەست کەوتەکان زۆر گەورەو گرنگن، وەك لە پێشەوە وترا، لە ئادەمیو ئەم جیهانو بوونەوەرە گەورەترو گرنگ ترن.

ئینجا با لەبەر ڕووناکی ئەم سەرەتاو پێشەکیە گوێبگرین لەسوورەتەکە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ﴾ بێگومان ئێمە نوحمان ڕەوانەکردو ناردمان بۆلای گەلەکەی، سوورەتەکە دەست پێئەکات بەڕوون کردنەوەی سەرچاوەی پەیامو عەقیدەکە، بێگومان تاقانە سەرچاوەیە بۆ ئەم بوونو بوونەوەرو ژیانە. ئەو تاقانە ڕێنومایی کەرمانە بۆ لای خۆی کەناوی(الله)یەو ئەم ئادەمی یەی دروست کردو ئامادەیی بۆ ناسینو پەرستنی خۆی لەسروشتیا دانا، ئینجا کاتێ لایان دا لە سروشتەکەیان پێغەمبەرانی خۆی بۆ ناردن، تا بیانگێڕنەوە بۆلای خۆی. (نوح)(علیە السلام) یەکەم نێراوێکی خوایە کە قورئان باسی بکات لە پاش(ئادەم)(علیە السلام) لەبارەی ئادەمەوە

قورئان باسی ڕەوانەکردنی، بۆ سەر گەل و تاقمێ ناکات، ڕەنگە ئادەم لە پاش هاتنی بۆ سەر ئەم زەوی یەو خەریك بوونی بە ژیانی ئەم زەوی یەوە مامۆستاو فێرکەری ڕۆڵەو نەوەکانی بووبێ، ئینجا لەپاش نەمانیو ماوەیەکی بەسەرا تێپەڕی نەوەکانی لایانداوە لەپەرستنی خوا، لە یەکەم جارەوە چەند وێنەو هەیکەلێکیان دانا بۆ دەست نیشان بە چەند هێزێکی غەیبی(نادیار) یا ئاشکرا کە لایان بەرزو بەڕێز بوو، یا لەسەر وێنەو شێوەی پیاو چاکانی پێش خۆیان، لەپاشان بەوەوە نەوەستانو لەو ڕێوە ئەوانەیان پەرست! بەناوبانگ تری ئەو وێنەو هەیکەلانە ئەو پێنجەیە کە ئەم سوورەتە باسیان ئەکات. ئینجا خوا نوح پێغەمبەری ڕەوانە کردەسەریان بۆ ئەوەی بیانگرێتەوە بۆ خوا پەرستی.

هەرچەند وا بەناوبانگە کە(نوح)(علیە السلام) کوڕەزای(ئیدریس)ـە(علیە السلام) وە بە دەم تەوراتو ئینجیلیشەوە هەروا ئەگێڕنەو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دوو کتێبە لادران لەوەی لەسەرچاوەکەوە هاتو دەستی زۆریان تێ‌خرا، کەواتە بەجێگای باوەڕنەمان، هەروەها زۆر لەم بابەتانە کە بەناوبانگن هەر قسەی دەماودەمنو ناچنەوە سەر سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو، لەبەرئەوەی لە(حاشیەیەك)دا ئەفەرموێ: زۆربەی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەوەن کە(نوح)(علیە السلام)لە پێش(ئیدریس)ـەوە(علیە السلام)بووە، لەبەرئەمانە هەموو ئێمە ناتوانین بەدڵنیایی هیچ کام لەو دوو ڕایە دان پیا بنێین. کەواتە لێ یان بێ‌دەنگ ئەبین. بەس لەگێڕانەوەی داستانو سەگوزشتەی پێغەمبەرەکان لەقورئاندا وا وەرئەگیرێ کە(نوح)(علیە السلام) لە سەرەتای ئادەمێتی یەوە بوو بێتو زۆر درێژیی تەمەنی تا ئەو ڕادەیە نۆسەدو پەنجا ساڵی بەسەر برد لەناو گەلەکەیا بۆ بانگ کردنیان، بەو پێیە ئەبێ تەمەنی ئەوانیش زۆر درێژ بووبێ، ئەو تەمەن دێرژیە وائەگەیەنێ کە کۆمەڵی ئادەمی لەو چەرخو سەردەمەدا کەم بووبێو هێشتا پەرەی نەسەندبێ وەك لە پاشا پەرەی سەندو زۆر بوون، ئەوەیش کە ئەیکەن بە بەڵگە لەسەر کەمێ ئادەمی ئەو سەردەمە بەپێی ئەوەیە ئەبینین باوی خوا وایە لەگیان لەبەرەکانی ترا، هەر جۆرو تیرەیە تەمەنی درێژبێت ژمارەیان کەمە وەك شێرو پڵنگو هەڵۆو واشەو... هتد. وە هەرکام تەمەنی کورت بێت ژمارەیان زۆرە. بۆ مێش کە تەمەنی زۆر کەمە ژمارەی زۆر زۆر.

أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ
وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ

---

ئەمەی کە ئەیڵێن تێڕوانینو بەراوردێکە خوا خۆی ئەزانێ، لەیەکەم جارەوە سەرچاوەی پەیامەکەی دیاری کرد، ئینجا کورتەی پەیامەکە ڕوون ئەکاتەوە. ئەفەرموێ: ﴿أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ﴾ واتە(نوح) مان نارد بەمەی کە گەلەکەت بترسێنە ﴿مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ لەپێش ئەوەی بێت بۆیان سزایەکی سەختو ئێشو ئازاردەر.

بێگومان ئەو سەرکەشیو گومڕاییو خۆ بەزل زانیەی کە ئەو گەلەی لەسەربوو هەربۆ ترساندن چاك بوونو ئەوەیان لەقەد بوو کە قاپی پەیامو پێغەمبەرێتیەکەیان لێ بکاتەوە بەترساندن بە سزای سەختی ئەم جیهانە یا سزای ڕۆژی دوایی یا سزای هەردووکیان، وە ئەو ترساندنە بکات بەکورتەی پەیامو پێغەمبەرێتیەکەی.

ئینجا باسی شێوە ڕاگەیاندنەکەی ئەکات کە ترساندن بەشێکی ئاشکرایە تیایا، لەگەڵ ئەو ترساندنەدا تەماداری کردن بە لێبووردنی خواو دواخستنی خۆیانو حسابیان بەمەرجی بڕواهێنانو گوێڕایەڵیان، هەروەها بەکورتی باسی ئەو بەنو مەبەستانە ئەکات کە بانگی ئەکردن بۆی، ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ (نوح) ووتی بەگەلەکەی: ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەلەکەم ﴿إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ڕوونو ئاشکرام. بەبێ شاردنەوەو پێچو پەنا ئەڵێم ترسێنەرمو بەبێ گێروگرفت بانگتان ئەکەمو کارەکەتان بۆ ڕوون ئەکەمەوە بەم ڕەنگە، ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەو خوایە بپەرستن کەناوی(الله)یەو ﴿وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾ لەو خوایە بترسنو خۆتان بپارێزن لەهۆی خەشمی، وە پەرستنی خوا بە تەنهاو ترسان لێی بەرنامەیەکی سووكو ئاسانو بێ گرێیە. ئەمەی کە(نوح) پێغەمبەر(علیه السلام) گەیاندی کورتەی هەموو ئایینەکانی ئاسمانیەو جیاوازی ناوەندی ئەم ئایینە لە بنەڕەتا نیە، بەڵکو لە فراوانیو یاساو هەندێ لەبەرنامەو یاسادا هەیە.

پەرستنی خوا بەتاكو تەنها بەرنامەیەکی تێرو تەواوە بۆ ژیان، کە هەموو شت ئەگرێتەوە: بۆچوون(تصور)ی خوایەتیو بەندەییو پەیوەندی نێوانی خواو بەندەو تێگەیشتن لەبوونو بوونەوەرو ژیانو ئادەمی.... ئینجا لەوەوە یاسایەکی ژیان هەڵئەقوڵێ بۆ ئادەمی، ئینجا لەوەشەوە بەرناکەیەکی تایبەتی بۆ ژیان بەرپا ئەبێ، بەنامەیەکی خواییو

ئاسمانی کە ئەگەڕێتەوە بۆلای پەیوەندیو پەیوەستی نێوان خوایەتیو بەندایەتی دا، بۆلای ناسینو زانینی ڕادەو سنووریێ کەخوا دایناوە بۆ هەموو زیندەوەرو هەموو شتێ، ترسان لە خەوایە کە زامنو پاڵپێوەنەرە بۆ ڕێكو ڕاستیو دامەزراوی مەردوم لەسەر ئەو بەرنامەیەو لانەدانو لانەکردنەوەی بەملاو بەولادا، وە بۆ فڕوفێڵ نەکردنو لاری نەکردن لەبەجێهێنانو بەدی هێنانی دا. هەروەك ئەو ترسانە تاکە سەرچاوەیە بۆ کردارو ڕەوشتی شیرین.

گوێ ڕایەڵیو فەرمان بەری پێغەمبەری خوا یەکەم هۆی بەهێزە بۆ دامەزراوی لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی خواو بۆ وەرگرتنی ڕێنومایی لەسەرچاوەیەك کە پەیوەستە بەیەکەم سەرچاوەی هەموو شتێکەوە، و بۆ مانەوەو نەبچڕانی پەیوەندی بە ئاسمانەوە لەڕێگای ڕاستی نەدۆڕاوی باوەڕپێکراوی خۆیەوە!!

ئەم بەندو خاڵانەی کە(نوح) پێغەمبەر(علیه السلام) بانگی گەلەکەی خۆی بۆکرد لەسەرەتای مێژووی ئادەمیەوە کورتەو پاڵفتەی بانگو بانگەوازەکانی خوایە بۆ هەموو چەرخو چینەکانی تریش پاش(نوح)(علیه السلام).

بانگی کرد بۆ ئەو خاڵو بەندانەو بەڵێنی دا لەسەریان بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ﴾ خۆش ئەبێو ئەسڕێتەوە لێتان لە گوناهەکانتان، ئەو گوناهانەی کە تێپەڕیان کردووە. ﴿وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّى﴾ وە دواتان ئەخات بۆ کاتێکی ناوبراوی دیاری کراو، حسابو پرسیارتان دوائەخات تا ئەوکاتە دیاری کراوە کە ڕۆژی دواییەو لەم جیهانەدا تۆڵەو سزای نابێ بۆتان، یا دواتان ئەخات بۆ درێژترین تەمەنێ کە دیاریکراوە بۆتان بەمەرجی بڕوا هێنانو گوێ ڕایەڵی، واتە ئەوانە ئەگەر بمانایەوە لەسەر گوناهو بێبڕوایی ماوەو تەمەنێکی کورتیان بۆ دائەنرا، ئەگەر کۆتاییان بهێنایە بە بێبڕوایی لە گوناهو تاوان ماوە ئەدرانو تەمەنی درێژیان بۆ دیاری ئەکراو دوائەخران بۆ ئەو تەمەنە درێژەیان خوا زاناو ئاگاداربوو کە کام بار ئەگرنو ئەیدەنە بەر، و ماوەو ئەجەل بەپێی ئەو زانینی خۆیە بۆ دانان. کەواتە دوو ماوەو ئەجەلیان نەبووە، بەڵکو بۆ هەموو شتێ هەر یەك ماوەو ئەجەل هەیەو ناگۆڕێو وەك پێش ناکەوێ بەهیچ ڕەنگێك دواش ناکەوێ. وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ﴾ بەڕاستی ماوەو ئەجەلێ کە خوا دیاری کردووە کاتێ هات دواناخرێ کەواتە پێشڕەوی بکەن بۆئەوەی بانگتان ئەکەم بۆی پێش دواهاتنی ماوەتان

لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ﴿٥﴾ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا ﴿٦﴾ وَإِنِّي
كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ
ٱسۡتِكۡبَارٗا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ وَأَسۡرَرۡتُ لَهُمۡ إِسۡرَارٗا ﴿٩﴾

---

﴿لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ واته ئەگەر ئێوە زانابوونایە پێشڕەویتان ئەکرد بەڵام زانا نین لەبەرئەوە پێشڕەوی ناکەن و بەگوێم ناکەن.

(نوح)(علیە السلام) دەستی کرد بەتێکۆشانی هەمیشەیی پاك و خاوێنی خۆی بۆ ڕێنومایی گەلەکەی، بەبێ ئەوەی بەرژەوەندی و سوودو قازانجێکی خۆی بوێ بێجگە لە فەرمانبەری و ڕەزامەندی خوا، لەو ڕێگایەدا دووچاری سزاو مەینەتی زۆر بوو، بێشەرمی و دەم درێژی و لاقرتی زۆری پێکرا. ماوەی(٩٥٠) نۆسەدو پەنجا ساڵ خەریك بوو لەگەڵ ئەو گەلە نەفامە سەرکەشەدا، لەگەڵ ئەوەدا چەند کەسێکی کەم بڕوایان پێهێنا وەتا بهاتایە ڕادەی ڕوو وەرگەڕان و گومڕایی و دەم درێژیان بەرزئەبوویەوە!

ئینجائاخری کارنزاو شکاتی بردەلای پەروەردگارخوا زاناو ئاداگاربوو بەوە و (نوح)یش ئەیزانی خواناردوویەتی وئاگادارەبەهەموو شتێ بەڵام دادو شکاتی دڵی ماندووی خواناسان تەنهابۆلای خوایە، لەبەرئەوە﴿قَالَ﴾(نوح) ووتی﴿رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم﴿إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا﴾ بەڕاستی من بانگی گەلەکەمم کرد بەشەوو بەڕۆژ واتە هەمیشە بانگم کردن بەبێ سستی و وازهێنان ﴿فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا﴾ کەچی بانگ کردنەکەم هیچی لێ زیاد نەکردن بێجگەلە تاربوون و ڕاکردنیان لێم، تاربوونیان لە بانگ کەریان بۆلای خوا، سەرچاوەی بوون و ژیانیان، سەرچاوەی هەمووچاکە و بەهرەکانیان، سەرچاوەی ڕووناکی و ڕێنومایییان و ئەوەی بانگیشی کردن داوای هیچ پول و پارەو کرێیەکی لێ نەکردن و هیچ باجێکی لەسەر دانەنان لەباتی گوێگرتن و فێرکردن و پێڕاگەیاندنیان؟ تاربوون و ڕاکردنیشیان لە کەسێکە کە بانگیان ئەکات بۆلای خوا بۆئەمەی ببورێ لێیان و ڕزگاریان بکات لە تۆڵەی تاوان و گومڕاییان؟

ئینجا(نوح)(علیە السلام) کۆتایی نەئەهێنا و هەمیشە بەرۆکی بەرنەئەدان و ئەوانیش وولاتیان بۆ بەجێنەئەهێلرا، ئەو نەفامانە شێوەیەکی پیسترو نەفامانەتریان بەکار ئەهێنا، بەم ڕەنگە پەنجەیان ئەخستە گوێچکەیان تا بانگ و قسەکانی نەبیستن خۆیان دەئەپۆشی تا

نەیبینن و سەرنجیشی نەدەن کە بەڕاستی ئەوە شێوەیەکی زۆر منالآنەیە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ﴾ بەڕاستی هەموو جارێ کەمن بانگم ئەکردن بۆ ئەمەی تۆ لێیان خۆش بیت و تاوانیان بسڕیتەوە، واتە بانگم ئەکردن بۆ بڕوا هێنان کە هۆی لێ بووردنیانە ﴿جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ﴾ پەنجەکانیان ئەخستە ناو گوێچکەکانیانەوە ﴿وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ﴾ پۆشاکەکانیان ئەدا بەمل خۆیاناو سەرو ڕووی خۆیان پێدائەپۆشی بۆئەمەی نەم بینن لەداخ و خەشمی خۆم و بانگ کردنەکەمدا ﴿وَأَصَرُّوا﴾ سوور بوون لەسەر بێبڕوایی و باشتر سەریان تێ‌ئەکرد و ئەنووسان پێیەوە، ﴿وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا﴾ وە خۆیان زۆر بەگەورە و زل ئەزانی لەوەی شوێنم کەون و گوێ ڕایەڵم بن بە خۆ بەزل زانینێکی بەتین.

ئینجا لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و کۆڵ نەدانە بەهەمیشەیی، بەچەند جۆرو شێوە لەگەڵیان خەریك ئەبوو، بەم ڕەنگە جارێ بەئاشکرا بانگی ئەکردن، جارێ تر ئاشکرایی و نهێنی تێکەڵ ئەکرد بۆیان. وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا﴾. ئینجا بەڕاستی من بانگم کردن بەئاشکرا، وا دەرئەکەوێ لە پێشەوە و لەیەکەم جارەوە بەنهێنی بانگی کردبن وەکو لەڕواڵەتی ووشەی ﴿ثُمَّ﴾ وەرئەگیرێ و سروشتی کارەکەیش هەر ئەبێ وابێ، ئینجا ئاشکرای کردبێ ﴿ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنْتُ لَهُمْ﴾ ئینجا ئاشکرام کرد بۆیان و بەئاشکرا بانگم کردن، ﴿وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ ئینجا نهێنیم کرد بۆیان بەنهێنی کردن. ئەوەی کە بەباشی بچێتە دڵەوە لەبارەی بانگ کردنەکەیەوە بەم جۆرە بووە: لەیەکەم جارەوە بەنهێنی بووە و هەمیشە خەریك بووە لەگەڵیان بەنهێنی و بێ پەلەکردن لەگەڵیانا لەئاشکرا کردنیا. ئینجا کەلە و ڕێگایەوە کاری لێ نەکردن ئاشکرای کرد، چونکە ئەو ئاشکرا کردنە بەهێزترە لەم ڕووەوە کە کارەکەی ڕاست و ڕەوایە و بەبێ باك دەری ئەخات، ئینجا کە ئەوەی کرد و شتەکەی دەنگی دایەوە لەناو هەموانا، بەهۆی ئەو سەرکەشە دەسەڵات دارەکانی مەترسی یان کردبێ لەوەی کاربکات لە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانیان، لەبەرئەوە ویستبێتیان کۆتایی پێ‌بێنن لەوەی ئەوان ئەیانەوێ، بەم ڕەنگە کۆنگرەی تایبەتی لەگەڵ گرتبن بۆ بانگ کردنیان، و لەو کۆنگرە تایبەتیەدا بەڕێکی و بێ پێچ و پەنا بانگی کردبن و لە هەمان کاتدا نهێنیشە لەگشت. بەو شێوەیە بانگ کردنەکە تێکەڵە لە هەردوو جۆرەکە: نهێنی و ئاشکرا، تێکەڵ لە ئاشکراو نهێنی بەو جۆرەی کەوتمان و هەڵئەگرێ ئەم جۆرە سێهەمە بەم جۆرەش بووبێ: شێوەی ئاشکرای بەجێ‌هێنابێ بۆ گشت، وە شێوەی نهێنیش بۆ یەکە یەکە.

فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾

**بەهەرحاڵ نەوەستاو هەر ڕێگایەکی بەلاوە بەکارو بەجێتر بووبێ بەکاری هێنا لەگەڵیان و موژدەی دانێ و تەماداری کردن بەخێرو چاکەی هەردوو جیهان، ئەگەر بڕوابێنن و داوای لێ خۆش بوون بکەن لەخوا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ﴾ ئینجا وتم پێیان: داوای لێ خۆش بوون بکەن لە پەروەردگارتان بە گەڕانەوە لە بێبڕوایی و هاوبەش بڕیاردان و گوناهو تاوان. ئەو داوایە بکەن و ئومێدەوار بن لێتان خۆش ببێت و گوناهو تاوانتان بسڕێتەوە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا﴾، چونکە پەروەردگارتان هەمیشە زۆر لێ خۆش بووو سڕەوەی گوناهە بۆ ئەوانەی ئەگەڕێنەوە بۆلای و داوای لێ ئەکەن.**

**وا دەرئەکەوێ ئەو گەلە بەهۆی شوومیی و نەگبەتی بت پەرستی و خراپەکارییانەوە خوا دووچاری بێبارانی و قات و قڕی و بێنەوایی و کەم بەرهەمی کردوون لە سامان و دارایی و ئەولاددا. بێگومان گەڕانەوە بۆلای خواو لەخوا ترسی و کەوتنە سەر ڕێگای خوا هۆیەکی مسۆگەرە بۆ بارینی بەزەیی خواو پیت و فەڕی بوونەوەرەکەی و زۆر چاکەو بەهرەی لەهەموو بارو ڕوویەکی ژیانەوە. بێجگەلەوەش هەوڵ و تێکۆشان بۆ خێرو چاکەی گشتی و ئاوەدان کردنەوەی وڵات و بەکارهێنانی ئەو هێزو ووزەی کە خوا دروستی کردووە لەم جیهانەدا بۆ بەندەکانی و دەست خستنی ئەو هەموو خێرو بێرە بە پێی ئەو بەرنامەی خوا دایناوە، ئەمانە هەموو بەشێکە لەئایینی خواو خواپەرستی.**

**هەوڵدان بۆ پاک و خاوێنی خواردەمەنی و ئاوو هەواو پاک و تەمیزی لەهەموو شتێکدا، و هەوڵی ساغی و تەندروستی و دوور کەوتنەوە لەهۆی نەخۆشی و ناساغی بەشێ ترە لە ئایین و خواپەرستی، کەواتە هەر گەلێ ئاوا بەڕێکی ڕێگای خوا بداتە بەر لە هەموو بارو**

ڕوویەکی ژیانەوە پێش کەوتوو ئەبن و سامان و دەرامەتیان بەلێشاو ئەبێ، بەهۆی دوورکەوتنەوەیان لەبەرەڵایی و بێناموسی و شەرواڵ پیسی ئەبێ زۆر بەگرنگی خەریک بن بەکارو بارو ڕێك خستنی ماڵ و خێزان و زۆر کردنی ژنهێنان و بەشوودان، ئەو کاتە بەپێی باوی خوا کوڕو منالیش زۆر ئەبێ کەواتە گەلی بڕواداری ڕاستەقینە کە بەپێی ئایین و بەرنامەکەی خوا ڕەفتار بکات خوا قاپی هەموو خێرو فەڕێکی لێ ئەکاتەوە.

جا لەبەر ئەوە(نوح)(علیه السلام) بەڵێن ئەم پێنج شتە گرنگەی دا بەگەلەکەی ئەگەر بڕوابێنن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا:

١- ﴿يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾ باران ئەبارێنێ بەسەرتانا بەزۆری و پیت و فەڕێکی زۆرەوە، دیارە بەهۆی ئەوەوە کشتوکاڵ و بەروبووم و میوەی زۆر فەراهەم دێت و هەرزانی ئەکەوێتە ووڵات و ئارام و خۆشی هەموو شوێنێ دائەگرێ.

٢- ﴿وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ﴾ وەلە چەند جۆر ماڵ و سامانی زۆرتان ئەداتێ.

٣- ﴿وَبَنِينَ﴾ وە کوڕو ئەولاد(منال)ی زۆرتان پێئەدا.

٤- ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ﴾ وە چەندەها باخ و بێستانتان بۆ فەراهەم ئەهێنێ.

٥- ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾ وە چەندەها جۆگەو ڕووبارتان بۆ فەراهەم ئەهێنێ.

لەچەند جێگایەتر لە قورئاندا خوا پەیوەستی خستووەتە ناوەندی بڕواو لە خوا ترسان و ڕۆزی و سامان و هەرزانی گشتی یەوە. بڕواو لەخواترسان و گەڕانەوە بۆلای خوای کردووە بەهۆی زۆری و فراوانی ڕۆزی و گوزەرانی خۆش. ئەوەش یاسایەکی ڕێك و ڕاستەو دامەزراوە بەپێی بەڵێنی خوا، و بەپێی باوی خوا لەژیانی ئادەمی دا، هەرچۆن ڕووداوو بەدی هاتووی ژیان بەڵگەو شایەتێکی ڕاستە لەسەر ئەوە بەدرێژایی چەرخەکان.

هەر گەل و ئوممەتێ بەڕاستی ڕووی کردبێتە خوا بەکردەوەی چاك و گەڕانەوەو داوای لێ بوردن لە خوا، کاربەدەست شەریعەتی خوا بووبێ تیایا، و دادو ئارامی بەدی هێنابێ لەناو

مەردوم دا، بێگومان هەموو خێرو خۆشی یە ڕژاوە بەسەریانا، وە خوا دەسەڵاتی پێداوەو وڵاتی خستووەتە ژێر دەست و کردوویەتی بە جێنشین تیایا بەچاکەو ئاوەدان کردنەوەو خۆشی و کامەرانی. بەڵێ چەند جارو لەچەند شوێن چەند گەل و ئوممەتێ بینراوەو ئەی بینین کە بێبڕواو لە خوا نەترس و بەدکردارن، لەگەڵ ئەوەدا هەموو هۆی ژیانی فراوانەو زاڵ و دەسەلات و سەرکەوتووو پێش کەوتووە. بەڵام با بزانرێ ئەوە تاقی کردنەوەیە بۆیان، ئینجا با بزانرێ ئەو هەموو هۆی خۆشی و کامەرانی یە تێکەڵەو شێلراوە بە چەند دەردو نەخۆشی دەروونی و دەماری کۆمەڵایەتی و پەستی کردەوە و ڕەوشت، یا پێراوە بەستەم و دەست درێژی و ژێرپێ کردنی ڕێزی ئادەمی و ئادەمێتی. هەر ئادەمی یە سەردانی ئەو وڵاتانە بکات بەباشی تێئەگات کەبەو جۆرە دەردەدارن. نووسەرو ژیرەکانیان ئەو پەڕی بێزاری دەر ئەبڕن لەو ژیانەیان و هاوار ئەکەن بۆ ڕزگار بوون.

ئەگەر سەرنجێکی ئەم دوو دەوڵەتە گەورەیە بدەن:(ڕوسیا و ئەمەریکا) کە هەموو شت و مەکیان تێرو تەواوە. لەگەڵ ئەوەدا لە ڕووسیا نرخ و ڕێزی ئادەمی و ئادەمێتی پێشێل و ژێر پێکراوەو پەست ترە لە ڕادەی بەندەیی و بەندایەتی، جاسووسێتی زۆری سەندووەو زاڵەو بیم لێکراوەو بووە بە مێردەزمەی وڵات و مەردوم و بەترس و لەرزێکی هەمیشەیی لەکوشتن و بڕین و بەند کردنەوە ئەژێنێ،و هەموو کەس مەترسی ئەکات کەقسەیەکی بۆ هەڵبەسرابێ مایەی تیا چوونی بێت و ئەمڕۆ یا بەیانی باڵ بەست بکرێ!

لە ئەمریکادا ئاشکرایە کە ئەخلاق(ڕەوشت)ی تیا نەماوەو ڕادەی پەست ترە لەڕادەی ئاژەڵ(حەیوان)، وە ڕادەی تێگەیشتن و بۆ چوون لەژیان گەیشتووەتە پەست ترین پلە، هەموو شت تەنها بریتی یە لەدۆلار! ئەگەر سەنجێکی ئەم دوو دەوڵەتە گەورەیە بدەین، تێئەگەین کەلەهیچ کامیان دا ژیانێکی ئادەمی یانە نی یە، کەواتە تەنها زۆری دەسەڵات و سامان و فراوانی هۆی ژیان، کامەرانی و ژیانی ئادەمی یانە پێك ناهێنێ.

﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾
وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾

لەپاش ئەوەی(نوح)(علیه السلام) ئەو بەڵێنە گرنگانەی پێدان بەو جۆرەی کەباس کرا، ئینجا سەرسامیو بێزاری دەربڕی لەبێ شەرمیو نەترسی یان لە خوا، لە کاتێکا سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا کە خوا لە خۆیانو لەم بوونەوەرەدا دای ناون ئەفەرموێ: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا﴾ ئایا چی یە بۆ ئێوەو چ هۆیە هەیە بۆتان لە کاتێکا کە ناترسن لە گەورەیی خوا، یا بڕواتان نی یە پێی؟ واتە هیچ هۆیە نی یە بۆ ئەوە.

﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ لەکاتێکا کە خوا ئێوەی دروست کرد بە چەند تەورو بار قۆناغی. دەی کەسێ کە ئێوەی بەو جۆرە دروست کرد شایستەیە بۆ ئەمەی سامو بیمی لێ بکەنو بترسن لە گەورەیی یەکەیو بڕواتان ببێ بەو گەورەیی یەو بەهۆی ئەوەوە بڕوای پێ بێننو گوێ ڕایەڵی بکەن.

چەند ڕایەك وتراوە سەبارەت بەم تەورو بارو قۆناغانەو هەموو هەر ئەگونجێنو ڕاستیشن، ئادەمی هەموو جۆرێ لەوانەی بەسەردادێتو گزەر ئەکات بە هەموویانا، بەڵام ئەبێ(نوح)(علیه السلام) دەست نیشانی بۆ شتێ کردبێ کە ناسراوو زانراو بووبێ لای ئەو گەلە، تا بەوە تەمێو ئامۆژگاری یان بکاتو لەوانە بێت کاریان لێ بکاتو بەهۆی ئەوە گوێ ڕایەڵی بکەنو بێن بەدەم بانگ کردنەکەیەوە. ئەوەی کەوا زۆربەی زانایانی تەفسیری لەسەرە ئەوەیە: مەبەست ئەو بارو قۆناغانەیە کە بەسەری دێت لە سکی داکیا: دڵۆپەئاو، خوێن پارە، گۆشت پارە، قەبارەی ئێسکی، بیچووی تێرو تەواو. بەڕاستی بڕوا وایە کەدەست نیشانی بۆ ئەمە کردبێ کە زۆربەی لەسەرە، چونکە باش ئەگونجێ ئەو گەلە ئاشناو زانا بووبن لەم بارو قۆناغانە بەهۆی ئەوەی منداڵی خۆیانیان ئەبینی لە بار ئەچوو لەسەر ئەو بارو تەورانە. هەروەها بەگوێرەی بێچووی زۆر لە حەیوانو گیان لەبەرانی تر، کەلەسەر ئەو بارو قۆناغانە ئەیان بینین. بەڵام ئایەتەکە نابڕین بەسەر هیچ کام لەوانەی کەوتراون لەمەوبەر، ئەو

باروو قۆناغانەی کە تازە لەم دوایی یەدا دۆزراونەتەوەو ڕێیان پێبرا، کە ئەڵێن: بێچوو لەسکی دایکیا لە یەکەم جاریەوە، وەك گیان لەبەرێ وایە کە تەنها سێلێك(خانەیەك) بێ، ئینجا لە پاش ماوەیەك وەك گیان لەبەرێکی لێ دێ کەپێك هاتبێ لەچەند سێلێ. ئینجا شێوەی گیان لەبەرێکی ئاوی وەرئەگرێ، ئینجا شێوەی گیان لەبەرێکی مەمکەیی ئینجا شێوەی گیان لەبەرێکی ئادەمی، ئەمەو هەر جۆرو باروو قۆناغێ تر کە دەرکەوێ لەمەو پاش بۆ زانایان، هەرکام لەوانەش بەری مەبەست بەو ئایەتە ئەکەون و دوور نی یە بەجارێ هەموو مەبەست بن، هەرچەند وەکو ووتمان ئەبێ(نوح)(علیە السلام) دەست نیشانی بۆ جۆرێ کردبێ کە ئەو گەلە ئاشناو زانا بووبن پێی بەهەرحاڵ(نوح)(علیە السلام) سەرنجی ئەو گەلەی ڕاکێشا بۆ بیرکردنەوە لە دروست بوونی خۆیان، و بێزاری دەربڕی لێیان، کە خوا بەو جۆرەدروستی کردوون، کەچی لەپاش ئەوە ئەوان ناترسن و باکیان نی یە لە پەروەردگاریان. بێگومان ئەو بێباکی یە ئەو پەڕی نەفامی یەو شتێکی زۆر بێزراوو هۆی سەر سوڕمانە! ئەو گەلە هەرچەندە بت پەرست بوون، بەڵام وا دەرئەکەوێ وەك بت پەرستەکانی قوڕەیش بڕوایان بە خوا و پەروەردگاریی خوا بووبێ.

ئەگەر بڕواشیان نەبووبێ بیرکردنەوە لەم دروست کراوانە بڕوا بە خوای پەروەردگار ئەچەسپێنێ و هیچ ماوە نادا بۆ گیرو گرفت لەو بڕوایەدا، چونکە وەك چەند جارێ ووتراوە ئایا ئەم دروستکراوانە بەڕێکەوت فەراهەم هاتن؟! ئایا خۆیان خۆیان خۆیانیان دروست کرد؟ ئایا هیچ دروستکراوێ هەیە بڵێ من ئەم دروست کراوانەم داهێنا؟! ئەم سێبارە بەهیچ کلۆجێ جێگای نابێتەوە لەدڵی هەر کەسێ کە بەش بڕاو و بێبەش نەبێ لەهەموو فام و تێگەیشتنێ، هەر کەسێ ڕێزی خۆی بەلاوە ببێ لەڕووی نایە خۆی بکات بەخاوەنی هیچ کام لەو سێ بارە. کەواتە هیچ بارێ نەمایەوە ئەمە نەبێت کەبڵێیت: خوای تاك و تەنها پەروەردگارە بۆ هەموو.

هەر چۆنێ سەرنجی ئەو گەلەی ڕاکێشا بۆ بیرکردنەوە لە دروست بوونی خۆیان هەروەها سەرنجی ڕاکێشان بۆ بیرکردنەوە لە دروست بوونی ئەم بوونەوەرە. ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا ﴾

ئایا نەتانزانیوەو بەچاوی دڵ سەرنجتان نەداوە ﴿كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ کە چۆن خوا حەوت ئاسمانی دروست کردو دایهێنان بەجۆرێ یەك لەسەر یەك و قات لەسەر قاتن.

ئەم حەوت ئاسمانەی کەلە قورئانا چەند جار باسی هاتووە ئێمە ناتوانین وەك چەند جاریتر ووتمان بەڕێکیو براوەیی(قگعی) مەبەست پێیان دیاری بکەین و بیان برین بەسەر بارێ لەو بارانەی کە لە زانیاری دا ووتراون، چونکە هەرچی ووتراوە تائێستە هەمووی گۆترە کاریەو نەزانراوە، زانینی ئەوەش پێویست نەکراوە لەسەرمان و پێویستیش نی یە ئەو زانینە بۆمان لەم شوێن و کاتانەدا کە مەبەست بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر خوایەتی خوای تاك و تەنها، بۆ ئەم مەبەستە تەنها ئەمە بەسە کە بە چاو ئەبینرێ، ئەمەی وەك خێوەتێکی شین وا بەلای سەرووەوەو ڕازاوەتەوە بەو هەموو ئەستێرەو مانگ و خۆرە لە ڕادەیەکا نین، بەڵکو هەندێ دوورترو بەرزترە لەوی تر، ئەم بینراوە نایابە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە لەسەر خوایەتی و زانین و توانین و کار دروستی پەروەردگار، ئەمە بۆ هەموو چین و تاقمێ دەست ئەدات، کەواتە هەر ئەمە پێویست بوو بۆ(نوح)(علیە السلام) کە سەرنجی ئەو گەلەی ڕاکێشا بۆ بیرکردنەوە لەوەی کە خوا چۆن ئەو حەوت ئاسمانەی بەو جۆرە دروستکرد؟

﴿وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا﴾ وە چۆن مانگی گێڕا لەناو ئاسمانەکاندا بەڕووناك کەرەوەی زەوی لەشەودا؟ ﴿وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ وە چۆن خۆری گێڕا بەچرایەکی گرنگ بۆ لابردنی تاریکی شەو لە هەر شت و لە هەر بەش و پارچەیەکی زەوی کە تیشکی ئەو خۆرەی بەرکەوێ؟

ئەو ئاسمانەی کە مانگی تیایە بەشێکە لەو حەوت ئاسمانە، و بوونی هەرشتێ لە هەر کام لەو حەوتە بوونە لە حەوتەکەدا، ئەمە وەك ئەوە وایە: فلان لە بەغدا دائەنیشێ لەگەڵ ئەوەدا بەغدا چەند ناوچەو محەلەیەکەو فلانیش لە تەنها بەشتێکی زۆر بچووکی بەغدادایە.

ببلەناوبردنی خۆر بەچرا وەرئەگیرێ کە خۆر ڕووناکیەکەی هی خۆیەتی و لەئەستێرەیە ترەوە بۆی نایە بەوێنەی مانگ کەلە خۆرەوە بۆی دێت بەڵام مانگی ناوبرد بەڕووناککەرەوە کە زۆرتر بەشتێ ئەوترێ کە ڕووناکیەکەی بەهۆی خۆیی و لەخۆیەوە هەڵنەقوڵێ.

ئینجا(نوح)(علیه السلام) جاریٚ تر سەرنجیان ڕائەکێشێتەوە بۆلای پەیدابوونی خۆیان لەزەوی‌و ئینجا گەڕانەوەیان بۆناو زەوی تائەوە بکات بەنیشانەو سەرەتا بۆ باسی زیندوکردنەوەیان. ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ نَبَاتٗا﴾ خوا ئێوەی ڕواند لەزەویدا بەڕواندن، واتە لەشی ئێوەی دروستکرد لەخاك، بەم ڕەنگە کەیەکەم کەس کەئادەمی بانگی هەمووانە لەخاك لەشەکەی دروست کردو ئینجا گیانی کرد بەبەریا وەلەپاش ئادەم ڕۆڵەو نەوەکانی دروستکرد لەو دڵۆپە ئاوە کە ئەویش لەخۆراکەو خۆراکیش لە زەوی پێك هاتووە، خوا بەو جۆرە ئێمە دروستکرد لەو زەوی‌و ئەم دروستکردنەی ناوبرد بەڕواندن، هەروەها لە زۆر شوێن لەقورئاندا ئەم شێوە نیشان ئەدات‌و پەیوەستی‌و پەیوەندی ئەخاتە ناوەندی ئادەمی‌و ڕوواوەکانی زەوی‌و جوتیان ئەکات پێکەوە، ئەوەش زۆر شتێکی بەجیٚیە چونکە ئادەمی‌و ئەو ڕوواوانە لە زۆر شتا وێنەی یەکن‌و لەزۆر شتی تایبەتی دا بەشداری یەکترن، هەردووکیان پێك هاتوون لە کەرەستەکانی زەوی‌و لە بەرو بوومی ئەم زەویەن‌و زەوی دایکیانەو هەردوو لە کۆشی ئەم دایکەو بەشیری ئەم دایکە ئەژین چونکە هەردووکیان پێویستیان هەیە بە خۆراك‌و ئاوو هەوا وە خۆراکیش لە زەوی وەرئەگرن‌و هەردوو پەرە ئەسێنن‌و گەورە ئەبن، وە هەردوو پێون ئەبن‌و زاوزێیان هەیە، وە هەردوو هەناسە ئەدەن‌و بەبیٚ هەناسەدان ناژین، هەروەها لەچەند شتی ترا لەبەرئەوە هەندیٚ لە لێزانان وتوویانە: ئادەمی درەختێکە لە درەختەکانی زەوی کە ئەتوانیٚ پیٚی لەزەوی ببڕیٚ‌و بگەڕیٚ بەسەر زەوی دا، وە درەخت ئادەمیەکە لە ئادەمیەکانی زەوی کە پیٚی چووە بەناخیا‌و بەهۆی ئەوەوە وەستاوە‌و ناجووڵیٚ لە شوێنی خۆیان. هەروەها ئەو پەیوەستی‌و جووت کردنە ئەوە نیشان ئەدا کە یەکێتی هەیە لەنێوان بنەڕەتەکان‌و هۆی گیان‌و ژیان لەم زەوی یەدا. کەواتە بڕواداری قورئانی هەست ئەکات بە پەیوەندی خۆی بە زەوی‌و زیندەوەرەکانی زەوی یەوە، تێگەیشتنێکی ڕاست‌و ڕاستەقینەی بۆ پەیدائەبیٚ.

ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا
فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ قَالَ نُوحٌ رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَنْ لَمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾

---

ئەم ئادەمی یانە کەلەم زەوی یە ئەڕوێن و دەردێن، ئەگەڕێنەوە بۆ ناو سکی ئەو دایکەیان جارێکی تر خوا ئەیانگێڕێتەوە هەرچۆنێ ڕواندنی و دەری هێنان. ئەو لەشەیان ئەبێتەوە بەخاك و تێکەڵی خاك ئەبێتەوە، هەروەك یەکەم جاری پێش ڕووان و سەوز بوونیان، ئینجا ئەوکەسەکەیەکەم جار ڕرواندنی لەزەوی ودەری هێنان، بۆ جاری دووهەمیش ئەیانڕوێنێتەوە و دەریان ئەهێنێتەوە وەك(نوح)(علیە السلام) فەرمووی: ﴿ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا﴾ ئینجا ئەتانکاتەوە بەناخی زەوەی دا ﴿وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ وە دەرتان ئەهێنێ لەزەوی بەدەرهێنانتان لەجاری دەووەمیش دا... بەڕاستی مەسەلەکە زۆر سووك و ئاسانەو پی،یست ناکا بەگیروگرفت و وەستان، کاتێ لەم بارو ڕووەوە سەرنج بدرێ کە قورئان نشیانی ئەدات شتەکە سیانە: دروست کردنی یەکەم جار لەخۆڵ، کردنەوەی بەخاك، ئەو دووانەیان ئاشکرایەو هیچ کەس نی یە نەیزانێ، دەی سێ‌هەم کە دووبارە کردنەوەیە بە خاك هیچ جۆرە جیاوازیەکی نی یە لە دروست کردنی یەکەم جار، کەواتە بۆ ئەبێ سەری لێ بکرێتەوەو وەك یەکەم جار سەرنج نەدرێ، بەڵکو ئەبوایە دووبارە کردنەوە بە سووك و ئاسانتر سەیر بکرایە، چونکە هەموو کەرەسەکان بەرێکی هەن و ئەو پەڕی ئەوەیە شێوەی خاکیان بەسەرا هاتووە، ئەبوایە ئەمەیانیان بەئاسانتر دابنایە ئەگەر چی بۆ خوا نابێ بوورترێ، چونکە بۆ خوا هەموو شت وەك یەك ئاسانەو هیچی ناوێ بێجگە لەوە مەیل و خواهیشێ بکات. جا(نوح) پێغەمبەر(علیە السلام) بەم جۆرە تەمێ‌ی گەلەکەی کردو سەرنجی ڕاکێشان بۆ ئەم شتە ڕاستە تا دڵ و دەرونیان هەست بکات بە دەستی قودرەتێ کە بەئاشکرا لەزەوی ئەیانڕوێنێ و دەریان ئەهێنێ و جارێکی تر ئەیانباتەوە بەناوی زەوی دا ئەیانکاتەوە بەخاك. سەرنجێکی ئەو دەستە قودرەتە بدەن و ئینجا لەوەوە چاوەڕوانی دروست کردنەوەی دووهەم بکەن و خۆیانی بۆ ئامادەبکەن.

ئینجا(نوح)(علیە السلام) تەمێ‌یان ئەکات و چاکەو بەهرەیەکی زۆر گرنگیان بیر ئەخاتەوە کەوا بەپێش چاویانەوەو ناتوانن دانی پیا نەنێن، ئەوەش بریتیە لە ڕاخستن و ژێر بار کردنی ئەم زەویە گەورەو پان و پۆڕە لەژێریانا، بەجۆرێ بە خۆشی و کامەرانی ژیانی تیا

ئەبەنە سەرو هەموو هۆی ژیانی لێ وەرئەگرن ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ بِسَاطٗا﴾ خوا زەوی بۆتان ڕاخستووە، پیایادەگەڕێن‌و هات‌و چۆو هەڵس‌و کەوتی خۆتانی تێدا دەکەن ﴿لِّتَسۡلُكُواْ مِنۡهَا سُبُلٗا فِجَاجٗا﴾ بۆئەمەی بگەڕێن تیایا و چەند ڕێگای پان‌و فراوان بدەنە بەر بۆ هەر شوێنێ ئارەزوو ئەکەن. زەوی هەرچەند خڕە، بەڵام لەبەر گەورەیی لە پێش چاو وەك ڕاخراو وایەو هەموو جۆرە گەڕان‌و پاڵ‌و پشتێکی بەسەرەوە ئەکرێ بەسووك‌و ئاسانی، تەنانەت بە بەرزی‌و چیاو شاخەکانیشیا، بەجۆرێ دروست کراوە بەسە بۆ ژیان‌و گوزەران. هەتا زانین‌و زانیاری پەرەبسێنێ و فراوان تر ببێ باشتر مەردوم تێ‌ئەگات لەئایابی ئەم زەوی یە ژێر بار کراوە، زۆر لە هۆو نهێنیەکانی ژیان دەرئەکەوەن کە پەروەردگار فەراهەمی هێناوە بۆ ژیان‌و بەرژەوەندی بەندەکانی! لە سوورەتی ﴿الملك﴾ دا باسی بەشێکی گرنگمان کرد لەو بەهرەو بەخششانە، لەبەر ئەوە لێرەدا بە پێویستم نەزانی درێژە بدەم بەو باسە.

ئا بەو جۆرە(نوح) (علیه السلام) هەوڵی داو ویستی ئەو شتە ڕاستانە بدا بە گوێی ئەو گەلەداو بیانچەسپێنێ لە دڵو دەروون‌و ژیری یاندا، هەوڵ‌و تێکۆشانی کرد بە چەند جۆرو لە چەند ڕێگایەکەوە ئەو ماوە زۆرو دوورو درێژە، بەبێ وازهێنان‌و کۆڵ دان، وە بە ئارام‌و خۆگری یەوە.

ئینجا سەرەنجامی ئەو هەموو هەوڵ‌و تێکۆشانە ئەمە بوو کە(نوح)(علیه السلام) ناچار بوو داد و شکات بباتە لای خواو نزای شەڕ بکاتە لای خوا وەکو ئەمەی فەرموو: ﴿قَالَ نُوحٞ﴾ نوح وتی ﴿رَّبِّ إِنَّهُمۡ عَصَوۡنِي﴾ ئەی پەروەردگارم بەڕاستی ئەوانە گوێڕایەڵ نەبوون‌و سەرکێشی یان لێ کردم، لەپاش ئەو هەوڵ‌و تێکۆشانە، لەپاش ئەو هەموو ئەرك‌و مەینەت‌و ماندوو بوونە، لەپاش ئەو هەموو پەندو ئامۆژگاری یە شیرینە، لەپاش ئەو هەموو ترساندن‌و تەمادار کردنەو بەڵێن دان بە ماڵ‌و ئەولادو خۆشی‌و کامەرانی یە. لەپاش ئەوانە هەموو یاخی بوون‌و سەرکێشی یان کرد لە(نوح)و شوێنی نەکەوتن.

﴿وَٱتَّبَعُواْ مَن لَّمۡ يَزِدۡهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارٗا﴾ وە شوێنی کەسێ کەوتن کە ماڵ‌و دارایی‌و ئەولادی هەر زیان‌و ڕەنجەڕۆیی زیاد کرد بۆیان، واتە لایان نەداو هەر بەردەوام بوون لەسەر شوێن کەوتنی سەرۆکەکانیان کە بەهۆی ماڵ‌و ئەولاەوە هەڵخەڵەتاو و لەخۆ گۆڕاو و یاخی تر بوون لە فەرمانی خوا، کەواتە ماڵ‌و منداڵەکەیان زیاتر زیانباری کردن لای خوا، بەم ڕەنگە سوور تر بوون لەسەر گومڕایی‌و گومڕا کردنی ژێردەستەکانیان،

وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا كُبَّارٗا ﴿٢٢﴾ وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا وَلَا سُوَاعٗا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسۡرٗا

وَقَدۡ أَضَلُّواْ كَثِيرٗا ﴿٢٣﴾

---

وەك وەرئەگیرێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا كُبَّارٗا﴾ وە پیلانیان کرد بە پیلانێکی زۆر گەورە، پیلانیان کرد بۆ بەرگری و نەهێشتنی بانگ کردنەکەی(نوح)(علیه السلام) و ڕێگە گرتنی لەوەی بچێتە دڵی ئەو گەلەوە، وە پیلانیان گێڕا بۆ شیرین کردن و ڕازانەوەی بێبڕوایی و گومڕایی و نەفامی یە کە ئەو گەلەی تێکەوتبوو، وە دەسەڵات و سامان و سەرۆکی یەکەیان یارمەتی دەرێکی بەهێز بوو بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەو گەلەو گوێ ڕایەڵ بوونیان بۆ ئەو سەرۆکانە.

یەکێ لە پیلانە زۆر گەورەکانیان ئەمە بوو کە هانیان ئەدان لەسەر کۆڵنەدان و واز نەهێنانیان لەو بت پەرستی و بتانەیان، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ﴾ وە وتیان ﴿لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ﴾ واز نەهێنن لە پەرستراوەکانتان، واتە هەر ئەوان بپەرستن و لانەدەن بۆ پەرستنی خواکەی(نوح) وتیان پەرستراوەکانتان لەبەر ئەوەی غیرەتیان بێنێتە جۆش، ئینجا لەناو پەرستراوەکانیانا بەتایبەتی ناوی گەورەو بەڕێزەکانیان بردن لەبەر زیادە هاندانیان لەسەر واز نەهێنان و کۆڵ نەدان، وتیان: ﴿وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا﴾ واز مەهێنن لە وەدد، ﴿وَلَا سُوَاعٗا﴾ وە لە سوواع، ﴿وَلَا يَغُوثَ﴾ وە لە یەغوپ، ﴿وَيَعُوقَ﴾ لە یەعوق، ﴿وَنَسۡرٗا﴾ وە لە نسرا. ئەم پێنجە گەورەو بەڕێز ترینی بتەکانیان بوون کە ئەپەرستران لە سەردەمە نەفامی یەکانی ئەواندا، پاش ئەوانیش تا چەرخ و سەردەمی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ) لەناو تیرەکانی عەرەبدا پێنج بت هەبوون ئەو ناوانە وە بەم جۆرە کە(بوخاری) و(موسلیم)و(ئیبنول منزر)و(ئیبن مەردەویە) ئەگێڕنەوە لە(ئیبن عەباس)ەوە -خوا لێ یان ڕازی بێت- کە فەرمووی: ئەو بتانە لە پاشا هاتنە ناو عەرەب، بەم شێوەیە:(ودّ) بۆ کولەیب،(سواع) بۆ هوژەیل،(یغوپ) بۆ غوتەیف،(یعوق) بۆ همدان،(نسر) بۆ حومەیر، واتە بەو ناوانە پێنج بت ئەپەرستران، نەك نەفسی ئەو پێنج بتە بووبن کە لە چەرخی(نوح)دا بوون، ئەوانە بوون بێجگە لە(اللات) بۆ

سەقیف،(العزّى) بۆ سەلیم و غەتفان و جەشم،(مناة) بۆ خوزاعەو ئەساف و نائیلە،(هُبل) بۆ مەككە، ئەم سێیەمە هەرە گەورەی ئەو سیانە بوو، لەبەر ئەوە ناونرابوو بە سەربانی كەعبەوە. ئا بەو جۆرە سەرۆك و سەركردایەتی یە گومڕاو گومڕاكەرەكان چەند بتێكیان داهێنا، هەركام بە ناو و شێوەو قەبارەیەكی جیاواز بەپێی هەست و ئارەزوویە كە باو بووبێ لە هەر سەردەم و چەرخێكی نەفامی دا، وە بە دەوریانا شوێن كەوتووی زۆرو زەبەنەی سادەو نەفامیان كۆ ئەكردەوەو غیرەتیان ئەهێنانە جۆش بۆیان، بۆ ئەمەی بەو بۆنەوە لغاویان بكەن و رایان كێشن بۆ هەر شوێنێ ئارەزوو بكەن، وەبیان هێڵنەوە لەسەر ئەو گومڕایی وسەرلێشێوانەتابەباشی گوێڕایەڵ بن بۆ ئەو سەرۆك و سەركردایەتی یە ستەمكارە.

لە چەند ڕیوایەتێكا هاتووە كە ئەو پێنج ناوە پێشووە ناوی چەند پیاوێكی چاك بوون، ئینجا كاتێ ئەوانە مردن وێنەو هەیكەلیان بۆ دروست كردن بۆ یادرگاری و تاسەیان ئەكردن، ئینجا كە كۆن بوون و ماوەیەكیان بەسەراهات پەرستران، جا لەمەوە وەرئەگیرێ كە وێنەو هەیكەل تا چ ڕادەیەك خەتەرەو جێگای مەترسیە، بەتایبەتی وێنەی ئەوانەی كە بە پیاو چاك دائەنرێن، چونكە زۆر نزیكە لە پاش ماوەیە زیادەڕەوی بكرێ دەربارەیان و خەڵكی سەریان لێ تێك بچێ وەك ئەوانەی كۆن و چەرخی(نوح)(علیه السلام).

بەو جۆرە سەرۆكەكانی گەلەكەی(نوح)(علیه السلام) تێكۆشانیان كرد بۆ گومڕاكردنی ئەو گەلە، ﴿وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا﴾ وە زۆریشیان گومڕاكرد وەك هەموو سەرۆك و سەركردایەتیەكی تری گومڕای ستەمكاری پاش ئەوان، كە خەڵكی كۆنەكەنەوە لەدەوری بتەكان. بتە دارو بەردەكان، بتە ئادەمیەكان، بتە بیرو باوەڕیەكان كەلەم چەرخی نەفامی ئەمڕۆدا زۆرتر ئەم جۆرە بتە باوەو لە هەموو بتەكانی تر زیانیان بەهێزترەو زۆرتر مەردومیان پێ هەڵئەخەڵەتێ!! مەبەستی ستەمكارەكان لە كۆن و تازەدا بەرگری كردن و لادانی خەڵكیە لە ئایین و بانگ كردنەكانی خواو دوورخستنەوەیان لە بانگەكەیان، بەو پیلانە زۆر گەورانە وە بەفرو فێڵ و كۆڵ نەدان!

وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا ﴿٢٤﴾ مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾

---

**ئینجا لەو کاتەدا ئەم نزایە هەڵقوڵا لەدڵی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە بەدژی ئەو ستەمکارە گومڕاو گومڕاکەرانە: ﴿وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا﴾[1] واتە: ئەی خوا ئەو ستەمکارانە هەر گومڕاییان زیاد بکەو باشتر لە ڕێگای ڕاست بیان ترازێنە، ئەم نزا لە دڵێکەوە هات کە تێکۆشانی دوورو درێژی کرد، مەینەتو ماندوویی سەختی چەشت، لە پاش بەکارهێنانی هەموو هۆی ڕێنومایییە کەلە دەستی هات دڵنیابووو باش زانی کەئەو دڵە ستەمکارە یاخی یە سەرکەشانە هیچ جۆرە خێرو ڕووناکیەکیان تیا نی یەو شایانی ڕێنومایی نینو شایستەی ڕزگاربوون نین، خوا هەواڵی پێدابوو هەرگیز بڕوا ناهێنن.**

**ئینجا پێش ئەوەی نزاکانی(نوح)(علیه السلام) تەواوبکات بە شێوەی تێهەڵکێش دواڕۆژو چارەنوسی هەردوو جیهانی ئەو گەلە باس ئەکات، تالە یەکەم جارەوە دەری بڕێ کەئەوەی دووچاریان ئەبێ لەبەر تاوانو خراپەکاریانە، ئەفەرموێ: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمْ﴾ هەر لەبەر گوناهو تاوانەکانیان ﴿أُغْرِقُوا۟﴾ نوقم کران لە ئاوداو خنکێنران پێی ﴿فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا﴾ بەدوای ئەوەدا خرانە ناو ئاگرێکی سەختو گەورە یا جۆرێکی تایبەتی لە ئاگر کە دەقو هاوکێشی تاوانو خراپەکانیان بێ، ئیتر مەبەست بەو ئاگرە ئاگرێبێ کە تاوانبار سزای ئەچێژێ لە پاش مردن ئیتر لە هەر شوێنێ ببێو هەرچی بەسەر بێ، یا مەبەست ئاگری دۆزەخو ڕۆژی دوایی بێت لەو کاتەوە کەمردن تا ڕۆژی دوایی ماوەیەکی کەمەو وەك هەر نەبێ وایە کاتێ بەراوورد بکرێ لەگەڵ نەبڕانەوەو دوانەهاتنی ڕۆژی دواییو سزای دۆزەخەکەی، یا ئەم جیاوازی کاتو چەرخو بەرو دواو دووریو نزیکیە کە هەیە بۆ ئێمەیەو بەپێی حسابی**

---

[1] زۆر کەس ئەفەرموون مەبەست گومڕایی یە لە کاروباری جیهانیانو پەك خستنیان لە نرخدانو درێژە بە پیلانەکانیان، یا مەبەست لەناوبردنو لەڕیشە هێنانیانە، بەڵام بەو دووجۆرە لادانە لە دیمەنو ڕووواڵەت بەبێ بەڵگەیەکی بەهێز، وە ڕێك پەیوەست نابێ لەگەڵ پاشو پێشی ئایەتەکەدا، ئینجا بەو شێوەی کە لە تەفسیرەکەدا ووترا هیچ جێگای ڕەخنە نی یە کەواتە بەگوێرەی دیمەنو ڕووواڵەت بڕۆین چاکترە، وە زانینی ڕاستەقینە لای خوایە، خوا خۆی چاك دەزانێ.

ئێمەیە، نەك بەلای خواو لە حسابی خوادا کە هەموو شت لای ئەو ئامادەیە لە هەموو کاتا ﴿فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَنصَارًا﴾ ئینجا ئەوانە دەستیان نەکەوت لەلایەن غەیری خواوە هیچ یارمەتی دەرانێ، واتە پەرستراوەکانیان هیچ سوودو نرخیان نەبوو نە ماڵو سامانو نە دەسەڵاتو نە کەسو کارو ئەولاد. لەم دوو ئایەتە کورتەدا کاری ئەوانە دوایی هاتو باسیان نەما لە ژیاندا. ئینجا لێرەدا هیچ درێژەی نەدا بەباسی چۆنیەتی نوقم کردنو خنکانیانو سوتاندنیان، کەواتە با ئێمەش شوێن قورئانەکە بکەوینو ئەو باسە هەڵگرین بۆ شوێنی تایبەتی خۆی بەیارمەتی خوا.

ئینجا نزاکەی تری(نوح)(علیه السلام) تەواو ئەکاتو لە پاشان لاڵەو پارانەوەی بۆ خۆیو بڕواداران، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ نُوحٌ﴾ (نوح) ووتی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾ ئەی پەروەردگارم هیچ کەس لەبێبڕواکان مەهێڵە لەسەر زەویدا. خوا خستیە دڵی(نوح)(علیه السلام) کە زەوی پێویستی بە شۆردنو پاککردنەوەیە لەو شەڕو پیسیە پەتیەی کەئەو گەلە لەو سەردەمەدا سەریان لێیەوە دەرچوو، وەهیچ چارەسەر نی یە بێجگە لەو شۆرینو پاککردنەوەو لە ڕیشە هێنانی ستەمکاران، چونکە مانەوەیان بانگو بانگەوازەکەی خوا ئەوەستێنێ بەتەواویو ئەبن بە بەرهەڵستو بەربەست لەگەیشتنی بۆ دڵو دەروونی کەسانی ترو ئەوەی کە(نوح)(علیه السلام) ویستیو داوای کرد ئەوەبوو، لەبەرئەوە ووتی ﴿إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ﴾ بەڕاستی ئەی خوای من ئەگەر تۆ ئەوان بهێڵیتەوەو لێیان گەڕێی ﴿يُضِلُّوا عِبَادَكَ﴾ بەندەکانت واتە -بڕواداران- گومڕا ئەکەنو لەڕێگای تۆ ئەیان ترازێنن، ئەوەش بە چەوساندنەوەو سزادانیان، یان بە هەڵخەڵەتاندنیان بەهۆی ئەو خۆشیو دەسەڵاتو کامەرانیەی کە بێبڕواکان هەیانە. ئینجائەوانە بارو وەزعێکیان فەراهەم هێنابوو کە بێجگە لەبێبڕوا هیچ کەسی تیانەئەژیا و پێی نەئەگەیی، لە هەموو بارو ڕوویەکەوە هۆی بێبڕواییان سازاندبوو، بەجۆرێ هەر منداڵو تازە کەسانێ تر پەیدابوایە لەسەر بەد عەقیدەییو بێبڕوایی پێئەگەیشتو بەهیچ ڕەنگ ماوەی نەئەبوو ڕووناکی ئاینو بڕوا ببینێ، مەبەستی(نوح) ئەوەبوو کەووتی: ﴿وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا﴾ ئەمانە هیچ کەسیان لێ نابێ بێجگە لە خراپەکارو زۆر بێبڕوا، وە هەر منداڵێکیان ببێ وەك خۆیان وائەبێ. لەبەرئەوەی دواکە بەجێو ڕوابوو خوا وەریگرتو ڕووی زەوی پاککردەوەو ئەو تاوانبارانەی لە ڕیشە هێناو بێجگە لە(نوح) و شوێنکەوتووەکانی هیچ ئادەمیەکی نەهێشتەوە!!

رَّبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيۡتِيَ مُؤۡمِنٗا وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارَۢا ﴿٢٨﴾

ئینجا لەگەڵ ئەو داوایەدا کە دووبارەی ئەکاتەوەو نزاکانی خۆی پێ‌دوایی هێناو لێرەشدا سوورەتەکەی پێ دوایی هات. لەگەڵ ئەو داوایەدا ئەم لاڵانەوە شیرینەی کرد: ﴿رَّبِّ ٱغۡفِرۡ لِي﴾ ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبەو ببورە لێم، ﴿وَلِوَٰلِدَيَّ﴾ وەلە دایك‌و باوکم، ﴿وَلِمَن دَخَلَ بَيۡتِيَ مُؤۡمِنٗا﴾ وەلە هەرکەس هاتبێتەماڵەکەم بەبڕواداری، ﴿وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ وەلە هەموو بڕواداران لەپیاوان‌و ئافرەتان لەهەر کات‌و چەرخێکدا.

نزاو پاڕانەوەکەی بۆ لێبووردنی خۆی شەرم‌و ئەدەبێکی خواناسی‌و پێغەمبەرێتی یە بەرانبەر خوای خۆی. شەرم‌و ئەدەبی بەندەیە لە حوزوری خوای پەروەردگاریا، بەندەیە کە خۆی ئەناسێ‌و ئەزانێ کە ئادەمی یەو هەرچەند گوێڕایەڵ‌و خواپەرست بێت هەڵەو کەم‌وکوڕی هەیە بەرانبەر بە خوا، هیچ کەس بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشت مەگەر خوا لوتف‌و بەزەیی بەکابێنێ لەگەڵی، وەکو پێغەمبەری گەورە موحەممەدی برای(ﷺ) فەرمووی: ئەمە ئەو داوای لێبوردنە بوو کە بانگی گەلە سەرکەشەکەی بۆکردو کەچی ئەوان نەیان کردو لە دەست خۆیان دەرکرد. وە ئەم کە پێغەمبەرە لەپاش ئەو هەموو تێکۆشان‌و سزاو ئازارو مەینەتە کە چەشتی لەڕێگای خوادا داوای لێبوردن ئەکات! بەندەی خواناس ئەبێ وابێ‌و خۆی بناسێ‌و خوای خۆی بناسێ.

پاڕانەوەی بۆ باوك‌و دایکی بەکارهێنانی چاکەیەو هەڵسانە بە مافی باوك‌و دایکی موسڵمانی‌و بڕوادار، ئەگەر بڕوادار نەبوونایە تەمێ‌و ئامۆژگاری ئەکرا لەسەری هەرچۆنێ لەبارەی داوای لێبوردن بۆ کوڕە بێ‌بڕواکەیەوە گلەیی هاتە سەرو تەمێ کرا لەلایەن خواوە(وەك لە سورەتی هودا تێ‌پەڕی کرد). داوای تایبەتی بۆهەرکەس چووبێتە ماڵەکەی بە بڕواداری لەبەر هەڵسانیەتی بە چاکەکردن‌و مافی برایەتی بڕوادار لەگەڵ بڕوادارا، لەبەر ویستنی خێرو خۆشی یە بۆ برای بڕواداری هەرچۆنێ بۆ خۆی ئەیەوێ، وەتایبەتی کردنی بە چوونی ماڵەکەیەوە ئیتر مەبەست بەو ماڵە خانوو و جێگای نیشتەجێ‌ی بێت یا کەشتی یەکەی یا هەرچی.. لەبەر ئەوەیە ئەو چوونە نیشانەی ڕزگار بوون بووە، وە لەبەر دیاری کردنی بڕوا دارانی ئەو کاتە بووە، داوای بەشێوەی گشتی بۆ بڕواداران لە هەر چەرخ‌و وڵاتێ

لەپێش‌و لەپاش خۆی لەبەر هەڵسانە بە چاکەو مافی هەموو بڕواداران. لەبەر هەست کردنە بەو پەیوەستی‌و نزیکی‌و خزمایەتی یە کە ئەبێ ببێ لە ناوەندی هەموو بڕواداراندا، بە درێژایی چەرخ‌و بە قوڵی‌و پانی وڵات‌و ئادەمی.

ئەوەیە پیت‌و فەڕو بەرهەم و دەست کەوتی نایاب لە عەقیدەو ئایینی خوادا، ئینجا بەرانبەر بەو پەیوەستی‌و خۆشەویستی یە ئەبێ دووری‌و نەویستن ببێ لە ستەم کاران‌و دوژمنانی خوا، کەواتە زۆر بەجێ‌یە لەپاش پاڕانەوەو لاڵە بۆ بڕواداران فەرمووی: ﴿وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا﴾ وە ستەم کارە بێ‌بڕواکان هەر لەناو چوون‌و لەڕیشەهێنان، یان زیان باری یان بۆ زیاد بکەو هەر ئەوە بکە بە بەشیان.

سورەتەکە دوایی هات، وێنەو شێوەیەکی ڕووناک‌و شیرینی تێکۆشانی(نوح) پێغەمبەری (علیە السلام) نیشان دا لەگەڵ وێنەو شێوەیەکی ڕەش‌و تاریکی ستەم کارەکان. ئەم دوو وێنەو شێوەیە خۆشەویستی‌و ڕێزێکی گرنگی فەراهەم هێنا لە دڵ‌و دەروونا بۆ ئەو پێغەمبەرە پاکە، سەرسوڕمان لەو کۆڵنەدان‌و تێکۆشانە بەرزە، بەڕاستی بیرکردنەوە لەو وێنەو شێوەیانە دڵ بەهێز ئەکات‌و توێشووی تێرکەری ئەدا بە ڕێبواری ئەو ڕێگا سەخت‌و درێژە، بەڕاستی قورئان شیرینی فەرموو: ﴿لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾

**وصلی اللە وسلم علی من أنزل علیە هذا القرآن العظیم**

الحمد للە خوا یارمەتی دام لێ بوومەوە لە تەفسیری ئەم سورەتە بەفەڕە لە ٢٠/٤/ ١٤٠٣ بەرانبەر ١٩٨٢/٣/٢
وە هەر لەم ڕۆژەدا دەستم کرد بە تەفسیری سورەتی(الجن) خوا یارمەتیم بدات بۆ تەواو کردنی ئەم تەفسیرەو وەریشی گرێ. آمین

## سوورەتی(الجنّ)

## مەککەیی یەو ژمارەی ئایەتەکانی(٢٨)ە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە هەر کات بە ئاهێستەو لەسەر خۆو هێواش‌و بە بیرکردنەوە بخوێنرێتەوە، دەنگ‌و ئاوازەیەکی تایبەتی ئەداتەوە لە دەروونا، لەگەڵ گەیاندنی بۆن‌و هەناسەی پەژارەیی‌و دڵغەمگینی‌و بەزەیی بەخۆهاتنەوەدا، بەتایبەتی لەپاش بەشی یەکەمی‌و لێبوونەوە لە گێڕانەوەی قسەو وتاری جنۆکە، لەکاتێکا کە ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) هەست ئەکات بە خۆشەویستی‌و سۆزو بەزەیی هاتنەوەی بە پێغەمبەردا(ﷺ) لەکاتێکا کە فەرمان ئەدرێت پێی بە ڕاگەیاندن‌و جاڕدانی خۆ ڕووت کردنی لە هەموو شتێ، لەبارەی کارو باری ئەم بانگ‌و بانگەوازەیەوە بێجگە لە ڕاگەیاندن‌و بێجگە لە چاودێری خوا.

لە پاش ئەوە ئینجا باهەر لەسەرەتاوە بزانرێ کەئەم سوورەتە چەند مەبەست‌و شتی گرنگ پێشان ئەدات: لەیەکەم جارەوە شایەتی دان لەلایەن تیرەیەکی تری جیاوازەوە واتە – جنۆکە– لەسەر زۆر لە مەسەلەی عەقیدە کەبت پەرستەکان دانیان پیا نەئەنا‌و زۆر بەتوندی دەم بازی‌و بەربەرەکانیان تیا ئەکردو لەخۆوە بەدەم بڕیاریان تیا ئەدا بەبێ بەڵگەو ڕابەرێ، لەهەندێ کاتدا لایان وابوو ئەیان گوت: محمد ئەمەی ئەیلێ لە(جن)ـەوە وەری ئەگرێ! ئینجا ئەوا(جن) خۆیان شایەتی ئەدەن لەسەر ڕاستی ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەیلێ، وە شایەتی ئەدەن لەسەر دەلەسەی بێبڕواکان‌و ئەیان خەن بەدرۆوە لەو قسە بێ نرخەیشیان کە ئەڵێن: محمد شت لە(جن) وەرئەگرێ. وە(جن) ئاگایان نەبووەو بێ خەبەر بوون لەم قورئانە تاکاتێ بیستیان لە پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا کەبیستیان دای چڵەکاندن‌و سەرسامی کردن‌و بە جۆرێ بوو بە دەنگ‌و باس لەناویانا‌و بەسەرسامی یەوە باسی ئەم ڕووداوە گەورەیان ئەکرد، کە ئاسمان‌و زەوی‌و ئادەمی‌و جنۆکەو مەلائیکەی خەریك کردووە، ڕێگای ئاسمانی لێ گرتوون! ئەم شایەتی ئەوانە نرخێکی گرنگی بوو لەدڵی مەردوم دا.

ئینجا ئەم سوورەتە گەلێ بیرو باوەڕی پڕو پووچی بەدرۆ خستەوە لە بارەی جنۆکەوە، کە ئەو شتە پڕو پووچانە جێگیر بووبوون لەدەروونی ئەو یەکەم چینەی کە ئەم قورئانەی بیست بەتایبەتی و لەدەروونی خەڵکی تریش دا بەشێوەیەکی گشتی، وە ئەم تیرەیەی لە رادەو شوێنی ڕاستەقینەی خۆیان نیشان دا بەبێ زیادە ڕەوی و ناڕاستی و ناتەواوی.

عەرەبەکانی ئەو سەردەمە باوەڕیان وابوو کە(جن) دەسەڵاتی هەیەو کار بەدەستە لە زەوی دا، لەبەر ئەوە هەر کەسێ لەوان شەوی بەسەر بهاتایە لە دۆڵ و شیوێ یا لەچۆڵ و بیابانێ پەنای ئەبرد بە گەورەی جنۆکە کەلای وابوو کار بەدەستە لەوێدا، ئەی ووت: پەنا ئەگرم بە بەگەورەی ئەم شیوە کەبمپارێزێ لە نەفامەکانی گەلەکەی. ئینجا ئیتر بێباك شەوی بەسەر ئەبرد! هەروەها بڕوایان وابوو کە(جن) غەیب زانەو هەواڵی غەیبی ئەدەن بە کاهینەکان و ئەوانیش ئەو هەواڵانە ئەدەن. لەناویانا چەند کەسێ بوون(جن)یان ئەپەرست و لایان وابوو خوا ژنی لێ خواستوون و مەلائیکەی لێ بووەو لەبەر ئەوە ئەیان ووت: مەلائیکە کچی خوان! بڕوا بە(جن) بەو شێوەیە یا بە وێنەی ئەوە باوو بڵاوبوو لە هەموو سەردەمە نەفامیەکانا، هێشتا تا ئەمڕۆش چەند قسەو باس و شتی پڕوپووچ لەو جۆرانە هەن لەناو زۆر تاقم و وڵاتا! لەم کاتەدا کەلە کۆنەوە تا ئێستاش ئەو بڕوا پووچ و ناڕاستە بووەو هەر دروشمیشی ماوە ئێستا. لەم کاتەدا یە پێچەوانەوە تاقمێ تر هەن بەهیچ ڕەنگ دان نانێن بەبوونی جنۆکەدا، هەر قسەو باسێ لەبارەی(جن) و بوونی یەوە بکرێ بەلایانەوە دەلەسەو پڕو پووچە.

لەناوەندی ئەو دوو بڕواو بارە ناڕاست و نارەوایەدا ئیسلام بارو باوەڕی ڕاست و ڕەوا ڕوون ئەکاتەوە بەم جۆرو شێوەی کەلەم سوورەتەدا باس کراوەو لە غەیری ئەم سوورەتەدا.

ئەوەی لەم سوورەتەوە وەرئەگیرێ ئەم چەند خاڵانەیە:

أ- (جن) هەیەو بوونی ڕاستە.

ب- چاکیان هەیە خراپیان هەیە، گومڕای گومڕاکەریان هەیەو گومڕای سادەو نەفامیشیان هەیە.

ت- دەست ئەدەن بۆ ڕێنومایی و ڕزگاربوون لە گومڕایی و دەست ئەدەن بۆ وەرگرتنی قورئان و تێگەیشتن لێ ی و سوود لێ وەرگتنی.

پ- دەست ئەدەن بۆ تۆڵە لێ سەندن و پاداش دانەوە وەك ئادەمی.

ج- ناتوانن هیچ کەڵك و سوودێ بگەیەنن بە هەرکەس پەنایان پێ ببەن، بەڵکو زیاتر ناڕەحەت و بێ ئارامی ئەکەن.

ح- بە هیچ ڕەنگ غەیب زان نین.

خ- لەپێشەوە پەیوەندی و هات و چۆیان بووە بۆ ئاسمان و گوێیان لە مەلائیکە ئەگرت، لە پاشان پەیوەندی یان نەما و بەرگری کران لەچوون و گوێ گرتن.

د- بەهیچ ڕەنگ خزمایەتی و ژن لێ خوازراوی و دەست و پەیوەندی یان نی یە بەخواوە.

ژ- بەهیچ ڕەنگ هێزو تەوانایان نی یە لە بەردەم هێزو تەواناى خوادا.

ئەم سوورەتە بە ڕێکی بوونی ئەو تیرەیەی ڕوون کردەوە زۆر لە سیفەتەکانی دەرخست، لەهەمان کاتا ئەو بڕوا پڕو پووچانەی کە هەبوو لە دەروونی ئەوانا بە ناڕاست و ناڕەوای دەرکردن. دەروونی موسڵمانی ڕزگار کرد لەو شتە بێ‌نرخ و دەلەسانە، هەروەها ڕزگاریشی کرد لەدان نەنان و بڕوا نەکردن بەبوونی ئەو تیرە گەورە و گرنگە.

هەروەها ئەم سوورەتە بڕوای ناڕاستی بت پەرستەکانی عەرەبی ڕاست کردەوە، کەبڕوایان وابوو جنۆکە کارو کردەوەو هێزو دەسەلاتیان هەیە لەم بوونەوەرەدا. بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان نی یەو دان نانێن بەبوونی جنۆکەدا. بڕوا بەبوونیان بە نەفامی و نەزانی دائەنێن و لاقرتی ئەکەن بە کەسێ کەبڕوای بەبوونی ببێ، نازانین پاڵ پێوەنەرو پاڵپشتی ئەوانە چی یەو لەسەر چ بنەڕەتێ ئەو بڕوای ئەوانە دامەزراوە؟!

ئایا ئەوانە هەرچی دروست کراو هەیە لەم بوونەوەرەدا هەموویان ناسی، ئینجا جنۆکەیان نەدی لەناویانا؟ بێ‌گومان هیچ کەس لە زانایان تا ئەمڕۆ هیچ کام لەم دووبارە نالێ، چونکە هەر لەم زەوی دایە بەتەنها زۆر لەزیندوو زیندەوەری تیایە ڕۆژ بەڕۆژ

ئەدۆزرێنەوەو دەرئەکەون، هیچ کەس ناتوانێ بڵێ: هەرچی دۆزراوەتەوە تا ئێستا هەر ئەوە هەیەو ئیتر هیچ نەماوە دەرکەوێ.

هەروەها چەند هێزی شاراوە بووەو هەیەو ڕۆژ بەڕۆژ دەرئەکەون ڕێیان پێئەبرێ‌و لەمەو بەر نەناسراو بوون‌و ئەگەر کەسێ بیوتایە هەن لاقرتی یان پێ ئەکردو بەشێت دەرئەکرا. زاناکان زۆر سوورن‌و بەگرنگی ئەیانەوێ هێزە بوونەوەری یەکان بناسن‌و بیاندۆزنەوە، لەگەڵ ئەوەدا هەر لە ڕێگای زانیاری یەوە بۆیان دەرکەوت‌و بێ گیروگرفت ئەڵێن: کە هێشتا وەستاون لە قەراغی نەناسراوو نەزانراوەکانی ئەم بوونەوەرەدا، هێشتا دەستیان بەهیچ نەکردووە!

ئایا ئەوانە کە دان نانێن بەبوونی جنۆکەدا ئەو هەموو هێزانەیان دیتووە کە بەکاری ئەهێنن‌و بەرهەمی وەرئەگرین، ئینجا جنۆکەیان نەدی لەناویانا، لەبەر ئەوە ئەڵێن نی یە؟! ئەمەش نی یە، ئەوەتا کارەبا کە هەمیشە باسی ئەکەن‌و ژیانی کامەرانی ئەمڕۆی لەسەر وەستاوە، هیچ کەس لەوانە نەیان دیووەو هەر کەس هەوڵ بدا بۆ دیتنی بەشێت دائەنرێ!

کەواتە لە چی یەوەو لەبەرچی ئەوانە ئەڵێن: جنۆکە نی یە؟ ئایا هۆی باوەڕ نەبوونیان ئەمەیە کە قسەی پڕوپووچ‌و دەلەسەی زۆرو زەبەنە وتراوەو کراوە لە بارەی جنۆکەوە؟ بێگومان ئەو قسە پڕوپووچانە فڕێ بدەین‌و بەو شێوەی کە قورئان ئەفەرموێ بۆیان بچین‌و تێیان بگەین. نەك یەکسەر بدەین لێی‌و کەشخە بکەین بەبڕوا نەبوون پێی، بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەو ڕابەرێکمان بەدەستەوە بێ لەسەر نەبوونی!

هەر کەس ڕێزی ژیری خۆی بەلاوەبێت لە خۆیەوە دەم.ناکوتێ لەم شتە غەیبی یانە، بەڵکو وەریان ئەگرێ لەم سەرچاوە تاقانە کە جێگای باوەڕو دڵنیایی یەو دژی ئەم سەرچاوە ناجوڵێتەوە بەهۆی چەند بۆ چوونێکی هەڵە کەلەم سەرچاوەیەوە وەرنەگیراون.

ئەم سوورەتە زیاد لە گەیاندنی ئەوەی کە باس کرا زۆر شتی گرنگمان نیشان ئەدات لەبارەی عەقیدەی پاك‌و خاوێنی ئیسلامەوە، وەکو بەدرێژی پێیان ئەگەین بەیارمەتی خوا.

لەیەکەم جارەوە دەست نیشان ئەکات بۆ ڕووداوێکی گرنگ، ڕووداوی گوێ گرتنی چەند کەسێ لەجنۆکە لەقورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی کاتو جێو شوێنو چۆنێتی ئەم ڕووداوە چەند ڕوایەتێ هاتووە وەك لە سوورەتی(الاحقاف)دا باسمان کرد، لەناو ئەو ڕیوایەتانەدا ڕیوایەتێ هەڵ ئەبژێرین کەلە چەند ڕێگایەکەوە ئەچێتەسەر(ئیبنو عەباس) –خوا لێی ڕازی بێت– و لە کتێبە باوەڕ پێکراوە کانیشا هەیە. یەکێ لەوانە کتێبی(دلائل النبوە)ی (ئیمامی بەیهەقی) کە هەواڵەکە ئەمێنێ لە(سەعیدی کوڕی جوبەیر)ەوەو ئەویش لە(ئیبنو عەباس) ەوە –خوا لێی ڕازی بێت– کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ چەند کەسێ لە هاوەڵانی ئەچن بۆ بازاڕی عەکاز(سوق العکاظ)، لەو سەردەمەدا تازە جنۆکە بەرگری کرابوون لە هەواڵ وەرگرتن لە ئاسمانەوە، ئینجا ئەو بەرگری کراوانە گەڕابوونەوە بۆ ناوی تیرەی خۆیان، ئەوانیش ئەڵێن: دەنگو باستان چی یەو چیتان بەسەر هاتووە؟ ئەمانیش ئەڵێن: بەرگری کراین لە گوێ گرتن لە هەواڵی ئاسمانو ئاگر کرا بەسەرمانا. ئەوانش ئەڵێن: ئەو بەرگری کردنەتان ئەبێ بەهۆی ڕووداوێکەوەبێت، کەواتە بڕۆن بگەڕێن بە هەموو ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوای زەوی دا، بگەڕێنو سەرنج بدەن تا بزانن هۆی ئەو بەرگری یە چی یە؟ ئەمانیش ئەڕۆن ئەگەڕێن ئەگەڕێن بە وولاتان دا.

ئینجا ئەو چەند کەسە بەرەو(توهامە) دێنو لە(نەخلە)دا ڕێیان ئەکەوێ لە پێغەمبەر(ﷺ) خەریکی نوێژی بەیانی یەو پێش نوێژی ئەکات بۆ هاوەڵەکانی، ئینجا کە گوێیان لە قورئان خوێندنی ئەبێ گوێ ئەگرن لیّ ی، ئینجا ئەڵێن: لە خوا ئەمەیە بووە بە بەرگری کەرتان لە وەرگرتنی هەواڵی ئاسمان، ئینجا لەوێدا ئەگەڕێنەوە بۆلای گەلەکەیانو ئەڵێن: بەڕاستی خوێنراوەیەکی نایابمان بیست کە ڕێنومایی ئەکات بۆ ڕێگای ڕاست لەبەرئەوە بڕوامان پێ‌هێناو هەرگیز هیچ کەس ناکەین بەهاوبەشی خوا. وەك لەدوا دوایی سوورەتی(الاحقاف)دا ئەفەرموێ: ئینجاخوای گەورەسورشی(وحی) کردە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو: ﴿قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا﴾ ئەوەی کە سروشی کرد بۆلای قسەی ئەو جنۆکانە بوو.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾

ئینجا با گوێ بگرین بۆ ئایەتە بە فەڕەکان ئەو هەواڵو باسانەمان بدەن بە گوێدا ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: وەحی(سروش) کرایە لام ﴿أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا﴾ کە چەند کەسێ لە جنۆکە گوێیان گرت لە قورئانێ کەمن خوێندم، ئەڵێن ئەوانە حەوت کەس بوون.

ئەم سەرەتایە وا نیشان ئەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی ئەو گوێ گرتنەدا، بێئاگابوون لەو گوێ گرتنو گوێ گرانە، تا ئەم هەواڵەی لە خواوە وەرگرت، ڕەنگە ئەمە یەکەم جار بووبێ، لە پاشا جارێ تر یا چەند جارێ تر کە پێغەمبەر(ﷺ) بە تایبەتیو بەحەزو ئارەزوی خۆی قورئانی خوێندبێ بەسەر جنۆکەدا. بەڵگە لەسەر ئەم جۆرە خوێندنەش حەدیسی(تیرمزی)یە کە ئەیهێنێ لە(جابر)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ناو هاوەڵەکانیو سوورەتی(الرحمن)ی بەسەرا خوێندن تا دواییو ئەوانیش بێدەنگ بوون، ئینجا فەرمووی ئەم سوورەتەم خوێند بەسەر جنۆکەداو ئەوان وەڵامو هەڵوێستیان شیرین تربوو لە ئێوە هەر جارێ کە ئەم ووت: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ ئەوان ئەیان ووت: لابشیو من نعمك ربنا نكذب، فلك الحمد.

بێگومان ئەم ڕووداوەی ئێرە لەگەڵ ئەوەی سوورەتی(الاحقاف)دا یەکێکە. چونکە لە هەردوولا یەك مەبەست نیشان ئەدەنو یەك شێوەیان هەیە، لەهەر دولا وەرئەگیرێ کە ڕووداوێکی کوتو پڕیو لەناکاو بووە، وە لەهەردوولا وەرئەگیرێ کە قورئان کاری لێ کردنو سەرسام بوون لێیو بەبڕوایەکی بەهێزەوە گەڕانەوە بۆ ناو گەلەکەیانو بڕوا هێنانی خۆیان دەربڕی، وەکو لەوێ بەڕوونی باسی کردو لێرەش ئەفەرموێ: ﴿فَقَالُوٓا۟﴾ ئینجا ئەو گوێ گرانە هەواڵیان دابە گەلەکەیانو ووتیان: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا﴾ بەڕاستی ئێمە خوێندراوێکی نایابو

سەرسوڕهێنەرمان بیست، واتە جیاوازبوو لەبیستراوی ترو وێنەی هیچ ووتراوو بیستراویتر نەبوو. یەکەم شت کە وەریانگرت لەم قورئانە ئەوە بوو کە نایاب و نەبیستراوەو مەردوم سەرسام ئەکات، بەڕاستی هەرکەس بە ووریای و تێگەیشتن و دڵێکی کراوە گوێ بگرێ لەم قورئانەو وەریگرێ هەست ئەکات بەوە کەئەمە شتێکی جیاوازەو وێنە هیچ ووتراوو بیستراوێ تر نی یەو شتێکی زۆر نایابە، زۆرو دەسەڵاتێکی تایبەتی هەیە بەسەر دڵ و دەروونا، کەواتە دەرئەکەوێ کەئەو کۆمەڵە ووریا و تێگەیشتوو بوون و ڕاستیان چەشت.

دووەم شت ئەمەبوو ﴿يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ﴾ ڕێنموونی بۆ ڕاست و ڕاستی و ڕێگای ڕاست بەرێکی و تەواوی. قورئان ئەو ڕێنموونی یە ئەکات بەهۆی ئەوە کە هەست و کرانەوە لە دڵدا فەراهەم ئەهێنێ و قاپی تێگەیشتن و ناسین و زانینی لێ ئەکاتەوەو پەیوەستی ئەکات بەسەرچاوەی ڕووناکی و ڕێنوماییەوە. هەروەها بەرهۆی ئەو بەرنامەی کە ڕێکی خستووە بۆ ژیان و گۆڕانی باری ژیان ئەو بەرنامەی کە ئادەمێتی هەرگیز وێنەی نەدیتووە بەرێژایی تەمەنی خۆی، لە ژێر سایەی ئەم بەرنامەدا گەیشتە ڕادەو پلەیە کەپێی نەگەیشت لەسایەی هیچ بەرنامەو هیچ شارستانیەکی ترا. ﴿فَـَٔامَنَّا بِهِۦ﴾ بەهۆی ئەوە بڕوامان پێ‌هێنا.

ئەم قورئانە بەو جۆرە کاری کرد لەو کۆمەڵە تێگەیشتووەو بەو شێوە چوون بەپیریەوە، بەپێچەوانەی سەرکەشە بت پەرستەکان کە ئەتاران لێی و هیچیان لێ نەئەمایەوە، ئەیان ووت ئەمەی لە(جن) وەرگرتووە، دەی ئەوان قورئان بەدرۆیان ئەخاتەوەو دەم کوتیان ئەکات، بەبڕوا هێنان و ملکەچی جنۆکە بۆئەم قورئانەو خۆ دوورخستنەوەو بێزاریان لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا، ئەوەتا لەپاش جاڕدانی بڕواهێنان ووتیان: ﴿وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا﴾ هەرگیز هیچ کەس ناکەین بە هاوبەش بۆ پەروەردگارمان، کەواتە بڕوا هێنانەکەیان پاک و پاڵفتە بووە لە هەموو چڵک و چەپەڵی و تێکەڵ نەبووە لە شتی پڕو پووچ، بەڵکو بڕوایە بوو کە هەڵقوڵا لەتێگەیشتن و وەرگرتنی قورئانەوە، بڕوایە بوو کە قورئان بانگی بۆ ئەکات، بڕوا بەتاک و تەنهایی خوا بەبێ وێنەو هاوبەش. خوای گەورە سیازدە شتی گێڕایەوە لەو کۆمەڵە جنۆکەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم ئەو هەواڵەبوو کە تێپەڕی کرد.

**دووەم: ﴿وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا﴾ وە بەڕاستی گەورەیی و دەسەلاتی پەروەردگارمان بەرزو بلندو بێ پێویستە ﴿مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً﴾ لەوەی ژنو هاوسەر ڕاگرێو بۆ خۆی ڕەوای دابێ واتە شتی وا ناگونجێو نەی کردووە ﴿وَلَا وَلَدًا﴾ وە نە ڕۆڵەو ئەولادیشی بۆ خۆی ڕەوا داوە، بەرزو بێ پێویست ترە لەوەی شتی وا ڕەوا بدا، عەرەب لە پێش ئیسلامدا لایان وابوو کە مەلائیکە کچی خوانو لایان وابوو ژنی لە جنۆکە خواستووە! ئینجا ئەوا جنۆکە خۆیان ئەو قسە پڕوپووچە ئەخەنەوە بەدرۆوەو خوا بە پاكو خاوێن ڕائەگرن لەوە!**

**بێگومان ئەو شتە ناڕەوایە ئەگەر لەوانەبوایە بگونجایەو بەهەر جۆر بچەسپایە شایستەبوو بۆ جنۆکە شانازی بکەن بەو قسەو بەهەرجۆر هەوڵ بدەن بۆ چەسپاندنی، بەڵام ئەوان وەك ئەو بت پەرستانە نەفامو نەبوون، ئەیانزانی بەهیچ کلۆج ئەو قسە ڕێگای نابێتەوە لەناو قسانا و هیچ ژیریە وەری ناگرێ، بەڵکو هەرکەس ڕێزی ژیری خۆی بەلاوە بێتو دەربەستی ئابڕوی خۆی بێت قسەی وا ناکات، لەبەرئەوە بەو شێوە زۆر گرنگە ئەو قسەو باوەڕە ناڕاستو ناڕەوایەیان دوورخستەوە، کەواتە ئەوەی کە ئەو کۆمەڵە ووتیان وەك صاروخو بۆمبایەکی گەورەبوو بۆ بۆردومانی ئەو تێکەشتنو بۆچوونە ناڕاستەو هەر بۆچوونو تێگەشتنێکی ناڕەوای تر، وەك ڕەوا دانی منالو ئەولاد بەهەر جۆرو شێوەیەك بۆ خوای گەورە!!**

**سێیەم: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا﴾ وە بڕوامان هێنا کە نەفاممان(واتە شەیتان) یا(بێبڕوامان) قسەی دوور لەڕاستیو لە سنوور دەرچووی ئەکرد دەربارەی خوا و شتی ناڕاستو نا شایستەی ئەبڕی بەسەر خوادا، بەم ڕەنگە ژنو منالی بۆ ڕەوا ئەدا، واتە بەهۆی گوێگرتنمان لە قورئان بۆمان دەرکەوت ناڕاستیو خراپی ئەوەی کە نەفاممان ئەی ووت، ئێمەش بەنەزانی دوایان کەوتین، هۆی هەڵەو خەڵەتانیان ئەمە بوو لەم چوارەمەدا!!**

وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾

---

**چوارەم:** ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ بەڕاستی ئێمە گومانمان وابوو کە هەرگیز ئادەمی و جنۆکە لەبارەی خواوە درۆناکەن و شتی درۆ نابڕن بەسەر خواداو بۆی ڕەوا نادەن، واتە نەفام و بێبڕوا هاوبەش و ژن و منالّی بۆ خوا ڕەوائەداو ئێمەش لامان وابوو کە هیچ کەس ناتوانێ شتی ناڕاست و ناڕەوا بۆ خوا دابنێ لەبەرئەوە دوایان کەوتین لەو شتە ناڕاشت و پڕو پووچانەدا، تا بەهۆی قورئانەوە ڕێگای ڕاستمان دۆزیەوەو دامانە بەر.

لەم قسەیانەوە دەرئەکەوێ کە هەستێکی پاکیان بووەو خوای خۆیان زۆر بەگەورە گرتووە، لەڕووی نەزانیەوە دووچاری شوێن کەوتنی بێبڕواکان بوون. ئەبێ ئەو هەستە پاکە شایانی بڕواهێنانی کردبێ بەهۆی گوێگرتنیان لەو قورئانەی کە بیستیان. بەڕاستی زۆر شایان بوو بۆ هەڵخەڵەتاوەکانی قوڕەیش چاویان بکردایە لەم کۆمەڵە جنۆکەو ئەوانیش هەڵگەڕانایەتەوە لە شوێنکەوتنی کوێرانەی گەورەو سەرۆکەکانیان، بێگومان گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە تەمێ و ڕێگا نیشان دانێکی ئاشکرا بوو بۆیان.

لە سەرەتای سورەتەکەوە باسی بڕواو باوێکی سەردەمی نەفامیمان کرد کە لایان وابوو جنۆکە دەسەلآت دارە بەسەر ئەم جیهان و ئادەمی یەداو هەر ناوچەو وڵاتێ دراوەتە دەست تاقمێ، لەبەر ئەوە هەرکەس بمایەتەوە لەشوێنی چۆڵ پەنای ئەبرد بە گەورەی ئەو شوێنە بۆئەمەی بیان پارێزێ لە نەفامەکانی ئەو شوێنە، جا ئەوا لێرەدا دەست نیشان ئەکات لەلایەن ئەو تاقمەوە، بۆ ئەو باوو باوەڕە ناڕەوایە لەم خاڵی پێنجەمەدا.

**پێنجەم:** ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾ بێگومان چەند پیاوێ لە ئادەمی پەنایان ئەبرد بە چەند پیاوێ لە(جن) ﴿فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ ئینجا پەنا پێبراوەکان گومڕایی و بێئارامی و سەرگەردانی پەنابەرەکانیان زیاد ئەکرد. شەیتان زاڵە بەسەر دڵی ئادەمی دا بێجگە لەوانەی خوا پەنای داون و پاراستوونی، هەرکەسێ ژێری هەبێ بەتەمای هیچ خێرێ نابێ لە شەیتان، چونکە دوژمنێکی ڕاستەقینەیەو کەمەری دوژمنایەتی بۆ بەستووە لە یەکەم باوکەوە کە ئادەمە، بەڵکو بێئارام و سەرگەردانی ئەکات. چونکە دڵ هەرکاتێ پەنای برد بۆ غەیری پەروەردگاری ئەبێ هەر بەشی بێئارامی و سەرگەردانی و دانەمەزراوی بێت.

وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَـٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا
شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَـٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾

---

**شەشەم: ﴿وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ﴾ وە ئەو پەنابەرانە گومانیان ئەبرد،هەرچۆنێ ئێوە گومانتان ئەبرد ﴿أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا﴾ کە هەرگیز خوا هیچ کەس ڕەوانە ناکات بە پێغەمبەرێتی، کەچی ئەوەتا خوا پێغەمبەرێکی ڕەوانە کرد بەم قورئانەوە کە ڕێنموونی ئەکات بۆڕێگای ڕاست، یا گومانیان ئەبرد هەرچۆنێ ئێوە گومانتان ئەبرد، کە خوا هیچ کەس زیندوو ناکاتەوەو حیساب و پرسیار نابێ، لەبەرئەوە کردەوەیەکیان نەکرد بۆ ڕۆژی دوایی یان و بڕوایان نەهێنا بەوەی پێغەمبەر بۆی هێنان.**

**هەردوو گومانەکە ناڕاست و ناڕەوایەو نەفامی و نەزانی و تێنەگەیشتنە لە کاردروستی و لێزانی خوا لە دروست کردنی ئادەمی دا. خوای گەورە ئەم ئادەمی یەی دروست کرد بە ئامادەیی و لێهاتنی بۆ چاکە و خراپەو ڕێگای ڕاست دانە بەرو گومڕایی(وەك بۆمان دەرکەوت لەم سوورەتەوە کە جنۆکەش لەسەر ئەم سروشتەیە بێجگە لەوانەیان کە لێبڕاون بۆ خراپەی ڕووت وەکو شەیتان کە دەرکرا لە بەزەیی خوا بەهۆی خراپی خۆیەوەو سەری لە خراپی ڕووتەوە دەرچوو و ئامادەیی بۆ خێرو چاکەی تیا نەما) جا لەبەر ئەوە خوای میهرەبان ویستی یارمەتی و کۆمەکی ئادەمی بکات بە پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێ- کە بەشی خێرو چاکەکەیان بهێننە جۆش و پەرۆش و ئامادەیی یان بۆ چاکە بپارێزن و بیخەنە ئیش کەواتە زۆر نەفامی یەگومان بردنی ڕەوانە نەکردنی پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێ- چونکە ئەو گومانە دژو پێچەوانەی بڕوایە بە میهرەبانی و بەزەیی بێسنوری خوا، هەروەها زیندوو کردنەوەی مردووەکان و حیساب و پرسیارو پاداش و تۆڵە شتێکی زۆر پێویستەو نەبوونی پێچەوانەی کاردروستی و لێزانی و دادپەروەری خوایە، هەرکەس بێبەش نەبێ لە تێگەیشتن و ژیری زۆر بە گونجاوو پێویستی سەیر ئەکات.**

ئا بەو جۆرە ئەو تاقمە خەریك بوون لەگەڵ گەلەكەیانا بۆ ئەمەی گومانە ناڕەواكانیان دوور خەنەوەو بیرو باوەڕی ڕێك و ڕاست لە دڵو دەروونیانا بچەسپێنن، قورئانیش ئەوانەیان لێ ئەگێڕێتەوە بۆ پاك كردنەوەی مێشكی بێبڕواكان لە شتی پڕو پووچ.

ئینجا ئەو تاقمە هەروەها چیان ئەزانی لەبارەی ئەم پەیام و پێغەمبەرێتی یەوە باسیان ئەكرد بۆ گەلەكەیان، بۆئەمەی هەرشتێ نارێك و نەگونجاو بێت لە گەڵی ڕوونی بكەنەوە بۆیان. لەم ئایەتانەی كە دێن و چەند ئایەتێ تر لەسوورەتەكانی ترا وا دەرئەكەوێ كە(جن-پەری) لە پێش ئەم پەیام و پێغەمبەرێتی یەدا ویستوویانەو هەوڵیان داوە بگەن بەئاسمان و بەهۆی ئەو دەنگ و باس و هەواڵێ وەرگرن لەوەی لەناو مەلائیكە(فریشتە)دا باس ئەكرێ، لەبارەی كارو باری دانیشتوانی ئەم زەوی یەوە كەسپێرراوە مەلائیكە جێبەجێ كردنی، ئینجا ئەوەی كەوەری ئەگرن تێكەڵی دەلەسەی زۆری بكەن و ئینجا بیگەیەنن بە(كاهن) و(عراف)ەكان و ئەوانیش بڵاوی بكەنەوە بەناو خەڵكا، تا بەهۆی ئەوە بەد گومان و بەد عەقیدەیان بكەن بەپێی ئەو بارو نەخشەی كە شەیتان دایناوە.

ئینجا با گوێ بگرین لەم خاڵە كە ئەو تاقمە ئاڕاستەی گەلەكەی خۆیان كرد لەم بارەیەوە كەبەكەمیان حەوتەمی ئەو سیازدە خاڵەیە كە خوای گەورە سروشی كردە لای پێغەمبەر(ﷺ) لەم سوورەتەدا.

حەوتەم: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ﴾ وە ئێمە لەمەوبەر نیازی چوونی ئاسمانمان كردو چووین ﴿فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ ئینجا ئاسمانمان بینی پڕ كرابوو لە پاسەوان و پاسداری بەتین و چەخماخەی ئاگرینی زۆر، بەهۆی ئەوە ڕێگای چوون و گوێ گرتنمان لێ بەسرا.

هەشتەم: ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ﴾ وە ئێمە لەوەوبەر دانیشتن لە چەند جێگای دانیشتن دا بۆ گوێگرتن، نە پاسەوان و نە چەخماخەو ئاگر بەرگری نەئەكردین، بەڵام ﴿فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْءَانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا﴾ هەركەس ئێستە گوێبگرێ ئەبینێ و دەستی ئەكەوێ پارچە ئاگرێ كەبۆی ئامادەكراوەو والە كەمینا بۆی، ئەكەوێ بەسەریا ئەی كوژێ، واتە ئەوسا شوێن چۆڵ بوو ئێستە دەستمان ناكەوێ و هەمووی پڕكراوە.

(ئیمامی ئەحمە)و(تیرمزی)و(نەسائی) حەدیسێ ئەهێنن لە(ئیبن و عەباس)ـەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ: شەیاتین چەند شوێنێکیان بوو تیا دائەنیشتن لە ئاسمان گوێیان تیا ئەگرت لەسروش(وحی) کەلەناو مەلائیکەدا باس ئەکرا، ئینجا کاتێ وشەیەکیان ببیستایە نەوەدو نۆیان لێ زیاد ئەکرد، ئینجا ئەوەی ئەیان بیست ڕاست بوو، وە ئەوەی زیادیان ئەکرد درۆبوو، ئینجا کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانە کرا بەرگری کران لە جێگای دانیستنەکانیان، ئەوانیش ئەوەیان باس کرد بۆ شەیتانی گەورە کەناوی(إبلیس)ـە، لەوەو بەر لێیان نەئەدرا بە ئاگری ئەستێرەکان، ئینجا شەیتانیش پێی وتن: ئەمە ئەبێ بە هۆی ڕووداوێك بووبێ لەزەوی دا، ئینجا سەربازەکانی خۆی نارد بە وولاتانا، ئەوانیش کە گەڕان ڕێیان کەوت لە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی ئەکرد لەبەینی دوو شاخ لە مەککەدا، ئینجا گەڕانەوەو ئەو هەواڵەیان دایەو ئەویش ووتی: ئەمەیە ڕووداوەکەی ئەم زەوی یە.

نۆیەم: ﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِيٓ﴾ بێگومان ئێمە نازیانین ﴿أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ئایانیازی خراپەو شەڕ کراوە بەو کەسەی وا لە زەوی دا ﴿أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾ یا پەروەردگاریان نیازی نیازی خێرو چاکەی پێکردوون؟ واتە ئێمەی کۆمەڵێ جنۆکە نازانین خوا چی ئەکات بە دانیشتوانی زەوی‌و نازانین پرکردنی ئاسمان لە پاسەوان‌و چەخماخەی ئاگر بۆ بەرگری ئێمە نیازی شەڕی پێکراوە بۆ دانیشتوانی زەوی یا نیازی خێری پێکراوە بۆیان. یا مەبەست ئەوەیە جاڕی غەیب نەزانی بدەن لە خۆیان‌و بێئاگاییان لە بڕیارو قەزاو قەدەری خوا. جا بەوە دەم کوتی هەموو کاهن‌و عەراف‌و هەرکەس کە خۆی بە غەیب زان دانێ ئەکاتەوە، چونکە لە جێی جن(پەری) غەیب نەزانێ ئەبێ ئەوان لەکوێ بزانن. لە کاتێکا کە جن ئەکەن بەسەرچاوەی غەیب زانی یەکەیان.

ئینجا ئایا ئەو پاسەوانانە لەکوێدا ئەوەستن؟و ئەوانە کێن؟ چۆن ڕەجمی شەیتانەکان ئەکەن بەو پارچە ئاگرانە؟ هەموو ئەمانە شتێکی غەیبین‌و قورئان‌و فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونیان نەکردوونەتەوەو هیچ سەرچاوەیە ترمان نی یە بۆ زانینی ئەم جۆرە شتانە. کەواتە هەر هەوڵ‌و دەم کوتانێ بکرێ لەم بابەتانەوە بێ هودە دەرئەچێ‌و کات زایە کردنە. بەهیچ ڕەنگ ڕێگانی یە بۆ ڕەخنە گرتن‌و دەم بازی لەبارەی ئەو چەخماخانەوە، بەمەی ئەوانە ڕوو ئەدەن بەپێی یاسایەکی بوونەوەریی، وە لەپێش ڕەوانە کردنی

پێغەمبەردا(ﷺ) هەربوون، و بەپێی یاسایەکن کە زانایانی ئاسمانی هەوڵ ئەدەن بۆ ڕوون کردنەوەی، بە چەند تێڕوانینێ کە هەڵەیش ئەکەن و هەندێجار ڕێ ئەبەن بە مەبەستەکە. تەنانەت ئەو تێ ڕوانینەشیان ڕاست بێت هیچ ڕەخنەیان پێناگیرێ، چونکە هەموو شتێ و هەموو یاساو نیزامێ خوا فەراهەمی هێناوەو ژێر بارە بۆ دەسەلاًت و خواهیشی خوا، کەواتە با ئەوانە هەر بووبن و خوایش بەکاری نەهێنابن لە ڕەجم و کوشتن و سووتاندنی شەیتانەکانا. ئینجا کاتێ کە ویستی بەکاری بێنێ. ئایا ئەمە چی تیایەو کەی جێگای سەر لێ کردنەوەو سەر سووڕمانە؟!

ئەو کەسانەی کە ئەمانە ئەکەن بە چیرۆك بۆ پارێزگاری خوا بۆ قورئان لە تێکەڵ بوون و گۆڕانی بە هەر شتێکی ترو ئەڵێن: نابێ ئەمانە بەپێی دیمەن و ڕواڵەتەکەیان وەرگیرێن. هۆی ئەو جۆرە قسانە ئەمەیە ئەو کەسانە هاتوون بۆلای قورئان بەچەند بۆچوون و تێگەیشتنێك کە جێگیربووە لە دەرونیانا، وە ئەوانەشیان لەسەرچاوەی ترەوە وەرگرتووە، غەیری قورئان. ئینجا ئەیانەوێ تەفسیری قورئان بکەنەوە بەگوێرەی ئەو تێگەیشتن و بۆ چوونانەی خۆیان... جا بەو پێیە مەلائیکە ئەکەن بە چیرۆك بۆ هێزی خێرو گوێڕایەڵی و شەیتان بۆ هێزی شەڕو تاوان و سەرکەشی. ڕەحم کردن ئەکەن بە چیرۆك بۆ پاراستن... هتد چونکە ئەوان لە پێشەوە لەدڵیانا ئەمە جێگیرە کە مەلائیکەو شەیاتین و جین ناگونجێ زیندوویەکی زاناو لەش دارو هەستیارو خاوەن کرداربن! ئایا ئەمەیان لە کوێوە هێنا؟ ئایا لە کوێوە ئەم بڕیارانەیان هێنا کە ئەیانەوێ بیانکەن بەسەرچاوە بۆ قورئان و حەدیس و بەهەر جۆر بووە ئەبێ قورئان و حەدیس ڕێك خرێن لەگەڵیان؟!

بێگومان ڕێگای ڕاست بۆ تێگەیشتن و تەفسیری قورئان ئەمەیە مەردوم هەموو بۆچوون و تێگەیشتنی لەوەوپێش لە دڵ و دەروونی دەرکا، هەموو بڕیارو بیرو باوەڕی خۆی دامەزرێنێ بە پێی ئەوەی قورئان و حەدیس بۆ نەخشە ئەکێشن و ڕوونی ئەکەنەوە. جا ئەو کاتە بێجگە لە قورئان و حەدیس ناگەڕێ بە دوای هیچ شتێ تراو نایەوێ ئەمان ڕێك بخات لەگەڵ هیچ شتێ تردا. هەر شتێ قورئان و حەدیس ووتیان هەیە ئەم ناڵێ نی یەو هیچ پینەو پەڕۆو تەئویلی تیا ناکات، وە هەر شتێ قورئان و حەدیس ووتیان نی یە یا ناڕاستە ئەم ناڵێ هەیە یا ڕاستە. وە هەر شتێ ئەوان لێی بێ دەنگ بوون ڕێگای هەیە قسەی تیا بکات و ژیریی و بەراوورد کردنی خۆی تیا بخاتە کار.

ئەو کەسانەی بڕوایان هەیە بە قورئان بەرانبەر بە قورئان و حەدیس ئەبێ بەو جۆرە بن و هیچ ڕێگایەتریان نی یە. کەچی لەگەڵ ئەوەدا زۆر کەس هەن لە بڕواداران، قورئان و حەدیس لائەدەن لە دیمەن و ڕووالەتەکەی و چەند تەئویل و پینە پەڕۆ ئەکەن بەڵکو بەهەر جۆر بووە ڕێکیان ئەخەن بۆچوون و تێگەیشتنی مەردون دا!!

ئەو کەسانەی کە بڕوایان نی یە بەم قورئانە و دان نانێن بەهەر شتێك دا کە زانیاری ڕێی پێ نەبردووە، بەڕاستی ئەوانە جێگای سەرسوڕمان و زۆر شایستەی ئەوەن پێکەنین و لاقرتی یان پێ بکرێ، چونکە زانیاری بێئاگایە لە نهێنی و شاراوەکانی ئەم شتانەی وا لە بەردەستیا. ئەوانە کە خەریکن پێیانەوە و بەکاریان ئەهێنن لە بەراوورد کردندا. ئەو بێ ئاگایی و نەناسینە ئەوە نیشانە و بەڵگە نی یە لەسەر نەبوونی ئەو نهێنی و شارراوانە. بێجگە لەوەش زۆر لە زانایانی ڕاستەقینە بڕوایان هەیە بە نەناسراو و نەزانراو لەسەر ڕێگای زانیاری یەوە بۆیان دەرکەوت کە نەزانراوی زۆر و زەبەنە هەن لەو شتانەی کەلەبەر دەستیانایە و لەپێشەوە لایان وابوو کە لێ بوونەتەوە لە زانینی هەموو کاروباریان! بەهۆی ئەوە ملیان کەچ کرد پیاوانە و تێگەیشتن لە سنووری خۆیان و زانینیان، نەك وەك ئەوانەی کە لافی زانین و زانیاری لێ ئەدەن و خۆیان بەخاوەن بیری زانستی نیشان ئەدەن، لەوانەی کە بڕوایان نی یە بەنایین و هەر شتێ کە هەستی پێ ناکەن!!

بێگومان ئەم بوونەوەرە پڕە لەنهێنی یەکان، وە ناوەدانە بە چەند گیان و هێزو ووزە، ئەم سوورەتی(جن)ەو هەروەها چەند ئایەتی تر لە قورئان حاڵیمان ئەکات لە چەند بەش و ناوچەیەك لەشتە ڕاستەقینەکانی ئەم بوونەوەرە، کە یارمەتی دەرە بۆ داڕتنی بۆچوون و تێگەیشتنێکی ڕاست و ڕەوامان لەبارەی بوون و بوونەوەر و ئەو هەموو هێزو گیان و گیان لەبەرانەی کە شەپۆل ئەدەن بە دەورمانا، و ئیش کەرن لەگەڵ گیان و ژیانیانا، ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە کە موسڵمان جیا ئەکاتەوە و ئەیوەستێنێ لەناوەڕاستا بەبێ کەم و کوڕی و زیادە ڕەوی، نە بڕوای بەشتی پڕوپووچ و خەیاڵی هەیە و نەلافی درۆینە لێ ئەداو خۆی نەناسێ لە سنووری خۆی دا. سەرچاوەی ئەو تێگەیشتن و بۆچوونە ڕاستەش قورئان و حەدیسە. موسڵمانی ڕاستەقینە هەموو شتێکی ئەگێڕێتەوە بۆلای ئەم دووانە و هەموو شتێ بەم تەرازووە ڕاستە ئەکێشێ.

بێگومان ڕێگا و ماوە هەیە بۆ ژیری بگەڕێ و بڕوا بۆ دۆزینەوە و دەست خستنی نەزانراو و نەناسراو، بەڵام لەسنووری دیاری کراوی خۆیا و ئیسلام پاڵی پێوە ئەنێ بۆ ئەو

هەوڵ و گەڕانە. بەڵام زیاد لەو سنوورە تایبەتی یە ژیری ناتوانیّ و دەسەڵاتی نی یە بەسەر گەڕان و پەل کوتانا، ئەو توانین و دەسەڵاتەی پیّ نەدراوە چونکە پێویستی نی یە پیّی لە هەڵسان بەکارو فەرمانی جیّنشینی لەم زەوی یەدا، هەر شتێکیش پێویست نەبیّ مافی ئەوەی نی یە کۆمەکی بکریّ لە سەری و بیّ سوودو بیّ هودەیە ئەو یارمەتی و کۆمەکی یە، خوایش هەرگیز شتی بیّسوودو بیّ هودە ناکات، چونکە پێچەوانەی لیّ زانی و کار دروستی یەتی، جا لەو شتانەی کە پێویستی پیّی نی یەو تەوانایش نەدراوە بە ژیریی بەسەریان، زانین و ناسینی حەقیقەتی جین و شەیاتین و ڕۆح و ئەو جۆرە شتانەیە....

ئەو کەسانەی کە ڕێنومایی خوایان وەرگرتووە، بەرانبەر ئەو جۆرە شتانە ڕائەوەستن لەو سنوورەدا کە خوا بۆی دەرخستوون لە کتێبەکانیا و لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکانی –سەلامی خوایان لیّ بیّ– ئیتر خۆیان خەریك ناکەن لە خۆڕایی یە شتێکەوە کە لەسنووری ژیری یان بەدەرە. بەڵکو هەوڵ و تێکۆشان ئەکەن و ژیری بەخت ئەکەن لە دەرخستن و زانین و ناسینیّ کەلە تەوانایانا هەیەو ئامادەکراوە بۆیان لەم زەوی و جیهانەدا. ئەوەی کە زانیان و فێری بوون بەکاری ئەهێنن لە کارو بەرهەم و ئاوەدان کردنەوەی ئەم زەویەو هەڵسانیان بە جیّنشینی تیایا، لەسەر ڕێگاو ڕێبازی خوا.

ئەو کەسانەی کە ڕێنومایی خوایان وەرنەگرتووە بوون بە دوو بەشی گەورە: کۆمەڵ و بەشێکیان زۆر بە گرنگی تێکۆشانیان کردو ژیری خۆیان خستە کار بە هەمیشەیی لە زانین و ڕیّبردن بەو شتانەی کە بیّ سنوورن و لەسنووری ژیریی ئێمەدا نین، وەك تێگەشتن لە زاتی پاکی خواو سیفەتەکانی، هەروەها ناسین و تێگەیشتن لەنهێنی و غەیبیەکان لە غەیری ڕێگای خواو کتێبەکانی و لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکانی و لەناو ئەم کۆمەڵەدا چەند فەیلەسوفیّ هەن دەمیان کوتا لە زانین و ناسینی حەقیقەتی ئەم بوونەوەرەو چۆنیەتی پەیدابوونی و پەیوەندی و پەیوەستی بە خواوەو پەیوەندی و پەیوەستی نێوان بەش و پارچەکانی، ئینجا ئەوانە پێیان هەڵکەوت و هەڵخلیسکا بەوێنەی چەند منداڵێکی پیّنەگرتوو کە بیانەویّ سەرکەون بەسەر شاخێکی سەختا کە ئەوەندەش بەرزبێت بە هیچ ڕەنگ ڕۆپەی دیارنەبیّ!!

ئەوانە کە پیّیان ئەوتریّ فەیلەسووفە گەورەکان چەند قسەو بیروباوەڕێکیان هەیە زۆر جێگای سەرسوڕمان و مەردوم ئەهێننە پێکەنین، کاتیّ کە بەراوورد بکرێن لەگەڵ ئەو تێگەشتن و بۆچوونانەی کە قورئان دای هێنان، هیچ کام لەو فەیلەسووفانە نی یە وانەبن، چ فەیلەسووفە ئیغریقیەکان، وە چ فەیلەسووفە موسڵمانەکان کە شوێن ئەوان کەوتن و کتێبە

ئیسلامیەکان‌و مێشکی زۆر لە موسڵمانەکانیان پڕکرد لەو بیرو باوەڕو قسە پڕو پووچانە. وەك فەیلەسووفەکانی ئەم چەرخی تازەیە!

وە ئەو کۆمەڵ‌و تاقمەکەی تریان، نائومێدبوون لە نرخ‌و سوودی ئەو ڕێگا کە تاقمی یەکەم پیایا ڕۆیشتن، لەبەرئەوە لایان دا لێی‌و خۆیان یەك بار کردو لێ بڕان بۆ زانین‌و زانیاری لە ڕێگای تاقی کردنەوەو بەراوورد کردن‌و پێك هێنان، وە ڕوویان وەرگێڕا لەشتی نەبینراوو نەزانراو، چونکە خۆیان بەهیچ ڕێگایان پێ نەئەبردو شوێنی ڕێنومایی خوایش نەئەکەوتن، چونکە باوەڕیان بەخوا نەبوو، لەبەرئەوە بوون بە ماددی ڕووت! ئەم تاقمە لەچەرخی هەژدەو نۆزدەدا گەیشتە ئەو پەڕی ڕادەو پلەی، بیرو باوەڕەکەیان وەك هەوری تاریك‌و ڕەش خەریك بوو بەتەواوی ئاسمانی جیهان داگرێ، زانیاری کرا بە خوایەکی تازەو هەر ئەو ئەپەرسترا لەلایەن زۆربەی دانیشتوانی وولاتانەوە، بەڵام لەسەرەتای ئەم چەرخی بیستەمەوە بەرەبەرە هۆشی کردەوەو ئەو لەخۆگۆڕان‌و هەڵخەلەتاوی یەی بلێسەی کەم بووەوە، لە پاش پارەکردنی ئەتۆم‌و ون بوونی ماددە لەبەرچاو، بەهۆی گۆڕانی بەڕووناکی یەکە نەزانراوو نەناسراوە، خەریکە یاسایشی نەزانراو بێ! تەنها ئیسلام مایەوە دامەزراوی لە بنەڕەتی بەهێزی خۆی کە دەست نادا بۆ کار لێکردن، و لەسەر بەردی ڕەقی نەشکاوی زانین باوەڕی هێنا کە ڕێگا نی یە بۆگومان‌و دوودڵی ڕووی تێبکات، ئیسلام بەو جۆرە مایەوە، ئەندازەیە لە نەزانراو ئەبەخشێ بە ئادەمی کە پێویست بێت‌و زانینی پیت‌و فەڕی تێدابێت بۆیان. وە هێزو وزەی ژیرییان فراوان ئەکات‌و هانیان ئەداو پاڵیان پێوەئەنێ بۆ تێکۆشان‌و کردەوە لەو جێنشینی یەی کە پێ‌ی سپێراوە لەم زەوی یەدا، وە ئامادە ئەکات‌و فەراهەم ئەهێنێ ئەوەی کە ژیریی ئیشی تێدا بکات بەئاسایش‌و بێ مەترسی‌و ڕێنموونی یان ئەکات بۆ ڕێگایە کە ڕاست ترینە لە زانراوو نەزانراودا!

ئینجا ئەو کۆمەڵە(جن)ـە لەم خاڵەدا بارو هەڵوێستی خۆیان باس ئەکەن لەبارەی ڕێنموونی خواوە. بەجۆرێ تێ ئەگەین کە ئەوانیش وەك ئادەمی سروشتێکی تێکەڵیان هەیەو دەست ئەدەن بۆ چاکەو خراپەو ڕێنومایی‌و گومڕایی، هەروەها ئەو تاقمە باسی عەقیدەی گەل‌و تیرەی خۆیان ئەکەن بەرانبەر بە خوا، لە کاتێکا کە ئەم تاقمە بڕوایان هێنا بوو بە خواو باسی دوا ڕۆژو پاداشت‌و تۆڵەی چاکان‌و خراپان ئەکەن.

وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾

---

**دەھەم:** ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە لەمەوبەر تیامانا هەبوو کۆمەڵێ لە خواترس و کردەوە چاك، وە تیامانا بوو کۆمەڵێکی جیاواز لەوان و پەست تر لەوان، بە شێوەی گشتی ﴿كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴾ ئێمە خاوەنی چەند ڕێگاو مەزهەبێکی جیاجیای پچڕ پچڕبووین. واتە ئێمە چەند کۆمەڵ و تاقمێ بووین، هەرکام ڕاو ڕێگایەکی هەبوو جیاوازو پچڕاو لەوی تر.

ئەم باس و بڕیارە لەلایەن ئەو تاقمە ڕوونی ئەکاتەوە کە سروشتی(جن) وەك ئادەمی تێکەڵە لە ئامادەیی بۆ چاکەو خراپە، بێجگە لەوانەی کە یەك بارن و لێ بڕاون بۆ شەڕو خراپە وەك تاقمی شەیتان و تاقم و خێڵەکەی. ئەمەش زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن و بۆ چوونمان سەبارەت بەم تیرەیە. چونکە کەس لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەو تیرەیە یەك بارەو هەر بۆ شەڕو خراپە دەست ئەدەن، تەنها ئادەمی سروشتی تێکەڵە، کەواتە ئەو کەسانە –ئەگەر خۆیان بەبڕوادار دائەنێن– ئەبێ بگەڕێنەوە بۆلای ئەمەی کەلە قورئان وەرئەگیرێ.

**یازدەهەم:** ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ وە بەڕاستی ئێمە زانیومانە و ئەزانین کە هەرگیز ئێمە لەدەستی قودرەتی خوا دەرناچین و یاخی نابین لێی لەهەر وڵات و شوێنێ بین لەزەوی دا، ﴿وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا﴾ وە هەرگیز یاخی نابین و لە دەستی دەرناچین بەڕاکردن لە زەوی و دەرچوون لێی.

ئەوانە وا بەرێکی دەریان خست کە(جن–پەری) دروست کراوو بەندەی لاوازی خوایەو ژێربارە بۆ خواهیش و دەسەڵاتی خوا. کەواتە زۆر بێ جێ و ناڕاست و ناڕەوا بوو کە بت پەرستەکان لەچۆڵ و بیابانا پەنایان ئەبرد بە(جن). داوای یارمەتی و کۆمەکیان لێ ئەکردن بۆ بەهاوارەوە چوون و جێبەجێ کردنی مەبەست و پێویستی یان. خزمایەتی و ژن و ژنخوازیان بڕیار ئەدا لەنێوان خواو ئەونا! وە ئەمەی کە ئەم تاقمە وتیان بە گەلەکەیان و قورئان ئەیگێڕێتەوە لێیانەوە ئامۆژگاریەکی زۆر گەورەیە بۆ ئەو بت پەرستانەو هەرکەس وێنەی ئەوان بێت.

وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ۖ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾ وَأَنَّا مِنَّا
ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ
حَطَبًا ﴿١٥﴾

---

**دوانزەهەم:** ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ وە ئێمە کاتێ ڕێنومایمان بیست بڕوامان پێهێنا، ئەوانە قورئانیان بیست بەڵام ناویان برد بە ڕێنومایی چونکە میهرەبان ناردیو کردیە تاقانە ڕێگای ڕێنموونیو ڕێنومایی، وە ئەوەندە تێرو تەواوە لە ڕێنومایی دا وەك ڕێنومایی ڕووت بێت وایە. ﴿فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ ئینجا هەرکەس بڕوابێنێ بە پەروەردگاری، ئەو کەسە مەترسی نابێ لەکەم کردنەوەی پاداشت،و لە داگیرکردنو هاتنی زەبوونیو ریسوایی بەسەریا، یا لە تەنگەتاوکردنو باری گران دان بەسەریا.

بێگومان زۆر لەبڕواداران دووچاری کەمو کوڕی دێت لەم ژیانی جیهانەدا، بەڵام ئەوە نابێ بەکەمو کوڕی. بەڵکو ئەوەی بە قازانجو بەرهەمێکی گەورە دەرئەچێ، چونکە چەند قات پاداشتو بریتی هەیە لای خوا! زۆرجار دووچاری زەبوونیو سزاو ئازار دێت و تەنگەتاو ئەبێ، بەڵام خوای پەروەردگاری فریای ئەکەوێ، تەواناو خۆگری پێئەدا، پەیوەستی دڵی بەخواوە هەموو ناخۆشیەك سووكو ئاسان ئەکات لەسەری، بێجگە لەوەش لە ڕۆژی دواییدا خوا لەباتی ئەو بەسەرهاتانە پلەو پلەی بەرز ئەکاتەوە.

کەواتە بەڕاستی بڕواداری ڕاستەقینە مەترسی ناکات لە هیچ شتێ لەوانەی کە زۆر قورسو گرانو تاڵو توونە لەسەر بێبڕوا، هەر بڕواداری ڕاستەقینە بە دەروونێکی بێباکەوە ئەژی، ئەو بێباکیە ئارامو ڕەحەتی ئەدا بەو بڕواداره لە ماوەی خۆشیو شادەمانی دا. هەتا کاتێ ئەوەی نەماو بەسەرهاتی خراپو ناخۆش ڕووی تێکرد، لەو کاتەیشا بەرگەئەگرێو دونیای لێ نایەتە یەكو بەرچاوی تاریك نابێ، بەڵکو ئەو بەسەرهاتە ناخۆشە ئەکات بەتاقی کردنەوە لەلایەن خواوەو لەبەرئەوە شانی ئەداتە بەر بەئومێدی دەرچوون لەو تاقی کردنەوەدا، ئینجا دەست کەوتی پاداشتی گەورە، لەهەمان کاتا دڵشادە بەهۆی چاوەڕوانی ڕزگاربوونو دەروو لێ کردنەوەی خوا. کەواتە ئەو کۆمەڵە(جن)ـە ڕاستیان کرد کە ووتیان: بڕوادار مەترسی ناکات لەوانەی کە باس کران. ئینجا ئەو تاقمە تێگەشتنو بۆچوونی خۆیان

لە ڕێنومایی و گومڕایی و پاداشت و تۆڵەیان ڕوون ئەکەنەوە بەم دواترین خاڵە کە لێرەدا سیازدەهەمە.

سێزدەیەم: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلۡمُسۡلِمُونَ﴾ وە بەڕاستی لەناو ئێمەدا هەیە تاقمی موسڵمانان کە مل کەچ و گوێڕایەڵن بۆ خوای خۆیان ﴿وَمِنَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ﴾ وەلە ناومانا هەیە تاقمێ لادەران لە ڕێگای خوا کە ستەم کارو دوورە پەرێزن لە دادو چاکە ﴿فَمَنۡ أَسۡلَمَ فَأُوْلَٰٓئِكَ تَحَرَّوۡاْ رَشَدٗا﴾ ئینجا ئەو کەسەی کە موسڵمانەو ملی کەچکرد بۆ خوای خۆی ئەوە بەووردی گەڕاون بەدوای ڕاستی و ڕێنومایی دا. واتە کاتێ ئیسلامیان هەڵبژارد بۆ خۆیان ئەوانە بەڕێکی گەشتن بەڕاستی و ڕێگایان کەوت لە هەر شتێ کە ڕاست و ڕەوابێت.

﴿وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبٗا﴾ وە ئەوانەی کە لادەرن لەڕێگای ڕاست کە ڕێگای بڕواو گوێ ڕایەڵی یە، ئەو لادەرانە لای خوا بڕیار دراوە کە ئەبن بە دارو کۆتەرەی دۆزەخ، واتە ئەبن بەسووتەمەنی دۆزەخ و ئاگری ئەویان پێ تاو ئەدرێ، هەرچۆنێ ئاگر لەجیهانا بەدارو کۆتەرە تاو ئەدرێ. ئەم فەرموودەیە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوە کە(جن) سزا ئەدرێن بەئاگر، ئەوەش دەست نیشان و بەڵگەیە لەسەر پاداشت دانەوەیان بەبەهەشت، وە هەرشتێ لە قورئان و حەدیسەوە وەرگیرا هەر کەس خۆی بەبڕوادار دابنێ نابێ سەری لێ بکاتەوە، بەڵکو ئەبێ خۆی ببەستێتەوە بە بۆچوونێکی قورئانی یەوە، هەرکەس وا نەکات بێگومان هەر درۆزنی و بێ ئابڕوویی بۆ ئەمێنێتەوە.

ئەم سیازدە خاڵە قسەو بڕیاری(جن) بوون لەبارەی خۆیانەوە، خوای گەورە گێڕایەوە بۆ بەندکانی کە سەراسەر پەندو ئامۆژگاری بوون، وە ئاگادار کردن و زانا کردن بوو بە چەند شتی گرنگ کە نەفامەکان بە پێچەوانە لێی حاڵی بوو بوون، ئینجا باسی کردەوەی خوا ئەکات لەگەڵ ئەوانەی کە دامەزراون لەسەر ڕێگای ڕاست و ئەوانەی لائەدەن، ئیتر ئەمەش بەندێ تربێ لەقسەو وتاری ئەو کۆمەڵە(جن)ـە وەك سیازدە بەندەکەی پێشوو، یا ئەمە لەقسەو وتاری ئەوان نەبێ و بەڵکو فەرموودەیەکە کەلەلایەن خواوە ئاڕاستەی ئەکرێ، زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەم باری دووەمەن، چونکە دیمەن و ڕووالەتی ئایەتەکە وا نیشان ئەدات. بەڵام باری یەکەمیش کە هەندێ لەزانایانی لەسەرە هەر ئەگونجێ و هەڵ ئەگرێ، بەڵکو زۆر ووردیشە، چونکە ئەوکاتە هەواڵ و بەڵێنەکە بەناوی خواوە ئەگەیەنن، کەواتە زیادە نرخ و بایەخێ ئەدات بەو هەواڵ و بڕیارە. وێنەی ئەمە لە قورئانا زۆرە.

وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَـٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَـٰهُم مَّآءً غَدَقٗا ﴿١٦﴾ لِّنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَمَن يُعۡرِضۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِۦ يَسۡلُكۡهُ
عَذَابٗا صَعَدٗا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ ٱلۡمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ

---

**کەواتە با ئایاتەکە بە هەردوو جۆر تەفسیربکەینەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَـٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَـٰهُم مَّآءً غَدَقٗا﴾ لەسەر باری دووەم واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ(وحی) سروش کرایە لام کە ئەگەر ئادەمی یا(جن) یا هەردوو یا لادەرەکان لەرێگای خوا دامەزراو بوونایە بەرێکی لەسەر رێگای ڕاست کە ئایینی ئیسلامە ئاوداشتمان ئەکردن‌و ئاوێکی زۆر فراوان کەمایەی زۆری‌و فراوانی ڕۆزی‌و نازو نیعمەت‌و خۆش گوزەرانی یە دەرخوارد ئەدان.**

**لەسەر باری یەکەم: واتە خوا ئەفەرموێ:(جن) لەبارەی ئێمەوە وتیان: ئەگەر خۆش گوزەرانیمان پێ‌ئەدان. لەباتی ڕۆزی زۆرو خۆش گوزەرانی فەرمووی: ئاوی زۆرمان پێ‌ئەدان، چونکە ئاو بنەڕەتی ژیان‌و گوزەران‌و هەموو ڕۆزی‌و خۆشی یەکە، زۆریی ئاو هۆی فراوانی ڕۆزی‌و خۆش گوزەرانی یە. جالەبەرئەوەی وتراوە: لە هەر شوێنێ ئاو بوو ماڵ‌و سامان هەیە، بەتایبەتی ئاو لەو چەرخەدا لای یەکەم گەل کەئەم قورئانەی بیست زۆر کەم‌و خۆشەویست بووە.**

**ئینجا هۆی ئەو فراوان کردنەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لِّنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ﴾ بۆ ئەمەی تاقی یان بکەینەوە تیایا، تا دەرکەوێ ئایا سوپاسی خوا ئەکەن‌و هەڵ ئەسن بە مافی ئەو بەهرەو میهرەبانیەو چاو لەبەری خوا ئەبن، یا بەپێچەوانەی ئەوە ئەبن؟ لەچەند شوێنێ لەم تەفسیرەدا وتمان کە مەبەست لە تاقی کردنەوەی خوا دەرخستنی کردەوەی تاقی کراوەکەیە، تا خۆیشی‌و خەڵکیش کردەوەکەی ببینن‌و خوا زانیویەتی بەدی بێت، چونکە خوا تەنها بەپێ‌ی زانینی خۆی لەگەڵ بەندەدا ڕەفبتاری ناکات، بەڵکو ئەبێ زانراوە کەیشی بەدی بێت ﴿وَمَن يُعۡرِضۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِۦ﴾ وە هەر کەس ڕوو وەرگێرێ لە قورئان‌و ئامۆژگاری پەروەردگاری ﴿يَسۡلُكۡهُ عَذَابٗا صَعَدٗا﴾خوا ئەیخاتە ناو سزایەکی سەخت کەبەرزئەبێتەوە بەملیاو زاڵ و داگیری ئەکات، خوا پەنامان بدات لێی، لەم دوو ئایەتەدا سەرنج ڕاکێشان هەیە بۆ سێ شتی زۆر گرنگ کەپەیوەندیان هەیە بە عەقیدەو بیروباوەڕی بڕوادارەوەو هۆی پێك هێنانی ئەو عەقیدەو بیروبڕوایە یە.**

یەکەم: پەیوەندیو پەیوەستی دامەزرانی گەلو ئوممەتەکان لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی خوا لەگەڵ ژیانی خۆشیو کامەرانیو هۆکانی ئەو ژیانە، یەکەن هۆیش بریتیە لەبوونی ئاو بەتێریو تەسەلی، ئەوەتا ژیان لە هەموو بەشو ناوچەیەکی زەوی دا لەسەر ئاو ڕاگیرە، خۆشیو هەرزانی شوێنی هەنگاوە پیرۆزەکانی ئاو کەوتووەو ئەکەوێ تەنانەت لەم چەرخو سەردەمەش دا کە پیشەسازی تێدا بڵاوبووەتەوەو کشتوکاڵ یەکەم سەرچاوە نیە بۆ ژیانو گوزەرانو خۆشی، بەڵام لەم چەرخەیشا ئاو هەر ئەو گرنگیەی هەیە لە ژیانو ئاوەدانی وڵاتو جیهانا.

ئەو پەیوەندیو پەیوەستیە شتێکی ڕاستی بەدی هاتووە لە ژیانا، بۆ نموونە زۆربەی گەلی عەرەب پێش ئیسلام لەو دەشتو بیابانو کۆشارەدا ئەژیان بە ژیانێکی ناخۆشو کەمو کووڕ، هەتا لەسەر ڕێگای ڕاست دامەزران، ئەو حەلە قاپی خێرو بێری زەوی یان لێ کرایەوەو وڵاتان کەتنە ژێر دەستیان، ڕۆزیو ئەو هەموو هۆی خۆش گوزەرانیەیان بۆ هەڵئەقوڵا لە هەموو لایەکەوە، ئینجا لایان دایەوە لە ڕێگا ڕاستەکەی خوا بەهۆی ئەوە دوژمنیان بەسەرا زاڵبوو، ئەو هەموو وڵاتەیان لەدەست سەنرایەوەو خۆشیان بەش بەشو ژێر دەست کران، ئینجا ئێستە کە سامانو هۆی ژیانیان زۆر بووە لەزۆربەی شوێنو وڵاتەکەیاندا هەمیشە وان لەناڕەحەتیو جەنگو ئاژاوەدا بەجۆرێ خێرو خۆشی لە ژیانیانا نی یە، مەگەر بگەڕێنەوە بۆلای ڕێگا ڕاستەکەیان، ئەو ئوممەتو وڵاتانەی تر کە لەسەر ڕێگای خوا نین، لەگەڵ ئەوەدا بەفراوانی سامانو هۆی ژیانیان هەیە، بەڕاستی ئەوانە گرفتارن بەچەنددەردونەخۆشیەوە کەلەڕووی ڕاستیدا هیچ خۆشیەکی بۆ نەهێشتوونەتەوە، ئەوانە لە چەند لایەترەوە لێیان قەوماوە.

ئادەمێتیو نرخو ڕێزی ئادەمیو ئاسایشو ئارامیان تێدا هەڵگیراوە، وە ئوە ژیانەیان بووە بە نەفرینو بەدبەختی بەسەریانەوە، وەك بە درێژتر ئەم باسەمان کرد لە سوورەتی نوحدا. دووەم شتی گرنگ کەئەم دوو ئایەتە کورتە دەست نیشانی بۆ ئەکەن ئەمەیە: زۆریو فراوانی ڕۆزیو هۆی ژیان تاقی کردنەوەیە لەلایەن خواوە.

خۆگرتنو دامەزراوی لەسەریو چاکەکردن تیایا زۆر قورسو گرانترە لە خۆگریو دامەزراوی لەسەر تەنگیو لەکاتی سەختو تەنگەتاوی دا! بە پێچەوانەی ئەوەی کە ئەزانرێو دەرئەکەوێ بۆ مەردوم کاتێ بە وردی سەرنج ئەداو بیر ئەکاتەوە. تەنگیو سزاو

ناڕەحەتی زۆرتر هۆی یادی خواو پەنا بردنو گەڕانەوەن بۆ لای خوا. خۆشیو شادمانیو دەسەڵات زۆرتر هۆی لەخۆگۆڕانو یاخی بوون لە خوا!

سێیەم شتی گرنگ ئەمەیە: ڕوو وەرگێڕان لە قورئانو ئامۆژگاری خوا کە زۆرجار پەیدا ئەبێ لە تاقی کردنەوە بەزۆریو فراوانی هۆی ژیانی کامەرانی، ئەو زۆریە ئەبێ بەهۆی سزا سەختەو سەری لەوەوە دەرئەچێ، کەواتە هەرکەس ژێر بێت ئەبێ لەکاتی خۆشیو شادمانیو فراوانی دەسەڵاتو سامانا زۆر وریاو ئاگاداربێت، تا ئەوەی کە خوا پێی داوە سەری نەکات بەو ئاگرە سەختەدا.

ئینجا دێتە سەر دوو بەندی تر کە ئەمانیش دەست ئەدەن بۆئەوەی لە قسەو ووتارەکانی ئەو تاقمە(جن)ە بێو خوای گەورە ئەی گێڕێتەوە هەڵی ئەگرن بۆ ئەوە هەر لەڕێوە بڕیارو فەرموودەی خوا بێو لەلایەن خۆیەوە ئاڕاستەیان بکات، یەکەم: ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ﴾ لەسەر باری یەکەم ئەڵێین: ئەو تاقمە(جن)ـە ووتیان بە گەلەکەیان: هەموو جێگا نوێژەکان(سوجدەگاکان) یا هەموو مزگەوتەکان هی خوانو تایبەتین بە خواوە ﴿فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا﴾ کەواتە لەگەڵ خوادا هیچ کەسی تر مەپەرستن تیایاندا، ئیتر ئەو پەرستنە بە سوجدە بۆ بردن بێت یا بە پەنا پێبردنو داوالێکردنی شتێ بێ کەهەرلە دەسەڵاتو توانای خوادایە وەك داوای پاراستنو یارمەتی بە شێوەی غەیبیو نهێنی!

لەسەر باری دووەم: واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ سرووش(وحی) کرایە لام، ئەم بەندەی کەووتراوە لەسەر هەردوو بار مەبەست بڕوایە بە تاكو تەنهایی خواو پەرستنی تەنها خوا، ئینجا لەسەر باری یەکەم ئەم بەندو خاڵە بۆ دووبارە کردنەوەو بەهێچزکردنی ئەو خاڵەیە کەلەیەکەم جارەوە ڕایان گەیاندو ووتیان ﴿وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا﴾ وە هەرگیز هیچ کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان.

لەسەر باری دووەم تەمێو ئامۆژگاریە کە خوا ئاڕاستەی ئەکات بەبۆنەی قسەو ووتاری ئەوتاقمەبڕوادارەو جاڕدانی خواپەرستی خۆیان! دووەم ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ﴾ لەسەر باری یەکەم: ئەو تاقمە ووتیان بە گەلەکەیان بەڕاستی کاتێ بەندەی خوا –واتە پێغەمبەر– هەڵسا بە پێغەمبەرێتی لە کاتێکا خوا ئەپەرستێ یا هەڵسا ئەیویست نوێژبکات

﴿كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا﴾ بت پەرست و بێبڕواكان كۆمەڵیان لێكردو یەك پارچەبوون لەسەری و دژی هەڵسان بۆ بەرگری نەهێشتنی ئەو ئایینە ڕاستەی كە بۆی هێنان، یا كۆمەڵیان لەسەركرد بەجۆرێ خەریك بوون بكەون بەسەر یەكدا بەهۆی سەرسام بوونیان لە نوێژو قورئان خوێندنەكەی كە شتێكی نەبیستراو و نەبیستراوبوو لایان، یا كۆئەبوونەوە بۆ ئازارو سزادانی بەڵام خوا ئەیپاراست لێیان وەك چەند جارێ ئەوە ڕوویدا. ئەو تاقمە(جن)ـە ئەمەیان ئەگێڕایەوە بۆ گەلەكەیان بەسەرسوڕمانەو لەو بێبڕوایانە.

وەلەسەر باری دووەم كەئەم بەندو خاڵە لەڕێوە هەواڵێ بێ لەلایەن خواوە كە ئەڵێن: واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ سروش كرایە لام كەكاتێ بەندەی خوا هەڵسا نوێژی ئەكردو قورئانی ئەخوێند تیایا، ئەو كۆمەڵە(جن)ـە بیستیان سەرسام بوون و سەریان سوڕما لە گرنگی و نایابی ئەم قورئانە لەبەرئەوە كۆبوونەوە لەو بەندەی خوا بەجۆرێ خەریك بوون یەك پارچە ببن وەك -لباد- پارچە خوری بنیشنە سەر ملی یەك، ناوبردنی پێغەمبەر(ﷺ) بەبەندەی خوا خۆشەویستی و نزیكی و تایبەتێتی نیشان ئەدا بۆی لەلایەن خواوە، لەبارێترەوە ملكەچی و گوێڕایەڵی تەواو ئەگەیەنێ بۆی كەئەوەش ئەوپەڕی پادەو پلەی بەرزە كە ئادەمی پێی بگات، وە با پێغەمبەر(ﷺ) زیادەڕەوی نەكرێ تیایا و نزیك نەخرێتەوە لە سنووری خوایەتی وەك زیادەڕەوی كرا لە عیسادا(علیه السلام).

لەپاش ڕاگەیاندن و جاڕدانی جن بەتاك و تەنهایی خواو دوورخستنەوەی هەموو هاوبەشێ لێی ئینجا فەرمان ئەدا پێغەمبەر(ﷺ) بەوێنەی ئەو ڕاگەیاندن و جاڕدانە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ ﴿إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي﴾ من هەر ئەو پەروەردگارەی خۆم ئەپەرستم و داوا تەنها لەو ئەكەم ﴿وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ وە هیچ كەس ناكەم بە هاوبەشی، كەواتە ئەمە قسەو بڕیاری ئادەمی و(جن)ـە هەردوولا یەكیان گرتووە لەسەری هەركەس لەوە لائەدا ئەو كەسە خۆی تاك ئەكاتەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

قُلْ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا
﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾

﴿قُلْ﴾ بلێ: ﴿إِنِّي لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا﴾ بەڕاستی من نەخاوەنی هیچ زیانێکم بۆ ئێوە وە نە خاوەنی هیچ خێرو قازانجێکم بۆتان نەلەم جیهانو نەلەو جیهان، واتە تەنها بەدەست خوایەهەمووزیانو سوودو ڕێنوماییو هەموو چاکیو خراپیتان. فەرمانیدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەرانبەر بە خوا خۆی ڕووت بکات لە هەموو شتێ وە بەهیچ ڕەنگ لافی هیچ شتێ لێ نەدا کە تایبەتیە بەو خوایە کەئەی پەرستنو هیچ هاوبەشی بۆ ڕەوا نەدا. مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە ڕێكو پێکە لەگەڵ قسەی ئەو کۆمەڵە(جن)ـە کە ووتیان: ئێمە نازانین نیازی خراپە کراوە بەوانەی وان لەزەوی دا یان خوا نیازی خێرو چاکەی پێکردون وە دڵنیایی ئەکات لەسەر ڕاستی ئەوقسەیە. ﴿قُلْ﴾ بلێ: ﴿إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ﴾ بەڕاستی هەرگیز هیچ کەس پەنای من نادا لە خواو بەرگریم لێ ناکا ئەگەر خوا بیەوێ زیانبارم کات.

﴿وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا﴾ وە هەرگیز دەستم ناکەوێ هیچ جێگای پەنایەك لە خوا ﴿إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ﴾ مەگەر ڕاگەیاندنێ کە لەلایەن خواوە هاتبێ، مەگەر فروستادەیی یەکانی لە ئایەتو سورەتەکانو لە هەر فەرمانێ کە بۆم هاتبن، واتە کارەکە کاری من نی یەو من هیچم بە دەست نی یە جگە لە ڕاگەیاندنو هیچ ڕێگای لادانم نی یە لەو ڕاگەیاندنە، من داوالێکراوم لەلایەن خواوەو هیچ کەس پەنام نادا لێیو هیچ پەنایەکم دەست ناکەوێ بێجگە لە ڕاگەیاندنو هەڵسانم بەو فەرمانو سپاردەی کە پێم سپێرراوە! کەواتە هەڵسانی بەو فەرمانە شتێکی ئارەزووکاری نی یە بەڵکو ئەرکێکی گرانەو خراوەتە سەر شانیو پێویست کراوە لەسەریو نابێ زۆر بە گرنگ نەیگرێ، وە شتێ نیە خۆی دەسەڵاتی ببێ تیایا، بەڵکو فەرمانێکەولەژوورترلە ئاسمانەکانەوە هاتووەو ئەبێ بەجێ بێت بەبێ ئەم لاو ئەولاو دوودڵی!

﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ﴾ وە هەرکەس سەرپێچیو نافەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەکات بەڕاستی بۆ ئەو کەسە هەیە ئاگری دۆزەخ ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ بەجۆرێ ئەمێننەوە تیایا هەتاهەتایەو بێبڕانەوە. مەبەست لەو سەرپێچی یە کە ئەوە تۆڵەیەتی سەرپێچی یە لە پەرستنی خوا بە تاكو تەنها، یا لەهەر شتێ کە هۆی دەرچوون بێ لە ئیسلامو گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەی تیا نەبێ لەم جیهانەدا.

حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ أَضۡعَفُ نَاصِرٗا وَأَقَلُّ عَدَدٗا ﴿٢٤﴾ قُلۡ إِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٞ مَّا تُوعَدُونَ أَمۡ يَجۡعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾

**ئەو بێبڕوایانە هەر بەردەوام ئەبن لەسەر سەرکەشی خۆیان و بڕواداران و یارمەتی دەرانی پێغەمبەر(ﷺ) بە لاوازو کەم و بێدەسەلات دائەنێن و سەرنج ئەدەن** ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ﴾ **هەتا کاتێ ئەبینن ئەوەی هەڕەشەیان لێ کراوە پێی** ﴿فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ أَضۡعَفُ نَاصِرٗا﴾ **ئەو کاتە ئەزانن کێ لاواز ترە لەبارەی یارمەتی دەرو کۆمەک کەرەوە،** ﴿وَأَقَلُّ عَدَدٗا﴾ **وە کێ ژمارەی کەمترە، واتە ئەوانە کە خۆیان بە زۆرو بەهێزو ملهوڕ سەیر ئەکەن، بڕواداران بەبێ هێزو کەم دائەنێن کاتێ ئەو هەڕەشەی لێیان کراوە بەدی هات، ئیتر لەم جیهان یان لەو جیهان ئەو کاتە ئەزانن کە خۆیان بێهێزو بێکەس و بێیارمەتی دەرن، وە تێئەگەن نەفام و نەزان بوون. بێگومان ئەو کاتە حاڵی ئەبن کە یارمەتی دەری پێغەمبەر(ﷺ) خوایە کە سەرچاوەی هەموو هێزو دەسەلاتێکەو هێزو دەسەلاتی بێسنوورە، ئەزانن کە لەشکرەکەی مەلائیکەو بڕوادارانە کە هێزو ژمارەی هیچ لەشکرێ پێی ناگات!!**

**بێبڕواو ملهوڕەکان هەرکات ئەم هەڕەشەیان ئەبیست بە لاقرتی یەوە پەلەیان ئەنایەوە بەهاتنی ئەوهەڕەشەیەوپرسیاریان ئەکرد لەکاتی هاتنی، خوایش هەموو جارێ فەرمانی ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە وەڵامیان بداتەوە هەر جارێ بە شێوەیە، لە هەموو جارێکا ئەیگەیاند کە ئەوجۆرە شتانەلەزانین ودەسەلاتی پێغەمبەر(ﷺ) بەدەرن، وەك لێرەدا ئەفەرموێ:** ﴿قُلۡ﴾ **بڵێ** ﴿إِنۡ أَدۡرِيٓ﴾ **من نازانم** ﴿أَقَرِيبٞ مَّا تُوعَدُونَ﴾ **ئایائەوەی هەڕەشەتان لێ کراوە پێی نزیکە هاتنی** ﴿أَمۡ يَجۡعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا﴾ **یا پەروەردگارم ماوەیەکی دووری بۆداناوەو بڕیاری داوە. ئەم ئایین و بانگ کردنە هی پێغەمبەر(ﷺ) نیەو ئەو داینەناوە، وەئەو هیچی بە دەست نیە بێجگە لە ڕاگەیاندن کە ئەوەش هەڵسانە بە ئەرکێ کە خراوەتە سەر شانی و ئەبێ هەڵسێ پێی، هیچ پەنایەکی نیەو ڕزگار نابێ بەو هەوڵو هەڵسانە نەبێ کە پێویست کراوە لەسەری، هەروەها ئەو هەڕەشەیەی کە کراوە لەسەر بڕواهێنان و ملپێچی، وە بەدیهێنانی ئەو هەڕەشەیە کاری خوایەو بەدەست خۆیەتی، پێغەمبەر(ﷺ) هیچ دەست و دەسەلاتێکی تیانیە، زانینی کاتەکەی لای خوایەو شتێکی نهێنی و غەیبی یە، ئەم جۆرە نهێنی و غەیبیانەش تایبەتێن بە خواوەو هیچ کەس نایانزانێ، مەگەر کەسانێ خوا زاناو ئاگاداریان بکات پێی،**

عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾

---

**وەكو ئەفەرموێ: ﴿عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ﴾ خوا زانای هەموو نادیاریو غەیبە ﴿فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ ئینجائەوخوایە هیچ کەس ئاگادارناکات بەسەرغەیبەکەی خۆیا﴿إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ﴾ مەگەر کەسێ کە خوا هەڵی بژاردبێو ڕازی بێ لێی کە ئەوەش فروستادەو نێرراوێکی خوایە.**

**لە سورەتی(قصص)دا بەدرێژی دوایـن لـەبارەی غەیبـەوە، هـەروەها لـە دوا دوایـی سوورەتی(لقمان)ەوە، هەرکەسێ ئەیەوێ باتەماشای ئەو دوو شوێنە بکات. ئەوەی ووتراوە لەسەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە وەرگیراوە، هێندێ لەوەی کەوتراوە لەوێو بۆئێرە هێنانی پێویستە ئەمەیە: وشەی(غیب) لە شەرعا بەدوو شێوە بەکار ئەهێنرێ:**

**یەکـەم: هەرشـتێ پێنـەکرێو لەچوارچێوەی هەسـت بـەدەربێت، ئـیتر بـەژیریی ڕووت ئەزانرێ یا بەهۆی نیشانەو بەڵگەیەکە ببێ لەسەری یان نەء؟**

**دووەم: ئەمەیە کە هەستی پێ نەکرێو بەهیچ ڕەنـگ ژیـری ڕێی پێنەبا لـە خۆیـەوە، وەهیچ نیشانەو بەڵگەو ڕابەرێ نەبێ لەسەری... زانینی ئەم دووەمە تایبەتیە بەخواوەو هیچ کەس لە بەندەکانی خوا بە هەوڵو تێکۆشان ڕێی پێنابا و نایزانێ بەزانینێکی تێرو تـەواو بێگومـان، مەگـەر خـوا ئاشـناو ئاگـاداری بکـات پێـی، ئەوکەسـەش ئـەبێ پێغەمبـەرو فروستادەی خوابێ، بێجگەلەوان هەرکەسی تر هەر بەسەرهاتو شتێ بکەوێتە دڵیەوە(وێنەی ئەم دووەمە ئەوانە زانین نینو ناگەنە ڕادەی نـەمانی گومانو دوودڵی) بەڵکو ئەوانە لەلایـەن خوا ناسەکانەوە پێیان ئەوترێ ئیلاهامو کەشفو فەراسەت، ئینجا ئەو ئاگادارکردنەوەیـەو چـۆنیەتیەکەی نیـشان ئـەدا کـە ئەفـەرموێ: ﴿فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا﴾ واتـە ئـەو نێرراوو فروستادەیە ئاگادارئەکات بەسەر هێندێ لەو غەیبە تایبەتیانەدا کە سروشی ئەکات**

بۆلای بەم ڕەنگە کە بێگومان ڕەوانە ئەکات لە پێش دەمی و لەپاشیەوە لە هەموو لایەکیەوە چەند پاسەوانێ لە فریشتە کە پاسی نێرراوەکە بکەن لەدەستکاری کردنی لەوەی کە خوا ئاگاداری کردوە بەسەریا، واتە ئەوەی کە خوا بەسروش ئەی گەیەنێ بە پێغەمبەرەکەی جێگەی هیچ گومان و دوو دڵیەك نیەو خوا ئەی پارێزێ لە هەموو لەکەیەك و بەهۆی پاسەوانی فریشتەوە ئەی نێرێ ﴿لِّيَعۡلَمَ أَن قَدۡ أَبۡلَغُواْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ تا خوا بزانێ کە بێگومان ئەو پاسەوانانە ڕایان گەیاندووە بە پێغەمبەر(ﷺ) کە پەیام و فروستادەییەکانی پەروەردگاریان بە پاك وخاوێنی لەهەر گەردو غوبارێك واتە ئەوەی کە خوا زانیویەتی لەپێش بەدی هاتندا بە بەدی هاتوویش ئەیزانێ وەك دەست نیشانیش ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيۡهِمۡ﴾ واتە ئەو پاسەوانانە ئەنێرێ لەکاتێکدا خوا زانا و ئاگاداری تەواوبووە بەهەر شتێ کە لای ئەوانەو بە هەموو بەسەرهاتیان کەواتە پێش ڕاگەیاندن وەك پاش ڕاگەیاندن هەر ئاگا و زانابووەو ئاگا و زانایە، خوای پەروەردگار ئەم دوو جۆرە زانینەی هەیە بەڵام بڕیارو ئەحکامەکانی شوێنی زانینی دووەم ئەکەوێ و بەپێی زانینی دووەم ڕەفتار ئەکات لەگەڵ بەندەکانی ﴿وَأَحۡصَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ عَدَدَۢا﴾ وە هەموو شتی هەڵژماردووە یەکە یەکە و ژمارەی هەموو شتێکی زانیوە یەکە یەکە، کەم و زۆرو گەورەو بچووك بەتایبەتی و بەدیاری.

فەرموودەی (الا من ارتضى من رسول) بە شێوەی(إستثناء متصل) تەفسیرم کردەوەو تەفسیریش کراوەتەوە بەپێی(استثناء منقطع) لەسەر ئەم بارە ئەڵێن خوا هیچ کەس ئاگادار ناکات بەسەر غەیبە تایبەتیەکەی خۆیدا، بەڵام ئەوەی کە خوا هەڵبژاردبێ و ڕازی بووبێ لێی لە فروستادەو نێرراوەکانی خۆی ئەو هەڵبژێرراوانە خوا ئەنێرێ لە هەموو لایەکیەوە پاسەوانێك لە فریشتە کە پاسەی ڕاگەیەنراوەکەی خوا بکەن.

وصلى الله وسلم على محمد وعلى آله وأصحابه اجمعين

## سوورەتی ﴿المزمل﴾
## مەککەیی یەو(٢٠)ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

لەهۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتەدا دوو ریوایەت هاتووە:

یەکەم: ئەمەیە: قورەیش کۆبوونەوە لە(دار الندوە)دا بۆ ڕێکخستنی پیلانێ دژی پێغەمبەر و ئەو ئایینەی کە هێنای بۆیان، ئینجا ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) بەهۆی ئەوەوە غەمبار بوو، خۆی داپۆشی بە پۆشاکەکەی و خەوت بە خەفەتەوە، ئینجا جوبرەئیل هات بەشی یەکەمی ئەم سورەتەی بۆهێنا.

دووەم: ئەمەیە: کە دەربارەی سووورەتی(المدثر)یش هاتووە:کورتەو پاڵفتەکەی ئەمەیە کە پێغەمبەر لەپێش پێغەمبەرێتی دا بەسێ ساڵ هەموو ساڵێ مانگێ ئەمایەوە لە ئەشکەوتی(حراء)دا خواپەرستی ئەکردو خۆی دوور ئەخستەوە لەو گەلە نەفامە، بێئارامو بێبڕوا بوو بە بیرو باوەڕی لەقو شەقی گەلەکەی، ڕێگایەکی ڕووناکو بەرنامەیەکی دیاری کراویشی لانەبوو کە پێی ڕازیو دڵئارام بێت.

ئەو کەنارگیریەش شتێ بوو خوا بۆی ڕێکخست بۆ ئەمەی ئامادەی بکات بۆ ئەو کارو فەرمانە گەورەیە کە بۆی ئەچوو، چونکە لەو ماوەی دوورکەوتنەوەو کەنارگیریەدا ڕزگار ئەبوو لە خەریک بوون بە ئەرکی ژیانو ئەو کارو فەرمانە بچووکانەی ژیان کە خەریك کەرن لە کارە گەورەو گرنگەکەی، لەو ماوەیەدا دەستی خاڵی ئەبوو بۆبیرکردنەوە لە ژیان لەگەڵ ئەم بوونەوەرەو ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونو ئاشکرایانەی کە خوای پەروەردگار داینـاونو خستونیەتیە بەرچاو، ڕۆحی لەگەڵ ئەم بوونەوەرەدا دەستی ئەکرد بە یادو وەسپو سەنای ئەو پەروەردگارە هەرکەسێ نیازی ئەوەی لێ کرابێ کە کار بکات لەژیانی ئادەمی داو بیگۆڕێ بۆ بارێکی تر... ئەو کەسە پێویستی هەیە بە هەندێ کەنارگیریو دوورکەوتنەوەو پچڕان لە کارو فەرمانە خەریك کەرەکانی ئەم جیهانو زەوی یەو لە هۆسەو هەرای ژیان، پێویستی هەیە بە چەند کاتو ماوەیە بۆبیرکردنەوەو وورد بوونەوەو ژیان لەگەڵ ئەم بوونەوەرە، چونکە خەریك بوونی هەمیشەیی بەم ژیانەوە دڵو دەروون پەك ئەخاتو بەرگری ئەکاتو ئەیخەوێنێ، کەواتە هەوڵ نادا بۆ گۆڕاندنی ئەو ژیانە، بەڵام پچڕانو دوور کەوتنەوە لێی ئامادەی ئەکات بۆبیرکردنەوەو هەوڵدان بۆ بارێکی گەورەتر. ئا بەو جۆرە خوا ئەو دوور

کەوتنەوەو کەنارگیریەی خستە دڵی محمد(ﷺ) کە ویستی گەورەترین سپاردەی بدا بەسەراو هێڵی مێژووی زەوی بگۆڕێ. خستیە دڵیەوە بە سێ ساڵ پێش ئەوەی ئەو کارە گەورەی پێبسپێرێ لەو سێ ساڵەدا ساڵێ مانگێ دوور ئەکەوتەوە لەو خەڵکەو بەو جۆرە ژیانی بەسەر ئەبرد تا کاتی خۆی هات. ئینجا کە کاتی دیاری کراوی خۆی هات بە فەرمانی خوا جوبرەئیل هات بۆلای کە لە ئەشکەوتی حیرادا بوو. بەو شێوەی کە بەناوبانگە سەرەتای سورەتی(العلق)ی بۆ هێنا.

ئینجا وەحی(سروش) وەستا تا ماوەیەك لە پاشان جارێکی تر پێغەمبەر(ﷺ) لەشاخی حیرا ئەبێ کە سەرنج ئەدا جوبرەئیل پەیدا ئەبێ، بەهۆی دیتنی ئەو بیمو دڵە لەرزەیە داگیری ئەکات هەتا ئەکەوێو لار ئەبێتەوە بۆ زەوی، بەو دڵە لەرزەوە ئەگەڕێتەوە بۆماڵەوەو ئەفەرموێ: دام پۆشن. ئەوانیش دای ئەپۆشن، هەر بەو بیمو دڵە لەرزەوە ئەمێنێتەوە، کە تەماشا ئەکات جوبرەئیل هاتو بانگی ئەکات: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾ هەندێ ئەڵێن وتراوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ﴾. ئیتر هەرکام لەم دوو ڕیوایەتە هۆی هاتنەخوارەوەی بەشی یەکەمی ئەم سوورەتە بێت، پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار کرا کە ئیتر خەوتن نەماو ئیسراحەت باری کرد! ئەرکو باری قورس هاتە پێشەوەو خرایە سەر شانی، هەوڵو تێکۆشانی دوورو درێژ پێویست کرا، لەو بانگ کردنە بەدواوە بێخەویو ئەركو مەینەتو کۆششی هەمیشەیی هات! وترا بە پێغەمبەر(ﷺ): هەڵسە. ئەویش هەڵسا، لەپاش ئەوە زیاد لە بیست ساڵ هەڵسا! ئارامو ئیسراحەتی نەگرت، بۆ خۆیو ماڵو منداڵی نەژیا، هەڵساو وەستا بەسەر بانگو بانگەوازەکەی خواوە، ئەو ئەرکە قورسو گرانەی خستە سەر شانو ماندوو نەبوو کۆڵی نەدا، ئەرکی سپاردەی هەرە گەورە لەم زەوی یەدا. ئەرکی هەموو ئادەمیو ئادەمێتی، ئەرکی هەموو عەقیدەو ئایین، ئەرکی تێکۆشانو بەربەرەکانێ لەچەند مەیدانی جیاجیادا.

ئەو ئەرکەی گرتە سەرشان لە مەیدانی دەروونی ئادەمیدا کە نوقم بووبوو لە بۆچوونو بیروباوەڕی نەفامیو نەزانی دا، کۆتو زنجیر کرابوو بە ئارەزوو و هەوا جۆر بەجۆرە ناڕاستو ناڕەواکانی، بارکرابوو بەبارە زۆر قورسەکانی ژیانو هۆی ژیانی ئەم زەویە.

کاتێ کە هەندێ لەو دەروونانە ڕزگار بوون لەو شتە ناڕەوایانە، تاقمو کۆمەڵێکی پاكو خاوێن فەراهەم هات ئینجا بەربەرەکانێو زۆران بازی لەلایەترەوە دەستی پێکرد لەمەیدانێ ترادا وە بەڵکو چەند بەربەرەکانێی تر یەك لەدوای یەك. لەگەڵ دوژمنانی ئایینو بانگەوازەکەی خوادا کە بەجارێ ئەو دوژمنانە هەڵمەتیان دایە سەری ئەوو سەر بڕواداران،

بە هەموو هێز سوور بوون لەسەر بڕینو نەهێشتنی ئەم نەمامە پیرۆزە کە ڕووا چەکەری دابوو، پێش ئەوەی گەشە بکاتو پەرە بسێنێو ڕیشە بکوتێو بەرزببێو پەل بهاوێژێو سێبەربکات بەدەورو بەریا. هێشتا لێ نەبوو بووە لەجەنگو بەربەرەکانێی نیمچەدورگە، جەنگو بەربەرەکانێی ڕۆم دەستی پێکرد کە بە هەموو هێز ئامادەکرابوو بۆ ئەم ئاینو گەلە تازەیە لەلای ژوورووی وڵاتەوە لێی داو نەیهێڵێ.

لەکاتی ئەو هەموو بەربەرەکانیو جەنگانەدا تێکۆشانو بەربەرەکانی دەروونیش هەر بەردەوام بوو، هەر بەردەوامیش ئەبێ هەتا بێ بڕانەوە، چونکە شەیتان خاوەنیەتی، ئەویش یەك چرکە ناوەستێ لە کارو فەرمانی خۆی لەناخی دەروونی ئادەمیدا.

لەو هەموو جەنگو بەربەرەکانی یەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەڵ ئەسا بەبانگ کردنەکەی خوا، پێغەمبەر چاودێرو کاربەدەست بوو بۆ بەرگری ئەو هەموو دوژمنایەتیو بەربەرەکانی یەی کە دوژمن هەڵ ئەسا پێی لە هەموو مەیدانێك دا هەڵئەسا بەوکارە قورسو گرانە بەخۆگری یەکی شیرینو وەستانی دوورو درێژی شەو نوێژو قورئان خوێندنو پەرستنی خوا بە هەر شێوەیە تر لەتواناداا بووایە، لەگەڵ ئەو هەموو ئەرکەدا تەنگ گوزەرانیو کەمو کوڕی ژیانی بۆ خۆیو ماڵو منالی داناو هەڵبژارد.

ئا بەوجۆرە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هەڵسا بە کارو فەرمانی خوا، ژیانی بەسەر برد زیاتر لە بیست ساڵ، هیچ کارو فەرمانێ بێئاگاو خەریکی نەئەکردلە کارو فەرمانێتر لەو ماوە درێژەدا، لەو کاتەی ئەو ئەرکە گەورەیەی درا بەسەرا. خوا پاداشی شایانی بداتەوە لەباتی ئێمەو هەموو ئادەمیو جیهان. ئەم سورەتە بە هەردوو بەشەکەیەوە لاپەڕەیەك لەمێژووی ئەم بانگو بانگەوازە دەرئەخاتو نیشانی ئەدات، دەست پێئەکات بەبانگ لێ کردن بە هەڵسانی بەو فەرمانەی پێی درا، شێوەی ئامادە کردنی بۆی ئەخشە ئەکێشێ بە شەونوێژو نوێژی ترو قورئان خوێندن بەڕێکیو یادو باسی خوا بە ملکەچیو لاڵانەوە، پشت بەستن تەنها بەخوا، خۆگریو ئارام لەسەر سزاو ئازارو گوێنەدانو وازهێنان بەشێوەیەکی ڕێكو ڕاست لە بێبڕواکان.

هەروەها بە هەردوو بەشەکەی لاپەڕەیە نیشان ئەدا لەلاپەڕەکانی ئەو تێکۆشانە گرنگەی کە ئەو گەلو کۆمەڵە هەڵبژێرراوە هەڵسا پێی بۆ گێڕانەوەی ئادەمی و ئادەمێتی بۆلای پەروەردگاری.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِصْفَهُ أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ

---

ئینجا با بەدڵ گوێبگرین بۆ سورەتە پیرۆزەکەو قاپی دڵ بکەینەوە بۆ پیت و فەڕی بە یارمەتی خوا. ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾ ئەی کەسێ کە خۆت پێچاوەتەوە بە پێخەف و پۆشاکەکەت و ڕاکشاوی ﴿قُمِ اللَّيْلَ﴾ هەستەو ڕاست بەرەوە بۆ شەو نوێژو لەشەودا نوێژبکە ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ مەگەر کەمێکی ئەوەش ئەمەیە: ﴿نِصْفَهُ﴾ واتە نیوەی شەو بەنوێژ تەواو بکەو بیبەرە سەر ﴿أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا﴾ یا کەمێك لەنیوەکەمتر شەو نوێژ بکەتا سێ‌یەك. ﴿أَوْ زِدْ عَلَيْهِ﴾ یا لە نیوەی زیاتر بکە تا نزیکی دووبەش لەسێ‌بەشی، بەکورتی شەو نوێژی لەسەر پێویشت کراو سەربەست کرا بۆ هەرکام لەم سێ‌بارە کەنیوەی شەو یاکەمێ کەمتر لەنیوە یا زیاتر لەنیوە.

بەڕاستی بانگ کردنێکی گەورەو سامناك بوو، پێغەمبەری ئازیزی دەرهێنا لەژێر جێگای گەرم و نەرم و جێگای ئارام و ئاسایش بۆ ئەمەی بیخاتە ناو کۆڕو گێژاوی تێکۆشان و بەربەرەکانێ لەڕێگای گۆڕینی دەروون و ژیانی جیهان و جیهانی یان دا. بێ‌گومان هەرکەسێ بیەوێ تەنها بۆخۆی بژی لەوانەیە بەئارام و شادمانی بژی، بەڵام ئەو کاتە بەبچووکی و کەم نرخی ژیان بەسەر ئەبا و بەبچووکی و کەم نرخی ئەمرێ بەڵام گەورەیەك کەبیەوێ بۆ خەڵکی تر ژیان بەسەربباو ئەرکی ئەو گەورەییە ببا بەڕێوە. ئەو کەسە ئەبێ ئارام و خەوتنی لانەمێنێ!!

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەرك و فەرمانە گرنگەکەی خۆی چاك ناسی کەفەرمووی بە خاتوو خەدیجە -خوا لێی ڕازی بێ- کە داوای لێ کرد بخەوێ و ئارام بگرێ: ئەی خەدیجە چەرخ و کاتی خەوتن تێپەڕی و ڕۆیشت! بەڵێ بەڕاستی لەو ڕۆژەوە خەوتن و ئاران گرتن ڕۆیشت و بێ خەوی و ماندویی و کۆشش و تێکۆشانی دوورو درێژهات!

پەروەردگاری فەرمانی پیادا بەشەو نوێژو قورئان خوێندن بە شێوەیە: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ واتە: وە بەڕوونو ڕەوانیو بێ پەلەو تێکەڵ کردن قورئان بخوێنە، بەڕاستی نزك تر شێوەیە کە ئەم ئایەتە ئەیەوێ بەم شێوە ﴿مرتلە﴾یەکە ئێستە باوە، بەتایبەتی ئەوەی مەنشاوی ئەیخوێنێ -خوا لێی خۆشبێ- وە مەبەست لەو شێوە خوێندنە ئەوەیە کە دڵ حازرو ئامادەبێتو بەباشی بیربکاتەوە لە مەبەستو شتە نهێنیەکانی ئایەتو ووتەکانی، بەم ڕەنگە لەکاتی ناوبردنی خواو سیفەتەکانیا دڵ هەست بکات بەگەورەییو بەرزیو پاکیو بێوێنەیی خوا، لەکاتی گەیشتن بە بەڵێنو باسی بەزەییو لێبووردنی خوادا ئومێدو چاوەڕوانی بۆ پەیدابێ وەلەکاتی گەیشتن بەهەڕەشەو باسی تۆڵەو سزای خوا ترسو بیم فەراهەم بێت وەلەکاتی گەیشتن بە فەرمانەکانی خواو جڵەوگیریەکانی ملکەچیو گوێ ڕایەڵی لەناوەڕۆکی دڵەوە هەڵقوڵێ، وە هەروەها....

دەی بێگومان ئەگەر بە پەلە پەل بخوێندرێو بدرێ بەمل یەکا ئەو مەبەستە گرنگانە پێك نایەن. خوای گەورە بەو نوێژو شەو نوێژو قورئان خوێندنە پێغەمبەری خۆشەویستی(ﷺ) ئامادەو شیاوکرد بۆ هەڵگرتنو ڕاگەیاندنی ئەو کارە گرنگەی کە بۆی هەڵبژارد کە بێگومان ئەوە پیرۆزترو بەهێزترو ڕاست ترین ڕێگا بوو بۆ ئەو مەبەستە گەورەیە. لەبارەی شەو نوێژیەوە چەند ڕیوایەتێ هاتووە کە چەند جۆرو شێوەیەك نیشان ئەدەن لە چۆنیەتی ئەو شەو نوێژەی، ڕیوایەتی صەحیح لەسەر ئەوەیە کە نوێژی وەتری لە یانزە ڕکات تێپەڕی نەکردووە، بەڵام ئەو یانزە ڕکاتە نزیکی دوولەسەر سێی شەوی پێتەواو ئەکرد بەخوێندنی قورئان بەو جۆرو شێوە شیرینەی کە خوا فەرمانی پێدا.

ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیا حەدیسێك ئەهێنێ لە سەعیدی کوڕی هیشامەوە کە چووەتە خزمەتی ئیبن عەباس -خوا لێیان ڕازی بێ- پرسیاری نوێژی وەتری پێغەمبەری لێ ئەکات(ﷺ) ئەویش ئەفەرموێ: با هەواڵت بدەمێ بەزاناتر بەوە لەم جیهانەدا، بڕۆ بۆلای عائیشەو پرسیار لەو بکە ئینجا وەرەوە بۆلام هەواڵم بدەرێ بەوەی پێت ئەڵێ... ئینجا سەعید ئەچێتو ئەڵێ ئەی دایکی بڕواداران هەواڵم بدەرێ لە خووو ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەویش ئەفەرمویٚ: ئایا قورئانت نەخوێندوە؟ ئەڵێ منیش ووتم: بەڵێ، ئەویش ئەفەرمویٚ: بێگومان خوو ڕەوشتی بریتی بوو لە قورئان، ئینجا سەعید ئەڵێ: نیازم بوو هەستمو بڕۆم لە پاشان شەونوێژیم بیرکەوتەوە، ووتم: ئەی دایکی بڕواداران هەواڵم بدەرێ لەبارەی شەونوێژیەوە، ئەویش فەرمووی: ئایا سورەتی(المزمل)ت نەخوێندووە؟ منیش ووتم: بەڵێ، ئەویش فەرمووی: خوا لەسەرەتای ئەم سوورەتەوە شەونوێژی پیویست کرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکانی یەك ساڵ شەونوێژیان کرد هەتا پێیان ئاوسا، خوا دوا دوایی سوورەتەکەی لە ئاسمان ڕاگیرکرد دوانزە مانگ، لەپاشان بەشی دوایی ئەم سوورەتەی نارده خوارەوەو بەوە ئەرکەکەی سوك کرد، بەهۆی ئەوە شەونوێژ گەڕا بەسوننەتو بەفەرز بەپێی ڕای زۆربە کرا بەسوننەت لەسەر هاوەڵەکانی بەڵام لەسەر خۆی هەر بە فەرزی مایەوە، ئینجا نیازم کرد هەستم لەپاشان بیرم کەوتەوەو ووتم: ئەی دایکی بڕواداران هەواڵی نوێژی وەتری پێغەمبەرم بدەرێ(ﷺ) ئەویش فەرمووی: ئێمە سیواكو ئاوی دەست نوێژمان بۆ ئامادە ئەکرد، ئینجا خوا بەپێی ویستو خواهیشی خۆی پێغەمبەری لەخەو بێدارئەکردەوە ئینجا سیواکی ئەکردو دەست نوێژی ئەگرت، ئینجا هەشت ڕکاتی ئەکرد بەسەر یەکەوە بەبێ تەحیات خوێندن لەبەینیانا، ئینجا لەهەشتەما دائەنیشت زیکری خواو نزای ئەکرد ئینجا بەبێ سەلام دانەوە هەڵئەسا ڕکاتی نۆیەمی ئەکرد ئینجا دائەنیشت زیکرو نزای ئەکرد ئینجا سەلامی ئەدایەوە بەجۆرێ ئەمان بیست، ئینجا دوو ڕکاتی تری بەدانیشتنەوە ئەکرد، ئەوە یانزە ئەی کوڕی خۆم، ئینجا کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) چوو بەلای ساڵەوەو لەشی قەڵەو بوو حەوت ڕکاتی بەسەریەکەوە ئەکردو ئینجا سەلامی ئەدایەوەو لەپاش سەلامدانەوە وو ڕکاتی تری ئەکرد، ئەوە نۆ ڕکات ئەی کوڕی خۆم هەر نوێژێکی بکردایە پێی خۆشبوو بەردەوام بێ لەسەری، وە هەرکات خەو یا ئێشو نەخۆشی یەك خەریکی بکردایە لەشەونوێژ لەڕۆژدا دوانزە ڕکاتی ئەکرد-واتە نوێژی چێشتەنگا. وە من بزانم هیچ شەوێکی ڕۆژ نەکردووەتەوە بە قورئان خوێندنەوە، وە هیچ مانگێ بە ڕۆژوو نەبوو لەسەر یەك بێجگە لە ڕەمەزان.

خوای گەورە ئەو فەرمانە گەورەی دا بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئینجا هۆی ئەو فەرمانە باس ئەکات ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ بەڕاستی ئێمە وتراوێکی قورس و گران ئەخەین بەسەرتا و ئەیدەین بەملتا واتە قورئان وەحی ئەکەین و ئەینێرینە خوارەوە بۆ سەرت کە ئەو قورئانە ئەرکی گرانە و پێویستی هەیە بەخۆ ئامادەکردن بۆی، قورئان خۆی لەخۆیا سوك و ئاسانە و ڕوون و ڕەوانە بۆ ووتن و بۆ بیرکردنەوە و پەندو تەمێ دادان و وەرگرتن، بەڵام زۆر قورس و گرانە لە تەرازوی خواو لە کێشانەی ڕاستی دا، قورس و گرانە لە کارکردنی لە دڵ و دەروونا، وەرگرتنی ئەو ڕووناکی و ناسین و زانینە و دەست بەسەرا گرتنی قورس و گرانە و پێویستی هەیە بەخۆ ئامادەکردن بۆی، پەیوەستی بە کۆمەڵی هەرە بەرز و بەگیانی بوون و بوونەوەرەوە بەو جۆرەی کە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) فەراهەم هات شتێکی قورس و گرانە و ئەو ئامادەکردنەی ئەوێ.

دامەزراوی ڕێك و ڕاست لەسەر ئەو سپاردە گەورەیە بەبێ دوودڵی و چاوە چاوە و لاکردنەوە بەملاوئەولادا و خۆگرتن و نەچوون بەدەم هیچ هێزێکی ڕاکێشەرو هیچ ڕێگاگرو بەرگری کەرێکەوە هەموو ئەمانە زۆر ئەرکێکی قورس و گرانن و پێویستن بەو وئامادەکردنە دوورو درێژە، بێگومان شەونوێژ لەکاتێکا خەڵکی خەوتوون و دوورکەوتنەوەو بچڕان لە تەمو تاریکی ژیانی ڕۆژانە وەیادو پەیوەستی دڵ بەخواوەو وەرگرتنی فەڕو ڕووناکی لێی، کۆبوونەوەو خەڵوەتکردنی دڵ لەگەڵی، خوێندنی قورئان بەو ڕێك وپێکیە و بەوجۆرەی کە هاتۆتە خوارەوە لە کۆمەڵی هەرەبەرزەوە، هەموو ئەوانە توێشوو خۆراکن وە هێزی دڵن بۆ هەڵگرتنی ئەو قورئانە زۆرە، بۆ هەڵسان بەو ئەرکە زۆر گرانەو ئەو تێکۆشانەی کە ڕووی کردە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هەروەها هەرکەس ئەو بانگ و بانگەوازەی ئەو بسێنێتەوە تا ڕۆژی دوایی لە هەموو چین و چەرخێکدا. ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ﴾ بەڕاستی ئەو گوێڕایەڵی و خوا پەرستیەی کەلە شەودا ئەبێ

هِيَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾

﴿هِيَ أَشَدُّ وَطْـًٔا﴾ هەر ئەو بەتین ترە لەبارەی ئەرك و زەحمەتەوە ﴿وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾ وە ڕێك و ڕاست و ڕوون ترە لەبارەی وتنەوە، واتە ئەو عیبادەت و خوا پەرستیەی کەلەشەودا بکرێ قورس و گرانترە لەوەی کەبە ڕۆژ بکرێ، کەواتە لەش و دەروون ڕام ئەکات لەسەر خۆگری و فێری هەڵگرتنی کاروباری گرانی ئەکات. هەرکەسیش بەوجۆرە ڕام بێت ئەتوانێ خۆگرو زاڵبێت لەمل ملان و بەربەرەکانێی بێبڕواو دوژمنان دا، هەروەها خوێندنی قورئان کەلەشەودا بکرێ یالە شەونوێژدا، تێگەیشتن و بیر کردنەوە تیایا تێرو تەواوترو ڕوون ترە، چونکە بەدڵێکی خاوێن و ئامادەوە ئەخوێنرێ، و کاتەکەش کاتێکی بێدەنگی و ئارام و بێکارو فەرمانیە، کەواتە خەریك کەری دڵ زۆرکەمە.

ئەو خوایە کەویستی پێغەمبەرەکەی ئامادە بکات(ﷺ) بۆ وەرگرتی ئەو قورئانە گەورەیە، و بۆ هەڵسانی بەو کارو ئەرکە زۆر قورسە شەو نوێژی بۆ هەڵبژارد چونکە خوا پەرستی لەشەودا ڕێك و پێکترو بەکارترەو زۆرتر پەرژان هەیەو دەست خاڵیە بۆ لێ بڕان بۆی. بەڵام لەڕۆژدا کارو فەرمانی تر زۆرترە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا﴾ بێگومان بۆ تۆ هەیە لە ڕۆژدا خەریك بوونی دوورو درێژ بە کارو فەرمانی ترتەوە ئیتر کارو فەرمانی پێغەمبەرێتی و هەوڵدان بۆ چەسپاندنی فەرمانی خوا لەناو خەڵکا، یا کارو فەرمانی ژیانیش، کەواتە با ڕۆژ بۆ ئەوە دابنرێ و لەوەدا بەخت بکرێ، و بالەشەویشدا هەر نوێژو یادو باسی خواو خوێندنی قورئانی تیا بکات.

هەڵئەگرێ کەسێ بڵێ ئەو نەخەوتن و بێ ئارامیە لەشەودا مەردوم بێهێزو لاواز ئەکات لەخۆگرتن و بەربەرەکانی، کەواتە چۆن لێرەدا ئەکرێ بەهۆی هێزو چالاکی؟ وەڵامی ئەم ڕەخنەو پرسیارە خەلیفەی چوارەم -خوا لێی ڕازی بێ- ئەیداتەوە. با گوێ شل کەین بۆ ئەم فەرموودەی کەڕیوایەت کراوە لێیەوە کەئەمە دەقەکەیەتی: لام وایە کەسی واتان هەیە ئەڵێ: کاتێ حاڵی کوڕی ئەبو تالیب ئەم جۆرەبێت: تەنگ گوزەران و کەم خۆراك و بەشەویش خەریکی شەونوێژبێت و کەم خەویی بێگومان بێهێزو لاواز ئەبێ و ناتوانێ جەنگ بکا لەگەڵ هاوسەرو دوژمنانا و بەربەرەکانێی ئازاو چالاکانی پێناکرێ. بابزانن درەختی

چۆڵی و بیابان ڕەق ترو بەهێزترە، درەخت و نەمامی ئاوەدانی و خزمەت کراو نەرم و ناسکە، ئەو دارەی لەشوێنی چۆڵ و بێ خزمەت دا ئەڕوێ ئاگری بەهێزترە و درەنگ تر ئەکوژێتەوە. من و پێغەمبەر دوو پەلی دارێکین و یەك بنکمان هەیە واتە هەرچۆنێ ئەو تەنگ گوزەران و کەم خەو و کەم خۆراك بوو لەگەڵ ئەوەدا بەهێزترو چالاك تر بوو، هەروەها منیش لەسەر ڕەوشت و کردەوەی ئەوم. ئینجا فەرمووی: سوێن بە خوا ئەگەر هەموو عەرەب یەك بن و پشت گیری یەك بکەن لەسەر جەنگ کردن لەگەڵم پشتیان تێ ناکەم...هتد. لەم فەرموودەیەوە ئەزانرێ کە وەرزش و پیازە کردن بەڕۆژو شەو نوێژو کەم خەوی و کەم خۆراکی و تەنگ گوزەرانی ئەگەر زیادە ڕەویان تیا نەکرێ و بە شێوە شەرعیەکەیان بەکاربهێنرێن، بەم ڕەنگە پەیڕەوی پێغەمبەریان تیا بکرێ، هەموو ئەوانە هۆی تەندروستی و لەش ساغی و بەهێزی و چالاکین و بەو جۆرە نیە کە نەزان گومان ئەبات.

ئینجا فەرمانی پێئەدا بە بەردەوامی لەسەر یادو ناوبردنی خواو خۆ ڕووت کردن و بچڕان لە هەموو شتێ بۆلای خوا. ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ﴾ وە ناوی خوای پەروەردگارت بەرە بەهەمیشەیی، دیارە مەبەست باس و ناو بردنی نیە تەنها بەزوبان و تەزبیحێکی سەد دانەیی بگیرێ بە دەستەوە، یا بکرێتە مل و هەمیشە دەم و لێوو پەنجە بجوولێنرێن پێیەوە! بەڵکو مەبەست یادو ووتنی دڵێکی ئاگایە لەگەڵ زوباندا، ئیتر ئەو باس و یادە بەهەر جۆرو شێوەیەك بێ یا مەبەست یادو ناوبردن بێت بە نوێژو قورئان خوێندن، ﴿وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا﴾ وە خۆت بپچڕە لە هەموو شتێ و بە تەواوی ڕوو بکەرە خوا بە پچڕان و ڕوو تێکردنێ کە پاك و خاوێن بێ لە غەیری خواو لە هەموو خەریك کەرێ و لە هەموو نیازو مەبەستێ تر. ئینجا هۆی ئەو فەرمانە دەرئەکەوێ کە ئەفەرموێ: ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ﴾ ئەو پەروەردگاری تۆیە پەروەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە، واتە هەموو بوونەوەر ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ خوایە نیە بێجگە لەوو تەنها ئەو خوایە ﴿فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا﴾ کەواتە ئەو خوایە بکە بە پشت پێبەسراو حەواڵە بۆلا کراوی خۆی لە هەموو کاروبارێکتا بەتایبەتی لەکاروباری فروستادەیی و پێغەمبەرێتی دا، واتە ماتوڵ خواو پەروەردگاری هەموو شتێکەو تاك و تەنهایەو هیچ خوایە تر نیە کەواتە پچڕان لە هەموو شتێ و ڕووکردن بە تەواوی بۆلای ئەو تاقانە شتێکی ڕاستی ڕاستەقینەیە کە بێجگە لەوە ناڕەواو ناشایستەیە، پشت بەستن بەو و حەواڵەکردنی هەموو شتێ بۆلای ئەو پشت بەستن و حەواڵە کردنە بۆلای تاقانە هێزێکی ڕاستی ڕاستەقینە.

وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا ﴿١٠﴾ وَذَرۡنِي وَٱلۡمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ وَمَهِّلۡهُمۡ قَلِيلًا ﴿١١﴾
إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا ﴿١٢﴾ وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ وَعَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٣﴾ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ وَكَانَتِ
ٱلۡجِبَالُ كَثِيبٗا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ رَسُولٗا شَٰهِدًا عَلَيۡكُمۡ كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا ﴿١٥﴾
فَعَصَىٰ فِرۡعَوۡنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذۡنَٰهُ أَخۡذٗا وَبِيلٗا ﴿١٦﴾

---

**پشت بەستن تەنها بەخوا سەرەنجامو بەرهەمێکی سروشتیە بۆ بڕوا بە تاکو تەنهایی خواو پەروەردگارێتی خوا... ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە(ﷺ) کە بانگ کرا بۆ ئەمەی ڕاپەڕێو هەڵسێ بە ئەرکی پێغەمبەرێتی، پێویستە لە یەکەم جارەوە بە تەواوی ڕوویکاتە خواو لە هەموو شتێ تر بپچڕێو تەنها پشت بەو ببەستێ، چونکە تەنها بەهۆی ئەوەوە هێزو توێشووی دەستکەوت ئەبوو بۆهەڵسانی بەو ئەرکە گرانەو لەو ڕێگا درێژەدا. ئینجا فەرمانی دا بە ئارامو خۆگرتن بەرانبەر لاریو نالەباریو دەم بازیو سەرکەشی بێبڕواکان، لێیان گەڕێ بۆخواو کەمێ مۆڵەتیان بدە، چونکە سزای سەختی لا هەیە بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ بە ئارامو خۆگر بە لەسەر ئەو وتە ناشیرینو ناڕەوایانەی کە ئەوانە ئەیڵێن.**

**لە سەرەتاوە دوو ڕیوایەتمان هێنا لەبارەی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتەوە ئەگەر یەکەم ڕیوایەت ڕاستو صەحیح بێت ئەو کاتە ئەبێ لەم ئایەتی دەهەمیشەوە تا ئایەتی نۆزدە لەسەرەتای پێغەمبەرێتیەوە نەهاتبنەوە خوارەوە، بەڵکو ئەمانیش وەك بەشی دووهەمی سوورە تەکە دواکەوتبن پاش دەرخستنی بانگەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و دەرکەوتنی بێبڕواکانو دەم درێژیانو ڕقو کینەی بەتینیان دەربارەی پێغەمبەرو ئایینەکەیو بڕواداران. ئەگەر ڕیوایەتی دووەم صەحیحو ڕاست بێت: ئەو کاتە ئەبێ بەشی یەکەمی بەتەواوی هاتبێتە خوارەوە لەپاش ئاشکراکردنی پێغەمبەرێتیو بانگ کردنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەبۆنەی کردەوەی خراپی بت پەرستەکانو ئازار دانی دڵی پێغەمبەر و بەگری کردنی ئایینو بانگ کردنەکەی. بەهەر حاڵ فەرمان دان بەئارامو خۆگری درا لە پاش فەرمان دان بەشەونوێژو یاد باسی خوا، ئەو دوو فەرمانە زۆر جار یەك ئەگرنو کۆئەبنەوە بۆ ئەوەی توێشوویان لێ وەرگیرێ بۆ ئەو ڕێگە سەختو درێژە.**

فەرمانی دا بەئارام‌و خۆگرتن‌و ئینجا فەرمووی: ﴿وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا﴾ وە قسەیان لەگەڵ مەکەو پشتیان تێبکە بە شێوەیەکی جوان، بەم ڕەنگە کەناربگرە لێیان بەبێ گلەیی‌و بناشت‌و قسەوباس، بێگومان ئەمەش پێویستی هەیە بەئارام‌و خۆگری لەپاش یادو باسی خوا. ئارام‌و خۆگرتن شتێکە خوا فەرمانی پێداوەو وەسێتی پێکردووە بۆ هەموو پێغەمبەرو نێرراوێکی، وەبۆ هەموو بڕواداران‌و شوێن کەوتووەکانیان، هەموو جارێ ئەم فەرمان‌و وەسیەتەیان بۆهاتووە، چونکە بەڕاستی ئارام‌و خۆگری توێشوو خۆراکیانە، چەك‌و قەڵغانیانە، قەڵا‌و پەنایانە، بانگ کردن بۆ ڕێگای خوا سەراسەر تێکۆشانە.... لەگەڵ سەرکەشی‌و تاربوون‌و پەلەکردنی‌و نائومێدی دا... تێکۆشانە لەگەڵ دوژمنەکانی ئەم ئایین‌و بانگ کردنەدا، لەگەڵ تەگبیرو پیلان‌و پڕوپاگەندەکانا. وە تێکۆشانە لەگەڵ هەموو دەروونا بە شێوەی گشتی لەکاتێکا کە ئەیانەوێ خۆیان قوتار بکەن لەئەرك‌و زەحمەتەکانی ئەم ئایین‌و بانگ کردنە،و ئەیانەوێ خۆیانەوێ خۆیان بشارنەوە لەپەنای پەردەو لەژێر چەند پۆشاکێك دا، بێگومان بانگ کەر بەرانبەر ئەم هەمووە، چەك‌و خۆراکی ئەبێ هەر ئارام‌و خۆگری بێت‌و ئەبێ یادو باسی خوایشی لەگەڵ بێت لە هەموو شوێنێکا، ئینجا دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات ئەم هەڕەشە سامناکەی کەئاڕاستەی بێ بڕواکانی ئەکات‌و ئەرکی بەربەرەکانی‌و دوژمنایەتی یەکەیانی لەکۆڵ ئەخات‌و ئەیگرێتە ژێردەستی خۆی ئەفەرمووێ: ﴿وَذَرۡنِي وَٱلۡمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ﴾ وازبێنە لەمن لەگەڵ بێبڕوا سامان دراو خاوەن ناز نیعمەتەکاناو لێیان گەڕێ بۆ خۆم ﴿وَمَهِّلۡهُمۡ قَلِيلًا﴾ وەکەمێ مۆڵەتیان بدە، واتە خۆم چارەسەریان ئەکەم‌و تۆڵەیان لێ ئەسێنم بەجۆرێ شایستەو دەقی تاوان‌و خراپەکانیان بێت، هەر ئەنداز مۆڵەت بدرێن هەر کەمە، بابەئەندازی هەموو تەمەنی ئەم جیهانە مۆڵەت بدرێن چونکە ژیانی ئەم جیهانە لەحیسابی خوادا وەك ڕۆژێ یا تاقێك وایە لەڕۆژێ بێبڕواکانیش لەڕۆژی دوایی دا هەر بەجۆرەی سەیر ئەکەن، بەڵکوبە سەعاتێکی سەیر ئەکەن، کەواتە ماوەی مۆڵەت دانەکەیان هەر کەمە با لەژیانی ئەم جیهانەدا خوا سزایان نەداو تۆڵەیان لێ نەسێنێ، چونکە ئەبێ هەر بگەن بەم چەند جۆرە سزایەو دواڕۆژو چارەنوسیان ئەمەیە کە هەڕەشەیان لێ ئەکات‌و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا﴾ بەڕاستی لامانە چەند کۆت‌و زنجیری قورس‌و گەورە، ئامادەکراون بۆبێبڕواکان‌وئەخرێنە قاچ‌و دەست‌و گەردنیان لەناو دۆزەخدا، ﴿وَجَحِيمٗا﴾ وەئاگرێکی هەڵگیرساوی بڵێسەدارمان لایەبۆیان ﴿وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ﴾ وە خۆراکێکمان لایە کەلە

گەرووداا ئەوەستێ و ئەگیرێ، نە ئەچێتە خوارەوەو نەدێتە دەرەوە ﴿عَذَابًا أَلِيمًا﴾ وە سزایەکی ئێش و ئازار دەرمان لایە بۆیان، وا دەرئەکەوێ کە ئەم سزایە لەجۆرێکی تری نەناسراوەو وێنەو نموونەی لەم جیهانەدا دروست نەکراوە، خوا بە بەزەیی و میهرەبانی خۆی بمان پارێزێ لێیان. ئەو سزایانە زۆر رێك و رەواو ڕاستن لەگەڵ ئەوانەی کە خوا سامان و نازو نیعمەتی ڕشت بەسەریاناو کەچی بەو جۆرە یاخی بوون و دژی ئایینی خواو پێغەمبەرەکەی هەڵسان. ئینجا شێوەیەکی سامناکی ئەو ڕۆژە نیشان ئەدا کە ئەو سزا سەختەی تیابەدی دێت، ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ﴾ ئەو سزایە لای ئێمە هەیە بۆ ئەو بێبڕوایانە، لەڕۆژێکا کەزەوی و شاخەکان ئەکەونە جومبش و لەرزە، ﴿وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا﴾ وە شاخەکان ئەبن بەتەپۆڵکەی لم و تۆزی نەرم و ناسك، پەنا بەخوا سزاکە تێپەڕی ئەکات بۆ هەموو زەوی و شاخەکان و ئەوەیان بەسەردێت چ جای ئادەمی لەڕو لاواز!

ئینجا لایە ئەکاتەوە بۆ لای بێڕوا دەسەڵات و سامان دارەکان، فیرعەونی دەسەڵات داری ستەم گاریان بیرئەخاتەوە کەچۆن لەناوی برد بەخۆی و سوپاو دەسەڵات و پادشایەتی یەوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ﴾ بەڕاستی ئێمە ناردمان بۆلاتان پێغەمبەرێ کە شایەتە بەسەرتانەوە، لەو ڕۆژە سەختەدا شایەتی ئەدات لەوانەتان کەبڕوایان نەهێناو دژی ئایینی خوا وەستان، هەر چۆنێ شایەتی ئەدا بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناو گوێ ڕایەڵبوون! ئەو پێغەمبەرەمان بۆ ڕەوانەکردن ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا﴾ هەرچۆنێ ڕەونەمان کرد بۆلای فیرعەون فروستادەو پێغەمبەرێ ﴿فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ﴾ فیرعەون و گوێ ڕایەڵی نەبوو و سەرپێچی کرد لەو پێغەمبەرە، ﴿فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾ ئینجا ئێمەش گرتمان و تۆڵەمان لێ سەند بەگرتن و تۆڵەیەکی قورسی دوواڕۆژو سەرنجام بەدو خراپ و لەچەند ئایەتێك دا باس کراوە. ئاوا بەکورتی دڵیان دائەچڵەکێنێ بەباسی ئەم سزایە، لەپاش نیشاندانی ئەو شێوە سزایە کەزەوی وێران ئەکات و شاخەکان ئەکا بەتۆز!

فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ۚ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾
إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾ ۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَىِ
ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ

---

ئەوە دوو جۆر سزابوو: سزای ئەو جیهانو سزای ئەم جیهان، کەواتە بێ بڕواکان چۆن خۆیان بۆ ڕزگار ئەکرێ لێیان؟ ئینجا جارێ تر ئەیان ترسێنێ بەسزای ڕۆژی دوایی، بەسەرهاتو ڕووداوێکیان بۆباس ئەکات کەکار ئەکات لەسروشتی منداڵو تێپەڕئەکات بۆ تێکدانی ئاسمان. ئەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا﴾ ئینجا ئایا ئێوە چۆن خۆتان ئەپارێزن، ئەگەر بڕوا نەهێنن، لەڕۆژێ کە ﴿يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا﴾ منداڵە ساواکان ئەگێڕێ بەپیر ﴿ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ﴾ ئاسمان لەت لەت ئەبێ پێی ﴿كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا﴾ بەڵێنی خوا لەزانینو بڕیاریا تێپەڕی کردووە کەشتێکی کراوی بەدی هێنراو ئەبێ. ئینجا لەکاتی نیشاندانو بیر خستنەوەی ئەو هەموو بیمو ترسە لەم کاتەدا کە زۆر بەجێ یە بۆ ئامۆژگاری، دەست کاری یەکی دڵو دەروون ئەکات بۆ ئەمەی بیربکەنەوەو ڕێگای خوا بدەنەبەر کە ڕێگای بەختەوەریو بێباکی یە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ﴾ بەڕاستی ئەم ئایەتانە ئامۆژگارو بیرخەرەوەن ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ ئینجا هەرکەس ویستی ڕێگای ئەداتە بەر بۆلای پەروەردگاری، واتە ڕێگا دانەبەر بۆلای خوا ئاسانەو هەرکەس بیەوێ ئەتوانێ بیداتە بەر کەواتە با مەردوم لەم جیهانەدا فریای خۆی کەوێ تا کاتو هەلی لەدەست دەرنەچووە.

لەم کاتەدا کەئەم ئایەتانە دڵو ئەژنۆی بێبڕواکان ئەهێننە لەرزە لەهەمان کاتا بڕواو دڵنیاییو خۆشی ئەخستەدڵی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەو تاقمەبێ دەسەڵاتەی کە لەگەڵی بوون، چونکە ئەیان زانیو هەستیان ئەکرد کە خوای پەروەردگار لەگەڵیانە، دوژمنەکانیان ئەکوژێو سزیان ئەدات، ئەم ماوەیە کە مۆڵەت دراون شتێکی کەمەو بەزوویی دوایی دێت لەکاتی دیاری کراوی خۆیا، وە ئەیزانی کە خوا واز ناهێنێ لەدۆستەکانی و دەستیان بەڕەڵا ناکات بۆ دوژمنەکانی. ئینجا لێرەدا بەشی دووەمی سوورەتەکە دێت لە تەنها ئایەتێکدا، کە هاتە خوارەوە لەپاش سەرەتای سوورەتەکە بەیەك ساڵ لەسەر بەهێزترین ڕای زانایان. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەستی بەزەییو میهرەبانی هێنا بەدڵو دەروونی بەفەڕی

پێغەمبەردا(ﷺ) هەروەها ئەو تاقمە بەختیارەی کەلەسەر ڕێبازی بوون، ماندوویی دەرکردن و ئەرکی سەرشانی سووک کردن، ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەو هاوەڵەکانی پێیان بوو بەهۆی وەستانی دوورو درێـژیان لەوشـەونوێژدا، خـوا نەیەویـست ئـەو پێغەمبـەرە(ﷺ) ناڕەحـەت و تەنگەتاو بکات بەو شەونوێژو قورئان خوێندنە، بەڵکو ویستی ئامادەی بکات بۆ ئەو کارو فەرمانە زۆر گەورەیـەی کە پـێی سپێرراوەو ئەوبێ تێکۆشانی تیا بکات هەر ئەندز ژیانی مابێت. هەروەها ئەو تاقمە بەختیارەش کەلەسەر ڕێگاکەی بوون، ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ﴾ بێگومـان پـەروەردگارت ئـەزانێ کـە تـۆ ئەوەسـتی لـە شـەونوێژدا کـەمتر لە(٢/٣)ی شەو. ﴿وَنِصْفَهُ﴾ وە نیوەی شەو ئەوەستی ﴿وَثُلُثَهُ﴾(١/٣)ی وەسێیەکی ئەوەستی. واتە بەسـێ جۆر تۆ شـەونوێژ ئەکـەیت ﴿وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ﴾ وە تاقمـێ لەوانـەش کەلـە گەڵتن لەو جۆرانەی تۆ شەو نوێژئەکەن.

فەردوودەکـە خۆشەویـستی و ئـارام پـێدان و دڵنیـایی لـێ ئـەبارێ، واتـە خـوای تـۆ تـۆ ئەبینێ و ئاگایەو زانایە بەوەستان و نوێژەکانت، وە بوەستان و نوێـژی ئەوانـەش کـە لەگـەڵتن، نوێـژو وەستانەکەتان وەرگیراوە لای خـواو لـە تـەرازووی خـوادا. خـوای تـۆ ئـەزانێ کـە تـۆو ئـەوان گوێتـان نـەدا بەراکـشان و خـەوو جێگـای گـەرم و نـەرم. لەبەرئـەوە ئەیـەوێ بـەزەیی و میهرەبـانی بـەکاربهێنێ لەگـەڵ تـۆو لەگـەڵ ئـەوانیش. ﴿وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ وە هـەر خـوا ئەندازەی شەوو ڕۆژ بڕیار ئەداو دیاری ئەکات و کورت و درێژی ئـەکات، کەواتـە ئـەو بـەڕێک و ڕاستی هەمیشە ئەندازیان ئەزانێ ﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ﴾ خوا زانی کە ئێوە هـەرگیز نازانن دیـاری بکـەن و هـەڵی ژمێـرن. (مقاتل) و چـەند کەسـێتر ئەفـەرموون: کاتـێ سـەرەتای ئـەم سـوورەتە هاتـەخوارەوە، بەو شێوە شـەونوێژ پێویست کراو موسڵمانان کەوتنە مەینـەت و ناڕەحتی، پیاوی وابوو نیوەی شـەوی نەئـەزانی و بۆی جوێ نەئەکرایـەوە لـە سێیەک، لەبەرئـەوە هـەتا ڕۆژ ئـەبووەوە هـەر خـەریک ئـەبوو لەترسـی ئـەوە نـەک هەڵـەبکات و ئەندازی پێویستی بـەجێ نەهێنابێ، بەهۆی ئەوە پێیان ئاوساو ڕەنگیان زەردو لاوازبوو، ئینجا خـوا میهرەبانی کردو کارەکەی لەسەر سووک کردن، وەکو فەرمووی: ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ لەبەرئەوە گەڕایەوە سەرتان لە ناڕەحەتیەوە گێڕانیەوە بۆ ڕەحەتی، لەکردەوەی گرانەوە بۆ کردەوەی ئاسان، ڕێگای دان کە ئەو ئەندازە دیاری کراوە بەجێ نەهێنن. خوا نایەوێ بارتان گران بکات و تەنگەتاوتان بکات، بەڵکو ویشتی توێشوو هەڵگرن و ئامادەبن، وەئەوەش بەجێهات.

﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿٢٠﴾

---

**﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ﴾ كەواتە هەر ئەنداز ئەگونجێ و بەئاسانی پێتان ئەکرێ شەونوێژ بکەن و قورئانی تیا بخوێنن. ئینجا چەند هۆیەتر باس ئەکات بۆ ئەو بارسووك کردنە، ئەوەش چەند شتێکە ڕوو ئەکاتە موسڵمانان و بەرگریان ئەکات لەو شەونوێژە زۆرو گرانە: وەك نەخۆشی و گەڕان و سەفەر کردن بۆ بازرگانی و ڕۆزی پەیدا کردن و غەزاکردن و جەنگ کردن لەڕێگای خوادا، ئەفەرموێ: ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ﴾ خوا زانی کەلەمەو پاش لەناو ئێوەدا چەند نەخۆشتان ئەبێ، ﴿وَءَاخَرُونَ﴾ وە چەند کەسێ‌ترتان ئەبن ﴿يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەڕۆن و سەفەر ئەکەن بەولاتانا ﴿يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾ نیازی هێنەدێ لەبەهرەو ڕۆزی خوا ئەکەن و بەدوایا ئەگەڕێن بێ‌گومان ئەم هەوڵ و تێکۆشانە ئیسلام پێویستی کردووە بۆژیان و ئەگەر بەپێی بەرنامەی خوا بکرێ، بەعیبادەت و خوا پەرستی دائەنرێ، خوا نایەوێ بەندەکانی سەربکەنە تەنها نوێژو ڕۆژو گۆشەگیری و وازهێنان لەژیان و هۆی ژیان،(ئیبن مەردەویە) حەدیسێ لە(ئیبن و مەسعود)ەوە ئەهێنێ کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: هەرکەس خۆراکێ بێنێ بۆ وولاتێ لەوولاتەکانی موسڵمانان ئینجا بەنرخی ڕۆژ بیفرۆشێ ئەو کردەوەیە ئەبێ بە هۆی پادەو پلەی بەرزی لای خوا.**

**خەلیفەی دووەم -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: لەپاش غەزاو تێکۆشان لەڕێگای خوا هیچ حاڵەتێ تر نیە کەلەسەری بمرم پێم خۆش تربێ لەوەی بمرم لەکاتێکا کەلە دۆڵ و شیوی شاخێکا بم و بەدوای بەهرەو ڕۆزی خوادا بگەڕێم، ﴿وَءَاخَرُونَ﴾ وە چەند کەسێ ترتان**

هەن ﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ جەنگو كوشتار ئەكەن لەڕێگای خوادا. ئاشكرایە كە جەنگو تێكۆشان بۆ بەرزكردنەوەی ئاڵای ئیسلامو حوكمڕانی ئیسلام پۆپەی هەرە بەرزە لە ئیسلاماو فەرزێكی زۆر گرنگە لەفەرزەكانی ئیسلام. كەواتە پێویستە كارێكی وا نەكرێ پەكی ئەم فەرزە گەورەیە بخرێ، لەبەر ئەوانەی باسكران خوای گەورە میهرەبانی كرد ئەركی شەونوێژی لەسەر سووك كردنو فەرمووی: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُ﴾ كەواتە ئەوەی كە ئەگونجێو بەئاسانی ئەكرێ لەشەونوێژو لە قورئان خوێندن تیایا، ئەوە بكەنو بیخوێنن ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژی فەرز بەڕێكو پێكی بەجێبێنن، بەمل كەچیو ئامادەییو وریایی دڵەوە ﴿وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ وە زەكات بدەن ئینجا فەرمان ئەدات -بێجگە لە زەكات- بەبەخت كردنی ماڵ لەخێرو چاكەدا لەبەر خوا، هانیان ئەدات لەسەری بەمەی ئەوە ناو ئەبات بەقەرزدان بە خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ﴾ وە قەرز بدەن بە خوا ﴿قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ قەرزێكی جوانو شیرین، بەم ڕەنگە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا بدرێو هیچ نیازێ تری لەگەڵ نەبێ، ئینجا بە شێوەی گشتی هەموو خێرو چاكەیە خۆشەویست ئەكات لایان كە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ﴾ هەر چاكەیەك كە پێشی ئەخەن بۆ خۆتان لەجیهانا ﴿تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ دەستتان ئەكەوێتەوەلای خوالەڕۆژی دواییدا ﴿هُوَ خَيۡرٗا﴾ بەچاكتر، ﴿وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗا﴾ وە بەگەورەتر لەبارەی پاداشتەوە، چونكە پاداشتی چاكە لای خوا بەدەقاتە!!

ئینجا سوورەتەكە دوایی ئەهێنێ بە ڕێنموونی ئەو بروادارانە كە خاوەنی خێرو چاكەو كردەوەی چاكن، بەداواكردنی لێ خۆش بوونو سڕینەوەی هەر كەمو كوڕیو هەرشتێكی ناڕەوا، كە بەندە هەر چەند چاك بێتو چاك بجوڵێتەوە بەرانبەر بەخوا ناتەواوەو بێ كەمو كوڕی نیەو هیچ كەس ناتوانێ هەڵسێ بەو مافەی كەلەسەریەتیو لەگەردنیایە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَ﴾ داوای لێ خۆش بوونو سڕینەوە بكەن لەخوا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ﴾ بەڕاستی خوا زۆر لێ بووردەو لێ خۆش بوویەكی میهرەبانە.

بەڕاستی ئەم بەشی دووەمە لەم سوورەتە دەست کاری کردن و تیماری دروون بوو بە شێوەی بەزەیی و میهرەبانی و خۆشەویستی و ئارام پێدان و دڵنیا کردن، لەپاش تێپەڕکردنی یەك ساڵ بەسەر ئەو هەموو تێکۆشان و ئەرکی گران و خەو لە خۆ شووم کردنەی کە باسکرا.

خوای میهرەبان ئەو ئەرکەی سووك کرد لەسەر موسڵمانان، بەم ڕەنگە ماوەی ئەونوێژی کەم کردەوە تا هەر چەندە کە ئەگونجێ و پێیان ئەکرێ، فەرزو پێویستی یەکەی سڕییەوەو کردی بە سوونەت لەسەریان، بەڵام پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هەر مایەوە لەسەر ڕێگا و ڕێبازی خۆی لەگەڵ خوای خۆیا، شەونوێژی هەر لەسەر پێویست بوو کەم تر نەبوو لەسێ یەکی شەو، خریك ئەبوو لەگەڵ پەروەردگاریا، خۆراك و توێشووی ڕۆح و ژیان و تێکۆشانی لێ وەرئەگرت، بێجگە لەوەش ئەگەر چاوی بخەوتایە هەرگیز دڵی بەفەڕی نەئەخەوت و هەمیشە خەریك ئەبوو بەیادی خواوە، بچڕابوو لە هەموو شتێ و بێجگە لەیادی خواو خۆشەویستی خوا هیچی تری تیانەبوو، لەگەڵ هەڵسانی بەئەرکی پێغەمبەرێتی و فروستادەیی بۆسەر هەمووان و گێتی.

صلى الله عليه وسلم كل حين وآن

لەکۆتایی دا ئەپاڕێمەوە لەخوای میهرەبان ببوورێ لە هەموو تاوان و گوناهم وەببوورێ لەدایك و باوکم و هەموو خزم و دۆست و برایەکی ئاینیم، لە ١٤٣/٥/١٤ لێ بوومەوە لە تەفسیری ئەم سوورەتە خوا وەری گرێ و یارمەتیم بدات بۆ تەفسیری ئەوەی کە ماوە -آمین- وە هەر لەم ڕۆژەدا دەستم کرد بە سوورەتی(المدثر).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنذِرْ (٢)

# سووره‌تی «المدثر»

## مه‌ككه‌یی یه‌و(٥٦)ئایه‌ته

## بسم الله الرحمن الرحیم

له‌باره‌ی كات و چه‌رخی هاتنه‌خواره‌وه‌ی ئه‌م سوره‌ته‌یشه‌وه دوو ڕا هه‌یه، چه‌ند ڕیوایه‌تێ هه‌یه كه ئه‌م یه‌كه‌م سووره‌ته هاتبێته خواره‌وه له‌پاش سووره‌تی(العلق) وه ڕیوایه‌تێ تر ئه‌مه‌یه كه ئه‌م سووره‌ته هاته خواره‌وه له‌پاش ئاشكرا كردنی پێغه‌مبه‌رێتی و ئازاردانی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له‌لایه‌ن بت په‌رسته‌كانه‌وه.

(بوخاری) حه‌دیسێ ئه‌مێنێ له‌(یه‌حیای كوڕی ئه‌بو كپیر)وه‌وه كه ئه‌فه‌رموێ: پرسیارم كرد له‌(ئه‌بو سه‌له‌مه‌ی كوڕی عبدالرحمن) له‌وه‌ی كه یه‌كه‌م جار هاته خواره‌وه له قورئان؟ ئه‌ویش فه‌مووری: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾ بوو، منیش ووتم: خه‌ڵكی ئه‌ڵێن سه‌ره‌تای سووره‌تی (العلق) بووه، ئه‌بو سه‌له‌مه‌ش ووتی: پرسیارم كرد له‌(جابر)و ئه‌وه‌م ووت كه تۆ ووتت،(جابر)یش ووتی: هه‌واڵێكت ئه‌ده‌مێ كه پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) پێی داوم: چووم بۆ(حیرا)و كاتێ ماوه‌ی مانه‌وه‌كه‌م ته‌واو كرد هاتمه خواره‌وه و بانگم لێ كرا، منیش ڕوانیم بۆ لای ڕاستم هیچ شتێكم نه‌دی، وه ڕوانیم بۆلای چه‌پم هیچ شتێكم نه‌دی، وه ڕوانیم بۆ به‌رده‌مم هیچ شتێكم نه‌دی، وه ڕوانیم بۆ دوا هیچ شتێكم نه‌دی، ئینجا سه‌رم به‌رزكرده‌وه و شتێكم بینی. ئینجا هاتمه‌وه بۆلای خه‌دیجه‌و ووتم دام پۆشن و ئاوی سارد بكه‌ن به‌سه‌رما، ئه‌فه‌رموێ: دایان پۆشیم و ئاوی ساردیان به‌سه‌رما، ئه‌فه‌رموێ: ئینجا هاته خواره‌وه: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنذِرْ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾. به شێوه‌یه‌تر(موسلیم) و (بوخاری) ئه‌م حه‌دیسه ئه‌مێنن له‌(جابر)ه‌وه: كه‌بیستوویه له پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له‌باره‌ی بچڕانی وه‌حییه‌وه هه‌واڵی داوه‌تێ، وه‌له‌و هه‌واڵه‌دا ئه‌مه‌ی فه‌رمووه: كه جارێ ئه‌ڕۆیشتم به‌ڕێوه ده‌نگێكم بیست له‌لای سه‌رومه‌وه، منیش چاوم

بەرزکردەوە بۆلای سەرووم، کە سەرنجم دا ئەو فریشتەیەم دی کەلە حیرا هات بۆلام، لەسەر کورسیەدا دانیشتبوو لە بەینی ئاسمانو زەوی دا، منیش سامو بیمم لێ نیشتو گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو ووتم: دام پۆشن، ئەوانیش دایان پۆشیم، ئینجا خوا سەرەتای ئەم سوورەتەی ناردە خوارەوە تا ئەگەر ﴿فَٱهۡجُرۡ﴾ ئینجا پاش ئەوە وەحیم بۆ هاتە خوارەوە یەك لەدوای یەك.

(ئبن و کەسیر) لەتەفسیرەکەیا ئەفەرموێ: ئەوەی لە بیربێ و گیرابێ ئەم ڕیوایەتە، ئەمەیش ئەوە ئەگەیەنێ کەلەپێش ئەم ڕووداوەوە وەحی هاتبێ چونکە ئەفەرموێ: ئەو فریشتەیەم دی کەلە حیرا هات بۆلام، کەئەوەش(جوبرەئیل) بوو کەلە یەکەم جارەوە سەرەتای سوورەتی(العلق)ی هێنابوو.

ئینجا لەپاش ئەو یەکەم جارە وەحی وەستاو ئینجا لەپاش ماوەیە فریشتەکە هاتەوەو وەحی هێنا، بەم شێوەیە هەر دوو ڕیوایەتەکە ڕێکەو دژایەتی ڕوونادا، چونکە ئەو کاتە سەرەتای ئەم سوورەتە ئەبێ بەیەکەمی پاش بچڕانو هاتنەوە، ئینجا ئایا سەرەتای ئەمو سەرەتای(المزمل) کامیان لەپێشەوە هاتبێ ئەوە جێگای گومانەو ناتوانین بەدڵنیایی و بێگومان دان بنێین بەهەرکام لەو دوو بارە، چونکە هەر دوو سەرەتا هاتوون بۆ ئامادەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەڵسانی بەو کارەو ئەرکە زۆر گرانەی کەپێی سپێررا، کە ئەوەش پێویستی هەیە بە ئامادەکردنێکی دەروونی لەپێشەوە، هەر دوو سەرەتا ئەو ئامادەکردنەی تیایە..... بەڵێ دڵ زیاتر بۆ ئەوە ئەڕوا کە سەرەتای(المزمل) لە پێشەوە هاتبێ لەو ماوەدا کە بانگ کردنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەنهێنی بووو سەرەتای ئەم سوورەتە لەپاش ئەو ماوەیە هاتبێ و بەهاتنی ئەم، ئەو قۆناغە دوایی هاتبێ و قۆناغی دووەم دەستی پێکردبێ کە قۆناغی دەرخستنی بانگ کردنە، هەروەها لەسەر هەموو بار دڵ بۆ ئەمە بەهێزترە کە سەرەتای ئەم دوو سوورەتە لەگەڵ باقی تری سوورەتەکەیانا نەهاتبێتە خوارەوە، بەڵکو هەردوو سەرەتا ماوەیە بەینیان کەوتبێ لەگەڵ ئەوی تریانا، بەهەرحاڵو بەهەر جۆر بووبێن هیچ مەبەستێکی سەرەکی ناگۆڕێو لەدەست دەرناچێ، کەواتە بابێینە سەر تەفسیری سوورەتەکەبە یارمەتی خوا. ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ﴾ ئەی کەسێ

که خۆت داپۆشیوەو پێچاوەتەوە بەسەر بەرگ و پۆشاکەکەت ﴿ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾ هەستەو ڕاست بەرەوەو مەردوم بترسێنە. ئەمە بانگ کردنێکی زۆر گەورەو گرنگە لەلایەن خوای بەرزو بڵندەوە هات بۆ هەڵسان و بەجێهێنانی کارو فەرمانێکی زۆر گەورەو گران. هات بۆ هەڵسانی بەترساندنی هەموو ئادەمی و بێدار کردنەویان و ڕزگار کردنیان لە خراپەو ناڕەوایی جیهان، لەئاگرو سزای ڕۆژی دوایی، بۆ تەمێ کردن و نیشان دانی ڕێگای بەختەوەری لەپێش لەدەست چوونی کات و هەلیان. بەڕاستی کارو فەرمانەکە ئێجگار قورس و بەئەرکە. وەرە بیرکەرەوە لەوەی تەنها کەسێ هەر چەند پێغەمبەرو نێرراوی خوا بێ بوەستێ بەرانبەر هەموو ئادەمی و جیهان و بیەوێ گۆڕانێکی تەواوی سەرتا بەخوار پێك بێنێ، بەرگری ئەو گومڕایی و بەد کرداری و لاری و ناڵەباری و سەر کەشی یە بکات و وەری گێڕێ بۆ ڕێنومایی و چاك کرداری و ڕاست و ڕێکی و گوێ ڕایەڵی!!

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) هەر چۆنێ ترسێنەر بووە، هەروەها موژدە دەریش بووە، بەڵام ترساندن ئاشکراتر فەرمانە بۆ پێغەمبەران(درودی خوایان لێ بێ) بە تایبەتی لەسەرەتاو یەکەم جاری هاتنیان، چونکە ڕەوانە کردنیان لەکاتێکدا بووە کە تاوان و ستەم و بەدکرداری زۆر پەرەی سەندبێ و ڕووناکی نەمابێ لەناو مەردوم دا، دەی بۆ ئەوەش ترساندن ڕاست و شایانە، بێجگە لەوەش مەبەست لە ترساندن پاراستنە لە سزاو ناخۆشی، کە ئەوەش لەپێش ترو گرنگ ترە بۆ مەردوم، کەواتە هەر ئەوە ڕاست و بەجێ بوو کە لێرەدا فەرمانی دا هەر بە ترساندن. وە لەم ترساندنەشا میهرەبانی و بەزەیی خوا بە بەندەکانی زۆر ڕوون و ئاشکرایە، ئەوەتا پێی خۆش بەندەکانی ڕێگای ڕاست بەندەبەرو بەد بەخت نەبن، ئەگینا خوا هیچ پێویستی نیە نە بە بەندەکانی و بەچاکەو خواپەرستی یان، ئەگەر بەندەکانی هەموو بێبڕواو تاوان بارتر بن موڵك و گەورەیی ئەو هیچ کەم و کوڕی ڕووی تێناکات، وە ئەگەر بەندەکانی هەموو لەخواترس ترو چاك بن، بەوە هیچ زیاد ناکات. لوتف و میهرەبانی یەکەی داوا ئەکات کە بەو جۆرە بە گرنگ بیانگرێ و ڕێنموونی یان بکات تا ڕزگار ببن لەلاری و ناڵەباری ئەم جیهان و سزای ئاگری ئەو جیهان، وە شاد ببن بە بەهەشت و ڕەزامەندی نەبڕاوەی خۆی!

لەپاش ئەو فەرمانە ئینجا ڕێنموونی ئەکات لەبارەی هێندێ شتی تایبەتی خۆیەوە. ئەفەرموێ: ﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾ پەروەردگارت بەگەورە بگرەو گەورەیی تایبەتی بکەبەو، بەزوبانو بەدڵو بەباوەڕ، واتە ئەگەر هەر شتێ هاتە ڕێگات واز نەهێنێ لەوە، چونکە تەنها ئەو گەورەیە کە شایانە بۆ بەگەورەگرتن، ئەم فەرمانە بەشێ لە بۆچوونو تێگەیشتن دا ئەمەزرێنێو ڕوونی ئەکاتەوە لە مەبەست بە خوایەتیو تاکو تەنهایی خوا.

بەڕاستی هەموو کەسێو هەموو شتێ بچووکەو بێهێزەو لاوازە. تەنها خوا گەورەیە، وە هەموو شتێو هەموو هێزێو هەموو بەسەرهاتو ڕووداوێ خۆی ئەشارێتەوە وون ئەبێو چاو نادا بەرانبەر گەورەییو دەسەڵاتی خوای بێ هاوتا. ئەم فەرمانە پەندو تەمێیە کە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە بەم هەستو بۆچوونەوە ترسێنەریی خۆی بەجێبێنێو بووەستێ بەبێ بیمو باك بەرانبەر هەموو ئادەمیو جیهان، وە بەرانبەر هەموو گرێو پلەو تەنگو چەڵەمەیە کەبێتە ڕێگاکەی، وە بەو هەستو بۆچوونە هەموو پیلانو هەموو هێزو هەموو پلەیە بچووكو بێ هێز ئەبوو لەبەر چاوی بەفەڕی، چونکە ئەیزانی ئەو خوایەتی کە ئەو فەرمانی ترسێنەرییەی پیاداوە گەورەیەو هیچ کەسو هیچ شتێتر هیچ نیەو هیچی بەدەست نیە. کەواتە ئەو بانگ کردنە ترسێنەری هەمیشە پێویستە بەو بۆچوونو هەستو تێگەیشتنە.

ئینجا ڕێنموونی ئەکات بۆ پاکێتیو خۆبە پاك ڕاگرتن، ئەفەرموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ وە هەر چی بەرگو پۆشاکت هەیە بەپاك ڕاگرە. کۆمەڵێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەست بەرگو پۆشاکی ڕاستەقینەیەو لەدیمەنو ڕواڵەتەکەی لای نادەن، واتە جلو بەرگت بپارێزە لەپیسیو چەپەڵیو ئەگەر پیس بوو بیشۆرە، نەك وەك بت پەرستەکان کەجلو بەرگیان نەئەپاراست لەپیسی چەپەڵی. بێگومان ئەوەش شتێکی نارەواو بێزراوەو پێچەوانەی سورشتی ئادەمی یە، بەتایبەتی ئادەمیە کە پێشەواو پێغەمبەر بێتو بەرنامە لە خوا وەرگرێو بیگەیەنێ بە مەردوم، بەڕاستی هەر مامۆستایە پیسو چەپەڵبێت قوتابی پارێز

ئەکاتە لەوەی شتی لێ وەرگرێ، ئەمە ڕای ئەو کۆمەڵەیەو زۆریەی زانایان ئەفەرموون: دیمەن و ڕووالەتەکە مەبەست نیە، بەڵکو مەبەست ڕاگرتنی دڵ و دەروونە بەپاکی و خۆپاراستنە لە هەموو کرداو ڕەفتارو ڕەوشتێ کە ناشیرین و قیزەون بێت، ئەوەش بەپێی باوی عەرەب کە بە مەردومی دڵ پاک و ڕەوشت و کردەوە پاک ئەیان ووت: بەرگ و پۆشاک پاک. وە هەرکەس دڵ پیس و ڕەوشت خراپ و بەدکرداو بوایە پێیان ئەوت بەرگ و پۆشاک پیسە، لەلای غەیری عەرەبیش هەر ئەوە باوە، ئەوەتا لەناو کوردەواریشا ئەڵێن: فلان داوێن پاکە، کاتێ خۆی بپارێزێ کارو کردەوەی بێناموسی، وەلەو بارەکەی ترەوە ئەڵێن: داوێن پیسە یا شەوڕواڵ پیسە. بێگومان ئەم ڕای دووەمە یەکەمیش ئەگرێتەوە،و ڕێك و پێك تریشە لە گەڵ سروشتی پێغەمبەرێتی و فروستادەیی دا، پاکێتی و خۆڕاگرتن بەپاکی بەم جۆری دووەمە شتێکی زۆر پێویستەو ناچاری هەیە پێ ی و پێغەمبەرێتی و فروستادەیی بەبێ ئەوە ناگونجێ و ناڕوابەڕێوە، چونکە پێغەمبەران(درودی خوایان لێ بێ) بۆئەوە نێرراون کە پاکی بلاوکەنەوەو مەردوم ڕزگاربەکەن لە هەموو پیسی و چڵك و چەپەڵی یەك، ئەبێ پێشەواو پەیڕەوی کراوبن، دەی ئەگەر خۆیان پاك نەبوونایە نەیان ئەتوانی خەڵکی ڕزگاربکەن لەپیسی و مەردوم فێری پاکی نەئەبوو لێ یانەوە، لەبەرئەوەی پێویست بووە بچنەناو کۆڕو تێکەڵی پیس و چەپەلان بکەن بۆ تیمارکردن و ڕزگار کردنیان، خوا بەجۆرێ دروستی کردن کە دەست نەدەن بۆ پیس و چەپەڵبوون و لەوانە نەبن چەپەڵی و پیسی وەرگرن لەخەڵکەوە، ﴿وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ﴾ وە هەر چۆن ببێ و هەر جرۆ ڕوو بدا هەر دوورکەوەو واز بێنە لە هاوبەش بۆ خواو لە هەموو هۆی سزای خوا.

پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەپێش پێغەمبەرێتیشدا دوور بووە لەو جۆرە شتانە وە سروشتی پاك و خاوێنی بێزی کردۆتەوە لەو لادان و لاری و نالەباریانە، وە هیچ کات نەبینراوە لێی بەشداریکردنی نەفامان و باوی نەفامان، کەواتە ئەم فەرمان و پەندو تەمێ یە بۆ دەربڕین و جاڕدانی ئەو دوورکەوتن و جیابوونەوەیە، بەجۆرێك هەرگیز یەك کەوتن و بەیەك گەیشتن نابێ و هیچ جۆرە پردێ نابەسترێ لەبەینی ئەم و بیرباوەڕی نەفاماندا.

وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ﴿١٠﴾

ئینجا پەندو تەمێی ئەکات بەمەی خوود پەسەند نەبێ و منەت نەنێ بەوەی ئەیکاتو پێی هەڵئەسێ، یا بەزۆرو گەورەی نەزانێ سەرنجی نەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ﴾ شت مەبەخشە لەکاتێکا بتەوێ زۆرترت دەستکەوێ لەبریتیدا، لە لەکاتێکا بەزۆری بزانی واتە هەرچی چاکە ئەکەیت بەکەمی بزانەو بەکەم سەرنجی بدە. بێگومان خوا زاناو ئاگابوو کە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) شتی زۆر ئەبەخشێ و کاری گەورەی زۆر ئەمێنێ و تێکۆشانو فیداکاری زۆر ئەکاتو دووچاری ئەرکو مەینەتی زۆر دێت، لەهەمان کاتا ئەیەوێ ئەوانەی کە پێی هەڵئەسێ بەگەورەو بەزۆری نەزانێ و منەتیان پێنەنێ.

ئەم پەیامو بانگ کردنە بەرێکو راستی لە دەروونێکا جێگیر ئەبێ کە دەربەستی هیچ شتێ نەبێ و گوێی نەبێ لە هەر شتێ کەلە پێناویا بڕوا، وە هەرچی بکاتو هەرچی ببەخشێ لەو رێگایەدا ئەبێ لەبیری نەمێنێ، بەڵکو ئەبێ لەبنەڕەتەوە هەر هەستی پێبکات، چونکە یادی خوا داگیری کردووەو هەر ئەوی لەبیرەو ئەشزانێ هەرچی بکاتو هەرچی بەخت بکات هەمووی بەهرەو میهرەبانیە کە خوا پێی داوەو بۆی کردووە وە هەمووی رێزگرتنو نرخ پێدانە بۆی، کەواتە ئەبێ سوپاسی خوا بکات لەسەری نەک بەزۆری دابنێ و کەشخەو منەتی پێبکات بەسەر هیچ کەسدا.

ئینجا لەدوای ئەوانە پەندو تەمێی ئەکات بەئارامو خۆ گری، ئەفەرموێ: ﴿وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ﴾ وە هەرجۆن بووەو هەرچی ڕوویدا هەر بۆ خواو لەبەر خوا خۆت ڕابگرە، فەرماندان بە خۆڕاگرتن پەندو وەسیەتێکە لەلایەن خواوە کە هەموو جارێ ناڕاستەی ئەکرد بۆ دامەزراندنو دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو بەسەرهاتو ڕووداوێکا کە قورسو گران بوایە لەسەر دڵو دەروون وە بەڕاستی خۆگرتن توێشووی سەرەکی و بنەڕتیە بۆئەو ڕێگا سەختەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دابوویە بەر، ڕێگەی بانگکردن بۆلای خوا، وەچەکی سەرەکی و بنەڕەتیە بۆ ئەو ئاژاوەو بەربەرەکانیە زۆر گەورەیە لەگەڵ ویستو ئارەزووەکانی دڵو

دەروون وە لەگەڵ دوژمنانی ئەو ئایین و بانگ کردنە بەسەرکردایەتی شەیتان و یاخی و مل هوڕەکانی ئادەمی، ئەو ئازاوە و بەربەرەکانیە سەخت و دوور درێژە بە توێشوو و چەکە نەبووایە بەڕێوە نەئەبرا، ئەو خۆڕاگرتنەی کە تەنها لەبەر خوا و بەتەمای ڕەزامەندی و پاداشتی خوا چارەسەر بوو بۆئەو گرێ کوێرەیە. لە(ئیبن و عەباس)ـەوە ئەگێڕنەوە کەلە قورئاندا خۆڕاگرتن لەبەر خوا سێ بەشە:

١- خۆڕاگرتن لەسەر بەجێهێنانی ئەوەی کە پێویست کراوە.

٢- خۆڕاگرتن لەخۆپارستن و دووركەوتنەوە لە هەرشتێ کە قەدەغەکراوە.

٣- خۆڕاگرتن لەبەر هەر بەسەرهاتێکی تاڵ و ناخۆش و هەرشتێ بارێ بەسەر دڵەوە لەیەکەم جاریەوە تا پەیدابوونی.

یەکەم سێ سەد(٣٠٠) دەرەجەی هەیە، دووەم شەش سەد(٦٠٠) دەرەجەی هەیە، سێیەم نۆسەد(٩٠٠) دەرەجەی هەیە. بەڵێ ڕاستە خۆڕاگرتن ئەگەڕێتەوە بۆ یەکێ لەم سێ بەشە و لەمە بەدەرنیە بەڵام چاك وایە وەك(زەمەخشەری) ئەفەرموێ: لێرەدا تایبەتی نەکرێ و نەبەسترێتەوە بە هیچ کام لەوانەوە بەڵکو مەبەست خۆڕاگرتن بێت لەبەر خوا، ئیتر بەهەرجۆرو شێوەیەك، کەواتە ئەو حەلە گشتی ئەگەیەنێ.

لەپاش ئەو پەندو تەمێیانە کە ئاڕاستەی پێغەمبەری کرد(ﷺ) ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ باسی ئەو شتەی کە مەردومی پێ بترسێنێ بەجۆرێ هەست و دەروون بێدار ئەکاتەوە بۆ سەختی و سامناکیەکەی، ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ﴾ واتە مەردوم بترسێنەو خۆت ڕبگرە لەسەر سزاو ئازاری بێبڕواکان چونکە کاتێ فوو ئەکرێ بە صورا ﴿فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ﴾ ئەوکاتە زۆر گرنگە لەو ڕۆژەدا، ڕۆژێکی تەنگ و گرانە ﴿عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ لەسەر بێبڕواکان ﴿غَيۡرُ يَسِيرٖ﴾ هیچ ئاسان نیە، واتە تەنگی و گرانیەکەی لە تەنها ڕووو بارێکەوە نیە، بەڵکو لە هەموو بارو ڕوویەکەوەیە و هیچ ئاسانی تیانیە بۆیان، بەجۆرێ نیە کە خۆشی و ئاسانی بەدووادا بێت، وەکو باوە لەدوای ناخۆشی خۆشی دێت، کەواتە بابێبڕواکان فریای خۆیان بکەون و بچن بەدەم ترسێنەرەوە پێش ئەمەی فوو بکرێ بە صوراو ئەو ڕۆژە سەختە بێت.

لەپاش ئەو هەڕەشە سامناکە بە شێوەی گشتی ئینجا ئەچێت بۆ هەڕەشە لە یەکێکی تایبەتی لە بێبڕواکان، کە وادەرئەکەوێ کاروکردەوەیەکی گەورەو سەرەکی بووبێ لە بێبڕوایی و پیلان گێڕیدا، بەهۆی ئەوە هەڕەشەیەکی زۆر سەختو گەورەی ئاراستە ئەکاتو وێنەو شێوەیەکی ناشیرینو بێزراوی بۆ نەخشە ئەکێشێ کە هۆی ڕسواکردنو لاقرتی پێکردنیەتی. چەند ڕیوایەتێ هاتووە لەسەر ئەوەی کە ئەو هەڕەشە لێکراوە(وەلیدی کوڕی موغەیرە)یە، (ئیبن جەریر) حەدیسێ ئەهێنێ لە(عیکرەمە)وە، کە(وەلید) ئەچێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش قورئانی بەسەرا ئەخوێنێ،(وەلید) یش ئەندازێ دڵی نەرم ئەبێ بۆی، ئەو هەواڵە ئەگات بە(ئەبو جەهل)و دێت بۆلایو پێی ئەڵێ: ئەی مامە! بەڕاستی گەلو نەتەوەکەت ئەیانەوێ ماڵو سامانێکت بۆ کۆکەنەوە ئەویش ئەڵێ: بۆچی؟ ئەڵێ: ئەیدەن پێت، چونکە تۆ چوویت بۆلای محمد ئەتەوێ دەست کەوتێکت ببێ پێی(بە شەیتانی ئەو قسەی ئەکردو ئەویویست غیرەتو دەماری بهێنێتە جۆش لەڕوویەکەوە کە ئەیزانی(وەلید) ئەوە ئەیگرێ).(وەلید)یش ووتی: قوڕەیش ئەزانن کە من لە هەمووان ماڵو سامانم زۆرترە! ئینجا(ئەبو جەهل) ئەڵێ: کەواتە قسەیەکی خراپی دەربارە بکە کە گەلەکەت بزانن تۆ بڕوات نیە بەوەی ئەو ئەیڵێو بێزاریت لێی! ئەویش ئەڵێ: چی بڵێم دەربارەی؟ سوێن بە خوا لەناو ئێوەدا نیە زاناتر لە من لە شیعرو جۆرەکانی، وە زاناترتان نیە لەمن بە هەڵبەستەکانی(جن)! سوێن بە خوا ئەوەی ئەو ئەی لێێ وێنەی هیچ کام لەمانەی نیە، سوێن بەخوا ئەوەی کەیڵێ شیرینی یەکی هەیە. بێگومان بەرزو زاڵەو هیچ ووتەیەتر بەرزو زاڵ نابێ بە سەریا. ئینجا(ئەبو جەهل) ئەڵێ: بە خوا گەلەکەت ڕازی نابن هەتا شتێ نەڵێیت دژیو لەکەو عەیبی لێ نەگری. (وەلید)یش ئەڵێ: ئەمە هەر جادووەو لە کەسێ ترەوە وەری گرتووە، ئینجا بەو بۆنەوە ئەم ئایەتانەی کە دێن دێنە خوارەوە. لەڕیوایەتێ ترا ئەمە هەیە: قوڕەیش ئەڵێن: بەخوا ئەگەر(وەلید) لابدا لە ئاینی بابو پیری هەموو قوڕەیش لائەدەن،(ئەبو جەهل)یش ئەڵێ: من چارە سەری ئەکەم بۆتان، ئینجا ئەچێ بۆلایو ئەویش لەپاش بیرکرنەوەیەکی درێژ ئەڵێ: ئەمە هەر جادووە، ئایا نابینن مەردوم ئەبچڕێو لەکەسو کاری ئەخات؟

ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴿١١﴾ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودٗا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا
﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴿١٦﴾ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾
فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾

---

**ئینجا با گوێ شل كەین بۆ ئەو ئایەتانەی كە بەبۆنەی ئەو ڕووداوە هاتنە خوارەوە. لە یەكەم جارەوە ئەم هەڕەشە پشت شكێنو سامناكە ئەكات، ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا﴾ وازبێنە لە منو ئەو كەسەی كە دروستم كردووە بە تاقو تەنهاو ڕووت و قووت لەهەر شتێ كە كەشخەی پێوە ئەكاتو پێی ئەنازێ، لێم گەڕێ بۆی، من چارەسەری ئەكەم، تۆ گوێی مەیەرێو دڵی خۆتی پێوە خەریك مەكە، چونكە من ئەجەنگم لەگەڵی، بێگومان هەركەس بەدڵێكی ووریاو بێدارەوە بیر بكاتەوە لەم هەڕەشەیە ئەبێ بكەوێتە لەرزینو دڵە تەپە، بیربكاتەوە لە پەلاماردانو ڕوو تێكردنی هێزو دەسەڵاتێكی بێسنوو. هێزو دەسەڵاتی خوا بۆ سەر بەندەیەكی لەڕو لاوازو بێهێزو بێدەسەڵات كە بەهیچ ڕەنگ چاو نادا لەناو ئەم بوونەوەرە پانو پۆڕەدا كە بێجگە لەخوا هیچ كەس سنوری نازانێ، ئەم بوونەوەرە بە زەویو هەموو ئاسمانەكانیەوە خەریكن لەتو پارە پارە ئەبن لە حەیبەتاو لە بیمو ترس لەخوا!!**

**ئینجا پێش ئەمەی باسی ڕوو وەرگێڕیو سەكەشیەكەی بكات باسی چاكەو بەهرەكانی ئەكات لەسەر ئەو بەندە لەخۆگۆڕاوە، ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا﴾ وەماڵو سامانێكی زۆرو فراوانم پێداوە، لە كشتوكاڵو ماڵاتو وڵاغو بازرگانیو باخو بێستان كە هەمیشە بەرو میوەی لێ نەئەبڕایە هاوینو زستان، وەك لە(ئیبنو عەباس)ەوە ئەگێڕنەوە كە وای فەرمووە، ﴿وَبَنِينَ شُهُودٗا﴾ وە چەند كوڕێك كە ئامادەو نیشتەجێن لەگەڵیو ناچن بەم لاو بەولادا بۆ پەیداكردنی سامانو هۆی ژیان، بەهۆی بێپێویستیو دەوڵەمەندی یانەوە، كەواتە هەمیشە شادمان بوو بە بینینو ژیان لەگەڵیان ﴿وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا﴾ وە چاك بۆم ڕێكخستووەو هۆی ژیانو ڕابواردنم بۆ سووكو ئاسان كردووە، بە سامانی زۆرو ڕێزو قەدر لەناو گەلا، بەجۆرێ پێیان ئەوت: ڕەیحانەی قوڕەیش، و نازناو بوو بە(الوحيد) واتە تاقانە پیاوی هەڵكەوتوو كە شایانە بۆ سەرۆكیو سەركردایەتی، هەرچۆنێ تاقانە بوو لە دارایيو دەرامەتو سامانی**

زۆرا، ﴿ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ﴾ لەپاش ئەو هەمووە هەر تێرنابێو بەتەمایە بۆی زیاد بکەم.. ئەو بەدبەختە لەگەڵ ئەو هەموو چاکەو بەهرەیەی خوا بەسەریەوە چاکەو گوێڕایەڵی یەکی نەکردو سوپاسی خوای نەکرد تا بەهۆی ئەوە بۆی زیاد بکات، کەواتە مافی خۆیەتی کە بەم شێوە سەختە نائومێدی ئەکاتو ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ نەخێر شتی وا ناکەم، با بەتەمای ئەوە نەبێ، چونکە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ لِآيَٰتِنَا عَنِيدًا﴾ بەڕاستی ئەو کەسە زۆر دژو پێچەوانەیە بۆ ئایەتەکانی ئێمە، سەرکەشو دان نەنێرە پێیان لەگەڵ ئەوەیشا ئەزانێ ڕاستن.

ئینجا هەڕەشەیەکی لێ ئەکات کە خۆشیو ئارامەکەی ئەگۆڕێ بەتەنگیو ناخۆشی، بوونو ڕێکەوتنو ڕابواردنەکەی ئەکات بە ناڕەحەتیو مەینەت، ئەفەرموێ: ﴿سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا﴾ واتە دووچاری سزایەکی ئەکەم کە لەتواناادا نەبێ، بەڵام بە وێنەو شێوەیەکی نایاب سزاکەی ئەخاتە پێش چاو، نیشانی ئەدات کە شێوەی کەسێ کە بەزۆر پاڵی پێوە بنرێو ببرێ بەرەو ژوور(هەوراز)و پلەی زۆر سەختدا کە ئەوپەڕی ماندوێتیو تەنگەتاویو هەناسەسواریو ئارەق ڕشتنی تیایە، بەڕاستی وێنەو شێوەیەکە زۆر ڕێكو سەربەسەرە، چونکە هەرکەس لابدا لەڕێگای ڕاستو سوكو ئاسانی ئیسلام، ئەبێ بکەوێتە سەر ڕێگایەکی وشکی سەختی بێخێرو بێر، ئەبێ ژیان بەسەر بەرێ بەبێئارامیو ناڕەحەتیو دڵتەنگیو تەنگەتاوی وەك بەرز ببێتەوە بەرەو ئاسمان، یا بەرز ببێتەوە بە بەرەوژوورکەیەکی ڕەقی سەختی بێئاوو ناندا، زۆر بە زەحمەتو نائومێد بێ لە دوا هاتنی ڕێگاکەی!

ئینجا ئەو وێنەو شێوەیە نەخشە ئەکێشێ لەوەدا کە ئەو کابرایە واتە(وەلید) لێکی ئەدایەوەو بیری خۆی ماندوو و هیلاك ئەکردو دەماری خۆی ئەگوشیو ناوچاوی ئەهێنایە یەكوئەگەڕا بۆ ئەمەی ڕەخنەیەکی دەست کەوێ کە قورئانی پێ عەیب دار بکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ﴾ بێگومان ئەوکابرایەبیری کردەوە لەوەی بیڵێ دەربارەی قورئانو بەدڵی بێبڕواکان بێت، ﴿وَقَدَّرَ﴾ وە دەرروونی خۆی بەکارهێنا ویستی بڕیارێ بدا کە بگونجێو بچەسپێو ڕێك بێت لەگەڵ مەبەستو ئامانجی بێبڕواکانا. ئینجا مەردوم سەرسام ئەکات لەبڕیارو ڕێپێبردنەکەی کە بەجۆرێ بوو چەسپاو و وەرگیراو لەدڵی ئەو بێبڕوایانەدا، یا سەرسوڕئەهێنێ لەوەی کە بەدوایا ئەگەڕاو خەریك بوو پێیەوە بۆ بێزاری دەربڕین لە کردەوەکەی، ئەفەرموێ: ﴿فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ دەك نەفرینی لێ بێو لەناوچێ! کە چۆن بڕیاری داو شتێکی ڕێك خست کە بەدڵی قوڕەیش بێت، یا چۆن خەریکی کاری وا ناڕەوا ئەبێ؟

﴿ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴿٢٥﴾﴾

ئەم شێوەو وتەیە بە پێی باوی عەرەب هات کە بەکاریان ئەهێنا لە کاتێکا سەریان سوڕبهاتایە لە شتێو بەگەورەو گرنگ بهاتایەتە بەرچاویان، ئەیانوت: فلان خوا بیکوژێ ئای چ سوارچاک و چالاکە؟! فلان خوا لەناوی بەرێ ئای چ شاعیرێکە؟! واتە گەیشتوەتە ڕادەیە ناحەز حەسادەتی پێ‌ببا و لەداخا نزای شەڕی لێ بکات، کەواتە بەکار ئەهێنرا بۆ وەسف و سەناو دەرخستنی گەورەیی گرنگی ئەو کەسە کە ڕستەکەی بۆ بەکار ئەهێنرا، تەنانەت بۆ کوڕو باوک و خۆشەویستیش بەکار ئەهێنرا.

بەڵام لێرەدا مەبەست تەنها سەر هێنانە لەشەیتانی و زۆر زانی(وەلید) و گەورەیی پیلان و پروپاگەندەکەی، یا مەبەست بێزاری دەربڕین و لاقرتی پێ کردنە پێی، لەبەر هەرکام ئەو ڕستەیە دووبارە ئەکاتەوە بە ووشەی ﴿ثُمَّ﴾ کەوا نیشان ئەدات ئەمەی دووەم بەتین تر و بەهێزترە لەیەکەم، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ وە ئەو دووبارە کردنەوە باوە لەم جۆرە شوێنانەدا. ﴿ثُمَّ نَظَرَ﴾ ئینجا هەمی تر وورد بیری کردەوە. ﴿ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ﴾ ئینجا کەلە ڕووی ڕاستیەوە ڕەخنەو لەکەیەکی دەست نەئەکەوت ئەیزانی هەرچی بڵێ ناڕاست و ناڕەوایە، ناو چاوی گرژبوو و برۆو تەوێڵی هێنایەوە یەک و ڕووی ناشیرین بوو ڕەش داگیرسا، یا مەبەست ئەوەیە سەرنجی ئەو کۆمەڵەی ئەدا بەدەوریا بوون و چاوی پیا ئەگێڕان، تا ئەوانیش سەرنجی بدەن و بەجارێ خۆیان ئامادە بکەن بۆ وەرگرتنی ئەوەی کە ئەیڵێ دەربارەی قورئان، ئینجا ئەویش ئەو شێوەی بەسەر خۆی هێنا تا ئەوانە هەڵخەڵەتێ و وانیشان بدا ئەوەی کە ئەیڵێ زۆر ڕاستیەتی و بەبیر کردنەوەو خەریک بوونێکی گرنگ فەراهەمی هێناوە بە هەر جۆرو هەرکام مەبەست بێت ئەو نەفرین لێ کراوە ئەیزانی هەرچی بڵێ ناڕاستەو ئەویست پشت بکاتەڕاستی‌ودانی پیانەنێ، وەکووەرئەگێرێ لەم فەرموودەیە: ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ﴾ واتەلەپاش ئەوبیرکردنەوەوخەریک بوونەئینجا پشتی کردە ڕاستی‌وڕووی لێ وەرگێڕاوخۆی بەزل زانی‌ودانی نەنابەڕاستیدا، ﴿فَقَالَ﴾ لەبەرئەوە ووتی: ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾ ئەم قورئانەهیچ نیەبێجگەلەوەی جادوویەکە وەرئەگیرێ لە جادووگەرانەوە و لەوجادووانەیەکەئەگەڕێنرێتەوە لە جادووگەرانەوە ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ﴾ ئەمە هەر ووتراوی ئادەمی یە.

شێوەیەکە هەر لەدەست قورئان دێت و هەتا هەتایە کردی بەجێگای پێکەنین و لاقرتی پێکردن و نەفرین و بێزاری دەربڕین لێی، لەپاش ئەوە ئینجا ئەم هەڕەشە سامناکەی لێ ئەکات کە دڵ و دەروونی ژیرو وریا ئەهێنێتە لەرزە، ئەفەرموێ: ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾ لەمەو پاش ئەی خەمە ناو . سەقەر.و ئەیسووتێنم پێی، واتە دۆزەخ یا تەبەقێ لە دۆزەخ کە تایبەتی یە بۆ ئەو جۆرە یاخی یانە.

ئینجا هەڕەشەکە سامناك تر ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ﴾ تۆ جووزانی . سەقەر. چیە؟ واتە کەورەترو سامناك ترە لەوەی تێگەیشتنی مەردوم پێی بگات!! ئینجا هێندێ لەسیفەت و نیشانەی باس ئەکات ئەفەرموێ: ﴿لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ﴾ هیچ شتێ ناهێڵێتەوەو لێی ناگەڕێ، واتە هەرچی بەربکەوێ ئەیمالێ و هەڵی ئەلووشێ و مەحفی ئەکاتەوە. ﴿لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ﴾ گۆڕەرو ڕەش کەرەوەی پێستە، یا زۆر ئاشکراو دەرکەوتووە لەدوورەوە بۆ ئادەمی، واتە لەبەر گەورەیی و سامناکی، لەگەڵ نرکەو نەعرتە پێکانی و بزیسکەو چەخماخە تووڕدانی هەر لەدوورەوە دیارەو ئاشکرایە بۆ مەردوم، کەواتە هەر لەدوورەوە ترس و لەرز ئەخاتە دڵ ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ چەند حەرەس و پاسدارێ وا بەسەر دۆزەخەوە، کە ژمارەیان نۆزدەیە. ئیتر نۆزدە کەس لە مەلائیکەی دڵ ڕەقی بەهێزو بەتین، یا نۆزدە ڕیزو تاقم، یا نۆزدە جۆر، ئەمە هەواڵێکە لەلایەن خواوە لەم چەند ئایەتەی داهاتوودا هێندێ شتمان بۆ ڕوون ئەکاتەوەو بەم ڕەنگەئەوەی کە بڕوادارە فەرموودەکانی خوا وەرئەگرێ بە ئەوپەڕی دڵنیایی و مل کەچی و دوو دڵی و ڕیکەڕیك و سەرلێ کردنەوە، شەرم و ئەدەبی بەندەیی خۆی بەکارئەهێنێ لەگەڵ پەروەردگاری، ئەوەی کە بێ بڕوایە بەپێچەوانە ئەجووڵێتەوەو بەبێ بڕوایی و بێ شەرمی دەم بازی ئەکات. بۆ وێنە کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە نۆزدە مەلائیکە بەسەر دۆزەخەوەیە، بێ بڕواکان کردیان بە هۆسەو لاقرتی و بێ شەرمی هی وایان هەبوو ئەی ووت: ئێوە گەل و کۆمەڵێکی زۆرن هەر چاری یەکێ لە نۆزدە ناکەن؟! یەکێ تریان ئەی ووت: نەخێر ئێوە بە هەمووتان چاری دووانیان بکەن ئەوانی تریان لەسەر من بۆتان چارەسەر ئەکەم! ئا بەو هەست و ڕۆحە پیسەوە ئەو فەرموودەیان وەرگرت.

وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ

---

**لەو کاتەدا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە ئەوەی کە پێویست بێ لەبارەی ئەو مەلائیکەتانەو مەبەست لەبارەی ژمارەیانی باس فەرموو، لەیەکەم جارەوە تێی گەیاندن کەئەونۆزدەچین‌وله چ جۆرێکن؟ فەرمووی: ﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً﴾ هەر مەلائیکەیەکمان گێراوە بە فەرمانداروو بەڕێوەبەری کارو باری ئاگری دۆزەخ، واتە ئەوانە ئادەمی نین‌و لەوێنەی ئێوە نین تابتوانن بەربەرەکانێیان لەگەڵ بەکەن‌و چاریان بکەن، بەڵکو ئەوانە مەلائیکەن‌و لەو دروست کراوە غەیبی‌و نادریارانەن کە هیچ کەس سروشت‌و هێزیان ناناسێ بێجگە لە خوا، لەبارەیانەوە خوا ئاگاداری کردووین کە ئەوانە سەرپێچی ناکەن لەهەر فەرمانێ کە خوا پێیان بسپێرێ، و هەر فەرمانێکیان پیا بدرێ ئەیکەن، کەواتە هێزو تەوانایان پێدراوە بۆ هەر کارو فەرمانێ کە داوایان لێ بکرێ، دەی کاتێ ئەوانە کرابن بەکاربەدەست‌و بەڕێوەبەری دۆزەخ ئەبێ لەلایەن خواوە هێزو دەسەڵاتی کەپێویست بێت پێیان دراوە، کەواتە بەهیچ ڕەنگ ڕێگا نیە بۆ ژێردەست کردن‌و زاڵ بوون بەسەریانا لەلایەن ئادەمی بێ‌هێزو دەستەپاچەو لاوازەوە، کەواتە لاقرتی کردن‌و دەم بازیەکەیان لەئەوپەری نەزانی‌و نەفامیەوە هاتووە.**

**لەبارەی ژمارەکەیانەوە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾وە ژمارەی ئەوانمان نەگێڕا بەو ژمارەیە مەگەر لەبەر ئەوە هۆی گومڕایی‌و سزای ئەو کەسانەیە کەبێ‌بڕوا بوون، بەم ڕەنگە ئەو هەواڵەمان داو ئینجا بێ‌بڕواکان دەستیان کرد بەدەم بازی‌و لاقرتی کردن، وەك لەپێشەوە باس کرا، کەئەوەش ئەوپەری لادان‌و گومڕاییەو هۆی سزای ڕۆژی دواییە، ئەو بێ‌بڕوایانە نەفام‌و نەزان بوون، کە پێویستە لەسەر هەموو کەس بەئەوپەری بڕواو مل کەچیەوە هەواڵی خوا وەرگرێ‌و نابێ بەهیچ کلۆج دەم بازی تیا بکات‌و سەری لێ بکاتەوە، وە ئەبێ بڕوای وابێ کە خوا بەهەر شتێ ئاگاداری کردبێ‌و لە هەرچی بێ‌ئاگای کردبێ هەر ئەوە ڕاست‌و بەجێیەو بەرژەوەندی تیایە، کەواتە پێویستە بە هەموو بڕواو دڵنیاییەوە باوەڕمان ببێ کە خوا نۆزدەی داناوە بەسەر دۆزەخەوە، ئیتر ئایا بۆچی هەر نۆزدەیە بەبێ**

زیادوکەم، ئەوە شتێکە تەنها خۆی ئەزانێ و هەر ئەوەش ڕێك و گونجاوە لەزانینی ئەو خوایەی کە هەموو شتی لەئەندازو سنووری خۆیان دروست کردووەو داناوە، هەروەها هەموو شتێ‌تر لەم بابەتانە، وەك ئەوە بۆچی ئاسمان حەوتن؟ بۆچی ئادەم لە خاك دروستکراوەو جنۆکە لەئاگر؟ بۆچی؟ بۆچی؟ بۆچی؟

وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە ئەمەیە بڵێین: پەروەردگاری کاربەدەستی گشتی بەو جۆرەی ویست و هەرچی ویست ئەیکات، خوای گەورە ئەو ژمارەی نۆدەی بڕیارداو هەواڵی پێدا لەبەر چوار شت:

١- ﴿لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ بۆ ئەمەی ئەوانەی نامەیان پێدراوە. واتە جوولەکەو نەسرانی. یەقین و بڕوای بەهێز پەیدابکەن بە قورئان، چونکە ئەبینن ئەو ژمارەیە کەلە قورئانا هاتووە ڕێکە لەگەڵ ئەوەی نامەکانی خۆیانی پێ‌هاتووە.

٢- ﴿وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَـٰنًا﴾ وە بۆ ئەمەی ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بڕوایان زیاتر ببێ، کاتێ کە بینیان نامەدارەکان بڕوایان هەیە بەڕاستی قورئان، وە بێجگە لەوەش بڕوادارەکان لەبەرئەوەی دڵیان کراوەبووو پەیوەست بوو بە خواوە، بەهاتنی هەموو فەرموودەیەکی خوا بڕوایان زیاد ئەبوو.

٣- ﴿وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ وە بۆ ئەمەی نامەدارو بڕوادارەکان گومان نەکەن و دڵ بێ‌ئارام نەبن و دڵنیا بن لە بڕواکەیان. بێ‌گومان زۆرجار مەردوم بڕواو یەقینی ڕاستی هەیە، بەڵام لەهەمان کاتا جۆرێ دڵەڕاوکەو بێ‌ئارامی بۆ پەیدا ئەبێ لەمەسەلەیەکا کە نادیاری و شاراوە بێت و بەڵگەو ڕابەری ڕوونی لەسەر نەبێ، وەجێگای لێکۆڵینەوەو قسەو باسیش بێت، جا مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە هەر چۆنێ بڕواو یەقینیان هەیە، با ئەو دڵەڕاکێ و بێ‌ئارامی دڵەیان نەبێ و ڕوویان تێ‌نەکات.

٤- ﴿وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ وە بۆ ئەمەی ئەو کەسانەی کە دڵیان نەخۆشی تیایە واتە ناپاکەکان و ئەو بێ‌بڕوایانەی کەبێ بڕواییەکەیان دەرئەبڕن ئەم دوو تاقمە بڵێن: ﴿مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا﴾ ئایا چیە ئەوەی کە خوا نیازی کردبێ بەم ژمارەیەو ئەبێ مەبەستی چی بێ پێی؟ لە کاتێکا کەسەرسووڕ ئەمێنێ لێی و ژیریی ئێمە وەری ناگرێ؟ ئەو نەفام و نەزانانە خۆیان تێ نەئەگەیشتن لەهۆی دیاری کردنی ئەو ژمارەیەو بڕوایان نەبووو دڵنیا نەبوون لەلێ زانی و کار دروستی خوا لە هەموو بڕیارو هەواڵ و

دروست کراوێکیا، وە دڵنیا نەبوون لەڕاستی هەواڵەکەو ئەو خێرو بەهرەی کەلەو هەواڵانەدا هەیە. ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ﴾ ئا بەو جۆرە کە باسکرا خوا هەرکەسێ گومڕا ئەکات کەبیەوێ، واتە هەرچۆنێ بێبڕوای بەو ژمارەیە گومڕاکردو بڕواداری ڕێنموونی کرد هەروەها هەرکەسێ وێنەی ئەوانەی بەو جۆرەیان بەسەر ئەهێنێ، کارەکە هەربەو جۆرە هاتووەو دێت، مەردوم دوو کۆمەڵی دوو بەرەکێن بەپێی ویستو خواهیشی خوا، چونکە هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆلای ویستو خواهیشی بێسنووری بەرگری نەکراوی خوا. ئەم ئادەمیە کە بەدەستی قودرەتی خوا فەراهەم هاتووە ئامادەیی تیایە بۆ هەر دووبار، کەواتە ئەوکەسەی کە ڕێگای ڕاستو ڕێنموونی ئەداتەبەرو ئەو کەسەی لە ڕێگای ڕاست لائەداتو گومڕایی هەڵئەبژێرێ هەردوو لەناو چوارچێوەو سنووری خواهیشو ویستی خوادا کارو کردەوە ئەکەن، کەبەو جۆرە دروستی کردوون ئامادەن بۆ هەر دوو ڕێگاو بارەکە، وە توانای کردوون بەسەر هەر کام لەو دوانە.

شتێکی ڕوونو ئاشکرایە کە خوای میهرەبان هەردوو ڕێگاکەی نیشان داوین، فەرمانی داوە بەوەی ڕێگا ڕاستەکەی خۆی بدەینەبەر، وە جڵەوگیری کردووە لە هەموو ڕێگایە تر، ئێمە نازانینو بێئاگاین لە خواهیشی خوا، بەڵام ئەزانین چیمان لێ داوا ئەکات، کەواتە لەسەرمانە ئێمە ویستو توانینی خۆمان بەکار بێنین لەوەی داوای لێ کردووین، وە ویستو خواهیشەکەی خۆی کە غەیبەو نیشانی نەداوین لێی گەڕێین بۆ خوا خۆیو ئێمە هیچ قسەی تیا نەکەین. بێگومان هەرچی ڕوویداو بەدی بێت ئەوەیە خوا مەیلی کردووەو ویستوویەتی!

بێگومانیش کە هەمووی بەجێیەو ڕاستو دروستە ﴿وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ﴾ هیچ کەس زاناو ئاگانیەبەلەشکروسەربازەکانی خوای تۆ بێجگە لە خوا خۆی، واتە کۆمەڵی دروستکراوەکانی خوا ـ کە مەلائیکە بەشێکە لێیان ـ هیچ کەس نازانێ چینو چۆنو ژمارەیان چەندەو دەسەڵاتو کارو پیشەیان چیەو دەسەڵاتو توانینیان لە چ ڕادەیەکایە؟

هیچ کەس ئەمانە نازانێ مەگەر خوای پەروەردگار، چونکە ئەوانە غەیبو نادیارین، هەر ئەندازێکی ویستبێ لەو شتە غەیبییانە دەری خستووە بۆمانو ئەبێ ئێمەش لەو سنوورەدا بوەستین، وە تەنها قسە قسەی خوایە، دوای ئەوە هیچ کەس ڕێگای دەم بازیو دەمە دەمێی نیە لە شتێکدا کەلە سنووری ژیریو زانینی ئێمە بەدەربێ.

(مقاتل) ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە هات بەبۆنەی دەم کوت کردنی(ئەبو جەهل)ـەوە کەبە لاقرتیەوە ووتی: ئایا خوای محمد هیچ لەشکرو کۆمەکی نیە بێجگە لەنۆزدەکەس، ﴿وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ وەلەشکرو سەربازەکانی خوا، یا دۆزەخ و نیشانەکان و ئەوانەی وان بەسەریەوە، کەبەشێکن لەو کۆمەڵ و لەشکرە هەر پەندو ئامۆژگارین بۆ ئادەمی، واتە باسی ئەوانە هەر بۆئەوە هاتووە مەردوم ئاگادار بکرێتەوەو بترسێنرێ پێیان، نەك ئەوە بکرێن بەجێگای قسەو باس و دەم بازی تیا کردن! هەر دڵێ بڕواداربێ پەندو ئامۆژگاری وەرئەگرێ، وە هەر دڵێ وێڵ و گومڕا بێ لە باتی تەمێ وەرگرتن دەم بازی ئەکات!

لەدوای باسی ڕۆژی دوایی و دۆزەخ و لەشکری خوا، ئینجا سوێن ئەخوات بە چەند شتێکی ئاشکرا لەم بوونەوەرەدا، کە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر ڕوونن و زۆربەی تێپەڕ ئەکات بەلایانا بەبێ هۆشی و بێئاگایی، لەکاتێکا کە هەموو ئەم شتانە شایەتن لەسەر نیازو مەبەستێکی گەورە لەدروست کردنیانا، وە لەسەر ئەوەی ئەبێ لێ پرسینەوەو حیساب و پاداشت و تۆڵەیە ببێت لەپاشە ڕۆژدا سوێن ئەخوا بەمانگ کەهەر کەس ووشیاربێت و سەرنجی بدا کاتێ کە هەڵدێ و کاتێ ئەڕواو کاتێ ئاوائەبێ، بێگومان ئەو کەسە هەست و هۆشێکی تایبەتی بۆ فەراهەم دێت و دەروونی زاخاو ئەدەرێتەوە لە چڵك و چەپەڵی بێئاگایی، سوێن ئەخوا بەشەو کاتێ پشتی تێکردو ڕۆیی بەئارام و بێدەنگیەوەو ئینجا شتێکی تری تازە هاتە جێگای کەلە هەموو بارو ڕوویەکەوە جیاوازە لێی، کە هەرکەس بیرێکی لێ بکاتەوە بێگومان کارئەکات لەدڵ و دەروونی و بەهرەو بەرهەمێکی تێئەخات کە خۆراکێکی بەهێزو گرنگە بۆ گیانی.

سوێند ئەخوات بەشێوەی شیرینی بەرەبەیان و ڕووناکیەکەی، کە هەر کەس سەرنجی بدات و بیرێکی لێ بکاتەوە، بێگومان تیشکی ئەو ڕووناکیە ئەدا لەدڵی و ڕووناکی تێئەخات، بەمەرجێ کە ژیریی لەکار نەکەوتبێ، ئەو خوایە کە دڵی ئادەمی دروست کردووە ئەزانێ کەئەو جۆرە بەڵگەو نیشانانە بەکارن بۆ ئەو دڵانەی کە کوێر نەبووبن و بە تەواوی سمەسایان لێ نەبڕوابێ.

كَلَّا وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾

---

**لەیەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾[1] واتە ئەوەی ئامۆژگاری کران پێی ڕێگایان نیە دانی پیانەنەێن، چونکە بەڵگەو نیشانەی زۆرو ئاشکرا هەیە لەسەری، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْقَمَرِ﴾ سوێن بەمانگ، ﴿وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ﴾ وە بەشەو کاتێ ڕۆیی و پشتی تێکرد، ﴿وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ﴾ وە بەرەبەیان کاتێ کە ڕووناکی ئەداتەوەو دەرئەکەوێ، سوێن بەمانە ﴿إِنَّهَا﴾ بەڕاستی . سەقەر- واتە ئەو ئاگرەی کە ناونراوە بەناوە ﴿لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ﴾ یەکێکە لەشتەگەورەکان کە ناهەموارو سامناکن، واتە ئەو بەڵاو شتەگەورانەی کە دووچاریان ئەبن زۆرن و . سەقەر- یەکەمی ئەو شتە گەورانەیە ﴿نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ﴾ بۆ ترساندنی ئادەمی. واتە لە هەموو شتێ شایستەترە بۆ ترساندنی مەردوم، وەك ئەگێڕنەوە لە(حەسەنی بەسری)یەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە فەرمووی: وەڵلاهی مەردوم نەترسێنراوە بەهیچ شتێ کە سەخت و سامناك تربێ لەو، وە گەرەتربێ لەوە!! پەنائەگرین بەخوای میهرەبان لەو هەموو شتە گەورەو سامناکانە کە دێنە ڕێگای بێبڕواکان، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ بارو حاڵی ترسێنراوەکان ئەفەرموێ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾ واتە . سەقەر- یەکێکە لە شتە گەورەکان بۆ ترساندنی هەر کەس لەئێوە کە پێش کەوتنی ویستبێ بەوەرگرتنی ئامۆژگاری و بڕواهێنان و گوێ ڕایەڵی. یا دواکەوتنی ویستبێ بە وەرنەگرتن و پشت تێکردنیان، یا مەبەست ئەوەیە پێش کەوتن یا دواکەوتن دەست ئەداو ئەگونجێ بۆهەرکەس لەئێوە هەرکامی ویستبێ و مەیلی کردبێ، واتە هەرچەند هەموو شت لە ژێر خواهیش و دەسەڵاتی خوادایە، بەڵام لە هەمان کاتا ئێوە بەبێ دەسەڵات و بەبێ خواهیش دروست نەکراون و زۆر پێهێنراو نین، بەڵکو سەربەستی و ئامادەییتان تیایە بۆ هەر بارو کردەوەیەك کە خۆتان هەڵی بژێرن بۆ خۆتان،**

---

[1] چەند ڕایە هەیە لەبارەی ئەم ووشەیەو تەفسیرەکەیا، یەکەم: ئایا پەیوەستە بەپێشەوەو وەستان لەسەر ئەم ئەکرێ؟ یابچڕاوەلەپێشەکەی و وەستان لەسەر پێشەکەی ئەکرێ. دووەم: ئایا بۆ تێخوڕینەو ئینکار، یا بۆ بێدارکردنەوەیە، یا بۆ دڵنیاکردنەو بەمەعنا(حقاً) وەلە تەفسیرەکەیا بەپێی ئەو ڕایانە چەند جۆرێ ووتراوە. ئەوەی کەلە تەفسیرەکەدایە بەهێزترە لام.

كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾
مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ
مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾

---

بێگومان مەردوم بەرو بەرهەمی کردەوەی خۆی دێتە ڕێگای‌و لێ پرسراوی کردەوەی خۆیەتی‌و بەسراوەو بەندکراوە پێیەوە. وەکو ئەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ هەموو نەفسێ بەسراوەو بەند کراوە لەڕۆژی دوایی دا بەو کردەوەی کەلە جیهانا کردی ﴿إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ﴾ مەگەر موسڵمانە پاك‌و خاوێنەکان، ئەمانە گەردنی خۆیان ئازاد ئەکەن‌و ڕزگاری ئەکەن، وەك کەسێك ماڵێکی خستبێتە ڕەهنی قەرزی‌و ئینجا قەرزەکە بداتەوەو ماڵەکەی بەرەڵائەکات، ئەمانە دووچاری سزا نابن، لەبەرئەوە گوناهو خراپەیەکیان نەکردووە کە شایستەی سزابن لەسەری، یا ئەگەر گوناهو تاوانیان کردبێ تۆبەو گەڕانەوەی شەرعیان لێ کردووەو بەهۆی ئەوە خوا هەموو سڕیونەتەوە، یا ئەوەندە چاکەیان زۆرو زیادو گەورەبووە ئەوانی پێ سڕاوەتەوە، وەك خۆبەخت کردن لەڕێگای خواو یارمەتی ئایینی خوا.

ئەو خوا پێداوانە: ﴿فِى جَنَّٰتٍ﴾ وان لەبەهەشتانێکدا، کە جێ‌و شوێنێکی ئەوەندە بەرزو بەرێزن وێنەیان نیەو بە دڵی هیچ کەسا نەهاتوون، لە کاتێکا ﴿يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾[1] پرسیار ئەکەن لە تاوانبارەکان کاتێ نیشانیان ئەدرێن‌و وان لەو دۆزەخە سەختەدا. پرسیاریان لێ ئەکەن بۆ سەرزەنشت‌و تەشەر لێ دانیان، بەم شێوەیە: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ﴾ ئایا چی ئێوەی خستە ناو . سەقەر؟ ئەوانیش بەزەبوونی‌و ڕسوایی یەوە وەڵامێکی درێژ ئەدەنەوەو چوار تاوان ئەکەن بەهۆی چوونیان بۆ ناو . سەقەر. بەم جۆرە ﴿قَالُوا۟﴾ ئەڵێن:

١- ﴿لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ﴾ ئێمە لە نوێژکەران نەبووین‌و نوێژمان نەئەکرد.

٢- ﴿وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ﴾ ئێمە خۆراکی هەژارمان نەئەدا، واتە مافی هەژارمان لەماڵی خۆمان دەرنەئەکرد، هەرچۆنێ خواپەرستیمان نەئەکرد بەنوێژکردن بۆ زاتی پاکی،

---

[1] ئەم ئایەتە بەچەند جۆرێ تر تەفسیرکراوەتەوە، هەموو لە مەبەستا نزیکن لەیەکەوە، یا هەر یەك ئەگرنەوە، لەناو ئەو جۆرانەدا ئەوە لە تەفسیرەکەدلیە بە لامەوە بەهێزترە.

هەروەها خواپەرستیمان نەئەکرد لەبارەی بەندەکانیەوە، بەھەڵسانمان بەو مافەی کە خوا پێویستی کرد بوو لە سەر شانمان، باس کردنی مافی هەژاران بەم هەموو گرنگیە لەچەند ئایەتو شوێنێکا ئامارەو دەست نیشانی تیایە بەدووشت:

ا- گرنگیو بەکاریی ئەم مافە لە چارەسەرکردنی زۆر نەخۆشیو دەردی کۆمەڵایەتی دا.

ب- دڵ ڕەقیو چنگ گوشراوی ئەو یەکەن چینەی کەئەم قورئانەی هاتەسەر لەحاستی هەژارو بێنەوا لەگەڵ ئەوەدا خاوەنی دەستو دەهەندە بوون بۆ ڕووپامایيو کەشخەو شانازی کردن، کەواتەماڵیان لە جێگای خۆیا سەرف نەئەکردو بەکاریان نەئەهێنا.

٣- ﴿وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ﴾ وە ئێمە خەریکی شتی بێنرخو بەتاڵو ناڕەوا ئەبووین لەگەڵ ئەو کەسانەی کە خەریك بوون بەو جۆرە شتانەوە، جا لەو جۆرە شتانەیە هەر قسەو کردەوەیەك بۆ مەبەستو ئامانجێکی ڕاستو ڕەوا نەبێ، وەك هێندێ قسەو کردەوە بۆ پێکەیاندنی مەردوم، یا گێڕانەوەی حیکایەتی درۆو دەلەسە بۆ ڕابواردنو مەجلیس خۆش کردن، یا گێڕانەوەی ئەو گەمەو گاڵتەو ڕابواردنەی کە ڕووئەدا لەبەینی ژنو مێردا، ئینجا ئەگەر ئەو کردەوەو قسەبێ نرخانە حەرامو قەدەغەش بن، ئەوە سزاو شەرمەزاریەکەی زۆرترو بەتین ترە، هێندێ لە زانایان ئەفەرموون: مەبەست بەم خاڵە گوێنەدانە بە کارو باری عەقیدەو بڕواو ئاینو دەم بازی کردنە لەبارەی پێغەمبەرو قورئانەوە.

٤- ﴿وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ وە ئێمە بڕوامان نەبوو بەڕۆژی دواییو هاتنیمان بەدرۆ ئەزانی ﴿حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ﴾ هەتا مردنمان بۆ هات کە هەموو شتی پێ ڕوونو ئاشکرا ئەبێت، هیچ گومانو دوودڵی ناهێڵێو مەجالو ماوە نادا بۆ گەڕانەوەو تۆبەو کردەوەی چاكو بەفەڕو پەڕۆکردنی کردەوەی خراپی لەوەوبەر، بنەڕەتو هۆی سەرەکی بۆ هەموو تاوانو خراپەیەك بێبڕواییە بەو ڕۆژە، ئەو کەسەی بڕوای بەو ڕۆژە نەبێ هەموو کێشانەو پێوانەیەکی لێ تێك ئەچێ،و بەلایەوە ژیانو ماوەی ژیان هەر ئەم ماوە کەمو کورتەیە، هیچ هیواو ئومێدێکی نیە بەوەی کە هەرچی لەدەست بچێ لێرە دەستی ئەکەوێتەوە لە ڕۆژی دوایی دا، کەواتە ئەکەوێتە پەلاماردانو تێکۆشان بە ڕاستو بەچەپدا بۆ دەست خستنی هەر ئەنداز لە هۆی خۆشیو ئارەزواتی نەفسی، بەهۆی ئەوەوە دووچاری خراپەکاریو دەست درێژی ئەبێو ژیان لە خۆیشیو لە مەردومیش تاڵ ئەکات.

ئەم خاڵی چوارەمە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونو ئاشکرایە لەسەر ئەوە کە ئەم تاقمە وەڵام دەرەوە بێبڕوان لە جیهانا، کەواتە مانەوەیان لە ئاگردا بێبڕانەوە لەبەر بێبڕواییە نەك بەهۆی هەڵسانیان بە هێندێ گوناهی گەورە، کەواتە ئەم ئایەتانە بەڵگە نین لەسەر ئەوە کە خاوەنی گوناهی گەورە هەمیشەیی ئەبێت لە دۆزەخدا، بەڵکو ئەمە وەرئەگیرێ کە زانایان فەرموویانە: بێبڕوایان هەرچۆنێ سزا ئەدرێن لەسەر بێبڕوایی هەروەها سزا ئەدرێن لەسەر هەموو گوناهی تریان، ئینجا بەدوای باسی ئەو هەڵوێستە ناڕەواو تاوانە گەورەیانەدا ئەم ڕستەیە ئەهێنێ کە هیچ هیواو ئومێدێ ناهێڵێتەوە لە گۆڕاندنی بەسەرهاتو چارەنووسیاندا. ئەفەرموێ: ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ﴾ کەواتە تکای تکاکاران سوودیان پێناگەیەنێو تازە کار لەکار ترازاوەو هەر چارەسەرێ بکرایە لەوانەبوو لە جیهانا بکرایە بە بڕوا هێنان، ماتوڵ بە بێبڕوایی مردن ئیتر هیچ ناکرێ، پەنا بە خوا ئەگرین لەو بەدبەختیو چارە ڕەشی یە!! بێگومان هیچ کەس تکاکار نابێ بۆیان، چونکە هیچ کەس بێ ئیزنی خوا تکا ناکات لە ڕۆژی دوایی دا، خوایش ئیزن بۆ بێبڕواکان لەگەڵ ئەوەدا بەهیچ کلۆج تکاکار نابێ ئەگەرچی لەوانەش بێت ببێ ئەو تکایە وەرناگیرێو سوودی نابێ!

لەم کاتەدا کەئەو بەسەرهاتو هەڵوێستە سامناکەی ڕۆژی دوایی بێبڕواکانی خستە بەرچاو بەو هەموو ڕسواکردنو نائومێدیو بەش براویەوە، لەم کاتەدا سەرنجیان ڕائەکێشێو ئەیانگێڕێتەوە بۆلای هەڵوێستیان لەم هەلو هەڵکەوتەی کەبۆیان فەراهەم هێنراوە لەم جیهانەدا، پێش گەیشتنیان بەو هەڵوێستە سامناکەی ڕۆژی دواییان کەلەم کاتەدا ڕوو وەرئەگێڕنو پشت ئەکەنە هۆی ڕزگاریان، بەڵکو بەئەسپایی ڕائەکەن لەو ڕێنموونیو هۆی ڕزگاریە کە نیشان ئەدرێن لە گەیاندنی ئەو مەبەستەدا شێوەیەکی سەریان بۆ ئەخشە ئەکێشێ کە هۆی پێکەنینو لاقرتی کردنە پێیانو سەرسوڕمانە لەکاری ناڕەوایان ئەفەرموێ: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ﴾ کەواتە ئایا چی ڕوویداوە لێیانو چی هەیە بۆ ئەوانە کە ڕوو وەرگێڕن لە قورئان کە ئامۆژگاریە بۆیان؟! واتە ماتوڵ بێبڕواکان پاشەڕۆژو چارەنوسیان بەو جۆرە ئەبێ کەووترا، ئیتر ئەبێ لەبەرچی پشت بکەنە ئەو قورئانە لەگەڵ ئەوەدا هۆی ڕووتێکردنو بڕوا پێهێنانو گوێڕایەڵیان بۆ زۆرە، کەواتە کردەوەکەیان زۆر ناڕاستو ناڕەوایەو جێگای سەرسوڕمانو بێزاری لێ دەربڕینە.

﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ۝٥٠ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ ۝٥١ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ۝٥٢ كَلَّا بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْآخِرَةَ ۝٥٣ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ۝٥٤ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ۝٥٥ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۝٥٦﴾

**ئەوان کە ڕوو وەرگێڕن لە قورئان بەجۆرێ ئەتارێن لێی و بێزارن ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ﴾ وەك ئەوانە کەرە کێوی بن کە زۆر بەهێز ڕاکەرو تاراوبنو هۆی تارینەکەشیان ئەمە بووبێ کە ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ ڕایان کردبێ لە شێر یا لە کۆمەڵێ ڕاوکەری تیرەنداز، لەناو گەلی عەرەبدا کەرەکێوی ئەکرا بەنموونەو چیرۆك بۆ ڕاکردنو تاربوونی بەهێزو بەتین، شێوەی کەرەکێوی لەکاتێکدا کەبەهێز ڕابکات بۆ هەموو لایە لەکاتی بیستنی دەنگی شێرو ترسانو ڕاچڵەکانیان لێی ئەو دیمەنو شێوەیە ناسراوبوو لەناو عەرەبدا، بڕیاردانی ئەو دیمەنو شێوەیە بۆ ئادەمی لەکاتی ترسان یا هۆی پێکەنینو لاقرتی کردنە پێ‌ی! جا چ جای لەکاتێکدا کە لەبەر ترسو هەڕەشە نەبێت بەڵکو لەبەر ئەوە بێ کەکەسێك ئامۆژگاری بکاتو خوای بیربخاتەوەو دواڕۆژو چارەنوسی بخاتە بەرچاو، وەهۆی ڕزگاربوونی بۆ فەراهەم بێنێ لەو ڕۆژو بەسەرهاتە سەختو سامناکە.**

**بەڕاستی وێنەو شێوەیەکی زۆر نایاب کارکەرە لەدەروونا، بەجۆرێ ئەو کەسەی بیری لێ بکاتەوە شەرم ئەی گرێ خۆی بخاتە ئەو دیمەنو شێوەیەو بێزاری لێ دەرئەبڕێ، بەڕاستی ڕوو وەرگێڕەکان مافی ئەوەیان هەبوو کەلەشەرما خۆیان بشاردایەتەوەو کۆتاییان بهێنایە بەو بارە ناڕەوایەی کەلەسەری بوون، لەترسی ئەوە ئەو دیمەنو شێوەیان بەسەرا نەکشێ!**

**ئینجا کۆتایی ئەهێنێ بەو دیمەنو شێوەیەو ئەگوێزێتەوە بۆ نەخشەکێشانی شێوەی دەروونیان کە پڕە لە حەسادەتو سەرکەشیو مل هوڕیو نەفامی، ئەفەرموێ: ﴿بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً﴾ هەموو یەکێ لەوانە ئەیەوێ کەچەند نامەو نوسراوێکی پێبدرێ کە کراوەو بڵاوکراوەبن لەبارەی مەبەست بەم نامەو نوسراوە چەند شتێ ڕیوایەت کراوەو**

ووتراوه هەموو دەست ئەدەن و هەڵئەگرن، یەکێ لەوانە ئەمەیە کە مەراق و حەسادەت گرتوونی و بۆ ئەوانیش ببێ، هەرکام لەوان چەند پەڕەیەکی نوسراوی بۆبێت و بڵاوبکرێتەوە بەسەر مەردوم دا، لەسەر ئەم ڕایە ئەبێ مەبەست بەوانە سەرۆکەکان بێت کە داخ بوو لە دڵیانا وەحی بۆسەر ئەوان نەیەت و لەوان تێپەڕیکات بۆسەر ئەم. ڕیوایەتێ‌تر ئەمەیە کە بێبڕواکان بیانویان ئەگرت بۆ بڕواهێنانیان بەمە کەهەرکام نامەو نوسراوێکی تایبەتی لەئاسمانەوە بۆ بێت و فریشتە بەتەڕو تازەیی بۆی بێنێ و هێشتا نەپێچرابێتەوەو تیا نوسرابێ لەخوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانەوە بۆ فلانی کوڕی فلان شوێنی(محمدی کوڕی عبدالله) بکەون، لەڕیوایەتێکی ترا ئەڵێ: ووتیان ئەگەر محمد ڕاست ئەکات با لەژێر سەری هەرکام لەئێمەدا نامەو نوسراوێ بەپیدابێ و تیایا نوسرابێ ڕزگاربوونی لەئاگر بەهەرجۆر بووبێ و مەبەست و پەڵپ و داواکەیان زۆر ناڕاستەو ئەو پەڕی نەفامی و لاری نیشان ئەدا، لەبەرئەوە شایستەی ئەوەن کە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ نەخێر شتی وا نابێ و بائەوانە کۆتایی بێنن لەو پەڵپ و بیانوە ناڕەوایانەیان.

ئینجاوازئەهێنێ لەوباسەو ئەڕوا بۆ باسی هۆی بڕوانەهێنان و عیناد و سەرکەشیەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْأَخِرَةَ﴾ ئەوانە لە ڕۆژی دوایی ناترسن واتە ئەو نەترسان و بێباکیەیان دووری خستوونەتەوە لە قورئان و تاراندوونی لێی.

ئەگەر ئەوانە بڕوایان ببوایەو تێبگەیشتنایە لەو ڕۆژە سامناکە لەسەر ئەو بارە نەئەبوون و لەڕێگای ڕاست نەئەترازان، ئینجا هەمی تر تێیان ئەخوڕێتەوەو دواترین قسەیان ناڕاستەئەکات و لێیان ئەگەڕێ کام ڕێگاو چارەنوسی بۆ خۆیان دائەنێن و هەڵی ئەبژێرن، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ با کۆتایی بێنن لە پشت کردنە قورئان و نەترسان لە ڕۆژی دوایی، ﴿إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ﴾ بێگومان قورئان ئامۆژگاریە مەردوم بێدارئەکاتەوەو ئەوەی پێویست بێ بیریان ئەخاتەوە ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾ کەواتە هەرکەس ویستبێتی لەجیهانا لەبیری بووەو لەبیری دەرنەکردووەو بەهۆی ئەوەوە بەختەوەر بووە لە هەردوو جیهانا، وەهەرکەس ئەوەی ناوێ چی ئەکات با بیکات ئەوە خۆی و ئەوەی هەڵیبژاردووە بۆخۆی.

هەرکەس بەهەشت و نازو ڕێزی بەهەشت بۆخۆی هەڵئەبژێرێ با هەڵی بژێرێ وەهەرکەس . سەقەر و سزای . سەقەر- هەڵئەبژێرێ با هەڵی بژێرێ. لەپاش ئەوەی ویست و خواهیشی دانا بۆ بەندەکانی و کردنی بەخاوەنی، خواهیشی لە هەڵبژاردنی ڕێگا بۆخۆیان، ئینجا بەربەرەڵایی ویست و خواهیشی خوا ئەهێنێ بەدوایا و گەڕانەوەی هەموو شتێ بۆلای خوا لەدواییدا، بڕوا بەوەش شتێکی ڕاستەو قورئان زۆر بەتوندی گرتوویەتی و ئەیەوێ بیچەسپێنێ لەدەروونی بەندەکانی خوادا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ﴾ وە ئەوانە بیرناکەنەوەو لەبیریان نابێ بەهیچ کلۆج ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ مەگەر خوا بیەوێ کەبیر بکەنەوەو لەبیریان بێ، چونکە هەموو کارو کردەوەو هەموو شتێ بەستراوە بەویست و خواهیشی گەورەی خواوە، لەو فەراهەم دێت و بۆلای ئەو ئەڕواو لەناو چوارچێوەی ئەودا ئەبێ، هیچ کەس ناتوانێ ویست و خواهیشی دژو پێچەوانەی ویست و خواهیشی خوا بێ.

بیرکردنەوەو لەبیربوون بۆ ڕێکخستنێکە خوا فەراهەمی ئەهێنێ بۆ هەرکەس لەبەندەکانی کە خوا خۆی ئەزانێ ئەو کەسە شایان و شایستەیە بۆی، هەموو دڵەکان وان لەبەینی دوو پەنجە لە پەنجەکانی قودرەتی خوا بۆ هەر بارو ڕوویە بیبا ئەیبا و چۆنی ویست وەری ئەگێڕێ، هەرکات خوا زانی کە نیازی بەندەکەی پاک و خاوێن و ڕاستە ڕووی ئەکاتە گۆڕایەڵی و چاکە، بەندە ئاگا نیەو نەزانە بەوەی کە خوا خواهیش و مەیلی کردووە، چونکە ئەوە نهێنی و غەیبەو لەسنوری زانینی بەندەدا نیە، بەڵام ئاگا و زانایە بەوەی داوای لێکردووەو فەرمانی پێداوە چونکە ئەمەی بۆ باسکردووە، ئینجا ئەگەر بەندە بەڕاستی لێ ببڕێ بۆ هەڵسان بەوەی کە خوا دوای لێکردووە ئەو حەلە خوا کۆمەکی ئەکات و بەرەو ئەوە ئەیبا بەپێی ویست و خواهیشە بێ‌سنوورو بەرگری نەکراوەکەی.

ئەوەی کە قورئان ئەیەوێ بیچەسپێنێ و دایڕێژێ لە دەروونی موسڵمانا ئەو بێ‌سنووری و بەربەرەڵایی مەیل و خواهیشەی خوایە، کە دەووری هەموو ویست و خواهیشێکی داوەو زاڵە بەسەریا، ئەوە ئەچەسپێنێ لەدەروونا تا بەندە لە هەموو شتێکا هەر ڕوو لەو خوایە بکات بەپاک و خاوێنی و هەر بۆئەو ملکەچ بێت... چونکە بەبێ ئەوە ئیسلام لە دڵدا

جێگیرنابێ، هەرکات ئەو ئیسلامە ڕاستەقینە لەدڵدا جێگیربوو شێوەیەکی تایبەتی پەیدائەکات، تێگەیشتن و بۆچوونێکی تایبەتی فەراهەم دێت کەلە هەموو ڕووداوەکانی ژیانیا بۆلای ئەوە ئەگەڕێتەوەو بەپێی ئەو بۆچوون تێگەیشتنە ئەجوڵێتەوە، ئەو تێگەیشتن و بۆچوون یەکەم مەبەستە لەباسی ئەو بێسنووری و بەربەرەڵاییە کەلە قورئانا هاتووە بەزۆری و هەموو شتی بەستووەتەوە بەخواهیش و مەیلی خواوە.

ئینجا سوورەتەکە دوایی ئەهێنێ بەوەصف و سەنایەك وەك ڕابەرو هۆ وایە بۆ پێشەکەی، پاڵپێوەنەرێکی بەهێزە بۆ گوێڕایەڵی خواو هۆی فەراهەم هاتنی ترس و ئومێدە لەدڵ و دەروونا کە کۆبوونەوەی ئەو دووانە نیشانەی بڕوای بەهێزی ڕاستەقینەیە، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾ هەر خوا شایان و شایستەیە بۆ لێ ترسان و خۆ لێ پارێزی و خوا شایان و شایستەیە بۆ لێ بووردن و شاردنەوەی گوناهو تاوانی بەندەکانی.

(ئیمامی ئەحمەد) و (تیرمزی) و (نەسائی) و چەند کەسی تر حەدیس ئەهێنن لە (ئەنەس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتە ئەخوێنێتەوەو ئینجا ئەفەرموێ: خوای ئێوە ئەفەرموێ: من شایانم بۆئەمەی مەترسی و خۆپارێزیم لێ بکرێ، کەواتە نابێ هیچ پەرستراوێ ڕەوا بدرێ لەگەڵ من، کەواتە هەرکەس لەمن ترسا و خۆی پاراست لێم بەم ڕەنگە هیچ پەرستراوێ تری ڕەوا نەدا لەگەڵم منیش شایانم بۆئەمەی لێی ببوورم و گوناهی بسڕمەوە.

**وصلی الله وسلم علی رسوله محمد وآله وصحبه وكل تابع لهم بإحسان**

**داوای لێبووردن ئەکەم لە پەروەردگار لەگەڵ وەرگرتنی ئەم تەفسیرەو یارمەتی دان بۆ تەواوکردنی. ١٤٠٣/٣/٣٠ بەرانبەر ١٩٨٣/٣/١٣.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿١﴾

## سوورەتی(القیامە)

## مەککەییەو(٤٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سوورەتە زۆر بەهێزو بەتوندی بەرەنگاری دڵ ئەوەستێ، شێوەی سامناکی ڕۆژی دوایی و ئەو وێران بوونی بوونەوەرو سامو بیمو دڵەلەرزەی ئادەمی نیشان ئەدات بەو شێوەو جۆرە کەس نەدیدەی قورئانیە، ئەوەش لەبەر دەم کوتکردنو بەرپەرچ دانەوەی ئەو نەفامە بێباوەڕانەی کە باوەڕان بەو ڕۆژە نیەو بەلاقرتیو سەرسوڕمانەوە پرسیار ئەکەن لەو ڕۆژەو لەهاتنی ئەو ڕۆژە، باسی ئەو ڕۆژەو ڕووداوەکانی گێڕاوە بە مەبەستێکی سەرەکیو ئەساسی وەك لەمەو پاش بەیارمەتی خوا ڕوون ئەبێتەوە لەناو بەناوی ئایەتەکاندا، بەکورتی مەبەستی ئەم سوورەتە ئەمەبوو، ئینجا با بەدرێژی ببینە ژێرسایەی ئایەتەکان، لەیەکەم جارەوە لەپاش وتەی بسم الله کەهەر یەکەم جار تەفسیرمان کرد لەباتی هەمووانـدا، ئەفەرموێ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ ئەو وتە پیرۆزەو وێنەی زۆر بەکارهێنراوە لە زمانی عەرەبدا، لە شێوەو وتاری تردا وەك لەقورئانیشدا لەچەند ئایەتێکدا هاتووە، واتە ووشەی ﴿لَآ أُقۡسِمُ﴾ لەپێش سوێند دا بەسێ جۆر تەفسیرکراوەتەوە:

١- سوێند ناخۆم، چونکە شتەکە ڕوونو ئاشکرایەو سوێندی پێناوێ، لێرەدا واتە سوێند ناخۆم بە ڕۆژی دوایی چونکە ئەو ڕۆژە بوونو هاتنی شتێکی ڕوونە.

٢- بەتوندی سوێن ئەخۆم بۆ دڵنیایی لەسەری.

٣- وتەی ﴿لَآ﴾ زیادەو سوێندئەخۆم، وەك پیتو وتەی تر کە زیادەو ئەڵێن وتاری پێجوان ئەکرێت، باری تریش گوتراوە دەربارەی وتەی ﴿لَآ﴾ ئەوەش ئەمەیە وتەی ﴿لَآ﴾ بۆ ڕەد بێت لەوەی کە بێبڕواکان گومان ئەبەن.

وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾
بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾

**﴿وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ وە سوێند بەو نەفسە لەخواترسە کەلۆمەی خۆی ئەکات لەسەر گوناهو کەمو کوڕی خۆی، وەبە چەند جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، سوێند لەسەر خوراوەکە باس ناکات بەڕوونی، بەڵکو بە شێوەیە ئەیگەیەنێ وەك ووتەیەکی سەربەخۆ، ئەفەرموێ: ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ﴾ ئایا ئادەمی وا گومان ئەبات کە ئێمە ئێسکەکانی کۆناکەینەوە؟ مەبەست هەموو ئادەمی نیە بەڵکو تیرەی ئادەمیە کە خاوەنی ئەو گومانە بەدە زۆرە لەناویاندا، هەر حوکمو بڕیارێك ڕووبکرێتە هەر تیرەیەك مەرج نیە هەموو ئەندامەکانی بەو جۆرە بن، شتێکی باوە لە هەموو زبانێکدا. مەسەلەی زیندوبوونەوەی مردو بەتایبەت لەپاش ڕزانیو تێکەڵبوونی بەخاكو نەمانی شێوەکەی ئەو مەسەلەیە لەناو بت پەرستەکانی عەرەبدا بەڵکو لەناو چەرخە نەفامیەکاندا لە کۆنو لەتازە ئەو مەسەلەیە زۆر بە نەگونجاو سەرنج ئەدرا قورئان لە گەلێ جێگادا بەچەند بەڵگەی ڕوون ئاشکرای ئەکات، جا لەبەرئەوە لێرەدا دڵنیایی لەسەر ئەکات بەجۆرێکی زۆر بەهێزو گرنگ ئەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾ بەڵێ کۆیان ئەکەینەوە لەکاتێکدا تواناو دەسەڵات دارین بەسەر ڕێكو پێك کردنی سەرە پەنجەو ئەترافەکانی وەك خۆیانی لێ بکەینەوە، واتە نەك تەنها کۆکردنەوەی ئێسکەکانی، بەڵکو گرنگتر لەوە کە بریتیە لەوەی وەك جارانی لێ ئەکەینەوە!! بێگانەکان لەم ئایەتەیان وەرگرت مۆرکردنی پەنجە(طبع الأصابع). پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگار کە شێوەی نەخشی پەنجەی هەرکەسی جیاواز گێڕاوە لە هەموو کەسانێکی تر!**

**ئینجا لێرەدا واز ئەهێنێ لە باسەکەو ئەگوێزێتەوە بۆ ئەوەی کە پاڵ ئەنێ بە ئادەمی یەوە بۆ ئەو گومانە بەوەر کە ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ﴾ ئادەمی ئەیەوێ تاوانو خراپەکاری بکاتو بەردەوام بێت لەسەر ئەوە بەبێ جڵەوگیری، واتە ئەگەر باوەڕبێنێ بە زیندوو بوونەوەو حیسابو پرسیارو تۆڵەی ڕۆژی دوایی ئەبێ کۆتایی بێنێو ناشیەوێ کۆتایی بێنێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ بە لاقرتی یەوە پرسیار ئەکاتو زۆر بە شتێکی دووری نیشان ئەداتو ئەڵێ: ئایا کەی ئەبێ ڕۆژی دوایی، جا لەبەر ئەوە وەڵامی ئەو پرسیارە ئەداتەوەو بەرپەرچی ئەداتەوە بە چەسپانیو بەبێ سەر لێ کردنەوەو سستی،**

﴿فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ الْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا
وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾﴾

**ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ الْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾ ئینجا کاتێ چاو لە سامو بیمو سەرگەردانی دا حەوارەو ئەبلەق ئەبێ، مانگ ڕووناکیەکەی نامێنێ،و خۆرو مانگ کۆئەبنەوە لە هەڵهاتندا، کاتێ ئەو ڕووداوە سامناکانە بەدی دێن ئادەمی ئەڵێ ئەمڕۆ بۆ کوێ ڕاکردن ئەبێ، واتە نائومێد ئەبێ و ئەڵێ بۆ چ شوێنێ ڕاکردن ئەبێ و بۆکوێ بڕۆین و خۆمان ڕزگار بکەین، بەم ڕووداوە سامناکانە کە بەدی دێن لەکاتی هاتنی ئەو ڕۆژەدا دەم کوتی ئەوانە ئەکاتەوە کە هاتنی ئەو ڕۆژە بە نەگونجاو و دوور دائەنێن، بێگومان هیچ پەنایە نیەو دەرچوون لە دەستی قودرەتی خوا نیە، لەبەر ئەوە پیایاندا هەڵئەشاخێ و پەنا نانی هەموو کەس کورت ئەهێنێ لە پەنای خواداو ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا لَا وَزَرَ﴾ با کۆتایی بهێنێ لەوەی بەدوای پەناو مەلجەئی ترا بگەڕێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ﴾ تەنها بۆلای خوایە لەو ڕۆژەدا قەرارگای هەموو کەس و هەموو کاروباری بەپێی بڕیاری ئەوەو بەپێی مەیل و خواهیشی ئەوەو، ئەوەی کە ئادەمی ئەیویست کە سەر بکاتە تاوان بەبێ حیساب و پرسیار هەرگیز نابێ، بەڵکو هەرچی کردبێ لەپێش مردن و ئەوە کە بەجێی هێشتبێ بۆ پاش مردن لە چاکەو لە خراپە پرسیاری لێ ئەکرێ بەپێی ئەوە پاداشت و تۆڵەی خۆی وەرئەگرێ وەك ئەفەرموێ: ﴿يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ ئادەمی هەواڵی پێئەدرێ و حیسابی لەگەڵ ئەکرێ بەهەر کردەوەیەك کە پێشی خستووەو دوای خستووە، ئەوەی کە لە ژیانی خۆی دا کردوویەتی لە کارو کردەوەی چاك، وە ئەوەی دوای خستبێ وەك وەقف و مزگەوت و عیلم و پیشەسازییەکی خێر کە لەپاش خۆی بەردەوام ئەبێ و ئەمێنێتەوە، یا بە پێچەوانەوە وەك شوێنی خراپەکاری و بیرو باوەڕێکەی بەد کە خەڵکی لەپاش خۆی شوێنی ئەکەوێ، ئادەمی هەر عوزرو بیانوویەك بهێنێتەوە لەسەر خراپەکاریەکەی سوودی نابێ و لێی وەرناگیرێ، دیارە ئەو عوزرو بیانووانە ناگرێتەوە کە شەرع ئەیانکات بە عوزر وەك شێتی و بێئاگایی و ئەو عوزرانەی تر، بە کورتی هەرکەسێ بە شەرع موکەلەف بێت،**

بَلِ ٱلْإِنسَـٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍۭ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱلْإِنسَـٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ﴾ واتە واز بێنن لەوەی کە هەواڵی پێ ئەدرێ، ئادەمی خۆی بەڵگەیە بەسەر خۆیەوەو شایەتە لەسەر کردەوەکانی خۆی، یا مەبەست ئەوەیە ئادەمی وا دروست کراوە ئەتوانێ ڕێگای ڕاست بداتە بەر، کەواتە بەرپرسیارە لە خۆی هەرچەند عوزرو بیانوو بهێنێ ئەوە لێی وەرناگیرێ وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ ئیتر هەرچەندە عوزرەکانی بهێنێتەوە. پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەوەندە بە سۆزو پەرۆش بوو لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی، مەترسی ئەکرد لەوە شتێکی لەبیر بچێ بەهۆی ئەوە بە پەلە لەگەڵ(جوبرەئیل)دا ووتەکانی ئەخوێندو نەئەوەستا تا ئەو لێ ببێتەوە، ئینجا خوا لەم چوار ئایەتی داهاتووەدا بەرنامەی وەرگرتنەکەی بۆ باس ئەکات و دڵنیای ئەکات کە پارێزگاری پەیامەکەی ئەکات و کۆی ئەکاتەوە، بە ڕوونی ئەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾ زوبانت مەجوڵێنە بە خوێندنی قورئانەکەت لەگەڵ(جوبرەئیل)دا بۆ ئەوەی پەلەی پێ بکەیت و بەپەلەوەری بگری نەوەك هەندێکت لەبیربچێ ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾ واتە پەلەمەکە و خەمی لەبیرچوونت نەبێ، چونکە لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سنگتداو دامەزراندنی لە زوبانتا ﴿فَإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ کەواتە بوەستەو کاتێ ئێمە خوێندمانەوە ئینجا تۆ شوێنی بکەوەو بەدوای ئەودا بیخوێنەوە.**

**خوێندنەکەی(جوبرەئیل)ی کرد بە خوێندنی خۆی، بە ڕاستی بەسە بۆ گەیاندنی پلەو پایەی بەرزی(جوبرەئیل)(علیه السلام) ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ ئینجا بێگومان لەسەر ئێمەیە بەیان و ڕوون کردنەوەی ئەوەی نادیاری و نەزانراو بێت لە ماناو مەبەستەکانی ئەو قورئانە، کەواتە پەروەردگاری میهرەبان دڵنیای کرد لەسەر پاراستنی ماناو مەبەستەکانی لە لوتف و میهرەبانیەکەی بەزیاد بێت، لەپاش ئەم چوار ئایەتە کە بە تێهەڵکێش هێنای بە دوای باس و**

ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی دا، ئینجا دەست ئەکاتەوە بەباسی هەندێتر لە بەسەرهاتو ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ واتە ئەی ئادەمی کۆتایی بێنەو هەڵمەخەڵەتێ بەم ژیانی دنیایە، یان ئەی پێغەمبەر پەلەکردن مەکە بە یادو لەسەرخۆ بە، ئینجا لەو پیاهەڵشاخانەوە ئەگوێزێتەوەو ئەنگو تەشەر ئەدا لە ئادەمی کە واز ئەهێنێ لە خێرو بەرژەوەندی خۆیو بەدوای شەڕو سزای خۆی دا ئەگەڕێ، ئەفەرموێ: ﴿بَلْ﴾ وشەی ﴿كَلَّا﴾ لێرەدا بۆ وازهێنانە لە مەبەستی پێشوو، هێنانی مەبەستێکی تر کە ئەفەرموێ: ﴿تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ (٢٠) وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ﴾ ئێوە ئەی ئادەمی ئەم ژیانی دنیاتان خۆش ئەوێو چاوتان هەر بڕیوەتە ئەمەو وازتان هێناوە لەوێ کە ئەبێ ئەو بە گرنگ بگرنو بزانن کە ئەم ژیانی دنیایە شتێکی کەمو کاتی یە، ئەوەی هەمیشەییو ئەبڕاوەیە ڕۆژی دوایی یە، ئینجا بەکورتی وێنەو نموونەیە ئەخاتە بەرچاو کە ئەفامان لە دنیادا باوەڕیان پێ ی ئەبوو، ئەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ﴾ چەند ڕوویەك لەو ڕۆژەدا لە خۆشیو کامەرانیدا ئەدرەوشێتەوە ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ سەرنج دەرن بۆلای پەروەردگاریانو تەماشای ئەو ئەکەنو هەر بەوەوە خەریکن، بەو وێنەو لەو کاتەدا سەرنجی هیچی تر نادەنو هیچی تریان بەخەیاڵدا نایە، هەرچۆنێ نموونەو وێنەیەك لە غەمو پەژارەو نائومێدیو بەش بڕاوی ئەخاتە بەرچاو و ئەفەرموێ: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ﴾ وە چەند ڕوویەك لەو ڕۆژەدا زۆر عەبوسو ناشیرینو ڕەش داگیرساون ﴿تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ﴾ لایان وایە و چاوەڕوانی ئەکەن سزاو کردەوەیەکیان دەربارە بکرێ کە شکێنەری بڕبڕەی پشتیانە.

ئەم ئایەتەو چەند حەدیسێ دیتنی بڕواداران بۆ خوا و نەدیتنو بێبەشی بێبڕواکان لەو بەهرە گەورەیە ڕوون ئەکەنەوە، بێگومان ئەو دیتنە بەجۆرێکە شایستەیە بۆ خواو لە سنوری باو و ژیری ئێمەدا نی یەو نابێ بەراوردی بکرێ لەگەڵ دیتنی ئێمەی ئەم جیهانەدا، کەواتە ئەبێ ئێمە بڕوامان پێ ی هەبێت با چۆنیەتیەکەی نەزانین وەك زۆر لە ڕووداو و بەسەرهاتەکانی تری ڕۆژی دوایی، کەواتە ئەو هەموو هەراو هۆسەی کە موعتەزیلە فەراهەمیان هێناو دووبەرەکیان پێ پێك هێنا لەنێوان موسڵماناندا و خەریکیان کردن لە مەبەستی ڕاستەقینەی ئیسلامو تەئویلی ئایەتو حەدیسیان کرد بەجۆرێکی ناڕەوا، ئەو هەراو هۆسەی موعتەزیلە زۆر ناڕاستو ناڕەوا بوو،خوا بیباو نەیهێنێتەوە.

كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ
يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴿٣٣﴾ أَوۡلَىٰ
لَكَ فَأَوۡلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾

---

**ئەو دوو وێنەو نموونەی ڕۆژی دواییەی خستە بەرچاو، ئینجا بەشێ لە شێوەی مردنو گیان کێشان ئەخاتە بەرچاو کە مردن یەکەم قاپیە بۆ ڕۆژی دوایی، ئەو مردنە کەهات هیچ شتێ بەرگری ناکاتو بەشی هەموو گیان لەبەرێکە، گەورەو بچوك، شاو گەدا، زۆردارو بێزۆر، کەبیرکردنەوە لەو مردنە خورپەو بیم ئەخاتە دڵی هەموو ژیرێو ئەیگێڕێتەوە لە سەرکێشیو خراپەکاری، لەیەکەم جارەوە پیا هەڵشاخانێ ئاڕاستەی ئەوانە ئەکات کە ژیانی دنیا باو ئەدەن بەسەر ژیانی ئەو دونیا، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ ئینجا ئەفەرموێ: ﴿إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ﴾ کاتێ گیان ئەگاتە لای سەرووی سنگ ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٍ﴾ وە ئەگوترێ: ئایا کێ دوعاو نوشتەیە ئەکات بۆی، بەڵکو ڕزگاری بکات لەو سەختیو تەنگیە؟ واتە ئەوانەی وان بەدەوریدا ئەکەونە کردو کۆشاك بۆ هەرشتێ کە ڕزگاری بکات ﴿وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ﴾ وە کابرای نەخۆش گومان ئەباتو ئەزانێ ئەم بەسەرهاتە مردنو جیا بوونەوەیەتی لەم دنیایە ﴿وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ﴾ وەلاقی ئەپێچێ بەلاقیەوەو ناتوانێ بیان جوڵێنێ، یان سەختی مردنو جیابوونەوە لەدنیا ئەپێچێو تێکەڵی سەختی سامو مەترسی ڕۆژی دوایی ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ﴾ لەو ڕۆژەدا هەر بۆلای پەروەردگارتە ئەی ئادەمی مردنو سەوق کردنت، ئەبێ بچیتە بەر حوکمو دادگای ئەو، ئینجا باسی کردەوە بەدەکانی ئەکات کە بەرهەمو سەرەنجامەکەی نەفرینە لەلایەن خواوەو ئەفەرموێ: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ﴾ ئینجا ئەو ئادەمیە بەدە نەباوەڕی هەبووە بەوەی کە پێویستە باوەڕی پێ‌ی هەبێ، وەنە بەڕاستی زانیوەو، نەنوێژی کردووە کە هۆی پەیوەندیە بەخوای خۆیەوە، ﴿وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بەڵکو ئەوەی بەدرۆ زانیوەو ڕووی وەرگێڕاوە لە خواپەرستیو گوێڕایەڵی، ئینجا خراپتر لەوە ئەوەبوو کەشخەو شانازی کردووە بەو بارو**

کردەوە بەدانەی وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِ يَتَمَطَّىٰ﴾ ئینجا ئەگەڕایەوە بۆ ناو کەس و کارو ماڵ و منداڵی بەکەشخەو لارەو لەنجەوەو شادمان بوو بەو بارو کردەوە بەدو پەستەی کە لەسەریەتی، کەواتە شایستەو شیاوی ئەوەیە کە ئەو نزاو هەڕەشە سەختەی ئاڕاستە بکرێ کە ئەفەرموێ: ﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ﴾ واتە وەیل و نەفرین بۆ تۆو خوا دووچاری شتێکت بکات کە پێت ناخۆشە ﴿ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ﴾ئەم ڕستە وەك لە حەدیسدا هاتووە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) یەخەی (ئەبو جەهل)ی گرت و ڕای وەشاندو ئەو ووتەیەی پێفەرموو، ئەویش ووتی ئەی محمد ئایا هەڕەشەم لێ دەکەیت، سوێندم بە خوا نەتۆو نەخواکەت هیچ شتێ ناتوانن بکەن، بەڵام خوا لەبەدرا بەڕیسوایی لەناوی برد بۆ دۆزەخ، لەمێژووی بانگەوازەکانی خوادا چەند(ئەبو جەهل) بووەو خوا بەو جۆرە لەناوی بردون، هەرچەندە ئەم ئایەتە لەبارەی(ئەبو جەهل)دا هاتبێتە خوارەوە، بەڵام تایبەتی نیە بەوەوە، بەڵکو هەموو ئەبو جەهلەکان ئەگرێتەوە، ئینجا لەدوا دوایی سوورەتەکەدا دەستکاریەکی دڵەکان ئەکات بەچەند بەسەرهات و ڕووداوێك کەبەسەر ئادەمی دێت و بەڵگەیەکی ڕوونن لەسەر تەگبیرو تەقدیری خوا لەژیان و پەیدا بوونی ئەم ئادەمیەو هەروەها بەڵگەن لەسەر زیندوبوونەوەو دووبارە کردنەوەی ئادەمی، ئەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ ئایا ئادەمی وا گومان ئەبات کەوازی لێ ئەهێنرێ بەبێ لێپرسینەوەو حیساب و پاداشت و تۆڵە، بێگومان ئەو گومانە هەڵەو ناڕاستە، چونکە کار دروستی و لێزانی خوا داخوازە بۆ ئەوە کە فەرمان بدا بە چاکەو جڵەوگیری بکات لە خراپە، ئەوەش نابێ بەبێ پاداشت و تۆڵە، وە زۆرجار لەم دنیایەدا پێك نایە کەواتە ئەبێ جیهان و ژیانێکی تر بەدی بێت تا ئەو دادپەروەریەی خوا ئەنجام بدرێ و بێت، ئینجا هەرچۆنێ لێزانی و دادپەروەریی خوا داخوازە بۆ دووبارەکردنەوەو دروست کرن و فەراهەم هێنانی یەکەم جار دەلیل و بەڵگەیەکی بەهێزو تێرو تەواوە لەسەر ئەو دووبارە کردنەوە، ئایا دروستکردنی یەکەم جار بەدەسەڵات و قودرەتی خوا نەبوو؟ بێگومان شتێکی ڕوونە ئەبێ بڵێین و ناچارین بڵێین: بەڵێ، چونکە ئەگەر وانەڵێین ئەبێ خوا نەواستە بڵێین بەڕێکەوت یا خۆی خۆی دروستکردووە!!

أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾

**بێگومان هەرکەسێك خۆی بە ژێر بزانێ لەڕووی نایە هیچ کام لەم دووانە بڵێ، کەواتە هەر بارە ڕاستەکە بڵێین وەك ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ﴾ ئایا ئادەمی دڵۆپێ نەبوو لەو ئاوەی کە ئەڕژێنرێتە منداڵ دان؟ ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾ ئینجا لەپاشا گەڕا بەگۆشت پارەیەك، ئینجا لەپاش ئەوە خوا دروستی کردو گیانی کرد بەبەریداو ڕێك و پێکی کرد ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ﴾ بەم جۆرە ڕێك و پێکی کرد لەو دڵۆپە ئاوەو دوو جۆری دروست کرد کە بریتیە لە نێرو مێ، کەواتە ئەبێ هەر ئەمە بڵێین و باوەڕمان هەر بەمە ببێ کە خوا ئەفەرموێ و ئەی هێنێ بەدوای ئەم بەڵگە ڕوونانەدا، ﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ ئایا ئەو پەروەردگارە کەئەم ئادەمیەی لە یەکەم جارەوە بەو جۆرە دروستکرد، ئایا ئەو پەروەردگارە تواناو دەسەڵات دار نیە بەسەر ئەوەی مردووەکان زیندوو بکاتەوە؟ پێغەمبەری ئازیزامان(ﷺ) هەرکاتێ ئەم ئایەتەی ئەخوێند ئەی فەرموو:(سبحانك بلى) پاك و بێگەردی بۆتۆ خوایە بەڵێ تواناو دەسەڵات داری، ئەم بەڵگەو دەلیلە ڕوونە لە چەند شوێنێ لەم تەفسیرەدا بەدرێژترو بەڕوون تر نوسراوە خوا بەمیهرەبانی خۆی لێمان وەرگرێ.**

**والحمد لله وصلي وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه وأزواجه وأولاده**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ
أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾

## سوورەتی «الإنسان»
## مەككەییەو(٣١) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

لەهەندێ ڕیوایەتا هاتووە کەئەم سوورەتە مەدینەییە، بەڵام نیشانەی مەدینەیی پێوە دیارنیە، بەڵکو بەڵگە لەسەر مەككەییەتیەکەی زۆرە بەتایبەتی کەلەدوادوایی سوورەتەکەدا فەرمان ئەدا بەخۆگری بۆ بڕیاری خوا کەئەو فەرمانە لە مەككەدا ئەهات، لەبەرئەوە بەدڵنیاییەوە ئەڵێن مەككەییە، لەم سەرتایەشدا چەند بەڵگەیەك باس ئەكات لەسەر مەككەییەتی ئەم سوورەتەو ڕوونن.

ئەم سوورەتە دەست پێئەكات بەباسی پەیدابوونی یەكەم جاری ئادەمی و تەقدیرو بڕیاری خوا لەم جیهانەدا لەسەر ئەساسی تاقیكردنەوەكانی خوا وە كۆتایی ئەهێنێ بەباسی دواڕۆژو سەرەنجامی ئەو تاقیكردنەوانە بەپێی ویست و خواهیشی خوا، كەواتە بەو سەرەتاو دواییە دەست نیشان ئەكات بەو تەقدیرو تەگبیرەی كە خوا دایناوە بۆ ژیان و پاش ژیان بەجۆرێ بۆ هەموو ژیرێ دەرەكەوێ كە نابێ ئەم ئادەمیە خۆی بەرەڵابكات و سەربكاتە تاوان و خراپەكاری، بەڵكو بیرو هۆشێك بكاتەوە لە دوا ڕۆژ، ئینجا لەنێوان ئەو سەرەتاو دوادواییەدا چەند شێوەی نازو نیعمەت ئەهێنێ بەدرێژی، وە ئەوەش بەڵگەیەكە لەسەر ئەمەی كە ئەم سوورەتە مەككەییە، ئینجا با گوێ بگرین لە ئایەتە پیرۆزەكان تا فەڕو بەرەكەتەكانی بڕێژێ بەسەر دڵ و دەروونمانا، لە پاش بسم الله ئەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا﴾ ئایا ڕابوورد بەسەر ئادەمی دا كات و چەرخێك لە زەمانی پێشوودا لەكاتێكدا ئەو ئادەمیە شتێكی نەبوو باسكراو بێت و هیچ دروستكراوی بەدڵ و

خەیاڵدا گوزەری نەدەکرد، واتە بەڵێ ئادەمی بەو جۆرەبوو تا خوا هەواڵی دروستکردنی دابە مەلائیکەتەکان، ئەم ئایەتی یەکەمە بەڵگەیەکی قەتعیە لەسەر ئەوە ئادەمی تازە پەیدابووەو هەر کەس بێجگە لەوە بڵێ هەڵەیەو درۆ ئەڵێ، یەکەم جار بەم شێوە پرسیارە بەڕاستی حەق وایە ئادەمی بیریێ بکاتەوە لەم فەرموودەیەو بیریێ بکاتەوە لەوەی لەم بوونەوەرەدا نەبوو ناوو باسی نەبوو تا دەستی قودرەت هێنایە کایەوەو کردی بەم گیانلەبەرە بەنرخەو هۆی ژیانو مانەوەو پەرەسەندنو زۆربوونی بۆ فەراهەم هێنا، پێویستە بیربکاتەوە لەوەی چۆنو لەچی فەراهەمی هێناوەو چی لێ داوائەکات؟ لەیەکەم جارەوە هەواڵی دا بەدروستکردنی ئەم تیرەیە بەدروستکردنی یەکەم کەس کە ئادەمەو باوکی هەموانەو لەخاك دروستی کرد بەو جۆرو شێوەی کە لە چەند ئایەتێکدا باسی فەرمووە، ئینجا باسی دروست کردنی نەوەکانی ئەکات بەگشتی چ نێرو چ مێ، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾ واتە بەڕاستی ئێمە نەوەکانی یەکەم کەسمان دروست کرد لە دڵۆپە ئاوێك کە تێکەڵە لە کەرەسەو ماددەی نێرو مێ کە یەك ئەگرنو پێوەن ئەبن لە منداڵداندا، یان تێکەڵ لەو کەرەسانە کە تایبەتن بەم تیرەیەو پارێزەری ئەم تیرەی ئادەمیەنو ناهێڵن تێکەڵی تیرەو گیان لەبەرێکی تر بن، کە بە زانیاری تازە ناو ئەبرێن بە(جینات) کە لە یەکەم جارەوە پارێزەری تیرەکەیە، هەروەها پارێزەری سیفەتو نیشانەکانی بنەماڵەکانە، بێگومان ئەبێ مەبەست بە(الإنسان)ی دووەمی نەوەکان بێت، چونکە ئەمان لەو دڵۆپە ئاوە دروست کراون، نەك یەکەم کە لەخاك دروست کراوە، دەستی قودرەت بەو جۆرە ئەم نەوەی ئادەمیەی دروستکرد لەو دڵۆپە ئاوە تێکەڵە، نەك لە خۆڕاییو گۆترەکاری، بەڵکو بۆئەوەی تاقی بکرێتەوەو بۆ ئەوەی خوا زانیویەتی ئادەمی بەکردەوە بەدی بێنێو ئاشکرای بکات، وەك فەرمووی: ﴿نَّبْتَلِيهِ﴾ لەکاتێکدا تاقی ئەکەینەوە، جا لەبەر ئەوە هۆی وەرگرتنو بەدی هێنانی تاقی کردنەوەکە فەراهەم بێت، خوای میهرەبان هێزی بیستنو بینینی پێبەخشیوە وەك ئەفەرموێ: ﴿فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ بەهۆی ئەوە گێرامان بەبیسەرێکی بینەر، ئینجا لەگەڵ ئەو هۆی ناسینو زانینەدا دەسەڵاتدارو توانای کردووە بەسەر هەڵبژاردنی ڕێگەیەك بۆ خۆی بەخواهیشی خۆی،

إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغْلَٰلًا
وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕێنموونیمان کردووەو بە ڕێگەی ڕاست ئاشنامان کردووەو بە بەڵگەو نیشانەی زۆرو بەناردنی نامەی خوا بۆی ﴿إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ ئیتر سوپاس گوزارو چاولەبەری چاکەی خوا، یان سپڵەو بێباوەڕ، لەباتی ڕێنموونی وەرگر فەرمووی: سوپاس گوزارو چاولەبەری چاکەی، چونکە سوپاس و چاولەبەری نزیکترین حاڵەتەکە ڕوو ئەکاتە دڵی ڕێنموونی وەرگر، لەپاش ئەوەی زانی کە هیچ نەبووەو ناوو باسی نەبووەو هێزی بیستن و بینینی پێدراوە، وە ڕێنموونی کراوەو ئینجا سەربەست کراوە بۆ هەڵبژاردنی کام بار، ئینجا بەرهەم و سەرەنجامی ئەو تاقی کردنەوەو هەڵبژاردنی هەردوو ڕێگەکە ئەخاتە بەرچاوو لە پێشەوە بەکورتی چارەنووس و پاشەڕۆژی بێ باوەڕو سپڵە باس ئەکات، ئینجا بەدرێژی چارەنووس و دوا ڕۆژی بڕواداری چاو لەبەر باس ئەکات، چونکە ترساندن و هەڕەشە گرنگترو بەسوودترە، بەم شێوە سەرەتاو دوا دوایی فەرموودەکە بریتی ئەبێ لەبڕواداران و ئەوەش شیرین ترە، وە درێژەی دا بە باسی نازو ڕێزی بڕواداران و بەکورتی باسی سزای بێبڕوایانی فەرموو، چونکە شێوەو جەوی سوورەتەکەو یەکەم جاری خۆشی و چاکەی خوایە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا﴾ ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێ باوەڕەکان زنجیرو کۆت و ئاگری بەتین و بڵێسەدار، خوا پەنامان بدات. زنجیر بۆ پێکانیان و کۆت بۆ دەستەکانیان و بەو زنجیرو کۆتانەوە تووڕ ئەدرێنە ناو ئاگر، ئینجا بەدوای ئەوەدا دێتە سەرباسی نازو ڕێزی کەس نەدیدەی چاکان و پاکان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ بەڕاستی چاکەکان ئەخۆنەوە لە شەرابی پیاڵەیەك کە کافور تێکەڵی شەرابەکەی ئەکرێ، کافور خوراوەیەك بووە سارد و شیرین و بۆن خۆش کە عەرەبەکان تێکەڵی عارەقیان ئەکرد، بۆ زیادە لەزەت و خۆشی، بێگومان هەموو خۆراکە خۆشەکانی بەهەشت ناویان ئەبات تا دڵیان بۆی بچێ و ئارەزووی بکەن، چونکە هەر خۆراکێ کەلە یەکەم جارەوە بینرابێ ترێزی لێ ئەکرێ، جا لەبەرئەوە هەر بەم ناوانی دنیا ناویان ئەبات،

عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ﴿٧﴾ وَيُطۡعِمُونَ
ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾

---

**وەزیاتر بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا﴾ واتە ئەو ئاوی چەشمەیە کەلە بەهەشت دا بەندەکانی خوا ئەیخۆنەوە بەتێکەڵی شەرابەکەیان و ئەیگێڕن بە فراوانیو بەئاسانی بۆ هەر شوێنێ مەیل بکەن، لە پێشەوە ناوی بردن بەچاکان(الابرار)، لێرەدا ناویان ئەبا بەبەندەکانی خوا بۆ زیادە ڕێز پێدان، چونکە کەسێك ناوببرێ بەبەندەی تایبەتی خوا ئەبێ پایەو پلەی لەبەرزترین دابێت، جالەبەرئەوە پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) زۆر شادمانو خۆشحاڵ بووە کاتێ خوا ئەو نازناوەی بەکارهێنابێ بۆی، ئینجا باسی هێندێ لە سیفەتو کردەوە چاکەکانی ئەو تاقمە بەرزە ئەکات، کە بەهۆی ئەو سیفەتو کردەوە شیرینانە بوون بەشایستەی ئەو نازو ڕێزو پایەو پلە بەرزانە:**

**١- فەرمووی: ﴿يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ﴾ واتە ئەو عیبادەتو چاکەی کە پێویستیان کردوەو لەسەر خۆیان بەڕێکی بەجێی ئەهێنن، ئەوانە کاتێ ئەوەی پێویستیان کردووە لەسەر خۆیان بەجێی بێنن ئەبێ باشترئەو کردەوانە بەجێ بێنن کە خوا پێویستی کردووە لەسەریان.**

**٢- ﴿وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا﴾ وە ئەترسن لە ڕۆژێ، واتە ڕۆژی دوایی کە شەڕو ناڕەحەتیەکەی پرژو بڵاوە بەزۆری، واتە بەهۆی باوەڕیان بەو ڕۆژە جڵەوگیری خۆیان ئەکەن لە گوناهو تاوان.**

**٣- ﴿وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا﴾ و خۆراك دەرخواردی هەژارو هەتیوو دیل ئەدەن لەگەڵ ئەوەدا ئەو خۆراکەیان خۆش ئەوێو پێویستێ پێ ی، لەبەر ڕەزامەندی خوا باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیاندا، ئەوانە کە جێگەی بەزەییو هیچ کەس مەرامێکی نیە پێیانو ڕووپامایيان پێناکرێ، ئینجا بۆئەوە ئەوان دڵ نەڕەنجێننو هیچ منەتێکیان بەسەردا نەکرێت پێیان ئەڵێن: ﴿إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا﴾ ئێمە هەر لەبەر خوا خۆراکتان ئەدەینێو دەرخواردتان ئەدەینو نامانەوێ لێتان لەلایەن ئێوەوە نەبریتیو پاداشتو نە سوپاس، وە نامانەوێ منەتتان بەسەردا بکەینو بەچاوی سوك تەماشاتان بکەین،**

إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم
بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ
ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ
قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾

---

﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾ بەڕاستی ئێمە مەترسی ئەکەین لەسەختی و سزای ڕۆژێکی زۆر ڕەش و سەخت کە دووچارمان ببێ لەلایەن پەروەردگارمانەوەو بەڵکو بەو کارو کردەوە چاکانە خوا پەنامان بدات، ﴿فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا﴾ جا بەهۆی ئەوە خوا ئەیان پارێزێ لە سزاو شەڕی ئەو ڕۆژە، وە لەباتی ئەو ئەو ڕوو ڕەشی و غەمباریە، شیرینی و جوانی ڕووو کەیف و خۆشیان پێئەبەخشێ، ﴿وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾ وە پاداشتیان ئەداتەوە بە باخ و باخاتی کەلە بەرو میوەکانیان ئەخۆن، وە بەناوریشم کە ئەیپۆشن ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ﴾ لەکاتێکدا پاڵ ئەدەنەوە لەو بەهەشتانەدا بەسەر تەخت و کورسیەوە ﴿لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ نابینن لەو بەهەشتانەدا نە گەرما و نەسەرما ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَٰلُهَا﴾وە سێبەرو سەهەندی درەختەکانی ئەو بەهەشتانە وا بەسەریانەوە ﴿وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ وە هێشووو بەرو میوەکانیان ژێر بارکراوە بۆیان چۆن ئارەزووو مەیل بکەن دێن بەدەست و دەمیانەوە ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ واتە لەم کاتەدا کەبە کامەرانی دانیشتوون بەسەر تەخت و کورسیەکانیانەوە لەژێر شێبەرو سەهەندەدا چەرخەکە ئەکرێ و ئەگێڕرێ و دابەش ئەکرێ بەسەریاندا شەرابێ لەناو پیاڵەو پەرداخێك دا کەلەزیوێکن وەك شووشە وان و وێنەیان لەم دنیایەدا نەبیستراوە، ئەو پیاڵەو پەرداخانە بەو ئەندازەن کە خۆیان لەدڵی خۆیاندا بڕیاریان داوەو پێیان خۆشە،

وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ
إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ
وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ
سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾

---

**﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا﴾ وە لەو بەهەشتانەدا دەرخواردیان ئەدرێ شەرابێ کە تێکەڵ کراوەکەی ئاوی چەشمەیەکە کەناو ئەبێ بە(زنجبیل) واتە لەتام دا وەك(زنجبیل) وایە کە عەرەبەکان تێکەڵی عارەقیان ئەکرد لەدنیادا بۆ زیادە لەزەت و خۆشی، بەوێنەی کافورە کە کەباسمان کرد، ﴿عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا﴾ کەئەو(زنجبیل)ـە ناوی کانی و چەشمەیەکە ناوئەبرێ بە(سلسبیل) گەوارە لەگەرو دا، خوا بەشدارمان بکات لەو خۆشی و نازو رێزە ئینجا شێوەی خزمەتـچیەکانمان ئەخاتە بەرچـاوو ئەفەرموێ: ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ﴾ ئەگەرێ و چەرخەئەکات بەسەر ئەو بەهەشتیانەدا گەنجانێ کە زۆر جوان و شیرینن هەمیشەیی کراون، واتە نەپیری و نە نەخۆشی و نە مردن رووییان تێ ناکات، جوانی و شیرینیەکەیان لەرادەیەکدایە ﴿إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾ کاتێ تەماشایان ئەکەیت وایان دائەنێیت وەك کۆمەڵە(لؤلؤ)یێکی پرژو بڵاو وان، ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ وە کاتێ ئەو شوێنە ئەبینی و چاو ئەکەوێتە نازو نیعمەت و پادشاییەکی گەورە دەبینێ، ئینجا باسی جل و پۆشاکیان دەکات ئەفەرموێ: ﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ﴾ واتە وابەسەر لەشیانەوە پۆشاکی ئاوریشمی سەوز، چ تەنك و چ ئەستور ﴿وَحُلُّوٓا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ﴾ وە ئەڕازێنرێنەوە و خشڵ تارا ئەکرێن بەبازی بەند و بازنانێ کەلە زیون، دیارە زیوی بەهەشت زۆر شیرینە و وێنەی زیوی دنیا نیە، لەهەندێ ئایەتدا ئەفەرموێ: ئەو خشڵانە لە ئاڵتوونن، وە ئەوە دژی ئێرە نیە چونکە خشڵی بەهەشت و شتەکانی جۆراوجۆرن و بەگوێرەی کات و کردەوە ئەگۆڕێن، هەڵئەگرێ ئەم زیوە خشڵی خزمەت چیەکان بێ و ئاڵتون خشڵ بێت بۆ بەهەشتیەکان، ﴿وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾ وە خوا دەرخواردیان ئەدات ﴿شَرَابًا طَهُورًا﴾ شەرابەن تەهور، بێگومان نیعەت هەرچەندە گەورەو زۆرو فراوان بێت، ئەگەر چاولەبەری و منەتی تێدابێت**

ناتەواوەو سەرشۆڕیەکی تێدایە لەبەرئەوە پەروەردگاری میهرەبان ئەو ناتەواویەش ناهێڵێ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا﴾ بەڕاتی ئەم هەموو چاکە کە باسکرا بۆ ئێوە ئەجرو پاداشتەو لەباتی کردەوە چاکەکانی خۆتانەو کۆشش‌و تێکۆشانەکەتان وەرگیراوەو سوپاس کراوە!

لەپاش ئەو بانگ کردنە بۆ بەهەشت‌و نازو ڕێزەکەی کە بەشێکی زۆری خستە بەرچاو، ئینجا هەڵوێستی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) دیاری ئەکات بەرانبەر ئەو بت پەرستە نەفامانە کە زۆر سووربوون لەسەر عینادو سەرکێشی‌و ئەیان ویست پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەندازێ کۆتایی بێنێ‌و ڕێک بکەوێت لەگەڵیان، ئەمانیش واز بێنن لە ئازاردانی باوەڕدارەکان، ئینجا لەو بوونەوەو بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلەیە لەم چەند ئایەتەدا هاتووە وا هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ) دیاری ئەکات‌و بەرنامەی ڕێک‌و ڕاستی بۆ ڕوون ئەکاتەوەو توێشووی ئەو ڕێگە سەختەی بۆ دیاری ئەکات، یەکەم ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلًا﴾ بەڕاتی ئێمە قورئانمان هێنایە خوارەوە بۆسەر تۆ بە وەجبە وەجبەو بەپێی لێزانی‌و کار دروستی خۆمان، ئەو کارە تایبەتە بەئێمەوەو هیچ کەس نابێ دەستکاری‌و بڕاەی تێدابکات، بەڵکو ئەبێ بەهیچ جۆر لێی لانەدرێ‌و فەرمان بەری بکرێ، ئیتر هەرچەن قورس‌و گران بێ لەسەر تۆو دوژمنانی تۆ، بێگومان بیروباوەڕی بت پەرستی لارو پوچەڵ شتێ نەبوو کە بتوانێ بەرەنگاری بیروباوەڕی ڕێک‌و ڕاست‌و پاک‌و خاوێنی خواپەرستی بوەستێ‌و بت پەرستەکان ئەو هەموو تێکۆشان‌و دوژمنایەتیە بکەن لە پێناویدا، بەڵکو ئەو بەربەرەکانی‌و تێکۆشانە لەبەر ئەوە بوو ئەو سەرۆکانە لەپەنای ئەو باوەڕە لارەی خۆیاندا چەند بەرژەوەندی‌و دەست کەوتێکی گرنگیان دەست کەوتبوو، بووە دەست کەوتی سەرۆکایەتی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی، وە ئەم ئایینی تازە ئەو هەموو دەست کەوتانەی لە دەست دەرئەکردن، کەواتە ئەبێ بە هەموو هێز بەرگری ئەم ئایینە تازە بکەن، پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەگەڵ تاقمێکی ڕەش‌و ڕووت‌و کەم لە مەیداندا بوون بەرانبەر ئەو هەموو هێزو دەسەڵاتە وەستابوون، ئەبێ بەهیچ جۆر لانەدرێ لە فەرمانەکەی خواو ڕێک کەوتنی نەبێ لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا،

فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ
ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ

---

**فەرمانی پێدرا بە خۆگری‌و بەم جۆرە: ﴿فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ﴾ کەواتە خۆگربەو بوەستە بۆ حوکم‌و بڕیاری پەروەردگارت ﴿وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾ وە گوێڕایەڵی هیچ تاوانبارو هیچ بێباوەڕێك مەبە لەو دوژمنانە کەئەیانەوێ بانگت بکەن بۆلای خۆیان ڕێك بکەون لەگەڵیان.**

**خۆگر بەو هەموو کارێ بەستراوە بە قەزاو قەدەری خواوە، خوا مۆڵەتی بەتاڵ ئەدات‌و بەتاڵ بافیش ئەکاتەخۆی‌و ماوەی سزاو ژێردەستەیی درێژە ئەکێشێ، هەموو ئەوانە لەبەر لێزانی‌و کاردروستی خوایە، خۆگربەو گوێنەگری لە هەوڵدانی بێبڕواکان بۆ نزیك کەوتنەوەو یەك گرتن لەناوەڕاستی ڕێگەدا، چونکە تاوانبارو بێباوەڕن بانگی تۆ بۆ خێر چاکە ناکەن، هیچ پردێك لە نێوان تۆ و ئەون دا نابەسترێ، چونکە ماوەی دووریەکەتان زۆر زۆرەو پردێك پێیدا ناگات، چونکە برنامەو بۆچوون‌و بڕیارتان دژی یەکترن کەواتە چارەنیە بێجگە لە خۆگری بۆبڕیاری خوای میهرەبان، بێگومان سەبرو خۆگری زۆر سەختەو ڕێگەکەش درێژە، جا ئەوا پەروەردگاری میهرەبان دەرمان‌و توێشووی بۆ دیاری کردو فەرمووی: ﴿وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ یادو باسی پەروەردگارت بکە بەیانیان‌و ئێواران، ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا﴾ واتە بەردەوام بە لەسەر عیبادەت‌و پەرستنی خوا، هەندێ ئەفەرموون مەبەست بە ﴿بُكْرَةً﴾ نوێژی بەیانیە، وە مەبەست بە ﴿وَأَصِيلًا﴾ نوێژی نیوەڕۆو عەسرە وە مەبەست بە ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ﴾ نوێژی مەغریب‌و عیشایە، وە مەبەست بە ﴿وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا﴾ شەونوێژە، بەڕاستی لەدڵدا ڕایەکی بەهێزو دڵگیرە، بەهەر حاڵ زیکرو یادو عیبادەت‌و پەیوەندی بە خواوە مایەی هەموو خێرو بەرەکەتێکە، وە بانگەوازەکەی خوا هەر ئەوەیە ئەبێ پەیڕەوی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بکرێت.**

**ئینجا هەمیتر دڵنیای ئەکات لەسەر جیاوازی‌و دووری بەرنامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ بەرنامەی نەفامەکاندا، ئەوانە بێئاگان لەبەرژەوەندی خۆیان‌و بێنرخی بەرنامەو بۆچوونەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ﴾ بەڕاستی ئەو نەفامانە ئەم ژیانی دنیایان خۆش ئەوێ‌و هەرچاویان بڕیوەتە ئەمە**

وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ۖ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا
﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ
ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣١﴾

---

**﴿وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا﴾ وە واز ئـەهێنن لـە ڕۆژێکـی قـورس و گـران لـەپێش دەمیانـەوە قورس و گران و بەنرخە لەلای خواو لەتەرازووی خوادا، کەواتە خەسارەتمەندی ڕاستەقینەن.**

**ئینجا ئـەو نەفامانـە کـە ئـەنازێن بـە هێـزو دەسـەڵاتیان و بەچاوی سـووکی و بێنرخی سەیری باوەڕدارەکانیان ئەکرد، خوای میهرەبان لێرەدا سووکی و بێنرخیان نیشان ئـەدات لای خوا، ئەفەرموێ: ﴿نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ﴾ ئێمە ئەوانەمان دروست کردووە لەپاش نەبوون ناو و باسیان نەبوو، ئێمە جومگەکانیانمان بەستووە پێکەوە بەدەمارەکانیان، کەواتە هەر هێزو دەسەڵاتێکیان ببێ هینی خۆیان نیە، بەڵکو لە پەروەردگاریانەوە هاتووە، ﴿وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا﴾ وە کاتـێ بمانـەوێ نـەیان هـێڵین و وێنـەی ئەمانـە ئەهێنینـە کایـەوە، کەواتە کەئەوەی نەکردو مۆڵەتی دان ئەوە فەزڵ و منەتی خۆی هەیە بەسەریانەوە، بەپێی حیکمەت و کار دروستی خۆی، کەواتـە بائەوانـە لـەخۆ نەگۆڕێن و یاخی نـەبن، ئـەم ئایەتـە هەرچۆنێ ئەوە نیشان ئـەدات، هـەروەها ئارام و بێباکی زیادو دڵنیایی ئـەدات پێغەمبـەری ئازیز(ﷺ) و شوێن کەوتووەکانی، ئینجا سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئەم هەل و فرستەی ژیان کە عەبدایەتی و هۆی ڕەزامەندی خوای تێدا پێك بێنن، بەگوێرەی بەرنامەو ئامۆژگاری خوا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ﴾ ئەم سوورەت و ئەم ئایەتانە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەی بەندەکانی خوان، کەواتە باوەڕی بگرن و شوێنی بکەون، ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ کەواتە هەرکەس بیەوێ ڕێگە ئەداتە بەر بۆلای پەروەردگاری، چونکە ئادەمی وا دروست کراوە ئەتوانێ بە**

مەیلو خواهیشی خۆی کام ڕێگە بداتە بەر، بەڵام دیارە هەموو کارێ ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو هەموو شتێ بەدەستی قودرەتی خوایە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەی بەندەكان ئێوە مەیلی هیچ شتێ ناكەن مەگەر كاتێ كە خوا بیەوێ مەیلی بكات، بەڵێ خوا دەسەڵاتی داوە بە بەندەو ئاشناو شارەزای كردووە بە چاكو خراپو ئاینو شەریعەتی بۆ ناردووە، بەڵام ئەوە سەرجەم ئەگەڕێتەوە بۆ قەدەری خوا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ پێزانینو كار دروستی خوا هەركەشیاوی هەرچی ببێ خوا بۆی فەراهەم ئەهێنێ، جا لەبەرئەوە ﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ﴾ خوا مەیلی هەرشتێ بكات ئەیخاتە ناو ڕەحمەتی خۆی كە بەهەشت یەكێكە لە بەرهەمی ڕەحمەتەكەی ﴿وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا﴾ وە ئامادەی كردووە سزایەكی سەختی ئێشو ئازار دەر بۆ ستەمكارەكان، واتە بێباوەڕەكان كە خوا مۆڵەتی دانو هیچ عوزرو بیانوویەكی بۆ نەهێشتوونەتەوە.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه وأزواجه أجمعين

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ﴿١﴾ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴿٣﴾ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴿٤﴾ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٥﴾
عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴿٦﴾

---

## سوورەتی(المرسلات)
## مەککەییەو(٥٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە لە یەکەم جاریەوە سەێند ئەخوات بەپێنج شت کە دەست ئەدەن بۆ چەند مەبەستێ بەبێ دیاری کردن، کە بەو جۆرە گەورەیی و گرنگی نیشان ئەدات، سوێند لەسەر خوراوەکە ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەیەو باوەڕ بەوانە بنەڕتێکی ئەساسیە لە هەموو ئاینو نامەکانی خوادا، نەفامەکان لە هەموو چەرخێك دا دژی ئەو باوەڕەنو بەرگریان کردووە، لەبارەی مەبەست بەو پێنج سوێند پێخوراوانەوە چەند ڕایەك هەیە، لەنێوان ئەو ڕایانە ڕای بەهێز . والله اعلم . ئەمەیە مەبەست بە یەکەم مەلائیکەیە، وە مەبەست بەدووەمو سێیەم بایە، مەبەست بەچوارەمو پێنجەمیش هەر مەلائیکەیە، لەسەر هەر بارو هەرحاڵ سوێند پێخوراوەکان کە دیاری نەکراونو لەواقیعو لەزانینی خوادا هەنو ڕاستن، موناسەبەتی ئەو سوێند پێخوراوانە لەگەڵ سوێند لەسەر خوراوەکە زۆر بەهێزترە کە ئەویش ئاشکرا نیەو لەواقیعو زانینی خوادا هەیەو ڕاستە، ئینجا با بەپێی ئەم ڕایە تەفسیری بکەینەوە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا﴾ سوێند بەو مەلائیکەتانەی کە ڕەوانە کراون بە فەرمانەکانی خوا دێن بەدوای یەکدا بە وێنە یاڵی چارەوێ، ﴿فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا﴾ ئینجا سوێند بەو بایانەی کە هەڵئەکەن بە تەوژم، ﴿وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴿٣﴾ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا﴾ وە هەور پرژو بڵاو ئەکەنەوە لەلای سەروو لە هەوادا، ﴿فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٥﴾ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا﴾ ئینجا سوێند بەو مەلائیکەتانەی کە وەحی ئەهێننە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەران لەبەر عوزرو نەهێشتی خراپە یان لەبەر ترساندنی خراپانو ناهەق خوازان.

إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا
ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ ﴿١٢﴾ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٤﴾

---

سوێند بەوانە کەباس کران ئەمەیە ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ﴾ بەڕاستی ئەوەی کەبەڵێنتان پێدراوە بێگومان بەدی بێت، ئەم سوورەتە بەشێوەی توندو تیژی فەرموودەکان ئاراستەدەکات دڵ ئەوەستێنێ بەوێنەی وەستان لەبەردەم دادگایەکی سامناکدا، ئەوەتا بەرەنگاری دڵ ئەوەستێ بەچەند پرسیارو بێزاری دەربڕین و هەڕەشە، بەوێنەی چەند تیرو کۆتەکێك کە بەکاربهێنرێن وە کۆتایی هەرکام لەو وتەو پرسیارانە ئەهێنێ بەم هەڕەشە سەختە ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ وەك تێپەڕئەکەین بەئیزنی خوا بەلایاندا.

ئەم سوورەتەکراوە بە دە بەش و پارچە لەپاش سەرەتاکەی، گەردش و خولانەوە ئەکەن بەدڵ و ڕاپئەوەشێنن و بێداری ئەکەنەوە. گەردشی یەکەم ئەو وێرانبوون و ئینقیلابە بوونەوەریە ئەخاتە بەرچاو کە ڕوونەدات کە ڕۆژێك دێت بەدوایا پێغەمبەران ئەکەونە مەحکەمە لەگەڵ گەل و قەومەکانیان دا، ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ﴾ ئینجا کاتێ کە ئەستێرەکان کوێر ئەکرێنەوەو ڕووناکیەکەیان ناهێڵرێ، ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ﴾ وە کاتێ کە ئاسمان لەت و پەت ئەکرێ ﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ﴾ وەکاتێ کەشاخ و چیاکان ئەکرێن بەتۆزو غوبارو ناهێڵرێن ﴿وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ﴾ وە کاتێ کە پێغەمبەرەکان کاتیان بۆ دیاری ئەکرێ کە ئامادەبن تێیدا بۆ شایەتی دان لەسەر گەل و ئوممەتەکانیان، ئینجا ئەگوترێ ﴿لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ﴾ ئایا بۆ چ ڕۆژێ دوا ئەخرێن، ئینجا ئەوا ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ﴾ یان مەبەست ئەوەیە کاتێ کە پێغەمبەرەکان کاتێکیان بۆ دیاری ئەکرێ کەپێی ئەگوترێ ﴿لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ﴾ واتە ئینجا بۆ دەرخستنی گەورەیی و سامناکی ئەو ڕۆژە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ﴾ واتە چی تۆی زاناکردووە کە ﴿مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ﴾ چیە؟ واتە چۆن زانیت ئەو ڕۆژە ئەوەندە گەورەیە، لەزانینی تۆ بەدەرە

وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾

---

﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ لەناو چوون‌و سزای سەخت بۆ بێبڕواکان بەو ڕۆژە، بەڕاستی لەم گەردشەدا شتێ نیشان ئەدات کە سەختی‌و سامناکیەکەی بە خەیاڵدا نایەت، وەرە بیربکەینەوە لەو تەقینەوەی کە بەجارێ هەڵەقوڵێ لەم ئاسمان‌و زەویەو هەموو بەش‌و پارچەکانی داگیربکات لە هەرچی تەقینەوەی بۆمبای ئەتۆمی‌و بومەلەرزەو هەورە تریشقەو بورکان لەچاو ئەوەدا وەك تەقینەوەی میزڵدان وایە!! خوا پەنامان بدات، ئینجا لەگەڵ ئەو ڕووداو ئنقیلابەدا ڕۆژێ بێتە پێشەوە بەدرێژایی تەمەن‌و مێژووی ئادەمی، پێغەمبەران ئامادە بکرێن بۆ شایەتی دان لە ئوممەت‌و گەلەکان لە دادگای خوادا بەڕاستی زوبان کۆڵەو قەڵەم کولە لەدەرخستنی شێوەی سامناکی ئەو ڕۆژو ڕووداوو بەسەرهاتە، بەبۆنەی ﴿يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ﴾ەوە، ئینجا گەردشی دووەم بەدڵ‌و دەروون ئەکات بەبیرخستنەوەی چوونی پێشووەکان‌و باوی خوا دەربارەی بێبڕواکان، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ ئایا گەلە پێشووەکانمان لەناو نەبردن وەك گەلی(نوح)و(عاد)و باقی تر؟ بەڵێ ئەوانەی لەناوبرد هەریەکە بەسزایەك، وەك لەچەند شوێندا قورئان باسی فەرمووە، ئینجا ئەمانەی پاش ئەوان هەر لەناوئەبەن ﴿كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ هەربەوجۆرە کردەوە ئەکەین بەبێباوەڕە تاوان بارەکان ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ ئەم هەڕەشەیە جیاوازە لەگەڵ پێشووەکە، چونکە یەکەم بۆ هەڕەشەبوو بە سزای ڕۆژی دوایی، وەئەم بۆ هەڕەشەیە بەسزای ئەم جیهانە، وە مەبەست بەیەکەم بێباوەڕە بە ڕۆژی دوایی مەبەست بەمە بێباوەڕەکانە بە پێغەمبەران‌و ئایەتەکانی خوا، کەواتە ئەم ڕستەو فەرموودەیە تیکرارو دووبارە کردنەوە نیە، بێجگە لەوەش دووبارە کردنەوە بۆ دڵنیاکردن‌و بەهێزکردنی مەبەست شتێکی شیرینەو لە زوبانی عەرەبیدا زۆر زۆرە،

أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ
﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ
شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾

---

ئینجا گەردشی سێیەم دێت بەسەرنج ڕاکێشان بۆ دروستکردنی یەکەم جاری ئادەمی بەو هەموو تەگبیرو گرنگیە ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾ ئایا ئێمە ئێوەمان دروست نەکرد لە ئاوێکی قیزەونی زەلیل ﴿فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾ ئینجا ئەو ئاوەمان گێڕا لەناو قەرارگایەکی مەحکەمی دامەزراو کە پارێزگاری ئەو ئاوە بکاتو شیاوبێت لەگەڵ هەر گۆڕانو گۆڕانکاریەك بەسەریدا بێت، واتە منالّدان ﴿إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾ تا ئەندازێکی زانراوی دیاری کراولای خوا﴿فَقَدَرْنَا﴾ ئینجائێمە تواناو دەسەڵاتداربووین بەسەر ئەوەدا، ﴿فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ﴾ ئینجا ئێمە تواناو دەسەڵاتدارێکی چاکین ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان نیە بەدەسەڵاتی ئێمە بەسەر دووبارەکردنەوەدا، ئینجا گەردشی چوارەم ئەکات بەبیرخستنەوەو بیرکردنەوە لەم زەویە کە دایکی هەموانەو هەموو ڕۆڵەکانی بە مردووو زیندووەوە ئەگرێتە خۆی، ئینجا چەند چیاو شاخی دامەزراوی تێدا داناوەو ئاوی سافو خۆشمان دەرخوارد ئەدا، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا﴾ ئایا زەویمان نەگێڕاوە بە کۆکەرەوەو گێڕەری ئێوە بۆناو کۆشو سکی خۆی بە مردووەکانو زیندووەکانتانەوە، ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ﴾ وە گێڕاومانە لە زەویدا چەند شاخو چیای دامەزراوی بەرز ﴿وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا﴾ وە دەرخواردمان داون ئاوێکی پاكو خۆش گەوار. بەچەند شوێنێکدا قورئان دەست نیشانی کردووە بەهۆی بوونی ئەو شاخانە بۆ ئەمەی زەوی بپارێزێ لە تاسەو لەنگەرە بەوێنەی کەشتی لەناو دەریادا کەباری زۆر قورس ئەخرێتە سەری تا لە گەڕان دا تاسەو لەنگەرە ئەکات، ئینجا بەدوای ئەوەدا باسی نیعمەتی ئاو ئەهێنێ کە چەندە ڕێکە، ئەوەتا ئەو شاخو چیایانە هۆی بوونی کانیاوو چەشمەکانن کەبارانو تەرزەو بەفر لەسەر شاخەکانەوە دێن بۆ ناو سکی زەویو ئەبن کانیاوو چەشمە ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ وەیل بۆ ئەوانەی کە نەفامو سپڵەنو باوەڕیان نیە بە چاکەو بەهرەکانی خواو چاو لەبەری ئەو پەروەردگارەنێن،

ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ
ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾
هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾

---

ئینجا گەردشی پێنجەم ئەمێنێ لەگەڵ بێباوەڕەکان و ئەوەی دووچاری ئەبن لە ﴿يَوْمَ ٱلْفَصْلِ﴾دا، ئەفەرموێ: ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ بڕۆن بۆلای ئەو سزای ئاگری دۆزەخەی کە باوەڕتان پێی نەبوو، ئینجا بەتایبەتی شێوەیەکی زۆر سەخت و سامناك ئەخاتە بەرچاو کە مافی ئەوەی هەیە بەبیری لێ کردنەوەی مووچرکە بەلەش دا بێت و دڵبکەوێتە تەپە تەپ و تیکە لە گەرووودا بگیرێ، ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٍ﴾ بڕۆن بۆلای سێبەری دۆزەخ کە لەبەر گەورەییەکەی خاوەنی سێ پەلە، سێ پەلی لێ ئەبێتەوە، دیارە سێبەری دوکەڵی دۆزەخ سووتێنەرو خنکێنەرە، بەڵام لێرەدا بۆ لاقرتێ پێکردنە کە ئەوەش سزایەکی دەروونیە، ئەفەرموێ: ﴿لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ﴾ نەسەهەندو فێنکە، وە نە بەرگری گەرما و بڵێسەئەکات ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ﴾ ئەو سێ پەلە دوکەڵە بزیسکە فڕێ ئەدات کە هەربزیسکەیەکی لە گەورەیی دا وەك خانوویەکە کە لەبەرد دروست کرابێ، وەلە ڕەنگ دا هەرکام ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾ وەك حوشترێکی زەردا وایە، واتە لەبەر ئەوەی دوکەڵی ئاگرە بەزەرد ئەبینرێ، وە ئەو بزیسکانە کەدێن بەدوای یەك دا وەك تاقمە حوشترێکی وان کەپرژو بڵاو ئەبنەوە، جا وەرە بیربکەینەوە لەو دوکەڵە کەسێ پارچەی لێ دبێتەوە، بزیسکەی بەو جۆرو شێوەیە تووڕ ئەدەن!! جا لەم کاتەدا کە دڵ و بیر خەریکن بەو شێوە سەخت و سامناکە کە زۆر ڕێك و ڕاستە، ئەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان بەو ڕۆژەو بەو سزایە.

لەپاش نیشان دانی ئەو شێوە دڵ تەزێنە، ئینجا شێوەی سام و بیمی دەروونی نیشان ئەدات تا ئەو ڕادەی گوێیان ئەبەسترێ و پیش ئەخۆنەوەو قسەیان بۆ ناکرێت و ئیزن نادرێن کە عوزرو بەهانەیە بۆ خریان بهێننەوە، ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾ ئەمڕۆ ڕێکە کە ئەوانە لەسام و بیم دا گۆیان ئەبەسترێ و ناتوانن قسە بکەن، ئیزن نیە بۆیان تا عوزرو بەهانە بێننەوە بۆ خۆیان

وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِۖ جَمَعۡنَٰكُمۡ وَٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمۡ كَيۡدٞ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾
وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ
هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾

---

**﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ ئەوانەی کەلە دنیادا باوەڕیان نەبوو بەو بەسەرهاتو ڕووداوانەی کە دێنە ڕێیان، لە هەندێ ئایەتدا ئەفەرموێ کە ئەوانە داخو حەسرەتو پەشیمان بوونەوەی خۆیان دەردەبڕنو عوزر ئەهێننەوەو سوێند ئەخۆن کە بێبڕوا نەبوون، وە ئەو ئایەتانە نابن بەدژی ئێرە، چونکە وەك(ئیبنو عەباس) ئەفەرموێ: ئەو ڕۆژە زۆر درێژە هەردوو جۆرە ڕووداوەکە بەدی دێن.**

**لەپاش ئەو هەموو قسەو باسو ڕووداوە سەختانە، ئینجا سەرشۆڕو بێئابڕوویان ئەکات بە لاقرتی پێکردنیان، ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ﴾ ئەمە ڕۆژی جیاکردنەوەی هەموو هەقو ناهەقێکە ﴿جَمَعۡنَٰكُمۡ وَٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئێوەو هەموو گەلەکانی پێشوومان کۆکردۆتەوەو ﴿فَإِن كَانَ لَكُمۡ كَيۡدٞ فَكِيدُونِ﴾ ئینجا ئێوە فێڵو پیلانێکتان هەیە دەربارەی من دەی بەکاری بێنن لەگەڵم ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ کە هیچ فڕو فێڵو حیلەیەکیان نیە بۆ ڕزگار بوون لە سزای خوا.**

**لەپاش نیشان دانو بێئابڕوو کردنو زەلیل کردنی تاوانبارەکان، ئینجا نازو ڕێز پێدانی لەخوا ترسەکان نیشان ئەدات،ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ بەڕاستی لەخواترسو خۆپارێزەرەکان ﴿فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ﴾ وان لەناو سێبەرو سەهەندو چەشمەو کانیاوەکاندا ﴿وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ﴾ وە لەناو میوەهاتو لەوەی ئارەزووی ئەکەن، ئەمانەش بەرانبەر بە سێبەری سوتێنەرو خنکێنەری تاوان بارەکان، ئینجا ڕێزپێدانی گەورە ئەمەیە، ئەفەرموێ: ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ واتە ئەوانەن لەناو ئەو هەموو نازو ڕێزەدا لەکاتێکدا لەلایەن خواوە پێیان ئەگوترێ: بخۆنو بخۆنەوەو نۆشتان بێت بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەی کە لە دنیادا کردتان ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ واتە چونکە ئێوە لە دنیادا چاکەکار بوون لە باوەڕو لە کرداردا، ئێمەش بێگومان ئابەو جۆرە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ﴾ کە خۆیان بێبەش کرد لە نازو نیعمەتو خۆیان خستە ناو ئاگری دۆزەخ،**

كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُواْ لَا يَرْكَعُونَ
﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾

---

**ئینجا لەم كاتەدا كە سەرنجی ڕاكێشا بۆ ئابڕوو بردنی بێباوەڕان و ڕێزو نازی چاكان و پاكان لەڕۆژی(الفصل)دا، لەم كاتەدا دەست بەجێ سەرنج ڕادەكێشێ و ئەمان هێنێ بۆ سەر زەوی بۆ دەم كوت كردن و ڕەزیل كردنی بێبڕواكان، وە ئەوەی هێشتا لەم جیهانەداین ئەفەرموێ: ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ﴾ بخۆن و ڕابوێرن كەمێ، واتە ئەم ژیانی دنیایە كە هیچ چاو نادات وەك نەبێ لەچاو ژیانی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی ﴿إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ﴾ بەڕاستی ئێوە تاوانبارانن ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ كە باوی ژیانی كەم و كورتی دنیایاندا بەسەر ژیانی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی دا.**

**ئینجا سەرسوڕمان نیشان ئەدات و سەر سوڕ ئەهێنێ لەو نەفامانە كە بانگ ئەكرێن بۆ ڕێنموونی و ڕێگەی ڕاست كەچی گوێڕایەڵی ناكەن وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُواْ لَا يَرْكَعُونَ﴾ كاتێ بگوترێ بەوانە ملكەچ بكەن بۆ خواو گوێڕایەڵی فەرمانی بن، یان نوێژ بكەن و ڕكوع بەرن بۆ خوا، ئەوانە بەگوێ ناكەن و ئەو پەندو ئامۆژگاریە وەرناگرن ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ كە گوێڕایەڵیان نەكرد بۆ ناسیحی ئەمینی خۆیان و خۆیان خستە بەر خەشم و سزای خوا، بێگومان ئەم قورئانە كە دواترین بەرنامەی خوایەو گەورەترین موعجیزەی خوایەو هاتووە بۆ ڕێنموونی هەموو جیهانیان، هەركەسێ بەم قورئانە ڕێگەی ڕاست نەداتە بەرو باوەڕ نەهێنێ ئایا لەپاش ئەم ئەبێ بە چ قسەو باس و تارێكی تر باوەڕ بێنێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾ ئایابەچ حەدیس و قسەو باسێكی تر باوەڕ ئەهێنن؟ بێگومان هەركەس بەم قورئانە چارەسەر نەكرێ ئیتر هیچ دەرمانێكی تر نیە.**

**وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه وأزواجه أجمعين**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾

## سوورەتی (النَّبأ)
## مەككەییەو (٤٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم جزمە هەمووی مەككەییە بێجگە لە دوو سوورەتی كە (البینە)و (النصر)ن، هەموو سوورەتەكانی كورتن، ئیتر بەپێی زۆری و كەمی لە كورتیدا گرنگتر لەوە ئەمەیە كە هەموو سورەتەكانی زۆر نزیكن لە یەكەوە لە تامو بۆن و هەناسەداو لە مەبەستو ئامانج و ڕەوشتو شێوەدا. بە شێوەی گشتی سەر تا بەخواری ئەم جزمە وەك چەند سیخورمە لێدان و تەقەتەق كردن و بانگ كردن بە دەنگێكی بەرز وایە كە بەكار بهێنرێن بۆ خەبەر كردنەوەی چەند خەوتوویەكی خەو قورسێ یا بۆ هاتنەوە هۆشی چەند كەسێكی بێهۆش! یا بۆ لاكرجنەوەو سەرنج ڕاكێشانی كۆمەڵێكی بێئاگا كە سەریان كردبێتە یاری و هۆسەو چەپڵەڕێزان.

مەبەستی ئەم جزمە وەك بریتی بێ لە تێخوڕین لە ئادەمی و بانگ لێ كردنیان بەوەی هۆش بكەنەوە، بێدار ببنەوە، سەرنج بدەن، لابكەنەوە، تێفكرێن، بیرێ بكەنەوە... بێگومان خوایەكتان هەیە، وە بێگومان سزای سەختو نازو ڕێزی بە دواوە هەیە بەرەو ڕووی ئەڕۆن.

ئەوەی كە زۆر گرنگ گیرابێ لەم جزمەدا بریتیە لە باسی دروست كردن و داهێنانی ئادەمی و زیندوو كردنەوەو دووبارە كردنەوەیان و باسی ئەم بوونەوەرەیەو سەرنج ڕاكێشان بە ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەی كە خوا فەراهەمی هێناون تیایاو هەمیشە وەك نامەیەكی كراوە وا بە پێش چاوی هەموو كەسێكەوەو بە هەموو زمانێ ئەخوێنرێتەوەو هەموو جۆرە كەسێ تێی ئەگاتو ئەوەی پێویست بێ لێی وەرئەگیرێ.

هەروەها لەم جوزئەدا زۆر بە جۆرێكی سامناك باسی ڕۆژی دوایی كراوە، وە بە چەند ناوی دڵ ڕاچڵەكێنەر ناو براوە كە هەر لە قورئان بیستراون و چەند وێنەو شێوەیەكی نەبینراوی نەبیستراو كە زۆر جێگای بیر لێكردنەوەو تەمێ لێ وەرگرتنن، ئەم سوورەتی یەكەمە وێنەیەكی تێرو تەواوە بۆ هەموو جزمەكە لەبارەی ئەوانەوە كە باس كراو ئاوێنەیەكی بالأنمایە بۆ مەبستە گرنگ و سەرەكیەكانی.

بەندێكی گرنگ لە پەیامەكەی پێغەمبەرمان (وەك هەموو پێغەمبەرەكانی تر) -درودی خوایان لێ بێ- بریتی بوو لە هەواڵدان بە هاتنی ڕۆژی دوایی و بانگ كردنی مەردوم بۆ بڕوا هێنان بەو ڕۆژەو هاتنی ئەو ڕۆژەش . هەر لە كۆنەوە . زۆر بە دوورو نەگونجاو سەیر ئەكراو دائەنرا لەدڵی نەفام و نەزانە بێبڕواكانا، لەبەر ئەوە ئەو هەواڵەی كە پێغەمبەر (ﷺ) پێی دان زۆر بوو بوو بەجێگای قسەو باسی ناویان و پرسیاریان ئەكرد لە یەكتر لەو بارەیەوەو ئەیانگوت: ئایا چۆن شتی وا ئەبێ؟ ئاخۆ ڕاست بێت شتی وا ئەبێ؟

ئینجا بەو بۆنەیەوە سەرەتای ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە بۆ سەركوت كردنی بێبڕواكان، بەشێوەی بێزاری دەربڕین و سەر سوڕهێنان، پرسیارێ ئاراستە ئەكات و ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾ ئایا ئەوانە لەچی پرسیار ئەكەن؟! واتە قسەو باس و پرسیارەكەیان نارەوایەو جێگای سەرسوڕمانە، وە هەواڵدان بە هاتنی ڕۆژی دوایی جێگای سەركردنەوە نیە، و هاتنی ئەو ڕۆژە زۆر ڕاست و بەجێیە، كەواتە ئاراستە كردنی پرسیاری ئایەتەكە بۆ زانینی وەڵام دانەوە نیە، لەبەر ئەوە قورئان خۆی وەڵامەكە ئەداتەوە، بەجۆرێ كە بێزاری دەربڕین و سەرسوڕهێنانەكە دەرئەخات و ئەفەرموێ: ﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ لەو هەواڵە گرنگ و گەورەیە پرسیار ئەكەن، واتە نەئەبوو سەریان بكردایەتەوە لە هەواڵی ئاوا گەورە، ﴿ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ﴾ كە ئەوانە تیایا دووبەرەكین، بەم ڕەنگە هێندێكیان بە هیچ جۆرێ بە ڕاستی نازانن و هێندێ دوو دڵن تیایا، یا ئەو گەلە تیا دووبەرەكین بە بڕوادارو بێبڕواوە، بەم ڕەنگە بڕواداران بەڕاستی ئەزانن و بێبڕوایش بە درۆی دائەنێ.

ئینجا بەرپەرچی بێبڕواکان ئاداتەوەو باسی ڕاستی هەواڵەکە ئاکاتو بەو سیفەتی گەورەییەوە وازی لێ ئەهێنێ، بەڵکولەباتی ئەوەدەست نیشان وئاماژە ئەکات بە هەڕەشەیەکی ترسێنەر، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾با ئەوانە کۆتایی بێنن و پەشیمان ببنەوە لە بڕوا نەهێنان، چونکە ﴿سَيَعْلَمُونَ﴾ بێگومان بەم نزیکانە ئەزانن چیان بەسەر دێت لە تۆڵەی بێبڕواییەکەیانا ﴿ثُمَّ﴾ لەپاش تێخوڕین وهەڕەشەی پێشووجارێ تر﴿كَلَّا﴾ با ئەوانە واز بێنن لەو بارەی وان لەسەری، چونکە ﴿سَيَعْلَمُونَ﴾ بەڕاستی بەم نزیکانە ئەزانن. ئیتر ئایا مەبەست بەم دوو هەڕەشەیە یەك شت بێت، یا مەبەست بە یەکەم کاتی گیان دەرچوون بێت کە لەو کاتەدا هەموو ڕاستی و ناڕاستیەك دەرئەکەوێ و مەبەست بە دووەم بۆ پاش مردن و زیندوو کردنەوە بێت، بەهەرکام دەست ئەدات و ئەگونجێ، لەسەر باری یەکەم دووبارە کردنەوەکە بۆ زیادە دڵنیا کردنە.

ئینجا بە دیمەن و ڕواڵەت ئەو هەواڵە گەورەیە بەجێ ئەهێڵێ و دوور ئەکەوێتەوە بۆ ئەمەی بگەڕێتەوە سەری لەپاش گەردش و خولانەوە پێکردن بەدڵ و دەروونی مەردوم لەم بوونەوەرەداو سەرنج ڕاکێشان و ئاوڕپێدانەی بۆلای هێندێ لە چاکەو میرەبانی خوا دەربارەی بەندەکانی، وە هێندێ لە شتی زۆر گرنگ کە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر ئاشکران لەسەر دەسەڵات و توانای بێسنووری خوا.

ئەم گەردش و خولانەوەو سەرنج دانە ئەکات بە مەردوم تا سەری بەندەیی و چاو لەبەری داخات بۆ خوای میهرەبان و بڕوای بەهێز بێنێ بە دەسەڵاتی خوا بەسەر زیندوو کردنەوەو حیساب و پرسیار لە هەمووان، گەیاندنی هەرکەس بە بەرو بەرهەمی کردەوەی خۆی لەو ڕۆژی دوایی و زیندوو کردنەوەدا، کە بێبڕواکان بەڕاست و گونجاوی دانانێن. ڕووی فەرموودەکە ئەکاتە بەندەکانی و بەشێوەی ـ پرسیارێ دەست پێ ئەکات کە بۆ دان پیانانە ـ چونکە هیچ کەس ملە جەڕێی پێناکرێ و ناچارە، ئەبێ دان بنێ بەو شتە ڕاستانەی کە ئاڕاستە ئەکرێن. ئەوانەش نۆشتن:

١- ڕاخستنی زەوی و ئامادەکردنی بۆ ژیان.

٢- فەراهەم هێنانی چیاو شاخەکان.

٣- گێڕانی ئادەمی بەدوو جۆر.

٤- فەراهەم هێنانی خەوتن بۆ ئارامو ڕەحەتی لەش.

٥- گێڕانی شەو بە کالاْو پۆشاك.

٦- گێڕانی ڕۆژ بەکاتی ئیشو کارو گوزەرانو ژیان.

٧- دروست کردنی حەوت ئاسمان بەلای سەرەوە.

٨- داهێنانو گێڕانی خۆر بە چرایەکی درەخشان.

٩- هاتنە خوارەوەی بارانو ئەو هەموو خێرو بێرەی کە لێی پەیدائەبێ.

ئینجا با یەك بەیەك گوێ شل کەینو بیرکەینەوە لەمانە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا﴾ ئایا ئێمە زەویمان ڕانەخستووەو نەمان گێڕاوە بە جێگای نیشتەجێ پێو ئارام گرتن بەوێنەی بێشکە! دروست کردنی زەوی بەو جۆرە کەباس کرا شتێکی ئاشکرایەو هەست پێکراوە بۆ ئادەمی لە هەموو چەرخو چینێکیا کە زانینو زانیاریو شارستانێتی لە هەر ڕادەیەکا بێ، زانینو تێگەیشتن لەوە پێویستی نیە بەخوێندەواریو زانینی زۆر، تەنانەت کۆچەرو ئەوانەش کە ئاوەدانیان نەدیبێ ئەوە ئەزانن بەلاْم ئەوەی کە ئێستا وەرئەگیرێ لەم ئایەتە گەورەترو فراوانترە لەوەی کە یەکەم چینو تاقم وەریان گرتو بەچاوی ڕووت هەستیان پێکرد، هەتا زانینو زانیاری بەرزتر بێتەوەو باعو سورشتی بوونەوەر باشتر دەرکەوێ، شتی گەورەترو فراوانتر وەرئەگیرێ!

لە تەفسیری سوورەتی (فرقان، یس، صف، سجدە، ذاریات، الرحمن)و گەلێ شوێنی تر شتی زۆرمان باس کردووە سەبارەت بەو شتە گەورەو گرنگانەی کەلەم چەرخە دواییانەدا دەرکەوتن، با ئەو سوورەتانە سەرنج بدرێن، ئینجا سەرنج دانو بیرکردنەوە لەم زەویە ڕاخراوو ژێربار کراوە بەو جۆرو شێوە سادەییەی یەکەم جار بەسە بۆ بڕواهێنان بەلێ زانیو کاردروستی خواو بە دەسەلاْتی بەسەر زیندوو کردنەوەی مردووەکاندا، سەرنج دانو بیرکردنەوە بەو سادەییە بەسە، چ جای بەم جۆرو شێوە قوولْو گرنگەی ئێستا!!

وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ۝٧ وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ۝٨ وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا ۝٩ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا ۝١٠ وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا ۝١١ وَبَنَيۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعٗا شِدَادٗا ۝١٢

﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا﴾ كێوو شاخەكانمان نەگێڕاوە بە چەند مێخێ بۆ زەوی بۆ ئەوەی تاسەو لەنگەر نەكات و ژیان بەسەریەوە بەئارام بڕوا؟ گێڕانی كێوەكان بە مێخ مەردوم بەسەرنج دانی ڕووت هەستی پێئەكات، ئەوەتا ڕێك وەك مێخی دەوارو خێوەت وان، بەڵام بارە ڕاستەقینەكەی لە قورئان وەرنەگرین و ئەزانین كەئەم كێوانە زەوی دائەمەزرێنن و پارێزگاری ئەكەن لەتاسەو جووڵە جووڵ، جا ئیتر ئەوەش بەهۆی هاوتایی بەرزی ئەمان لەگەڵ قوڵی و نزمی ناو بێخی دەریاكانا، یا بەهۆی هاوتای قرچ هەڵهاتن و چوونەیەكی ناو سكی زەوی لەگەڵ قرچ هەڵهاتن و چوونەیەكی دەرەوەی زەوی، یا بەهۆی ئەوە لە چەند لایەكەوە باری زەوی قورس بكەن و لەخشە نەكات بەهۆی بوومەلەرزەو تەقینەوەو بزوتنەوەی ناو سكی زەوی، یا لەبەر هەر هۆیەكی تر كە هێشتا نەزانراوە. زۆر شت هەیە كە قورئان ئاماژەو دەست نیشانی بۆ كردووەو كەچی ئەوانە لەپاش چەند چەرخ بۆ ئادەمی دەركەوتن!

﴿وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا﴾ وە ئایا ئێوەمان بە جووت دروست نەكردووە، تێكەڵ لە نێرو مێ؟ ئەمەش شتێكی ڕوون و ئاشكرایە كە ئادەمی بەم دوو جۆرە دروست كراوە، ژیانی ئەم ئادەمیەو پەرەسەندنی و زۆربوونی بەهۆی ئەو دوو جۆرەیەو بەیەك گەشتنیانە، وەلەو ڕێگایەوە ماڵ و خێزان و خۆشی و ڕابواردن و ژیانی كامەرانی دەست كەوت ئەبن. زانینی ئەمانە ئاشكرایەو هەموو جۆرە كەسێ ئەیزانێ، جا لەبەر ئەوە قورئان ڕووی فەرموودە ئەكاتە ئادەمی بەتێكڕایی و ئاوری پێئەداتەوە بۆی، تا بەهۆی ئەوە بیری بكاتەوەو هەست بكات بەو مەبەست و ڕێكخستن و تەگبیرە كە خوای پەروەردگار كردووەیەتی.

ئینجا دوای ئەوە كە زانین و زانیاری بەرز بووەوە بەگرنگ تر بیربكاتەوە لەو دەستە قودرەتەی كە ئەوەندە لێزان و كاردروستە لە دڵۆپێ ئاو نێر دروست ئەكات و لە دڵۆپێ تر مێ، بەبێ ئەوەی بە ڕووالەت هیچ جیاكەرەوەو جیاوازیە بێ لەنێوان دڵۆپە ئاوەكانا، كەچی ئەمەیان بەڕێگایەكا ئەبا ئەبێ بەنێرو ئەوی تر بەڕێگای تایبەتی خۆیا ئەبات تا ببێ بەمێ، ئەو حەلە هەر كەس بێبەش نەبێ لەژیری و تێگەیشتن ئەزانێ كە جیاكەری ئەوەو بەڕێوەبەرو پێگەیەنەری مەیل و ئارەزووی خوای پەروەردگارە. ﴿وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا﴾

وەئایاخەوتنمان نەگێڕاوەبەمردن وپڕینەوەتان لەئیش وکاروبزوتنەوە، تا ئەوەش ببێ بە مایەی حەسانەوەو ماندوویی دەرچوونی لەش و هەموو هێزو ووزەکانتان؟

بەشێ لە تەگبیری خوا بۆ ئادەمی - بەڵکو بۆ هەموو گیان لەبەران - ئەمەیە کە خەوتنی بۆ داناون کە بەسەرهاتێکەو نەمردنی تەواوەو نەزیندوویی تەواوەو ئەیحەسێنێتەوەو هەموو شەکەتی و ماندوویی دەرئەکات و هۆش و وورپایی ئەهێنێتەوە، ئەم بەسەرهاتە بەشێوەیەکی نایاب و سەرسوڕهێنەر پەیدا ئەبێت و هیچ کەس نازانێ چۆنەو چیەو هیچ دەسەڵاتی کەسی تیانیە، کابرای خەوتوویش بەهیچ ڕەنگ نازانێ ئەوەی چۆن بەسەردێت! ئەم بەسەرهاتە نهێنیە کەلەنهێنی و نەزانراوەکانی گیان و لەشی زیندوو هیچ کەس نایزانێ بێجگە لەو کەسەی کەئەو لەش و گیانەی روست کردووەو ئەو شتە نهێنی و نەناسراوەی تیا داناوە و ژیانی پێوە بەستووە، ئەوەتا هیچ کەس ناتوانێ بەبێ خەوتن بژی مەگەر ماوەیەکی کەم، وەئەگەر هات و بەهەر هۆیە خەوی لێ شووم بکرێ بێگومان ناژی و ئەمرێ.

خەوتن بێجگە لەوەی پێویستیەکە لە پێویستیەکانی لەش و دەمار بەوێنەی خواردن و خواردنەوە، بێجگەلەوە چەند سوودو بەرهەمی تری هەیە. بێگومان وازهێنانی ڕوحە لە جەنگ و بەربەرەکانێی بەتینی ژیان، ڕووبەکاتە مەردوم و چەك و قەڵغانی پێدائەنێ پێی خۆش بێ یانە، ملی پێشۆڕ ئەکات بۆماوەیە، بۆئاشتی و ئاسایش، کە ئەوەش دووبارە پێویستە بۆ مەردم بە وێنەی خواردن و خواردنەوە، هێندێ جار یەکێ خەو ئەیگرێ لەکاتێکا باری دڵی زۆر قورس و غەمبارەو دەماری تێك چووەو دەروونی بێزارەو بیم و ترس داگیری کردووە، لەگەڵ چاوی نابەیەکا و خەوە نوچکە بردیەوە چەن دەمێکی کەم، ئەو خەوتنە کەمەو ئەو خەونوچکەیە گۆڕان و هەڵگەڕانەوەیەکی تەواو فەراهەم ئەهێنێ لە لەش و گیان و دەمارو دڵ و دەروون و هێزو ووزەکانی ئەو کەسەدا، وەك ئەمە یەکێ تربێت بێجگە لە کابرای پێشوو، ئەم بەهرەو چاکەیەو ئەم موعجیزە گەورەیە ڕووی دا بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆ موسڵمانانی بەتەنگ هاتوو لەڕووداوی (بدر)و (اُحد)دا وە خوا بەوە منەتی نا بەسەریانا لەسوورەتی (آل عمران)و (الانفال)دا، وە لە ڕووداوی (جمل)دا ڕووی دا بۆ (ئیمامی علی) — خوا لێی ڕازی بێ— هەروەها زۆر جار ڕووی داوە بۆ موسڵمانانی تر لەکاتی ترس و تەنگانەدا کەواتە خەوتن پێویستیەکە لە پێویستیەکانی گیانداران بەتایبەتی ئادەمی، وە بەهرەو چاکەیەکە لە بەهرەو چاکەکانی خوا کە داهێنەرو بەخشندەی هەر خوایە، شتێکی نهێنی و دەستکردێکە لە نهێنی و دەستکردەکانی خوا کە هیچ کەسی تر دەخلی تیا نیە،

بێگومان بیرکردنەوە لێی بەم شێوە قورئانیە دڵ بێدار ئەکاتەوە بەو دەستە قودرەتەی کە ئەو موعجیزەیە بەدی ئەهێنێ بە هەمیشەیی و هەروەها بیرکردنەوە لێی ڕاستی و گونجاوی زیندوو بوونەوە ئەخاتە بەر چاو، ئینجا هێندێ لە تەگبیرەکانی خوا ئەمەیە کە هەرچۆنێ خەوتنی داناوە لەپاش بزوتنەوەو ئیش و کار، هەروەها شەویشی داناوە کە زۆر ڕێك و گونجاوە بۆ خەوتن، و ڕۆژیشی داناوە کە زۆر تر ڕێك و گونجاوە لەگەڵ ئیش وکاردا، جا ئەوا باسی شەوو ڕۆژیش ئەهێنێ بەدوای باسی خەوا، ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا﴾ ئایا شەومان نەکردووە بە داپۆشەر وەك جل و بەرگ؟ واتە هەرچۆنێ جل و بەرگ مەردوم دائەپۆشێ و ئەیپارێزێ لە سەرماو گەرماو دەرکەوتنی ئەو شوێنانەی کە دەرکەوتنیان ناڕەوایە، هەروەها تاریکی شەویش مەردوم و گیانلەبەر ئەپارێزێ لە گەلێ شتی خراپ، وە گەلێ مەبەستی گرنگ هەیە کە لەژێر پەردەی تاریکی شەوا نەبێ بەدی نایەت و دەست کەوت نابێت، ﴿وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا﴾ وە ئایا ڕۆژمان نەکردووە بەکاتی ژیان؟ کە لەڕۆژا ڕاست ئەبنەوە لە خەو کە وەك مردن وایەو ناو براوە بە برای مردن، یا کردمان بەکاتی ژیان بەم ڕەنگە تیا هەڵسوڕێن و کار بکەن بۆ دەست خستنی ئەوەی پێی بژین، ﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا﴾ وە ئایا دروستمان نەکردووە بەلای سەرووتانەوە حەوت شتی بەتینی بەهێز؟ کە بەتێپەڕکردنی ئەو هەموو کات و چەرخانە هیچ جۆرە تێکچوون و کەم و کوڕی و ناڕێکیەك ڕوویان تێ ناکات.

مەبەست بەم حەوتە بەتینەی ئێرە هەر ئەو حەوت ئاسمانەیە کە لە چەند شوێنی ترا بەوە ناویان ئەبات، ئەو حەوت ڕێگایە کە لە سوورەتی (المؤمنون)دا ناوی ئەبات. ئینجا مەبەست بەمانە بە شێوەیەکی دیاری و بە بێگومان خوا خۆی ئەزانێ... هەڵئەگرێ مەبەست حەوت خولگەکەی ئەو حەوت ئەستێرە گەڕۆکانە بن کە بەناوبانگن، بەتایبەتی ئەم حەوتە باس ئەکات، چونکە ئاشکران و بەناوبانگن لەناو گشتیدا، وە کۆمەڵەی خۆری ئێمەو جیهانی ئێمە بەم حەوتە پێك هاتووە، هەڵئەگرێ مەبەست حەوت کۆمەڵە مەجەڕەو کاکێشان بێت کە بەپێی زانیاری تازە هەرکام کۆمەڵە ئەستێرەیەکن ژمارەیان ئەگاتە سەد ملیۆن ئەستێرە. هەڵئەگرێ مەبەست شتی تر بێت کە ئەم بوونەوەرەی لێ پێك هاتووەو ئادەمی بەشێکی زۆر کەمی لێ ئەزانێ.

وَجَعَلۡنَا سِرَاجٗا وَهَّاجٗا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ مَآءٗ ثَجَّاجٗا ﴿١٤﴾ لِّنُخۡرِجَ بِهِۦ حَبّٗا وَنَبَاتٗا ﴿١٥﴾
وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا ﴿١٦﴾

**ئەوەی کە گرنگ بێت ئەمەیە کە ئەم حەوتە بەهێزو دامەزراوو پەیوەستو بەستراون پێکەوەو تێکچوونو پچڕان ڕوویان تێ ناکات مەگەر خوا بیەوێ، وە ڕێك خراون لەگەڵ جیهانی زەویو ئادەمی داو پێکهێنەری ژیانن بەسەر ئەم زەوی یەوە، ﴿وَجَعَلۡنَا سِرَاجٗا وَهَّاجٗا﴾ وە ئایا دروستمان نەکردووە چرایەکی درەوشاوە یا بڵێسەداری زۆر گەرم؟ واتە ئەم خۆرە شیرینەی کە جیهانمان بۆ ڕووناك ئەکاتەوەو مایەی ژیانی هەموو گیان لەبەرانو خۆراکمانە، و مایەی پێکهاتنی هەورە ، بەم ڕەنگە کار ئەکات لە ئاوی دەریاکانو هەڵمو تەمیان لێ پێك ئەهێنێو بەرز ئەبنەوە بۆلای سەروو ئەبن بەو هەورانەی کە ئەبن بە باران، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ﴾ وە ئایا ئەمان باراندووەتە خوارەوە لەو هەورانەی کە نزیکە کاتی گوشینیان؟ یا گوشراون بەبا، یا بەهێزی کارەبا، ﴿مَآءٗ ثَجَّاجٗا﴾ ئاوێکی زۆر بەلێزمە؟ ﴿لِّنُخۡرِجَ بِهِۦ﴾ بۆ ئەمەی دەربێنین بەو ئاوە ﴿حَبّٗا وَنَبَاتٗا﴾ دانەوێڵەو گیاو درەختو ڕووەك بۆ خۆراکی ئێوەو ئاژەڵتان، ﴿وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا﴾ وە باخاتی چڕو پڕو بەناویەکا چوو.**

**لەپاش ئەو گەردش پێکردنو ئاوڕپێدانەوە بۆلای ئەو هەموو بەرهەمی دەسەڵاتو توانینو لێزانی خوا،بۆلای ئەو هەموو بەهرەو بەخشیشەی خواو سەرپەرشتیو ڕێكو پێك کردنی کاروباری بەندەکانی، کە بێگومان هەرکەس فامدارو تێگەیشتوو بێت بەبیرکردنەوە لەوانە تێئەگاتو دڵنیا ئەبێ کە خوایە ئەم ئادەمیەی ئەوەندە بە گرنگ گرتبێت هەرگیز بەرەڵای ناکات بەبێ لێپرسینەوە، ئەبێ پێغەمبەرو بەرنامەی بۆ بنێرێ تا ئەو پەروەردگارەی پێ بناسێو بانگی بکات بۆ ڕێگا ڕاستەکەیو ئاشناو زانای بکات بەو شتانەی کە بە تەنها بە ژیریی و بیر نازانرێن، وە بیترسێنێ بەو ڕۆژە دوایی یەی کە دەست نیشانو ئاماژەی بۆ کرد لە سەرەتای سوورەتەکەوەو بە توندی هەڕەشەی پێکردو ناوی برد، ئینجا ئەوا ئەگەڕێتەوە سەریو ئاماژەی بۆ ئەکاتو لێرەدا بە ناوێ لە ناوەکانی ناوی ئەبات کە زۆر ڕێکە لەگەڵ مەبەستی سوورەتەکەو ئەو ئاژاوەو دووبەرەکی یەی کە بێبڕواکان پێی هەڵئەسان،**

إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَـٰتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا
﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّـٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ﴾ بەڕاستی ڕۆژی جیاکردنەوەی ڕاستو ناڕاستو چاكو خراپ، ڕۆژی بڕیاردانو بڕینەوەی هەموو ئاژاوەو دووبەرەكی ﴿كَانَ مِيقَـٰتًا﴾لە زانینو بڕیاری خوادا كاتی دیاری كراوە بۆ كۆكردنەوەی هەموانو گەیاندنیان بە بەرو بەرهەمی كردەوەیان، بۆ بڕینەوەی هەموو دووبەرەكیو ئاژاوەی ئەم جیهانەیان.**

**ئەو ڕۆژە ڕۆژێكە كە یاسای ئەم بوونەوەرەی تیا ئەگۆڕێو هۆی پەیوەستی ئەپچڕێتەوە، لە چەند شوێنا ئامـاژەی بـۆ ئەكاتو زۆر بەسەرهاتو ڕووداوەكانی ئەخاتە بەرچاو، وەك لێرەشا ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ﴾ ڕۆژێ كە فو ئەكرێ بە صورا بـۆ زیندووكردنەوەی مردووەكان، ئینجا ئێوە هەموو زیندوو ئەبنەوەو لە گۆڕەكانتان دێنە دەرەوە ﴿فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا﴾ ئێوەش بەبێ تەفرە پۆل پۆل دێن بۆ جێگای وەستانو دەشتی كۆبوونەوە.**

**قورئان لە چەند جێگایەكا باسی صورو فوكردن بە صورا ئەكات، لە حەدیسدا بە (قرن) ناوی ئەبات، ئێمە بێجگە لە ناوەكە هیچی تری لێ نازانین لەبەر ئەوە بەكورتی تێپەڕمان كرد بەسەریاو لە دیمەنو ڕواڵەتەكەی لامان نەداو چۆنیەتیەكەیمان حەواڵەی خوا كرد، وەك ئەو هەموو شتە غەیبیانەی تر كە لە سنووری ژیریو زانینی ئێمەدا نینو نە بەگوێرەی هەندێ ڕیوایەتی لاواز لەسەری ئەڕۆین، وە نە لە ڕواڵەتەكەشی لای ئەدەینو ئەڵێین: مەبەست نیشان دانی چەسپانیو گورجی زیندوو بوونەوەی مردووەكانە. ئەوەی كە گرنگو شایستە بێ بۆ باسو بیر لێ كردنەوە ئەمەیە كە ئێمە بڕوامان ببێ بەو زیندوو بوونەوە بە یەك جارو بە كوتو پڕی، زیندوو بوونەوەی ئەو لەشانەی كە بوون بە خۆڵو تۆزو پرژو بڵاو بوونەتەوە بە جیهانو هەر بەشو پارچەیەكی كەوتووەتە شوێنێ، زیندوو بوونەوەی لەشی ئەو هەموو تاقمو چین لەدوای چینەی كە بە درێژایی تەمەنی ئادەمی هاتنو تێپەڕینو جێگاو شوێنیان چۆڵ كرد بۆ یەكترو بەجارێ ئەم زەوی ئێستە نەیئەگرتن، ئەوانە بە یەك جار ڕاست ئەبنەوەو**

ئینجا پۆل پۆل لە هەموو لایەکەوە دێن بۆ کۆبوونەوەی گشتی، کۆبوونەوەی ئەو هەموو تاقم و پۆلە کە پێشەکەی ئاگای لەدواکەی نیەو ژمارەی خوا ئەیزانێ!

﴿وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا﴾ وە ئاسمان لەت لەت ئەکرێ و پەیوەستی نامێنێ و لەتەکانی جوێ ئەبنەوە لەیەك، کەواتە هەمووی وەك دەرگای لێ دێ، واتە ئەم دەستووورو باری ئێستەی نامێنێ و هەموو ئەشێوێ بەمل یەکا، ئەم ئایەتە بەچەند جۆرێ‌تر تەفسیرکراوەتەوە و هەموو جۆرەکان هەر چاك وترا‌ون، بەلاّم ئەمەی کە لێرەدا ووتمان لەگەڵ زۆر لەئایەتەکانی ترا رێك ترە. ﴿وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ﴾ وەکێوەکان ئەپەوێنرێن و ئەخرێنە گەڕان بەسەر زەوی دا، واتە ئەکرێن بەتۆزو تەم ئینجا وەك رێگەیەکی ڕەوانیان لێ دێت ﴿فَكَانَتْ سَرَابًا﴾ کەلە دوورەوە وەك ئاو ئەبینرێ و کەچی ئاو نیە، تۆزو تەمی کێوەکانیش لەدوورەوە بەکێو دائەنرێن و کەچی کێویش نین.

خوای گەورە بەسەرهاتی کێوەکانی بە چەند جۆرێ باس فەرمووە: لەگەڵ زەوی دا هەڵئەگیرێن و ئەدرێن بەمل یەکا هەتا بە یەك جار پارە پارە ئەبن، ئینجا وەك خووری هەلاجی کراویان لێ دێت و تێکەڵ ئەکرێن بەشی کراوەیی، ئینجا ئەبن بە تۆزو پرژو بلاّوئەبنەوە، با هەڵیان ئەگرێ و کۆیان ئەکاتەوەو وەك هەور ئەیانگێڕێ، دوایی وەك ئەم رێگە ڕەوانەیان لێ دێت، کەواتە نامێنن، یا کە ئەبن بە تەم و تۆز ڕووناکی یان لێ ئەکەوێ و وەك رێگەی ڕەوان دەر ئەکەون!

ئەمەیە ئەو بەسەرهاتە سامناکەی کە ڕوو ئەدا لە گۆڕانی ئەم بوونەوەرەدا، وەك ئەو بەسەرهاتە سامناکە کە پەیدا ئەبێ لە کۆکردنەوەی پاش فووکردن بەصورا، هەنگاوی تر ئەنێ لەپاش باسی فوکردن بەصورا، بەم شێوەیە لە چارەنووس و دواڕۆژی سەرکێشەکان و لە خوا ترسەکان ئەخاتە بەرچاو، یەکەم جار باسی یەکەم تاقم ئەکات کە بڕوایان نەبوو و پرسیاریان ئەکردلەناویەکدا لەوهەواڵە گەورەیە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا﴾ بەڕاستی دۆزەخ لە زانین و بڕیاری خوادا کەمینێکەو جێگای چاوەڕوانیە بۆبێ بڕوایان، ﴿لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا﴾ بۆ یاخی و سەرکێشەکان جێ و شوێنێکە،

لَّبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا ﴿٢٥﴾ جَزَآءٗ وِفَاقًا ﴿٢٦﴾
إِنَّهُمۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا ﴿٢٨﴾

---

**ئەگەڕێنەوە بۆلای بەجۆرێ ﴿لَّبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا﴾، ئەمێننەوەو نیشتەجێ ئەبن تیایا ماوەی دوورو درێژی داونەهاتوو، لە کاتێکا ﴿لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا﴾، ناچەژن تیایا نەفێنکی، ﴿وَلَا شَرَابًا﴾ وە نە هیچ خواردنەوەیەك ﴿إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا﴾ مەگەر ئاوی بەکوڵو کێمو زووخێ کەلە لەشی دۆزەخیان دەرئەچێ ﴿جَزَآءٗ وِفَاقًا﴾ تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ بە تۆڵەیەکی ڕێكو سەر بەسەر لەگەڵ کردەوەکانیان .**

**(مقاتل) جوانی فەرمووە: هیچ تاوانێ گەورەتر نیە لە بێبڕوایی، وەهیچ سزایە گەورەتر نیە لە سزای ئاگر، کەواتە تاوانو تۆڵەکەیان سەربەسەرن. بەکورتی تاوانەکەی نیشان دان، ئینجا بەدرێژی باسی ئەکاتو دوو شتی زۆر گەورەو سەرەکی باس ئەفەرموێ: کە کانی هەموو تاوانو خراپەیەکن:**

**١- ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا﴾ بێگومان ئەوانە لەجیهانا بەتەمای لێ پرسینەوەی ڕۆژی دوایی نەبوونو بڕوایان پێی نەبوو کە بڕوا بەو ڕۆژو لێ پرسینەوە بەندێکی سەرەکی و بنەڕەتیە لەو بەندانەی کە هەموو پێغەمبەرانی پێ ڕەوانەکراوە -درودی خوایان لێ بێ- بێجگە لەوەش هەرکەس بڕوای بەو ڕۆژە نەبێ جڵەوی خۆی بەرەڵائەکات بۆ هەر تاوانو خراپەیە کە حەزی لێ بکات....**

**٢- ﴿وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا﴾ وە بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دائەنا، بەدرۆ دانانێکی تەواوو سوور بوون لەسەری، بێگومان ئەوە ئەو پەڕی تاوانە کە خوا بەڵگەو نیشانەی ڕوون دابنێ بۆ ئەمەی بەندەکانی وێڵ نەبنو پێی بکەونە سەر ڕێگاو کەچی ئەوانیش بەو بێشەرمیو لاریە پێشوازی لێ بکەنو خۆیان کوێر بکەن لەئاستی، ئەوان بەو جۆرە تاوان بار بوون.**

وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا ٢٩ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا ٣٠ إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ مَفَازًا ٣١ حَدَآئِقَ وَأَعۡنَٰبٗا ٣٢ وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا ٣٣

---

﴿وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا﴾ وە ئێمەش هەموو شتێکمان هەڵبژاردووە بەنوسین‌و ئاگامان لە هەموو شتێکە کەواتە نەهیچمان لێ ون ئەبێ، وە نەتاوانبارەکانیش ئەتوانن دان بە تاوانی خۆیانا نەنێن.

ئینجاتیری ژاراوی ئەکرێ بە بەنوکەی دڵیانا‌و نائومێد ئەکرێن لە هەموو خێرو خۆشیەك و لەهەرگۆڕان یا سووك کردنێك، بەتوانج‌و تەشەر لێدانەوە پێیان ئەوترێ: ﴿فَذُوقُواْ﴾ کەواتە بچێژن تۆڵەو سزای بێبڕوایی خۆتان ﴿فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا﴾ ئینجا ئێمەش هەرگیز هیچتان بۆ زیاد ناکەین سزاو ئازار نەبێ.

مەبەست ئەوە نیە هەتا ڕادەو پلەی سزاکەیان بەرزتر ئەکرێتەوەو بەتین تر ئەکرێت، کە ئەوەش ڕێك نیە لەگەڵ ڕواڵەتی ﴿جَزَآءٗ وِفَاقًا﴾دا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە هەرکاتێ دەق گیرا بەهەر سزایەکەوەو بەهۆی ئەوە ئێش‌و ئازاری لەبەرچاو سووك بوو، وەك خۆی‌و یەکەم جاری لێ ئەکرێتەوەو هەستکردن پێی تازە ئەکرێتەوە یا مەبەست ئەوەیە سزا لە دۆزەخدا چەند جۆری هەیەو جۆرەکانی ئەگۆڕێ‌و هەردەمە جۆرە سزایەکی ئەبێ وەك لە سوورەتی (ص)دا ئەفەرموێ: ﴿وَءَاخَرُ مِن شَكۡلِهِۦٓ أَزۡوَٰجٌ﴾وە سزای تر هەیە لەوێنەی سزای پێشوو کە چەند جۆرێکن. ئینجا بەرانبەر سزای سەختی سەرکێشان دێتە سەر باسی هێندێ لە نازو نیعمەتی لە خواترسان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ مَفَازًا﴾ بەڕاستی بۆلەخواترسەخۆ پارێزەرەکان هەیە جێگای بەهرەمەندی‌و گەیشتن بە نازو نیعمەت، ﴿حَدَآئِقَ﴾ چەند باخاتی ڕازاوەی پڕ لە درەختی جۆر بەجۆری میوەداری تیایە، ﴿وَأَعۡنَٰبٗا﴾وە بەتایبەتی چەند جۆری ترێی خۆش‌و بەلەزەت ﴿وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا﴾ وە کچانی تازە مەمك کردووی هاوتەمەن،

وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا كِذَّٰبٗا ﴿٣٥﴾ جَزَآءٗ مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابٗا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلرَّحۡمَٰنِۖ لَا يَمۡلِكُونَ مِنۡهُ خِطَابٗا ﴿٣٧﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا
مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا ﴿٣٨﴾

---

﴿وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا﴾ وە پیاڵـەی پڕلەشـەراب، بـەڵام ئەوشـەرابەی کـە سەرئێـشەو سەرخۆشـی و بێهۆشی لێ پەیدانابێ، وەك لەئایەتی تراباسی فەرمووە﴿لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا﴾ نابیستن لە بەهەشتا ﴿لَغۡوٗا﴾ نە قسەی لـەق و لۆق و پڕوپووچ ﴿وَلَا كِذَّٰبٗا﴾ وە نـە بەدرۆخستنەوە، نەلـەکاتی شـەراب خواردن و نە لە هیچ کاتێکا، واتە هەرچۆنێ لـەبارەی نازو نیعمەتـەوە تێرو تـەواون هـەروەها هیچ شتێ نابیستن کە دڵیان گەرد بگرێ پێی، ئەو خوا پێداوانە پاداشت ئەدرێنەوە ﴿جَزَآءٗ مِّن رَّبِّكَ﴾ بـە پاداشـتێك لەلایـەن پەروەردگارتـەوە ﴿عَطَآءً حِسَابٗا﴾ بـە بـەهرەو بەخششێ کـە بەسـەو کەم و کوڕی تیانیە، ئینجا لەدوا دوایی سوورەتەکەدا ئەگەڕێتەوە بۆسەر ئەو ڕۆژە سامناکەی کە لەسەرەتای سوورەتەکەوە ئاماژەی بۆ ئەکرد، ئەو ڕۆژەی کە بووبوو بە دەنگ و باس لـەناو بێبڕواکـان و دووبـەرەکی بـوون تیایـا، ئەگەڕێتـەوە هێندێ لەبەسـەرهات و ڕووداوی سـامناك باس ئـەکات کەلـەو ڕۆژەدا ڕووئـەدەن و بـەدی دێـن، ئەفـەرموێ: ﴿رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ ئەو پەروەردگارەی تۆ کە پـەروەردگاری ئاسمانـەکان و زەویـەو هـەرچی لەناویانایـە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِۖ﴾ کە زۆر بەخشندەو میهرەبانە، لەگەڵ ئەوەیشا ﴿لَا يَمۡلِكُونَ مِنۡهُ خِطَابٗا﴾ هـیچ کـەس لـە دانیشتوانی ئاسمانـەکان و زەوی لەلایـەن خـواوە دەسـەڵات و توانـای هـیچ جـۆرە قـسەیەکیان نیـە لەگـەڵ خوادا بۆ کەم کردنەوەی ئەو سزاو تۆڵەیە یا بۆ زیاد کردنی پاداشت، هـیچ کـەس ناتوانێ هـیچ ڕەخنەیـەك بگـرێ و هـیچ بڵـێ ﴿يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ﴾ لـەڕۆژێکا کـە (جوبرەئیـل) و مەلائیکەتەکانی تر بەڕیز ڕائەوەستن لەکاتێکا ﴿لَّا يَتَكَلَّمُونَ﴾ کەسیان قسە ناکەن و دوو لێوە ناکەنەوە، ﴿إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ مەگەر کەسێ کە خوای میهرەبان خۆی ڕێی قسەکردنی بدات ﴿وَقَالَ صَوَابٗا﴾ وە ئەو کەسەش قسەی بەڕێ و بەجێ بکات بەم ڕەنگە تکایە بکات کە وەرگیرێ.

ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَـٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَـٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾

**شێوەو هەڵوێستی ئەو مەلائیکەتانە کە نزیکن لە خواوەو پاکن لە گوناهو خراپەکاری، شێوەو هەڵوێستی ئەوانە بەو هەموو ترس و لەرزەوە ناتوانن دەم بکەنەوە بەبێ ئیزن و ڕێدان! ئێجگار سامناکەو بیم و ترس ئەخاتە دڵەوە، لەم کاتە ڕێکەدا ئەم فەرموودە بەهێزە ئاراستە ئەکات وئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ﴾ ئە ڕۆژەی کە باسکرا ڕۆژێکی ڕاست و بێگومانە و شایستەی قسەو باس و سەرلێکردنەوەو دووبەرەکی نیە ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا﴾ ئینجا هەرکەس بیەوێ ڕێگا ئەداتە بەر بۆلای پاداشتی پەروەردگاری خۆی، هەرکەس ویستی لە جیهانا فریای خۆی کەوێ پێش هاتنی ڕۆژی دوایی و لەدەست دەرچوونی هەل و هەلکەوتی خۆی، پێش ئەمەی سەری لەو دۆزەخەوە دەرچێ کە باسکرا، ئینجا ئەم هەڕەشە بەتینە دووبارە ئەکاتەوە: ﴿إِنَّآ أَنذَرْنَـٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا﴾ بەڕاستی ئێمە ئێوەمان ترساندو ئەوا ئەتان ترسێنین بە سزایەکی نزیک کە سزای ڕۆژی دواییەو ئەو دۆزەخە سەختەی کە لەم سوورەتەدا چەند شێوەیەکی دڵ داچڵەکێنەری باس کرد، ئەم سزایەش هەرچەند بەپێی تێگەیشتن و باوی ئێمە دووربێت و هەر ئەندازە ماوەی دوورو درێژ مابێ بۆ هاتنی لەڕووی ڕاستیدا نزیکە چونکە دوور ئەوەیە کە ڕۆیشت و تێپەری کرد، هەرچی بێگومان بەدی بێت و ڕوودبدات ئەوە نزیکە، بێجگە لەوەش مردن لە هەموو کەسێکەوە نزیکە، هەرکەسیش بمرێ پێی ناوەتە ڕۆژی دوایی، وەك ئەفەرموێ لە حەدیسا (من مات فقد قام قیامتە) هەرکەس مرد ڕۆژی دوایی ئەو کەسە هاتووەو بەرپا بووە، وە بێگومان سزای دۆزەخیانیش لەمردنەوە دەست پێئەکات، کەواتە لەم بارەشەوە هەر نزیك بوو ﴿يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾ واتە ئێوەمان ترساند بەسزایەکی نزیك کەبەدی دێت لە ڕۆژێکا کە مەردوم سەرنج ئەدات و ئەبینێ هەر کردەوەیەك کە پێشی خست و لەجیهانا کردی ﴿وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ﴾ وە بێبڕوا ئاواتە خوازەو ئەڵێ: ﴿يَـٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا﴾ ئای کاشکێ من گڵ بوومایەو ئادەمی نەبوومایە تا ڕۆژم نەگەیشتایەتە ئەم ڕۆژە!! پەنا بەخوا لە ڕۆژێ کە ئاواتی وای تیا بخوازرێ، داواکارین خوا بەمیهرەبانی خۆی پەنامان بدا لەسزای ئەوڕۆژەو سەرشۆڕی ئەو ڕۆژەو ڕوو ڕەشی ئەوڕۆژە.**

**وصلی الله علی سیدنا محمد وآله وصحبه أجمعین**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ ﴿٩﴾

---

## سووره‌تی ﴿النازعات﴾
## مه‌ككه‌ییه‌و (٤٦) ئایه‌ته

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئه‌م سووره‌ته‌ش نموونه‌یه‌كه له نموونه‌كانی ئه‌م جوزمه له ئاگادار كردنه‌وه‌ی مه‌ردوم به ڕۆژی دوایی‌و باره ڕاسته‌قینه‌كه‌ی، بۆ ئه‌و مه‌به‌سته گرنگه له چه‌ند باریكه‌وه ده‌ستكاری دڵ ئه‌كات، له یه‌كه‌م جاره‌وه به باس كردن‌و سوێند خواردن به چه‌ند شتێكی نادیار، كه هه‌ر به‌وه ترس‌و بیمێ فه‌راهه‌م ئه‌هێنێ له ده‌رووندا، ئینجا چه‌ند شێوه‌و چه‌شمه‌ندازێكی ئه‌و ڕۆژه نیشان ئه‌دات كه هه‌ر به ناوبردنیان دڵی ووریا ئه‌كه‌وێته له‌رزه، ئینجا به دوای ئه‌وه‌دا هه‌واڵی به‌سه‌رهات‌و له‌ناو بردن‌و سزای سه‌ختی یه‌كێ له بێ‌بڕوا سه‌ركێشه‌كان ئه‌هێنێ و له پاش ئه‌وه به‌شێكی گرنگ له نیشانه‌و به‌رهه‌می ده‌سه‌ڵات‌و توانینی خوا ئه‌خاته به‌ر چاو كه شایه‌تێكی زۆر ڕاست‌و به‌هێزن له‌سه‌ر خوایه‌تی خواو ته‌گبیرو چاودێریی خوا له‌م بوونه‌وه‌ره‌داو كاردروستی خوا له هه‌موو شتێكا، ئینجا ئه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ سه‌ر ڕۆژی دوایی‌و باسی پاداشت‌و تۆڵه‌ی كرده‌وه‌ی ئه‌م جیهانه كه له‌و ڕۆژه‌دا به‌دی ئه‌هێنرێن.

خوای گه‌وره له سه‌ره‌تای ئه‌م سووره‌ته‌دا سوێند ئه‌خوات، وه‌ك له سه‌ره‌تای چه‌ند سووره‌تی ترو له شوێنی تردا سوێند ئه‌خوات، سوێند خواردنه‌كانی خوا یا بۆ نرخ‌و بایه‌خ دانه به سوێند له‌سه‌ر خوراوه‌كه‌و دڵنیا كردنه له‌سه‌ر ڕاستی‌و گه‌وره‌ییه‌كه‌ی‌و ووریا كردنه‌وه‌یه له‌سه‌ر بڕوا پێ‌هێنانی، یا بۆ ده‌رخستنی نرخ‌و گه‌وره‌یی سوێند پێ‌خوراوو سوێند له‌سه‌ر خوراوه‌كه‌یه، یا له‌به‌ر ئه‌وه‌یه سوێند پێ‌خوراوه‌كه له ڕاده‌و پله‌ی خۆیا بناسرێ‌و ڕێزی خۆی پێ‌بدرێ، به‌م ڕه‌نگه ئه‌گه‌ر شتێكه مه‌ردوم بڕوای پێ‌نیه‌و دانی پیا نانێ، با بڕوای پێ‌بهێنێ‌و به‌باشی دانی پیا بنێ. ئه‌گه‌ر شتێكه به‌بێ كه‌ڵك‌و نرخ سه‌یری ئه‌كات، چونكه نایناسێ‌و بیری لێ ناكاته‌وه، با بیری لێ بكاته‌وه‌و بیناسێ‌و نرخ‌و ڕێزی

شایانی پێبدا. وە ئەگەر شتێکە زیادەڕەوی کراوە تیایا با ئەو زیادەڕەویە نەکرێ و بەپێی ئەوەی کە قورئان نیشانی ئەدا بناسرێ.

بۆ وێنە: خوا سوێند ئەخوات بە زاتی پاکی خۆی، دەی بێگومان هەرکەس بێبەش نەبێ لە فام و تێگەیشتن بەو سوێندە ئەوپەڕی دڵنیایی بۆ پەیدا ئەبێ و دڵی پڕئەبێ لە بڕوای بەهێز بەو سوێند لەسەر خوراوە، وە سوێند ئەخوات بە قورئان و ڕۆژی دوایی کە بەوە دەرئەکەوێ قورئان فەرموودەی خوایەو گەورەو گرنگەو ڕۆژی دوایی ڕاستەو بەدی دێت و قوتاربوون لە دەستی ناگونجێ و ڕووداوێکی گرنگ و گەورەشە، سوێند ئەخوات بە ئەستێرەو مانگ و خۆر تا بەبێ‌نرخ سەرنج نەدرێن و بیر بکرێتەوە لەو هەموو بەهرەو کەڵک و پیت و فەڕەی کە خوا لەوانەدا دایناوەو با زیادەڕەویش نەکرێ تیایاندا تا ئەو ڕادەی کە نەفامان بە کارکەر دایان نان لە کاروباری مەردومداو بە هۆی ئەوە پەرستنیان، ئینجا خوا سوێندی پێ‌خواردن و چەند ناو و نیشان و سیفەتێکی بۆ باس کردن کە شایەتن لەسەر ئەوەی دروستکراوێکی بە نرخ و بە کەڵکن بەڵام ژێربارن و هیچیان بەدەست نیە، ئاماژە کردن بەم ئەندازەیە بەسە بۆ هەرکەسێ کە بەدوای ڕاستیدا بگەڕێ.

ئینجابا گوێ بگرین بۆ سورەتەکەو دڵی بۆ بکەینەوە، بەڵکو بە ئیزنی خوا هەندێ لە پیت و بەهرەکانی وەرگرین و دڵ و دەروونمانی پێ ڕووناك ببێتەوە.﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا﴾ خوای گەورە سوێندی خوارد بەم پێنج تاقمە لە دروست کراوەکانی خۆی و ئەمانە بەم جۆرانە تەفسیر کراونەتەوە: هەموو چەند تاقمێ بن لە مەلائیکە، یا هەموو هەر ئەستێرە بن، یا چوار پێشووەکە ئەستێرە بن و پێنجەم مەلائیکە بێت، یا سیانە پێشووەکە ئەستێرە بن و چوارەم و پێنجەم مەلائیکە بن، بێجگە لەم ڕایانە چەند ڕایە تریش هەیە، بە هەرحاڵ و هەر جۆر مەبەست بێت هێنانیان بەم شێوەیە ترس و لەرزین ئەخاتە دەروون و چاوەڕوانی هەموو شتێکی سامناك ئەکرێ، جا لەبەر گەیاندنی ئەو مەبەستە و لەبەر بەکارهێنانی شەرم و ئەدەب لەگەڵ قورئانا وەك خەلیفەی دووەم ئەفەرموێ: ئەوەی بۆتان ڕوونە لەم قورئانە شوێنی کەون، وە ئەوەی کە ڕوون نیە وازی لێبێنن، لەبەر ئەو دوو هۆیە چاك وایە هەر بەم شێوە نادریار و شاراوەییە بەسەریا بڕۆین، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر لە زانایانی ئەم ئوممەتە بڕیویانن بەسەر یەکێ لەو مەبەستانەی کە باسکران ئەوا ئێمەش پەیڕەویان ئەکەین، وە ئەو ڕایە هەڵئەبژێرین کەئەیان برێ بەسەر مەلائیکەدا، لەسەر ئەم ڕایەش بەچەند جۆرێ ڕاڤەکراون،

یەکێ ئەو جۆرانە ئەوەیە کە مەبەست ئەو کۆمەڵە فریشتانەن کە کارو باری مردنیان پێسپێراوە، جا بەپێی ئەوە ئەڵێین: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾ سوێند بەو تاقمە فریشتەی کە گیانی بێبڕوایان ئەکێشن زۆر بەسەختی ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا﴾ سوێند بەو تاقمە فریشتەی کە گیانی بڕواداران ئەکێشن بەنەرمو نیانیو ووردەووردەو لێ ڕاوەستان تابڕوادارەکە ئیسراحەت بکاتو ئینجا دەست پێئەکەنەوە بەهێواشو ئاسایشی وەك مەلەوان لەناو ئاودا کەلەسەرخۆ ئەبزوێتەوە، کە مەبەست بەم فەرموودەیە ﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا﴾ وە سوێند بەو تاقمە فریشتە گیان کێشەی کە بەهێواشو لەسەرخۆ ئەجووڵێنەوە لەگیان کێشاندا بۆئەمەی ئێشو ئازاری سەخت نەگات بە گیان کێشراوەکە، یا مەبەست نیشان دانی شێوەی هاتنیانە لە ئاسمانەوە و کشانیان وەك مەلەوان لەناو ئاودا، ئینجا کە گیانەکان ئەکێشن چەسپانی ئەکەن بەبردنی گیانی دۆزەخیان بۆلای بەهەشت ئینجاهەڵئەسن بەتۆڵەو پاداشتیانو تەگبیری کاروباریان ئەکەن کەئەم دووفەرمانەمەبەستە کەئەفەرموێ: ﴿فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا﴾ ئینجاسوێند بەو فریشتانەی کە چەسپانی ئەکەن بە گیانی بێبڕوایان بۆ دۆزەخ، وە بەگیانی بڕواداران بۆ بەهەشت ﴿فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا﴾ ئینجا هەڵئەسن بە تۆڵەو پاداشتیانو تەگبیری کاروباری پێویستیان ئەکەن.

سوێندی خوارد بەوانەو سوێند لەسەر خوراوەکەی باس نەکرد چونکە وەرئەگیرێ لەم ئایەتانەی دوواوە کەئەوەش شتێکە لەم بابەتە: ڕۆژی دوایی بەرپا ئەبێو ڕۆژی زیندووکردنەوەو تۆڵەو پاداشت دەست پێئەکات ﴿يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ﴾ لە ڕۆژێکا کە زەویو هەرچی وابەسەریەوە ئەکەوێتە لەرزەو تێکچوون یا شریخەو شاخەکەرەکە ڕووئەداو دەست ئەکات بە شریخەو شاخە واتە یەکەم جار کە فوو ئەکرێ بەصورا، لەکاتێکا ﴿تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ﴾ کە ئاسمانو ئەستێرەکان دێن بەدوای زەویدا لەلەرزینو تێکچوونا، یا شاخەو شریخەی دووەم دێت بەدوایا بۆ زیندووکردنەوە.

هەرکام لەم دووبارە مەبەست بێت هەر ڕێكو ڕاستەو بەدی دێت، بە بیرکردنەوە لێی مەردوم باش بۆی ڕوون ئەبێتەوەو هەست ئەکات بەڕاستی ئەم فەرموودەیە: ﴿قُلُوبٞ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ﴾ چەند دڵێ لەو ڕۆژەدا لەترسانائەلەرزنوتەپەتەپ ئەکەن ﴿أَبۡصَٰرُهَا خَٰشِعَةٞ﴾ چاوەکانی ئەو خاوەن دڵانە لەترسانا شۆڕو سەرەوژێرن.

يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُواْ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا
هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ
طُوًى ﴿١٦﴾

---

﴿يَقُولُونَ﴾ بێبڕواكان ئەڵێن: ﴿أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي ٱلْحَافِرَةِ﴾ ئایا ئێمە ئەگێڕێنرێینەوە بۆ ژیان لەپاش مردن‌و وەك خۆمان پێش مردنمان پێ‌ئەكرێتەوە؟ ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً﴾ ئایا زیندوو ئەكرێینەوە كاتێ بووین بە ئێسقانی ڕزیووی ناو بۆش كە كاتێ بای پیا بچێ دەنگ ئەداتەوە، واتە دوای مردن‌و ئەوەشمان بەسەربێت كە زۆر دوورە لە ژیانەوە هەر زیندوو ئەكرێینەوە؟ ﴿قَالُواْ تِلْكَ﴾ ئەڵێن ئەو گێڕانەوەو زیندووكردنەوەمان ﴿إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾ ئەگەر وابێ گێڕانەوەیەكی زۆر زیاندەرە بە ئێمە، ئەم قسانەی كەلە بێبڕواكان ئەیگێڕێتەوە قسەی یەكەم جاریانە كەلە گۆڕەكانیان دێنە دەرەوەو لە بێهۆشی‌و سەرگەردانی خۆیانا ئەیڵێن‌و پرسیار ئەكەن لەیەكتر، یاقسەی بۆگەنی ئەم جیهانەیانەكە بەكەشخەو لاقرتیەوە دەم بازیان پێ‌ئەكرد بەهەركام هەر ئەگونجێ‌و زانایانی تەفسیر ووتویانە، بەهەرحاڵ ئەوا قورئان زۆر بەسووك‌و ئاسان بڕیاری ڕاستی ئەدات‌وپێمان ڕائەگەیەنێ كەئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ﴾ئەوگێڕانەوە و زیندووكردنەوە هەر بەیەك دەنگ‌و تێخوڕین پەیدائەبێ ﴿فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ هەر لەگەڵ ئەو دەنگ‌و تێخوڕینە بوو ئیتر ئەوانە بەزیندوویی وان لە زەویەكی تەختی كاكی بەكاكی سپیدا؟

لەیەكەم جاری سوورتەكەوە تا ئێستا شێوەی توندوتیژی بەكارهێنا كەئەوە زۆر ڕێك‌و شایان بوو لەگەڵ باس‌و مەبەستەكەدا، ئینجا هێواشی ئەكاتەوەو بە شێوەیەكی نەرم‌و ناسك‌و بەكورتی داستانی موسا و فیرعەون ئەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دڵخۆشی دانەوەو دڵنەوایی كردنی لەسەر بڕوا نەهێنان‌و سەركێشی‌و لاقرتی كردن‌و دەم بازی ئەو یەكەم تاقم‌و گەلەی كە بانگی ئەكردن بۆسەر ڕێگای ڕاست‌و بۆلای خوا، دڵنەوایی ئەكات بەمەی كارەكە هەروابووەو هەروا هاتووە، ئەوەتا موسا بەو شێوە شیرینە بانگی فیرعەونی كردو كەچی ئەو هەر یاخی بوو تا خوا ئەوەی بەسەر هێنا و دووچاری سزای هەردوو جیهانی كرد.

کەواتە لە گێڕانەوەی ئەم داستانەدا موژدەیەکی گەورەش هەیە بۆی بەسەرکەوتن و زاڵبوونی خۆی و ئایینەکەی، وەك موسا پێغەمبەر (علیه السلام) هەرچۆنێ هەڕەشەشی تیایە لە گەلە بێبڕواکەی، کە جێیە فیرعەون بەو هەموو دەسەڵات و تواناوە خوا لەناوی برد ئەمانیش لەناوئەبات.

سەرگوزەشتەو داستانی موسا (علیه السلام) لە هەموو داستانێتر زۆرتر هاتووەو درێژەی پێدراوە لە قورئانا. لە زۆر سوورەتی تر لەمەوپێش چەند زنجیرەیەکی جۆر بەجۆر هاتووە بە چەند شێوەیەکی تایبەتی جیاواز بەپێی باس و مەبەستی شوێنەکە، ئەوەش بەپێی باوی بێوێنەی قورئانە کە ئەو شێوە جۆر بەجۆرانە بەکار ئەهێنێ. لەم سوورەتەدا بەکورتی هاتووەو بە چەسپانی تێپەڕئەکات بەسەریاو ئەیخاتە بەرچاو، هەر لە بانگ کردن و ڕەوانە کردنیەوە تا سەری فیرعەون ئەکات بە سزای ئەم جیهان و ئەو جیهانا، ئەو داستانە دوورو درێژەی ئەو ماوە زۆرە ئەهێنێ بە چەسپانی لە چەند ئایەتێکی کورت و بچکۆلەدا کە ئەوە ڕێکە لەگەڵ سروشتی سوورەتەکەدا. ئەم چەند ئایەتە کورتە چەند زنجیرەیەکی ئەو داستانە نیشان ئەدا، لە یەکەم جارەوە دەست پێئەکات بەئاڕاستەکردنی فەرموودەو پرسیارێ کە بۆ وورباکردنەوەو ئامادەکردنی دڵ و گوێ یە بۆ وەرگرتن و گوێ گرتن لە قسەو باسەکە ئەفەرموێ: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ ئینجا ئەگەر ئەم هەواڵ و باسەی لە پێش ئەم سوورەتەدا بۆ هاتنی ئەبێ بڵێین! ئایا داستانی (موسا) تەفسیر بۆ نەهاتووە؟ واتە بێگومان بۆت هاتووە کەواتە پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرە، ئەگەر ئەمە یەکەم جاربێ ئەم هەواڵەی پێبکات، ئەبێ بڵێین: ئایا بۆت هاتووە، یان با من هەواڵت بدەمێ، چونکە پەندو ئامۆژگارە تیایە. ﴿إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ﴾ سەرگوزشتەو داستانی (موسا) کاتێك کە پەروەردگاری بانگی لێکرد، ﴿بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى﴾ لەکاتێکا کە موسا لە شیوی پاك و پیرۆز کراوا بوو کەناوی ﴿طُوًى﴾یەو لای دەستەڕاست کێوی (طور) کەوتووە بۆ هەر کەس کەلە (مدینه)وەبێت.

بەڕاستی ئەو کاتی بانگ لێ کردنە هێجگار کاتێکی بەرزو گەورەو بەرێزو نایابە، وە بانگ کردنی خوا لە هەر بەندەیە لە بەندەکانی شتێکی زۆر گرنگ و گەورەیە، گەورەترە لەوەی کەرتاری ئادەمی بتوانێ دەری بخات و ڕوونی بکاتەوە، بۆچوون و تێگەیشتنی ئادەمی بتوانێ پێی بگات، چونکە ئەوە نهێنیەکە لە نهێنیەکانی خوای گەورە، و نهێنیەکە لەو نهێنیانەی کە خوا لەهێندێ ئادەمی دا داینا وەو بەهۆی ئەوە ئامادەبووە بۆ وەرگرتنی ئەو بانگ کردنە.

ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾
فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ
﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾

---

**لەچەند شوێنی ترا درێژەی داوە بەو بانگ کردنو ووتو وێژەی کە ڕووی دا لە بەینی خواو (موسا)دا لەو کاتو هەڵوێستەدا، بەڵام لێرەدا کە کاتی تێپەڕکردنە بەچەسپانی، بەپێی شوێنو مەبەستە کە هیچ لەو بارەیە نادوێ، بەڵکو بەدوای باسی فەرماندان بە ناردنو پەیامەکەی (موسا) ئەهێنێ: ﴿ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ﴾ واتە بانگی لێ کردو فەرمووی: بڕۆ بۆلای فیرعەون ﴿إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ چونکە بەڕاستی یاخی بووەو لەسنوور تێپەڕی کردووە. بێگومان سەرکێشی و یاخی بوون شایستەی بوونو مانەوە نیە، چونکە شتێکی ناڕەواو بێزراوە، خاکو وولات تێك دەدە، دژو پێچەوانەی فەرمانو دادو خواستی خوایەو خوا خەشمی لێی هەیە، لەبەرئەوە ئەو بەندە هەڵبژێراوەی نارد بۆ ئەمەی ئەو تاوانە بوەستێنێو ئەو سەر کێشە بەرگری بکات.**

**ئینجا فێری کرد کە چۆن قسە بکات لەگەڵ ئەو سەرکێشەدا، فەرمانی دا بە شێوەیەکی زۆر شیرینو ڕاکێشەری دڵ لەگەڵی بدوێ، بەڵکو کۆتایی بێنێ،و خۆی بپارێزێ لە خەشمی خوا، فەرمووی: ﴿فَقُلْ﴾ ئینجا کە چوویتەلای پێی بڵێ: ﴿هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ﴾ ئایا ئەتەوێ خۆت پاك بکەیتەوە لە چڵكو چەپەڵی بێ بڕوایی و سەرکێشی، ﴿وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ﴾ وە ئەتەوێ ڕێگات نیشاندەم بۆلای پەروەردگارت تا بیناسی و بەهۆی ئەوە بترسی لێی و گوێڕایەڵی بکەیت بۆی؟ بێگومان هەرکاتێ بەندە خوای خۆی ناسی لێی ئەترسێ، کە لێیشی ترسا جڵەوی خۆی بەرەڵا ناکاتو یاخی نابێ، وە هەر کات سەری کردە گوناهو تاوانو یاخی بوو، ئەوەلای داوە لە پەروەردگاریو دوور کەوتووەتەوە لێی و ڕێگای ون کردووە، ئینجا (موسا) پێغەمبەر ئەو فەرمانەی کە پێی سپێررابوو بەجێی هێنا بەو جۆرو ڕەووشتەی خوا فەرمانی داو فێری کرد، بەڵام ئەوە هیچ کەڵکی نەبوو لەنەرم کردنی ئەو دڵە ڕەقە بۆشەی فیرعەونی ستەمکاری خوا نەناس. ﴿فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ﴾ ئینجا موسا نیشانەو موعجیزە گەورەکەی نیشاندا کە گەرانی داردەستەکەی بووبە ئەژدیها، یا ئەمە لەگەڵ دەستە**

درەوشـاوەکەی ﴿فَكَذَّبَ﴾ ئینجـا هـەر بـڕوای نـەهێناو موسـای بـەدرۆزن‌و جادوبـاز دانـاو ﴿وَعَصَىٰ﴾ وە یاخی بوو لێی. بەوە وازی نەهێنا، بەڵکو کەوتە هـەوڵ‌و تێکۆشـان بۆ بەربەستی (موسا)و تێکدانی کارەکەی، چونکە زانی ئەو نیشانەو موعجیزەیە کار ئەکات لە دڵی ئەو گەلـەداو دڵیـان ئـەگۆڕێ‌و ڕای ئەکێشێ بـۆلای (موسـا)و ئایینەکـەی، وە هەوڵەکەشـی لـەم ڕووەوە بوو کە (موسا) جادوبازەو ئەمیش هـەموو جادوبازەکانی بۆ کۆئەکاتـەوە بۆ جـادوو لێ کردنی، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ﴾ لە پاشا فیرعەون پشتی کردە گوێڕایەڵی بە تێکۆشان بۆ بەربەسـت کـردن و بـەر پـەرچ دانـەوەی موسـا، ﴿فَحَشَرَ﴾ ئینجاجادووبـازی وڵاتەکـەی کۆکردەوە ﴿فَنَادَىٰ﴾ بـانگی کـردن‌و جاڕیـدا لـەناو ئـەوان‌و سـوپاو گەلەکـەیاو ﴿فَقَالَ﴾ ئینجـا ووتی: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ من خوای هەرە بەرزو بڵندی ئێوەم!

ئەو ستەمکارە یاخیە ئەو ووشەو قسە زۆر پیس‌و بۆگەنەی بەدەما هات لەناو ئەو هەموو کۆڕو کۆمەڵە گەورەیەدا بەبێ‌باك‌و شەرم، چونکە شارەزای ئەو گەل‌و کۆمەڵە بوو ئەیزانی کە نـەفام‌و نـادانن، بێ‌گومـان شـتێکی ئاشـکرایە کـە هێـزو دەسـەڵات‌و سـتەم‌و دەسـت درێـژی ستەمکارو یاخی یەکان لەسـەر نـەفامی‌و نـادانی‌و کـەودەنی‌و سـادەیی گـەل‌و ژێردەستـەکان ڕاگیرە لە هەموو چەرخ‌و تاقم‌و چینێکا، ئەگینا هەموو یاخی‌و سەرکێشێ تەنها کەسێکە لـەو گـەل‌و کۆمەڵـەو لـە ڕاسـتی دا ئـەو هێـزو دەسـەڵاتەی نیـە، بـەڵکو هێـزو دەسـەڵاتەکەی ئـەو کۆمەڵ‌و گەلە نادانەیەکە ئەبن بە وولاخـی ژێرباری‌و پشتی خۆیانی بۆ دانەخـەن‌و ئـەویش سـوارییان ئـەبێ! وە ملـی بـۆ درێـژو شـۆڕئەکەن‌و ئـەویش لغاویـان ئـەکات! وە سـەری بـۆ دائەخـەن‌و ئـەویش بـەرزو زاڵ ئـەبێ بەسـەریانا! دەسـت بـەرداری مـافی سـەربەرزی‌و ڕێـزی خۆیـان ئـەبن تـا ئـەویش یـاخی ئـەبێت‌و هـەموو مافیـان ژێرپـێ‌و داگیر ئەکات! گـەل‌و کۆمـەڵ ئـەوەی بەسـەر دێـت‌و ئەکەوێتـە چـاڵی بەدبـەختی، چـونکە بـەهۆی سـادەیی‌و نادانیـەوە هەڵخەڵـەتاوە، لـەبارێ تـرەوە ئەترسـێ. ئـەو ترسـەش زۆر ناڕاسـت‌و بێ‌جێ‌یـە، چـونکە ئـەو سەرکێش‌و یاخیە .کە تەنها یەکێکە .هەرگیز ناگونجێ بەهێزو بەدەسەڵات تربێ لـەو هـەموو گەل‌و کۆمەڵە، ئەگەر ئەوان هەست بکەن بە ئادەمێتی‌و ڕێزو سەربەرزی‌و ئازادی خۆیـان. هـەرکام لـەوان یەکێکـە وەك ئـەو بـەڵام یاخیەکـە ئەیخەڵـەتێنێ‌و وا ئەباتـە مێـشکیەوە کـە کاروباری ئەوی بەدەستەو لەگەڵ ئەوەدا کاروباری هەموو بەدەست خوایە.

هەرگیز ناگونجێ تەنها یەکێ یاخی ببێ لەناو گەل و کۆمەڵێکی دانای مەردی خواناس دا، هەر گەل و کۆمەڵێ خوای خۆی بناسێ و بڕوای ڕاستەقینەی پێی ببێ هەرگیز مل شۆڕ ناکات بۆ تەنها یەکێکی وەك خۆی نەفازانج و نەزبانی بە دەست بێت! گەل و کۆمەڵەکەی فیرعەون نادان و کەودەن و خوانەناس بوون بۆیە فیرعەون توانی بەو جۆرە یاخی ببێ و بێ شەرم بێبك ئەو قسە پیسە بكات لە ناویانا!!

فیرعەونی سیا چارە لە خۆی گۆڕاو یاخی بەە تا ئەو ڕادەیە جاڕی خوایەتی دا بۆ خۆی ﴿فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ﴾ ئینجا خوایش گرتی بەسزای ڕۆژی دوایی و ئەم دنیاش بەخنکاندنی خۆی و سوپاو دەست و بەستەکەی بە ڕیسوایی و نەفرین لێ کراوی لە هەر دوو جیهانا.

باسی سزای ڕۆژی دوایی پێش خست. چونکە سەخت ترو هەمیشەییە. کەواتە سزای ڕاستەقینە هەر ئەو سزایەیە، هەر ئەو سزایەش سزای ڕاستەقینەی ئامادەکراوە بۆ یاخی و سەرکێشەکان. وە هەم سزای ئەو ڕۆژە ڕێك و پێك ترە لەگەڵ ڕۆژی دوایی دا کە کراوە بە مەبەستێکی سەرەکی سوورەتەکە. بێجگە لەوەش بەم شێوەیە ئایەتە کە بە ووشەی ﴿وَالْأُولَىٰ﴾ تەواو ئەبێ کە ڕێك و پێکە لەگەڵ دوایی ئایەتەکانی پاش و پێشیا کە ئەوەش شتێکی پێویستە بەپێی باوی ڕەوان بێژی، فیرعەون کە خاوەنی هێزو دەسەلاتی بەتین بوو، پادشایەتی و جڵەوی وولاتێکی گەورەو فراوانی لە دەستا بوو بەو جۆرەی بەسەرهات، دەی ئەبێ بێبڕواکانی تربەتەمای چی بن؟﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ﴾ بێگومان لەم باس و بەسەرهاتە گرنگەی موسا و فیرعەون دا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هەر کەس کەلە خوابترسێ. بێگومان ئەوکەسەی کەخوانەناسێ و لێی ئەترسێ ژیروتێگەیشتووە، وەهەرکەسیش ژیروتێگەیشتوو بێت ئەزانێ کە ئەو بەسەرهاتی فیرعەونە پەندو ئامۆژگاریە بۆ مەردومی تر، بەڵام ئەو کەسەی کە خوا ناناسێ و لێی ناترسێ، ئەوە پەردەو بەرهەڵست هەیە لەبەینی ئەوو پەندو ئامۆژگاری داو هۆش ناکاتەوە مەگەر کاتێ کە دووچاری تۆڵەو بەرهەمی کردەوەی خراپی خۆی دێت کە تازە دەردەکەشی تیمار ناکرێ و ڕزگار بوونی نابێ!

ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلْأَرْضَ
بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾

لەپاش ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاو ئاوڕی دایەوە بە دڵو دەروون بۆ لەناوچوونی یاخی یانی ڕابردوو کە بەهێزو دەسەڵاتی خۆیاندا ئەنازین، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر بت پەرستەکان کە کەشخەیان ئەکرد بەو ئەندازە هێزو دەسەڵاتە کەمەی کە خوا پێ‌ی دابوون، ئەگەڕێتەوە سەریان ڕووی فەرموودەیان تێ ئەکاتو ئەیانگێڕێتەوە بۆلای بەشێ لە بەرهەمو دەسەڵاتی خوا لەم بوونەوەرەدا، ئەفەرموێ: ﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا﴾ ئایا دروست کردنی ئێوە گرانترە ﴿أَمِ ٱلسَّمَآءُ﴾ یا دروست کردنی ئاسمان؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بۆ ئەوان تەنها وەڵامێکەو ئەبێ هەر بڵێن: ئاسمان! کەواتە ئایا بە چ هێزێکی خۆتان ئەنازن کە ئاسمان لە ئێوە بەهێزترو بەتین ترە، وە ئەو کەسەی کە ئاسمانی دروست کردووە بەهێزترە لە ئاسمان؟ ئەم پرسیارە بۆ باری تریش دەست ئەداو بۆ مەبەستی تریش هەڵئەگرێ، کە ئایا زیندوو کردنەوەتان بۆچی بە دوورو نەگونجاو سەیر ئەکەن لەکاتێکا زیندوو کردنەوە دووبارە کردنەوەی دروست کردنی یەکەم جارە، وە دروست کردنی یەکەم جار ئاسانترە لە دروست کردنی ئاسمان، دەی کەسێ بتوانێ ئاسمان دروست بکات کە گرانترە ئەبێ باشتر بتوانێ دووبارەتان بکاتەوە، لەسەر هەر بار بەکارهێنانی گرانترو سووکتر بەپێ‌ی باوو تێگەیشتنی بێبڕوایانە، ئەگینا بۆ خوا هەموو شت یەکسانەو ئاسانەو هیچی پێویست نیە بێجگە لەوەی خوا بیەوێ ببێ ئیتر ئەبێ بەبێ تەفرەو دواکەوتن! ئینجا ئەندازێ بە درێژی باسی دروست کردنی ئاسمان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿بَنَىٰهَا﴾ ئاسمانی دروست کرد، بەم ڕەنگە ﴿رَفَعَ سَمْكَهَا﴾ قەدو باڵای بەرز کردەوە ﴿فَسَوَّىٰهَا﴾ ئینجا ڕێكو پێکی کرد، بەم ڕەنگە هەموو ئەستێرەو مانگو ڕۆژو بەشو پارچەکانی لەشوێنی تایبەتیو لە چەمەرەو خولگەی تایبەتی خۆیانا دامەزراندو خستنیە کارو ڕاگیرو دامەزراوی کردن هەر کام لەسەر باری تایبەتی خۆی‌و بەستنیەوە پێکەوە بەبێ ترازانو دواو بەرو بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەی هیچ کام، تا ئاوای

لیٚ هات شێوه گشتی یەکەش لە دوورەوە وەك كۆنكريتو بینایەکی دارێژراو وایە، بە سەرنج دانو تێروانینێکی ڕووتو سادەش دەرئەکەوێ ئەو ڕێكو پێکیو پەیوەستیو گونجاویە خوای کاردروست پێکی هێناوە لەم ئاسمانەدا، بەجۆرێ هەموو خاوەن ژیریەك سەرگەردانو سەرسامە تیایا، هەرکەس ڕێزی خۆی بەلاوە بێ ناچارە ئەبێ دان بنێ بە بوونی هێزی هەرە گەورە کە تەگبیرکەرو بەڕێوەبەری ئەو هەموو کاروبارەیە، هەرکەس ئەیەوێ خۆی بێئابڕوو نەکات ئەبێ دان بنێ بەوەدا، ئیتر با بڕوای بە هیچ ئایینێ نەبێ!

﴿وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا﴾ وە شەوی ئاسمانەکەی تاریك کرد ﴿وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا﴾ وە ڕووناکی ڕۆژەکەی دەرهێناو دەری خست، واتە شەوو ڕۆژی داهێنا هاتنی ڕووناکیو تاریکی بەدوای یەکتردا شتێکی ئاشکرایەو هەموو کەس ئەیزانێ، وە هۆی بیرکردنەوەیە لەو دەستە قودرەتەی کە ئەوە ئەکات، بەڵام هەرشتێ کە زۆر بینراو دەقی پێوە گیرا لەبەرچاو کۆن ئەبێو لەیاد نامێنێ، جا لەبەرئەوە قورئان ئەم جۆرە شتە نایابانە تازە ئەکاتەوە بەبێدار کردنەوەو سەرنج ڕاکێشان بۆلایان، بەوە هەستو هۆش ئەخاتەوە سۆزو پەرۆش بۆیانو تازەیان ئەکاتەوە لە دەروونا. ﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾وە لەپاش ئەوەی ئاسمانی بەوجۆرەدروستکرد ئینجا زەوی ڕاخستو وای لێکردکەدەست بدابۆژیان تیایا، بەم ڕەنگە ﴿أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا﴾ ئاوی لیٚ دەرهێنا لەزەوی ئاوەکەی ﴿وَمَرۡعَىٰهَا﴾ وە لەوەڕگەی بۆخۆراکی ئادەمیو ئاژەڵ ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا﴾ شاخو کێوەکانی دامەزراند بۆ لەنگەر گرتنی زەویو بەرگری کردنی لەتاسەو لەنگەرەکردن. ئایەتی (حم) سوورەتی (سجدە)وا نیشان ئەدا لەپێش ئاسمانا دروست کراوە، ئەم ئایەتە ئەفەرموێ: ڕاخستنی زەویو ئامادەکردنی بۆ ژیان خستە پاش دروست کردنی ئاسمان، نەك دروست کردنەکەی کەواتە ئەم دوو ئایەتە دژی یەکتر نینو جێگای هیچ ڕەخنەیەك نیە تیایاندا.

تێڕوانینی ئاسمانی تازە نزیکە لە مەبەست بەم ئایەتو شێوە کاتێ کە ئەڵێن چەند سەدان ملیۆن ساڵ تێپەڕی کرد بەسەر زەوی دا، ئەخولایەوەو شەوو ڕۆژی ئەهات بەسەردا پێش ئەوەی کە ڕاخرێو ئامادەبکرێ بۆ کشتوکاڵ، پێش ئەمەی پێستەکەی وەك ئێستەی لیٚ بێتو بەرزیو نزمی لیٚ پەیدا ببێ.

مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٣﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ
ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴿٣٩﴾

خوای گەورە ئەوانەی کردو ئینجا ئەفەرموێ: ﴿مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾ واتە ئاسمان و زەوی بەو جۆرە دروست کرد لەبەر بەهرەمەند کردن و ژیاندنی ئێوەو ئاژەڵتان، بەڵێ لەلوتف و کەرەمی بەزیاد بێت خێرو بێرو بوومی ئەم ئاسمان و زەوییە ئەگەڕێتەوە بۆ ئێمەو ئاژەڵمان.

خوای میهرەبان ئامۆژگاری ئادەمی ئەکات و تەگبیری گەورەو گرنگی خۆیان بیر ئەخاتەوە لەلایەکەوە، وەلەلایەترەوە دەست نیشان و ئاماژە ئەکات بۆ ئەمەی کە دروست کردنی ئاسمان و زەوی ئەوەی لەناویانایە هەروا بەگۆترە کاری نەکراوە، بەڵکو هەموو شتێ بەتایبەتیەو ئەو پەڕی ووردەکاری تیا بەکار هێنراوە، لە داڕشتن و پیلانی ئەم ئاسمان و زەویەدا حیسابێ کراوە بۆ ئەم ئادەمیەی کە خوا ویستی بیکا بەجێنشین لەم زەویەداو ئەوەی پێویست بێبۆ بوون و مانەوەو پەرەسەندن و بەرز بوونەوەی ئەم ئادەمیە تێبینی کراوە لە داڕشتن و پیلانی بوونەوەردا بەشێوەی گشتی. وەلەداڕشتن و پیلانی کۆمەڵەی خۆریی ماندا بەتایبەتی، وە لە پیلانی ئەم زەویەدا بەتایبەتی تر، قورئان لەم دەست نیشان و ئاماژە کردنەدا چەند شتێکی ڕوون و ئاشکرای باس کردووە کە بەچاوی ڕووت ئەبینرێن و ناسراون لای هەمووکەس،دروست کردنی ئاسمان وڕێك وپێك کردنی هەمووبەش وپارچەکانی و بەدواهاتنی شەوو ڕۆژو ڕاخستنی زەوی و دەرهێنانی ئاو لەوەڕی و دامەزراندن و لەنگەر گرتنی کێوەکانی، باسی ئەم شتە ئاشکرایانەی کردووەو کردونی بەمایەی ژیان و بەهرەمەندی ئادەمی و ئاژەڵی. کە ئەمانە شایستەن بۆ ئەوەی ئاڕاستەی هەموو جۆرە کەسێ بکرێن لە هەموو چەرخ و چینێکا، لەگەڵ ڕادەو پلەی ژیری و زانیاری هەموودا شیاوو گونجاون، لەبەرئەوەیەفەرموودەکانی قورئان گشتی یە بۆ هەموو ئادەمی لە هەموو چەرخێکا و لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیا. قورئان بەم شتە ئاشکرایانە تێی گەیاندین لەو تەگبیرە گەورەیەو لەو ووردەکاری و ڕێکخستنە گرنگەی کەبەکارهێنراوە بۆ بەرژەوەندی ئەم ئادەمیە، ئینجا لەدوای ئەو شتە ئاشکرایانەبەسەدان و بەهەزاران شتی ترهەیە کە تێبینی کراوە لە

داڕشتن و پیلانی (تصمیم) ئەم بوونەوەرەدا کە بەرەبەرە دەرئەکەون و رێیان پێ ئەبرێ، ئەمانەو ئەوانە هەموو شایەت و نیشانەیەکی ڕوون و ڕووناکن لەسەر ئەوەی کە ڕێکەوت و گۆترەکاری بەهیچ کلۆجێ ناگونجێ، هەرکەس بەش براو نەبێ لە تێگەیشتن و ژیری ئەزانێ کە سروشتی ئەم بوونەوەرە دژو پێچەوانەی گۆترەکاری و ڕێکەوتە، بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانەئادەمی ئەوەندە پەستی و نەفامی داگیری بکات تا ئەو ڕادەیە بڕوای ببێ بەڕێکەوت بەڵکو شتی وا بەدڵیا گوزەر بکات و دوودڵ بێت لەناڕاستی و نەگونجاوی ڕێکەوت!

ئەو هەموو ڕێکخستن و وردەکاریە دەست پێ ئەکات لە هەموو بوونەوەرەوە بە شێوەی گشتی، ئینجا بەتایبەتی لەم کۆمەڵەی خۆری ئێمەوە کە هۆنراوەتەوە و ڕێکخراوە بەپێی زانیاری تازە لە سەدەها ملیۆن ئەستێرە، لەناو ئەوانەدا ئەم زەویە ئەستێرەیەکی تایبەتی و تاقانەیە کە ڕێك و پێك و گونجاو کراوە بۆ ژیانی ئادەمی، هیچ کەس ـ تائەمڕۆ ـ ئەستێرەیە تری نەدۆزیوەتەوە کە بەوێنەی ئەم ڕێك و گونجاو کرابێ بۆ ئەم ژیانە! ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە چەند هۆیەکی ئاشکرای ئەم ژیانە هەر لەم زەویەدا هەیە و ناسراوە کەئەوەی شایانی باس بێت سێ شتە: قەبارەیەکی ڕێك و گونجاو، دووریەکی میانە، پێکهێنان لەچەند کەرەستەیە کەپێویستن بۆ بزوتنەوەی ژیان.

پێویستی هەیە بەقەبارەیەکی تایبەتی، چونکەبەبێ هەوا ئەم ژیانەنابێ و مانەوەی پەردە و پێستێکی هەوا بەدەوری زەویدا بەستراوە بەو هێزی کێشندەی کە هەیە لەزەویداو بەپێی قەبارەکەی، وە پێویستی هەیە بەدووریەکی میانەیی لە خۆرەوە لەم ڕادەتایبەتیەی کە بۆ زەوی هەیە چونکە نزیکتر بێت لەم ڕادەی ئێستەیە لەبەر گەرمی هیچ کەس خۆی بۆ ناگیرێ و ئەسووتێ، وەئەگەر دوورتربێت لەبەرساردی وسەرماژیان نابێ وهەمووشتێکی تەڕئەیبەستێ، وەپێویستی هەیە بەو هەموو کەرەستانە بەو ڕادەو ڕێژەیە کە هەیە لەزەوی دا چونکە لەسەر ئەو ڕادەو ڕێژەیە خۆراك فەراهەم دێت کە گیان و ژیانی لەسەر ڕاگیرە وە هیچ ئەستێرەیە تر وەك زەوی بۆی ڕێك نەخراوەلەبارەی ئەم شتەسەرەکیانەوەبەڕاستی هەرکەس شوێنی قورئان بکەوێ و لەم چاوە قورئانیەوە سەرنجی ئەم ئاسمان و زەویە بدات ئەو کەسە تێ ئەگات لەم تەگبیرو وردەکاری و ڕێکخستنەی کەبەکار هێنراوە لە داڕشتن و پیلان (تصمیم)ی ئەم

بوونەوەرەدا، ئەو حەلە بەباشی تێئەگات کە هاتنی ڕۆژی دوایی و پرسیارو تۆڵەو پاداشت شتێکی پێویستەو هەر ئەبێ ببێت، چونکە ناگونجێ ئەم بوونەوەرەو ئەم ئادەمیە بەو جۆرەو شێوە گرنگە لەیەکەم جارەوە دروستکرابێ و ئەم ئادەمیە بەرزە نەگات بە پلەی هەرە بەرزی خۆی وە هەرگیز ناگونجێ بەم ژیانە کەم و کورتە کاری تەواوببێ، وەنابێ ئەم هەموو سەرکێشی و خراپەکاری و ناڕاستی و نارەواییە هەروا بڕواو وەك باسکی بانان بۆی دەرچێ و قوتاربێ بە بێ لێ پرسینەوە، وەئەم هەموو چاکەو دادو ڕاستو ڕەواییەش هەروا بڕواو وون ببێ بەبێ سەرو شوێن، لەگەڵ ئەوەیشا خاوەنەکەی دووچاری ئەو هەموو ئازارەش بووبێ لە جیهانا لە ڕێگای ڕاستی و دادو چاکەدا بەڕاستی نەهاتنی ئەو ڕۆژە دژو پێچەوانەی سروشتێ ئەم بوونەوەرو ئادەمییەیە، دژو پێچەوانەی ئەو هەموو ڕێك و پێكی و وردەکارییەیە کە بەکار هێنراوە لەم بوونەوەرەدا بە هەموو بەش و پارچەکانیەوە، کەواتە شتیچکی زۆر بەجێ و ڕاستە کە بەدوای ئەم باسی ڕابردووەدا باسی ڕۆژی دوایی ئەهێنێ و پەیوەستی ئەکات پێیەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾ ئینجاکاتێ کەڕۆژی دوایی دێت کە یەکێك لەناوەکانی ﴿ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾یە واتە ڕووداوە گەورەکە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو هەموو داگیرئەکات کەئەم ئاسمانە داڕێژراوە، ئەم زەویە ڕاخراوە، ئەم کێوە دامەزراوانە، ئەم زیندوویێتی و زیندەوەرانە، ئەم بوونەوەرە گەورەو گرنگە زاڵە بەسەر ئەوانەدا هەموویان داگیرئەکات، کەواتە لە هەموو ڕووداوێك گەورەترە، کاتێ ئەو ڕۆژە دێت و هەموو زیندوو ئەکرێنەوە ﴿يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ﴾ ئەوڕۆژەی کەمەردوم بیرئەکەوێتەوە هەرکردەوەیەك لە جیهانا کردوویەتی ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ﴾ دۆزەخ بەڕوونی دەرئەخرێ بۆ هەر کەس بڕوانێ و ببینێ، وە لەو ڕۆژەدا دوو تاقم هەن و پاشە ڕۆژو چارەنوسیان بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ﴾ هەرکەس لە جیهانا سەرکەشی کردبێ و یاخی بووبێ لە فەرمانی خوا ﴿وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا﴾ ژیانی جیهانی هەڵبژاردبێ بەسەر ڕۆژی دوایی و هەوڵی هەر بۆ ژیانی جیهانی بووبێ و هیچ گوێی نەبووبێ لە ڕۆژی دوایی ﴿فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ﴾ بەڕاستی هەر دۆزەخ جێ و شوێنی ئەبێ لەو ڕۆژەدا.

وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ
أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾

**﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ﴾ وە هەرکەس ترسابێ لە پایەی بەرزو بڵندی پەروەردگاریو لە وەستانی لەبەردەم دادگای ئەودا ﴿وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ﴾ بەرگری خۆی کردبێ لە ئارەزوی خراپە، بەم ڕەنگە ئارەزوی نەفسی خۆی کردبێ بە شوێن کەوتووو پەیڕەوی کەری ئاینو فەرمانی خواو ئەگەر نیازی خراپەیە بەدڵیا هاتبێ بیری ئەو ڕۆژی دواییەی کردبێتەوەو نەچووبێ بەدوای ئارەزوەکەیا ﴿فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ بێگومان هەر بەهەشت جێو شوێنی ئەو کەسەیە، ئەو کەسەی کە بەڕاستی لە خوا بترسێ پەلاماری گوناهو تاوانا نادا، ئەگەر بەپێی بێهێزیو لاوازیە کە ڕووئەکاتە ئادەمی دووچاری گوناهێ بووبێ، ئەو ترسەی کەلە دڵیایە ڕایئەکێشێ بۆ پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوەو داوای لێبووردن، ئەوکاتە لە ڕیزی گوێ ڕایەڵان دەرناچێ.**

**جڵەوگیری نەفس لەئارەزەوی ناڕەوا نیشانەی جێگیربوونو مانەوەیە لە گوێڕایەڵی خوادا، چونکە ئەو ئارەزوە پاڵپێوەنەرو هاندەرە لەسەر هەموو شەڕو خراپەیە کە کەم کەس هەیە دووچاربوونی لەو ئارەزوە نەبێو بەشتێ تر بێ. هەر ترسان لە خوا ئەبێ بە بەربەستو بەرهەڵستێکی ڕەقو بەهێز لەبەردەم ڕاپەڕینو پەلاماردانی نەفسدا، بەدەگمەن هەر بەرهەڵستێتر خۆی بۆ ڕاگیرئەکرێ لەبەردەم نەفسو ئارەزوی نەفسدا، جالەبەرئەوە قورئان ئەم دووانەی کۆکردەوە لەم تەنها ئایەتەدا ئەو کەسەی کەئەمە ئەفەرموێ پەروەردگاری نەفسەو زاناو ئاگایە بە هەموو دەردو چارەسەرێکیو ئاگایە بە هەموو کونو قوژبنێکیو هەموو چرچولۆچێکی، ئەزانێ ئارەزوودەردەکان لەکوێداخۆیانداشاردووەو چۆن دەرئەکرێن و لەکون ئەهێنرێنە دەرەوە! خوا داوای ئەوە ناکات کە نەفس ئارەزوی نەبێ، چونکە خوا ئەزانێ شتی وا لەتوانادا نیەو ئەویش داوایەکی نەکردووە کەلە توانادا نەبێ، بەڵکو خوا ئەوەی ئەوێ کە بەرگری بکرێو جڵەوی بەرەڵا نەکرێ، بە ترسان لە خوا ئەو بەرگریو جڵەوگیریە بکرێ، لەباتی ئەو تێکۆشانە سەختەدا بەهەشتی بڕیار داوە بۆ ئەو تێکۆشەرانە بەڕاستی ئادەمی بەم جڵەو گیریو تێکۆشانە ئەبێتە ئادەمی، وە بەوە نابێتە ئادەمی جڵەوی نەفسی بەرەڵابکاتو گوێڕایەڵ بێت بۆهەمووحەزوئارەزووەکانی، نابی بووترێ کە**

ئارەزووەکان شتێکی سوشتین و چارەسەر ناکرێن، ئەو کەسەی کە ئەو حەزو ئارەزووەی دروست کردووە لەدەورونا، هەرئەو کەسە نەفس و دەورنیشی وا دروست کردووە کە بتوانێ جڵەوگیری خۆی بکات لەوەی پێویستە جڵەوگیری و بەرگری کردنی، و بەهەشتیشی کردووە بەپاداشت بۆ هەرکەس لەو تێکۆشانەدا زاڵ و سەرکەوتووبێت، ئازادی و سەربەستی ئادەمی بەمە ئەبێ کە بەندەی هیچ کەس و هیچ شتێ نەبێ بێجگە لە خوا، کەواتە وەختێ ئازادی و سەربەستی وەرئەگرێ کە ڕزگاربێ لەبەندەیی حەزو ئارەزووی نەفس و نەبێتە دیل و دەست گیرکراوی نەفس و ئارەزووەکانی نەفس، ئەمەیە ئازادی و سەربەستی ئادەمی، ئەمەیە ئازادی و سەربەستیەك کە شایستەیە لەگەڵ ئەو ڕێزەی کە خوا داویەتی بە ئادەمی، شایان و شیاوە لەگەڵ سەربەستی خواهیش و مەیل و هەڵبژاردنێ کە خوا داویەتی بە ئادەمی، بارو حاڵی تریش هەیە کە نەزان و نەفام ناوی ناوە ئازادی و سەربەستی، ئەوەش کە جڵەو بەرەڵاکردنی نەفس و شوێن کەوتنی ئارەزووە ناڕاستەکانیەتی تا مەردوم بۆ هەر لایە ببا بیبا و بەهەر کونێکا ئەکا بیکات، بەڵام ئەوە ئازادی ئادەمی نیە بەڵکو ئازادی ئاژەڵیەو لە ڕاستیداپیس ترین شێوەی بەندەیی یەبۆئادەمی وهیچ مەردێکی ژیرداوای ئازادی واناکات.

ئینجا لە کۆتاییدا ئەگەڕێتەوە بۆ دواندن لەبارەی ڕۆژی دواییەوە کە سەرەتای سوورەتەکەی بەباسی ئەو ڕۆژە کردەوەو کردی بە مەبەستێکی سەرەکی لە سوورەتەکەدا، سەرکێشە یاخیەکان هەموو جارێ پرسیاریان ئەکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) کەئەم ڕۆژی دواییە کە تۆ باسی ئەکەیت کەی ئەبێ؟ خوای گەورەش ئەو پرسیاری ئەوانە ئەهێنێ و ڕوونی ئەکاتەوە کە زانینی ئەوە تایبەتە بە خواوەو کارو فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) هەر ترساندنی مەردومە بەو ڕۆژە، ئەو ڕۆژە ئەوەندە گەورەو گرنگە ژیانی جیهان و مانەوە لە جیهانا لەپێش چاوی ئەوان زۆر کەم و کورتە، ئەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾ ئەی پێغەمبەر بێبڕواکان پرسیارت لێ ئەکەن لەڕۆژی دوایی﴿أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا﴾ کەی بەرپا ئەکرێ و بەدی ئەهێنرێ؟ بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) کە زۆر سووربوو لەسەر بڕواهێنانی ئەوانە پێی خۆش بووە کە کاتەکەی بزانێ و وەڵامیان بداتەوەو دڵی خەریك بوو بەوەوە ئینجا بۆ بێزاری دەربڕین لە پرسیارەکەی ئەوان یا سەرسوڕهێنان لە دڵ خەریك بوونەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیەوە، ئەفەرموێ: ﴿فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ﴾ ئایا تۆ لەچیدایت لەوەی باسی کاتی ئەو ڕۆژەیان بۆ بکەیت و ئاگاداریان بکەیت بە کاتی بەرپا بوون و هاتنی؟ واتە تۆ نازانی باسی بکەیت بۆیان، کەواتە پرسیارەکەیان لە تۆ بێ جێیە یا لەچیدای لەوەی کە خۆت خەریك بکەی بەوەوە.

تۆ ئەوە نازانیت ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَاهَآ﴾ سەرەنجامی ئەو ڕۆژە هەربۆلای پەروەردگارتەو ئەو ئەزانێ کەی دێت و بەرپا ئەبێ ئیشی تۆ ئەوە نیە کە ئەوانە پرسیاری لێ ئەکەن ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا﴾ ئیشی تۆ ئەوەیە کە هەر ترسێنەری کەسێکی کەلەوانەبێ بترسێ لەو ڕۆژەو کاری تۆ هەر ڕاگەیاندن و ئاگادار کردنەوەیە بە ئامادەبوون بۆ ئەو ڕۆژە، ئینجا شێوەی گەورەیی و سامناکی ئەو ڕۆژە ئەخاتە بەرچاو کە کارئەکات لە هەست و بۆچوونی ئەواندا بەجۆرێ ژیانی جیهان و تەمەنی جیهان و ڕووداوەکانی و هەموو بەهرەو شتەکانی چاو نادەن لە چاو گەورەیی و گرنگی هاتنی ئەو ڕۆژەدا ئەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا﴾ بێبڕواکان کاتێ کە ڕۆژی دوایی ئەبینن وا دێتە بەرچاویان کە ﴿لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا﴾ نەماونەتەوە لەکاتی هاتنیان بۆ جیهان و تائەو ڕۆژە مەگەر ئێوارەیەك یا چێشتنگایەك.

ژیانی جیهان لە پێش چاویان ئاوا بێنرخ و لاواز ئەبێ، ئەو ژیانەی کەکاتی خۆی ئاژاوەو شەڕە شاخیان لەسەر ئەکرد، ئەو ژیانەی کە هەڵیانبژاردو باویان ئەدا بەسەر ڕۆژی دوایی دا، لە پێناویا دەستیان هەڵگرت لەبەشی هەرە بەرزو نەبڕاوەیان، ئەو ژیانەی کەلە پێناویا خۆیان دووچاری ئەو هەموو تاوان و ستەم و خراپەکاریەکرد، ئارەزوی ناڕەوای نەفس ڕایکێشان تابوون بە بەندەی ئەڵقە لە گوێی... ئەو ژیانە بەو جۆرە بێنرخ و بێ کەڵك و کەم و کورت ئەبێ لەبەرچاویان، کەواتە لەوێدا بۆیان دەرئەکەوێ کە نەفام و نەزان و بێهۆش بوون، وەئەوەی کە ئەوان کردیان هیچ کەس نایکات کە بینا و بیسەر بێت!

وصلى الله وسلم على رسوله محمد وعلى آله وصحبه

## سوورەتی ﴿عبس﴾
## مەککەییەو (٤٢) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سوورەتە چەند بەشێکەو هەموو بەشەکانی بەهێزو گرنگ‌و بەکارن. بەشی یەکەم خەریکەبەڕووداوێکی دیاری لەڕووداوەکانی سیرەتی پێغەمبەر(ﷺ) خەریك ئەبێ بە تەمێ‌و ئامۆژگاری و بانگ کردنی کۆمەڵێ لە گەورەو سەرۆکەکانی قورەیش بۆ ئیسلام. لەو کاتەدا موسڵمانێکی هەژار دێت بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە ناو ئەبرێ بە (ابن ام مکتوم) ، لەبەر ئەوەی کوێربووە نازانێ بەوجۆرەپێغەمبەر(ﷺ) خەریکە بەو تاقمەوە، لەبەر ئەوە ناوەستێ تا ئەولێ ببێتەوە، بەڵکوقسەکەی ئەبڕێ‌وئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوالەوەی تازەبۆت هاتووە وخوافێری کردویت منیش فێربکە،دووسێ جارئەمەئەڵێتەوە،ئینجاپێغەمبەر(ﷺ)بەوەدڵگران ئەبێ‌و ناوچاو گرژ ئەکات‌و ڕووی لێ وەرئەگێڕێ، ئینجا بەو بۆنەوە سەرەتاو یەکەم بەشی ئەم سوورەتە دێتە خوارەوەو سەرزەنشتی ئەکات لەسەر ئەو ڕوو گرژ کردن‌و ڕوو وەرگێڕانە.

بەڕاستی ئەم تەمێ‌وسەرزەنشتە کەئاراستەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) کرا بەبۆنەی ئەم ڕووداوە، ئێجگار شتێکی گەورەو گرنگە، شتێك نیە هەروا بەسادەیی تێپەڕ بکرێ بەسەریا، بەڵکو پێویستە زۆر بە ووردی بیری لێ بکرێتەوە لەو مەبەست زۆرو گرنگەی کە ئاماژەو دەست نیشانی بۆ کراوە، ئەم تەمێ‌و سەرزەنشتە ئەو مەبەستە بەرزو گرنگە شتێکە ئەم ئایینی ئیسلامە، هەروەها هەموو ئایین‌و پەیامە ئاسمانیەکانی پێش ئەم ویستی لە زەویدا بیچێنێ‌و بیڕێنێ، تا بەهۆی بەرو بەرهەمەکەیەوە باری ژیان بگۆڕێ‌و پاك‌و خاوێن ببێتەوە لەو هەموو لاری‌و نالەباریە، ئەوە مەبەستە گەورە گرنگە تەنها ئەمەنیە: کە چۆن ڕفتار بکرێ لەگەڵ تەنها یەکێ لە ئادەمی یا تاقمێ؟ وەك لەدیمەن‌و ڕواڵەتی ڕووداوەکەوە وەرئەگیرێ، بەڵکوزۆر بەرزتروگەورەترەلەوە، ئەومەبەستە گەورەیە ئەمەیە: کە مەردوم هەموو کاروباری ژیانی چۆن بەراورد بکات؟و چۆن بیکێشێ؟و بە چ مەن‌و تەرازوویەك کە پێوانەو

کێشانەی کاروباری ژیان بکات؟و لە چ لایەکەوە نرخ وەرگرێ و دایبنێ بۆ هەر شتێ؟ لەم ڕووداوەو چەند ئایەتەدا مەردوم ئاگادار ئەکات کە تەنها بە تەرازووی ئاسمان هەموو شتێ بکێشن‌و نرخ بۆ هەموو شتێ لە ئاسمانەوە وەرگرن‌و بەپێی ڕاو فەرمانی ئاسمان دایبنێن‌و بڕیاری بدەن‌و ئیتر ڕووت لە هەر شتێکی ئەرزی‌و ئازادو سەربەست لە هەموو زۆرو زەختێ کە لە زەوی یەوە هەڵقوڵێ، ئەو تەنها تەرازووەی کە خوا دیاری کردو لەگەڵ پێغەمبەرەکانی ناردی بۆ بەراورد کردن‌و کێشانە بریتی یە لە خوا ناسی‌و لە خوا ترسان، وەك ئایەتی ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾[1] ڕوونی کردەوەو قورس‌و سووکی هەموو شت لای خوا تەنها بەپێی ئەو دیاری کراوی خوایەیە، ئەوەش شتێکی ئاسمانی ڕووتەو دەخڵی بە هیچ شتێ تری ئەرزیەوە نیە. ئادەمی لە ژیانا پەیوەستی هەیە لە ناویانا لە چەند بارو ڕوویەکەوە، کە هەمووی نرخ‌و وەزن دارن بە لایانەوەو سەرنج ڕاکێشن لە ژیانا، نرخ‌و ڕێز دائەنێن بۆ چەند شتێ کە بەپێی ئەوانە مەردوم هەڵئەسەنگێنن وەك هێزو دەسەڵات‌و نەژادو سامان‌و دارایی‌و خزمایەتی‌و دۆستی‌و هتد.... ئادەمی بەو جۆرە ئەژیان‌و تێگەیشتن‌و بۆچوونیان بەو شێوەیە بوو، ئینجا ئیسلام هات ڕووی وەرگێڕا لە هەموو ئەوانە کە هەرچەند بەهێزو دامەزراو بوون لە دەروونا‌و بە توندی سەرنج ڕاکێشەر بوون، لەباتی هەموو ئەوانە تەنها تەرازووو نرخەکەی خۆی داناو لە دەروونیدا ناشتی، کە ئەوە شتێکی زۆر گەورەی کەس نەدیو و بێ وێنە بوو لە زەوی داو یەکەم موعجیزەی ئیسلامەو یەکێ بوو لە موعجیزە گەورەکانی کەکاری کرد لە ژیان‌و بەرو بەرهەمەکانی، ژیانی گەل‌و کۆمەڵی موسڵمانی جیاکردەوە لە هەموو گەل‌و کۆمەڵی تر لە هەموو جیهانا وەك لەمەو پاش چەند نموونەیە ئەهێنین‌و ئەیخەینە بەرچاو، بە یارمەتی خوا، ئەم ڕووداوە بوو بە سەرمەشق‌و ئاوێنەیەکی بالانما بۆ فێرکردن‌و تەمێ دادانی هەموو بڕواداران‌و ڕام کردنیان لەسەر دەست بەردار کردنیان لە هەموو تەرازوو و بەراورد کەرێکی ئەرزی‌و دەست گرتن تەنها بە تەرازوو و

---

[1] بەڕێزو بە نرخ ترتان لای خوا، لەخوا ترس ترتانە. سورەتی الحجرات.

بەراورد كەرێكى ئاسمانى. ئەو پیاوە بێنەواو كوێرە هات لە كاتێكدا كە پێغەمبەر(ﷺ) خەریك بوو بەو چەند سەرۆكەوە (عتبەو شیبەی رەبیعەو ئەبوجەهل، امیەی كوڕی خلف، ولیدی كوڕی مغیرە و عباس)یشیان لەگەڵ بوو بانگی ئەكردن بۆ ئیسلام، هیوای وابوو بە موسڵمان بوونی ئەوانە قۆرتو گرێ نەمێنێ لە ڕێگای ئیسلامو موسڵماناندا، چونكە ئەو سەرۆكانە بە ماڵو بە هێزو دەسەڵاتیان وەستابوون لە ڕێگایانداو هەڵئەسان بە هەموو پیلانێ دژی ئیسلامو موسڵمانان، تا ڕادەیە وەستاندبوونیان لە مەككەدا، ئەوانەی كە لە دەرەوەی مەككەو لە دەورو بەری بوون نەئەهاتن بەدەم بانگەوازەكەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەكاتێكاكەخزموكەسوكارەكانی ئەوهەڵوێستە ناڕەوایەیان هەبوو لەگەڵ خۆیو ئاینەكەی.

ئەو پیاوە كوێرە بێنەوایە هاتە خزمەتی لە كاتێكا كە ئەو خەریك بوو لەگەڵ ئەو كۆمەڵە سەرۆكە نەك لەبەر مەبەستو بەرژەوەندیەكی تایبەتی خۆی، بەڵكو هەوڵو خەریك بوونەكەی لەبەر ئیسلامو بەرژەوەندی ئیسلام بوو، چونكە ـ وەك وتمان ـ ئەگەر ئەوانە موسڵمان بوونایە ئیتر لە مەككەو دەورو بەری مەككەدا هیچ گرێو گوتاڵو دڕكو داڵێ لەڕێگای بانگەوازەكەدا نەئەما. لەو كاتی خەریك بوونە بەو كارە گرنگەوە ئەو پیاوە دێتو ئەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا پێم بخوێنەو فێرم بكە لەوەی خوا فێری كردوویو ئەو داوایە چەند بارە ئەكاتەوەو قسەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبڕێ، هەرچەند چاوی نەبووە بەڵام خۆ زانیویەتی خەریكەو قسەئەكات لەگەڵ ئەوانەدا، جالەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) دڵگران ئەبێو پێناخۆشیەكەی لە ڕووی پیرۆزیا دەرئەكەوێ، ڕووی گرژ ئەبێو وەری ئەچەرخێنێ، لە كاتێكا كە ئەویش چاوی نیە تا ئەوە ببینێو دڵ ئازار ببێ، وەك باس كرا گرژبوونو ڕوو وەرگێڕانەكەشی لەبەر خۆی نەبوو، بەڵكو لەبەر خەریك بوونی بوو بەو كارە زۆر گرنگە كە ئومێدی شتێكی زۆر گەورەی لێ ئەكرد بۆ ئیسلام و موسڵمانان، لەگەڵ ئەوەدا ئاسمان هاتە وەڵام لەسەر ئەو كوێرە هەژارەو هیچ گوێی نەبوو لە هیچ شتێو لە هیچ نیازی چاكو بەرژەوەندیەك كە ئادەمی بە گرنگ و گەورەتری دائەنا، بەڵكو گوێی نەبوو لەوەی كە گەورەترو چاكتری هەموو ئادەمی بە گەورەو گرنگی دانا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ﴿٤﴾

ئاسمان هاته وەڵامو ئەو سەرزەنشته هات لەلایەن پەروەردگارەوەو ئاراستەی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی کرد کە خاوەنی خووڕەوشتی بەرز بوو، هاتو ئاراستەی کرد بە شێوەیەکی سەختو بەتین، وشەی ﴿كَلَّآ﴾ی ئاراستەکرد کە لێرەدا بۆ تێخوڕینو بێزاری دەربڕینە! ئەو شێوەی کە قورئان ئەم گلەییو سەرزەنشتەی پێکرد شێوەیەکی تاقانەیەو ناگونجێ لاسایی بکرێتەوەو بەهیچ زمانێ تر ناگەیەنرێ، نە بە نوسینو نە بە وتن، قورئان بەو شێوەی خۆیە مەبەستەکەی گەیاندبە چەسپانیو چەند وشەو ڕستەیەکی کورتو بەهێز، فەرمووی: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * عَبَسَ﴾ ناوچەوانی گرژ بوو، ﴿وَتَوَلَّىٰٓ﴾ و ڕووی وەرگێڕا ﴿أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ﴾ لەبەر ئەوە ئەو کوێرە هاتە لایو قسەکەی بڕی... ناوبردنی بە کوێر دوو شتی لێ وەرئەگیرێ: یەکەم عوزر هێنانەوە بۆی کە لەبەر کوێری نەیزانی کاتی ئەو پرسیارە نیەو ئەو قسەبڕینە بێجێیە، دووەم کە کوێرە شایانی بەزەییو میهرەبانی پێکردنە نەك ڕوو گرژ کردن. لە یەکەم جارەوە ناوی پێغەمبەر (ﷺ) ناباو ڕووی فەرموودەی تێ ناکات تا نیشانی بدات کە کارەکە ئەوەندە ناخۆشە خوا نایەوێ بیدا بە ناوچاویاو بیدا لەڕووی، لەبەر میرەبانی پێکردنو ڕێزگرتنی بەمەی ئەو شتە ناخۆشە نەدا لەڕووی، یا لەبەر زیادە گلەییو گەیاندنی بێزاری بەتین لەو کردەوەیە تا ڕادەیە وەك دەنگی لێ وەرگرێو شکاتی لەدەست بکات، لەسەر هەر بار ئینجا شێوەی باسەکە ئەگۆڕێو ڕووی فەرموودەی تێئەکات، لە یەکەم جارەوە بە هێواشیو ئەندازێ بە نەرمی ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يُدۡرِيكَ﴾ تۆ چوزانیتو چی تۆ ئاشنا ئەکات بە حاڵو نیازی ئەو کوێرە ﴿لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ﴾ بەڵکو بەهیوابێ باش پاك ببێتەوە لە گوناه بەوەی لە تۆی وەرئەگرێ ﴿أَوۡ يَذَّكَّرُ﴾ یا بیری بکەوێتەوە ئەوەی لە یادی چووە یا ئامۆژگاری وەرگرێ ﴿فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ﴾ ئەو کاتە بیر خستنەوە، یا ئامۆژگاریەکەی تۆ قازانجی پێئەگەیەنێ، واتە تۆ نازانی بەڵکو لەلایەن ئەو کوێرەوە شتێکی گەورە بەدی بێت کە وەرگرتنی تیشكو تروسکەیە لە ڕووناکی خواو جێگیربوونی لە دڵیا، کە لای خواو تەرازووی خوادا هەر شتی وا بەنرخو قورسە.

أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾
فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾

---

ئینجاشێوەی گلەیی وسەرزەنشتەکە بەتین ترئەکات بەم ڕەنگە بە شێوەی سەرسوڕمانەوە باسی ئەوکردەوەی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەکات وسەرسوڕئەمێنێ لێی و بەدرێژی ڕوونی ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ﴾ ئەوکەسەی کەخۆی بەبێ نیازومەبەست دائەنێ لەتوێولەثایینەکەت و لەو هەموو ڕوناکی و پیت و فەڕەی کە لای تۆیە ﴿فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ﴾ تۆ لەگەڵ ئەوە خەریك ئەبی بە ڕوو تێکردن و بە هەوڵدان و بە گرنگ گرتن. ﴿وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ﴾واتە لەکاتێکا هیچ سووچ و مەترسی نیەلەسەرتۆلەمەدا کەئەوخۆی پاك نەکاتەوە بەبڕواهێنان لەچڵك وچەپەڵی بێبڕوایی و گوناهو تاوان. تۆ هیچ زیانێ ڕووت تێناکات بە مانەوەی لەو چڵك و چەپەڵی و پیسیەی کە تیایەتی و تۆ پرسیاری گوناهو تاوانی ئەوت لێ ناکرێ، تۆ بەهۆی ئەوەوە یارمەتی نادرێیت و سەرناخرێی، وە هەڵناسی بەکاری ئەو. ﴿وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ﴾ ئەو کەسەی کە دێت بۆلات بەپەلە ﴿وَهُوَ يَخْشَىٰ﴾ لەکاتێکالەخوا ئەترسێ ﴿فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ﴾ تۆ لەوە خۆت هەڵەو بێئاگا ئەکەیت، ئینجا شێوەی گلەییەکە بەتین تر ئەکات تا ئەگاتە ڕادەی تێخوڕین، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ با هەرگیز شتی وا نەبێ و ڕوو نەدا لێتەوە.

ئینجا پەیام و بانگەوازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون ئەکاتەوەو ڕێزو بەرزی و گەورەییەکەی دەرئەخات، نەبوونی پێویستی و نیازی بەهیچ کەس و بە هیچ پشتیوانی و گوێنەدانی بەهیچ کەس مەگەر کەسێ کە بەڕاستی ڕووی تێبکات و هەر ئەمی بوێ، هەرکەس ئاوا بەڕاستی بێتەپێشەوە لەگەڵی ئەمیش ئەمیش ئەوبە گرنگ ئەگرێ، ئیتر ئەو کەسە بارو نرخی هەرچۆن بێ لە تەرازووی جیهانا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾ بەڕاستی ئەو قورئانە کە بێبڕواکان خۆیان بەبێ نیازو پێویست دائەنێن لێی پەندو ئامۆژگاریە. واتە گرنگەو بەسە بۆ چارەسەر کردن و پێویستە تەمێی لێ وەرگیرێ و ڕەفتاری پێبکرێ ﴿فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ﴾[1] واتە ئینجا هەرکەس ویستی بیرێ بکات و وەریگرێ و ڕەفتاری پێبکات و ڕێنموونی لێ وەرگرێ ئەتوانێ ئەوە بکات و هیچ ڕێگرێ نیە لێی مەگەر ئەوە کە خۆی ئەوەی نەوێ و داخوازی نەبێ... ئەو قورئانە نوسراوەتەوە ﴿فِي صُحُفٍ﴾ لە چەند پەڕەیەکی، ﴿مُّكَرَّمَةٍ﴾ ڕێز پێدراوی

---

[1] بەپێی تەفسیرەکە ڕاناوی (أنها) و (ذكره) ئەگەڕێتەوە بۆ قورئان، یەکەمی بە مێینی (مێ) فەرموو لەبەر وشەی (تذكرة) یا بەپێی ئایەتو سورەتەکانیێتی، ئەم ڕایە لای زۆر بە پەسەند کراوەو ڕێکیشە لەگەڵ ئایەتی سورەتی _ المدثر_دا: ﴿كَلَّا إِنَّهُ تَذْكِرَةٌ ۝ فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ﴾ بێجگەلەم ڕایەچەندڕایەترەمەیە، هەرچەند ئەگونجێن بەڵام دڵ پێی ئارام نیە.

﴿مَّرۡفُوعَةٖ﴾ بڵندو پایه بەرز کراوی ﴿مُّطَهَّرَةِۭ﴾ پاك‌و خاوێن کراو لەهەر نەنگ‌و ڕەخنەیەك، بەتایبەتی پاك‌و تەمیز گیراوە لە دەستی پیسی شەیتانەکان، بەڵکو هەر بەدەستی پاکی فریشتەکانی خوا هاتووەو ڕاگەیەنراوە، وەك لە چەند شوێنێکا ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە، وە لێرەشا ئەفەرموێ: ﴿بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ﴾ بەدەست چەند نوسەرێکەوەن لەو فریشتانەی کە قورئانیان ڕوو نوس کرد لە (لوح المحفوظ) وەك (مجاهد)و کۆمەڵێ ئەفەرمون: کە ئەو نوسەرانە ﴿كِرَامِۭ﴾ بەڕێزو گەورەن لای خوا ﴿بَرَرَةٖ﴾ لە خوا ترس‌و گوێڕایەڵن بۆ خوا، کەواتە ئەم قورئانە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە بەرزو بەڕێزو پاك‌و بەنرخە، زۆر گەورەترە لەوەی خۆی پێوە خەریك بکرێ لەگەڵ ئەوانەی کە ڕووی لێ وەرئەگێڕن‌و خۆیان بەبێ نیازو پێویست دائەنێن لێی، بەڵکو هەر بۆ ئەوانە چاکە ڕێزی ئەزانن‌و ئەیانەوێ خۆیانی پێ پاك‌و خاوێن بکەنەوە کەواتە (ابن أم مکتوم) هەرچەند هەژارو بێ‌نەواو کوێر بوو ئەبێ ڕێزی بگیرێ‌و نرخی گەورەی بۆ دابنرێ، چونکە ڕێزو نرخی ئەم قورئانەی بەلاوە بوو، وە ئەیویست خۆی پاك‌و خاوێن بکاتەوە، بەڵام ئەو کۆمەڵە سەرۆك‌و زۆردارو دەسەڵات‌و سامان فراوانە ئەبێ نرخ‌و ڕێزیان بۆ دانەنرێ‌و گوێیان پێ‌نەدرێ، چونکە ڕێزی قورئانیان نەزانی‌و خۆیان بێ‌نیاز دائەنا لێی.

ئەمەیە تەرازووی ڕاست، ئەمەیە تەرازووی خوا کە هەموو نرخ‌و بێ‌نرخی پێ دەرئەکەوێ، مەردوم‌و هەموو کاروبارێ ئەبێ بەم تەرازووە بەراورد بکاو بکێشێ، ئەمەیە بڕیارو وشەی خوا کە ئەبێ هەموو بڕیارو وشەو قسەیە بگەڕێتەوە بۆلای.

ئەم تەرازووەشی کەی دانا؟ هەر لە سەرەتای هاتنی ئەم ئاینەدا دایناو لە مەککە هەڵیواسی لەکاتێکا کە بانگ‌و بانگەوازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەتارێنرا،وموسڵمانان تاقمێکی کەمی بێ‌دەسەڵات بوون، خەریك بوون‌و هوڵدان لەگەڵ ئەو سەرۆکانەدا هیچ مەبەست‌و بەرژەوەندیەکی شەخسی تیا نەبوو، گوێ نەدان بەو کوێرە هەژارە لەبەر هیچ هۆیە تر نەبوو، بەڵکو ئەویش‌و ئەمیش هەر بەنیازی بەرژەوەندی ئەو ئاین‌و بانگەوازەوە بوو، بەڵام ئەم ئاین‌و بانگەوازە ئەو تەرازووەی داناو هەر ئەوەیشی لەوێ داناو هەر ئەوەیشی ئەوێ، ئەم

ئایینو بانگەوازە بەرزو بەهێزو دامەزراو و یارمەتی دراو نابێ بە دامەزراندنو بەکارهێنانی ئەم تەرازووە نەبێ....

ئەم گلەیی و سەرزەنشتە کاری کرد لە دەروونی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە هێزو گەرمو گوڕی، بە سۆزو پەرۆشەوە ڕاپەڕی بۆ دامەزراندنو جێگیرکردنی ئەو مەبەستە گەورەیە لە هەموو ژیانیاو لەژیانی گەلو کۆمەڵی موسڵمانانیشدا بۆ هەموو ئەو تەرازووەی بەکارهێنا. یەکەم کارو جوڵانەوەی بۆ بەدی هێنانی ئەو مەبەستەو بەکارهێنانی ئەو تەرازووە ڕاستە ئەوە بوو کە ئەم ئایەتانەی خوێندەوە بەسەر جیهاناو ئەم جارە قورسەی لەخۆی داو ڕای گەیاند کە ئەو کارەی پێی هەڵسا ناتەواو بوو، ئەوا خوایش بەو جۆرە گلەیی و سەرزەنشتی ئاراستە کردلەسەری، بەڕاستی ئەوجارڕدانە کارو کردەوەیەکی زۆر گەورە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) نەبێ کەسی تر ناتوانێ هەڵسێ پێی، لەهەر بارێکەوە سەرنج بدرێ لەو کاتەدا، بەڵێ تەنها لە پێغەمبەر(ﷺ) دێت کە جاڕی وا لەخۆی بدا، ئەگەر هەر پیاوێکی گەورەی تر بوایە باسیشی نەدەکردو ئەوپەڕی ئەوە ئەبوو کە لە داهاتوودا شتی وای نەئەکردو خۆی ئەپاراست لە دووبارە کردنەوەی هەڵەی وا، بەڵام پێغەمبەریتی شتێ ترەو هیچ شتێ تر پێی ناگات! ئایا کێ ئەتوانێ لەو کاتە سەختو تەنگەدا شتی وا گەورە بدا بە ناوچاوی ئەو هەموو سەرۆکانەدا کە کوڵابوون لە خۆپەسەندیو خۆپەرستی دا، و ئەوپەڕی ڕادە کەشخەو شانازییان ئەکرد بە نەژادو تیرەو سامانو دەسەڵاتەوە. ئینجا بێگومان ئەم جۆرە کارو بیروباوەڕی ئاوا ئەبێ هەر لە ئاسمانەوە هاتبێو ناگونجێ شتی وا لە زەوی و لە دانیشتوانی زەویەوە هەڵقوڵێ، بەتایبەتی لەو سەردەمو لەناو ئەو کۆمەڵەدا!!

هەر هێزی ئاسمان شتی وا دائەمێنێو بەرێگای ڕاستی خۆیا ئەیبا، لە یەکەم جارەوە لە دەروونی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەستی پێکردوئینجا لەوێوە هێنایە ناو گەلو وڵاتو دایمەزراند لە جیهانو وڵاتا لەژیانی گەلو ئوممەتی موسڵماندا تا چەند چەرخی دوورو درێژ. بەڕاستی هەر هێزی ئاسمان بوو کە توانی ئادەمی بگۆڕێ بەگۆڕانێکی ڕاستەقینەو لە هەستو کردەوەدا ڕووتی بکاتو بیپچڕێ لە هەموو بیرو باوەڕو تێگەیشتنو بۆچوونو هەموو باوێك کە لەم زەویەوە هەڵقوڵابێو دەقی پێوە گیرابێ، لە جێگای ئەوانەدا شتی تری هێنا بێجیاوازی و دژایەتی ئەو بیرو باوەڕو بۆچوونو باوە پێشووانەو جێگیرو دامەزراوی کرد تا

بوو بە باوێكی تازەو بەرنامەیەكی تازەو لەناو گەلدا وەرگیرا بە ئەوپەڕی پێخۆش بوون‌و ڕەزامەندیەوەو پێچەوانەی ئەوە بێزراو و نەویستراو بوو.

بەڕاستی ئەوە لەدایك بوونێكی تازە بوو بۆ ئادەمیێتی، ئەوە موعجیزەیەك بوو بەدی هات لەسەر دەستی ئیسلامدا بەتایبەتی لەو چەرخ‌و سەردەمەدا. بێگومان ئێستا ئێمە تێناگەین لە بارە ڕاستەقینەكەی ئەو گۆڕانەو ئەو زیندوو كردنەوەی ئادەمیێتیە، چونكە لەڕووی ڕاستیدا ئێمەو گەلی ئێستا ئەو گۆڕانەی تیا نیەو نەپچڕاوە بە تەواوی لە بیروباوەڕو باوو بۆچوونێ كە لەم زەویەوە هاتووەو تێی كەوتووین. ئەو گۆڕان‌و پچڕانە هەروا شتێكی سووك‌و ئاسان نەبوو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) توانی پێی هەڵسێ ـ بەیارمەتی خوا ـ بیچێنێ لە دەروون‌و ژیانا، وە توانی پەروەردەی بكات‌و پێی بگەیەنێ‌و پاسەوانی بكات هەتا بنج بەس بوو ڕیشەی كوتاو پەل‌و پۆی دەركردو سێبەرو سەهەندی كرد بۆ ژیانی گەل‌و كۆمەڵی موسڵمان چەند كات‌و چەرخێكی درێژ. لەگەڵ ئەو هەموو هۆی لادان‌و لاری یەی كە ڕووی كردە موسڵمانان. لەپاش ئەم ڕووداوەو هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) سۆزو پەرۆشی بەكار ئەهێنا بۆ ئەو هاوەڵە هەژارو كوێرەو چاودێری ئەكرد، هەرجارێ پێی ئەگەیشت پێی ئەفەرموو: مەرحەبا لە كەسێ كە خوا سەرزەنشتی منی كرد لەسەری، دوای كۆچ كردن بۆ مەدینە دوو جار كردی بە جێنشینی خۆی بەسەر مەدینەوە، ئینجا لەبارەی بەكارهێنانی تەنها تەرازووی ئاسمانی‌و جێگیر كردنی تەنها نرخێ كە لە ئاسمانەوە هاتبێ، لەم بارەیەوە بە جوانی ئەزانم چەند وێنەو نموونەیە باس بكەین لە كردەوەو ڕەفتاری ئەو پێغەمبەرە گەورەیە (ﷺ) :

١- زەینەبی پورزای خۆی كە لە بەرەی قورەیش بوو مارەی كردلە (زەیدی كوڕی حارثة)كە بەندەیەكی ئازاد كراوی بێكەسی غەریب بوو، مەسەلەی ژن‌و ژن خوازیش زۆر گرنگەو تێبینی تیا ئەكرا، بەتایبەتی لەناو گەلی عەرەب‌و، وە بەتایبەتی تر لەناو قورەیشداكە خۆیان بە ئاغاو سەرۆكی هەموو عەرەب دائەنا.

٢- كاتێ برایەتی خستە بەینی هاوەڵەكانی، (زەید)ی كرد بە برای (حمزە)ی مامی‌و (بلالی حەبەشی)كردبە برای (خالدی كوڕی روەیحەی خشعمی) -خوا لە هەمووان ڕازی بێت-

٣- زەیدی کرد بە یەکەم فەرماندار بەسەر سێ‌هەزار لە هاوەڵەکانی مهاجرو ئەنسار، وە پێش (جعفری کوڕی ئەبو تالب)ی خستو خۆی ڕەوانەی کردنو کەوتە تەکیان تا لە مەدینە دەرچوون.

٤- دواترین کردەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو بارەیەوە ئەوە بوو کە (ئوسامەی کوڕی زەید)ی کرد بە فەرماندارو کاربەدەستی لەشکرێ کە ناردی بۆ غەزای ڕۆم، کە ئەو لەشکرە پێك هاتبوو لەزۆربەی مهاجرو ئەنصار،و (ئەبوبکر)و (عومەر)یان تیا بوو کە هاوڕێی هەمیشەیی پێغەمبەر (ﷺ) بوونو بوون بە یەکەمو دووەم جێ‌نشینی لەپاش خۆی بەبڕیاری هەموو موسڵمانان، هێندێ کەس ڕەخنەیان بوو لە مەسەلەی کرانی (ئوسامە) بە فەرماندار لەکاتێکا کە کوڕێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو بوو، بە کوڕی زۆر لەو لەشکرە ئەشیاو لەو بارەیەوە (ئیبنو عومەر) -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەفەرموێ وەك (بوخاری)و (مسلم)و (تیرمزی)ئەگێڕنەوە لێیەوە: پێغەمبەر (ﷺ) لەشکرێکی ناردو (ئوسامەی کوڕی زەید)ی کرد بە فەرمانداری -خوا لێیان ڕازی بێ- ئینجا هێندێ کەس ڕەخنەیان گرت لە فەرمانداریەکەی، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ئەگەر ئێوە ڕەخنە ئەگرن لە فەرمانداریەکەی لەوەو پێش ڕەخنەتان گرت لە فەرمانداری زەیدی باوکی،و سوێند بە خوا باوکی شایان بوو بۆ فەرمانداریو خۆشەویست ترین کەس بوو بە لامەوە، وە ئەمیش خۆشەویست ترین کەسە بە لامەوە.

٥- کاتێ لەبارەی سەلمانی فارسیەوە چەند کەسێ قسەی ناڕێکیان کرد، بەپێی باوی ڕەگەز پەرستیو نەتەوایەتی، عەرەبایەتیو فارسێتییان هێنایە کایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی خۆی وەشاند لە کارەکەداو هیچی تێدا نەهێشتەوەو فەرمووی: سەلمان لە ئالو بەیتی منە.

٦- (ئەبو زەڕ)و (بلال) جارێ دەمیان تێ‌گیرا -خوا لێیان ڕازی بێ- (ئەبوزەڕ) لە دەمی دەرچوو و وتی بە (بیلال): کوڕی قولەڕەش، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) خەشمی بەتینی گرت لەو وشەیەو زۆر بە ڕقو سەختیەوە فەرمووی بە (ئەبوزەڕ) وەك (ئیبن المبارك) حەدیسەکە ئەهێنێ: ئەی (ئەبو زەڕ) کوڕی ئافرەتی سپی هیچ زیاتر نیە لە کوڕی ئافرەتی ڕەش. فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دڵی (ئەبو زەڕ)ی گرتو کاری لێ کرد

تا ئەو ڕادەیە تەوێڵی نایە سەر زەوی‌و سوێندی خوارد نابێ بەرزی بکاتەوە تا(بلال) پێی پیا نەنێ، لەجیاتی ئەو وشەی کە بەدەمیا هات.

٧- (ئیمامی ئەحمەد)لە مەسنەدەکەیا حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئەنەسی کوڕی مالیك)ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی چوو بۆ خوازبێنی ئافرەتێکی ئەنصاری بۆ (جولەیبیب) ناوێ کە یەکێ بوو لە بەندەی ئازادکراو، ئینجا کاتێ دایك‌و باوکی کارەکەیان بەدڵ نەبوو نەیاندا، ئافرەتەکەوتی: ئایا ئێوە ئەتانەوێ مل پێچی بکەن لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)؟ ئەگەر ئەو بەوە ڕازیە ژنی بدەنێ، ئەوانیش ڕازی بوون‌و ژنەکەیان پێدا.

٨- (موسلیم) حەدیسێ ئەهێنێ لەبارەی ئەم (جولەیبیب)ەوە کە کاتێ لە غەزای (ئوحود)دا شەهید کراو پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بگەڕێن بۆی، ئینجا دۆزیانەوە لەناو حەوت بت پەرستا کە ئەم ئەوانی کوشتبوو ئەوانیش ئەمیان شەهید کردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لای‌و وەستا بە سەریەوەو فەرمووی: حەوت کەسی کوشتووەو ئینجا ئەوانیش ئەمیان کوشتووە، ئەمە لە منەو من لە ئەوم، ئینجا خستیە سەر هەردوو دەستی خۆی، وە هەردوو دەست‌و قۆڵی خۆی کرد بە سەرین‌و کورسی بۆی.

ئا بەو پەندو تەمێی خواو بەو کردەوەو ڕەوشتە شیرینانەی پێغەمبەر (ﷺ) ئادەمێتی بەدی هاتەوە لەسەر بارو شێوە تاقانەو کەس نەدیوەکەی خۆی، کۆمەڵو گەلێ پێك هات کە هەموو کاروباری ژیانی لە ئاسمانەوە وەرگرت، پاك‌و خاوێن لە هەموو هەڵەو لاری ئەم زەوییە. بە ڕاستی ئەمە بوو موعجیزەی گەورەی ئیسلام، ئەو موعجیزەی کە بەدی نەهات بە مەیل‌و خواستی خواو کرداری پێغەمبەر (ﷺ) نەبێ، ئەم موعجیزەیە خۆی بە خۆی شایەتە لەسەر ئەوە کە ئەم ئایینە لای خواوە هاتووەو ئەوەی هێنای پێغەمبەرەو بەشێ لە تەگبیری خوا بۆ ئەم کارە گەورەیە ئەمە بوو کە لە پاش پێغەمبەر (ﷺ) (ئەبوبەکر)و (عومەر) هاتن – خوا لێیان ڕازی بێ- کە چاك تێگەیشتبوون لە سروشتی ئایین‌و کارەکە، و چاك ڕەنگیان گرتبوو و خۆیان ڕازاندبووەوە بە خو و ڕەوشتە شیرینەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و زۆر بە قوڵی خۆشەویستی ئەو لە هەست‌و دەرونیانا جێگیر بوو، ئەوپەڕی ڕادە سوور بوون لە هەنگاونان بەجێگا هەنگاوەکانی ئەوداو گەڕان بەدوای شتێك کە هۆی پێخۆش بوون‌و ڕەزامەندی ئەو بێت، (ئەبوبکر) –خوا لێی ڕازی بێ- لەدڵیا جێگیر بوو ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نیازی کردو

ویستی لەبارەی فەرماندارى (ئوسامە)وە، لەبەر ئەوە یەكەم كردەوەی ئەوە بوو لەشكرەكەی (ئوسامە)ی ڕێكخست بە فەرماندارى (ئوسامە)و بە نەفسی خۆی ڕەوانەی كردن و كەوتە تەكیان تا لە مەدینە بەدرەقەی كردن، (ئوسامە) بە سوارىو (ئەبوبكر)ی جێنشین بە پیادە، ئینجا (ئوسامە) كە كوڕێكی گەنجە شەرمی كرد خۆی بە سوارىو ئەو بە پیادە، لەبەر ئەوە وتی: ئەی جێنشینی پێغەمبەر یا ئەبێ تۆیش سوار بیت یا منیش دائەبەزم، ئینجا ئەمیش سوێندی خوارد كە نە تۆ دائەبەزىو نە منیش سوار ئەبم، وە فەرمووی: ئایا چی تیایە كە من ساتێ بە پیادە بێمو هەردوو پێم تۆزاوی بكەم لەڕێگای خوادا؟

ئینجا (ئەبوبكر) ئەزانێ پێویستی هەیە بە (عومەر)، لە كاتێكا ئەركی جێنشینی خراوەتە سەر شان، بەڵام (عومەر) سەربازێكە لە لەشكرەكەی (ئوسامە)داو (ئوسامە) فەرماندارە، كەواتە پێویستە پرسی پێ بكرێو ئیزنی لێ بخوازرێ، لەبەر ئەوە (ئەبوبكر)ی جێنشین ئەفەرموێ بە (ئوسامە): ئەگەر ڕات هەیە كۆمەكی من بكەیت بە (عومەر) بیكە، پەنا بە خوا! با بیر بكەیتەوە لەم داواو قسەیە: ئەگەر ڕات هەیە كۆمەكیم بكەیت بە (عومەر) بیكە. بەڕاستی ئەم جۆرە كردەوانە وان بە پۆپەو ئاسۆیەكی بەرزەوە هیچ كەس پێی ناگات مەگەر بە مەیل و كۆمەكی خوا و لەسەر دەستی پێغەمبەرێك لەلایەن خواوە!

ئینجاخواچەرخی ڕۆژگاری واهێنالەپاش(ئەبوبكر) (عومەر)ی هێنایەپێشەوە،بابۆنموونە چەند كردەوەو قسەیەكی ئەویش باس بكەین بۆ ئەم مەبەستەی كە خەریكین پێیەوە:

ا- (عەمماری كوڕی یاسر)ی كرد بە كاربەدەست و نوێنەری خۆی بەسەر (كوفە)وە كە لەو سەردەمەدا وەك پایتەختی عێراق وابوو، (عەممار)ی هەڵبژارد، چونكە لە تەرازووی خوادا بەنرخ بوو.

ب- (ئەبوسوفیان)و كۆمەڵێ‌تر لە گەورەكانی قوڕەیش كە لە ئیسلاما دواكەوتوو بوو لە قاپی (عومەر)دا وەستابوون ئیزنیان ئەخواست بچنەلاىو لەو كاتەدا (صوهەیبی ڕۆمی)و (بیلالی حەبەشی)شێوە حازر بوون (عومەر)یش پێش ئەوان ئیزنی ئەم دوانەی دا، چونكە لە ئیسلاما پێشكەوتوو بوونو لەوانە بوون كە غەزای بەدریان كردبوو، ئینجا (ئەبو سوفیان) بەوە لووتی ئەتۆزێتەوە،و لەسەر باوی چەرخی نەفامی بە داخ و قینەوە ئەڵێ: ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە، ئیزنی ئەو بەندەیانە ئەدات و ئێمە لەبەر

قاپیدا ئەهێڵێتەوە!! ئینجا (عومەر)یش -کە بەڕاستی ئیسلام لە دەروونیا ناسراوو جێگیر بوو- پێی وتن: ئەگەر ئێوە بەوە خەشمناك ئەبن گلەیی لە خۆتان بکەن‌و ڕقتان لە خۆتان بوێ، ئەوان‌و ئێوە بانگ کران بۆ ئیسلام، ئەوان چەسپانی یان کردو پێش کەوتن، ئێوە سستیتان کردو دواکەوتن، ئەی چۆن ئەبن کاتێ لە ڕۆژی دوایی دا ئەوان بانگ ئەکرێن‌و ئێوە ئەهێڵرێنەوە؟

ت- جیرەو مانگانەی (ئوسامە) زۆرتر ئەکات لە هینی (عبداللە)ی کوڕی، ئەویش پرسیاری لێ ئەکات کە بۆچی وا ئەکەیت؟ (عومەر)یش ئەفەرموێ: کوڕی خۆشەویستم، باوکی ئەو خۆشەویست تر بووە لەباوکی تۆ بەلای پێغەمبەرەوە (ﷺ) وە خۆیشی خۆشەویست تر بووە لە تۆ بەلایەوە، ئینجا منیش خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵئەبژێرم‌و باوی ئەدەم بەسەر خۆشەویستی خۆمدا[1].

پ- (عەممار)ی نارد بۆ پشکنین‌و محاسبەی (خالیدی کوڕی وەلید)، کەئەو فەرماندارە سەرکەوتووە بووەو خاوەنی نەژادێکی بەرز بوو لە قورەیشدا، وە ئەگێڕنەوە کە (عەممار) باڵبەستی ئەکات بە مێزەرەکەی تا لە پشکنین‌و محاسبەکەی ئەبێتەوەو دەرئەکەوێ کەپاکەوهیچی لەسەرنیە،ئینجابەرەڵای ئەکات‌وبەدەستی خۆی مێزەرەکەی ئەبەستێتەوە... (خالد)یش هیچ بەوە خۆی تێك نادا، چونکە ئەزانێ (عەممار) لە ئیسلاما پێش کەوتووە لێی!

ج- (عومەر) ئەڵێ دەربارەی (ئەبوبکر): ئەو گەورەمانەو گەورەی ئێمەی ئازاد کردووە، واتە (بیلالی حەبەشی) کە کاتی خۆی بەندەی (ئومەیەی کوڕی خەلەف)بوو، بە هەر جۆر پێی بکرایە سزای ئەدا، ئینجا (ئەبوبکر)یش لێی کڕی‌و ئازادی کرد -خوا لە هەموویان ڕازی بێ-.

ح- (عومەر) کاتێ ویستی جێنشین دیاری بکات فەرمووی ئەگەر سالم کە ئازاد کراوی (ئەبو حذیفة) بوو زیندوو بوایە ئەمکرد بە جێنشین بەسەرتانەوە، ئەوەی فەرموو، لەکاتێکا کە (عثمان)و (علي)و (طلحة)و (زبیر)و (سعد)و (عبدالرحمن) بوون، هیچ کام

---

[1] ترمذي ڕیوایەتی کردووە.

لەمانەی بە تایبەتی دیاری نەکرد، بەڵکو بڕیاری دا ئەم شەش کەسە یەکێکیان هەڵبژێرن! ئەم چەند شتەمان باس کرد بۆ نموونە، تا بۆمان دەرکەوێ شێوەی بەکارهێنانی تەرازووی خوا لە ڕووداوەکانی ژیاناو لەناو کۆمەڵی موسڵماندا ئەو شتە گەورەیە جێگیر بوو، ماوەیەکی دوورو درێژ مایەوەو ڕەفتاری پێکرا، لەپاش یەکەم چین و یەکەم چەرخ ئەو تەرازووە لانەبرا بە تەواوی لە زەوی دا مەگەر بەم نزیکانە لەپاش زاڵ بوونی نەفامی تازە بە زاڵ بوونێ کە هەموو ناوچەکانی جیهانی گرتەوە، ئینجا نرخ و بێنرخی بەپێی زۆری و کەمی دۆلارە، لە ڕوسیاا کە سەرۆکی دەوڵەتە ڕۆژهەڵاتەکان بوو، بە تەواوی نرخ لە ئادەمی سەنرایەوەو درا بە ئامێرو چەك و ئەو جۆرە شتانە. لە وڵاتە بەناو موسڵمانەکانیشدا نەفامی کۆن سەری هەڵدایەوەو زاڵ بوو، ئەونەفامیەی کە ئیسلام هات و چارەسەری کرد، وە چەند ڕەگەزایەتی و ڕەگەز پەرستی سەری هەڵدایەوەو کە ئیسلام کاتی خۆی لە ڕیشەی دەرهێنان، تەرازووەکەی خوا لەناوا لابراو نرخ دان بە هەر کەس بە پێی چەند شتێکەو لە چەند بارو ڕوویەکەوەیە کە بە هیچ کلۆج پەیوەندی بە بڕواو لە خوا ترسیەوە نەماوە.

هیچ هیواو ئومێدێ نیە بۆ ڕاست کردنەوەو بەرزکردنەوەی ئادەمێتی و ئادەمی مەگەر بەم بانگ کردن و بانگەوازە ئیسلامی یەی کە هەیەو چاوەڕوانی ئەکرێ نەفامی کۆن و تازە لەناو بەرێو لەسەر دەستیا جارێکی تر ئادەمێتی بێتەوە کایە وەك یەکەم جار، ئەو ئادەمێتی یەی کە جارێ پێدرا لەو ڕۆژەدا بەو چەند ئایەتە کورتانە. لەپاش ڕوون کردنەوەو جێگیر کردنی ئەو حەقیقەتە گەورەیە کە باس کرا لەم ئادەمیەدا، کە ڕوو وەرئەگێڕێ لە ڕێنموونی خواو خۆی بەبێ نیازو مەبەست دائەنێ لە بڕواهێنان، وە خۆی بە زل سەیر ئەکات بەرانبەر بانگ کردنی بۆ لای پەروەردگاری.

مەردوم سەرسام ئەكات لە كارو كرداری و بێبڕوایی و بیرنەکردنەوەی لە سەرچاوەی بوون و پەیدا بوونی، و هەست ناکات بە چاودێری و سەرپەرشتی خوا بۆی لە هەموو قۆناغێ لە قۆناغەکانی پەیدابوون و پێگەیشتنی لە هەردوو جیهانا، و هەڵناسێ بەوەی پێویستە لەسەر شانی بەرانبەر پەروەردگارو پارێزەری ئەفەرموێ: ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ﴾ دەك لەناوبرێ ئادەمی و بکوژرێ و سەرنقوم بکرێ! واتە ئەوەندە خراپ و بەدکردارە شایستەی زیندوویی و مانەوە نیە، خراپی و بەدکردارییەکەشی بەمە دەرئەخات کە ئەفەرموێ: ﴿مَآ أَكْفَرَهُۥ﴾! ئای ئادەمی چ ناسوپاس و بەد نمەك و سپڵەو چاکە لەبەر چاو نەبووە! لەگەڵ ئەو هەموو چاکەی کە خوا لەگەڵی ئەکات هەر لە دروست کردنیەوە تا مردن و تا زیندوو کردنەوەی، و ئەو هەموو بەهرەو بەخششەی کە ئەیڕێژێ بە سەریا! ئەگەر بیرێکی بکردایەوە لەوانە ئاوا ناسوپاس و پێنەزان و بێباك و لوت بەرزو خۆ بەزل زان نەئەبوو.

ئادەمی چۆن لەڕووی دێ ناسوپاس و پێنەزان بێت؟ ئایا نازانێ ﴿مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ﴾ خوا لە چ شتێ دروستی کردووە، ئەگەر نازانێ با بزانێ ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ﴾ لە دڵۆپێ ئاو دروستی کردووە، لەو شتە قیزەونە بێنرخە پێکی هێنا، و لەو شتە بێهێزو لاوازەی دروست کرد، ﴿فَقَدَّرَهُۥ﴾ئینجا ئامادەی کردووەو ڕێکی خستووە بۆ هەر شتێ و بۆ هەر کارو فەرمانێ کە شایان و شیاوە بۆی و تایبەتیە پێیەوە، یا نرخ و ڕێزی پێداوە بەم ڕەنگە کردی بە دروست کراوێکی ڕێك و پێك لەناو هەموو دروست کراوەکانا، لەو بنەڕەتە پەستەوە بەرزی کردەوە بۆ ئەو پلە بەرزەی کە زەوی و هەرچی وا بەسەر زەوی یەوە خستیە ژێر باری، بەڵکو هەرچی وا لە بوونەوەرا بە شێوەی گشتی ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾ ئینجا ڕێگای ژیانی بۆ ئاسان کرد، یا ڕێگای ڕێنومایی و ڕۆیشتنی پیایا بۆ ئامادەو ئاسان کرد، ئیتر چ بۆ بڕینی قۆناغی ژیان، وە چ بۆ ڕێگای ڕاست دانە بەر لە ژیانا، هەتا کاتی ژیانی لە جیهانا دوایی دێت ﴿ثُمَّ أَمَاتَهُۥ﴾ ئینجا مرانی و مراندنیش هەر بە چاکەو بەهرە ئەژمێررێ، چونکە قاپی کردنەوەیە بۆ زیندوو بوونەوەی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی کە ئەوەش بۆ چاکان و پاکان بەهرەو چاکەیەکی زۆر بەنرخ و گەورەیە، ئینجا بە مردوویش هەر ڕێزی بۆ داناوە بەم ڕەنگە

فَأَقْبَرَهُۥ (٢١) ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ (٢٢) كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ (٢٣) فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ (٢٤) أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا (٢٥)

﴿فَأَقْبَرَهُۥ﴾ له پاش مردن خستی و ئه‌یخاته گۆڕه‌وه‌و له‌شه‌كه‌ی ئه‌شارێته‌وه‌، نه‌ك وه‌ك ئه‌و هه‌موو گیان له‌به‌رانه‌ی تر كه مردار بوونه‌وه له‌و ده‌شت و ده‌ره ئه‌كه‌ون و بۆگه‌نیان بلاو ئه‌بێته‌وه‌و قێزیان لێ ئه‌كرێته‌وه‌و سه‌ر ئه‌كرێته لاكه‌كه‌یان، ئه‌و خستنه گۆڕه‌ش به‌وه بوو خوا ئاده‌می فێركردو نایه دڵی كه مردووی خۆی بشارێته‌وه‌و به ته‌بیعه‌ت زۆر سووری كرد له‌سه‌ر ئه‌وه‌و فه‌رمانیشی پێدا له‌سه‌ر زوبانی پێغه‌مبه‌ران -درووده‌ی خوایان لێ بێ- خوای گه‌وره ئاده‌می له خاك فه‌راهه‌م ئه‌هێنێ له پاشا به‌و جۆره ئه‌یخاته‌وه ناو سكی زه‌وی، ﴿ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ﴾ ئینجا كاتێ كی ویستی زیندووی ئه‌كاته‌وه بۆ حیساب و پرسیارو تۆڵه‌و پاداشت.

له پاش ئه‌وه‌ی باسی زۆر سپڵه‌یی ئاده‌می كردو سه‌رنجی ڕاكێشا بۆ ئه‌و هه‌موو چاكه‌و به‌هره‌یانه‌، ئینجا ئه‌فه‌رموێ: ﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ﴾[1] به‌ڕاستی ئاده‌می هێشتا ئه‌وه‌ی كه خوا داوای لێكردووه‌و فه‌رمانی پێداوه به‌جێی نه‌هێناوه‌، ئیتر یا به هیچ كامی هه‌ڵنه‌ساوه‌، یا ئه‌گه‌ر هه‌ڵسابێ به هه‌مووی هه‌ڵنه‌ساوه‌، چونكه هیچ كه‌س نیه به‌رانبه‌ر به خوا كه‌م و كوڕی نه‌بێ، ئاده‌می به‌شێوه‌ی گشتی، به‌هه‌موونه‌ندامه‌كانیه‌وه‌، به‌هه‌موو تاقم و چینه‌كانیه‌وه و به درێژایی ته‌مه‌نی، هێشتا هه‌ڵنه‌ساوه به هه‌موو پێویستی سه‌رشانی، به ته‌واوی و بێ كه‌م و كوڕی، چ جای ئه‌وه زۆربه‌ی ڕووی وه‌رگێڕاوه له په‌روه‌ردگاری و خۆی به گه‌وره‌و بێ پێویست دائه‌نێ له ئایین و ئامۆژگاری و ڕێنموونیه‌كه‌ی.

له‌پاش باسی چاكه‌و به‌هره‌ی خوا له نه‌فسی ئاده‌میدا، ئینجا باسی چاكه‌و به‌هره‌ی ئه‌كات له فه‌راهه‌م هێنانی خۆراك و خوارده‌مه‌نی كه پێویسته بۆ مانه‌وه‌و ژیانی كامه‌رانی ئاده‌می ئه‌فه‌رموێ: ﴿أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا﴾ ئینجا با ئاده‌می سه‌رنجێ بدات و ئاوڕێ بداته‌وه بۆلای خۆراكێ كه پێویست ترو نزیك ترو په‌یوه‌ست ترین شته بۆی... با سه‌رنجی ئه‌م شته نایابه

---

[1] وشه‌ی ﴿كَلَّا﴾ به پێی ته‌فسیره‌كه له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه كه به مانای (حقا) وه به‌ستراوه به ڕسته‌كه‌ی دوایه‌وه‌، وه زۆر كه‌س ئه‌یبڕن به‌سه‌ر تێخوڕیندا، له‌سه‌ر ئه‌و باره پچڕاوه لێی و په‌یوه‌ندی هه‌یه به ڕسته‌ی ﴿فَأَقْبَرَهُۥ﴾ وه‌، وه ڕسته‌كه‌ی دوای خۆی ئه‌و تێخوڕینه‌یه‌، به‌م جۆره‌ش چاكه‌و ئه‌گونجێ، زانینی ته‌واو لای خوایه.

بدا که به سوك‌و ئاسان پەروەردگار هەمیشه بۆی فەراهەم ئەهێنێ، با بیر بکاتەوەو بێدار بێتەوە لەو شتە نایابەو لەو موعجیزە گەورەیە کە بەهۆی سوك‌و ئاسانی‌و باوو دەق پێوە گرتنەوە گرنگی‌و نایابیەکەی لەیاد چووە، با بیربکاتەوە بە درێژی لەو هەموو قۆناغانەی کە دێت بەسەر ئەو خۆراکەدا، هەرچۆنێ سەرنجی ڕاکێشرا بۆ بیرکردنەوە لەو قۆناغانەی کە ئادەمی گوزەری پیا ئەکات، بێ‌گومان هەرکەس بەش براو نەبێ لە ژیری‌و تێگەیشتن، لە هەردوو سەرنج دان‌و بیرکردنەوەکەدا هەست ئەکات‌و چاوی دڵی ئەو دەستە قودرەتە ئەبینێ کە ئەم کارە گرنگ‌و گەورانە ئەکات، ئەو حەلە سپڵەو پێ‌نەزان نابێ، بەڵکو چاو لەبەرو سوپاس کەر ئەبێت، با بەدرێژی سەرنج بدات بەم جۆرەی کە هەرچۆنێ لەم سورەتەدا یەکەم قۆناغی بۆ ئادەمی لەو دڵۆپە ئاوەوە دەست پێ‌کرد، هەروەها یەکەم قۆناغی خۆراکەکەشی لە ئاو دەست پێ‌ئەکات‌و ئەفەرموێ: ﴿أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا﴾ واتە با ئادەمی سەرنجی ئەمە بدا کە ئێمە ئاومان ڕشت لای سەسەوە بە ڕشتنێکی نایاب، کە هەر بە ئێمە شتی وا ئەکرێ، ڕشتنی ئاو بە شێوەی باران شتێکی ئاشکرایەو هەموو ئادەمیەك لە هەموو لایە ئەیبینێ‌و ئەیناسێ.

کەواتە بەم جۆرو شێوەیە بۆ هەموو ئادەمی یە دەست ئەدات، ئیتر ڕادەو پلەی زانین‌و ناسین‌و ژیریی هەرچۆن بێ، بەڵام کاتێ کە ئادەمی پێش کەوت لە ناسین‌و زانیاری دا مەبەستی تریش وەرئەگرێ لەم فەرموودەیە کە دوورکەوتوو ترو کۆن ترە لەم بارانەی کە هەموو جارێ پەیدا ئەبێ‌و ئەبینرێ.

لەبارەی ئەم دەریا لوشانەی کە ئاوەکانیان ئەبێ بە هەڵم‌و بەرز ئەبێتەوەو ئەبێ بە هەورو ئینجا بە باران دێنە خوارەوە، لەبارەی ئەو دەریا لوشانەوە نزیك ترین تیۆرو تێ‌ڕوانین بەلای زانایانی تازەوە ئەمەیە کە ئەمانە لە پێشەوە لە ئاسمان بون بەلای سەرومانەوە، لە پاشا ڕژێنراونەتەوە سەر زەوی؟[1] وە ئەم تیۆرو تێ‌ڕوانینە هەرچەند ئێمە نایبڕین بەسەر ئەم ئایەتەداو ناڵێین مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە، بەڵام بێ‌گومان بۆچوون‌و تێگەیشتنمان بەرانبەر ئەم ئایەتە پان‌و فراوان تر ئەکات، ئەم تیۆرە لەوانەیە ڕاست بێت، وە لەوانەیە چەند تیۆری تریش پەیدا ببێ لەبارەی پەیدابوونی ئاو لەم زەویەدا، بەهەر جۆرو لەسەر هەر بار مەبەستە ئاشکراکە ناگۆڕێ‌و ئەمێنێتەوە بۆ ئایەتەکەو دەست ئەدات ئاراستەی هەموو جۆرە ئادەمیە بکرێ لە هەموو چەرخ‌و وڵات‌و چینێکدا.

---

[1] یەکێ لەو زانایانە خاوەنی پەڕاوی ناوبراوە بە (الإنسان لا يقوم وحده) کە زانای ئاسمانی (محمود صالح) وەری گێڕاوە بۆ عەرەبی بەناوی (العلم يدعو للإيمان).

ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾
وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ
وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾

---

یەکەم شت بۆ پێکهێنانی خۆراك ئەو ئاوە ڕێژراوە بوو کە هیچ کەس ناتوانێ بڵێ من دەخلم هەیە لە پەیداکردنی ئەم ئاوە، یا ڕشتن‌و هێنانە خوارەوەی. ئینجا دێتە سەر قۆناغی پاش ئەو، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا﴾ لە پاشا زەویمان لەت کرد بە لەت کردنێکی نایاب کە پێویست بێ بۆ ئەوەی دەست دا بۆ لێ ڕواندن، یا لەت کردنێ کە شایان‌و شیاو بێ لەگەڵ ڕووداوەکەداو بەپێی بەرژەوەندی ئەو بێت. ئەم قۆناغی لەت کردنەش هەر بەم دیمەن‌و ڕواڵەتە ئاشکرایەش شتێکی زۆر سەر سوڕهێنەرەو دەست ئەدا بۆ ئەمەی سەرنجی هەموو جۆرە کەسێکی بۆ ڕاکێشرێ، با کەسێ بێ ئاوەدانیشی نەبینێ، چونکە ئەوەتا ئەبینێ ئاو لەو سەرووە دێتە خوارەوە، ئینجا ئەبینێ زەوی لەت ئەکات‌و ئەچێ بەناو خۆڵەکەیاو تێکەڵی هەموو بەش‌و پارچەیەکی ئەبێ، یا ئەبینێ چووزەو چەکەرەی ڕووداوەکە کە چەندە وردو باریك‌و لاوازو ناسکە، لەو زەویە قورس و ڕەقە سەر دەرئەهێنێ‌و گەشە ئەکات‌و بەرز ئەبێتەوە، بەو هەموو جۆرو شێوەیە کە ئەبینرێ دەی ئایا کێ هەیە ئەوەندە نەفام‌و نەزان بێت بڕوای نەبێ بەو دەستە قودرەتەی کە ئەو جۆرە کارانە ئەکات؟!

زانایانی تازە لەبارەی زەویشەوە تیۆرەو تێڕوانینێکیان هەیە کە ئەم زەویە لە یەکەم جارەوە بەردێکی ڕەقی وشك بووە، لەپاشا بەهۆی لافاوو ڕژانی ئاو بەسەریا ئەو بەردە ڕەقە لەت لەت‌و پارە پارە بوو، تا لەوە پێستێکی نەرم‌و شل کشا بەسەر ئەم زەویەداو بەهۆی چەند کەرەسەیە ترەوە وای لێهات دەست بدات بۆ کشتوکاڵ‌و شت لێ ڕوان، ئینجا ئەگەر ئەم تیۆرە ڕاست بێت بەباشی ئەم ئایەتە ئەیگرێتەوەو ئەمەش ئەگەیەنێ، لەسەر هەر بارو بەهەر حاڵ قۆناغی سێهەم ئەمەیەکەئەفەرموێ: ﴿فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا﴾ ئینجاڕوواندمان لەزەویدا دانەوێڵە ﴿وَعِنَبًا﴾ و ترێ ﴿وَقَضْبًا﴾ سەوزەیە کە بەروبوومی بە تەڕی ئەخورێ‌و چین لە دوای چین پەیدا ئەبێ ﴿وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا﴾ و زەیتون‌و دارخورما ﴿وَحَدَآئِقَ غُلْبًا﴾ و باخاتی گەورەو پڕ ﴿وَفَٰكِهَةً﴾و

میوە ﴿وَأَبًّا﴾و لەوەڕ، ئەمانـەمان ڕواند ﴿مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ﴾ لەبەر خۆشـی و قازانج بـۆ خۆتـان و ئاژەڵتان لە ماوەی ژیانی جیهانا.

ئەمە بوو قسەو باسی خۆراك و هەمووی دەست کردو داهێنراوی کەسێ بوو کە ئادەمی دروست کردو دای هێنا، ئادەمی هیچ دەست و دەسەڵاتێکی نەبووەو نیە لەهیچ قۆناغێ لە قۆناغەکانیا... تەنانەت ئەو دانەوێڵەو تۆمەیش کە ئەیچێنێ و ئەیکات بە ژێر خۆڵەوە... چونکە ئەو چێنراوو نێژراوەی دروست نەکردووە، بەڵکو خوا خۆیشی و چێنراوەکەیشی ڕاهێناو دروستی کردن و ئادەمی فێری ئەو ئاشتن و چاندنە کردو هێزو دەسەڵاتی دایە بەسەر ئەوەدا، بەهیچ کلۆج ڕووان و سەوز بوون و پەرە پێدان و پەروەردە کردن بە دەست ئادەمی نیە، ئینجا موعجیزەی گەورەو شتی سەرسوڕهێنەر ئەمەیە کە خاکەکە هەر خاکێکەو ئاوەکە هەر ئاوێکەو کەچی ڕوواوەکان بە خۆیان و بەرو بوومو شێوە و تام و بۆن و ڕەنگیانەوە جیاوازن، وە هەر بەزرو تۆمەیە هەموو کەرەسەو شتە تایبەتیەکانی ئەو درەخت و ڕوواوەی پێیەو تیا داشاراوە کە وەك دایك وایە بۆ تۆوو بەزرەکە، ئینجا ئەمیش هەموو ئەوانە ئەدات و ئەیگوێزێتەوە لە خۆیەوە بۆ درەخت و ڕواوی تر کە لەمەوە پەیدا ئەبێ و وەك ڕۆڵەو نەوەی ئەم وایە، هەروەها بەبێ گۆڕان و لێشێوان و تێکچوون... دەستی قودرەت هەموو جۆرێ ئەبا بەڕێگای تایبەتی خۆیاو پەرەی پێ ئەدات و ئەیپارێزێ و ئەیهێڵێتەوە، بەبێ ئەمەی ئاگای بێ و دەخلی بێ لە هیچ کام و هیچ شتێ لەوانە!!!

خوای پەروەردگار بەو جۆرو شێوەیە خۆراك فەراهەم ئەهێنێ بۆ بەندەکانی تا ژیانی جیهان دوایی دێت، ئینجا بەدوای ئەمەدا کارو باری تر دێتە پێشەوە کە ئادەمی پێویستە پێش هاتنی بیری لێ بکاتەوەو خۆی بۆ ئامادە بکات بەو جۆرو شێوەیە کە خوا هەواڵی داوەو ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ﴾ ئینجا کاتێ ڕۆژی دوایی دێت کە ناوئەبرێ بە ﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾ واتە ڕووداوێکی زۆر سامناك و گەورە کە شاخەو شریخەو گرمەی زۆر گەورەی لێ پەیدا ئەبێ کە گوێ کەڕ ئەکات لە بیستنی هەر شتێکی ترو نایەڵێ هیچی تر ببیستێ، شاخەو شریخەی هاتنی ئەو ڕۆژەو شاخەو شریخەی شێوان و بەیەکادانی ئەو هەموو ئەستێرەو مانگ و ڕۆژو شاخ و کێوە گەورانە، ﴿يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ﴾ئەو ڕۆژەی کە مەردوم ڕائەکات لە برای، ﴿وَأُمِّهِۦ﴾و لە دایکی، ﴿وَأَبِيهِ﴾و لە باوکی، ﴿وَصَٰحِبَتِهِۦ﴾و لە ژن و هاوسەری، ﴿وَبَنِيهِ﴾و لە کوڕەکانی، واتە کە ئەو ڕۆژە هات هەموو کەس خەریکە بە خۆیەوەو هەوڵ و داوای ڕزگاربوونی خۆیەتی و مەبەستی کەسێکی تر نیە،

لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ ﴿٤٠﴾ تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾

---

چونکه ﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ﴾ بۆ هەرکەسێ لەوانە لەو ڕۆژەدا بارو حاڵێك هەیە کە بەسیەتی و بێنیازی ئەکات لە هەرکەسێ تر. بێگومان دیمەنو ڕواڵەتەکە گشتیە، بە پێی چەند حەدیسیش ئەو شێوە گشتیە مەبەستەو تایبەتی ناکرێ بە بێبڕواو تاوانبارانەوە، کەواتە ئەو بە خۆ خەریك بوونو نەپەرژانە بە نەزەر پاکانو چاکانەوە لە هێندێ کاتو بەسەرهاتی تایبەتیدایەنەك بە هەمیشەیی وەك لە حەدیسی دایکی ئیماندارانەوە دەرئەکەوێ کە لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکانا هاتووە کە عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ئایا خێزانی خۆتان بیر ئەکەوێتەوە لە ڕۆژی دوایی دا؟ لە وەڵاما فەرمووی: لە پێنج شوێنو بەسەرهاتا نەخێر کەسمان بیر ناکەوێتەوەو هەرکەس خەریکە بە خۆیەوە، دەقی حەدیسەکەئەمەیە! ئەوە حاڵی مەردومە بە شێوەی گشتی، ئینجا باسی حاڵی بڕوادارو بێبڕوا ئەکابەجیا، ئەفەرموێ: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ﴾ چەنددەموچاوێ لەو ڕۆژەدا ڕۆشنو ڕووناکە، ﴿ضَاحِكَةٞ﴾ دەم بە پێکەنینە ﴿مُّسۡتَبۡشِرَةٞ﴾مۆژدەبەخشو شادمانە، ﴿وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ﴾ وە چەند جەموچاوێ لەو ڕۆژەدا ﴿عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ﴾ وا بەسەریانەوە تۆزو غوباری زەبوونیو سەر شۆڕی ﴿تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾ ڕەشی غەمباریو نائومێدی دایان ئەگرێو دایان ئەپۆشێ... هیچ شێوەیە ناشیرین تر نیە کە تەپو تۆزو ڕەشی کۆ ببێتەوە بەسەر دەمو چاوەوە وەك ئەبینرێ لە جیهانا دەموچاوی ئەو قولە ڕەشانەی کە لە خەڵوز ڕەش ترنو لە هەمان کاتا تەپو تۆزیشی پێوەیە! ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ﴾ ئەوانە کە ڕوویان وای بەسەر دێ لە ڕۆژی دواییدا، ئەوانەن بێبڕوایانی لە فەرمانی خوا دەرچووەکان لە جیهانا... داواکارین لە پەروەردگاری میهرەبان ئەو ڕوو ڕەشییەمان بەسەر نەهێنێ.

وصلى الله وسلم على رسوله محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ
﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ ﴿٥﴾

## سوورەتی «التكوير»
## مەككەییەو (٢٩) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە دوو بەشەو هەر بەشەی بەشێكی گرنگ دەردەخاتو باسی بەندێكی گەورە ئەكات لە بەندە سەرەكیو بنەڕەتیەكانی عەقیدەی ئیسلام:

یەكەم: باسی ڕۆژی دوایی و چەند بەسەرهاتو گۆڕانیچكی گەورەو سامناك ئەكات كە لەو ڕۆژەدا دێت بەسەر ئەم بوونەوەرەداو هەموو شتێ ئەگرێتەوە.

دووەم: باسی (وەحی) سروش ئەكات لەگەڵ چەند نیشانەو سیفەتێكی ئەو فریشتەی كە هەڵی گرتو هێنای، وە چەند نیشانەو سیفەتێكی ئەو پێغەمبەرەی كە لێی وەرگرت – سەلامی خوا لە هەردوو بێت– لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە دوانزە بەسەرهاتو ڕووداوی سامناك باس ئەكات كە بەدی دێن لە سەرەتای نەمانی جیهانو وێران بوونی، تا كاتی لێپرسینەوەی دوای زیندوو بوونەوە، بەڕاستی ئەوەندە سامناكن كار ئەكەن لە هەموو دڵێكی بڕواداری وریا، زانایان لە ڕاڤەو تەفسیریانا چەند ڕایە هەیە وەك لە كتێبەكانی تەفسیردا باس كراونو لەناو ئەو ڕایانەدا ڕایەكمان هەڵبژارد كە بەلامانەوە بەهێزتر بوو، لەسەر هەموو ڕووو بارێ ئەم ڕووداوانە دەست نیشانمان بۆ ئەكەن بەمەی كە ئەم بوونەوەرەی كە ناسراوە لامان، ئەو بوونەوەرە جوانو شیرینەی كە هەموو بزوتنەوەو جوڵانەوەی بەشو پارچەكانی دیاری كراوەو بە تەرازوویەكی ڕاست كێشراوە كە بە هیچ كلۆج دەست نادا بۆ بەرو دواو بەرزو نزمو خوارو ژوور، وە هەموو كاروباری لە ڕادەو ڕێژەیەكی شیاوی گونجاودایە، ئەوپەڕی وردەكاری تیاكراوەو هۆنراوەتەوە بە بەتین ترین یاسا، ئەم بوونەوەرە گەورەو گرنگە بەنو شیرازەی ئەپچڕێو هەموو پارە پارە ئەبێتو هەڵەوەرێو ئەم دەزگا (آلة)و دوكانە نامێنێو بارو حاڵێ تر دێتە پێشەوە كە لەم بوونەوەرەدا نەناسراوە، مەبەستو

ئامانجی ئەم بەشی یەکەمەلەم سوورەتە دامەزراندن و جێگیرکردنی ئەم عەقیدەو باوەڕەیە لە هەست و دەروونیا، بۆ ئەمەی بپچڕێ لەم بوونەوەرەو دڵی پێوە نەبەستێ و دڵ تەنها بە خواوە ببەستێ کە هەر ئەو ئەمێنێ و گۆڕان ڕووی تێناکات.

ئینجا با گوێ بگرین لەم ڕووداوانە یەك بە یەك و بیریان لێ بکەینەوە، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ *إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ کاتێ خۆرئەپێچرێتەوەو تیشك و ڕووناکیەکەی ناهێڵرێ ﴿وَإِذَا النُّجُومُ انْكَدَرَتْ﴾ وە کاتێ ئەستێرەکان هەڵئەوەرێن و ئەکەونە خوارەوە، ئیتر خوا خۆی ئەزانێ ئەم ئەستێرانەی کە ئەوەیان بەسەر دێت کامەن؟ ئایا ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆریی ئێمەن، یا ئەستێرەکانی کاکێشانی ئێمەن، یا هەموو ئەستێرەکانی ئاسمانێ کە تەنها خوا ژمارەو جێ و شوێنیان ئەزانێ؟؟

﴿وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ﴾ وە کاتێ کە کێوەکان ئەڕەوێنرێن، بەم ڕەنگە ئەکرێن بە تۆزو وەك هەڵم و تەم با کۆیان ئەکاتەوەو ئەیانگێڕێ، وەك هەور.. ﴿وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾وە کاتێ کە حوشترە ئاووسەکان کە کەوتبنە مانگی دەهەمیان گوێیان پێنادرێ و بە چاوو بە سەر ناکرێن، واتە ئەو جۆرە حوشترە کە خۆشەویست ترو بەنرخ ترین ماڵی عەرەب بووە لەو سەردەمەدا، بەهۆی تەنگی و سەختی ڕۆژەکەوە گوێیان پێنادرێ و کەس هۆشی بە لایانەوە نامێنێ.

(قورتوبی) لە تەفسیرەکەیا ئەفەرموێ: مەبەست لێرەدا چیرۆکە، ئەگینا لەو ڕۆژەدا حوشتر نیە، واتە ئەگەر ببوایە نرخی بۆ دانەئەنراو کەس گوێی پێنەئەدا، بەڵام ڕای بەهێزو بێ گرێ ئەمەیە کە لە دیمەنەکەی لانەدرێ و ئەوە لە کاتێکایە پێش وێران بوونی جیهانەو بۆ کاتێکە کە سەرەتای خەریکە دەست پێبکات، کەواتە با هەر بەپێی ڕواڵەتەکە بێت، وەك بەو جۆرەتەفسیرمان کردەوە، هەروەهائەڵێن سەبارەت بەمەش کەئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ وە کاتێ کە جروجانەوەرەکان و گیان لەبەرانی کەژو چۆڵی کۆ ئەکرێنەوە، ئەمەش کەمێك لەپێش وێران کردن و فوو کردن بە صوردایە، کە هەموو ئەوانە بیم و ترس وایان لێ ئەکات سەرگەران و سەرلێشێواو ئەبن لە بێشەو کونی خۆیان دێنە دەرەوەو کۆ ئەبنەوەو هۆشیان نامێنێ بەلای دوژمنایەتی ناو خۆیان، هەروەك بیم و ترسیان لە ئادەمیش نامێنێ و بێ پەروا خۆیان ئەکەن بە ئاوەدانیدا!!

وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴿٩﴾

﴿وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ﴾ وه كاتێ دەریاكان پڕئەكرێن، بەم ڕەنگە بەرهەڵست‌و بەربەست نەماو هەموو بە سوێرو شیرینەوە تێكەڵ ئەبن‌و ئەبن بە یەك دەریا، یا مەبەست ئەوەیە هەڵگیرسێنرێن و بكرێن بە یەك پارچە ئاگر، ئەوەش بەهۆی تەقینەوەو جیابوونەوەی هایدرۆجین لە ئۆكسجین تیایاندا، یا بەهۆی تەقینەوەی زەڕەو ئەتۆم، بێ‌گومان ئەم زۆر سامناك ترەو زانینی ئێمە پیا ناگات، چونكە تەقاندنەوەی ئەندازەیەكی دیاری كراو لە بۆمبایەكی زەڕەیی هایدرۆجینی ئەو هەراو بەزمە فەراهەم ئەهێنێ‌و جیهان پڕئەكات لە سام‌و بیم، ئەی ئەگەر هەموو زەڕەكانی دەریاكان بتەقێنرێنەوە بەهەر جۆرو شێوەیەك، ئەبێ چی ڕوو‌بدات‌و جیهان چی بەسەر بێت؟!! بێ‌گومان تێگەیشتنی ئێمە كول‌و دەستەپاچەیە لە بۆچوونی ئەو بیم‌و ترسەو ئەوەی كە بەرپا ئەبێ لەو تەقینەوە گەورەو فراوانەوە!

﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ﴾ وه كاتێ كە گیانەكان جووت ئەكرێنەوە لەگەڵ لەشەكاندا، واتە لەشەكان دووبارە ئەكرێنەوەو گیانیان ئەكرێتەوە بەبەرا ﴿وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ﴾ وه كاتێ كە كچی زیندە بەچاڵ كراو پرسیاری لێ ئەكرێ ﴿بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ﴾ بە چ گوناهێ كوژرا؟

لە سەردەمی نەفامی پێش ئیسلاما لەناو عەرەبەكاندا باو بووە زیندەبەچاڵ كردنی كچ لەبەر چروكی‌و چاوچنۆكی‌و برسێتی، یا لەبەر مەترسی بەدناوی، هەڵئەسان بەو كردەوە پیسە بە چەند جۆرو شێوەیە كە دڵ دێتە لەرزەو موچڕكە بە لەشا ئەهێنێ، هەر كچێ زیندەبەچاڵ نەكرایە بە ئەوپەڕی ڕیسوایی‌و بەدبەختی ڕاگیرئەكرا تا گەورە ئەكرا، ئینجا پەڵاسێكی خوری یا موو ئەكرا بە بەریاو ئەنێررا بۆ لادێ شوانیی حوشتر بكات! ئەگەر ئەوەشی لەگەڵدا نەكرایەو بدرایە بە شوو ئەژێنرا بە ژیانێكی سەخت، كاتێ مێردەكەی بمردایە حەقداری مردووەكە شتێكی لە جل‌و بەرگی خۆی ئەدا بەسەریا، واتە كەس داوای نەكات‌و بمێنێتەوە، ئینجا ئەگەر خۆی دڵی گرتی مارەی ئەكرد ئیتر ئەو پێ‌ی خۆش بوایە یا نا! وە ئەگەر دڵی نەیگرتایە ئەیهێشتەوە تا ئەمردو ئینجا كەلەپوورەكەی ئەبرد، ئەبوایە بەند بكرایە تا مردن‌و ماڵەكەیشی بۆ ئەو كابرایە ئەبوو، یا خۆی لێی بكڕیایە، ئەگینا ڕزگار بوونی نەبوو... وا ئەبوو یەكێ ژنەكەی تەڵاق ئەدا بە مەرجێ شوو نەكات بە كەسێ نەبێ كە ئەم پێ‌ی خۆش بێ، یا خۆی لێی بكڕێ بە هەرچەندێ كە لەمی وەرگرتووە... وا ئەبوو ژنی

مردووەکەیان ئەهێشتەوە بەدیاری منالێکەوە هەتا گەورە ئەبوو ئینجا ئەیخواست، وە پیاوی وابوو ئافرەتێکی بە هەتیوی ئەکەوێتە ژێر دەست، ئینجا ئەو ئافرەتە داماوەی بەرگری ئەکرد لە شووکردن‌و بە دیاری خۆیەوە ئەیهێشتەوە ئەگەر ژنەکەی مرد ئەو کاتە مارەی بکات! یا مارەی ئەکرد لە کوڕێکی ساوای‌و بە دیاریەوە ئەیبەستەوە لەبەر ئەوەی جوان بوو، یا ماڵی هەبوو با بۆ کوڕەکەی بێ‌و دەستی کەسی تر نەکەوێ....

ئەوە بوو باوو سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام سەبارەت بە ئافرەت، هەتا ئیسلام هات ئەو هەموو کردەوەو باوە ناڕاست‌و ناڕەوایانەی نەهێشت‌و ئافرەتی ڕزگار کردو مافی ڕاستەقینەی خۆی پێدا، وەك لە چەند شوێنی ترا باس کرا.

بە تایبەتی مەسەلەی زیندە بەچاڵ کردنی زۆر بە گرنگ گرت‌و لە چەند ئایەتێکدا دژی هەڵساو جڵەوگیری لێ کرد تا بە تەواوی ئەو باوە پیسەی لە ڕەگ‌و ڕیشە دەرهێنا. یەکێ لەو ئایەتانە ئەم ئایەتی ئێرەیە کە ئەو کردەوە پیسە ئەکات بە مەبەستێ لە مەبەستەکانی ڕۆژی دوایی کە بە تایبەت پرسیاری لێ ئەکرێ، شان بە شان‌و لە ڕیزی ئەو بەسەرهات‌و ڕووداوە سامناکانە باسی ئەکات، وەك ئەمیش یەکێ بێت لەو ڕووداوە گەورانەی کە دێن بەسەر بوونەوەردا!! ئینجا ئەفەرموێ: پرسیار لە زیندە بەچاڵ کراوەکە ئەکرێ، نەك لە زیندەبەچاڵ کەری تاوانبار، لەبەر دڵنەوایی‌و دڵخۆش کردنی زیندە بەچاڵکراوەکە، لەبەر دەربڕینی خەشم‌و قین‌و بێزاری لە زیندەبەچاڵ کەری تاوانبار، تا ئەو ڕادەیە دەرئەکرێ لەوەی ڕووی پرسیارو قسەی تێ بکرێ، لەبەر زیادە دەم کوت کردنی ئەو تاوان بارە، بە وێنەی دەم کوت کردنی ئەوانەی کە لایان دا لە ئایینی پاکی عیسا، وەلە ڕۆژی دوایی دا خوا ئەفەرموێ: بە عیسا ﴿ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئایا تۆ گوتت بە مەردوم من‌و دایکم بکەن بە دوو پەرستراو و تێپەڕن لە پەرستنی خوایە کە ناوی (الله)یە؟ ئا بەو جۆرە ئیسلام ئافرەتی ڕزگار کرد لەو سەردەمە نەفامیەدا کە بەهیچ کلۆج بەدڵی هیچ کەسدا نەئەهات شتی وا، وە هەرگیز بیریشی لێ نەئەکرایەوە، چونکە ئەو ڕادەو جۆرە ژیانە بۆ ئافرەت بوو بوو بەباو بە درێژایی چەند چەرخ بەبێ سەر لێکردنەوەو بە شتێکی ناڕەواو ناڕاست سەیر بکرێ، وەهیچ پاڵ پێوەنەرێ نەبوو بۆ گۆڕین‌و نەهێشتنی ئەو بارەو حاڵە بەڵکو بە پێچەوانەوە، مەردوم دژی گۆڕینی‌و نەهێشتنی بوون، کەواتە ئەم کردەوەی کە ئیسلام پێی هەڵسا وەك زۆربەی کردەوەکانی تری بەڵگەو ڕابەرێکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە لەلایەن خواوە هاتووە!

وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾
عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴿١٤﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ
إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾

---

﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾ كاتێ نامەكانی كردەوە بڵاو ئەكرێنەوە هەرچی كردەوەی خراپ و ناڕەوا هەیە دەرئەخرێ، كە ئەوەش ئێجگار ناخۆش و دڵ داگیركەرە، چونكە گوناهی وا هەیە بە بیرلێكردنەوەشی دڵ بێئارام ئەبێ، چ جای ئەوە ئاشكرا بكرێ لەناو مەردومدا، لەبارەی نامەی كردەوەوە چەند حەدیس هاتووە یەكێ لەوانە ئەمەیە كە (ئیبن المنذر) لە (ئیبن جریر)ەوە ئەیهێنێ كە ئەفەرموێ: كاتێ ئادەمی ئەمرێ نامەی كردەوەكانی ئەپێچرێتەوە، ئینجا لە ڕۆژی دوایی دا بڵاو دەكرێتەوەو پرسیارو حیسابی لەگەڵ ئەكرێ بەپێی ئەوەی تیایەتی، ئێمە نازانین ئەم نامانە چۆنن و لە چین؟ بەس بڕوامان هەیە كە هەموو كردەوەكانمان ئەنوسرێ و لە ڕۆژی دوایی دا دەرئەخرێن، هەروەها لە هەر شتێكی غەیبی تردا بڕوامان هەیە پێی بەو جۆرو شێوەی كە هاتوون و ئیتر چۆنێتی هیچ كام لەوانەنازانین و داوای ئەوەمان لێ نەكراوە.

﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ﴾وە كاتێ كە ئاسمان قەڵخ ئەكرێ و لائەبرێ، واتە ئەمەی وا بە لای سەرمانەوە كە لەبەر چاو وەك خێوەت و گومەزێكی شین وایە نامێنێ، ئیتر ئایا چۆن لائەبرێ و چی ئەبێ؟ ئەوە لە زانینی ئێمە بەدەرە، بەس ئێمە وا حاڵی ئەبین كە لەو كاتەدا ئەم خێوەت و گومەزە شینە نابینرێ، ئەمە بۆ ئێستەی ئێمە بەسە.

ئینجا دواترین هەنگاو دێتە پێشەوە لەو ڕووداوانەی ئەو ڕۆژە سامناكە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ﴾ وە كاتێ كە دۆزەخ زۆر بە توندی هەڵئەگیرسێنرێ و تاو ئەدرێ... ئینجا ئایا لەو كاتەدا دۆزەخ لە كوێیەو چۆن تاو ئەدرێ و بەچی تاو ئەدرێ؟ بۆ ئەوە هیچ شتێكی دڵنیاكەرو بێگومانمان نیە بە دەستەوە بێجگە لەوەی كە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ سوتەمەنی و هەڵگیرسێنەری ئادەمی و بەردە، ئەوەش پاشی تێتوڕدانی دۆزەخیەكانە بۆ ناوی، ئیتر بۆ پێش ئەوە خوا خۆی زاناو ئاشنایە بە خۆی و سوتەمەنی و هەڵگیرسێنەری، ﴿وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ﴾ وە كاتێ بەهەشت نزیك ئەخرێتەوە لە چاكان و لە خوا

ترسانەوە، دەرئەکەوێ بۆ ئەو بەڵێن پێدراوانە بە ئامادەکراوی بۆیان و بۆ تێچوونیان بە سووک و ئاسانی! لە کاتێکدا ئەم ڕووداوو بەسەرهاتانە بەدی دێن ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴾ هەموو کەس ئەزانێ بە هەر کردەوەیە کە ئامادەی کردووەو پێشی خۆی خستووە لە ژیانی جیهانا.

هەموو کەس ئەزانێ لەو ڕۆژە سەخت و سامناکەدا بە هەموو کردەوەکانی جیهانی لە چاکەو خراپە. ئەزانێ بە هەمووی لە کاتێکا ناتوانێ هیچی لێ بگۆڕێ و یا هیچی لێ زیاد یا کەم بکات... ئەزانێ لە کاتێکا کە پچڕاوە لە جیهانەکەی و جیهانەکەی لەم پچڕاوە، هەموو شتێ و هەموو باوێکی لەوەو پێشی گۆڕاوە، هیچ شتێ نەماوەتەوە بێجگە لە خوا، کە بەهیچ ڕەنگ گۆڕان ڕووی تێ ناکات... کەواتە بۆ هەموو کەس هەروا چاکە کە ڕوو بۆلای خوا بکات، ئەو حەلە خوای دەست ئەکەوێ لە هەموو بەسەرهات و گۆڕانێکدا!!

ئەو زانینە پەیدا ئەبێ بەهۆی نامەکانەوە، یا هەموو کردەوەکان دەرئەخرێن لە وێنەو شێوەیەکی تایبەتیدا کە شایان و شایستەی کردەوەکان بێت لە جوانی و ناشیرینی دا، بۆ خوا ئەوە هیچی تێناچێ، وەك ئەوەی کەئەفەرموێ: مردن ئەبرێتە وێنەی بەرانێك و لە بەینی دۆزەخ و بەهەشتدا سەر ئەبڕرێ!!

بەشی یەکەمی سوورەتەکە لێرەدا دوایی هات، ئینجا دەست ئەکات بە مەبەستی دووەم بەوجۆروشێوەیە کەلەسەرەتای سوورەتەکەوە باسمان کرد، بێبڕواکان لەبارەی پێغەمبەرەوە کە بەباشی ئەیان ناسی بڕوای بەهێزیان بوو بە بیری و ژیریی بەرزی و بە ڕاستی و پاکێتیەکەی، دەربارەی ئەو پێغەمبەرە هەرجارێ شتێکی بێجێ و ناڕەوایان ئەوت، هێندێ ئەیانوت: شێتەو شەیتانێ دێتە سەری و ئەم هەواڵ و قسەو باسەی بۆ ئەهێنێ و ئەمیش ئەیلێ، ئەمەشیان ئەوت بۆ پڕوپاگەندەو پیلان گێڕان لەگەڵ خۆی و ئەو ئایینەی کە هێنای وەك لە چەند هەواڵ و حەدیسا باس کراوەو لە چەند شوێنێ لەم تەفسیرەدا بە درێژی ئەو باس و هەواڵەماندا، هێندێ کە ئەوەیان ئەگوت لەبەر سەرسوڕمانیان بوو لەم قورئانەی کە وێنەیان نەبیستبوو، جا بەپێی گومان و باوی خۆیان کە لایان وابوو هەر شاعیرێ شەیتانێکی هەیە ئەو وتارەی پێ ئەڵێ، وە هەر کاهینێ شەیتانێکی هەیە ئەو هەواڵە غەیبیانەی بۆ ئەهێنێ،و شەیتان دەستکاری هێندێ ئادەمی ئەکات و لەسەر زوبانی ئەوان ئەو قسەو باسانە ئەکات، ئەوەندە لارو نەفام و بەدخوو بوون، ڕێگایان لە قسە ڕاستەقینەکە نەئەکەوت، یا نەیان ئەویست دانی پێدا بنێن و بیلێن کە ئەوە سروشە لای خواوەو هێنراوە

خـوارەوەی پـەروەردگاری هـەموو جیهـان‌و جیهانیانـە، ئینجـا قورئـان ئەهاتـە خـوارەوە بەرپەرچی ئەو بێبڕوایانەی ئەدایەوەو دەم کوتی ئەکردن‌و چەند بەڵگەو نیشانەی ئەخستە بەرچـاویان لەسـەر ڕاسـتی‌و پـاکی ئـەم قورئانـەو هـاتنی لەلایـەن خـواوە، وە لـە پـاکی سەرچاوەکەی‌و پاکی پێغەمبەر (ﷺ) یەکێ لەو سورەت‌و شوێنانە ئەم بەشی دووەمەیە لەم سوورەتە کە زۆر بەهێزەو دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەو مەبەستە گرنگە.

بە جۆرو شێوەیەکی زۆر نایاب‌و دڵڕفێن ئاماژە ئـەکات بـۆ هێنـدێ لەبەرهـەمی زانین‌و توانین‌و کاردروسـتی خـوا لـەم بوونـەوەرەدا، تـا بـەهۆی ئـەوە بیرێ بکرێتـەوەو مـەردوم لـە گومرایی و لاری خۆی کۆتـایی پێبێنـێ ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ﴾ لەبارەی ئەم ڕستەوە لـە چەند شـوێنێکا وتمان کە بەسێ جۆر تەفسیر کراوەتەوەو هەرکام ڕێکەو ئەگونجێ، لێرەدا لەسـەر ئەم ڕایـە ئەڕۆم کە ئەڵێ: وشەی (لا) زیادە نیەوبۆ (نفی)یە واتە سوێند ناخۆم، چونکە شتەکە ئەوەندە ئاشکرایە سوێندی ناوێ، سـوێند نـاخۆم ﴿بِٱلۡخُنَّسِ﴾بە هەموو ئەستێرەکان کە لەبەرچاو ون ئەبن بـەڕۆژا ﴿ٱلۡجَوَارِ﴾ کە گـەڕۆکن لـە خولگەی خۆیانا ﴿ٱلۡكُنَّسِ﴾ کە بە شـەوا لـە شوێنەکەی خۆیانا هەڵدێن‌و دەر ئەکەونـەوە، یـا ئـەو ئەسـتێرانەی کە شـەو بـە شـەو ئەگەڕێنـەوە بـەرەو ڕۆژهـەڵات‌و ئەگـەڕێن تـا خۆیـان ئەکـەن بـەناو ڕوونـاکی ڕۆژاو ون ئـەبن، کـە ئەوانـەش ئـەو ئەسـتێرانەن کـە پێیـان ئـەوترێ: گەڕۆکـەکان. هـەرکام مەبەسـت بـێ ئەسـتێرەکان خۆیـان لـە خۆیانا دیمەن‌و ڕواڵەتێکی زۆر شیرین‌و دڵڕفێنیان هەیەو لە هەموو بارو ڕوویەکەوە ڕابەرو نیشانەیەکی ئاشکران لەسەر گەورەیی‌و کار دروستی پەروەردگار، ئینجا قورئان ئەوەنـدەی تـر شـیرینیان ئـەکات کـە لـە دیمـەن‌و ڕواڵـەتێکی گیان لەبەری جوانا نیشانیان ئـەدات، وەك ئاسك لە گەڕان‌و هاتوچۆو دەرکەوتن‌و خۆ داشاردنیانا!!

سوێند ناخۆم بەو دروست کراوە گرنگانە ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ﴾و شەو کاتێ ئەڕواو پشتی تێ ئـەکات ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ وە بـە بـەیانی کاتـێ دەم ئەکاتـەوەو هەناسـە ئـەدات، واتـە شـەبەق ئـەدات‌و ڕوونـاکی دەرئـەکات وەك هەناسـە بـدات‌و بـە زەردەخەنـەوە دەم بکاتـەوە، بێجگـە لـەوەش هـەر لەگـەڵ شـەبەق دای نەسـیم‌و هـەوای ناسـك دێـت لـەو تەرەفـەوە، وەك کـەنارەی ئاسمان دەمی کردبێتەوەو هەناسە بدات‌و ئەو نەسیمە ناسکە هەناسەی ئەو بێت!!

بە ڕاستی هەر بە قورئان ئەکەوێ بدوێ لەهەر شتو باسی هەر شتێ بکات... ئەو شتە نایابو سەرسوڕهێنەرانەی خستە بەرچاو، بەجۆرێ هەموو دڵێکی زیندووی وریاو بێدار کردەوەو ئاشنای کرد بەو دەستە قودرەتەی کە ئەم هەموو شتە دڵڕفێنانەی لێ دەرچووە، بەڕاستیو ڕەوایی بانگ کردن بۆ بڕواهێنان بەو شتانەی کە پێویست کراوە بڕوا هێنان پێیان ئینجا لەم کاتە زۆر ڕێکەدا کە دڵ ئامادە کراوە بۆ بڕوا هێنان، لەم کاتەدا ئەدا لە دەماخی بێبڕواو بێ دەماخە کە لە بۆشەکانو دەم کوتیان ئەکاتەوەو دڵی بڕواداران باش پاراو ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە کە بەو شێوە باسی ڕۆژی دوایی و ئەو ڕووداوانە کرد، وتەی نێرراوێکی خوایە کە فریشتەی سروشی خوایە بۆلای پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێ– واتە (جوبرەئیل) لەلایەن خواوە ئەیهێنێو ڕای ئەگەیەنێ بە پێغەمبەر (ﷺ) نەك وتەی شەیتانەو شەیتان ئەیهێنێ وەك بێبڕوا بێدەماخەکان ئەیلێن.

ئینجا چەند سیفەتێك باس ئەکات بۆ ئەم نێرراوی خوا کە بەرزیو بڵندی ئەم وتەیە ڕوون ئەکاتەوە، هەرچۆنێ میهرەبانی خوا دەرئەخات لەگەڵ ئەم ئادەمیەدا، تا ئەو ڕادەیە نێرراوێکی ئاوا گەورەی بۆ هەڵبژارد بۆ گەیاندنی ئەم سروشی خوا بەو پێغەمبەرە هەڵبژێرراوە – سەلامی خوایان لێ بێ– بە ڕاستی مافی ئادەمی ئەوەیە سەری شەرمو خەجاڵەتی دابخات بۆ ئەو خوای میهرەبانە کە ئاوا بە گرنگ گرتوویەتیو لەگەڵ هیچ نیازو پێویستی نیە بەم ئادەمیە، ئەگەر خوا ئاوا ڕێزی نەگرێ ئەم ئادەمیە هیچ چاو نادا لەناو ئەم بوونەوەرەدا:

١- ﴿كَرِيمٖ﴾ نێرراوێکی بەڕێزو گەورەیە.

٢- ﴿ذِي قُوَّةٍ﴾ خاوەنی هێزە لە ژیرییو بیری داو هەرچی وەرئەگرێ لە بیری ناچێو دوورە لە هەڵە.

٣- ﴿عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ﴾ لای خوای گەورەی پادشا بەرزو پایەدارە.

٤- ﴿مُّطَاعٖ ثَمَّ﴾ فەرمان ڕەوایە لای خوا لەناو فریشتەکانیاو گوێڕایەڵی کراوە.

أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾

**٥- ﴿أَمِينٍ﴾ پاك‌و دەست پاك لەوەی كە سپاردە كراوەتە لای.**

**بێگومان (جوبرەئیل)یش وەك هەموو دروست كراوەكانی تر دەستە پاچەیە لە حاستی ئەم قورئانەو وێنەی ئەم قورئانەی بۆ نایە لە لایەن خۆیەوە، بەس خوا ئەم فریشتەیەی جوێ كردەوە لەناو هەموو دروست كراوەكانی دا بەمەی بتوانێ ئەم قورئانە وەربگرێ‌و بیگەیەنێ بە پێغەمبەر (ﷺ) جا لەبەر ئەوەو تەنها لەو ڕووەوە ئەم قورئانەی دانا بە وتەی ئەم فریشتە بەڕێزە، ئەگینا هیچ دەخلێكی تری نیە لەم قورئانەدا.**

**ئەوانە سیفەتی ئەو نێرراوە بوون كە سروشەكەی خوای هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا سیفەتێكی ئەمیش باس ئەكات‌و وەڵامی بێبڕواكانی پێ ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾ بێگومان هاوڕێكەتان شێت نیە، واتە محمد كە چاك ئەیناسن‌و ماوەیەكی درێژ هاوڕێییتان كردووەو شارەزای ژیریی بەهێزو ڕەوشتی بەرزی بوون، ئەوە بوو هەر لە گەنجیەوە لە ناویانا نازناو كرا بە (الأمین) واتە مەردێكی ڕاست‌و پاك، كەواتە چۆن كاتێ ئایینی ڕاست‌و دروستی بۆ هێنان قسەی ناڕاست‌و ناڕەوای دەربارە ئەكەن؟!!**

**﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ﴾ سوێندبەخوا محمدئەو نێرراوەی بینی لە ئاسۆی ڕوون‌و ڕووناكدا، ﴿وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ﴾ بێگومان چروك و بەرچاو تەنگ نیە لە گەیاندنی سروشی خواداكە شتێكی غەیبی‌و نهێنی یەو هەرچی بۆی هاتبێ ڕای ئەگەیەنێ بە تەواوی، بەبێ هیچ پوڵو پارەو شتێ بەوێنەی كاهینەكان كە شتێ بڵێن بە خۆڕایی نایڵێن.**

**﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ﴾ بێگومان ئەو قورئانەی كە ڕای ئەگەیەنێ وتەو قسەی شەیتان نیە كە دەركراوە لە میهرەبانی‌و بەزەیی خوا، چونكە ئاشكرایە كە شەیتان بەرنامەو ئایینی ئاوا ڕێك‌و ڕاست نالێ‌و ڕای ناگەیەنێ ئینجا بۆ بێزاری دەربڕین ئەم پرسیارەیان لێ ئەكات: ﴿فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ﴾ دەی ئایا بۆ كوێ ئەڕۆن لەو بڕیارو قسە ناڕێك‌و ناڕاستانەدا؟ یا مەبەست ئاگادار كردنەوەیانە بە گومڕایی‌و سەر لێ شێوانیان، واتە بۆ كوێ ئەڕۆن‌و چۆن قوتار ئەبن لە حەق‌و ڕاستی كە بەهەر لایەكا بڕۆن بەرەنگارتان ئەبێ؟!**

إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾

---

**﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەو قورئانە هیچ نیە ئەوە نەبێ کە ئامۆژگاریە بۆ هەموو جیهانیان و بیرخەرەوەی هەموانە بەو شتانەی کە سروشتیان لەسەری داڕێژراوە کە ناسین و پەرستنی خوایەبە تەنهاو بەبێ هیچ هاوبەشێ، وە ئاشناکەریانە بە خۆیان و پەروەردگاریان و ئەو بوونەوەرەی کە تیا ئەژین و بەباشی ئەوانەیان پێئەناسێنێ.**

**قورئان هەر لە سەرەتای هاتنە خوارەوەیەوە لە مەککەی پیرۆز، لەو کاتەدا کە هەر کوڕێ زۆر ئازاو چالاك نەبوایە زاتی نەبوو بڵێ من موسڵمانم، لەو کاتە تەنگەدا ئەم جارە زۆر گەورەیەی دا کە ئەم ئایینە جیهانی یەو گشتی یە بۆ هەموو جیهان و جیهانیان، وەك لە چەند ئایەت و سورەتە مەککەییەکانی ترا باس کرا: (الأنبياء، الفرقان، فاطر،ص،ن) کەواتە ئەم جاڕدانەشی ڕابەرێکی بەهێزو موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) قورئان هەرچەندبەوجۆرە جیهانی و گشتییە، بەڵام هەموو کەس شوێنی ناکەوێ و ئەو ئامۆژگاریەی وەرناگرێ، بەڵکو کەسانێ سوودی لێ وەرئەگرن کە خێرو چاکە خوازن، جا لەبەر ئەوە ئەم ڕستەیەی هێنا بەدوای ئایەتی پێشوودا: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾ واتە ئامۆژگاریە بۆ هەر کەسێ لە ئێوە کە حەزی کردبێ و ویستبێتی ڕێك بێت و ڕێك ڕاوەستێ لەسەر ڕێگای ڕاست، لەسەر ئەم بارە ئەم ڕستەیە سەربەخۆ نیەو بەڵکو شوێن کەوتووە بۆ ڕستەی پێشوو و بریتی (بدل)ی ئەوە، ئەگونجێ ڕستەیەکی سەربەخۆ بێت و مەبەست پێی هەواڵدان و بێدار کردنەوەیە بە سوك و ئاسانی ڕێگەو بەرنامەکەی خوا تا ڕادەیە هەرکەس حەزی لێ بکات و**

بیەویٚ بە ئاسانی ئەتوانیٚ ئەو ڕێگـ.ـیە بداتە بەرو ئەو بەرنامەیە بگرێتە گەردن، چونکە ڕابەرو بەڵگەو نیشانەی ڕوون ئەوەندە زۆرو فراوان و ڕێك و ڕەوانە بە هیچ ڕەنگ هیچ بڕو بیانووی نەهێشتووەتەوە، بەتایبەتی بەو جۆرو ڕەوشتە شیرین و بەکارەی قورئان ئەیاندا بە گوێچکەداو ئاراستەیان ئەکات، کەواتە هەرکەس لەڕێگا ڕاستەکەی خوا لائەدا سوچ لە خۆیەتی و دەین و هەواڵی بە ملی خۆیەتی و هیچ کەس لێپرسراو نیەلێی لەو بارەیەوە ئینجا بۆ ئەمەی هیچ کەس لەخۆی نەگۆڕیٚ و خۆی بە ئازادو سەربەستی تەواو دانەنیٚ و لای وا نەبیٚ هەرگیز جیا ئەبێتەوەو ئەپچڕیٚ لە خواهیش و مەیلی خوا، بۆ ئەمەی هەموو کاروباری بگێڕێتەوە بۆلای خوایە کە هەموو شت ئەگێڕێتەوە بۆلای، بۆ ئەوەی بۆچوون و تێگەیشتنی بەندە ڕێك و ڕاست بکاتەوە، لەبەر ئەوە لەم جۆرە شوێنانەدا کە باسی دەسەڵات و خواهیشی بەندە ئەکات، بێداری ئەکاتەوە بەم جۆرە فەرموودەیە ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ ئێوە مەیل و ئارەزووی ڕێکی و ڕێك ڕاوەستان ناکەن، یا هەر لە بنەڕەتا مەیل و ئارەزووتان نابیٚ مەگەر خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیان بیەویٚ و مەیلی ئەوە بکات، واتە مەیل و خواهیشی ئێوە دروست کراوی خوایەو بەدەست ئەوە، کەواتە هەموو شتتان ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەو.

**وصلى الله على محمد نبي الرحمة وعلى آله وصحبه وسلم**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾

عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾

---

## سووره‌تی «الإنفطار»
## مه‌ككه‌ییه‌و (١٩) ئایه‌ته

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئه‌م سووره‌ته كورته‌ش باسی گۆڕان‌و وه‌رگه‌ڕانێ ئه‌كات كه ڕووئه‌كاته ئه‌م بوونه‌وه‌ره وه‌ك سووره‌تی پێشوو باسی كرد، به‌ڵام ئه‌م به‌جۆرو شێوه‌یه‌تر جیاواز له شێوه‌و شكڵی پێشوو، وه‌ك هه‌ر دوو مرۆڤه كه به‌شداری یه‌كترن له زۆر شتدا، به‌ڵام وێنه‌و شێوه‌و نیشانه‌یان جیاوازه ئه‌م سووره‌ته پێك هاتووه له چوار پارچه‌و به‌ش. به‌شی یه‌كه‌م باسی چوار ڕووداوی گه‌وره‌و سمناك ئه‌كات كه به‌دوای ئه‌وانه‌دا هه‌موو كه‌س تێ ئه‌گات له خۆی‌و چاره‌نووسی، كاتێ پرسیارو حیساب دێته پێشه‌وه. ئه‌م چوار ڕووداوه دووانی پێشوویان ئاسمانێ‌ودووانه‌كه‌ی تر زه‌مینێ، ئه‌فه‌رموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ﴾ كاتێ ئاسمان له‌ت ئه‌بێت.

باسی ئه‌م له‌ت بوونی ئاسمانه له‌چه‌ند سووره‌تی ترا كراوه‌و له‌هیچ كام دا مه‌به‌ست به‌و له‌ت بوونه ڕوون‌و دیاری نه‌كراوه، كه‌واته چاك وایه به‌سه‌ریا تێ‌په‌ڕ بكه‌ین به‌بێ دیاری كردنی بارو شێوه‌یه‌كی تایبه‌تی‌و دیاری. هه‌ر ئه‌وه‌نده به‌سه بۆ ئێمه كه له‌دڵمانا جێگیر ببێ شێوه‌ی گۆڕان‌و وه‌رگه‌ڕانێكی زۆر به‌هێزو به تین له‌م بوونه‌وه‌ره‌ی كه‌وا به به‌رچاومانه‌وه‌و بزانێ كه ئه‌م یاسا ناسراوو زانراوه نامێنێ‌و ئه‌وه‌ی كه خوا ئه‌م یاسای پێ‌ڕاگیر كردووه نایهێڵێ‌و ئه‌یپچڕێ، ئه‌وه بزانێ تا به‌هۆی ئه‌وه دڵ نه‌به‌ستێ ته‌نها به‌و په‌روه‌ردگاره‌وه نه‌بێ كه نه‌مان‌و گۆڕان ڕووی تێ‌ناكات.

﴿وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾ وه كاتێ كه ئه‌ستێره‌كان ئه‌كه‌ونه خواره‌وه‌و پرژو بڵاوئه‌بنه‌وه، له‌پاش ئه‌وه‌ی كه ڕاگیر بوون له شێون‌و جێگای خولگه‌ی تایبه‌تی خۆیاناو به‌بێ به‌رو دواو

زیادو کەم گەردش و خولانەوەی خۆیانیان ئەکرد، لەو ڕۆژەدا ئەو هۆی ڕاگیر کردن و پەیوەستیە نامێنێ، کەواتە گەردیان ئەچێ بەباو پرژو بڵاو ئەبنەوە لە بۆشایی فەزادا.

﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ وە کاتێ کە دەریاکان پڕ ئەکرێن، بەم ڕەنگە بەربەست نەهێڵراو سوێرو شیرین تێکەڵ کران تا تەڕو وشکی ڕووی زەویان داپۆشی، یا کاتێ ئاوی دەریاکان ئەقێنرانەوەو کرانەوە بەو دوو هەڵمو غازەی کەبە تێکەڵ کردنیان ئاو پەیدابوو یا زەڕەی ئەو غازو هەڵمە ئەقێنرانەوە، وەك لە سوورەتی پێشوویشان ئامارژەکان بۆ کرد ... یا بەهەر جۆرو شێوەیەتر کە بەدڵی ئادەمی دا نەهاتووە، بەهەر جۆرو بار ڕووداوێکی زۆر گەورەو سامناکەو دەروون ئەخاتە لەرزە.

﴿وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ﴾ وەکاتێ کە گۆڕەکان هەڵئەدرێنەوە بە جۆرێ دیوی ناویان ئەکەونە سەرو دیوی سەریان ئەکەونە ناو، ئیتر ئەوە بەهۆی ڕووداوەکانی پێشووبێت یا ئەمەیە ڕووداوێکی سەربەخۆبێت و لەو ڕۆژەدا پەیدا ئەبێ کەچەند ڕووداوی زۆرو زەبەندە ڕوو ئەدەن تیایا، لەسەر هەر بارو بەهەرکام مردووەکان لەو گۆڕانە دێنە دەرەوە بەزیندوویی وەك جاری جاران .

لەو ڕۆژەدا کە ئەم ڕووداوانە بەدی دێن ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾ هەموو کەس ئەزانێ بەهەر کردەوەیەك کەلە پێشەوە کردبێتی، وە بەهەر کردەوەیەك کەدوای خست و لە پاشا کردی، یا هەر کردەوەیە کە لەژیانی خۆی دا کردی و پێشی خست، وە هەر کردەوەیە کە بەرهەمی دواخستبێ بۆ پاش مردنی یا هەر کردەوەیە کە پێشی خست بۆ ژیانی جیهانی، وە هەر کردەوەیە کە دوای خستبێ بۆ زەخیرەو توێشووی ڕۆژی دوایی.

بەهەر حاڵ و بەهەر بار ئەم زانینە بە درێژی و بەوردی پەیدا ئەبێ لەو ڕۆژەدا کە ئەو ڕووداوە سامناکانەی تیا بەدی بێت، کە ئەو زانینەش خۆی یەکێکە لەو ڕووداوە سامناکانە کە دڵ ئەخەنە لەرزەو داچڵەکان!! لە پاش ئەم سەرەتایەکە ترسێنەرو بێدار کەرەوەی هەموو هەست و ژیری و دەروونێکی زیندوو، ئینجا دێتە سەربەش و پارچەی دووەم لەسوورەتەکە، کەسەر زەنشت و گلەیی ئاڕاستەی ئادەمی ئەکات بەجۆری بۆنی هەڕەشەشی لێ دێت، لەسەر ئەو بێ باکی و بێ هۆشیەی کە مرۆڤ هەیەتی بەرانبەر ئەو پەروەردگارەی کە ئەو هەموو چاکەو بەهرەیەی ڕشتووە بەسەریا...

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ٨﴾

جا قورئان دەستكاری یەكی دڵی ئەكات بەو سەرزەنشتو هەڕەشەیەو هێندی لەو چاكە و بەهرەیانەی بیر ئەخاتەوە ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ﴾ ئەی ئادەمی بانگی لێ ئەكات بە ئادەمێتی یەكەی كە بەرزترو بەرێزترین بەهرەیە كە خوا پێی داوەو بەوە جوێی كردۆتەوە لە هەموو گیان لەبەرانی تر و رێزی داوە بەسەریاناو بەسەر زۆر لەدروتكراوەكانی تریا، بەوە كردی بەجێنشین لە زەوی دا، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿مَا غَرَّكَ﴾ چی تۆی هەڵخەڵەتاندو فریبی داوی ﴿بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾ بە پەروەردگاری گەورەو میهرەبانت، بەم رەنگە هەڵناسی بە مافی بەندەیی خۆتو سسی ئەكەیت لە فەرمانی ئەو پەروەردگارەتان، سپڵەییو بێشەرمی بەكار ئەهێنی لەگەڵی، لەكاتێكا كەئەو میهرەبانەو خاوەنی چاكەو بەهرەیە بەسەرتەوە.

ئینجاهێندێ لەوچاكەوبەهرەیەباس ئەكات بەدرێژیو بەتایبەتی، كەبە كورتی گەیاندی و ئاماژەی بۆ كردن لەبانگ كردنی بەناوی ئادەمێتی یەوە. باسی دروست كردنی ئەكات بەم جۆرە رێكوپێكو شیرینە، لە كاتێكا ئەیتوانی بەهەر شێوەیەتر دروستی بكردایە، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَكَ﴾ ئەو پەروەردگارە گەورەو میهرەبانەت كە دروستی كردی لەنەبوون ﴿فَسَوَّىٰكَ﴾ ئینجاوەك دروستی كردی رێكی خستیت بەم رەنگە ئەندامەكانتی رێكو راستو ئامادەكراو كرد بۆهەموویێویستیتو شیاوو گونجاولەگەڵ هەركاروفەرمانێ كەبۆت دانراوە.

﴿فَعَدَلَكَ﴾ ئینجا وەك ئەوەی كرد ئەندامەكانتی یەكسانو هاوتا كردی، نەك دەستێ كورتو دەستێ درێژ، یا چاوێ پانو گەورەو چاوێ ترت بچوكو تەسك، یا بەشێكو پارچەیەكت لەسەر رەنگێو بەشەكانی ترت لەسەر رەنگێتر... بەڵكو بەم جۆرەی لێ كردی كە ئەفەرموێ: ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾[1] لەهەر وێنەو شێوەی نایاب كە خۆی ویستی تۆی داناو یەكی خستی. بەراستی هەر كەس هەستی لەكار نەكەوتبێ و بێداربێت ئەبێ بەم گلەییو سەرزەنشتە بیرێ بكاتەوەو شەرم بیگرێ، بەڵكو ئەبێ گیانی بكەوێتە لەرزەو

---

[1] ئەم ئایەتە بەچەند جۆرێكی تریش تەفسیر كراوەتەوە، ئەوانەش هەر باشنو ئەگونجێن.

موچڕکە بەلەشیابێت، ئەبێ بۆ وای لێ نەیەت کە پەروەردگار ئەو گلەیی و سەرزەنشتە گەورەیەی ئاڕاستە بکاتو ئەو هەموو چاکەیەی بیر بخاتەوە؟!

بەڕاستی دروست کردنی ئادەمی لەسەر ئەم شێوە شیرینو ڕێكو پێکە بەهرەیەکە شایستەیەبۆ ئەمەی بەقوڵی بیری لێ بکرێتەوە، مایەی سوپاسی دوورو درێژو خۆشەویستی بەتینە بۆ پەروەردگارو شەرمو تەریق بوونەوەی هەڵقوڵاو لە کانگای دڵەوە، ئەو پەروەردگارە میهرەبانە ئەیتوانیەکی بخستایە لە هەر وێنەو شێوەیەتر کە خۆی مەیلی ببوایە کەچی ئەم وێنەو شێوە نایابەی بۆ هەڵبژارد کە هەموو عەقڵێ تیایا سەرگەردانەو هیچ کەس ناگات بەباس کردنی نایابی ئەم ئادەمیەدا، بێگومان ئەو جوانیو شیرینیو ڕێكوپێکی یە دەر ئەکەوێ لە پێك لەشو ژیریو ڕۆحو گیانیا بە یەکجارو پێکەوە.

لەو بارەیەوە چەند پەراوی گرنگو گەورە دانراوە کەلە کۆنو لەتازەوە. ناگونجێ لەم جۆرە شوێنانەدا بەدوورو درێژی ئەو باسەبکرێ. بەڵام چاك وایە لەهەر شوێنێکا دەست نیشانو ئاماژەبکرێ بۆ هێندێ لەوانە ... کۆ ئەندامە گشتی یەکان بۆ پێك هاتنی لەشی ئادەمی: کۆئەندامی ئێسکی، دەماری، پێشتی، هەرسی (الهضمي)، خوێنی، هەناسەدان، توخمەیی (التناسلي)، ماسولکەیی، کۆئەندامی میز، چەشن ، بیستن، بینین، بۆن، لیمفی. هەر کام ئەندامە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم جیهانە کە مەردومی نەزان زۆر بە پەرۆشو سەرسووڕمانەوە سەرنجی ئەداتو بیری لێ ئەکاتەوەو کەچی خۆی لەبیرچووە کە لە هەموو شت نایاب ترە لە جیهان دا!!

(مجلة العلوم الإنكليزية) ئەڵێ: دەستی ئادەمی سەر دەستەی هەموو شتە نایابەکانی جیهانە، لەوانەیە بەهیچ ڕەنگ نەگونجێو دەست نەدا دروست کردنی شتێ ترە وەك دەستی ئادەمی وابێ لە سووكو ئاسانیو چەسپانیو دەسەڵات بەسەر ئەو هەموو کارو فەرمانە گرنگانەدا، هەر کات بتەوێ خوێندنەوەی کتێبێ بەدەست وەری ئەگری، ئینجا ڕاگیری ئەکەیت بەدەستت لەسەر بارێ کەرێكو گونجاو بێت بۆ تیا خوێندن کاتێ بتەوێ پەرەیەکی هەڵدەیتەوە پەنجەت ئەخەیتە کار بۆیو کەمێ زۆری لێ ئەکەیت لە ڕادەیەکا پێی هەڵگێڕیتەوەو بەدەستت پێنوسەکە ئەگریو ئەنووسی، هەر شتێکت پێویست بێت بەدەستت جێبەجێی ئەکەیت، قاپیو پەنجەرەی پێئەگریتو دای ئەخەیتو پێیانەوە ئەدەیت، هەروەها. هەر دوو دەست بیستو حەوت پارچەئێسکی تێدایەو هەرکام نۆزدە

ماسولکەی تێدایە[1]. بەشێ لەگوێچکەی ناوەڕاستی ئادەمی بریتی لە زنجیرەیە کە پێک هاتووە لە چوار هەزار کەوان (قوس) کە ئەو پەڕی ڕادە وردەکاری تیا کراوە، لە قەبارە و شێوەکانیانا. وا دەرئەکەوێ کەوانانە ئامادەکراون بۆ ئەمەی لەهەر لایە هەرجۆرە دەنگێ ببێ وەری ئەگرن و ئەیگوێزنەوە بۆ مێشك لەسەر بارو شێوەی خۆی[2].

مەڵبەندی هەستیاری بینین لە چاودا سەدو سی ملیۆن پێشوازخانەی ڕووناکی تیایە، پێڵوو برژانگ هەمیشە هەڵئەسن بە پارێزگاری لە تۆزو خۆڵ و هەموو شتێکی بێگانە کە لەوانەبێت بچێە ناو چاوەوە، هەروەها تیژی ڕووناکی ئەشکێنن بەهۆی سێبەر کردنیان بۆ چاوو لێ کەوتنی ڕووناکی یەکە لە یەکەم جارەوە لەئەوان، بێجگە لەوە بزوتنەوەیان بەرگری چاو ئەکات لە وشك بوونەوە، ئیتر با بوەستێ بوونی فرمێسك بەدەوری چاودا کە بەهێزترین پاکژکەرەوەیە بۆ چاو.

کۆئەندامی چەشتن لەئادەمیدا زمانە، کاروفەرمانی ئەگەڕێتەوە بۆچەندسێڵ و خانەیەکی چەشتن کەهەن لەگۆپکەکانی ڕووی سەرەوەی زماندا، بەسەرپەردە لینجەکەیەوە، ئەو گۆپکانەچەندشێوەیەکی جیاوازیان هەیەوپێك هاتوون لەچەند خانەیەکی درێژکۆڵەو کوڵکن.

لەو خانانەوە هەستە ڕیشاڵیەکان بەرەو مێشك دەکشێن و ئەو تامانەی کەوەری ئەگرن لە خواردەمەنیەوە ئەیدەن بەمێشك. ئەم کۆئەندامی چەشتنە لەیەکەم جاری دەم و زمانەوە دەست پێ دەکات، هەتا بگونجێ بۆ ئادەمی تف کردنەوەی هەرشتێ کەزیانی ببێ بۆی یا حەزی لێ نەکات و ئارەزووی نەکات، وە بەم کۆئەندامە ئادەمی هەست ئەکات بە هەموو جۆرە تامێ کەوەری ئەگرێ. زمان نۆ هەزار قۆقزی زۆر ووردی تیایە هەرکام لەوانە بەچەند دەمارێ پەیوەستە بە مێشکەوە. دەی ئەبێ ژمارەی ئەو دەمارانە چەندبن؟ و قەبارەیان چی بێ؟ وە چۆن بەتەنها ئیشێ ئەکەن. و هەموویشی کۆ ئەبنەوە لە مێشك داو پێکەوە هەست ئەکەن[3]. کۆئەندامی دەماریی کەبە تەواوی زاڵە بەسەر هەموو لەشدا، پێك دێت لەدەمارەکان کە وەك موو باریك و ووردن و بڵاوبوونەتەوە بە هەموو ناوچەو بەشەکانی لەشدا، و پەیوەستێ بەدەمارە گەورەکانەوە. ئەمانیش پەیوەستێ بە کۆئەندامی مەڵبەندیەوە، ئینجا هەر بەش و پارچەیەك لە لەش هەست بکات بەساردی یا گەرمی یا ئێش و ئازارێ، دەست بەجێ دەمارە

---

[1] پەرلوی –الله والعلم الحدیث– دانرلوی عبدالرزاق نوفل.

[2] العلم یدعو للإیمان.

[3] الله العلم الحدیث.

وورده‌كان ئه‌و هه‌سته ئه‌ده‌ن به هه‌موو مه‌ڵبه‌نده ده‌ماریه‌كان كه بڵاوبوونه‌ته‌وه به هه‌موو له‌شا، ئه‌مانیش ئه‌و هه‌سته ئه‌ده‌ن به‌مێشك، وه خێرایی ئه‌و بڵاوبوونه‌وه‌و گه‌یاندنه سه‌د مه‌تره له چركه‌یه‌كدا[1]!!

ئه‌گه‌ر ئاوڕێ بده‌ینه‌وه بۆلای هه‌رس (هضم) كه‌ئیش‌و كار كردنه له كاریگه‌ریه‌كی كیمیای داو بۆلای ئه‌و هه‌موو خۆراك‌و كه‌ره‌سه‌یه كه‌ئه‌یخۆین، به ڕاستی ئه‌زانین كه‌ئه‌و كارو كرده‌وه زۆر نایاب‌و سه‌رسوڕهێنه‌ره. كاتێ كه سه‌رنج ئه‌ده‌ین هه‌ر شتێك بخورێ گه‌ده هه‌رسی ئه‌كات‌و به‌جۆرێ ئه‌یكوڵێنێ بێ ئه‌وه‌ی زیان بكات به‌خۆی‌و خۆی هه‌رس بكات!!

له هه‌مه جۆرو بابه‌ت خۆراك تووڕئه‌ده‌ینه‌ناو ئه‌و كارگه‌یه، به‌بێ مه‌ترسی‌و به‌بێ چاودێری‌و گوێ پێدان به‌و كارگه‌یه، یا بیركردنه‌وه له چۆنێتی چاره سه‌ركردنی كیمیایی هه‌رسه‌كه بۆی! له‌و هه‌مووه تێكه‌ڵه‌یه گه‌ده ئه‌وشتانه هه‌ڵئه‌بژێرێ كه قازانجیان هه‌یه ئه‌وه‌ش به‌م شێوه‌یه هه‌موو جۆره خۆراكێ پاره‌پاره‌ئه‌كات‌و پاڵفته‌كه‌ی ئه‌گێڕێته‌وه بۆلای به‌شه كیمیاییه‌كانی‌و دووباره‌یان ئه‌كاته‌وه به چه‌ند پرۆتینێكی تازه كه‌ببێ به خۆراك كه بۆ هه‌موو سێڵ‌و خانه جیاوازه‌كانی، ئه‌و شتانه هه‌ڵئه‌بژێرێ كه كه‌ره‌سه‌ن بۆ هه‌رس، هه‌روه‌ها هه‌موو كه‌ره‌سه پێویسته‌كانی تریش، ئه‌یه‌وێ ئه‌و هه‌موو شته پێویستانه به‌هه‌میشه‌یی ئاماده‌بن له ئه‌ندازێكی ڕێك‌و پێكاو ئه‌وه‌ی پێویسته به‌كاری ئه‌هێنێ‌و ئه‌وه‌ی زیاد بێ ئه‌یهێڵێته‌وه له جێگای تایبه‌تی دا بۆ كاتی پێویست. ئینجا كاتێ ئه‌و خۆراكه به‌و جۆره ئاماده ئه‌كات بۆ خواره‌ده‌مه‌نی سێڵ‌و خانه‌كان، به‌بێ وه‌ستان‌و به هه‌میشه‌یی به‌شی هه‌موو سێڵ‌و خانه‌یه ئه‌نێرێ یه‌كه به‌یه‌كه، كه ژماره‌یان له‌چه‌ند هه‌زاران ملۆن تێپه‌ڕ ئه‌كات‌و زۆرترن له ژماره‌ی هه‌موو ئاده‌می له جیهانا، بۆ هه‌ر سێڵ‌و خانه‌یه به‌شی تایبه‌تی دیاری كراوی خۆی ئه‌نێرێ كه گه‌شه‌ی پێبكات‌و په‌ره‌ی پێبسێنێ.

بۆ وێنه: كه‌ره‌سه‌ی ئێسك ئه‌نێرێ بۆ خانه‌كانی ئێسك، و كه‌ره‌سه‌ی گۆشت ئه‌نێرێ بۆ خانه‌كانی گۆشت، و كه‌ره‌سه‌ی پێست ئه‌نێرێ بۆ خانه‌كانی پێست، هه‌روه‌ها كه‌ره‌سه‌ی نینۆك‌و دان‌و موو هه‌موو شته‌كانی تر!!

له‌م كارگه‌كیمیاویه گرنگه‌دا ئه‌و هه‌موو كاره گه‌وره‌و گرنگانه پێك دێن به بێ ئه‌مه‌ی هیچ ئاده‌می‌و گیان له‌به‌رێ به‌هیچ ڕه‌نگ ئاگا‌و ده‌سه‌ڵاتی ببێ له‌وانه‌دا. به‌رهه‌می ئه‌و كارگه‌یه زۆرترو گرنگ ترو نایاب تره له هه‌ركارگه‌یه‌تر له جیهانا كه له‌سه‌ر ده‌ستی ئاده‌میدا كرابێ!

---

[1] الله العلم الحديث.

یاسای ناردن‌و دابەش کردن لەو کارگەیەدا زۆر زۆر گەورەترو نایاب ترە لەهەر یاسایە تر بۆ ناردن‌و دابەش کردن لە جیهانا[1]. ئەمەی کە گوترا لەبارەی ئەم کۆئەندامانەوە بەشێکی زۆر کەمە لەوەی کە تا ئێستا ڕێی پێبراوە لەلایەن ئادەمیەوە، هەرچۆنێ باسی بەشێکی زۆر کەم لە کۆئەندامەکان کرا، وە ئەوانەی کە باس نەکراون وتراوەکان نموونەو وێنە بوون بۆیان، وە ئەو هەموو کۆئەندامانە کە چەندە نایاب‌و سەرسوڕهێنەرن گیان لەبەرانی تریش هاوبەشی ئادەمێن تیایاندا، ئەوەی کە مابێتەوەو تایبەتی بە ئادەمیەوەو مایەی ڕێزو جیابوونەوەیەتی، بریتیە لەهێزی ژیری‌و بیری‌و ڕۆحەکەی، کە لەم سورەتەدا ئاماژەی بۆکرد لە سەرەتای ئەم ئایەتەوە بەوەی بانگی لێکرد بە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ﴾ ئەی ئادەمی، کە یەکەم چاکەی خوا و جێگای منەت نانیەتی بەسەر ئادەمی یەوە. ئەم هێزی ژیرییە کە ئێمە نایزانێن چیەو چۆنە؟ وە هێزەکەش خۆی ناناسێ‌و نازانێ چۆن ئەزانێ‌و لە چ ڕێگایەکەوە شت ئەزانێ؟!!

ئەم زانراوانی ئێمەیە، باوا دابنێێن کە لەڕێگای دەمارە وردەکانەوە ئەگەن بەمێشك، بەڵام ئایا چۆن جێگایان ئەبێتەوەو مێشك لە کوێیان دائەنێ! چونکە ئەم مێشکە ئەگەر وەك شریتی تەسجیل بێت، ئەبێ لەماوەی شەست ساڵێکا -کە تەمەنێکی میانەیە بۆ ئادەمی- هەزارامەتر درێژایی بێت، ئەگینا جێگای ئەو هەموو وێنەو شێوە و دەنگ‌و ڕەنگ‌و وتە هەست‌و بیریی‌و زانینەی تیا نابێتەوە، تا لە پاشا یادی بکەونەوە، لەگەڵ ئەوەشا لەپاش دەیان ساڵ زۆر لەو شتانەی بیر ئەکەوێتەوەو ئەکەونەوە یادی!

ئینجائایا چۆن ئەو هەموو شتە جیاوازانە کە بەجیاو تاکە تاکە وەریگرتوون لە کات‌و ماوەی دوورو درێژا چۆن ئەو هەموو یەك ئەخات‌و کۆیان ئەکاتەوە، تالە هەموویانەوە ڕۆشنبیریەکی کۆکراوە فەراهەم دێت بۆ ئادەمی، ئینجا چۆن بەرز ئەبێتەوە لەو زانراوانەوە بۆ ڕادەو پلەی زانین‌و زانیاری؟ لەڕێی پێبراوەکانەوە ئەگاتە ڕادەی تێگەیشتن‌و ڕێ‌پێ‌بردن؟ و لە بەراووردکردنەوە ئەگاتە پلەی ناسین‌و بەراووردکردن؟ ئەم هێزی ژیریی‌و بیریە یەکێکە لە بەهرە تایبەتیەکانی ئادەمی کە جیاکەرەوەیەتی لە گیان لەبەرانی تر. لەگەڵ ئەوەدا گەورەترین بەهرەی نیەو بەرزترین جیاکەرەوەی نیە، بەڵکو بەهرەی هەرەگەورە ئەو تروسکە ڕووناکیەیە لەو ڕۆحەی کە تایبەتییەتی هەیە بە خواو جیاوازە لە دروستکراوەکانی تری.

---

[1] کتێبی: العلم يدعو للإيمان.

ئەو ڕۆحەی کە بەهرەو بەخششە گەورەکەی خوایە بۆ ئەم ئادەمی یە وە بەهۆی ئەوە بووە بە ئادەمی، وە بەو ناوە بانگی لێکرد، و ئەم گلەیی و سەرزەنشتەی ئاڕاستەکرد، ئەو گلەیی و سەرزەنشتەی کە بەڕاستی شەرمو خەجاڵەتی ئەهێنێ بەسەر مەردومدا، کاتێ کە بیر لەخۆی ئەکاتەوەو بیر بکاتەوە لە گەورەیی خواو ئەو هەموو چاکەو بەهرەی خوا بەسەریەوە.

ئینجا ئەو سەرزەنشتە سەختە دوایی پێ ئەهێنێ بە تێخوڕینێکی داچڵەکێنەر لەسەر ئەو خەڵەتاندن و فریو خواردنەیان، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ واز بێنن و بگەڕێنەوە لەوە، واتە چاکەو بەهرەی خوا ئەبوایە جڵەوڕاکێش و مایەی گوێڕایەڵی بوایە نەک هۆی یاخی بوون و سەرکێشی، کەواتە ئەوەی کە باوە لەناو نەفامو تاوانبارانا کە دڵخۆشی خۆیان ئەدەنەوە بەمەی ئەڵێن: مەترسەو باکت نەبێ خوا کەریمە، یا خوا چ پێویستی هەیە بە سزادانی ئێمە، ئەی ڕەحمەکەی لە کوێیە؟ ئەو جۆرە قسانە ناڕەوایەو ناگونجێ لەگەڵ ئەم ئایەتەدا، بەڵێ ئەبێ بەندە چاوەڕوان و بە ئومێدبێ بە میهرەبانی و لێبووردنی خوا، بەڵام نەک ئومێدو چاوەڕانیەک کە بێباکی لە خواو سەرکردنە تاوانی لەگەڵ بێت، چاوەڕانی وا سپڵەییەو تاوانەو پێویستە خۆپارێزی و تۆبەی لێ بکرێت، وەنابێ هیچ کەس هەڵخەڵەتێ بەقسەی شەیتانەکانی ئادەمی و (جن)ی. ئینجالەو مەبەستە ئەگوێزێتەوە بۆ باسی تاوانێکی گەورەتر کەسەرچاوەو کانی هەموو تاوان و خراپەیەکە، ئەو بێباکی و هەڵخەڵەتانەش هەر ئەگەڕێتەوە بۆئەم تاوانەگەورەیە کەبریتیەلە بڕوانەکردن بە ڕۆژی دوایی و حیساب و پرسیار، ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ﴾ واتە ئێوە ناگەڕێنەوەو کۆتایی ناهێنن و هیچ هۆی ئەو هەڵخەڵەتان و بێباکیەتان نیە، بەڵکوئێوە بڕواتان نیەبە ڕۆژی دوایی و پرسیارو پاداشت و تۆڵە، یا بڕواتان بە ئایینی ئیسلام نیە کەبەڵێن و هەڕەشەی تیایە بە زیندووکردنەوەو حیساب و پرسیار، وە ئەوانە بەدرۆ ئەزانن. بێگومان هەر دڵێکیش بەو جۆرە بێت ڕێگای ڕاست و چاکەو گوێڕایەڵی ناداتە بەرو دڵی ئەمرێ و دەروونی شەیدای ناوو غەرقی ڕیا و بێهۆش ئەبێ.

وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾
وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾

---

**ئێوە بڕواتان نیە بەو ڕۆژە ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ﴾ لە کاتێکا کەبەسەرتانەوە هەیە چەند فریشتەیەکی پارێزەر بۆ کردەوەکانتان لە زایەبوون و لەبیرچوون ﴿كِرَامًا﴾ پاك و بەڕێزن ﴿كَٰتِبِينَ﴾ نوسەرن بۆ هەموو کردەوەکانتان ﴿يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ ئەزانن و ئاگان بەهەرچی ئێوە ئەیکەن لەچاك و لە خراپ پێویستە لەسەر هەموو کەس کە بڕوای ببێ بەمەی کە هەموو کردەوەیەکی لەسەر ئەنوسرێ و هەڵئەگیرێ بۆ ئەو ڕۆژەی کە خوا بەڵێنی پێداوە، ئەو فریشتانە وەك ئەیان نووسن شایەتیشیان لەسەر ئەدەن تا هیچ کەس حاشای پێنەکرێ و هیچ بڕو بیانویەکی بەدەستەوە نەبێ، ئیتر ئێمە نازانین ئەو وەرگرتن و نوسینە چۆنە، ئەوەی کە پێویستە بۆ ئێمە ئەمەیە کەبزانین ئێمە بەرەڵا نەکراوین بەبێ لێپرسینەوە و هیچ کات ئێمە تەنها نابین و خۆمان بۆ ناشاردرێتەوە و هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵی بەرز و بەڕێزین، کەواتە ئەبێ شەرم بمان گرێ لەسەر کردەوەیەکی ناڕەوا و ناشایستە.**

**ئینجا چارەنوس و جێ و شوێنی خاوەن کردوەکان دیاری ئەکات لەپاش حیساب و پرسیار ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ﴾ بێگومان چاکان وچاك کردەوەکان لەناونازوڕێزوبەهرەمەندیدان ﴿وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ﴾ وە بێگومان بەدکردارەکان لەکە سنووری خوا دەرچوون لەجیهانا بەبێ گەڕانەوە لەناو دۆزەخان، بەجۆرێ ﴿يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾ ئەچنە ناو ئەو دۆزەخە لە ڕۆژی دوایی دا بەچوونێ کە گڕو گەرمیەکەی ئەچەژن ﴿وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ﴾ بێگومان ئەوانە دوورکەوتوو نابن لەو دۆزەخە واتە بەهەمیشەیی تیا ئەبن و نەلەیەکەم جارەوە خۆلادان و ڕاکردنیان ئەبێ لێی وە نەلە پاشا ڕزگاربوون و دەرچوون ئەبێ لێی. خوا پەنامان بدا زۆر پێویستە لەم جۆرە شوێنانەدا بوەستین و بەقوڵی بیربکەینەوە لە ئاگری دۆزەخ بەتایبەتی لە مانەوەی هەمیشەیی تیا، ئینجا لەبەرئەوەی بێبڕوایی بەو ڕۆژە مایەی ئەو ڕوو ڕەشی و بەد بەختیەیە نەفام و نەزانەکانیش بێبڕوان پێی، لەبەرئەوە ئەوانەگەڕێتەوەسەرباسی ئەوڕۆژە بۆ ڕوون کردنەوەی گەورەیی وگرنگی وسامناکی ئەوڕۆژە.**

وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ * ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ﴾ تۆ چووزانی چیە ڕۆژی پاداشتو تۆڵە؟ ئەم شێوە پرسیارە لە قورئانا هەیەو مەبەست دەرخستنی گەورەیی و سامناکی ئەو پرسیار لێ کراوەیە، واتە ئەوەندە گەورەو سامناکە لە سنووری تێگەیشتنو زانینی مەردوم بەدەرە، ئینجا بارو حاڵەتێ ئەهێنێ بەدوای ئەو شێوە پرسیارەداکەئەوگەورەیی وسامناکیەی پێ دەرئەکەوێ ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نیەو دەسەڵاتی هیچ شتێکی نیە بۆ هیچ کەسێك.**

**﴿وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ﴾ هەموو کارێ لەو ڕۆژەدا بۆ خوایەو تایبەتیە بەخواوە. بێگومان هەموو کارو بارێ لەهەردوو جیهانا بەدەست خوایەو هیچ کەس هیچی بەدەست نیە، بەڵام لەو ڕۆژەدا ئەو شتە ڕاستە ڕوونو ئاشکرا ئەبێت، کە لەجیهانا بێئاگاو هەڵخەڵەتاوەکان بێئاگان لێی و نایزانن، کاتێ ئەو ڕۆژە هات بۆ ئەوانیش دەرئەکەوێ ئەو شتە ڕاستە، خوا بەمیهرەبانی خۆی بمانپارێزێ لە خەڵەتانو بێباکی لەو ڕۆژە.**

**وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ﴿٣﴾
أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

## سوورەتی «المطففین»
## مەککەییەو (٣٦) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سوورەتە پێك هاتووە لە چوار بەش‌و پارچە:

یەکەمیان: ئەدوێ لەتەرازووبازان‌وهەڕەشەی سەختیان لێ ئەکات‌و بێئابڕوویان ئەکات.

بەشی دووەم: زۆر بەتوندو تیژی ئەدوێ لەوانەی کە یاخین‌و لەسنووری خوا دەرچوون.

بەشی سێیەم: ڕوو پەڕەی پاك‌و بەرزی چاکان‌و پاکان نیشان ئەدات.

بەشی چوارەم: باسی سزاو ئازارو بێشەرمی یەك ئەکات کەلە جیهانا دووچاری چاکان و خوا ناسان ئەکرا لەلایەن تاوانبارانەوە، ئینجا بەرانبەر بەوە باسی دوا ڕۆژو چارەنووسی هەر دوو تاقمەکە ئەکات.

ئەم سوورەتە بە شێوەی گشتی بەشێ لەبارو حاڵی ئەو گەل‌و کۆمەڵە دەرئەخات، کە ئەم بانگ کردن‌و بانگەوازەی خوای تیا بڵاو ئەکرایەوە، هەر چۆنێ بەشێ لەڕێگاو ڕەوشتی قورئان نیشان ئەدات سەبارەت بە بەرەنگاری‌و چارەسەر کردنی ئەو باوو کردەوە ناڕاستانەی کە ئەو گەلەیەیان پێ دەردەدار بوو.

ئینجابابەدڵ گوێ بگرین لەم سوورەتەپیرۆزە ئەومەبەستەگرنگانەمان بدابەگوێدا،لەیەکەم جارەوەجاڕی جەنگ کردن ئەدات لەگەڵ تەرازووبازەکانا ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ٱلَّذِينَ﴾ سزای بەتین‌وسەر شۆڕی هەیە بۆ تەرازووبازەکان لە ڕۆژی دواییدا. ڕواڵەتی ئایەتە کە دەست ئەدا بۆئەوەی بڕیارو هەواڵدان بێت یان نزای شەڕبێت لەلایەن

خواوه بۆ ئەو سیاچارانه كه مەبەست بە نزا لەلایەن خواوه بڕیارێكی تەواوەو دەست نادا بۆ گۆڕان!

ئەو تەرازووبازانە ئەمانەن كە ئەفەرموێ: ﴿إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ كاتێ كە پێوانە بكەن لەحاڵی مەردوم بۆ خۆیان ﴿يَسۡتَوۡفُونَ﴾ بەتێرو تەواوی ئەیكەن، بەڵكو بەزیادەشەوە وەك ووتەی ﴿عَلَى﴾ ئاماژەی بۆ ئەكات ﴿وَإِذَا كَالُوهُمۡ﴾ وە كاتێ پێوانەیان بۆ بكەن لەماڵی خۆیان ﴿أَو وَّزَنُوهُمۡ﴾ یا كێشانەیان بۆ بكەن ﴿يُخۡسِرُونَ﴾ كەمو كوڕی ئەكەنو زیانباریان ئەكەن لە پێوانەو كێشانەكەداو كەمتر لە مافی خۆیانیان پێ‌ئەدەن، ئیتر ئەوە بە شێوەی دزیو نهێنی بێ كە زۆرتر بەو جۆرە ئەیكەن یا بەئاشكراش بێت وەك باوبووەو هەر باویشە لەلایەن زۆردارو سامان زۆرەكان كەبەو جۆرە ڕەفتارئەكەن لەگەڵ ژێردەستەو زەبوونو ناچارەكانا، ئینجا بەبێزاری دەربڕینو سەرسوڕهێنانەوە ئەم شێوە پرسیارە ئەكات ئەفەرموێ: ﴿أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئایا ئەو مەن گۆڕ و ترازووبازانە گومان نابەن، ﴿أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ٤ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ كە بێ‌گومان ئەوانە زیندوو ئەكرێنەوە لە ڕۆژێكی گەورەو سامناكا ﴿يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ڕۆژێك كە ئادەمی بەتێكڕایی ئەوەستن لەبەر فەرمانی خواو لەبەردەم دادگای خوادا، واتە ئایا ئەوانە تائەو ڕادەیە نەفامو نەزانن لایان وایە ئەو ڕۆژە نایەو تۆڵەی ئەو تاوانەیان لێ ناسەنرێت؟

ئەم سوورەتە لای زۆربەو لەسەر ڕای بەهێز مەككەییە، مەبەستی سەرەكیو ئامانجی گرنگی سوورەتە مەككەییەكان داڕشتنو چاندنی بیرو باوەڕی ئیسلام و جێگیركردنی بنیاتی ئیسلامە لە دڵی مەردومدا، لەگەڵ پێكهێنانی هەستیارێكی خوو ڕەوشتی بە شێوەی گشتی وە پەیوەست كردنی ئەو هەستیارە بەو بیرو باوەڕو بنیاتەوە، بەڵام خەریك بوونو هەوڵدان بۆ مەسەلەیەكی دیاریو تایبەتی وەك ئەم مەسەلەی تەرازووبازیە ئەوە دواكەوت بۆ چەرخی مەدینەو پاش بەدیهاتنی دەوڵەتی ئیسلام كاتی دەست كرا بەڕێكخستنی ژیانی كۆمەڵایەتی بەپێی دەستوورو یاسای ئیسلامو لە ژێر سایەی ئیسلامدا. كەواتە هاتنە خوارەوەی ئەم مەسەلەیە لەم سوورەتەداو بە گرنگ گرتنی تا ئەو ڕادەیە دەروازەی مەبەستەكانی

سـوورەتەکەی پێکرایـەوە، بەڕاسـتی سـەرنج ڕائەکێـشێ و شـایانە بـەبیر لـێ کردنـەوەو بێداربوونەوە بۆی، بێگومان ئەمە چەند شتێ نیشان ئەدا:

یەکەم: ئەوە نیشان ئەدا کە ئیسلام لەناو گەلی مەککەدا دووچاری کردەوەو باوێکی زۆر خراپ بوو بوو، وە تووشی حاڵەتێکی سەخت بوو لەبارەی ئەم ترازووبازیەوە کە بوو بوو بەباو و گەورەو سەرۆکەکان کردبوویان بەکاری پیشە بۆ خۆیان لە کاتێکا کە سامان و دارایی لە دەست ئەوانا بوو، کاروانی بازرگانی لە هاوینا بۆ شام و لە زستانا بۆ یەمەن ئەوان هەڵئەسان پێی، کەواتە بە ئارەزووی خۆیان ئەوە کردەوەیان بوو، هەژار و بێدەستەکانیش ناچاربوون ملیان شۆڕ ئەکرد بۆیان، وەك ئێستەش کە ئەوە باوە بە شێوەیەکی زۆر ناڕەوا لەلایەن دەوڵەتە گەورەکانەوەو لە بازاڕە ڕەشەکانی جیهانا.

دووەم: هەر لەیەکەم جار و لەسەرەتاوە سروشتی ئەم ئایینە تازەیە دەرئەخات و ڕوونی ئەکاتەوە کە بەرنامەی ژیانی گشتیەو هەموو کاروباری ئەگرێتەوە، وە ژیان ڕاگیرئەکات و دائەمەزرێنێ لەسەر بنەڕەتی خوو ڕەوشت ئەوەتا لەو کاتەشا کەجڵەوی ژیانی کۆمەڵایەتی لەدەستا نەبوو وە لەچەند بار و ڕوویەکەوە لە تەنگ و چەڵەمەدا بوو، لەو کاتەشا خۆی پێنەگیراو بێدەنگ نەبوو لەو جەور و ستەم و بەد خوورییەو بەو جۆرە بەهێز و بەتینە دژی وەستا و جاڕی دوژمنایەتی و جەنگینی دا لەگەڵ ئەو ستەمکار و بەد خوانەدا!!

لەکاتێکا کەئەوانە بەتەواوی زاڵبوون بەسەر هەموو بیروباوەڕ و کاروباری ئەو گەل و کۆمەڵە بێدەست و بەشخوراوانەدا، ئەمانە خۆیان جووڵەو چرکەیان پێ نەئەکرا بەرانبەر ئەو زۆردارانە، کەواتەئیسلام ووریاکەرەوەی گەلەوراپەڕێنەریەتی نەك بێهۆشخەر و دەستگربێت بەسەر دەمیا وەك هێندێ لە نەفام و درۆ و دەلەسە چیەکان پڕوپاگەندەیان بەوە کرد!!

ئینجا لەمانەوە دەرئەکەوێ کە هۆی بەهێز و پاڵپێوەنەری بەتین بۆ بەکارهێنانی ئەو دووژمنایەتیە سەختەو ئەو هەڵوێستە ناڕەوایە لەلایەن ئەو سەرۆك و دەسەڵاتدارانەوە، ئەمە بوو کە باش تێگەیشتبوون لە سروشتی ئەم ئایینەو ئەیانزانی کە ئەدا بەسەر دەستیانا، وەئەدا لەو هەموو بەرژەوەندیە ناڕەوایانەیان تەنها بەوە ڕازی نابێ لێیان شایەتمانێکی

دەمی بهێنن و نوێژێ بکەن و خۆیان ناوبنێن موسڵمان، تێگەیشتبوون کەئەم ئایینە تازەیە ئەیەوێ تاقانەبێت و دان نانێ بەهیچ بیرو باوەڕێ و بەهیچ یاسا و دەستوورێ لەلایەن خۆیەوە نەهاتبێ، وە تێکەڵ نابێ لەگەڵ هەرشتێ کەلە ئاسمانەوە نەهاتبێ، وە هەرگیز دەست هەڵناگرێ لە هیچ شتێکی خۆیی و هەنگاوێ نایەتە پێشەوە بۆئەوەی لەناوەڕاستی ڕێگادا بگات بەشتێکی تر کەلەئاسمانەوە نەهاتبێ و لەگەڵی یەك کەوێ، جا لەبەرئەوە کەوتنە جەنگ لەگەڵ ئەم ئایینەدا بە هەموو هێزو ئاگرەکەیان تاودا لە پێش کۆچکردن و لەپاش کۆچکردن تا خوا لەناوی بردن وە ئەوانەی کەلە هەموو چەرخ و چینێکا دژی ئەم ئایینە وەستاون و ئەوەستن و ئەیانەوێ ئەم ئایینە زاڵ نەبێ بەسەر ژیانا، ئەوانە بەباشی تێگەیشتوون و چاك ئەزانن کەئەم ئایینە بەو جۆرەیە کە باسکرا، کەواتە ئەزانن کە ئیسلام هات جڵەوگیریان ئەکات لە جەورو داگیرکردن و دەست درێژی، ئەوانیش ناتوانن بەبێ ئەو تاوانانە بژین و دەستیان پێ هەڵناگیرێ لەبەرژەوەندی ناڕەوای خۆیان کەئەبێ شەڕی سەروماڵی بکەن لەگەڵیان!

هەرکەس تێگەیشتبێ لە ئیسلام ئەزانێ کەکاتی بەڕاستی ئیسلامی گرتە گەردن ئەبێ ڕاپەڕێ و بکەوێتە بەربەرەکانێ و تێکۆشان، ئەبێ خۆی ئامادەبکات بۆ چەشتنی هەموو تاڵی و سوێریەك و کوشتن و بڕین و ماڵ و سامان بنێتە ئەو لایەوە، نابێ ئێمە تەماشای حاڵی خۆمان و موسڵمانی ئەمڕۆ بکەین، بەڕاستی شتێکی ئاشکرایە کە ئەم ئیسلامەتی ئێمەیەئەوەنیە کەخوا داوای ئەکات، ئیسلامەتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوڕێکانی بگرێتە بەرو بەموو لانەدرێ لە ڕێگا ڕاستەکەی ئەوان، هەرکاتیش ئەوە کرا وەستان نابێ و ئەبێ تێکۆشانی هەمیشەیی ببێ تا سەرو ماڵ لەپێناوی ئیسلاما ئەڕوات یا خوا سەریان ئەخات وەك ئەوانی سەرخست. ئەو تاقمە مەدینەییەی کە چوون بۆ مەککەو پەیمانیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) چاك تێگەیشتن و بەپێی ئەوە پەیمانیان دا، وەکو (ئیبن ئیسحاق) ئەگێڕێتەوە لە (عاصمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادە) وە کە ئەو تاقمە کاتێ کۆبوونەوە بۆ پەیمانی دووەمی (عەقەبە) لە پێش کۆچکردندا.

(عەباسی کوڕی عبادەی ئەنصاری) ووتی: ئایا ئێوە ئەزانن لەسەرچی پەیمان ئەدەن بەم پیاوە؟ ئەوانیش ووتیا: بەڵێ. ئینجا ئەویش ووتی: بێگومان ئێوە پەیمانی پێئەدەن لەسەر جەنگ کردنی ئادەمی بەسوورو ڕەشیەوە، جا ئەگەر ئەزانن کاتێ ماڵتان تیاچوو، پیاوماقوڵتان کوژرا وازی لێ ئەهێنن‌و پەیمانەکەتان نابەنەسەر ئەوە هەر لە ئێستەوە وازی لێ بێنن‌و پەیمانی مەدەنێ چونکە سوێند بەخوا ئەگەر وابکەن ئەوە بێئابڕووییە لەجیهان‌و ڕۆژی دوایی دا، وە ئەگەر ئەزانن پەیمانەکەتان ئەبەنە سەر با ماڵتان تیاچێ‌و پیاوتان بکوژرێ ئەوا پەیمان بدەن، چونکە سوێند بەخوا ئەوە چاکە بۆتان لە جیهان‌و ڕۆژی دوایی دا، ئەوانیش ووتیان ئێمە پەیمان ئەدەین لەسەر ئەوە، ئینجا وتیان دەست بێنەو ئەویش دەستی هێناو پەیمانیان دایە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئینجا جڵەوگیریان ئەکات لەو ترازووبازیە و بێباکیان لە ڕۆژی دوایی‌و تێیان ئەخوڕێ ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ واز بهێنن‌و بگەڕێنەوە لە تەرازووبازی‌و بێئاگایی لە ڕۆژی دوایی‌و لێپرسینەوەی ئەو ڕۆژە، چونکە ﴿إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ﴾ بەڕاستی نامەی بێبڕواو بەد کارەکان ﴿لَفِي سِجِّينٖ﴾ لەناو دەفتەرێکی گشتیدایە کەئامادەکراوە بۆ تیانوسینی کردەوەی خراپی بێبڕوایانی ئادەمی‌و (جن)ـی، کە ناوی ﴿سِجِّينٖ﴾ ـە، وە بێگومان هەرکەس ناوو کردەوەی لەو دەفتەرە ڕەشەدا بنوسرێ ئەو کەسە بێبەشە لە بەزەیی‌و میهرەبانی خوا واتە کۆتایی بێنن لەو تەرازووبازی‌و بێئاگاییە، ئەگینا ئەخرێنە ڕیزی ئەمانەو لەو دەفتەرەدا ناوو کردەوەتان ئەنوسرێ، خوا پەنامان بدات لەو بەدبەختیە بەڕاستی هەرەشەیەکی ئیجگار سامناک‌و دڵتەزێنە.

ئینجا سامناکتری ئەکات بەم شێوە پرسیارە کەلە قورئانا باوە بەکارهێنانی بۆ ئەو مەبەستە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ﴾ ئایا چی تۆی زاناو ئاشنا کردووە کە ﴿سِجِّينٞ﴾ چیە؟ واتە نازانی چیەو لەوانە نیە زانینت پیا بگات،

كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾
إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾

---

﴿كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ﴾ (سجّين) دەفتەرێكی نوسراوی ڕوونی بڕیار لەسەر دراوە، بەبێ زیادكردن‌و كەم كردن یا دەفتەرێكی دیاری كراوی نیشانە كراوە بۆ تۆڵەو سزا[1]، ئەو نامەو دەفتەرە هەڵئەگیرێن تا لەو ڕۆژە گەورەیەدا ئەخرێتە بەر چاوو بە پێی ئەوانە تۆڵەو سزا ئەبێت.

ئینجا كە ئەوەش بوو ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ سزای سەخت لەوڕۆژەدا بۆ درۆزنە بێبڕواكانە. ئینجا بێبڕواكان دیاری ئەكات‌و نیشانەی بێبڕوایی ڕوون ئەكاتەوەو، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ كەسانێكن كە بڕوایان نیە بە ڕۆژی تۆڵەو پاداشت كە ڕۆژی دواییە ﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ وە هیچ كەس بێبڕوا نیە بەو ڕۆژە و بە درۆی نازانێ مەگەر هەموو دەست درێژی كەرێكی لەسنوور دەرچوو كە سەری كردبێتە گوناهو خراپەكاریو خوی پێوەگرتبێ.

بێگومان هەركەس بڕوای ببێ بەو ڕۆژەو ترسی تۆڵەو سزای ئەو ڕۆژەی لە دڵابێت كۆسپەی لێ ئەكەوێ‌و ناتوانێ بێباك جڵەوی نەفسی بەرەڵابكات بۆ تاوان‌و خراپە، وە سەركردنە تاوان‌و گوناهو خو گرتن پێیەوە نیشانەی بێبڕواییەو جڵەوكێشە بۆ بڕوانەكردن بەو ڕۆژەو بە قورئان‌و بێشەرمیو دەم درێژی دەربارەی ئایەتەكانی وەكو ئەفەرموێ: ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا﴾ كاتێك كە ئایەتەكانی ئێمە بخوێندرێتەوە بەسەریا كە پەندو ئامۆژگاریان تیایەو ترساندن بە سزاو بەسەرهاتی گەلە بێبڕواكانی ڕابردوو، كاتێ ئەو ئایەتانە بخوێنرێتەوە بەسەریا، لەبەر نەفامیو نەزانی دەربارەی ئەو ئایەتانە ﴿قَالَ﴾ ئەڵێت: ئەمانە ﴿أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ داستان‌و ئەفسانەی پڕوپوچی پێشووەكانەو نوسراونەتەوە ئەو نەفامە بێشەرمانە ئەو دەم درێژیە ئەكات‌و خوای گەورەش دەم كوتی ئەكات‌و بەدرۆی ئەخاتەوە،

---

[1] لە تركیبو تەفسیری ئەم سێ ئایەتەدا چەند جۆری وتراوە هەموو ئەگونجێن، وە هەروەها لە سێ ئایەتی داهاتووی تاقمی چاكانیشدا.

كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُو الْجَحِيمِ
﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا
عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ نەخێر وانیە، بەڵێ ئاشكرایە وەك ڕۆژی ڕووناك كە ئایەتەكانی خوا ڕاستو ڕەوانن وە ئەو نەفامانە درۆئەكەنو سەریان لەبەرد ئەدەن، ئایەتەكانی خوا ئەوانەن كە ئەخوێنرێنەوە بەسەر بوونەوەرداو ئەخوێن بەمل هەموو كەساو بەر ئەبڕنەوە لە هەموو كەس وە هەموو كەس لە حاستیان داماوو دەستەپاچەن، ئایەتەكانی خوا گەورەترین ڕابەرو ڕێگە نیشاندەرن و وەك ڕۆژی ڕووناك ئەدرەوشێنەوە، ئەو نەفامانە كە نایان بینن وەك شەمشەمە كوێرە وان كە خۆر نابینن، لەم ئایەتانەدا هیچ شتێ نیە كە هۆی دەم درێژیو بێبڕوایی ئەوانەبێت وە هیچ سوچو ڕەخنەیە لەمانا نیە ﴿بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ بەڵكو سواری دڵی ئەوان بووە ئەو كردەوە خراپانەی كە كردوویانەو وەك پەردەی ڕەش كشاون بەسەر دڵەكانیانا، بەهۆی ئەوە هەست ناكەن بەڕاستیو دروستی ئەو ئایەتە ڕوونانە، بەڵێ هەر دڵێ سەری كردە گوناهو تاوان كوێرئەبێو سۆمای لێ ئەبرێو تاریك ئەبێو هەستی كزئەبێ بەرەبەرە هەتا بەتەواوی ئەمرێ. (ئیبن جریر)و (تیرمزی)و (نەسائی)و (ئیبن ماجە) حەدیس ئەهێنن لە (ئەبو هورەیرە)وە ووتەی (نەسائی) بەم جۆرەیە: بەندە كاتێ گوناهێك بكات خاڵێكی ڕەش لەدڵیا پەیدا ئەبێ ئینجا ئەگەر وازی هێناو داوای لێبووردنی كردو تۆبەی كرد دڵی سافو پاك ئەبێتەوە. بەڵام ئەگەر گوناهی زیادكرد خاڵەكەی زیاد ئەكات هەتا زاڵ ئەبێ بەسەر دڵیا، وە ئەوە مەبەستە كە خوا ئەفەرمووێ: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ وە (حەسەنی بەصری) –خوا لێی ڕازی بێ– ئەفەرموێ: گوناه لەسەر گوناهە هەتا دڵ كوێرئەكاتو ئەمرێ ئەوە بارو حاڵی ئەو بەد كارە بێبڕوایانەیەو هۆی بەد كاریو بێبڕوایەكەیانە ئینجا باسی هێندێ لە چارەنوسو دواڕۆژیان ئەكات لەو ڕۆژە گەورەیەدا كەڕێكو هاوتای هۆی بەدكاریو بێبڕوایەكەیان بێت، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ باكردەوەیە نەكەن كەببێتە پەردەی ڕەش بەسەر دڵیانەوە ﴿إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە لەو ڕۆژەدا بێبەشن لە دیتنی خوا كەئەو دیتنە خۆشترو بەرزترین بەهرەكانی خوایە لە ڕۆژی دوایی دا،

ئەوانە لە جیهانا گوناهو تاوان‌و یاخی بوونیان بووبە پەردە بەسەر دڵیانەوە وە بەرگری کردن لە هەست کردن بە خوا و یادی خوا و دڵی کوێرکردن هەتا ڕەشی‌و تاریکی بەسەراهات. کەواتە تۆڵەی ڕێك‌و پێك ئەمەیە کە بێبەش بکرێن لەو ڕۆژەدا لە سەرنجدان‌و دیتنی خوای پەروەردگاریان، پەردە دابدرێتەوە لەبەینی ئەوان‌و گەیشتن بەو بەختەوەری‌و کامەرانیە، بەڕاستی ئەو بێبەشیە سزایەکە لەسەری هەموو سزایەکەوە وە بێبەشیەکە لە ژوور هەموو بێبەشیەکەوە، دواڕۆژو دابڕانێکە کەلەولایەوە بەد بەختی تر نیە، ئەم ئادەمیە بەڕێزە ڕێزو ئادەمیەتیەکەی بەوەبوو کە پەیوەست بێت بە پەروەردگاریەوە، دەی کاتی خۆی لەوە بپچڕێ ڕێزو ئادەمێتیەکەی نامێنێ‌و لە گشت گیانلەبەرێ بەدتر و پەستترەو شایستەی ئەوەیە بکرێ بەسووتەمەنی دۆزەخ وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ﴾ لەپاش ئەو نائومێدی‌و بێبەشیە ئینجا ئەچنە ناو دۆزەخ.

﴿ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ لەپاش چوونە دۆزەخ ئینجا بۆ سزادانی دەروونیان بە تەشەرەوە پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو سزایەیە کەلە جیهانا بڕواتان پێی نەبوو بەدرۆتان ئەزانی.... ئای چەندە سزایەکی سەختە تەشەردان لەهەرکەس کە دووچاری سزاو ناخۆشیەك ببێ بەتایبەتی تەشەردان لێی بەکردەوەی خۆی کە بووبێ بەهۆی سزاو ناخۆشیەکەی!!

ئینجا لاپەڕەیەتر ئەخاتە بەرچاو، لاپەڕەی چاکان، ئەوەش بەپێی باوی قورئان کە زۆرتر ئەو دوو لاپەڕە ئەهێنێ بەدوای یەکا بۆئەوەی بەرانبەرکێ پێك بێت لەبەینی دوو حاڵەت‌و دوو تاقم‌و دوو دواڕۆژو چارەنوس دا، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ بەڕاستی نامەی کردەوەی چاکان لەناو دەفتەرێکی گشتی دایە کە ئامادەکراوە بۆ تیانوسینی کردەوەی چاکی چاکان لە ئادەمی‌و (جن)ی‌و فریشتە، کە ناوبراوەبە ﴿عِلِّيِّينَ﴾ هەرکەس ناوو کردەوەی لەو دەفتەرەدابێ بێگومان ئەو کەسە ڕزگار ئەبێ لە سزاو ئەگات بەنازو ڕێزو میهرەبانی خوا هەتا هەتایە.

ووتەی ﴿عِلِّيِّينَ﴾ بەرزی‌و بڵندی نیشان ئەدات لەمەوەوەرئەگیرێ کەئەبێ ووتەی ﴿سِجِّينٍ﴾ پەستی‌و نزمی بگەیەنێ ئینجا بۆئەوەی بەرزی‌و گرنگی ئەو دەفتەرە ڕوون تر بکاتەوە ئەم شێوەپرسیارەناڕاستەئەکات، ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ﴾تۆچووزانی ﴿عِلِّيِّينَ﴾چیە؟ واتەئەوەندە گرنگە لەسنووری زانینی تۆدانیە!

كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴿٢٠﴾ يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعۡرِفُ
فِي وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ
ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾

---

**﴿كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ﴾ ئەودەفتەرەنوسراوێكی نیشانەكراوە بەنیشانەی پاداشتو میهرەبانی خوا، یا نوسراوێكی ڕوونی بڕیار لەسەر دراوە، هەركام مەبەست بێت ئەو دەفتەرە شتێكی بەڕێزو پایە بەرزە ﴿يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ كە فریشتە نزیكەكانی بارەگای خوا ئامادەنو تەماشای ئەكەن، ئینجاباسی ئەونازوبەهرەیە ئەكات كە ئەو چاكانە دەست كەوتیان ئەبێ لەو ڕۆژە گەورەیەدا.**

**ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ بەڕاسـتی ئـەو چـاكانە وان لـەنازو خۆشـیو بـەهرەدا ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ لـەكاتێكا بەسـەر تـەختی ڕازاوەوە سـەرنج ئـەدەنو تەماشـای ئـەو هـەموو شـتی جـۆر بـەجۆری كـەس نـەدیوە ئەكـەن كـە خـوای میهرەبـان پـێی داون لەبەهەشـتا، خۆشـی بەهرەمەندی ئەوانە لەڕادەیەكایە كاتێ سـەرنجیان بـدەی ﴿تَعۡرِفُ فِي وُجُوهِهِمۡ﴾ ئـەبینیو ئـەناسی لە ڕووخسارییانا ﴿نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ﴾ پاراویو شیرینی خۆشیو خۆش گوزەرانی ﴿يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ﴾ دەرخواردیـان ئـەدرێ لەشـەرابی خـاوێنی سـەربەمۆر، كە﴿خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞۚ﴾ دواییەكـەی بۆنی میسك ئـەدات، نـەك وەك شـەرابی دنیا كە بۆگـەنی نـاخۆش ئەداتـەوە، یا لـەناو پیاڵـەو پەرداخێكان كە بەمیسك سەرچەسپو مۆركراون، لەباتی تەپەدۆرو سەرقاپی تر كەلە دنیادا بـاوە، بەهـەرجۆرو بەهـەر حـاڵ ئـەم وەصـفو باسـانە بـۆ نزیـك خستنەوەیە لـە بۆچـوونو تێگەیشتنی ئێمە، ئەگینا ئەو نازو نیعمەتو ئـەو شتانەی كە خوا لەبەهەشتا ئـەی بەخشێ بەبەنـدە خـوا پێداوەكـانی ئـەو شـتانە وێنـەی ئەمانـە نیێ كەلـە دنیادا ئـەیان بەخشێ مەگـەر تەنها لەناوەكانیانا وێنەو هاوبەشین!!**

**ئینجاپێش ئەوەی باسەكەتەواوبكات ئەم تێهەڵكێشە ئـەكات: ﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ﴾ باهەر لەبەر ئەو نازو خۆشیو میهرەبانیە بەربەرەكانیو دەست پێشكەری بكەن ئەوانەی كە**

بەربەرەکانی کەرو دەست پێشکەرانن. بەڕاستی تێهەڵکێشەکە زۆر بەرزو بەنرخە، پەندو ئامۆژگاریەکی گەورەی تێدایە، هەر دڵێ مردو نەبێ بەم تێهەڵکێشە چەند شتێکی زۆر گەورەو ڕاستی بیرئەکەوێتەوە:

١- دەست پێشکەری و بەبەرەکانی بۆ ڕۆژی دوایی هەر بەبیرو باوەڕی پاك و کردەوەی چاك ئەکرێ، کەئەوەش سوودو قازانجی گشتی تێدایەو مایەی یەکێتی و برایەتی و خۆشەویستی و ئاوەدانیە لەناو گەلدا بەپێچەوانەی بەربەرەکانی و دەست پێشخەری بۆ دنیا کەئەبێ زۆرتر بەدزی و دەست درێژی و ناپاکی و زیان گەیاندن و داگیرکردنی مافی یەکتر ئەبێ، وەسەرەنجامی دووبەرەکی و دوژمنایەتی و بێئارامی و تێکچوونی وڵاتە.

٢- دەست پێشکەری و بەربەرەکانی بۆ ڕۆژی دوایی بەرگری ناکات و دژی هەوڵ و تێکۆشان نیە بۆ ژیانی دنیا، بەڵکو بێگومان هەر هەوڵ و تێکۆشانێ بکرێ بە شێوەیەکی شەرعی و بەپێی بەرنامەی خوا لە ئایینی ئیسلاما بەشێکە لە هەوڵ و تێکۆشان بۆ ڕۆژی دوایی کەواتە هەوڵ و دەست پێشکەری بۆ ڕۆژی دوایی هاندەرو پاڵپێوەنەرە بۆ هەوڵ و تێکۆشانی ژیانی دنیا، بەڵام بە پێچەوانەی هەوڵ و دەست پێشکەری بۆ ژیانی دنیا کە زۆرتر بەرگری کەرو دژو نەگونجاوە لەگەڵ هەوڵ و کۆشش بۆ ڕۆژی دوایی.

٣- بەربەرەکانی و تێکۆشان بۆ ڕۆژی دوایی بەرهەم و دەستکەوتی نەبڕاوەو دوانەهاتووەو بەنرخە بەلای خواوە بە پێچەوانەی بەرو بەرهەمی تێکۆشان بۆ ژیانی جیهان کە هەرچەندە زۆرو گەورەو فراوان بێت دوابڕاوو دواهاتوو بێنرخە بەلای خواوە، هەموو دنیا لای خوا هاوتای باڵی مێشوولەیە نیە وەك لە حەدیسا ئەفەرموێ!

٤- بەربەرەکانی دەست پێشکەری بۆڕۆژی دوایی هەست وڕۆحی مەردومی پێ بەرز ئەبێتەوە، بەڵام بەپێچەوانە لەم بارەوە هەتا تێکۆشان بەهێز و بەتین تربێت هەست و ڕۆح پەستترو نزمتر ئەکاتەوە.

زۆر سەیرە، ئاشکرایە کە ئیسلام بەم جۆرو شێوەیە کە ئەو چەند نموونەیەی باسکرا، وەئاشکرایە کە ئیسلام ئادەمی داناوە بە جێنشین لەم زەویەداو ئەیەوێ جڵەو کلیلی ژیان و جیهانی لەدەست دابێت بەگوێرەی بەرنامەی خوا، وەداوائەکات لە ئادەمی کە ئەوەستێ و وڵات ئاوەدان و پاك و تەمیزبکاتەوەو ژیان بەرزبکاتەوەو هەوڵ و تێکۆشان بکات بۆ بەکارهێنانی ئەو هێزو ووزەیە کە خوا بوونەوەرەدا بۆی داناوەو بۆ بەرژەوەندی ئەم دروستی کردووە، لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی موسڵمانانیش ـ چ جای خەڵکی تر ـ بە پێچەوانەو دژی ئەم بارە ڕاستەو ئەم حەقیقەتە چووەتە دڵیانەوە، بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمان و داخ و مەراقە!

بەبۆنەی ئەو تێهەڵکێشەوە ئەم چەند خاڵ و مەبەستەمان خستە بەرچاو، ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکەو لە پێشەوە باسی شەرابەکە دوایی بێنین، بەپێی باوی جیهان ئەو شەرابەی کە ئەخۆنەوە ئاوی تێکەڵ ئەکەن جا ئەم شەرابەی کە لەم ئایەتەدا باسی ئەکات هەرچۆنێ خۆی جیاوازە لە شەرابی ئەم جیهانەو لەناوەکەدا هاوبەشن، هەروەها ئەو ئاوەشی کە تێکەڵی شەرابەکەی ئەکرێ جۆرە ئاوێکی تایبەتی و وێنەی ئەم ئاوی ئێرە نیە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ﴾ ئەوەی کە تێکەڵی ئەکرێ لەسەرچاوەیەکە کە ناوبراوە بە ﴿تَسۡنِيمٍ﴾جا چ سەرچاوەیە! ﴿عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ سەرچاوەیەك کە بەندە نزیك خراوەکان لێی ئەخۆنەوە، ئەو بەندەیانەی کە بەرزترین تاقم و کۆمەڵن و لە سوورەتی (الواقعە)دا ناوی بردن بە ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ﴾ پێشکەوتووە پێشکەوتووەکان کە بریتین لە پێغەمبەران ــ سەلامی خوایان لێبێ ـ یا ئەوان و(صدیقین)ەکان....

ئەو سەرچاوە بەرزو بڵندە لەو شتانەن کە هیچ کەس لەم جیهانەدا نازانێ ڕادەو پلەی بەرزیان و ئامادەکراوە بۆ ئەو خاوەنە تایبەتیانە، وەك (ئیبن عەباس) ئەفەرموێ: ئەو خاوەنە تایبەتیانە لە ئاوی ئەو سەرچاوەیە ئەخۆنەوە بەپووتی و بێ تێکەڵ کردن، بەڵام بۆ بەهەشتیەکانی تر تێکەڵ ئەکرێ، خوا بە میهرەبانی خۆی بێبەشمان نەکات، لەپێشەوە باسی خراپ و بەد کردارانی کرد لەگەڵ تۆڵەیان بەکوورتی، لە پاشا باسی چاکانی هێنا بەدوایانا و ئەندازێ درێژەیدا بە پاداشتی بەرزو بەرێزیان، ئینجا کۆتایی باس و سوورەتەکە ئەهێنێ بەباسی بەشێك لەو ئازارو لاقرتی و دەم درێژیەی کە دووچاری چاکان ئەبوو لەلایەن بەد کرداو تاوانبارەکانەوە لە جیهانا تا لە ئەنجامی ئەوەدا خوا کارێکی وا ئەکات چاکان لەو نازو نیعمەت و جێگای بەهرەمەندی خۆیاندا لاقرتی ئەکەن بەو تاوانبارانە، بەپێی باوی خۆی قورئان باسەکە بە شێوەیە ئەکات وەك ئێستا ڕۆژی دوایی هاتبێت و بەسەرهات ڕووداوەکە لەوێ ئەگێڕێتەوە بۆ مەردوم، لەکاتێکا کە چاکان وان لە خۆشی و شادی خۆیانا و بەدکارەکانیش وان لەناو سزاو ئازاری خۆیان و بەدەردی خۆیانا ئەتلێنەوەو بەداخی سەختەوە سەرنجی چاکان ئەدەن، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بەدکردارو تاوان باربوون ﴿كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ﴾ کاتی خۆی لەجیهانا پێئەکەنین بەوانەی کە بڕوایان هێنابوو، وەلاقرتیان پێئەکردن و بەبێ نرخیان دائەنان لەبەر هەژاری و بێ نەواییان یا لەبەر لاوازی و بێدەسەڵاتیان لەوەی بەرگری ئازارو دەست درێژی بکەن لە خۆیان یا لەبەرئەوەی خۆیان بە سەنگی و سەلارەو قورس ئەگرت لەوەی کاری نەفامانە بکەن... هەرکام لەوانە مایەی پێکەنین و لاقرتی پێکردنیانە لەلایەن ئەو تاوانبارو یاخیانەی کە خۆ بە زل زان و لەخۆ گۆڕاو بوون، ئەو ستەمکارانە ئەوەی لەدەستیان بهاتایە بەکاریان ئەهێنا بۆ ئازاردانی ئەو بڕوادارانەو لەگەڵ ئەوەشا پێئەکەنین پێیان وە ئەوانیش بە خۆگری و ڕەوشتی شیرینی خۆیانەوە بەرانبەریان ئەوەستا.

وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓاْ
إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُواْ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ
﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾

---

**﴿وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ﴾ وەکاتێ بڕوادارەکان ڕابووردنایە بەلای تاوانبارەکانا، تاوانبارەکان لەناو خۆیانا تەشەرو توانجیان ئاڕاستە ئەکردن بەچاوو برۆ لیّ داگرتن، یا بەدەست، یا بەهەر جۆری تر کە باوبووە لەناویانا بۆ گاڵتە پیّکردن، ئەوەش بەنیازی دڵشکاندن و تەریقکردنەوەیان، ئەو بەد بەختانە ئەو دەست درێژیو کارە بەدانەیان ئەکردو بەو جۆرو شێوە ناڕەوایە تێر پێئەکەنین و لاقرتیان ئەکرد بەبێ سەرلێکردنەوەو پەشیمانی بەڵکو کەشخەو شانازیان پێوەئەکرد وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ﴾ وە کاتێ ئەگەڕانەوە لە کۆڕو مەجلیسیان بۆ ناو ماڵو منداڵیان و لیّ ئەبوونەوە لە ڕابواردن و ئەو کارە بەدانە ﴿ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ﴾ ئەگەڕانەوەبەخۆشی وگاڵتەو پێکەنینەوە، ئەوەش ئەو پەڕی ناپیاویو پەستیو دڵ ودەروون مردووییە.﴿وَإِذَا رَأَوْهُمْ﴾ وەکاتێ بڕوادارەکانیان بدیتایەلەهەر شوێنێکا ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەیان ووت ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ﴾ بەڕاستی ئەوانە گومڕان و سەرلیّ تێکچوون چونکە لەڕێگاو ئایینی باوباپیریان لایان داوە. بەڕاستی شتێکی زۆر سەیرەو زۆر جێگای سەرسوڕمانە کە گومڕاو بەد کردارو تاوانباری وەك ئەوانە بڵێن بەو بڕوادارە چاك کردارو شیرین ڕەوشتانە: ئەمانە گومڕان!!**

**ئەو ئایەتانە هەرچەند هاتوونەتە خوارەوە دەربارەی سەرۆکە یاخیەکانی قورەیش، کەئەوە کردەوەیان بوو دەربارەی ئەو تاقمە موسڵمانەی کە پێشکەوتن لە ئیسلام داو بەڕاستی ڕێبازی پێغەمبەریان (ﷺ) دایە بەر بەتایبەتی دەربارەی ئەو تاقمە موسڵمانە ڕەش و ڕووتە بێ کەسەی وەك (بیلال)و (یاسر)و (عمار)و (صهیب)و وێنەیان، ئەم ئایەتانە هەرچەند دەربارەی ئەو دوو تاقمە ئەهاتنە خوارەوە، بەڵام لەهەموو چەرخ و چینێکا وێنە ئەم دوو تاقمە هەر بووەو هەر هەیشەو هەر ئەشبێت بەخۆیان و کردەوەکانیانەوە، ئەو قسە ناڕاست و ناڕەوایە کەیەکەم تاقم ووتیان دەربارەی ئەو بڕوادارانە وە هەروەها هەموو جێ نشینەکانیان لە هەموو چەرخێکا کە ئەیڵێن دەربارەی ئەو بڕوادارانە وە هەروەها هەموو**

جێنشینەکانیان لە هەموو چەرخێکا کە ئەیڵێن دەربارەی بڕواداراني چەرخی خۆیان... ئەو قسە ناڕاستو نارەوایە ئەوەندە بێنرخو بێجێیە شایستەی لێ کۆڵینەوە نیەو ئەو نرخەی نیەکەپێویست بکات بەڕوونکردنەوەی ناڕاستیەکەی بەڵکوئەم لاقرتیە نابڕوبەرو دڵتەزێنەیان بەسەکەفەرمووی ﴿وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ﴾ ئەوبێبڕوا تاوانبارانە رەوانە نەکراون بۆسەر باوەڕدارەکان بەچاودێرو ئامۆژگاری کەرانی ئەوان واتەمافی قسەکردنوچەنەبازیان نیە.

بەو گاڵتە پێکردنو لاقرتیە سەختە باسی ئەو کردەوە خراپانەی ئەم جیهانەیانی دوایی پێهێناو ئەو لاپەڕەی هەڵدانەوەو لاپەڕەیەتری ئەو جیهانی بڕوادارەکانو ئەوان ئەخاتە بەرچاو، بەڵام بەجۆرو شێوەیە وەك ئێرەو ئێستا ئەو شوێنو کاتەی ئەو ڕۆژە بێت ئەفەرموێ: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئینجا ئەوانەی کە بڕوایان هێنابوو ئەمڕۆ ﴿مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ﴾ بەوبێبڕوایانەپێئەکەنن لەکاتێکا ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ وان بەسەرتەختی ڕازاوەو بەشادمانیەوە ئەڕوانن و سەرنج ئەدەن، سەرنجی خۆیان ئەدەن بەو هەموو بەهرەمەندی و ئاوات بەدی هاتوویە و سەرنجی دوژمنەکانیان ئەدەن بەو نائومێدیو بەش بڕاویو ڕیسواییو ئەو هەمووجۆرە سزایە کە دابارێوە بەسەریانا، خوا پەنامان بدات لێی ئینجا گاڵتەو لاقرتیەتریان پێئەکات بۆ سزادانی دەروونی ئەوانو زیادە شادمانی بڕوادارەکان، ئەوەش بەمەی کە تۆڵەو سزاکەیان بە (ثواب) دانەوە ناو ئەبات کە زۆرتر بۆ خۆشیو چاکە بەکار ئەهێنرێ، وەك بەلاقرتیەوە ئەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ موژدەیان بدەرێ بەسزایەکی سەخت، ئەفەرموێ: ﴿هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ ئایا بێبڕواکان پاداشت درانەوە لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی کە ئەیان کرد دەربارەی بڕواداران واتە وەك خوا بفەرمووێ بە بڕوادارەکان ئایا پاداشتی ئەوانمان دایەوە لەسەر کردەوە خراپەکانیان کە هێندێکیان لاقرتی کرنو پێکەنین بوو بەئێوە؟ هەرچۆنێ پاداشتی ئێوەمان دایەوە لەسەر کردەوە چاکەکانتانو کارێکی وامان کرد ئێوە لاقرتیو پێکەنینێك ئەکەن بەوان؟ واتە بەڵێ بەڕاستی تۆڵەی ڕاستو ڕەوای خۆیان لێ سەندرا.

لێرەدا پێویستە بوەستینو ئەندازێ بیربکەینەوە لەو تاقمە کەمو بێدەسەڵاتەی کەلەو کاتەدا چۆن پێگیرابوون بەدەست ئەو کۆمەڵە زۆرو بەدەسەڵاتەی کە دوژمنایەتیدا گەیشتبوونە ئەوپەڕی ڕادەو پلەو بەهەر جۆر لەدەستیان بهاتایە ئازارو سزای ئەو تاقمە بێدەسەڵاتە زەبوونەیان ئەدا ئینجا بەرانبەر ئەو هەموو دەست درێژیو جەورو ستەمە هەر

دڵنەوایی و دڵخۆشکردن و بوو بەوەی بەهەشت بۆ بڕواداران و دۆزەخ بۆ بێبڕواکان، بێگومان خوا خوایەو ئەیزانێ کە ئەم تاقمە کەمە بەگیرهاتووە پەرە پێئەدات و زاڵیان ئەکات و دوژمنەکانیان لە ڕیشە ئەهێنێ بەو جۆرو شێوەیەی کە پاشا بەدی هات و بینرا لەگەڵ ئەوەدا لەو هەموو چەرخی مەککەدا دڵخۆشی نەکردن بەو موژدە گەورەیە بەڵکو هەموو بەڵێن و موژدەیە هەر بەهەشت بوو، بەهەشت و بەس. وەك پێغەمبەریش (ﷺ) لەشەوی پەیمانی (عقبە) دا هەر بەڵێنی بە بەهەشت داو ئیتر بەس، هۆی ئەوەش ئەمەبوو کە قورئان ئەیویست چەند دڵی پەروەردەبکات بەجۆرێ هەموو نیازو مەبەستێکی تەنها خوا بێت و گەیشتن بەڕەزامەندی خوا، چەند دڵێ پاڵفتەکراوبن و لە هەموو تاقیکردنەوەیەکا دەرچووبن، چەند دڵێ کەبەهێزو خۆگرو دامەزراوو نەگۆڕاوبن تا بەهۆی ئەوە بتوانێ دەست لە هەموو شتێ هەڵگرن لەبەر خواو لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا، شایان بن بۆ هەڵگرتنی گەورەترین سپاردەی خوا، دەی بێگومان ئەو دڵانەو خاوەنی ئەو دڵانە ئەبێ پەروەردە بکرێن و پێبگەیەنرێن لەسەر ئەو بارو شێوەی کە ئەو تاقمە کەمەی پێ پەروەردەکراو پێگەیەنراو ئەبێ ئەو ڕێگایە بدەنە بەر کەئەوان دایانە بەرو گوزەریان کرد پیایا.

ئینجا پاش ئەوەی ئەم تاقمە بەڕێزە پێگەیشت و لە هەموو تاقیکردنەوەیەکا دەرچوون، ئەوەش بەوە تەواوبوو کە کۆچکرا بۆ مەدینە کاتێ پێگەیشتن خوا زانی ڕۆشتن و نیازو مەبەستیان تەنها خوایە، ئەو حەلە موژدەی سەرکەوتنی پێدان و ئینجا زاڵی کردن و سەری خستن و جڵەوی هەموو کاروباری دانە دەست. ئەو بەسەرهاتی ئەوانە دەرسێکە بۆ هەموو تاقم و کۆمەڵەکانی پاش خۆیان تا دنیا دنیایە، وە ئەو ڕێگا ڕاستە کە خوا ئەیەوێ ڕێگاکەی ئەوانە، داواکارین خوا بمان خاتە سەر ئەو ڕێگا ڕاستە.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وكل تابع لهم باحسان الى يوم الدين

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٢﴾

## سووەرتی «الإنشقاق»
## مەککەییەو (٢٥) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە دەست پێئەکات بە هێندێ لەو بەسەرهات و گۆڕانە گەورەیانەی کە ڕوو ئەکەنە ئەم بوونەوەرە لەو جۆرە بەسەرهات و گۆڕانەی کە بە فراوانی باس کران لە سوورەتی (التكوير)دا، ئینجا لە سوورەتی (الانفطار)دا، وە لە پێشەوە هەر لەم جزمەدا ئەو باسەی کرد لە یەکەم سوورەتیا، بەڵام باسەکەی ئێرە شێوەیەکی تایبەتی هەیە شێوەی مل کەچی و زەبوونی بۆ خوا، ملکەچی و زەبوونی ئاسمان و زەوی بە ئارەزوو و خۆش و ئاسانی.

ئەم سەرەتاو دەست پێکردنە پێشڕەو و پێشەکیە بۆقسەکردن لەگەڵ ئادەمی داو جێگیرکردنی ترسی خوا لە دڵیا.

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾ کاتێ کە ئاسمان لەت ئەبێ، وەك لە سوورەتی (الانفطار)دا وتمان: مەبەست بە لەت بوونی ئاسمان دیاری نەکراوە کەواتە بەسەریا تێپەڕ بکەین چاکە بەبێ دیاری کردن، تەنها ئەوەمان بەسە کە گۆڕانێکی زۆر گەورەو گرنگ دێت بەسەر بوونەوەردا، ئەوەی کەواتە خوا ئەم بوونەوەرەی پێ ڕاگیر کردووە نایهێڵێ و ئەیپچڕێ، کەواتە با تەنها بە خواوە دڵ ببەستین کە نەمان و گۆڕان ڕووی تێناکات، ئینجا بە تێهەڵکێش لێرەو لەداهاتوودا ڕستەیە ئەهێنێ بۆ دڵنیا کردن لەسەر بەدی هاتنی ڕووداوەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾ وە ئاسمان گوێی گرت لە پەروەردگاری و مل کەچ بوو بۆی، وە شایستە کراوە بۆ ئەو گوێگرتن و مل کەچیە، واتە لەلایەن ئاسمانەوە هیچ شتێ نەبووە کە یاخی بوون و سەرپێچی تێدا بێت بۆ خواهیش و مەیلی خوا،

وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٥﴾

﴿وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ﴾ وه كاتێ زەوی تەخت ئەكرێ بە نەهێشتنی كێوەكانیو هەموو بەرزیو نزمیەكانی، یا ڕائەكێشرێو پانترو فراوان تر ئەكرێ ﴿وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا﴾ وە هەرچی وا لەناو سكیا لە مردووانو هەر شتێكی تر تووڕی ئەداتە دەرەوە ﴿وَتَخَلَّتْ﴾ وە بە باشی خۆی خاڵی ئەكاتەوە ﴿وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا﴾ وە زەوی گوێی گرتووە لە پەروەردگاری خۆیو مل كەچیەتی بۆ هەموو خواستو فەرمانێكی ﴿وَحُقَّتْ﴾ وە شایستە كراوە بۆ ئەو گوێڕایەڵیو مل كەچیە.

دیمەنو ڕواڵەتی ئەم ئایەتانە وا نیشان ئەدەن كە ئاسمان و زەوی زیندووەو گوێگرو گوێڕایەڵن بەبێ ملپێچیو گیرو گرفت، وەك لە چەند شوێنی تریشا ئەوە گەیەنراوەو نیشان دراوە، ئیتر ئایا بە مەبەست بەو جۆرە تەعبیرانە گەیاندنی ئەو پەڕی ژێر باریی ئەمانەیە بۆ خواهیشو دەسەڵاتی خواو بێسنووری دەسەلاتو توانای خوایە، یا هەر لە ڕووی ڕاستیدا گیانو هەستێكی تایبەتی خۆیان هەیەو پەروەردگاری خۆیان ئەناسنو ملكەچن بۆی، بێگومان وەك لە چەند شوێنێكا وتمان ئەم بارو ڕای دووەمە ڕاست ترەو نزیك ترەو هیچ پێویست نیە لەم دیمەنو ڕواڵەتانە لابدەین بەبێ ڕابەرو بەڵگەیەكی شەرعی، لادانەكە هەر لەبەر ئەوەیشە كە دوورە لە باوو تێگەیشتنی ناتەواوو كەمو كوڕی ئێمەوە بێگومان ئەو دووریەش هیچ هۆو بەڵگەیە نیە بۆ ئەو لادانە، چونكە چەند هێزو ووزەی شاراوە بوو لەم بوونەوەرەدا كە لە ڕێگای زانیاریەوە خوا ئاشنای كردبێ پێیانو چەندی تریش هەن كە هەموو ئەوانە لە باوو تێگەیشتنی ئێمە بەدەرنو بە دڵی هیچ كەسیشدا گوزەریان نەئەكرد.

خوای گەورە وەڵامی ووشەی (إذا)ی نەدایەوە و نەیفەرموو كاتێ ئەوانە بەدی دێن چی ڕوودەدات، بەڵكو لێی بێدەنگ بوو، لەبەر ئەوەی لە سوورەتی(التكویر)و (الانفطار)دا وەڵامی دایەوە بە ڕستەی ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ﴾، ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾ وەك تێپەڕیان كرد، وێنەی هەركام لەوانە بەسەو دەست ئەدا بۆ ئێرەش یا لەبەر ئەوەی دڵی گوێگر بڕواو هەر شتێكی ڕێكو گونجاوی بۆ دەركەوت بیكات بە وەڵام لێرەدا، وەك خاوەنی (كشاف) ئەفەرموێ: یا لەبەر ئەوە وەڵامەكە ئەمەیە: هەموو كەس ئەگات بە بەرهەمو سەرەنجامی كردەوەی خۆی،

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾

**وەك وەرئەگێڕێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ﴾ ئەی ئادەمی ﴿إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا﴾ بە ڕاستی تۆ تێکۆشەریت و وای لە ئەرك و مەینەتی کرداری چاك یا خراپدا تا ئەگەیتە لای پەروەردگارت بە مردنت، واتە تا ئەو ڕۆژەی ئەمریت و بە حوزوری خوا ئەگەیت هەر خەریکیت بە خەریك بوونێ کە کارت تێئەکات و پێتەوە دیارە ﴿فَمُلَٰقِيهِ﴾ ئینجا ئەگەیت بە بڕیاری پەروەردگارت و تۆڵەو پاداشتێ کە ئەو بڕیاری لەسەر داوە، یا ئەگەیت بە بەرهەم و تۆڵەو پاداشتی تێکۆشان و کردەوەکەت.**

**بەڕاستی لەم کاتەدا کە گوێڕایەڵی و ملکەچی ئاسمان و زەوی خستە بەرچاو، ئەم بانگ کردنە زۆر بەجێیەو زۆر بەنرخە بۆ بێدار کردنەوەی، وەك بفەرموێ: ئەی ئادەمیەك کە پەروەردگارت بە ئادەمی دروستی کردی و بەوە جیای کردیتەوە لەناو ئەم بوونەوەرە فراوانەدا، ژیری و بیری و ئەو ڕۆحە تایبەتیەی پێبەخشیت، ئەی ئادەمی تۆ شایستە تری بۆ گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ پەروەردگارت، تۆ شایان تری بە پەرستنی ئەو خوایەی تۆی ئاوا جیا کردەوە، ماف و بەهرەو چاکەی ئەو بەسەرتەوە زۆر ترو بەتین ترە.**

**ئەی ئادەمی تۆ کۆچ و کاروانی ژیانت لەم سەر زەویەدا دوایی پێئەهێنی و ئەو ڕێگا سەختە ئەبڕیو بەو ئەك و زەحمەتەی کە دووچاری ئەبی، گەڕانەوەو دواڕۆژت بۆلای پەروەردگارتەو هەموو کاروباری ژیانت لەم جیهان و زەویەدا بە زەحمەت و ناڕەحەتی ئەڕواو ئەگوزەرێ، ئەگەر بە لەش و بە ئادەمی تۆ کۆچەریت لەم سەر زەوییەو ئەو ڕێگا سەختە ئەبڕی بەو ئەرکە دووچاری ئەبی و گەڕانەوەی ڕۆژت بۆلای پەروەردگارتەو هەموو کردەوەیەکت دەچێتە بەردەستی، ئەو کاتە هەموو کاروباری ژیانت لەم جیهان و زەوییەدا بە زەحمەت و ناڕەحەتی ئەڕواو ئەگوزەرێ، ئەگەر بە لەش و کردەوەی لەش ئەرك و ماندوویت ئەبێ، بێگومان هەست و بیرت هەمیشە لە ئەرك و زەحمەتدایە، کەواتە دەسەڵات دارو بێدەسەڵات وا لە مەینەت و ناڕەحەتیدا، ئیتر با جۆری ئەرك و مەینەتەکە جیاواز بێت، ئینجا**

دواڕۆژ هەر بۆلای خوایە کەواتە با ئاگات لە خۆت بێت بەڵکو لەوێ بکەویتە ڕەحەتی، ئەی ئادەمی لێرە هەموو لە ناڕەحەتیدایەو هیچ کەس نیە لە هەموو بارێکەوە لە خۆشیدا بێت، بەڵام لەوێ مەردوم دوو بەشە: بەشێکی لە سزاو ناڕەحەتی وەهادایە کە هەموو سزای دنیا چاو نادا لە حاستی ئەو، وە هەموو خۆشییەکی ئەم جیهانی لەبیر ئەباتەوە، بەشێکی تری لەپاش چوونی بۆ بەهەشت لە خۆشی و شادیو شادومانیەکی وەهادایە کە هەموو خۆشی و شادمانی ئەم جیهانە چاو نادا لە حاستی ئەو، وە هەموو سزاو مەینەتی ئەم جیهانە ئەم جیهانی لەبیر ئەباتەوە. ئەی ئادەمی کەواتە کارێکی وا بکە لەم جیهانە کە خوا لەوێ بتخاتە ئەو خۆشیە نەبڕاوەو دوورت خاتەوە لە سزاو ناڕەحەتیەکەی ئەوێ.

ئینجا ڕۆژو چارەنووسی تێکۆشەرەکان ڕوون ئەکاتەوە کاتێ کە ئەگەنە حوزوری پەروەردگاریان وتێمان ئەگەیەنێ کەئادەمی لەدووبەشن،ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾ ئینجا هەرکەسێك نامەی کردەوەی بدرێ بەدەستی ڕاستیەوە ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾ ئەوە ئەوسا پرسینەوەی لەگەڵ ئەکرێ بە پرسینەوەیەکی سووكو ئاسانو بێ لێکۆڵینەوەو توندو تیژی، وەك دایکی ئیمانداران (عائیشە) -خوا لێی ڕازی بێ-ئەفەرموێ: ئاشنا ئەکرێ بە گوناهەکانی و لە پاشا چاوپۆشیی لێ ئەکرێ، ﴿وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا﴾ ئەگەڕێتەوە بۆلای حەڵاڵو هاوسەرو کەسو کاری لە بەهەشتا بە کەیفو خۆشییەوە ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ﴾ وە هەرکەسێ نامەی کردەوەی پێبدرێ لە پشتیەوە، واتە بدرێ بە دەستی چەپی و لە پشتیەوە وەری ئەگرێ چونکە دەستی ڕاستی زنجیر کراوە بە ملیەوەو دەستی چەپی براوەتەوە بۆ پشتی و بەسراوەتەوەو بەوە وەری ئەگرێیا وەك لە حەدیسێکا هاتووە کە دەستی چەپی ئەکرێ بە سنگیاو تا لە پشتیەوە دەرئەچێو بەو شێوەیە بە دەستی چەپی وەری ئەگرێ، کەواتە بە هەرکام هەر بە دەستی چەپ وەری ئەگرێو ئەم ئایەتی ئێرەیە دژی ئایەتی سورەتی (الحاقە)نیە کەوا نیشان ئەدات بە دەستی چەپ وەری ئەگرێ، وە جیاوازی ئێرە لەگەڵ ئەوێ ئەمەیە: لەوێ بە کورتی فەرموویەتی بە دەستی چەپ وەری ئەگرێ، وە لێرە شێوەو چۆنێتیەکەی باس کردووە زیاد لەوێ، بەوەش دژایەتی ڕوو نادات.

﴿فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ١١ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ١٢ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ١٣ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ١٤ بَلَىٰٓۚ إِنَّ
رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ١٥ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ١٦ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ١٧ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ١٨﴾

**ئەو کەسەی کە نامەی پێئەدرێ بەو شێوەیە ﴿فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا﴾ ئەو کەسە ئەوسا هاوار ئەکات‌و داوای مردن‌و لەناوچوون ئەکات، چونکە مردنەکەی زۆر خۆشە لەچاو ئەو سزایەی کە هەر ساتێکی مەرگێکی سەختە، ئای هاوار بۆ سزایەك کە ئاواتی مردنی بۆ بخوازرێ‌و هیچ پەناوەۆی ڕزگارییەك شك نەبابێجگە لەمردن!! خوا بەبەزەیی‌و میهرەبانی خۆی پەنامان بدات‌و دووچاری ئەومان نەکات. ﴿وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا﴾ وە ئەچێتە ناو ئاگرێکی هەڵگیرساوی بەتین، لەم شوێنەو لە هەموو شوێنەکانی تری وێنەی وا دەرئەکەوێ کە ئەوانەی نامەیان ئەدرێ بە دەستی ڕاستیانەوە بڕوادارە لە خوا ترسەکانن، وە ئەوانەی کە ئەدرێ بە دەستی چەپیانەوە بێبڕواو لە خوا نەترسەکانن، کەواتە ئەبێ بڕواداری گوناهبار چۆن بن‌و نامەیان چۆن پێئەدرێ؟ هێندێ ئەفەرموون بەدەستی ڕاستیانەوە ئەدرێ پاش سزادان، وە هێندێ تر ئەفەرموون بە دەستی چەپیانەوە ئەدرێ، هێندێ تر لەسەر ئەوەن کە بێدەنگە لەمانەو باسی ئەمانەی نەکردووە، بەڕاستی ڕای یەکەم‌و دووەم زۆر بێهێزو لاوازن‌و لەگەڵ دیمەن‌و ڕواڵەتی ئایەتەکانا یەك ناکەون، بەڵام ڕای سێیەم ڕێکەو وەك خاوەنی تەفسیری (بحر) ئەفەرموێ: ڕێکەو نابێ لێی درێ، بە ڕاستی چاکی فەرمووەو ئەبێ هەر ئەم ڕایە وەرگیرێ، بەڵکو ئەگەر ئێمە چاوێ بگێڕین بەناو هەموو قورئانا بۆمان دەرئەکەوێ کە هەموو مژدەو بەڵێنەکانی قورئان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو لە خوا ترسانەو هەموو هەڕەشەکانی هەر بۆ بێبڕواو لەخوا نەترسەکانەو ئیتر بێدەنگە لە بڕواداری گوناهکار، ئەمانە نە ئەوەندە چاکن شایانی مژدە پێدان بن، وە نە ئەوەندە خراپن هەڕەشەیان لێ بکرێ.**

**ئینجا بەرانبەر ئەو بەسەرهات‌و سزا سەختەی کە باسی کردبوو بۆ ئەو عاقیبەت شەڕەی کە لە پشتیەوە نامەی کردەوەی پێئەدرێ، بەرانبەر ئەوە باسی حاڵەتی ڕابردووی ئەکات لە جیهانا کە سەری لەو ڕۆژە سەختەوە دەرکرد، باسەکە بە جۆرو شێوەیە ئەکات وەك جیهان‌و ژیانی جیهان تێپەڕیان کردبێ‌و ئێستا ئێمە لە ڕۆژی دوایی دا بین‌و باسەکەمان بۆ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسە ﴿كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا﴾ لە جیهانا لەناو ماڵ‌و منداڵ‌و کەس و کاریا کەیف خۆش‌و شادومان بوو، چاوی هەر بڕیبووە ئەو ژیانەو هیچ بیری نەئەکردەوە**

لە دواڕۆژو ژیانی تر، ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾ چونکە بەڕاستی لای وابوو کە هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆلای خواو پاش مردن زیندوو ناکرێتەوە، کەواتە هیچ حیسابێکی بۆ ڕۆژی دوایی نەکردو هیچ توێشوویەکی بۆ هەڵنەگرت.

ئینجا بەرپەرچی ئەداتەوەو بە هەڵەی دەرئەکات لە گومانەکەیا، ئەفەرموێ: ﴿بَلَىٰٓ﴾ نەخێر وا نیە کە ئەو گومانی برد، بەڵکو زیندوو ئەکرێتەوە، چونکە ﴿إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا﴾ بێگومان پەروەردگاری ئەو بینا بووە بە ئەوو هەمیشە بینایە پێی‌و ئاگادارە بە هەموو کردەوەکانی‌و هیچ شتێکی لێ وون نابێ، کەواتە بەپێی کاردروستی خۆی پێویستە بیگێڕێتەوەو بەپێی لێزانی خۆی‌و کردەوەی ئەو ڕەفتاری لەگەڵ بکات.

لەپاش ئەو گەردشە گەورەو بەکارەی کە کردی بە دڵو دەروون، ئینجا هەمی تر ئاوڕ ئەداتەوە بە دڵو ئەیگێڕێتەوە بۆلای ئەم بوونەوەرەی کە مەردوم ئەژی تیایا، لە کاتێکا بێئاگا ئەبێ لەو تەگبیرو ڕێکخستنەی کە بەکارهێنراوە لەم بوونەوەرەو هەرچی وا لەم بوونەوەرەدا، کە بەشێ لەوانە ئەو هەموو بەسەرهاتانەیە کە دێت بەسەر بەندەکانی خوادا، ئەفەرموێ: ﴿فَلَآ﴾ چەند جارێ لەمەو پێش ووتمان کە ئەم ڕستەیە بە سێ‌جۆر تەفسیرو ڕاڤە کراوە، یەکێ لەوانە ئەمەیە کە ووشەی (لا) بۆ بەرپەرچ دانەوەو بە درۆ خستنەوەی ڕاو گومانێکە کە بێبڕواکانی لەسەرە، (ئیمامی ڕازی)لێرەدا ئەمەی پەسەند کردووەو ئەفەرموێ: گومانی نەگەڕانەوە بۆلای خوا ڕاست نیەو گومان بە هەڵەیە. ﴿أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ﴾ سوێند ئەخۆم بەو سوراییەی کە پەیدا ئەبێ لە ئاسۆدالە ئاوابوونی خۆرەوە ﴿وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ﴾ وە بە شەوو هەرچی شەو کۆی ئەکاتەوە ﴿وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ﴾وە بە مانگ کاتێ کۆ ئەبێتەوەو ڕووناکیەکەی بە تەواوی دەرئەکەوێ وەك شەوی چواردەو پانزە، دەست نیشان کردن بەم شتانەو سوێند پێ خواردنیان هەموو دڵێکی زیندوو ووریاو بێدار ئەکاتەوە بەو دەستە قودرەتەی کە فەراهەم هێنەرو پەروەردگارەو هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرەی ڕاگیر کردووە، نەخشەی هەموو هەنگاوو بزوتنەوەیەکی کێشاوە، هەروەها بیرکردنەوەی لەم سوێند پێ‌خوراوانە بیم‌و ترس‌و بێدەنگی‌و کێش‌و ماتەمی ئەخاتە دڵ، گۆڕانی ڕووناکی ڕۆژو ڕۆشتن بەرەو تاریکی کش‌و ماتی شەوو کۆبوونەوەی ئەو شتە لە شەوا کە بەهیچ ڕەنگ بۆ مەردوم نایەنە خەیاڵ پیایانا ناگات، هەروەها شێوەی ڕووناکی لەسەرخۆو هێواشی مانگ کە ئەکشێ بەسەر وڵاتا.

لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍۭ ﴿٢٥﴾

---

سوێند ئەخوات بەم چەند شتە کە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکران لەسەر ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەم هەموو گۆڕانو بەسەرهاتانە پێك دێنێو ئەیانهێنێ بەدوای یەکا، سوێند ئەخوات لەسەر چەند گۆڕانو بەسەرهاتێ کە دێت بەسەر ئادەمی دا هەتا سەری دەرئەچێ لە دامەزراندنو جێگیربوون لە بەهەشت یا لە دۆزەخدا، ئەفەرموێ: ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾ ئێوە ئەی ئادەمی سواری چەند کارێکی سەختو گرانو سزایان ئەچەژن، وە تێئەپەڕن بەچەند بەسەرهاتێکی یەك لەدوای یەك کە چوون یەکن، ئەو بەسەرهاتانە دیاری کراونو نەخشە کێشراون بەوێنەی ئەو بەسەرهاتانەی کە لە سوێندەکەدا ئاماچەی بۆ کردن لەو بەسەرهاتانەش کە بریتین لە مردنو هەموو بەسەرهاتەکانی دوای مردن تا زیندوو کردنەوەو بەسەرهاتە سامناکەکانی ڕۆژی دوای تیا جێگیر بوونو نیشتەجێ لە بەهەشت یا لە دۆزەخدا یا ئەمانە لەگەڵ بەسەرهاتەکانی ژیانی جیهانو هەموو قۆناغەکانی ژیان کە لە دڵۆپە ئاوەکەی ناو سکی دایکەوە دەست پێئەکات، ئینجا ئەم هەموو بەڵگەو ڕابەرە ڕوونانە هەنو خودایش بەو جۆرە ئاماژەیان بۆ ئەکاتو سەرنجیان بۆ ڕائەکێشێو سوێندیشیان پێئەخوات ﴿فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ کەواتە چی هەیە بۆ بێبڕواکان کە بڕوا ناهێنن، ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ﴾ وە کاتێ قورئان ئەخوێنرێتەوە بە سەریانا ملی بەڵام بۆ کەچ ناکەنو سەری بۆ داناخەن؟ واتە بڕوا نەهێنانو مل کەچ نەکردنیان جێگای سەرسوڕمانو بێزاری لێ دەربڕینە، چونکە بە زمانی سروشت قسەیان لەگەڵ ئەکات، وەقاپی دڵیان ئەکاتەوە لە حاستی ئەو هەموو نیشانەو بەڵگەی دەروونیو بوونەوەرییانەو هەستی لە خوا ترسیو ملکەچیو گوێڕایەڵی ئەهێنێتە جۆشو خرۆش، بەڵێ بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانو

بێزاری دەربڕینە بڕوانەهێنان و مل کەچ نەکردن، چونکە ئەگەر بیر لە هیچ بەڵگەو نیشانەیە نەکرێتەوە بێجگە لەوەی کە لەم سوێندەدا ئاماژەی بۆ کرد، بێگومان هیچ کەس جێگای ملەجەڕێی نیە، چونکە کەسێ بتوانێ ڕووناکی ڕۆژ بگۆڕێ بەو سووراییی و زەردیی پاش ئاوابوونە، ئینجا ئەوەش بگۆڕێ بە تاریکی شەو، وە بتوانێ ئەو هەموو شتە کۆبکاتەوە لە شەوا لەپاش بڵاوبوونەوەیان لە ڕۆژا، گیان لەبەران لە بێدارییەوە بگۆڕێ بۆ خەوتن، هەروەها مانگ لە ناتەواویەوە بگۆڕێ بۆ تەواوی، هیچ کام لەو بەسەرهاتانەی لێ نەگۆڕێ و لەبیری نەچێ و بە یاسایەکی تێرو تەواو ئەو هەموو کارە جیاوازە ببا بەڕێوە.

بێگومان ئەوکەسەئەتوانێ بەسەرهاتەکانی ئادەمیش فەراهەم بێنێ و بیانگۆڕێ. ئەوانە بەوەناوەستن بەملکەچ نەکردن وسوژدە نەبردن ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ﴾ بەڵکوئەوانەکەسانێکن بڕوایان نەهێناوەوقورئان بەدرۆ ئەزانن ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ﴾ وە خودایش ئاگادارترو زاناترە بە هەرچی کە ئەوانە کۆی ئەکەنەوە لە دڵیانا، ﴿فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئینجا کەواتە مزگێنییان بدەرێ بە سزایەکی ئازاردار، ئای هاوار پەنا ئەگرین بە خوای میهرەبان لە موژدەی ئاوا!!

ئینجا بەرانبەر ئەو بێبڕوایانە دواڕۆژو پاداشتی بڕواداران باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڵام کەسانێ کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە ﴿لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ﴾ بۆیان هەیە پاداشتی نەبڕاوە، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو پاداشتە نەبڕاوەدا -آمین-.

وصلى الله وسلم على رسوله وعلى آله وصحبه أجمعين

## سوورەتی ﴿البروج﴾
## مەککەییەو (٢٢)ئایەتە

**بسم الله الرحمن الرحيم**

ئەم سوورەتە دەست نیشان ئەکات بۆ ڕووداوێکی زۆر سامناك و دڵ تەزێن کە بەناوبانگە بەڕووداوی (اصحاب الاخدود) ئەم ڕووداوە بەدرێژی باسکراوە لەهێندێ لە کتێبە باوەڕپێکراوەکانی حەدیسا، کورتەکەی ئەمەیە: کۆمەڵێ لە بڕواداران لە پێش ئەم ئوممەتەدا ئەڵێن: لەو مەسیحیانە بوون کە لایان نەدابوو لە ئایینی ڕاستەقینەی عیسا پێغەمبەر (علیه السلام) ئەو کۆمەڵە دووچاری گەلێکی دوژمنی یاخی دڵڕەق بوون، داوایان لێ ئەکردن هەڵگەڕێنەوە لەو ئایینە پاکەی خۆیان، ئەوانیش بەگوێیان نەکردن و دەستیان گرت بەئایین و ئاقیدەکەی خۆیانەوە. ئینجا ئەو سەرکێشانە لەغەمیان بۆ هەڵکەندن و پڕیان کرد لە ئاگر، ئەو بڕوادارانەیان تیا سوتاند، لەپێش چاوی ئەو کۆمەڵ و گەلە گەورەی کە زۆرداران کۆیان کردنەوە بەدەوری ئەو لەغەم و ئاگرەدا، تا بەچاوەوەبن و بەدیاری ئەو کردەوە پیسەوەبن، بۆ خۆشی و ڕابواردنی دڵی ئەو یاخی و سەکێشانە. ڕابواردن بەسوتاندنی ئادەمی بەزیندوویی کە هیچ تاوانێکیشیان نەبوو بێجگە لەوە کە بڕوایان بوو بە تاك و تەنهایی خوای گەورە.

بێگومان ئەو ڕووداوە نموونەی بڕوای ڕاستەقینە نیشان ئەدا کە شایانە بۆ هەموو بڕوادارێك بیکەن بەسەر مەشق بۆ خۆیان و چاو لەوانە بکەن لەو فیداکاریە کە ئەوانە کردیان لەپێناوی ئاقیدە و بڕوادا. ئەم ڕووداوە هۆی بەهێزکردن و دامەزرادنی دڵی ئەو تاقمە کەمە بوو کە لەمەککەدا تێگیراو و داماو بوون بە دەست ئەو گەل و کەمەڵە یاخیەی کە هەرچی لەدەستیان بهاتایە بە کاریان ئەهێنا لەسزادانی ئەو بڕوادارانەدا. هەروەها هۆی دامەزراندنی دڵ و دان بەخۆداگرتنە بۆ هەر بڕوادارێ لەهەر چەرخێکا کە دووچاری سزاو ئازار ببێ لەپێناوی ئایین و بڕواکەیا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ (١) وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ (٢) وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ (٣)

---

ئەم سوورەتە لەیەکەم جارەوە پێش دەست نیشان کردن بە ڕووداوە دڵتەزێنەکە دەست پێ ئەکات بەسوێند خواردن بەسێ شت کە گەورەو گرنگن و بەڵگەن لەسەر دەسەڵات و گەورەیی خوا. وەنیشانەن لەسەر بە گرنگ گرتنی خوا بۆ ئەو ڕووداوەو خەشمی بەتینی دەربارەی. ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * وَٱلسَّمَآءِ﴾ سوێند بەو ئاسمانە کە ﴿ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾ خاوەنی ئەو ئەستێرانەیە کەوەك قەڵاو کۆشکی گرنگ وان بۆ ئاسمان، یا خاوەنی ئەو قۆناغانەیە کە ئەو ئەستێرانە گواستنەوەی تیا ئەکەن لەکاتی گەڕانیانا، یا خاوەنی ئەو دوانزدە کەلوو (برج)ە بەناوبانگەیە کەشەشیان کەوتووتە سەرووی هێڵی ئیستوا، وە شەشەکەی تریان کەوتوونەتە لای خوارووی. وە هەر سیانیان بۆ وەرزێکە لە چوار وەرزەی ساڵ، وەك بەدرێژی لە سوورەتی (الفرقان)دا باسمان کرد ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ﴾ وە سوێند بەو ڕۆژەی کەبەڵێن دراوە بەهاتنی. واتە ڕۆژی دوایی ﴿وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ﴾وە سوێند بەبینەرو بینراو لەو ڕۆژەدا، واتەلەو ڕۆژەدا هەمووکەس و هەموو کردەوەکان ئامادەو ئاشکرا ئەکرێن و نیشان ئەدرێن، بەجۆرێ هەموو کەس هەموو کردەوەکان ئەبینێ، کەواتە هەموو کەس لەو ڕۆژەدا بینەر ئەبێت و هەموو کردەوەکانیش بینراو ئەبن، لە تەفسیری ئەم دوو وشەیەدا نزیك لە سێ شت ووتراوە، لەناو هەموو ئەوانەدا ئەوەمان هەڵبژاردو لەدڵمانا بەهێزتربوو. هەر چۆنێ لە بارەی سوێند لەسەر خوراوەکەیشەوە چەند ڕایە هەیەو پەسەندتر لە دڵمانا ئەمەیە کە وتراوەو بریتیە لەمە: بێبڕوا یاخیەکانی مەککە نەفرین لێ کراون و دەرکران لە میهرەبانی خوا، بەڵگەش لەسەر ئەو لابراوە ئەم ڕستە سامناکەیە کە کراوە بەسەرەتاو دەرگای ڕووداوە سەختەکەی پێکراوەتەوە کە لەم سوورەتەدا دەست نیشانی بۆ ئەکات و مەبەستێکی سەرەکی یە تیایا،

قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ﴿٦﴾ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ
﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ
وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ

---

**ئەفەرموێ: ﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ﴾[1] نەفرین کرا لەخاوەنەکانی لەغمەکان ئەم ڕستەیە خەشم و ڕقی سەختی خوا نیشان ئەدات لەو کەسانەو لە کردەوە پیسەکەیان هەرچۆنێ گەورەیی ئەو تاوانە ئەگەیەنێ تا ڕادەیەك کە خەشم و قینی خوای هەڵساند. و ئەو هەڕەشە سەختەی لێ کردن. ئەو ستەمکارانە لەغمیان هەڵکەند بوو پڕیان کردبوو لە ئاگرو سووتەمەنی، تا ئەو ڕادەیە لەغمەکە بەئاگر ئەبینرا. جا بۆ گەیاندنی ئەوە ڕاڤەی لەغمەکەئەکاتەوەو لەباتی ئەوا ئەفەرموێ: ﴿ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ﴾ نەفرین کرا لە خاوەنەکانی ئاگرێ کە خاوەن سووتەمەنی بوو، نەفریان لێ کراو بەری خەشمی بەتین کەوتن لەلایەن خواوەو شایستەی ئەوەبوون، ﴿إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ﴾ لەکاتێکا کە بەدەوری ئەو ئاگرەدا دانیشتبوون ﴿وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ﴾ وە ئەوانەی تەماشاکەرو سەرنج دەری ئەوەبوون کە ئەیانکرد بە بڕوادارەکان، بەڕاستی ئەوە ئەو پەڕی ستەم و بەدکرداریەیەو سەرسووڕ ئەمێنێ لەوەی کە ئادەمی بگاتە ئەو پلەو ڕادەیە لە درندەیی و دڵ ڕقیدا! تاوانی ئەو بڕوادارانەش ئەمە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ﴾ ستەمکارەکان هچی قین و بێزاریەکیان نەبوو لێیان ﴿إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ بێجگە لە بڕواهێنانیان بە خوای زاڵی بەدەسەڵاتی سوپاس کراو. بەڵێ تاوانی ئەو بڕوادارانە هەر ئەوە بوو کە بڕوایان بوو بەو خوا دەسەڵات دارە، کە شایستەیە بۆ سوپاس کردن لە هەموو کاتێکا، وە خۆی لەخۆیا سوپاس کراوە با نەزان و نەفام نەیپەرستن و سوپاسی نەکەن.**

**تاوانەکەیان هەر ئەوە بوو کە بڕوایان نەبوو بەخوایە ﴿ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ کە هەر بۆ ئەوە پادشایەتی ئاسمانەکان و زەوی و هەر ئەو خاوەتی هەمووە ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ وە خوا بەسەر هەموو شتێکا ئاگادارەو بینایە بۆ هەموو شتێ و هەموو شتێ ئامادەیەلای. کە**

---

[1] ئەم ڕستە هەرچۆنێ بۆ هەواڵ ئەدات، هەڵئەگرێ نزابێ، واتە با نەفرین بکرێ لەوانە، لەسەر ئەمبارە توندتر سەخت ترە، چونکە کەسێ کە خوا نزای شەڕی لێ بکات ئەبێ چۆن بێت.

هێندێ لەو شتانە كارو بەسەرهاتی بڕوادارەكانەو تاوان‌و دەست درێژی یاخی‌یە خاوەن لەغمەكانە... بەڕاستی ئەم ڕستەیە ئارام دەرە بەدڵی بڕواداران. هەر چۆنێ هەرەشەیەكی گەورەیشە لەسەركێشە دەست درێژی كەرەكان.

بەو جۆرەو شێوەیە دوایی هات گێڕانەوەی ئەو بەسەرهات‌و ڕووداوە كە دڵی ووریا پڕئەكات لەخەشم‌و بێزاری لەو تاوانبارانەو كردەوە پیسەكەیان، هەر چۆنێ سەرنج ڕائەكێشێ بۆ بیركردنەوە لە خەشم‌و قینی بەتینی خوا تا ئەو ڕادەیە كەئەو ڕستە سامناكەی كرد بەسەرەتا بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەكە!

هەروەها گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە دوایی هات لەو چەند ئایەتە كورتانەدا كە دڵ پڕ ئەكات لەسەرسام بوون لەبڕواو ئاقیدە، كە سەركەوت‌و زاڵبوو بەسەر ئەو تاقی كردنەوەدا، سەركەوت بەسەر گیان‌و ژیان‌و هیچ لەهێزە ڕاكێشەرەكانی زەوی كاری لێ نەكرد. بێگومان ئەو بڕوادارانە ئەیانتوانی خۆیان ڕزگار بكەن‌و گیانی خۆیان بپارێزن بەرانبەر تێكشكانی بڕواكەیان، بەڵام ئایا هەر خۆیان چەندەیان زیان ئەكرد هەر لەدنیادا پێش ڕۆژی دوایی! ئینجا ئادەمێتی بەشێوەی گشتی چەندەی زیان ئەكرد؟ بێگومان ژیان بەبێ بڕواو ئاقیدە زۆر بێ نرخە، وە ژیان بەبێ ئازادی‌و سەربەستی زۆر ناخۆش‌و ناشیرینە، ژیان زۆر پەستە كاتێ كە یاخی‌و سەركێشەكان زاڵ ببن بەسەر گیان‌و ڕۆح دا لەدوای زاڵبوونیان بەسەر لەشا. دەی ئەگەر ئەوانە ئەو تێشكانەیان بەسەر خۆیان بهێنایە ئەو مەبەستە گەورەو گرنگەیان لەكیس ئەچوو و ژیانێكی بێ نرخی قیزەونی پەستیان ئەبوو. بەڵام كەئەوەیان بەسەر خۆیان نەهێنا خۆیان دووچاری ئەو ژیانە نەبوون‌و ژیانی بەنرخی شیرینی بەرزیان ڕوون كردەوەو كردیان بەسەر مەشق بۆ هەموو تاقم‌و چینەكانی پاش خۆیان هەتا هەتایە. ئینجا لە ڕۆژی دوایشدا بۆ خۆیان بەهرەو پاداشی نەبڕاوە هەیەو بۆ دوژمنەكانیشان سزای سەختی نەبڕاوە وەك وەرئەگیرێ لەم دوو یاساگشتی‌یەی كە ئەیهێنێ بەدوای گێڕانەوەی ڕووداوەكەدا.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی ﴿فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ﴾ كە سزاو ئازاری پیاوە بڕوادارەكان و ئافرەتە بڕوادارەكانیان دا لەسەر بڕواكەیان‌و بۆ ئەوەی هەڵیان گێڕنەوە لەئایین‌و بڕواكەیان. ﴿ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟﴾ ئینجا تۆبەیان نەكرد لەوە ﴿فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ﴾ بۆ ئەو سزادەرانە هەیە سزای دۆزەخ،

وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ذَٰلِكَ
ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾

---

﴿وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ﴾ وە بۆیان هەیە سزای سووتێنەری بەتین، ئەمە هەرچەند وەرئەگیرێ لەسزای دۆزەخ بەڵام سزای سووتێنەری ڕۆژی دوایی لەکوێو سزای ناو لەغمەکە لەکوێ؟ لە بەتینیو لە درێژە کێشانا! سوتاندنی دنیا بە ئاگرێکە کە ئادەمی هەڵی ئەگیرسێنێ سوتاندنی ڕۆژی دوایی بە ئاگرێکە کە خوا هەڵی ئەگیرسێنێ! سوتاندنی دنیا ساتێکەو ئەبڕێتەوە، سوتاندنی ڕۆژی دوایی نەبڕاوەو هەتاهەتاییە! لەگەڵ سوتاندنی دنیادا ڕەزامەندی خوا هەیە لە بڕوادارەکانو زاڵبوونی مەبەستێکی گرنگی ئادەمی هەیە، لەگەڵ سوتاندنی ڕۆژی دوایی دا خەشمی خوا هەیەو بێئابڕوویی، وە ئەو ڕەزامەندیو بەهرەی خوا دەرئەکەوێ دەبارەی بڕوادارەکان لە بەهەشتا وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان هێنا ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾ وە کردەوە چاکەکانیان کرد ﴿لَهُمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾ بۆیان هەیە چەند باخاتێ کە ڕووبارەکان دێنو ئەچن بەبنیانا ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ﴾ هەر ئەو دەست کەوتی بەهەشتەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە. ڕزگاربوون لە ئاگر بەتەنها گەیشتنە بە ئاواتو ئامانج، چ جای ئەوە چوونی بەهەشتیشی لەگەڵ بێت!

ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) هەڕەشەیەکی گەورە ئەدا بەگوێی هەموو تاوانبارانا بەتایبەتی ئەو خێڵانەی مەککە کە ئازاری یارەکانی پێغەمبەریان ئەدا (ﷺ) خوا لەوانیش ڕازی بێت، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ بەڕاستی دەست وەشاندنی پەروەردگاری تۆو تۆڵەی سەختی لەیاخیوستەمکارەکان زۆربەتینوبەهێزە. ئینجازیاتر توانینو دەسەڵاتی خۆی ڕوون ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾ بێگومان هەر خوایە کەلەیەکەم جارەوە مەردوم دروست ئەکاتو هەر خوایە کە دووبارەی ئەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا، هەرکەسیش بەو جۆرە بێت ئەبێ دەست وەشاندنو تۆڵەی ئیجگار سەختو بەتین بێت.

﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ﴾وه هەرئەو لێ خۆشبووه، بەهۆی ئەوه هەركەس تۆبە بكاتو بگەڕێتەوه بۆلای لێی خۆش ئەبێ، قاپی ئەو تۆبەيە هەميشە لەسەر پشتەو داناخرێ لە هيچ گەڕاوەيەك ئيتر هەرچەند تاوانو گوناهەكەی زۆر گەورەبێت تا نەگاتە كاتی گيان دەرچوونو نائومێدی لە ژيان ﴿ٱلْوَدُودُ﴾ هەر ئەوه كە زۆر ئەو بەندەيانەی خۆش ئەوێ كە گوێڕايەڵن بۆیو ڕەزامەندی ئەو پێش ئەخەن لە هەموو شتێ، تائەو ڕادەيە گيانی خۆيان بەخت ئەكەن لە پێناوی ڕەزامەندی ئەودا، ئەويش ڕادەو پلەيان بەرزئەكاتەوه تا ئەو ڕادەيە خۆشەويستیو دۆستايەتی بەكارئەهێنێ لەگەڵيان، كە ئەوەش پلەيەكی ئەوەندە بەرزو بڵندە هيچ زوبانو هيچ پێنوسێ ناتوانێ تەعبيری بڵێو بينوسێ.... كەواتە ئەبێ ئەو گيانەی كە بەختی ئەكات بۆ ئەو وه هەرچۆنيش بێ ئەبێ هەر بڕوا، ئەبێ چی بێتو چ نرخێكی ببێ لەچاو ئەو پلە بەرزەی كە پێی ئەبەخشێ: پلەی دۆستايەتیو خۆشەويستی، ئەبێ ئەو سزا كاتيەی كە ئەی چەژن لە جيهانا لە ڕێگای ئەودا ئەبێ ئەو سزايە چی بێ؟ ئەبێ ئەمە چی بێ لە حاستی دڵۆپێ لەو خۆشەويستيە بەرزو بڵندەی كە ئەيدا بەو بەندەيە؟ بێگومان ئەبينرێ كە چەند كەس لە بەندەكانی ئەم زەويە دەست هەڵئەگرن لە گيانو ژيانی خۆيان لە پێناوی قسەو فەرمانو ڕەزامەندی ئادەميەكی وەك خۆيان كەواتە بۆ ئەبێ مەردوم بە سۆزو پەرۆشەوه دەست هەڵنەگرێ لە هەموو شتی خۆی لەبەر خواو لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا؟

بەڕاستی گيان هيچ نيەو هەمووئێشو ئازارێ هيچ نيەوهەمووئەم جيهانەهيچ نيەلەچاو ئەو لوتفو ميهرەبانيەو تۆزێ لە ڕەزامەندی ئەو خوايەی كە ﴿ذُو ٱلْعَرْشِ﴾ كە خاوەنی تەختو بارەگای پادشايەتیو خوايەتيە ﴿ٱلْمَجِيدُ﴾ كەگەورەيە لە زاتی خۆياو لە سيفەتەكانيا ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ هەرچيەكی بوێ ئەيكات بەباشی هيچ شتێ بەرگری ناكات لێی، كەواتە هەركات ويستی يارمەتی بڕواداران ئەدات وه هەركات ويستی دوژمنو دەست درێژی كەران لەناو ئەبات، وه هەركات ويستی مۆڵەتيان ئەدات تا ماوەيەك يا هەر لێی ئەگەڕێ لە جيهاناو هەڵی ئەگرێ بۆ ڕۆژی دوايی، هەرچی ويستو هەرچی كرد بەرژەوەندیو كاردروستی تيايەو هەر ئەوه ڕاستە كە ئەيەوێو ئەيكات ئيتر ئێمە تێئەگەين يان نە؟

هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ
مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ﴿٢٠﴾ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾

ئینجا دەست نیشان و ئامارژەئەکات بۆ دوو داستان و ڕووداوی دوورو درێژ کە بەناوبانگ و ناسراوبوون لای گوێگران و بەدرێژی باسەکەیان هاتبوو چەند جار لە قورئانا، لەبەرئەوە زۆر بەکورتی خستیە بەرچاو، ئەم ڕووداوانە دوو نموونەن لەوانەی خوا ویستی و کردی، وە دوو نموونەن بۆ دەست وەشاندنەکانی و دوو شێوەن بۆ بانگکردن بۆلای خوا، وە یاخی بوون و پشت تێکردنی بێبڕواکان دوو نموونەن بۆ شێوەی ئازارو سزایەك کە دەست درێژی کەران کردیان دەربارەی بانگکەرانی ڕێگای خواوهەڵگرتنی ئەوبارەگرانەلەلایەن بڕوادارنەوە، بەوێنەی داستانی خاوەن لەغمەکانی سەرەتای سوورەتەکە. ئەم دوو ڕووداوەشی باسکرد بۆ ئەو تاقمە کەم و بێ دەسەڵاتەی مەککەو بۆ هەموو تاقمێکی تری وەك ئەوان لە هەموو چەرخ و چینێکابۆدڵخۆشی دانەوەوئارامدان پێیان، ئەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ﴾ ئایا پێت گەیشت هەواڵ و داستانی لەشکروسەربازەکان؟ لەباتی ئەوانەئەفەرموێ: ﴿فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ﴾ واتە داستانی فیرعەون و گەل و لەشکرەکەی کەچەند تاوان و دەست درێژیان کردو چەند بەدەسەڵات بوون و لەپاشا خوا لەناوی بردون و موسا و گەلەکەی ڕزگارکردو دەسەڵات و پاشایەتی دا بەوان و کردنی بە فەرمانڕەواو کاربەدەست لە وڵاتا، وە داستانی تیرەی سەمود کە زۆردارو بەهێزبوون و عەرەب بوون، ئینجا خوا (صالح) پێغەمبەری (علیه السلام) بۆناردن و ئەوانیش سەکێش و یاخی بوون و ملیان شۆڕنەکرد تا خوا لە ڕیشەی هێنان و (صالح) و تاقمێکی کەم کەلەگەڵی بوون ڕزگاری کردن و ئیتر نەیکردن بە حوکمڕان لەبەر هەر هۆیە کە خۆی ئەیزانی، کەواتە با پێغەمبەرو شوێن کەوتووەکانی دڵخۆش و دڵئارام بن کە سەرکەوتن و زاڵبوون هەر بۆ ئەوان و ئایینەکەیانە، باسەرکێش و یاخیەکانیش بترسن لە دووچاربوونی سزای هەردوو جیهان بەوێنەی یاخی و سەرکێشەکانی گەلی ڕابردوو.

ئینجا واز ئەهێنی لە قسەو باسی پێشوو دوو مەبەستی گرنگ ئاڕاستە ئەکات بەڕوونی و بەتوندی:

یەکەم: حاڵ و باری بێبڕواکان ڕوون ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٍ﴾ ئەوانەی کەلە زانینی خوادا بێبڕوان و بڕوا ناهێنن بەهەمیشەیی وان لە بەدرۆ زانینی قورئانا و هەمیشە بەدرۆی ئەزانن ﴿وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ﴾ لەکاتێکا خوا بەدوایانەوە ئاگادارە بە هەموو شتیان و بەزانین و دەسەڵات دەوری داون، کەواتە هەرگیز لەدەستی قوتار نابن وە ئەوانیش بێئاگان لەوە.

دووەم: ئەگوێزێتەوە لەباسی بێبڕوایی و نەگەڕانەوەی ئەوانەوە بۆ باسی بەرزی و بڵندی قورئان بۆئەوەی نیشان بدا کە بێبڕوایی و بەدرۆ زانینی ئەوان نرخی نیەو زیانی نیە ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٌ مَّجِيدٌ﴾ ئەوەی ئەوان بەدرۆی دائەنێن قورئانێکی بەرزو پیرۆزە ﴿فِي لَوۡحٍ مَّحۡفُوظِۭ﴾ وا لە لەوحێکی پارێزراو لەدەست کاری کردنی شەیتان و هەرکەسیتر، ئێمە نازانین ئەو لەوحە چۆنەو لەکوێیە؟ چونکە یەکێکە لەو شتە غەیبیانەی کە زانینی نەدراوە بەئێمە، بەس ئێمە سوود وەرئەگرین لەو ناوو وتنە کەئەم قورئانە دامەزراوو پارێزراوە لە هەموو کارو بڕیارا گەڕانەوە هەر بۆلای ئەوە، هەموو قسەیەتر کەلەوە نەهاتبێ ئەڕواو تەنها قسەی ئەو ئەمێنێتەوە.

**وصلى الله وسلم على من أنزل عليه هذا القرآن الكريم وعلى آله وصحبه وكل تابع لهم بإحسان الى يوم الدين**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴿٢﴾ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴿٤﴾

## سووره‌تی ﴿الطارق﴾
## مه‌ککه‌ییه‌و (١٧) ئایه‌ته

## بسم الله الرحمن الرحیم

له سه‌ره‌تای ئه‌م جزمه‌وه وترا: که‌شێوه‌ی گشتی سووره‌ته‌کانی ئه‌م جزمه، وه‌ك چه‌ند ڕاوه‌شاندن‌و ته‌قه‌ته‌ق کردن‌وبانگ لیّ کردن به‌ده‌نگێکی به‌رز وایه که به‌کاربهێنرێن بۆ خه‌به‌ر کردنه‌وه‌ی چه‌ند خه‌وتوویه‌کی خه‌و قورس! یا بۆ هێنانه‌وه هۆشی چه‌ند مه‌بسته‌تێکی بێ‌هۆش: یا بۆ ئاوڕ پێدانه‌وه‌ی کۆمه‌ڵێکی بێ‌ئاگا که خه‌ریکبن به‌یاری‌و ڕه‌قس‌و سه‌ما و به هۆسه‌و چه‌پڵه ڕێزانه‌وه. مه‌به‌ستی ئه‌م جزمه وه‌ك بریتی بێت له تێ‌خوڕین له ئاده‌می‌و بانگ لیّ کردنیان به‌مه‌ی بێداربنه‌وه، هۆش بکه‌نه‌وه، بیریّ بکه‌نه‌وه که بێ‌گومان خوایه‌کیان هه‌یه‌و لێپرسینه‌وه‌و پرسیارو تۆڵه‌تان هه‌یه به‌وێنه‌و نموونه‌یه‌کی ڕوون‌و ڕه‌وانه بۆ ئه‌و مه‌به‌سته گشتیه‌ی جزمه‌که.

ئه‌م سووره‌ته ئاماژه‌ئه‌کات بۆ سێ‌پایه له‌پایه‌کانی بیروباوه‌ڕی ئیسلام: خوایه‌تی‌و په‌روه‌ردگاری خوا، ڕۆژی دوایی‌و زیندووکردنه‌وه، ڕاستی قورئان، بێ‌گومان یه‌که‌میان گه‌وره‌ترو گرنگ تره، به‌ڵکو سه‌رچاوه‌و بنه‌ڕه‌ته بۆ هه‌موو پایه‌کان‌و هه‌موو شتێ له‌م ئایینه گه‌وره‌دا، که‌واته مافی خۆیه‌تی ئاوا به گرنگ بگیریّ، به‌م ڕه‌نگ بکریّ به یه‌که‌م‌و سوێندی له‌سه‌ر بخوریّ، وه‌کو ئه‌فه‌رمویّ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *وَٱلسَّمَآءِ﴾ سوێند به ئاسمان، ئاسمان به‌هه‌ر شتێ ئه‌وتریّ که به‌لای سه‌ره‌وه بێ، ئینجا له‌ناو ئه‌و هه‌مووه‌دا شتێ باس ئه‌کات‌و به‌تایبه‌تی سوێندی پێ‌ئه‌خوات، ئه‌فه‌رمویّ: ﴿وَٱلطَّارِقِ﴾ سوێند به‌وه‌ی که‌له شه‌وا ده‌رکه‌ویّ ئه‌وه‌ی که‌به شه‌و ده‌رکه‌ویّ زۆره‌و لێره‌دا هه‌موو مه‌به‌ست نیه به‌ڵکو مه‌به‌ست شتێکی تایبه‌تی گه‌وره‌یه له‌به‌رئه‌وه به‌م پرسیاره که‌له قورئانا باوه به‌کارهێنانی بۆ گه‌یاندنی گه‌وره‌یی‌و گرنگی پرسیار لیّ کراو که گه‌وره‌یی‌و گرنگی ئه‌و ده‌رکه‌وتووه ده‌رئه‌خات‌و ئینجا دیاری‌و ناونوسی ئه‌کات، ئه‌فه‌رمویّ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ﴾ ئایا چی تۆی زانا و ئاگادارکرد

کەچیە ئەو بە شەو دەرکەوتووە؟ واتە تۆ چوزانی ئەوەندە سەیرو گرنگە بیرو زانینی تۆ پیاناگات ﴿ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ﴾ ئەو بە شەو دەرکەوتووە ئەستێرەیەکە بە ڕووناکی خۆی کونکەری تاریکیە، ئەستێرە بە تێکڕایی ئەم سیفەتو نیشانەی هەیە، ئەم ووتەیە هیچ ئەستێرەیەکی تایبەتی نیشان نادات وە هیچ پێویستیشی نیە بەمەی بڕیێ بەسەر یەکێ یا کۆمەڵە ئەستێرەیەکی تایبەتیدا، بەڵکو نەبڕینو باری دیاری نەکردن چاکترە تاوەك سوێن بێت بە هەموو ئەستێرەکان کە بەشدارن لەم سیفەتەی کە باسکرا.

خوای گەورە لەزۆر ئایەتا باسی ئاسمانو زەویو مانگو ڕۆژو ئەستێرە ئەکات وە زۆر جار سوێندیشیان پیێ ئەخوات، چونکە بەسەرهاتیان لە هەموو بارو ڕوویەکەوە لەبارەی شێوەو دیمەنو گەڕانو خولانەوەو هەڵهاتنو ئاوابوونیان... هتد، بەڵگەو ڕابەرێکی ڕوونو ئاشکران لەسەر داهێنەرو پەروەردگاروبەڕێوەبەریان، وە هەستو دەروون پاراو ئەکەنەوە بەبڕوای دامەزراوی بەهێز بەو خوای پەروەردگارە، جا لەبەرئەوە خوای گەورە لێرەدا ئەو سوێندەی خواردو سوێند لەسەر خوراوەکەشی ئەمەیە: ﴿إِن كُلُّ نَفۡسٍ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٌ﴾ هیچ کەس نیە مەگەر وا بەسەریەوە ئاگادارو چاودێر. واتە هیچ کەس بوونو مانەوەو بەڕێوەچوونی هەموو کاروباری ژیانی لە خۆیەوە نیەو بە ڕێکەوت نیەو بەڵکو هەموو ئەوانەو هەرچی بکاتو هەرچی بەسەر بێت هەمووی بە ئاگاداری چاودێرێکەو لە ژێر چاودێری ئەوایەو هەمووی بەپیێ خواستو تەگبیرو خواهیشی ئەوە، بێگومان هەموو نیازو کردەوەکانیشی لەسەر هەڵئەژمێرێو ئەیان نوسیێ بەوردیو ئەبیێ لیێ پرسینەوەو حیسابێکیش بێت بەدوای ئەوەدا، مەردوم هەروا بەرەڵانەکراوە بە ئارەزوی خۆی چی ئەکات بیکاتو چی ئەڵیێ بیڵێت، ئەو چاودێرو ئاگادارە خوای پەروەردگارە.

بەڕاستی ئەم ووتەوڕەستەیەئێجگار گەورەو سامناکە،و جێگیربوونی لە هەر دڵێکا بەسە بۆ چارەسەرکردنی هەموو لاریو نالەباریەکی،چونکە ئەزانیێ هەست ئەکات کە هەمیشە وا بەپێش چاوی ئەو چاودێرو ئاگادارەوە، وە ئەزانیێ هەرگیز بەتەنها ناژیو شوێنێکی چۆڵی دەست ناکەویێ، هەرچەندە بەدیمەنو ڕووالەت تەنها بێتو هیچ گیان لەبەرێکی لیێ نەبیێو هەرچەند خۆی بشارێتەوە، چونکە ئەو چاودێرە هەیەو هەمیشە ئامادەیەو هەموو پەردەیە ئەدڕیێو ئەکات بە هەموو داشارراوێك، هەرچۆنیێ ڕووناکی ئەستێرەدەست کردەکەی هەموو پەردەی دوورودرێژی تاریکی کون ئەکات.لەیەکەم جارەوە بەو سوێندەو بە ئاوڕ پیێدانەوە بۆلای ئاسمانو ئەستێرە، دەست نیشانی کرد بۆ بوونو جێگیرکردن (اثبات)ی ئەو چاوێرە.

ئینجا بۆئەوەی باشتر دەرکەویّ و جێگیر ببێ سەرنج ڕاتەکێشێ و ئاوڕئەداتەوە بە ئادەمی بۆ بیرکردنەوە لە پەیدابوونی خۆی، کەلە چی دروستکراوەو بووە بەو ئادەمیە نایابە کە هەموو ژیریی و بیری تیایا سەرسامە! بێگومان هەرکەس بەتەواوی چاوی دڵی کوێر نەبێ و سۆمای لێ نەبڕابێ بیر لەوە بکاتەوە دڵی پڕئەبێ لە بڕوای بەهێز بەو چاودێرە ئاگادارەی کەوا بەسەریەوەو ئەزانێ کە بەهیچ کلۆج ناگونجێ پەیدابوونی خۆی و بەڕێوەچوونی کاروباری بوون و مانەوەی بەبێ ئەو، ئەفەرموێ: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ﴾ کەواتە با ئادەمی سەرنج بدات و بیربکاتەوە ﴿مِمَّ خُلِقَ﴾ ئایا لەچی دروستکراوە؟ هەرکەس نازانێ با بزانێ ﴿خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ﴾ کە دروستکراوە لە ئاوێکی هەڵقوڵاوی ڕژاو بە تەکان و بە چەسپان ﴿يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ دەرئەچێ لەناوەندی مورغەی پشتی پیاو و ئێسکەکانی لای سەروی سنگی ئافرەتەوە.

زانایانی تەندروستی کۆن باوەڕیان وابوو کە ئەو ئاوە لە هەموو لەشەوە دێت و زۆربەی لە مێشکدا پەروەردە ئەبێ و ئینجا نیشتەجێ ئەبێ لەچەند دەمارێکدا، جا بەهۆی ئەوە بێبڕواکان دەم درێژیان ئەکردە سەر ئەم ئایەتەو ڕەخنەیان لێ ئەگرت، زانایانی تەفسیریش بەرپەرچیان ئەدانەوەو پینەو پەڕۆیان ئەکرد بۆ ئایەتەکە.

بەڵام قورئان ئەو قورئانەیە کە نهێنی و شتە نایابەکانی هەرگیز دوایی نایەن و هەرکەس لە هەر بارێکەوە بدوێ دژی هەر سەر شۆڕیی و ڕوو ڕەشی بۆ ئەمێنێتەوەو خوا ڕاستی قورئانەکەی دەرئەخات درۆی دوژمنە نەفامەکان ئاشکرا ئەکات، بۆ نموونە لێرەدا هەر لە ڕێگای زانیاری تازەوە دەرکەوت کەئەو ئاوە لەناوەندی ئەم دوو شوێنەدا دەرئەچێ کە قورئان فەرمووی پێش (١٤٠٠)ساڵ لەمەوبەر، ئەو موعجیزە گەورەیەی دەرخست لەسەر دەستی بێبڕواکان و دوژمنەکانی قورئانا، ئەوە شتێکی نهێنی بوو لە زانینی خواداو بەدڵی کەسا گوزەری نەئەکرد هەتا نیوەی ئەم چەرخی بیستەمە کە زانیاری تازە لە ڕێگای خۆیەوە بۆی دەرکەوت کە ئاوی پیاو لە ئێسکەکانی موروغەی پشتیەوە پەیدائەبێ، وە ئاوی ئافرەت لەئێسکەکانی سەرەوەی سنگیەوەپەیدا ئەبێت، ئینجا یەك ئەگرن لە مناڵدانا و لەهەردووکیان ئادەمی پەیدا ئەبێت!

بەڕاستی شتەکە زۆر سەیرەو سەر لە کرداری خوا سوڕئەمێنێ، چونکە ئەو دوو شتە بەڕووالەت زۆر دوورن لەیەکەوە: ئەو دڵۆپە ئاوە کە دەرئەچێ لەو دوو شوێنەی کە باسکرا، ئەم ئادەمیە ژیرو زانایەی کە خاوەنی ئەم هەموو هێزو ووزەیانەیەو ڕێکخراوەو پێکهێنراوە لەو هەموو بەش و کەرەستە جیاوازانەو ئەو هەموو ووردەکاریەی کە تیا کراوەو هەتا بێت شتە نهێنیەکانی باشترو زۆرتر دەرئەکەون... ئەو ماوەو مەسافە دوورو درێژەی کە ئەو دڵۆپە ئاوەی پیا ئەڕواو ئەی بڕێ تا ئەبێ بەم ئادەمیە زاناو ئیشکەرە هەموو ژیرێ تێئەگەیەنێ و ئەو دەستە قودرەتەی نیشان ئەدات کە ئەو کردەوە ئەکات وە ئەچرپێنێ بە گوێچکەیەوە کە پەروەردگارێ هەیە پارێزەرو چاودێربێت بەسەر ئەو دڵۆپە ئاوەوە تا ئەیکات بەو ئادەمیە!!

لەو دڵۆپە ئاوە تەنها خانەیەکە کەلەوانەیە بەووردبین نەبینرێ، نە هێزو نە هەست و نە هۆش و نە ژیریی و نە خواهیشی هەیە، هەر جێگیربوو لە منالدانا دەست ئەکات بە هەوڵ و تێکۆشان بەدوای خۆراکدا، چونکە پەروەردگار بەچڵێس و خۆرای دروستکردووەو هەمیشە خۆراکی ئەوێ، بەهۆی ئەوە ئەنوسێ بەدیواری منالدانەوەو زامداری ئەکات و حەوزێکی خوێنین بۆ خۆی روست ئەکات و هەمیشە خوێنی تەڕو تازەی بۆ دێت! ئینجا بەبێ وەستان و بە هەمیشەیی دەست ئەکات بەدابەشی بوون و بە ملیۆنەها خانەی لێ ئەبێتەوە، ئەو خانەیە کە بێهێزو لێ زانین و بێ خواهیشە، ئەزانێ چی ئەکات و خەریکی چیەو چی ئەوێ.

بەهۆی ڕێنموونی ئەو دەستە قودرەتەی کە پارێزەرو چاودێرێتی؟ ئەم خانەیە هەموو کۆمەڵە خانەیەکی تازە کە پەیدائەبێ لێیەوە دیاری و تایبەتی ئەکات بۆ پێکهێنانی بەش و پارچەو کۆئەندامێ لەم کۆشکە تازەی کە ئەیەوێ دروستی بکات.... کۆشکی لەشی ئادەمی... بەم ڕەنگە کۆمەڵەیە کۆئەندامی ئێسکی فەراهەم ئەمێنێ، کۆمەڵەتر کۆئەندامی دەماری، کۆمەڵەتر بۆ پێکهێنانی کۆئەنامی ماسولکە، هەروەها تا دوایی هەموو کۆئەندام و بەش و پارچە بنەڕەتیەکان لەو کۆشکە گرنگەدا!

بەڵام ئەو کردەوەیە هەروا سادەو ئاسان نیەو هەروا بە گەزاف و گۆترە کاری نیە، بەڵکو بە ئەوپەڕی ووردەکاری و لێزانی، چونکە هەر ئێسکێ جیاوازەو وێنەی ئێسکەکانی تر نیە لە کۆئەندامی ئێسکیدا، هەروەها دەمارێ جیاوازەو وێنەی دەمارەکانی تر نیە لە کۆئەندامی دەماریدا، و هەروەها هەموو ئەندامێ لە کۆئەندامەکانی تردا. جا لەبەرئەوە هەر کۆمەڵەیە کە ئەڕوا بۆ پێکهێنانی هەر کۆئەندامێ لەناو خۆیانا بەش بەش ئەبن بەچەند تاقمێکی تایبەتی،

هەر تاقمێ پارچەو بەشی تایبەتی خۆی پێك ئەهێنێ! هەر خانەیەکی بچووك ئەڕواو ڕێگای خۆی ئەناسێو ئەزانێ بۆ کوێ ئەڕواو چی لێ داوا ئەکرێ؟!و هەرگیز هەڵە ناکات، بۆ وێنە ئەو کۆمەڵە خانەی کە ئەیەوێ چاو پێکبێنێ ئەزانێ کە چاو ئەبێ لە چ شوێنێکدا بێ، کەواتە بۆ ئەو شوێنە تایبەتیو دیاری کراوە ئەڕوا لەگەڵ ئەوە بۆ هەر شوێنێ بڕوا چاو پێکدێت! بەڵام ناڕوا بۆ ئەو شوێنە دیاری کراوە نەبێ. دەی ئایا کێ پێی ووت: ئەبێ هەر بۆ ئەو شوێنە بڕۆیت نەك بۆ هیچ لایەتر؟ بێگومان خوا کە چاودێرو پارێزەری بەرزو بڵندەو، ئەو خوایە ڕێنموونی ئەکاتو ئەینێرێ بۆ جێگاو شوێنی تایبەتی خۆی، ئینجا ئەو هەموو خانەیانە بە یەکەیەکەو بە کۆمەڵ ئیش ئەکەن لە چوارچێوەیەکی دیاری کراوی تایبەتی دا کە پارێزەری جۆری ئەو کۆئەندامە بنو تێپەڕ نەکەن لەوە، یا تێکەڵی بکەن لەگەڵ جۆری ترا، بۆ وێنە ئەو خانەی کە پەرەئەسێنێو دابەش ئەبێ بۆ پێکهێنانی چاوی ئادەمی، هەوڵو تێکۆشان ئەکات بۆ پێکهێنانی چاوی ئادەمی، هەوڵو تێکۆشان ئەکات بۆ پێکهێنانی جۆرو شێوەیە کە تایبەتیەوە بە ئادەمیەوە، نایەڵێ شێوەی چاوی گیان لەبەری تر پێك بێت، یا تێکەڵ لە دوو جۆری جیاواز، بەڵکو زۆر جار پارێزگاری نەتەوەو نەژادی ئەکات، دەی ئایا کێ ئەو دەسەڵاتە ئەدا بەو خانەیەو کێ ئەوەی فێر ئەکات؟ لەکاتێکا هەرکام لەو خانە سادەیە نە هۆشی هەیەو نە ژیریی و نە دەسەڵاتو نە خواهیش، بێگومان هەرکەس شێت نەبێت بە دڵێکی پڕ لە بڕواوە ئەڵێ: خوا ئەو کارە سەرسوڕهێنەرانەیان پێئەکات... وە هەرکەس هەر جۆرە گومانێکی لەوەدا بێ ئەو کەسە شیاوی ئەوە نیە قسەی لەگەڵ بکرێو لە هەموو شێتێ پەست ترو شێت ترە، ئەگەر هەموو ئادەمی کۆبکرێتەوەو داوای پێکهێنانی چاوێ یا بەشە چاوێکی لێ بکرێ ناتوانن بڵێن: ئەو کردەوەمان پێئەکرێ، دەی کەواتە ئەو خانە بێهێزو بێدەسەڵاتو بێهۆشو بێخواهیشو مەیلە چۆن ئەو کردەوە گەورەی پێ ئەکرێ کە هەموو ئادەمی داماوو دەستە پاچەیە لە کردنی؟! ئەوەی کە باسمان کرد بەشێکی زۆر زۆر کەمە لەو هەموو شتە نایابانەو ئەو کردەوە سەرسوڕهێنەرانەی کە نایەتە ژمارە بۆمان. ئەمانەو وێنەیان شایەتن لەسەر ئەو تەگبیرو وردەکاریەی کە بەکارهێنراوە لەم ئادەمیەدا کە لە یەکەم جارەوە لەو دڵۆپە ئاوەیە کە هێنای لێرەدا، هەموو ئەمانە ئەو دەستە داهێنەرو پارێزەرو چاودێرە نیشان ئەدەن کە خوا سوێندی خوارد لەسەر بوونی، هەرچۆنێ دەرگای دڵ ئەکەنەوە، بۆ تێچوونو دامەزراندنو وەرگرتنو داڕشتنی بڕوای بەهێز بە زیندوو کردنەوەی ڕۆژی دوایی کە نەفامە بێبڕواکان بڕوایان پێی نیە،

جا بەو بۆنەوەو لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٌ﴾ بەڕاستی دروستکەرو داهێنەری ئادەمی تواناو بەدەسەلاتە بەسەر گێڕانەوەو زیندوو کردنەوەی ئادەمی ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾لە ڕۆژێکا -واتە ڕۆژی دوایی -کە هەموو نیازو بیرو باوەڕو کردەوە نهێنیەکان دەرئەخرێن‌و ئاشکرا ئەکرێن، کەواتە چاك‌و خراپ بەباشی دەرئەکەون‌و جیا ئەکرێنەوە، کەس ناتوانێ بە دەم خۆی بپەرێنێتەوەو هیچ خراپ‌و ناپاکێ ناتوانێ خۆی بە چاك‌و پاك نیشان بدات.

بەڵێ بە ڕاستی ئەو داهێنەرە، بە دەسەلاتە بەسەر دووبارە کردنەوەداو دروست کردنی یەکەم جار شایەتێکی ڕاست‌و بەهێزە لەسەر ئەو دەسەلاتە، هەرچۆنێ شایەتە لەسەر کاردروستی‌و لێزانی‌و تەگبیری ڕێك‌و ڕاستی، ئینجا ئەگەر ئەو دووبارە کردنەوە نەبێ ئەبێ ئەو هەموو تەگبیرو ووردەکاریە بەبێ هوودەو بەبێ نرخ هەروا بڕواو ئەبێ دادی خوا دەرنەکەوێ‌و بەرهەمی نەبێ، کەواتە پێویستە ئەو دووبارە کردنەوە، تا هەموو کەس بگات بە بەرو بەرهەمی کردەوەی خۆی‌و دادی خوا دەرکەوێ‌و بەدی بێت، پێویستە هاتنی ڕۆژێ کە مەردوم ڕووت‌و قووت ببێ لە هەموو هێزو یارمەتی دەرێ کە لەم جیهانەدا خراپەو ناپیاوی پێ ئەکردن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ﴾ ئینجا نیە بۆ ئادەمی نە هیچ هێزێك لەلایەن خۆیەوە خۆی پێ قوتار بکات، وە نە هیچ یارمەتی دەرێکی هەیە بۆ ڕزگاربوونی لەوەی تێ‌ی کەوتووە... بەڕاستی دەرکەوتنی نهێنیەکان لەگەڵ ڕووت بوون لە هەموو هێزو دەسەلاتێ سزاو ناڕەحەتیەکە بەتین ترو چەند بارە ئەکاتەوە، خوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتیمان بدات لەو ڕۆژە سەختەدا.

لە سەرەتای سورەتەکە ووتمان: ئەم سوورەتە ئاماژە ئەکات بۆ سێ پایە لە پایەکانی ئاقیدەو بیرو باوەڕی ئیسلام، تائێرە یەکەم‌و دووەم دوایی هاتن، ئەوا هاتەسەر پایەی سێ‌یەم کە ڕاستی قورئانە، هەرچۆنێ لە یەکەم جارەوە سوێندی خوارد بە دوو شت، ئەوا لێرەشا سوێند دووبارە ئەکاتەوە بە دوو شتی تر لەسەر ئەم مەبەستی سێ‌یەمە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ﴾ سوێند بەئاسمانی خاوەن باران، کەجارلەدوای جارلەپاش نەمان ئەیگێڕێتەوە و ئەیبارێنێ

﴿وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ﴾ وە سوێند بەزەوی خاوەن ڕووەك لەگیاو هەموو سەوزەیەك كەزەوی لەت ئەكەن‌و سەری لێ دێننە دەرەوە، یا خاوەن قڵیش‌و لەت بوون بۆ گیاو هەموو ڕووەكێ لێی دەربێن. سوێند بەو ئاسمان‌و زەوییە ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ﴾ بێگومان قورئان -كە ئەم سوورەت‌و ئایەتانەی پێشوو بەشێكن لێی- وتەو وتارێكی ڕاست‌و دروستە كە جیاكەرەوەی هەموو هەق‌و ناهەقێكە، ﴿وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ﴾ بێگومان گاڵتە نیە. كەواتە پێویستە هەموو كەس ڕێنموونی لێ وەرگرێ‌و پەیڕەوی بكات، یەكێ لەهۆی گەورەیی قورئان‌و دەستە پاچەیی هەموو كەس لەحاستی ئەوەیە كە هەر وشەو وتەیەكی لە جێگای شیاوو تایبەتی خۆیایەو پەیوەستە بەووشەكانی دەوروبەری‌و ڕێك‌و پێكە لەگەڵ ئەو ماناو مەبەستەی كە ئەو وشەیەی تیا بەكار هێنراوە، بەجۆرێ دەست نادا بۆ گۆڕین‌و دەست كاری، لەم بارەیەوە چەند نموونەیەكمان كردووە لەم تەفسیرەدا لەمەوبەر، ئەوا لێرەشا دەست نیشان ئەكەم بۆ ئەمەی كەدێت: بێگومان شێوەی هاتنی ئاو بەتەكان لە ئاسمانەوەو دەرهاتنی شینایی‌و ڕووەك لەزەوی یەوە.... كە ئەم دووانە گیان‌و ژیان نیشان ئەدەن لە جۆرێ لە جۆرەكانیا، شێوەی ئەو دووانە وەك شێوەی ئەو ئاوە وایە كە بەتەكان هەڵئەقوڵێ لە ئێسكی پشت‌و سنگەوەو ئەڕژێتە ناو مناڵدان، لەگەڵ دەرهاتنی بێچوو لە تاریكی‌یەكانی مناڵدانەوە، ژیان هەر ژیانەو شێوەكە وەك یەكەو بزوتنەوەكەوەك یەكە. بەیاسایەكی دامەزراوو نەگۆڕاو، و هەردووەدەست كردی یەك پەروەردگارن‌و نیشانەیەكی ڕوون‌و ئاشكران لەسەر پەروەردگاریان كەبێ وێنەو هاوتایە لە هەموو بارو ڕوویەكەوە! هەرچۆنێ ڕێك‌و پێكی هەیە لەگەڵ شێوەی ئەستێرەكە كە بەڕووناكیەكەی كون ئەكاتە تاریكی‌و ئەو هەموو پەردەیانە لەت ئەكات، هەروەها لەگەڵ شێوەی دەرخستن‌و ئاشكراكردنی هەموو پۆشیدەو نهێنیەكانی دڵ‌و دەروون ئینجا زیاد لەوانە لەم سوێندی دووەمەدا دەست نیشان هەیە بەمەی كە بەم قورئانە دڵ‌و دەروون زیندوو ئەبێتەوەو ئەو هەموو خێرو بێرو بوومەی لێ دەستكەوت ئەبێ!!

لەپاش ئاماژەکردن بۆ ئەو هەموو مەبەستە گرنگانە وەلە پاش دەست نیشان کردن بۆ زیندووکردنەوەو دەرخستنی هەموو نیازو کردەوە نهێنیەکان، ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) بەدڵنیاکردن و ئارام پێدان و دڵخۆشکردن و بە گوێ پێنەدان و نرخ دانەنان بۆ ئەو هەموو پیلان و بەربەرەکانی و دوژمنایەتی و بەربەست و بەرهەڵستەی کە بت پەرستەکان پـێی هەڵئەسـان بەرانبـەر خـۆی و ئـەو تاقمـە کـەم و بێدەسـەڵاتەی کەلـە مەککـە دامـابوون بەدەسـت ئـەو گەلـە مـل هـوڕو سـەرکێش و بەدەسـەڵاتەوە، ڕووی فـەرموودەی تێئـەکات و ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا﴾ بەڕاسـتی ئەوانـە فـڕوفێڵ و پـیلان ئەکـەن بەتونـدی و هەرچـۆن لەدەسـتیان بێـت بـۆ نەهێشتنی ئیسلام و کوژاندنـەوەی ڕووناکیەکـەی ﴿وَأَكِيدُ كَيْدًا﴾ وەمنـیش بەرانبەر کردەوەی ئـەوان کـردەوە ئەکەم و تۆڵـەی ئـەو کـردەوە خراپانـەیان لـێ ئەسێنم، واتـە ئەوانە کەلەو ئاوە بێنرخە دروستکراون بەبێ هێـزو دەسـەڵات و بـەبێ ژیـریـی و زانین، ئەوانـە کەبەو شێوە دروستمان کردوون و دواڕۆژو چارەنوسیشیان گەڕانەوەیە بۆلای ئێمـە بـەجۆرێ هـەموو نهێنیـەکانیان دەرئـەخرێ و بـەبێ ئـەوەی هـیچ هێـزو پـەنا و دەسـەڵات و یارمـەتی دەریشان ببێ، ئەوانە پیلان و فڕوفێڵ ئەکەن و نیازی خراپیان هەیە لێتان.

منیش کەپەروەردگارو بەدەسەڵات و پارێزەرو چاودێرم و هەموو شتم بەدەستە بەرانبـەر کردەوەکانی ئەوان و دژیی ئەوان ڕەفتار ئەکەم ﴿فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ کەواتە مۆڵەتی بێبڕواکان بدەو پەلە مەکە لە تۆڵە لێ سەندنیان ﴿أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا﴾ دان بگرە بەخۆتا و کـەمێ بوەسـتەو لێیـان گـەڕێ تـا کـاتی خـۆی دێتـە پێـشەوە، بێگومـان ئـەو مۆڵـەت دان و دواخـستنی تۆڵـەو سـزایە هـەر

ئەندازەیەك ببێ هەر كەمە، با بەقەدەر هەموو تەمەنی جیهان بێت، چونكە هەموو تەمەنی جیهان هەر كەمەو چاو نادا لە حاستی سزای نەبڕاوەی دوانەهاتوویانا خوا پەنامان بدات لێی، ئەو دواخستنە بەرژەوەندیی و حیكمەتی تیایە نابێ هەرگیز پەلەی لێ بكرێ، ئەم ئایەتە هەرچۆنێ ئەو هەڕەشە سامناكەی تیا بۆ بێبڕواكان، هەروەها موژدەیەكی گەورەشی تیایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)و لەدوای ئەو بۆ یارەكانیی و هەموو بڕواداران، موژدەیەكی گەورەی لێ وەرئەگیرێ بەئەو پەڕی دڵخۆشكردن و پلەو پایە بەرزكردنەوەو بەكارهێنانی میهرەبانیی و خۆشەویستی، ئەوتا لەگەڵ ئەوەدا هەموو كاروبارێ بەدەست خوایەو لە دەستی پێغەمبەردا نیە (ﷺ) لێرەدا بەڕووالەت ئەوی كردووە بە خاوەن كارو فەرمانڕەوا وەك فەرموویەتی: كاری ئەوانە بەدەست تۆیە، بەلام پەلە مەكەو لێیان بووەستە كەمێ!! بەڕاستی ئاڕاستەكردنی ئەم جۆرە فەرموودەیانە تیماركەری هەموو زامێكەو مەڵهەم و دەرمانی هەموو ئێش و ئازارێكەو دەركەری هەموو داخ و دوویەكە.

فالحمد لله أولاً وآخر وصلى الله وسلم على من أنزل عليه هذا القرآن العظيم

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾

# سوورەتی «الأعلی»
## مەککەییەو (١٩) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیمامی عەلی)یەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم سوورەتەی خۆش ویستووە. وەلە صەحیحی (مسلم)دا ئەفەرموێ: کە پێغەمبەر(ﷺ) لەجەژنەکانو لە ڕۆژی جومعەدا ئەم سوورەتەو سوورەتی (الغاشیة)ی ئەخوێند، وە ئەگەر جومعەو جەژن بکەوتنایەتە ڕۆژێ هەر ئەیخوێندن واتە لە هەردوو نوێژەکەدا. بەڕاستی هەقی خۆی بووە ئەم سوورەتەی خۆش ویستبێ بەتێکڕایی ئەم بوونەوەرەی بۆ کردووە بە شوێنی خوا پەرستی بەجۆرێ هەموو کونو قوژبنێ دەنگ ئەداتەوە بە تەسبیحاتی خواو ناوو باسی خوا، وەکردووەیەتی بە پێشەنگایەك بۆ یادو سوپاسی. هەقی خۆی بووە خۆشی ویستبێ، کە موژدەی پێئەدا بە فێرکردنی قورئانو دڵنیاکردنی لەسەر بیرو لەیاد نەچوونیو بەڵێنی پێدا کەلە هەموو کارو باری ئایینەکەیا شتی سووكو ڕوونو ڕەوانی بۆ داناوە.

هەقی خۆی بووە خۆشی ویستبێ، کە باسی تاكو تەنهایی خواو ڕاستی سروشتی خواو تۆڵەو پاداشتی ڕۆژی دوایی تیایە، کە ئەم سێ شتە پێکهێنەری ئاقیدەو ئایینی خواو لەنامەو کتێبە پێشووەکانیشیا ئەم سیانە هاتوون، بێگومان ناسینی خوا گرنگ ترو لە پێش ترە لە هەموو شتێ، هەموو بیرو ژیرییە دەستەپاچەو داماوو کۆڵو کولە لە ناسینی زاتی پاکی مەگەر بەو ناوو سیفەتانەی کە خوا دایناون بۆ خۆیو ئیزنی داوە بە بەکارهێنانیانو ئەو ناوو سیفەتانەش ئەبێ لەسەر بارو شێوەیەك بەکاربهێنرێنو وەرگیرێن کە شیاوو شایستە بن بۆ خوا، جا ئەوا لەسەرەتای ئەم سوورەتەوە فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەیەوە ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ بە پاكو تەمیز ڕایبگرە ناوی پەروەردگارت کە بڵندترە لە هەموو کەسو هەموو شت، وە

بپپارێزە لە هەر شتێ کە شیاوو شایستە نیە بۆ ئەوو لەگەڵ ئەو، کەواتە ئەبێ ناوو سیفەتێکی بۆ بەکاربهێنرێ کەلە ئاینی ئیسلاما هاتبێ، ئینجا ئەبێ ماناو مەبەستێکی لێ بگیرێ کە بگونجێ بۆ خوا، بۆ وێنە: ناوو سیفەتی (الأعلى) کە لێرەدا هاتووە نابێ مەبەست بەرزیو بڵندی بێت لە جێگاو شوێنا، بەڵکو بەرزیو بڵندی لە رادەو پلەو پایەدا، بەکورتی ئەبێ بەجۆرێ بێت کەلە شەریعەتدا باس کراوەو رەوا دراوە، وەك روون کراوەتەوە لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکانا.

ناوبردنی خواو بەپاكو تەمیز ڕاگیرکردنی تەنها بە ووتنو بەدەمی رووت پێك نایەت، بەڵکو ئەبێ لە دەروونەوە دەست پێبکاتو ماناو مەبەستی ئەو سیفەتانە لە دڵا ئامادەببێ، دڵو دەروون بژی بە رووناکی پیتو فەڕیانەوە.

ئەم فەرمانە لەیەکەم جارەوە بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) وە کاتێ ئەم فەرمانە هات دەست بەجێ گوێ ڕایەڵی کردو فەرمووی: ﴿سبحان ربي الأعلى﴾ فەرمانی دابە موسڵمانان کە ئەوڕستەیە بڵێن لە سوجدەکانیانا، هەرچۆنێ کاتێ ئایەتی ﴿ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ هاتە خوارەوە، خۆی فەرمووی ﴿سبحان ربي العظيم﴾ وە فەرمانی دا کەئەو ڕستەیە بخەنە ڕکوعەکانیانەوە.

ئایا بۆچی فەرمووی: ناوەکەی بە پاك ڕاگرەو نەی فەرموو زاتی پەروەردگارت بە پاك ڕاگرە؟ لەوەڵاما ئەوترێ:

یەکەم: بەپاك ڕاگرتنی ناوەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ بەپاك ڕاگرتنی زاتی پاکی.

دووەم: ئەوەی کە دەست بدا بۆ پاك ڕاگرتن تەنها ناوو سیفەتەکانیەتی، وەئەوەی کە بیرو ژیریی بتوانێ پێی بگات هەر ئەو ناوو سیفەتانە، ئیتر هەموو بیرو ژیرییەیە لە حاستی زاتی بێوێنەی کولو کۆڵەو سەرگەردانە تیایاو بەهیچ کلۆج رووی تێناکات، مەگەر لەڕێگای ئەو ناوو سیفەتانەوە کە بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا هەن لەسەریانو ئایەتەکانی قورئان ڕێنموونیمان ئەکەن بۆیان، وەکو لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴾ ئەو پەروەردگارەتە کە هەموو شتی دروست کرد، ﴿فَسَوَّىٰ﴾ ئینجا وەك دروستی کرد ڕێكەو پێکی کردنو یەکسانی کردن لەمەدا کە بەلێ زانیو بەپێی بەرژەوەندی دروستی کردن، وە دروست کردنی هەموو جۆرێکی تێر تەواو کردو گەیاندیە ئەوپەڕی ڕادەو پلەیەك کەشیاو وشایانی ئەو جۆرە بێت.

﴿وَٱلَّذِى قَدَّرَ﴾ وە ئەو پەروەردگارەت کە بڕیاری داوەو دیناوە بۆ هەموو دروست کراوێ کارو پیشەو مەبەست لە دروست کردنی، وە هەموو جۆرێکی دروست کردووە لەسەر ئەندازێکی دیاریو تایبەتی لە هەموو بارو ڕوویەکییەوە، ﴿فَهَدَىٰ﴾ ئینجا ڕێنموونی کردووە بۆ ئەو کارو پیشەو مەبەستەی کەبۆی دروست کراوە، وە ئاراستەی کردووە بۆ ئەوەی پێویستە بۆیو پێویستی پێی هەیە، وە هەموو شتێ هەڵئەسێ بەکار وپیشەی خۆیو ئەوەی بۆی دانراوەو ئاراستە کراوە بۆی، بەجێی ئەهێنێ بە سورشت یا بەخواهیشو مەیلی خۆی. ئەمانەی کەباس کران لە هەموو ئەم بوونەوەرەدا هەن. گەورەو بچووکی، نرخدارو بێنرخی. هەموو جۆرە شتێ ڕێكو پێكو تێرو تەواو دروست کراوەو ئامادە کراوە بۆ بەجێهێنانی کارو فەرمانی خۆی. هەموو جۆرێ مەبەست لەبوونی دیاری کراوە، ڕێك خراوە بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە بە سووكو ئاسانی... وە هەموو دروست کراوەکان بە کۆو کۆمەڵی شیاوو گونجاونو ڕێك خراون بە سووكو ئاسانی بۆ هەڵسانو بەجێهێنانی کاری گشتی، هەرچۆنێ بەیەکە یەکەش ڕێك خراو ئامادەکراون بۆ بەجێهێنانی کاروفەرمانی تایبەتیو یەکەیەکە، هەر زەڕەیە بەتەنها ڕێكو پێکیو گونجاوی خراوەتە بەینی کارەباو نیوترۆنو ئەلەکترۆنی، بەوێنەی ڕێكو پێکیو گونجاویو هاوکاریەك کە هەیە بۆ کۆمەڵەی خۆری لە بەینی مانگو خۆرو ئەستێرەکانا، هەردوو وەك یەك ڕێگەی خۆیان ئەناسنو کارو فەرمانی خۆیان بەجێئەهێنن....

سێلو خانەیەکی زیندوو دروستکراوێکی تێرو تەواوەو ئامادەکراوە بۆ هەڵسانی بەکارو فەرمانی خۆی، هەرچۆنێ بەرزترین گیان لەبەر ڕێکخراوو ئامادەکراوە بۆ بەجێهێنانی کارو فەرمانی خۆی، لە زەڕەیەکەوە تا کۆمەڵی خۆری، هەروەها لە سێلو خانەیەکەوە تاگەورەترین گیان لەبەرچەندڕادەو پلەیەهەیە، هەموو ئەوانەش دروستکراوێکی تێرو تەواوو ئامادەکراون بۆ کارو پیشەی خۆیان شیاوو گونجاوو هاوکاری یەکترن، ئەم

بوونەوەرە شایەتێکی حازرو ئامادەیە لەسەر ئەوەی کە باسکرا. مەردوم ئەگەر دەرگای دڵی دانەخرابێ و بینایی سۆمایی لێ نەبڕابێ هەست بەڕاستی ئەم مەسەلەیە ئەکات، ئیتر ڕادەی زانیاریو خوێندەواری هەرچۆن بێ، ئەم مەسەلەیە هەرچەند ئاوا ڕوونو ئاشکرایە بەڵام پێویستە هەموو جارێ بڕوا تازە بکرێتەوەو بتەوتر بکرێت بەبیرکردنەوەو ئاوڕدانەوە بۆلای ئەم هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە کە خوا دایناون لەم بوونەوەرەدا، وەك قورئانیش لەم دوو ئایەتە کورتەدا دەست نیشانی بۆ کردینو لە دەیان ئایەتی تردا سەرنجمان ڕائەکێشێو فەرمان ئەدات بەو بیرکردنەوەیە.

لەم بارەیەوە پێم خۆش بوو چەند وێنەو نموونەیەك بخەمە بەرچاو کە سەرۆکی ئەکادیمی علوم لە نیۆیۆرك (أ. کریسی مۆریسۆن) باسی کردون لە کتێبی ناوبراوی بە (ئادەمی بەتەنها پایەدار نابێ) پێم خۆش بوو وێنەو نموونە لەو کتێبە بێنم بۆ ئەوەی موسڵمانان باشتر غیرەتیان بێتە جۆشو لەبەرئەوەی زۆر کەس لە ڕۆڵە نەشارەزاکانی ئیسلام قسەی ئەوانە باشتر کاریان لێ ئەکاتو بەقسەی ئەوانە باشتر دڵنیا ئەبن! ئەو زانایە ئەڵێت پەلەوەرو باڵندە هەرچەند بڕواو دووربکەوێتەوە هەڵە نابێتو ڕێ ئەباتەوە بەهێلانەو جێو شوێنەکەی، ئەوەتا ئەبینی چۆلەکەی بولبول کە هێلانەی کردووە لەبەرماڵەکەتاو لەپایزانا کۆچ ئەکات بەرەو خوار، بەڵام لەبەهارا کە ئەگەڕێتەوە دێتەوە بۆ هێلانەکەی خۆی.

لەمانگی ئەیلولدا چەند تاقم لە زۆربەی باڵندەی ئێمە ــ واتە ئەمریکاــ ئەفڕن بەرەو خوارووی وڵات، زۆر جار هەزار میل ئەبڕن بەسەر دەریادا بەڵام هەڵە نابنو ئەگەڕێنەوە بۆ جێگای خۆیان، کۆتر لەناو قەفەزا بەهۆی دەنگی ئەتاریو بەرەڵا ئەبێتو زۆر بەسەرگەردانی ئەگەڕێ لەپاشا دێتەوە بۆ شوێنەکەی بەبێ لێ تێکچوون، مێش هەنگ بۆشەك (خلیە) کەی خۆی ئەدۆزێتەوە لە هێلانەو لەناو دارو درەختەکانا هەرچەند بای سەختو بەتەوژم هەڵبکاتو هیچ نیشانەو بەڵگەیەکی بۆ نەهێڵێتەوە، جاڵجاڵۆکە خانووەکەی ئەتەنێ بەجۆرێ زۆر لە تەنینی ئادەمی ڕێكو پێکترە، ئەگەر ئادەمی زۆر جار هەڵەئەکاتو تەنراوەی دووبارە ئەکاتەوە ئەو هەرگیز ئەو هەڵەیەش ناکات، ئینجا کە ئەیتەنێ شتێکی لینجی لێ ئەدا وەك

سرنش و کەتیرە بەوە تەنراوەکەی ئەبەستێتەوەو قایمی ئەکات، کاتێ بایەك یا گێژەڵوکەیەك لێی بدات تێکی نادات وەلەبارێترەوە ئەو شتە لینجە ئەگەر مێشی پێوە نیشت ئەیگرێ بۆیو ئەبێ بە خۆراك بۆ جاڵجاڵۆکەکە، پەپولەیەکی مێ با هەڵیئەگرێو لە کونێکەوە ئەیکات بە ژوورێکا، جا دوای ماوەیەکی کەم ئیشارەتێ ئەدا بە نێرەکەی لەهەر شوێنێ بێ، ئەویش خێرا ئەو ئیشارەتە وەرئەگرێو وەڵامی ئەداتەوە دەی ئایا ئەو پەپولە مێیە ئێزگەی پەخشی پێیە؟ یا نێرەکە رادیۆی پێیە؟ تەلەفۆنو رادیۆ دوو شتی نایابن بۆ ئێمەو بە گورجی قسەو هەواڵمان ئەگەیەنن بەیەکتر، بەڵام خۆمان بە خۆمان هیچمان پێناکرێو ئەبێ ئەوانە بەکاربێنینو ببەسرێتەوە بەوانەوە، کەواتە پەپولەکە لە ئێمە پێشکەوتووترو باڵاترە کە پێویستی نیە بەو جۆرە شتانە خۆیان بەخۆیان کارەکەیان بەسەر ئەبەن!

زانای ناوبراو لە کتێبەکەیا ئەمانەو چەندەها شتی تری سەرسوڕهێنەر باس ئەکاتو ئەیانخاتە بەرچاو، لەلایەن مێرووڵەو چەند گیانلەبەری تر، ئاویو غەیرە ئاوی، وەلەبارەی درەختو ڕووەکەوە. ئینجا ئەڵێ بێگومان پەروەردگارێ هەیە ڕێنمونی ئەمانە ئەکات بۆ بەجێهێنانو بەدی هێنانی ئەو هەموو کارو کردەوەو شتە سەرسوڕهێنەرانە، بەڵێ بێگومان خوایەکی پەروەردگارهەیە ڕێنمونی ئەوانەو غەیری ئەوانە ئەکات لەو هەموو روستکراوانە، گەورەو بچووکیان، ئەو خوایەش ئەوەیە خۆی پێناساندین لەسەرەتای ئەم سوورەتەوە بە ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ۝١ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾....

ئەو چەند نموونەی کە باسمان کرد بەشێکی کەم بوو لەوەی ئەو زانایە لە کتێبەکەیا باسی کردووە، هەرچی ئەو زانایانەش وتوویەتی بەشێکی زۆر زۆر کەمە لەوەی کە ئادەمی ڕێی پێ بردووەو باسی کردووە لەبارەی ڕووەكو گیان لەبەرانەوە، هەرچیش وتراوە لەکۆنو لە تازەوە بەشێکی زۆر زۆر کەمە لەوەی کە ئەم دوو ئایەتە کورتە دەست نیشانی بۆ ئەکەن لەم بوونەوەرە گەورەو فراوانەدا کە ئێمە هیچی لێ نازانین مەگەر ئەندازەیە کە زۆر کەمترە لە کەم!!

﴿وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ﴾ وە پەروەردگارت کەسێکە کە هەموو جۆرە سەوزیو ڕووەکێکی لەزەوی دەرهێنا کە هەر جۆرێ بۆ خواردنێ جۆرە گیان دارێ دەست ئەداو چاكو شیاوە بۆی. بەڵێ خوای گەورە ئەم زەوییەی دروست کردو خۆراکی تیا دانا بۆ هەموو جۆرەگیان لەبەرێ کەبەسەرپشتیدا بگەڕێ یالەناوسکیداخۆی داشاردبێ یابەلای سەرووییەوە بفڕێ.

ئەو سەوزەو لەوەڕە لەیەکەم جاری‌یەوە سەوزە، لەپاشا بەرەو زەرد بوون ئەڕوا هەتا ئەبێ بەپووشو ڕەش دائەگیرسێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ﴾ ئینجا گێڕای بە پووشێکی ڕەش داگەڕاو، بێگومان بەسەوزی دەست ئەدا بۆ لەوەڕ، وە بە پووشی دەست ئەدات وەك لەو بەینەشا هەر دەست ئەدات، کەواتە لە هەموو بارو کاتێکا هەر بەکارە بۆ ئەم ژیانی جیهانە، بە فەرمانو بڕیاری خوای پەروەردگار. ئەوەی بەسەر ئەو لەوەڕەدێت کە یەکەم تەڕو تازەو شیرینەو بەماوەیەکی کەم ئەمرێو ئەبێ بە پووشو پەڵاش. ئەم بەسەرهاتە وێنەو نموونەیەو دەست نیشانە بۆ ژیانی جیهان کە چەند شیرینو دڵڕفێنەو کەچی بە ماوەیەکی کەم نامێنێو تێ‌پەڕئەکات...

لە پێشەوە باسی ڕێنموونی خوای کرد بە شێوەی گشتی. ئینجا بەڵێن ئەدا بە ڕێنموونی‌یەکی تایبەتی بە پێغەمبەر (ﷺ) کە گەورەترین موژدەیە لەیەکەم جارەوە بۆ ئەو لەپاشا بۆ ئوممەتەکەی. لەم بەڵێنو موژدەیەدا ڕابەرو موعجیزەیەکی گەورە بەدی هات. ئەوەتا بەم ئایەتە کەلە سەرەتای پێغەمبەرێتی‌یەوە هاتە خوارەوە هەواڵی دا بەهێنانە خوارەوەی ئەم قورئانەو فێرکردنیو لەبەرکردنو لە بیرنەچوونەوەی، ئەم هەواڵەش بەرێكو ڕاستی بەدی هات. ئەفەرموێ: ﴿سَنُقۡرِئُكَ﴾ ئێمە بە سروش قورئانت بۆ ئەنێرینو ئەتکەین بە خوێنەریو لەبەری ئەکەیت ﴿فَلَا تَنسَىٰٓ﴾ ئینجا تۆش لەبیرت ناچێتەوە ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ مەگەر ئەوەی کە خوا ویستبێتیو حەزی کردبێ.

ئەمە موژدەیەکی زۆر گەورە بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دڵنیاو دڵئارامی کرد لەبارەی ئەم قورئانەوە کە شیرین و خۆشەویست بوو لە دڵی بەفەرپاو زۆر بەسۆزو بە پەرۆشەوە خەریکی ئەبوو، وە زۆر غەمی لەبیر چوونەوەی بوو، تا ئەو ڕادەیە نە ئەوەستا تا (جوبرەئیل) لێ بێتەوەو بە پەلە لەگەڵی ئەی ووت. وەك لە سوورەتی (القیامة) دا باسی کرد، تا خوا موژدەی دایەو ئەرکی ئەوەی لە کۆڵ خست و مەترسی لەبیرچوونی لەدڵ دەرکرد.

لەپاش ئەوە ئەمە موژدەیەکی گەورە بوو بۆ ئوممەتەکەی، ئەمانیشی دڵنیاو دڵئارام کرد لەسەر بنەڕەتی ئایین و ئاقیدەکەیان. بەمەی لەلایەن خۆیەوە هاتووەو خۆی پارێزەریەتی و لەدڵی پێغەمبەرەکەیا ڕاگیرو دامەزراوی ئەکات. وە ئەمەش بەشێکە لەڕێزو گەورەیی ئەم ئایینە لای خوا، بەشێکە لە نرخ و بایەخ پێدانی لەتەرازووی خوادا، سەبارەت بەم ڕستەیە ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ زانایان چەند شتێکیان ووتووە، ئەوەی کەلە دڵا بەهێزترو جێگیرترین ئەمەیە کە مەبەست پێی ڕوونکردنەوەی بێسنووری و بەر مەرەخەسی خواهیش و مەیلی خوایە واتە پاش ئەو موژدەو بەڵێنی خوا کە دەست نادا بۆ گۆڕان و بۆ بەدی نەهاتن.

پاش ئەوەش هەر هێشتا شتەکە لەچوارچێوەی خواهیش و مەیلی خوا دەرناچێ و ئەگەر مەیل بکا لەبیری ئەچێتەوە، بێگومان ئەو مەیلەس ناکات. وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾ ئەگەر مەیل بکەین و بمانەوێ ئەوەی کە سروشمان کردووە بۆت نایهێڵین. بێگومان ئەزانین کە مەیل و خواستی ئەوەشی نەرکردوە، کەواتە لەسەر ئەم ڕایە بەڵێن و موژدەکە بەهێزتر ئەبێ، چونکە وانیشان ئەدات کە بەهیچ ڕەنگ لەبیرچوون ڕوو نادا و هیچ هۆیە نیە بۆی بێجگە لە مەیل و خواهیشی خوا کە ئەوەش ئاشکرایە نابێ...

جێگیرکردن و دامەزراندنی بڕوا بەبێ سنووری و بەر مەرەخەسی مەیل و خواهیشی خوا لەدڵ و دەروونا زۆر بەکەڵك و بەکارە بۆ بەندە بۆ ئەوەی هەمیشە خوای لەیادبێ لە هەموو کاروبارێکیا. وە بۆ بەهێزکردنی بەندەیی بۆ خواو چاو لەبەری بۆی و لە خۆنەگۆڕان لە هەر کردەوەیەکی چاك کە پێی هەڵسێ.

جا لەبەر گەوەریی و بەنرخی ئەو بڕوایە قورئان لەگەڵێ لە ئایەتەکانیا خەریك ئەبێ بۆ فەراهەم هێنان و بەهێزکردنی ئەو بڕوایەخوای میهرەبان ئەو موژدە گەورەیەیدا ﴿إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ﴾، چونکە بەڕاستی ئەو خوایە زانایەو ئاگاردارە بە هەموو شتێکی ئاشکراو هەرچی پۆشیدەو نهێنییە. کەواتە زانیویەتی ئەو بەڵێن و موژدەیە زۆر بەجێیەو پڕ لەبەرژەوەندییە، لەبەرئەوە موژدەکەی داو بەدی هێنا. ئینجا موژدەو بەڵێنی تر ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە گشتی یەئەفەرموێ: ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ﴾ ئێمەیارمەتی تۆ ئەدەین هۆشیارو گەنجاوت ئەکەین بێگیر و گرفت بۆ ڕەفتارکردن بەئایین و شەریعەتێ کەسووك و ئاسانە وەرگرتن و تێگەیشتن لێی. ئەمە هەرچۆنێ موژدەیەکی گەورەیە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەیەکەم جارەوەو لە پاشا بۆ ئوممەتەکەی. هەروەها سروشتی ئایینەکە دەرئەخات، وە حەقیقەتی بانگ و بانگەوازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون ئەکاتەوەو سوودو کەڵکی ئاشکرائەکات بۆ ژیان و جیهان. ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) کە خوا خستێیە سەر ئەو ڕێگاو بەرنامە ڕاست و ڕەوانە، ئەو ڕێگا سووك و ئاسانەی دایە بەر لە هەموو ژیانیا.

کەواتە بە هیچ کلۆج نارێکی و دژایەتی نەبوو لەم بوونەوەرەدا مەگەر لەگەڵ ئەو کەسانەی کەلایاندا لەڕێگاو هێڵی ڕاستی ئەم بوون و بوونەوەرە گەورەیە، ئەوانەش هیچ جۆرە کێش و نرخێکیان نییە کاتێ کە بەراوورد کرێن لەگەڵ ئەم جیهان و بوونەوەرەدا ئەو ڕێگا ڕاستەی دایە بەر بەسووك و ئاسانی. سووك و ئاسانی لەدەستیا، لەزوبانیا، لە هەموو هەنگاوێکیا، لەکردەوەیا، لەبیرو بۆچوونیا، لە هەموو کارو باری و ژارەسەکردنی هەموو کارو باری لەگەڵ خۆی و لەگەڵ مەردوما، بەڵێ پێغەمبەرمان (ﷺ) بەو جۆرە بووە لە هەموو کارێکا. لەهەر دوو کارێك کە بخرایەتە دەست و ئارەزووی خۆی هەمیشە ئاسانتریانی هەڵئەبژارد. وەك لەحەدیسێکی صەحیحدا هەیە کە (بوخاری) و (موسلیم) ئەیهێنن لەدایکی ئیمانداران (عایشە)-خوا لێی ڕازی بێ- هەروەها لە حەدیسێ تردا کەلە صەحیحی (بوخاری)دا هەیە هەر لە دایکی ئیماندارانەوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو کەس نەرم و نیانتر بووە لەناو ماڵ و خێزانیا، زۆر دەم بە پێکەنین و زەردەخەنە بووە لەناویانا. وە بەحەدیسێ تری صەحیحی (بوخاری) دا ئەفەرموێ: ئەگەر کارەکەرو کەنیزەکێ ئیشێکی

پێی بکەوتایە بەسووك و ئاسانی ئەچوو بەدی‌یەوە، واتە هیچ ڕەنگ دەعیەو دوماری نەبووە تانانەت لەحاستی کارەکەرێکیشدا!

لە پۆشاك و خۆراك و پێ‌خەف و هەر شتێ تردا هەمیشە کام سووك و ئاسان و کەم ئەرك بووبێ ئەوەی هەڵبژاردووە بۆ خۆی. وەك باسکراوە لە کتێبەکانی سیرەتا، هەرکەس ئەیەوێ بەدرێژی ئاگادار ببێ با سەرنجی ئەو کتێبانە بدات بەتایبەتی کتێبی (زاد المعاد). وە لەبارەی فەرماندان و هاندانی لەسەر بەکارهێنانی سووك و ئاسانی نایەتە ژمارەو باس کردن لە پێش هەموو شتێکدا کارو کردەوەی ئایین و ئاقیدەو خوا پەرستی کەداوا ئەکات و فەرمان ئەدا بەسووك و ئاسانی ببرێ بەڕێوە، بەبێ زۆر لە خۆهێنان و زۆرە ملەیی، یەکێ لەو فەرموودەیانە ئەم حەدیسەیە کە (بوخاری) ئەیهێنێ: (إن هذا الدين يسر) بەڕاستی ئەم ئایینە سووك و ئاسانە، (ولن يشاد الدين احد إلا غلبه) وە هەرکەس ئەم ئایینە بەسەخت و گرانی بگرێ و زۆرە ملێی تیا بەکار بێنێ هەرگیز پێی بەجێ نایەو پەکی ئەکەوێ. واتە ئەوەی پێویست کراوە لەسەری بەجێی بێنێ و ئیتر هەر ئەندازەیەك پێی کرا بەئاسانی بیکات و زیاد لەوە خۆی تەنگەتاو نەکات. وەلە حەدیسێ تری (بوخاری)دا ئیسلام (ان المنبت لا ارضاً قطع ولا ظهراً ابقى) بەڕاستی ئەو کەسەی کەلە سواری دا بەتەواوی ولاغ تاو ئەدات نەهیچ ڕێگاو مەسافەیەك ئەبڕێ و نەهیچ ولاغێکیش ئەمێڵێتەوە بۆ خۆی، واتە هەرکەس بیوێ هەموو کارو فەرمانی ئایین بەجێ‌بێنێ پێی بەجێ نایەو پەکی ئەکەوێ، وەك سوارێ کە بەتەواوی تاو بدات و هێز ببڕێ لەولاغەکەی، ئەو ولاغەی پەکی ئەکەوێ و نامێنێ و هیچ ڕێگاش نابڕێ.

لەباری مامەڵەو کڕین و فرۆشتنەوە(بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ: (رحم الله امرءاً سمحاً) میهرەبانی خوا بۆ کەسێ کەچاو پۆشی کەربێت (اذا باع) کاتێ ئەفرۆشێ (واذا اشترى) وەکاتێ ئەکڕێ (واذا اقتضى) وە کاتێ داوای قەرزئەکات و ئەیسێنێتەوە...

سووك و ئاسانی لە دڵی پیرۆزی پێغەمبەر دا (ﷺ) جێگیرو خۆشەویست بوو. وەسەختی و تەنگی بێزرو بووە تا ڕادەیە ناوێ سووك و ئاسانی بیگەیەنێ پێی خۆش بووەو بێزار بووە لەناوێ کە سەختی و تەنگی پیشان بدات، لەم بارەیشەوە (بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ لە (سەعیدی کوڕی موسەیەب)ەوە کەباوکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا فەرمووی پێی: ناوت چیە؟ ئەویش ووتی: (قزن) - واتە سەخت و گران - ئەمیش فەرمووی: نەخێر تۆ

(سهل)یت ئەویش ئەڵێ: ناوێ كە باوكم لێی ناوم نایگۆڕم! (سەعید) ئەفەرموێ: ئینجا دوای ئەوە ئیتر سەختیی و ناڕەحەتی لە ئێمە نەبڕاو هەر مایەوە.

ڕەوشت و سیرەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەمووی چەند لاپەڕەیەكە لە ئاسانی و چاوپۆشی و نەرم و نیانی لە هەموو كارو بارێا. بۆ وێنە: جارێ پیاوێكی كۆچەرو لادێی دێتە خزمەتی داوای شتێكی لێ ئەكات ئەویش شتەكەی پێئەدا ئینجا پێی ئەفەرموێ: چاكەم كرد لەگەڵت؟ ئەویش ئەڵێ نەخێر چاكەت نەكردو چاك نەجوڵایتەوە لەگەڵم! بەهۆی ئەوە موسڵمانان خەشمناك ئەبن و هەڵئەسن بۆی، پێغەمبەریش (ﷺ) ئیشارە ئەكات بەوەی وازی لێ بێنن. ئینجا ئەچێتەوە ماڵ و ئەنێرێ بە دوای كابراداو شتێ تری ئەداتێ. ئینجا ئەفەرموێ: ئایا چاكەم كرد لەگەڵت؟ كابراش ئەڵێ: بەڵێ: خوا پاداشتت بەخێر بداتەوە ئینجا ئەفەرموێ: تۆ كاتی خۆی لەناو هاوەڵەكانما ئەوەت ووت كە ووتت ئەوان دڵگران بوون پێی، ئینجا ئەگەر حەز ئەكەیت ئەوەی كە ئێستا ووتت لای من لەناو ئەوانیش دا بیڵێ، با ئەوەی لە دڵیانا هەیە دەربارەی تۆ با نەمێنێ، ئەویش ئەڵێ: بەڵێ باشە. ئینجا بۆ بەیانی دێت و، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێ: ئەم پیاوە ئەوەی ووت كەووتی، ئینجا من شتێ ترم دایە لای وایە ئێستا ڕازی بووە، ئینجا ڕووی كردە كابراو فەرمووی: ئایا وایە؟ كابراش ووتی بەڵێ، خوا پاداشتی چاكەت بداتەوە، لەپاشا فەرمووی: وێنەو من و ئەم پیاوە وەك پیاوێ وایە كە حوشترێكی ببێ و یاخی بووبێ لێی، لەپاشا مەردوم بكەونە دوای بۆئەوەی بیگرن، كەچی تابێ یاخی تر ببێ، ئینجا خاوەن حوشترەكە بانگی ئەو مەردومانە بكا بڵی لێی گەڕێن بۆ خۆن چونكە باشتر ئەیناسم و بەزەییم هەیە بۆی، ئینجا ئەو خاوەنە بچێ بۆی و گیا و پوشی بۆ ببا تا وورده وورده بیهێنێتەوە و لەبەردەمیا خۆی خوس بدات و ئەویش بارەكەی بخاتە سەر پشت و خۆیشی بقونێتە سەری، ئەگەر من جڵەوگیری ئێوەم نەكردایە و بتان كوشتایە ئەچووە ئاگر، ئابەو جۆرە سووك و ئاسانی و نەرم و نیانی و بەو دڵ و دەروونەوە یاخی و تاراوەكانی ڕام ئەكردن و ڕاینەكێشان بۆ گوێڕایەڵی خوا. وێنەو نموونەی زۆرو زەبەنە هەیە لە ڕەووشت و سیرەتیا كە هەموو بەرهەمی ئەو موژدەیەبوو كە پەروەردگاری پێیدا، ئەو ئادەمیە بەرزو بەڕێزو خۆشەویست و ڕێنموونی كراو بۆ ئاینێ و بەرنامەی ڕاست و ڕەوان و سووك و ئاسان خوا بەو جۆرو شێوەیە هێنای بۆئەمەی ئەو بانگكردنەی خواو ئەو سپاردە گەورەیە هەڵگرێ و بیگەیەنێ بە ئادەمی و جیهان، بەو جۆرەی خوا ویستی گەیاندی، خوا پاداشتی بداتەوە لەباتی ئەو ئایینە گەورەو ئەم ئادەمی و جیهانە.

هەر کەس لەگەڵ ئەم شەریعەت و بەرنامەی خوادا بگەڕێ لە هەموو کات و شوێن و بەسەرهاتا سووک و ئاسانی ئەبینێ، وە هەر گرێیە بێتە ڕێگای بۆی ئەکاتەوە، لە هەموو تەنگاوی و نارەحەتیەکا گوشادی و ڕەحەتی داناوە، ئاقیدەو بڕوایەکی سووک و بێگرێ و بەئاسانی ئەچێتە دڵەوەو ژیریی وەریئەگرێ، تەنها خوایەکی پەروەردگارو بێ وێنە کە هەموو شتی دروستکردووە لەناو بەندەکانیا پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی بەندەکانی خوا بگێڕنەوە بۆلای پەروەردگاریان و تێیان بگەیەنن مەبەست لە بوون و دروستکردنیان، ئینجا ئەرک و تەکلیفیان بەپێی دەسەڵات و توانایە. لەکاتی تەنگی و ناچاریدا قەدەغەکانی ڕەواداوە بەو جۆرو شێوەی کە زانیان فەرموویانە!

لەپاش ئەو دوو موژدەگەورەیەی کە دای بە پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا فەرمانی پێئەدا بە ڕاگەیاندنی ئایین و پەیامەکەی کە سەرانسەر پەندو ئامۆژگاریە، ئەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ﴾ ئینجا ئامۆژگاری بکە، ئامۆژگاری مەروم بکە بەوەی سروشمان کرد بۆت ﴿إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ ئەگەر ئامۆژگاری سوود بگەیەنێ، بێگومان ئامۆژگاری سوودی هەر ئەبێ کەم یا زۆر هەرگیز هیچ چین و تاقمێ و هیچ وڵاتێ خاڵی نابێ لە گوێگرو سوود وەرگر، هەرچەند خراپە وڵات دابگرێ و دڵ ڕەق و تاریک ببێ، بێگومان ئامۆژگاری پێویست بووە لە پێغەمبەر (ﷺ) سوودی بووبێ یان نا کەواتە مەبەست لەم ڕستەیە چیە ئەگەر ئامۆژگاری سوود بدات؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: مەبەست نەنگ گرتن و تەشەردانە لەو تاقمە سەرکێشانەی کە خۆیان بەزل دائەناو گوێیان نە ئەگرت، بەوەی کە دوورە ئامۆژگاری کاریان تێبکات، وە مەبەست هەوڵدانە بەدڵ ڕەقی و دڵمۆرکراوی ئەوانە، وە باوە بەکارهێنانی ئەم ڕستەیە بۆ کەسێ کە خەریک بێت بە ئامۆژگاری ئەو جۆرە کەسانە.

سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿١٣﴾

**یا ئەڵێین: مەبەست بەرگری کردنی پێغەمبەربوو (ﷺ) لەو هەموو داخ و مەراقەی کە ئەیچەشت لەسەر بڕوا نەهێنانی ئەو تاقمە سەرکێشە کە بە هەموو جۆر خەریك ئەبوو لەگەڵیان و ئامۆژگاریەکەی کاری لێ نەئەکردن واتە پاش ئەوەی تۆ هەڵسای بە ئەرك و پێویستی سەر شانتا ئیتر تۆ هیچت لەسەر نیەو مەردوم بە ئارەزووی خۆیان دوو جۆرو دوو تاقمن و هەر جۆرو تاقمێ ڕێگای تایبەتی و کردەوەی تایبەتی خۆی هەڵئەبژێرێ و هەرکام ئەگات بە سەرئەنجام و بەرهەمی ڕێگاو کردەوەی خۆی، وەك دەرئەکەوێ کە ئەفەرموێ:**

**﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ﴾ بیر ئەکاتەوەو ئامۆژگاریەکەی تۆ وەرئەگرێ هەرکەسێ کە لە خوا ئەترسێ، بە هۆی ئەو ترس و بیمە گوێڕایەڵی ئەکات و ئەگەڕێتەوە لە خراپەکاری، هەر دڵێ کە زیندوو بێت ئەزانێ ئەم بوونەوەرە خوایەکی داناو کاردروستی هەیە، ئەو حەلە ئەزانێ کە هەروا لە خۆڕایی دروستی نەکردووەو ئەم ئادەمیەی بەرەڵا ناکات بەبێ لێپرسینەوە، وە ئەبێ تۆڵەو پاداشتی بڕیار دابێ بۆ کردەوەیان، کەواتە هەر بەو زانینە بیم و ترس پەیدا ئەکات و ئەگەر ئامۆژگاری کرا وەری ئەگرێ.**

**﴿وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى﴾ وە خۆی دوور ئەگرێ لە ئامۆژگاریت بەدبەخت ترو خراپ ترین کەس، واتە ئەو کەسەی کە سوورو دامەزراوە لەسەر بێبڕوایی و بە هیچ ڕەنگ دان نانێ بە زیندوو بوونەوەدا. ئەو کەسەی کە ئاوا بێت بە بەدبەختی ئەژی لە جیهانا، چونکە ڕۆح و دڵێکی تاریك و مردووی هەیەو تێنەگەیشتووەو بێئارامەو تێر نابێ و هەمیشە وا لە بەربەرەکانێ داو لە ڕۆژی دواییشدا بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾ کە کەسێکە ئەچێتە ناو ئاگری گەورە، واتە ئاگری دۆزەخ کە گەورەیە بە هێزو تینەکەی، وە گەورەیە بە ماوەکەی کە هەتا هەتاییەو نەبڕاوەیە، خراپتر لە هەموو شت ئەمەیە ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا﴾ لەپاش تێچوون نامرێ لە ناویا تا بەوە ڕزگار ببێ،﴿وَلَا يَحۡيَىٰ﴾ وە ناژیت بە ژیانێ کە هیچ سوودێکی ببێ، بەڵکو بەو سزایەوە ئەژی کە ئاوات بۆ مەرگ ئەخوازێ و مردن ئاوات و ئامانجێکی بەرزە بۆی ئەگەر دەستی بکەوێ!**

قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿١٦﴾ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ
﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾

**ئینجا بەرانبەر ئەو بەدبەختە ئەو کەسەیە کە ئەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ﴾ بەڕاستی ڕزگار ئەبێ و ئەگا بە ئامانج کەسێ کە لە جیهانا خۆی پاك کردەوە لە بێبڕوایی و بەدخویی و بەدکرداری، ﴿وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ﴾ وە ناوی پەروەردگاری خۆی بردو بە دڵیش یادی کرد. بێگومان ئەوحەلە گەورەیی خوا لەدڵیاجێگیر ئەبێ و سام و بیمی خوا ئەکەوێتە دڵی ﴿فَصَلَّىٰ﴾ بە هۆی ئەوە مل کەچ و گوێڕایەڵ بوو بۆی، یا نوێژی بەجێ هێنا.**

**بەڵێ بێگومان هەرکەس لە جیهانا بەو جۆرە بێت ڕزگار بوون و گەیشتن بە ئامانج مسۆگەرە بۆی، لە جیهان و لە ڕۆژی دوایی دا، لە جیهانا ئەژی بە ڕۆحێکی ڕووناك و دڵێکی زیندووبە هۆی ناسین و یادی خوا و شیرینی باس و یادەکەی، ئینجا لە ڕۆژی دوایش دا ڕزگارە لە سزاو ئاگری گەورەو گەیشتووە بەنازو ڕێزی نەبڕاوەی بەهەشت. کەواتە پاشە ڕۆژو چارەنووسی ئەمە لە کوێ و پاشە ڕۆژو چارەنووسی بەدبەختەکە لەکوێ؟**

**ئینجا لەم کاتەدا ڕووی فەرموودە ئەکاتە بێبڕوا بەدبەختەکان و هۆی بەدبەختی و بێئاگایی و لادانیان لە ڕێگای ڕزگاری باس ئەکات تا سەریان لە ئاگری گەورەوە دەرچوو. ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا﴾ واتە ئێوە ئەو شتانە ناکەن کە هۆی ڕزگار بوونتانە، بەڵکو ئێوە ژیانی جیهان هەڵ ئەبژێرن و باوی ئەدەن بەسەر ڕۆژی دوایی دا. کە ئەوەش مایەی هەموو تاوان و هەڵەو خراپیەکەی، وە هۆی تەمێ وەرنەگرتن و خۆ دوور خستنەوەیە لە ئامۆژگاری، لەگەڵ ئەوەدا ئێوە هەڵی ئەبژێرن ﴿وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾ لەکاتێکا کە ژیانی کە ژیانی ڕۆژی دوایی چاك ترو بەرزترو بەردەوام ترە، کەواتە ئەپەڕی نەفامی و نەزانییە باودانی ئەم ژیانی ئێستای کەم و کورت و پڕداخ و دووە بەسەر ئەو ژیانە بەرزو بەڕێزو دوانەهاتووەدا.**

**ئینجا لە کۆتایی سوورەتەکەدا ئاماژە ئەکات بۆ یەکێتی ئەم ئایین و ئاقیدەیە لەگەڵ ئایین و ئاقیدەکانی تر کە لە ئاسمانەوە هاتوون، کەواتە شتێکی تازە پەیدا بوونییە بەڵکو هەر لە کۆنەوە هاتووەو ڕیشەو پەلی کوتاوە بە هەموو جیهانا بە درێژایی هەموو چەرخ و**

بـــەپانی هـــەموووولات. ئەفـــەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾ بەڕاســـتی ئەمـــەی کەلـــەم ســـێ ئایەتـــە ڕابوردووەدایـە. یـا ئـەوەی لـەم سـوورەتەدایە ﴿لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ﴾ لـە نامـە پێشووەکانایە. ﴿صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ﴾ لەنامەکانی ئیبراهیمو موسادایە کە هێندێکن لە نامە پێشووەکان.

بێگومـان ئـەوەی لـەم سوورەتەدا هـاتووە، یـا ئـەوەی لـەو سـێ ئایەتـەدا هـاتووە بنیـاتو بنەڕەتە گەورەکانی هەموو ئاینو ئاقیدەکانی ئاسمانە. بەگۆڕینی ئاینو نامەکان ئەمانە نەگۆڕاون. کەواتە هەر کەس بڕوای بە نامەو ئایینەکانی تر هەیە با بڕوایشی ببێ بەم ئاینو نامەیە، چونکە لەگەڵ ئەوان یەکە. ئەوەی کە جیاوازیێت لەناو ئایینـەکانی خـوادا شێوەی خوا پەرستیو هێندێ کاروباری ژیانە کە پەیوەستیو پەیوەندیان بووە بەکاتو چەرخو چینێکی تایبەتییەوە.

بێگومـان ئـەبێ هـەموو ئایینـەکان لـەبنیاتو بنـەڕەتا یـەك بنو هـەر یـەك شت بگرنـەوە، چونکە هەموو ئایینەکانی خوا ڕاستن، وە لە هەموو جۆرێکیشا ڕاست ئەبێ یـەك شـت بێـت. ئەوەتا هەر بەپێی یاسایەکی ئەندازەو ئەندازیاری ڕێگاو هێڵی ڕاست ئەبێ تەنها یەکێك بێت، بێگومان تاكو تەنهایی خواو تاكو تەنهایی ئەو خواهیشو مەیلەی کە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرانی پێویست کرد، هەر ئەو تاكو تەنهایی یەش داخوازە بۆ ئەو یەکێتی ئاینو ئاقیدەیە... هـەموو یـەك ئـاینو ڕێگـای ڕاسـتە، ئەگەڕێتـەوە بـۆ یـەك سەرچـاوە جیـاوازی یەکـەیان ــ وەك ووتمـان ــ لـە ڕووی هێنـدێ شـتی تایبەتی‌یەوەیـە کـە سـەرەکی نینو لـە سنووری بنەڕەتو سەرەکی‌یەکان دەرناچن، ئەوەش بەپێی جیاوازی چەرخو چینەکان بوو، وە لەبـەر چـەند هۆیـەکی تایبـەتی بـووە. هەمووشـی ئەگەڕێتـەوەو یـەك ئـەگرن لـەو تـەنها بنەڕەتەدا. کەلە یەك سەرچاوەوە هاتووە...

هـاتووە لەلایەن پەروەردگاری پایە بەرزەوە کە هـەموو شتی دروست کردو ئینجا وەك دروستی کردن ڕێكو پێکی کردنو یەکسانی کردن لەمـەدا کە هـەمووی بەلێ زانی کراوەو بەپێی بەرژەوەندین. ئاسمان بەم جۆرە ئەم سوورەتە بەرزەش دوایی هات.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمدو آله وصحبه

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ (١) وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ (٢) عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ (٣) تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً (٤)
تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ (٥) لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ (٦) لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ (٧)

## سووەرتی «الغاشیە»
## مەککەیی یەو (٢٦) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە یەکێکە لەوانەی کە هاندەرو پاڵ پێوەنەرن بۆ وورد بوونەوەو بیر کردنەوە، بۆ ئومێدو چاوەڕوانی، بۆ ترس و بیم کردن، بۆ هەوڵ و تێکۆشان بۆ پاشە ڕۆژو ڕۆژی دوایی! ئەم سوورەتە ئاوڕ ئەداتەوە بەدڵی ئادەمی و سەرنجی ڕائەکێشێ بە دووشت: ڕۆژی دوایی و جیهانە فراوانەکەی. وە بۆ ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەی کە وان بەرچاوانەوە لەم بوونەوەرەدا. لەپاش ئەوە تەمێ و ئامۆژگاری مەردوم ئەکات بە حیساب و پرسیاری ڕۆژی دوایی و دەسەڵات و زاڵی خواو، گەڕانەوە بە ناچاری بۆلای خوا. هەموو ئەوانەش ئەکات بە جۆرو شێوەیەکی زۆر بەکار، بە هێواش و لە سەرخۆ، بەڵام چاك ئەچێتە دڵەوەو جێگیر ئەبێ، زۆر سامناکیشە. لەیەکەم جارەوە شێوە پرسیاریێ ئاڕاستە ئەکات کە گەورەیی و گرنگی پرسیار لێ کراوەکە نیشان ئەدات. بەو شێوەیە بەکار ئەهێنرێ بۆ وورِیا کردنەوە تا باش گوێی بۆ بگیرێ و بیری لێ بکرێتەوە. ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ ئایا پێت گەیشتووە هەواڵ و دەنگ و باسی ڕۆژی دوایی کەناوێ لەناوەکانی (الغاشية)یە، واتە ئەو ڕووداوە زۆر گەورەو ناهەموارەی کەدێت بەخۆی و هەموو سزاو دەردێکی یەوەو ئەدا بەسەر هەموو شتێکاو هەموو کەس داگیر ئەکات؟ پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کاتێ ئەم فەرموودەیەی ئاڕاستە کراو بیستی دڵی گەورەو بەفەڕی هەستی کرد بە گەورەیی و قورسی ئەم ئاڕاستە کردنە بۆ شەخسی خۆی، هەر کاتێ ئەم سوورەتەی ئەبیست، وەك ئەو یەکەم جار بێ وەری گرێ و ببیستێ لە ڕێوە لەخوا، لەبەر بەتینی

هەستیاری دڵ بەو فەرموودەیە. (ئیبن و ئەبوحاتەم) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیبن و مەیمونە)وە کە جارێ پێغەمبەر (ﷺ) ڕائەبوورێ بەلای ئافرەتێکدا ئەم سوورەتە ئەخوێنێ. ئینجا ئەوەستێ و گوێ شل ئەکات و ئەفەرموێ: (بەڵێ بێگومان پێم گەیشت).

ئەم فەرموودەیە هەر چەند ئاڕاستەی پێغەمبەر (ﷺ) کراوە بەڵام گشتی یە بۆ هەرکەس کە گوێی لەم قورئانە بێت. چونکە ئەم هەواڵ و دەنگ و باسە هینی ئەم قورئانەیە کە چەند بارەی ئەکاتەوە، ئامۆژگاری پێ ئەکات و بەم هەڕەشە و موژدە ئاڕاستە ئەکات، هەستیاری و بیم و ترس و خۆپارێزی پێ ئەهێنێتە جۆش لە دەروونا. هەر چۆنێ چاوەڕوانی و ئومێدیشی پێ هەڵئەگرێنێ جا بەهۆی ئەوە ئەو دەروونانە هەمیشە ووریا ئەبن و نامرن و بێئاگانابن.

ئینجا هێندێ لە هەواڵ و بەسەرهاتی ئەو ڕۆژە ئەهێنێ و ئەیخاتە بەرچاو ئەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ﴾ چەند ڕوویەك لەو ڕۆژەدا بیم و ترس دارو شەرمەزارو داماو و سەر شۆڕن ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾ ئیش کەرێکی شەکەت و ماندوون، ئیش کەرو ماندوو بوون لەدنیادا، بەڵام بەرهەمەکەی لەو ڕۆژەدا سزاو زیانبارییە، چونکە کارو کردەوەکانیان بۆ خوا نەبووە و لە ڕێگای خوادا ماندوو نەبوون بەڵکو بەو کردەوانە خوایان لە خۆیان ڕەنجاندووە یائیش کەرێکی شەکەتن لەو ڕۆژەدا. بەم ڕەنگە هەمیشە کۆت و زنجیر ڕائەکێشن و گێرەی پێوە ئەکەن لە مەیدانی حەشرو لەناو دۆزەخا ﴿تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً﴾ ئەچنە ناو ئاگرێکی گەرم و بەتاو بەجۆرێ سزاو گەرمی یەکەی ئەچەژن وە کاتێ تینوویان بوو ﴿تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ﴾ ئاو ئەدرێن لە کانی یەك کە گەیشتۆتە ئەوپەڕی لەگەرمیدا، وەکاتێ کەبرسی یان بوو﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾ هیچ خۆراکێکیان بۆ نیە مەگەر لەوێنەی گیای حوشتر خواری ووشك کە ﴿لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ﴾ نەکەس قەڵەو ئەکات و نەکەس بێ پێویست ئەکات لە برسێتی بێگومان ئەو حوشتر خوارەش لە ئاگرە، وەك زەقوم و ژەقنەمووت. شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئێمەی ئەم دنیایە تێناگەین بەتەواوی لەڕادە و چۆنێتی ئێش و ئازاری سزای ڕۆژی دوایی. ئەوەی ئێمە وەری گرین و تێی بگەین لە باسی ئەم جۆرە سزادارانەوە: ئاگری بەتین، ئاوی بەکوڵی تەواو گەرم، خۆراکی دڕکینی وەك حوشترخوارە.

وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾

---

ئەوەی لەم جۆرە باسانە وەری گرین ئەمەیە سزاو ئێش و ئازارە کە ئەگاتە ئەپەڕی ڕادەو پلە. سزای ئەو ڕۆژو جیهانە زۆر لەوە بەتین و بەهێزترە کەبە خەیاڵی ئێمەدا دێت. هیچ کەس بە شێوە ڕاستەقینەکەی تێی ناگات مەگەر ئەوانەی کە ئەچەژن! پەنا ئەگرین بە خوا کە بەمیهرەبانی خۆی ئەوەمان پێ نەچەژێ ـ ئامین ـ لەبارەی یەك کەوتنی ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتی (الحاقة)دا کە ئەفەرموێ: خۆراکیان هەر لە (غسلین)ە، وە لە سوورەتی (الواقعە)و (الصافات) دا ئەفەرموێ: لەدرەختی زەقوم ئەخۆن لەبارەی یەك کەوتنی ئەمانەو دوور خستنەوەی تەپ و تۆزی دژایەتی یەکە بەڕواڵەت ئەکەونە بەرچاو لەو بارەیەوە لە سوورەتی (الحاقة)دا ئەندازەیە دوایین با سەرنج بدرێ تا ئەو تارمایییە ڕەشە لە پێش چاوی نەشارەزاون ببێت. ئینجا بەرانبەر ئەو سزاو ئازارەی کە باسی کرد بۆ ئەو تاقمە. باسی هێندێ لە خۆشی و نازو ڕێزو کامەرانی تاقمێ‌تر ئەکات کە لەجیهانا ڕێگایە تریان داوەتەبەر لێرەدا باسی ئەوتاقمەوئەو سزایەی پێش خست بەبۆنەی ناوی (الغاشیة) وە کەبیم و ترس و سزای لێ وەرگیرێ. ئەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ﴾ چەند ڕوویەك لەو ڕۆژە دا جوان و شیرینن ولەخۆشیدا ئەدرەوشێنەوە. ﴿لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ﴾ ڕازین لە کۆشش و کردەوەی دنیایان، چونکە بوو بەهۆی ڕەزاوبەزەیی خوا ئینجاوەسف و سەنای جێگا و شوێنەکەیان ئەکات لە حەوت بارەوە:

أ- ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾ وان لەبەهەشتێکی بەرزو بڵندا. بەرزو بڵند چ لە شوێن و جێگادا، وەچ لەڕادەو ڕێزو قەدردا.

ب- ﴿لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً﴾ نابیسن لەو بەهەشتەدا هیچ قسەیەکی پڕو پوچ و بێ‌سوود، کەواتە هەمیشە ئەژین بە ئەوپەڕی ئارام و ئاسایش و ئاشتی و خۆشەیستی و ڕەزامەندی و ڕابواردنی پاك و خاوێن لە هەموو گەردو لەکەیەك... ژیانی ئاوا بەتەنها و بەبێ هیچی تر ژیانێکی بەختەوەری و کامەرانییە، خۆشی ئەو ژیانە کاتێ دەرئەکەوێ کە بەراووردی بکەین لەگەڵ ژیانی ئەم جیهانە کە بڕە لە قسەی پڕوپوچ و بێ شەرمی و ئاژاوەو بەربەرەکانی و چەقەو چیرە، وەبەم ڕستەیە تێمان ئەگەیەنێ کە ژیانی گەل و کۆمەڵی ئیماندارانی ڕاستەقینە، کەلەناو خۆیانا بەو شێوە پاك و خاوێنە بەسەری

ئەبەن، ژیانی ئەوانە لەم جیهانەدا بەش‌و نموونەیەکە لە ژیانی بەهەشتیان‌و هەر لە ئێستەوە خۆیانی بۆ ئامادەئەکەن‌و خۆیانی پێ‌شایستە ئەکەن بۆ ئەو ژیانە بێ وێنەی بەهەشتە، هەر ژیانێ بەو جۆرە پاك‌و خاوێن ئەبێ بێ نرخ‌و بێ‌کەڵکە. با هەموو کلورو نازو نیعمەتی لەگەڵ بێت!

جا لەبەرئەوە لە پێشەوە باسی ئەوەی کردو لەپاش ئەوە هاتە سەر باسی نازو نیعمەتە جۆر بەجۆرەکانی تر بەم پێنج خاڵەیان:

ا- ﴿فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ﴾ لەو بەهەشتەدایە کانی سەرچاوەیە کە هەمیشە هەڵئەقوڵێ‌و دێت‌و ئەچێ. ئاوی کانی‌و چەشمەی ئاوا چەندە خواردنەوەی خۆشە، زیاتر جوان‌و دڵڕفێنە.

ب- ﴿فِيهَا سُرُرٌ مَرْفُوعَةٌ﴾ تیایەتی چەند تەخت‌و کورسی‌یە کە بەرزکراون، بەجۆرێ کە خاوەنەکەی بەسەری‌یەوە دانیشت ئەوەی پێی خۆش بێ ئەیبینێ.

ت- ﴿وَأَكْوَابٌ مَوْضُوعَةٌ﴾ وە چەند پیاڵەو پەرداخێ کە دانراون‌و ئامادەکراون بۆ پێ خوارنەوە.

پ- ﴿وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ﴾ وە چەند پشتی‌و پاڵپشتێکی ڕیز کراو،

ج- ﴿وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ﴾ وە چەند قاڵی‌و هۆرتەی نایابی ڕەنگا‌و ڕەنگ‌و گوڵ گوڵێنێ کە ڕاخراون لە هەر شوێنێ کە پێویست بێت.

ئەمانە چەند شتێ بوون کە دانیشتوانی زەوی وێنەو نموونەی دیون. وە ئەمانەو وێنەیان باس ئەکرێن بۆ نزیك خستنەوەی ڕادەی نازو نیعمەت‌و خۆشی بەهەشت لە تێگەیشتنی دانیشتوانی زەوی‌یەوە. ئەگینا ئەم لە کوێ‌و ئەو لەکوێ؟

لەپاش ئەوەی بەشێ لە تۆڵەو سزاو پاداش‌و نازو ڕێزی ڕۆژی دوایی خستە بەرچاو، ئینجا سەرنج ڕائەکێشێ‌و ئاوڕ ئەداتەوە بەمەردم بۆ بەشێکی گرنگ لە بەرهەمی دەسەڵاتی خوا کە نیشانەیەکی ڕوون‌و ئاشکران لەسەر لێزانی‌و کار دروستی خوا، بەجۆرێ هەموو داناو ژیرێ ئەزانێ کە پێویستە بوونی ژیان‌و جیهانێکی تر بێجگە لەم ژیان‌و جیهانە. وە بۆئەو مەبەستە چوار شتی ئاشکراو دیاری ئەخاتە بەرچاو.

ئاسمان‌و زەوی‌و کێوەکان‌و حوشتر. باسی حوشترو کۆکردنەوەی لەگەڵ ئەو سیانەدا کە بەدیمەن زۆر دوورە لێیانەوەو پەیوەستی نی‌یە پێ‌یانەوە لەم بارەوەیە کەئەو گەلەی یەکەم جار ئەم قورئانەی هاتە سەرو چوو بە گوێچکەیا عەرەب بوون. دانیشتوانی عەرەبی ئەو چەرخەش بێ کشتوکاڵ بوون. کەواتە ناچاربوون بچن بە وڵاتانا بەسواری حوشترو بەباری

حوشتر خۆراك‌و ڕۆزی بێنن. لەو كۆچ‌و كاروانەداهات‌و چۆو گوزەریان بەدەشت‌و دۆڵ‌و ناو شاخەكانا بوو، كەواتە هەمیشە ئەو چوار شتەیە پێش چاویانەوە بوو، لەدڵ‌و خەیاڵیانا كۆبوون. ئەوەتا یەكەم جار سەرنجیان بدایە ئەو حوشترەیان ئەدی كە بەسەر پشتی‌یەوە بوون، كاتێ سەریان بەرز ئەكردەوە ئاسمانیان ئەبینی‌و تەماشای ئەم لاویان ئەكرد شاخەكان لەبەر چاویان بوون، وەكاتێ سەرنجی خواریان ئەدا زەوی یان ئەدی‌و بێجگە لەوەش كە حوشتر بەو جۆرە بوو، بەڕێزترین ماڵیان بوو. بێجگە لەوە حوشتر دروست كراوێكی نایابی تایبەتییە، بەوێنەی ئاسمان‌و زەوی‌و كێوەكان، پڕە لەبەڵگەو نیشانەی ئاشكرا لەسەر زانین‌و توانین‌و كار دروستی خوا. ئەوەتا بەجۆرێ دروستكراوە جیاواز لە گیان لەبەرو حەیواناتی تر، وەشیاوو گونجاوە لەگەڵ وڵات‌و مەبەست‌و ئامانجی دانیشتوانی وڵاتا، بەم ڕەنگە:

ا- گیاندارێكی بەرزو باڵا بەرزە كەواتەسوارەكانی لەو وڵاتە زۆر گەرمەدا كەمتر گەرمایان ئەبێ. چونكە لەبەر بەرزی هەوا ئەیگرێ‌و دوورە لەبۆن‌و هەڵمی گەرمی زەوی.

ب- زۆر بەهێزەو باری زۆر قورس هەڵئەگرێ.

ت- بەو گەورەیی‌و باری زۆر قورسەوە ئەتوانێ بەناو لم‌و دەشتا بڕواو نەنیشێ، چونكە پێكانی پان‌و گەورە دروست كراون.

پ- بەپێی كەم لەوەڕی وڵاتەكە، كەم خۆرەو هەموو جۆرە شتێكیش ئەخوات كە حەیوان‌و ئاژەڵی تر نایخۆن، بۆ وێنە حوشتر خوار كەلەو وڵاتەدا زۆرترەو حوشتر چاك ئەیخوات‌و پێی ئەژی.

ج- زۆر بەرگە گرە بۆ تینوێتی تا ڕادەیەكە كە بیست سەعات ئەتوانێ بەو باری زۆر قورسەوە بڕوا لەو خاك‌و وڵاتە زۆر گەرمەدا. كەواتە زۆر گونجاوە لەگەڵ كەم ئاوی ئەو وڵاتەدا.

ح- ئەو گیان لەبەرە بەرزە بە پێوە بار ناكرێ. لەبەر ئەوە وا دروست كراوە بە تێ‌خوڕینی منداڵێ یخ ئەدرێ تا بەئاسانی باربكرێ. ئینجا بەو باری گرانەوە بە فەرمانی منداڵێ ڕاست ئەبێتەوەو ئەوەندە بەهێزە باكی لەو بارە گرانە نیەو بە ئاسانی ڕاست ئەبێتەوە.

خ- زیادە ئەژنۆو جومگە دروست كراوە بۆ چوار پەل، ئەگینا لەكاتی یخ دا دانە ئەمووچایەوە.

كەواتە هەر ئەوە ڕاستو بەجێیە کەلێرەدا لە پێشەوە ئاوڕ ئەداتەوە بە یەکەم چینو گەل بە تایبەتیو هەموو کەس بە شێوەی گشتی. ئاووڕیان پێئەداتەوە بۆ وورد بوونەوە لەم گیان لەبەرە گرنگەو ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ﴾ واتە ئایا ئەوانە کوێرو نابینان تا وورد نابنەوە وئاوڕنادەنەوە بۆلای حوشتر ﴿كَيْفَ خُلِقَتْ﴾ کە چۆن دروست کراوە؟ دەی با سەرنج بدەنو وورد ببنەوە لەو هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانە تا بەهۆی ئەوەوە بڕوا بێنن.

بێگومان ئەزانن کە خۆیان بەهیچ ڕەنگ دەخلیان نییە لە دروست کردنی ئەو گیان لەبەرەدا، وە ئەو گیان لەبەرەش خۆی دروست نەکردووە، کەواتە هیچ بارێتر نەمایەوە ئەمە نەبێ کە خوای پەروەردگاری بەدەسەلاتی زانای کار دروست دای هێناوە، ﴿وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ ئایا تەماشای ئاسمان ناکەن ﴿كَيْفَ رُفِعَتْ﴾ کەچۆن بەرز کراوەتەوە؟

لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئانا باسی ئاسمان کراوەو سەرنجی مەردومی بۆ ڕاکێشراوە، بێگومان مافی خۆیەتی، چونکە ئاسمان دروست کراوێکی زۆر سەر سووڕهێنەرە، با زۆر بەسادەیش سەرنج بدرێو بیری لێ بکرێتەوە. نازانی تەماشای کوێی بکەیتو بیر لە کوێی بکەیتەوە. تەماشای مانگو خۆرەکەی بکەیت. تەماشای ڕۆژە ڕووناکەکەیو، لای ئێوارەو ئاوابوونو نەمانی ڕووناکی یەکەی بکەیت. هاتنی تاریکییە پانو پۆڕەکەیو ئەستێرە شیرینەکانی کەپرژو بڵاوبوونەوەوهەریەکەشێوەو ڕەنگێکی جیاوازیان هەیەو ئەدرەوشێنەوە و پێئەکەنن بەدەم مەردومەوە. تەماشای هەڵهاتنی مانگو خۆرو ئەستێرەکانی، تەماشای هەر شتێکی ئەکەیت هەر سەرسام ئەبیت. دەی با بێبڕواکان وورد ببنەوەو بیرێ بکەنەوە ئایا کێ ئەم ئاسمانەی ڕاگیر کردو وەستانی بەبێستوونو پایە؟ کێ ئەو هەموو ئەستێرەی تیا بڵاوکردەوە کە نایەنەژمارە؟ کێ ئاوا ڕازاندییەوەو شیرینی کرد؟ بێگومان هیچ کەس ناتوانێ بڵێ: دەخلم هەیە لەهیچ شتێکیا. ئاسمان خۆشی خۆی بەو جۆرە لێ نەکردووە. کەواتە ئەبێ داهێنەرو بەرزکەرەوەو ڕاگیر کەرێکی ببێ. ئەمەش ئەوەندە ڕوونو ئاشکرایە هیچ زانینو زانیاریو خۆماندووکردنی ناوێ، بەڵکو سەرنج دانو تەماشا کردنێکی ڕووت بەسە بۆ ئەو مەبەستە ئەگەر سەرنج دەرەکە بێ هۆشو دڵ مردوو نەبێ. تەماشا کردن بەم شێوە سادەییەبەسەچ جای سەرنجدانو ووردبونەوە لەوهەمووشتەنایابە سەرسوڕهێنەرانەی کەلە زانیاری تازەدا دەرکەوتوونو بەرەبەرە دەرئەکەونو خەڵکی پێ ئاشنا ئەبن!!

وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ
عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾

---

﴿وَإِلَى ٱلْجِبَالِ﴾ وە تەماشایەکی کێوەکان ناکەن ﴿كَيْفَ نُصِبَتْ﴾ کە چۆن ڕاگیر کراون بە دامەزراوی‌و بەبێ جم‌و جوڵ، وەك مێخ داکوتراون بەزەییدا. ئەم کێوانە ــ وەك لە قورئانەوە دەرئەکەوێ ــ لەنگەری زەوی ئەگرن‌و هۆی دامەزران‌و تاسە نەکردنی زەوین، وەنیشانەی ڕێ‌و بانن بۆ ڕێبواران، و هۆی چەشمەو کانیاوەکانن. بێجگە لەمانەش کێوەکان قەڵاو پەنان بۆ ئادەمی‌و گیان لەبەرانی دوژمن دار، دیمەن‌و ڕواڵەتێکی شیرینیان هەیە بۆ تەماشاکەران،و جێگای دوور کەوتنەوەن لە چەقەو قاڵەو قیژەی خەڵکی‌و ئیش‌و فەرمانە پەستەکانیان، لە تەماشاکردنیان سام‌و شکۆیە لەدڵی مەردوما پەیدا ئەبێ بە جۆرێ هەست ئەکات بەزەبوونی و بچووکی‌و مل کەچی خۆی.

﴿وَإِلَى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا سەرنجی زەوی نادەن ﴿كَيْفَ سُطِحَتْ﴾ کە چۆن ڕاخراوە؟ ئەم زەوییە ڕاخراوەو وا بە بەرچاوەوە، ڕێك‌و پێك خراوە بۆ ژیان بە سەریەوەو گەڕان‌و ئیش‌و کار تیایا، هیچ کەس نیە بتوانێ بڵێ: من دەخلم هەیە لەوەدا، وە خۆیشی خۆی ڕانەخستووە.... دەی ئایا ئەو بێبڕوایانە ورد نابنەوەو پرسیار ناکەن: ئایا کێ ڕای خست‌و ئامادەی کرد بۆ ژیان؟ بێگومان هەرکام لەمانەی کە باس کران بەسە بۆ ئەوەی ویژدان‌و دەروون بهێنێتە سۆزو پەرۆش،و دڵ زیندوو بکاتەوە بە بڕواهێنان بە داهێنەرو پەروەردگاری بێهاوتا، گیان‌و ڕۆح بخاتە سەر ڕێگا بەرەو خوای میهرەبان‌و پەرستن‌و گوێڕایەڵی بۆی بە تاك‌و تەنها.

لەپاش ئەوەی ئاوڕی دایەوە بە دڵو دەروون‌و گێڕای بەو جیهانەداو هێندێ لە سزاو نازو نیعمەتی ئەوێی خستە بەرچاو، لەپاش ئەوە سەرنجی ڕاکێشا بۆ وورد بوونەوە لە هێندێ لە دروست کراوەکانی خوا کە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونن لەسەر خوایەتی خواو دەسەڵاتی بەسەر زیندوو کردنەوەو هێنانی ڕۆژی دوایی دا لەپاش ئەوە ئینجا کارو پیشەی پێغەمبەر (ﷺ) دیاری ئەکات بەرانبەر خەڵکی، کە بریتیە لە تەمێ‌و ئامۆژگاری‌و ڕاگەیاندنی ئەو ئایینەی کە بۆی هاتووە، ئەو حەلە هەر دڵێ زیندووو وشیار بێت بەوە گوێ ڕایەڵ ئەبێت‌و تەمێ وەرئەگرێ، هەر دڵێکیش بێ هۆش‌و بێ فەڕ بێت ئەوە چارەسەری بە دەست ئەم نیەو شایستەی ئەوە نیە ئەم ئەوەندە داخ‌و مەراقی بۆبخواو لێی گەڕێ بۆ سزای خوا،

ئەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ﴾ کەواتە ئەی پێغەمبەر بە تەمێو ئامۆژگاری، خوا و ڕۆژی دوایی و هەرچی پێویستە بیری مەردومی بخەرەوە، چونکە ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ﴾ تۆ هەر بیر خەرەوەی، ئیتر بێجگە لەوە هیچ شتێکت بۆ نیەو هیچ شتێکت لەسەر نیەو ناتوانی بڕوا ببەیتە دڵی مەردومەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾ تۆ دەسەڵات دار نیت بەسەر ئەواناو کاری دڵی ئەوان بە دەست تۆ نیە، تا بە زۆر بڕوایان پێ بێنی، بەڵکو کاری هەموو دڵێ هەر بە دەست خوایە، هیچ کەسی تر دەسەڵاتی نیە بە سەریا، وە جەنگو کوشتارو هەر تێکۆشانێ تر کە پێویست کرا بۆ ئەوە نەبووە کە بە زۆر بڕوا بە مەردوم بهێنرێ، بەڵکو هەر بۆ دەست گرتنی دەست درێژی کەر بووەو نەهێشتنی ڕێگرو بەرگری کەری ڕێگای خواو ڕاگەیاندنی ئایینی خواو بڵاو کردنەوەی بانگو بانگەوازەکەی خوا ئەمە شتێکی ڕوونو ئاشکرایە لە ئایینی ئیسلاما بە پێی قورئانو کردەوەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)و بە پێی بڕیارو کردەوەی هەموو جێنشینەکانو هاوەڵەکانی -خوا لێیان ڕازی بێ- هەروەها بڕیاری هەموو پێشەواو زانایانی موسڵمانانیشی لەسەرە، کەواتە هەموو فیکو فاکو پڕوپاگەندەی دوژمنانو داخ لە دڵانی ئیسلام و موسڵمانانی لەم بارەیەوە دەریای بێ پەی ئیسلامی پێ لێڵ نابێو شایستەی ئەوە نیە هیچ جۆرە نرخێکی پێبدرێ. ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە ئەم تەفسیرە پێی هەڵساوە لە چەند سورەتێکا با سەرنج بدرێن.

دیاری کردنی ئەم کارو پیشەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لێرەدا فەرمووی لە چەند سوورەتێ ترا وتراوە لەبەر چەند هۆیە، یەکەمو سەردەستەی ئەو هۆیانە ئارام دانە بەدڵی بەفەڕی پێغەمبەرو نەهێشتنی داخو مەراقێکە کە ڕووی تێئەکرد لەسەر بڕوانەهێنانی سەرکێشە نەفامەکان، وە دڵخۆش کردنی بەوەی کەئەوهیچ سوچی نیەلەوەدا، ئینجاوەك پێغەمبەر(ﷺ) دەسەڵاتی نیە بە سەریاناو کاری ئەو هەر پەندو ئامۆژگاریو بیرخستنەوەیە، ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناو نایهێنن لەپاش تەمێو بیرخستنەوە ئەوانە قوتار نابنو خوا وازیان لێ ناهێنێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ﴾ بەڵام هەرکەس پشتی هەڵکردبێ لە جیهانا لەو بیر خستنەوە،

**وە بڕوای نەهێنابێ بە ئایینە ڕاستەکەی خوا ﴿ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴾ ئەو کەسە خوا سزاو ئازاری ئەدات بە سزاو ئازاری هەرە گەورە لە ڕۆژی دوایی دا کە هیچ سزایەکی پێ ناگات. ئینجا بۆ زیادە دڵنیایی کردنو باوەڕ بەهێزکردن بەو تۆڵە سەندنە ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴾ بەڕاستی هەر بۆلای ئێمەیە گەڕانەوەیان ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾ پاشان بەڕاستی هەر لە ئێمەیە لێپرسینەوەیان، ئاسمان بەم شێوەیە سوورەتەکەی دوایی هێنا، وە بەم جۆرە کارو پیشەی پێغەمبەری (ﷺ) دیاری کرد، هەروەها کارو پیشەی هەرکەسێ کە بەڕاستی ڕێبازی ئەوی دابێتە بەرو بیداتە بەر، بەڵام پێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێ کە بەشێ لەو کارو پیشەو بیرخستنەوە (جیهاد)ە بە هەموو جۆرو شێوەیەکەوە بە پێی توانا کە دواترینو بەرزترین پلەی جەنگو کوشتارو فیداکارییە، کەواتە هەوڵدان تەنها بە زوبانو بە نووسین بەس نیە، داواکارین لە خوای میهرەبان یارمەتیمان بدات بۆ تێکۆشان لە ڕێگای بەرزکردنەوەی ئاڵای ئایینە بەرزەکەیا.**

**وصلى الله وسلم على سيد المجاهدين وعلى آله وصحبه الأكرمين وكل تابع لهم بإحسان إلى يوم الدين**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡفَجۡرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ﴿٤﴾

## سووەرتی ﴿الفجر﴾
## مەككەیی یەو(٣٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە بە شێوە گشتیەكەی ئەڵقەیەكە لە ئەڵقەكانی ئەم جزمە لە بانگ كردنی دڵی ئادەمیدا بۆ بڕواهێنان و لە خوا ترسان و وریایی و بیركردنەوە. لە یەكەم جارەوە سوێند ئەخوات بە چەند شتێ كە چەند ڕایە هەیە لە ڕاڤەیانا، لەناو ئەوانەدا ڕایە هەڵنەبژێرین كە بە لامانەوە بەهێزترە ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *وَٱلۡفَجۡرِ﴾ سوێند بەو كاتەی كە شەو ئەڕواو شەبەق ئەدا، ﴿وَلَيَالٍ عَشۡرٖ﴾وە سوێند بە شەوانێ كە (دە)ن، بێگومان ئەو دە شەوە ئەبێ بەڕێزو پیرۆز بن، ئیتر یەكەم دە شەوی مانگی قوربان بن، یا یەكەم دە شەوی مانگی (محرّم)، یا دە شەوی دوایی مانگی مانگی ڕەمەزان. یا هەر دە شەوێ تر، هەرچۆن مەبەست بن هەڵنەگرێو خوا هیچ كامی دیاری نەكردوون، كەواتە چاك وایە كە ئێمەش بەو شێوە نادیاریە بەسەریا تێپەڕ بكەین ﴿وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ﴾ وە سوێند بە نوێژی جووت و تاك، یا بە هەموو جووت و تاكێ ئەو حەلە جووتەكە هەموو دروستكراوەكانی خوا ئەگرێتەوە، وە تاكەكەش تەنها خوای تاك و تەنهایە، ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ﴾ وە سوێند بە شەو كاتێ ئەگەڕێو دێت و ئەڕوا، بێگومان ئەم سوێند پێخوراوانە هەروا وتەو وشەیەكی ڕووت نین بەڵكو ئەمانە هەناسەو نەسیمێكی ناسكیان هەیە، نەو ئاونگێكی نەرمو بۆن خۆشیان هەیە، مێشك و دەماخ و دەروون ئەژێننەوەو پاراوی ئەكەنەوە، بە نەرمی و بە هێواش ئەچرپێنن بەگوێچكەی ڕۆح و ژیرییەوەو پەروەردگاری بیر ئەخەنەوە، زانین و كاردروستی و دەسەڵاتی ئەخەنە بەرچاو، كەواتە زۆر گرنگن،

هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ ﴿٥﴾ أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ﴿١٢﴾

وەك بەم شێوە پرسیارەش ئاماژەیان بۆ ئەکات: ﴿هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ﴾ئایا لەم شتە گرنگانەدا کە باس کران سوێند پێخواردنێ هەیە بۆ خاوەن ژیریی، کە بەس بێت بۆیو دڵنیا ببێ پێی؟ واتە بەڕاستی بۆ مەردومی ژیر ئەمانە بەسنو دڵنیا کەرن بۆی، چونکە زۆر بەکەڵكو بەکارنو ئەبێ ژیر سوودو بەهرەیان لێ وەرگرێ. سوێند لەسەر خوراوەکەی باس نەکرد، چونکە بەباشی وەرئەگیرێ لەم چەند ئایەتەی کە دێن، نە وتنی بەهێزترەو باشتر مایەی جێگیر بوونیەتی لەدڵا، چونکە گوێگر لەپاش بیرکردنەوەو ورد بوونەوە ئەیزانێو وەری ئەگرێ، لەسەر چەند شێوەو بارێ وەری ئەگرێ وەك هەرکام لەمانە: بێبڕوا یاخیەکان لەناو ئەبەمو تۆڵەیان لێ ئەسەنم، ئەم بێبڕوا سەرکێشانە لە چنگمان دەرناچنهەرچەند ماوەیە مۆڵەت بدرێنو ڕابوێرن، تۆڵەو سزای خوای تۆ لە کەمینایە بۆ بێبڕوا یاخیەکان، هەرکام لەمانەو وێنەیان وەرئەگیرێن لە باسی تۆڵەسەندنو لەناوبردنی ئەم سێ گەلە کە بەهێزترو یاخی تری هەموو گەلانی ڕابردوون لە مێژووی کۆنا، کەلەم چەندئایەتە کورتانەدا کۆی کردنەوەوفەرمووی: ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ ئایا نەتزانیوە بەزانینێ وەك دیتن ﴿كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ﴾ کە پەروەردگارت چۆنیکرد بە (عاد)و چی بەسەر هێنان؟

ئەم گەلە ئەوەیە کە ناوبراوە بە ﴿إِرَمَ﴾ یش، کەواتە (عاد)ی یەکەمن ئوممەتی هود پێغەمبەر بوون (علیه السلام) نیشتەجێ بوون لەلای خوارووی نیوە دورگە لە بەینی (حضرموت)و (یمن)دا، ﴿ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ﴾ کە خاوەنی خێوەتو ئەستون بوونو خێوەت نشین بوون یا مەبەست ئەوەیە خاوەن پایەو هێزو دەسەڵات بوون، بەهەر حاڵ ئەو گەلە قورئان لە شوێنی تریشدا باسی هێزو دەسەڵاتیان ئەکات، وەك لێرەدا ئەیانکات بە دەسەڵات دار ترو بەهێزترین گەل لەناو هەموو گەلانی پێش خۆیانا، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ کە وێنەیان دروست نەکراوە لە وڵاتانا تا ئەو چەرخو سەردەمە! ﴿وَثَمُودَ﴾ وە ئایا نەتزانیوە کە خوای تۆچی کرد بە (ثمود)ی ئوممەتی (صالح) پێغەمبەر (علیه السلام) کە نیشتەجێ بوون لە (حجر)دا لەناوەندی حیجازو شاما ﴿ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ﴾ کە گەلێکی وابوون شاخیان

بڕیبووو داتاشی بوو، بۆ خانوو تیا دائەنیشتن لەو شیوو دۆڵەی کە کردیان بەجێ و شوێن بۆ خۆیان ﴿وَفِرۡعَوۡنَ﴾ وە ئایا نەتزانی کە خوای تۆچی کردو چۆنی کرد بە (فیرعەون) کە حوکمڕان و پادشای میصر بوو، لەچەرخی موسا پێغەمبەرا (علیه السلام) ئەو فیرعەونەی ﴿ذِی ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ کە خاوەنی مێخەکان بوو. ئیتر ئایا مەبەست بەم ووتەیە زۆری لەشکرو سوپاکەی بێت کە خێوەتی زۆریان بووەو خێوەتیش بە سەنگ و مێخی زۆر ڕاگیرئەبێ، یا مەبەست ئەو مێخانە بێت کە ئەڵێن: سزای خەڵکی پێئەداو ئەیبەستنەوەو چوار مێخەی پێئەکردن. یا مەبەست ئەو ئەهرامانە بێت کەوەك مێخ داکوترا بوون بەزەوی داو ئێستاش نموونەیان ماوە لە میصرا. کە نیشانەن لە سەر هێزو دەسەلات و شکۆی (فیرعەون). جا لەبەرئەوە دڵ بۆئەم مەبەستی سێیەمەزیادئەڕواو باشتر وەری ئەگرێ. ئەوسێ گەلە ﴿ٱلَّذِینَ﴾ کەسانێك بوون کە ﴿طَغَوۡاْ فِی ٱلۡبِلَـٰدِ﴾ لە وولاتی خۆیانا یاخی بوون و لە سنووری دادو ڕاستی دەرچوون. وە بەرهەمی سەرکێشیش هەر تاوان و خراپەکارییە. وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَأَكۡثَرُواْ فِیهَا ٱلۡفَسَادَ﴾ ئینجا خراپەیان زۆر کرد لە وولاتا، چونکە یاخی بوون هەر چۆنێ هۆی خراپی یاخێیەکەیە، هەروەها هۆی خراپی و تێك چوونی ئەو گەلەشە کە ئەو یاخی گەرێتێیەی لەگەڵ ئەکرێ و هەموو شیرازەو پەیوەستێیەکی ژیان تێك ئەدات و ئەی پچڕێنێ لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، ژیان لە ڕێگای ڕاست و سروشتی خۆی ئەترازێنێ بۆ ڕێگایەکی چەوتی پڕ لە کۆسپ و دڕك و داڵ کە بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ لەگەڵ کارو پیشە گرنگەکەی ئادەمی کە دروست کراوە بۆ هەڵسانی پێ ی: ئەوەش کە بریتێیە لەکاروباری جێنشینی لە زەویدا! وەهۆی ئەمانەش ئەوەیە کە یاخی بوون کابرای یاخی ئەکات بەدیل و بەندەی ئەڵقە لەگوێ بۆ ئارەزووی نەفسی خۆی. کەواتە لە سنوورێکی دیاری دا ناوەستێ و تەرازوویەکی ڕاستی دامەزراوی نابێ. دیارە ئەوەش ئەوپەڕی خراپی و تێك چوونە. ئینجاکەیاخییە کەوای لێ هات و ئەوەی بەسەرهات، بێگومان ئەیەوێ گەل و کۆمەڵە بکات بە بەندەیەکی زەبوونی ژێر بار بۆ خۆی و وازناهێنێ تا گەل بەو جۆرەی بەسەر نەیەت، ئەو حەلەش ئەو گەلە داری بەسەر بەردێیەوە نامێنێ، بۆگەن ئەکات و هەستی ئازادی و سەربەستی و ڕێزی ئادەمێتی تیا لە کارئەکەوێ و ئەکوژێتەوە، هەمیشە بەداخ و کینەو بێئارامیەوە ژیان بەسەر ئەبات، وە ئەبێ بەلەوەڕگا بۆ کرم و ماری بەد خوویی و ناپیاوی و بێناموسی، مەردی و کردەوەو ڕەوشتی بەرزی لە بیرئەچێتەوە.

ئینجا ئەو یاخیـیە بە هەموو جۆر ئەیەویٚ نەفامی و نەزانی و کەودەنی و تێنەگەیشتن پەرەپێبدا لەناو گەلدا، بۆئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو گەلە هۆشێ نەکاتەوەو هەوڵێ نەدا بۆ تێکدان و ڕووخاندنی ئەو تەخت و بەختە ناڕەوایەی کە ئەو یاخیـیەی لەسەر ئەژی، جا ئیتر چ خراپەو تێکچوونێ لەمانە پێشترە کە باسکران! ئەو سێ گەلە بەو جۆرەی بەسەرهات و لەکار کەوتن، کەواتە پێویست بوو پاك کردنەوەی زەوی لێیان و لەناوبردنی ئەو تۆوە پیسە ﴿فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ﴾ بەهۆی ئەوە پەروەردگاری تۆ بەتوندی و بەزۆری چەند جۆرێ لە سزاو تۆڵەی خست بەسەریان و دای گرتنەوە پێیان تا دوایی لەناوی بردن و لە ڕیشەی هێنان، ناوبردنی سزاکەیان بە ﴿سَوۡطَ﴾ کە بەقەمچی ئەووترێ یالەبەرئەوەیە سزاو تۆڵەکەیان پێکهاتبوو لە چەند جۆرێ هەرکام لەوانە ئێش و ئازاری خۆی ئەگەیاند و ئەوانی تری پێ سەخت تر ئەبوو، بەوێنەی قەمچی کە پێکدێت لە چەند تەڵێ و هەرکام تینی خۆی هەیەو تەڵەکانی تریش بەتین تر ئەکات، یا لەبەرئەوەیە هەرجۆرە سزایە کە دووچاری ئەوانە کرا هەرچەندە سەخت و بەتین بوون، بەلاّم ئەگەر بەراوورد بکرێن لەگەڵ سزای ڕۆژی دواییدا، ئەو سزایانە هەموو وەك قەمچی وان لە چاو سزای ڕۆژی دواییاندا.

لەبارێ ترەوە باسی قەمچی لەگەڵ ئەو سەرکێش و یاخیانەو باسی سزادانیان بە قەمچی زۆر شیرین و بەجێیە، چونکە ئادەمی کەلە ڕێگا ڕاستەکەی خۆی لایدا وەك ووڵاخی یاخی و سەرکێش وایە، ئەو جۆرە ووڵاخانەش زۆرتر بە قەمچی دائەگیرێنەوە تا ژێربار ئەکرێن!

باوی خوا لە جیهانا هەر وابووە، هەرگیز وازی نەهێناوە لە دەست درێژی کەران و یاخیان، ئیتر هەرچەند ماوەو مۆڵەتی دابن لەبەر هەر هۆیە کە خۆی ئەیزانێ لە کاتی دیاری کراوی خۆیا داوێتی لە دەست و دەماخیان و لەناوی بردوون وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ لە کەمینایە بۆ یاخی و ستەمکاران، واتە سزاو تۆڵەی هەمیشە ئامادەیە لەکاتی تایبەتی و دیاریکراوی خۆیا بەدی دێت و دائەبارێ بەسەریانا، لە گێڕانەوەی لەناوچوونی ئەو یاخیانەوە ئارام و دڵنیاییە ڕوونەکاتە دڵی بڕواداران لە هەر چەرخ و لەهەر ووڵاتێ، لەکاتێکا کە بەگیربێن بەدەست یاخی و ستەمکارانەوە. بەڕاستی ئەم ئایەتەی کە ئێستا خەریکین پێیەوە ئەژین لەگەڵی بەتەواوی بڕواداری ڕاستەقینە ئەبێ دڵی

فێنك ببێتەوەو ئارامی تەواو جێگیر ببێ تیایا، چونكە كە زانی پەروەردگاری هەمیشە چاودێرە بۆی هیچ كەس و هەیچ شتی لەدەست ناچێ، ئیتر ئەبێ باكی لەچی ببێ و لەچی بترسێ و غەمی چی لێبێت؟ ئەمەی ئێرە نموونەیەكە كە بڕواداڕانی پێ پەروەردە ئەكات، جیاوازە لەو نموونەیەی كەلە سوورەتی (البروج) دا نیشانی دا، قورئان بەهەرجۆرە كە دڵی بڕواداران ئارام پێئەدات و پێیان ئەگەیەنێ تابتوانن لە هەموو بەسەرهاتێك دا هەڵسن بەپێویستی سەرشانیان بەرانبەر بانگ و ئایینەكەی خوا. وە بێباك نەبن و هەمیشە چاوەڕوانی ناخۆشترین بەسەرهات و ڕووداو بكەن بۆ خۆیان لە ڕێگای خوادا، وە هەموو شتێ بدەنە دەست خواو حەواڵەی بڕیارو خواهیشی ئەوی بكەن. خوای گەورە باسی تۆڵەو بەسەرهاتی ئەو سێ گەلەی كردووە لە چەند شوێنێ ترا بە جیاجیا و پێكەوە، وە لە هێندێ شوێنا زۆر بە كورتی وەك لێرەدا بەم چەند ئایەتە كورتە باسی بڕینەوە، لە هێندێ شوێنا هەر سێكی بە درێژی باسكردوون وە لە هێندێ ترا نە زۆر كورت و نە زۆر درێژ، وە لە هەێندێ شوێنا دەست نیشانی ئەكات بۆ یەكێ لەمانە، ئەو تیكرارو چەند بارە كردنەوەو بەو چەند جۆرو شێوە جیاوازە هەمووی ڕێكەو بەجێیەو هەرئەوە ڕاستە، چونكە مەبەست لە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهات و داستانانە یا بەڵگەو ڕابەرهێنانە لەسەر دەسەڵاتی خواو زاڵی بەسەر بەندەكانیا یا مەبەست دڵنەرم كردنی ئەوانەیە كە ڕووی فەرموودەكەیان تێكراوە، یا مەبەست ترساندنی مەردومەو نەهێشتنی بڕوبیانوی یا بۆهەرشتێ لەم بابەتانە، دەی بێگومان هەر جێگا و شوێنێ لەوانەی كە ئەو باس و داستانانەی تیا ووتراوە جۆرە ووتن و ووتارێكی تایبەتی هەڵنەگرێ و ڕێكترە لەگەڵی: كورت، درێژ، میانە، بۆ وێنە: لەم سوورەتەدا مەبەست دڵنەوایی و دڵخۆشكردنی پێغەمبەر (ﷺ) و یارەكانیەتی لەیەكەم جارەوەو لە پاش ئەوان هەموو بڕوادارانی تر كە وەك ئەوان یاخێتی و یاخیان لەڕێگایانا وەستابن، بۆ ئەو مەبەستەش تەنها ئەمە بەسە ئامازەو دەست نیشان بكرێ بە كورتی بۆ تۆڵە لێ سەندنی ئەو یاخیانەو لەناوبردنیان. خوای پەروەردگار لە كەمینایە لەبەر خاتری ڕۆژی دوایی و داوای تێكۆشان ئەكات لە بەندەكانی بۆ ئەو ڕۆژە، بەڵام ئادەمی هەر چاو ئەبڕێتە ئەم ژیانە بڕاوە. خوای پەروەردگار ئاگادارە بە هەموو شتێ ئاشكراو نهێنی، هەرگیز بەپێی دیمەن و ڕواڵەتی ڕووت ڕەفتار ناكات، بەڵكو هەموو كردارو ڕەفتاری بەپێی تەرازوویەكی ڕاستی دامەزراوی وورده كە هەرگیز هەڵەو زیادەڕەوی و كەم و كوڕی لانیە، بەڵام ئادەمی نەزان و تێنەگەیشتووەو زۆرتر سەرنجی دیمەن و ڕواڵەت ئەدات.

فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ
رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ
طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾

---

بەهۆی ئەوە هەمیشە هەڵەبازەو بۆچوونو بڕیارەکانی ناڕێكو ناڕاست دەرئەچن، وەك دەرئەکەوێ لەم دووئایەتەی کەلەبارەی ئادەمیەوەئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ﴾ واتە بەڵام ئادەمی ﴿إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ﴾ کاتێ پەروەردگاری تاقی بکاتەوە ﴿فَأَكْرَمَهُۥ﴾ بەم ڕەنگە ڕێزی بگرێ ﴿وَنَعَّمَهُۥ﴾ وە چاکەوبەهرەی بەسەرابڕێژێ﴿فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ﴾ لەوکاتەدا ئەڵێ: پەروەردگارم ڕێزی گرتمو منی خۆش ئەوێ، ﴿وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ﴾وە کاتێ کەتاقی بکاتەوە﴿فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ﴾ بەم ڕەنگە ڕۆزی لەسەرتەنگ بکاتوکەمی پێدا﴿فَيَقُولُ﴾ئەوحەلەئەڵێ ﴿رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ﴾ پەروەردگارم ڕسواو بێ نموونی کردم.

بەڵێ ئادەمی بەپێی بۆچوونو تێگەیشتنێ کەلە خۆی هەڵقوڵێ وە بەپێی گەزو تەرازووی خۆی مەسەلەی زۆرو کەمی ڕۆزیو سامانو دارایی بەو جۆرە پێوانو کێشانە ئەکات کە ئەم دوو ئایەتە فەرمووی، واتە زۆری ڕۆزیو پایە بەرزی ئەم جیهانە ئەکات بە بەڵگەو نیشانە لەسەر چاکی مەردومو ڕێزو خۆشەویستی بەلای خواوە، وە کەمو کوڕیو پایە پەستی ئەکات بە بەڵگەو نیشانە لەسەر خراپیو بێنرخی بەندە بەلای خواوە.

لە هەردوو بارەکەدا هەڵەو نەزانە، چونکە نرخی مەردوم بەلای خواوە نەبەستراوەو پەیوەندی نیە بە شتو مەکی ئەم جیهانەوە، وە زۆریی ئەو شتو مەکە بۆ هەرکەس نیشانەی ڕەزامەندی خوا نیە لێی، هەرچۆنێ کەمیو نەبوونی نیشانەی ناڕەزاییو خەشمی خوا نیە لێی، -بەڵکو وەك بە چاو ئەبینرێ-خوا هێندێ لە چاکانو هێندێ لە خراپان بەشدارو بەهرەمەند ئەکاتو هێندێ تر لە هەردوو بێبەشو بەش بڕاو ئەکات، کەواتە هیچ کام لەو دوو بارە بەڵگەو نیشانە نەبوون لەسەر ئەوەی کە ئادەمی بێبڕوا گومانی بۆ ئەباتو بڕیاری لەسەر ئەدات، بەڵکو هەردوو بەسەرهاتەکە بۆ تاقی کۆدنەوەیە، بەم ڕەنگە خوا هێندێ لە بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە بە زۆریی سامانو دەسەلات تا دەرکەوێ ئایا بەوە سوپاسی خوا ئەکاتو چاو لەبەری ئەبێ، یا ناسوپاسو سپڵەیەو یاخی ئەبێت؟ هەروەها

هێندێ لە بەندەکانی تاقی ئەکاتەوە بە نەبوونی و بێدەسەلاتی، تا دەرکەوێ ئایا خۆگرو بە ئارامە لەژێر ئەو بارە گرانەی کە خوا خستوویەتە سەر شانی، یا خۆنەگرو بێئارامەو بێزاری دەرئەبڕێ لەو بەشەی کە خوا پێی داوە؟

لەناو ئەو گەلەی کە یەکەم جار ئەم قورئانە چوو بە گوێچکەیدا چەند کەسێ بوون -وەك هەموو گەلێکی نەفامی تر لە هەر وڵاتو چەرخی ترا- پەیوەستییان هەر بەم جیهانو زەوی یە بوو ئەو گومانە ناڕەوایەیان بووکە ئەم دوو ئایەتە گەیاندی، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە هەر دەسەڵاتو سامانو پایەبەرزی شت بوو بە لایانەوەو هەموو نرخو رێزێ هەر بۆ ئەوە بوو! لەبەر ئەوە هەڵپەو تێکۆشانیان بۆ ماڵو سامان زۆر بەهێزو بەتین بوو، زیاد لە ئەنداز خۆشیان ئەویست، تا دەبوو تێرخواردنیان نەبوو لێی، هەرچۆنێ دووچاری چرووکی و چنگ گوشراوی کردبوون.

جا لەبەر ئەوە بە هەردوو گومانەکەیا بە درۆیان ئەخاتەوەو ئینجا ئەگوێزێتەوە بۆ ئەنگێکی گەورەتریان کە بریتییە لەو چرووکی و چاوبرسێتی و دڵڕەقی و خۆپەرستی یەی کە پێی دەردەدار بوون، ئەو دەردە دەروونییەشیان هۆی هەڵەو گوناهە ناڕەواکانیانە، بۆ ئەوەی زیاتر بیانباتەوە بە خۆیانا رووی فەرموودەیان تێئەکات، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ نەخێر وا نیەو کار بەو جۆرە نییە کە ئادەمی بێبڕوا تێی گەیشتووەو ئەیڵێ ﴿بَل﴾بەڵکو ئێوە چرووكو چاوبرسی و دڵڕەقن، کارو کردەوەتان لە وتەو بەدگومانییەکەتان خراپترە، ئەوەتا:

١- ﴿لَا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ﴾ رێزی هەتیو ناگرنو چاودێریو دەست گیرۆیی ناکەن کە منداڵێکی زەبوونو بێباوكو بێنازەو زۆر جێگای بەزەیی یە.

٢- ﴿وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ﴾ وە هانەهانەی یەکتر نادەن لەسەر خۆراك دان بە هەژاران و دەست گیرۆییان. قورئان تەنها بە دەست گیرۆیی رازی نابێ بەڵکو پێویستی کردووە کە مەردوم لەناو خۆیانا هانەو هونەی یەکتر بدەن لەسەر دەست گیرۆیی، ئەوەتا لێرەو لە چەند شوێنێ ترا بێزاری دەرئەبڕێ لەسەر ئەو هان نەدانە، چ جای یارمەتی نەدانو دەست گیرۆیی نەکردنو گوێ پێنەدانی هەژاران، هەروەها هەتیوو هەموو زەبوونو لێقەوماوێ، جا لەسەر ئەم بنەڕەتە لە شەریعەتی ئیسلاما بیرو بڕوا (مبدا)یێك دانراوە کە پێی ئەوترێ (التکافل الإجتماعي) نەك تەنها بۆ چارەسەر کردنی تەنگ‌وچەڵەمەی ناو گەل، بەڵکوبە تەمێو ئامۆژگاری یەکترو هەموو کارێکی خێری تر.

وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ﴿٢٠﴾ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ
دَكّٗا دَكّٗا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ﴿٢٢﴾ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ
وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٢٣﴾

---

٣- ﴿وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا﴾ وە میراتو کەلەپوور ئەخۆن بە تەواویو بە بەشی بەشدارانیشەوەبەتایبەتی بەشی ئافرەتومناڵ، چونکە لایان وابوو کەلەپوور خۆر ئەبێ کەسێ بێت بتوانێ جەنگ بکات،واتەحەراموحەڵاڵ تێکەڵ ئەکەنوگوێیان لێی نییە.

٤- ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا﴾ وە ماڵو دارایی تان خۆش ئەوێ بەخۆش ویستنێکی زۆر، تا ڕادەیەك بەرگریتان ئەکات لەدەست گیرۆییو دەست درینەوە لە هەژارانو پێویستی یان، وە پاڵتان پێوەئەنێ بۆ داگیرکردنو خوێن مژین بەبێ سەر لێ کردنەوە بێگومان لەو سەردەمی نەفامیەیە دا لەناو گەلی مەککەدا باوبووە هەڵپەکردن بۆ کۆکردنەوەی ماڵو سامان بەهەر جۆرو بەهەر شێوەیە کە بگونجایە، بەبێ بەزەییو بە ئەوپەڕی دڵڕەقییەوە، وەبێ دەسەڵاتی هەتیو بە تایبەتی ئافرەت پاڵپێوەنەربوو بۆ داگیرکردن و دەست بەسەراگرتنی ماڵو داراییەکەیان.

بەتایبەتی سەبارەت بە کەلەپووری کە بۆیان بەجێئەما هەرچۆنێ ئەو هەڵپە بەتینە هەبوو لەناوا هەروەها چرووکیو چاوبرسێتیش دڵی داگیر کردبوون، تا ڕادەیە ماڵو داراییان لە جێگەی خۆیا سەرف نەئەکرد، ئەو دوو سیفەتە خراپە باوی هەموو گەلێکی نەفامە لە هەموو چەرخو کاتێکا تا ئێستا!!

جابەو بۆنەوە ئەن چەند ئایەتە هاتو ئەو سیفەتە پیسانەی دەرخستو بێزاری لێ دەربڕینو جڵەوگیری کردنو بەو شێوە سەختو بەتینەی کەچوو بە گوێچکەمانا بێگومان ئەو بەدگومانیو بەد ووتاریو بەد کرداریو بەد خوییەی کە ئادەمی پێیانەوە دەردەدارە بە هۆی بێبڕوایی بە ڕۆژی دواییو لێ پرسینەوەی خوا لەو ڕۆژەدا. لەبەرئەوە لێرەدا لەپاش بێزاری دەربڕینو جڵەوگیرییان لە کردەوەکانیان هەڕەشەیەکی زۆر سەختو سامناك ئەکات بەهاتنی ئەو ڕۆژە، بە جۆرو شێوەیە هەر لەدەست قورئان دێتو لاسایی ناکرێتەوە.

ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ لەکردەوەو ڕەووشتەکانتان کۆتایی بێننو لێیان پەشیمان بنەوە، چونکە

﴿إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا﴾ کاتێ کەزەوی ووردو خاش ئەکرێ، بەم ڕەنگەیەك بەیەك کێوەکانی پارەپارە ئەکرێن‌و ئەکرێن بەتۆز، وە هەموو بەرزی‌یەکانی نامێلرێن‌و تەخت ئەکرێن، تا هەموو زەوی ئەبێ بە دەشتێکی کاکی بەکاکی بەبێ چاڵ‌و چۆڵی.

﴿وَجَآءَ رَبُّكَ﴾ وە پەروەردگارت دێت. بێگومان ئەم ووتەیەو هەموو وێنەکانی لەو ئایەتانەن کە پێیان ئەوترێ: (متشابە) سەبارەت بەو (متشابە)انە هەموو زانایانی ئیسلام یەك ڕاو یەك قسەن لەوەدا کە هیچ کام لەوانە مەبەست دیمەن‌و ڕواڵەتەکەیان نی‌یە وەك لەئایەتی (٦) لەسوورەتی (٣)یشەوە دەرئەکەوێ. ئینجا سەبارەت بەدیاری کردن یا دیاری نەکردنی ماناو مەبەستێ بۆیان، زانایان بوون بەدوو تاقم: یەکەم کەناونراون بە (سَلَف) نایان بڕن بەسەر ماناو مەبەستێکا و ئەفەرموون: خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی چی‌یە. دووەم کە پێیان ئەوترێ (خَلَف) ماناو مەبەستیان بۆ دیاری ئەکەن. بۆ وێنە لێرەدا بە (٦) جۆر ڕاڤەیان کردووە یەکێ لەوانە ئەمەیە: فەرمانی خوا دێت بۆ لێ پرسینەوەو تۆڵە سەندن‌و پاداشت دانەوە ﴿وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ وە فریشتەی ئاسمانەکان دێن پۆل پۆل‌و ڕیز ئەبن بەدەوری ئادەمی‌و جنۆکەدا. ﴿وَجِاْيٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ﴾ وە دۆزەخ ئەهێنرێ لەو ڕۆژەدا. واتە ئاشکرا ئەکرێ بۆهەرکەس کەسەرنج بدا. ئایەتی (النازعات)دا فەرمووی: ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ﴾ دۆزەخ دەرئەخرێ بۆ هەر کەس کەبیبینێ....

ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانە هەرچەند شتێکی غەیبین‌و ئێمەی ئەم جیهانە بێئاگاین لەبارو شێوە ڕاستەقینەکەیان، بەڵام هەق وایە بە بیستنی ئەم ئایەتە بەهێزو بەتینانەو بەبیرلێکردنەوەیان بە شێوەیەکی سادەی خۆمان ئاسایش دەروون بێتە کوڵ‌و دڵ بکەوێتە تەپەتەپ‌و موچڕکە بەلەشا بێت، هەر لە ئێستەوە فریای خۆمان بکەوین‌و بیرێ لە حاڵی ئەوێی خۆمان بکەینەوە پێش بیرکردنەوە لەو ڕۆژەدا کە تازە هیچ سوودێکی لێ وەرناگرین، وەکو ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ﴾ لەو ڕۆژە دا ئادەمی هەرچی کردبێ لەجیهانا بیری ئەکەوێتەوەو ئەزانێ کە خراپی کرد بەڵام ﴿وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ تازە لەکوێ ئەو بیرکردنەوە سوودی ئەبێ بۆی؟ نەخێر بەهیچ ڕەنگ سوودی لێ وەرناگرێ، چونکە کاتی نەماو هەلی لەدەست دەرچوو،

يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ
ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

---

جالەبەرئەوە بەدڵێکی زۆر بەکوڵ و بەداخ و پەشیمانیەوە ﴿يَقُولُ﴾ ئەڵێ: ﴿يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي﴾ ئای کاشکێ من کردەوەی چاکم پێش بخستایە لە جیهانا بۆ ژیانم، واتە بۆ ژیانی ئەمڕۆم، چونکە هەر ئەوە ژیانی ڕاستەقینەیەو شایانە بەوە ناوببرێ بە ژیان، وە هەر ئەو شایستەی خۆ ئامادەکردنەو توێشووو زەخیرە بۆ دنانە.

ئەو ئادەمیە سیاچارە کە ئەمڕۆ بێباک و بێئاگایە لەو ڕۆژە دا ئاوا داماوو غەمبارو نائومێدە، تۆڵەو چارەنوسیشی لەم دوو ئایەتەوە وەرئەگیرێ کە ئەفەرموێ: ﴿فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ﴾[1] ئینجا لەو ڕۆژە دا هیچ کەس ئەو سزایە نادا کە خوا ئەیدا وەهیچ کەس ئەوەی لەدەست نایە ﴿وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ﴾ وە هیچ کەس ئەو کۆت و زنجیر کردنە ناکات کە خوا ئەیکات و هیچ کەسی تر ئەوەی پێناکرێ، سزادانی خواو کۆت و زنجیر کردنی چەند وێنەو جۆرێکیان باس کراوەو ڕوون کراونەتەوە لە ناوبەناوی سورەتەکانی قورئانا، لێرەدا بە کورتی بەسەریا تێپەرئەکات و ئەیگەیەنێ کە تاقانەن و وێنەیان نیەو نابێ لەسەر دەستی هەموو ئادەمیدا، یا لەلایەن هەموو دروست کراوێکدا، ئەمەش بەرانبەر سزاو ئازاردان و کۆت و زنجیر کردنی یاخی و سەرکێشەکان کە دەست نیشانی بۆ کردن لە پێشەوە لە کورتە باسەکەی (عاد)و (سەمود)و (فیرعەون)دا، کەواتە ئەو یاخی و سەرکێشانە چیان لە دەست دێت با بیکەن، سزادان و کۆت و زنجیر کردن چۆن ئەکەن با بیکەن، چونکە لە دواڕۆژدا سزا

---

[1] وتەی (يُعَذِّبُ، يُوثِقُ) بە (يُعَذَّبُ، يُوثَقُ) ئەخوێندرێتەوە لەسەر ئەو بارە ئەڵێن: هیچ کەس سزا نادرێ بەوێنەی ئەو سزادانەی کە خوا ئەیدا، وە هیچ کەس کۆت و زنجیر ناکرێ بەو کۆت و زنجیرکردنەی کە خوا ئەیکا، لەسەر هەردوو بار بە جۆری تریش تەفسیرکراونەتەوە، بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە بەهێزترە لام.

ئەدرێن‌و كۆت‌و زنجیر ئەكرێن بەم جۆرە بێ‌ڕێنەی كە ئەم دوو ئایەتە ئاماژەی بۆ كردن‌و لە بۆچوون‌و تێگەیشتنی ئێمە بەدەرن!!

ئینجا لەناو ئەو هەموو ترس‌و دڵە لەرزەو ئەو سزاو كۆت‌و زنجیرەی كە ئاراستەی یاخی‌و سەركێشەكانی كرد، لەناو ئەوانەدا نەسیمی بەفەڕی نەرم‌و ناسكی میهرەبانی خوا ئەم بانگ كردنە خۆشە ئەدات بە گوێچكەو دەماخی ئەو كەسەی كە دڵئارامە بەیادی خوا، وە دڵئارامە بەو بڕوا دامەزراوەی كە گومان‌و دوودڵی ڕووی تێناكات، وە دڵ ئارامە بە بڕیارو كردەوەی خوای خۆی، ئەم بانگ كردنە خۆشەی كە ئەدرێ بەگوێیدا لەكاتی گیان دەرچوونی، یا لە ڕۆژی دوایی پاش لێبوونەوە لە حیساب‌و پرسیاری، یا لەكاتی چوونی بۆ بەهەشت ئەدرێ بەگوێیدا لەلایەن خواوەو پێی ئەوترێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ﴾ ئەی نەفسی بە ئارام ﴿ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ﴾ بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت، واتە بۆلای فەرمانی، یا بۆلای بەڵێن‌و میهرەبانی ئەو، یا بۆلای شوێنی ڕێزت لە پەنای خوادا، بگەڕێرەوە ﴿رَاضِيَةً﴾ بە ڕەزامەندی ﴿مَّرْضِيَّةً﴾ بە ڕەزا لێ بوویی، ﴿فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى﴾ ئینجا بچۆرە ناو بەندە تایبەتی‌یە نزیكەكانم‌و بچۆرە ڕیزی ئەوان ﴿وَٱدْخُلِى جَنَّتِى﴾ وە بچۆرە ناو بەهەشتەكەمەوە.

بەڕاستی زوبان‌و قەڵەم كول‌و كۆڵە لە باس‌و نووسینی گەورەیی‌و بەرزی ئەم لوتف‌و میهرەبانیەو خۆشی ئەم بانگ كردنە، داواكارین لەم بەهرە گەورەو فراوانە بێبەشمان نەكات بۆ خاتری ئەم قورئانە كە لە مانگی ڕەمەزانا هاتە خوارەوە، وە بۆ خاتری ئەم سوورەتە كە لەڕۆژی ١٦ی ڕەمەزانی ١٤٠٢ لێ بوومەوە لە تەفسیرەكەی -آمین-.

**وصلى الله وسلم على من أنزل عليه هذا القرآن الكريم**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴿٤﴾

## سووره‌تی «البلد»

## مه‌ككه‌یی یه‌و (٢٠)ئایه‌ته

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئه‌م سووره‌ته ــ له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا بچكۆله‌و كورته ــ چه‌ند شتێكی گرنگی بنه‌ڕه‌تی تیایه له‌باره‌ی ئاده‌می و ژیانی ئاده‌میه‌وه، به‌ڕاستی هه‌ر له‌ ده‌ست قورئان دێت به‌و جۆره شتی زۆرو گه‌وره كۆبكاته‌وه له‌ وتارێكی كه‌ما، وه‌ هه‌ر به‌ قورئان ئه‌كه‌وێ ده‌ست كاری دڵ بكات و به‌ چه‌سپانی دڵ ووریا بكاته‌وه‌و ئاگاداری بكات به‌ شتی گرنگ.

ده‌ست پێ‌ئه‌كات به‌ ده‌ست نیشان كردن به‌ سوێندێكی گه‌وره له‌سه‌ر بارو حاڵێكی هه‌میشه‌یی دامه‌زراو له‌ ژیانی ئاده‌میدا كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ ڕه‌نج و ئه‌رك و مه‌ینه‌تێ كه‌ ئاده‌می تیا ئه‌ژی هه‌ر له‌ یه‌كه‌م جاری دروست كردنیه‌وه هه‌تا دوایی، له‌ یه‌كه‌م جاره‌وه‌ سوێند ئه‌خوا به‌ شاری مه‌ككه، كه‌ یه‌كه‌م ماڵی خوای تیایه‌و به‌ فه‌رمانی خوا (ئیبراهیمی خه‌لیل)و (ئیسماعیلی كوڕی) دروستیان كرد بۆ ئاده‌میزاد، تا ببێ به‌ په‌ناو جێگای ئاسایش و بێباكی بۆیان، چه‌ك و جه‌نگ و دوژمنایه‌تیان و ئاژاوه‌ی تیا تووڕده‌ن، وه‌ به‌ ئاشتی و برایه‌تی یه‌ك بگرن تیایاو ڕێزی كه‌س نه‌شكێنرێ، هه‌رچۆنێ قه‌ده‌غه‌یه‌ ده‌ست درێژی كردن تیایا بۆ سه‌ر هه‌موو دره‌خت و په‌له‌وه‌رو هه‌موو گیان له‌به‌رانی تری بێجگه‌ له‌ مارو دووپشك و مشك و هێندێ شت، ئینجا ئه‌و ماڵه‌ خوا كردی به‌ ڕووگه‌ بۆ هه‌موو موسڵمانانی سه‌ر زه‌وی و له‌ هه‌موو لایه‌كه‌وه‌ بچن بۆ به‌جێ هێنانی فه‌رزی حه‌ج هه‌تا جیهان جیهانه. كه‌واته‌ شاره‌كه ئێجگار گه‌وره‌و به‌نرخه‌و شایانه به‌وه‌ی كه خوا گه‌وره‌ییه‌كه‌ی ده‌رخات به‌وه‌ی سوێندی پێ ئه‌خوات و ئه‌فه‌رموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ سوێند ئه‌خۆم به‌م شاره، ﴿وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ له‌ كاتێكا كه‌ تۆ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر نیشته‌جێی له‌م شاره‌دا. خوای میهره‌بان به‌م ڕسته‌یه‌ ڕێزی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌گرێ به‌م ڕه‌نگه‌ باسی ئه‌وو نیشته‌جێیی ئه‌و له‌و شاره‌دا ئه‌كات به‌هۆی زیاده‌ ڕێزو گه‌وره‌یی شاره‌كه. ئینجا له‌وه‌یشه‌وه‌ ده‌ست نیشانی تیایه‌ به‌ گه‌وره‌یی تاوان و هه‌ڵوێستی پیس و ناڕه‌وای بت په‌رسته‌كان، كه‌ له‌لایه‌كه‌وه‌ خۆیان

بە خزمەتکارو کلیلەوانی ئەو ماڵە پیرۆزە دائەنا، وە بە نەوەی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و ئەوپەڕی ڕێزیان نیشان ئەدا بۆ ئەو ماڵە بە فەڕە بە تایبەتیو بۆ هەموو شارەکەو دەروبەری بە شێوەیەکی گشتی، کەچی لە لایە ترەوە دەستیان نەئەگێڕایەوە لە ئازاردانی دڵی ئەو پێغەمبەرەو دەست درێژیو ئازاردانی بڕواداران[1]!

﴿وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ﴾ سوێند ئەخۆم بە باوكو بە ڕۆڵەی، ئیتر هەر باوكو ڕۆڵەیەك تا هەموو باوكو ڕۆڵەیەك لە ئادەمی بگرێتەوە، بەڵکو لە هەموو گیان لەبەرێ – وەك ئیبنو عەباس – ئەفەرموێ، بەڵکو هیچ بەرگری کەرێ نیە لەوەی کە شتی تر بکرێ تا هەموو درەختو شینایی و ڕووەکێکیش بگرێتەوە، بێگومان لەناو باوكو ڕۆڵە ئادەمیەکانا لە یەکەم جارەوە لێرەدا (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل) یا (ئیسماعیل)و (محمد) دێن بە خەیاڵا – سەلامی خوایان لێ بێ– ئەوەش بەبۆنەی ئەو شارو ماڵە بەفەڕە کە زیادە تایبەتیو پەیوەستیان هەیە بەو پێغەمبەرانەوە – سەلامی خوایان لێ بێ–. سوێند بەو شارە کە ئەو ماڵەی تیا دروست کرا بۆ ئادەمی، وە درەختی ئادەمێتی ڕاستەقینەی تیا نێژرا لەپاش لاواز بوونو پیس بوونی لە وڵاتانی ترا، وە لەم شارەدا گەشەی کردو ڕیشەی کوتا، یا لە پاشا لە پەنای ئیسلاما بە تەواوی گەیشتە ئەوپەڕی ڕادەو پلەی هەرە بەرزی خۆی.

سوێندم بەم شارەو بە باوكو ڕۆڵەی ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ بێگومان ئێمە ئادەمیمان دروست کردووە لە ڕەنجو ئەركو مەینەتا، واتە ژیانی ئادەمی زنجیرەیەکە لە هەوڵو تێکۆشانو ڕەنج کێشان بەبێ کۆڵدانو پچڕان هەر لەکاتێ کە لە سکی دایکیایە، هەتا دێتە جیهانو هەرچەند ژیانی تیا بەسەر ئەباتو تا ئەمرێو ئەگات بە حوزوری خواو ئەگات بە تۆڵەو پاداشێ کە خوا دایناوەو بڕیاری لەسەر داوە، هەرکەس بە پێی کردەوەی خۆی.

بەڵێ هەر لە کاتێکەوە کە تەنها سێڵو خانەیەکەو نیشتەجێ ئەبێ لە منداڵدانادەست ئەکات بە هەوڵو ڕەنج کێشان بۆ ئەوەی (بە فەرمانی خوا) بارو وەزعی بسازێنێ بۆ ژیانو خۆراك هەتا پێئەگاتو کاتی دەرچوونی دێتە پێشەوە، کە ئەو دەرچوونەش بە ڕەنجو ئەرکێکی زۆر سەخت بەدی دێت، لەوانەیە خۆیشیو دایکیشی تیا بچن، ئەگەر یارمەتیو کۆمەکی خوا نەبێت هیچ دایكو منداڵێ لەوە قوتار نەئەبوون! ئینجا کە لەگەڵ هاتە جیهان

---

[1] ئەم ڕستەیەبەدوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە وەهەردوویشی ئەگونجێو ڕێکە، بەڵام ئەوەی کەلەتەفسیرەکەدایە بە لامەوە ورد ترو بەهێزترە.

ئەرك و مەینەتی گەورەتر دەست پێ ئەكات، لەڕێوە دەرگای سی ئەكرێتەوەو كۆئەندامی هەناسەی ئەكەوێتە ئیش، ئینجا كۆئەندامی هەرسی و كۆئەندامی خوێنی! ئینجا ئەكەوێتە ئەركی دەركردنی میزو پیسایی، كە ئەمانە هیچیان لەپێش دەرچوونیا نەبوون و پێویست نەبوون، كەچی بە كوت و پڕی پەیدا بوون و پێویست بوون، ئینجا ئەركی قنگەنشین و گاگۆڵكێ و پێ گرتن و ڕاست بوونەوەو هەنگاو نانی، هەموو ئەزانین كە هەركام لەوانە بە چ هەوڵ و ڕەنجێ پێكدێن، هەروەها ئەركی دان دەرهاتنی كە هەر دانێك بە چ هەوڵ و ڕەنجێ دەردێت، تا ڕادەیەك نەخۆش ئەكەوێ بە دەرهاتنیان!

ئینجا فێربوونی قسەو هەر شتێ تر كە پێویستە تا پێ ئەگات و فام و هۆشی پەیدا ئەبێ، تا ئێستای ئەرك و ڕەنج كێشانەكە لەسەر یەك بارەو هەموو كەس وەك یەك تیا بەشدارە، ئینجا هەوڵ و تێكۆشان جۆر بەجۆر ئەبێ و هەر تاقمێ خەریكی شتێكەو هەوڵ و ڕەنج بۆ شتێ ئەدا، یەكێ بە هێزو بازوو خەریكەو یەكێ بە بیرو ژیریی تێكۆشان ئەكات، یەكێ بۆ تیكەیە نان و بۆ بەرگ خەریكە، وە یەكێ تر ئەیەوێ هەزاری هەیە بیكا بە دوو هەزارو دە هەزاریەكێ بۆ پادشایەتی و گەورەیی و بەری جیهان هەوڵ ئەدات و یەكێ لە ڕێگای خوادا خەریكە، یەكێ بۆ خۆشی و ئارەزووی نەفس هەوڵ ئەدات و یەكێ‌تر بۆ ئایین و ئاقیدەی تێكۆشان ئەكات، یەكێ بەرەو ئاگری دۆزەخ ئەڕواو یەكێ تر بەرەو بەهەشت.

بەكورتی ژیانی جیهان وا لەناو چاڵی ئەرك و ڕەنج و كێشەداو هەمووی هەر ڕەنج و كێشەیە و بەس شێوەو هۆكان جیاوازن، بەڵام ڕەنجەڕۆ ترو زیانبار تری هەمووان كەسێكە كە ڕەنجی ژیان بە جۆرێ بچەژێ كە سەری لە ئاگری دۆزەخەوە دەركات، وە بەهرەمەند تر كەسێكەكەلەجیهان‌وژیانا ڕەنج و هەوڵەكەی سەری لە بەهەشت و ڕەزامەندی خواوە دەربكات.

بێ‌گومان هەر لەم زەوییەدا هێندێ لە تۆڵەو پاداشتی دەست كەوت ئەبێ پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ، ئەوەش بە پێی ئەو مەبەستەی ڕەنج و تێكۆشانەكەی بۆ ئەكرێ، هەر ڕەنج و تێكۆشانێ لە پێناوی كارێكی گەورەو گرنگ و پاك و خاوێنا بكرێ، تێكۆشەرو ڕەنج كێشەكەی بە ئارام ترو دڵشاد ترەو ماندووو شەكەت نابێ و هەر ماڵێكی لە پێناویا بەخت كردبێ گوێی لێ نییە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو كەسەی كە هەوڵ و تێكۆشان ئەكات لە پێناوی شتی بێ نرخ و پڕوپووچا! ئەو كەسەی كە خۆی بەخت بكات لەڕێگای بانگ كردن بۆ ئایین و ڕێگای ڕاستی خوا، وەك ئەو كەسەنی‌یە كە خۆی بەخت ئەكات لە ڕێگای ئارەزووی پڕوپووچی نەفسدا، لەهەست و لە بۆچوون و لەئارامیدا.

أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾

---

لەپاش ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی ژیانی ئادەمی، ئینجا دەست ئەکات بە لێکۆڵینەوەی هێندێ شت کەئادەمی لافی لێئەدات، وە هێندێ بۆچوون و تێگەیشتنی کەلە کردەوەکانییەوە دەرئەکەوێ. ئەم ئادەمی یە کەبەوجۆرە دروست کراوەو لە ڕەنج و کێشەناکەوێ، خۆی لەبیر نامێنێ و هەڵئەخەڵەتێ بەو هێزو دەسەلاتەو بەرەیە کە پەروەردگاری پێ ی داوە، بەهۆی ئەوە بەجۆرێ کردەوە ئەکات وەك لێ پرسینەوەی بۆ نەبێ، چاوەڕوانی ئەوە ناکات کە ڕۆژێکی بەسەر بێت هەموو حیسابێکی لەگەڵ بکرێ. جالەبەرئەوە لەخۆی ئەگۆڕێ و یاخی ئەبێت و خۆی ناگێڕێتەوە لە دەست درێژی و خراپەکاری، بەهەرجۆر بۆی بکرێ ماڵ و سامان ئەنێ بەیەکەوە. دەربارەی ئەو ئادەمی یە ئەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ﴾ ئایا ئادەمی وائەزانێ کە هەرگیز هیچ کەس زۆرو دەسەلاتی نابێ بەسەریا؟

ئەوئادەمی یەئەگەردوای یارمەتی لێ بکرێ بۆکارێکی خێروباش﴿يَقُولُ﴾ ئەڵێ: ﴿أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا﴾ ماڵی زۆرو کۆمەڵم لەناوبردووەو ئەوەی کە لەمەوبەر کردومە بەسە. ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ ئایاوا ئەزانێ کەهیچ کەس ئەوەی نەدیوە؟.. نازانێ کە چاوی قودرەتی خوا هەمیشە وا بەسەریەوە، وە زانینی خوا هەمیشە چوار دەوری گرتووە، کەواتە خوا ئەزانێ و ئەوەی بەختی کردووە لەچی دا بەختی کردووەو لەبەر چی و بەچ نیازێ داوێتی؟ بەلام ئەو کەسە لەبەر نەفامی خۆی ئەوەی لەبیر نیەو وائەزانێ کە چاوی لێی نیە!

بەرانبەر ئەو لەخۆ گۆڕانەی کە چووەتە مێشکی ئەو ئادەمیە نەفامە وە بەرانبەر ئەو چروکی و چاوبرسێتیەی کە داگیری کردووەو لەگەڵ ئەوەشا لافی پیاوەتی و بەخشین لێ ئەدات بەرانبەر ئەوانە قورئان ڕووبەڕووی ئەوەستێ و بەشێ لە چاکەو بەهرەی خوا ئەدا بەناوچاویا، کە بەهۆی ئەوانەوە بووە بە ئادەمی و بەبێ ئەوانە هیچ نرخێکی نیەو ناژی، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ﴾ ئایادووچاومان پێ نەداوەکەبەبێ چاوداماو و دەستەپاچە ئەبوو کاروباری نەئەڕۆیشت ﴿وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾ وە زوبانێك و دوو لیچومان نەداوەتێ کە بەبێ ئەوانە هەرچۆنێ زۆر ناشیرین دەرئەچوو هەروەها هیچ کەڵکیشی نەئەبوو وەك دارو بەردێك وائەبوو

وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ
ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾

---

﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ﴾ وە ڕێگای چاكو خراپمان نیشان نەداوە؟ واتە وامان دروست كردووە بەسورشتو بەهۆی ژیریی و بیری چاكو خراپ ئەناسیٚ و لەیەكیان جیائەكاتەوە، ئینجا سەربەخۆشمان كردووە بەجۆریٚ ئەتوانیٚ كام ڕێگا بداتە بەر كە هۆی بەرزیو گەورەیی ئادەمی و جیابوونەوەی لە گیان لەبەرانی تر ئەم بەهرە گەورەیە، دەی خوایە كە ئەو بەهرەیانەی داوە بە ئادەمی، بیٚگومان ئەشتوانیٚ بیانسێنێتەوە لیٚی و دەستە پاچەو داماوو بیٚدەسەلاتی بكات كەواتە ئەو ئادەمییە ئەبوایە لە خۆی نەگۆڕایەو بەد گومانو بەد ووتار نەبوایە، بەڵكو سەری بەندەیی و سوپاسی شۆڕ بكردایە بۆ ئەو پەروەردگاریو ئەو بەهرەیانەی بەكاربهێنایە لەڕێگای ڕەزامەندی خوای بەخشندەو میهرەبانی، كە هێندیٚ لەمایەی ڕەزامەندی خوا بەزەیی هاتنەوەیە بە بەندەكانی خواو چارەسەر كردنی كۆسپو گرێیان لەبەر خوا كەچی وای نەكرد، وەكو ئەفەرمویٚ: ﴿فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ﴾ ئینجا ئادەمی نەچووە ناو پلەی سەختو ڕێگای سەختو بەرەو ژووری نەبڕی. واتە كردەوەیەكی نەكرد كەلەسەر دڵو دەروونی سەختو قورس بێت بەوێنەی ڕۆشتن بەڕێگای بەرەو ژووری سەختو بڕینی پلەی سەخت كە چەندە بەئەركو زەحمەتە بەسەر لەشەوە. وە لەبەینی ئەوو بەهەشتا ئەو ڕێگاو پلەییە هەیە، هەر كات بڕی، چوونە بەهەشتی مسۆگەرە، واتە بابڕوا بەو ڕێگا سەختەدا با ئەو دەستكەوتە گەورەی دەست كەویٚ. ئینجا بۆ نیشان دانی گەورەیی و گرنگی ئەو ڕێگاو پلەییە بەلای خواوە، ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ﴾ تۆ چووزانی ئەو ڕێگاو پلەیە چییە؟ ئینجا ڕوونی ئەكاتەوە بەیەكیٚ لەم دوو شتە:

١- ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ ڕزگار كردنی بەندەو بەشداری كردن لە ئازاد بوونیا.

٢- ﴿أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ﴾ یا خۆراك دانە لە ڕۆژێكی برسێتیو قاتیو گرانی دا ﴿يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ﴾ بەهەتیوێكی خزم ﴿أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ﴾ یا بەهەژارێكی زۆر بیٚنەوا كەبەسەر خۆڵەوە دانیشیٚ و بكەویٚ. واتە ئادەمی هەوڵی نەدا بۆ نەهێشتنی دوو نەخۆشی گەورە لەناو گەلا: برسێتیو ژێر دەستەیی.

بێگومـان نەخۆشـی یـەکانی گـەل و ئەنـدامی گـەل زۆرن، بـەڵام بەتایبـەتی ئـەم دوانـەی باسکرد، چونکە:

أ- لەو سەردەمەدا ئەو دوو نەخۆشی‌یە زۆری سەندبوو لەناو ئەو گەلەی کەیەکەم جار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا ئەوەبوو زۆربەی ئەیناڵاند بەدەست ئەم دوو دەردەوە.

ب- ئەم دوو نەخۆشییە ئێجگار سەخت و کاریگەرن لە ئادەمی و ئادەمێتی، بە جۆرێ تا ئەم دوانـە بمێنـێ لـەجیهانا، یـا یەکێکیـسیان ئـادەمی ناحەسـێتەوەو ئـادەمێتی لاوازەو ناتـەواوە؟ وە ئـەم دوانـە وەك سەرچـاوە وان بـۆ زۆربـەی نەخۆشـی‌یەکانی تـری گـەل و ئەندامی گەل.

کاتێ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ئیسلام دەوڵەتێکی نەبوو کە بەرنامەو شـەریعەتێکی ببـێ، بەڵکو موسڵمانەکان ژمارەیـەکی کـەمی بـێ دەسـەڵات بوون و بەخۆیان و ئیسلامەکەیانەوە لـە مەککـەدا چـواردەور درابـوون. وە یاسـای بەنـدەیی یاسـایەکی دامـەزراوی دان پیـانراوی باوەڕپـێکراوبوو لەمەککـەو لەنیوەدوورگـەو لـە هـەموو جیهانـا لەسـەر پـیس تـرین شـێوەی. هـەروەها داگیـر کردنـی مـاڵ و مـافی هـەتیو شـتێکی ڕەوا دراوبـوو. سامانداراەکان دڵ ڕەق و بێبـەزەیی بـوون دەربـارەی هـەژارو کەوتـەکارەکان. لـەو کاتـەدا ئیـسلام هـات بـەم شـێوە قورئانی‌یـە داوای چارەسـەرکردنی ئـەو نەخۆشـی‌یە پیسانەی کـرد، کـە ئـەوەش بەڵگەیـەکی بەهێزو گەورەیە لەسەر ئەوە کە ئـەم ئایینـە ئاسمانی‌یـە، وە چارەسـەرکردنی گـرێ و کۆسـپی ژیان مەبەستێکی سەرەکیە لە ئیسلاما هەر لەسەرەتا و یەکەم جارەوە بە گرنگ گرتوویـەتی و ئەیەوێ چارەسەربکرێ. ئەگەر لەلایەن خواوە نەهاتایـە، کـێ ئـەیتوانی ئـاوا بچێ بەگژی ئـەو هـەموو بـارە جیهانی‌یـەدا، بەتایبـەتی ئـەم تاقمـە کـەم و بێدەسـەڵاتە کەلەبـەر کۆسـپ و گرێـی خۆیان نەیان ئەپەرژایە سەر کۆسپ و گرێی کەسێکی تر؟!

بێگومان هەر پلەیـەبڕێ و هـەر کردەوەیـەکی چاك بکرێ، ئـەبێ لەسـەر بنـەڕەتی ئیمـان و بڕوای ڕێك و پێك بێت، ئـەگینا لـە تـەرازووی خـوادا هـیچ وەزن و نرخـی نابـێ و خـوا نایـەوێ بێجگـە لـەوەش کـردەوەی چـاك کەلەسـەر ئـەو بنـەڕەتـە نـەبێ دامـەزراو نابـێ و پـشتی پێنابەسترێ، چونکە بەرنامەیـەکی دامـەزراوی نابێ، بـەڵکو بـەپێی ئارەزووی نـەفس ئـەبێ، کەشتێکی گۆڕاوە هەر دەمە بەبارێکا.

ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
بِـَٔايَـٰتِنَا هُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ ﴿٢٠﴾

---

کەواتە ئیمان و بڕوا سەر دەستەیەو باڵاترە لە هەموو شتێ، لەبەر ئەوە لەبارەی نەبڕینی ئەو پلەو ڕێگا سەختەوە باسی نەبوونی بڕوایش ئەکات بەجۆرێ کەئەبوو لە پیشەوە ببوایە، وە دەست نیشانیش ئەکات کە ڕادەی بەرزو بڵندترە لە ڕزگارکردنی بەندەو نان و خۆراك دانی کاتی برسێتی و قاتی، ئەو دەست نیشانەش بە وتەی ﴿ثُمَّ﴾ ئەکات کەلێرەدا بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستەیەو هەروەها لەگەڵ باسی نەبوونی بڕوا باسی نەبوونی ئامۆژگاری بەخۆگرتن و ئامۆژگاری بەبەزەیی هاتەوەش ئەکات ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ واتە ئینجا ئادەمی سەرەڕای ئەوە هیچ کام لەو دوو پلە سەختەی نەبڕی، لەو کەسانەش نەبوو کە بڕوایان هێناوەکەبڕواهێنان لە هەموو شت پێویست ترو گەورەترەو مایەو بنەڕەتە بۆ هەموو چاکەیەك ﴿وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ﴾ وە لەوکەسانەش نەبوو کەلەناو یەکترا ئامۆژگاری یەکتریان کردووە بە خۆگرتن و خۆ ڕاگیرکردن لەبەر کارو فەرمانی خوادا ﴿وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ﴾ وەلەو کەسانەش نەبوو کە ئامۆژگاری یەکتریان ئەکرد بەبەزەیی و میهرەبانی لەگەڵ بەندەکانی خوادا.

خۆگرتن سیفەتێکی زۆر پێویستە بۆ بڕوا بە شێوەی گشتی، وە بۆ بڕینی پلەو ڕێگای سەخت بە شێوەیەکی تایبەتی، وە ئامۆژگاری کردنی یەکتر بەو خۆگرتنە، مایەی یەکێتی و یەکگرتنی کۆمەڵە، چونکە بەو ئامۆژگاریە هەموو هەست ئەکەن کە دەربەستی یەکترو غەمخواری یەکترن، وە هەموو بەشداری یەکترن لەو ئەرکەی کەلەسەرشانیانە، ئەرکی تێکۆشان بۆ پێکهێنانی ئاین و بڕواکەیان لەژیانا، کەواتە بەهۆی ئەوە بەهێز ئەبن و کۆمەڵ و لەشکریان ناشکێ. بەزەیی هاتنەوە سیفەتێکی سروشتی و ئادەمیە بەهۆی بڕواوە پاك و خاوێن و بەهێزو دامەزراوتر ئەبێ و ئامۆژگاری یەکتر پێی مایەی یەکێتی و یارمەتی و سۆزو پەرۆشە بۆ یەکتر، کە بەردەوامی و کامەرانی گەل و کۆمەڵیش لەسەر ئەوە ڕاگیرە.

ئینجا بەکورتی دوارۆژو چارەنووسی ئەوانە باس ئەکات کە خاوەنی بڕواو ئەو کردەوە چاکانەن، ئەفەرموێ: ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ﴾ ئەوانەی کە ئەو پلەو ڕێگا سەختە ئەبڕن بەو شێوەی کە قورئان نیشانی دان ئەوانە یارانی دەستی ڕاستن بە شێوەی کەلە سوورەتی (الواقعه) دا باسکران.

ئینجا بەرانبەر بەو تاقمە بەختیارە باسی دواڕۆژی تاقمی دژو دوژمنی ئەوان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا﴾ وە کەسانێ کە بڕوایان نەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمە، واتە ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە کە ئێمە دامان ناوە لەم بوونەوەرەدا، یا بە ئایەتەکانی قورئان کە هەموو شتێکی پێویستی تیایە ﴿هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ﴾ ئەو بێ بڕوایانە یارانی دەستی چەپن، وە ئەمانیش بەدرێژی باسکران لە سوورەتی ناوبراودا، بێگومان ئەم تاقمە ڕەوشتو کرداری پیسو نارەوای تریان زۆربووە بەڵام پێویست ناکات باکردنیان، چونکە هیچ کام لەوانە چاو نادەن لەگەڵ پیسترین شت کە بێبڕواییە، وە بێبڕوایی کانو کانگای هەموو خراپەیەکە، خوا پەنامان بداتو بمان پارێزێ لێی.

﴿عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ﴾ وا بەسەریانەوەو دایان ئەگرێ ئاگرێکی داخراو واتە قاپیەکانی دائەخرێ لەسەریان تا هیچ دوکەڵو تەمو غەمو بۆگەنێکی دەرنەچێو لەوانە نەبێ باوو هەناسەیە بێتە ژوورەوە، وە دەرچوونو ڕزگاربوونیشیان نەبێ لێی، بەڕاستی هەق وایە بەبیرلێکردنەوە لەو بەد بەختیە خەوو خۆراك شووم ببێو تیکە لە گەروودا بگیرێ، داوائەکەین خوای میهرەبان بمان پارێزێ - ئامین -.

باسی تۆڵەی ئەمانی کردوو بێدەنگ بوو لەبەڵێنو پاداشتی تاقمی بەختیار چونکە لەم شوێنەدا باسی ئەمان مەبەستو سەرەکیەو باسی تاقمی بەختیار بە بۆنەی ئەوانەوەیەو وەك تێهەڵکێش وایە.

ئابەم شێوە ئەم سوورەتە کورتەی دوایی پێهێنا کە ئەو هەموو شتە سەرەکیانەی تیابوو لەبارەی ژیانی ئادەمیەوە، وە لەبارەی بۆچوونێ کەلە بڕواوە هەڵقوڵێ، کەمەر لەدەست قورئان دێت ئەو هەموو شتە زۆرو فراوانە کۆبکاتەوە لە جێگایەکی ئاوا کەم دەرەتانو تەنگدا، وەلە هەمان کاتا ڕوونو ئاشکراش بن.

**سبحان من أنزل هذا القرآن العظيم على ذلك الرسول الكريم صلى الله عليه وسلم وآله**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا (١) وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا (٢) وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا (٣) وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا (٤)

## سوورەتی «الشمس»
## مەككەییەو (١٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە كورتە چەند دەسكاری یەكی دڵو دەروون دەكات بەمەی سەرنجی ڕائەكێشێ بۆ چەند چەشمەندازی ئەم بوونەوەرە شیرینە، كە هەر دڵێ زیندوو بێت بە بیرلێكردنەوەو تەماشا كردنی ـ بە جۆرو شێوەیەكی سادەش بێت ـ پاراو ئەبێتەوەو ئەژێتەوە بە ئاوی شیرینو بێگەردی بڕوا، وە بەتیشكی ڕووناكی یەكەی تەمو تاریكی نامێنێ لە دەروونا.

جا لەبەر ئەوە قورئان لەزۆر لە ئایەتەكانیا ڕووی دڵمان ئەكاتە ئەو بوونەوەرەو چەشمەندازەكانی، بە تایبەتی لە سوورەتە مەككەییەكان كە مەبەستی سەرەكی تیاچاندنو بەهێزكردنی بڕواو ئاقیدەیە لە دڵو دەروونا، وە بە تایبەتی تر لەم جزمەدا كە زۆربەی سوورەتەكانی ئەو سەرنج ڕاكێشانە ئەكاتو دڵ ڕوو ئەكاتە ئەم بوونەوەرەو بە چەند جۆرو ڕەوشتێو لە چەند ڕێگایەكەوە، ئیتر لەڕێوەو یەكسەر، یا بە دەست نیشان كردن، وەك لێرەدا كە سوێندیان پێ ئەخواتو ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * وَالشَّمْسِ﴾ سوێند بە خۆر، ئەو شتە گەورەی كە بە پێی زانیاری تازە گەورەترین قەبارەیە لەم كۆمەڵەی خۆری ئێمەداو ملیۆنێكو سێسەد هەزار ئەوەندەی ئەم زەوییەی ئێمە ئەبێ، ئەو خۆرەی كە ژیان لەم جیهانو زەوی یەدا بەبێ تیشكو ڕووناكیەكەی ئەو ناڕواو ناگونجێ.

ئەو خۆرە درەخشانەی كە لە چێشتەنگاوا لە هەموو كات شیرین ترە، كەواتە هەقی خۆیەتی كە سوێند بەو كاتەش ئەخواتو ئەفەرموێ: ﴿وَضُحَاهَا﴾ وە سوێند بە ڕووناكیەكەی

لە چێشتەنگاوا، واتە سوێند بە خۆر بە شێوەی گشتی و لە هەموو کاتا، وە بە تایبەتی لەو کاتەدا، ﴿وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا﴾ وە سوێند بە مانگ کاتێ دێت بە دوای ئاوابوونی خۆرداو هەموو شەو ڕووناك ئەکاتەوەو ئەبێتە جێگری خۆر لە شەوا بە ڕووناکیەکەی، ئەوەش ئەو سێ شەوەیە لە بەینی دوانزەو شانزەدا یا دێت بەدوای خۆرا لە هەڵاتنا کە ئەوەش لە پانزەی یەکەمی مانگدا ڕوو ئەدات، یا دێت بەدوای دیار نەبوونی خۆردا، واتە دەرئەکەوێ لەکاتی دیارنەبوونی خۆرا، ئیتر لە سەرەتای شەو یا لە ناوەڕاستی، یا دوادوایی شەو، کە ئەوەش هەموو شەوەکانی مانگ ئەگرێتەوە بێجگە لە شەوێ یا دوو شەو لە ئاخری مانگەوە کە لە دەورووبەری خۆرا هەڵدێ، لەسەر هەر بار مانگ لە هەموو بارو ڕوویەکەوە شتێکی زۆر نایابی سەرسوڕهێنەرو دڵڕفێنەو شایانە بۆ ئەوەی دڵو دەروون بە بینینی بکەوێتە سۆزو پەرۆش و سەری بەندەیی دابخات بۆ پەروەردگاری، ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا﴾ سوێند بە ڕۆژ کاتێ کە خۆر بەتەواوی دەرئەخات. واتە لەکاتی سایەقەو بێ هەورو تەم، کە لەو کاتەدا شیرین و دڵڕفێن ترەو زۆر تر سوود وەرئەگیرێ لە ڕووناکی و تیشکی خۆر. بێگومان ڕووناکی بەهرەیەکی ئێجگار گەورەیەو زۆر پێویستە لە ژیان و لە جیهانا. یەکێ لە نیشانەی گەورەیی و گرنگیەکەی ئەمەیە کە لە سەرەتای ئەم سوورەتەدا لەم سێ ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کرد.

هەرچەند بەو جۆرە بەکەڵك و پێویست بێت، لە هەمان کاتا شەوو تاریکیش بەهرەیەکی زۆر پێویست و بە کەڵك و گەورەیە لە ژیانا، هەرچۆنێ هاتنی بەدوای ڕۆژو ڕووناکیداو هاڵو گۆڕیان بە یەکتر ڕابەرو بەڵگەیەکی بەهێزن لەسەر ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەم بەهرەیانە فەراهەم ئەهێنێ بۆ ژیانی هەموو زیندووو زیندەوەرێ، جا کەواتە ئەمیش زۆر شایستەیە بە ئاوڕدانەوەی مەردوم بۆلای، بەمەی خوای گەورە سوێندی پێ ئەخوات، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا﴾ وە سوێند بەشەو لەکاتێکا کە خۆر دائەپۆشێ بە تەواوی و هیچ جۆرە ڕووناکیەکی دەرناکەوێ، وەك ئەو چەند شەوەو ئەو کاتانەی شەو کە مانگیان تیا دەرناکەوێ و دنیا تاریك و تنوکە، کە ئەو کاتانە زۆر سامناکن و دڵو دەروون ئەخەنە کارو بێداری ئەکەنەوە.

وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴿٥﴾ وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾

قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾

**لە پێشەوە سوێندی خوارد بە چوار شت، دوانیان ئاسمانی بوون: خۆرو مانگ، وە دوانیان زەمینین و لە زەویدا فەراهەم دێن: ڕۆژو شەو، ئینجا سوێند ئەخوات بە ئاسمان و بە زەوی بە شێوەی گشتی و بە هەموو شتێکیانەوە، سوێند ئەخوات بەو پەروەردگارەی کە ئەوانەی فەراهەم هێناوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا﴾ وە سوێند بە ئاسمان و ئەو پەروەردگارەی کە ئاسمانی دروست کردووەو هەموو بەش و پارچەیەکی یەك خست و پەیوەستی کردن پێکەوە ﴿وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا﴾ وە سوێند بە زەوی و ئەو کەسەی کە ڕای خست و ڕێکی خست و گونجاوی کرد بۆ ژیان تیایا، بەم جۆرو شێوەیە کە هەموو ژیرییە تیا سەرگەردانە، تابێت نایابیەکەی ڕوونتر ئەبێتەوەو شتە نهێنییەکانی زۆرتر ئاشکرا ئەبن، مەبەست لەزەوی ئاشکرایەو ئەمەیە کە تیایا ئەژین و بەباشی ناسراوە لامان. بەڵام لەبارەی ئاسمانەوە بە شێوەیەکی ڕاستی هیچ نازانین، بێجگە لەوەی کە وەك خێوەت و گومەزێکی شین وا بەلای سەرمانەوەو خۆرو مانگ و ئەو هەموو ئەستێرەی تیا پەخشان بووەتەوە، وە هەموو پەیوەست و بەستراوە پێکەوە لە پێش ژاومان، بەبێ شێوان و تێکچوون بە وێنەی کۆشکێکی بەتینی دامەزراو، ئیتر زیاد لەوە هەرچی ووتراوە هەموو گۆترە کای‌یەو تێ ڕوانینێکی ڕووتەو دەست ئەدەن بۆ بە درۆخستنەوەو بڕارەکردن.**

**بێگومان زەوی بۆئادەمی دانراوەو ژێربارکراوە، وە ئادەمی بەنرخترین گیان لەبەرەتیایا، بێجگە لەوەش کە ئادەمی گرنگ ترو نایاب تری دروست کراوەکانی خوایە لەم زەوییەدا، مەبەست لەم سوێندانەش تەمێ و ئامۆژگاری ئادەمی‌یە. کەواتە زۆر شیرین و بەجێیەکە خۆی سوێندێکیش ئەخوات بەنەفسی ئادەمی و پەروەردگاری، وەبەم سوێندەش ئایەتەکانی پاش و پێش جۆش ئەدا بەیەکەوە لەهۆنینەوەو لە مەبەستا و دەست نیشان ئەکات کە ئادەمی یەکێکە لە ڕابەرو نیشانە گەورەکانی ئەم بوونەوەرەو پەیوەستە بەو هەموو ڕابەرو نیشانە گەورانەی ترەوە. ئەفەرموێ: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا﴾ وە سوێند بەنەفسی ئادەمی، بەو کەسەی کە ئەو نەفسەی داهێناو ڕێك و پێکی کرد، بەم ڕەنگە ئەو هەموو هێزو وزە ئاشکرا و نهێنیەی پێبەخشی و بۆ هەر کام لەوانە کارو پیشەیەکی دیاری و تایبەتی دانا، بەگوێرەی ئەو هێزو ووزەیانە لەش و قەبارەو چەند ئەندام و پەلێکی بۆ دروست کردووە کە دەست**

بدات بۆ بەکار هێنانی ئەو هێز و وزەیانەو بگونجێ لەگەڵ کارو پیشەکانیانا گرنگترین بەرهەمی ئەو ڕێكو پێك خستنە ئەوەیە کە ژیریی پێداوەو ڕێنموونی کردووە بۆ چاك و خراپ و ڕێگای ڕاستو چەوتی نیشان داوەو دەسەڵاتو توانینی داوەتێ بەسەر کردنی چاکەو خراپەو کامڕێگا بداتەبەر، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ ڕێنموونیو ئاشنای کردووە بە بەدکرداری خۆیو پارێزگاریێ خۆی. کەواتەئەزانێ چی خراپەو چی چاکە؟ هەرچۆنێ سەربەخۆی کردووە و ئەوتوانێ بە ئارەزووی خۆی کامیان هەڵبژێرێو بیکات. لەم ئایەتانەو لەچەند ئایەتی ترەوە دەرئەکەوێ کە ئادەمی دروست کراوێکی تایبەتیەو بەسروشت ئامادەیی هەیە بۆ چاکەو خراپەو ڕێنومایيو گومڕاییو بە شێوەیەکی ئاساییو یەکسان. ئەتوانێ چاكو خراپ لەیەك جیا بکاتەوە، هەرچۆنێ ئەتوانێ خۆی ئاڕاستەبکات بۆهەرکام لەودووانە. ئینجابێجگەلەوئامادەییوهێزە سروشتیانە هێزێکی تێگەیشتووی ئامۆژگاری کەری تیایە کە کۆمەکی بکات لەسەر ئەوەی هەمیشە باشترین ڕێگا بداتە بەرو هەڵی بژێرێ. کە تەکلیفو تۆڵەو پاداش بەستراوە بەو هێزەوە. جا هەرکات ئادەمی ئەم هێزەی بەکارهێنالەپاكو خاوێن کردنی هەموو هێزو وزەکانی تریو بەهێزکردن و گەشەپێدانی ئامادەیی خێرو چاکە، وە زاڵ کردنی بەسەر ئامادەیی بۆ شەڕو خراپە.

بێگومان ئەو حەلە ئەو ئادەمیە بەهرەمەند ئەبێ دوور لە زیان، هەرکات ئەم هێزەی لاوازکردو دایشارد ئەو حەلە بێبەشو زیان بار ئەبێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾[1] بەڕاستی ڕزگارو بەهرەمەندبوو ئەو کەسە ی کە نەفسی خۆی پاك کردەوە لە هەموو جۆرە شتێکی خراپ بەم ڕەنگە پەروەردەی کردو گەشەی پێدا هەتا گەیشتە ئەو ڕادەو پلە بەرزەی کە ئامادەیی هەیە بۆی، بەهۆی ئەوەوە گەیشت بە بەرو بەرهەمی کردەوەی چاکی خۆییو مەردومیش بەهرەمەندبوون لێیەوە. ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ وە بە ڕاستی نائومێدو زیان باربوو ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی وونو نابووت کرد، بەم ڕەنگە لایدا لە ڕێگەی ئادەمێتیو شوێنی هێزی شەڕو خراپە کەوت، تا بەهۆی ئەوە ئادەمێتی لە خۆیدا داڕنیو بووبە پیسترین گیان لەبەر، جا چ زیانێ لەوە گەورەترە کە ئادەمی بەدەستی خۆی خۆی ئاوا لێ بکات. کەواتە ئادەمی سەربەستیەکی هەیە، دەی ئەبێ بەرانبەر ئەو سەربەستیە بەرو بەرهەمی کردەوەکانیشی بۆ ببێ توانینو دەسەڵاتێکی هەیە دەی ئەبێ ئەرکو تەکلیفیش

---

[1] وەڵامی ئەم سوێندانە ئەم دوو ڕستەیە بەلای زۆر لە زانیانەوە وە بەڕاستی زۆر بەجێیە ئەو ڕایەو چەسپاوە لە دڵدا.

بکەوێتە سەر شانی و بەهرەیەکی تایبەتی پێدراوە کەواتە بەرانبەر ئەوە واجب و پێویست ڕووی تێنەکات، بەهرەو چاکەیەتر لەلایەن خواوە بۆ ئەم ئادەمیە ئەوەیە کە لێی نەگەڕاوە بەپێی ئامادەییە سروشتیەکەی خۆی هەڵسوڕێ و نەیداوەتە دەست تەنها ژیری و هێزی هەڵبژاردنی خۆی، بەڵکو کۆمەکی کردووە بە ئاین و پەیامێ کە بۆی ناردووە، ئەو ئاین و پەیامە تەرازوویەکی ڕێك و ڕاستی داوەتە دەستی کە بە موو سەر نەکات و هەموو شتی پێ بەراوورد بکات، وە هۆی بڕواهێنان و ڕابەرو بەڵگەی ڕوون و ڕەوانی نیشان داوە هەر لە نەفس و لەشی خۆیی و هەموو دەوروو بەری و ئەو بوونەوەرەی کە تیایا ئەژی، هیچ پەردەو بەربەستێکی لەبەرچاوانەهێشتووەکەواتەهەمووحەق وڕاستی ئەبینێ لە شێوە ڕاستەقینەکەی خۆیا. کەواتە هێزی ژیریی هەر کارێ بکات لە ڕووی تێگەیشتن و زانینەوە ئەیکات، ئەزانێ ڕوویبۆ کوێ بکات و بۆ کوێ بڕوا، بەکورتی بەو جۆرەیە خواهیشی خوا لەم ئادەمیەدا، هەرچیش ڕوویدات و بەدی بێت لە ئادەمیەوە هەموو بەخواست و خواهیشی خوایە، لەم باسە کورتەوە چەند شتێ وەرئەگیرێ:

یەکەم: نرخ و ڕێزی ئەم ئادەمیە بەمەی کە کراوە بە هەڵگری ئەرك و تۆڵەو پاداشت و کردەوەی خۆی و سەربەستی پێدراوە لە هەڵبژاردنی کردەوەو بارو ڕێگای خۆیا (لەناو چوارچێوەی خواهیشی خوادا کە ئەو سەربەستیەی پێ بەخشیوە) بەهۆی ئەو بەهرەوە ئادەمی بووە بە دروستکراوێکی تایبەتی و ڕادەو پلەیەکی بەرزی هەیە لەم بوونەوەرەداو ڕێزی دراوە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانی خوادا.

دووەم: ئەبێ ئەم ئادەمیە بێدارو وریاو خۆ پارێز بێت، کاتێ کە ئەزانێ بڕیاری خوا لەم لا بەدی دێت لەناوەندی کردەوەو ڕەفتاری خۆیا. بێگومان ئەوە ئەرك و بارێکی گرانە خراوەتە سەر شانی نابێ گوێی پێنەداو بێئاگابێ لێی!

سێیەم: ئەبێ بزانێ کە هەمیشە پێویستی هەیە بە گەڕانەوە بۆلای بەرنامەی خواو تەرازووە ڕاست و دامەزراوەکەی، تا هەمیشە بزانێ و مەترسی نەبێ لە چوونی بۆ نێو ڕیزو کۆمەڵی ئەوانەی کە ئارەزووی نەفسی خۆیان کردووە بە خواو پەرستراوی خۆیان، هەرکات ئەو هەڵخەڵەتان و گومڕابوون و شوێنکەوتنەی نەبێ هەمیشە نزیك ئەبێ لە خوا و بەپێی ڕێنموونی ئەو ئەجوڵێتەوە، لە هەموو تاریکی و چۆڵ و بیابانی ڕێگەی ژیانا لە نوری خوا ڕووناکی وەرئەگرێ، بێگومان هەرکات بەندە بەو جۆرە بوو بە ئاسانی توانا ئەبێت بەسەر پاك و خاوێن کردنی نەفسی لە هەموو چڵك و چەپەڵیەك.

كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ﴿١٣﴾
فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ﴿١٥﴾

---

ئینجا نموونەیە باس ئەکاتو ئەیخاتە بەرچاو لە نموونەکانی نائومێدیو زیان بارییەك کە دووچاری ئەو کەسە ئەبێت کە نەفسی خۆی وونو نابووت ئەکات: ئەو نموونەش بریتیە لەوسزای سەختو لەناوچوونەی کەبەسەر خێڵی ﴿ثَمُودُ﴾ هات، باسی ئەم خێڵەو بەسەرهاتی لە چەند سوورەتێکدا هاتووە، لە هەموو شوێنێ لەو شوێنانەدا ئەندازەیە درێژە درا بەو باس و داستانە، نزیکتر ئەمەیە کەلەم جزمەدا باسمان کرد لەسوورەتی (فجر)دا کەواتە تەماشای بکرێ، وەلێرەدا هەر ئەم ئەندازەو کورتەیە بەسە کە ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ﴾ خێڵی ﴿ثَمُودُ﴾ بڕوای نەهێناو پێغەمبەرەکەیان بە درۆزن دانا بەهۆی یاخی بوونیانەوە ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا﴾ کاتێ خراپترینی خێڵەکە چوو بۆ کوشتنی حوشترەکە ﴿فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ﴾ ئینجا پێغەمبەرەکەی خوا (صالح) پێی وتن ﴿نَاقَةَ ٱللَّهِ﴾ وازبێنن لە حوشترەکەی خوا، کە کردی بە موعجیزەی ئەو پێغەمبەرە ﴿وَسُقْيَٰهَا﴾ وازبێنن لە بەش و نۆرە ئاوەکەی، ئەو بەشە ئاوەی کە کاتی خۆی بڕیاری لەسەر دانو ترساندنی بە سزای بەتینی خوا ئەگەر ئازاری ئەو حوشترە بدەن، واتە هەواڵی پێدان بە هاتنی سزای خوا بۆ سەریان ئەگەر ئازاری بدەن ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ ئینجا ئەوانیش بڕوایان پێنەکردو بەدرۆزنیان دانا ﴿فَعَقَرُوهَا﴾ بەهۆی ئەوە حوشترەکەیان کوشت، ئیتر بە هەموویانەوە ئەو کردەوە خراپەیان کرد، وەك (قەتادە) ئەگێڕێتەوە، یا ئەو خراپترە کردی بە ڕەزامەندیو پێخۆشبوونی ئەوانی تر، کەواتە وەك هەموو کردبێتیان وایەو هەموو بەشدار ئەبن لە گوناهو تۆڵەکەیا.

ئینجا لەو کاتەدا دەست قودرەت هاتە پێشەوە بۆ دەست لێوەشاندنیانو لێدان بەم جۆرەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ﴾ ئینجا پەروەردگاریان خەشمو سزای دابەسەریانا بەهۆی گوناهی خۆیانەوە ﴿فَسَوَّىٰهَا﴾ پاشان خەشمو سزای یەکسان کرد بۆیان

بەم ڕەنگە هەمووی گرتنەوەو هیچ کەسی لێ دەرنەکردن، یا تەختی کردن بە زەویەکەیانەوە، پەروەردگاریان ئەوەی بەسەر هێنان ﴿وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا﴾ لە کاتێکا کە مەترسی ناکات لە دواڕۆژی ئەو کردەوەیە کە پێی کردن.

بێگومان خوای گەورە پاك‌و بێگەردە لە مەترسی کردن، ئایا لە کێ بترسێ‌و لە چی بترسێ؟ بە هیچ کلۆج گومانی ئەوەی پێنابرێ، کەواتە مەبەست لەم ڕستەیە دیمەن‌و ڕواڵەتەکەی نیە، بەڵکو مەبەست گەیاندنی زۆر سەختی‌و بەتینی سزاکەیانە، چونکە ئەو کەسەی کە مەترسی دوا ڕۆژی نەبێ زۆر بەتین‌و سەخت دەست ئەوەشێنێ.

بێجگە لەوە ئەم ڕستەیە لاقرتی کردن بەو گەل‌و خێڵە نیشان ئەدات‌و ڕیسوایی‌و بێنرخییان دەرئەخات. ئامۆژگاری بەو جۆرو شێوەیە ئەم سوورەتە دوایی هات کە نیشانی دا بوونی پەیوەستی لەناوەندی نەفسی ئادەمی‌و هەموو شتە گرنگەکانی ئەم بوونەوەرە گەورەیەدا، وەك گەیاندنی پەیوەستی باوی خوا لە تۆڵەسەندن‌و سزادانی بێبڕوایان‌و یاخیانا، بە نەفسی ئادەمی‌و بە هەموو شتەکانی تری ئەم بوونەوەرە، لە سنووری بڕیارە گشتیەکەی خوادا، کە خوای هەموانەو خاوەنی بڕیارەکانە.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣﴾

---

## سووره‌تی ﴿الليل﴾
## مه‌ككه‌ییه‌و (٢١) ئایه‌ته

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئه‌م سووره‌ته حه‌قیقه‌تی كرده‌وه‌و تۆڵه‌و پاداشت دیاری ئه‌كات، له‌چوارچێوه‌ی چه‌ند چه‌شمه‌ندازێكی ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌و سروشتی ئاده‌می‌دا، ئینجا هه‌ر چۆنێ كرده‌وه‌و پاداشت‌و تۆڵه دوو جۆری جیاوازو دژی یه‌كترن. هه‌روه‌ها ئه‌و چوارچێوه‌ش كه هه‌ڵی بژاردووه، پێك هاتووه له چوارشت له سه‌ره‌تای سووره‌ته‌كه‌وه، كه جیاوازیی‌و دژایه‌تی هه‌یه له‌ناوه‌ندی یه‌كه‌م له‌گه‌ڵ دووه‌ما وه‌ك سێیه‌م له‌گه‌ڵ چواره‌ما..

* خوای گه‌وره سوێند ئه‌خوات به‌م جۆره‌ی كه ئه‌فه‌رموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾ سوێند به‌شه‌و كاتێ كه ڕووی زه‌وی دائه‌پۆشێ به تاریكی‌یه‌كی ﴿وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾ وه سوێند به ڕۆژ كاتێ كه ئاشكرا ئه‌بێ‌و ده‌رئه‌كه‌وێ ﴿وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ﴾ وه سوێند به‌و كه‌سه‌ی كه نێرو مێی دروست كرد كه خوای په‌روه‌ردگاره.

بێ‌گومان شه‌وو ڕۆژ دوو كاتن به‌رانبه‌رو دژی یه‌كترن له شێوه‌و له‌نیشانه‌و له‌به‌رهه‌مدا. هه‌روه‌ها تیره‌ی نێرو مێ به‌رانبه‌رو جیاوازن له یه‌كتر له شێوه‌و وێنه‌و نیشانه‌دا. ئه‌م شه‌وو ڕۆژه كه به‌م یاسا تێرو ته‌واوه دێن‌و به‌دوای یه‌كاو ئه‌چن به‌ناو یه‌كا، به‌ڵگه‌و نیشانه‌یه‌كی زۆر ئاشكران، له‌سه‌ر ئه‌و ده‌سته قودره‌ت‌و لێزانه‌ی كه ئه‌م كاره گه‌وره‌یه ئه‌كات، به‌هه‌میشه‌یی. هه‌روه‌ها به‌ڵگه‌و نیشانه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه كه ئه‌و كه‌سه‌ی ته‌گبیری ئه‌م شه‌وو ڕۆژه ئه‌كات، هه‌رئه‌و كه‌سه‌یه‌كه‌ته‌گبیری ژیانی ئه‌م ئاده‌می یه ئه‌كات، وه هه‌رچۆنێ دروستی كردووه، له خۆڕایی‌و بێ هوده دروستی نه‌كردووه‌و هه‌ر وایش وازی لێ ناهێنێ كه مردبێ سه‌رو شوێن بڕوا.

هه‌ر چه‌ند بێ‌بڕواو سه‌رتێك ده‌ران هه‌وڵ‌و تێكۆشان بكه‌ن‌و ده‌مبازی بكه‌ن له‌م شته ڕاست‌و ڕه‌وانه‌داو بیانه‌وێ ڕووی مه‌ردومی لێ وه‌رگێڕن، هیچ سوودی نی‌یه‌و دڵی ئاده‌می

هەمیشە بەسراوە بەم بوونەوەرەوەو ئەوەی بوونەوەر پێی ئەڵێ و ئەچرپێنێ بە گوێچکەیا، باش وەری ئەگرێ و تێی ئەگات، هەر چۆنێ خۆیشی بۆ خۆی بیری بکاتەوەو وورد ببێتەوە، هەر ئەبێ بزانێ کە پەروەردگاری هەیە، ئیتر هەر چەند بێبڕواو گومڕاکەران بەدەوریا دەست بکەن بەهۆسەو دەمبازی، بۆ سەرتێك دان و گومڕاکردنی.

هەروەها دروست کردنی نێرو مێ نیشانەو بەڵگەیەکی زۆر ئاشکرایەو خۆی ئەچەسپێنێ لەدڵا و هیچ ماوەو ڕێگایە ناهێڵێتەوە بۆ دەمبازی کەران و سەرتێکدان. چونکە لە ئادەمی و هەموو گیان لەبەرانی مەمکدارا نێرو مێ لەیەك شت پەیدا ئەبێ: لەو دڵۆپە ئاوە پەیدا ئەبن لەیەك گرتنی سێڵ و گەرایەك کەواتە لە پاشا ئەم جیاوازییە لەچی پەیدابوو؟ کێ ووتی بە یەکێکیان: ببە بە نێرو ووتی بە یەکێ‌تر ببە بەمێ؟! ئەمەی کە لەم دوایی‌یەدا دەرکەوت کە چەند شتێ هەیە ئەبنە هۆی ئەو جیاوازی‌یەو هێندێ ئەگێڕن بەنێرو هێندێ تر بەمێ، ئەوە هیچ گۆڕانێ ناهێنێ بەسەر ئەم مەسەلەدا.

چونکە ئەو کاتە ئەڵێین: ئایا کێ ئەو شتانەی فەراهەم هێناو دابەشی کردن و جوێی کردنەوە، تا هێندێ لەو ئاوەی گێڕا بەنێرو هێندێ تر بەمێ؟ وە چۆنئەو دوو جۆرە ڕێك خرا تا بووبە یاسا بۆ ژیان و پەرەسەندنی ئەو گیان لەبەرانە؟! ئایا شتی وا گرنگ و سەرسوڕهێنەر هەر لە خۆیەوەو بەڕێکەوت فەراهەم هات؟! نەخێر بەڕێکەوت ناگونجێ و هەر کەس ڕێزی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز لە ڕووی نایەشتی وا بەدەمیا بێت، چونکە ڕێکەوت و دووبارە بوونەوەی ئەوەتا بە پێی یاسای بیرکاری بۆ دووبارە بوونەوی (١٠) شتی یەك لەدوای یەك و بەڕیز بە دە ملیار ئیحتیمال تەواو ئەبێ!! کەواتە هیچ چارە نەما ئەوە نەبێ بڵێین: پەروەردگاری کار دروستی زانا ئەو شتانە فەراهەم ئەهێنێ. بەهیچ ڕەنگ ڕێگا نی‌یە بۆ ڕێکەوت دەست کاری هیچ کارو بارێکی ئەم بوون و بوونەوەرەبکا....

ئەو نێرو مێ‌یە تایبەتی ناکرێ بە ئادەمی یا گیان لەبەرانی مەمکدار، بەڵکو گشتی‌یە بۆ هەموو گیان لەبەرانی ترو هەموو ڕووەکێ (النبات) بەڵکو هەموو دروست کراوی تریش ئەگرێتەوە. وەك لە سوورەتی (الذاريات) و چەند شوێنی تر ئەم باسەمان کرد. بەتەنها خوا تاك و تەنهایەو بێوێنەو بێهاوسەرە. ئەمەی کە ووتمان هێندێ بوو لەو مەبەستە گرنگانەی کە لەم سوورەتەدا وەرئەگیرێ.

إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾

خوای گەورە سوێندی خوارد بەوانە لەسەر ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ﴾ بەڕاستی کردەوەو کۆششتان جیاوازەو جۆر بەجۆرە، بەم ڕەنگە هێندێ چاكو هێندێ خراپ، هێندێ بە کەڵکەو هێندێ بێ کەڵك، هێندێ زیاندارەو هێندێ بێزیان، هەروەها ئەوەش بەپێی جیاوازیو جۆر بەجۆریی سروشتی مرۆڤ و تێگەیشتنو بۆ چوونیەتی... کە هەریەکێو هەر تاقمو کۆمەڵێ ڕێگایەکی هەیەو ئارەزووی شتێ ئەکاتو دڵی بەشتێ خۆشەو بەشتێکەوە خەریکە... ئەمانە لەگەڵ ئەوەی زۆر جیاوازن، بەڵام بە خۆیانو کردەوەکانیانەوە کۆئەبنەوەو کورت ئەکرێنەوە لەم دوو کۆمەڵەو لەم دوو ڕیزەدا کە دژو بەرانبەری یەکترن: ئینجا سوێند لەسەر خوراوەکەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرەنجامەی کە باسی کردووە بۆ ئەم دوو تاقمە کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ﴾ ئەو کەسەی کە بەخشینو بەخت کردنی کردبێ لە ڕێگای خوادا، ئیتر بەماڵو بەگیان یا بە هەرکام، بەپێی توانینو بۆ گونجان، ﴿وَاتَّقَىٰ﴾ وە خۆی پاراستبێ لە هۆی خەشمو سزای خوا ﴿وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ﴾ وە بڕوای هێنا بە ئایینی ئیسلام، کەهەرکات ناوی شتی چاكوشیرین ببرێ ئەم ئایینە یەکەمو سەردەستەیە و شیاوترە بۆ ئەو ناوە، هەر کەس کردەوەو کۆششی ئاوابێ ﴿فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ﴾ ئێمە ئامادەو ڕێكو پێکی ئەکەین بۆ ئاسانترین ڕێ، کە ئەو ڕێیە بوو خوا موژدەی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) وەخستییە سەریو لەم ئایینو شەریعەتەدا بۆی نارد. وەك لە سوورەتی (الاعلی)دا ئەندازەیە بە درێژی لێی دواین.

ئەو کەسەی کە هەڵسێ بەو کردەوە شیرینانە، بێگومان ئەوەی لەدەستی هاتبێ بەختی کردووە بۆ پاكو خاوێن کردنی خۆی. کەواتە شایستە ئەبێ بۆ ئەو کۆمەکیو یارمەتییەی کە خوا بەمەیلو خواهیشی خۆی پێویستی کردووە لەسەر خۆی بۆ ئەو جۆرە بەندانەی، کەبەبێ ئەو کۆمەکیو یارمەتییە بەندە هیچی بۆ ناکرێو دەسەڵاتی بەسەر هیچ شتێکا نییە. بێگومان هەرکەس خوا یارمەتیو کۆمەکی بکات ئەو کەسە ئەگات بە ئامانج... ئەگات بە ئاسانیو نەرمو نیانیو بێگرێو ئەرك. هەر لە ئێستاوە کەوا لەم جیهانەدا ئەگاتو بەو شێوە شیرینە ئەژیو ژیان بەسەر ئەبات.

وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴿١١﴾
إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْـَٔاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴿١٥﴾ ٱلَّذِى
كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ
﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾

---

**﴿وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ﴾ وە هەر كەسێ چرووكی كردبێ، بەم ڕەنگە ماڵ و گیانی خۆی بەكار نەهێنابێ لە ڕێگای خوادا. ﴿وَٱسْتَغْنَىٰ﴾ وەخۆی بەبێ نیازو بێ پێویست زانیبێ لە ڕەزامەندی خواو پاداشتی لای خوا، بەم ڕەنگە گوێی لێ نەبووبێ و هەوڵی بۆ نەدابێ ﴿وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ﴾ وە بڕوای نەكردبێ بە ئایینی ئیسلام ﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ﴾ ئەو كەسە ئێمەش ئامادەی ئەكەین و ڕێكی ئەخەین بۆ سەخت ترین ڕێ. كەڕێی خراپە كارییە، وەپێی خراپە كاری هەر چەند لەم جیهانەدا بەرزی و سەركەوتنی تیابێ و خاوەنەكەشی خۆی بە بەختەوەر دابنێ، بەڵام لە ڕووی ڕاستیدا سەخت ترین ڕێگایە، چونكە هەڵی ئەدێرێ و سەری ئەكات بە دۆزەخا، كە هیچ شتێ لەوە سەخت و سامناك تر نییە، جا ئەو كاتە ماڵ و سامانەكەی كە چرووكی پێكرد چ سودێكی پێ ئەگەیەنێ؟ وە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ﴾ ماڵەكەی هیچ سوودێكی نابێ بۆی كاتێ كە هەڵدێراو كەوتە ناو ئاگر. لێرەدا بەشی یەكەمی سوورەتەكە دوایی هات، لەم بەشەدا دوو ڕێگا و دوو بەرنامە ڕوون كرایەوە بۆ ئادەمی لە هەموو چەرخ و چینێكیا دەركەوت كە ئادەمی دوو كۆمەڵە. هەموو كەس كردەوەیە ئەكات كە خۆی هەڵی ئەبژێرێ بۆ خۆی! ئەو حەلە خوایش ڕێگای بۆ ئاسان ئەكات بەپێی كردەوەكەی و ئەو بارەی ئەو بەندە هەڵی بژاردووە. ئینجا لە بەشی دووەما باسی دواڕۆژو چارەنووسی هەردوو كۆمەڵەكە ئەكات، لەپێش هەموو شتێكا ڕوونی ئەكاتەوە كە هەر كام لەو دوو كۆمەڵە چارەنووس و دوا ڕۆژێكی پێ دراوەو بەپێی وادە، وە تاوانبار هیچ ڕێگای بڕوو بیانووی نییە، چونكە سەرەڕای ژیریی و سەربەستی و سەربەخۆیی یەكە كە پێی دراوە، ڕێگای ڕاست و چەوتیشی بۆ دیاری كراوەو ترسێنراویشەو هەواڵی هاتنی ئەو ڕۆژە سەختەی پێ دراوە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ﴾ بەڕاستی لەسەرمانە ڕێنموونی و باسی ڕێی چاك و خراپ. خوای گەورە بە**

میهرەبانی خۆی بڕیاری دا لەسەر خۆی ڕێنموونی و ڕوون کردنەوەی ڕێی ڕاست و چەوت لە دووبارەوە: یەکەم لەڕێگای سروشت و ژیریی‌یەوە. دووەم: لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە بەو پەیام و بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانە، کەواتە هیچ کەس هیچ بڕوو بیانوویەکی بەدەستەوە نامێنێ و هیچ ستەمێ لەکەس ناکرێ، بەڵکو هەموو کەس بەبەرو بەرهەمی کردەوەی خۆی ئەگات ﴿وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ﴾ وە بەڕاستی هەردوو جیهان هینی ئێمەیەو هەموو کارو بارێ لە ژێر قودرەتی ئێمەدایە، کەواتە هەرچی بکەین ئەیکەین و هیچ لەدەستمان دەرناچێ، کەواتە ئەو کەسەی ئەیەوێ دوور بێ لە خواو سەرکێش بێت بۆ کوێ ئەڕوا؟!

﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ﴾ ئینجا ئێوەمان ترساندووە بە ئاگرێك کە بڵێسەی ئەسێنێ بەتەواوی. ئەم ئاگرە بەتینە ﴿لَا يَصْلَاهَا﴾ ناچێتەوە ناوی بەتین ترین سزای ناچەژێ ﴿إِلَّا الْأَشْقَى﴾ مەگەر بەد ترین و چارەشەڕترین کەس ﴿الَّذِي كَذَّبَ﴾ کە کەسێکە بڕوای نەکردبێ بە ئایین و بەرنامەی خوا ﴿وَتَوَلَّىٰ﴾ وە ڕووی وەرگێڕابێ لە گوێ ڕایەڵی بۆ فەرمانی خواو پشتی کردبێتە ڕێنموونی خواو بانگ کردنی خوا ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا﴾ وە دوور ئەخرێتەوە لەو ئاگر ﴿الْأَتْقَى﴾ کەسێ کە زۆر خۆ پارێزە لەبێ بڕوایی و تاوان و خراپەکاری. کە ئەوە کامەران ترو خۆش بەخت ترە، ئینجا ناوو نیشانی ئەم خوا پێداوە باس ئەکات بەم چەند ڕستەیە کە ئەفەرموێ: ﴿الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ﴾ کە کەسێکە ماڵی خۆی ئەدات و ئەبەخشێ لە کاتێکا ﴿يَتَزَكَّىٰ﴾ ئەیەوێ خۆی پاك بکاتەوە لە چروکی ڕژدی و بەهۆی ئەوە پاك ببێتەوە لە گوناه نەك بۆ ڕووپامایی و کەشخەو خۆزل کردن بەسەر مەردوما. وە چاکەو پیاوەتی‌یە بداتەوە، وە هیچ کەسێکیشی بەلاوە نی‌یە تا بیەوێ پاداشی ئەو چاکەو پیاوەتی‌یە بداتەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ﴾ وە بەلایەوە نی‌یە چاکەو پیاوەتی هیچ کەسێك کە پێویست بێ پاداشت بدرێتەوە، واتە ئەو ماڵ و دارایی‌یەی کە ئەیدا لەبەر هیچ شتێك نی‌یە ﴿إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ﴾ بێجگە لە نیازو بەدوا گەڕانی ڕەزامەندی پەروەردگاری خۆی کە بەرزو بڵند ترە لە هەموو کەس و لە هەموو شت. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ پاداشتی ئەم زۆر لە خواترس و زۆر خۆپارێزەرە.

ئەفەرموێ: ﴿وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾سوێندبەخوا لەمەولاڕازی ئەبێ. بەڕاستی بەڵێنێکی زۆرگەورەیە، چونکە لە هەموو خۆشیەیە خۆشتر ئەمەیە کە دڵ ڕازیو پێخۆش حاڵو بە ئارام بێت. ئینجا باسی ئەوەی نەکرد کە ئەم خوا پێداوە ڕازی ئەبێ لێی، بۆ ئەمەی شێوەی گشتی بگەیەنێ واتە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە ڕازی ئەبێو بە هەموو ئارەزووو ئاواتو ئامانجێك ئەگات!!

کەواتە ڕازی ئەبێ لە ئایینەکەی ڕزای ئەبێ لە پەروەردگاری ڕازی ئەبێ بە هەموو بڕیاری. ڕازی ئەبێ لەهەر بەشێ کەپێی ئەدا لە خۆشیو ناخۆشیو بوونو نەبوونیو ڕەحەتیو تەنگیو هەموو بەسەر هاتێکا. کەواتە بێئارامو دڵتەنگو تەنگەتاو نابێ.

ئەمانەی هەموو ئەبێ سەرەڕای ڕەزامەندی لەنازو ڕێزە نەبڕاوەکەی بەهەشتو پەنای پەروەردگار. بەڕاستی ئەم پاداشتە ئەوەندە گەورەیە نازانین چی بڵێین دەربارەی، هەر لەدەستو دەهەندەی خوا دێت بەهرەو بەخششی وا بدات. لەلوتفو میهرەبانی یەکەی بەزیادبێت. ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ باسی قۆرتو گرێیە کە کەوتووەتە دڵ لە لەبارەی ئەو چوار ئایەتەی کە لەم سوورەتەدا باسی تۆڵەی بەدکارانو پاداشتی چاکان ئەکەن.

هۆی ئەو کۆسپو گرێیە ئەمەیە کە بەڕواڵەت ئایەتەکان دژ یەکتر دەرئەچن بەم ڕەنگە ئایەتی تۆڵە کە وانیشان ئەدات کە بڕواداری گوناهبار سزا نادرێ، وە ئایەتی پاداشت وا ئەگەیەنێ کە سزا ئەدرێ، چونکە ئایەتی یەکەم سزاو سوتان بە ئاگری دۆزەخ کوورت هەڵئەهێنێ لە بەدترین کەسدا. وە ئایەتی دووەم وا ئەگەیەنێ کە سزا ئەدرێ، چونکە دوور خستنەوە لەو ئاگرە کوورت هەڵئەهێنێ لە زۆر لە خوا ترسی زۆر خۆپارێزەرا.

بۆ کردنەوەی ئەو گرێیەو نەهێشتنی ئەو گومانە چەند شتێ ووتراوە هەر کام لەوانە دەست ئەدات بۆ کردنەوەی ئەو گرێیەو نەهێشتنی ئەو گومانی دژایەتییە:

١- بەو شێوەی تەفسیرمان کردەوە ڕێكو پێکەو ڕێگای ئەو ڕەخنەیە نامێنێ.

٢- مەبەست بەوئاگرە ئاگرێکی تایبەتییە کەبەهێزترو بەتین ترە وەك وەرئەگیرێ لە جیمەن و ڕواڵەتی ﴿نَارًا﴾وە، وە مەبەست بە﴿الْأَشْقَى﴾ کافرکەلەهەمووکەس بەدتروچارەشەڕترە.

وە مەبەست بە ﴿الْأَتْقَى﴾ بڕواداری بێگوناهە کەلە هەموو کەس کامەرانو خۆشبەخت ترە، ئەم خوا پێداوە دوور ئەخرێتەوە لەو ئاگرە بەجۆرێ هەست ناکات بەهیچ ئێشو

سزایەکی هەر لە دووریشەوە کەواتە بڕواداری گوناهبار بەو جۆرە دوور ناخرێتەوە لێی ئیتر با بسوتێنرێ پێی، بەڵکو ئەگەر سزادرا بە ئاگرێ‌تر سزا بدرێ کەتینی و هێزی کەمتربێت.

٣- ووتەی هێجگاری و هەمیشەیی تێبینی کراوە. واتە ناچێتە ناو ئەو ئاگرە بە هەمیشەیی مەگەر خراپترین کەس کە کافرە. وە دوور ئەخرێتەوە لێی بە هەمیشەیی چاکترین کەس، کەواتە لەم دووانە بەدەر نە هەمیشەیی ئەبێ تیایا، وە نە بەهەمیشەیی دوور ئەخرێتەوە لێی. ئیتر بسووتێنرێ پێ‌ی یا نە ء

٤- ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە بە بۆنەی گەورەیە لە گەورەکانی بت پەرستەکان و گەورەیە لە گەورەکانی بڕواداران، بۆ بەرانبەرکێ کردن لەناوەندی سیفەت و بەسەرهاتی ئەو دووانەدا کە دژو پێچەوانەی یەکترن بەم ڕەنگە بە یەکێکیان ووترا بەدترین و تایبەتی کرا بەو ئاگرەوە، وەك ئەو ئاگرە هەر بۆ ئەو دروست کرابێ، کەواتە لەڕووی ڕاستی دا کوورت هەڵهێنان و تایبەتی کردن مەبەست نی‌یە ئەو حەلە هیچ ڕەخنەیە ڕوونادا، ئەمە ڕای (زەمەخشەری)یە.

٥- ووتەی (صلی) لەزمانی عەرەبا بریتی‌یە لە سزاو سووتانێکی تیبەتی بەم ڕەنگە چاڵێك پڕبکرێ لە پشکۆ، ئینجا مەڕێ بهێنرێ و بخرێتە ناوەڕاستی ئەو ئاگرەو چەند توێ‌ی لە ژێرو چەند توێ‌ی بەسەریەوە بەو جۆرە لەناو ئەو توێیانەدا بسووتێنرێ کە ئەوە سەخت ترو بەتین ترین شێوەیە ئەو حەلە ئەڵێن: ئاگرێك کە هەر بەدترین کەس سزا ئەدرێ پێی لە ناو تەبەقەکانی و بەسەخت ترین شێوە سزا ئەدرێ پێ‌ی. وە دوور ئەخرێتەوە لێی چاکترین کەس.

کەواتە هەر کەسێ نە بەد تربێت و نە چاکتر، ئەگەر سزا درا وەك بەد تر سزا نادرێ، وە ئەگەر سزا نەدار بەوێنەی چاکترەکە دوور ناخرێتەوە تا بەهیچ ڕەنگ ناخۆشی نەبینێ، وە خوا خۆی باش ئەزانێ.

وصلی الله وسلم علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه اجمعین

## سوورەتی ﴿الضُحَى﴾
## مەککەییەو (١١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە هەمووی تایبەتییە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە هەموو بارو ڕوویەکەوە سۆزو بەزەیی و لوتف و خۆشەویستی خوا نیشان ئەدات و ئاراستەی دڵی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی ئەکات (ﷺ) و هەمووی بە هاوارەوە چوونە لە لایەن پەروەردگارییەوە و دڵخۆش کردن و دڵخۆشی دانەوە و ئارام پێدان و خەم دەرکردنە لەو دڵە ناسکەی کە تەنگەتاو خەمبار بوو لەبەر درەنگ هاتنی جوبرەئیل و دواکەوتنی سروش لێی لەسەرەتای پێغەمبەرێتیەکەیەوە. ئەو دواکەوتنەش بوو بەهۆی فاك وفیك و پڕوپاگەندەی بت پەرستەکان.

لەڕیوایەتی زۆربەی کتێبەکانی سیرەدا هەیەکەماوەیە سروشی خوا بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وەستا و (جوبرەئیل) ـ سەلامی خوا لە هەردووبێت ـ ئینجا بت پەرستەکان ووتیان: (محمد) خواکەی دەستی لێ هەڵگرت و وازی لێ هێنا ئینجا خوا ئەم سوورەتەی ناردە خوارەوە. بێگومان سروشی خواو گەیشتن بە (جوبرەئیل) مایەی هێزو ئارامی دڵی پێغەمبەربوو (ﷺ) و توێشووی ڕێگاکەی بوو، ئارام دەرو ماندوویی دەرکەری بوو لەو هەموو ئەرك و زەحمەتەی کە ئەهاتە ڕێی، وە مایەی فێنکی دەروونی بوو لە گەرمای بەیتنی سەرکێشی و بێبڕوایی سەرکێش و بێبڕواکان.

ئینجا کاتێ ئەو سروشە وەستا توێشوو نەما، مایەی فێنکی و ئارامی دڵ لەبەر چاوی ون بوو و دڵ بڕا لە خۆشەویستی، بەتەنها مایەوە بەبێ نان و ئاو لە گەرمای ئەو ڕێگە سەخت و درێژەدا، بەڕاستی ئەوەش بارێکی زۆر گرانەو دڵ پێی هەڵناگیرێ. لەو کاتە سەخت و بەتینەدا ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە، هات بە جۆرێ هیچ نارەحەتی نەهێشت لە دڵداو پڕی کرد لە ئارامو خۆشی و هیواو بڕوای بەهێز. چەند ڕایە هەیە لەبارەی ماوەی ئەو وەستان و بچڕانی سروشەوە. بە هێزتری ئەو ڕایانە ئەوەیە کە (بیهقی) ڕیوایەتی ئەکات کە ماوەکەی شەش مانگ بووە[1].

---

[1] فتح الباري بەرگی یەك لاپەڕە ٢١.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾
وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ﴿٥﴾

---

زانایانی ئیسلام لە کتێبە باوەڕپێکراوەکانا هۆی ئەو وەستانەو چۆنێتی‌یەکەیان بەدرێژی بۆ باس کردووەو لێرەدا بە پێویستم نەزانی هیچ بڵێم، هەر کەس ئەیەوێ با تەماشای ئەو کتێبانە بکات، خوای گەورە لەسەرەتای سوورەتەکەوە سوێند ئەخوات بەدوو کاتی گرنگ لەسەر چەند شتێکی زۆر گەورەو گرنگ بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) یەکەمیان نەهێشتن و دوور خستنەوەی گومانی واز لێ هێنان و دڵگیری خوا لێی ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * وَٱلضُّحَىٰ﴾ سوێند بە چێشتینگاو ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ﴾ وە سوێند بە شەو کاتێ کە ئارام ئەگرێ، واتە: زیندەوەرەکان ئارام ئەگرن و لە بزوتنەوە ئەکەون ئەحەسێنەوە، یا سوێند بەشەو کاتێ کە تاریکی یەکەی بەتین ئەبێ کە ئەویشە کاتی حەسانەوەو ئارام گرتنە. ئەم دوو کاتە هەرچۆنێ دوو بەڵگەو نیشانەی گەورەن لەسەر دەسەڵات و کار دروستی خوا، هەروەها زۆر ڕێك و پێك و پەیوەستن لەگەڵ سوێند لەسەر خوراوەکەو مەبەست لەم سوێندەدا.

یەکەم: ڕووناکی و ئارام و حەسانەوە ئاڕاستەی دڵی پێغەمبەرەکەی ئەکات پێش ئەمەی ئەفەرموێ: ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾ پەروەردگارت وازی لێ نەهێناو دەست بەردارت نەبووەو دڵگیر نەبووە لێت وەك ووترا پێت بە ناڕەوایی و ئەو گومانە بەدە برا لەلایەن ئەوانە کەویستیان ئازاری دڵت بدەن.

دووەم: ﴿وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ﴾ وە بەڕاستی ڕۆژی دوایی باشترە بۆت لەم جیهان و ڕۆژی یەکەمە. واتە هەر چەن لەجیهانا بەرزترین پایەو گەورەترین بەهرەی پێداوی، بەڵام ئەوەی کەلە ڕۆژی دوایی دا پێت ئەدات و دەست کەوتت ئەبێ گەلێ چاکترە لەم، چونکە بەهرەی ئێرەت زیان و ئازارو ناخۆشی لەگەڵە، بەڵام بەهرەی ئەوێت پاکەو دوورە لە هەر شتێ کە دڵ بگرێ. سەرەڕای ئەوە چەند بەهرەیەکی تیبەتی هەیە لەو ڕۆژەدا دەرئەکەوێ، پێشەوایی و پێشکەوتنی لە هەموو پێغەمبەران ــ سەلامی خوایان لێ بێ ــ وە کردنی

ئوممەتەکەی بە شایەت لەسەر هەموو ئوممەتەکانی ڕابردوو، کردنەوەی قاپی تکاو شەفاعەتی گەورە بەهۆی ئەمو لەسەردەستی ئەما، کە هیچ کەس زاتی نایە دەست بیا بۆ کردنەوەی ئەو قاپیە. کاتێ ئەم ئەیکاتەوە بەجارێ سوپاس ئەکرێ لەلایەن هەموو کەسەوە!

هەروەها چەند بەهرەی تیبەتی تر کە ئەمانەی باسکران بەش‌و نموونەیەکن لێیان.

هێندێ لەزانایان ئەفەرموون: مەبەست بەمە دوایی‌و یەکەم جاری ژیانی ئەم جیهانەو پێغەمبەریتی یەکەیەتی، واتە لەمەولات گەلێ باشتر ئەبێ لەیەکەم جارت ئەوەتا بەچاوی خۆی بینی کە قورئان بە تەواوی هاتە خوارەوەو، شەریعەتە عالەمیەکەی بە پایان گەیشت‌و دەوڵەت‌و ئوممەتێکی لەسەر پەرەی سەندو ڕیشەی کوتاو پەلی هاوێشت بەرەو هەموو جیهان، ئەوەبوو نامەی نوسی بۆ پاشاکانی جیهان‌و بانگی کردن بۆ بڕوا هێنان بە ئایینەکەی، ئەم تەفسیرەشی هەر ئەگونجێ‌و ڕێکە بەڵام چەند حەدیسێ قۆڵگیری ڕای یەکەمەو بێجگە لەوەش ووتەی: (الآخرة، الأولی) بەکارهێنانی بۆ ئەم دوو جیهانە باوەو لەشەرعا هەر ئەوەیان لێ وەرئەگیرێ.

سێیەم: ﴿ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴾ وە بەڕاستی لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ ئەبەخشێ تا خۆت ڕازی ئەبیت. ئایا ئەمە بەڵێنە بە بەهرەکانی ئەم جیهانەی، وەك کەیاندنی خۆی‌و ئایینەکەی[1] لەنیوە دوورگەدا، لەچەرخی خۆی‌و لەژیانی خۆیا، وە پەرەسەندن‌و بڵاوبوونەوەی ڕوونـاکی ئایینەکەی بەووڵاتاناو زاڵبوون‌و سەرکەوتنی لەشکری ئیسلام بەسەر پادشاو ستەمکارەکانی جیهانا، لەچەرخی چوار خەلیفە گەورەکان‌و چەرخەکانی دواتر، تا ئەو ڕادەیە زۆربەی ئاوەدانی ووڵات بە هەموو خێرو بێریەوە هاتە ژێر سەرکردایەتی ئیسلام‌و جڵەوی ژیان‌و جیهانی گرتەدەست. ئایا مەبەست ئەم بەهرەیانەبێت؟ یا ئەو هەموو بەهرە تایبەتیانە بێت‌و ئەو هەموو ئەجرو پاداشتە گەورەی کە خوا پێ‌ی ئەدا لە ڕۆژی دواییدا یا گشتی بێت‌و بەهرەکانی هەردوو جیهان مەبەست بن هەرکام لەم سێ ڕایە هەڵبژێراوی تاقمێکە لەزانایانی تەفسیر. بەڵام بەڕاستی شێوە گشتی‌یەکە لە دڵا جێگیرو پەسەندترە، چونکە ڕواڵەتی ئایەتەکە گشتی‌یەو نەبەستراوە بەهیچ کامەوە. کەواتە بۆچی تایبەتی بکرێ‌و ببەسترێتەوە بە یەکێکیانەوە؟

---

[1] بەپایان‌و سەرکەوتن‌و زاڵبوونی بەسەر دوژمنەکانی خۆیی‌و ئایینەکەی.

ئینجا بێجگە لەمە بەڵێنی تایبەتی پێدراوە بە هەردوو جۆرە بەهرەکە. کەواتە با ئەم هەر لەسەر دیمەنو ڕواڵەتەکەی بێت بێگومان بەبێ ڕابەرو بەڵگەیەکی بەهێزیش نابێ شتی گشتی تایبەتی بکرێ ئینجا بیری پێغەمبەری ئەخاتەوە ئەو هەموو سەرپەرشتیو چاودێریو چاکەیە کە خوا کردی لەگەڵی هەر لە منالیەوەو پێش پێغەمبەرێتی. کەواتە پاشی پێغەمبەرێتی چۆن وازی لێ ئەهێنێو بەهرە مەندتری ناکات؟!

ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ﴾ ئایا پەروەردگارت تۆی دەست نەکەوت بە هەتیوو، ئایا تۆ هەتیو نەبووی؟ واتە بەڵێ. ئەوە بوو باوکی ئەما لە کاتێکا کە هێشتا ئەم نەهاتبووە دنیاو لەسکی دایکیابوو. ﴿فَـَٔاوَىٰ﴾ ئینجاخوا تۆی گرتە لای خۆیو حەوانیتیەوە. بەم ڕەنگە دڵی (عبدالمطلب)ی باپیری هێنایە سۆزو پەرۆش تا ڕادەیە کەلە کوڕەکانی خۆشەویست تری کرد بەلایەوە. ئینجا کە تەمەنی گەشتە هەشت ساڵیو باپیری مرد. دڵی (ئەبوتالب)و مامی هێنایە سۆز بۆی، لە کوڕەکانی خۆی بەڕێزتر بەخێوی کرد. ﴿وَوَجَدَكَ ضَآلًّا﴾ وە ئایا تۆی دەست نەکەوت بەبێ ئاگاو بەسەرگەردان لە دۆزینەوەی ڕێیەکی ڕاست بۆ خۆتو گەلەکەتو هەموو کەس. واتە تۆ بە نەخوێندەواری پێگەیشتی لەسەردەمی نەفامیداو لەناو گەلێکی نەخوێندەواری نەفاما کەبت پەرست بوونو خاوەنی ئاقیدەو باوەڕێکی پڕوپوچ. وە تۆش بێزاربویت لەو ئاینو باوو ڕەوشتی ئەوانە. وە نەلای شوێن کەوتووەکانی (موسا)و (عیسا) کەئەوانیش ئایینەکەی خوایان گۆڕیبووو دەستکاریان کردبوو. تۆبەو سەرگەردانییە مابوویتەوەو بیرت ئەکردەوە لە ڕێگای ڕزگاری ﴿فَهَدَىٰ﴾ ئینجا ڕێنموونی کردیو ڕێگای ڕاستی نیشان دای، بەم ئایینەی کە سروشی کرد بۆلات، وە بەم بەرنامەیە کە گەیاندیتی بە خوا. ﴿وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ﴾ وە ئایا تۆی دەست نەکەوت بە هەژارو بێنەواو ئینجا دەوڵەمەندو بێ پێویستی کردی بە بەرزی نەفسو قەناعەت، وە بەماڵی خەدیجەو بە خریدو فرۆشیو بازرگانی؟ واتە بیر لە حاڵی خۆتو ڕابووردووی ژیانت بکەرەوە. ئایا خوا دەست بەردارت بووو لێگەڕ بوو لێت کە هێشتا ئەم کارە گەورەیەت پێ نەسپێرابوو؟ کەواتە دڵنیاو بەئارام بە ئێستا باشتر وازت لێ ناهێنێو باشتر تۆی ئەوێ.

ئینجا بە بۆنەی باسی حەواندنەوەی لە هەتیویو، ڕێنموونی کردنی لەسەرگەردانیو دەوڵەمەند کردنو نەهێشتنی هەژاری. بەو بۆنەیەوە ئامۆژگاریيەك ئاڕاستە ئەكات یەكەم جار بۆ پێغەمبەر(ﷺ)و بۆ هەموو موسڵمانان لەپاش ئەو. ئامۆژگاری بە چاودێریو چاكە كردن لەگەڵ هەموو هەتیویێو بەئازار نەدانو چارەسەكردنی هەموو سواڵكەرو داواكەرێ، وە بەدان نان بە چاكەی پەروەردگارو چاو لەبەری بۆی: ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ﴾ ئینجا كەواتە تۆش هەتیو زەبون مەكەو دڵی مەڕەنجێنەو مافو ماڵی داگیر مەكە، وەك ئەوە باو بووە لەو چەرخو سەردەمی نەفامیەدا. تا ئیسلام هاتو پایەو پلەی هەتیوی بەرزكردەوەو زیاتر لە بیست شوێن ناوی ئەبات لە قورئانا، قورئانی دا بە چاودێریو سەرپەرشتیو پارێزگاری مافو ماڵیو بەخێوكردنو پێگەیاندنی لەلایەن كار بەدەستی تایبەتی خۆیانەوە كە ئەبێ بۆیان دیاری بكرێ، ئەگەر نەیانبێ، ئەوەتا بەپێی باوی ئیسلام كە هاتووە بۆ بڵاوكردنەوەی ڕادەونەهێشتنی تۆوی ستەمو چارەسەركردنی هەموو زەبوونیو چەوسانەوە و داماوی ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ﴾ ئایا مەبەست بە وشەی ﴿ٱلسَّآئِلَ﴾ پرسیاركەرە لە كاروباری ئایینیو پێویستی خۆی؟ یا مەبەست بێنەوای سواڵكەرە؟ یا بە شێوەی گشتی؟ هەركام لەم سێ ڕایە ڕێكەو ئەگونجێو هەریەكە كۆمەڵێ لە زانایان هەڵیان بژاردووەو بەڵگەی تایبەتی یان بۆ باس كردووە لەسەر ڕای یەكەم سێ ئایەتی دوایی پەیوەستە بە سێ ئایەتەكەی پێشیانەوە بەڕیز كە ئەویش شتێكی جوانە واتە هەتیو بویتو خوا پەروەردەی كردیو تۆی خستە پەنای خۆی، كەواتە تۆش ڕێزی هەتیو بگرە بەو جۆرەی كەلە تەفسیرەكەدا ووترا، وە تۆ نەزانو سەرگەردان بوویتو زانای كردیو ڕێنموونی كردی، كەواتە تۆش پرسیاركەر زانا بكەو تورە مەبە لێیو تێی مەخوڕە، بەڵكو بەخۆشیو ڕووی خۆشەوە وەڵامی بدەرەوە.

وە تۆ فەقیرو بێ دەست بوویت‌و خوا دەوڵەمەندی کردی، کەواتە تۆش بەم جۆرەبە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ﴾ باسی بەهرەو چاکەی پەروەردگارت بکەو دانی پیابنێ.
بەڵام لەسەر رای دووەم ریزە کە تێك ئەچێ، چونکە ئەو حەلە ئەبێ ئایەتی ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ﴾ بەسرابێ بە ئایەتی ﴿وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ﴾ ئەبێ ببەسترێ بەئایەتی ﴿وَوَجَدَكَ ضَآلّٗا﴾ نەوە. وە ئەم ریز تێك دانەشی هەر بەپێی یاسای رەوان بێژی شیرینەو وێنەی هاتووە لە قورئانا، بەتایبەتی لێرەدا زۆر جوانە، چونکە دەست نیشانی تیایە بە پێش خستنی مافی بەندە لەسەر مافی خوا کە ئەوەش لە ئیسلاما وا دانراوە، ئینجا کاتێ بە هەرکام لەم دوو رایە رێك‌و راست بیت، بێگومان رای سێیەمیش هەر رێك‌و جوانە، کەواتە رێگا هەیە بۆ تەفسیرکردنی ئایەتی باس کراو بەهەر جۆر لەم سێ جۆرەی کەباس کران بەڵام لەبەرئەوەی داماوو هەژاریش، وەك هەتیو بەشی خوراوو ستەم لێ کراو بووە لەو سەردەمەدا، دڵ بەمە بەهێزترە کە ئەم ئایەتەش دەست نیشان بێ بەچارەسەرکردنی هەژارو داماوان. کەواتە با لەم ئایەتەدا ئەمانە مەبەست بن. ئا بەم جۆرە سوورەتەکە دوایی هات....

صلی الله وسلم علی محمد وآله صحبه اجمعین

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ ﴿٤﴾

## سوورەتی ﴿الشرح﴾
## مەککەییەو (٨) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئـەم سـوورەتە لـەپاش سـوورەتی (الـضحى) هاتـە خـوارەوە، وەك تەواوكـەری ئـەو بێـت. ئەمیش وەك ئەو میهرەبانی و بەزەیی خوا نیشان ئەدات دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) وە بـەهرەو بەرهـەمی بە گـرنگ گـرتن و چاودێری خۆی ئەخاتـە بەرچاوی و موژدەی خۆشـی و ڕەحـەتی پێ ئەدا، لـە کۆتاییدا فـەرمانی پێ ئـەدات بەشـتێ کە مایـەی ئـەو خۆشـی و ڕەحەتی یەو هۆی پەیوەندیـەتی بـە خـوای خۆیـەوە، بێ‌گومـان پێغەمبـەری خۆشەویـست (ﷺ) لـە پـێش پێغەمبەرێتی دا دڵتەنگ و بێ ئارام بوو لـەو ئایینـە پڕوپوچەی کە گەلەکەی لەسەری بوون. هەمیـشە مـەراقی بـوو ڕزگـار بوونیـان لەدەسـت ئـەو نـەفامی و نەزانییـە، تـا خـوا بەچـرای پێغەمبـەرێتی دڵـی ڕوونـاك كـردەوە، ئینجـا لـە پاشـی ئـەوە لەلایـەترەوە خـەم و پـەژارە دڵـی داگیرکـرد و بـاری شـانی قـورس كـرد، خـەم و پـەژارەی ڕاگەیانـدن و چەسـپاندنی ئـەو ئایینـە گەورەیە، لەگەڵ بوونی ئەو کۆسپ و گرێیە لـە ڕێگاکـەیا، وە ئـەو بـێ مێشكی و دڵ ڕەقییـەی گەلەناو ئەو گەلەدا جێگیر بوو بوو بەهۆی ئەو ئایینە پڕوپووچەی کەبە درێژایی چەند چەرخ دەقیـان پێوەگرتبـوو، ئینجـا لەبـەر ئـەوە بـە هـەموو هێـز و توانـاوە وەسـتان دژی خـۆی و ئایینەکەی، وە هـەموو پیلان و کۆسپ و گرێیانـەیان خستە ڕێگاکـەی، تـا خـوا دڵـی بەهێز و فراوان کرد و یارمەتیدا، تا زاڵبوو بەسەر هەموو کۆسپ و گرێکانا و باری شانی سووك كرد. جا بەو بۆنەیەوە ئەو یارمەتی و بەهرەیانـەی خستە بەرچاوی پێغەمبـەر (ﷺ) بۆ دڵ خۆشی

کردن و بەهێز کردنی لە هەڵسانی بەو ئەرکە زۆر گەورەی کە پێی سپێررا، ئەفەرموێ:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ ئایا گوشادو فراوانمان نەکرد بۆت سنگت؟ دڵمان شادمان و بەئارام نەکردی بۆ ئەم ئایین و پەیامە؟ و کارو بارمان سووك و ئاسان نەکرد بۆت؟ خۆشەویستمان نەکرد لە دڵتاو ڕێگاکەمان نەکردەوە بۆت؟ خۆت تەماشای دڵی خۆت بکە. ئایا هەست ناکەیت بەو خۆشی و فراوانی و ڕووناکی‌یە؟ ئایا لەگەڵ ئەو هەموو ئەرك و کۆسپ و ناڕەحەتیەدا خۆشحاڵ و شادمان نیت؟ واتە ئێمە دڵمان بەو جۆرە گوشادو فراوان کردی تا تۆش بەو جۆرە شامان بوویت.

﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ﴾ وە هەڵمان گرت و خستمان لێت ﴿وِزْرَكَ﴾ ئەو بارە گرانەت ﴿الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ کەپشتی قورس کردبوویت، واتە خۆت ئەزانی کە چ بارێکی گران بەسەرتەوە بوو سەرودڵی داگیر کردبوویت، ئینجا ئێستا هەست ئەکەیت بە لاچوونی ئەو بارە گرانەو سووك بوونی باری لەش و دڵت. ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ وە بڵندمان کردەوە بۆت ناوو ناوبانگت، واتە هەرچۆنێ دڵمان فراوان کردی و باری لەشمان سووك کردی، هەروەها ناومان بەرزکردیتەوە. بەرزمان کردەوە لەناو مەلائیکەو کۆمەڵی هەرە بەرزدا، بەرزمان کردەوە لە جیهان و زەویدا، بەرزمان کردەوە لەم بوونەوەرەدا.

بەرزمان کردەوە بە پێغەمبەرێتی و بەم ئایین و قورئانە، ئایا چ ڕادەو پلەیە ئەگاتە ئەمە کە شەوو ڕۆژ لەسەر هەموو مەنارەو مزگەوتەکانی جیهان بانگ ئەدرێ و ناوی ئەم نەبرێ لەپاش ناوبردنی خوا لە هەموو نوێژێکا شایەتی ئەدرێ لەسەر خوایەتی خواو پێغەمبەرێتی ئەم؟!! وە پێویست کراوە سەڵەوات و سەلام لەسەری و بەبێ ئەوە نوێژ لەکەس لەکەس وەرناگیرێ؟! بەڵێ ناوەکەی گەیاندە ئەوپەڕی ڕادەو پلە بەهۆی ئەم قورئانە کە هەموو جنۆکەوئادەمی تیایاسەرسام‌وسەرگەردانە، وە بەرزی کردەوە بەهۆی ئەم ڕێگاو بەرنامەیەی کەهەموو ژیری یەلەحساتی ملکەچ و زەبوونەوناتوانێ سەریەرزبکاتەوەوخۆی بەشت بزانێ!!

کەواتە ئەو ئەرك و ماندوویی یە چی یەو کەی چاو ئەدات لەچاو ئەو بەهرەو بەخششەی کەتیماری هەمووزامێکەودەرمانی هەموودەردێکە. بێبڕواکان تەشەریان ئەدالەپێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی بە هەژاری و نەبوونی، ئینجا خوای میهرەبان لەپاش باسی ئەو بەهرە گەورەیانە بەڵێنی پێئەدا بەدەروو لێ کردنەوەو نەهێشتنی تەنگی و ناخۆشی لێیان، وەك فەرمویێتی: ئەو چاکەو بەهرەیانەم لەگەڵ کردی بەو جۆرەی کە باس کرا، ئینجا بەهیوابەو نائومێد مەبە لەچاکەو بەهرەی خوا لەم بارەیشەوە، چونکە ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا﴾ بێگومان لەگەڵ ئەو تەنگی و ناخۆشی یەی کەئێوەی تێدان خۆشی و ئاسانیەکی گەورە هەیە، واتە هاتنی ئەو ئاسانی و خۆشی یە زۆر نزیکەو وەك پێکەوە بن لەگەڵ ناخۆشی و تەنگی و تەنگانەکەدا. سوپاس بۆ خوا هەرواش بوو، ئەوە بوو بەدوای ئەو تەنگی و سەختی دا خۆشی و ئاسانی هات و ئەو هەموو خێرو بێرە ڕژا بەسەر پێغەمبەرو یارەکانیا ـ سەلات و سەلامی خوا لەسەر خۆی و یارەکانی ـ چەن شوێن و ناوچەیەکی گرنگ کەوتە ژێر دەستیان و مل کەچ بوون بۆ ئیسلام. ئینجا ئەو بەڵێنە گەورەیە دووبارە ئەکاتەوە بە هەمان ووتە بۆ ئارام پێدان و دڵنیاکردنی لەسەر نەهێشتنی ئەو تەنگی و تەنگانەی کە وەك دوکەڵێکی ڕەش و تاریك سەر دڵی گرتبوو، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا﴾ ئیترئایا بەو دوو خۆشی و ئاسانی یە هەریەك شت بێت، یا جیاواز بن، بەم ڕەنگەمەبەست بە یەکەم هینی چەرخی پێغەمبەربێت (ﷺ)و مەبەست بە دووەم هینی چەرخەکانی جێنشینەکان و پاشی ئەوان بێت. یا مەبەست بە یەکەم ئاسانی و خۆشی جیهان بێت بە تێکڕایی و دووەم خۆشی و ئاسانی ڕۆژی دوایی بێت، بەهەرکام هەر ڕێکەو ڕاستەو بەدی هات و بەدی بێت. بەڵام حەدیسێ کە (بیهقی)و (ئیبن و جەریر)و (حاکم)و (عبدالرزاق) ئەیهێنن، کە ڕۆژی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێکەنین و خۆشی یەوە دێتە ناو

یارانی‌و ئەفەرموێ: (لَن يَغلِبَ عُسر يسرين)، هەرگیز تەنگی‌یەك زاڵ نابێ بەسەر دوو خۆشی دا، ئینجا هەردوو ئایەتەکە ئەخوێنێتەوە، ئەم حەدیسە وا ئەگەیەنێ کە خۆشیەکان جیاواز بن بەو جۆرو شێوەی کە باسمان کرد، ئینجا بێگومان ئەمە یاسایەکە لە یاساکانی خوا لەم بوونەوەرەدا کە بەدوای تەنگی‌و تەنگانەدا خۆشی‌و دەروو کردنەوە ئەبێت بۆ هەموو کەس‌و بۆ هەموو گەلێ لەم جیهانەدا. بەڵام بەمەرجێ کۆڵنەردێ‌و ئەوەی لەدەست دێت لە هەوڵ‌و تێکۆشان بەکاربهێنرێ‌و پشت بەخوا ببەسترێ، بەتایبەتی ئەگەر پەیرەوی پێغەمبەر (ﷺ) بکرێ‌و ڕێگا و ڕێبازەکەی ئەو بدرێتە بەر ڕزگاربوون‌و سەرکەوتن مسۆگەرە.

لەپاش بیرخستنەوی ئەوبەهرەوچاکەگرنگانەو بەڵێن دان بەخۆشی‌و دەروو لێکردنەوەی داهاتوو، ئینجاپەندوئامۆژگاری یەك ئاراستەی پێغەمبەرئەکات کەسەرچەشمەیەبۆپارابوونی دەرون‌و توێشووی تێر کەرە لەو ڕێگا سەخت‌و درێژەدا، وە هۆی یارمەتی دانی خوایەو مایەی گوشاد کردن‌و فراوان کۆدنی سنگ‌و دڵی بەفەڕی بوو. ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ﴾ کەواتە هەرکاتێ لێ بوویتەوە لەکارێکی خێر و چاکەو لەخەریك بوونت لەگەڵ مەردوم‌و کاروباری جیهان‌و ژیانا، هەر کات لەوانە بوویتەوە ﴿فَانصَبْ﴾ خۆت ماندوو بکە لە چاکەو کارێکی خێری ترو لەخواپەرستی‌یەترا، وە کاتی خۆت زایە مەکەو مەمێڵە بەبێ هوودە بڕوا. ﴿وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾ وە حەزو ئارەزووت بگێڕە تەنها بۆلای خواو هەر لەو بپاڕێرەوەو پشت هەر بەو ببەستەو داوا هەر لەو بکە.

وصلى الله وسلم هذا النبي الحبيب الكريم وعلى آله وصحبه

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾

## سوورەتی «التین»
## مەككەییەو (٨) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەو مەبەستە سەرەكی‌یەی كە ئەم سوورەتە نیشانی ئەدات، بریتی‌یە لەباسی ڕێك‌و ڕاستی ئەو سروشتەی كە ئادەمی لەسەر داڕێژراوە، وە ڕێك‌و پێكی‌و گونجاوی ئەو سروشتە لەگەڵ سروشتی بڕوا ئاقیدەی ڕاست‌و ڕێكا و گەیشتنی ئەو سروشتە بە پۆپەی هەرە بەرزو ڕازاوەی تەواوی خۆی، بەهۆی ئەو بڕوا ئاقیدەیەوە، نزم بوونەوەی ئادەمی‌و گەیشتنی بە پەست ترین پلە كاتێ لابدا لە سروشتی خۆی‌و بڕوا ئاقیدەكەی. خوای گەورە سوێند ئەخوات لەسەر ئەو مەبەستە گرنگە بە چوار شت: دوانیان ناسراون بەبێ خیلاف‌و دووبەرەكی (توری سینا)و (شاری مەككە)، بەڵام سەبارەت بەو دوانەی تر چەند ڕایە هاتووە بەم جۆرانەی خوارەوە:

١- مەبەست ئەو دوو میوەیەن كە ناوبراون لامان.

٢- (تین) ڕەمزو ئاماژەیە بە (طور تینا) كە لەنزیكی دمشق دایە، وە (الزیتون) ڕەمزو ئاماژەیە بە (طور زیتا) لەبیت المقدس.

٣- (التین) ئاماژەیە بۆ درەختی هەنجیر لەبەهەشتا كەكاتی خۆی ئادەم‌و حەوا بەگەڵاكانی خۆیان داشارد لەپاش دەركەوتنی عەیب‌و عەورەتیان لە سەرەنجامی ئەو خواردنەی كە قەدەغەبوو لێیان پێش هاتنە خوارەوەیان بۆ ژیانی ئەم جیهانەیان. وە (الزتیون) ئاماژەیە بەو گەڵا پەلكەی كەكاتی خۆی ئەو كۆترە هێنایەوە بۆ (نوح) پێغەمبەر(ﷺ) لە كەشتیەكەی داو بەهۆی ئەوەوە دەركەوت كە تۆفانە كەڵە نیشتنەوە دایەو نزیكی

سەرزەوی بوونەتەوە. (نوح) ئەو کۆترەی نارد بۆ تاقی کردنەوەو ئەویش ڕێی کەوت لەدرەختێکی زەیتوون بەسەر شاخێکەوەو ئەو گەڵاو پەلکەی لێ هێنایەوە.

٤- (التین) ئامارژەیە بەو شوێنەی کە.ئەو درەختەی لێ ڕوا، لەو شاخەی کە کەشتی یەکەی (نوح)ی بەسەرەوە وەستاو (الزیتون) ئامارژەیە بۆ (بیت المقدس).

٥- (التین) ئامارژەیە بۆ شاخەکانی ناوەندی (حلوان)و (حەمە ـ ـن) کە درەختی هەنجیری تیایە بەفراوانی. وە (الزیتون) ئامارژەیە بۆ شاخەکانی شام کە ئەو درەختەی لێ ئەڕوێ بە فراوانی.

٦- ئەم دووانە لەگەڵ سێیەما دەست نیشانن بەخاکی پاکی شامو قودس کە خێرو فەڕی هەردوو جیهانیان تیایە. (تین)و (زەیتون)ە کە ئامارژەیە بە خێرو فەڕی ئەم جیهانو (توری تینا) بۆ فەڕی ئایینی، ئینجا ـ.پێی ئەوەی کەزانراوە لە شوێنەکانی ترا ئەبێ لەناوەندی سوێند خوراوو سوێند. لەسەر خوراوەکانا پەیوەندی تێرو تەواو هەبێو پەیوەست بن پێکەوە، جا لێرەدا ئەو پەیوەندیو پەیوەستییە ئاشکرایە سەبارەت بە (توری سینا)و (شاری مەککە) کەدوو شوێنن پلەو ڕادەی مرۆڤیان تیا بەرز بووەو ئاینو شەریعەتی خوا هاتە خوارەوە تیانا. سەبارەت بە سوێند پێخوراوی یەکەمو دووەمیش: التین والزیتون. لەسەر هەموو ڕاکان بێجگە لە یەکەم پەیوەندی یەکەیان ئاشکرایە، وە لەسەر ڕای یەکەمیش ئەبێ ئەو پەیوەندی بەبێ. هیچ دوور نییە کە مەبەست موژدەدان بێت ـ لەو کاتە سەختەی مەککەدا ـ بەوەی ئەو شوێنانە لەپاشە ڕۆژا دێنە ژێر دەستی ئیسلامو موسڵمانان، وە ئامارژەبێت بە گرنگی شامو فەلەستین کە جێگایەکیشن بۆ ئەو دوو درەختو میوەیە. بە هەر حاڵ ئەبێ ئەو دووانە دەست نیشان بن بۆ چەند جیچگاو شوێنی، یا چەند یادو بیرەوەرییە کە پەیوەندیان ببێ بە بیرو بڕواوە. یا بە پەیدا بوونو تێگەییشتنی مرۆڤەوە.

ئینجابابێینە سەر ئایەتەکە لەسەر ئەم بنەڕەتە تەفسیری بکەین، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ سوێند بەهەنجیرو بەزەیتوون. ئیترلەسەرهەرڕایە

لەوڕایانەکەباسکران[1] ﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾وە سوێند بە(توری سینا) کەموسا پێغەمبەر سروشی لەوێ وەرگرت و قسەو مناجاتی لەگەڵ خوادا. ﴿وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ﴾ وە سوێند بەم شارە ـ واتە مەککە ـ کەجێی ئاشتی و ئارمی و بێباکی یە، سوێند بەمانە ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ﴾ بێگومان ئادەمیمان دروست کرد ﴿فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ لە جوانترین شێوەدا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، بەم ڕەنگە خاوەنی مشت و جەستەی ڕێك و قەدو باڵای بەرزو ڕاستەو لەسەر دوولاق ئەوەستێ و ئەڕواو بە دەست شت وەرەئەگرێ و خواردن ئەخوات، وە چەند ئەندامی جیاوازی پێدراوە بۆ بەکار هێنانی هەموو هێزو ووزەکانی، سەرەڕای هەموو ئەوانە گیانێکی تایبەتی پێ دراوەکە ڕازاوەتەوە ژیریی و تێگەیشتن و ڕێ بردن بە هەموو پێویست و بەرژەوەندی یەکی ژیان و بەجۆرێ ئەگونجێ و دەست ئەدا بۆ هەڵسانی بەکارو باری جێنشینیەکەی لەزەویدا، وە بەڕێوەبردنی سەرۆکایەتی و سەرکردایەتی یەك کە خوا پێی داوە لەم جیهانەدا، بەکورتی ئادەمی وا دروست کراوە هەرکەس تەماشای بکات ئەزانێ کە ئەمە دروست کراوێکی تایبەتی یەو جیاکراوەتەوە لە هەموو دروستکراوەکانی تر، وە ڕێزو بەهرەی تایبەتی پێدراوە، ئەم ئادەمی یە ئەگەر لە سروشتە پاك و خاوێنەکەی خۆی لانەدا ئەو حەلە بەو جۆرە بەرزو بەڕێزەو لەوانەیە پلەو پایەی لە مەلائیکە گەورەکان بەرزتر بێتەوە، بەڵگە لەسەر ئەوەش ئەمەیە لە شەوی میعراجدا (جوبرەئیل) لە شوێنی خۆیا وەستاو پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بەرزتر بووەوە بۆ جێگاو پلەی زۆر بەرزتر، بەڵام هەر کات ئەم ئادەمی یە بەرزو بەڕێزە لەو سروشتە پاکەی خۆی لابدا ئەو حەلە ئەبێ بە پیس ترین گیان لەبەر بەلای پەروەردگاری یەوە. و خوا ئەیگێڕێ بە پەست و نەوی تر لە پەست و نەوی یەکان،

---

[1] بەڕاستی ڕای سێیەم باش ئەچەقێ لە دڵداو پەسەندە بەلامەوە، ئەگەر زانیو بولیە بەبێ سەر لێ کردنەوە هەر بەوجۆرە تەفسیرم ئەکرد، چونکە لەسەر ئەو ڕایە ئاماژەیە بە چوار چەرخ و قۆناغی گرنگ بۆ ئادەمی: یەکەم چەرخ و قۆناغی ئادەم کە بەهەشت بوو، دووەم چەرخی (نوح) کە پێی ئەوترێ ئادەمی دووەم، سێیەم چەرخی موساو ئەو هەموو موعجیزە گەورانە: هاتنە خوارەوەی سروشی خواو وەرگرتنی لەو شوێنە بەفەڕەداو قسەو مناجاتی موسا لەگەڵ خوادا بوو بە وەرگرتنی تەورات کە هەموو ئەوانە شتێکی زۆر نایابی بێوێنەبوون و سەری ئادەمی یان پێ بەرزبوویەوە. چوارەم چەرخی هاتنە خوارەوەی قورئان کە گەورەترین ڕوداوە لە مێژووی جیهان و ژیاندا.

ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾

وەكو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ﴾ لە پاشا ئادەمیمان گێڕا بە پەرستنی پەستان، وە پەست تر ئەبێ لەپەستان، مافی خۆیەتی خوا ئەوەی بەسەربێنێ، چونکە پەستەکان لە سروشتی خۆیان لانادەن و لەسەر ڕێگاو ڕەچەی خۆیان ئەمێننەوە، بەڵام ئادەمی خۆی بەدەستی خۆی لەسروشتە پاکەکەی خۆی لا ئەدات لەڕادەو پلە بەرزەکەی خۆی دێتە خوارەوە کەواتەهەرچۆنێ نرخ و ڕێزبۆ خۆی ناهێڵێ لای خوا، وە لەڕەفتارو کرداریا لە هەموو جۆرو جانەوەرێ خراپتر ئەبێ، هەروەها لە ڕۆژی دواییدا لە پەسترین شوێنایە کە دۆزەخە.

ئەم دیمەن و شێوە شیرینەی ئێستای ئەگۆڕێ بە پیس ترین و ناشیرین ترین دیمەن و شێوە، خوا پەنامان بدا لەوبێ نرخی و بەد بەختی و ڕوو ڕەشی و ناشیرینی یە، ئادەمی بەو جۆرە ئەبێ بە پەست ترینی پەستان ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان بەجێهێنا. ئەمانە لەسەر سروشتە پاکەکەی خۆیان ئەمێننەوەو بەبڕواو کردەوەی خۆیان سروشتەکەسان زاخاو ئەدەنەوەو هیچ تەم و تاریکییە ناهێڵن بەسەر ڕووی سروشتیانەوە، وە بەرزئەبنەوە بۆ ڕادەو پلەی ئادەمێتی خۆیان بە تەواوی، وە ئەگەن بە ژیانی ڕاستەقینەی نەبڕاوە لە شوێن و جێگای ئامادەکراوی نەبڕاوە، بەبێ دواهاتن و بڕوانە پاداشتیان هەیە وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ ئینجا بۆیان هەیە پاداشتێ کە نەبڕاوو نەبڕاوەیە. یا پاداشتەکە منەتیان بەسەرا ناکرێ، بەڵکو پێیان ئەوترێ ئەوە مافی خۆتانەو پاداشتی کردەوەی خۆتانە!!

تەفسیر ئەم ئایەتە بەو جۆرەی کە وترا، زۆربەی زانایانی لەسەرە، وە زۆر پەسەندو ڕاستە کە ئادەمی کاتێ کەلە سروشتی خۆی لابدا لەهەردوو جیهانا ئەوەی بەسەر دێت،

بەڵام لێرەدا لەسەرئەم تەفسیرە گرێ یە هەیەلەدڵماو هەرچەند هەوڵم داو گەڕام بە کتێبەکانی تەفسیرا ئەو گرێیەم بۆ نەکرایەوە.

گرێکەش ئەمەئە: بەپێی ئەوتەفسیرە ئەبێ ئەم (استثناء) یە(متصل) بێت وە (استثناء متصل)یش نیشانەی گشتییە لە (نستثنی منه)ە کەدا، ئەو حەلە ئەبێ بڵێین هەموو ئادەمیمان گێڕابەپەسترینی پەستەکان، بێجگەلەوانەی بڕوایان هێناوکردەوە چاکەکانیانکرد.

بێگومان هەموو ئادەمی وانی‌یە، چونکە ئەوانەی تەکلیفی شەرعیان لەسەر نی‌یە، وە ئەوانەی بڕواداری گوناهبارن نابن بە پەسترینی پەستان، جا لەبەر ئەوە هەرچەند بەو جۆرە تەفسیرم کردەوە لە پێشەوە لەسەر ڕای زۆر لە زانایان، بەڵام ئەو تەفسیرەی کە بڕوام پێ‌ی هەیە بەبێ گیرو گرفت ئەمەیە کە (عکرمە)و (ضحاك)و (نەخەعی) ئەفەرموون، هەروەها (قتادە) لە ڕیوایەتێکا، کە مەبەست بە پەسترینی پەستان حاڵەتی زۆر پیری و کەوتەکارییە، کەلەو کاتەدا هەموو هێزو ووزەکان لەکار ئەکەون و پشت کوڕ ئەبێ و هەموو مووەکان سپی ئەبن و لەش و چەرمە سافەکان چرچ و لۆچ ئەبن و ڕەش دائەگیرسێن و هۆش و گۆش و بیستن و بینین نامێنێ و دەنگ و قسە ئەبن بەچپەو لێو جوڵانەوەو ڕستە ئەبێ بەڕستە پڕوپوچ و دژو پێچەوانەی ژیریی، بێگومان ئەو حاڵەتە پەستری هەموو پەستانە لەناو ئادەمی دا، هەروەها لەناو گیان لەبەرانی تریشدا، چونکە ئەوان هەرچەند بێ کەڵك بن لەسەر سروشتی خۆیانن، بەڵام ئادەمی تا لەسەر سروشتی خۆی نەترازێ ئەوەی بەسەر نایە، ئەم تەفسیرە بەم جۆرە هیچ گرێی تیا نی‌یە، چونکە لەسەر ئەم بارە ئادەمی بەشێوەی گشتی مەبەست نابێ، بەڵکو مەبەست تیرەکەیە کە کەلەناو ئەو تیرەدا زۆر کەس ئەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەو حاڵەتە، وە (استثناء)ە کەش (منقطع)ە و بۆ نەهێشتنی گومانی یەکسانی هەموو گەڕێنراوەکانە، واتە ئەوانە کە بڕوادارو خاوەن کردەوەی چاك بووبن، بالێ بکەون و هیچ چاکەیەکیان پێ‌نەکرێ هەر ئەجرو پاداشتیان نەبڕاوەیە، چونکە لەو کەوتە کارییەشا هەر کردەوەی چاکیان بۆ ئەنوسرێ وەك لەوەو بەرو حاڵی لەوەو بەریان ئەم تەفسیرە بەم جۆرە وەك ئایەتی سوورەتی

(الحج) وایە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ﴾ وە لەوێ تەفسیریمان کردووە، مەبەست پێی بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر ڕاستی و گونجاوی زیندوو کردنەوەو حیساب و تۆڵەو پاداشت، بێگومان ئەو حەلە پەیوەستی ئەم دوو ئایەتەی دواییە بەتێن ترو ئاشکرا تر ئەبێ، کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ﴾ واتە ئەی ئادەمی خوا تۆی دروست کرد لە یەکەم جارەوەو دای ڕشتی لەجوانترین شێوەدا ــ وەك باسکرا ــ ئینجا لەو ژێریی و تەواویییەوە ئەتگۆڕێ و ئەتکات بەپەست ترینی پەستان بکاتەوە، کەواتە لەپاشی ئەو باسەی کە بۆت کرا ئیتر چی هەیە پاڵت پێوە بنێ بۆ بێبڕوایی بە زیندووبوونەوەو تۆڵەو پاداشتی. وەچی هەیە تۆ بگێڕێ بە درۆزن و ئەو درۆ زلەت پێبکات کە ئەڵێیت: زیندوو بوونەوەو حیساب و تۆڵە نابێ؟! ئەی ئادەمی چۆن تۆ ئەو درۆ زلە ئەکەیت، ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ ئایا خوا دادپەروەرتر نییە لە هەموو دادپەروەرەکان؟ واتە نەبوونی تۆڵەو پاداشت دژو پێچەوانەی دادپەروەرییە، وە خواش لە هەموو کەس دادپەروەرترە، کەواتە ئەبێ بەزیندووکردنەوەو تۆڵەو حیساب بەدی بێنێ، یا ئایا خوا فەرمان ڕەواتر نییە لە هەموو فەرمان ڕەواکان؟ بێگومان فەرمان و بڕیاری زیندوو کردنەوەو تۆڵەو حیسابی داوە کەواتە ئەبێ بەدی بێت هەرکام لە ئێمە بڕوامان بەوە هەیەو لەپاش خوێندنی ئەم ئایەتە ئەڵێین ﴿بلى وانا على ذلك من الشاهدين﴾ وەك حەیسیش فەرمانمان پێئەدا، تەواوبوو.

وصلى الله وسلم على محمد وعلى آله

# سوورەتی ﴿العلق﴾
## مەککەییەو (١٩) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەوەی کە یەکەم جار هاتە خوارەوە لەم قورئانە سەرەتای ئەم سوورەتە بوو، بە پێی بڕیاری کۆڕو جەماوەری زانایانی ئیسلام، وە ئەو ڕیوایەتانەی کەوا نیشان ئەدەن، یەکەم جار غەیری ئەم هاتووە بەهێز نین و هەموو تەئویل کراون، وەك لە سوورەتی (المزمل)و (المدثر)دا هێندێ دواین لەم بارەوە.

(ئیمامی ئەحمەد)و (بوخاری)و (مسلیم) ئەم حەدیسە ئەهێنن کە دایکی ئیمانداران (عائیشە) ئەفەرموێ: یەکەم جار سروش (وحی) بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پێکرد لە خەو بینینەوە، بەم ڕەنگە هەر خەوێکی ئەبینی وەك ڕۆژی ڕووناك بەدی ئەهات، لەپاشا کەنارگیری و خەڵوەت گرتن لە دڵیا خۆشەویست کراو ئەچوو بۆ ئەشکەوتی (حرا) خەڵوەی ئەگرت و خواپەرستی تیا ئەکرد، چەند شەوێك ئەمایەوەو توێشووی ئەو چەند شەوەی ئەبرد، ئینجا ئەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە لای خەدیجە توێشووی ئەبرد بۆ چەند شەوێتر، هەتا سروشی بۆ هات لەو ئەشکەوتەدا، بەم ڕەنگە فریشتەی سروش هات بۆلای و پێی ووت: بخوێنە. ئەفەرموێ: منیش ووتم خوێندەوار نیم، ئەفەرموێ: ئینجا گرتمی و گوشیمی بەخۆیەوە هەتا ناڕەتی کردم ئینجا بەرەڵای کردم و ووتی: بخوێنە: منیش ووتم خوێندەوار نیم، ئینجا دووبارە گرتمی و گوشیمی هەتا پشووی لێ بڕیم. ئینجا بەرەڵای کردم و ووتی: بخوێنە منیش ووتم: خوێندەوار نیم. ئینجا بۆ جاری سێیەم گرتمی و بەتەواوی گوشیمی بە خۆیەوە، ئینجا ووتی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾﴾ ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەڕێتەوە بەم پێنج ئایەتەوەو بەدڵە لەرزەوە هەتا دێتەوە بۆلای (خەدیجە)، ئینجا ئەفەرموێ: دام پۆشن، دام پۆشن و ئەوانیش دای ئەپۆشن هەتا بیم سامەکەی نامێنێ، ئینجا ئەفەرموێ: ئایا چیم بەسەر هاتووە هەواڵەکەی

ئەداتێ ئەفەرموێ: بەڕاستی مەترسی ئەکەم لەخوا کە دووچاری شتێ ببم، (خەدیجە)ش ئەفەرموێ: نەخێر مەترسەو موژدە بەخش بە کە هەرگیز خوا تۆ ڕیسواناکات، چونکە تۆ سیلەی ڕەحم بەجێئەهێنی، و قسەت ڕاستە، ئەرکی خەڵکی ئەخەیتە سەرشانتو دەست گیرۆیی مەردوم ئەکەیت، و نان ئەدەیت بە مەردومو میوان پەزیری، یارمەتی حەقو ڕاستی ئەدەیت، لەپاشان (خەدیجە) خاتوون ئەیبا بۆلای (وەرەقەی کوڕی نەوفل) کە ئامۆزای (خەدیجە) بوو، ئەو (وەرەقە)یە بوو بوو بە نەسرانیو ئایینی عیسای گرتبووە گەردن لەو سەردەمی نەفامی دا، نوسەر بووە بە عەرەبیو بەزمانی عبریو ئینجیلی ئەنووسیو ئەیخوێندەوەو پیاوێکی پیر بوو چاوی نەمابوو، ئینجا (خەدیجە) ئەفەرموێ: ئەی ئامۆزا گوێبگرە لە برازاکەت، (وەرەقە)شێوە ئەڵێ ئەی برازام چیت دیتووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵەکەی خۆی بۆ باس ئەکات، ئینجا وەرەقە ئەڵێ ئەوەی تۆ دیتووتە ئەو فریشتەیە بووە کە ڕەوانە کراوە بۆ سەر عیسا. ئای کاشکی من گەنج بوومایە، کاشکی من زیندوو بوومایە لەو کاتەدا کە گەلەکەت تۆ دەرئەکەن. پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ئایا ئەوان من دەرئەکەن؟ (وەرەقە)ش ئەفەرموێ: بەڵێ هیچ کەس نەبووە بە وێنەی تۆ هاتبێ بە ئایینێو دوژمنایەتی لەگەڵ نەکرابێ، وە ئەگەر من بمێنمو ئەو ڕۆژەی تۆ یارمەتییەکی بەهێزت ئەدەم. ئینجا ئەوەندەی نەبرد (وەرەقە) مرد. (طبري)ش وێنەی ئەم حەیسە ئەهێنێ لە (عبدالله کوڕی زوبەیر)ەوە. ئەم ڕووداوە گەلێ جار ئەبیستێنو ئەخوێنینەوە لە کتێبی سیرەو تەفسیردا، هەروا بەبێ وەستان بیرلێ کردنەوە بەسەریا تێپەڕ ئەکەین. لەگەڵ ئەوەدا ئەبوایە هەموو جارێ بەوپەڕی سەرسوڕمانو ڕێزەوە بوەستاینایەو بەدرێژی بیرمان لێ بکردایتەوە، چونکە ڕووداوەکە زۆر زۆر گەورەو گرنگە، هەر چەند ئێمە هەوڵ بدەین بە دەمو بە نوسین گەورەییو گرنگی ئەم ڕووداوە باس بکەینو حەقیقەتو بارە ڕاستەقینەکەی ڕوون بکەینەوە، پیا ناگەینو توانای ئەوەمان نییە، چونکە هێندێ ناوچەی گەورەیی ئەو ڕووداوە لەتێگەیشتنو بۆچوونی ئێمە بەدەرە... بێگومان ئەوکات ئەو دەمەی کە ئەو ڕووداوەی تیا بەدی هات، گەورەترو بەنرخ ترین کات بوو کە تێپەڕی کرد بەسەر ئەم زەوییەدا لە هەموو

مێژووی تەمەنی ئەم زەوی‌یەدا! ئەو ڕووداوە خۆی لە خۆیا گەورەو بەنرخە، وە ئەوەی کە نیشانی ئەدات و ئەیگەیەنێ گەورەو بەنرخە، وە بەرهەم و سەرئەنجامی هەر گەورەو بەنرخە.

ئینجا با بەکورتی بزانین خۆی لە خۆیا چی‌یەو ئەوەی ئەیگەیەنێ و نیشانی ئەدات چی‌یە؟ وە بەرهەم و سەر ئەنجامی چییە؟ ئەم ڕووداوە بریتیە لەوە، کە خوای پەروەردگار کە خاوەن و کاربەدەستی هەموو شتە، زاڵ و بەدەسەڵاتە بەبێ سنوور، بێ‌نیازو بێ‌پێویستە بە هەرشتێ، ئەو خوایە ڕووی بەزەیی و میهرەبانی خۆی کرد بۆلای ئەم دروستکراوە کە پێی ئەوترێ: ئادەمی و ئەژی لە بەشێکی زۆر بچوک لەم بوونەوەرە گەورەو فراوانەدا کە تەنها خوا ئەم پەڕو ئەو پەڕی ئەزانێ، ئەم دروستکراوو گیان لەبەرەی کە زەوی ناویشی نازانێ، ڕووی بەزەیی و میهرەبانی تێکردو ڕێزی دا بەمەی کە یەکێکە لە خۆی هەڵبژارد بۆ ئەمەی ببێ بە جێگای تیشك و ڕووناکی خوای میهرەبان، وە ببێ بە گەنجینەو بەهەرگای حیکمەت و کاری دروستی خۆی، وە ببێ بە کان و سەرچاوەی فەرمان و فەرموودەی بۆ جیهان و جیهانیان، بیکات بەنوێنەرو بەدی هێنەری بڕیارو نیازی خۆی بۆ زەوی و بۆ دانیشتوانی زەوی. دەی بەڕاستی گەورەیی ڕووداوی وا بێ‌سنوورەو ئەم پەڕو ئەو پەڕی بۆ ئێمە دەرناکەوێ بە تەواوی، بەڵکو ئەندازێ لەو گەورەییەمان بۆ دەرئەکەوێ کاتێ بەپێی توانای خۆمان بیری بکەینەوە لە ڕادەو پلەی بێ سنوورو بێ سەرەتای بڕانەوەی خوایەتی خوا، لە پەنای وەدا بیرێ بکەینەوە لە ڕادەی بەندە بەو هەموو کەم و کوڕی و لەڕولاوازییەی کە هەیەتی تا ڕادەیە دیار نی‌یەو چاو نادا لەناو ئەم بوونەوەرەدا، لەگەڵ ئەوەدا ئاوا بە گرنگ بگیرێ و ئەو ڕێزەی پێ بدرێ، فەرمان و فەرموودەی خوای بۆ بێت!!

ئەم ڕووداوە گەورەیە لەلایەن خواوە فەراهەم هات بەبێ هیچ هۆیەك بێجگە لە بەزەیی و میهرەبانی‌یە بێ سنوورەکەی. ئەم بەهرەو ڕێزە لە ڕادەیەکایە کە بۆچوون خەیاڵی ئادەمی پیا ناگات، وە بە هیچ ڕەنگ ناتوانێ هەڵسێ بە سوپاسی: با هەموو ماوەی ژیانی سەر لە سوژدە بەرزنەکاتەوە، بەرهەم و پیت و فەڕی ئەم ڕووداوە لە ژیانی ئادەمی دا بەجۆرێ بوو ڕووی ژیانی گۆڕی لە هەموو بارێکیەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾

بەهۆی ئەم ڕووداوە پیرۆزەوە ئادەمی و ئادەمێتی سەر لەنوێ هاتنەوە جیهان و لە دایك بوونەوە، بەڵام لەسەر شیرین ترو تێرو تەواوترین شێوەیان و ڕێگا و ڕێبازی ڕاست و دروستیان بۆ نەخشە کێشراوە، هەموو نیشانەو دروشمەکانی بەڕوونی و بەبەرزی دانرا بەجۆرێ تێپەڕ کردنی هەزارەها چەرخ و ڕووداو بەسەر ئەو نیشانەو دروشمانەدا کاریان لێ ناکات و نایان گۆڕێ و کوێری ناکاتەوە، بەڵکو هەر تەپ و تۆزێکیان ئاڕاستەبکرێ بە ئاسانی لائەبرێ و پاك و خاوێن ئەکرێنەوە. دەروونی مەردوم زانا و ئاشنابوو بە خۆی و بە ژیان و ئەم بوونەوەرەی تیایا ئەژی، بۆچوون و تێگەیشتنێکی بۆ پەیدابوو بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و ڕەوان، بەجۆرێ لەوەوبەر شتی وای دەست کەوت نەبووە، بێگومان لە ڕێگای ئەم ئایینەوە نەبێ هەرگیز دەست کەوتیشی نابێ، خوای گەورە لەیەکەم جاری سروشە(وحی)کەی و یەکەم بەش لە قورئانەکەی فەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) بەم فەرموودەیە: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ واتە ئەو قورئانەی کە سروش ئەکرێ بۆت بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتی دروست کرد، دەستی پێکرد بەناوی خواو فەرمانی دا کە یەکەم هەنگاوی لەڕێگا پیرۆزەکەیا ئەوەبێت. بەناوی خوای پەروەردگاریەوە بخوێنێ. وە لەناو سیفەت و نیشانەکانی خوادا باسی دروست کردنی کرد کە زۆر ڕێك و پەیوەستە بە پەروەردگارێتی و نیشانەیەکی ئاشکرایەلەسەری، ئینجابەتایبەتی باسی دروستکردنی ئادەمی ئەکات کەنایابتروگرنگترینی هەموودروستکراوەکانیەتی و وێنەونوێنەرێکی ڕێك وڕاستەبۆهەموودروستکراوەکانی.

ئەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ﴾ ئادەمی دروست کرد لەخوێن پارە. لەو نوختە خوێنە خەستەی کە ئەنووسێ بەدیواری مناڵدنەوە. لەو شتە سادەو بێهۆش و نەفام و نەزان و بێ دەسەڵاتە، ئەم ئادەمیە وریا و ژیرو خاوەن بیرو زیرەکی و توانا و دەسەڵاتەی دروست کرد، کەواتە بۆ ئەو پەروەردگارە خیچی تێناچێ ڕادەو پلەی یەکێ لە ئادەمی بەرزبکاتەوە، وە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کە نەخوێندەواربووەو لەناو گەلێکی نەخوێندەواردا پێگەیشت. ڕادەو پلەی بەرزبکاتەوە وەك خوێندەواری لێ بکات و بیکات بە فرستادەی خۆی

بۆ سەر هەموو بەندەکانی. ئینجا فەرمانی پێئەداتەوە بە خوێندن و هێندێ لە بەهرەی خۆی نیشان ئەدات تا پێغەمبەر (ﷺ) دڵخۆش و دڵنیا بێ و ئەو بەهانەی نەهێڵێ کە هێنایەوە بۆ (جوبرەئیل)، بەمەی کە خوێندەواری نی‌یە. فەرمووی: ﴿ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ﴾ بخوێنە لە کاتێکا هەر پەروەردگارت بەخشندەو میهرەبان ترێکە ﴿ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ﴾ کە مەردومی فێرکردووە بەهۆی قەڵەمەوە کە شتێکی بێگیانی بێزمانە، کەواتە هەر ئەو خوایە ئەتوانێ بەبێ قەڵەم پێغەمبەر(ﷺ) بکات بە خوێنەر.

﴿عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ﴾ ئادەمی فێرکردو زانای کرد بەشتێ لە پێشەوە نەی ئەزانی، شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئادەمی لەیەکەم جاری هاتنە جیهانەوە هیچ نازانێ لە پاشا بەرەبەرە خوا فێری هۆی ژیانی ئەکات، ئینجا بەرەبەرە فێری ئەم هەموو شتەی کردو هەتا بێت فێری شتێکی ئەکات کەلە پێشەوە نەیزانێ و بێئاگا بوو لێی. دەی ئەو خوایەی کە ئادەمی هێنا لەو نوختە خوێن پارەدا کە زانای کردو فێری ئەو هەموو شتەی کرد، بۆ ئەو خوایە چی تێئەچێ کە پێغەمبەر(ﷺ) وەك خوێندەوارێك لێ بکات و زانای بکات بەو هەموو شتەی کە تەنها خوا ئەندازو ڕادەیان ئەزانێ؟ ئامۆژگاری بەو جۆرە خوا پێغەمبەرەکەی خۆی دڵنیا و بەئارام و بێ باك کرد.

بێگومان قەڵەم لەوەوبەرو ئێستاو لەوەو پاشیش دەستێکی ئێجگار بالای هەیەو هۆیەکی زۆر گەورەو گرنگە لە ژیانی فێربوون و زانینی ئادەمی‌دا. ئەم نرخ و گرنگی‌یەی لەوەوبەر نەئەزانرا بەتایبەتی لەناو ئەو گەلە نەخوێندەوارەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا، چونکە دەقیان گرتبوو بە نەخوێندەواریەوەو بەبێ ئەوە ژیانیان بۆ سەر نەئەبرا، بەلام خوای پەروەردگار کە ئاگای لەم هەموو شتەیە خۆی زانیویەتی کە قەڵەم تا چ ڕادەیە بەنرخە لە ژیانی بەندەکانیا، بەتایبەتی لە ژیانی ئەم ئوممەت و ئایینە بەرزەدا، لەبەرئەوە هەر لەیەکەم دڵۆپە بارانێ کە هاتە خوارەوە لە ئاسمانی بەزەیی میهرەبانی‌یەکەی بۆ زیندوو کردنەوەی جیهان و جیهانیان، لەو یەکەم دڵۆپەدا ئامارەی کرد بەنرخ و ڕێزی قەڵەم. لەگەڵ ئەوە ئەو پێغەمبەرەی کە یەکەم جار ئەم دڵۆپە بارانەی کەوت بەسەراو ئەم سەرەتایەی بیست ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) نەخوێندەواربوو خوێندن و نوسینی نەبوو، کەواتە ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خۆیەوە بوایە باسی شتێکی نەئەکرد کە خۆی نەی بێت و لێی بێبەش بێت!! ئینجا بۆی دەرەخستین کە سەر چاوەی فێرکردن تەنها خوایە. ڕوونی کردەوە کە ئادەمی هەرچی ئەزانێ و هەرچی فێرکراوە هەمووی لەخواوەیە، وە هەرچی نهێنی‌یەکانی

بوون و بوونەوەرو ژیان کە بۆی دەرکەوتووەو لەبەرەوە بۆی دەرئەکەوێ هەموو لەو تاقانە سەرچاوەوە هاتووە، کە بێجگە لەو سەرچاوەیە تر نییە، بەم سەرەتایە کە پێنج ئایەتی کورتەو یەکەم جار هاتە خوارەوە، بەم سەرەتا کورتە یاساو بنەڕەتی دامەزراندو دا ڕشت بۆ تێگەیشتن و بۆچوونێکی بڕوای بێ پایان و فراوان کە پێویستە بڕوادار بڕوای خۆی لەسەر دامەزرێنێ.

هەموو کارێ هەموو بزوتنەوەیە، هەموو هەنگاوێ، هەموو کردەوەیەکی بڕوادار ئەبێ بەناوی خواوە بێت، وەلەسەر ناوی خوا دامەزرێ و بەرپا ببێ، بەناوی خواوە دەست پێ بکات، وە بەناوی خواوە بەڕێوە بڕوا، وە ڕوو بۆلای خوا بکات، وە بۆلای ئەو بڕواو بە نیازی ئەو بێت. تەنها خوا دروستکەرو پەروەردگارە، وە تەنها ئەو فێرکەرو زاناکەرە بۆ هەموو فێرکراوو زاناو زانا کراوێ. ئەم بیرو باوەڕو حەقیقەتە قورئانیەیەی یەکەم کە یەکەم جار دڵی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) وەری گرت، هەر ئەمە بوو بە هەمیشەیی و مایەوە لەگەڵی لە هەموو ماوەی ژیانیا، هەموو هەست و نیازو کارو کرداری لەسەر ئەو یاساو بنەڕەتەبوو. بەم ناوەوە کە یەکەم یاساو بنەڕەتی بۆ ئیمان و بڕوا. خاوەنی کتێبی (زاد المعاد) خوا پاداشتی گەورەی بداتەوە لە کتێبی ناوبراویا باسێکی زۆر گرنگی هەیە لەو بارەیەوە. هەموو ڕەوشت و کرداری پێغەمبەر (ﷺ) کورت هەڵئەهێنێ لەیادی خواو باسی خوادا، ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو کەس تێرو تەواوتر بووە لەبارەی یادو باسی خواوە. بەڵکو هەموو قسەو ووتاری ئەگەڕێتەوە بۆ باس و یادی خواو ئەوەی خوا پێی خۆش بووبێ.

فەرمانی جڵەوگیری و دنانی یاسای بۆ ئوممەت باس و یادی خوایە، هەوڵدان لەبارەی ناوو سیفەتەکانی خواو بڕیارو کردەوەکانی و بەڵێن و هەڕەشەکانی هەموو باس و یادی خوایە، وەسف و سەنای خواو باسی چاکەو بەهرەکانی و سوپاس و تەسبیح کردنی باس و یادی خوایە، داواو نزاکردنی ئومێدو بیم لێ کردنی هەموو باس و یادی خوایە، بێدەنگ بوون و قسەنەکردنی باس و یادی خوا بووە بەدڵ، چونکە لە هەموو کات و بەسەرهاتیا هەر باس و یادی خوای کردووە باس و یادی خوا لەگەڵ هەناسەیا بووە لە هەڵسان و دانیشتن و ڕاکشانیا و لە ڕۆشتنیا بە پیادەو بە سواری و لە گەڕان و دابەستنیا، لە کۆچ و کاروان و نیشتەجێ بوونیا. ئینجائەندازێ بەدرێژی لەهەموبارو ڕوویەکی ژیانیەوە، بۆ هەموو کاروبارێکی حەدیسێك ئەهێنێ لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکانی حەدیسەوە سەبارەت بە باسی و یادەکانی خوا. هەر کەس ئەیەوێ ئاشنا بێت بەوانە با تەماشای کتێبی ناو براوبکات.

كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ﴿٨﴾ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ﴿٩﴾ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ
﴿١٠﴾ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ﴿١٢﴾ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ

ئینجا بەپێی ئەم یاساو بنەڕەتە ئیمانییەکە سەرەتاو یەکەم جاری ئەم سوورەتەی پێهاتو ژیانی پێغەمبەری (ﷺ) لەسەر دامەزرا. بەپێی ئەو هەموو چاکەو بەهرەیە کە ئاماژەی بۆ کرد ئەبوایە ئادەمی چاو لەبەری ئەو پەروەردگارە بوایەو سوپاس و گوێڕایەڵی بکردایە، بەڵام بەداخەوە ئادەمی وا دەرنەچوو، بەڵکو ترازاو لای دا لەسەر ئەو ڕێگاو ڕێبازە ڕاستە، وەك بەشی دووەمی ئەم سوورەتە ڕوونی ئەکاتەوە، کە ئەفەرموێ: ( كَلَّآ )[1] با کەس سپڵەو ناسوپاس نەبێ بەرانبەر چاکەو بەهرەکانی خوا. واتە ئەبوایە هیچ کەس وانەبووایە، کەچی سپڵەو ناسوپاسە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ﴾ بەڕاستی ئادەمی یاخی ئەبێ ﴿أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ﴾ لەبەرئەوە خۆی بینیوە بە دەوڵەمەندو خۆی بە پێویست زانی . ئادەمی بە شێوەی گشتی بێجگە لەوانەی لەوانەی خواناسن و خوا پاراستوونی کاتێ خوا دەسەڵات و سامانی پێدان و بەئارەزووی خۆیان خوا بۆی ڕێکخستن. لەخۆیان ئەگۆڕێن و لووت ئەکەن بەکەڵەشاخ لە حاستی بەندەکانی خوا، لەباتی چاو لەبەری بۆ خواو مل کەچ کردن بۆ فەرمانەکانی و خۆ نزم لە حاستی بەندەکانی خوا ئەو کەسەی کە ئاوا یاخی ئەبێت و لە خۆی ئەگۆڕێ قورئان ئەدا بەلووتیا بەم هەڕەشە سامناکە ﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ﴾ بەڕاستی هەر بۆلای پەروەردگارت ئەگەڕێنەوە، واتە هەموو کەس لەپاش مردن زیندوو ئەکرێتەوەو ئەچێتە بەردەم دادگای خوا. کەواتە ئەو یاخیانە چی ئەکەن و بۆ کوێ ئەچن؟ بەم فەرموودەیە ئەو هەڕەشە سەختەی کردوو لە هەمان کاتدا یاسایەتری لە یاسا بڕواییەکانی ئیسلامی دەرخست. یاسای

---

[1] ووشەی (کلا) بەپێی تەفسیرەکە بۆ تێ خوڕینە، وەك لەزۆرەبەی شوێن دایە. هەندێ ئەفەرموون بە مانا (حقا) واتە بەڕاستی. هەندێ تر ئەفەرموون بەمانا (الا) یەو بۆ بێدارکردنەوەیە.

گەڕانەوە بۆلای خوا لە هەموو شتێكو لە هەموو كارو نیازو كردەوەیەكا، كەواتە شوێنی گەڕانەوە تەنها بۆلای خوایە، بۆ چاكو خراپو بۆ گوێڕایەڵو بۆ یاخی، بۆ دەوڵەمەندو بۆ هەژار... هەرچۆنێ پەیدابوونی یەكەم جار لە خواوەیە هەروەها گەڕانەوەش بۆلای ئەوە...

ئینجا شێوەیە لە شێوەكانی یاخی بوونو سەركێشی نیشان ئەدات: شێوەیەكی زۆر بێزراوی ناشیرینە، مەردوم سەرسام ئەكات لێی، سەرسووڕ ئەهێنێ لە ڕوودانی شتی وا خراپو بێزراو، باسەكە بەجۆرێ ئەكات هەر لە دەست قورئان دێتو بەهیچ قەڵەمێو لە هیچ زمانێك دا لاسایی ناكرێتەوە. ئەفەرموێ: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ۝٩ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ﴾ پێم بڵێو هەواڵم بدەرێ لەبارەی كەسێكەوە كە جڵەو گیری ئەكات لە بەندەیە لە بەندەكانم كاتێ كە نوێژ ئەكات! واتە سەرت سوڕبمێنێ لەو كەسەو لەو كردەوە زۆر خراپەی!

ئینجا هەڕەشە ئەكات لەو یاخیەو ئەیترسێنێ لە تۆڵەی خوا، ئەفەرموێ: ﴿أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ۝١١ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ﴾ هەواڵم بدەرێ ئەگەر ئەو كەسەی كە ئەو جڵەو گیریە ئەكات لەسەر ڕێی ڕاست بێت لەو جڵەو گیری كردنەدا، یا فەرمان بە چاكەو لەخواترسی بدات لەو بت پەرستیو هاوبەش دانانەی كە بانگی بۆ ئەكات، وەك خۆی ئەڵێو خۆی وا ئەزانێ، ﴿أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ هەواڵم بدەرێو پێم بڵێ: ئەگەر ئەو كەسە بڕوا بە ئایینی خوا نەكاتو پشت هەڵكات لێی وەك ئێمە ئەزانینو بەو جۆرە ئەیناسین، بە هەر كامو لەسەر هەر بارێ ﴿أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ﴾ ئایا نەیزانیوە كە خوا ئەیزانێو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێكا، واتە با بترسێ لە خوا و با بزانێ كە خوا زانایە بە هەموو شتێ كەواتە بە پێی كردەوەكەی ڕەفتاری لەگەڵ ئەكاتو تۆڵەی لێ ئەسێنێ، بە ڕاستی كردەوەكەی هۆی سەرسوڕمانە! ئەم تەفسیرو ڕاڤەیە بە پێی ڕای (زەمەخشەری)و چەند زانایە تر، بێجگە لەم مەبەستە جۆری تریش تەفسیر كراوەتەوەو هەموو هەر ئەگونجێنو هەركەس هەركام هەڵبژێرێ بەرگری ناكرێو ڕێگای هەیە.

يَرَىٰٓ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾
كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾

ئینجابەرانبەرئەویاخی بوون‌وسەرکێشیە بەم هەڕەشە سەخت‌و سامناکە هاتە خوارەوە:
﴿كَلَّا﴾ با کۆتایی پێ بێنن لەوسەرکێشی‌و یاخی بوونە﴿لَئِن لَّمْ يَنتَهِ﴾، ﴿كَلَّا﴾ سوێندبە خوا ئەگەر کۆتایی نەهێنێ لەو بارەی کە لەسەریەتی ﴿لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾ بەتوندی ئەنەون لە پێشی سەری‌و ڕای ئەکێشن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، بەڵام کام پێشەسەر؟ ﴿نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ پێشەسەرێکی درۆزنی هەڵە.

بێگومان درۆزن‌و هەڵە شەخسی یاخی‌یەکەیە، نەك پێشەسەری، بەڵام ئەو شێوەیەی کە قورئان فەرموویەتی زۆر گرنگترە، چونکە وا نیشان ئەدات کە ئەو یاخی‌یە لە درۆو هەڵە کردندا گەیشتووەتە ڕادەیەك وەك هەموو بەش‌و پارچەیەکی درۆزن‌و هەڵە بێت، دروشم‌و نیشانەی هەڵەکەی لە سەریا ئاشکرا تر بووە کە بە شێوەیەکی کەشخەو خۆ بە زل زانی هەمیشە تەوێڵ‌و لووت‌و سەری بەرز ئەکردەوە لە حاستی مەردوم، ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە دەربارەی (ابو جهل) کە بانگی ئەکرد بۆ بت پەرستی‌و جڵەو گیری ئەکرد لە خواپەرستی، جارێ سوێندی خوارد کە ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) ببینێ سەری لە سوژدەدا بێت، پێ بنێ بە سەریا بیتلێنێ بە خۆڵەوە، ئینجا بینیی‌و نەیتوانی، جا کە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە ئەم هەڕەشە سەختەی لێ کرد، وتی بە پێغەمبەر (ﷺ) ئایا تۆ هەڕەشەم لێ ئەکەیت؟ لەکاتێکا کە من لە هەموو دانیشتوانی مەککە کۆڕو مەجلیسم زۆر ترە، بێجگە لەوەش (ابو جهل) هەمیشە کەشخەو شانازی‌و فیزی ئەکرد بەو کۆڕو کۆمەڵەکەی، لەبەر ئەوە ئەوا قورئان ئەدا بە لووتیاو دەم کوتی ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ﴾ دەی با بانگ بکاتە کۆڕەکەی، ﴿سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ﴾ ئێمەش بانگی فریشتە بەهێزەکانی خۆمان ئەکەین بۆی کە سزادانیان بە دەستە بۆ سزادان‌و لەناوبردنی بە ئاشکرا لەم جیهانەدا، لە حەدیسێکدا ئەفەرموێ: ئەگەر ئەو بانگی کۆڕەکەی بکردایە ئەو فریشتانە ئەهاتن بە ئاشکرا ئەیانگرت،

یا بانگی فریشتەی سزای بۆ ئەکەین لە ڕۆژی دوایی دا بۆ ئەوەی زنجیری بکەن‌و ڕایکێشن بۆ ناو دۆزەخ.

ئینجا دووبارە ئەخورێتەوە ئەو یاخی‌یەو جڵەو گیری ئەکات لە یاخی بوون‌و کردەوە خراپەکەی، پەندو ئامۆژگاری بەندە گوێڕایەڵەکەی ئەکات بە بەردەوامی و هەمیشەیی لەسەر گوێ‌نەگرتن‌و بە قسە نەکردنی ئەو یاخی‌یە، بەردەوامی‌و هەمیشەیی لەسەر خواپەرستی خۆی‌و خۆ نزیك خستنەوە لە خوای خۆی، ئەفەرموێ: ﴿ كَلَّا ﴾ با ئەو یاخی‌یە کۆتایی بێنێ ﴿ لَا تُطِعْهُ ﴾ بە قسەی نەکەیت ﴿ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ﴾ وە سوژدە بێنە بۆ خوا و خۆتی لێ نزیك بخەرەوە بە پەرستن‌و گوێڕایەڵی بۆی، واتە بەردەوام بە لەسەر کاروباری خۆت، ئایا مەبەست بەم سوژدە بردنە نوێژە وەك زۆربەی زانایان ئەفەرمون، یا مەبەست هەر سوژدەیە وەك شافیعی‌و هەندێ لە زانایانی تری لەسەرە، بە هەرکام مەبەست بێت نیشان ئەدات کە سوژدە بردن زۆر گەورەیە، گریان‌و نزاکردن تیایا زۆر پێویستە وەك چەند حەدیسێ لەم بارەوە هاتووەو ئایەتیش فەرمانی پێ‌ئەدات. ئەم ئایەتانە هەرچەند سەبارەت بە (ابو جهل)و پێغەمبەر (ﷺ) هاتبێتە خوارەوە، بەڵام فەرمان‌و بڕیارەکانی گشتیە بۆ هەر یاخی‌و سەرکێشێ کە جڵەوگیری ئەکات لە نوێژو خواپەرستیدا، وە گشتی‌یە بۆ هەموو بڕوادارێکی خواپەرست کە بانگ ئەکات بۆلای خوا و خواپەرستی.

خوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتیمان بدات لەسەر گوێڕایەڵی‌و پەرستنی خۆی‌و لەسەر بەهێزی‌و دڵدامەزراویمان بەرانبەر پیلان‌و کردەوەی خراپی دوژمنانی خۆی‌و ئایینەکەی.

وصلى الله وسلم على رسوله محمد وعلى آله وصحبه

لە ٣ی شوال ١٤٠٣هـ٢/٨/١٩٨٣م تەواو بوو

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ
إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾

## سوورەتی «القدر»
## مەككەییەو (٥) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

قسەو باس لەم سوورەتەدا لەبارەی ئەو شەوە پیرۆزەیە کە بەناوبانگە، ئەو شەوەی کە پەیوەستی و پەیوەندی زەوی تیا فەراهەم هات لەگەڵ ئاسمان و کۆمەڵی هەرە بەرزا، شەوی دەست پێکردن و یەکەم جاری هاتنەخوارەوەی قورئان بۆسەر دڵی بەفەڕی پێغەمبەر (ﷺ) شەوی ئەو ڕووداوە زۆر گەورەی کە زەوی وێنەی ئەوەی نەدیوە لە گەورەیی و لە کارکردن و لە بەرهەما بۆ ژیانی جیهان و جیهانیان.

ئەو شەوەی کە ئەم سوورەتە باسی لێوە ئەکات ئەو شەوەیە کە لە سەرەتای سوورەتی (الدخان)دا باسی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ﴾ بەڕاستی ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لە شەوێکی پیرۆزی بە پیت و فەڕدا، ئەو شەوە شەوێکە لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزان، وەك لە سوورەتی (البقرە)دا ئەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ﴾ واتە ئەو چەند ڕۆژەی کە ڕۆژووی تێدا بڕیار دراوە مانگی ڕەمەزانە کە قورئانی تیا هێنراوەتە خوارەوە، واتە لەو مانگەدا دەست کرا بە هێنانە خوارەوەی قورئان، لە ڕیوایەتی (ئیبن و ئیسحاق)دا ئەڵێ: یەکەم جاری (وحی) سروشی خوا بە سەرەتای سوورەتی (العلق)بوو لە مانگی ڕەمەزان لەکاتێکا کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ئەشکەوتی (حیرا)دا کەنارگیر بوو بۆ خواپەرستی، لەبارەی دیاری کردنی ئەو شەوە چەند ڕیوایەت و حەدیسی زۆر هاتووە، وەك بەناوبانگن، هەموو ئەوانە یەکن لەمەدا کە ئەو شەوە یەکێکە لە شەوەکانی ڕەمەزان.

ئینجا با بێینە سەر تەفسیرو ڕاڤەی سوورەتە بەفەڕەکە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ بەڕاستی ئێمەقورئانمان ناردەخوارەوە لە شەوی ڕێزو گەورەیی و شەرەفدا یا لە شەوی بڕیارو تەگبیری هەموو کاروباردا،بە هەرکام مەبەست بێت ڕاستەو ڕێکە لەگەڵ ئەو ڕووداوە گەورەی کە ڕووی دا لەم بوونەوەرەدا،

ڕووداوی هاتنەخوارەوەی قورئان و پێغەمبەرێتی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ ڕووداوێ لەو ڕووداوە بە نرخ ترو گەورەتر نیە لەم بوونەوەرەدا، هیچ ڕووداوی تر وەك ئەوە بڕیارو تەگبیری ژیانو جیهانی تیا نەکراوە، ئیتر ئایا ناردنە خوارەوەی هەموو قورئان مەبەست بێت کە لەو شەوەدا لە (لوح المحفوظ)ەوە هاتە خوارەوە بۆ ئاسمانی ئەم جیهانە، وەك لە حەدیسا ئەفەرموێ، یا مەبەست دەست کردن بێت بە ناردنە خوارەوە کە لەو شەوەدا دەست پێکراو سەرەتای (العلق) هاتە خوارەوە، گەورەیی ئەو شەوە لە ڕادەیەکایە کە بیرو زانینی ئادەمی پیا ناگاتو دەرەقەتی نایە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ﴾ ئایا چی تۆی زانا کردووە کە چیە ئەو شەوە؟ واتە تۆ نازانیو زانینی تۆ پەی نابا بە گەورەییو نرخی ئەو شەوە. ئینجا نرخو گەورەیییەکەی دەرئەخات بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ﴾ ئەو شەوە چاکترە لە هەزار مانگ ـ واتە هەزار مانگ کە ئەو شەوەیان تیا نەبێ ـ هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست لە ناوبردنی هەزار لێرەدا ئەو ژمارە تایبەتییە نیە بەڵکو مەبەست زۆرییە، بەوێنەی ئەم هەزارەی کە لەم ئایەتەدایە: ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمۡ لَوۡ يُعَمَّرُ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ هەرکام لەوان پێی خۆشەو ئاوات ئەخوازێ کە تەمەنی درێژ بکرێو بژێنرێ هەزار ساڵ.

بێگومان ئەو شەوە باشترو بەکەڵك ترە بۆ ژیانو جیهان لە هەزارەها مانگو ساڵ، چونکە ئەوەتا چەند هەزارەها مانگو ساڵو چەرخ هاتو تێپەڕی کرد، بەبێ ئەوەی هێندێ لە پیتو فەڕی ئەوشەوەی تێدا بووبێ، وە بەبێ ئەوەی هێندێ لە بەرهەمی ئەو شەوەیان بەجێ هێشتبێ بۆ مەردوم!!

ئایا لە هەموو تەمەنو ژیانی ئادەمیو جیهانا ئەم ئایینو ئاقیدەو شەریعەتە گشتیە بووە کە پاكو بێلەکەیە لە هەر نەنگو ڕەخنەیەكو مایەی کامەرانیو خۆش بەختی هەردوو جیهانە؟!! زۆربەی زۆری زانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەستی ئەو ژمارە تایبەتییەیە، بەڵگەیشیان چەند حەدیسێکە: یەکێ لەوانە ئەمەیە کە (ئیمامی مالیك) لە (موطأ)دا ئەفەرموێ: کە تەمەنی ئوممەتەکان نیشانی پێغەمبەر (ﷺ) درا، لەناو ئەوانا بینی کە تەمەنی ئوممەتەکەی خۆی کورت تر بوو، بەهۆی ئەوە غەمی لێ هات کە ئوممەتەکەی لە کردەوەدا ناگەن بەوان، ئینجا خوا ئەو شەوەی پێبەخشیو گێڕای بە چاکتر لە هەزار مانگ، هیچ جێگای سەر لێکردنەوەو سەرسوڕمان نیە کە خوای میهرەبان لەبەر خاتری قورئان کە سیفەتو فەرموودەی خۆیەتیو لەبەر دڵشاد کردنی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی (ﷺ) کردەوەی چاکی ئەو تەنها شەوە بە نرخو گەورەتر بکات لە کردەوەی چاکی هەزار مانگ.

ئینجا بێگومان پیتو فەڕی ئەو شەوە تایبەتی نیە بە تەنها ئەو یەکەم شەوەی کە قورئان تیا هاتە خوارەوە، بەڵکو لەپاش ئەو شەوە هەتا دنیا دنیایە ئەو پیتو فەڕە بۆ وێنەی ئەو شەوە هەیە لە مانگی ڕەمەزانی هەموو ساڵێکدا، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو هەموو حەدیسە سەحیحانەیە کە لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکانا هەنو فەرمان ئەدەن بە ئیمانداران کە بگەڕێن بە شوێن ئەو شەوەدا لە دە شەوی دوایی مانگی ڕەمەزان، هەروەها مانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتاو زیادە هەوڵو تێکۆشانی لەو شەوەدا، هەر لەبەر ئەوەیشە لەناو ئەم ئوممەتەدا بووە بە باو زیندوو کردنەوەی ئەو چەند شەوە بە نوێژو خواپەرستی هەتا بەیانی، بە ئومێدی گەیشتن بەو شەوەو دەست کەوتی پیتو فەڕو پاداشتی گەورەی.

ئینجا هۆی گەورەیی و چاکتری ئەو شەوە باس ئەکات لە دوو بارەوە: یەکەم: ئەفەرموێ: ﴿تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾ لە بارەی وتەی ﴿تَنَزَّلُ﴾ەوە دوو ڕا هەیە لای زانایانی تەفسیر.

یەکەم: مەبەست پێی ڕابردووە، وە هێنانی لە شێوەی ئێستاو داهاتوو بۆ ئامادەکردنی ئەو شێوە ڕابردووە، کە ئەوەش شتێکی شیرین باوە لە عیلمی ڕەوان بێژی داو لە قورئانا وێنەی زۆری هەیە.

دووەم: کە زۆربەی لەسەر ئەمەیە مەبەست ڕواڵەتو دیمەنەکەیەتی و بۆ ڕابردوو نیە، جا با بە پێی هەردوو ڕاکە ڕاڤەو تەفسیری بکەین.

لەسەر ڕای یەکەم: لەو شەوەدا فریشتە بە شێوەی گشتی و (جوبرەئیل) بە تایبەتی هاتنە خوارەوە بۆ ئاسمانی یەکەم، یا بۆ سەر زەوی بە فەرمانی پەروەردگاریان لەبەر خاتری هەموو کارێکی ڕاستو ڕەواو پێویست بۆ جیهانو جیهانیان، کە لەم ئایینو قورئانەدایە، واتە خوا ویستی ئەم قورئانە گەورەیە بنێرێتە خوارەوە کە گەورەترین بەرنامەو دواترین شەریعەتی خوای تیایە، بە هۆی ئەوەو لەبەر ڕێزی ئەو قورئانە، لەو شەوی هاتنە خوارەوەدا ئەو میهرەجانە گەورەو گرنگەی فەراهەم هێنا لە فریشتەکانو (جوبرەئیل)، لەگەڵ ئەو قورئانەو بەو قورئانەوە سەرجەم هاتنە خوار بۆ ئاسمانی یەکەم، یا لەگەڵ ئەو یەکەم بەشە لە قورئان هاتنە خوارەوە بۆ سەر زەوی و بۆلای پێغەمبەر (ﷺ).

لەسەر ڕای دووەم: لەو شەوەدا کە قورئانی تیا هاتە خوارەوە هەموو ساڵێ فریشتەو (جوبرەئیل) دێنە خوارەوە بە فەرمانی خوا بەهۆی هەموو کارێ کە بڕیار دراوەو دیاری کراوە بۆ ئەو ساڵە تا ساڵی داهاتوو، ئەو کارو بڕیارانە ئەهێنن و ڕای ئەگەیەنن بە فریشتە فەرماندارەکان بۆ بەجێهێنان و بەدی هێنان، بە هەرحاڵ و لەسەر هەر بارێ بێگومان لەو شەوەدا قاپی خۆشبەختی و کامەرانی کرایەوە لە جیهان و لە جیهانیان، لە کاتێکا کە هەوری ڕەش و تاریکی نەزانی و نەفامی و جەورو ستەم جیهانی داگیر کردبوو، ڕادەی ئادەمی پەست تر بووبوو لە ڕادەی پیس ترین گیان لەبەر، لەو شەوەدا تیشك و ڕووناکی دادو میهرەبانی خوا دەرکەوتەوەو لە شێوەیەکی زۆر تێرو تەواو ترا، هەتا ئادەمی لەبەر ئەو ڕووناکیە هەڵئەساو دائەنیشت و ڕەفتاری ئەکرد، تامی دادو ئادەمێتی ئەچەشت، ئارام و ئاشتی ڕاستەقینەی دەست کەوت بوو، ئاشتی دەروون، ئاشتی ماڵ و خێزان، ئاشتی گەل، لەو کاتەوە ئەو ڕووناکی‌یە لەبەرچاو وون بوو، مەردوم و جیهان کەوتنە گێژاوی بێئارامی و ئاژاوەو جەنگ و کوشتار، لەگەڵ ئەوەدا لەبارەی ئاوەدانی و شارستانی و شت و مەك و مادەوە، زۆر پێش کەوتووەو قاپی هەموو خێرو بێری زەوی لێ کراوەتەوە!!

ئەو هەموو خێرو بێرە هیچ خۆشی و ئارامی ناگەیەنێ بەدڵ و دەروون، چونکە دەروون لە تاریکی شەوەزەنگ دا ئەژی و ئەو ڕووناکی‌یەی کەلەو شەوەدا دەرکەوت، ئێستا لەبەرچاو وون بووە، کەواتە مافی خۆیەتی کە ئەو شەوە پیرۆزە ئەوەندە بە گرنگ بگیرێ و هەموو ساڵێ یادی بکرێ و لەدوای پیت و بەهرەکەیا مەردوم بگەڕێ، وەك پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرمانی دا لەچەند فەرموودەیەکیا کە بەناوبانگن و لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکانا بڵاو بوونەتەوە.

باری دووەم بەهۆی گەورەیی و چاکتری ئەو شەوە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ﴾ ئەو شەوە هەر سەلامە هەتا ڕۆژ ئەبێتەوە. واتە ئەو شەوە ئەوەندە سەلامی تیا ئەکرێ لە بڕواداران لەلایەن مەلائیکەوە، وەك هەمووی بریتی بێت لە سەلام، یا ئەو شەوە هەر ئاشتی و بێ باکیە لە هەر شتێ مەترسی لێ بکرێ و شەڕو خراپەو بەڵای تیا نی‌یەو نابێ. نەك وەك شەوەکانی تر. داوای سەلام و سەلامەتی ئەکەین لە خوای میهرەبان.

سەبارەت بەم شەوە پیرۆزە ئیشکال و گرێ‌یە هەیە بەجوانی ئەزانم قسەی لێ بکەین.
ئەوەش ئەمەیە: بێگومان هەموو شوێن و وڵاتێ وەك یەك نین لەبارەی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆرو مانگەوە، بەڵکو دواو بەریان ئەکەوێ تا ڕادەیە لە هەموو سەری مانگێکا وڵاتەکان بە

ڕۆژێ پێش‌و پاش ئەکەون لەیەکتر، بەم ڕەنگە لە هێندێ شوێن مانگ ئەکەوێتە پاش ئاوابوونی خۆرو ئەبینرێ کەواتە مانگ نوێ ئەبێتەوە، لە وڵاتێ‌تر ناکەوێتە پاش ئاوابوونی کەواتە لەو وڵاتەدا مانگ نوێ نابێتەوەو مانگی تازە نەهاتووەتە پێشەوە، بەم پێیە ئەبێ شەوی (لیلة القدر) مان تەنها شەوێ نەبێ، وە ئەبێ لە هێندێ وڵات لەو شەوە لەشەوە تاکە کان بێت‌و لە وڵاتێ‌تر ئەبێ لە شەوە جووتەکانا بێت، بەڵکو لە هێندێ وڵات مانگی ڕەمەزان هەر نابێ وەك ئەو وڵاتانەی کە شەش مانگ ڕۆژەو شەش مانگ شەوە، کەواتە نابێ کاتی هاتنە خوارەوەی قورئان هەر شەو بووبێ، بەڵکو لە هەندێ شوێن هەمووی شەو بووبێ‌و لە هەندێ تر هەمووی ڕۆژ بووبێ‌و لە هێندێ تر بەشێکی شەو بێت‌و بەشێکی تری ڕۆژ، لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەم گرێ‌و ڕەخنەیە لای کۆڕو جەماوەری زانایان ڕوونادات کە بۆ هاتنی ڕەمەزان‌و هەموو مانگەکانی تریش گوێ نادەنە جیاوازی هەڵهاتن‌و دەرکەوتنی مانگ، بەڵکو لایان وایە لە هەر وڵاتێ مانگی یەك شەوە بینرا بەسە بۆ هەموو شوێن‌و وڵاتەکانی تریش بە شێوەی گشتی.

سەبارەت بەو شوێنانەی کە ماوەی شەویان زۆر کورتە، یا ماوەی شەش مانگ هەر ڕۆژە یا شەوە، سەبارەت بەو وڵاتانە بەپێی کات ژمێر شەوو ڕۆژو مانگ دیاری ئەکرێت، ڕابەرو بەڵگە بۆ ئەوە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی لە وەڵامی یارەکانیا کە پرسیاریان کرد لەبارەی ڕۆژەکەی جەجاڵەوە کە وەك ساڵێ وایە ئایا بۆ ئەو ڕۆژە نوێژی ڕۆژێکمان بەسە؟ ئەویش فەرمووی نەخێر (ولكن اقدروا له قدره) بەڵکو ئەندازەی ڕۆژی بۆ دیاری بکەن، ئەو گرێ‌و ڕەخنەیە کە بگیرێ تەنها لەسەر ئەم ڕایە ئەگیرێ کە ئەڵێ: بینینی مانگ لە تەنها وڵاتێ بەس نییە، بەڵکو بینینی پێویستە بۆ هەموو ناوچەیەکی جیاواز بەو جۆرەی کەلە کتێبی فیقە دا باسکراوە... لەسەر ئەم ڕایەش ئەڵێین: لە ڕووی ڕاستیدا (لیلة القدر) تەنها ئەو یەکەم شەوەیە لەشەوەکانی ڕەمەزانی مەککە کە یەکەم جار قورئانی تیا هاتە خوارەوە لەیەکەم ساڵی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر لەپاش ئەوە هەرشەوێ تر لە هەر مانگ‌و ساڵی تر ناو ببرێ بە (لیلة القدر) بە شێوەی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو لەبەرئەوەیە وێنەی ئەو یەکەم شەوەیە، هەر پیت‌و فەڕو ڕێزێ بدرێ بەو وێنەیان لەبەر خاتری ئەو یەکەم شەوەیە، کەواتە بۆ میهرەبانی خوا هیچی تێناچێ ئەو پیت‌و بەهرەیە دووبارە بکاتەوە بۆ هەر وڵاتێ تر کە شەوو ڕۆژیان جیاوازبێت لەگەڵ شەوو ڕۆژی مەککەو مەدینەدا، ئەم وەڵامە لەسەر

ڕای یەکەم لە تەفسیری ﴿ تَنَزَّلُ ﴾دا ڕێکەو ئارامدەرە بە دڵ، بەڵام لەسەر ڕای دووەم پێویست هەیە بە لێکۆڵینەوەی تر.

یەکەم: ئەڵێن ناوبردنی بە شەو، دیاری کردنی شەوێکی تایبەتی بۆی بە پێی ئەو وڵاتو شوێنەیە کە قورئانی تیا هاتەخوارەوە، (لیلة القدر) لەڕاستیدا ئەو شەوی ئەوێیە، ئیتر با ئەو شەوی ئەوێ لە شوێن ڕۆژبێت، با لەوێ تاك بێتو لە وڵاتێ ڕێکەوتی جووت بکات، هیچ درۆ نییە لەبەر ئەمە بێت هێندێ لە حەدیسەکان فەرمان ئەدەن بە زیندووکردنەوەی دە شەوەکە بەتەواوی، وە هێندێ تر فەرمان ئەدەن بە تێکۆشانو زیندووکردنەوەی ڕۆژەکانیش لەو دە شەوەدا.

دووەم: ئەڵێن ئەوپەڕی دواو بەرو جیاوازی مانگ لە هەموو ئەو وڵاتانەی کە شەوو ڕۆژیان هەیە تەنها شەوێکە دەی بۆ خوا هیچی تێناچێ ئەو پیتو فەرو هاتنەخوارەوەی (جوبرەئیل)و مەلائیکانە دووبارە بکاتەوە لەو دوو شەوەدا، ئەو کاتە هەموو وڵاتێ (لیلة القدر)ی تایبەتی خۆی ئەبێ بەهەموو پیتوفەڕیەکەیەوە وهەموومسوڵمانێ بەشدارئەبێتیایا.

سێیەم: ئەڵێن بۆ هەموو وڵاتان هەر شەوێکە، بەم ڕەنگە هەموو بەشدارن لە بەشو پارچەیە لەو شەوی (لیلة القدر)ەدا، ئیتر با هەموو لە دەست پێکردنو تەواوبوونا بەشدار نەبن، بەم جۆرە شەوەکە لە مەدینەوە دەست پێئەکاتو لە پاش نیوسەعات لە ئوردن لە پاش سەعاتێ لە قاهیرەو هەروەها....

ئەم باسو پرسیارە زۆر بە درێژی لێکۆڵینەوەی تیا کراوەو ئەڵێن: ئیمام (ابن تيميه) بەدرێژی لێی دواوەو بەڵام ئێمە کتێبەکەیمان دەست نەکەوت، وە لام وایە ئەم لێکۆڵینەوەی لێرەدایە بەس بێت.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله وصحبه

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ
يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ ﴿٣﴾

## سوورەتی «البینة»
## مەدینەییەو (٨) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە لە قورئانا بە مەدینەیی نوسراوە، هەروەها لە زۆربەی ڕیوایەتەکانیشا هەر بەو جۆرە هاتووە، هەرچۆنێ ڕووالەت و شێوەی تەعبیرو مەبەستەکانیش هەر باری مەدینەیەتی بە هێز ئەکەن، بەڵام لە هەمان کاتدا هیچ دوور نییە مەککەیی بێت وەك لە هێندێ ڕیوایەتیشا بە مەککەیی دانراوە. ئەم سوورەتە چوار شتی گرنگی و مێژوویی و بڕوایی نیشان ئەدات:

یەکەم: ئەمەیە کە ڕەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) پێویست بوو، بۆ گۆڕاندنی بێبڕواکانی نامەدارو بت پەرستەکان لەو بیروباوەڕەی کە سەری لە گومڕایی و دووبەرەکی و ئاژاوەوە دەرکردن، وە بەغەیری ئەوە ئەو گۆڕان و ڕاستکردنەوە نەئەگونجا.

دووەم: دووبەرەکی و ئاژاوەی نامەدارەکان لە نەزانین و تێنەگەیشتنەوە نەبوو، بەڵکو لەپاش ئەوەبوو کە زانین و بەڵگەی ڕوون و ئاشکرایان بۆهات.

سێیەم: ئایینی خوا لەبنەڕەتا یەکەوڕیاساو پایەکانی ڕوون و ڕەوانن و هۆی دووبەرەکی و ئاژاوە نین.

چوارەم: بێبڕواکان لەپاش ئەوەی بەڵگەو نیشانەی ئاشکراو ڕوونیان بۆ هات، لای خوا خراپترن لە هەموو گیان لەبەران و دروستکراوەکانی خوا، وە بڕوادارەکان کە خاوەنی کردەوە چاکەکان لای خوا چاکترینی هەموو دروستکراوەکانی خوان.

ئەم چوار مەبەستە زۆر گرنگ و بەنرخە لە تێگەیشتن و زانینی کارو بەرو بەرهەمی ئەم ئایینی ئیسلامە ئەم پەیامە دوا دواییە، وەك لەمەولا بەدرێژی ڕوونی ئەکەینەوە، لە پێش ئەمەی خوا ئەم قورئانە بنێرێتە خوارەوەو ئەم پێغەمبەرەمان بۆ ڕەوانە بکات، ئەم زەوی و جیهانە پێویستیەکی ناچاریان پەیداکرد بەئایین و پەیامێکی تازە، چونکە تاوان و ئاژاوەو خراپەکاری و بڵاوبووبووەوە بە هەموو چمك و ناوچەکانی زەویدا، کوفرو بێبڕوایی ڕووی کردبووە بیرو باوەڕی هەموو دانیشتوان بە تێکڕایی و یەکسانی چ ئەوانەی بە نامەدار ناوئەبران کە ئایینی ئاسمانیان بۆ هاتبوو لە پاشا دەستکاریان کردبوو گۆڕیان، چ بت پەرستەکان لە نیوە دوورگەو لە دەرەوەی نیوە دوورگەدا بەجۆرێ هیچ ئومێدێ نەما بۆ چارەسەرکردنی، مەگەر بەناردنی ئایین و پەیامێکی تازەو بەرنامەیەکی تازەو بزوتنەوەیەکی تازەو سەرکردایەتیەکی تازە، بە هیچ کلۆج ئەو تاقمانە نەئەگۆڕان و وازیان نە ئەهێنا لەو بارەی کەلەسەری بوون مەگەر بەم ئایینە تازەو لەسەر دەستی ئەم پێغەمبەرە تازەدا، وەك لەسەرەتای ئەم سوورەتەدا ئاماژەئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ مُنفَكِّينَ﴾ ئەوانەی کە بێبڕوابوون لە نامەدارو بت پەرست و هاوبەش بڕیاردەرانی عەرەب، وازهێنەر نەبوون لەو بارەی کەلەسەری بوون و لێی جیانەبوونەوە.

﴿حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ﴾ هەتا بۆیان هات بەڵگەو نیشانەی ڕوون کە ئەوەش ﴿رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ پێغەمبەرو ڕەوانەکراوێ لەلایەن خوا، واتە (محمد) (ﷺ) کە خۆی بەخۆی موعجیزەو بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر پێغەمبەرێتیەکەی، بێجگە لەو هەموو موعجیزانەی کە خوا پێی بەخشی کە گەورەترینی هەموو موعجیزەکانی خوا ئەم قورئانە کە وەك خۆر ئەدرەوشێتەوە هەتا هەتایە بە ئاسمانی ژیریەوە، کە ئەو پێغەمبەرەش ﴿يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ﴾ ئەخوێنێتەوە بەسەریانا چەند لاپەڕەیەکی پاك و خاوێنکراو لەهەر شتێکی ناڕاست و ناڕەوا، واتە قورئانی پیرۆز کە ﴿فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ﴾ تیایەتی چەند نامەو کتێبێکی زۆر بەنرخ ـ واتە کورتەو پاڵفتەی نامەو کتێبە ئاسمانیەکانی پێشوو ـ یا مەبەست هەر سەدو چواردە سوورەتەکەی قورئانە کە

هەرکام وەك نامەیەکی سەربەخۆ وایە، کەواتە هاتنی ئەم پەیامو پێغەمبەرێتیە زۆر بەجێو پێویست بوو، وە ڕەوانەکردنی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) لەکاتی خۆیا بوو، ناردنی ئەم قورئانە ڕووداوێك بوو کە بەبێ ئەوە ئەم زەویو جیهانە چارەسەر نەئەکرا، ئینجا ئەمەی تا چ ڕادەیەك پێویستی ئەم جیهانو زەویەبوو بەم پەیامو پێغەمبەرەو قورئانە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە ئەم چەند نموونە ڕاستانە لە کتێبی زۆر بە نرخ کە ناونەبرێ بە (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين) دانراوی مامۆستای بەرز (ابو الحسن الندوی) خوا پاداشتی بداتەوە لە فصلی یەکەم لە بابی یەکەمیا ئەفەرموێ: چەرخی شەشەمو حەوتەمەی زایینی بەلای هەموانەوە لە پەست ترین چەرخەکانی مێژوو بوو، چونکە چەند چەرخی لەوەو بەر ئادەمێتی بەرەو پەستی ئەهاتو لە پۆپەی بەرزی خۆی بەرەبەرە دائەخزاو ئەهاتە خوارەوە، لەسەر زەوی دا هێزێك نەبوو دەستی بگرێو بەرگرێ بکات لە پەستی کەوتنە ناو چاڵ، چەرخ و بەسەرهاتی ڕۆژگار هەمیشە هەر بەرەو ئەو ئەهات، ئادەمی لەو سەردەمەدا پەروەردگاری خۆی لە یاد چووبوو، بەهۆی ئەوە خۆیو چارەنووسو پاشە ڕۆژی خۆیشی لە بیرچوو، فامو ژیریی لا نەما، خێرو شەڕو چاكو خراپی جیانەئەکردەوە لە یەکتر، چەند ماوەیە لەوەوپێش دەنگی بانگو بانگەوازەکانی پێغەمبەران نزمو بوو بووو نەئەبیسترا، ئەو چرایانەی کەئەوان دایان گیرساند کوژابوونەوە بە تەواویو بە هۆی ئەو هەموو ڕووداوو بەسەرهاتە خراپانەوە کەلە پاش ئەوان پەیدابوون یا تروسکەیەکی بێهێزیان مابووەوە کە ڕووناکیان نەمابوو مەگەر بۆ هێندێ دڵو دەروون، چ جای ماڵو وڵاتو دەشتو دەر، پیاوانی ئایینی کشابوونەوە لە مەیدانی ژیانو وازیان هێنا لە بەربەرەکانی بۆ ئەمە ئاقیدەو ئایینەکەیان بردە کەنیسەو خەڵوەخانەو شوێنە چۆڵەکان بۆ ئەمەی خۆیان بپارێزنو دووچاری ناخۆشی نەیەن، یا لەبەرئەوەی بە ئارزەووی ئارامو ئاسایشیان بوو، ئەیان ویست خۆیان قوتارکەن لەدەست ئەركو زەحمەتی ژیان، لەبەرئەوەی داماوو دەستەپاچە بوون لەبەرێوە بردنی ئایینو ڕامیاریو ڕۆحو ماددەدا، ئەگەر کەمێ لەو پیاوە ئایینیانە مابنەوە لە

مەیدانا خۆیان بۆ نەگیراو یەك کەوتن لەگەڵ پادشاکان و دنیاپەرستان و یارمەتیان دان لە تاوان و خراپەکاری و داگیرکردن و خوارنی ماڵی مەردوم بە ناهەق و بە ناڕەوا...

ئایینە گەورەکان گەڕان بە نێچیری ژێردەستی تاوانباران و ئارەزوو بازان، بوون بە گاڵتەی دەستی ناپاکان و ستەمکاران، تا وایان لێهات ڕۆح و شێوە ڕاستەقینەکیان نەما، بەجۆرێ ئەگەر ئاییندارە ڕاستەقینەکانی لەوەوبەر بهاتنایەتەوە جیهان نەیان ئەناسینەوە، ئەو شوێنانەی کە شوێنی شارستانی و ڕۆشنبیری و دادو حوکمڕانی و ڕامیاری بوون، گەڕان بە جێگای بێیاسایی و تێکچوون و خراپەکاری و جەورو ستەمی کاربەدەستان، لەبارەی ڕۆح و دەروونەوە نابووت بوون، سەرچەشمەی ژیانیان ووشك بوو، بێبەش لە ئایینی ئاسمانی یاسایەکی دامەزراوی ئادەمی.

ئەم چاوپیاخشانەو دەست نیشان کردنە بە چەسپانی کورتەیەکمان نیشان ئەدا لەبارەی حاڵەتی ئادەمی و ئایینەکان پێش ڕەوانەکردنی ئەم ئایینی پێغەمبەرە (ﷺ) قورئانیش لە چەند شوێنکا دەست نیشان ئەکات بەدروشم و نیشانەکانی بێ بڕوایی و لادان لەڕێگای خوا، کە نامەدارەکان و بت پەرستەکانی داگیرکردبوو، بەرهەم و سەرەنجامی ئەو بێبڕوایی و لادانە لە ڕێگای خوا بریتی بوو لە پەستی و خراپەکاری و ئاژاوەو وێرانیەك کە هەموو ناوچەیەکی زەوی گرتەوە. بەکورتی لەو چەرخی پێش هاتنی ئیسلامەدا گەل و ئوممەتێ نەبوو لەم زەویەدا کە ڕێك و پێك بێت و دامەزرابێ لەسەر بنەڕەتی خوو ڕەوشتی پاك، وە دەوڵەت و میریەك نەبوو کەلەسەر دادو بەزەیی بەرپا بووبێ و سەرکردایەتیەك نەبوو کە لەسەر زانین و لێزانی دامەزرابێ و داڕێژرابێ، وە ئایینێکی ڕاست نەبوو کەلە پێغەمبەرانەوە هاتبێ و وەرگیرابێ، جالەبەرئەوە خوا بەزەیی هاتەوە بە ئادەمی و جیهانا بە ناردنی پێغەمبەرێ کەلەلایەن خۆیەوە کە ئەم قورئان و ئایینەی پیانارد، کە بێبڕوایانی نامەدارو بت پەرستەکان نەئەگۆڕان و لایان نەئەدا بەو بارە خراپەی کەلەسەری بوون، بەم ئایین و پێغەمبەرە نەبێ.

وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ

لەپاش ڕوونکردنەوەی بارو حاڵی بێبڕواکان بە تێکڕایی، ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر نامەدارەکان بە تایبەتی بۆ هەڕەشە لێدانو تاوانبار کردنیان، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەوانەی کە نامەیان پێدرابوو واتە زاناکانیان لەناو خۆیان بەش بەش نەبوونو جیانەبوونەوە لەیەکتر ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ﴾ دوایی ئەوەنەبێ کەبەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان بۆ هاتبوو لەلایەن پێغەمبەرەکانیانەوە، واتە ئەو بەش بەش بوونو دووبەرەکیەی کە پەیدایان کرد لەڕووی نەزانینو بێئاگایی نەبوو، بەڵکو ئاینو ڕێگا ڕاستەکەی خوایان ئەزانیو ئەناسی، ئەگەر بە پێی ئەو زانینو ناسینە ڕەفتاریان بکردایە یەك بارو یەك قسە ئەبوون، بەڵام بەو جۆرەیان نەکرد، بەڵکو هەرکام لەوانە لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیو شوێن کەوتنی ئارەزووی خۆی، ئەو هەموو دووبەرەکیەیان دروست کرد، یەکەم جار دووبەرەکی دروست بوو لەناو تیرەو بەرەکانی (یهود)دا لە پێش ڕەوانەکردنی عیسادا (علیه السلام) ئەوەبوو بەش بەش بوون بە چەند تاقمو کۆمەڵێ، لەگەڵ ئەوە کە پێغەمبەرەکەیان موسابوو وە نامەکەیان تەورات بوو، بوون بە پێنج تاقمو کۆمەڵی سەرەکی:

١- صدوقی. ٢- فریسی. ٣- ئاسی. ٤- غلات. ٥- سامری... هەرکام لەمانە نیشانەو بیروباوەڕی دیاری هەبوو، ئینجا پاش ڕەوانەکردنی عیسا دووبەرەکی کەوتە بەینی یەهودو نەصرانیەکان، لەگەڵ ئەوەی عیسا پێغەمبەر (علیه السلام) بۆ هەموو ڕەوانە کرابووو ئاینەکەی ڕێك بوو لەگەڵ تەوراتا، کەچی لەگەڵ ئەو هۆی یەکێتیو یەك باریە ئاژاوەو دووبەرەکیەکەیان گەیشتە دوژمنایەتی سەختو خوێنڕشتن، مێژوو باسی چەند کوشتنو بڕینو قەڵاچۆکردنێ ئەکات کە بەرپابوو لە بەینی ئەو دوو گەلەدا، بەڕاستی بە بیر

لێکردنەوەشیان مووچڕکە بەلەشەدا دێت، هەرکەس ئەیەوێ بەدرێژی ئاگاداربێ بەسەر ئەو ڕووداوانەدا با تەماشای کتێبە ڕاستەکانی مێژوو بکات بەتیبەتی کتێبەکانی (مقریزی).

ئینجا دووبەرەکی و ئاژاوە کەوتە ناو نەصرانیەکانیش خۆیان، لەگەڵ ئەوەی یەك نامەو پێغەمبەریان هەبوو لە یەکەم جارەوە دووبەرەکی و ئاژاوەیان لەبارەی ئاقیدەوە بوو، لەپاشان بەش بەش بوون بەچەند تاقمێکی دوژمنی خوێنڕێژ، لەناو ئەمانیشدا چەند جۆرە کوشتن و بڕین و سزادان و سووتاندن ڕوویدا کە بەباسکردنیان مووگرژ ئەبێت و پێستی لەش قرچ هەڵدێت و وێنەو نموونەی زۆر هەیە و باسکردنیان بە پێویست نازانم.

خراپترین لە هەموو شت ئەوەیە وەك لە پێشەوە باسکرا کە ئەوانە هۆی ئەو ئاژاوەو دووبەرەکیەبوون، ئەوانەی مایەی ئەو کوشتن و بڕینەبوون بێئاگا و نەزان نەبوون، بەڵکو ڕێگا و ئایینە ڕاستەکەیان بۆ ڕوون کرابووەوە، زانایانی تەفسیر چەند ڕایەکی جیاوازیان هەیە لە تەفسیری ئایەتی یەکەم و چوارەم، زۆر بەگران سەیری ئەکەن، تەنانەت (واحدی) ئەفەرموێ: ئایەتی گرانترین ئایەتە لە قورئانا، لەبەرئەوەیە بەچەند جۆرێ تەفسیر کراون، وەك باسکراون لە کتێبەکات تەفسیردا بەدرێژی، وەك تەفسیری (ڕازی) و (ڕوح المعانی)، هەرکام لەو تەفسیرانە ئەگونجێ و دەست ئەدات، ئەوەی کەلە تەفسیرەکەدایە یەکێکە لەو ڕایانەو لە دڵما پەسەندەو جێگەی باوەڕمە. ئەوانە لەبارەی ئایین و ئاقیدەوە بەوجۆرەی کە ئاماژەی بۆکرا بەش بەش بوون و تاقم تاقم لێی وەستانەوە، لەگەڵ ئەوە ئایینی خوا ڕوون و ڕەوانەو ئاقیدە شتێکی سووك و بێگرێیە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەوانە فەرمانیان پێنەدراوە لە نامەکانی خۆیانا، هەروەها لەم قورئانەشا بۆ ئەمە نەبێ کە خوا بپەرستن، بەجۆرێ ﴿مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ پاك و خاوێنکەری ئایینەکەیان بن بۆ خوا لە هەموو هاوبەش و هەموو شتێ‌تر، واتە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە گوێڕایەڵ و ملکەچ بن تەنهابۆ خوا ﴿حُنَفَآءَ﴾ لابدەن لە هەموو ئایین و بیروباوەڕێکی ترو تەنها لەسەر ئایینی خوا دامەزراو بن، ﴿وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە نوێژ بەڕێك و ڕاستی بەجێبێنن و،

وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴿٦﴾

---

**﴿وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ﴾ وه زهكات بدهن ﴿وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ﴾ ئهوهى كه باسكرا له پهرستنى خوا به پاكو خاوێنىو بىَ هيچ هاوبهشىَو لادان له ههر ئاينو شتى ترو بهجىَهێنانى نوێژ بهرێكىو زهكات دان ئهوهيه ئايينى نامهراستو بهنرخهكانى خوا، بهڵىَ بنياتو بنهڕهتو پايهى ئايينى خوا ئهمهيه: پهرستنى خوا بهتهنهاو خاوێن كردنى ئاينو ملكهچى بۆى، لادان له هاوبهش دانانو ئهوانهى هاوبهشى بڕيار ئهدهن، نوێژى رێكو ڕاستو زهكات دان...**

**كهواته ههركهس ئهم پايهو بنياتانهى بهجىَهێنا بىَگومان ئهو كهسه بڕواو ئايينى ڕاست دروستى ههيه، ئايينى خوا يهك ئايينهو ئاقيده يهك ئاقيدهيه له ههموو پهيامهكانى خواداو دهست بهدهست پێغهمبهرهكان هێنايان ـ سهلامى خوايان لێبىَ ـ بىَگومان ئهوهش شتێكى ڕوونو ڕهوانو ئاسانهو هيچ گرىَيهكى تيانيه، به هيچ ڕهنگ ئهو ئاينو ئاقيدهيه ڕێگاى بچڕانو دووبهرهكى نادات و مايهى يهكێتىو پهيوهستيه.**

**ئينجا كاتىَ كه بهڵگهى ئاشكرا هات له ئايينه پێشووهكاندا، لهپاش ئهوه بهڵگهى زۆر ڕوونو ئاشكرا هات له شێوهى پێغهمبهرێكدا كه ئهم قورئانه گهورهو پاكو خاوێنه ئهخوێنێتهوه بهسهر ههموواندا، ئاقيدهيهكى سووكو ئاسانو بىَگرىَيان بۆ ڕوون ئهكاتهوه، دواى ئهوه ئيتر ڕێگا ئاشكرايهو هيچ كهس بڕو بيانوى نامێنىَ، دواڕۆژو چارهنووسى بڕوادارو بىَبڕوا ئاشكرايه وهكو ئهفهرموىَ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بهڕاستى ئهوانهى كهله جيهانا بڕوايان نهمێنا بهم ئاينو قورئانه ﴿مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ لهنامهدارو هاوبهش بڕيارده‌ران ﴿فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ لهڕۆژى دوايى وان لهناوئاگرى دۆزهخا له كاتێكا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ﴾ ئهمێننهوه تيايا به ئێجگارىو بىَبڕانهوه، چونكه ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ﴾ ههر ئهوانه خراپترينى ههموو دروست كراوانن لهبارهى كردهوهوه، بهڵىَ بهڕاستى كردهوهى ئهوانه له ههموو كهسى تر خراپترهو**

بێبڕواییەکەیان لە هەموو بێبڕوایی یە بەد ترو ناشیرین ترە، چونکە ئەوەی کە ئەیان کرد لەڕووی نەزانینەوە نەبوو بەڵکو بەباشی پێغەمبەریان ئەناسی و ئەیانزانی پێغەمبەرێتی یەکەی ڕاستە، و بەچاوی خۆیان موعجیزەکانی پێغەمبەریان ئەبینی، چ موعجیزە زاتی‌یەکانی کە لەشەخصی خۆی هەڵ قولاً، وە چ موعجیزەکانی تری کە خوا لەسەر دەستی دەری ئەخستن، ئەوان لە پێشەوە ئەیانزانی کە پێغەمبەرێکی وا دێت، لەبەرئەوە پەیمان و بەڵێنیان دا کە هەرکات هات بڕوای پێ بێنن، لەگەڵ ئەوەدا پەیمان و بەڵێنەکەیان شکاند، سەرەڕای ئەوە بە هەموو جۆر بەرگری ئایینی خوایان ئەکردو بوون بە بەرهەڵست لە ڕێگای بڕوا هێنانی مەردوم دا، بوون بەسەر مەشق بۆ هەموو چین و تاقمەکانی پاش خۆیان و بوون بەهۆی سەرلێ تێکدان و گومڕایی زۆر لە ئادەمی تا دنیا دنیایە، بێجگە لەو هەموو شەڕو ئاژاوەو جەنگ و کوشتارەی کە کردیان دەربارەی پێغەمبەرو بڕواداران، بێجگە لەوەی نامەدارەکان نامەکەی خوایان گۆڕی و دەست کاری‌یان کرد بە ئارەزووی خۆیان.

ئینجا کاتێ بیربکەینەوە لەو هەموو کردەوە خراپانەو بەراوردیان بکەین لەگەڵ هەموو کردەوە خراپەکانی تر لەم جیهانەدا، کاتێ بەووردی ئەو بەراووردە بکەین تێ ئەگەین کە هیچ کەس ناگاتە ئەوانە تەنانەت شەیتانیش، چونکە شەیتان وەك ئەوان لە پێشەوە زانا نەبووەو بەڵێنی بڕوا هێنانی نەدا، وەك بە ئاشکرا نەکەوتە شەڕو جەنگ، هەر هەوڵ و تێکۆشان بکات بۆ گومڕا کردنی مەردوم ڕوو بەڕوو نی‌یە، بەڵکو بەنهێنی و بەخەتەرە خستنە دڵ خەریکە، ئەم ئەندازە درێژەم پێدا، چونکە ئەم ڕستەیە کراوە بەجێگای لێکۆڵینەوەو قسەو باس لەناو زانایانی تەفسیردا، گرێ کوێرەیەکی تیا دروستکراوە بەبێ ئەوەی بەتەواوی کرابێتەوە، بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە وورد بینەوە لێی هیچ گرێ‌یە نامێنێ و ڕوون ئەبێتەوە کە ئەوانەی خراپتری هەموو دروست کراوەکانی خوان و هیچ کەس پێیان ناگات لە کردەوەی خراپا، کەواتە زۆر بەجێ‌یەو پڕ بە پڕە ئەو تۆڵە سەختە بۆ ئەو خراپترینانە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

---

ئینجا بەرانبەر بەوانە لە كردەوەو پاداشتا ئەمانەن كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەڕاستی ئەوانەی كە بڕوایان هێناو كردەوە چاكەكانیان بەجێ هێنا، بێگومان پێغەمبەرمان (ﷺ) بەڵكو هەموو پێغەمبەرانی تریش ـ سەلامی خوایان لێبێ ـ یەكەمو سەردەستەن لەناوئەم كۆمەڵەبەرێزەدا كەواتەلێرەداهیچ جێگەی قسەوباس نییەكەئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ﴾ هەر ئەوانەن چاكتری هەموو دروست كراوەكانی خوا. كردەوە چاكەكان بریتی‌یە لە هەر كارو فرمانێ كە فەرمانی پێدابێ، وە بریتییە لە پەرستن‌و گوێڕایەڵی خوا لە كردەوەو لە ڕەوشت‌و كردارو لە هەموو مامەڵەیەكا سەر دەستەی ئەوانە دامەزراندن‌و ڕاگیركردنی ئایین‌وشەریعەتی خوایەلەزەویداو حوكمڕانی‌و بەجێهێنانی یاساو بڕیارەكانی خوا لەزەوی دا، هەوڵ‌و تێكۆشان لەو ڕێگایەدا، نەك بەجێهێنانی تەنها نوێژو ڕۆژوو زەكات، چونكە ئیسلام بەش بەش ناكرێ‌و هەر بەش‌و پارچەیەكی بەجێ نەهات ئیسلامی ڕاستەقینە بەجێ نایە، وە هەر ئەو كەسانەی كەبە تەواوی ئیسلام ئەگرن‌و ڕێگا ڕاستەكەی ئەدەنەبەر، تەنها ئەوانە شایانن بەم مزگێنی‌و بەڵێنە گەورەیە كە ئەفەرموێ: ﴿جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ پاداشتی ئەوانە لای پەروەردگاریانە ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ﴾ چەند بەهەشتێكە كە شوێنی نیشتەجێ ومانەوەن كە﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ڕووباروجۆگەكان دێن‌و ئەچن بەژێرو بەینیاندا.

لە كاتێكا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە ئێجگاری ﴿أَبَدٗا﴾ هەتا هەتایە بێ دواهاتن‌و بڕانەوە، ئینجا خۆشی‌و شادمانی‌یەكە ئەگەیەنێتە ئەو پەڕی ڕادەو پلەكە ئەفەرموێ: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ خوا لەوان ڕازی ئەبێ‌و ئەوانیش لە خوای خۆیان ڕازی ئەبن، چونكە بەڕاستی هیچ میهرەبانی‌و بەهرەیە ناگاتە ئەو ڕادەیە كە خوای گەورە ڕازی‌و

خۆش نوود بێ له بەندەی خۆی، ئەوە له هەموو شتێ تر زیادتر مایەی ئارامو کەشخەو شادمانی دڵه، وەك هیچ بەهرەیە ناگاتە ئەوە كە دڵو دەروون ڕازیو خۆشنوود بێ، چونكە هەموو خۆشی یەتر بەستراوە بەو ڕەزامەندیو خۆشنوودییەوە، بەڕاستی زوبانو نوسین كوڵ بەكوڵەلەحاستی ئەم بەهرە گەورەیەونازانرێ بەچ جۆروڕادەی بەرزو بڵندی ئەو بەهرەیە باس بكرێ و ڕوون بكرێتەوە!!

ئینجا دوایی باسو سوورەتەكە ئەهێنێ بەشتێ كە مایەی ئەو هەموو ئەجرو پاداشتو بەهرەیەو هۆی دەست كەوتنیانە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ﴾ ئەو پاداشتو بەهرەیە بۆ كەسێكە كەلە جیهانا ترسا بێ لە پەروەردگاری خۆی. وە سامو بیمی ئەو دڵی داگیر كردبێ بەجۆرێ پاڵی پێوەنابێ بۆ هەموو چاكەیەو بەرگری كردبێ لەلادان لەڕێگا ڕاستەكەی خوا. بێگومان هەركەس ئەو سامو ترسە لەدڵیا دامەزراو جێگیربێت بە پاكو خاوێنی خوا ئەپەرستێو هەموو كردەوەكانی تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەبێت، بە هیچ ڕەنگ نیازی غەیری خوا نابێو شەرمو ئەكاتو خەجاڵەت ئەبێ لەوەی نیازی غەیری خوا ببێ. بەڵێ بەڕاستی بە كانگاو سەرچاوەی هەموو خێرو چاكەیە. ئای چەندە ڕاستو شیرینە ئەم حەدیسە: (رأس الحكمة مخافة الله) سەرو پۆپەی هەموو كاروكردەوەیەكی ڕاستو دروست ترسانە لە خوا.

خوا بە بەزەییو میهرەبانی خۆی بەشدارمان بكاتو دڵمان پڕ بكات لەو سامو ترسە،

آمین.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله وصحبه اجمعين

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾

## سوورەتی ﴿الزلزلة﴾

## مەككەيى يە يا مەدينەيى يەو (٨) ئايەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە لە قورئان‌و لە هێندێ ڕیوایەتا مەدینەیی یە، وە مەككەیی‌یە لە هەیندێ ڕیوایەتی تر، بەڕاستی مەبستەكەی بەرەو مەككەیی یە. ئەم سوورەتە وەك بوومەلەرزەیەكی بەتین وایە بۆ دڵە بێئاگاكان، تێ خوڕین‌و بانگ لێ كردنێكی زۆر بەهێزە، دڵ ئەخاتە لەرزەو لەكوت‌و ڕێكا حیساب‌و پرسیارو تۆڵەو پاداشت ئەهێنێتە بەرچاوی، چەند ڕووداوو بەسەرهاتێكی سامناك نیشان ئەدا كە دڵی بێدارو وریا خۆی بۆ ناگیرێ لە حاستیان ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا﴾ كاتێ كەزەوی ئەهێنرێتە لەرزەو جوڵە جوڵی پێ‌ئەكرێ بە لەرزەو جوڵاندنە تایبەتی‌یەكەی خۆی كە بەجارێ هەموو دەروو ناوی ئەگرێتەوە. دیارە ئەمە لەو كاتەدا ڕوو ئەدات كە ئەفەرموێ: ﴿وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا﴾ وە زەوی هەرچی شتە قورس‌و گرانەكانی خۆی هەیە كەلە ناویایە دەری دانە دەرەوەو فڕێی دان، لە كان‌و غەزنەو هەموو شتەكانی تر كە هەڵی گرتبوون چەند چەرخ ماوەی دوورو درێژە.

بەڕاستی شێوە و بەسەرهاتێكی زۆر سامناكەو مەردوم سەرسام‌و سەرگەردان ئەكات‌و هەركەس لەبەر خۆیەوە ئەڵێ: ئای هاوار ئەمە چی‌یەو بۆچ وای لێ هات، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا﴾ وە ئادەمی لەو ڕۆژەدا ئەڵێ: ئەوە چی بوو بۆ زەوی وای بەسەرهات؟ چی ئەم زەویەی وا لێكرد؟ ئەم شێوە پرسیارە هینی كەسێكە كە سەرگەردانی سەر لێ تێك چووە كە لە ناكاو شتێ ببینێ كە نەیدیوە، وە دووچاری شتێ ببێ كە بە دڵیا گوزەری نەكردووە.

يَوْمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٖ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتٗا لِّيُرَوْاْ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾

بەڵێ مەردوم لە جیهانا بوومەلەرزەی گەورەو سەختی دیوە، وە بە هۆی ئەوە بیمو ترسو داچڵەکانو دڵە لەرزەی بەسەر هاتووە، وێران بوونو ئاوارەییو مردنو لەناوچوونی دیوە، بەڵام کاتێ بومەلەرزە هەرە گەورە دەبینێ هیچ کام لەو بەسەرهاتانەی جیهانی لەبیر نامێنێو هیچ کام لە حاستی ئەو چاو نادەنو وێنەی ئەو نین، بەڵکو ئەوە شتێکی تازەی یەکەم جارە ڕوو دەدات!!

﴿يَوْمَئِذٖ﴾ لەو ڕۆژەدا کە ئەو بەسەرهاتو ڕووداوانە بەدی دێن ﴿تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾زەوی دەنگو باسو هەواڵەکانی خۆی باس ئەکاتو ئەیانگێڕێتەوە، واتە دەنگو باسو هەواڵی ئەو بەسەرهاتانەیو هۆی بەدی هاتنیان، یا هەواڵی هەر کردەوەیەکی چاك کە ئادەمی کردوونی بەسەر پشتیەوە، هەرکام مەبەست بێت ئەو هەواڵدانە لە خۆیەوە نییە، بەڵکو ﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا﴾ بەهۆی ئەوەوەیە کە پەروەردگارت سروشی بۆ کردووەو فەرمانی پێداوە بەو هەواڵدانە. ئەو هەواڵدانە بەزوبانی حاڵبێت بەم ڕەنگە چەند نیشانەو دروشمێکی تیا فەراهەم ئەهێنێ کە ئەو هەواڵانەی لێ وەرگیرێ، وەکو هێندی لە زانایان ئەڵێن، یا هەر بە گفتوگۆ، بەم ڕەنگە خوا بیهێنێتە زوبانو ئەو هەواڵانە بدات، وەکو کۆمەڵو زۆربە ئەفەرموون، وە بەڕاستی هیچ پاڵ پێوەنەرێ نىیە بۆ لادان لە دیمەنو ڕواڵەتی هەر ئایەتێ یا حەدیسێك بەوێنەی ئەم ئەم حەدیسەی کە لێرەدا هاتووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، کە حەدیسێکی حەسەنو صەحیحەو (ئیمامی ئەحمەد)و (تیرمزی) ئەیهێنن لە (ئەبو هورەیرە) وە کە ئەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند لەپاشا فەرمووی: ئەزانن هەواڵەکانی زەوی چییە؟ ئەوانیش وتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، ئەویش فەرمووی هەواڵەکانی ئەمەیە شایەتی ئەدات لەسەر هەر پیاوو ئافرەتێ بەهەر کردەوەیەك کەکردوویەتی بەسەر پشتیەوە، ئەڵێ: فلان ئەو کردەوەی کرد لە فلان ڕۆژدا.

بەڵێ بەڕاستی زۆر نارەواو ناڕێکە لادانی ئەم جۆرە ئایەتو حەدیسانە لەدیمەنو ڕواڵەتی، کە ئەو لادانەش بەبێ ڕابەرو بەڵگەیەم دروست نىیە لای کۆڕو کۆمەڵی زانایان، چونکە بۆ خوا چی تێئەچێ ئەم هەموو داروبەردە بهێنێتە زوبان؟ ئایا ئەو کەسەی کە قسە ئەکاتوزوباندارە بە خۆیو کەرەسەو کۆئەندامی قسەکردنەکەیەوە لە خاك دروست نەکراوە؟

بەڕاستی بەلامەوە زۆر نارێکە سەرکردنەوە لەم جۆرە شتانە، هەر لەبەرئەوە پێچەوانەی باوەڕیێمەوێنەیمان نەدیوەبەتایبەتی لەم چەرخەداکەئەم هەمووتەسجیلو فیلمی تەلەفزیۆنو سینەما ئەبینین و ئەو هەموو قسەو باسەیان لێ ئەبیستین. ئەو ڕۆژەی کەئەم ڕووداوانەی تیا بەدی دێت ڕۆژی دواییە کە لە وێران بوونی ئەم جیهانەوە دەست پێئەکات ئیتر بەبێ بڕانەوەو دواهاتن، کەواتە ئەم ڕووداوانە وێنەیان لە هەرکاتێکا ڕوویدەن پاش وێران بوونی ئەم جیهانە شتێکی ڕاستە لەو ڕۆژە درێژەدا ڕوویان داوە، ئیتر لەسەرەتاو نزیکی وێران بوون بن یان ماوەیەکی پێچووبێت وە کاتی ڕووداوەکان نزیك بن لەیەکەوە یا زۆر دووربن.

﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا﴾ لەو ڕۆژە دا هەموو ئادەمی لە گۆڕەکانیان دەرئەچن بە پشێوی‌و پرژو بڵاوی یا بەچەند تاقم‌و کۆمەڵێکی جیاواز ﴿لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ﴾ بۆئەمەی کردەوەکانیان نیشان بدرێ، ئیتر ئەو نیشان دانە بەوە بێت هەموو کردەوەکانیان بە نوسراوی ببینن بە درێژی لەنامەو دەفتەری کردەوەکانیا، وەك لە چەند ئایەتی ترا ئەفەرموێ کە ئەو نامەیان نیشان ئەدرێ، یا نیشان بدرێن لە شێوەی تەسجیل‌و فیلمەکانی ئەمڕۆدا، یا بەهەر جۆرو شێوەیەتر کە خوا ئەیزانێ، بە هەر کام‌و بەهەر جۆر مەبەست بێت ئەو نیشان دانە شتێکی ئێجگار سامناك‌و ناهەموارە بۆ تاوانبار، چونکە هۆی تۆڵەو سزاکەیان ئەبینن‌و هەر لەپێشەوە ئەو دیتنە ئەبێ بە سیخێکی ژەهراوی‌و ئەچێ بە بەنۆکەی دڵیا، کاتێ کە بیریان لێ ئەکاتەوەو ئەزانێ بەدەستی خۆی خۆی بەد بەخت‌و شەرمەزار کرد، بە تایبەتی هێندێ کردەوە هەیە ئەوەندە پیس‌و قیزەونە هەر لە جیهانا حەز ئەکات بمرێ کەس بەوەی نەزانێ، جا وەرە ئەو کردەوە خراپە دەرخرێ‌و ئاشکرا بکرێ لە بەردەم دادگای گەورەو لە حزوری خواداو لەبەرچاوی هەموو ئادەمی‌و جنۆکەو مەلائیکە!! خوا پەنامان بدات‌و ئەو شەرمەزاریەمان بەسەر نەهێنێ بەلووتف‌و میهرەبانی خۆی ـ آمین ـ.

بەڕاستی تەنها ئەو نیشان دانە تۆڵەو سزایەکی زۆر سەختە چ جای ئەو حساب‌و پرسیارە سەخت‌و سامناکە کە دێت بەدوای ئەم نیشان دانەدا، ئیتر با بوەستێ تۆڵە لێ سەندن‌و سزا دان بە ئاگری دۆزەخ!! هەروەها نیشان دانی چاکەی بڕوادارانیش پێش خستنی هۆی خۆشی‌و کامەرانی‌یەو زیادە پاداشتێکە، هەرچۆن نیشان دانی خراپەکانی جۆرە تۆڵەیەکەو لەوانەیە ئەو نیشان دان‌و شەرمەزارکردنە ببێ بە تۆڵەو ئیتر خوا لێی ببورێ، وەکو لە چەند ڕیوایەتی حەدیسەوە وەرئەگیرێ، هەروەها نیشان دانی چاکەی بێ بڕواو بێبەش کردن لە پاداشت زیادە سزایەکی دەروونییە کە شایستەن بۆی.

ئینجا ڕوونی ئەکاتەوە کەئەو نیشان دانە بە شێوەیەکی گشتی تەواوەو هیچ کردەوەیە نىیە نیشان نەدرێ، ئەفەرموێ: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ﴾ ئینجا هەرکەس ـ بڕوادارو بێبڕوا ـ بەقەد کێش و قورسی هەر ووردیلەیەك چاکە بکات لە جیهانا ئەیبینێ لەو ڕۆژە دا، ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ﴾ هەروەها هەرکەس بەقەد کێش و قورسی هەر ووردیلەیەك خراپە بکات ئەیبینێ لەو ڕۆژەدا، ووتەی ﴿ذَرَّةٍ﴾ زانایانی تەفسیر لەمەوبەر بە سێ جۆر ڕاڤەیان کردۆتەوە: مێشوولە، مێرووله زۆر ووردەکان کە بەحاڵ ئەبینرێن، ئەو شتە ووردیلکانەی کەلەناو ڕووناکی خۆردا ئەبینرێن کاتێ لە کون و دەلاقەیەکەوە بێتە ناو هۆدەو ژوورێك... لەمەوپێش ئەوانە بچووکترین شت بوون کە وەرئەگێران لەو ووتەیە... بەڵام ئەمڕۆ ئەزانین کە ئەو ووتەیە ناوە بۆ شتێکی دیاری کە زۆر زۆر بچووکترە لەو ووردیلکانەی کەلەناو ڕووناکی خۆردا ئەبینرێن، چونکە ئەم ووردیلکانە بەچاوی ڕووت ئەبینرێن، بەڵام ئەمەی کە ئێستا پێی ئەوترێ ﴿ذَرَّةٍ﴾ ئەتۆم بە هیچ جۆرێ نابینرێ تەنانەت گەورەترین ووردبین، هیچ کەس تا ئێستا نەی دیتووە بەڵکو نیشانەو دروشمەکانی ئەبینین!!

جا لێرەدا ئەمە بکرێ بە مەبەست تەفسیری چاکترو ڕێکترەو لەگەڵ دادپەروەری خوادا گونجاوترە لەبەرئەوە لە دڵدا جێگیرترە، کەواتە هەر کردەوەیەك چاك بێت یان خراپ بابەقەد ئەو ئەتۆمەبێت یا بچووکتر هەموو ئەوانە ئامادەئەکرێن و نیشانی خاوەنی کردەوە ئەدرێن و پرسیارو حسابی لەگەڵ ئەکرێ و بەپێی خۆی پاداشت و تۆڵەی هەیە، ئیتر پاداشت و تۆڵەکەی لێرە وەرگیرابێ یا لەوێ وەرگیرێ، هەرکات ئەم ئایەتە وێنەی لە دڵا جێگیربووو دڵ ڕەنگی گرت پێی ئەو کاتە هیچ کردەوەیەك بەسووك و بێنرخ سەیر ناکات وە نالێ: فلان کردەوە بچووکەو هیچ حسابێکی بۆ ناکرێ، بەڵکو بە پەرۆشەوە پەلاماری هەر چاکەیەك ئەدا کە بۆی هەڵکەوێ، وە کە ئەکەوێتە دڵە لەرزە لەبەر هەر گوناهێ کە کردبێتی چونکە ئەزانێ تەرازووی دادی خوا هیچ شتێ بەجێ ناهێڵێ و هەموو شتێکی پێ ئەکێشرێ، ئەو تەرازووە

لە دڵی ئەو بڕوادارانەدا دائەمەزرێ و جێگیری ئەبێ، بەهۆی ئەوەوە هەموو کردەوەیەك کاری لێ ئەکات و بەهەر کردەوە سووك یا قورس ئەبێتەوە. بەڵام چەند دڵێ هەن مردوون و ناکەونە جووڵەو لەخشە بەهیچ کردەوەیەکی خراپ بابە قەد گەورەترین شاخ و کێو گەورەبێت. وە بەژێر پێکردنی هیچ چاکەیەك تێك ناچن و ترس و بیمیان نییە. با ئەو چاکەیە لە هەموو کێوەکانی دنیا گەورە تربێت!

زۆر لە زانایانی تەفسیر ئەفەرموون: مەبەست بە پیشاندان و بینینی کردەوەکان، پیشان دان و دیتنی تۆڵەو پاداشتەکەیانە. ئینجا ئەو حەلە گرێ و ئیشکالاّ دێتە رێیان، کەبە پێی ئەو تەفسیرە ئەبێ هەموو بێبڕوایەك سوود وەرگرێ لە کردەوەی چاکی. وەئەبێ هەموو بڕوادارێك تۆڵەی کردەوەی خراپی بدرێ. بێگومان ئەم دوو شتە دژو پێچەوانەی ئایەت و حەدیس و بڕیاری زانایانی ئیسلامن. جا لەبەرئەوە ئەوانەی کە تەفسیریان بەو جۆرە کردووەتەوە ناچاربوون بە چەند وەڵام و پینەو پەڕۆیە بۆ کردنەوەی ئەو گرێیەو نەهیچشتنی ئەو ئیشکالە گەورەیە، هیچ کام لەو وەڵام و پینەو پەڕۆیانە دڵنیاکەر نین و ئارام نادەن بەدڵ، وە هەموویان لادانن لە دیمەن و ڕوواڵەت بەبێ هۆو پاڵپێوەنەرێ، هەرچۆنێ ئەصڵی تەفسیرەکەش لادانە دیمەن و ڕوواڵەت، بەڵام بەو جۆرەی کەلەم تەفسیرەدا ووتمان نەلادانە لە ڕوواڵەت و دیمەن وە نەهیچ گرێ و ئیشکالێ پەیدائەبێ.

بەڕاستی لە خۆمەوە چەند ساڵە لە دڵمان هەر ئەم تەفسیرەم بەدڵ بووە کە لێرەدایە، بەڵام زاتم نەبوو لە خۆمەوە بڵێم تا لەکاتی تەفسیری ئەم سوورەتەدا ـ سوپاس بۆ خوا ـ بینیم لە تەفسیرە گەورەکاندا کە بەم جۆرە تەفسیر کراوەتەوە، تەنانەت (ئیمامی ڕازی) ئەفەرموێ: ئەمە ڕای (ئیبن عەباس)ە -خوا لێیان ڕازی بێ- ئینجا بەهۆی ئەوە بێترس و بێباك بەو جۆرە تەفسیرم کردەوەو ئومێدەوارم کە ڕێم کەوتبێ لە ناوەڕاستی ڕێگای ڕاست.

وصلى الله وسلم على سيد القادة وقائد السادة محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾

## سووره‌تی ﴿العاديات﴾
## مه‌ككه‌ییه‌و (١١) ئایه‌ته

## بسم الله الرحمن الرحيم

خوای گه‌وره سوێند ئه‌خوات به ئه‌سپ و ووڵاخی سواری كاتێ ئه‌خرێته جه‌نگه‌وه‌و كارو بزوتنه‌وه‌كانی له‌م باره‌یه‌وه باس ئه‌كات، یه‌ك له‌دوای یه‌ك.

ئه‌فه‌رموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا﴾ سوێند به‌و ئه‌سپ و ووڵاخانه‌ی كه چه‌سپان و تاو ده‌رن به پیشكه‌و پرمه‌وه. ﴿فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا﴾ئینجا ده‌رهێنه‌ری پزیسكه‌و چه‌خماخه‌ن له‌به‌ردی ژێرپێیان له‌كاتێكدا كه‌به سم و ناڵ و بزماره‌كانیان لێی ئه‌ده‌ن. ﴿فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا﴾ ئینجاهه‌ڵمه‌ت ده‌رن بۆسه‌ر دوژمن له‌ناكاودا به شه‌به‌یخون ئه‌ده‌ن به‌سه‌ریا له‌به‌ره‌به‌یانا ﴿فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا﴾به‌هۆی ئه‌وه‌ته‌پ و تۆزیان هه‌ڵسان له به‌یانیدا ﴿فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا﴾ ئینجا له‌وكاته‌دا چوونه ناوجه‌رگه‌ی كۆمه‌ڵی دوژمن.

ئه‌وانه‌ی كه‌یه‌كه‌م جار ئه‌م قورئانه‌یان بیست به‌م شێوه‌یه په‌لاماری دوژمنیان ئه‌داو جه‌نگیان له‌گه‌ڵ ئه‌كرد، وه ئه‌و شێوه‌یه شتێكی ناسراوبوو لێیان. جا سوێند خواردن به ئه‌سپ و ووڵاخی سواری له‌م چوارچێوه‌دا، هه‌ستی بزوتنه‌وه‌و چالاكی و سوارچاكی ئه‌خاته دڵی مه‌ردوم و تێی ئه‌گه‌یه‌نێ كه موسڵمان ئه‌بێ هه‌میشه ئاماده‌و ووریا و ئازاو مه‌ردی مه‌یدان بێت، سه‌ر دانه‌خات بۆ سته‌م و ناڕه‌وایی وه هه‌میشه له‌سه‌ر چز بن بۆ هه‌ركه‌س كه بیه‌وێ ده‌ست درێژیان لێ بكات و مافیان ژێرپێ بخات، خوای گه‌وره به‌و ئه‌سپ و ووڵاخانه سوێندی خواردو سوێند له‌سه‌ر خوراوه‌كه‌ی باروحاڵه‌تێكی ناڕاست و ده‌روونی‌یه بۆ ئاده‌می كاتێ كه دڵی بۆش و خاڵی له بڕوای به‌هێزو پیت و فه‌ڕو به‌رهه‌می بڕوای به‌هێز، سوێند ئه‌خوات له‌سه‌ر ئه‌و بارو حاڵه‌ته تا مه‌ردی موسڵمان ڕاپه‌ڕێ و هێزو ووزه‌ی خۆی بخاته كار بۆ به‌رگری ئه‌و بارو حاڵه‌ته ناڕاست و ناڕه‌وایه،

ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ﴾ بەڕاسـتی ئـادەمی زۆر سـپڵەو ناسوپاسـە بـۆ پەروەردگاری خۆی، وە دان نانێ بەو هەموو چاکەو بەهرە گەورە گەورانەی کەڕشتوویە بەسەریا، وە ئەو بارو حاڵەتە ناپەسەندەی دەرئەکەوێ لە قسەو کردەوەکانی‌یەوە بەم ڕەنگە ووتارو کرداری دژو پێچەوانەی فەرمان و ڕەزامەندی خوایە، کەواتە وەك خۆی شایەت بێت لەسەر خۆی و بە دژی خۆی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ وە بەڕاستی ئادەمی شایەتە لەسەر ئەو سپڵەیی و ناسوپاسیەی، یا بەڕاستی لە ڕۆژی دوایی دا خۆی دان ئەنێ بەو شتە ڕاستەداو شایەتی ئەدا لە خۆی ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾ وە بەڕاستی ئەو زۆر بەتین و بەهێزە لە خۆشویستنی ماڵ و خێرو خۆشیدا بۆ خۆی، چونکە زۆر خۆشەویستەو هەر خۆی ئەوێ و ئیتر گوێی لە کەسی تر نی‌یە.

ئادەمی بەسروشت بەو جۆرەیە مەگەر بڕوای ڕاستەقینە جێگیرو دامەزراو ببێ لە دڵیان، ئەو حەلە ئەو بڕوایە سروشتی ئەگۆڕێ و ئەیکات بە کەسێکی تر، بەم ڕەنگە سپڵەیی و ناسوپاسییەکەی ئەگۆڕێ بە سوپاس و چاولەبەری بۆ خوای خۆی وە چرووکی و خۆپەرستیەکەی ئەگۆڕێ بە بەزەیی و دەست و دڵ گوشادی و باودانی مەردوم بەسەر خۆیا، ئەو شتانەی نیشان ئەدات کە شایستەن و شایانن بۆ هەوڵدان و دڵ پێوەبەستن و بە گرنگ گرتن، ئەو شتانەی نیشان ئەدات کە مەدرومی پێ ئەبێ بە مەردی مەردانە لەمەیدان و ئادەمیەکی بەرزی بەڕێز، نەك ئەو شتانەی کە گیان لەبەرانی تر هاوبەشی ئەکەن تیایا و بەگرنگ گرتنیان ئادەمی لەپلەی بەرزی ئەهێننەخوارەوە بۆ ڕادەی چوارپێ و گیان لەبەرانیتر.

ئادەمی ـ بەبێ ئەو بڕوایەـ زۆر بچووك و پەستە، لەناو چاڵ و زەلکاوی ئەم زەوی‌یەدا ئەژی، بەستراوە بە جیهان و ژیانێکی تەنگ و تەسکەوەو بەتەمەنێکی کەم و کورتەوە، وەبەند کراوی خۆیەتی، هیچ شتێ بەرەڵای ناکات و لەچاڵ دەری ناهێنێ و سەری بەرز ناکاتەوە بێجگەلە پەیوەستی و پەوەندی بە جیهانێکی تر کە گەورەترو بەرزتربێت لەم جیهان و زەوی‌یە، وە دووربێت لەزیانی ئەم جیهانەو گەورەترو بەڕێزتر بێت لەخۆی‌ولەهەرچی والەم جیهانەدا. ئەوجیهانەگەورەوبەرزوبەڕێزە جیهانێکە کەدەست کردی خوای بێ سەرەتایە، وەئەگەڕێتەوە بۆلای خوای دوانەهاتوو، وە هەر دوو جیهان یەك ئەگرن تیایا بەبێ کۆتایی و دواهاتن.

﴿ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ ﴿٩﴾ وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ﴿١١﴾

**جالەبەرئەوەی کە ئادەمی بەو جۆرەیە ئەوا سەرنجی ڕائەکێشێ و هەڕەشەی لێ ئەکات، بۆ چارەسەر کردنی ئەو نیازو کردەوە خراپانەی ئەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ ﴿٩﴾ وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ ﴾ واتە ئایا ئەو ئادەمیە سپڵەیە کە باسکرا نازانێ کاتێ ئەو مردوانەی کە وان لەناو گۆڕەکانا زیندوو کرانەوەو دەرهێنران، وە ئاشکرا کرا ئەو ڕازو نیازەی کەلە دڵەکانایە، ئەو ئادەمییە نازانێ کە ﴿إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری ئەوان لەو ڕۆژە دا ئاگادارو زانایە بەوان و بە هەموو نیازو کردەوەیەکی ئەوان، واتە با ئەوانە بترسن لە تۆڵەی خوا لەو ڕۆژە دا لەسەر ئەو نیازو کردەوە خراپانەیان بەهۆی ئەو بیم و ترسەوە کۆتایی بێنن لە بەد نیازی کردەوەی خراپ[1]، بێگومان خوا لە هەموو کات و ڕۆژێکا زاناو ئاگایە بە هەموو شتێ، بەڵام زانینی ئەو ڕۆژە بەرو بەرهەمی هەیە حیساب و پرسیارو تۆڵەو پاداشتی بەدوادا دێت، کە مەبەست ئاماژەکردنە بۆ ئەوەو ترساندن و هەڕەشەیە پێی، خوا بە بەزەیی خۆی بیم و ترسی ئەو ڕۆژە لەدڵمانا جێگیربکات، بەجۆرێ بمان گێڕێتەوە لە خراپەو ڕوومان بکاتە چاکە ـ ئامین ـ.**

**وصلى الله وسلم على محمد وآله وصحبه**

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە ﴿يَعْلَمُ﴾ تەعلیق کراوە بەڕستەی ﴿إِنَّ رَبَّهُم﴾ەوەو ئەو ڕستەیە جێگری (مفعول)ە کانیەتی وە زۆریە لەسەر ئەوەیە کە ئەو ڕستەیە سەربەخۆیەو (مفعول)ی (يَعْلَمُ) لابراوە تا دەست نیشان بێت بەوەی کە تەنها بوونی زانین بەسە بۆ داچڵەکانی دڵ و کۆتایی هێنان، ئینجا دڵ بەرەڵا نەبێت بۆ دۆزینەوەی هەر شتێ کە دەست بدا بۆ ئەوەی بکرێ بە (مفعول)ی، بەهەر دوو بار ڕێکەو هەر مەبەستەکە وەرئەگیرێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ﴿٤﴾

---

## سوورەتی ﴿القارعة﴾
## مەککەییەو (١١) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە چەند ڕووداوو بەسەرهاتێکی سامناک نیشان دەدات کە ڕوو ئەکەنە ئەم جیهانەو هەندێ لەوانەی کە تیا ئەچن ئادەمی و کێوەکانە، لە یەکەم جارەوە دەست پێ ئەکات بەناوێ لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی کە هەر بە ئاوازو دەنگی پیتەکانی دڵ دائەچڵەکێنێ، هەرچۆنێ بەماناکەشی دەنگی لێدان وتەقەو شاخەو شریخە ئەدا بە گوێچکەدا تا ڕادەیەک دڵی بێدار ئەخاتە خورپەو داچڵەکان، ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * ٱلۡقَارِعَةُ﴾ ئەو ڕۆژی دواییەی کە بە شاخەو شریخەی دڵ ئەخاتە لەرزەو دایئەچڵەکێنێ.

ئینجا بەدوای ئەو وتەیەدا پرسیارێ ئەمێنێ کە گەورەیی و سامناکی ئەو ڕۆژە دەرئەخات، ئەفەرموێ: ﴿مَا ٱلۡقَارِعَةُ﴾ ئایا چیی ئەو ڕۆژەی کە ناوبراوە بەو ناوە بەسامە؟ ئاخۆ ئەو ڕۆژە چی بێت؟ ئینجا لەباتی وەڵامی ئەو پرسیارە پرسیارێ تر ئاراستە ئەکات کە گەورەترو سامناک تری ئەکات لە دەروونا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ﴾ ئایا چی تۆی زانا کرد کە چیە ئەو ڕۆژە؟ واتە تۆ چوزانی، چونکە ئەو ڕۆژە گەورەترە لەوەی کە زانین و بۆچوونی کەس پیایا بگات!!

ئینجا ئەو ڕۆژە نزیک ئەخاتەوە لە تێگەیشتنمانەوە بەباسی هێندێ لە ڕووداوو بەسەرهاتەکانی، ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ﴾ باسی ئەو ڕۆژە بکە کە ئادەمی وەک پەپوولەی پەرش و بڵاو کراوە وان، لە زۆریی بێ ئارامی و سەرگەردانی و بەیەکاچوونا، نازانن چی بکەن و بۆ کوێ بچن و چیان بەسەر دێت؟

وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى
عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ
مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾

---

﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ﴾ وە شاخەکان و کێوەکان وەك خوری شی کراوەیان لێ دێ: خوری ڕەنگاوڕەنگ، بە پێی جیاوازی ڕەنگی شاخەکان بەجارێ تێکەڵ ئەبن، ئەمە یەکەم شێوەو چەشمەندازێکی ئەو ڕۆژەیە کە لێرەدا نیشانی ئەدات، بە ڕاستی ئەوەندە سەخت و بەسامە مافی ئەوەی هەیە بە بیرلێکردنەوەی دڵ دەست بکات بە تەپەتەپ و لەش موچرکەی پیا بێت و دەمارەکان بکەونە لەرزەو تیکە لە گەروودا بگیرێ! ئینجا دواڕۆژو چارەنووسی مەردوم باس ئەکات لەو ڕۆژەدا، ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ ئینجا ئەو کەسەی کە کردەوە کێشراوەکانی قورس و سەنگین و بەنرخ بن ﴿فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ ئەو کەسە لە گوزەران و نۆش و خۆشییەکانە کە خۆی پێی ڕازییەو پەسەندی ئەکات ﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ وە ئەو کەسەی کێشراوەکانی سووك بێت بەم ڕەنگە چاکەی هەر نەبێ، یا ئەگەر بوبێتی لای خوا بێنرخ بن ﴿فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ﴾ دایکی ئەو کەسە ﴿هَاوِيَةٌ﴾یە، واتە جێ و شوێنی ئەوەیە، وە ناوبردنی بە دایك کە هۆی ئارام و حەسانەوەیەو جێی پەناو ڕازونیازە، لاقرتی پێکردنی لێ وەرئەگیرێ کە ئەوەش سزایەکی سەختی دەروونی تیایە، ئینجا بە پێی باوی خۆی ئەم شێوە پرسیارە ئاراستە ئەکات بۆ سام و بیم و خستنە دەروون، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ﴾ تۆ چووزانی ﴿هَاوِيَةٌ﴾ چییە؟ واتە لە بۆچوون و تێگەیشتنی تۆ بەدەرە.

ئینجا ئەوا خۆی وەڵام ئەداتەوەو ئەو دایکەیان بۆ باس ئەکات ئەفەرموێ: ﴿نَارٌ حَامِيَةٌۢ﴾ ئەو (هَاوِيَةٌ) ئاگرێکی بڵێسەداری هەڵگیرساوە. خوا پەنامان بدات لێی ـ آمین ـ.

بێ‌گومان لە چەند ئایەت‌و حەدیسا هەیە باسی ئەم کێشانەو قورس‌و سوکی کردەوەی مەردومە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەوەی پێویست بێت لەسەر بڕوادار لەم شتە غەیبانەدا ئەوەیە کە بڕوای هەبێ پێیان لەسەر ئەو بارو شێوەیە کە مەبەستێ لای خواو پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر بەبێ سەر لێکردنەوەو لێکۆڵینەوە کە هیچ سوودی لێ وەرناگیرێ بێجگە لە ئاژاوەو دووبەرەکی، کەواتە پێویستە لەسەرمان بڕوامان هەبێ کە خوا لە ڕۆژی دوایی دا کەم‌و زۆریی‌و ڕێزو بێ‌نرخیی کردەوەکان ئاشکرا ئەکات ئیتر بە هەر جۆرە کە خۆی ئەیزانێ‌و بڕیاری لەسەر داوە، وە نابێ هیچ سەربکەینەوە لەوە بە تایبەتی لەم چەرخەدا کە خوا ڕێی بەندەکانی خست لە چەند جۆرە تەرازوویە بۆ کێشانەی قورسی‌و سووکی‌و تەڕی‌و وشکی، ساردی‌و گەرمی‌و، بەرزی‌و نزمی‌و، سستی‌و خێرایی... کە کێشانەی ئەم جۆرە شتانە بە خەویش بەدڵی کەسا گوزەری نەئەکرد، کەواتە با هیچ نەبێ تەرازووی کردەوەکانیش دابنرێ بە جۆرێکی تایبەتی وەک ئەم تەرازووانەی ئێستا.

وصلى الله وسلم على سيدنا ومولانا محمد وآله وصحبه

# سوورەتی «التكاثر»
## مەككەییەو (٨) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە دەنگ‌و ئاوازێكی تایبەتی هەیە، وەك دەنگی ترسێنەرێك كە بەجێگایەكی بەرزەوە وەستابێت‌و بەدەنگێكی بەرزی درێژ بانگ بكات‌و بخورێتە چەند كەسێكی بێئاگای خەوتوو بەسەر لێواری چاڵێكی زۆر قەڵەوە، بانگیان لێ ئەكات بۆ ئەمەی بێداربېنەوەو نەكەونە ناو چاڵكە.

بێگومان ئەم ژیانی جیهانە قۆناغێكە لە قۆناغەكانی ئادەمی‌و كاتی كردەوەو تاقی كردنەوەیەتی، كاتی ئەوەیە هەركەس خوا پێداوبێ لێرە توێشوو هەڵگرێ بۆ دواترین قۆناغ‌و پلەی ئادەمی‌و بۆ ژیانی دوانەهاتوو و نەبڕاوەی، كەواتە هەركەس ژیرو فامداربێ ئەم ژیانە كورتە ناكات بە ئامانجی هەرە گەورەو مەبەستی سەرەكی، بەڵكو خەریك ئەبێ پێیەوەو تێكۆشانی بۆ ئەكات بەجۆرێكی شایستەو لە سنووری ڕاست‌و ڕەوای خۆیا، بەڵام هەموو ئادەمی لەسەر ئەم ڕێگاو بارە ڕاستە نەوەستا، بەڵكو هەر لە كۆنەوە تائێستاش‌و لەمەولاش زۆر بەلاڕێی گرتووەو ئەیگرێ، بەتەواوی خۆیان ئەدەن بەدەم ئەو ژیانە كورت‌و خەڵەتێنەرەوە، هەموو هەوڵ‌و تێكۆشان‌و مەبەستێكیان ئەبەستن پێیەوە، هەمیشە چاویان بڕیوەتە ئەوە تا بەهەرجۆر بووە ئەم ژیانەیان بەرز بكەنەوەو هەركەس لەوانە ئاواتی ئەوەیە ساماندارو دەوڵەمەندتر بێت لە هاوسەرانی‌و شانازی ئەكات بە زۆری ماڵ‌و سامان‌و ئەولادو كەس‌و كارەوە، لە ژیانیا هەر خەریكە بەو جۆرە شتانەوە تا هۆشی بەلای خۆیەوە نامێنێ‌و ئەكەوێتە ناو ژاڵی بەد بەختی‌و بێبەشیەوەو ئامانج‌و مەبەستی ڕاستەقینەی لەدەست دەرئەچێ، جالەبەرئەوە ئایینی پاكی ئیسلام هەمیشە بانگ ئەكاتە ئەو بێهۆشانەو ڕێگایان بۆ ڕووناك ئەكاتەوەو ئەیان ترسێنێ لەو شتانەی كە هۆی بەد بەختی‌و بەش بڕاویانن وە ئەم سوورەتە یەكێكە لەو بانگ كەرو ڕێگا ڕووناك كەرو ترسێنەرانە،

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ



**ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ ئێوەی خەریكو بێئاگاكرد لە یادی خواو بیركردنەوەتان لە پاشە ڕۆژ، شانازیكردنتان بە زۆری ماڵو دارایی ئەولادو كەسو كارەوە ﴿حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ﴾[1] هەتا مردنو چوونە ناو گۆڕەكانتانەوە بەبێ پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە، واتە هەموو ئاوات ئامانجتان ئەوەیە كەلەیەكتر زیاتر بنو شانازی پێوەبكەن بەسەر یەكترا ئەی بێهۆشو سەرخۆشەكان، ئەی ئەوانەی شانازی ئەكەن بەو شتانەی كە بەجێی ئەهێڵن، ئەی خەڵەتاوەكان بەو ژیانە كەمو كورتەی كە وان تیایا، ئەی ئەوانە كە بە ماوەیەكی كەم ئەوانە بەجێئەهێڵن كە شانازیان پێوە ئەكەن، وەئەچنە ناو گۆڕێكی تەنگو تاریك كە شانازی تیانییە. بێداربینەوەو هۆش بكەنەوە پێش ئەوەی بكەونە ئەو چاڵە تەنگو تاریكەو هەموو هەڵێكتان لەدەست دەرچێ.**

**ئینجا تێیان ئەخوڕێ دڵیان دائەچڵەكێنێ بەو بیمو سزاو ترسە كە بەرەو ڕووی ئەچنو دووچاریان ئەبێ لەپاش مردن، ئەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ وازبێننو كۆتایی بێنن لەو خەریك بوونە، كار بەو جۆرە نییە كە ئێوە گومان ئەبەن ﴿سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ لەمەولا ئەزانن كە چیتان بەسەر دێت ﴿ثُمَّ كَلَّا﴾ دیسان ئەڵێم: وازبێننو پەشیمان بنەوە لەو خەریك بوون بێئاگاییە ﴿سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ لەمەولا ئەزانن چیتان بەسەر دێت. ئەم دووبارەكردنەوەی تێخوڕینو ترساندنە بۆ بە گرنگ گرتنو دڵنیا كردنە، یا جیاوازن لە یەكتر، بەم ڕەنگە یەكەم بۆ ترساندنە بەسزای گۆڕو دووەم بۆ ترساندنە بە سزای ڕۆژی دوایی، وەك لە (ئیمامی علی)یەوە ئەگێڕنەوە – كرم الله وجهه –.**

---

[1] یا لە شانازیكردنتان بە خۆتانەوە ئەوەستان تا چوون بۆ گۆڕستان بۆ شانازی كردن بە مردووەكانیشەوە، زۆر كەس بەم جۆرەی فەرمووە.

ئینجا سام و بیمەکە بەتین تر ئەکات و دەست نیشان ئەکات بەوەی کە کارەکەیان زۆر گران و سامناکەو ئەوان بێئاگان و تێی ناگەن لەبەر سەرخۆشی و خەریك بوونیان بە ماڵ و سامان و شانازی کردنیان پێیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿ كَلَّا ﴾ واز بێنن و ئێوە نەزانن و ئەوەی ئەیزانن زانینی ڕاستەقینە نیە ﴿لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ ﴾[1] ئەگەر ئێوە ئەتانزانی و ئەزانن چی لە بەردەمتانەوەیە بە زانینێکی ڕاستەقینە، وەك ئەو شتانەی کە دڵنیاو دڵئارامن پێی، واتە ئێوە نەزانن بۆیە بە شتی هیچ و پووچەوە خەریکن، ئەگەر زانینی ڕاستەقینەتان ئەبوو هەرگیز لەسەر ئەم باری ئێستا نەئەبوون.

ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ ئەو شتە سامناکەی کە مەردومی پێترساندو ناوی برد، ئەفەرموێ: ﴿ لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ ﴾ سوێند بە خوا دۆزەخ ئەبینن ئەی خەریك کراوان بە شانازی کردن بە دارایی و سامان، ئینجا زیاتر دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەو بینینەو سامناك تری ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ﴾ دووبارە سوێند بە خوا دۆزەخ ئەبینن بە دیتنێ کە ڕێك و ڕاستەو هیچ پێچ و پەردەی تیا نیە، واتە خۆتان بە چاوی خۆتان ئەیبینن کە ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخ، کەواتە لە خوا بترسن و خۆتان مەخەنە بەر سزای خوا.

ئەم دووبارە کردنەوەی سوێندە لەسەر دیتنی دۆزەخ یا لەبەر دڵنیا کردنە لەسەری و بەهێزکردنی بڕوایە پێی، یا لەبەر ئەوەیە دیتنەکان جیاوازن، بەم جۆرە یەکەم بۆ کاتی مردن و پاش مردنە تا ڕۆژی دوایی و زیندوو کردنەوە، وە دووەم دیتنی ڕاستەقینەی ڕۆژی دوایی ، وەك لە (ئیمامی علی)یەوە ئەگێڕنەوە – کرم الله وجهە- کە فەرموویەتی: ئێمە گومانمان بوو لە سزای گۆڕاهەتا سوورەتی (التكاثر) هاتە خوارەوە، یا دیتنی یەکەم لە دوورەوەیەو دووەم کاتێکە تێی ئەچن، یا یەکەم کاتێکە کە هەموو کۆئەکرێنەوە بە دەوریا، وە دووەم کاتێکە ئەخرێنە ناویەوە، خوا بە بەزەیی خۆی هیچ کام لەو دیتنانەمان بە نسیب نەکات ــ آمین ــ .

---

[1] بە پێی ڕێزمانی (ڕەوان بێژی) وەڵامی (لو) زۆرجار ناوترێ لەبەر چەند هۆیە، یەکێ لەوانە ترساندن و سامناك کردنی شتەکەیە وەك لێرەدا وا کراوە.

ئینجائەم هەڕەشە سەختەشیان ئاراستە ئەکات ئەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴾ ئینجا سوێند بە خوا پرسیارتان لێ ئەکرێ لەو ڕۆژی دواییەدا لە هەرشتێ کە خۆش بێت بە لاتانەوەو خۆشیتان پێ بگەیەنێ لە جیهانا، پرسیاتان لێ ئەکرێ لە کوێوە پەیداتان کرد؟ وە لە چیدا سەرفتان کرد؟ ئایا سوپاسی خواتان لەسەر کرد یاسپڵەو ناسوپاس بوون؟ ئایا مافی خوا و بەندەکانی خواتان دایا چروكەو ڕژدو لاسارو خۆپەرست بوون؟ پرسیارتان لێ ئەکرێ لەو ماڵو سامانەی کە هەوڵو تەقەلاتان هەر بۆ ئەوە بووە، وە شانازیتان هەر بەوەوە ئەکرد؟

بە پێی شوێنەکەو هەڕەشەکانی پێشوو مەبەست بەم پرسیار لێکراوانە هەر ئەوانەن کە ئەم سوورەتەیان ئاراستە کراو ڕووی فەرموودەیان تێکرا، کەواتە مەبەست بە پرسیار لێکردنیان تەشەر لێدان و سەرشۆڕ کردن و بێئابڕوو کردنیان و دەرخستنی تاوان و خراپەکاری و سزادانی دەروونییانە، ئیتر پرسیارەکەیان پێش دۆزەخ بێت یا پاش چوونیان، چونکە پرسیار لە بێبڕواکان هەر لەبەر ئەو مەبەستانەیە، بەڵام پرسیار لە بڕواداران کە بکرێ بە جۆرو شێوەیە ترەو بۆ مەبەستی ترە، وەك لە حەدیسەوە وەرئەگیرێ، ئا بەم جۆرە ئەم سوورەتە پیرۆزە دوایی هات کە هەشت ئایەتەو هاوتای هەزار ئایەت ئەکات وەك (حاکم)و (بەیهەقی)ئەگێڕنەوە لە (ئیبن و عومەر)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا هیچ کام لە ئێوە ناتوانێ هەزار ئایەت بخوێنێ لە هەموو ڕۆژێکا؟ ئەوانیش عەرزیان کرد ئایا کێ ئەتوانێ هەموو ڕۆژێ هەزار ئایەت بخوێنێ؟ ئەویش فەرمووی: ئایا هیچ کەس ناتوانێ سوورەتی (التكاثر) بخوێنێ؟ هەروەها لە چەند ڕێگایە ترەوە وێنەی ئەم حەدیسە هاتووە، هۆو سرپی ئەوەش ئەوەیە: کە مەبەستەکانی قورئان ئەگەڕێتەوە بۆ شەش مەبەست، وەك (ئیمامی غەزالی) ئەفەرموێ، وە یەکێ لەوانە باس و ناسینی ڕۆژی دواییە کە ئەم سوورەتەی تیا هاتووە.

وصلى الله وسلم على حبيبه محمد وعلى آله وصحبه

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡعَصۡرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ
بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾

---

## سوورەتی «العصر»
## مەککەییەو (٣) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

لەم سوورەتە کورتەدا بەرنامەیەکی تێرو تەواو وەرنەگیرێ بۆ ژیانی ئادەمی بەو جۆرو شێوە بەرزو پاكو خاوێنەی کە ئیسلام ئەیەوێو داوای ئەکات، ئەم سوورەتە دەستورو یاسایەکی گشتی داناوە لە چەند وتەیەکی کورتدا، ئەم سورەتە کارو پیشەو ناونیشانی ئوممەتی موسڵمانی ڕوون کردووەتەوە لە ئایەتی سێیەمدا. بە ڕاستی ئەمە موعجیزەیەکی گەورەیە و هەر لە دەستی قورئان دێت شتی وا بکات! شتێ کەوا زۆر گەورەو گرنگ بێت لەبارەی ئەم سوورەتەوە ئەمەیە: کە بە درێژایی هەموو چەرخو کاتێ، وە بە درێژایی ئادەمی لە هەموو چەرخو چینیا، لەمەو بەرو ئێستاو لە داهاتوودا، بۆ هەموو ئەمانە تەنها بەرنامەیە هەیە کە ڕاستو سوودبەخش بێت، وە تەنها ڕێگەیە بۆ ڕزگاری، ئەوەش ئەو بەرنامەیە کە ئەم سوورەتە نەخشەی کێشاوە و سنووری دیاری کردووە، ئەم تاقە ڕێگایە کە ئەم سوورەتە نیشانەو دروشمی بۆ دیاری کردووە، ئیتر بێجگە لەوە زیانەو دەردی سەری‌و بەدبەختی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * وَٱلۡعَصۡرِ﴾ سوێند بە کاتو چەرخ ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ﴾ هەموو ئادەمی لە زەرەرو زیانایە ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ وە کردەوە چاکەکانیان کردبێ ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ﴾ وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە هەرشتێ کە ڕاستو دروستو نەگۆڕاوە، کە لای سەرووی هەموانەوە بڕوا بە خوایەو شوێن کەوتنی بەرنامەو فەرمانی خوایە لە هەموو شتێکا ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارامو خۆڕاگرتن لەسەر هەموو کارو بارێکی قورسو گران کە ڕوویان تێبکات، واتە تاقە ڕێگەی ڕزگاری‌و دوور لە زیان ئەم چوار شتەیە: بڕوا، کردەوەی

چاك، ئامۆژگاری یەكتر بە هەرشتێ ڕاستو ڕەوایە، ئامۆژگاری یەكتر بە خۆڕاگرتن، ئینجا با بە درێژی بدوێین لەم چوارە كە ئەوەندە گەورەو بەكارن بۆ ژیانی ئادەمی، تا بە باشی تێیان بگەینو بیانناسینو ئینجا بە یارمەتی خوای میهرەبان خۆمان برازێنینەوە پێیان:

یەكەم: ئایا بڕوا چیە؟ بڕوا لە كتێبەكانی زانایانی ئیسلاما بریتیە لە باوەڕ كردن بە ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو ئەو ئاینو بەرنامەو هەواڵانەی كە هێنایو بۆی هات لەلایەن خواوە، وە بەستنەوەی دڵ و ڕەزامەندی دڵە بەوانەو وەرگرتنیان لە ناخی دڵەوە، ڕاڤە كردنی بڕوابەوشێوەیەشتێكی بەناوبانگوناسراوەوباسكردنی زۆرپێویست نیە لێرەدا، بەڵكو ئەوەی پێویستە ئەمەیە كە باسی سروشتی ئەو بڕوایە بكەینو نرخی ڕوون بكەینەوە لە ژیانا.

بێگومان شێوە ڕاستەقینەكەی ئەو بڕوایە بریتیە لە پەیوەستی بەندەی لەڕو لاوازی دروست كراوی بێدەسەڵات، پەیوەستی ئەو بەندەیە بە خوای پەروەردگاری كە سەرچاوەی ئەم بوونەوەرەیەو سەرەتاو دواهاتن بۆ بوونی خۆی نیە، ئینجا لەوەوە پەیوەستی بەم بوونەوەرەی كە دروستكراوەو دەستكردی ئەوە، وە پەیوەستی بەو نیزامو یاسای كەلەم بوونەوەرەدا كاردەكات، وە بەو هەموو هێزو توانای كە تیایدا دانراوە.

ئەو حەلە بەندەی بڕوادار لە سنووری كەمو كوڕی خۆی دەرئەچێو تێپەڕئەكات بۆ پانیو فراوانی ئەم بوونەوەرە گەورەیە وەلە سنووری هێزی لەڕو لاوازی خۆی دەرئەچێ بۆلای ئەو هەموو هێزە گەورەی بوونەوەرە، وەلە سنووری تەمەنی كەمو كورتی خۆی دەرئەچێ بۆلای تەمەنو ماوەی دوورو درێژی ئەم بوونەوەرە كە بێجگە لە خوا كەس نایزانێ، كەواتە بڕواداری ڕاستەقینە بۆچوونو تێگەیشتنی جیاوازو تایبەتی هەیە، ئێجگار گەورەو فراوانەو بێبڕوا لێی بێبەشە.

ئینجا ئەو پەیوەستیە هەرچۆنێ ئەو بەهرەیانە ئەدات، هەروەها لەلایە ترەوە ئەوپەڕی خۆشی ئەدا بەدەروون، چونكە ئەو بوونەوەرەی نیشان ئەدا بە كۆشكو جێو شوێنێكی ڕازاوە لە هەموو بارو ڕوویەكەوە كە خوا فەراهەمی هێناوەو ژێرباری كردووە بۆی، بەدیتنی هەموو بەشو پارچەیەكی شادمان ئەبێ، وە ژیانی لەو بوونەوەرەدا نیشان ئەدات بە گەڕانو ڕابواردن لەسەیرانگاو میهرەجانێكی گرنگا دانراوە بۆ ئادەمی لە هەموو كاتو وڵاتێكا، بێگومان ئەو تێگەیشتنو ژیان بەسەربردنە ئەوپەڕی خۆش بەختیو كامەرانیە، ئەوە دەست كەوتێكە هیچ دەست كەوتێ تر هاوتایی ناكات بێبەشی لێی زیانێكە هیچ زیانێ

هاوتای ناكات. ئینجا بێگومان بڕوا بەدی دێت بەچەند سیفەتو كەرەستەیە كە ئادەمیتی بەرزو بەرێز پێك نایەو بەدی نایە بەبێ ئەوانە:

١- پەرستنی تەنها خوایە، كەسەری بەندی پێبەرزئەبێتەوە لە پەرستنی هیچ دروست كراوێتر، وە ئاسایی و یەكسانی ئەخاتە دەروونی لەگەڵ هەموو بەندەكانی ترا، ئەو حەلە خۆی زۆر زەبوون ناكات بۆ هیچ كەس، وە سەرداناخات بۆ هیچ كەس بێجگە لە خوای تاكو تەنها زاڵە بەسەر هەمووشتێكا. شتێكی ئاشكرایە كە ئازادیو سەربەستی ڕاستەقینە بۆ ئادەمی پێك نایەت بەوەنەبێت.

٢- وەرگرتنو پەیڕەویكردنی تەنها بەرنامەی خوا لە هەموو بارو ڕوویەكی ژیانەوە، وە دەست گرتن تەنها بە تەرازووی خواو شەریعەتو یاسای خوا، ئەو حەلە ئارەزووی نەفسو بەرژەوەندی تایبەتی لەناوا نامێنێ و لە جێگەی ئەوا شەریعەتو دادی خوا دێتە پێشەوە، بڕوادار هەست ئەكات بەنرخو بەرزی بەرنامەكەی، وە بەرزو بڵند ئەبێتەوە بەسەر بۆچوونو یاساو بەرنامەیەترا كەلە زەوییەوە هەڵقوڵێ.

٣- ڕوون بوونەوەی پەیوەندی بەینی پەروەردگارو بەندەكانی، بەڕوونی جیابوونەوەی ڕادەو پلەی خوایەتی لە ڕادەی بەندەیی بەبێ تێكەڵو پێكەڵیو لە سەر شێوە ڕاستەقینەكەی هەردووكیان، كە بەوجۆرە بەندە ئەگات بە خوای خۆی بەبێ پێچو گرێ، وە یەكسەرو لەڕێوە بەبێ پێویستی بەواسیتە لە بەینا، ناسینی خوا بەو جۆرەو گەیشتن بە خوا بەو شێوە ڕێكو خاوێنە ڕووناكی ئەخاتە دڵو ئارام ئەدا بە گیانو دەروون دڵنیا ئەكاتو دوودڵیو ترسو بێ ئارامی لێ دوور ئەخاتەوە، هەرچۆنێ لە سنووری خۆیا ڕاگیری ئەكاتو بەرگری ئەكات لە خۆ گۆڕانو خود پەرستیو خۆ بەزل زانی بەناهەقو دەست درێژی كردن بۆ سەر بەندەكانی خوا.

٤- دامەزراوی لەسەر بەرنامەی خواو نەگۆڕان بەم لاوبەولادا، كەواتە كردەوەكانی هەروا لە خۆوە نابن وەك دەست ترازان، بەڵكو هەموو پاڵپێوەنەرێكی دەروونیان هەیەو بەنیازێكی تایبەتی ئەكرێن بۆ مەبەستو ئامانجێكی دیارین.

٥- باوەڕ بەرێزی ئادەمی بەلای خواوە، كە بەهۆی ئەوە بەندە نرخو ڕێزێ بۆ خۆی دائەنێ، وە شەرم ئەكات لەوەی خۆی پەستو نزم بكاتەوە لەو ڕادەو پلەی كە خوا بۆی داناوە، باوەڕبوون بەوەی كە بەندە بەرێزە بەلای خوای پەروەردگارییەوە بەرزترین بۆچوونو

تێگەیشتنێکە کە ئادەمی بۆ خۆی دانابێ، هەر بیرو باوەڕو مەزهەبو بۆچوونێ کە ئەو نرخو ڕێزە نادا بە ئادەمیو پەستی ئەکاتەوەو ئەیگێڕێتەوە بۆ بنەڕەتێکی بێ نرخو دووری ئەخاتەوەو ئەیپچڕێ لە کۆمەڵی هەرە بەرز... ئەو ئەو بیرو باوەڕو مەزهەبو بۆچوونە لە ڕاستی دا دوژمنی ئادەمیو ئادەمێتی‌یە، وە مەبەستەکەی ئەوەیە لەپلەی هەرە بەرزی بیهێنێتە خوارەوە، وە نیازەکەی ئەوەیە با بەدەمیش نەڵێ!!

جا کەواتە بۆچوونو مەزهەبەکانی داروینو فرۆیدو مارکس پیس ترینو خراپترین دەردێ بوون کە ڕوویان کردە سروشتی ئادەمی، دەست درێژیەکی گەورەو زامدارکردنێکی کوشندەبوون بۆ ئادەمێتی، شایستەی ڕق لێ هەڵگرتنو ئەوپەڕی بێزاری دەربڕینن، مافی ئەوەیان هەیە زۆر بە پڕو پووچو بێ‌نرخ سەیر بکرێنو بەسووک ترین نیشان بدرێن.

بێگومان هەست پاکی – کە شتێکی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ گەلو ئەندامی گەل – بەهەرەو سەرەنجامی هەست کردنە بەرێزی بەندە بەلای خواوە، وەهەست کردن لە ئاگاداری خوا بەسەر دەروونو هەموو پێشیدەو شاراوەیەکا، چونکە هەر ئادەمی‌یە لەسەر تەوەرەی خۆی نەترازابێ، بۆچوونو مەزهەبەکانی فرۆیدو مارکسو وێنەیان ئادەمێتیەکەی نەسڕیبێتەوە، ئەو ئادەمی‌یە شەرم ئەکات لەوەی کە ئادەمیەکی وەکو خۆی ئاگاداربێ بەسەر نیازی خراپو هەرناپاکی‌یە کەلە دەروونیا بێت، وەئەبێ بەهەر جۆر بووە پاك بێتەوە لای ئەو کەسە، دەی بڕواداری ڕاستەقینە کە دڵە لەرزەیەتی لە حاستی خواو ئاگاداری خوا ئەبێ باشتر هەوڵ بدا بۆ پاكو خاوێنکردنی دڵو دەروونی!

هەستیاری خوو ڕەوشتی بەروبەرهەمێکی سروشتی‌یەو مسۆگەرە بۆ بڕوابە خوایەکی دادپەروەری میهرەبانی لێ بووردەی بەخشندەی بەزەیی دار، کە خراپەی پێناخۆشەو چاکەی خۆش ئەوێ، ئاگادارو زانایە بە هەموو نیازو خەتەرەیە کە پۆشیدەو شاراوەیە، بەروبەرهەمی بڕوای ڕاستەقینە زۆر گەورەو گرنگە، وەك وورياییو بێداری دەروون بەرانبەر هەموو چاکەو خراپەیە، و دوورکەوتنەوە لە شەڕە گرتگی ئەم زەویو جیهانە، هەڵبژاردنی ئەو ئەجرو پاداشتەی کە لای خوایە بەسەریا، ئەو حەلە دەروونی ناکەوێتە بێئارامیو پەلەپەل لەبەر داوکەوتنی سەرئەنجامو بەروبوومی کردەوەی، چونکە ئەزانێ ئەم زەویو جیهانە جێگەی پاداشت نی‌یەو ئەم ژیانی جیهانە دواچۆڕو کۆتایی ژیان نی‌یە، بەڵکو قۆناغێکە بۆ گەیشتن بە ژیانی نەبڕاوە، جا بەهۆی ئەوەوە ئەم بڕوادارە هەوڵو تێکۆشان

ئەكات بۆچاكە لەبەر ئەوەی چاكە خوا پێی‌خۆشە، وە جڵەوگیری ئەكات لە خراپە لەبەرئەوەی خراپە خوا پێی ناخۆشە، بەم هەستو تێگەیشتنەوە ئەتوانێ بوەستێ بەرانبەر هەموو هێزی شەڕو خراپە. بەڕاستی ئەو بڕوایە بنەڕەتی گەورەی ژیانە، هەموو لقو پەلێكی خێرو چاكە بەمەوە بەستراوە، وە هەموو بەرو میوەیەكی بەنرخ لەمەوە پەیدائەبێ. ئەگینا بەزووی سیسو ووشك ئەبێو بەرو میوەكە ئەگەنێو بۆگەن ئەكاتو بەكارنامێنێ.

بڕوا مەڵبەندو تەوژمێە بۆ هەموو ڕێگا بەرزەكانی ژیان. بڕوا بەرنامەیە هەموو جۆرە كردەوە جیاوازەكان كۆئەكاتەوەو یەكیان ئەخاتو ئەیان هۆنێتەوەو بە ڕێگەیەكا ئەیانباتو یەك هۆو پاڵپێوەنەریان بۆ دائەنێو یەك مەبەستو ئامانجیان بۆ دیاری ئەكات.

جالەبەرئەوە قورئان هیچ جۆرە نرخێ دانانێ بۆ هەر كردەوەیە، كەلەسەر بنەڕەتی بڕوا نەبێو دانەمەزرابێ، وە نەبەسترابێ بەو تەوەرەوە، وە بەپێی ئەو بەرنامەیە بەرپا نەبووبێ، چەند ئایەت لە قورئانا بەڕوونیو بێ پێچو پەنا ئەوە ڕوون ئەكاتەوە: هەركەس تۆزێ ووردبێتەوەو ژیریی بخاتەكار ئەبێ گومانی نەبێ لەبێ نرخو بێ پاداشتی بەلای خواوە بۆ هەر كردەوەیە كەلەسەر بنەڕەتی بڕوا بەرپا نەبووبێ، چونكە ئەو كردەوانەی كە وابن لەبەر خواو نیازی خواوە نەكراوە، كەواتە چۆن ئەبێ نرخو پاداشتیان لای خوا بێ!!

بڕوا بەڵگەیەكی ڕوونە لەسەر ساغیو ڕێكی سروشتی بڕوادارو ڕێكیو گونجاوی لەگەڵ سروشتی هەموو بوونەوەردا، وە بەڵگەیە لەسەر تێگەیشتنو حاڵی بوونی لەو هەموو ڕازو نیازو پێچڕپانەی كە بوونەوەر بەكاری ئەهێنێ لەگەڵ ئادەمیدا، چونكە ئەم بوونەوەرەی كە ئادەمیی تیا ئەژی هەموو بەشو پارچەیەكی لە هەموو بارو ڕوویەكەوە نیشانەیەكی ئاشكرایە لەسەر ئەو دەستە قودرەتەی كە ئادەمیو ئەم بوونەوەرەی داڕشتووە بەم جۆرو شێوەی كە ژیریی تیا سەرسامو سەرگەردانە. دەی هەر ئادەمییە تێ نەگەیشتو حاڵی نەبوو لەو هەموو دەست نیشان كردنو پێچڕپاندنە، بێگومان ئەو ئادەمییە ناساغەو سورشتی لەسەر تەوەرە ترازاوەو ئیش ناكات، هەرچەندە بەڕواڵەت بەساغو دامەزراوو بەكار دابنرێ. بەڕاستی جیهانی بڕوادار ئێجگار قووڵو پانو پۆڕترو درێژترو بەرزو شیرین ترە بەجۆرێ جیهانی بێبڕوا هەرچاو ناداتو تەنگو تاریكو لەڕولاوازو ناشیرینە. وەزیانبارە بە ئەوپەڕی زیان!

دووەم: کردەوەی چاك بەروبەرهەمی سروشتی‌یە بۆ بڕوا، وە بزوتنەوەیەکی هەمیشەیی یە بۆی‌و دەست پێ‌ئەکات هەر لەگەڵ یەکەم جاری جێگیربوونی بڕوا لەدڵا، چونکە بڕوای ڕاستەقینە شتێکی نەوەستاوەو هەرکات جێگیربوو ئەکەوێتەجولاْن‌و تێکۆشان بۆ پێك هێنان و بەدی هێنانی خۆی لە دەرەوەی دەروونا لە شێوەی کردەوە چاکەکانا. ئەمەیە بڕوای ڕاستەقینەی ئیسلامی. بەهیچ ڕەنگ ناگونجێ بوەستێ بەبێ جولەجوڵ، وە ناگونجێ شاراوەبێت‌و دەرنەکەوێ لە شێوەیەکی زرت‌و زیندوودا لە دەوری دەروونا... ئەگەر ئەو جولاْنەو بزوتنەوە سروشتی‌یەی نەبێ ئەوە قەڵب‌و ڕووکەشە یا مردووە، بڕوا بەوێنەی گوڵێکی بۆن خۆشە کەبە سروشت بۆنی خۆشی خۆی ئەهاوێ ئەگینا ئەبێ بۆنی نەبێ‌و لەکار کەوتبێ!

جا لەمەوە دەرئەکەوێ نرخی بڕوا. دەرئەکەوێ کە بڕوا بزوتنەوەیەو کردەوەیەو بیناکردنەوەی وێرانەو ئاوەدان کردنەوەی چۆڵ‌و کاول‌و بیابانە، هەموو ئەوانەش لەبەر خوایەو لەڕێگەی ڕەزامەندی خوایە... بڕوا شتێکی بێ کەڵکی دەستەپاچە نی‌یە، بۆ خۆی لە دڵ‌و دەروونا کەوتبێ، وە بڕوا تەنها بریتی نی‌یە لە نیازو ویستێکی پاك‌و خاوێن بەبێ جولاْن‌و کردەوە، بەڵکو ئەبێ هێزێکی هەرە گەورە بێت ئیش‌و کاربکات لە کۆڕو ناوەرۆکی ژیانا. بێ‌گومان ئەوە شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە کاتێ کە زانیمان بڕوا بەستنەوەی دڵە بەبەرنامەی خواوە، ئەم بەرنامەیەش بووتنەوەیەکی هەمیشەیی نەبچڕاوە لەم بوونەوەرەدا، کەبە تەگبیرهاتووە، لەبەر مەبەست‌و ئامانجێ هاتووە، سەرکردایەتی بڕوا بۆ ئادەمی سەرکردایەتی‌یە بۆ بەدی هێنانی بەرنامەی بزوتنەوەو ئیش کردن بەهەمیشەیی، بزوتنەوەو جولاْنەوەیەکی پاك‌و چاك‌و چاك کەری هەموو لارو نالەبارو خراپەیە.

ئەوەبوو بەکورتی باسی بڕواو کردەوە چاکەکان کەیەکەم‌و دووەم لەو بەرنامە گەورەو گشتی‌یە کەئەم سوورەتە دەست نیشانی بۆکرد، ئینجا دێینە سەر باسی سێ‌یەم‌و چوارەم، ئەندازێ نرخ‌و بەرهەمی ئەمانیش ئەخەینە بەرچاو: بێ‌گومان ئامۆژگاری یەکتر بەهەر شتێ کە ڕاستە، ئامۆژگاری یەکتر بەخۆڕاگرتن بەو جۆرو شێوەی کە باس کران، نیشانەو پێك هێنەری گەل‌و کۆمەڵی موسڵمانن، واتە هەر گەل‌و کۆمەڵێ ئەو دوو شتەی تیا بەدی هات، بێ‌گومان ئەو گەل‌و کۆمەڵە گیانێکی تایبەتی‌و شێوەیەکی تایبەتیان هەیە، هەست ئەکەن بە بوون‌و کارو پیشەی خۆیان، ئەزانێ خەریکی چی‌یەو بۆچی هەوڵ ئەدات، وە ئەزانێ یەکێ

لە کردەوە چاکەکانی سەرکردایەتی‌یە لە ڕێگەی بڕواو کردەوەی چاکەوە، لەبەرئەوە ئامۆژگاری یەکتر ئەکەن بەشتێ کە کۆمەکیان ئەکات لەسەر هەڵسانیان بەو سپاردە گەورەیە.

بەڵێ لەو دوو ئامۆژگاری یەکترەوە دەرئەکەوێ کە ئەو گەل‌و کۆمەڵە بەکگرتووو پەیوەست‌و تێکەیشتووو خێر خواو دڵسۆزن، وە چاودێرو پاسەوانی ڕاستی‌و دادو خێرو چاکەن... ئەوەش بەرزترو پاك ترین شێوەیە بۆ گەل‌و میللەتی هەڵبژێراو... ئا بەو جۆرە ئیسلام ئەیەوێ گەل‌و میللەتەکەی چاك‌و بەهێزو تێگەیشتووبێت‌و چاودێرو پاسەوان بێت بۆ پاراستنی‌و دادو چاکە لە زەوی‌دا، وە بە برایەتی‌و خۆشەویستی‌و ڕاستی بژین.

ئامۆژگاری بە هەموو شتێکی ڕاست‌و دروست زۆر زۆر پێویستەو ناچاری هەیە پێی، چونکە هەڵسان بەڕاست‌و ڕاستی گرانە، وەکو کۆسپ‌و بەرگری زۆر هەیە لە ڕێگەیا: هەواو ئارەزووی نەفس، سەرکێشی سەرکێشان، ستەم‌و دەست درێژی ستەمکاران‌و دەست درێژی کەران، باوو بۆچوونی ناڕەوای گەل‌و کۆمەڵ، بە دواکەرانی بەرژەوەندی... وە ئەو ئامۆژگاری یەکترە بیرخستنەوەیەو وریا کردنەوەیەو هاندانی یەکترەو بێدارکردنەوەیە بەیەکتی‌و نزیکی لە مەبەست‌و ئامانجا، وە بەبرایەتی‌و کۆمەکی‌و یارمەتی دان لە ئەرك‌و سپاردەی گەردن‌و سەرشانا، ئەو حەلە هیچ کەس خۆی بەتەنها نازانێ، بەڵکو ئەزانێ کە هەموو بە یەك جارو پێکەوە پارێزەرو پاسەوانی حەق‌و ڕاستین، کەواتە هەرکەس بە دڵێکی بەهێز پڕ لە ئومێدو هیواوە هەڵسێ بەکارو فەرمانی پاسەوانی یەکەی، ئەم ئایینە ــ کە سەردەستەو پێشەوایە لە حەق‌و ڕاستی داــ ڕاگیر نابێ‌و کاروباری ناڕەوا مەگەر بە پاسەوانی گەل‌و کۆمەڵێکی بەهێز کەبەڕاستی قۆڵگیرو یارمەتی دەری یەکترن، هەروەها ئامۆژگاری یەکتر بەخۆگری زۆر زۆر پێزیستەو ناچاری هەیە بۆێ، چونکە هەڵسان بەئەرکی بڕواو کردەوەی چاك، و هەڵسان بە پاسەوانی حەق‌و ڕاستی زۆر زۆر گرانەو پێویستی هەیە بە خۆگرتن، خۆگرتن لەسەر تێکۆشان‌و بەربەرەکانێ لەگەڵ نەفسدا، تێکۆشان‌و بەربەرەکانێ لەگەڵ غەیرا، و خۆگرتن لەسەر هەر سزاو مەینەتێ کەڕوویدا، و خۆگرتن لەسەر کەشخەو بافیش کردنی بەتاڵ، و خۆگرتن لەسەر درێژی ڕێگەو سستی برینی قۆناغەکان، وەکو پڕبوونەوەی ڕێگەو دووری‌یەکەی!!

جا ئەو ئامۆژگاری یەکترە بە خۆگری هێزو دەسەلات چەند جارەئەکاتەوە، دڵسۆزی‌و خۆشەویستی ئەخاتە ناو زیادە تێکۆشان‌و سووری‌یە فەراهەم ئەهێنێ، خۆشی‌و لەزەتی

کۆمەڵ لەدڵ دئەمەزرێنێ کە ئیسلام بەدی نایەو ناژی لەناو گەلو کۆمەڵدا نەبێ. کەواتە بەبێ ئەو ئامۆژگاری‌یە زیانو زایە بوون پەیدا ئەبێو ڕووئەکاتە هەمووان.

هەر کەسێکی ژیریی خاوەن بیرو هۆش کاتێ کە سەرنج بداتو بیر بکاتەوە لەم دەستوورە شیرینەو لەم ڕێگە ڕاستە بێ‌گری‌یە کە قورئان نەخشەی کێشا بۆ ژیانی تاقمو کۆمەڵی بەهرەمەندی ڕزگار لەزیان، کاتێ بیربکاتەوە لەوە، سامو بیم دڵی دائەگرێ کاتێ لەم بارەوە سەرنجی ئەو زیانە گەورەیە ئەدات کە چوار دەوری ژیانو جیهانی داوە لە هەموو گۆشەو چمێکێکی زەوی دا، وە سامو بیم دای ئەگرێ کاتێ بیرئەکاتەوە لەم سەرگەردانیو زایەبوونەی کە ئادەمی سزاکەی ئەچەژێ لە جیهانا - پێش هاتنی ڕۆژی دوایی - سامو بیم داگیری ئەکات کاتێ بیرئەکاتەوە لەڕوو وەرگێرانو پشت تێ‌کردنی ئادەمی لەو خێرو بەهرە گەورەیەی کە خوا ڕشتی بەسەریا، لەگەڵ نەمانو لەدەست دەرچوونی پاسەوانی حەقو ڕاستیو داد بوو لەم زەوی یەدا.

لە هەموو شت سامناک تر ئەوەیە کە ئەوانەی بە موسڵمان ناو ئەبرێن دوورترین کەسن لەو خێرە گەورەیە، وە لە هەموو کەس زیاتر ڕوو وەرگێڕن لەو بەرنامەی کە خوا بۆی هەڵبژاردوون، وە لەو دەستوورە کە دایناوە بۆیان، وەلەو ڕێگە ڕاستەی کە نەخشەی کێشا بۆیان بۆ ڕزگار کردنیان لە زیانو زایەبوون، وە ئەوەی کە هۆی سەرسوڕمانە ئەوەیە ئەو ناوچەو وڵاتانەی کە ئەم خێرە گەورەیەی یەکەم جار لێ هەڵقوڵا وازی هێنا لەو ئاڵاو بەیداخەی کە خوا بەرزی کردەوە بەسەریانا، ئاڵاو بەیداخی بڕواو چەند ئاڵاو بەیداخێ تریان بەرز کردەوە کە خێرو خۆشیان نەدی هەرگیز لە ژێریا.

ئەو ناوژەو وڵاتانە هیچ ناوو باسێکیان نەبوو نە لەئاسمانو نەلەزەوی دا، هەتا ئیسلام هات بەیداخی خوای بەسەرا بەرزکردنەوە، بەبێ هاوبەشیو بەناوی خواوە ناونرا، بەبێ هاوبەش، وە بەنیشانەی خوا نیشانەدار کرا بەبێ هاوبەش... ئەو ئاڵاو بەیداخەی کە عەرەب لەژێر سایە یا زاڵبوو، بوو بەگەورەو سەرۆك،و سەرکردایەتی جیهانو ئادەمیتی کرد بە شێوەیەکی کەس نەدیوی نەبینراو لە هەموو مێژووی خۆیانو هەموو ئادەمی دا بە تێکڕایی.

لەبارەی ئەو سەرکردایەتی‌یە ڕێكو ڕاستەوە نووسەرانی زۆر لەخۆییو بێگانە زۆریان نووسیوە، لێرەدا بەجوانی ئەزانم هێندێ لەوە باس بکەم کە مامۆستای لە خوا ترسی ڕاستگۆ (ابو الحسن الندوي) فەرموویەتی لەکتێبی بەرزی بەنرخی‌دا: {ماذا خسر العالم

بانحطاط المسلمين؟} لەبارەی ئەو سەرکردایەتی‌یەوە، لە ژێر ناونیشانی {عيد القيادة الإسلامية الأئمة المسلمون، خصائصهم}.

موسڵمانان زاڵبوون‌و بوون بەسەرۆکی جیهان، و گەل‌و میللەتە قەڵب‌و ڕووکەسەکانیان لێ خست لەو سەرکردایەتی‌و سەرۆکایەتییەی کە بەناڕەوا دەستی خۆیانیان خست‌و بەناڕەوا هەڵسان بە کاروبارو بەڕێوەبردنی، ئەمان کە چوونە جێگای ئەوان ئادەمێتیان برد بەڕێوە زۆر بەڕاستی‌و ڕێك‌و پێکی، وە بەڕاستی‌و بە فراوانی ئەو سیفەتانەیان تیابوو کە شایستەی کردبوون بۆ سەرکردایەتی هەموو گەل‌و میللەتەکان، بەجۆرێ خۆشبەختی‌و ڕزگاری‌یان مسۆگەربێت لە ژێر ئەو سەرکردایەتی یەداو لە سایەو پەنایا لەبەرئەوە:

یەکەم: ئەو موسڵمانانە خاوەنی نامەو یاساو شەریعەتێکی خوایی بوون، کەواتە یاساو شەریعەتیان بۆ دانەنان لەلایەن خۆیان بەئارەزووکاری، چونکە هۆی هەموو سەرلێ شێوان‌و بەدبەختییە لە جیهانا لادانە لەیاساو شەریعەتی خواو ڕەفتار کردنە بەیاساو شەریعەتی ئەرزی‌و دەستکردی ئادەمی‌یەکان‌و سەرچاوەی هەڵەو نەزانی‌و ستەمە، وەلە ڕەوشت‌و ڕامیاری‌و کردەوەیان لەگەڵ مەردوما ڕێك‌و ڕاست ئەڕۆیشتن‌و پێیان هەڵنەئەخلیسکا، لەکاتێکا کە خوا نوورو ڕووناکی‌یەکی پێ دابوون پێی ئەڕۆیشتن بەڕێدا لەناو مەردوما، وە شەریعەتێکی بۆ دانابوون حوکمڕانی‌یان پێ‌ئەکرد، قورئانەکەیان فەرمانی پێ‌دابوون بەدادپەروەری لەگەڵ دوچمن‌و ناحەزیشدا.

دووەم: ئەمانە حوکمڕانی‌و سەرکردایەتی‌یان نەگرتە دەست بەبێ پێگەیشتن‌و پێ‌گەیاندنیان لەبارەی خوو ڕەوشتی شیرینەوە، وە بەبێ پاك‌و خاوێن کردنی دەروونیان لە هەموو چڵك‌و چەپەڵی‌و بەدخووی‌یە، بە پێچەوانەی زۆربەی میللەتەکان‌و پیاوەکانی میری‌و کاربەدەستی تر لە چەرخەکانی ڕابووردو و ئێستادا، بەڵکو ئەمانە ماوەیەکی دوورو درێژ مانەوە لەژێر پەروەردەو پێ‌گەیاندنی پێغەمبەرا (ﷺ)و چاودێری کردنیان بەووردی، پاك‌و خاوێنی کردن‌و تەمێ‌و ئەدەبی دادان، پێی گەیاندن بە پشت کردنە دنیاو دوور کەوتنەوە لە حەرام‌و قەدەغەو بە دەست‌و دەم‌و داوێن پاکی‌و دوورکەوتنەوە لە ناپاکی، و بەترسان لە خواو خۆنەپەرستی‌و باوڕدانی بەرژەوەندی مەردوم بەسەر بەرژەوەندی خۆیانا، بەچاو هەڵنەخستن‌و هەوڵ نەدان بۆ حوکمڕانی‌و کاربەدەستی‌و سوور نەبوون لەسەری. ئەوەتا فەرمووی: {إنا والله لا نولّي هذا العمل احدا سأله، أو احدا حرص عليه}. سوێند بە خوا

ئێمە ئەم کارە نادینە دەست هەرکەس کە داوای بکات، یا هەرکەس سووربێت لەسەری[1]
هەمیشە ئاوازەی ئەم ئایەتە لە گوێچکەیانا ئەزرنگایەوە: ﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾[2]، کەواتە پەلاماری مووچە خۆری و کاریەدەستیان نەئەداو تەپ و کۆنەئەکەوتن بەملیا، چ جای ئەوە خۆیان گەلاڵە بکرن بۆی، وە خۆیان بە پاك و شایان دابنێن و بە پرو پاگەندە خۆیان بچەسپێنن، وەماڵ سامان بەخت بکەن لە پێناویا.

کەواتە ئەو موسڵمانانە هەرکات کاروباری مەردومیان بکەوتایەتە ژێر دەست دایان نەئەنا بەدەست کەوتێکی تالآنی و تیکەیەکی تەخت کەوتبێتە دەستیان و هەڵیان بۆ هەڵکەوتووە با بەسەریا تێپەڕنەکەن هەرچی‌یان بەخت کردووە باوەریگرنەوە لەو ژێردەستانە، بەڵکو ئەو کاربەدەستی‌یەو هەرچیان ئەکەوتە ژێردەست بەسپاردەیەکیان دائەنا لە گەردنیانا، وە بەتاقی کردنەوەیەکیان سەیر ئەکرد لەلایەن خواوە، ئەیانزانی کەلە حوزوری خوادا ڕاگیر ئەکرێن، و پرسیاریان لێ ئەکرێ لە هەموو شتێ، هەمیشە ئایەتەکانی قورئانیان لەبیربوو کە فەرمان بەگێڕانەوەی سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان و بەدادپەروەری لەکاتی حوکمڕانیدا، هەروەها دڵە لەرزەیان بوو لە حاستی ئەو ئایەتانەی کە هەواڵ ئەدەن بە تاقی کردنەوەی خوا، دڵە لەرزەیان بوو لە دەرنەچوون لەو تاقی کردنەوانەدا.

سێیەم: ئەوانە خزمەتکاری تەنها تیرەو بەرەیە نەبوون، نێرراو فروستادە نەبوون بۆ گەلێ یا بۆ نیشتمانێ، کە هەر هەوڵ بۆ کامەرانی و بەرژەوەندی تەنها ئەو تیرەیە یا ئەو گەل و نیشتمانە بدەن، ئەیان زانی کەئەوان بۆ ئەوە دروست نەکراون کە هەر ئەمان کار بەدەست و حوکمڕان بن و ئەو خەڵکە هەر ژێر دەست و ڕایەت بن، ئەمانە ڕانەپەڕین بۆ ئەوەی ئەمپراتۆریەتێکی عەرەبی پێك بێنن کە بخۆن و بنۆشن لە ژێر سایەیا، و کەشخە بکەن و لووت بەرز بکەنەوە و بیکەن بەکەڵەشاخ لەژێر ئالآکەیا، و مەردوم لە ژێر حوکمڕانی ڕۆم و فارس دەربێنن بۆ ژێر حوکمی عەرەب و حوکمڕانی خۆیان! بەڵکو ڕاپەرین بۆ ئەمەی مەردوم دەربێنن لەپەرستنی بەندەکانی خوا بۆ پەرستنی خوا بەتاك و تەنها، و لەتەنگی ئەم جیهانە بۆ پانی و فراوانی ڕۆژی دوایی، و لەستەمی ئایینەکانی تر بۆ دادی ئیسلام. وەك (ڕەبعی

---

[1] بخاری وموسلیم.

[2] واتە ئەو بەهەشت و ڕێزو بڕیار ئەدەین بۆ ئەو کەسانەی کەنایانەوێ لەزەویدا زاڵی و دەست درێژیو خراپەکاری بکەن، وە پاشە ڕۆژی چاك تایبەتی‌یە بەلە خواترسەکانەوە. سوورەتی ـــ القصص ـــ.

کوڕی عـامر) فـەرمووی لـەکۆڕی (یزدجـرد)دا[1] کەواتـە هـەموو گـەل و میللەتـەکانی جیهـان بەلایانەوەیەکسان بوون، هەموونادەمی بەلایانەوەیەکسان بوون،چونکە پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) فەرمووی: {الناس کلهم من آدم، وآدم من تراب} هـەموو ئادەمی لـە ئادەمـە وە ئـادەمیش لـە خاکە، {لافضل لعربي على اعجمي ولا لاعجمي على عربي الا بالتقوى} هیچ هونەرو زیـادە نیـیە بـۆ هـیچ عـەرەبێ بەسـەر غـەیرە عـەرەبا، وە هـیچ غـەیرە عـەرەبێ زیـادەی نیـیە بەسـەر عەرەبا مەگەر بە لە خواترسی، وە قورئانەکەمان جاڕی یەکسانی ئادەمی داو مافی ئادەمێتی داو بەکردەوە بەدی هێنا[2]. بۆ نموونـە (ابن الجوزی) لـە کتێبـی (عمر)دا ئەفـەرموێ: (عـەمری کوڕی عاص) کە کرابوو بە کاربەدەست بەسـەر وڵاتـی مـصرەوەو کوڕەکـەی دای لـە کـوڕە مـصریەك وەبـە کەشـخەوە پـێی ووت: وەریگـرە لـە کـوڕی زۆر بـەڕێزەکان، واتـە تـۆ کـوڕی قیبتی و رایەتی و من کوڕی کاربەدەستم و قورەیشیم، ئینجا مصریەکەش شکاتی لێ کرد لای خەلیفەی دووەم (عمر)–خوا لێی ڕازی بێ– ئەویش فەرمانی دا کەلەکاتی حەج دا هـەردوولا بێن بۆ مەککە، ئینجا کە هاتن تۆڵەی سەند لە کوڕەکەی (عەمر) وە بەپێش چاوی ئەو هـەموو خەڵکەوە قیبتیەکە دای لێی تۆڵەی خۆی لێ سەند، وە (عمر) پێی فەرموو: {متی استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا} کـەی ئێـوە ئـەم خەڵکـەتان کـرد بـە بەنـدە لـە کاتێکا کـە دایکیان بە ئازادی هێنانی و خستنیەوە؟ ئەو کۆمەڵە بەختیارە درێغیان نەکرد لە هیچ کەس و هەموو شتێکی بەنرخ کەلایان بوو گەیاندیان و مەردومیشیان بەشدارکرد تیایا، بەهیچ ڕەنگ لە هیچ کارێکا گوێیان نەبوو لە تیرەو نەژادو ڕەنگ و نیشتمان، بەڵکو بەیەکسان و ئاسـایی ڕەفتاریان کرد لەگەڵ هـەمووانا، بوون بە هـەورێکی ڕەحمـەت بەسـەر وڵاتـان و دانیشتوانی وڵاتانـەوە، دەشـت و دەریـان پـێ ئاوداشـتبوو، هـەموو سـوودیان لـێ وەرگـرتن، هەرکـەس بەپێی لێهاتن و ئامادەیی وەرگرتنی بەرنامەکەی خوا.

لەسایەو پـەنای ئـەو کۆمەڵـەو لـە ژێـر حـوکمڕانی ئەوانـەدا هـەموو میللـەت و گەلـەکان ـ تەنانـەت ئەوانـەیش کەهـەر لـە کۆنـەوە چەوسـاوەبوون ـ توانیـان بـەش و مافیـان وەرگـرن لـە ئـایین و زانـین و ڕەوشـت و کاربەدەسـتی و حـوکمڕانی دا، وە هاوبەشـی عەرەبـەکان بکـەن لـە دروستکردن و داڕشتنی جیهانێکی تـازەدا، بەڵکو زۆر لـە ئەندامی ئـەو گەل و میللـەتانی تـرە

---

[1] البدایه والنهایه لابن کثیر.

[2] ئەم باسە بەدرێژی لەچەند شوێنێکا کراوە لەم تەفسیرەدا بەتایبەتی با تەماشای سوورەتی (الحجرات) بکرێ.

سەرکەوتن بەسەر عەرەبا لە زۆر شتی بەنرخ و گەورەدا، لەناویانا چەند پێشەواو مامۆستاو زانایە هەڵکەوتن کەبەئاسانی نایەنە ژمارەو بوون بە تاجی سەری عەرەبەکان.

چوارەم: ئادەمی لەشەو گیان، خاوەن دڵ و ژیریی و هەست و سۆزو چەن ئەندامێکە، ئەم ئادەمیە خۆش بەخت نابێ و ناگات بە ئامانج و بەرزنابێتەوە بۆ پلەی بەرزی هەتا ئەو هەموو هێزو ووزانەی پەرە نەسێنن و گەشە نەکەن بە جۆرو شێوەیەکی میانەو بەبێ زیادەڕەوی و کەم و کوڕی، هەرکام خۆراکی تایبەتی و شایانی خۆی وەرنەگرێ، بە هیچ کلۆج شارستانی و ئاوەدانی ڕاستەقینە دەست ناکەوێ و بەدی نایە مەگەر کاتێ ژیانێکی میانە زاڵببێ کە پێکهاتبێ لەهەستی ئایینی و خوڕەوشت و ژیریی و لەشێ کە بگونجێ بۆ ئادەمی، گەیشتن بە ئادەمێتی تێرو تەواوی خۆی بە ئاسانی.

تەجرەبەو بەراووردکردن ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو جۆرە ژیانەش نابێ و پەیدا نابێ مەگەر کاتێ کە جڵەوی ژیان و بەڕێوە بەرایەتی بدرێ بەدەستی کەسانێکەوە کە بڕوایان ببێ بەڕۆح و ماددە پێکەوە، ئەوانە نموونەو نوێنەرێکی تێرو تەواوبن لە ژیانی ئایینی و ئەخلاقیدا، خاوەنی ژیرییەکی ساغ و زانینێکی ڕاستی سوود بەخشبن.

مامۆستای بەنرخ (ابو الحسن الندوي) لەسەر ئەم باسە ئەڕوا تائەکاتە ئەم باسە بەناونیشانی {دور الخلافة الراشدة مثل المدينة الصالحة} ئەوە شتێکی ڕاستە، چونکە ئێمە نەمان بیستووەو نەمان ناسیوە هیچ چەرخ و دەورێ بووبێ لە مێژوودا تێرو تەواوترو جوان و شیرین تر لەو هەموو بارو ڕووەوە لە دەورروو چەرخی خەلافەتی ڕاشیدە، چونکە تەنها لەو چەرخ و دەورەدا هێزی ڕۆح و ئەخلاق و ئایین و زانی و ماددە یەکیان گرت و کۆمەکی یەکتریان کرد لە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی ئادەمی ڕاستەقینەی تێرو تەواودا، وەلەبەرپابوونی شارستنی و ئاوەدانی شیاو و شایستەدا، حکومەت و میریە پێك هات گەورەترە لە هەموو میری و حکومەتانی جیهان، هێزێکی ڕامیاری ماددی بەدی هات کە سەرکەوت بەسەر هەموو هێزێ لە چەرخی خۆیا، کە ئەخلاق و ڕەوشتی بەرز زاڵبووتیایا، سەنگ و تەرازووی ڕەوشتی پاك ئیشکەرو کاربەدەست و لە ژیانی مەردوم و لە یاسای حوکمڕانیدا، خوو ڕەوشتی بەرز گەشەی کرد تیایا لەگەڵ بازرگانی و پیشەسازی دا پێکەوە و بەدەست لەملی یەکتر، و بەرزی ڕۆح و ڕەوشت ئەڕۆیشت و دەستە مل بوو لەگەڵ پانی و فراوانی وولاتا، بەهۆی ئەوەوە تاوان و دەست درێژیی کەم بوو، خراپەکاری و دەست

وەشاندن بەرچاو نەئەکەوت لەچاو پان و پۆڕی وڵات و زۆری دانیشتوانی دا، لەگەڵ ئەوەدا پاڵ پێوەنەرو هۆی زۆریش هەبوو بۆ ئەو تاوان و خراپەکاری و دەست درێژی یانە، وە پەیوەندی و پەیوەستی نێوان گەل و ئەندامی گەل زۆر بەهێزو پتەوو شیرین بوو، بەڕاستی ئەو چەرخ و دەورەیە بە جۆرێ بوو بە خەویش بەرزتر لەوە نەئەبینرا، و بەدڵ نایە پاك و خاوێن تر لەوەو كەشخەتر لەوە....

ئەمەی کە باسکرا هێندێ بوو لە نیشانەو سیفەتەکانی ئەو چەرخ و ماوە پیرۆزەی کە ئادەمی و ئادەمێتی تیا ژیا لەچێر سایەی ئەو یاسا و دەستووره ئیسلامی یەی کە ئەم سوورەتی (العصر) پایەو بنەڕەتەکەی داڕشت، وە لەژێر ئەو ئاڵا ئایینی یەی کە کۆمەڵی بڕواو کردەوە چاکەکان هەڵیان گرت و بەرزیان کردەوە، ئینجا ئەو خۆشبەختی و کامەرانی یە لەکوێ و ئەم گومڕایی و ون بوون و زایە بوونە لە کوێ کە ئادەمی و ئادەمێتی ئەمڕۆ پێیان دەرنەدارەو لە هەموو وڵات و شوێنێکا، وە ئەو زەرەرو زیانیاری یەی کە ئادەمی و ئادەمێتی دووچاری بووەو بەدبەخت بوو پێ ی، کوێر بوون لەو خێرو پیت و فەڕە گەورەی کە گەلی عەرەب دەست کەوتی بوو هێنای بۆ ئادەمی و ئادەمێتی لەو ڕۆژەدا کە هەر ئاڵای ئیسلامی بەرزکردەوەو بێجگە لە ئیسلام هیچ مەبەست و نیازێ تری نەبوو تا بەهۆی ئەوە سەرکردایەتی کەوتە دەست و بووبە مامۆستای فێرکردن و پەروەردە بۆ جیهان و ئادەمی.

ئینجا ئەو ڕایەتەی دانا و دەست بەرداری بوو بەهۆی ئەوە کەوتە چاڵی بەدبەختی و لەکاروان دواکەوت و بوو بە شوێن کەوتە لەژیانا و لە جیهانا، لەپاش ئەوە هەموو کاروانی ژیان بەرەو زیان و زیامبوون ڕۆیی، هەموو ئاڵاکان بوون بەئاڵای شەیتان و تەنها ئاڵایە نەما کە هەر هینی خوا بێت، هەموو بووبە ئاڵای بەتاڵ و ناهەق هەموو بوو بە ئاڵای کوێریی و گومڕایی. هەموو بوو بە ئاڵای زیان و زیانباری!! ئینجا با بزانرێ کە ئاڵا بێ وێنەکەی خوا هەر هەیەو هەر ئەمێنێ، چاوەڕوانە بۆ دەستێ کەبەرزی بکاتەوە، بۆ گەل و میللەتێ کەبێتە ژێری و بڕوا بەرەو خێرو خۆشی و ڕزگاری.

ئەوە لەبارەی قازانج و زیان لەم جیهان و زەوی یەدا، و قازانج و دەست کەوتی ئەم جیهانە لە ژێر ئاڵای خوادا هەر چەند بەرزو بڵند بێت زۆر بچوك و بێ نرخ دەرئەچێ کاتێ بەراوورد بکرێ لەگەڵ قازانج و دەست کەوتی ڕۆژی دوایی کە کەسانێکی پێ بەهەرمەند ئەبن کە ئەمڕۆ بێجگە لە ئاڵای خوا ئاڵایەتریان ناوێ، هەروەها هەر زیانێ کە ڕوو ئەکاتە ئەوانەی کە

ئالآی خوا بەرز ناکەنەوە هەر چەند سەخت و گەورەبێت لەم جیهانەدا، زۆر بچوك و سووکەو هیچ چاو نادات کاتێ بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو زیانەی کە دووچاری ئەبن لە ڕۆژی دوایی دا، بەڕاستی قازانج و زیانی ڕاستەقینە ئەوەیە لەو جیهان، لەو ماوە درێژو نەبڕاوەدا، قازانج و زیان هەر لەوێیە لەڕووی ڕاستیدا، قازانجی گەیشتن بە بەهەشت و ڕەزامەندی خوا، وە زیانی گەیشتن بەئاگری دۆزەخ و خەشمی خواو بێبەش لە ڕەحم و بەزەیی بێ سنوورەکەی، لەوێ مەردوم ئەگات بە پلەی هەرە بەرزی، یا دێتە خوارەوەو ئادەمێتی لەکیس ئەچێ و ئەڵێ: ئای کاشکی خۆڵ و گڵ بوومایە. ئەم سوورەتە کورتە، بەڵکو تەنها ئایەتی سێیەم بەڕوونی ڕێگای دیاری کردو نەخشەی کێشاو ڕوونی کردەوە کە تەنها ڕێگەیە بێ زیانەو ڕزگارییەو ئیتر بێجگە لەوە ڕێگەی زیان و زیانبازییە، ڕێگەی بڕواو کردەوەی چاك و بەرپا بوون و پەیدابوونی گەل و کۆمەڵی موسڵمان کە ئامۆژگاری یەکتر بەکەن بەڕاست و ڕاستی و بەخۆگرتن وەك باس کرا.

جا لەبەرئەوە هەر دوو پیاوێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ ئەگەیشتن بەیەك جیانەئەبوونەوە هەتا یەکێکیان ئەم سوورەتەی ئەخوێندەوە بەسەر ئەوی ترا، ئینجا یەکێکیان سەلامی ئەکرد لەوی ترو ئینجا جیائەبوونەوە لە یەکتر، پەیمانیان ئەبەست لەسەر ئەم یاساو دەستووری خواییە، بەڵێ ڕاستە ئەم سوورەتە ئێجگار گرنگە، ڕەحمەتی خوا بڕژێ بەسەر (ئیمامی شافعی)دا کە ئەیفەرموو: ئەگەر بێجگە لەم سوورەتە هیچی تر نەهاتایەتە خوارەوە ئەم سوورەتە بەس بوو بۆ هەموو، چونکە هەموو عیلمەکانی قورئان ئەگرێتەوە.

وصلى الله وسلم على الحبيب المصطفى وعلى آله وكل تابع لهم باحسان

## سوورەتی «الهُمَزة»
## مەککەییەو (٩) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سوورەتە وێنەو شێوەی هێندێ لە ئادەمی نیشان ئەدات کەبوون لەناو گەلو کۆمەڵی یەکەم چەرخی ئەم ئایینەدا، لە هەمان کات نموونەیەکە لە هەموو تاقمو چینێکا هەبووەو هەر ئەشێت. شێوەو وێنەی ئادەمی‌یەکی بێ نرخی ناکەسە کە بەلایەوە هەر پارەو دارایی شتە، لەکەو نەنگو نەگبەتی تەنها لاتیو بێ نەوایی‌یە، وەلای‌وایە ڕێزو نرخی هەموو شتێو هەموو کەسێ ئەبێ بەگەزو تەرازووی سامانو دارایی پێوانەو کێشانە بکرێ، بەڵکو ئەو پارەو ماڵە ئەپەرستێو پشت هەر بەوە ئەبەستێ لە هەموو کارو بارێکیا، و لای وایە مردنی لێ دوور ئەخاتەوە، بەرگری هەموو قەزاو هەدەرێکی لێ ئەکات، ئەگەر زیندوو بوونەوەو ڕۆژی دوایش بەڕاست گەڕاو هات لەوێش کاری بۆ ئەکاتو لە هەموو شتێ ئەی پەڕێنێتەوە!

جالەبەرئەوە هەمیشە دڵی وا لەلای ئەو ماڵو سامانەیو چاوی تێئەبڕێ لەیەکی ئەداتەوەو بەکەشخەو خۆشیەوە ئەی ژمێرێ، وە بەو ماڵو سامانە خۆی لێ ئەگۆڕێو زۆر بە گەورە سەرنجی خۆی ئەداتو مەردوم بە سوکو بێ‌نرخ سەیر ئەکات، تاڕادەیە گاڵتەو لاقرتیان پێ‌ئەکاتو بەچاوو بەبرۆو بەدەستو بەزبان تەشەر ئەداتو لەکەداریان ئەکات!

ئەوەیە وێنەو شێوەی زۆر پەستو نامەردانەی هەرکەسێ کە بێ‌بەش بێت لە پیاوەتیو مەردایەتیو ڕووت بێت لە بڕوا، بێ‌گومان ئەو وێنەو شێوەیە زۆر بێزراوو قیزەوونە بەلای ئیسلامەوە، دژو پێچەوانەی بیروبڕواو مەبەستەکانیەتی، لەزۆر شوێن جڵەوگیری کردووە لەلاقرتی کردنو تەشەردانو لەکەو ڕەخنەگرتن لە مەردوم، بەتایبەتی لێرەدا کە زۆر بەسەختو بەتین گرتوویەتیو زۆر بە ناشیرینی دەرئەکاتو هەڕەشەی سامناکی لەسەر ئەکات، لەوەوە وا دەرئەکەوێ کە ئەو شێوەو کردەوە پەستە بەکارهێنرابێ لەلایەن بت پەرستەکانەوە دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان، چەند ڕیوایەتێ هاتووە بەدیاری کردنی چەندکەسێ لەوبت پەرستانە لەو بارەیەوە، بەڵام شێوەی باسو هەڕەشەکەی گشتییە کەواتە تایبەتیان ناکەین، هەرچەند ئەم سوورەتە بە بۆنەی ئەوانەوە هاتبێتە خوارەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّاۖ
لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴿٦﴾

---

ئینجا گوێ شلکەین بۆ سوورەتەکەو بەڕاستی دڵی بدەینێ، ئەفەرموێ:

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ﴾ لەناو چوون، یا خەشم و سزای خوا بۆ هەرکەسێکە کەناوی مەردوم ئەبا بەخراپەو تانەو تەشەر ئەدات و هەوڵئەدا بۆ سوک و ڕیسواکردنی بەهەرجۆر بۆی بکرێ، وەئەوەی کردووە بە باوو پشە بۆ خۆی، کە ئەوەش ﴿ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ﴾ کەسێ کەماڵی زۆری کۆکردووەتەوە هەموو جارێ ئەی ژمێرێ لەبەرئەوەی زۆری خۆش ئەوێ و دڵی بەستراوە پێیەوەو پشتی هەر بەو بەستووە تاڕادەیە ﴿يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ﴾ وا ئەزانێ کە ماڵ و داراییکەی ئەیهێڵێیتەوە بە ئێجگاری و نایەڵێ هەرگیز بمرێ و مانەوەی بۆ مسۆگەر کردووە، واتە ئەو داراییە ئومێدی مانەوەی ژیانی بەهێزکردووە لە دڵیا تاڕادەیە سەری لێ تێکداوەو لای وایە ژیان و دووری لەناخۆشی بەستراوە بەو شتانەی کە بەڕووالەت هۆی ژیان و تەنروستین، وە ئەو هۆیانەش بەدارایی دەستکەوت ئەبن، کەواتە هەڵئەخەڵەتێ و وائەزانێ ئەو داراییە ئەی هێڵێتەوە هەتا هەتایە.

یا ئەو ئومێدی مانەوەو ژیانە مردنی لەبیر ئەباتەوەو خەریکی ئەکات هەر بەم ژیانەوە، وە پاڵی پێوە ئەنێ بۆ درێژەدان لەدروستکردنی خانوو کۆشک و باغ و بێستان و زەوی و زارو چەند کردەوەیە کەئەبێ کەسێ بیانکات لای وابێ کەهەرگیز نامرێ، بە هەر حاڵ ئەو کەسە هەڵخەڵەتاوەو هەر ئەبێ بمرێ و ئەو بارو حاڵەی کەلەسەریەتی سەری ئەکات بە دۆزەخا، لەبەرئەوە قورئان بەم شێوە سەختە ئەدا بەدەمیا و هەڕەشەی لێ ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿كَلَّاۖ﴾ نەخێر وانییەو باوا نەزانن ﴿لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ﴾ سوێند بەخوا تورئەدرێنە ناو ئاگرێکی بەهێزی تێکشکێنەرەوە ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ﴾ تۆ نازانی ئەو ئاگرە چییە، ئەو ئاگرەی کە هەرچی تێخرا ئەیهاڕێ و دایئەپاچێ، ئەو ئاگرە ئاگرێکە لە زانین و تێگەیشتنی مەردوم بەدەرە! ئینجا هێندێ سیفەت و نیشانەی باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ﴾ ئەو ئاگرەی کە ناوبرا بە ﴿ٱلۡحُطَمَةُ﴾ ئاگری خوایە کەهەڵگیرسێنراوە بە فەرمانی خوا.

﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ﴾ كە ئاگرێکە هووروژم ئەباتە سەر دڵەکان و دایان ئەگرێ! ئەو دڵانە کە ناسکترین بەش و پارچەن لە لەشداو کەمترین ئازارو سزای سەخت وەرئەگرن، ئەو دڵانە کە جێگەی بیروباوەڕی پیس و خووڕەوشتی خراپن و کانگای هەموو کردەوەیەکی بەندن، لەو دڵانەوە هەڵئەقوڵێ لە خۆگۆڕان و خۆ بەزل زانی و نرخ دانەنان بۆ مەردوم و تانەو تەشەر لێدان و دەم درێژی کردن دەربارەی خەڵکی کەواتە ئەو دڵانە مافی خۆیانە کە ئەو ئاگرە سەختە ئەدا بەسەریانا بەو جۆرە، بەڕاستی هەڕەشەکە ئیجگار سامناکەو تۆڵەکە زۆر سەخت و بەتینە، ئەبوایە هەر بەبیرلێکردنەوەی خەو و خۆراك لە مەردوم هەڵگیرایە!! بەڕاستی ئاوازەو دەنگی ووتەو پیتەکان و ناوبردنی ئاگرەکە بە ﴿ٱلْحُطَمَةُ﴾ دڵی ووریا دائەچڵەکێنێ، وە ناوبردنی بە ئاگری خوا ئەوە نیشان ئەدات کە ئاگرێکی تاقانەیەو وەك هیچ ئاگرێ تر نییە ئینجا لە هەموو خراپترو سەخت تر ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾ بەڕاستی ئەو ئاگرە دانراوە لەسەریان قاپیەکەی پێوە دراوەو قفڵ دراوە لێیان، کەواتە بەهیچ ڕەنگ ڕێی دەرچوون و ڕزگاربوونیان نییەو هەناسەو بایەکیان بۆ دەرناکرێ بەوجۆرە ئەمێننەوە لەکاتێکا ﴿فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةِۭ﴾ وان لەناو چەند عەموێکی ڕاخراوا بەدرێژی، بەکەلەپچە کراوی و بەستراوەیی!! خوا پەنامان بدا بەبەزەیی خۆی.

وەرە بیربکەرەوە لە سزای وا: ئاگری تاودراوی خوا، کابرای تێتوڕدرێ و قاپی لەسەر داخرێ و لەگەڵ ئەوەشدا بەکۆتکراوی ببەسترێتەوە بە مێخ و عەمودی ئاگرینەوە! ئەو تۆڵە سەختە دەق و سەربەرە لەگەڵ تاوانەکەدا: ئەو کابرا خوا دروستی کردو سامان و دارایی دایە

کەچی سەرکێشی کرد لە پەرستنی و بڕوا بەو پەروەردگارە، لەباتی ئەوا دارایی و سامانەکەی پەرست و لەخۆی گۆڕا و بەچاوی سوک و ڕیسوایی سەیری بەندەکانی خوای ئەکرد، دەمی بەرەلاکرد لێیان بەتانە و تەشەردان و لەکەدارکردن و ناوبردنیان بە خراپە، کەواتە ئەبێ خوای داد پەروەریش بەو جۆرە تۆڵەی لێ بسێنێ.

ئابەو جۆرە قورئان ئەگەڕا بەدوای ڕووداوەکانی ئاین و بانگەوازەکەیا و ئەیگرتنە ژێردەست و سەرکردایەتی ئەکردن، ئەوەش چەکێکی بەکاری بڕندە بوو بۆ پارەپارە کردنی پیلانی پیلان گێڕان و دڵی دوژمنانی ئەخستە لەرزە و ئارامی ئەدا بەدڵی بڕواداران و دامەزراوی ئەکردن. لەو جڵەو گیرو هەڕەشەکردن و دەم کوت کردنەی کەلەم سوورەتەدا کرا دەربارەی ئەو شێوە نامەردییەی کە باس کرا دووشت وەرئەگیرێ:

یەکەم: ناشیرین کردنی پەستی و بەد خویی و قیزەونکردنی ئەو شێوە نامەردیە لەدەروونا.

دووەم: لەسەرکردنەوە و بەرگری کردن لەبڕواداران و پاراستنیان لەوەی ڕیسوایی و سەر شۆڕی ڕوویان تێبکات و دڵنیا کردن بەوەی کە خوا ئاگادارە بەو جۆرە شتانەی کە ڕوویان تێ‌ئەکات و پێشی ناخۆشە، وە تۆڵەیان ئەسێنێ... بەڕاستی ئەوەش بەسە بۆ بەرزکردنەوەی ڕۆح و دەروونیان و بڵندی و سەرکەوتنیان بەسەر پیلانی دوژمنان.

وصلى الله وسلم على من انزل عليه هذا القرآن الكريم وعلى آله

## سووره‌تی «الفيل»
## مه‌ككه‌ییه‌و (٥) ئایه‌ته

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئه‌م سووره‌ته ئاماژه ئه‌كات بۆ ڕووداوێكی زۆر به‌ناوبانگ كه ڕووی دا له نیوه دوورگه‌دا، له ساڵی له‌دایك بوونی پێغه‌مبه‌را (ﷺ) ئه‌و ڕووداوه به‌ڵگه‌و نیشانه‌یه‌كی ئاشكرایه له‌سه‌ر به گرنگ گرتن‌و چاودێری خوا بۆ ئه‌و ناوچه پیرۆزه كه خوا هه‌ڵی بژار بۆ ئه‌مه‌ی ببێ به‌جێگه‌ی هه‌ڵهاتن‌و بڵاوبوونه‌وه‌ی دواترین به‌رنامه‌و شه‌ریعه‌تی خۆی، وه‌ببێ به په‌روه‌ردگای ئایین‌و ئاقیده تازه‌كه‌ی، وه‌ببێ به خاڵ‌و نوخته‌ی ڕاپه‌ڕین بۆ فڕاندن‌و ده‌ربه‌ده‌ركلادنی نه‌فامی‌و شۆڕش كردن به‌سه‌ر هه‌موو به‌دخوویی‌و به‌دكرداری‌یه له‌ڕووی زه‌وی‌دا، وه جێگیر كرنی ڕێنموونی ڕاست‌و ڕاستی‌و هه‌موو خێری له جیهانا.

كورته‌ی ئه‌و هه‌موو ڕیوایه‌تانه‌ی كه هاتوون له‌باره‌ی ئه‌م ڕووداوه ئه‌مه‌یه: ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌كار به‌ده‌ست‌و حاكم بوو بۆ یه‌مه‌ن له‌لایه‌ن پادشای حه‌به‌شه‌وه، كه ناو ئه‌برێ به (ئه‌بره‌هه) كه‌نشینه‌یه‌كی دروستكرد له یه‌مه‌نا به‌ناوی پادشای حه‌به‌شه‌وه، به هه‌موو عه‌نعه‌نه‌و ته‌نته‌نه‌یه‌كه‌وه، به‌نیازی ئه‌وه كه واز به عه‌ره‌به‌كان بێنێ له كه‌عبه‌و ڕایان كێشێ بۆ لای ئه‌و كه‌نشته‌یه، چونكه ئه‌یزانی یه‌مه‌نی‌یه‌كان وه‌ك هه‌موو عه‌ره‌به‌كانی تری نیوه دوورگه دڵیان به‌ستراوه به كه‌عبه‌وه، له‌و باره‌یه‌وه نامه‌ی نووسی بۆ پادشای حه‌به‌شه، بێگومان ئه‌ویش شتی وای زۆر پێخۆشه، به‌ڵام عه‌ره‌ب ده‌ست له‌و ماڵه پیرۆزه هه‌ڵناگرن، چونكه لایان وابوو كه ئه‌وان له نه‌وه‌ی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)ن كه خاوه‌نی ئه‌و ماڵه پیرۆزن، ئه‌وه‌ش هۆی كه‌شخه‌و شانازی‌یان بوو به‌پێی باوی خۆیان كه زۆر كه‌شخه‌یان ئه‌كرد به‌نه‌سه‌ب‌و نه‌ژاده‌وه،و بیرو باوه‌ڕی خۆیان ــ هه‌رچه‌ند پڕوپووچ بوو ــ به‌لایانه‌وه چاكتر بوو له بیروباوه‌ڕی ئه‌هلی كیتاب كه به‌ده‌وریانا بوون، له كاتێكا ئه‌یان كه ئایینه‌كه‌ی ئه‌وانیش چه‌ند شتی پڕو پوچی تێكه‌ڵ كرابوو، له‌به‌رئه‌وه (ئه‌بره‌هه) بڕیاری ته‌واوی دا له‌سه‌ر ڕووخاندنی كه‌عبه تا خه‌ڵكی لێ دووربخاته‌وه‌و ڕایانكێشێ بۆلای كه‌نشته‌كه‌ی خۆیان، له‌شكرێكی زۆری به‌هێزی خسته‌ڕێ به چه‌ند فیلێكه‌وه، وه فیلێكی زۆر گه‌وره‌و به‌ناوبانگیان بوو كردی به پێشه‌نگ بۆ له‌شكرو فیله‌كان، ئینجا ئه‌و هه‌واڵ‌و نیازه كه‌وته ناو عه‌ره‌به‌كان،

بیستان و بەنیازەکەیان زانی، دیارە ئەوەش زۆر سەختە لەدڵیانا، لەبەر ئەوە (ذونفر) کەیەکێ بوو لە گەورەو پادشاکانی یەمەن، بەخۆی و گەلەکەی و هەرکەسێ تر کە لەگوێی کرد وەستان لەڕێگەیانا و جەنگیان کرد لەگەڵی، بەڵام بەرگەیان نەگرت و شکان و (ذونفر) بەدیل گیرا.

ئینجا (نفیل) کوڕی (حبیبی قشعمی) بەدوو هۆزی عەرەبەوە بەرەنگاری وەستان ئینجا ئەوانیش هەر شکان (نفیل) بەدیل گیرا، لەپاشا ڕازی بووبێ بەدەلیل و ڕێگە نیشان دەریان، ئینجا ڕۆشتن هەتا گەیشتنە (تائیف) لەوێدا چەند پیاوی لە هۆزی (ثقیف) هاتن بەدەمیانەوەو وتیان: ئەوماڵەی تۆ بەدوایا ئەگەڕێی لێرە نییەو لە مەککەیە، ئەوەش بۆ ئەوەی لایدەن لەو ماڵەی کە دروستیان کردبوو بۆ بتەکەیان کە ناوی ئەبرا بە (اللات) وە پیاویان لەگەڵ ناردن کە ڕێگەیان نیشان بدات بۆ سەر کەعبە! ئینجا کە (ئەبرەهە) گەیشتە (المغمس) شوێنێکە لەبەینی (تائیف)و (مەککەدا)، سەر لەشکرێکی نارد لە پێشەوە بۆ مەککەو ئەویش هەرچی مەڕو ماڵات و حوشتری قوڕەیش و ئەو ناوە بوو تاڵانی کردو ناردی بۆ (ئەبرەهە) وە لەناو ئەوانەدا دوو سەد حوشتری (عبدالمطلب)ی تیا بوو لەو چەرخەدا (عبدالمطلب) گەورەو سەرۆکی (مەککە)و (قوڕەیش) بوو، ئینجا (قوڕەیش)و (کنانە)و (هوزەیل)و هەرکەس بەو دەورەدابوو نیازیان کرد جەنگ بکەن، ئینجا بۆیان دەرکەوت کە دەرەقەت نایەن لەبەرئەوە وازیان لەوە هێنا.

(ئەبرەهە) فروستادەیەکی نارد بۆ مەککە بۆ ئەمەی ڕای گەیەنێ بەگەورەی ئەو شارە کە پادشا نەهاتووە بۆ جەنگ لەگەڵ ئەوان، بەڵکو هاتووە بۆ ڕووخاندنی ئەو ماڵە، جا ئەگەر ئەوان دەنگ نەکەن ئەوە هیچ پێویست نییە بە خوێن ڕێژی! وە ئەگەر گەورەی شارەکە جەنگی ناوێ بێت بۆلای پادشا... ئینجا کاتێ کە قسەکەی ڕاگەیاند، (عبدالمطلب) پێی ووت: ئێمە جەنگمان ناوێ و توانای جەنگ کردنیشمان نییە، ئەم ماڵە ماڵی خوایەو ماڵی (ئیبراهیمی خەلیل)ە (علیه السلام)... جا ئەگەر خوا بەرگی لێ بکات ئەوە ماڵی خۆیەتی و ڕێزگیراوی خۆیەتی، وە ئەگەر خوایش وازی لێ ئەهێنێ ئەوا ئێمە هیچمان پێناکرێ... ئینجا لەگەڵی ڕۆیشت بۆلای (ئەبرەهە).

(ئیبن و ئیسحاق) ئەڵێ: (عبدالمطلب) پیاوێکی بەسیماو بەشان و شەوکەت و شیرین بوو، کە لەگەڵ (ئەبرەهە) بینی زۆر بەگەورەو بەڕێز هاتە پێش چاوی، ئەوەندە ڕێزی بوو لای نەیویست خۆی لەسەر کورسی بێت و ئەو لە خوارەوە پێشی ناخۆش بوو حەبەشەکان

ببینن لەسەر تەخت و لەشانی پاشادا دانیشێ، لەبەرئەوە خۆی لەتەختەکە هاتە خوارەوەو لەسەر فەرش دانیشت و (عبدالمطلب)ی لای خۆی دانا، ئینجا وتی بەدیلماجەکەی: پێی بڵێ: پێویستیت چیە؟ (عبدالمطلب)یش فەرمووی: دوو سەد حوشترم گیراوە بەتاڵانی براوە بمداتەوە، ئینجا کەئەوەی پێ وت (ئەبرەهە) وتی: پێی بڵێ: کاتێ کە بینیم زۆر بە گەورەو گرنگ هاتە بەرچاوم سەرم سووڕما لێی، ئینجا کاتێ کە قسەیم وەرگرت لەبەرچاوم کەوت، ئایا بۆ تکای دووسەد حوشترم لێ ئەکەیت و باسی ئەوماڵە ناکەیت کە ئایینی خۆت و باوك و باپیرتی لەسەرەو من هاتووم بۆ ڕووخاندنی؟ (عبدالمطلب) فەرمووی: من خاوەن حوشترەکانم، بێگومان ئەو ماڵەش خاوەنێکی هەیە بەرگری لێ ئەکات (ئەبرەهە)ش وتی: ناتوانێ سەرپێچی بکات لەمن، ئەویش وتی: ئەوە تۆو ئەوە ئەو!.. ئینجا حوشترەکانی دایەوە، ئینجا (عبد المطلب) گەڕایەوە بۆ مەککەو هەواڵەکەی پێدان، وە فەرمانی دا کە لەو (مەککە) دەرچن و خۆتان پەنا بەن لە شیوو دۆڵی شاخەکان، ئینجا هەڵساو هەڵقەی قاپیەکەی کەعبەی گرت، وە چەند کەسی تر لە قورەیش هەڵسان و دەستیان کرد بە نزاو پاڕانەوە لە خواو داوای یارمەتی و سەرکەوتنیان کرد لێی، ئەگێڕنەوە لە (عبد المطلب)ەوە کە وتی: (لا هَمَّ إنَّ العبدَ يَمنَعُ رحلَهُ فَامنَع رِحالَك، لا يَغلِبَنَّ صليبُهُم و مِحالُهُم أبَداً مِحالَكَ، إن كُنتَ تارِكَهُم و قِبلَتُنا فَأمرُ ما بَدا لكَ) واتە: ئەی خوایە بەندە بەرگری ئەکات لە شت و مەکی خۆی، دەی تۆش بەرگری بکە لە شتی خۆت با سەلیب و پیلانیان زاڵ نەبن بەسەر کردەوەو پیلانی تۆدا ئەگەر تۆ واز ئەهێنی لەوان و ڕووگەکەی ئێمە ئەبێ لەبەر هەر هۆیە بێت کە بۆ تۆ دەرکەوتووەو خۆت ئەزانی و ئێمە نایزانین، ئینجا (ابرهە) لەشکرو فیلەکەی بەرەو مەککە ڕێکخست، ئینجا فیلەکە ئەژنۆی داداو بەرەو مەککە نەڕۆیشت، هەرچەند هەوڵ و تەقەلایان دا لەگەڵی هیچ سوودی نەبوو، ئەو ڕووداوەش شتێکی ڕاستە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە (بوخاری) ڕیوایەتی ئەکات: کە لە ڕۆژی (حودەیبیە)دا حوشترەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەژنۆی داداو بەرەو (مەککە) نەڕۆیشت، ئینجا موسڵمانەکان وتیان: سینی کردووە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: سینی نەکردووەو ئەوە خووی ئەم نیە، بەڵکو ئەو کەسەی کە فیلەکەی وەستان و بەندی کرد لە چوون بۆ (مەککە) ـ واتە خوا ـ هەر ئەو کەسە ئەمیشی وەستان و بەندی کردووە، هەروەها (بوخاری)و (موسلیم) حەدیسێ ئەهێنن کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی گرتنی (مەککە)دا فەرمووی: خوا فیلەکەی بەند کرد

لەوەی بێتە سەر (مەککە)و پێغەمبەرەکەی‌و بڕوادارانی زاڵ کرد بە سەریا... هتد. کەواتە ئەو ڕووداوە شتێکی ڕاستەو خوا ئەو فیلەی بەرگری کرد لە ڕۆیشتن بۆ (مەککە) لە ڕووداوی ڕۆژی فیل دا.

ئینجا ئەوەی کە خوا ویستی بەدی هات: لەشکرەکەو سەرۆکەکەی لەناو بردبەم ڕەنگە پۆل پۆل پەلەوەری نارده سەریان ورده گڵمەتی لێدان تا لەناوی بردن، بەو جۆرەی کە لەم سوورەتەدا ئەیفەرموێ، وە (ابرهه) دووچاری دەردی خۆی بوو، لەشی داڕزاو پارە پارە بوو، چەند کەسێ لەگەڵ خۆیان گێڕایانەوە بۆ شاری (صنعاء) ئینجا نەمرد هەتا سنگی لەت بووو دڵی هاتە دەرەوە، وەك لە چەند ڕیوایەتێکا ئەفەرموێ. چەند ڕیوایەتێ هاتووە لەبارەی جۆری ئەو باڵندەو پەلەوەرانەو شێوەو قەبارەیان‌و ئەندازەو قەبارەی ئەو بەردانەو جۆریان‌و چۆنێتی لێدان‌و کردەوەی ئەو پەلەوەرانە، هەرچۆنێ لە هێندێ لەو ڕیوایەتانەدا هەیە کە دەردی ئاوڵەو سورێژە لەو ساڵەدا پەیدا بوو لە (مەککە)دا.

ئەو کەسانەی کە حەز ئەکەن لە تەنگ کردنەوەی چوارچێوەی خەواریق‌و شتە نهێنی‌و غەیبی‌یەکان، و ئەیانەوێ هەموو شتێ لەوانەوە بگێڕنەوە بۆ باوو یاسایە کە خوا لەم بوونەوەرەدا دایناوە، ئەوانە ئەیانەوێ ئەو بەسەرهات‌و ڕووداوە بەرن بەسەر دەردی ئاوڵەو سوورێژەدا، وە باڵندەکانی بەرن بەسەر مێش‌و مێشوولەیەکا کە میکرۆبی ئەو دەردانەیان هەڵگرتبێ‌و گەیاندبنیان بەو لەشکرە، یەکێ لەوانە (شێخ محمد عبدە)یە -خوا لێی خۆش بێ- کە لە تەفسیری ئەم سوورەتەدا ئەفەرموێ: لە ڕۆژی دووەما ئەو دوو دەردە بڵاو بوویەوە لەو لەشکرەدا، (عیکریمە) وتوویەتی: ئەوە یەکەم ئاوڵەیە بوو کە پەیدابوو لە وڵاتی عەرەبدا، وە (یعقوبی کوڕی عوتبە) ئەڵێ: یەکەم جاری دیتنی ئەو دوو نەخۆشی‌یە لەو ساڵەدا بوو، ئەو نەخۆشی‌یە کارێکی وای هێنا بەسەر لەشی ئەو لەشکرەدا زۆر بە دەگمەن شتی وا ڕوویدابێ لە جیهانا، لەشیان داڕزاو پارەپارە ئەکەوتە خوارەوە، بەهۆی ئەوە لەشکرێ کە بە سەرۆکەکەیانەوە بە بیم‌و لەرزەوە ڕایان کردو گەڕانەوە تا بەو جۆرەیان بەسەرهات. ئینجا (شێخ محمد عبدە) ئەفەرموێ: ئەمە شتێکە هەموو ڕیوایەتەکانی لەسەرە،و بڕوا پێ‌کردنی شتێکی ڕێك‌و ڕاستە، وە ئەم سورەتەش بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە ئەو نەخۆشی‌و ئاوڵەیا سورێژە پەیدا بوو بەهۆی ئەو ورده بەردانەوە کە کەوتن بەسەر ئەو لەشکرەدا، بەهۆی چەند پۆلێکی گەورە گەورە لە پەلەوەر کە خوا لەگەڵ با دا ناردنی.

ئەڵێ: کەواتە دروستە بڕوامان وابێ کە ئەو باڵندەیانە لە جۆری مێش و مێشوولە بن کە هەڵگری میکرۆبی هێندێ نەخۆشین، وە ئەو بەردانە لە قوڕێکی وشکی ژاراوی بووبن کە با هەڵی گرتبێ و لکابن بە لاق و پەلی ئەو گیان لەبەرانەوە، ئینجا کاتێ مێش و مێشوولەکە کەوتبێ لە لەشی ئەوانە، میکرۆبەکان چووبنە لەشیان و ئەو زامانەیان تیا فەراهەم هێنابێ تا لەشیان بەو جۆرەی لێهات، وە زۆر لەم باڵندە لاوازانە بە گەورەترین لەشکری خوا ئەژمێررێن بۆ لەناوبردنی هەرکەسێ کە خوا بیەوێ و مەیلی لێ بێ، ئەم گیانلەبەرە لاوازەی کە پێی ئەوترێ: میکرۆب لەو لەشکرانەن، ئەوەندە زۆرن هەر خوا ژمارەیان ئەزانێ، وە دەرکەوتنی بەرهەمی دەسەڵات و توانینی خوا لە لەناوبردنی یاخی و سەرکێشەکانا هیچ نەبەستراوە بەوەی ئەو پەلەوەرانە بەقەد کێوێ بن، یا جۆرێکی کە نەدیوو تایبەتی بن، یا ڕەنگ و شێوەو قەبارەیەکی دیاری یان ببێ.

ئەو یاخییە سەرکێشە کە نیازی کرد ماڵی خوا بڕوخێنێ، خوا ئەو جۆرە باڵندەی بۆ ناردن کە هۆی ئەو نەخۆشیەی پێ گەیاند، بەهۆی ئەوە خۆی و لەشکرەکەی لەناوبردن پێش ئەوەی بگەنە مەککە، ئەوەش چاکەو بەهرەیە بوو خوا ڕشتی بەسەر دانیشتوانی (مەککە)دا ــ لەگەڵ ئەوەی بت پەرست بوون ــ لەبەر پارێزگاری ماڵەکەی خۆی، هەتا کەسێکی بۆ ڕەوانەکا پارێزگاری بکا بەهۆی هێزی ئایینەکەیەوە، وە ئەوە تۆڵەو سزایە بوو خوا دای بەسەر ئەوانەی کە ویستیان دەست درێژی بکەنە سەر ماڵەکەی خوا، ئینجا (شێخ) ئەڵێ: ئەمەیە ئەو ڕاو بارە کە پشتی پێ ببەسترێ لە تەفسیری ئەم سوورەتەدا، وە بێجگە لەمە ڕاست نیەو وەرناگیرێ مەگەر بە پینەو پەڕۆ تەئویل وە بەمە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا باشتر ئاشکرا ئەبێ کە تۆڵەی سەند لە کەسێ کە خۆی بەزل زانی و کەشخەی کرد بە فیلەوە کە گەورە ترین حەیوانە، لەناوی بردو لەڕیشەی هێنا بە بچوکترین گیانلەبەر کە بەچاو نابینرێ، هەموو ژیرێ ئەزانێ کە ئەمە گەورەترو نایاب ترو دڵگیرترە! ئەمە بوو بە کورتی ڕای (شێخ محمد عبده) لەم شوێنەدا. بەڵام بەڕاستی کە بیری لێ ئەکەینەوە ڕاو قسەکەی زۆر بە دوور دائەنێین و هیچ پێویستمان نیە بەو پینەو پەڕۆیە، لەبەر چەند هۆیە:

١- ئەوەی (شێخ) فەرموویەتی لادانە لە دیمەن و ڕواڵەتی ئایەتەکە، بێگومان ئەو لادانەش قەدەغەیەو نارەوایە مەگەر ناچار ببین، بەم ڕەنگە ئەوەی کە نیشانی بدا دژی ژیری بێ و ژیریی وەری نەگرێ، دەی ئایا چی تیایەو بۆ ئەبێ سەر بکرێتەوە لەوە کە بە

مەیل و فەرمانی خوا هەر باڵندەو پەلەوەریّ وردە بەرد بدا لە هەرکەسیّ و کاری لیّ بکات و زامداری بکات تا ڕادەیە لەشی داڕزیّنیّ؟ ئایا ئەم جۆرو شیّوەی کە لە دیمەنی ئایەتەکە وەرئەگیریّ لە دەسەلاّتی خوادا چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ ئەو جۆرو شیّوەی کە (شیّخ) بۆی داناوە؟ بیّگومان هەموو بڕواداریّ ئەزانیّ کە هەموو شت بۆ خوا وەك یەك ئاسانە، وە نابیّ هەر شتیّ پیّچەوانەی باوی ئیّمە بیّت ئیّمە بە نەشیاو و نەگونجاوی دابنیّین، بەڵکو هەر شتیّ دژو پیّچەوانەی باوی خوا بیّت هەر ئەوە نەشیاو و نەگونجاوە، وە ئەو شتانەی کە پیّیان ئەوتریّ: موعجیزەو خەواریق و پیّچەوانەی باوی ئیّمەن، ئەو شتانەش هەر کردەوەو باوی خوان، کەواتە ئەبیّ بەرانبەر ئەو موعجیزەو خەواریقانە ئیّمە دوو دڵ نەبین و بیّگومان بین، وە نابیّ پینەو پەڕۆو تەئویلیان تیا بکەین بۆ ویّنە ئایا هیچ بڕواداریّ ئەتوانیّ گومانی ببیّ و دوودڵ بیّت لەوەی کە داردەستە وشکەکەی (موسا) (علیه السلام) بوو بە ئەژدەها؟ بەڵکو ئەگەر ئیّمە ورد بینەوە ئەو شتانەی کە ئیّمە بە باویان دائەنیّین لە ڕووی ڕاستیدا هەموو موعجیزەو خەواریقن: هاتنی شەوو ڕۆژ بەدوای یەکاو چوونیان بەناو یەکترا موعجیزەو خاریقەیە، هەڵهاتنی خۆرو مانگ بەو جۆرو یاسا تیّرو نەگۆڕاوە موعجیزەو خاریقەیە، ئەو بارو شیّوەی کە شیّخی خوا لیّ خۆش بوو داینا بۆ ئەو ڕووداوە وەك لە پیّشەوە وترا هەر ئەو بارو شیّوەیە چەند موعجیزەو خەواریقیّ کە ڕیّکە لەگەڵ دیمەن و ڕواڵەتەکەیا، وە بیّ برین بەسەر موعجیزەو خەواریقیّکا کە ئەبیّ بە زۆرەملیّ و پینەو پەڕۆ بیچەسپیّنین؟!!

٢- ئەم بارو شیّوەی کە ڕواڵەتەکە ئەیگەیەنیّ و پیّچەوانەی باوی ئیّمەیە، ئەم بارو شیّوەیە بەهیّزترە لە پیّش چاوی مەردومدا زیاتر ڕیّزو پیرۆزی ئەو ماڵی خوا نیشان ئەدات کە خوا ویستی بیپاریّزیّت لە دەست دریّژی دەست دریّژی کەران و بیم و ترسی لیّ دوور خاتەوە، تا ببیّ بە مەرکەزو ڕووگە بۆ ئادەمیزاد، وە ویستی ڕووناکی دواترین ئایین و بەرنامەی لەویّ هەڵقوڵیّنیّ و بکشیّ بۆ هەموو جیهان، بەو بەسەرهات و ڕووداوە ئەو ماڵە پیرۆزەی بەڕیّزو سامناك بکات لەبەرچاوی دۆست و دوژمن، و بەوە دای لە دەماخی هەموو سەرکیّش و ستەمکاریّ کە نیازی خراپی ببیّ دەربارەی، وە کردی بە تەمیّ و دەم کوت کردن بۆیان، چونکە بە ئاشکرا بینرا دەستی قودرەت هاتە وەلاّم

لەسەر ئەو ماڵە پیرۆزە، ئەو لەشکرە بەهێزەی لەریشە هێنا بە بەردە باران کردنی لەلایەن ئەو کۆمەڵە پەلەوەرە لاوازانە، دەی ئەگەر بەو شێوەکەی تر بوایە کە (شێخ) فەرمووی ئەو ڕێزو پیرۆزیە بەو جۆرە ئاشکرا نەئەبوو لەبەرچاوی هەمووان، وە ئەو تەمێ‌و دەم کوت کردنە بەو جۆرە ڕوون‌و ڕەوانە بەدی نەئەهات.

٣- بە هەموو ڕیوایەتەکان وەك لە مێژوویشدا بەناوبانگە لەشی ئەو لەشکرە داڕزاو پارە پارە ئەکەوتە خوارەوە، دەی نەبیستراوە هەرگیز ئاوڵەو سورێژە کەسێکی وا لێ کردبێ، کەواتە ئەو بەسەرهاتە بە جۆرێکی تاقانەی کەس نەدیو بووە، بە پێچەوانەی باو کە پێی ئەوترێ موعجیزە یا خەواریق، وە ئەو ڕیوایەتی (عیکریمە)و (یەعقوب)ەش کە باس کران هیچ ئەوە ناگەیەنن کە ئەو لەشکرە دووچاری ئاوڵەو سورێژە بووبن، بەس هەر ئەڵێن کە لەو ساڵەدا ئەو نەخۆشیانە لەو دەورو بەرەدا پەیدا بوون، دەی ئەوەش زۆر شتێکی ڕێکەو لەوانەیە بەڵگەیە تر بێت لەسەر ڕاستی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتە، چونکە لەهەر وڵاتێ لەشی مردووو مرداری بوو زۆر بووو نەشارانەوە، بۆگەن‌و میکرۆبات هەوا پیس ئەکەن‌و بەهۆی ئەوە چەند نەخۆشی پەیدا ئەبن.

٤- ئەو بارو شێوەی کە شێخ کردی بە تەفسیر بەهیچ ڕەنگ بەدڵی ئەو یەکەم گەلەدا نەهاتووە، بەڵکو هەر ئەوەیان لێ وەرگرتووە کە ڕواڵەتەکە ئەی گەیەنێ: باڵندە پۆل پۆل هاتن‌و بە وردە گڵمتکی ڕەق لێیان دان‌و بەوە قەلاچۆیان کردن‌و چەن‌و مل خستنیان بەسەر یەکا، دەی لەو کاتەدا زۆربەی ئەو گەلە دوژمنی پێغەمبەر (ﷺ) و ئایینەکەی بوون، تا ڕادەیە لە نەتاشیوە بۆیان ئەتاشی‌و بە هەموو جۆر ئەگەڕان بەدوای ئەوەدا بە شتێ لەکەداری بکەن، وە ئەو ڕووداوەش دوور نەبووە، بەڵکو نزیکی پەنجا ساڵێ لەوەو بەر بووە، هەرکەس لەو چەرخەدا تەمەنی گەیشتبێتە (٦٠)ساڵ بەباشی لەبیری بووە، کەواتە ئەگەر ئەم ڕووداوەبەو جۆرە نەبوایە کە دیمەنی سوورەتەکە ئەیگەیەنێ، لە هەموو لایەکەوە ئەو دوژمنانە لێیان ئەکرد بە هەراو ئەیان گوت: ئەم درۆ زلە چی بوو کردت؟!!

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ﴿٥﴾

**وە ئاشكرایشە هیچ كەس هیچ ڕەخنەیەكی نەبوو بەرانبەر ئەم سوورەتە، كەواتە با هەموو كەس بەبێ باك تەفسیری ئەم سورەتە بكاتەوە بە پێی دیمەن و ڕواڵەتەكەی و بڵێ: خوا ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەت زانیوە بە زانینێ وەك بە چاو دیبێتت ﴿كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ﴾ كە چۆنی كرد پەروەردگارت بە خاوەنەكانی ئەو فیلەی كە بەناوبانگە؟ كە ئەوانەش (ابرهە)و لەشكرەكەی بوون، واتە بەڵێ زانیوتە هەرچەند خۆت نەت دیبێ، چونكە ڕووداوەكە زۆر بەناوبانگەو لە زۆر كەسیش بیستراوە كە لەو كاتەدا بوون ﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ﴾ ئایا پیلان و فرو فێڵەكەیان كە هەڵسان پێی بۆ لەناوبردنی كەعبەو وێران كردنی و وەرگێڕانی مەردوم لێی و ڕاكێشانیان بۆلای كەنشتەكەی خۆیان، ئایا ئەو پیلان و فرو فێڵەی بە هیچ دەرنەكردو ونی نەكردو بەتاڵی نەكردەوە؟ واتە بەڵێ ئەزانی كەخوای تۆ چۆنی پێكردن، وەك ڕوونیشی كردەوە كە ئەفەرموێ: ﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾ ناردیە سەریان باڵندەو پەلەوەر پۆل پۆل ﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ﴾ كە لێیان دان بە وردە بەردێ كە پەیدا ئەبێ لە قوڕێكی ڕەق، یا بەردێ كە قوڕی پێوە درابێ و وشك بووبێتەوە پێیەوە، واتە گڵمتكی ڕەق، وە بەو لێدانە لەشیان داڕزا ﴿فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ﴾ بەهۆی ئەوە خوا كردنی بە وێنەی گەڵای وشك كە خۆرەو سۆس لێی دابێ و پارە پارەی كردبێ، یا بەوێنەی كای خوراوی لێ كردن كە ماڵات و چوارپێ ئەیخوات و ئەیجوێ و ئەیكا بە هەویر، بەهەركام مەبەست ئەوەیە كە لەشی ئەو لەشكرە داڕزاو پارە پارە بووبەو گڵمتكانەی كە ئەو باڵندەیانە لێیان ئەدان!! بەم جۆرە ئەم سورەتەمان تەفسیر كردەوەو باوەڕمان وایە كە ئەم جۆرو شێوەیە مەبەستەو هەرگیز ناچین بەلای ئەو جۆرو شێوەی كە شێخی خوا لێ خۆش بوو كردی بە تەفسیر، بەڵام لە هەمان كاتا داوای ڕەحمەت و ڕەزامەندی خوا ئەكەین بۆ شێخ، چونكە ئەزانین بە ڕاستی خزمەتی ئیسلامی كردووەو ویستوویەتی بە هەر جۆر بووە ئیسلام**

بچەسپێنێ لە دڵی مەردومدداو ئەو زاتە لە چەرخێکی تایبەتیدا ژیاوە ناچار بووە بەم جۆرە تەئویل و لادان و پینەو پەڕۆیانە، ئەم زانا بەرزە لە چەرخێکا بوو خەریك بوو بە تەواوی ڕووناکی ئیسلام بکوژێتەوە لە دەروونی زۆربەی موسڵمانانیشا، وە ئەورووپا بە هەموو زۆرو چەك و دەسەڵات و پیشەسازیەکەوە وڵاتی ئیسلامی داگیر کردو سەلیبیێتی و سەهیۆنیستی جیهانی بە هەموو داخ و کینەو پیلانە شەیتانیەکانیانەوە هاتنە پێشەوە، لە هەموو بارو ڕوویەکەوە خەریك ئەبوون بەبێ وەستان و وچان بۆ دوورخستنەوەی ڕۆڵەی موسڵمانان لە ئیسلام بە گومان و بێبڕواکردنیان، وە لەلایە تریشەوە هەر لە کۆنەوە شتی پڕو پووچی زۆرو زەبەنەو ئیسرائیلیات بڵاو بووبووەوە لەناو گەل و لە جیهانا بەناوی ئیسلامەوەو کە ئیسلامیش لەوانە دوورە، بەینی ئاسمان و زەوی، لەو چەرخە ڕەش و تاریکەدا ئەم شێخە بەڕێزە قۆڵی لێ هەڵکردو سنگی خۆی کرد بە سوپەر بۆ بڵاو کردنەوەی ئیسلام و بەرگری کردن لێی، وە ئەم جۆرە لادان و تەئویل و پینەو پەڕۆی بەکارهێنا بۆ تیمارو چارەسەر کردنی هێندێ دڵی نەزانی نەخۆش، خوا پاداشتی بەخێر بداتەوە. ئینجا بگەڕێینەوە بۆ ژێر سایەی سورەتەکە بۆ ئەمەی ئەم چەند خاڵانەی لێ وەرگرین:

یەکەم: خوا نەیویست خانەو ماڵەکەی خۆی بپارێزێ لەسەر دەستی ئەو بت پەرستانەدا، هەرچەند ئەوانە شانازییان پێوە ئەکردو ئەوپەڕی ڕێزیان بوو بۆی و زۆر بە پیرۆز سەیریان ئەکرد، بەڵکو کاتێ ویستی بیپارێزێ دەستی قودرەتی خۆی خستە کارو ئاشکرای کرد کە بت پەرستەکان دەستەپاچەو بێدەسەڵاتنبەرانبەر هێزی دوژمن، بۆ ئەمەی ئەو بت پەرستانە هیچ چاکەو منەتێکیان نەبێ بەسەر ئەو خانەی خواوە، ئینجا بەرانبەر ئەو بەهرەو بەزەییە کە خوا بەکاری هێنا ئەبوایە عەرەب بە تێکڕایی و قوڕەیش بە تایبەتی بە چەچپانی و بەبێ خۆگرتن ملیان کەچ بکردایە بۆ فەرمانی خوا و ئەو پێغەمبەرەی کە لە خۆیان بۆی ناردن، کەچی بە پێچەوانە ئەوپەڕی سەرکێشی و مل هوڕییان بەکارهێنا، جا لەبەر ئەوە قورئان لە چەن شوێنا هەڕەشەی لێ کردن و هێرشی بردنە سەر.

دووەم: ئەم ڕووداوو بەسەرهاتە نیشانی داین کە خوا ڕێی ئەوانەی نەدا کە نامەدار بوون زاڵ ببن بەسەر خانەو ماڵەکەی و ئەو خاکە پیرۆزە، لەگەڵ ئەوە دانیشتوانی دەورووبەری بت پەرست بوون، بۆ ئەمەی ئەو خانەی خۆیە بمێنێتەوە بە ئازاد کراوی لە زۆرو دەسەڵاتی

ستەمكاران و دەست درێژی كەران و پیلانی پیلان گێران، تا ئەو خاكە ئازادو سەربەست بێت هەتا ئاین و ئاقیدەی تازە دێتە پێشەوەو بە ئازادی و سەربەستی لەو خاكەدا بڕوێ و پەل بكوتێ، وە هیچ هێزو دەسەڵاتێ زاڵ نەبێ بەسەر ئەم ئایینە پیرۆزەی كە هاتووە بۆ ئەمەی سەركردایەتی ئادەمی بكات نەك سەركردایەتی بكرێ و بێگومان ئەوەش بەشێ بوو لە بڕیارو تەگبیری خوا بۆ ئاین و خانەكەی خۆی پێش ئەمەی بە دڵی هیچ كەسا هاتبێ كە پێغەمبەری ئەم ئایینە لەو ساڵەدا لەدایك بووە!

ئینجا خوای گەورە كە ئەم خانەی خۆیە پاراست و نەیدا بەدەم نامەدارو مەسیحی یەوە لەو چەرخەدا كە دەروبەری ماڵەكەی بت و بت پەرستان بوون، كاتێ ئەوەی كرد ئەبێ لەپاش ئەوە باشتر بیپارێزێ لە هەموو زۆرداریێ لە كاتێكا كە دەوروبەری موسڵمان و خوا پەرستەو لە هەموو وڵات و ناوچەكانی جیهانەوە پێنج فەرزە ڕوو ئەكرێتە ئەو ماڵە بەفەڕە، كەواتە ئەبێ دڵشادو موژدە بەخش بین و باكمان نەبێ لەو هەموو پیلان و نیازی خراپەی كە هەن بەرانبەر ناوچە پیرۆزەكانی ئیسلام لەلایەن سەلیبی و سەهیۆنیەكانەوە كە چەند چەرخە خەریكن بەبێ وچان و وەستان، وە بە ئاشكراو لە پەنای پەردەوەخەریكن و هەموو جۆرە چەكێ بەكار ئەهێنن بۆیان و ئەیانەوێ نەیان هێڵن و داگیریان بكەن، ئەبێ بە ئیزنی خوا باكمان نەبێ لە مارەكەی سەهیۆنیەكان كە بە خەیاڵ پلاوی خۆیان دەوری مەدینەیان پێ‌داوە، باكمان لەو جۆرە نیازو كردەوە پیسانە نابێ، چونكە ئەو خوایەی كە مەككەو ماڵەكەی خۆی پاراست لەو پیلانە گەورەیە، هەر ئەو خوایە هەموو پیلانێ تریش بەهیچ دەرئەكات و ئەیداتەوە بە سەرو ملی پیلان گێڕەكانا!

سێیەم: ئەم سوورەتە نیشان ئەدات كە عەرەب لە پێش ئیسلاما هیچ هێزو كیان و سەربەخۆیی و ئازادییەكی نەبووە، لە یەمەنا لە ژێر چەپۆكەی فارس یا حەبەشەدا بووە، وە لەلای سەرەوە شام لەژێر حوكمی ڕۆما بوو لەڕێوە یا بە پێكهێنانی دەوڵەتێكی عەرەبی لەژێر حوكم و چاودێری ڕۆما. وە ئەوەی ڕزگار بووبێ لە ژێر چەپۆكەیی تەنها ناوەڕاستی نیوەدورگە بوو، بەڵام ئەویش ئەژیا بە ژیانێكی لادێیی و كۆچەرێتی، یا بە دووبەرەكی و ئاژاوە، كە هێزێكیان لێ پەیدا نەئەبوو كە گوێی پێ بدرێ و نرخ دار بێ لە مەیدانی هێزە جیهانیەكانا، وا ئەبوو جەنگ بەرپا ئەبوو لەناو تیرەكاناو درێژەی ئەكێشا چل ساڵ،

بەهەرحاڵ ئەو هەموو تیرەیانە بە تەنها تەنهاو کۆو پێکەوە گوێیان پێ نەئەدراو نرخیان نەبوو لەناو دەوڵەتە بەهێزەکانی هاوسێیانا، ڕووداوی ساڵی فیل بەڵگەو نموونەیە بۆ ئەوەی کە وترا، عەرەب بەو جۆرە بوون لەپێش ئیسلاما، بەڵام لەژێر ئاڵای ئیسلاماو بۆ یەکەم جار لە مێژووی عەرەبا هێزێکی دەوڵەتی جیهانییان بۆ پەیدا بوو کە سامو بیمی لێ کرا، هێزو دەسەڵاتێکیان بۆ فەراهەم هات کە گەسکیدا لە وڵاتەکانو پاکی کردنەوە لە زۆردارانو دەست درێژی کەرانو تەختو بەختی جەورو ستەمیان ڕووخاندو سەرکردایەتی ئادەمی و جیهانیان گرتە دەست، لەپاش ئەوەی هەموو سەرکردایەتییە ڕووکەشو نەفامیەکانیان لە ڕیشە هێنا، بەڵام با بزانرێ ئەوەی کە عەرەبی بەو پایە گەیاند ئەمە بوو عەرەبایەتیو ڕەگەزپەرستییان لەخۆیان داڕنیو لەبیریان نەما، هەر ئەوەیان لەبیر بوو کە موسڵمانن، موسڵمانو بەس، وە هەر ئاڵای ئیسلامیان بەرز کردەوەو ئیتر بەس، بیرو باوەڕو ئاقیدەیەکی گەورەو گرنگیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتو بە دیاری دایان بە ئادەمی و ئادەمێتی بۆ ئەوەی فریای کەونو ڕزگاریان کەن لە گومڕایی، وە نەتەوایەتیو ڕەگەزایەتیان لەگەڵ خۆیان هەڵنەگرت، بیرو باوەڕێکی ئاسمانییان هەڵگرت کە مامۆستایەتی مەردومی پێبکەن، نەك بیرو باوەڕو مەزهەبێکی ئەرزی کە مەردومی پێ ملکەچ بکەن بۆ خۆیان، لە وڵاتی خۆیان دەرنەچوون بۆ تێکۆشان لە ڕێی خوادا، نەك بۆ ئەوەی ئیمپراتۆریەتێکی عەرەبی فەراهەم بهێنن کە لە سێبەریا بحەوێنەوەو بە کەشخەو شانازییەوە ڕابوێرنو حوکمڕانی بکەن، وە بۆ ئەوە دەرنەچوون کە مەردوم بهێننە دەرەوە لە حوکمی فارسو ڕۆم بۆلای حوکمی عەرەبو حوکمی خۆیان! بەڵکو دەرچوون بۆ ئەوەی دەریان بێنن لە پەرستنی هەموو بەندەکانی خوا بۆ پەرستنی خوا بە تاكو تەنها، وەك (ڕەبعی کوڕی عامر) وتی بە (یەزدی جورد): خوا فەرمانی داوە بە ئێمە بۆ ئەوەی ئادەمی دەربێنین لە پەرستنی بەندەکانی خوا بۆ پەرستنی خوا بە تەنها، وە لە تەنگی جیهان بۆ فراوانی ڕۆژی دوایی، وە لە ستەمی ئایینەکان بۆ دادپەروەریی ئیسلام [1] تەنها لەو کاتەدا عەرەب کییانو سەربەستی بۆ پەیدا بوو، هێزی بۆ فەراهەم هات وە سەرکردایەتی دەست کەوت.

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير.

بەڵام ئەوانەشی هەموو بۆ خوا بووو لەڕێی خوادا بوو، ئەو هێزو کییانو سەرکردایەتیەی بۆ مایەوەو بەردەوام بوو تا لەسەر ئەو ڕێگا ڕاستەی خۆیان بوون، ئینجا کاتێ لایان داو کەوتنەوە سەر ڕەگەز پەرستیەکەی خۆیانو وازیان هێنا لە ئاڵای خواو ئاڵای نەتەوایەتیو ڕەگەزایەتیان بەرز کردەوە، ئەو حەلە جیهانو وڵات یەخەی خۆیان لێ هەڵتەکاندنو گەلانی جیهان ژێر پێو پێشێلی کردن، تەنانەت پیس ترین گەل کە جوولەکەیە توانی لەناوجەرگەی وڵاتیانا دەوڵەتێك پێك بێنێو عەرەبەکان دەرکات. خوا ئەوەی بەسەر هێنان، چونکە ئەمان خوای خۆیانیان لەبیرچووو وازیان لێ هێنا، ئینجا خوایش ئەوانی بەرەڵا کردو دەستی یارمەتی لێ گێڕانەوە!

ئایا بەبێ ئیسلام عەرەب چیەو خۆی بەچی ئەزانێ؟ ئایا چ بیرو باوەڕێکیان هەیە کە پێشکەشی بکەن بۆ جیهانو ئادەمی؟ ئەگەر واز بێنن لە ئیسلام و ئیسلام لە خۆیان داڕنن؟ ئەبێ چ نرخێ ببێ بۆ هەر گەلو میللەتێ کە بیرو باوەڕێکی نەبێ ڕای گەیەنێ بە مەردوم؟ هەر گەلو میللەتێ کە سەرکردایەتی کردبێ لە هەر چەرخێکا ئەبێ خاوەنو نوێنەری بیرو باوەڕێ بووبێ.

هەر گەلو میللەتێ کە وەها نەبووبێ وەك (تەتار) کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتنو وڵاتیانماڵی، وەك بەربەرەکان کە لە ڕۆژئاواوە هاتنو دەوڵەتی ڕۆمانیان داگیر کرد، ئەوانە هیچ کام نەیان توانی ماوەیەکی درێژ بمێننەوەو بژین، بەڵکو توانەوە لەناو ئەو وڵاتو میللەتانەی کە داگیریان کرد، بێگومان تەنها بیرو باوەڕو ئاقیدەیە کە عەرەب بگەیەنێ بە جیهانو مەردوم هەر ئاقیدەو بیرو باوەڕی ئیسلام بووەو بەس، هەر ئەوەش بەرزی کردنەوە بۆ پلەی سەرکردایەتی، دەی کاتێ ئەوەیان لە خۆیان داڕنی کارو پیشەیەکیان نامێنێ لە جیهانا، وە هیچ دەورێکیان نامێنێ لە مێژوودا.

بەڕاستی ئەمە شتێکە پێویستە عەرەب چاك بیری لێ بکەنەوە ئەگەر ئەیانەوێت بژین بەو ژیانە مەردانەی کە لە پێشەوە بوویان لە ژێر ئاڵای ئیسلاما، وە ئەگەر ئەیانەوێ هێزیان ببێ، وە ئەگەر سەرکردایەتیان ئەوێ، هەر خوا مەردوم دەرئەهێنێ لە چاڵی گومڕایی.

**وصلى الله وسلم على سيد القادة وقائد السادة محمد وعلى آله وصحبه وكل تابع لهم بإحسان**

# سووره‌تی ﴿قُرَیش﴾
## مه‌ككه‌ییه‌و (٤) ئایه‌ته

## بسم الله الرحمن الرحيم

(ئیبراهیمی خه‌لیل) (علیه السلام) كاتێ لێ بووه‌وه له دروست كردنی خانه پیرۆزه‌كه‌ی خوا، نزای كردو لالاوه له خوا كه ده‌وروبه‌ری ئه‌و ماڵه بكات به شارو ولاتێكی به ئارامی بێباك‌و ڕۆزی دانیشتوانی بدات له هه‌موو جۆره میوه‌جات، خوایش ئه‌و نزایه‌ی وه‌رگرت‌و ئه‌و ماڵه پیرۆزه‌ی بێباك‌و ئازاد كرد له زۆرو ده‌ست درێژی سته‌م كاران، دانیشتوانی ئه‌و شوێنه‌شی بێباك‌و بێبیم كرد، ته‌نانه‌ت له كاتێكا كه بت په‌رست بوون‌و هاوبه‌شیان بۆ خوا ڕه‌وا ئه‌دا له كاتێكا كه به هه‌رچوار ده‌وریانا ترس‌و بێ ئارامی‌و تالان‌و بڕۆو كوشتن‌و بڕین بوو، قورئان ئه‌وه ئه‌دا به ناوچاویاناو ئه‌فه‌رموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ﴾. به‌سه‌رهات‌و ڕووداوی (ابرهه)و له‌شكره‌كه‌ی بوو به‌هۆی زیاده ڕێزو پیرۆزی ئه‌و خانه‌ی خوا له‌دڵی عه‌ره‌باله هه‌موو ناوچه‌كانی نیوه دوورگه‌دا، وه ڕێزگرتنی دانیشتوانی (مه‌ككه)، به‌هۆی ئه‌وه ئه‌گه‌ڕان به هه‌موو لایه‌كا به ئارام‌و بێباك، له‌هه‌ر كوێ بوونایه چاكه‌و پیاوه‌تیان له‌گه‌ڵ ئه‌كرا، ئه‌و به‌هره‌و ڕێزه‌ی كه له په‌نای ئه‌و خانه‌ی خوادا ده‌ستیان كه‌وتبوو به‌هۆی ئه‌وه دوو كاروانی گه‌وره‌یان دامه‌زراندبوو له هاوینا ئه‌چوون بۆ شام، وه له زستانا ئه‌چوون بۆ یه‌مه‌ن، به هه‌موو ئارام‌و ئاسایشێكه‌وه، هیچ مه‌ترسییان نه‌بووله‌و هه‌موو تالان‌و جه‌رده‌یی‌و ڕێگرتنه‌ی كه بلاو بووبووه‌وه له هه‌موو ناوچه‌كانی نیوه دوورگه‌دا، وه به ئاره‌زووی خۆیان ئه‌گه‌ڕان‌و هاتوچۆیان ئه‌كردو بازرگانی خۆیان ئه‌كرد، به‌هۆی ئه‌وه به خۆشی ژیانیان ئه‌برده سه‌ر به سامانی زۆرو ڕۆزی فراوانه‌وه، به‌بێ هیچ بیم‌و ترس، نه له كاتی نیشته‌جێداو نه له كاتی گه‌ڕان‌و كاروان‌و كه‌ڵه‌كیانا، كه خۆشترین به‌هره له جیهانا تێری‌و بێباكیه، جا ئه‌وا له‌م سووره‌ته‌دا ئه‌و دوو به‌هره‌و منه‌ته گه‌وره‌یان ئه‌خاته به‌رچاو وه‌ك له سووره‌تی پێشوودا به‌هره‌و چاكه‌ی ڕووداوی فیلی بیر خستنه‌وه.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ﴿١﴾ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ﴿٢﴾ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ﴿٣﴾
ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ﴿٤﴾

---

**ئەم چاکەو بەهرە گەورانەیان بیر ئەخاتەوە تا شەرم بیانگری‌و سەری بەندەیی داخەن بۆ پــەروەردگاریان، ئەفــەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ﴾ هــەر لەبــەر هۆگریی قوڕەیش ﴿إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ﴾ هۆگرییان بە هاتووچۆو کاروانی زستان بۆ یەمەن‌و هـاوین بـۆ شـام ﴿فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ﴾ دەی بـا خـاوەنی ئـەم خانەیـە بپەرستن ﴿ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ﴾ ئـەو خوایـەی کـە خـواردن‌و خواردەمـەنی پێدان لەبەر برسێتی‌و نەهێشتنی برسێتییان، یـا لـەباتی برسـێتییە کـە جـێی خـۆی بـوو بیانبوایـە، چـونکە لـە وڵاتێکی وشکی کرێنی بێ کشتوکاڵدا بوون ﴿وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ﴾ وە ئارام‌و دڵنیـای کـردن لەبـەر تـرس‌و نەهێشتنی تـرس، یا لـەباتی بیم‌و ترسێ کـە جـێی خـۆی بـوو بیانبوایە وەك هـەموو ئەوانـەی کـە بـە دەورو بـەریانابوون کـە بـە تـرس‌و بێئارامیـەوە ئـەژیان، واتـە ئـەم قوڕەیشەی کە لە سایەو پەنای ئەم خانەی خوادا بە کامەرانی ئەژین، ئەگەر لەبەر هیچی تر خوا ناپەرستن هەر هیچ نەبێ با هەر لەبەر ئەم تێرکردن‌و ئارام پێدانە بیپەرستن کە ئەم دوو چاکەیە گەورەترین چاکەن لە جیهانا. بەڕاستی بیرخستنەوەی ئەم دوو بەهرە گەورەیە ئەبێ دڵ شەرمێن بکات‌و تەریق بوونـەوەو خەجاڵـەتی بێنـێ بەسـەر دەروونا بەرانبـەر پـەروەردگار، وە قوڕەیش نەزان‌و بێ ئاگا نەبوون لە نرخی ئەو خانە پیرۆزەو پیت‌و فەڕی لە ژیانیانا، وە لە کاتی تەنگیدا هەر هاواریان لە خاوەنی ئەو خانەیە ئەکردو پەنایان تەنها بەو ئەبرد، ئەوە بوو (عبد المطلب) بەرەنگاری (أبرهە) نەوەستا بە هێزو لەشکر، بەڵکو بەرەنگاری وەستا بە خوای ئەو خانەیە وەك بە درێـژی باسی کرا لـە سـوورەتی پێشوودا، بەڵام چی ئەکەیت لە دەسـت نـەفام‌و نـەزانێ کـە کـارو کـردەوەی دژو ناپەسـەند ئـەهێنێ بەسـەر مەردومـدا، ئـەم سـوورەتە هەرچـەند سـەربەخۆیەو (بسم الله)ی تایبـەتی بـۆکراوە، بـەڵام لـە مەبەسـتا وەك تەواوکـەرو درێـژە پێـدان وایـە بـۆ سـوورەتی پێـشوو، وە هەرچـەند لـە چـەند ڕیوایـەتێکا ئەفەرموێ: کە نۆ سوورەت لە بەینیانا هاتووەتە خوارەوە، بەڵام لە قورئانا هـاتووە بە دوایا، چونکە لە مەبەستا هاوبەش‌و پەیوەستن.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ﴿٢﴾

## سورەتی «الماعون»
## مەککەیی یەو (٧) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە لە هێندێ ڕیوایەتا هەمووی مەککەییەو لە هێندێ ڕیوایەتی ترا سێ ئایەتەکەی پێشی مەککەییەو ئەو چوارەکەی دوایی مەدینەییە، لەسەر ئەم بارەش هەمووی بە مەککەیی ناو ئەبرێ، چونکە سەبارەت بە مەککەیەتی و مەدینەیەتی تەماشای سەرەتای سورەت ئەکرێ، بەبێ دووبەرەکی سەرەتاکەی مەککەییە، کەواتە هەمووی بە مەککەیی ناو ئەبەین، بەڵێ وا دەرئەکەوێ دووەم بەهێزتر بێ، تا ڕادەیە لەوانەیە باوەڕ بێتە سەر ئەوە کە هەمووی مەدینەییە وەك هێندێ لە زانایانی لەسەرە، چونکە سێ ئایەتی پێشوو جۆشە لەگەڵ چوار ئایەتەکەی دواییدا، ئەو چوارەش باسی ڕووپامایی و ناپاکی ئەکات، کە ئەوەش لەناو کۆمەڵی موسڵمانانی مەککەدا نەبووە، بەڵکو ئەو خووە ناپەسەندە لە چەرخی مەدینەدا پەیدا بوو وەك چەند جارێ باس کرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دروستەو ڕێکەو ئەگونجێ کە هەروەك وتمان سیانە پێشووەکە مەککەیی و لە پاشا لە مەدینە ئەم چوارە هاتبنە خوارەوەو پەیوەستیش بن لەگەڵ سیانە پێشووەکەدا، وێنەی ئەوە زۆرە لە قورئانا، ئەوە موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی قورئان، ئینجا با بێینە سەر ئەو مەبەستە گرنگەی کە ئەم سوورەتە خەریکە پێیەوە، کە بریتیە لە ڕوون کردنەوەی مەبەست لە بڕواو بێبڕوایی، ئینجا بێجگە لەوە دەست نیشان کردن بۆ سروشتی ئەم ئایین و ئاقیدەیە، وە بۆ ئەو بەزەیی و میهرەبانیە فراوانەی کە خوا ویستی بۆ ئادەمی بەهۆی ئەم ئایین و شەریعەتە پیرۆزەی کە بۆی ناردن.

ئەم ئایینە ئایینی دیمەن و ڕواڵەتی ڕووت نیە، وە نوێـژو ڕۆژوو عیبادەتەکانیشی کەڵك و نرخێکی ئەوتۆیان نیە ئەگەر بە ڕاستی و پاك و خاوێنی نەبن و لە دڵەوە هەڵنەقوڵێن و دڵ و دەروون ڕووت نەکرێ لە هەموو نیازێ تر بێجگە لە نیازی خوا، بەجۆرێ ئەو ڕاستی و خۆ ڕووت کردنە کاربکات لە دڵ و ڕاپەڕێنێ بۆ کردەوەی چاك، وە بڕواو ڕاستیەکەی

دەرکەویّ لە کردارو ڕەوشتا، تا بەهۆی ئەوە ڕووی ژیانی ئەم جیهانە وەرگێڕیّ بۆ چاکی و بەرزی. هەروەها ئەم ئایینە چەند بەش و پارچەیەکی جیاواز نییە کە دەست بدا بۆ دابەشکردن، تا مەردوم بەئارەزووی خۆی هەرکامی بەجیّهێنا بەجیّی بێنیّ و هەرچیشی واز لیّ هێنا وازی لیّ بێنیّ.

بەڵکو ئەم ئایینە بەرنامەیەکە هەموو بەش و پارچەکانی تەواوکەری یەکترن و بە هەموویان بەرنامەکە بەدی دێت، وە هەموو بەش و پارچەکانی پەیوەستن بەیەکەوە و عیبادەت و مامەڵە و کاروباری یەکە یەکە و گەل و کۆمەڵی قۆڵگیری یەکترن، وە بەهۆیەوە ئادەمی بەتێکڕایی دڵ و دەروونیانی پیّ چاک و پاک ئەبیّ وە هەموو پەل ئەگرن و کۆمەڵ و قۆڵگیرئەبن لە خێرو چاکەدا.

بیّگومان زۆر کەس هەن بەدەم ئەڵێن موسڵمانین و بڕوامان هەیە بەم ئایینە، نوێژو فەرمانەکانی تریش بەجیّ ئەهێنین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕوای ڕاستەقینە دوورە لێیان و ئەوانیش دوورن لە بڕواوە، چونکە بڕوای ڕاستەقینە چەند بەرهەم و نیشانەیەکی هەیە، هەرکات ئەوانە نەبوون بڕواڕاستەقینەکە نییە، هەرچەند بەزوبان بڵیّ وەهەرچەند بەڕواڵەت کردەوەی چاک و عیبادەت و خواپەرستی ببیّ! بڕوای ڕاستەقینەی هەرکات دامەزراو جێگیربوو دەست بەجیّ ئەکەوێتە بزوتنەوە وەك لە سوورەتی (العصر)دا ووتمان بۆ ئەوەی خۆی دەرخات و خۆی بەدی بێنیّ لە شێوەی کردەوەی چاکا کەواتە ئەگەر ئەو بزوتنەوەیە خۆ دەرخستنەی نەبوو ئەوە نیشانە و بەڵگەی نەبوونی بڕوایە هەر لە بنەڕەتەوە، هەروەك لەم سوورەتەیشەوە وەرئەگیریّ، کە نەبوونی کردەوەی چاك و بوونی کردەوەی خراپ ئەکات بە نیشانەوبەڵگە لەسەر بیّبڕوایی، ئەفەرمویّ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ﴾ ئایا دیوتە و ناسیوتە کەسیّ کە بڕوای نییە بە ئایین یا بەتۆڵە و پاداشت؟ ئەم پرسیارە بۆ ئەوەیە گوێگر بکەوێتە سۆزو پەرۆش بۆ ناسینی پرسیار لیّ کراوەکە، بیّگومان هەرکەس ئەم پرسیارە ببیسیّ ئەکەوێتە چاوە چاو تابزانیّ ئەو بیّبڕوایە کیّیە و قورئان کیّ دائەنیّ بەبیّبڕوا؟ ئینجاکەسەرنج ئەدات بەم جۆرە وەڵام ئەداتەوە: ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ﴾واتە ئەگەر نەتزانیوە بزانە ئەو بیّبڕوایە کەسێکە کە بەتوندوتیژی هەتیو دەرئەکات و ئەیتارێنیّ و ڕیسوای ئەکات و ئازاری دڵی ئەدات، ئینجا وەك خۆی چروك و چاوبرسیە و بیّبەزەییە و دەست گیرۆیی ناکات هەروەها لەسەر کیسەی مەردومیش هەر چروکە،

وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾

---

وەكو ئەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾ وە هانە هانەی مەردومیش نادات لەسەر خۆراك پێدان بەهەژار، واتە ئەگەر بەڕاستی بڕوای بە ئاین ببوایەو بڕوای ڕاستەقینە لەدڵیا دامەزرایە هەرگیز هەتیوی دەرنەئەکردو پیاهەڵنەئەشاخاو ئازاری دڵی نەئەدا، وە بێدەنگ نەئەبوو لە هاندانی مەردوم لەسەر بەخێوکردنو دەست گیرۆیی هەژار.

ئەمەی کەووترا هەرچەند دژو پێچەوانەی ئەوەیە کە باوەو بڵاوبۆتەوە لەناو خەڵکاو لە کتێبەکانی زانایان نوسراوە، کە بڕوا هەر ئەوەیە کەلە دڵاو ئیتر کردەوەی لەگەڵ ببێ یان نا؟ هەرچەند دژو پێچەوانە بێت بەڵام لەڕووی ڕاستیدا شتەکە بەو جۆرەیە کە ووترا، وە باری ڕاستەقینەی بڕوا کە نرخی ببێ لای خواو خوا ئەیەوێو داوای ئەکات هەرئەوەیە کەوترا، ئەوەی کە باوەو لە کتێبەکانا نوسراوە مەبەست شتێکی ڕواڵەتییە کە بکرێ بە بناغەو بنەڕەت بۆ ڕەفتارو مامەڵی شەرعی، واتە هەرکەس لافی بڕوا لێ بداتو بەدەم خۆی بەبڕوادار دابنێ ئەو کەسە لە زاهیری شەرعا بەبڕوادار دائەنرێ کردەوەو ڕەفتاری بڕواداری لەگەڵ ئەکرێو لەڕیزی بڕواداران ئەژمێرێ، وە مەبەست بەوەی کەلە ئایەتەکە وەئەگیرێ ئەو بڕوا ڕاستەیە کە بەرو بەرهەمی هەیەو لە کردەوەدا دەرئەکەوێ، بێگومان بڕوا ووتەو قسە نییە کە بەدەم بوترێ بەڵکو بڕوا لەڕووی ڕاستیدا گۆڕانو حاڵێکە لە دڵا کە پاڵی پێوەبنێو ڕاپەڕێنێ بۆ خێرو چاکە، خوا قسەو ووتەی ڕووتی ناوێ لە بەندەکانی، بەڵکو لەگەڵ ووتنەکەدا داوای کردەوەیەکیان لێ ئەکات کە بڕواکەیان بەڕاست دەرکاتو لە شێوەی

کردەوەدا دەرکەوێ، ئەگیناقسەی ڕووت چ نرخێکی هەیە،بەکورتی ئەم سوورەتە بڕوایەکمان بۆ باس ئەکات کەلە تەرازووی خوادا کێشی هەیەو بەنرخە، ئەمە شتێکی جیاوازە لە بڕوا ڕواڵەتیەی کە ڕەفتارو مامەڵەی شەرعی لەسەر ئەکرێ، وەك ووتمان. بێگومان هەتیوو هەژار وێنەو نموونەی کەساسیو بەش بڕاوىو لێقەوماوین، وە هەرکەس ڕووناکی بڕوا لە دەرونیابێت بەزەیی دێتەوە بە هەتیوو هەژاراو ئەگەر گوێی نەبوو لێیانو بێبەزەیی بوو دەربارەیان ئەوکەسە لە ڕووی ڕاستیدا بڕوای بە ئایینو تۆڵەو پاداشت نییە.

ئینجا کاتێ کە دەرکردنو ئازاردانی هەتیوو هەوڵنەدان بۆ ژیاندنی هەژار تاوانێکی ئەوەندە گەورەبن کە نیشانەی بێبڕوایی بن ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ کەواتە سزای سەختو لەناوچوون بۆ نوێژکەرانێ کە بێئاگان لە نوێژەکەیانو هیچ گوێیان لێ نییە هەتا ئەڕواو نامێنێ، یا بەجۆرێ نایکەن کە خواو پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕازی بێ، بەڵکو بەپەلەو بێهۆشو بێئاگان لێیو دڵیان لای نییە بەهیچ ڕەنگ، وە بارێکی زۆر گران لە کۆڵ خۆیانی ئەکەنەوەو لەبەر خوا نایکەن ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ﴾ ئەوانە کەسانێکن کە ڕووپامایی ئەکەن، نوێژو کردەوەی چاك ئەکەن لە پێش چاوی مەردوم بۆئەمەی وەصفیان بدەنو بەچاك ناویان ببەن ﴿وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ﴾ وەبەرگری ئەوشتانە ئەکەن کە سوودو یارمەتی مەردومی تیایە، وەك زەکات یا ئەوشتانەی کە پێویستی هەیە پێیان مەردوم لەیەکتری ئەخوازن وەك شتومەكو قاپو قاچاغی ناو ماڵ، ئەوانە نوێژی ڕاستەقینە ناکەن بەڵکو چەن کردەوەو جوڵانەوەیە ئەکەن کە بەڕووالەت وەك کردەوەو جوڵانەوەی نوێژ وان، دەمو لێو وەجوڵێننەوەو وەك مەکینەی درومان ئەیدەن بەیەکا بەبێ ئەوەی دڵو هەستو هۆشیان بەلای ئەوەوە بێت کە ئەیڵێن، کەواتە بۆیە کاریان لێ ناکاتو بەرهەمی ئەو نوێژە لە

دەرونیانا پەیدا نابێ، بەهۆی ئەوە بەزەییان نایەتەوە بە بەندەکانی خواداو بەرگری ئەو شتانەیان لێ ئەکەن کە سوودو پارمەتی تێدایە بۆیان ئابەم جۆرە ئەبێ ئەم ئایینو ئاقیدە پیرۆزە بناسینو بگەین بە سروشتو بارە ڕاستەقینەکەی، ئەوەتا ئەبینین قورئان ئەو هەڕەشە گەورەیە ئەکات لەو جۆرە نوێژکەرانە، چونکە نوێژەکەیان وەك لەشێکی بێگیان وایەو هەر بەڕواڵەت نوێژەو خوایش نوێژێکی ئەوێ کە گیانی تێدابێتو نوێژکەرەکە بگۆڕێ، ئەگینا بەلای خواوە نوێژێیە بەڵکو گوناهو تاوانێکە کەئەو هەڕەشە سامناکەی لەسەر کردووە بەتاوانێکی گەورە تر نیشانی دا لەتاوانی ئازاردانی دڵی هەتیوو هەوڵنەدان بۆ هەژار!

ئینجا بابیرێ بکەینەوە لە میهرەبانیو چاکەی خوا بەسەر بەندەکانی‌یەوە، کاتێ کە ئایینو پێغەمبەرانی بۆناردن، بێگومان خوا هیچ نیازو پێویستیەکی خۆی نییە چونکە بێ‌نیازو بێ‌پێویستە بە هیچ شتێ بەڵکو بە میهرەبانی خۆی خێرو چاکەی ئەوێ بۆ بەندەکانی، پاکی دڵو کامەرانی ژیانو خۆشبەختی ئەوێ بۆیان، ژیانێکی بەرزی ئەوێ بۆیان کە بنەڕەتی لەسەر هەستی پاكو یەکێتیو قۆڵگیریەکی جوانو خۆشەویستیو برایەتیو ئارامی دڵو کردەوەو ڕەوشتی خاوێن بێت.

ئینجا ئایا مەردوم بۆ کوێ ئەڕواو دوورئەکەوێتەوە لەمە خێرو خۆشیە؟ وەلەم ڕەحمەتو خۆشبەختیە؟ وەلەم پلەو پایە بەرزو بەرێزە؟ ئایا بۆ کوێ ئەڕوا بۆ ئەوەی بەسەرگەردانیەوە پێی هەڵخلیسکێ لە چۆڵو بیابانی ڕەشو تاریکی نەفامیدا، لەکاتێکا ئەم ڕووناکییە گەورەی بۆ دانراوە لەسەر ڕێگەی ڕاستی ئاسانی بێ‌گرێو بێ‌گیروگرفت؟

وصلى الله وسلم على من انزل عليه هذا القرآن الكريم هدى للناس

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾

## سوورەتی «كوثر»
## مەككەییەو (٣) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سوورەتە تایبەتیە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەوێنەی سوورەتی (الضحی)و سوورەتی (الشرح) خوای پەروەردگاری دڵنەوای ئەكات تیایاو دڵخۆشی ئەداتەوە، بەڵێنی ئەاتێ بە خێرو چاكەو هەڕەشە ئەكات لە دژمنەكانی بەدوا بڕاوی، وە ڕێگەی سوپاسی نیشان ئەدات.

جا لەبەرئەوە ئەم سوورەتە نموونەو وێنەیەكە لە ژیانی پێغەمبەرو بانگو بانگەوازەكەی لەیەكەم جاری چەرخی مەككەدا، وێنەو نموونەی پیلان پێگێڕانو ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) و نموونەو شێوەیەكە لە چاودێریو سەرپەرشتی خوا بۆ بەندە خۆشەویستەكەیی و ئەو تاقمە كەمەی كەلە گەڵی بوون.

ئەگێڕنەوە نەفامەكانی قوڕەیش كە هەمیشە خەریك بوون بە پیلان گێڕیو پڕوپاگەندەو لاقرتی كردنەوە دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) و ئایینەكەی، بۆئەمەی كوڕو كۆمەڵ دووربخەنەوەو لای بدەن لە گوێگرتنو وەرگرتنی ئەو ئایینە ڕاستەی كە بۆیان هات لەلایەن خواوە، ئەو نەفامانەش وەك (عاصی كوڕی وائیل)و (عوقبەی كوڕی ئەبو موعەیت)و (ئەبو جەهل)و (ئەبو لەهەب)و ئەوانی تر، ئەوانە ئەویان ووت بە پێغەمبەر (ﷺ) (ابتر) واتە وەجاخ كوێرو دوابڕاو، یەكێ لەوانە بەخۆشیەوە ئەی ووت لێی گەڕێن بەبێ وەجاخ ئەمرێو كارەكەی دوای دێت! ئەو جۆرە پیلانە بێنرخە دەنگو ئاوازەیەكی گرنگی بوو لەناو ئەو گەلەدا كە كەشخەو شانازیان ئەكرد بە كوڕی زۆرەوە، وە بەو قسەو پڕوپاگەندە ناپەسەندە دوژمنو داخ لە دڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆشیو شادی ئەكەوتە دڵیان، جالەبەرئەوە ڕەنگە ئەو قسەیە ئازاری گەیاندبێ بەدڵی پیرۆزو بە فەریو غەمبار بووبێ پێی.

لەبەرئەوەئەم سوورەتەهاتەخوارەوە بۆ نەهێشتنی هەر غەمو خەفەتێ، وە ئەو خێرو بێرە هەمیشەییو دوانەهاتووەی خستە بەرچاو كە خوای پەروەردگاری بۆی هەڵبژارد، لەگەڵ

بێ‌خێری و دوابڕاویەك كە بڕیاری دا بۆ دوژمنەكانی، فەرمووی ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ﴾ بەڕاستی پێمان بەخشیت شتی زۆری بە فەڕ، هەركەس بیەوێ بگەڕێ بەدوای ئەو شتە زۆرو بەفەڕەی كە خوا پێی بەخشیوە دەستی ئەكەوێ بۆ هەرلایە سەرنج بدات یا بیربكاتەوە، ئەو خێرە زۆرو بەفەڕو گەورەیەی دەست ئەكەوێ لە پێغەمبەرێتیەكەیا كە بەرزترین پلەیە بەندە پێی بگات، بەتایەتی پەیام‌و پێغەمبەرێتیەكەی ئەم كە گشتێیەو نەبڕاوەیە تا جیهان جیهانەو دەستی ئەكەوێ زۆر بەلێشاوو بەفراوانی لەم قورئانەی كە خوا بۆی نارد كەتەنها سوورەتێكی دواهاتن ئیەیە بۆ پیت‌و فەڕی! دەستی ئەكەوێ لەناو مەلائیكەو كۆمەڵی هەرە بەرزدا كە سەڵەواتی لەسەر ئەدەن‌و سەڵەوات ئەدەن لەسەر هەركەس كە سەڵەوات بدا لەسەری لەم زەوی یەدا، ناوی بەرامبەر كراوە بەناوی خواوە لە ئاسمان‌و زەوی دا، دەستی ئەكەوێ لە كردارو ڕەوشتە شیرینەكانی كە بەجێی هێشتن بۆ پاش خۆی‌و نەبڕاوەن هەتا هەتایە بەدرێژایی چەرخ‌و بە پانی هەموو زەوی‌و جیهان، بەملێونەها لەپاشی خۆی ئەو كردارو ڕەوشتە شیرینانەیان كرد بە سەرەمەشق بۆ خۆیان‌و پەیڕەوی یان كردو ئەكەین تا دنیا دنیایە، بەدڵێكی پڕ لەسۆزو خۆشەویستی‌یەوە.

دەستی ئەكەوێ لەو هەموو بیرو بڕوا پیرۆزانەی كە بەجێی هێشتن لە هەموو بارو ڕوویەكی ژیانەوە، وە پیت‌و فەڕیان جیهان‌و ئادەمیان داگرت، بە بڕوادارو بێ‌بڕواوە، ئاشكرایە شەریعەتەكەی ئەو بوو بە چرایەكی ڕووناك، هەر گەل‌و میللەتێ ئەندازێكیان لێ وەرگرت وەك هەوێن بوو بەهۆی بەستن‌و مەیینی یاساو بەرنامەكانی خۆیان، بەڵام بە پۆشاك‌و ناوو دیمەنی ترەوە بۆ ئەوەی نەناسرێنەوە بە بەرهەمی بیری‌و ژیریی ئەوان دابنرێن! هەروەها دەستی ئەكەوێ لە چەند شتی ترا، كە بەئاسانی نایەبە ژمارەو باس لێ كردن، بەڕاستی ئەوەی خوا بەخشی بەم پێغەمبەرە گەورەیە (ﷺ) ئەوەندە زۆرە نایەتەژمارەو دوا نەهاتووەو بێ سنورە. لەبەر ئەوە قورئانیش دیاری نەكرد، تا هەموو خێرو چاكەیە بگرێتەوە كەلە سنووری زانینی ئێمەدایەو بێجگە لەوەی زیادە لەوەو لەزانینی ئێمە بەدەرە، چەند ڕیوایەتێ هاتووە كە مەبەست بە ﴿ٱلْكَوْثَرَ﴾ ڕووبارێكە ئەدرێ بە پێغەمبەر لەبەهەشتا (ﷺ) بەڵام (ئیبن‌و عەباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- وەڵام ئەداتەوە بەوەی كە ئەو ڕووبارە بەشێكە لەو خێرە زۆرەی كە دراوە بە پێغەمبەر (ﷺ) بەڕاستی ئەو فەرموودەی ئەوڕێك ترو گونجاو ترە لەگەڵ شوێنەكەو هۆی هاتنە خوارەوەی سوورەتەكەدا.

﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾

لەپاش دڵنەوایی و دڵنیا کردنی لەسەر ئەو بەهرەو بەخشـشە زۆرو بەفەڕە، بە پێچەوانەی پڕواگەندەچی و پیلان گێڕەکان، ئینجا فەرمان ئەداو ئامۆژگاری پێغەمبەر ئەکات بە سوپاس ئەوە چاکەو بەهرەیە بە پەرستنی پەروەردگاری بە پاك و خاوێنی و بە خۆ ڕووت کردن لە هەموو نیازو لە هەموو شتێ لەبەر خوا. ئەفەرموێ: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ﴾ کەواتە نوێـژ بکە بۆ پەروەردگارت، وە قوربانی سەر ببڕە لەبەرئەوە، لەئایەتی یەکەما دەم کوتی پیلان گێڕەکانی کرد بەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دوا بڕاوو بێ خێر نییە، بەڵکوشتی گەورەو بەفەڕی دوا نەهاتووی پێدراوە، وەك باس کرا، ئینجا پیلان و پڕوپاگەندەکەیان ئەگێڕێتەوە بۆ سەر خۆیان و بەدی ئەهێنێ لە خۆیانا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ﴾ بەڕاستی هەر ناحەزەکەت دا بڕاوە، نەك تۆ ئەی پێغەمبەر.

بێگومان خوای میهرەبان هەر چۆنێ ئەو بەڵێنەی کەدای بە پێغەمبەر بەدی هێنا(ﷺ) وەك باسمان کرد، هەروەها ئەم هەڕەشەش کەکردی لەناحەزی بەدی هێنا، ئەوەتا ئەو دوژمنە سیا چارانە بەدوا بڕاوی تیا چوون و هیچ ناوو باسیشیان نەما مەگەر بە نەفرین لێ کردن، لەکاتێکدا ناوی پێغەمبەر (ﷺ) بە پیرۆزی و شۆزو خۆشەویستی و سەڵەوات لێدان تا هات پەرەی سەندو هەر پەرەش ئەسێنێ، بێگومان ئەبێ هەروابێ، چونکە بڕواو خێرو ڕاستی ناگەنجێ بێ خێرو دوا بڕواو دا هاتوویێت، چونکە ڕیشەی کوتاوە بەناو هەموو بەش و پارچەکانی بوونەوەرداو پەل و گەڵای هاویشتووە بە هەموو لایەکا، ئەوەی بێخێرو بێرو دوابڕاوە هەر بێ بڕوایی و شەڕو بەتاڵ و ناڕاست و ناڕاستی‌یە، بانگ کردن بۆلای خواو خێرو ڕاستی هەرگیز دا بڕواو بێ خێر نابێ، بانگ کەرو خاوەنەکەی دوادارو خاوەن پیت و فەڕ ئەبێ، چونکە بەستراوە بەخواوە کەبوون و مانەوە هەر بۆئەوە، ناهەق و بێبڕوایی و بەتاڵ، هەر چەندە بەدیمەن و ڕواڵەت بە بەرزو گەورەو دامەزراو دابنرێ لەڕولاوازو بێ بنج و بنەوانەو بۆشەو لە ڕەگ و ڕیشەهاتووە....

خوا ڕاستەو ڕاستی فەرموو، پیلان گێڕو پڕوپاگەندەکەران لارو چەوت و درۆزنن.

وصلى الله وسلم على صاحب الكوثر وعلى وآله وصحبه

# سوورەتی «الكافرون»
## مەككەییەو (٦) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

عەرەبەکان لەپێش هاتنی پێغەمبەریشا بڕوایان بە خوا بوو، وەك قورئان لێیانەوە ئەگێڕێتەوە، بەڵام نەیانئەناسی بەو ناسینەی کە شیاوو شایان بێت، وە نەیانئەناسی بەو ناوو نیشانو سیفەتانەی کە خوا بۆ خۆی دانابوون، بەهۆی ئەوە هاوبەشیان بۆ ڕەوا ئەداو بەپێی خۆی بەڕێزو بە گەورە نەیان ئەگرت، بەو جۆرو شێوەی کە شایانە نەیان ئەپەرست، ئەوانە چەند بتو هاوبەشێکیان بۆ ڕەوا ئەدا کەوێنەو دەست نیشان بوو بۆ پیاو چاكو گەورەکانی ڕابووردوو، یا بۆ مەلائیکە. لایان وابوو کە مەلائیکە کچی خوانو خوا ژنی خواستووە لە تیرەی جنۆکە، یا هەر بەبێ ئەو نیازو مەبەستانە ئەیانپەرستن، لەسەر هەر نیازو بارێ لایان وابوو کە ئەو بتانە نزیکیان ئەخەنەوە لە خواوە وەك لەسەرەتای سوورەتی (زومر)ەوە باسی ئەو نیازو مەبەستەیان ئەکات. ئەو بت پەرستانەی وەك قورئان لێیانەوە ئەگێڕێتەوە، بڕوایان بوو کە خوا پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوییەو، خوا مانگو ڕۆژی ژێر بار کردووەو باران ئەبارێنێ، وەك لە سوورەتی (العنكبوت)دا فەرمووی، سوێندیان بە خوا ئەخواردو لەنزا کردنا ناویان ئەبردو هاواریان لێ ئەکرد.

بەڵام لەگەڵ ئەو بڕوادا بڕوایان بەو بتانەو پەرستنی ئەو بتانە سەری لێ تێك دابوون لە بۆچوونو تێگەیشتنو باوو نیشانەو دروشمیانا، بەم ڕەنگە بەشێ لە کشتوکاڵو ماڵاتو حوشترو ئەولادیان بڕیار ئەدا بۆ ئەو بتانە، تاڕادەیە گەلێ جار کوڕەکانیان ئەکرد بە قوربانی بۆ ئەو بتانە، وەك لە سوورەتی (الانعام)دا ئەمانە ئەگێڕێتەوە، با تەماشای تەفسیری ئەو ئایەتانەی ئەوێ بکرێ.

ئەوانە لەگەڵ ئەوەدا لایان وابوو کەلەسەر ئایینی (ئیبراهیم)نو ئەوان ڕێگەیان ڕاست ترە لەنامەدارەکان کە لەگەڵیان ئەژیان لە نیوە دورگەدا، چونکە جولەکە ئەیان ووت: (عوزەیر) کوڕی خوایە، گاوەرەکان ئەیان ووت: (عیسا) کوڕی خوایە، لەکاتێکا بت پەرستەکان ئەیان ووت: مەلائیکەکچی خوایەولەگەڵ جنۆکە دەستو پەیوەندی ژن خوازی هەیە، دەی بەخەیاڵی خۆیان مەلائیکەو جنۆکە نزیك ترن لە خواوە لە (عیسا)و (عوزەیر)، کەواتە

بیروباوەڕی خۆیـان بەچاكتر ئـەزانی... لەگـەڵ ئـەوەی هـەمووی گـومڕایی و بت پەرستی‌یەو لەبت پەرستی دا دەست بژن و چاك و خراپ نی‌یەو هەمووی هەر پیس و خراپە.

ئینجا كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانە كراو فەرمووی: ئایینەكەی من هـەر ئایینی ئیبراهیمە (علیـه الـسلام) ئـەو بـت پەرسـتانە ووتیـان: ئێمـە لەسـەر ئـایینی (ئیـبراهیم)بـن، كەواتـە پێویستمان چی‌یە بەمەی شوێنی (محمد) بكەوین و وازبێنین لەو ئایینەی كەلەسەری بووین؟ لە هەمان كاتا كەتنە هەوڵدان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ یەك كەوتنیان و نەمانی دووبەرەكی و ئاژاوە، بەم ڕەنگە ئەو سوژدە ببا بۆ بتەكانی ئەومان و ئەمانیش سوژدە ببەن بۆ خوای ئەو! ئەو بێ‌دەنگ بێت لە بتەكانیان و لەكەو ڕەخنە نەگرێ لێیان و لە پەرستنیان، ئینجا هەر شتێ تـری ئـەوێ و داوای ئـەكات لێیـان بـۆی بـەجێ بێـنن! وا دەرئەكـەوێ تێكـەڵ و پێكـەڵی بیرواوەڕەكەیان و دان نانیان بەخوای پەروەردگار لەگەڵ پەرستنی بتەكانیان پاڵی پێوەناون بۆ ئەو یەك كەوتنەو گەیشتنیان بەیەك لە ناوەڕاستی ڕێگەدا.

بـەو بۆنەوەئـەم سـوورەتە هاتـە خـوارەوە بـۆ نەهێـشتنی ئـەو ئومێـدی یـەك كەوتنـە، وە ڕێگەبڕین لەو هەوڵ و تەقەلایەو بۆ جیاكردنەوەو پچڕانی ئەو دوو جۆرە پەرستنەو ئەم دوو بەرنامەو ئەو دوو ڕێگەیە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠
عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾

---

ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە بەو هەموو دڵنیاکردن و دووبارە کردنەوەی یەك نەگرتن و یەك نەکەوتنە، تا هیچ قسەو باسێ نەمێڵێ لەو بابەتەوە، ومنیازی یەك گرتن و گەیشتن بەیەك ببڕێ بەهیچ کلۆج، فەرمووی: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ئەی بێبڕواکان. فەرمانیدا کە هەر لەیەکەم جارەوە بانگیان لێ بکات و بەناو و سیفەتێ باسیان بکات کەپچڕان و جیابوونەوە لەیەکتر بگەیەنێ کە بەهیچ ڕەنگ چاوەڕوانی یەك کەوتن نەمێنێ، ئینجا دڵنیای بکات لەسەر ئەو پچڕان و یەك نەکەوتنەو بەڕوونی و بەبێ پێچ و پەنا هەواڵی پێبدات، لەیەکەم جارەوە لەدوو ووتەو ڕستە: یەکەم هەواڵ بەپچڕان و یەك نەکەوتنە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) دووەم بەپچڕان لەلایەن بێبڕواکانەوە، ئەفەرموێ: ﴿لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ واتە بڵێ من ناپەرستم ئەوەی کە ئێوە ئەیپەرستن ئێستا و لەمەو پاش. ﴿وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ﴾ وە ئێوەش هەرگیز ناپەرستن ئەوەی کە من ئەیپەرستم ئێستا و لەمەوپاش. واتەپەرستراومان یەك نییەوجیاوازن لەیەکتر،هەرچۆنی شێوەی پەرستنەکەشمان جیاوازە، ئینجا یەکەم ڕستە دووبارە ئەکاتەوە بە شێوەیە کە بەردەوامی و دامەزراوی ئەگەیەنێ لەسەر ئەو نەپەرستنە. ئەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ﴾ وە من هەرگیز ناپەرستم ئەوەی کە ئێوە پەرستووتانە، ئینجا دووەم ڕستەش دووبارە ئەکاتەوە لەسەر شێوەی یەکەم جاری، تا هیچ جێگەی گومان و دوودڵی نەمێنێ. ئەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ﴾ وە هەرگیز ئێوەش ناپەرستن ئەوەی کە من ئەیپەرستم، زانایانی تەفسیر لەبارەی ئەم چوار ڕستەیەوە دوو تاقمن:

یەکەم: کەزۆربەیە، ئەفەرموون: جیاوازن و هیچ دووبارە کردنەوەیان تیا نییە، ئینجا ئەم تاقمە لەناو خۆیانا دووبەرەکین لە هۆی جیاوازی یەکەیانا، لە چەند بارو ڕوویەکەوە کەباس کردنیان درێژەپێدانەو ئەبێتە مایەی بێزاری و بەلامەوە هیچ زیادە نرخێ نادا بەمەبەستەکە.

دووەم: لەسەر ئەوەن کە ڕستەی سێیەم‌و چوارەم دووبارە کردنەوەیە بۆ یەکەم‌و دووەم، وەك دەست نیشانمان بۆ کرد، بەهەرکام‌و لەسەر هەریار جوانەو ڕێکە، لەسەر ڕای دووبارە کردنەوە هیچ خراپەیە ڕوو نادات‌و ڕێگە نی‌یە بۆ هیچ ڕەخنەیە، چونکە دووبارە کردنەوە شتێکی باوەو بە زۆرو فراوانی لە قورئان‌و اه ووتاری عەرەبا هەیە، بەتایبەتی لەم جۆرە شوێنانەدا کە مەبەستەکەیان گرنگن، ئینجا ئەو پچڕان‌و یەك نەکەوتنە کورت ئەکاتەوە بەم دوو ڕستەکوورتە: ﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ﴾ هەر بۆ خۆتانە ئایینی خۆتان‌و تێپەڕ ناکات لەئێوەوە بۆ من، وە هەر بۆ خۆمە ئایینی خۆم‌و تێپەڕناکات بۆ ئێوە، کەواتە دژو بەرامبەری یەکترن، بەبێ تێکەڵ بوون‌و یەك کەوتن‌و بەبێ ئەوەی بگونجێ ڕێگەو پردێ ببەسترێ لە بەینا!!! بێگومان جاڕی ئەو جیابوونەوەو پچڕانە زۆر پێویست بوو لەبەر ڕوون کردنەوەی ئەو دژایەتی‌و دووبەرەکی‌یە تێرو تەواوەی کەلە ڕووی ڕاستی‌دا هەبوو، بەجۆرێ کە بەهیچ کلۆج نەئەگونجا یەك کەوتن‌و گەیشتن بەیەك لەناوەڕاستی ڕێگەدا، دژایەتی لە ئاقیدەو بیروباوەڕدا، لە بۆچوون‌و تێگەیشتنتا‌و لە بەرنامەو سروشتی ڕێگەدا، چونکە بێگومان خواپەرستی‌و باوەڕ بەتاکی خوا بەرنامەیەکەو هاوبەش بڕیاردانیش بەرنامەیەترە جیاواز لە هەموو شتێکا، هەرگیز ئەو دوو بەرنامەیە کۆنابنەوەو ناگەن بەیەك... بڕوا بەتاکی خواو پەرستنی بەتەنیا مەدروم ڕوو پێ‌ئەکات‌و ئەیبا ـ لەگەڵ هەموو بوون‌و بوونەوەردا ـ بەرەو خواو بۆلای خوا بە تەنیا‌و بەبێ هیچ جۆرە هاوبەشێ، وە سەرچاوەیەکی بۆ دیاری ئەکات بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕو ئاقیدەو ڕەوشت‌و کردارو بۆچوون‌و تێگەیشتنی لەبارەی بوون‌و بوونەوەرو ژیان‌و ئادەمییەوە، ئەو سەرچاوەش تەنها خوایە بە بێ‌هاوبەش، جا لەبەر ئەبێ ژیانی خواپەرست لەسەر ئەو بنەڕەتە دامەزرێ‌و بەرپابێ، بەبێ تێکەڵی‌و پەیوەندی بەبت پەرستی‌و هاوبەش بڕیار دانەوە لە هیچ شێوەو دیمەنێکیا، نەبەئاشکراو نەبە نهێنێ.

ئەم جیابوونەوەو پچڕانە بەم ڕوونیی و ڕەوانییە زۆر پێویستە بۆ بانگ کەرانی ڕێگەی خواو بانگ کراوان بۆ ڕێگەی خوا. بێگومان بۆچوون و تێگەیشتنی نەفامێتی و بێبڕوایی زۆر جار ئەشێویّ و تێکەڵ ئەبێ لەگەڵ بۆچوون و تێگەیشتنی زانین و بڕوادا، واتە چەند شت هەیە لە نەفامیی و بێبڕواییەوە هاتووە لەبنەڕەتا، کەچی تێکەڵ ئەبێت و بەهێنی ئیمان و بڕوا سەیر ئەکرێ، بەتایبەتی لەناو ئەم تاقم و کۆمەڵانەی کەلە پێشەوە ئاقیدەو بڕوایان ناسیوەو لە پاشا لایانداوە، وە ئەو تاقم و کۆمەڵانە سەرکێش و یاخی ترین تاقم و کۆمەڵەکانی ترن لە ئاقیدەو بڕوایان نەبووەو نەناسیوە، ئەویش لەبەر ئەوەیە ئەوانەی کە ئاقیدەو بڕوایان لەپێشەوە بووە حۆیان بەشت سەیر ئەکەن و لایان وایە لەسەر ڕێگەی ڕاستن، لەکاتێکا بەخۆیان نازانن و لایانداوە، وە بیروباوەڕو کردەوەکانیان تێکەڵ لە چاك و لەخراپ و ڕاست و ناڕاست، ئەو تێکەڵ و پێکەڵییە زۆر جار بانگ کەری ڕێگای خوا فریب ئەدات بەمەی دان بنێ بە چاکەکەیا بە ئومێدی ڕاکێشانی لادەرەکە بۆ ڕێگەی ڕاست و ڕاست کردنەوەی ناڕاست و لارەکانی. بێگومان ئەو فریب خواردنە ئەوپەڕی مەترسی تێدایەو لەوانەیە بە ئاسانی ببێ بەهۆی وەرگرتنی خراپەکانیشی و فریب خواردنی هەموو نەزان و نەشارەزایە! بێگومان نەفامی و بێبڕوایی هەر نەفامی و بێبڕواییە، ئیتر لە هەر دیمەن و شێوەیەکا ببێ، تێکەڵ بێت یا نە ، ئایینی ئیسلامیش شتێکی دیاری و جیاوازو سەربەخۆیە، ئەم دوانەش زۆر دوورن لەیەکەوە، ڕێگەی ڕاست و بێقۆرت و گرێ، بریتییە لە دەرچوون لە نەفامی بە تەواوی بۆلای ئیسلام بەتەواوی بریتییە لە خۆداڕنین لە نەفامی بە هەموو شتێکیەوە بۆلای ئیسلام بە هەموو شتێکیەوە.

یەکەم هەنگاو بۆ بانگ کەری ڕێگەی خوا هەست کردنیەتی بە کەنارگیری و دوور کەوتنەوەی تەواو لەبۆچوونی نەفامێتی و بەرنامەو کردەوەی نەفامێتی، کەنارگیری و دوور کەوتنەوەیە کە بەهیچ ڕەنگ ڕێگەی گەیشتن بە یەك کەوتن نەدات، وە ڕەوای کۆمەکی و هاوکاری نەدات مەگەر کاتێ نەفامێتی و نەمێنێ و بگوێزرێتەوە بۆ لای ئیسلام بە تەواوی.

نەفامێتی بە هەر وێنەو پۆشاکێ خۆی دەرخاتو بە هەر جۆر ناوی ئیسلام بنێ‌لەخۆی هەر نەفامێتییەو یەك کەوتنو گەیشتن بەیەك ناگونجێ لەگەڵی!

بەردی بناغە بۆ بانگ کەری ڕێگەی خوا هەست کردنیەتی بەوەی کە خۆی شتێکی تری جیاوازە لە هەموو تاقمو کۆمەڵێ تر، ئایینو ئاقیدەیان جیاوازەو ڕێگای جیاوازە، بە هیچ کلۆج ناگونجێ هەنگاوێ لەگەڵیا بڕوا، لە ڕێگەکەیانا، کارو پیشەی ئەم ئەمەیکە لەسەر ڕێگەی خۆیا بڕوا، بەبێ لادانو یەك کەوتنو دابەزین لە زۆرو لە کەمی ئایینەکەی! بانگ کەرانی ڕێگەی ئیسلام زۆر زۆر پێویستێ بەم پچڕانو تێکەڵ نەبوونە. زۆر زۆر پێویستێ بەوەی کە بزانن ئەیانەوێ ئیسلام سەر لەنوێ دائەمەزرێننو دای ئەمێننەوە لەناو گەلو کۆمەڵێکی نەفامی لادراو لەڕێگەی ڕاست، وە لەناو کەسانێ کەلە پێشەوە ئاقیدەو ئایینیان ناسیوە، لەپاشا دوور کەوتوونەتەوە تا لە بیریان نەماوەو لایانداوە... بە هیچ کلۆج یەك کەوتنو ڕێك کەوتن نابێ‌و ناگەن بەیەك لەنیوەی ڕێگەداو هیچ پینەو پەڕۆیە ناکرێ‌و نابەسترێن بە هیچ شتێکی ترەوە. بەڵکو کاری ئەمان بانگ کردنە بۆ لای ئیسلامو بانگ کردنی یەکەم جاری بانگ کردن لەناو کۆمەڵی نەفاما و جیابوونەوەی تەواو لە هەموو بارو ڕوویەکی نەفامی یەکەیانەوە. بەو جۆرەی کە فەرمان درا: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ وەك ڕوون کرایەوە. بەبێ ئەوە ئەم تاریکیو تێکەڵو پێکەڵی هەر ئەمێنێ، بانگ کردنیش بۆلای ئیسلام بەو فشو فۆڵێیەو، لەسەر ئەو بنەڕەتەبێ هێزو لاوازە نابێ‌و ناگونجێ‌و کارو باری ناڕوا، ئەم ئایەتە لەسەر ئەم بارو شێوەی کە تەفسیر کرایەوە نەسڕاوەتەوە بە ئایەتی کوشتار، وەك چەند کەسێ لەسەر ئەوەنو تەفسیری ئەکەنەوە بەواز هێنان لەیەکترو بەسەریەکا نەچوون، بێ‌گومان ئەم ڕایە بێ‌هێزو لاوازە. والله اعلم.

وصلى الله وسلم على اكرم مخلوق وعلى آله وصحبه

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾
فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾

---

## سوورەتی ﴿النصر﴾
## مەدینەیی یەو (٣) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ﴾ کاتێ کۆمەکی خواو زاڵ کردنی تۆ بەسەر دوژمنا هاتو بەدی هات﴿وَٱلۡفَتۡحُ﴾ وە گرتنی شاری مەککە بەدی هات ﴿وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾ وە دیت کە مەردوم موسڵمان ئەبوون و ئەهاتنە ناو ئایینی خوا پۆل پۆل ﴿فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ﴾ ئینجا تۆش پەروەردگارت بەپاک و تەمیز ڕاگرە لە هەر شتێ کە شایستەنێیە، لەکاتێکا سوپاسی بکە بەهەر ناوو سیفەتێ کە شایان و شایستەیە ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡهُ﴾وە داوای لێ بووردن بکەلێی ﴿إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾چونکە بێگومان پەروەردگارت زۆر گیراکەرو پەشیمان بوونەوەوداوای لێ بووردن بووەو هەمیشەیی هەمیشەیی هەروایە.

ئەم سوورەتە کورتە هەر چۆنێ موژدە ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) بەیارمەتی دانی خوا بۆی و بەگرتنی شاری مەککەو موسڵمان بوونی مەردوم بە پۆل پۆل، وە هەرچۆنێ فەرمانی پێئەدات بەڕووکردنە خوا بە سوپاس و سەناو داوای لێ بووردن لە کاتی بەدیهاتنی ئەو موژدەیانە کەپێیدا.

ئەم سوورەتە هەرچۆنێ باسی ئەو دوو شتە ئەکات لە هەمان کاتا سورشتی ئەم ئایین و بەرنامەیە دەرئەخات، لەگەڵ ئەو ڕێزو بەرزی و ڕاستی لێ بڕان بۆ خواو ئازادی و سەربەستی یەی کە ئیسلام ئەیەوێ ئادەمی پێی بگات. ئەو پایەو پلە بەرزەی، کە هەرگیز دەست کەوت نابێ مەگەر لە ژێر سایەی ئیسلاما.

چەند ڕیوایەتێ هاتووە لەبارەی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتەوە، لەناو هەموانا ڕیوایەتێ هەڵئەبژێرین کە (ئیمامی ئەحمەد) ئەیهێنێ لە دایکی ئیمانداران (عایشە)وە –خوا

لێـی ڕازی بـێ- کـه ئەفـەرموێ: (ﷺ) لـه دوا داویــی ژیانیـا زۆر ئەیفـەرموو: (سـبحان الله وبحمده استغفر الله واتوب إليه)، وه ئیفەرموو: خوا هەواڵی پێدام کەلەمەو پاش نیشانەیەك ئەبینم لەناو ئوومەتەکەما، وەفەرمانی دا کەهەرکات ئەو نیشانەیەم بەو جۆرەیە باس‌و یادی بکەم، وه ئەو نیشانەیەشم دی کەئەوەیە لەم سوورەتەدا وەك باسکراوە(مسلیم)یش هەر بەم جـۆره ڕیوایەتەکـە ئـەهێنێ لەڕێگـەی (ئـەبو داودی کـوڕی هینـد)ەوه. (ئـیبن کەسـیر) لـه تەفسیرەکەیا ئەفەرموێ: مەبەست بەفەتح لـەم سوورەتەدا فەتحی (مەککە)یە بەلای هـەموو زانایانـەوە، چونکه هـەموو تیرەو خێڵـەکانی عـەرەب چاوەڕوانی گرتنـی مەککـەیان ئـەکردو ئـەیان ووت: ئەگـەر زاڵ ببـێ بەسـەر مەککـەیی یـەکانا ئـەوا ڕاسـته پێغەمبـەره، ئینجـا کاتـێ زاڵبوو، پۆل پۆل موسڵمان بوون، ئینجا دوو مانگی نەبرد هەتا نیوه دورگه پڕبوو لەبڕوا، لـەناو هـەموو تیرەکـانی هـەرەبا کـەس نـەما موسـڵمانێتی دەر نـەبڕێ سـوپاس بـۆ خـوا، وەك (ئیمـامی بوخـاری) لەصـەحیەکەیا بـەم جـۆره ئەفـەرموێ‌و لـه (عومـەری کـوڕی سـەلەمە) وەئەیهێنێ: ئەفەرموێ: کاتـێ کـه (مەککـه) گیرا هـەموو تیرەیـه چەسپانی کرد بـه موسڵمان بـوون بـۆلای پێغەمبـەر (ﷺ)و لەپێشەوه چاوەڕوانی گرتنـی مەککـەیان ئـەکرد ئـەیان ووت: وازبێنن له (محمد)و گەلەکەی، ئەگەر زاڵ بوو بەسەریانا ئـەوا ڕاسـته پێغەمبەره... هتد. ئەم ڕیوایەتـه ڕێـك‌و پێکـه لەگـەڵ دیمـەن‌و ڕواڵـەتی سـوورەتەکەدا، بـەم ڕەنگـه لـەکاتی هاتنـه خوارەوەیا ئاماژه ئەکات بەو موژدەیە کەله پاشا بەدی دێت، لەگەڵ فەرمان دان به پێغەمبـەر (ﷺ) بەو سوپاس‌و سـەنا‌و داوای لـێ بووردنـه کەبیکا لەکاتی بـەدی هـاتنی ئـەو موژدەیـەو دەرکەوتنی ئەو نیشانەیە.

ڕیوایـەتێ‌تر هەیـه لـه (ئـیبن‌و عـەباس)ەوه، کەبـەدی هـاتنی ئـەو موژدەیانـەی کـردووه بەنیشانەی نزیکی لەدنیا دەرچوونی پێغەمبـەر (ﷺ) لەبەر ئەوه خـوا فەرمانی پـێداوه بـەو وەسف‌و سەنا‌و داوای لێ بوردنه، ئەم ڕیوایەته هەر چەند وا نیشان ئەدات که ئەو موژدەیانه بەدی هـاتبێ پێش هاتنـەخوارەوەی سـوورەتەکە، بـەڵام لەهـەمان کاتـا ئـەگونجێ‌و دوور نـییـه کەله پێشەوه سوورەتەکه هەواڵی دابێ بەهاتنی ئەو موژدەیانە، ئینجا کاتێ بـەدی هـاتبێ بـۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەوتبێ کەکارو فەرمانی له جیهانا تـەواو بووه و بـەو نزیکانـه ئەچێ بـۆ حوزووری خوا. وه مەبەستی (ئیبن‌و عەباس)یش هەر ئەوه بووبێ، بەم جۆره ئەم ڕیوایەتـەش ڕێك ئەکەوێ لەگەڵ ڕواڵەتی سوورتەکەو ڕیوایەتەکانی تریش کەباس کران.

بەڵێ ڕیوایەتێ تر هەیە (حافظ) ئەیهێنێ لە (ئیبن و عەباس)ەوە، کەکاتێ ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر (ﷺ) بانگ ئەکاتە (فاطمة) کچی سەلامی خوای لێبێ ئەفەرموێ: هەواڵی مردنی خۆمم پێدراوە بەهۆی ئەوە (فاطمة) دەست ئەکات بەگریان.

لەپاشا دەست ئەکات بە پێکەنین، ئەفەرموێ: هەواڵی مردنی خۆی پێدام لەبەرئەوە گریام ئینجا فەرمووی خۆ ڕاگرە تۆیەکەم کەسی لە ئاڵ و بەیتم کە پێم ئەگەیت و دێیت بۆلام بەهۆی ئەوە پێکەنیم. بێگومان ئەم ڕیوایەتە وا ئەگەیەنێ کەلە پێش هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتەدا ئەو نیشانانە بەدی هاتبن، ئینجا کە سوورەتەکە هات و نیشانەکانی خستە بەرچاوی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دەرکەوت کە کاری لە جیهانا دوایی هاتووە و نامێنێ.

بەڵام یەکەم ڕیوایەت کە هەڵبژێررا بەهێزترە لای زانایانی حەدیس وە ڕێکە لەگەڵ ڕواڵەتی سوورەتەکەدا، بێجگە لەوەش ئەم حەدیسی گریان و پێکەنینە بەجۆری تریش ڕیوایەت کراوە کە لەگەڵ یەکەم ڕیوایەتا پاش یەك ئەکەوێ و هیچ گرێیە نامێنێ، ئەو ڕیوایەتەش ئەمەیە کە (تیرمزی) ئەیهێنێ لە دایکی ئیمانداران (أم سلمە)وە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی گرتنی مەککەدا بانگی کردە (فاطمة)و چپەیەکی بۆکردو (فاطمة) دەستی کرد بە گریان، ئینجا چپەیەکی تری بۆ کرد، دەستی کرد بە پێکەنین، (أم سلمە) ئەفەرموێ: لەپاش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە دنیا دەرچوو، پرسیاری ئەو گریان و پێکەنینەم لێ کرد، ئەویش وتی: هەواڵی دامێ کە نامێنێ، منیش گریام، لە پاشا هەواڵی پێدام کە من گەورەترم لە هەموو ژنانی بەهەشت بێجگە لە (مەریەمی کچی عمران)، منیش پێکەنیم.

دەی ئاشکرایە ئەم ڕیوایەتە ڕێکە لەگەڵ ڕواڵەتی سورەتەکەداو لەگەڵ یەکەم ڕیوایەت کە هەڵبژێررا، کە خوا نیشانەیەکی داناوە لە بەینی خۆی و پێغەمبەرا (ﷺ) کە ئەوەیە لەم سوورەتەدا، ئینجا کاتێ کە مەککە گیرا بۆی دەرکەوت کە ئەمانی نزیکەو بەهۆی ئەوە بانگی (فاطمة)ی کرد – سەلامی خوای لێ بێت– وەك باس کرا، باوەڕمان بەو ڕایە بەهێزە کە ئەفەرموێ: ئەم سوورەتە لەپێش بەدی هاتنی ئەو نیشانانەدا هاتە خوارەوەو هەواڵەکە یەکێکەلەهەواڵەغەیبییەکانی قورئان کەهەرکام لەوانە موعجیزەیەکن بۆ پێغەمبەری ئازیز(ﷺ).

ئینجا ئەڕۆین بۆ مەبەستێکی دامەزراوو تەمێیەکی هەمیشەیی کە ئەم سوورەتە کورتە ئەی گەیەنێ تا بزانین ئەم سوورەتە بچکۆلەیە ئاماژە ئەکات بۆ چ پلەو پایەیەکی بەرز. لە سەرەتاوە بۆچوون و تێگەیشتنێکی تایبەتی ئەخاتە دەروونمانەوە لە بارەی ئەوەی کە ڕوو ئەدا لەم بوونەوەرەدا، وە ئەوەی بەدی دێت لەم ژیانەدا، لەبارەی کارو فەرمانی پێغەمبەر

(ﷺ) و کارو فەرمانی بڕواداران لەم بانگو بانگەوازەی کە پێی هەڵسان بۆ ئایینی خوا و بۆلای خوا، ئەو سنوورەی کە پێی ئەگەن و تێپەڕ نابن لێی.

ئەو بۆچوون و هۆی تێگەیشتنەش وەرئەگیرێ لەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ﴾ کەواتە: کۆمەکی کردن و زاڵ کردنە کە هینی خوایەو خوا ئەیهێنێ: لە کاتێکا ئەیهێنێ کە خۆی بڕیاری داوەو ویستوویەتی: وە لەسەر ئەو بارو شێوەی کە خۆی بۆی داناوە، لەبەر ئەو مەبەستەی کە خۆی نەخشەی کێشاوە، پێغەمبەر و یارەکانی لەو بارەیەوە هیچیان بە دەست نیەو دەستیشیان نیە لەو کۆمەکی و زاڵ کردنەدا! بەڵکو کارەکە کاری خوایەو پێکی ئەهێنێ بەوان یا بە تاقم و کۆمەڵێ‌تر، وە ئەوان ئەوەیان بەسە کە لەسەر دەستی ئەوانا پێکی هێنا، وە ئەوانی کرد بە پاسدارو پاسەوانی و بە ئەمیندار بە سەریەوە، هەر ئەمەیە بەشی ئەوان لەو زاڵ کردن و فەتح و موسڵمان بوونی مەردومەدا بە پۆل پۆل، جا لەم بۆچوونە تایبەتیەو لەم تێگەیشتنەوە ڕوون ئەبێتەوە کە ئەبێ پێغەمبەر (ﷺ) بەرانبەر ئەو ڕێزو بەهرەی کە خوا کردی لەگەڵ خۆی و موسڵمانان، ئەبێ بەرانبەر ئەوە ڕوو بکاتە پەروەردگاری بە وەسف و سەناو سوپاسی و داوای لێبوردن لەکاتی زاڵ کردن و سەرکەوتنیا.

وەسف و سەناو سوپاسی بکات لەسەر ئەو بەهرەو منەتە گەورەی کە دای بەسەریانا، بەم ڕەنگە خۆی و یارەکانی کرد بە پاسەوان و ئەمینداری ئایین و بانگەوازەکەی و لەسەر ئەو چاکەو میهرەبانیە کە ڕشتی بەسەر ئادەمێتیدا لە ڕێگای زاڵکردنی ئایینەکەیەوە، وە لەسەر ئەوەی مەردوم بە پۆل پۆل ڕزگار بوون لە کوێری و گومڕایی و زیانباری.

داوای لێبوردنەکەیش لەبەر چەند حاڵەتێکی دەروونی کە زۆر جار دەسەڵات نیە بە سەریاناو لە خۆیانەوە ڕوو ئەکەنە دەروون، داوای لێبوردن لە کەشخەو زیادە شادمانیە کە پەیدا ئەبێ لەکاتی زاڵبوون و سەرکەوتنا، لەپاشی تێکۆشان و بەربەرەکانێ‌ی زۆر، داوای لێبوردن لە بێ‌ئارامی و تەنگەتاوی و بێزارییەك کە پەیدا ئەبن لە درێژەکێشانی ماوەی بەربەرەکانێ و دووچار بوونی سزاوئازاری سەخت لەلایەن دوژمنی مل هوڕو سەرکێشەوە، لە هەر نیازو خەتەرەیەکی ناڕەوا کەبەدڵا هاتبێ لەو ماوە دوورو درێژەدا، وەك خەتەرەی درەنگ هاتنی بەڵێن و یارمەتی خوا و کەم ئومێدیە کەلەکاتی تەنگانەدا دێت بەدەروونا، داوای لێ بوردن لە هەر کەم و کوڕیە لەباسوپاس و سەنای خواداو لە هەڵنەسان بەوەی پێویستە لەسەر بەندە بەرامبەر چاکەو میهرەبانی پەروەردگار، بێجگە لەمانەش داوای لێ بوردن لە کاتی زاڵ بوونا کەکاتی لە خۆگۆڕان و لەخۆ بایی پەندو تەمێیە بۆ نەفس و بەرگری

ئەكات لەوەی كەشخەو شانازی ڕووی تێبكات، بەڵكو ئەبێتە هۆی زیادە سوپاس و چاولەبەری بۆ خوا، وە ئەبێ بەهۆی هەست كردن بەكەم و كوڕی و ناتەواوی و دەستەپاچەیی بەندە بەرامبەر بەخوای خۆی، ئینجا ئەم هەستە بەرگری ئەو زاڵبووە ئەكات لەهەر ناڕەواییەیە دەربارەی گیراوو ژێردەست كراوەكان، بەڵكو چاوەڕوانی ڕەزامەندی و فەرمانی خوا ئەكات دەربارەیان، چونكە ئەزانێ خوا زاڵی كردووە بەسەریانا، وە دەسەڵاتە كەهێنی خوایە پێیداوە، ئەگینا بێ ئەم، بێ دەسەڵات و دەستە پاچەیە.

بەڕاستی ئەم هەست و ڕەوشتە ئاسۆیەكی ئێجگار شیرین و بەرزو بەڕێزە، كە قورئان بانگی بۆ ئەكات و ئەیەوێ بەندە پێی بگات و بۆو سەركەوێ، ئاسۆیەكە مەردومی تیا بەرزو گەورەئەبێ، چونكە لە خۆگۆڕان و خۆ بەزل زانی نامێنێ و بەڕاستی مل كەچ بۆ خوا.

بەڕاستی ئەوەیە ئازادی و ڕزگار بوون لە هەموو چڵك و چێوێكی خود پەسەندی و خود پەرستی، تا ڕادەیە هیچ حەزو مەبەستێ نامێنێ بێجگە لە ڕەزامەندی خوا، لەگەڵ ئەوەدا ئەوە تێكۆشانە بۆ زاڵبوونی خێرو چاكەو پێك هێنان و بەدی هێنانی حەق و ڕاستییە، وە هەوڵ و تێكۆشانە بۆ ئاوەدان كردنەوەی زەوی و بەرزكردنەوەی ژیان و سەركردایەتی جیهان و ئادەمی بەجۆرێكی پاك و خاوێن و بێ لەكە كە مەردوم هەر بەرەو خوا ببا، و بەبێ هودەو لە خۆڕایی هەوڵ ئەدا بۆ ئازادی و سەربەستی ئەو كەسەی كە بەستراوەتەوە بە خۆی و بەرژەوەندی خۆیەوەو كۆت و زنجیری حەزو ئارەزووی خۆی لەدەست و مل و قاچی دایە، ئەو كەسە هەرگیز ئازادی و سەربەستی دەست كەوت نابێ، مەگەر ڕزگاربێ لە خۆی و حەزو ئارەزووی، وەلەكاتی زاڵبوون و دەسەڵاتا خۆی داڕنێ لە هەموو شتێكی خۆی بۆئەوەی یادو نیازی خوا بكات بەتەنیا، هەر ئەوەیە باوو ڕەوشت و ئەدەبی پێغەمبەرێتی، كە خوا ئەیەوێ ئادەمی و ئادەمێتی پێ بەرزیكاتەوە بۆ ئاسۆ بەرزەكان، یا هەر بۆ ئەو ئاسۆیانە بڕوانن و چاو هەر بڕنە ئەو بەهەمیشەیی. (یوسف) پێغەمبەر (علیە السلام) هەر بەو جۆرە بوو ئەو حەلەی كە هەموو شتی بۆ تەواو بوو، وەخەوەكەی بەدی هات، لەو كاتەدا هەر یادی خوای كردو باسی بەهرەو چاكەكانی خوای كرد بەسەریەوەو چاولەبەری خۆی بۆ خوا دەربڕی، لەو كاتەدا خۆی داڕنی لە خۆشی و شادمانی و شانازی، ڕووی كردە پەروەردگاری بە سوپاس و یاد وەسف و سەناوە، لەكاتێكا كە گەیشتە ئەوپەڕی دەسەڵات و نازو ڕێزو پادشایەتی، هاوارو نزای ئەمەبوو: ئەی پەروەردگار تۆ خاوەن و كاربەدەستی منی لە جیهان و لە ڕۆژی دواییدا، بە موسڵمانێتی بم مرێنە، وە بەم ڕەنگە خەرە ڕیزی پیاوچاكان، لەو كاتەدا

نەگەورەیی و نەدەسەڵات و نە پادشابەتی و نە خۆشی و شادمانی کۆبوونەوەو گەیشتن بەباوك و دایك و براو کەس و کارو نەهیچ شتی تر لەبەر چاوی ئەم پێغەمبەرەدا نەما بەڵکو وێنەو شێوەی ئادەمی‌یەکی تەنها دەرکەوت کە ئەکرۆزێتەوەو ئەلاڵێتەوە لای پەروەردگاری کە موسڵمانێتی یەکەی بپارێزێ هەتا ئەیمرێنێ، وە بیباتە ڕیزی پیاوچاکانی خۆی، بە لوتف و میهرەبانی خۆی.

لەسەر ئەو باوو ڕەوشتە (سلیمان) پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بە سوپاس و وەسف و سەنای خوا کاتێ کەبینی تەختەکەی (بەڵقیس) ئامادەبوو لەبەر دەستیا، ئەوەی بە بەهرەو میهرەبانی خوا دانا و بەس، نەك هیچ جۆرە هونەرێ بۆ خۆی دابنێ، هەر لەسەر ئەو باوو ڕەوشتە شیرینەبوو پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) لە هەموو ژیانیا و لەکاتی زاڵبوون و گرتنی شاری مەککەدا بەسەر پشتی حوشترەکەیەوە سوژەی برد بۆ خواو هەر بەو شێوەیە چووە ناو شاری مەککە، ئەوشارەی کە دانیشتوانی سزاو ئازاریان داو دەریان کردو جەنگیان لەگەڵ کردو لە ڕێگای ئایینەکەیا وەستان بە هەموو توندو تیژیەکەوە... ئینجا کاتێ کە خوا زاڵی کردو بەو جۆرە مەککەی خستە ژێردەستی و خۆشی شادمانی ئەو زاڵبوون و سەرکەوتنەی لە بیرنەبوو، بەڵکو کەوتە سوژدەبردن و وەصف و سەنای خواو داوای لێبووردن بەو جۆرەی کە خوا فەرمانی پێداوە، لەپاشی ئەوە هەر بەردەوام بوو لەسەر ئەو سوپاس و وەصف و داوای لێبووردنە تا کۆچی کرد لەم جیهانە، ئەو ڕەوشتە پاکەی هەر مایەوە لەناو هاوڕێکانیا لەپاش خۆی ـ خوا لێیان ڕازی بێ ـ ئابەو جۆرە ئادەمی و ئادەمێتی بەرزبوویەوە بەهۆی بڕوا بەخوا، وە پاك و خاوێن بووو ڕووناکی دایەوە بەجیهانا، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لە بەهرەو پیت و فەڕی بڕوا بە خواو ئایینە پیرۆزەکەی، آمین.

وصلی الله وسلم علی حبیبه المصطفی وحبیبا محمد الی یوم الدین – آمین –

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾

---

## سوورەتی ﴿المسد﴾
## مەككەییەو (٥) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە لەبارەی (ئەبو لەهەب)ەوە، کەمامی پێغەمبەرە (ﷺ) هەروەها لەبارەی ژنەکەیەوە، کەئەم دوانەلەهەموو کەس بەتین تربوون لە دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ) و ئایینەکەیا.

(ئیبن و ئیسحاق) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ڕەبیعەی کوڕی عەبیادە)وە کە ئەڵێ: من کوڕێکی گەنج بووم، لەگەڵ باکوم بووم، سەرنجی پێغەمبەرم ئەدا (ﷺ) کاتێ کە ئەگەڕا بە ناو تیرەو هۆزەکانا، پیاوێکی خێلی دەم و چاو سوورو سپیش بەدوایا ئەهات، پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەستا بەسەر هەر تیرەیەکەوەو پێی ئەفەرموون: من پێغەمبەری خوام بۆلای ئێوە، فەرمانتان پێئەدەم کە خوا بپەرستن و هیچ هاوبەشی بۆ دامەنێن، باوەڕم پێبێنن و بەرگرییم لێ مەکەن، هەتا لەلایەن خواوە پێتان ڕاگەیەنم، ئەوەی کە خوا ڕەوانەی کردووم پێی، وە کاتێ لێ ئەبووەوە لەقسەکەی ئەو پیاوە خێلەش بەدوایا ئەهات و ئەی ووت بەو تیرەیە: ئەمە ئەیەوێ لە (لات)و (عوززا) خۆتان داڕنن و واز بێنن لەوان و لە دۆست و سوێن خوارەکنتان لەجنۆکەکانی بەرەی (مالیکی کوڕی ئەقحەمی)، وە بێن بۆ سەر ئەم ئایینە تازەو ئەم گومڕاییی یە کە هێناویەتی، کەواتە گوێی بۆ مەگرن و شوێنی مەکەون، (ڕەبیعە) ئەڵێ منیش ووتم بەباوکم: ئەمەکێیە؟ ئەویش ووتی: (ئەبو لەهەب)ی مامیەتی. (ئیمامی ئەحمەد)و (تەبەرانی)ش هەر بەم شێوەیە ئەم هەواڵە ئەهێنن ئەمە نموونەیە کە لەپیلان و کردەوە خراپەکانی (ئەبو لەهەب) دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ)و بانگ کردنەکەی، وە ژنەکەشی کە (ام جحیلی کچی حەربی کوڕی ئومەیە) بە یارمەتی دەری بوو لەو هێرش و کردەوە پیسانەدا کە بەهەمیشەیی خەریك بوون پێیەوە، (ئەبو لەهەب) هەر لەیەکەم ڕۆژی بانگ کردنەکەی

پێغەمبەر (ﷺ) ئەم هەڵوێستە خراپەی هەبوو، (ئیمامی بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەر سەفاو بانگی کردە قورەیش، ئەوانیش کۆبوونەوە لە دەوری، ئینجا پێی فەرموون: پێم بڵێن: ئەگەر من پێتان بڵێم کە دوژمن لە ئێوارە یا لە بەیانیدا ئەدا بەسەرتانا، ئایا بڕوام پێ ئەکەن؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ، ئەویش فەرمووی: دەی بێگومان من ترسێنەرم بۆتان لەپێش هاتنی سزایەکی بەتین، ئینجا (ئەبو لەهەب)یش ئەڵێ: ئایا تۆ بۆ ئەمە ئێمەت کۆکردۆتەوە؟ لەناوچیت و ڕەنجەڕۆ بیت، ئینجا خوا ئەم سوورەتەی ناردە خوارەوە، کاتێ بەرەو نەوەی (هاشم) بە سەرکردایەتی (ئەبوتالیب) بڕیاریان دا لەسەر پاراستنی پێغەمبەر (ﷺ) هەرچەند هەموو لەسەر ئایینەکەشی نەبوون، بەس لەبەر خزمایەتی، (ئەبو لەهەب) بە تەنیا لێیان جوێ بووەوەو پاڵی دا بە قورەیشەوەو سوێندخواریان بوو بە دژی پێغەمبەر (ﷺ) و بەرەی هاشم، کە براو کەس و کاری بوون، وە ئەوەیش یەکێ بوو لەوانەی کە بڕیاری دا لەسەر ئەو نامەیەی کە قورەیش نووسییان دژی بەرەی هاشم و دەنگ لێ وەرگرتنیان و برسی کردنیان، بۆ ئەمەی واز بێننلە پێغەمبەر و یارمەتی نەدەن (ئەبو لەهەب) دوو کچی پێغەمبەر (ﷺ) ی خواستبوو (رقیة)و (ام کلثوم) بۆ دوو کوڕی خۆی، پێش پێغەمبەرێتی، ئینجا لەپاش پێغەمبەرێتی فەرمانی دا پێیان بە تەڵاق دانیان بۆ ئەوەی ئەرکی بەخێو کردنیان بکەوێتە سەر شانی پێغەمبەر (ﷺ) کەواتە ئازارەکە بەتین تر بوو، ئەگێڕنەوە کە ئەو ژنە دارو دڕکی هەڵئەگرت و لە ڕێگای پێغەمبەردا دایئەنا!

ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو جەنگ و دوژمنایەتیە لەلایەن (ئەبو لەهەب)و ژنەکەی، وەخوا لەباتی پێغەمبەر(ﷺ) کارەکەی گرتە ژێر دەستی خۆی و خۆیکرد بە خاوەنی، فەرمووی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ﴾ دەك لەناوچێ هەردوو دەستی (ئەبو لەهەب)، واتە خۆی لەناوچێ و نەمێنێ، بەڵام لەباتی خۆی دوو دەستی فەرموو، چونکە کارو فەرمانی ئادەمی بەستراوە بە دەستەکانیەوەو هەرکات دەستەکانی نەما وەك خۆی نەمێنێ وایە، لەبەر ئەوە بووە بە باو وتنی هەردوو دەست لە جێگای خاوەن دەستەکانا، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە کردەوەی خراپیان ببێ و بە هۆی ئەو کردەوە خراپانەوە دووچار ببن، وەك لێرەدا.

لە پێشەوە بە شێوەی نزا فەرمووی، کە نزا لەلایەن خواوە ئێجگار سەخت و سامناکەو بە هیچ کلۆج ڕزگار بوون نابێ لێی، ئینجا بە شێوەی هەواڵدانیش دڵنیایی لەسەر ئەکات،

لەسەر ئەو لەناوچوونەو مەبەستەکە بەهێزتر ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَتَبَّ﴾ وە (ئەبو لەهەب) لەناو چوو، واتە بەدی هاتنی لەناو چوونەکەی ئەوەندە ڕاستەو هیچ جێگەی گومان نیە، وەك لەمەو بەر بەدی هاتبێ‌و ئێستە هەواڵی پێ بدرێ وایە، کەواتە لەم ئایەتە کورتەدا نزاو بەدی هاتنەکەی نیشان دا، وە جەنگ‌و بەربەرەکانیەکە دوایی هات‌و بڕایەوەو پەردەیەکی بەسەرا هێنرا، ئینجا ئەو لەناوچوون‌و نەمانە ڕوون ترو جێگیر تر ئەکات لە دەروونا کە ئەفەرموێ: ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ﴾سوودو قازانجی نەدا پێی سامان‌ودارایییەکەی و ئەوەی بەهەوڵ‌و تێکۆشان دەست کەوتیکرد، وە بەرگری ئەو نەمان‌و لەناوچوونەی لێ نەکرد.

ئەمە تۆڵەکەیەتی لە جیهانا، وە تۆڵەی لە ڕۆژی دوایی دا ئەمەیە کە بێ‌گومان ﴿سَيَصۡلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ﴾ ئەچێتەناو ئاگرێکی خاوەن بڵێسەوەو بەجۆرێ سوتاندن‌و گەرمیەکەی ئەچەژێ ﴿وَٱمۡرَأَتُهُۥ﴾ وەژنەکەیشی ئەچێتە ناو ئەو ئاگرە.

(ئیبن‌و ئەبی حاتەم)و (ئیبن‌و جەریر) ئەگێڕنەوە لە (ئیبن‌و زەید)ەوە کە ئەو ژنە بەدە بە کوڵ پەل‌و پۆی دارودڕکی ئەهێناو بەشەو بڵاوی ئەکردەوە لە ڕێگای پێغەمبەرا (ﷺ) بۆئەمەی بچێ بە پێ‌یاو ئازاری ببێ، هەروەها (قەتادە) ئەڵێ لەگەڵ ئەوەی دەوڵەمەندو سامان داربوو، لەبەرچروکی بە کوڵی خۆی داری ئەهێنا لەسەر هەرکام لەم دووبارە ئەوا خوا بێ‌ئابڕووڕیسوای ئەکات‌و تەشەری لێ ئەدا بەمەی کە: ﴿حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ﴾ هەڵگری کۆڵەدارو دڕکە، لەکاتێکا ﴿فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ﴾ لە مل‌و یەخەیدایە گوریسێکی بادراو لە پوشی خورما، لەسەر ئەم دوو ڕایە ئەم دوو ئایەتە ڕووالەتەکەیان مەبەستەو لەو دیمەن‌و ڕووالەتە لانادرێن، بەڵێ لەسەر ڕای یەکەم دوورنێیە ئاماژەشی تیابێت بەهەڕەشە لێ کردنی بەمەی کەلەسەر ئەو شێوەیە سزا ئەدرێ لە دۆزەخا، وەك لە ئایەت‌و حەیسەوە وەرئەگیرێ کە دۆزەخی سزا ئەدرێن لەسەر ئەو بارو شێوە تاوانەی کە لە جیهانا کردوویانە لەسەری بوون، ئەوەش بۆ سزادانی دەروونیانە هەمیشە لەبیریان بێت کەبەدەستی خۆیان خۆیان خستە ناو سزا، لێرەدا ڕایەتر هەیە کە مەبەست لەم دوو ئایەتە ڕووالەتەکەیان نێیە، بەڵکو مەبەست بە ﴿حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ﴾ هەڵگری هۆی هەڵگیرساندنی ئاگری دوژمنایەتی‌و ئاژاوە نانەوەیە، واتە فیتنەو دوو زوبانەو ناکۆکی‌و ئاژاوە ئەنێتەوە لەناو مەردومدا، هەرکەس وابێ لە زمانی کوردیشا پێی ئەوترێ: ئاگر خۆشکەرو چڵۆسك ئەهەڵخرێن، بەم جۆرەش هەر ڕێکەو ئەگونجێ‌و ئەو ئافرەتە ئەم سیفەتە ناپەسەندەشی هەر بووە، لەسەر هەر بارو ڕایە ئەم

سوورەتە وەك سیخێكی سوورەوەكراو چوو بەدڵو جگەری ئەو ئافرەتەدا كە خۆی بەشت ئەزانی و بە نەسەبو نەژادیا ئەنازی، لەبەرئەوە خەریك بوو هارو شێت بێ كاتێ ئەفەرموێ:موسڵمان سوورەتە بڵاوبوویەوە، (ئیبن و ئیسحق) ئەڵێ: بیستومە ئەو ئافرەتە بەدە كاتێ ئەم سوورەتەی بیست، پەلاماری پێغەمبەری دا (ﷺ) لەكاتێكا دانیشتبوو لای كەعبەداو (ئەبو بەكر)ی لەخزمەتا ئەبێ، پەلاماری ئەدا بە بەردێكی پڕی مشتەوە، ئینجا كاتێ بەلای سەریانەوە ئەوەستێ خوا چاوی لە حاستی پێغەمبەر (ﷺ) كوێرئەكات و نایبینێ و ئەڵێ: ئەی (ئەبو بەكر) هاوڕێكەت لە كوێیە؟ ئەڵێن شیعری پیاوتوم، والله ئەگەر دەستم ئەكەوت ئەم بەردەم ئەدا بەدەمیا بزانە والله منیش شیعر بێژم! ئینجا ئەم شێوە پیسە دێت بەدەمە پیسەكەیا: مذمما عصینا، وامره ابینا. ئێمە یاخی ئەبین لە كەسێ كە زەم كراوە، وە سەرپێچی ئەكەین لە فەرمانی، ئینجا ئەڕوا، ئەبو بەكریش -خوا لێی ڕازی بێ- ئەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لات وایە تۆی بینی؟ ئەویش ئەفەرموێ: منی نەبینی، خوا چاوی ئەوی گرت لەمن، (حافظ ابو بكر)یش وێنەی ئەم هەواڵە ئەهێنێ لە (ئیبن و عەباس)ەوە خوا لە هەمووان ڕازی بێت.

ئابەو جۆرو شێوەیە ئەم سوورەتە هاتەوە خوارەوەو جاڕی لەناوچوون و ماڵوێرانی دا لە (ئەبو لەهەب)و ژنەكەی، لەگەڵ خەشمو سزای سەختی دۆزەخ بۆیان لەگەڵ ئابڕووبردن و ڕیسواكردنیان، ئەوەش لە تۆڵەی ئەو هەموو پیلان و بەد كرداریەی كە هەڵسان پێی دەربارەی ئایین و پێغەمبەری خوا (ﷺ).

**وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾

## سوورەتی «الاخلاص»
## مەككەییەو (٤) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سوورەتە كورتە هاوتایی سێ یەكێكی قورئان ئەكات، وەك لەچەند ڕیوایەتێكی صەحیح و ڕاستا هەیە، (ئیمامی بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ (ئەبو سەعد)ەوە كە گوێی لە پیاوێ ئەبێ ئەم سوورەتە ئەخوێنێ و هەر ئەیڵێتەوە، ئینجا كە ڕۆژ ئەبێتەوە دەێت بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بۆ باس ئەكات و بە شتێكی كەم نیشانی ئەدا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: سوێند بەكەسێ كە گیانی منی بەدەستە ئەو سوورەتە هاوتای سێ یەكێكی قورئانە نابێ سەرسوڕبمێنێ لەوە، چونكە لەیەكەم جاری سوورەتەكەوە فەرمان دراوەبەپێغەمبەر(ﷺ) كەجاڕی یەكتایی خوابدات لەهەموباروڕوویەكەوە بەبێ هیچ هاوبەش و هیچ وێنەیەك وە ئەو یەكیتاییەش بنەڕەت و سەرچاوەیە بۆ ئەم ئیسلامە گەورەیە لەهەموو باروڕوویەكەوە، وەبەهەموبەش وپارچەكانیەوە ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ هەواڵی ڕاست و بەجێ كە شایستەی گومان و دوو دڵی نەبێ ئەمەیە: ﴿هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ئەوخوایەی كەناوی ﴿ٱللَّهُ﴾ یەكتایە لە هەموو ڕوویەكەوە، یەكتایە لە بوونا. بەم ڕەنگەلەڕووی ڕاستیدا هەرئەو بەڕاستی هەیەو هەر بوونی ئەو بوونێكی ڕاستەقینەیە، وە هەركەس وهەرشتێ تركەهەیەو بوونی هەیەلەوولەبوونی ئەو لەو پەیدابووەو هەیەو ڕاگیراوە.

ئینجا لەبەرئەوە یەكتایە لە كردەوەیشدا، بەم ڕەنگە لەم بوون و بوونەوەرەدا هیچ كەسی تر هیچ كارو هیچ ئیشێ ناكات ئەو نەبێ، وە هەموو كارو كردەوەو ئیشێ ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەوو بەخواست و خواهیشی ئەوەو بەو فەراهەم دێت.

ئینجا هەردڵێ ئەم بۆچوونو تێگەیشتنەی تیا جێگیر بوو، بێگومان ئەو دڵە ڕزگار ئەبێ لەوەی ببەسترێتەوەو پشت ببەستێ بەهیچ کەسو بەهیچ شتێ‌تر جگە بە خوای تاكو تەنیا کە بوونی ڕاستەقینە تایبەتیە بەوو هەموو کاروبارو کردەوەیە ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەوو لە ڕووی ڕاستیدا هینی ئەوەو ئەو فەراهەمی هێناوە. کەواتە ــوەك ووترا لەپێشەوەــ لەڕووی ڕاستیدا هیچ شتێ‌تر نی‌یە بێجگە لە خوا، وە هیچ کەس هیچ شتێ ناکات بێجگە لە خوا، دەی کەواتە ئەو دڵە چۆن پشت ببەستێ و ببەسترێتەوە بەهەر شتێ ترەوە کەبوونی ڕاستەقینەی نی‌یەو کردەوەی ڕاستەقینەی نی‌یە، بەڵکو ئەو دڵە ئازاد ئەبێ و بەرەڵا ئەبێ لە هەموو کۆتو ونجیرێ و لە هەموو هێزێکی ڕاکێشەی ئەم زەوی و جیهانە، هیچ ئارەزوویەك نایبەستێتەوەو ڕایناکێشێ، وە داناچڵەکێ و ناتاریێ بەهیچ بیمو ترسێ، بەڕاستی ئەو دڵە کە خوای دەست کەوت ئیتر ئەبێ ئارەزووی چی تر بکات؟ ئایا ئیتر چی لەدەست دەرچووو چی ناتەواوە؟ وە ئایا ئەبێ لە چی بترسێ لە کاتێکا کە هیچ کەس هیچ شتێ ناکاتو هیچ شتی بەدەست نی‌یە بێجگە لە خوا؟

هەرکات ئەم بۆچوونو تێگەیشتنە جێگیربوو لە دڵدا، دڵ ڕەنگی گرت پێ‌ی، بێگومان ئەو دڵە لە ڕێ‌وە هیچ نابینێ جگەلە خوا، وە ئەو دیتنی خوای لەگەڵەو لێی جوێ نابێتەوە لەکاتی دیتنی هەرشتێ تردا، ئەو حەلە دەستی قودەرتی خوا ئەبینێ لە هەموو کارو فەرمانو لە هەرشتێکا کە بکەوێتە بەرچاوی، ئینجا لەدوای ئەمە ڕادەو پلەیەکی تر هەیە بۆ ئەو دڵە کەلەم بوونەوەرەدا هیچ شتێ نابینێ بێجگە لە خوا، چونکە لەڕووی ڕاستیدا هیچ شتێ تر نی‌یە جگەلە خواو هیچ شتێ‌تر چاونادا جگەلەبوونی خوا.

هەروەها ئەو دڵە هەمشیە ئەوەی لەیادە کە هەموو کردەوەو کارێ بەدەست خوایەو خوا ئەیانکات کەواتە هیچ کەسێ و هیچ شتێ‌تر بەخاوەن کارو کردەوە نازانێ، وە هەموو شتێ و هەموو ڕووداوێ و سەرچاوەی بوونی هەموو شتێکە، بەم بۆچوونو باوەڕە هەموو بزوتنەوەو جوڵانێ ئەگێڕێتەوە بۆلای خوای یەکتا کە زۆر گرنگەو قورئان زۆر بە گرنگ گرتوویەتی، ئەوەتا لە زۆر شوێنا هەموو کاروباری لە ڕێ‌وە ئەبەستێ بە کردەوەو خواهیشی خواوە، ئەو شتانەی کە بە ڕووالەت هۆی کارو کردەوەنو لەوانەوە کارو کردەوەکان ئەبینرێن، ئەوانە دوورئەخاتەوەو بە خاوەن کاروکردەوەیان دانانێت، بۆ وێنە فەرمووی بە پێغەمبەر (ﷺ) کەلە جەنگ بەدرا مشتێ خۆڵی کرد بە ڕووی بێ بڕواکاناو هەموو لەو خۆڵەیان بەرکەوت ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ لەڕاستیدا تۆ ئەو مشتە خۆڵەت تێ نەگرتن لە کاتێکا

کەبەرووالەت تۆ گرتت، بەڵکو خوا تێیگرتن، وە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ یارمەتی دان و زاڵکردن نییەمەگەرلەلایەن خواوە، وەئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئێوەخواست و خواهیش ناکەن، مەگەر خوا بیەوێ و خواهیش بکات، بێجگە لە مانە زۆری تریش هەیە، ئینجا کاتێ دڵ بەو جۆرە سەرنجی ئەو شتانەی دا کە بەرووالەت سەبەبن و هۆی فەراهەم هاتن، وە هەموو کاروبارێکی گێڕایەوە بۆلای مەیل و خواهیشی خوا، ئەو حەلە ئارام ئەو دڵە داگیرئەکات، وە تاقانە رووگەکەی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ روو لە کێ بکات و داوا لەکێ بکات، وە ئومێدو چاوەڕوانی لە کێ بێ و لەکێ بترسێ؟ وە بەئارام و دامەزراو ئەبێ بەرامبەر ئەو هەموو ئەسباب و شتە رووالەتیانەی لە ڕاستیدا هیچ نین و هیچیان بەدەست نییە! ئائەمەیە پلەکانی رێگە بۆلای خوا کە ئەهلی تەریقەت ویستیان پیا بڕۆن و پیاسەرکەون، بەڵام لەو هەموو کۆمەڵە گەورەیە کەمێك بە رێکی و بەبێ هەڵکەوتن بەو رێگەیەدا ڕۆیشت و سەرکەوت، زۆریەی هەڵخلیسکان و نەگەیشتن، بەم رەنگە کەنارگیربوو وازی هێنا لە کارو فەرمانی جێنشینی لە زەوی دا، وە وازی هێنا لەوەی ئایین و ئاقیدەکەی بەدی بێنێ بە کردەوە لە ژیانا، بێگومان ئیسلامیش داوا ئەکات کە موسڵمانان رێگە بدەنە بەر بۆلای خوا لەکاتێکا بێنە مەیدان و ئەرکی ژیان بگرنە گەردن بەهەرجۆرێکی رەوا کە بگونجێ، خەریك ببن بەوەی کە ژیانی ئادەمی پێکئەهێنێ، هەڵسن بەکاروباری جێنشینیەکەیانەوە، بە هەموو پێویستیەکیەوە، لە هەمان کاتا هەمیشە هەست بکەن کە هیچ شتێ هیچ نییە تەنها خوا نەبێ وە هیچ شتێ نییە لە ڕاسیتدا خوا نەبێ، وە هیچ رێگەیە تری ناوێ! ئەو دڵەی کە یەکتایی خوا لە دڵیا جێگیربێ بەو جۆرو شێوە ڕاستەی کە باسکرا، ئەو دڵە تێئەگات لە بەرنامەی تێروتەواوی ژیان لە هەموو بارو روویەکەوەو ئەزانێ چی ئەکات و چۆن ئەکات؟ ئەزانێ ئەبێ تەنها خوا بپەرستێ و کەلە ڕاستیدا تەنها ئەو هەیە و هەموو کارێ بەدەست ئەوەو بە خواهیشی ئەوە، ئەبێ ئومێدی هەر بەو بێ و هەر لەو بترسێ، لە هەموو خۆشی و ناخۆشیدا هەر روو لە خوا بکات، ئەگینا چ سوودی هەیە رووتێکردن و بەتەمابوون لە هەرکەس هەرشتێ کە لەڕاستیدا نییەو هیچی پێناکرێ و هیچی بەدەست نییە.

ئەزانێ ئەبێ هەموو بیروباوەڕو ئاقیدەو سایا و نیزامێ هەر لە خواوە وەرگرێ، چونکە وەرگرتنی ئەوانە ئەبێ هەر لە کەسێ بێت کە تاك و تەنیا و یەکتایە لە زاتی خۆیا و لە دەروونیشا بەو جۆرە ناسراوە، وە ئەزانی ئەبێ هەموو کاروکردەوەو نیازو بزوتنەوەی هەر لەبەر خوا بێت و بە نیازی خواوە بێت، بە ئومێدی نزیك کەوتنەوە لەو خوایەو ڕزگاربوون

لەسەر بەرهەڵستو پەردو ڕێگرو گومڕاکەرو سەرتێك دەرێك کە مەردوم دوور ئەخاتەوەو ئەیپچڕێ لە خوای پەروەردگاری، تەنانەت با ئەو بەرهەڵستو پەردەیە بریتی بێ لە خۆیی و حەزو ئارەزووی خۆیی و هەموو خۆشی ئەم جیهانە.

ئەو دڵە ئەزانێ کە ئەبێ پەیوەستو بەستراوبێ بەم بوونەوەرەو پەیوەندی ببێ لەگەڵی بەسۆزو بەزەیی و خۆشەویستی، چونکە ئەزانێ ئەمە هەموو لەدەستی قوردەتی پەروەردگار دەرچووەو بەرهەمو فەراهەم هێنراوی بوونو خواهیشو دەسەلاتی ئەوە، کەواتە هەمووی خۆشەویستە، چونکە دیاریە لەلایەن خوای خۆشەویستەوە، کەواتە مەبەست لە ڕزگاربوونی دڵ لە غەیری خوا خەشمو بێزاری نیە لێی و دوورکەوتنەوەو ڕاکردن لەدەستی کەنار گیری لە خەریك بوون پێیەوە، بەڵکو مەبەست لە ڕزگاربوون لێی ئەوەیە دڵ نەبەستێتەوە بە خۆیەوەوخەریکی بکات لەناسینی خواویادی خواو ملکەچی بۆ خوا، بەڕاستی بەرنامەیەکی بەرزو ئازادو گەورەیە، ئەم زەوی و جیهانە بەشێکی بچووکە تیای، هەموو ژیانی جیهان کەمو کورتە لەناویا، وە هەموو خۆشی و ڕابواردنی جیهان بێنرخ و نەویستراوو پشت پی نەبەستراوە لای، وە ڕزگاربوونو بەرەڵابوون لەمانە مەبەستو ئامانجێکی زۆر گەورەو بەنرخە، بەڵام وەك ئاماژە کرا ڕزگاربوون لەوانە بەلای ئیسلامەوە بریتی نیە لە کەنارگیری لێیانو گوێ پێنەدانو دەست بەرداربوون لێیان، یا خەشمو بێزاری و دوورکەوتنەوە لێیان، بەڵکو مەبەست خەریك بوونو بەربەرەکانیەکی هەمیشەییە بۆ بەرزکردنەوەی ئادەمی و ئادەمێتی و ڕزگارکردنو بەرەڵاکردنی ژیان لە کۆتو زنجیرەکانی، کەواتە لەڕاستیدا بیریتیە لە جێنشینی و سەرکردایەتی بە هەموو ئەرکو پێویستیەکانیەوە، بە هەموو ئازادبوون وسەربەستییەوە، بێگومان ڕزگاربوون لەڕێگای کەنارگیری و ڕەهبانیەتەوە سوكو ئاسانە، بەڵام ئیسلام ئەوەی ناوێ و دژیەتی، چونکە جێنشینی لەزەویداو سەرکردایەتی ئادەمی بەشێکە لە بەرنامەی خوا بۆ ئەو ڕزگاربوونە، بەڵێ ئەم ڕزگار بوونەی کە ئیسلام ئەیەوێ زۆر گرانە، بەڵام لەم ڕێگایەوە ئادەمێتی بەدی دێت، واتە لەم ڕێگایەوە ڕۆح زاڵ ئەبێ، کە ئادەمێتی ئادەمی و جیابوونەوەی لە گیان لەبەرانی تر بەم ڕۆحەیە، وە لەم ڕێگایەوە ڕۆح ڕزگار ئەبێ و ئەگەڕێتەوە بۆلای سەرچاوەکەی خۆی، بەرزی و بڵندیەکەی خۆی بەدی ئەهێنێ،لەکاتێکاکەخەریکی کاروفەرمانی خۆیەتی لەومەیدانەداکەپەروەردگاری بۆی داناوە.

تاكو تەنیایی خوا و جێگیر بوونی یەکتایی خوا لە دەروونا بەو شێوە ڕاستەی کە باس کرا قسەیەکی ڕووت نیە کە بە دەم بوترێ، یا تەنها شتێکی دەروونی نیە، بەڵکو بنەڕەتو

سەرچاوەیە بۆ هەموو کاروبارێکی ئاین، وە هەموو ئاین هەر ئەوەتەو ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە، وە هەر شتێ تر کە لە ئایینا هەیە هەمووی بەرو بەرهەمێکی سروشتیەو پەیدا ئەبێ لە پاش جێگیر بوونی ئەو یەکتاییە لە دڵو دەروونا، جا لەبەر ئەوە یەکەم بانگ کردن لە ئیسلامو لە ئایینی خوادا بۆ ڕوون کردنەوەو جێگیر کردنی ئەو یەکتاییە بووە لە دڵو دەروونا لەسەر ئەو بارو شێوە ڕاستەقینەی کە باس کرا، وە هەرچی لادان و گۆڕانێ کە ڕووی کردە ئەهلی کیتابو هەموو ئەهلی ئایینەکانی پێشوو، کە بیرو باوەڕو بۆچوونو ژیانی تێك دان، هەموو ئەو گۆڕانو لادانە پەیدا بوون لە نەمانو کوێر بوونەوەی شێوەی شیرینو پاكو خاوێنی یەکتایی خوا لە دەروونا، ئینجا دوای ئەوە لاریو چەوتیە تر پەیدا بوو، پێویستە بزانرێ کە ئەو شێوە یەکتاییەی کە ئیسلام هێنای زۆر بە گرنگ ترو قوڵتر گیراوە بەمەی هەموو ژیانی گرتووەتەوە، وە کراوە بە بنەڕەت بۆ ژیان لە هەموو بارو ڕوویەکیەوە، کراوە بە یاسا بۆ بەرنامەی کردەوە لە گیانا، ئەبێ بەرهەمی دەرکەوێ لە هەموو شتێکا، وە یەکەمی بەرهەمەکانی ئەوەیە کە ئەبێ تەنها شەریعەتی خوا کاربەدەستو حوکمڕان بێت لە ژیانا، وە هەرکاتێ بەرهەمەکانی نەبوو، بە تایبەتی یەکەم بەرهەم، ئەو حەلە بیرو باوەڕی یەکتایی خوا نابێو ناگونجێ!

کاتێ کە خوا تاكو تەنیاو یەکتا بوو بەو شێوە ڕاستەی کە باسکرا، بێگومان ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ تەنها خوا گەورەیەکی نیاز کراو و داوا لێ کراوە بۆ بەجێهێنانی هەر مەبەستو پێویستیەك، وە هەر ئەو جێی هیواو ئومێدە، ئەگینا تاكو تەنیاو یەکتا نابێ، بێگومان ﴿لَمْ يَلِدْ﴾ هیچ کەسی لێ نەبووە ﴿وَلَمْ يُولَدْ﴾ وە لە هیچ کەسیش نەبووە ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ وە هیچ کەس وێنەی خوا نەبووەو نیە... شتێکی ئاشکرایە کە بوونی هەرکام لەم سیانەش ناگونجێ لەگەڵ خوایەتی داو دژو پێچەوانەی یەکتاییەتی، کەواتە سیفەتی یەکتایی خوا کە لە یەکەم ئایەتایە ئەم سێ سیفەتەش ئەگرێتەوە کە لە سێ ئایەتەکەی ترایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەرسێکی بە تایبەتیش باس کردنو هێنانی بەدوای یەکەمدا لەبەر زیادە ڕوون کردنەوەی خوایەتی خوا و یەکتاییەکەی، وە بۆ بەرپەرچ دانەوەو دوورخستنەوەی بڕوا بە دوو خوا: خوای خێرو خوای شەڕە بە لایانەوە وابوو کە خوای شەڕ دژو پێچەوانەیەتیو هەمیشە ئەیەوێ بە دژو پێچەوانەی خوای خێر بجوڵێتەوەو خراپە بڵاو بکاتەوە لە جیهانا، وە بەناوبانگ ترین ئەم ئاقیدە پڕو پووچە ئاقیدەی فارسەکانی ئەو سەردەمە بوو کە دوو خوایان بڕیار ئەدا: خوای ڕووناکیو خوای تاریکی! ئەم ئاقیدەیە

ناسـراو بـوو لـەلای خـوارووی نیوەدوورگـەدا بـەهۆی دەوڵـەتی فارسـەوە کـە زاڵ بـوو بـە سەریانا!!

بێجگە لەوە هەرکام لەم چوار ئایەتە ئەدات لە بیرو باوەڕێکی ناڕاستی نەگونجاوو دەم کوتی خاوەن بێبڕواکان ئەکاتەوە:

یەکەم: ئەدا لە هەر بیرو باوەڕێ تر کە نەگونجێ لەگەڵ یەکتایی خوادا لە هەر بارو ڕوویەکەوە، بۆ نموونە وەك بیرو باوەڕی (مجسمە) کە یەك خوا بڕیار ئەدەن، بەڵام بە لایانەوە وایە کە لەش‌و قەبارەی هەیەو پێکهاتووە لە چەند بەش‌و پارچەیە!

دووەم: ئەدا لە ئاقیدەی بت پەرستان کە لە ڕێوە بت ئەپەرستن‌و هاواریان لێ ئەکەن بە ئومێدی ئەوە نزیکیان بخەنەوە لە خواوەو تکایان بۆ بکەن لای خوا.

سێیەم: ئـەدا لـە بیرو بـاوەڕی گـاورو جولەکـە، کـە لایـان دا لـە ئـایینی ڕاسـتی خـواو (عیسا)و (عوزەیر) دائەنێن بە کوڕی خـواو بـە خوایشیان ئـەزانن، کەواتـە لایـان وایـە خـوا کەسی لێ ئەبێ‌و لە کەسیش ئەبێ!

چوارەم: ئەدا لە ئاقیدەی ئەوانە کە لایان وایە خوا وێنەو هاوبەشی هەیە لە کردەوەدا، وەك هێندێ لە بت پەرستان کە مەلائیکە ئەکەن بە هاوبەشی خوا، هەروەها هەرکەسێ تر ئاقیدەی ئاوا ناجۆری ببێ‌و شتێ ڕەوا بدا بۆ غەیری خوا کە تایبەتیە بە خواوەو هەر بە خوا ئەکرێ، کەواتە ئەم سوورەتە بە ڕێکی‌و بە پاك‌و خاوێنی ئاقیدەو باوەڕی تاك‌و تەنیایی خواو خوا بە یەکتا گرتنی ڕوون‌و ئاشکرا کرد، هەرچۆنێ لە سورەتی (الکافرون) دای لە هەر جۆرە یەك کەوتن‌و نزیك بوونەوەو گەیشتن بە یەك لە نێوان ئاقیدەی تاك‌و تەنیایی خواو ئاقیدەی بت پەرستی‌و هاوبەش بڕیاردان... هەرکام لەم دوو سوورەتە لە ڕوویەکەوە تاکی‌و یەکتایی خوا ڕوون ئەکەنەوەو نیشانی ئەدەن، لەبەر ئەوە ئەویش ناوبراوە بە سورەتی (الاخلاص) پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ئەم دوو سوورەتەی ئەخوێند لە نوێژی سوننەتی بەیانیدا، دەرگای ڕۆژی لە خۆی ئەکردەوە بەم دوو سوورەتە، بێگومان هەڵبژاردنی ئەم دووانە لە یەکەم هاتنی ڕۆژەوە لە خۆڕایی نیەو بێ مەبەستێکی گرنگ نیە.

**وصلى الله وسلم على هذا النبي الكريم وكل عبد مصطفى**

# سوورەتی «الفلق»
## مەككەییەو (٥) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سوورەتەو سوورەتی (الناس) كە دێت بە دوایا ئامۆژگاریەكە لەلایەن خواوە، لە یەكەم جارەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وە لەپاش ئەو بۆ هەموو بڕواداران، بە پەناهێنان بە خواو خۆ خستنە سایەو پەنای، لە هەر شتێ كە مەترسی لێ بكرێ: دیاریو نادیاری، ناسراوو نەناسراو، بە شێوەی كورتیو بە درێژی، وەك قاپی پەنای خۆی بۆ كردبنەوە، وە دەستی میهرەبانی بۆ درێژكردن،و بەسۆزو پەرۆشەوە بفەرموێ پێیان: وەرن بۆ ئێرە، وەرن بۆ پەنای من، وەرن بۆ جێگەی ئارامو ئاسایشی خۆتان، وەرن من ئەزانم لە خۆتانا لاوازو بێهێزنو دوژمنتان زۆرەو چواردەورتان مەترسییە، هەرلێرە ئارامو ئاسایشو بێزیانی هەیە، جالەبەرئەوە هەركام لەم دوو سوورەتە دەست پێئەكەن بەیەكێ لەم دوو فەرمانو ئامۆژگارییە: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ * قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ وەك لەمەو پاش تەفسیری ئەكەینەوە بەیارمەتی خوا.

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەخۆشیو پەرۆشەوە باسی ئەم دوو سوورەتەی فەرمووە، وەك (ئیمامی مالیك)و (موسلیم)و (تیرمزی)و (ئەبوداود)و (نەسائی) باسی ئەكەنو حەدیسێ ئەهێنن لە (عوقبەی كوڕی عامیر)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا نەتزانی كە ئەم شەو ئایەتێ هێنرایەخوار، وێنەیان نەبینراوە؟: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ..قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، هەروەها (نەسائی) حەدیسێتر ئەهێنێ لە (جابر)ەوە –خوا لێی ڕازی بێ– ئەفەرموێ كە پێغەمبەر (ﷺ) پێ فەرمووم كە ئەی (جابر) بخوێنە، منیش ووتم: باوكو دایكم بەقوربانت بێت چی بخوێنم؟ فەرمووی: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ..قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ منیش خوێندمن، ئینجا فەرمووی: بیانخوێنەوە چونكە هەرگیز وێنەیانت نەخوێندووە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾

---

لەم سوورەتەدا خوا باسی خۆی ئەکات بەسیفەتێکی کەپەنای پێئەگیرێ لەشەڕو ئازاری ئەوەی کە باسی فەرمووە لە سوورەتەکەدا، ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *قُلۡ ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ پەنا ئەگرم بە خوا کە تاریکی شەو لەت ئەکات‌و ڕووناکی بەیانی لێ دەرئەهێنێ، یا تاریکی نەبوونی لەت کردو بوون‌و بوونەوەری لێ دەرهێنا، هەرکام مەبەست بێت ڕێکە لەگەڵ پەنا پێگیراوەکە، ئەفەرموێ: ﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴾ پەنا ئەگرم بەو خوایە لەشەڕو ئازاری هەرشتێ کە ئەو خوایە دروستی کردووە، لەسەر باری یەکەم ڕێکە، چونکە بە ڕووناکی بەیانی مەردوم بێ باك ئەکات لەشەڕو ئازاری شتێك کە شاراوەو نادیاری بێت، زۆر ڕێك‌و بەجێیە پەناگرتن بە خوای دروستکراوەکان لە شەڕو ئازاری دروستکراوەکانی، بێگومان ئەم دروستکراوانە لە هێندێ کاتا شەڕو ئازاریان هەیە، هەرچۆنێ لە هێندێ کاتی ترا خێرو چاکەیان هەیە، وە پەنا گرتن بە خوا لێرەدا لەشەڕو خراپەکەیانە بۆئەوەی هەر خێرو چاکەکەیان بمێنێتەوە، ئەم خوایەی کە دروستی کردوون دەسەڵات دارە بەسەر ئەوەدا.

لە پێشەوە بەکورتی پەنای پێ ئەگرێ لەشەڕو خراپەی هەموو دروستکراوەکان.ئینجا فەرمانی پێئەدا کە بەتایبەتی پەنای پێبگرێ لەشەڕو ئازاری سێ شت:

یەکەم: ئەفەرموێ: ﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴾ لەشەڕو زیانی شەوی تاریك کاتێ دیت‌و مەردوم‌و دەورووبەری دائەگرێ، بێگومان شەو لە خۆیا شتێکی سامناکەو دڵ دائەگرێ، بێجگە لەوەی چاوەڕوانی زیانی چەند شتی تیا ئەکرێ: دڕوندەیە بێت‌و پەلاماربدا، دزو جەردەیە کەبێت‌و زیان‌و پەنێ بدا، دوژمن‌و ناحەزێ کەبە ڕۆژ هیچیان پێنەکرێ، مارو دووپشك‌و هەر گەزەندەیە کە مەردوم لەبەر تاریکی بێئاگایە لێیان، هەروەها غایلەو خەتەرەو داخ‌و درۆو ئێش‌و ئازارو نەخۆشیە کە بەشەوا زۆرترو بەتین ترن، وە بابوەستێ شەیتان کەشەو کات‌و هەلێکی چاکە بۆی کە بەئارەزووی پیسی خۆی نیازی خراپ‌و کردەوەی خراپ ئەکات بە مەردوم‌و باشتر ئەتوانێ لەشەوا هەڵی سوڕێنێ بۆ هەر کاروبارێکی ناڕەوا.

دووەم: ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴾ وەلە شەڕو زیانی ئەو نەفسە پیسانەی کە جادووگەرن و تێئەکۆشن بۆ ئازاردان لە ڕێگەی چاوبەس و هەڵخەڵەتاندنەوەو بەچاوو ڕاو کارئەکەن لە هەست و هۆش و دەماردا، گرێ ئەدەن لە دەزوو بەن و فووی پیائەکەن، کەئەوە باوێکە لە باوەکانی جادووگەران!

سیحرو جادووبازی سروشتی هیچ ناگۆڕێ، وە لەڕووی ڕاستیدا هیچ شتێکی ڕاستەقینە فەراهەم ناهێنێ، بەڵکو چاوو ڕاو هێندێ شت ئەخاتە بەرچاو بەو شێوەی کە جادووبازەکە ئەیەوێ، وەك قورئان بۆمان باس ئەکات لە سوورەتی(طه) دا کە حەبل و گوریس و داردەستەکانی جادووبازەکان واخرایە خەیاڵ و بەرچاوی موسا بەهۆی جاووەکەیانەوە کە ئەوانە ژاوەیان دێت و ئەجوڵێن، بەهۆی ئەوە موسا (علیه السلام) لە دەروونی خۆیا مەترسیەکی کرد لەوەی ئەوەی ئەوانە کردیان شتێکی ڕاستەقینەبێت و خوا بۆی چارەسەر نەکات، تا خوا سروشی کردە لای کە مەترسەو هەرتۆ بڵندو سەرکەوتووی، فەرمانی دا کە داردەستەکەی فڕێدا تائەوانە هەموو هەڵلوشێ، لەپاشان کە فڕێی دا هەمووی قوت داو هەڵیلوشین و ئینجا بووەوە بە داردەستە ڕەق و ووشکەکەی جاران، هینەکانی ئەوان هەر حەبل و داردەست بوو نەگۆڕابوون و جووڵانەکەیان ڕاست نەبوو بەڵك و چاو ڕاوبوو بەلام داردەستەکەی موسا (علیه السلام) لەڕاستیدا خوا گۆڕی و کردی بە ئەژدەها تا ئەوانی قوت داو لەپاشا وەك خۆی لێکردەوە، لەبەرئەوە جادووبازەکان بۆیان دەرکەوت کە موسا (علیه السلام) ڕاستەو پێغەمبەرەو ئەوانیش بڕوایان پێهێنا، وەك بە درێژی لە سوورەتی ناوبراوا باسمانکرد.

سروشتی جادوو بەو جۆرەیەو پێویستە ئێمەش بەو شێوەیە بیناسین و تێی بگەین، وە بەو شێوەش کارئەکات لە مەردوم، چەند هەستێکیان بۆ فەراهەم ئەهێنێ بە پێی ڕاگەیاندنی خۆی، چەند هەستێك ئەیان ترسێنێ و ئازاریان ئەدات و ئەیان بات بەرەو ئەو بارەی کە جادووگەرەکە پێی خۆشەو ئەیەوێ، لەم سنوورەدا ئەوەستێ لەوەرگرتن و تێکەیشتن لە جادووو فووکردن بە گرێدا، بێگومان ئەوە شەڕو خراپەیە کە پەنائەبرێ بە خوا لێی وە پێویستە خۆ خستنە سایەو پەنای بۆ ڕزگاربوون و بەرگری شەڕو خراپەی.

چەند ڕیوایەتێ هاتووە، هێندێکیان صەحیحن و بەڵام نەگەیشتوونەتە ڕادەی تەواترمکە، (لەبیدی کوڕی ئەعسەب)ی جوولەکە جادووی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینەدا چەند ڕۆژێ یا چەند مانگێ تاڕادەیە وانەکەوتە خەیاڵی کە کارو ئیشێکی کردووە کەچی نەشی کردبوو، ئەم دوو سوورەتە هاتنەخوارەوە بۆ ئەمەی ببنە هۆی ڕزگاربوونی لەو بەسەرهاتە، لەخەوا پێی ووترا ئەو جوولەکە جادووی لێ کردووە بەهۆی چەند شتێکەوە کە گرێی داوەو خستوویەتە چاڵاوی بیری (ذي اروان) ئینجا ئەو شتانە ئامادەکران و ئەم دوو سوورەتەی خوێندو بەخوێندنی هەر ئایەتێ گرێیە لە گرێکان ئەکرایەوەو لەپاشا ئەو حاڵەتەی نەما و ڕزگار بوو.

بەڵام بەڕاستی ئەوانەی لەو ڕیوایەتانەدا هەیە دژو پێچەوانەی ئەو پەنا دان و پارێزگاریەن کە خوا داوێتی بە پێغەمبەران، بەتایبەتی ئەم پێغەمبەری ئێمەیە ـ سەلات و سەلامی خوا لە هەمووان بێت ـ ناگونجێ لەگەڵ بڕواکردن بەوەی کە هەموو کردارو ووتارێکی پێغەمبەر (ﷺ) یاسا و شەریعەتەو ئەبێ پەیڕەوی بکرێ، هەروەها ئەو ڕیوایەتانە یەك ناکەون و دژو پێچەوانەی قورئانن کە پێغەمبەر (ﷺ) دوورئەخاتەوە لەوەی جادووی لێکرابێ، وە بت پەرستەکان دەم کوت ئەکات و ئەیانخاتەوە بەدرۆوە لەوەی کە ئەیان ووت: (محمد) جادووی لێکراوە، وەك لە سوورەتی (الفرقان)دا باسکرا، جالەبەرئەوە ئەم ڕیوایەتە بەدوور دائەنێین، وە هەر حەدیسێ نەگەیشتبێتە ڕادەی تەواتر ناکرێ بە بنەڕەت بۆ کاروباری ئاقیدەو بڕوا، وە هەر حەدیسێ نەگونجێ لەگەڵ قورئانا، گوێی پێنادرێ و ئەبێ قورئان گوێ بۆ گیراو و پێشەوابێت.

بێجگە لەمانەش ڕای بەهێزو باوەڕپێکراو لەسەر ئەوەیە کە ئەم دووسوورەتە مەککەین، بێگومان لەلای هەموانەوە ئەو ڕووداوە ئەگەر بووبێ لە مەدینە بووە، کەواتە چۆن لەو ڕیوایەتانەدا ئەڵێ ئەم دوو سوورەتە هاتنەخوارەوە بەبۆنەی ئەو ڕووداوەو بۆ ڕزگاربوونی پێغەمبەر (ﷺ) هاتنە خوارەوە، کەواتە دەرئەکەوێ کە ئەم ڕیوایەتانە هەر لە بنەڕەتەوە بێهێزو لاوازن.

سێیەم: ﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ وە پەنا ئەگرم بەو خوایە لەشەڕو زیانی مەردومی حەسود، کاتێ حەسادەت ئەبا. حەسادەت حاڵەت و نەخۆشیەکی دەروونیە کە بریتیە لە بێئارامی و پێناخۆشبوونێ کە پەیدائەبێ بەرامبەر چاکەو بەهرەیە کە خوا دابێتی بە بەندەیە لە بەندەکانی، لەگەڵ ئاوات خواستنی نەمانی ئەو چاکەو بەهەرەیە، ئیتر لەگەڵ ئەو

ئاواتەدا بەکردەوەش خەریك ببێ بۆ نەهێشتنی یان نە ء بێگومان ئەگونجێ شەڕو زیانێ ڕووبکاتە ئەو خاوەن بەهرەیە کاتێ کابرای حەسود ئەو حاڵەتە دەروونی خۆیە ئاڕاستەکرد، ئەوەش سیڕێکەو هێزێکی نهێنییە خوا دروستی کردووە، وەك ئەو هەموو هێزە نهێنیانەی تر کە خوا لەم بوونەوەرەدا دروستی کردوون و ئێمە هیچ لێیان تێناگەین و هەستیان پێناکەین، بەس بوونی هێندێکیانمان لێ ئاشکرابووە بە هۆی بەرهەمەکانیانەوە، بۆ وێنە: خەواندنی کەسێ و قسە لێ وەرگرتنی لەو ڕێگایەوە کە پێی ئەوترێ (التنويم المغناطيسي) کە شتێکە بوونی ئاشکرایەو هیچ کەس تێناگات نەلە خۆی و نەلەهۆی پەیدابوونی، هەروەها پەیوەستی و پەیوەندی لەبەینی دوو کەسا زۆر لە دوورەوەو بەبێ بوونی هۆیەکی هەست پێکراو کەئەوەش شتێکە ڕاستەو چەند جارێ ڕوویداوەو ڕێگە نییە بۆ ئینکاری، بەم جۆرە شتە نهێنیانە لەبەرئەوەی تێیان ناگات و هەستیان پێناکات، چونکە ئێمە بێئاگاین و ئەوەی کە ئەیزانین بەشێکی زۆر کەمە، کەواتە باهیچ کەس لە خۆیەوە دەم نەکوتێ لەو شتانەی کە بێئاگایە لێیان، یا لەسنووری زانینیا نین، وە با زبان بەرەڵانەکات و بەبێ بیرلێ کردنەوە قسە توڕدا وەبا سەر نەکاتەوە لەو جۆرە نهێنیانە کەلە قورئان یا لە حەدیسی صەحیحەوە وەرئەگیرێ، ئایا ئەم جۆرە هێزانە چ جۆرە جیاوازیەکی هەیە لە هێزی ڕاکێشەری موگناتیس کە بەرهەمی ئاشکرایەو هەستی پێ ناکرێ و تائێستاش کەس نازانێ چییە؟ و چۆن پەیدا ئەبێ؟ وەلەیەکەم جاریشەوە بەرێکەوتی خوا ڕێی پێدرا، کەواتە با هەموو هێزی دڵ و دڵنیاییەکەوە پەنا ببەین لەشەڕو زیانی حەسود کاتێ حەسادەت ئەبا پێمان، وەك خوای پەروەردگار فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و لەپاش ئەو فەرمانی بۆ بڕواداران و شوێن کەوتوانیشێتی، (ئیمامی بوخاری) و خاوەن صەحیحەکانی تریش حەدیسێ ئەهێنن لەدایکی ئیمان داران عایشەوە -خوا لێی ڕازی بێ- کە پێغەمبەر چونکە کاتێ کە ئەویست ڕاکشێ بۆ خەوتن لەشەوا هەردوو لەپی دەستی کۆئەکردەوەو فووی پیائەکردن و سوورەتی (الاخلاص) و ئەم دوو سوورەتەی بەسەرا ئەخوێندن و ئینجا دەستی ئەهێنا بەلەشیا، لەسەرو دەمو چاوی و پێشی لەشیەوە دەستی پێئەکرد تا سێجار بەو جۆرەی ئەکرد.

**وصلى الله وسلم على سيد القادة وقائد السادة محمد رسول الله و خاتم النبيين وعلى آله وأصحابه وكل تابع لهم بإحسان الى يوم الدين**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ
ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾

---

## سوورەتی ﴿الناس﴾
## مەككەییەو (٦) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

**لەم سوورەتەدا خوا فەرمان ئەدا بە پەناگرتن بەخوا لەشەڕو زیانی زیاندەرێكی تری تایبەتی كە زیانەكەی زۆر زۆر گەورەیەو خۆشی لە هەموو زیاندەرێ زیاندەرترەو كانگای هەموو شەڕو خراپەیەكە. ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری ئادەمی ﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ﴾ پادشای ئادەمی ﴿إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ﴾ پەرستراوی ئادەمی ﴿مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ﴾ لەشەڕو زیانی كەسێ كە نیازو قسەی خراپ ئەخاتە دڵ ﴿ٱلْخَنَّاسِ﴾ كەزۆر ڕەوەك و ڕاكەرەو باوی خۆ شاردنەوەو خۆ وون كردنە كاتێ كەبەندەباس‌ویادی خوای كرد﴿ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ﴾ ئەوەڕەوەكەی كەبە نهێنی شتی خراپ ئەخاتە دڵی مەردوم ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ لە جنۆكەو لە ئادەمی.**

**لە سوورەتی پێشوودا پەنا ئەگیرێ بە خوا بەیەك ناوو سیفەتی لەو هەموو شەڕو زیان‌و خراپیە كە نایەتە ژمارە، بەڵام لەم سوورەتەدا پەنا ئەگیرێ بە سێ ناوو سیفەتی خوا لەشەڕو خراپەی یەك شت، چونكە ئەم شتی ئێرە كە شەیتانە كانگای هەموو شەڕو خراپەیەكەو كۆڵنەدەرەو بە هەمیشەیی وا لە كەمینا وە شەڕو خراپەكەشی لە هەموو شت خراپترو زیاندەر ترەو لە هەدوو جیهانا كارئەكات‌و هێندێكیشی نەبڕاوەو وانەهاتووە، بێجگە لەوانە ئەم زیاندەری ئێرە بەخۆی‌و زیانەكەیەوە شاراوەن‌و مەردوم‌و پێیان نازانێ‌و ناش زانێ چۆن بەرگری بكات‌و خۆی لێ لابدات؟ كەواتە پێویستە پەنا گرتن بە پەروەردگاری پارێزەری تەمێ‌دادەری خاوەنی كاربەستی بەرزو بڵندی زاڵی بەدەسەڵات، خوای گەورە پەروەردگارو پاشاو كاربەدەست‌و پەرستراوی هەموو شتێكە، بەڵام لێرەدا**

تایبەتی کرد بە ئادەمیتیەوە، بۆئەوەی پەناهێنەر هەست بکات بە نزیکی و تایبەتێتی خۆی بە خوای پەنا پێدراویەوە، ئەو حەلە پەنا هێنانەکە بە سۆزو بەپەرۆشتر ئەبێت و چاوەڕوانی ئومێدی پەنادانی بەهێزتر ئەبێت، چونکە ئەو ناوو سیفەتانە میهرەبانی خوا ڕائەکێشن و ئەیبارێنن بەسەر پەناهێنەرا.

خوای میهرەبان پەندو ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەی کرد (ﷺ) هەروەها ئوممەتەکەی بە پەنابردن و خۆ خستنە سایەو پەنای خوا، لەگەڵ ئامادەکردنی ئەم سیفەتانە لە دەروونا لەشەڕو زیانێکی شاراوە کە بەنهێنی ئەکشێ بۆ دڵ و دەروون وە هیچ چارەئ‌یەو مەردوم دەرەقەتی نایەت مەگەر بە کۆمەکی و یارمەتی دانی ئەو خوای پەروەردگارە.

قورئان لەیەکەم جارەوە ئەم زیانەدەرەی باس کرد بە دوو سیفەتی ﴿ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ﴾ نیازوقسەی خراپ لەدڵ و دەروون خەری ڕەوەکی ڕاکەر ئینجا کارو ئیشەکەی دیاری ئەکات: ﴿ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ﴾ کە کەسێ کە نیازو قسەی خراپ بە نهێنی ئەخاتە دڵی مەردوم تیرەو بەرەیشی دیاری ئەکات ﴿مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ کەلە جنۆکەو ئادەمی‌یە، بێ‌گومان ئەم باسکردنە بەم شێوەیە دڵ و دەروون بێدارو وریا ئەکاتەوەو سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئامادەکردن یا بۆ بەرگری یا بۆ چاوەڕوانی و ئامادەیی، چونکە هەرکەس ژێرو تێکەیشتوو بێت هەرکات بەو جۆرە هەواڵی پێدراو ئاگادارکرا بەوەی کە دوژمنێکی ئاوا لە کەمینایە بۆی، ئەو کەسە ئەبێ خۆی ئامادەبکات بۆ بەرگری کردنی ئەو دوژمنەی.

وەسوەسەو نیازو قسەی خراپ خستنە دڵ لەلایەن شەیتانەوە، هەرچەند ئێمە نازانین چۆنەو چۆن هەڵئەستێ پێی، بەڵام سەرەنجام و بەرهەمی ئەو کردەوە پیسە بەباشی هەست پێ‌ئەکەین لەدەروونی خۆمانا ولەواقیعی ژیانمانا شتێکی ئاشکرایە، ئەزانین ئەو دوژمنایەتی و بەربەرەکانی‌یە لە کۆنەوە بووەو هاتووە لە بەینی ئادەم و شەیتانا وە شەیتان جاڕی ئەو دوژمنایەتیەی داو ئیزنی لە خوا خواست لەوەداو خوایش ئیزنی دا لەبەر هۆو حیکمەتێ کە خۆی ئەیزانێ و بەشێکیشی لە ئێمەوە دەرکەوتووە وەك چەند جارێ باسکرا، خوای میهرەبان ئادەمی بەرەڵا نەکردووە بەبێ چەك و بەبێ دەسەڵات، بەڵکو ئیمان و بڕوای بۆ کردووە بە قەڵغان، وە یادی و خواو پەنابردن پێی کردووەیەتی بەچەکێکی بەکار کە هەمیشە بەدەستیەوەبێت و بەو قەڵغان و چەکە بەئاسانی پەکی ئەو دوژمنە ئەخات و دەستەپاچەی ئەکات، بەمەرجێ بەکاریان بێنێ، کەواتە ئەگەر ئادەمی بەکاری نەهێنان و دوژمنەکەی زاڵبوو بەسەریا ئەو حەلە خەتای خۆیەتی و خۆی تاوانبارە.

(ئیمامی بوخاری) حەدیسێ ئەهێنێ لە (ئیبن و عەباس)ەوە -خوا لێیان ڕازی بێ- کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: شەیتان وەستاوە بەسەر دڵی ئادەمییەوە کاتێ ئادەمی یادو باسی خوای کرد ئەو ئەڕواو ڕائەکات، کاتێ بێئاگابوو وەسوەسەو نیازو قسەی خراپ ئەخاتە دڵی.

وەسوەسەی شەیتان بەو جۆرەی کە باسکرا، بەڵام وەسوەسەی ئادەمی زۆری ئاشکرایەو ئەسان ناسێن و هێندێکی لێ ئەناسێن کە بەهێزترو بەتێن ترە لە هینی شەیتان! هاوڕێی خراپ کە شەڕو نیازی خراپەو نازو باوەڕی ناڕەوا ئەخاتە دڵ و سەرلە کابرا تێك ئەدات و ژێریی داگیرئەکات لەبارو لەلایەکەوە کە کابرا بەخۆی نازانێ و خۆی بۆ ناپارێزێ، چونکە هاوڕێیەتی و لێی ئەمینە، یەکێکە لەو شەیتانە ئادەمیانە! دەست و پێی خراپ و ئەوانەی کە نزیکن لەسەرۆك و دەسەڵات دارانەوە کە وازیان لێ ناهێنن و کارو کردەوەی خراپ لە پێش چاویان شیرین ئەکەن تائەیان ئەکەن بەسەرکێش و ستەمکارێکی وا لەووڵاتا داری بەسەر بەردیەوە ناهێڵن و بەزۆرو ستەم وێرانی ئەکەن، یەکێکن لەو شەیتانە ئادەمیانەی کەپەنابگیرێ بەخوا لێیان! ئەودوو ڕوو و دوو زبانانەی کە قسەی درۆ ئەڕازێننەوەو ئاژاوەو کینەو دووبەرەکی ئەخەنە ناو موسڵمانان بەشێکە لەو شەیتانە ئادەمیانە.

ئەو کەسانەی کەئەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی وێنەو فیلمی بێناموسی و هەرشتێ تر کە مەردوم فێری بەد خویی ئەکەن و ڕای ئەکێشن بۆلای کاری بێناموسی و شەڕواڵ پیسی، ئەو کەسانە سەردەستەو پێشەوان لە شەیتانێتیدا. بە دەیان شەیتانی تری ئادەمی هەن کە بەکرێگیراوی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتن و صەلیبیتی و صەهیۆنێتی جیهانی ئامادەی کردن و تێی بەرداونەتە ناو موسڵمانان و داوو تەپکەیان لە ڕێگەیانا داناوەو مەردوم و بە خۆی نازانێ تا ئەگیرێ! ئادەمی بێهێزو دەستە پاچەیە لەبەرگریکردنی ئەو کردەوە خراپانەی کەشەیتانەکانی جنۆکەو ئادەمی پێی هەڵئەسن بە نهێنی بۆ لادان و سەرتێکدانیان جالەبەرئەوە خوای میهرەبان ڕێنموونیمان ئەکات بۆ قەڵغان و چەکی بەکار لەم جەنگ و بەربەرەکانێیە سامناکەدا! ئەم سوورەتە سەرنجمان ڕائەکێشێ و دەست نیشانمان بۆ ئەکات بەدووشتی گرنگ کاتێ کە ناوی شەیتان ئەبات بە ﴿الْخَنَّاسِ﴾:

١- ئەو دوژمنە کۆڵ نەدەرەو هەمیشە بەدوای هەل و هەڵکەوتێکا ئەگەڕێ، کە لەگەڵ بۆی کرا ناوەستێ لە گومڕاکردن و سەرتێکدان.

٢- هەرچەند بەو جۆرە ناوەستێو کۆڵنەدەرە بەڵام لە هەمان کاتا بێهێزو خۆ نەگرەو ڕەوەکە بەرامبەر هەر کەسێ کە بێداربێت لە حاستی فێڵو پیلانیو ڕێگای لێبگرێ بەو چەكو قەڵغانەی کە خوا تەمێی ئەکات پێی، کەواتە ئەوشەیتانە لەهەر تیرەیە ببێ، جنۆکە بێت یا ئادەمی هەرکات بڕوادار بەرەنگاری وەستا، واز ئەهێنێو ڕائەکات، بەڵام با بزانرێ سەرکەوتن لە جەنگو بەربەرەکانێدا بە نۆبەیەو هەمیشە سەرکەوتن بۆ تاقمێ دەست نادا، بەڵێ بێگومان ئەگەر بڕوادار وریا بێتو بێئاگا نەبێ لە بەکارهێنانی چەكو قەڵغانەکەی هەرگیز ژێر ناکەوێو هەر سەرکەوتوو ئەبێ، کەواتە ئەگەر ژێر کەوت خەتا لە خۆیەتی، هەرکەس خۆی لە بەندەیی خوا نەخات شەیتان زاڵ نابێ بەسەریا وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا خوای گەورە بۆمان باس ئەکات کە کاتی خۆی فەرمووی بە شەیتان: ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ﴾ بە ڕاستی تۆ دەسەڵاتت نیە بەسەر بەندە تایبەتیەکانی منا، خوابە میهرەبانی خۆی بمانخاتە ڕیزو ژێر ئاڵای ئەو بەندە تایبەتیانەی خۆی.

**وصلى الله وسلم على سيد القادة وقائد السادة محمد رسول الله و خاتم النبيين وعلى آله وأصحابه وكل تابع لهم بإحسان الى يوم الدين**

سوپاسی بێهاوتا بۆ خوای پەروەردگاری میهرەبان کە یارمەتی دام لەم ڕۆژەدا، یەك شەممە ١٤٠٤/١/٣هـ لێ بوومەوەلە تەفسیری ئەم سوورەتە کە لە سوورەتی (الکهف)ەوە هاتووە، الحمد لله ثم الحمد لله ثم وثم... داواکارم کە لێم وەرگرێو یارمەتیم بدات بۆ تەفسیر کردنی ئەو بەشی یەکەمەی کە ماوە، داواکارم کە بیکا بەهۆی سڕینەوەی گوناهمو بیکا بە قەڵغانو چەکێکی بەکاربۆم لەجەنگو ئاژاوەم لەگەڵ شەیتانو شوێن کەوتووەکانی شەیتان - آمین-.